# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی یازدەیەم

## تەفسیری سوورەتی (یوسف)

عەلی باپیر

# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

عەلی باپیر

بەرگی یازدەیەم

تەفسیری سوورەتی (یوسوف)

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

نووســەر : عەلی باپیر.

نەخشەسازیی ناوەوە : عزالدین محمد عمر.

نۆرەو ساڵی چاپ : یەکەم ١٤٤٠ ك– ٢٠١٩ز .

تــیراژ : ١٠٠٠ دانە .

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەكی ئەم تەفسیرە بەگشتی

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلامُ اللهِ وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ[1] .

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەكان !

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - كە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین كتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەكانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفكرینو ڕامان، فێركردن، كارپێكردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێو ، خاوەنەكەی لە دنیاو دواڕۆژدا لێی بەهرەمەندە.

---

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) كە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەكرد ، پێش هەر قسەیەكی گرنگ ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییكردن (خِطْبَة)و... هتد، وە ئەم وتارە ، هەركام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێكی هێناوە.

منیش كە - وەك باسكردنی چاكەی خوا (التحدّث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم كردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاكەی لەگەڵ كردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی كردووم و، بەر لە تەمەنی بیست ساڵییەوە هیدایەتی داوم، كە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بكەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەكانی قورئان و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەكەتەكانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێكڕای كتێب و نامیلكەو وتارو دەرسەكانم، كەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، كە دیارە هەر ئەمەش شتێكی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، كە ئەویش هەر ڕوونكردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێكردن و كارپێكردنیەتی، شتێكی دیكەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو كە براو خوشكانێكی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەكردم كە دەست بكەم بە دانانی تەفسیرو لێكدانەوەیەكی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، كە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو كارە گەورەو گرنگە بكەم، بەڵكو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێكی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێكی وام بۆ دەڕەخسێ كە بتوانم خێرایی تێدا بكەم و خۆمی بۆ یەكلایی (متفرِّغ) بكەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بكەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێكدانەوەیەشم ، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی كە باون و ، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونكە بێگومان قورئان : هەندێكی هەندێكی ڕوون دەكاتەوە: (القرآن یُفَسِّر بعضُهُ بَعْضَاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونكە پێغەمبەری خواش ڕوونكەرەوە (مُبَیِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾

النحل، واتە: وە زیكرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار ، تاكو ئەوەی بۆ خەڵكی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بكەیەوە، وە بەڵكو خۆشیان بیربكەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێكدانەوەیەكی وا بۆ قورئان پێشكەش بە مسوڵمانانی كوردستان بكەم،

کە لە قورئـان بوەشـێتەوەو ، مایەی بەهرەو سوودی خوێنـەران بێ، بەتایبـەتیش کە زیاتر لـە سی (٣٠) ساڵە لەگـەڵ قورئـانی بـەرزو مـەزنو تەفسیـرەکانیو کتێبـەکانی سوننەتدا خـەریکمو ، دەیـان کتێـبو بەرهـەمی جۆراوجـۆرم لـە زۆربـەی بوارەگـانی زانسـتەکانی شـەریعەتدا پێشـکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیستو دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایـەن ئـەمریکاوە - لـە (٢٠٠٣/٧/١٠ تـاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفـەتێکی گـەورەو گـرنگ بـوو، بـۆ زیـاتر پێـدا قووڵـبوونەوەی کتێبـی خـوا (تبـارك و تعالی)، وە بۆ پەیدابوونی تێگەیشـتنی تایبـەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتـەکانی یەوە ، ئەم ڕاستییەش لە مەوسـووعەی : (الإسـلام كما يتجلّى في كتـاب الله تعالـى)دا زۆر چـاك درەوشـاوەتەوە[1]، بـەڵام هـەڵبەتە ناڵـێمو هیچکەسـیش بـۆی نیـە بڵـێ: کـە ئـەم تەفسیرەی مـن تێروتـەواوە، چـونکە وێـڕای سـنووردداربوونی توانـاو بڕسـتم ، لـە بەرانبـەر کتـێبی لـە هـەموو ڕووێکـەوە ڕەهـا (مطلق)و بێسـنوور (لا محـدود)ی خـوادا، نەشمویسـتوە کـە زۆر بەمـلاولادا بچـمو بچمـە نێـو هـەندێك وردەکـارییەوە، کـە یـان مـن تێیـدا پسپۆڕو شـارەزا نیم، یـان خوێنـەر پێویسـتی پێـی نیـە، لـە کاتێکدا دەیـەوێ لـە قورئـان تێبگـاتو، بزانـێ خـوا (تبارك وتعـالی) ڕاستەوخۆ چی پێ فـەرمووە ؟!

ئنجا هـەر لێرەشەوە بـە پێویستی دەزانم پڕ بـە دڵ سوپاسی ئـەو بـرا گەنجـە ڕووح سـووكو گـورجو گـۆڵو دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نـەکرد نـاوی بهێـنم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشان تایپکردنو دوایی پێداچوونەوەو هەڵەگـیریی، سـەرجەم ئەم زنجیـرە دەرسە، کە لە ئەسڵدا لە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشکەش کراون، هـەروەها هـەڵسا بە (تخریج)ی سەرجەم دەقەکانی سوننەت، لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوەو، زەحمەتو ماندووبوونێکی زۆری بە سەرجەم بەرگەکانی ئەم تەفسیرە کێشـاوە، خـوا بە باشـترین شـێوە پاداشتی بداتەوەو، هـەر صـاڵحو سـاغو سـەلامەتو

---

[1] ئەو مەوسـووعەیە کە ئێسـتا چاپ کراوەو ، کەوتۆتـە بەردەسـتی خوێنـەرانو، سـەرجەم هەشـت بـەرگو دەوری سـێ هـەزارو پێـنج سـەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیـەو، هەوڵمـداوە بەگشـتی تێیدا باسـی سەرجەم لایەنەکانی ئیسـلام بکەمو، تاکە سـەرچاوەشم قورئـان بـووە، وێـڕای دەقـەکانی سـوننەت، کە لە هۆش (ذاکرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا ، کـراوە بـە دوازدە (١٢) کتێبـی سـەربەخۆ ، بە مەبەستی ئاسانتـر سوود لـێ بینـرانی

سـەربەرزبێ[١]، لە خوای بەرزو بێهـاوتاش داواكارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە كوڕانو كچان، لەنێو گەلەكـەماندا، زۆر بكـات .

شـایانی باسیشـە كـە ئێمـە لـەم تەفسیـرەماندا باسـی بـەش (جـزء)ەكـانی قورئـانو دابەشكردنەكانی دیكـەی وەك: - (حـزب) - ناكـەین، چونكە هـەر سـوورەتێك بۆخـۆی شـتێكی سـەربەخۆیـەو، سـەرجەم ئایەتـەكانی وەك ئاڵقـەكانی زنجیرێـك پێكـەوە پەیوەستنو، ئاشكراشە كـە دابەشـكرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەسـت (٦٠) (حـزب)، شـتێكە لەلایـەن زانایانـەوە كـراوە، بـۆ ئاسـانكاریی خوێنـدنی قورئـان، دیارە ئێمە لە دابەشكردنی بەرگەكانی ئەم تەفسـیرەشـدا، دیسان حیسـاب بـۆ بەشەكان (أجزاء)ی ناكـەینو، بە گوێرەی سـوورەتەكان، بەرگـەكانی دیـاریی دەكـەین

دوا قسـەشـم ئەوەیـە كـە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشـتـر گوتمـان - لـە ئەسڵدا بەشـێوەی دەرسو وتـار پێشكەش كـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیـدا چوومـەوەو، بـەپێی پێویسـت دەستكارییم كردوە، دیارە هـەموو دەرسـێكیش بـەناوی خـواو ستایشی خـوا ﷻ دەسـتی پێكردوە، بەڵام ئێمە لـە سـەرەتای دەرسـەكانەوە ، ئەوانـەمان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبـارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبـة الحاجـة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشـەكییەوە هاتوە، لـەجیاتی سـەرەتای سـەرجەم دەرسـەكانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ، وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧ هـەولـێر

---

١) ئـەو بـرا دڵسـۆزە ئێسـتاش پـاش سـوورەتی (یوسـف)، سـەرگەرمی سـوورەتی (الرعـد)و سوورەتەكانی دواییشیەتیو عەزمیشی جەزم كردوە ، كە ئەگەر تەمەنمـان بـەردەوام بێ ، هەتـا كۆتـایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی كارەكەی بێ

# بەرچاوڕوونییەکی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

خوێنەری بەڕێز !

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەمو زۆر لێیان سوودمەند بووم ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیوە، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکاتو نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتنو بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبیو بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتییو بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەمو، زۆریش لە ئەمانەتی زانستی (الأمانة العلمية) دەخەفتێمو مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینییو ئەمانەت پارێزی ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم لەبارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتنو بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە ، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەکی ئەم بەرگە

خوشك‌و برا بەرێزو خۆشەویستەکانی خوێنەرەوەی (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز) !

ستایشی بێ پایان و شایستە بۆ خوای زاڵی بە بەزەیی، کە یارمەتی داین بگەینە تەفسیرکردنی سوورەتی (یوسف)یش علیە السلام کە بەشێك لە جوزئی دوازدەو بەشێکیش لە جوزئی سێزدە دەگرێتەوە.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئێمە بە نەفەسێکی درێژو قووڵ تەفسیری ئەم سوورەتە بەپێزەی قورئانی مەزنمان کردوەو، هەڵوەستەی زۆرمان لە بەرامبەر ئایەت‌و ڕستەکانی دا کردوە، لێرەدا بە پێویستی نازانم هیچی دیکە بڵێم، بەڵام سەرنجتان ڕادەکێشم بۆ:

یەکەم: ئەو شەست (٦٠) دەرس‌و پەندەی کە کۆتایی باسکردنی ژیان‌و بەسەرهاتی (یوسف)دا علیە السلام خستوومانەڕوو، کە زۆر شایستەی لێوردبوونەوەو تێوەڕامانن

دووەم: کورتە باسەکانی کە لە میانی تەفسیرکردنەدا هاتوون، بەتایبەت :

١/ کورتە باسێك لەبارەی خەونەوە

٢/ باسێکی گرنگ لەبارەی هاوبەش بۆ خوا دانان (شرك)ەوە.

خواش بە لوطف و بەخششی بێسنووری خۆی تەمەنی هەموو لایەکمان زیاتر پڕ بەرەکەت بکات‌و، بە ڕەزامەندیی خۆی دا بەکارمان بێنێ‌و ، کاروبارمان ڕاستە بێنێ‌و سەرەنجاممان خێر بکات.

٣ ی محرم ١٤٤٠ ك

٢٠١٨/٩/١٣ ز هەولێر

# دەستپێک

بەڕێزان !

خوا پشتیوان بێ دەست دەکەین بە ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای ئایەتە بەپێزەکانی سووڕەتی (یوسف)، کە ئەمڕۆ (٢٠)ی مانگی (شوال)ی (١٤٣٧)ی کۆچییە، بەرانبەر (٢٥)ی تەمموزی (٢٠١٦)ی زایینی، دیارە ئێمە ئەم دەرسەمان تەرخان دەکەین بۆ پێناسەی ئەم سووڕەتەو، تیشك خستنە سەر نێوەڕۆکیو، ئەو بابەتانەی کە گرتوونیە خۆی

# پێناسەی سوورەتی (یوسف) و نێوەڕۆکەکەی لە پێنج خاڵدا

**یەکەم** / سووڕەتی یوسف هەر ئەم ناوەی هەیە، چونکە هەندێك لە سووڕەتەکانی قورئان زیاتر لە ناوێکیان هەیە، سووڕەتێکی مەککەییەو، ژمارەی ئایەتەکانی (١١١) ئایەتە، ئەویش بە یەك دەنگیی زانایان، چونکە هەندێك جار زانایان لە سەرژمێر کردنی ژمارەی ئایەتەکانیشدا، ڕاجیاییان هەیە، بەڵام ئەوە کە ئەم سووڕەتی (یوسف)ە ناوەکەی هەر ئەو ناوەیەو، ژمارەی ئایەتەکانیشی (١١١)یە، هیچ زانایەك ڕایەکی جیاواز لەوەی نەبووە.

**دووەم** / ئەم سووڕەتە تایبەتە بە بەسەرهاتی یوسف عليه السلامەوە، یوسف کوڕی یەعقووب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ، ئنجا بەسەرهاتی یوسف عليه السلام تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە، کە لەم سووڕەتەشدا (٢٥) جار ناوی یوسف دووبارە بۆتەوەو، لە هەموو قورئاندا (٢٧) جار ناوی یوسف هاتوە، (٢٥) جاریان لەم سووڕەتی (یوسف)داو، لە سووڕەتی

(الأنعام)یشدا جارێك لە ئایەتی (١٨٤)داو، لە سووڕەتی (غافر)یشدا جارێك لە ئایەتی (٣٤)دا، واتە: هەمووی (٢٥ + ١ + ١ = ٢٧) جار، ناوی یوسوف لە قورئاندا هاتوە.

**سێیەم** / ئەم سووڕەتی یوسوفە لە ڕیزبەندیی موصحەفدا ژمارە (١٢)یە، بەڵام لە ڕیزبەندیی هاتنە خواردا (تَرْتِيب النّزول) لەسەر ڕای زۆربەی زانایان : ژمارە (٥٣)یە، هەشیانە ژمارەیەك زیاتر، یاخود کەمتری گوتوە، چونکە ئەوە شتێك نیە زانایان هەموویان لەسەری یەك دەنگ بووبن، ئنجا ئەم سووڕەتە لە دوای سووڕەتی (هود) هاتوەو، لە پێش سووڕەتی (الحجر)دا، ئەوەش ڕای زۆربەی زانایان

**چوارەم** / بەسەرهاتی یوسوف ﷺ تاکە بەسەرهاتێکە بەو شێوەیە لە قورئاندا هاتبێ، واتە: تەنیا ئەم بەسەرهاتی یوسوفە، وەك بەسەرهاتێکی تەواو (قِصَّة كَامِلَة) لە قورئاندا هاتوە، هەر لە سەرەتاوە قۆناغی منداڵی تاکو، گەنجێتیو تا دوایی، دیارە بەسەرهاتی پێغەمبەرانی دیکە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لە قورئاندا هاتوە، بەڵام لە هیچ شێوێنێك هەمووی بەسەر یەکەوە نەهاتوە، بەڵکو لە هەر سووڕەتەدا بەشێکی، یان چەند بەشێکی هاتوەو، تیشکی خراوەتە سەر، نەك وەك ئێرە، بە شێوەیەکی زنجیرەییو پلە پلەیی لە سەرەتاوە تا کۆتایی

**پێنجەم** / ئەم سووڕەتە وەك گوتمان ژمارەی ئایەتەکانی (١١١)یەو، لە ڕووی بابەتەکانیو نێوەڕۆکییەوە، بە پێی سەرنجدانی من، ئەم سووڕەتە لە پێشەکی (مُقَدِّمَة)یەك پێك دێت، لەگەڵ سێزدە (١٣) ئاڵقەو بەشی یەك لە دوای یەك‌و، ئەنجامگیریی (إِسْتِنْتَاج)ێك لە کۆتایی دا، هەر بۆیەش من کۆی ئەم سووڕەتەم دابەش کردوە، بۆ پازدە (١٥) دەرس، کە لێرەدا هەر کامیان تیشکێکی دەخەمە سەر، بۆ بەرچاوڕوونیی خوێنەرانی بەڕێز :

# دەرسەكانی ئەم سوورەتە

**دەرسی یەكەم:** كە وەك پێشەكی وایە، شەش (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، لەم شەش (٦) ئایەتەدا، خوا ﷻ سەرەتای پێناسەی قورئان دەكات، دەفەرموێ: ﴿ الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ۝١ ﴾، بە كتێبێكی ڕوونكەرەوە، یاخود ڕۆشن، پێناسەی دەكات، دوایی دەفەرموێ: ئێمە ئەم قورئانەمان بە زمانی عەرەبیی ناردۆتە خوار، بەڵكو بفامن، دوایی باسی ئەوە دەكات كە بەهۆی ئەم قورئانەوە، ئێمە باشترین بەسەرهات گێڕانەوەمان بۆ تۆ فەراهەم هێناوە، كە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، هەرچەندە پێشتریش لە بێ ئاگایان بوویێ

ئنجا دوایی دێتە سەر باسی یوسوف ؑ كە خەونێكی بینیوەو، واش پێدەچێ پێش قۆناغی باڵغ بوون بووبێ، جا هەندێك دەڵێن: تەمەنی یازدە (١١) ساڵ بووەو، هەندێكی دی دەڵێن: تەمەنی دوازدە (١٢) ساڵ بووەو كەمترو زیاتر، هەرچەندە لە پەیمانی كۆندا دەڵێ: تەمەنی حەڤدە (١٧) ساڵ بووە، بەڵام وەك دوایی دەیگەینێ، وا پێدەچێ پێش قۆناغی باڵغ بوون بووبێ، كە یوسوف خەونێك دەبینێ، دەڵێ: من لە خەونم دا خۆرو مانگ و یازدە (١١) ئەستێرەم بینین، كڕنووشیان بۆ دەبردم، ئەو خەونە بوو بۆ بابی دەگێڕێتەوە، بابیشی دەڵێ: ڕۆڵە! ئەو خەونەت بۆ برایەكانت مەگێڕەوە، نەوەك پیلانێكت لە دژ بگێڕن، چونكە شەیتان دوژمنێكی ئاشكرایە بۆ مرۆڤ، واتە: شەیتان دنەدانو خوتخوتەی خراپیان بخاتە دڵو، ئێرەیی و حەسوودییان بەرانبەر بە تۆ بجووڵێو، سەرەنجام تووشی زیانێكت بكەن .

دوایی مۆژدە دەدا بە یوسوف ؑ كە ئاوا پەروەردگارت تۆ هەڵدەبژێرێو، لێكدانەوەی مانای خەونەكانو، لێكدانەوەی مانای فەرموودانت فێر دەكاتو، چاكەی خۆی لەسەر تۆو لەسەر بنەماڵەی یەعقووب تەواو دەكات، وەك چۆن

پێشتـر چاکـەی خـۆی لەسـەر هـەردوو بابـت واتـە: ئیبـراهیم‌و ئیسحاق : بـاب‌و باپیـرت تـەواو کردوە، بێگومان پەروەردگـارت زانای کـاربـەجێیـە .

**دەرسی دووەم :** ئاڵقـەی یەکەمی بەسەرهاتی یوسوف پێکـدێنـێ، کـە لـە ئایـەتی (٧ تـاکو ١٨) ئایەت، واتە: دوازدە(١٢) ئایەت دەگرێتـە خۆی، لەم ئاڵقـەی یەکەمـەدا، خـوا ﷻ دەست دەکات بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی یوسوف ﷺ، کە برایەکانی، {واتە: دە (١٠) برایەکـەی دیکـەی}، بـە پێـی ئـەو زانیارییانـەی لـە پـەیمانی کـۆنیشـدا هـاتوون، چونکە یوسـوف‌و بنیامین لە دایکێك بوون بە ناوی (راحیل)و، دە (١٠) برایـەکـەی دیکەیان لە دایکێکی دیکـە بوون، یـان لـە دایکـێکـی دیکـەو، کەنیزەکەکـەی، بـە نـاوی (لـیـیَا) یاخـود (لَیْئَـة

بە هەر حاڵ، ئەو برایانـە دەچنە لای بابیـان، دوای ئـەوەی کـە لەبـەر خۆیانـەوە دەڵێن: بابمان یوسـوف‌و برایەکەی (بنیـامین)، لـە ئێمـە زیـاتر خـۆش دەوێ، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئێمـــە دە (١٠) بـراین، وا دیـارە وا تەصـەووڕ دەکـەن، وەك دوایـی باسـی دەکەین.

ئنجا لـە نێـوان خۆیانـدا نەخشـە دادەڕێـژن کـە یوسـوف بکوژن، یـاخود لەسـەر زەمینێکی چۆڵ فـڕێی بـدەن، بـۆ ئـەوەی کـە بابیـان زیـاتر ڕوو لـەوان بکـات، دوایـی یەکێکـیان دەڵـێ: نا، نەچـن بیکـوژن، بەڵـکـو فڕێیدەنـە قـووڵایی بیـرێکەوە، کـە دوایی هەندێك کـاروانـچی بۆ خۆیان هەڵی بگرنەوەو، دەربازمـان بـێ، ئیدی دەچن بۆ لای بابیان‌و بە گلـەیی کردنەوە دەڵێن: بۆچـی تـۆ متمانـە بـە ئێمـە ناکەی، کـە ئێمە دڵسـۆزین بۆ یوسوف؟! بەیـانی لەگەڵمان بینێرە بۆ سەفەرو گەشـت، ئـەویش دەڵـێ: پـێم ناخۆشـە لـێم دوور بکەوێتـەوەو دەترسێم گـورگ بیخـوات، ئـەوانیش دەڵێن: ئنجا ئەگەر ئەو گورگ بیخواو، ئێمەش ئەو هەموو برایە بین، کەواتـە: ئێمـە زیانبـارین، ئیـدی سـەرەنجام ڕێکدەکـەون کـە یوسـوف بخەنـە بیـرەکەوەو، دەیخەنـە بیرەوە، خـوای پەروەردگاریش یوسوف ﷺ ئاگادار دەکاتەوە کە کاتێـك دێ، تـۆ ئـەوە دەخەیەوە بیر برایەکانت، بـێ ئەوەی ئەوان هەسـتی پـێ بکـەن

دوایی دە بڕایـەکە دەگـەڕێنەوە بـۆ لای بابیـان‌و درۆیـەك ڕێکـدەخـەن، دەڵێن: ئێمە ڕمبازێنمان دەکرد، یاخود پێشبـڕکەمان دەکرد، یـاخود نیشانەمان دا دەکـردو،

یوسوفمان لە لای كەڵو پەلەكانمان بەجێ هیشتبوو، بەڵام كە هاتینەوە، گورگ خوارد بووی، تۆش بڕوامان پێ ناكەی، هەرچەندە ڕاستگۆ بین، ئنجا خوێنێكی درۆینیش واتە: خوێنی گیسكێك، یاخود كاوڕێك، لە كراسەكەی هەڵدەسوون، بابیشیان دەڵێ: بەڵكو ئێوە هەر بۆ خۆتان ئەوەتان ڕێكخستوە، من بە شێوەیەكی جوان ئارام دەگرمو، هەر پەنا بە خوا دەگرم، لە بەرانبەر ئەوەدا كە ئێوە دەیڵێن .

**دەرسی سێیەم:** دەبێتە ئاڵقەی دووەم، لە بەسەرهاتی یوسوف و، ئەمەیان چوار ئایەت دەگرێتە خۆی ئایەتەكانی: (١٩ تاكو ٢٢)، كە لەم ئاڵقەی دووەمەدا، دوای ئەوەی یوسوف فڕێ دراوەتە نێو بیر، باسی هاتنی كاروانێك دەكرێ كە ئەوانیش ئاو هێنەرەكەی خۆیان دەنێرن بۆ سەر بیرەكەو، كاتێك دۆڵچەكە دادەهێڵێ، دیارە یوسوف خۆی پێوە دەگرێو دەچێتە نێو دۆڵچەكە، ئنجا كە هەڵیدەكێشێتەوە، لە جیاتی ئەوەی ئاو بێ، دەبینێ منداڵێكی تێدایە : دڵخۆش دەبێ، دوایی وەك كەڵو پەلێكی بازرگانیی پەنهانی دەكەنو، وای پێشاندەن كە ئەوە هی خۆیانەو، بە نرخێكی كەم دەیفرۆشن، ئنجا دەیكڕێ لە میسڕ – دیارە لێرە باس ناكات، بەڵام دوایی بۆمان دەردەكەوێ كە عەزیزی میسڕە كە هەندێك دەڵێن: سەرۆكی سوپای میسڕ بووە، هەندێك دەڵێن: جێگری سەرۆكی وڵاتی میسڕ بووە، گرنگ ئەوەیە بە وشەی (عزیز) ناوی دەهێنرێ – ئامۆژگاریی هاوسەرەكەی دەكات كە ڕێزی لێ بگرێ، خواش دەفەرموێ: ئاوا بەو شێوەیە ئێمە یوسوفمان لەوێ نیشتەجێ كرد، لە بیرەوە بۆ قەصر، لە قووڵایی بیرێكی تاریكەوە، بۆ ڕۆشنایی كۆشكێكی ڕازاوە .

ئنجا خوا ﷻ دەری دەخات، كە هەرچی بیەوێ دەكاتو، زاڵە بەسەر كاروباری خۆیدا، بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن، دوایی باسی ئەوە دەكات، كە كاتێك یوسوف گەیشتە تۆغیانی تینو توانای خۆی: هەم حیكمەتمان پێدا، هەم زانیارییمان پێدا، ئاوا پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوە

**دەرسی چوارەم:** كە ئاڵقەی سێیەم دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (٢٣ تاكو ٢٩)، واتە: (٧) ئایەت، لێرەدا میحنەتی دووەم، لە ماڵی عەزیزی میسڕدا بۆ یوسوف دێتە پێش، كە بریتیە لەوەی هاوسەرەكەی تەماع لە یوسوف ﷺ دەكاتو، خۆی بۆ

ڕادەنوێنێ كە زینای لەگەڵدا بكات، بەڵام یوسوف دەڵێ: پەنا بە خوا، پاشان دەڵێ: وەك وەفا بۆ هاوسەرەكەی تۆ، كە ڕێزی لە من گرتووەو خزمەتی كردووم، ستەمكارانیش سەرفراز نابن، من ئەو كارە ناكەم، ئیدی سەرەنجام (لەسەر ڕای هەندێك لە زانایان) دەبێتە چنگە پرچەیان: ئافرەتەكە دەیەوێ لێی بدات، لەبەر ئەوەی ئەو غوڵامیەتیو بە قسەی ناكات، بۆ ئەو گوناهە، یوسوفیش (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لەبەر ئەوەی بەڵگەی پەروەردگاری دەبینێ: ئەو ئیمانو عەقیدەیەی لە دڵو عەقڵی دایە، كە ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، ئەویش دەستی لەبەر دەكردەوەو لێی دەدا، بەڵام سەرەنجام یوسوف دەیەوێ بچێتە دەرێو ڕادەكات، وە ئافرەتەكەش بە دوای داو، لە دوایەوە كراسەكەی دەگرێو ڕایدەكێشێو دەیدڕێنێ، بەڵام لە دەرگای دەرەوە دەگەنە مێردی ئافرەتەكە (عەزیزی میسر)و ئافرەتەكە بوختانێكی بۆ هەڵدەبەستێو دەڵێ: سزای كەسێك كە نیازی خراپەكردنی هەبێ بەرانبەر بە هاوسەرەكەی تۆ، جگە لە زیندانیی كردن، یاخود ئازارێكی بە ئێش، چی دیكەیە ؟!

دیارە یوسوف عليه السلام یش وەك بەرگریی كردن لە خۆی دەڵێ: ئەو پڕكێشیی منی كردوە، ئەو موغازەلەی منی كردوەو، ویستوویەتی: من خراپەی لەگەڵدا بكەم، نەك من دەست پێشخەربم، واتە: ئەو دەست پێشخەر بووە، دوایی یەكێك لەو بنەماڵەیەی ئەو كابرایە، (لە نیزیكانی عەزیز) دەڵێ: تەماشا بكەن! ئەگەر كراسەكەی لە پێشەوە دڕابێ، ئەوە ئافرەتەكە ڕاست دەكاتو، ئەگەر كراسەكەی لە دواوەش دڕابێ، ئەوە یوسوف ڕاست دەكات، كە تەماشا دەكەن: كراسەكەی لە دواوە دڕاوە، واتە: ڕای كردوە لە چنگی، عەزیز بۆی دەردەكەوێ كە دەست پێشخەرییەكە لە ئافرەتەكەوە بووە

ئنجا عەزیز دوایی ئامۆژگاریی یوسوف دەكات دەڵێ: باسی ئەو بابەتە مەكە، بە ئافرەتەكەش دەڵێ: داوای لێبوردن بكە، (واتە: لە من بۆ گوناهەكەت)، چونكە تۆ خەتابار بووی، ئنجا چ ئەو وای لێ حاڵی بووبێ، كە تەنیا چنگە پرچەو دەمەقاڵێیان بووە، یاخود وەك حەقیقەتی مەسەلەكە حاڵی بووبێ، كە ئافرەتەكە دەست پێشخەریی كردوە: یوسوف زینای لەگەڵدا بكات، گرنگ ئەوەیە بۆی دەردەكەوێ كە خەتا بە لای هاوسەرەكەیدایەو، بار بەلای ئەودا لارە.

**دەرسی پێنجەم:** ئاڵقەی چوارەمی بەسەرهاتی یوسوف دەگرێتە خۆی‌و، ئایەتەکانی: (٣٠ تا ٣٥) دەگرێتەوە، واتە: شەش (٦) ئایەت، لەم ئاڵقەی چوارەمەدا ئافرەتانی میسڕ (دیارە دەبێ ئافرەتانی تایبەت بووبن، کە سەروکاریان بووە لەگەڵ کۆشکی عەزیزی میسڕو لەگەڵ هاوسەری عەزیزی میسڕدا) لە بەینی خۆیاندا گلەیی دەکەن: چۆن دەبێ ژنی عەزیز تەماع بکاتە غولامێکی خۆی‌و، هێندەی خۆش بوێ، داوای لێبکات کە خراپەی لەگەڵدا بکات؟! ئەویش کە بەو پیلانەیان دەزانێ، {بۆیە بە وشەی (مکر) پیلان، هێناویەتی، ڕەنگە ئافرەتەکان هەر مەبەستیان ئەوە بووبێ: هانی ئەو ژنە بدەن یوسوفیان پێشان بدات)، دیارە ئەویش کورسییانیان بۆ دادەنێ‌و، جۆرە میوەیەکیان بۆ دادەنێ کە پێویستیی بە چەقۆ بێ، بۆ ئەوەی سپی بکرێ، یان قاش قاش بکرێ، سەرو چەقۆشیان دەداتە دەست، ئنجا لەو کاتەدا کە ئەوان سەرگەرمی میوە خواردن، یاخود میوە قاش قاش کردنن، بە یوسوف دەڵێ: بچۆ بۆ لایان، تاکو خزمەتیان بکات، بۆ ئەوە ببینن، کاتێك کە دەیبینن، زۆر سەرسام دەبن بە جوانیی‌و هەیبەتی یوسوف (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)و، دەستی خۆیان لە تاوان دەبڕن، واتە: دەست‌و پەنجەی خۆیان لە تاوان برینداز دەکەن، کە وا سەرنجیان دەچێتە سەر یوسوف، ئاگایان لە دەست‌و پەنجەی خۆیان نامێنێ‌و، دەشڵێن: ئەوە بەشەر نیە، بەڵکو ئەو فریشتەیەکی بەرێزە .

ئنجا ژنەکەی عەزیزیش دەڵێ: ئا ئەوە بوو کە سەرکۆنەی منتان لەسەری دەکرد، ئنجا دانی پێدا دێنێ، دەڵێ: من داوام لێ کردوە کە لەگەڵم جووت بێ، بەڵام ئەو خۆی پاراستوەو، ئەگەر ئەوەی من فەرمانی پێدەکەم، نەیکات، زیندانیی دەکرێ، یاخود زۆر زەبوون‌و ڕیسوا دەبێ، یوسوف ﷺ یش لە بەرانبەر ئەوەدا لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە، دەفەرموێ: من زیندانم پێ خۆشترەو لەوەی ئەوان منی بۆ بانگ دەکەن، ئەگەر تۆش پیلانی ئەوان لە من لانەدەی، ئەوە من بە لایاندا دەچم‌و لە نەفامانندا دەبم، پەروەردگاریشی وەڵامی ئەو پاڕانەوەی دەداتەوەو، پیلان‌و فێڵی ئەوانی لێ دوور دەخاتەوە، چونکە خوا بیسەری زانایە.

دوایی هەرچەندە ئەو هەموو نیشانانە دەبینن‌و، بۆیان دەردەکەوێ کە یوسوف پاك‌و بەرییە، بەڵام دیسان بڕیاری زیندانیی کردنی دەدەن، تاکو کاتێکی

نادیار، یانی: بۆ كاتێك كە كۆتاییەكەی دیار نیە، بۆ ئەوەی ئەو (قیل) و (قال)و دەنگ‌و باسە، كۆتایی پێ بێ

**دەرسی شەشەم:** ئاڵقەی پێنجەم لە بەسەرهاتی یوسوف دەگرێتە خۆی‌و، ئایەتەكانی: (٣٦ تا ٤٢)، واتە: حەوت (٧) ئایەت دەگرێتەوە، لەم ئاڵقەی پێنجەمەدا، باسی چوونە زیندانی یوسوف ﷺ دەكرێ، كە دوو كەسیش كە لەگەڵیدا هاوەڵ دەبن لە زینداندا، ئنجا یەكێكیان خەون دەبینێ: كە ترێی گوشیوەو شەڕابی دروست كردوە، بۆ گەورەكەی خۆی، ئەوی دیكەشیان خەون دەبینێ: كە سینیە خواردنێكی لەسەر سەری داناوە، باڵندە لێیان خواردوەو، داوای لێ دەكەن كە ئەو دوو خەونەیان بۆ تەعبیر بكات‌و، مانایەكانیان بۆ لێكبداتەوە، یوسوف ﷺیش ئەمە بە هەلێك دەزانێ، كە پێش ئەوەی خەونەكانیان بۆ تەعبیر بكات، بانگیان بكات بۆ خوا پەرستیی‌و، تەنیا بەندایەتی بۆ خوا كردن، دیارە ئەوانە هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، ئیدی بەڵگەیان بۆ دێنێتەوە كە بێجگە لە خوا ﷻ هیچ كەس‌و هیچ شتێك شایستەی پەرست نیە، بۆشیان ڕوون دەكاتەوە كە لەو خوا بە یەكگرتنەی دا، شوێن ڕێبازی باب‌و باپیری خۆی: ئیبراهیم‌و ئیسحاق‌و یەعقووب، كەوتوەو، بۆیان نیە هاوبەش بۆ خوا دابنێن، دوایی بەڵگەیان بۆ دێنێتەوە لەسەر پووچەڵیی شیرك‌و، تەنیا ڕاستیی، خوا بە یەكگرتن.

ئنجا دوایی دێتە سەر مانا لێكدانەوەی خەونەكەیان، یەكەمیان كە خەونی بینیوە ترێی گوشیوەو، شەڕابی لێ دروست كردوە، پێی دەڵێ: تۆ بەردەدرێی‌و، دووبارە دەچیەوە سەر پیشەكەی خۆت: شەڕاب دەدەی بە گەورەكەی خۆت، بە هی دووەمیشیان دەڵێ: تۆش هەڵدەواسرێی‌و (إعدام) دەكرێی، سزا دەدرێی، باڵندەش لە گۆشتی كەللەی سەرت دەخۆن، پێشیان دەڵێ: خەونەكەتان تەواو بوو، مانایەكەی بەو شێوەیە، ئنجا بەوەیان كە دەزانێ، یاخود گومانی زاڵی وا دەبێ، كە دەربازی دەبێ، پێی دەڵێ: لەلای گەورەكەی خۆت باسم بكە، كە من لێرە بە زوڵم زیندانیی كراوم، واش پێدەچێ ئەو گەورەیەی ئەو كەسە شەڕابی بۆ دروست دەكات، پیاوێكی پایەدار بووبێ، هەندێك دەڵێن: پادشای میسر بووە، كە عەزیز جێگری بووە، یاخود بەڕێوەبەری پۆلیس (مدیر الشرطة)كەی بووە، بەڵام شەیتان لە بیری ئەو كابرایە دەباتەوە، كە باسی یوسوف بكات لەلای گەورەكەی

خۆیو، سەرەنجام یوسوف ﷺ چەند ساڵێکی دیکە بە زوڵم لەو زیندانە دەمێنێتەوە، ﴿فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ۝٤٢﴾، وشەی (بِضۡعَ)یش، دەڵێن: لە (٣ تاکو ٩) ساڵە، هەندێکیش دەڵێن: (٧) ساڵە .

**دەرسی حەوتەم:** ئاڵقەی شەشەم لە بەسەرهاتی یوسوف دەگرێتە خۆیو، ئایەتەکانی: (٤٣ تا ٤٩)، واتە: حەوت (٧) ئایەت، دەگرێتەوە لەو ئاڵقەی شەشەمەدا، باسی خەون بینینی پادشا دەکرێ، پادشای میسر، کە خەون دەبینێ: حەوت مانگای لەڕ، حەوت مانگای قەڵەو دەخۆنو، حەوت گوڵە گەنمی لەڕ (یانی: بێ هێزو پێز)، حەوت گوڵە گەنمی قەڵەو دەخۆن، ڕیش سپیو دەستڕۆیشتووانی کۆڕو مەجلیسی خۆی کۆدەکاتەوە، دەڵێ: تەعبیری ئەو خەونەم بۆ بکەن، ئەوانیش دەڵێن: ئەوە خەونێکی تێکەڵو پێکەڵەو، ئێمە شارەزای مانای خەونی تێکەڵو پێکەڵ نین

لێرەدا، لەو کاتەدا ئەو کابرایەی لە دوو کەسەکە، (دوو هاوەڵە زیندانییەکە یوسوف) کە دەربازی دەبێ، دوای ماوەیەك، وە بیری دێتەوە دەڵێ: من هەواڵی تەعبیرو مانای ئەو خەونەتان پێ دەڵێم، بمنێرن، نەفەرێك هەیە لە زیندان کە مەبەستی پێ یوسوف ﷺە، ئەگەر پێی بڵێمو خەونەکەی بۆ باس بکەم، ئەو لە تەعبیری خەونان باش دەزانێ، ئیدی دەچێو پێی دەڵێ: ئەی یوسوف! ئەی پیاوی ڕاست بێژ! هەواڵمان پێبدە، بە تەعبیری خەونێکی وا، کە حەوت مانگای لەڕ، حەوت مانگای قەڵەو دەخۆنو، حەوت گوڵە گەنمی وشك یان لەڕو بێهێزو پێز، حەوتی تەڕوتازە یان پڕ دان دەخۆن، دیارە یوسوفیش تەعبیری خەونەکەی بۆ دەکاتو، لە هەمان کاتیشدا نەخشەشیان بۆ دادەنێ، دەڵێ: لەمەودوا حەوت ساڵی پڕ هاتو باتو پڕ بارانو بەرەکەت دێن، ئنجا ئەوەی کە لەو حەوت ساڵەدا بەرهەمی دێنن، لە دەغڵو دان، هەڵیگرن لە گوڵەکەی خۆیدا، باشتر دەپارێزرێ، لەوەی کە لە بەین بچێ، دوایی حەوت ساڵی گرانییو قاتو قڕیی دێنو، ئەوەی لە حەوت ساڵی پێشوودا بەرهەمتان هێناوە، دەتوانن لەو حەوت ساڵە گرانییو قاتو قڕیی یەدا، سوودی لێ ببینن، دوایی ساڵی پازدەیەم: حەوت ساڵی هەرزانیی، دوایی حەوت ساڵی گرانیی، ئنجا ساڵی پازدەیەم، دووبارە دەرووی خێر

لە خەڵك دەگرێتەوەو، خوای پەروەردگار لە فریای خەڵكەكە دێ، بە دابەزاندنی ئاو لە سەرێوە .

**دەرسی هەشتەم:** ئاڵقەی حەوتەم دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (٥٠ تا ٥٧)، واتە: هەشت (٨) ئایەت، لە خۆی دەگرێ، لەم ئەڵقەی حەوتەمەشدا، پادشا دوای ئەوەی، ئەو كەسەی ناردوویەتی بۆ لای یوسوف، تەعبیری خەونەكەی بۆ دێنێتەوە، سەری سووڕدەمێنێو پێی شتێكی زۆر عەجایب دەبێ، كە: خەونەكەی پەیوەندیی بە پازدە ساڵی داهاتووی وڵاتەكەیەوە هەیە! بۆیە دەڵێ: ئەم كابرایەم بۆ بێنن، یوسوفم بۆ بێنن، ئنجا دوای ئەوەی نوێنەرەكە دەچێ بۆ لای یوسوف ﷺ، یوسوف نایەتەدەر لە زیندان، دەڵێ: بگەڕێوە بۆ لای گەورەكەت، لێی بپرسە: ئەو ئافرەتانەی كە دەستو پەنجەی خۆیان بریندار كرد، لە كاتی میوە خواردندا، كە پەروەردگاری من بە فێڵەكەیان ئاگادارە، لێی بپرسە: ئەو ڕووداوە چی بوو؟! یوسوف دەیەوێ: بەر لەوەی لە زیندان بێتە دەرێ، سەرەتا خۆی تەبریە بكاتو پاكییەكەی خۆی دەربخات، تاكو نیشانەی پرسیاری لەسەر نەبێ، دیارە پادشاش ئەو ئافرەتانە كۆدەكاتەوەو لێیان دەپرسێ: ئەو كارەی ئێوە چی بوو؟ ئەو كێشەیەی ئێوە چی بوو؟ كە ئێوە هەمووتان گەلە كۆمەكییتان لە دژی یوسوف دەكرد، داواتان لێدەكرد كە زیناتان لەگەڵدا بكات؟ ئەوانیش گوتیان: پاكیی بۆ خوا هیچ خراپەیەكمان لێ نەبینیوە، ژنەكەی عەزیزیش گوتی: ئێستا هەق دەركەوت: من دەست پێشخەرییم بۆ كرد، من داوام لێ كرد كە لەگەڵم جووت بێ، بۆیە ئەو لە ڕاستگۆیانە .

ئنجا یوسوف ﷺ دەڵێ: ئەوەم بۆیە كرد، تاكو بزانێ، (واتە: عەزیزی میسر بزانێ) كە من خیانەتم لێ نەكردوە، كاتێك ئەو لە ماڵ نەبووەو، بێگومان خوا ناهێڵێ فێڵی خیانەتكاران سەربگرێ

پاشان یوسوف وەك خۆ بە كەمگرییەك دەڵێ: من خۆشم بە پاك دانانێم، نەفسی خۆم بە بێ گوناه دانانێم، چونكە نەفس زۆر فەرمان دەكات بە خراپە، مەگەر لە كاتێكدا كە پەروەردگاری بەزەیی پێیدا بێتەوەو لایبدات، بێگومان پەروەردگاری من لێبوردەی میهرەبانو بە بەزەییە

ئنجا دووبارە پادشا ئیلحاح دەکات دەڵێ: بۆم بێنن، من بە تایبەت دەیکەم بە ڕاوێژکاری خۆم، یاخود کاروباری تایبەتیی خۆمی پێ دەسپێرم، ئنجا کاتێك دێت و قسەی لەگەڵدا دەکات دەڵێ: تۆ لەلای ئێمە خاوەن پێگەو ڕێزیو، بە ئەمینداروو دڵسۆزیشت دەزانین، یوسوف ﷺ یش بۆی پێشنیار دەکات کە لەسەر عەمبارەکانی زەوی دایبنێ، واتە: کاروباری ئابووریی پێ بسپێرێ، خۆشی بە دوو سیفەت بۆ ئەو پێناسە دەکات، دەڵێ: من پارێزەریشم و زاناشم .

ئنجا خوا دەفەرموێ: بەو شێوەیە ئێمە یوسوفمان لە زەویدا کردە خاوەن پێگە، کە بۆ هەر شوێنێك ویستبای، دەیتوانی بچێ، واتە: دەست ئاوەڵا دەبێ لە میسردا، ئاوا بەو شێوەیە ئێمە بەزەیی خۆمان تووشی هەر کەسێك دەکەین کە بمانەوێ، پاداشتی چاکەکارانیش زایە ناکەین، بێگومان پاداشتی دواڕۆژ بۆ ئەوانەی کە خاوەنی بڕواو پارێزکاریین، باشترە لە هی دنیا

**دەرسی نۆیەم:** ئاڵقەی هەشتەمی بەسەرهاتی یوسوف ﷺ، ئایەتەکانی: (٥٨ تاکو ٦٢)، یانی: پێنج (٥) ئایەت دەگرێتە خۆیو، دەرسی نۆیەمی ئێمە پێکدێنێ، لەم ئاڵقەی هەشتەمەدا خوا ﷻ باسی برایەکانی یوسوف ﷺ دەکات، کە کاتێك قاتو قڕیو گرانیی بەسەر وڵاتدا دێ، دیارە لە حەوت ساڵی دووەمدا بووە، دێن بۆ میسر، بۆ ئەوەی کە باراشو ئازووقە بکڕن لە میسرو بیبەنەوە، دەبیستن کە لە میسر دەغڵو دان هەیە، پاشەکەوت کراوە، دیارە بە پێی نەخشەکەی یوسوف ﷺ

ئنجا کاتێك کە بارەکانیان بۆ بار دەکات واتە: دەغڵو دانو زەخیرە دەبەنەوە، کە دیارە دەبێ دە (١٠) کەس بوون، هەرچەندە لێرەدا تەفاصیلی نەهاتوە، بەڵام بە پێی سیاقی ئایەتەکان دەزانرێ: یوسوف دەبێ لێی پرسی بن: ئێوە کێنو لە کوێ دێن؟ ئێوە چەند کەسن؟ ئەوانیش گوتوویانە: ئێمە هەمووماندوازدە براینو برایەکی دیکەشمان لە ماڵێیە، هەڵبەتە ئەویش پرسیویەتی: بۆچی نەهاتوە؟ گوتوویانە: لەبەر ئەوەی برایەکی دیکەمان هەبووە، ئەو دوو برایەمان پێکەوە لە دایکێکنو، بابمان زۆری خۆشدەویست، بەڵام ئەو برایەمان لەبەین چوو، ئێستاش بابمان دڵی بەو برایەی دیکەمان خۆشە کە ناوی (بنیامین )ەو، برای ئەو برایە بزربووەمانە، دەبێ ئاوا تەفاصیلێکیان بۆ باس کردبێ .

چونکە یوسوف دەڵێ: دەبێ ئەو برایەتانەم بۆ بێنن، ئەگەر نەیهێنن، جارێکی دیکە مەیەنەوە بۆ لای من، بۆ باراش بردنو زەخیرە بردنو، توخنی وڵاتی ئێمە نەکەون !

ئەوانیش بەڵێنی پێدەدەن: هەوڵ لەگەڵ بابمان دەدەین کە لەگەڵمان ئیزنی بدات، دوایش یوسوف بە بەردەستەکانی، بەو گەنجانەی کە لەبەر دەستی دا کاریان کردوە، دەڵێ: نرخی باراشو زەخیرەکەی کە هێناویانە، بۆیان بخەنەوە نێو بارەکانیان، تاکو کە گەڕانەوە بیبیننو، جارێکی دیکە بگەڕێنەوە بۆ لامان !

**دەرسی دەیەم:** کە ئاڵقەی نۆیەم پێکدێنێ، ئایەتەکانی: (٦٣ تا ٦٨) واتە: شەش (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی ئەوەیە: کاتێك دەگەڕێنەوە بۆ لای بابیان بە باراشەوەو، بارەکان دەخەنو ئیسراحەت دەکەنو، هەواڵی پێدەدەن کە ئێمە لێمان قەدەغە کراوە جارێکی دی بچین باراشو زەخیرە لە میسر بێنین، مەگەر برایەکەمان لەگەڵمان بنێرێ، واتە: بنیامینی برامان !

ئەویش دەڵێ: ئایا چۆن تێتان ڕا ببینمو متمانەتان پێبکەم، مەگەر هەر ئێوە نەبوون کە متمانەم پێکردن دەربارەی یوسوفو، بەو شێوەیە بەو دەردەتان برد!! بەڵام دوایی جۆرە ئومێدەوارییەکیان دەداتێ کە لەگەڵیان بنێرێ، لەبەر ئەوەی زۆر پێویستییان بە باراشو زەخیرە بووەو گرانیی بووە.

ئنجا کاتێك بارەکانیان دەکەنەوەو تەماشا دەکەن: نرخی باراشو زەخیرەکەیان خراوەتەوە نێو بارەکانیان، دەڵێن: ئەی بابە! ئێمە چی دیکەمان دەوێ؟ ئەوە نرخو پارەکە، یاخود کەلو پەلێ کە باراشەکەمان پێی کڕیوە، ئەو زەخیرەیەمان پێ کڕیوە، بۆمان نێردراوەتەوە، ئنجا ئەو برایەمان لەگەڵ بنێرە، بۆ ئەوەی زەخیرە بۆ ماڵو خێزانمان بێنینو، بەهۆی ئەو برایەشمانەوە، بارێکی دیکە زیاد دەکەین، چونکە ئەوەی پێشتر کەمە

ئنجا بابیشیان: یەعقووب (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەڵێ: لەگەڵتان نانێرم تاکو پەیمانم پێ نەدەن، مەگەر هیچ چارەتان نەبێو دەورتان بگیرێ، ئەگەرنا دەبێ پارێزگاریی لێ بکەنو بیهێننەوە

ئنجا ئەوانیش بەڵێنی پێ دەدەن، دوایی بابیان ئامۆژگارییان دەكات، دەڵێ: هەمووتان لە دەرگایەكەوە مەچنە ژوور، بەڵكو لە چەند دەرگایەكی جیاوازەوە، بچنە شارەكەوە، دیارە میسرِیش وەك هەموو وڵاتانی دیكەی ئەو كاتە بووەو، هەموو دەوڵەتان شووراو دەروازەیان هەبووە، پێیان دەفەرمویٚ: لە چەند دەروازەیەكی جۆراو جۆرەوە بچنە ژوور، ئنجا ئایا لەبەر چاوو زار لێیان ترساوە، یاخود لەبەر باری ئەمنیی بووە بۆ ئەوە گومانی خراپیان پێ نەبردریٚ؟ هەر چۆنی بیٚ: بە پێی ئامۆژگاریی بابیان لە چەند دەروازەیەكی جۆراو جۆرەوە دەچنە ژوور، خواش دەفەرمویٚ: ئەوە هەر شتێك بوو یەعقووب ویستی پێیان بڵیٚ، ئەگەرنا ئەوەی خوا بیەویٚ، هەر ئەوە دێتە دی .

**دەرسی یازدەیەم :** كە ئاڵقەی دەیەمەو، ئایەتەكانی: (٦٩ تا ٧٩)، واتە: یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی، لەم ئاڵقەیەی دەیەمەدا لە بەسەرهاتی یوسوف ﷺ، باسی ئەوە دەكریٚ، كە دوای ئەوەی برایەكان دەچن بۆ لای یوسوفو، دەچنەوە بۆ هێنانی زادو زەخیرە، یوسوف بنیامینی برای جیادەكاتەوەو، خۆی پێدەناسێنیٚو، ئامۆژگاریی دەكات كە دڵ نارِەحەت نەبیٚ

ئنجا دوای ئەوە كە بارەكانیان بۆ ساز دەكاتو زادو زەخیرەیان بۆ دەپێچنەوە، ئەو رِبەیەی دەغڵەكەیان پێ پێواوە، ئەو ئامرِازەی كە دەغڵەكەیان پێ پێواوە {كە هەم بە (سقایة) ناوی هاتوە، هەم بە (صواع)یش}، دەیخاتە نێو باری برایە گچكەكەیانەوە، واتە: بنیامینی برای دایكییو بابیی، ئنجا دوایی رِادەگەیەنریٚو جارِچییەك جارِ دەدات، دەڵیٚ: ئێوە دزنو دزییتان كردوە، ئەوانیش دەڵێن: چییتان لیٚ ون بووە؟ دەڵێن: ئێمە ئەو ئامرِازەی كە باراشەكەی پیٚ پێوراوە، بارەكانی پیٚ پێوراون، – كە وەك تەنەكەو رِبەیەك وا بووە، بەناوی: (صواع)و (سقایة) هاتوە، ئەوەمان لیٚ ون بووە، كە ئەوەش دەفری تایبەتی پادشایە، هەندێك دەڵێن: لە زێرِ بووەو، هەندێك دەڵێن: لە زیو – ئنجا دەڵیٚ: هەر كەسێك ئەوەمان بۆ بێنێتەوە، من بارێك زەخیرەی بە خەڵات دەدەمیٚ، ئەوانیش دەڵێن: بۆ خۆتان دەزانن : ئێمە نەهاتووین خراپەكاریی لە زەویدا بكەینو، جاری دووەممانە دێینو، ئێمە قەت دز نەبووین، ئەوانیش دەڵێن: ئەو كەسە سزای چییە، ئەگەر ئێوە درۆتان كرد، ئەگەر ئەو دەفرە دزراوە لە باری

یەكێكتاندا دۆزرایەوە؟ دەڵێن: هەر كەسێك لە بارەكەیدا دۆزرایەوە، خۆی دەبێتە پاداشتی، واتە: دەبێتە كۆیلەی ئەو كەسە كە دزییەكەی لێكردوە، - كە دیارە بە پێی دینی یەعقووب سزای دزیی وا بووە، یان ئەوان خۆیان ئەو جۆرە سزایە دادەنێن كە سزایەكی قورسە، وەك داكۆكییكردن لەسەر ئەوە كە ئەوان بەریین لەو تۆمەتە ! - بەو شێوەیە سزای ستەمكاران دەدەینەوە .

ئنجا دەست دەكات بە پشكنینی بارەكانیان، پێشێ باری هەموویان دەپشكنێ، تێیاندا نابێ، دوایی دێتە سەر باری بنیامین، كە دەیپشكنن، دەبینن لەوێ دایە، كە دیارە بە ئیتتیفاق لە نێوان یوسوفو بنیامیندا ئەو تەگبیرە كراوە

ئنجا خوا عزوجل دەفەرموێ: ئاوا بەو شێوەیە نەخشەمان بۆ یوسوف دانا، چونكە بە پێی بەرنامەو یاسای پادشای میسر، بۆیان نەبوو بیكەنە كۆیلە، ڕەنگە سزایەكەی زیندانیی كردن بووبێ، یان سزایەكی دیكە بووبێ، بۆ وێنە: غەرامەیەكی دارایی بووبێ، بەڵام بە پێی دینی یەعقووب، یان ئیجتیهادی ئەو دە (١٠) كوڕەی، ئەو كاتە هەر كەسێك دزیی لە كەسێك كردبایە، دەبوو بە كۆیلەی ئەو كەسە كە دزیی لێ كراوە، ئەوانیش دەڵێن: ئەگەر دزیی بكاتو دزیی كرد بێ، ئەوە برایەكەشی كاتی خۆی، هەر دزیی كردوە، {كە مەبەستیان پێی (یوسوف)ە}، بەڵام یوسوف ئەوە لە دڵی خۆیدا پەنهان دەكات، كە دیارە تۆمەتێكە پێی دەكەنو دەڵێ: ئێوە زۆر خەڵكی خراپن، - بەڵام لەبەر خۆیەوە ئەوە دەڵێ - خوا زاناترە بەوەی كە ئێوە دەیڵێن

ئەوانیش تەكلیفی لێ دەكەن، دەڵێن: ئەی عەزیز! باببێكی پیری بە تەمەنی بە ساڵداچووی هەیە، یەكێك لە ئێمە لە جێی وی گل بدەوە، ئێمە دەبینین تۆ لە چاكە كارانی، واتە: مۆڵەتی ئەو بدە، بەڵام یوسوف عليه السلام دەڵێ: پەنا بە خوا، كە ئێمە جگە لەو كەسەی كەلو پەلی خۆمانمان لە بارەكەی ئەودا دۆزیوەتەوە، كەسێكی دیكە گل بدەینەوە، كەسێكی دیكە بگرینو بیكەینە كۆیلە، ئەگەر وا بكەین: ئێمە لە ستەمكاران دەبین، بۆیەش نالێ: جگە لەو كەسەی كە دزیی كردوە، چونكە دزیی نەكردوە، بەڵكو دەڵێ: جگە لەو كەسەی كە شتەكەی خۆمانمان لەلای ئەو دۆزیوەتەوە، لەوەشدا ڕاست بووە، دوایی دەڵێ: ئەگەر جگە لەو گل بدەینەوەو سزا بدەین، ئەو كاتە ئێمە لە ستەمكاران دەبین، ئێمەش ستەم ناكەین

**دەرسـی دوازدەیـەم:** کە ئالقەی دەیەمی بەسەرهاتی یوسوف ﷺ دەگرێتە خۆیو ئایەتەکانی: (٨٠ تا ٨٧)، واتە: هەشت (٨) ئایەت دەگرێتەوە، باسی ئەوەیە کە دوای ئەوەی برایەکانی یوسوف ﷺ نائومێد دەبن، لەوەی یەکێك لەوان لەجیاتی (بنامین) گل بداتەوە، لە سزای ئەوەدا کە ئەو دەفرەی زەخیرەکەی پێ پێوراوە، کە دەفرێکی تایبەتیی پادشا بووە، لە بارەکەی دا دۆزراوەتەوە، لە سزای ئەوەداو بە پێی دینی یەعقووب ﷺ، کە یوسوف گوتوویەتی: چی لێ بکەینو سزایەکەی چییە؟ ئەوانیش بە پێی دینی خۆیان، کە بە حوکمی شەریعەتی یەعقووب ئەوە بووە: هەر کەسێك دزیی لە کەسێك بکات، دەبووایە ببێتە کۆیلە لەلای ئەو کەسە، ئنجا ئایا بۆ ماوەی هەتا هەتایە، یاخود بۆ ماوەی چەند ساڵێك ؟!

وەك پێشتریش گوتمان دەشگونجێ ئەو جۆرە سزایە تەنیا پێشنیاری برایەکانی یوسوف بوو بێو، هیچ پەیوەندیی بە ئایینی یەعقووبو شەریعەتەکەییەوە نەبوو بێو، من ئەم ڕایەم پێ پەسندە

دوای ئەوەی کە لێی نائومێد دەبن، جێگۆڕکە بەو برایە بکاتو یەکێکی دیکە بێنێتە شوێنی، لەبەر دڵی بابیان، لەبەر خۆیانەوە کۆبوونەوە دەکەنو دەڕۆن، بەڵام گەورەکەیان، - ئەوەی لە هەموویانەوە بە تەمەنترە - بە سەرزەنشت کردنەوە بە برایەکانی دەڵێ: بۆ خۆتان دەزانن! کە کاتی خۆی بابتان پەیمانێکی پتەوی لێ وەرگرتن، پێشتریش کەمتەرخەمییتان کرد دەربارەی یوسوف، کە نەتانپاراست، بەڵکو خستتانە بیرو چاڵەوە، ئێستاش من ئەم سەر زەمینەی میسر بەجێ ناهێڵم هەتا یان بابم مۆڵەتم دەدا کە بگەڕێمەوە بۆ لای، یاخود خوا ﷻ دەروویەکەم لێ دەکاتەوەو خواش باشترین بڕیاردەرو باشترین دەروو لێکەرەوەیە، ئنجا ئامۆژگارییان دەکات دەڵێ: بگەڕێنەوە بۆ لای بابتان، پێی بڵێن: بە پێی ئەوەی کە ئێمە بینیمان کوڕەکەت دزیی کردووەو، ئێمە هەر شایەدیی لەسەر ئەوە دەدەین کە خۆمان زانیومانە، بەڵام نازانین دیوی پەنهانی شتەکان چۆنە، پارێزەر نین بۆ ئەوەو، نازانین چی لە ئارادا هەیە؟ چونکە لە تەفسیرەکاندا هاتوە: دوای ئەوەی کە ئەو دەفرە لە باری بنیامیندا دەدۆزرێتەوە، برایەکانی سەرزەنشتی دەکەن، دەڵێن: بۆچی وات کردوە؟ دەڵێ: من وام نەکردوە، دەڵێن: ئەدی کێ خستوویەتە نێو بارەکەی تۆوە؟ دەڵێ: ئەو کەسەی کە جاری یەکەم پارەکەی خستبۆوە نێو بارەکانتان، هەر ئەویش ئەوەی خستۆتە نێو

بارەکەی منەوەو، من نازانم چۆنە! بۆیەش زۆر بە جەزمیی نالێن: کوڕەکەی تۆ دزیی کردوە، بەڵکو دەڵێن: ئێمە ئاگاداری پەنهان نین، بەلاّم بە ڕواڵەت، لە باری وی دابووە، پرسیاریش بکەن لە خەڵکی ئەو شارە، کە ئێمە تێیدا بووین، لەو کاروانەش بپرسن کە ئێمە لەگەڵیدا بووین، کە دیارە هەر ئەو دە (١٠) کوڕە نەبوون‌و، خەڵکی مەنتیقەکە بە گشتیی بوون، کوڕانی یەعقووبیش یازدە (١١) بار بوون بە (بنیامین)ەوە، ئنجا کە ئاوا دەڵێن، یەعقووب ﷷیش دەڵێ: بەڵکو نەفستان شتێکی بۆ ڕازاندوونەوەو، ئەوەتان کردوە، منیش بە شێوەیەکی زۆر جوان خۆم ڕادەگرم، زۆر نیزیکە خواش ﷻ هەموویانم پێکەوە بۆ بێنێتەوەو، بە هەموویانم شاد بکاتەوە، بێگومان خوا زانای کاربەجێیە

ئنجا پشتییان تێدەکات‌و دەڕوات‌و، زۆر خەفەت بۆ یوسوف دەخواو، لە پەژارەییان چاوی سپی دەبن، یانی: زۆر خەفەتبار دەبێ‌و، نەخۆشیی چاو سپێتیی بەسەردا دێ، کە هەندێك دەڵێن: بریتی بووە لە کوێریی، ئەوانیش گلەیی لێدەکەن دەڵێن: تۆ بەردەوام هەر باسی یوسوف دەکەی! تاکو زۆر کەنەفت دەبی، یاخود لە بەین دەچی، واتە: گلەیی لێدەکەن، دەڵێن: تۆ بۆچی ئەوەندە خەفەتی بۆ دەخۆی؟ ئەویش دەڵێ: من خەفەت‌و پەژارەی خۆم تەنیا بۆ لای خوا دەردەبڕم‌و، ئەوەی من دەیزانم، ئێوە نایزانن.

ئنجا ئامۆژگارییان دەکات‌و دەڵێ: ڕۆڵەکانم! بچن لە یوسوف‌و لە برایەکەی بگەڕێن‌و، لە بەزەیی خوا نائومێد مەبن، لە فەرەحنایی خوا، لە دەرووی خوا، نائومێد مەبن، چونکە تەنیا کۆمەڵی بێبڕوایان لە بەزەیی خوا نائومێد دەبن

**دەرسی سێزدەیەم:** کە ئاڵقەی دوازدەیەمی بەسەرهاتی یوسوف دەگرێتە خۆی‌و، ئایەتەکانی: (٨٨ تاکو ٩٨) واتە: یازدە (١١) ئایەت، دەگرێتەوە، لەم یازدە (١١) ئایەتەدا بۆ جاری سێیەم باسی چوونەوەی کوڕەکانی یەعقووب ﷷ دەکات بۆ میسر، کە ئەو کات، تەنیا نۆ (٩) برا ماونەوە :

١- یوسوف لەوێیە

٢- بنیامینی براشی لەلای خۆی گل داوەتەوە، لە بەرانبەر ئەو دەفرەدا کە لە بارەکەیدا دۆزراوەتەوە

٣- برایە گەورەكەشیان كە لە پەیمانی گۆندا دەڵێ: ناوی (رۆوبین) بووە، ئەویش دیارە هەر لەوێ نەچۆتەوە، مانای وایە (١٢- ٣ = ٩) نۆ كەسیان ماونەوە.

ئنجا كاتێك ئەو نۆ برایە دەچنەوە، پێی دەڵێن: ئەی عەزیز! ئێمە ماڵو كەسو كارمان زۆر تووشی هەژاریی و نەداریی بوون، {دیارە گرانییەكە حەوت (٧) ساڵی ڕەبەق درێژەی كێشاوە}، ئێستاش نرخێكی كەممان هێناوە، بەڵام تۆ بە پێی نرخی چاك بارەكانمان بۆ تەواو بكە، چاكەشمان لەگەڵدا بكە! بێگومان خوا پاداشتی چاكەكاران دەداتەوە، وادیارە مەبەستیان لەوە كە دەڵێن: چاكەمان لەگەڵدا بكە! واتە: ئەو برایەمان لەگەڵ بنێرەوەو بماندەوە .

ئنجا یوسوف ﷺ چی دیكە تەحەممول ناكات، خۆیان لێ نەناس بكات، بۆیە خۆییان پێ دەناسێنێ و پێیان دەڵێ: ئایا لە یادتانە چیتان بە یوسوفو برایەكەی كرد؟! كە ئێوە ئەو كاتە نەزانو نەفام بوون، كە ئەوە جۆرێك لە پۆزش بۆ هێنانەوەشیانە، واتە: ئێوە نەفام بوون، دەنا واتان نەدەكرد، ئەوانیش دەڵێن: ئایا تۆ یوسوفی؟! دەڵێ: بەڵێ، من یوسوفم ئەمەش برایەكەمە، خوا چاكەی لەگەڵماندا كردوە، هەر كەسێك پارێزكار بێو، خۆڕاگربێ، بێگومان خوا پاداشتی چاكەكاران زایە ناكات، ئەوانیش دانی پێدا دێننو دەڵێن: سوێند بە خوا، خوا تۆی بەسەر ئێمەدا هەڵبژاردوەو ئێمە خەتابار بووین، واتە: تۆ شایستەتر بووی كە خوا هەڵتبژێرێ، ئێمەش كاتێك حەسوودییمان پێ بردی، خەتابار بووین، ئەویش دەڵێ: ئەمڕۆ هیچ گلەییەكتان لێ ناكەم، خوا لێتان ببوورێ، خواش بە بەزەییترینی بە بەزەییانە، ئەم كراسەم بەرن بەسەر دەمو چاوی بابمی دابدەن، تاكو دووبارە چاوی چاك بنەوە، لەو نەخۆشییەو، هەموو خزمو كەسوكارەكەشتان بێنن، ماڵو منداڵەكانیشتان بێنن .

ئنجا كاتێك كە كاروانەكە جیادەبێتەوەو دەڕوات، بابیان هەر لەوێوە، - لەسەر زەمینی كەنعانەوە- دەڵێ: من بۆنی یوسوف دەكەم، ئەگەر بە بەهەڵەداچووم لە قەڵەم نەدەن، ئەوانیش دەڵێن: بە خوا تۆ هەر لە بەهەڵە داچوونی پێشێت دای، بەڵام كاتێك كە موژدەدەر دێو كراسەكە بە چاوی یەعقووب دەداو، چاوی چاك دەبنەوە، پێیان دەڵێ: ئایا پێم نەگوتن: ئەوەی لە لایەن خواوە دەیزانم، ئێوە نایزانن ؟

ئەوانیش دەڵێن: ئەی بابە! داوای لێبوردنمان بۆ بكە لە گوناهەكانمان، بێگومان ئێمە خەتابار بووین

ئەویش دەفەرموێ: لەمەو دوا داوای لێبووردنتان بۆ لە پەروەردگارم دەكەم، بێگومان هەر ئەو لێبوردەو بە بەزەییە

**دەرسی چواردەیەم:** كە دەبێتە ئاڵقەی سێزدەیەمو كۆتایی لە بەسەرهاتی یوسوف ﷺ، ئایەتەكانی: (٩٩ تا ١٠١)، واتە: سێ (٣) ئایەت، دەگرێتەوە، باسی دوا ئاڵقەی بەسەرهاتی یوسوفە ﷺ كە لە قورئاندا گێڕدراوەتەوە، كە ئەمجارە كوڕەكانی یەعقووب بۆ جاری چوارەم دەچنەوە بۆ میسرو بابو دایكی یوسوفیشو، چەند خێزانی بوون، هەموویانو، هەموو خزمو كەسیان، كە لە پەیمانی كۆندا دەڵێ: هەتا هەشتا كەس بوون، هەموویان دەچن بۆ میسرو لە دەروازەی كۆشك دەچنە ژوورو، لە یوسوف ﷺ وە ژوور دەكەون، ئەویش دەڵێ: وەرنە نێو میسرەوە بە مۆڵەتی خوا، بە ویستی خوا، وەرن بە دڵنیاییەوە، ئنجا بابو دایكی دەباتە سەر تەختی حوكمڕانیی، بارەگای عەرش، واتە: ئەو تەختەی حوكمڕانیی كە لەسەری دانیشتوەو، پاشان هەموویان، واتە: هەم بابو دایكیو، هەم یازدە برایەكەی، كڕنووشی بۆ دەبەن .

كە بە تەئكید لێرەدا مەبەست لە كڕنووش واتە: بە جۆرێك سڵاوی لێدەكەن كە ناوی لێنراوە سەجدە، كە ئێمە دواتر بە تەفصیلێ باسی دەكەینو، بێگومان مەبەست كڕنووشی عیبادەت نیە، چونكە كڕنووشی عیبادەت، تەنیا بۆ خوا دەبردرێ، یەعقووب ﷺو یوسوف كە دوو پێغەمبەری پایە بەرزی خوان، بە تەئكید قبووڵ ناكەن سەجدە بۆ غەیری خوا ببردرێ، وەك دوایی باسی دەكەین: وشەی (سجدة) لە بەكارهێنانی قورئانداو لە زمانی عەرەبییشدا: بۆ هەر كام لە :

١- دەست بە سینگەوە گرتن

٢- ڕێز لێگرتن

٣- سڵاو كردن

٤- جۆرێك لە چەمینەوە، بەكاردێو مەرج نیە سەر بخرێتە سەر زەوی، ئنجا پێی بگوترێ: سەجدە، چونكە خوای پەروەردگار باسی سەجدەی دارو درەخت دەكات،

کە سێبەرەکەیان لەسەر زەوییەو باسی چەمینەوەی دارو درەخـت دەکـات، بـە لای ڕاسـتو چەپ دا، کە با دەیهێنـێو دەیجوولێنی، کـە دیـارە ئـەوەش مەبەسـت پـێ چەمینەوەو جۆرێك لـە لار بوونەوەیـە.

ئنجا یوسـوف ﷺ لێرەدا بە بابی دەڵێ: بابە گیان! ئا ئەوە ماناو سـەرەنجامی ئەو خەونەمە کە پێشـتـر بینیبـووم، ئێسـتا پەروەردگارم خەونەکەمی بە ڕاست گـێڕا

کە زۆر لە زانایان دەڵێن: لە نێوان هاتنەدی ئـەو خەونـەو، واتـە: سـەرەنجامەکەی کـە هاتۆتــە دیو دەرکـەوتوەو، خــەون بینینـەکـەدا: چـل (٤٠) سـاڵی ڕەبـەق بـووە، چونکە یوسـوف بـە منـداڵیی خــەونەکەی بینیـوە، بـەڵام کاتێـك کە تەعبیـرەکـەی هاتۆتـە دی، گـەورە بووە ! (تأویـل)یش بە مانـای سەرەنجـامە، لـە ( أَوْلَ )ەوە هـاتوە، (آلَ یَؤُلُ أَوْلاً)، واتە: (رَجَـعَ، یَرْجِـعُ، رُجُوعَـاً)، یـانی: ئـەو سـەرەنجامەی کـە لـە شـتێك دەردەکـەوێو، لـێرەدا: (تـأویل)، یانی: گـێڕانەوەی خـەون بـۆ ئـەو سـەرەنجامەی کە تێیــدا دێتــە دی، دەڵـــێ: ئــەوە سـەرەنجــامی خەونەکەمــە، خــوای پەروەردگـــارم بەڕاسـتی گـێڕا .

ئنجا یوسـوف ﷺ زۆر بـە نەزاکـەتو نەجابـەتـەوە دەڵـێ: پەروەردگـارم چاکەی لەگـەڵ مندا کرد، کە منـی لە زیندان دەرهێنــا، باسـی بیـــرەکە ناکـــات، بـۆ ئـــەوەی دڵی برایەکانی ئـازار نەداو، ئیحراجیـان نـەکاتو شـەرمەزاریان نـەکات، بـەڵکو باسـی ئەوە دەکات کە خوای پەروەردگار چاکـەی لەگـەڵ کردوەو لە زینــدان دەریهێنـــاوە، کـە تۆمـەتی پێکرا بـوو، هـەروەها دەڵـــێ: خـوا چـــاکەی لەگـەڵ منـدا کـــردوە کـە ئێوەشـــی لـە بیـــابانەوە هێنـــا، دوای ئـەوەی کـە شـــەیتان بـەینی مـنو برایـەکانمی تێکدا، لێرەش دا خۆی پێش دەخـات، دەڵێ: شەیتان بەینی منو برایەکـانمی تێکدا! بێگومان پەروەردگـارم بۆ هەر کـارێك بیـــەوێ، زۆر پەنهانکـارو لــێزانە، هـەر ئـەو زانـای کـاربەجێیـە .

ئنجـا لـە پـەروەردگاری دەپاڕێتـەوەو، دەفـەرموێ: ئـەی پـەروەردگارم! تـۆ هـەم حوکمڕانییت بە من داوەو دەست ڕۆیشتووت کردووم، هەم لـە مانـای لێکـدانەوەی خەونانت فێر کـردووەو، مانـای لێکـدانەوەی هـەر قسەیەکـت فێـر کـردووم، کـە لـە مەرامەکـەیو لە مەبەستەکەی تێبگـەم

چونكە (أَحَادِيث) كە كۆی (حَدِيث)ە، مـەرج نیـە تەنیـا بـە مانـای خـەون بـێ، بەڵكو هـەر قسەیەكە كەسـێك دەیكات، ئەگـەر تـۆ مەبەسـتەكەی پشتەوەی بزانـی، ئەوە شتێكی گرنگە، یوسوف ﷺ بەو شێوەیە بووە، یـاخود مەبەسـتی لـە: (تـأويل الأحاديث) یـانی: فەرمایشـتەكانی خوا، وەحیی‌و پەیـامی خـوا، چاك لـە مەبەسـت‌و مانـاو مەرامەكـەی تێبگـەی، ئنجا دەفەرمویّ: ئەی بەدیهێنەری ئاسـمانەكان‌و زەوی! تـۆ سـەرپەرشـتیارمی لـە دنیـاو دوا ڕۆژدا، بـە ملكەچـیی بممرێنـەو، وە دەگـەڵ صـاڵحـان‌و چـاكـانم بخـە

ئەمـە سـێزدە (١٣) ئاڵقەكـە، كـە زنجیـرەی بەسـەرهاتی یوسـوف ﷺ لـە قورئـاندا پێكدێنن

**دەرسـی پازدەیـەم‌و كۆتـایـی**: ئەنجامگیـریی: كـە ئـەمیش دە (١٠) ئـایـەت دەگرێتـە خۆی، ئایـەتەكانی: (١٠٢ تا ١١١)، واتـە: كۆتا ئایـەتەكانی سـوورەتی یوسـوف، كـە خـوا ﷻ لەم دە (١٠) ئایـەتـەدا سەرەتا، ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەكات، كـە ئەوانـە لـە هەواڵـەكانی نادیـارن، بـۆ تۆمـان سـروش كـردوون، واتـە: نـە خـۆت زانیـوتن، نـە كۆمەڵگاو دەورووبەرەكـەت، نە هیچ كـەس ئاوا نەیزانیـوە، دوایی دەفـەرمویّ: تـۆ لە لایان نەبووی كـاتێك كە هەموویان لەسەر ئەو پیـلانە كۆبوونـەوە، كـە بریتـی بوو لەوەی یوسوف ﷺ لە بابی دابڕن، بیكـوژن، یاخود بیخەنە چاڵ‌و بیـرێكـەوە، كـە دوایـی ئـەوەی دووەمیـان كـرد، تـۆ لـەویّ نەبـووی، كەواتـە: ئـەو هـەموو وردەكـارییـانە كە خوا ﷻ بەیانی كردوون، كە مەرج نیە لە كتێبـە پێشـووەكانیشـدا بەو شێوەیە بـووبن، كـە ئێمـە ئێستا تەماشـای پـەیمانی كۆن دەكـەین، زۆر حاڵـەتی دەروونیی، وەك: هاندەری یوسـوف كە ئەوەی گوتووە، هاندەری وان كە وایان كردووە، هـاندەری عەزیـزی میسـر، كە فـلان قسـەیەی كـردووە، هـاندەری ئافرەتەكـە كە بوختـانی بە یوسـوف كردو... هتد، ئەو هەموو وردەكارییانە، كە تەنیا خـوا پێیـان ئاگـادار بووە، لە پەیمـانی كۆندا نیـن .

دوایی دەفەرمویّ: تۆش هەرچـەندە بتـەویّ‌و سـوور بـی، زۆربـەی خەڵـكی هـەر ئیمـان نـاهێنن، ئەگـەرنا دەبـوو هـەر بـەوە كـە تـۆ بەسـەرهاتێكی وەك ئـەم بەسـەرهاتـەی یوسوفیان بـۆ دەخوێنیـەوە، بـەو هـەموو وردەكارییـەوە، كـە خۆشـت نەخوێنـدەواری، گەلەكەشـت نـە شـارەزاو نەخوێنـدەوارن، كـە ئـەم بەسەرهـات

گێڕانەوەیە لە هێڵە گشتییەکانیدا، ڕێك وەك ئەوەیە کە لە پەیمانی کۆندا هاتوە، کە لەلای خاوەن کتێبەکانە، دەبوو هەر ئەوە بکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە کە تۆ پێغەمبەر خوای ﷺ، بەڵکو زۆر لایەنی پەنهان کە لە قورئاندا باس دەکرێن، لە بەسەرهاتەکان، لە کتێبە پێشووەکاندا نین، یاخود لە وێدا بە هەڵە باسکراون و دەستکاریی کراون، قورئان ئەوانەش ڕاست دەکاتەوە .

دوایی دەفەرموێ: تۆ لە بەرانبەر ئەوەدا کە پەیامی خوایان پێ دەگەیەنی، هیچ کرێ و پاداشتیان لێ داوا ناکەی، چونکە ئەوە هەر بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان، دوایی خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە زۆر نیشانە هەن لە ئاسمانەکان و زەویدا، ئەو بێبڕوایانە بە لایاندا ڕەت دەبن، بەڵام وەك پشتیان تێ بکەن، بە چاوی عەقڵ و دڵ سەرنجیان نادەن و، پەندیان لێ وەرناگرن و، وەك نیشانەی خوا مامەڵەیان لەگەڵدا ناکەن

دوایی دەفەرموێ: زۆربەشیان بڕوا بە خوا ناهێنن، مەگەر هاوبەش بۆ خوا دانەرین، واتە: کاتێك کە دان بە بوونی خوادا دێنن، شیرکی دەخەنەگەڵ، دان بە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتیی و خاوەنداریێتیی خوادا دێنن، بەڵام لە بەندایەتیی کردن و لە پەرستنی خوادا، هاوبەشان پەیدا دەکەن، هاوبەش بۆ خوا دادەنێن

دوایی خوا ﷻ هەڕەشەیان لێ دەکات و دەفەرموێ: ئایا دڵنیان لەوەی کە داپۆشەرێك لە سزای خوا بۆیان بێ، هەورێك بەڵایەك کە دایانبپۆشێ، دڵنیان لەوەی کە بەڵایەکی وایان بۆ بێ، یاخود (سَاعَة) واتە: ئاخیر زەمان کتوپڕ بێ و، ئەو دنیایە تێکبچێ بەسەریاندا، بێ ئەوەی ئەوان هەستی پێ بکەن، ئایا دڵنیان ؟!

دوایی بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بڵێ، ئا ئەمە ڕێبازی منە، خۆم و ئەوانەی کە شوێنم کەوتوون لەبەر ڕۆشنایی دا بەرەو خوا بانگەواز دەکەین، پاکیی بۆ خوا، من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم .

پاشان خوا ئەو ڕاستییە ڕادەگەیەنێ و دەفەرموێ: لە پێش تۆدا بەس پیاوانمان بە پێغەمبەر ڕەوانە کردوون، لە خەڵکی شارە قەڵەباڵغەکان، واتە: نە ئافرەتمان ناردوون، نە خەڵکی لادێ و بیابان نشینیشمان ناردوە، چونکە دەبێ کەسانێك ببنە نوێنەری خوا، کە عەقڵ و هۆشێکی هۆشیارو دڵێکی بێداریان هەبێ و،

لـە نێـو قەڵەبـاڵـغیی دا ژیـابنو، بـە عـادەتو نەریتـی خـەڵك شـارەزا بـن، ئنجا پیاوانیش زیاتر دیارە شایستەن کە ئەو باری قورسی پێغەمبەرایەتییە هەڵبگرن .

دوایی دەفـەرموێ: ئایا بـە زەویـدا نەڕۆیشتوون کـە سـەرنج بـدەن: سەرەنجـامی ئەوانەی پێش ئـەوان چۆن بووە، تاکو پەندیان لـێوەربگـرن؟! بێگومان مەنزڵگـای دوا ڕۆژ باشـتـرە بۆ کەسـانێك کە پارێـز دەکـەن، ئایـا نافـامن ؟!

دوایـی لـە میـانی باسـی بەسـەرهاتی پێغەمبەرانـدا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەفـەرموێ: پێغەمبـەران بـەردەوام بـوون، هەتـا کاتێـك کە پێغـەمبـەران نائومێد بوون، واتە: نائومێد بوون لەوەی کـە گەلەکـانیان بـڕوا بێـننو، گومانیـان وابـوو، واتـە: خـەڵـکەکەش گومانیـان وابـوو کـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) درۆیان لەگـەڵ کراوە، کە گـوتراوە: گەلەکـانیان سـزا دەدرێن، ئەگـەر ئیمـان نەهێنـن، ئەمە واتایەکـی، چەند واتایەکی دیکەشـی هـەن، کە دوایی باسـیان دەکـەین، ئـا لـەو حاڵەتەدا کە پێغەمبەران نائومێد بوون، لە ئیمان هێنانی خەڵکەکانیان، خەڵکەکەش گومانیـان وابـوو، یاخود یەقینیـان وابوو کە پێغـەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) درۆیان لەگەڵـدا کراوە، لە لایەن خواوەو، هیچ سزا نادرێن لەسـەر ئـەوەی کە بـڕوا ناهێـنن، ئـا لـەو حاڵـەتەدا: ﴿ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا ﴿١١٠﴾ ﴾یوسـف، یارمـەتییو هاوکـاریی ئێمەیـان بۆ هاتو، ئەوانەش کە ویسـتمان، دەربـاز کران، چونکە بێگومـان سـزای ئێمە لە کۆمـەڵی تاوانباران، بەرپـەرچ نادرێتـەوە .

لـە کۆتـایی دا خـوا ﷻ دەفـەرموێ: بێگومـان لـە گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی پێشـووەکاندا: پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) گـەلو کۆمەڵگـایەکانیاندا، پەند هەیـە بـۆ خاوەن عـەقڵان، ئنجا ئـەم قورئانـەش ئـەو بەسـەرهاتـانە کـە خوا دەیانگێڕێتـەوە، قسـەیەك نیـە، کـە هەڵبەسـترابـێ، بەڵـکو بـە ڕاسـت دانـەری کـتێبـە پێشـووەکانە، ئەوانەی لە پێش دا ڕابردوون، هەروەها ڕوونکەرەوەی هـەموو شـتێکە کە ژیانی بەشـەر پێویستیی پێی بـێو، ڕێنمایی‌و بەزەییـە، بـۆ کۆمەڵـێك کە بڕوا بێـنن

ئەمەش پێناسـەو خسـتنە ڕووی نێوەڕۆکی سـووڕەتی یوسوف عليه السلام بوو.

# چەند زانیارییەك لەبارەی یوسف و بابی و برایەكانیەوە

بەرلەوەی دەست بكەین بە توێژینەوەی ئایەتەكان، پێویستە چەند زانیارییەكیش بخەینە ڕوو، كە دیارە ئەو زانیارییانە زیاتر لە پەیمانی كۆن، لەوێشدا لە تەوراتو بەتایبەت لە (سفْرِ التكوین) بە پلەی یەكەم وەردەگیرێن :

**یەكەم : ڕەچەڵەكی یوسوف** عليه السلام:

لە (صحیح البخاري)دا هاتوە، كە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی یوسوف فەرموویەتی: {الْكَرِيم ابْنِ الْكَرِيم ابْنِ الْكَرِيم: يوسف ابْنُ يَعْقُوب ابْنِ إِسْحَاق ابْنِ إِبْرَاهِيم} (البخاري برقم: (٣٣٨٢))

واتە: بەڕێزی كوڕی بەڕێزی كوڕی بەڕێز، یوسوفی كوڕی یەعقووبی كوڕی ئیسحاقی كوڕی ئیبڕاهیم (علیهم الصلاة والسلام

دیارە یوسوف كوڕی یەعقووب بووە، یەعقووبیش كوڕی ئیسحاقە، ئیسحاقیش كوڕی ئیبڕاهیمە، ئیبڕاهیم (خَلِيلُ الله) صەڵاتو سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ.

**دووەم : ناوی برایەكانی یوسوف :**

یەعقووب عليه السلام وەك لە پەیمانی كۆندا هاتوە، لە سووڕەتی یوسوفیشدا هەر ئاماژەكە دەیگرێتەوە، كە جگە لە یوسوف یازدە (١١) كوڕی بوون، چونكە بەپێی خەونەكەی یوسوف عليه السلام، كە دەفەرموێ: ﴿إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ

﴿وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِى سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾﴾ يوسف، دوایيش كە دەفەرموێ: ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّى حَقًّا ﴿١٠٠﴾﴾ يوسف، كە دیارە مانگو خۆر بابو دایكەكەینی، یازدە (١١) ئەستێرەكەش، یازدە (١١) برایەكانتی، كەواتە: دەبێ یەعقووب جگە لە یوسوف، یازدە (١١) كوڕی بووبن .

ئنجا ناوەكانیان لە قورئاندا نەهاتوون، لەبەر ئەوەی هیچ حیكمەتێك بەوە نایەتە دی، بەڵام لە پەیمانی كۆن، لە (سِفْر التكوين) لە (إصحاح)ی (٢٩ و ٣٠)[١] لە لاپەڕەكانی (٧٨، ٧٩، ٨٠) درێژەیەكی داوە، دەربارەی كوڕەكانی یەعقووب عليه السلام و بەم شێوە ناوەكانی هێناون:

١) راؤبين

٢) شمعون

٣) لاوي

٤) يهوذا

٥) يسَّاكر

٦) زبولونا .

ئەم شەش كوڕە لە (ليئة) بوون، كە كچی خاڵی یەعقووب بووەو، خاڵی یەعقووب ناوی (لابان) بووە

٧) یوسف .

٨) بنيامين

---

١) بڕوانە: التَّفسير التطبيقي لِلكِتابِ المقدَّس العَهدُ القَديم، سفرُ التكوين، الإصحاح: ٢٩، ٣٠، ص ٧٨، ٨٠.

ئەم دووانەش لە (راحیل) كچی دووەمی خاڵی یەعقووب، كە ناوی (لابان)ە پەیدابوون، دیارە (لابان) دوو كچی بوون، (لیئة) یاخود (لِییا) لەگەڵ (راحیل) هەردووكیان كچی (لابان) بوون

٩) دان .

١٠) نفتالي .

ئەو دووانەش لە (بلْها) یان (بیلها) بوون، كە كەنیزەكی (راحیل) بووە.

١١) جاد .

١٢) أشیر .

ئەو دووانەش لە (زلفا) پەیدابوون، كە ئەویش كەنیزەكی (لیئة) بووە.

هەڵبەتە ئەمە (عبدالوهاب بن النجار) لە (قصص الأنبیاء)[1] دا هێناویەتی، دواییش وردتر ئاماژەی پێدەكەم‌و لە پەیمانی كۆنیشدا هاتوە

**سێیەم: بەسەرهاتی هاوسەرگیریی یەعقووب، لەگەڵ دوو كچەكەی خاڵی بە ناوی لابان:**

لە پەیمانی كۆندا هاتوە، كە من ناتوانم هەمووی بێنم، بەڵام ئەوەی جێی مەبەستە لە (سِفْر التكوین) لە (إصحاح)ی (٢٨) لاپەڕە (٧٥) دا دەڵێ: (فَاستَدعَى إِسْحَاقُ يَعْقُوبَ وَبَارَكَهُ، وَأَوْصَاهُ وَقَالَ لَهُ: لاَ تَتَزَوَّجْ مِنْ بَنَاتِ كَنْعَانَ، قُمِ انطلق إِلَى سهل أَرَامَ، إِلَى بَيْتِ بَتُوئِيلَ أَبِي أُمِّكَ، وَتزَوَّجْ إِحْدَى بَنَاتِ لاَبَانَ...

كە ئەمە دوایی درێژییەكی هەیە، كاتێك ئیسحاق یەعقووب دەنێرێ بۆ لای لابان، واتە: ئیسحاق یەعقووبی بانگ كرد، (سەلامی خوایان لێ بێ)، دوعای بۆ كردو ئامۆژگاریی كردو پێی گوت: ژن لە كچانی كەنعان مەهێنە (دەوروبەری فەلەستین) هەڵسە بڕۆ بچۆ بۆ لای دەشتی ئارام، (ناوچەی حەڕڕان‌و لای دیمەشق‌و ئەولاتر) لەوێ بۆ لای ماڵی (بَتُوئیلْ) بچۆ، بابی دایكت، (واتە: باپیری)، لەوێ یەكێك لە كچەكانی (خاڵت) (لابان) بهێنە .

---

١) ص ١٢٠.

ئنجا لە (إصحاح)ی (٢٩) لاپەڕە (٧٧)دا دەڵێ: (وَتَابَعَ يَعْقُوب رِحْلَتَهُ حَتَّى وَصَلَ أَرْضَ حَارَان.. ) حەڕران دیارە كە لە نێو سووریای ئێستادایە، واتە: یەعقووب ڕۆیشتو سەفەرەكەی درێژە پێدا، تاكو گەیشتە سەر زەمینی حاڕان، {(حَرّان) یان (حاران) هەردووكیان دەگوترێن} .

ئنجا هەر لە ئیصحاحی (٢٩)، لە لاپەڕە (٧٧و ٧٨)، لە ژێر ناوونیشانی هاوسەرگیریی یەعقووب لەگەڵ لیئەو ڕاحیل دا، لەوبارەوەش تەفصیلێكی هێناوە: (زواج يعقوب من ليئة و راحيل) :

دەڵێ: {وَقَالَ لابَانُ لِيَعْقُوبَ: هَلْ لأَنَّكَ قَرِيبِي تَخْدِمُنِي مَجَّانَاً؟ أَخْبِرْنِي مَا أُجْرَتُكَ؟ وَكَانَ لِلابَانَ ابْنَتَانِ، اسْمُ الْكُبْرَى لَيْئَةُ، وَاسْمُ الصُّغْرَى رَاحِيلُ. وَأَجَابَ يَعْقُوبُ خَالَهُ: أَخْدِمُكَ سَبْعَ سِنِينٍ لِقَاءِ زَوَاجِي بِرَاحِيلَ ابْنَتِكَ الصُّغْرَى . ثُمَّ قَالَ يَعْقُوبُ لِلابَانَ: أَعْطِنِي زَوْجَتِي لأَنَّ خِدْمَتِي قَدْ كَمُلَتْ، فَأَدْخُلَ عَلَيْهَا. فَجَمَعَ لابَانُ سَائِرَ أَهْلِ النَّاحِيَةِ وَأَقَامَ لَهُم مَأْدُبَةً، وَعِنْدَمَا حَلَّ الْمَسَاءُ حَمَلَ ابْنَتَهُ لَيْئَةَ، وَزَفَّهَا إِلَيْهِ فَدَخَلَ عَلَيْهَا. وَوَهَبَ لابَانُ زِلْفَةَ جَارِيَتَهُ لِتَكُونَ جَارِيَةً لابْنَتِهِ لَيْئَةَ. وَفِي الصَّبَاحِ اكْتَشَفَ يَعْقُوبُ أَنَّهُ تَزَوَّجَ بِلَيْئَةَ! فَقَالَ لِلابَانَ: مَاذَا فَعَلْتَ بِي؟ أَلَمْ أَخْدِمْكَ سَبْعَ سَنَوَاتٍ لِقَاءَ زَوَاجِي مِنْ رَاحِيلَ؟ فَلِمَاذَا خَدَعْتَنِي؟. فَأَجَابَهُ لابَانُ: لَيْسَ مِنْ عَادَةِ بِلادِنَا أَنْ نُزَوِّجَ الصَّغِيرَةَ قَبْلَ الْبِكْرِ . أَكْمِلْ أُسْبُوعَ لَيْئَةَ، ثُمَّ نُزَوِّجُكَ مِنْ رَاحِيلَ، لِقَاءَ خِدْمَتِكَ لِي سَبْعَ سِنِينَ أُخَرَ. فَوَافَقَ يَعْقُوبُ، وَأَكْمَلَ أُسْبُوعَ لَيْئَةَ، فَأَعْطَاهُ لابَانُ رَاحِيلَ ابْنَتَهُ زَوْجَةً أَيْضاً. وَوَهَبَ لابَانُ بِلْهَةَ جَارِيَتَهُ لِتَكُونَ جَارِيَةً لابْنَتِهِ رَاحِيلَ . فَدَخَلَ يَعْقُوبُ عَلَى رَاحِيلَ أَيْضاً، وَأَحَبَّ رَاحِيلَ أَكْثَرَ مِنْ لَيْئَةَ. وَخَدَمَ خَالَهُ سَبْعَ سِنِينَ أُخَرَ}[1]

(پەیمانی كۆن) بەسەرهاتەكەی باسكردوە، كە دوای ئەوەی ئیسحاق یەعقووب دەنێرێو دەڵێ: بچۆ بۆ لای خاڵت، یەكێك لە كچەكانی وی بێنە، باس دەكات، كە چۆن چووەو لە ڕێگا خەونی بینیوەو، دوایی بە هەر حاڵ ڕۆیشتوە، تاكو چۆتە

---

١) بڕوانە: التَّفسير التطبيقي لِلكِتابِ المقدَّس العَهدُ القَديم، سفرُ التكوين، الإصحاح: ٢٩، ص ٧٧، ٧٨.

ماڵی خاڵیو، دەستی كردوە بە شوانیی، دیارە ئەوان مەڕدار بوونو شوانیی بۆ كردوون

ئنجا لابان بە یەعقووبی گوت: ئنجا ئایا هەر لەبەر ئەوەی تۆ خزممی بە بەلاش خزمەتم دەكەی، هەواڵم پێبدە كرێیەكەت چییە؟ چیت لە بەرانبەردا بدەمێ؟ لابان دوو كچی هەبوون، كچە گەورەكەیان ناوی (لَيْئَة) بوو، كچە گچكەكەش ناوی (راحیل) بوو، یەعقووب وەڵامی خاڵی دایەوە، گوتی: حەوت ساڵان خزمەتت دەكەم، (واتە: شوانییت بۆ دەكەم) لە بەرانبەر ئەوەدا كە تۆ كچە گچكەكەت (راحیل)م بدەیە، ئنجا یەعقووب دوای ئەوەی كە حەوت ساڵ شوانییەكەی تەواوكردو خزمەتی كرد، گوتی: خێزانەكەمم بدەیە، چونكە خزمەتەكەم تەواو بوو، حەوت ساڵەكەم تەواو كردن بۆ ئەوەی بیگوازمەوە .

لابانیش خەڵكی ئەو ناوچەیەی هەموو كۆكردەوەو دەعوەتی كردنو سفرەو خوانێكی بۆ ڕازاندنەوە، ئنجا دوای ئەوەی كە ئێوارە داهات لە جیاتی ئەوەی كە (راحیل)ی بۆ بەرێ، (لَيْئَة)ی بۆ ڕازاندەوەو بۆی برد، وەك بووك (بەلام دیارە شەو بووەو وەك ئێستا كارەباو چرا نەبووە، واش پێدەچێ شێوەی یەكدیشیان كردبێ)، ئیدی یەعقووبیش دەچێتە لای (وەك بووكو زاوایەتی)، هەروەها لابان (زِلْفَة)ی كەنیزەكی خۆشی دەدات بە (لَيْئَة) كە خزمەتی بكات، بەلام لە بەرەبەیاندا یەعقووب بۆی دەردەكەوێ كە (لَيْئَة)ی هێناوە، {واتە: كچە گەورەكەی خاڵی هێناوەو، ئەویان بۆ گواستۆتەوە، نەك كچە گچكەكەی كە (راحیل)ە}، بۆیە یەعقووب بە لابان دەڵێ: ئەوە چیت پێ كردووم، ئەدی من حەوت ساڵ خزمەتم نەكردووی كە (راحیل)م وەك هاوسەر پێ بدەی، بۆچی فێڵت لێ كردووم؟ لابانیش پێی دەڵێ: عادەتو نەریتی ئەم وڵاتەی ئێمە، وا نیە كە ئێمە كچی گچكە لە پێش كچی نۆبەرە دا بە شوو بدەین، بۆیە تۆ جارێ حەفتەی (لیئة)ی تەواو بكە، {حەفتەیەك لای بە (وەك بووكو زاوایەتیی)}، دوایی (راحیل)یشت پێ دەدەین، لە بەرانبەر ئەوەدا كە حەوت ساڵی دیكە، خزمەتمان دەكەی، یەعقووبیش ڕازی دەبێو، حەفتەكەی لەگەڵ (لَيْئَة) دەباتە سەر، دوایی لابان (راحیل)یشی وەك هاوسەر

پێدەداو، لابان (بَلْها)ش كە كەنیزەكی خۆی بووە، دەیدا بە كچەكەی (راحیل) كە وەك كەنیزەیەك خزمەتی بكات .

ئنجا یەعقووب دەچێتە لای (راحیل)یش {واتە: لەگەڵ ئەویشدا وەك بووكو زاوایەتیی}، و (راحیل)ی خۆشتر دەوێ، لە (لَیْئَة)، حەوت ساڵی دیكەش خزمەتی خاڵی دەكات .

دیارە تەورات (سفر التكوین) بەو شێوەیە ناوی كوڕەكانی یەعقووبی هێناوە:

١) راؤبین .

٢) شمعون

٣) لاوي .

٤) یهوذا .

٥) یسَّاكر

٦) زابلۆن .

ئەوانە هەر شەشیان لە (لَیْئَة) كە (لِیا)شی پێ گوتراوە، پەیدا بوون

١) یوسف

٢) بنیامین.

لە (راحیل) پەیدابوون

٣) دان

٤) نفتالي .

لە (بَلْها) كەنیزەكی (راحیل) پەیدا بوون

٥) جاد

٦) أشیر .

لە (زُلْفة) كەنیزەكی (لَیْئَة) پەیدا بوون

بەو شێوەیە ئەو دوازدە (١٢) كوڕە بوون، دیارە لە (سِفر التكوين)دا بەو شێوەیە هاتوە، بەلاّم چەندی وایەو چەندی وا نیە؟ حەقیقەت ئێمە هەر شتێك كە لە قورئاندا نەهاتبێ، یان لە سوننەتی صحیحی پێغەمبەر دا ﷺ نەهاتبێ، بە تەواوی ناتوانین بڵێین: لێی دڵنیاینو پشت ئەستوورین

لەوبارەوە با ئەم فەرموودەیە سەرنج بدەین: {عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ بِكِتَابٍ أَصَابَهُ مِنْ بَعْضِ الْكُتُبِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي أَصَبْتُ كِتَابًا حَسَنًا مِنْ بَعْضِ أَهْلِ الْكِتَابِ، قَالَ: فَغَضِبَ، وَقَالَ: أَمُتَهَوِّكُونَ فِيهَا يَا ابْنَ الْخَطَّابِ! وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَقَدْ جِئْتُكُمْ بِهَا بَيْضَاءَ نَقِيَّةً، لا تَسْأَلُوهُمْ عَنْ شَيْءٍ فَيُخْبِرُوكُمْ بِحَقٍّ ، فَتُكَذِّبُوا بِهِ، أَوْ بِبَاطِلٍ ، فَتُصَدِّقُوا بِهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ كَانَ مُوسَى كان حَيًّا اليوم مَا وَسِعَهُ إِلاَّ أَنْ يَتَّبِعَنِي} {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَة بِرقم: (٢٦٩٤٩)، وَأَحْمَد بِرقم: (١٥١٩٥)، وَصَحَّحَهُ إِبْنُ كَثِير ، وَحَسَّنَهُ الأَلْبَانِي، (إرواء الغليل) رقم: (١٥٨٩)}

جابیری كوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: عومەری كوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) ڕۆژێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ نووسراوێكی لە خاوەن كتێبەكانەوە دەست كەوتبوو، هات بۆ پێغەمبەری خوا ﷺی خوێندەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ تووڕە بوو، فەرمووی: ئەی كوڕی خەتتاب! ئایا ئێوە تێیدا سەرگەردانو سەراسیمەن {واتە: لە ئیسلامدا، لە بەرنامەی خوادا سەرگەردانن، تاكو پێویستییتان بە سەرچاوەی دیكە هەبێ؟}، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، من ئەو بەرنامەیەی خوام بە سپێتیی‌و پاكیی بۆ هێناون، ئێوەش پرسیار لە خاوەن كتێبەكان مەكەن، كە وەلاّمێكی ڕاستتان بدەنەوە، كەچی ئێوە بە درۆی دابنێن {لەبەر ئەوەی متمانەتان پێیان نیە}، یاخود وەلاّمێكی ناڕاستتان بدەنەوەو، ئێوەش بە ڕاستی دابنێن {لە هەردووك حاڵەتدا تووشی گوناه دەبن}، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر مووسا زیندوو بووایە، هیچ چاری نەبوو، دەبوو شوێن من بكەوێ .

واتە: بۆ ئەو شتانەی كە لە ڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن، نابێ پشت بە خاوەن كتێبەكان ببەسترێ، چونكە پەنهانە، بەلاّم ئایا بۆمان دروستە شتێك كە پەیوەندیی

بە عەقیدەوە نیەو، پەیوەندیی بە حەڕامو حەڵاڵەوە نیە، بەڵكو زیاتر پەیوەندیی بە هەندێ بەرچاوڕوونییو وردە كارییەوە هەیە، سوود ببینین لە هەندێك كتێبی خاوەن كتێبەكان؟ بە دڵنیاییەوە بۆمان هەیە، هەر بۆیەش توێژەرەوانی قورئان، مەگەر چۆن دەنا هەموویان لە خاوەن كتێبەكانەوە نەقڵ دەكەن، بە تایبەت لە پەیمانی كۆنەوە، ئەوەی پەیوەندیی بە بەسەرهاتی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەیە، بەڵام وەك چی؟! هەندێ وردەكاریی كە لە قورئاندا نەهاتوون، وەك بەرچاو ڕوونیی زیاتر، وەك ناوی كوڕەكانی یەعقووب، یان ناوی خێزانەكانی، یان هەندێ وردەكاریی دیكە، كە شتێكی بنەڕەتیی ئیمانو عەقیدە، پێیەوە پەیوەست نیە، ئنجا چ بە ڕاستیان دابنێی، چ بە ناڕاستیان دابنێی، نابێ بە جەزمیی وەریبگری، چونكە تەنیا بەرچاو ڕوونییەكەو لە هەر دوو حاڵەندا، چ بە ڕاستی دابنێی، یان پێت وابێ ناڕاستە، زیانێكی نیە، بەڵام نابێ بە جەزمیی بڵێی: ئەو شتە هەر وایە، یاخود هەر وانیە، مادام ئەو زانیارییە لەگەڵ زانستو عەقڵدا تێكناگیرێ، پێش هەموو شتێك، لەگەڵ قورئاندا تێكناگیرێ، یان لەگەڵ فەرموودەیەكی پێغەمبەردا ﷺ، ئەوكاتە تۆ وەك زانیارییەكی زیادە، وەك هەندێك وردەكارییو بەرچاوڕوونیی، دەتوانی لێی بەهرەمەند بی، ئێمەش هەر لەو ڕوانگەیەوە، جار جار هەندێ زانیاریی لە پەیمانی كۆنەوە، یاخود لەوەی كە پێ دەگوترێ: (الكتاب المقدس) بە هەردوو بەشی: (پەیمانی كۆن)و (پەیمانی نوێی وەردەگرین، ئەوەندەی بە پێویستی بزانین، جاری واش هەیە، كە زانیارییەكی هەڵەی تێدا هەبێ، {یانی: لە كتێبی پیرۆز (الكتاب المقدّس)دا}، وەك لە درێژەی تەفسیری سووڕەتی (یوسوف)دا دەیهێنین، ئەوەش بە تەئكید باس دەكەینو ڕاستی دەكەینەوە.

ئنجا پێویستە ئەوەش بزانین كە بەسەرهاتی یوسوف عليه السلام لە (سفر التكوين)دا چواردە (١٤) ئیصحاحی بۆ تەرخان كراون، كە ئیصحاح لە جێی سووڕەتی ئێمەیە، لە ئیصحاحی (٣٧ تاكو ٥٠)، لە لاپەڕە (٩٥ تاكو ١٢٥) لە ( التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)دا، كە دەكاتە (٣١) لاپەڕ، هەمووی بۆ بەسەرهاتی یوسوف عليه السلام تەرخان كراوە ، ئەو بابەتەی كە خوا لە سووڕەتی (یوسوف)دا باسی كردوە، بەڵام كاتێك ئەوەی خوا لە سووڕەتی (یوسوف)دا باسی كردوە، دەربارەی بەسەرهاتی یوسوفو،

ئەوەی كە لە پەیمانی كۆندا هاتوە، لە (سِفر التكوین)دا، بەراوردیان دەكەین، زۆر زۆر جیاوازن، ئەو شێوە دارِشتنو وردەكارییەی كە لە قورئاندا هەیە، ئەو هەموو نەزاكەتو نەجابەتە كە لە قورئاندا هەیە، كە وشەیەكی تێدا نیە ناشایستە بێ، لەگەڵ ئەوەی كە لە پەیمانی كۆندا، هەیە زۆر جیاوازە

بەڵام ئەمەش ئەوە دەردەخات، كە ئەویش (پەیمانی كۆن/ تەورات)، بێگومان كاتی خۆی خوای پەروەردگار واقیعەكە چۆن بووە، لەوێش لە (سفر التكوین)دا باسكراوە، كە لەگەڵ ئەوەی كە لە قورئاندا هاتوە، لە هێڵە گشتییەكانیدا وەك یەكە، بەڵام لە هەندێ وردەكارییدا جیاوازە

ئنجا لە تەفسیرەكاندا هاتوە كە دوای ئەوەی خوای زانا سوورەتی (یوسف)ی ناردۆتە خوارو دایبەزاندوە بۆ سەر پێغەمبەری خاتەم ﷺ زۆرێك لە خاوەن كتێبەكان كە بوون، دوای ئەوەی كە ئەو سوورەتەیان خوێندۆتەوەو، تەماشایان كردوە لە هێڵە گشتییەكانیدا، لەگەڵ ئەوەی كە لە لای خۆیانە، رِێك دێتەوە، پێغەمبەرێكی نەخوێندەواریش ئەو زانیارییانە دەڵێ‌و، هەندێك شتی پەنهانیشی تێدایە، كە لە قورئاندا باسكراونو لە كتێبەكانی ئەواندا نین : ئیمانیان هێناوە، دوای ئەوەی كە زانیویانە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایەو، بە سروشی خوا، ئەو بەسەرهاتانەی بۆ دابەزێنراون

# دەرسی یەکەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان شەش (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی (١ تا ٦)، لە سەرەتای سوورەتی (یوسوف)، کە وەك پێشەکی وان، بۆ کۆی بەسەرهاتی یوسوف ، کە لەم سوورەتەدا باسکراوە، ئنجا ئێمە ماناو مەبەستی ئەم شەش (٦) ئایەتە شیدەکەینەوە، کە لەم شەش ئایەتەدا، خوا ﷻ پێناسەیەکی کورتی قورئان دەکاتو، حیکمەتو ئامانج لە دابەزێنرانی قورئان دەخاتەڕوو، باسی ئەوەش کراوە کە خوا بەهۆی دابەزاندنی قورئانەوە، باشترین بەسەرهاتی بۆ پێغەمبەری خاتەم گێڕاوەتەوە، هەرچەندە پێشتریش لەوبارەوە بێئاگا بووبێ .

پاشان باسی خەون گێڕانەوەکەی یوسوف بۆ بابی (عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلامَ)، دەکات کە دیارە یوسوف کوڕی یەعقووبە، کە وا پێدەچێ ئەو کاتە ئەو خەونەی دیوە – وەك پێشتریش باسمان کرد – لە قۆناغی نابالغیی دابووبێ، لە قۆناغی دە دوازدە (١٠- ١٢) ساڵیی دا، هەر ئەوەندە بووبێ، خەونەکەشی ئەوە بووە: یازدە ئەستێرەو خۆرو مانگی بینیون، کە کڕنووشیان بۆ بردوە، واتە: کڕنووشی ڕێزگرتن.

بابیشی ئامۆژگاریی دەکات کە خەونەکەی بۆ برایەکانی نەگێڕێتەوە، کە سەرەنجام لەبەر ئێرەیی (حەسوودیی) پێ بردنی، پیلانی لە دژ بگێڕن، بەهۆی دنەدانو خوتخوتەی شەیتانەوە، کە دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ مرۆڤ و، هەمیشە لێی لە بۆسەدایە .

دوایش یەعقووب ، موژدە بە یوسوفی کوڕی دەدات، – دیارە یەعقووبیش تەعبیری خەونانی زانیوە، یاخود خوای پەروەردگار بۆی ئیلهام کردوە – کە ئەو خەونەی یوسوف ئەوە دەگەیەنێو موژدەی تێدایە کە پەروەردگاری هەڵیدەبژێرێ،

(واتە: هەڵیدەبژێرێ بۆ پێغەمبەرایەتیی)، تەعبیری خەونانیشی فێر دەكاتو، چاكەی خۆی لەسەر خۆیو بنەماڵەكەی (بنەماڵەی یەعقووب) تەواو دەكات، وەك چۆن وەختی خۆی، چاكەی خۆی لەسەر هەردوو بابی، (واتە: ئیبراهیمو ئیسحاق) تەواو كردوە، كە مەبەست لە چاكە تەواوكردن، پێ بەخشینی پلەی پێغەمبەرایەتییەو، دەستڕۆیشتوو كردنە لە نێو خەڵكو كۆمەڵگادا.

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّى رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِى سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾ قَالَ يَٰبُنَىَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا۟ لَكَ كَيْدًا ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

((بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. ئەلیف، لام، ڕا، ئەوانە ئایەتەکانی کتێبێکی ڕوونکەرەوەن ﴿١﴾ ئێمە لە قاڵبی قورئانێکی عەرەبییدا دامانبەزاندوە، بەڵکو بفامن‌و تێبگەن ﴿٢﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ!) ئێمە بەهۆی ئەوەوە کە ئەم قورئانەمان بۆ سروش کردووی، باشترین بەسەرهاتت بۆ دەگێڕینەوە، هەرچەندە بێگومان تۆ پێش وی (پێش دابەزینی قورئان) لە بێئاگایان بووی (لەوبارەوە) ﴿٣﴾ یادبکەوە! کاتێك یوسوف بە بابی خۆی (یەعقووب)ی گوت: ئەی بابە گیان! من یازدە ئەستێرەو خۆرو مانگم لە خەوندا دیتن : کڕنووشیان بۆ بردبووم ﴿٤﴾ بابی گوتی: ئەی کوڕیژگەی خۆم! خەونەکەت بۆ برایەکانت مەگێڕەوە، کە لە ئەنجام (ی ئێرەیی پێ بردنت)دا پیلانێکت بۆ ساز بکەن، بێگومان شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ مرۆڤ ، (لێی لە بۆسە دایە) ﴿٥﴾ بەو شێوەیە (کە چاکەی لەگەڵدا کردووی‌و موژدەی پێداوی) پەروەردگارت هەڵتدەبژێرێ‌و فێری تەعبیرو مانا لێکدانەوەی خەونانت دەکات‌و، چاکەی خۆی لەسەر تۆو بنەماڵەی یەعقووب تەواو دەکات، (بە کردنت بە پێغەمبەر) وەك چۆن ئەو چاکەیەی پێشتر لەسەر هەردوو بابت: ئیبراهیم‌و ئیسحاق تەواو کرد، بە دڵنیایی پەروەردگارت زانای کارزانە ﴿٦﴾)).

# شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( ٱلْمُبِينِ ) : لە (أبان)ەوە هاتوە، (أبان) لە زمانی عەرەبییدا هەم بە (لازم) دێ، واتە: پێویستیی بە (مفعول بە) ناكات، وەك (أبان القمرُ) مانگەكە دەركەوت، وە هەم بە (مُتَعدِّي) دێ، واتە: پێویستیی بە (مفعول بە) دەكات، وەك (أبانَ محمدُ الكتابَ) موحەممەد كتێبەكەی ڕوونكردەوە، جا بە پێی سیاق بۆمان دەردەكەوێ كە ئایا وشەی (مبين) هەردوو واتایەكەی واتە: (ڕوون) یان (ڕوونكەرەوە)، یان یەكێكیانی لەگەڵ دەگونجێ ؟

لێرەش: ( تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ) ئەوانە ئایەتەكانی كتێبێكی ڕوون، یان ڕوونكەرەوەن، هەردووكیانی لەگەڵ دەگونجێن، كەواتە: لێرەدا وشەی (مبين) دەگونجێ (مُتَعدِّي)بێ‌و دەشگونجێ (لازم)بێ، دەگوترێ: (أبان الشيءَ يُبِينُ، فهو مبِينٌ)، واتە: شتەكەی ڕوونكردەوەو، ڕوونكەرەوەیە، هەروەها دەگوترێ: (أَبانَ يُبِينُ الشيءُ يُبِينُ)، واتە: شتەكە ڕوون بۆوە، (فهو مبين)، واتە: ئەو ڕوونە، هەردوو واتایەكەی لەگەڵ دەگونجێن، هەرچەندە ڕەنگە مانای ڕوونكەرەوەی لەگەڵدا گونجاوتربێ، چونكە ئەم قورئانە ماناو مەبەستەكان‌و بەسەرهاتەكان‌و ڕاستییەكان، ڕوون دەكاتەوەو، خۆشی لە خودی خۆیدا ڕوون‌و ڕۆشنە .

( عَرَبِيًّا ) : واتە: ئەم قورئانە بە زمانی عەرەبیی هاتوە، وشەی (عربي) بە مانای ڕۆشن دێ، دەگوترێ: (الإعراب: البيان)، (إعراب) واتە: ڕوون كردنەوە، (أَعْرَبَ عن نفسهِ) واتە: مەبەستی خۆی ڕوون كردەوە، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {الثَّيِّبُ تُعْرِبُ عَنْ نَفْسِهَا} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٧٥٨)، تعليق شعيب الأرنؤوط : صحيح لغيره، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً ابْنُ مَاجَه برقم: (١٨٧٢) قَالَ الألبَانِي: صَحِيح}، واتە: بێوەژن (ئافرەتێك كە شووی كردبێ‌و هاوسەرەكەی نەمابێ) بۆخۆی قسەی خۆی دەكات، واتە: پێویستە بە ڕوونیی هەڵوێستی خۆی ڕابگەیەنێ، كە ئایا بەو پیاوەی كە دەیانەوێ لێی مارە بكەن ڕازییە، یان ڕازی

نیە، بەڵام کچ مەرج نیە بە قسەی خۆی تەعبیر بکاتو، ئەگەر بێدەنگیش بێ، ئاساییە، بەڵام بێدەنگییەك ئەوەی لێ بفامرێتەوە، کە ڕازییە، ئەو کاتە پێویستیی بە قسە کردن ناکات، کەواتە: (تُعْرِبُ عَنْ نَفْسِهَا) واتە: مەبەستی خۆی ڕوون دەکاتەوە .

کە خوا دەفەرموێ: ﴿ حُكْمًا عَرَبِيًّا ﴿٣٧﴾ ﴾الرعد، (أي: مُفْصِحاً، يُحِقُّ الحَقَّ وَيُبْطِلُ البَاطِلَ) واتە: حیکمەتێکی ڕوون، زۆر بە ڕوونیی هەق وەك هەقو، ناهەق وەك ناهەق پێشان دەدات .

( ٱلْقَصَصِ ) : (القَصُّ: تَتَبُّعُ الأَثَرِ، وَالقَصَصُ: الأَثَرُ، وَالقَصَصُ: الأَخْبَارُ المُتَتَبَّعَةُ)، ( قصص) بە مانای شوێن پێکەوتن دێ، هەروەها (قصص) بە مانای خودی شوێن پێیەکانیش دێ، دیسان (قصص) بە مانای ئەو هەواڵانەش دێ، کە بەدوای یەکدا دێن، ئنجا وشەی (قصص) جاری وایە، وەك(اسم المفعول) بەکاردێ، یانی: (المقصوص) گێڕدراوە، ئەو بەسەرهاتەی کە گێڕدراوەتەوە .

( يَٰٓأَبَتِ ) : واتە: ئەی بابە گیان ! وشەی (أبتِ) ئەم (ت)ێیەی کە دەچێتە سەری، لەجیاتی (ي)ە، لە جیاتی بڵێ: (يا أبي) دەڵێ: (يا أبت) ئەی بابی من! بابی خۆم، کە زیاتر لە حاڵەتی ڕێز لێگرتنو سۆزو خۆشەویستیی دەربڕیندا، بەکاردەهێنرێ .

( كَوْكَبًا ) : (الكَوْكَبُ: النَّجْم)، وشەی (كَوْكَب) لە زاراوی قورئان دا بە مانای ئەستێرە دێ، دەگوترێ: (كَوْكَب وَكَوْكَبَة، مثل: بَيَاض وَبَيَاضَة)، ...

( سَٰجِدِينَ ) : (السجُودُ: أَصْلُهُ التَطامنُ وَالتَذَلُّل) وشەی (سجود) لە ڕیشەدا بە مانای خۆ نزم کردنو ملکەچ کردن دێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴿٦﴾ ﴾الرحمن، واتە: ئەستێرەو درەخت، کڕنووش دەبەن، ئنجا ئایا ئەستێرەو درەخت چۆن کڕنووش دەبەن؟ واتە: ملکەچن بۆ فەرمانی خواو بە پێی یاساکانی خوا ﷻ بەڕێوە دەچن، هەروەها لە سووڕەتی ئەعرافدا، هاتوە:

﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا ١٦١﴾ الأعراف، واتە: بە کڕنووش بردوویی بچنە نێو دەرگاکە، کە بە تەئکید مەبەست ئەوەنیە نێوچەوانیان بخەنە سەر زەوی، چونکە ئەگەر نێوچەوانت لەسەر زەوی بێ، ناتوانی بڕۆی، واتە: بە ملکەچیی، ئنجا ملکەچییەکە، چ چەمینەوەی جەستەی لەگەڵدابێ، چ مەبەست ملکەچیی مەعنەویی بێ، واتە: بە ملکەچ کردن بۆ فەرمانی خواوە، بچنە نێو دەروازەکەوە، نەك بە لووت بەرزیی و یاخیی بوونەوە .

( رُءۡيَاكَ ) : واتە: خەونەکەت، دەڵێ: (الرُّؤيَا: مَا يُرَى فِي المَنَامِ)، (رؤيا) ئەوەیە کە لە خەوندا دەبینرێ، وشەی (رؤية) و (رؤيا) هەردووکیان بە مانای بینین، بەڵام (رؤيا) ئەوەیە لە خەوندا دەیبینن، (رؤية) ئەوەیە کە لە حاڵەتی بێداریی دا بە چاوی سەر دەبینرێ .

( كَيۡدًا ) : (ضربٌ من الإحتيال، ممدوحٌ أو مذمومٌ) (کید) جۆرێکە لە فێڵ و پەنهانکارییەك، ئنجا ئەگەر بۆ مەبەستی باش بێ، ئەوە خاوەنەکەی لەسەری مەدح دەکرێ و، ئەگەر بۆ مەبەستی خراپ بێ، خاوەنەکەی لەسەری سەرزەنشت دەکرێ .

( يَجۡتَبِيكَ ): واتە: هەڵتدەبژێرێ، (يصطفيك، ويختارك)، لە چییەوە هاتوە؟ (جَبَيْتُ الماءَ في الحوض) ئاوەکەم لە گۆمەکە، یان گۆلەکەدا کۆکردەوە، وشەی (جابية)ش بەو گۆلە گەورەیە دەگوترێ، کە ئاوی تێدا کۆدەکرێتەوە، دەگوترێ: (الحوضُ الجامع)، (الإجْتِبَاءُ: الجَمْعُ عَلَى طَرِيقِ الإِصْطِفَاءِ)، (إِجْتِبَاء) ئەوەیە کە شتێك کۆبکرێتەوە بە شێوەی هەڵبژاردن .

( تَأۡوِيلِ ) : (التَّأْوِيلُ: الرُّجُوعُ إِلَى الأَصْلِ، وَفِيهِ المَوْئِل للمَوْضِع الَّذِي يُرْجَعُ إِلَيْهِ، والتأويل: هو رَدّ الشيء إلى الغَايَة المرادَة مِنْهُ)، وشەی (تأويل) بە مانای گەڕانەوە بۆ ئەسڵە، بۆیە بەو شوێنەی کە خەڵکی بۆ لا دەگەڕێتەوە، دەگوترێ: (مَوْئِل)، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ مَوۡئِلٗا ٥٨﴾ الكهف، واتە: جگە لە خوا شوێنێکی دیکەو کەسێکی دیکە نابیننەوە، بۆ لای بگەڕێنەوە، لە ڕۆژی دوایی دا، هەموویان دەچنەوە بۆ خزمەت خوا .

کەواتە: (تأویل) بریتیە لە گێڕانەوەی شتێك بۆ ئەو مەبەستەی کە لێی ویستراوە، بۆیە یوسوف دوای ئەوەی کە خەونەکەی دێتە دی، لە کۆتایی بەسەرهاتەکەی داو، بابیو دایکیو یازدە برایەکەی دەچن بۆ میسرو، کڕنووشی ڕێز لێگرتنی بۆ دەبەن، سڵاوی ڕێزگرتنی حوکمڕانانەی لێدەکەن، دەڵێ: ﴿وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ ١٠٠﴾، واتە: ئەی بابە گیان! ئەوە سەرەنجامی خەونەکەمە، کە پەروەردگارم هێنایەدی .

(ٱلۡأَحَادِيثِ) : کۆی (حَدِیث)ە، (کُلُّ کَلَامٍ یبْلُغُ الإِنْسَانَ مِنْ جِهَةِ السَّمْعِ أَو الوَحيِ فِي یَقَظتهِ أو فِي مَنَامِهِ، یُقَالُ لَهُ: حَدِیث، وَالحَدِیثُ مَا یَتَحَدَّث بهِ الإِنْسَانُ فِي مَنَامِهِ)، واتە: (حَدِیث) هەر قسەیەکە بگاتە ئینسان لەو ڕووەوە کە دەیبیستێ، یان لە ڕێی وەحییەوەو، لە کاتی بێداریی یان لە کاتی خەودا، هەروەها هەر شتێك کە ئینسان لە کاتی خەوندا قسەی پێدەکات، یاخود دەکەوێتە بەرچاوی پێی دەگوترێ: (حَدِیث).

(ءَالِ يَعۡقُوبَ) : واتە: بنەماڵەو نیزیکانی یەعقووب، (یُسْتَعْمَلُ الآلُ فِیمَا یَخْتَصُّ بالإِنْسَانِ اخْتِصَاصَاً ذَاتِیاً، إمّا بقَرَابَة قَرِیبَة أَو مُوَالاَةٍ)، وشەی (آل) بەکاردەهێنرێ بۆ کەسانێك کە تایبەتن بە مرۆڤەوە، بە شێوەیەك کە تایبەتن بە خودی خۆیەوە، جا چ بەهۆی خزمایەتییەکی نیزیکەوە بێ، چ بەهۆی سەر پێ بوونو شوێنکەوتنەوە بێ، دیارە بە نسبەت (آل یعقوب)ەوە : کوڕەکانیو خزمەکانی، هەم لە ڕووی نەسەبو ڕەچەڵەکەوە لێی نیزیك بوونو، هەم لە ڕووی شوێنکەوتنو شوێن پێ هەڵگرتنشەوە، لێی نیزیك بوون.

# مانای گشتی ئایەتەکان

ئێمە لەبەر ئەوەی کە پێشتر تا ڕاددەیەك تیشکمان خستە سەر بەسەرهاتی یوسوف ﷺ لەبەر تیشکی ئەم ئایەتە موبارەکانەدا، هەروەها لە ڕووی مێژووییەوە هەندێك شتمان باس کردو، لە ڕووی پەیمانی کۆنەوە هەندێك زانیاریمان خستە ڕوو، لێرەدا بە کورتیی لە بارەی ئێستا ئەم شەش (٦) ئایەتەوە دەدوێین، کە وەك پێشەکیی و ڕێ خۆشکردن وان، دەست پێکردنی گێڕانەوەی بەسەرهاتی یوسوف ﷺ لەگەڵ بابی یەعقووب و یازدە (١١) برایەکەی و دایکی دا، پاشان ئەوەی کە لەسەر دەستی برایەکانی بەسەری هاتووە، ئنجا دوایی لە ماڵی عەزیزی میسڕدا کە بوختانی پێ دەکرێت و چوونە زیندانیی و، دوایی هاتنە دەری، لە زیندان و، بوونی بە عەزیزی میسڕ، بوونی بە پیاوێکی دەست ڕۆیشتوو لە میسڕدا، بە پێی ئەوەی کە ئایەتەکان دەیگەیەنن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَآءُ ﴿٥٦﴾﴾ یوسف، واتە: ئاوا زەوییمان بۆ یوسوف تەخت کرد، یاخود دەست ڕۆیشتوومان کرد کە بە کەیفی خۆی چۆنی پێ خۆش بوو، لەوێ بەو شێوەیە ڕەفتاری دەکرد، مانای وایە یوسوف دەستڕۆیشتوو کراوە لە وڵاتی میسڕدا، ئەم شەش (٦) ئایەتە دەستپێکی ئەو بەسەرهاتەن .

خوا ﷻ سەرەتا دەفەرموێ: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، وەك جاری دیکەش باسمان کردوە، هەر کاتێك دەگوترێ: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، واتە:

١- ئەم کارەم دەست پێ دەکەم بە ناوی خوا.
٢- ئەم کارە بۆ خوا دەکەم .
٣- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- بە شانو شەوکەتی خۆم نانازم، بەڵکو بە یارمەتیی دانو بە ئاسانکاریی خوا ئەم کارە دەکەم .

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ الٓر ﴾، دیارە پێشتر لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، قسەمان دەربارەی ئەو پیتە پچڕ پچڕانە، کردوە، کە لە سەرەتای بیستو نۆ (٢٩) سوورەت لە قورئاندا، ئەو پیتە پچڕ پچڕانە هاتوون، کۆی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەش ئەگەر دووبارە کردنەوەیان لێ تەرك بکەین، چواردە (١٤) پیتن، باشترین مانا لێکدانەوەش بۆ ئەو پیتانە، کە زۆربەی توێژەرەوان لەسەری ڕێککەوتوون، ئەوەیە کە خوا ﷻ لە میانی هێنانی ئەو پیتانەدا کە لە سەرەتای ئەو سوورەتانەوە هاتوون، کە هەموویان سوورەتی مەککەین، جگە لە دووانیان، مەدینەییین، کە (البقرة) و (آل عمران)ن، دەیەوێ بە خەڵك بفەرموێ: کە ئەو قورئانەی ئێوە نکوولیی لێ دەکەنو، تۆمەتی هەڵبەستنی پاڵ دەدەنە لای موحەممەد ﷺ، هەر لەو پیتو دەنگانە پێکهاتوە کە ئێوە پێیان دەنووسنو قسەیان پێ دەکەن، ئنجا ئەگەر ڕاست دەکەن، ئەو قورئانە لە لایەن خواوە نەفەرمووێنراوەو، نەهاتوە، فەرموون: ئەو پیتو دەنگانە لەبەر دەستی ئێوەشدا هەن، ئێوەش وێنەی ئەو قورئانە، یاخود وێنەی دە (١٠) سوورەت، یاخود وێنەی سوورەتێکی، بێنن، ئنجا کە نەتانتوانی، ئەوە بزانن و دڵنیابن کە ئەوە فەرمایشتی خوایەو، خوا ﷻ هەر لەو پیتانەی کە لەبەر دەستی ئێوەدا هەنو، ئێوە قسەیان ئاساییان لێ دروست دەکەن، خوا فەرموودەیەکیان لێ دروست دەکات، کە دەستەوسانکەر بێ بۆ خەڵكو، پڕ بێ لە نهێنیی، هەم لە ڕووی بێژەکانیەوە، هەم لە ڕووی نێوەڕۆکییەوەو، لە هەموو بوارەکاندا پڕ بێ لە نهێنییو ڕاستیی وا، کە جگە لەو زاتەی، جگە لەو کەسەی، کە نهێنیی ئاسمانەکانو زەوی دەزانێ، هیچ کەسی دیکە ئەو نهێنییانە نەزانێو، ئەو ڕاستییانە پەی پێ نەبات .

﴿ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴾، ئا ئەو ئایەتانە ئایەتەکانی کتێبێکی ڕوونن، یاخود کتێبێکی ڕوونکەرەوەن .

ئنجا ئایا بۆچی بە ﴿ تِلۡكَ ﴾، دەیهێنێ، کە ئاماژەیە بۆ دوور؟ دەڵێین : ئەوە ئاگادارکردنەوەیە لە پایەو پێگەی بەرزی قورئانو، ئایەتە سەر سوڕهێنەرو دەستەوسانکەرەکان .

﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾، پێشی هەر ئایەتەكان پێناسە دەكات، كە ئەو ئایەتانە هی كتێبێكی ڕوونن، یان هی كتێبێكی ڕوونكەرەوەن، دوایی خوای پەروەردگار زیاتر تیشكی دەخاتە سەر قورئانو پێناسەی دەكات، دەفەرموێ: ئێمە دامان بەزاندوە، ﴿ قُرْءَٰنًا ﴾، لە حاڵێكدا خوێنراوەیە، چونكە قورئان یانی: خوێنراوە، (قرآناً)، یانی: (مَقْروءاً)، ﴿ عَرَبِيًّا ﴾، واتە: ڕۆشنە، وشەی (عَرَبي)، بەڵێ، مانای زمانی عەرەبییش دەگرێتەوە، بەڵام لێرەدا وشەی (عربي)، نەكراوە بە ناو بۆ ئەو زمانە تایبەتییەی كە گەلی عەرەب قسەی پێدەكەن، ئنجا لەبەر ئەوەی گەلی عەرەب لە زمانی غەیری خۆیان تێنەگەیشتوون، ناویان لێناوە، (عَجَميٍّ)، واتە: زمانێك كە ڕوون نیە، زمانێك كە لێڵە، دیارە زمانی خۆیان پێ ڕوونو ڕۆشن بووە .

هەڵبەتە هەموو كەسێك زمانی خۆی پێ ڕۆشنەو، زمانی بەرانبەرەكەی كە نایزانێو لێی تێناگات، پێی ناڕۆشنە، بەڵام بە هەر حاڵ ئەم ناوە بۆتە ناوونیشان بۆ ئەو زمانە تایبەتییەی، كە نەتەوەی عەرەب قسەی پێ دەكەن .

ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەم كتێبەمان كردوە بە كتێبێكی خوێنراوەو زۆر ڕۆشن، ﴿ لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾، بەڵكو بفامن، بەڵكو تێی بگەن، بەڵكو شارەزا بن، دیارە بەڵكو (لعَلَّ)ەكە، پەیوەندیی بە مرۆڤەكانەوە هەیە، واتە: ئومێد وایە، ئەگەری هەیە، كە ئێوە تێبگەن، مەبەست ئەوانە، ئەگەری هەیە، ئەگەرنا بە نسبەت خوای باڵادەستەوە شتێك بیەوێ بیكات، دەیكات .

﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ ﴾، ئێمە باشترین بەسەرهاتت بەسەردا دەخوێنینەوەو دەیگێڕینەوە، بە هۆی ئەوەوە كە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ سروش كردوە، ﴿ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴾، بێگومان تۆ پێش ئەوەش (واتە: پێش ئەم قورئانە) لە بێ ئاگایان بووی،ئەم (إنْ)ە (إنْ)ی (مُخَفَّفَة)یە لە (مُثَقَّلَة)ە، جاری واش هەیە (إنْ)، بە مانای (ما النافية) دێ، بەڵام چۆن دەزانین: ئەم (إنْ)ە، بۆ تەئكیدە، بۆ جەختكردنەوەیە، یاخود بە مانای (ما النافية) دێ؟ بەهۆی ئەم (ل) لامەوە، ﴿ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴾،

ئەم (لَ)ە، كە بوو، مانای وایە ئەم (إنْ)ە، بۆ جەختت كردنەوەیە، واتە: بە دڵنیاییەوەو بێگومان پێش ئەم قورئانە، تۆ لە بێ ئاگایان بووی، لەو بەسەرهاتانە، یاخود لە بێ ئاگایان بووی لەو ڕاستییانەی كە لە ڕێگای وەحییەوە نەبێ نازانرێن، چونكە زۆربەی توێژەرەوان هەر دەڵێن: ﴿ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴾، واتە: لەبارەی بەسەرهاتی یوسوفەوە، یان لەبارەی ئەو بەسەرهاتانەوە، كە لە قورئاندا گێڕدراونەوە، بەڵام لە ڕاستییدا چەمكەكەی زۆر فراوانترە، واتە: تۆ لە بێ ئاگایان بووی (ئەی موحەممەد! ﷺ) لە هەموو ئەو شتانەی كە لە ڕێی وەحی یەوە نەبێ نازانرێن .

ئنجا دێتە سەر باسی بەسەرهاتەكە: ﴿ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ ﴾، واتە: یاد بكەوە كاتێك یوسوف بە بابی گوت: ﴿ يَٰٓأَبَتِ ﴾، ئەی بابە گیان! ﴿ إِنِّى رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِى سَٰجِدِينَ ﴾، من یازدە (١١) ئەستێرەم بینین و، خۆرو مانگیشیم بینین، كە بۆ من كڕنووشیان بردبوو، دیارە - وەك دواییش باسی دەكەین – وشەی (سجدة)و (سجود)، مانایەكەی ئەوە نیە كە حەتمەن نێوچەوان و تەوێڵ بخرێتە سەر زەوی، وەك سەجدەی عیبادەت كە ئێمە لە نوێژدا دەیبینین، بەڵكو (سجدة)و (سجود)، بریتیە لە چەمینەوەو نووشتانەوە، وەك حاڵەتی جەستەیی و بەرهەست، هەروەها بریتیە لە ملكەچیی و زەبوونیی و بچووكیی پێشان دان، لە ڕووی مەعنەوییەوە .

یوسوف زۆر بە كورتیی خەونەكەی بۆ بابی دەگێڕێتەوە، كە خۆرو مانگ و یازدە ئەستێرەی بینیون كڕنووشیان بۆ بردوە، یانی: سڵاویان لێكردوەو ڕێزیان لێ گرتوە، دیارە یەكسەر بابی لە خەونەكەی تێدەگات، ئنجا كە تەماشای حاڵ و ڕواڵەت و هەڵسوكەوتەكانی یوسوفی كوڕیشی كردوە، زانیویەتی لێی دەوەشێتەوە، خەونی وا ببینێ، ئەو خەونەش دیارە خوای زاناو شارەزا بە وەحیی، یان بە خورپە (إلهام) تەعبیرەكەی خستۆتە دڵی یەعقووبەوە ﵇، یەعقووب دڵنیا بووە كە خەونەكەی چی دەگەیەنێ؟ بۆیە یەكسەر پێی دەڵێ: ﴿ قَالَ يَٰبُنَىَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا۟ لَكَ كَيْدًا ﴾، گوتی: ئەی ڕۆڵە گیان! خەونەكەت بۆ برایەكانت مەگێڕەوە،

بـە سـەریاندا مەخوێنـەوە، ﴿ فَيَكِيدُوا۟ لَكَ كَيْدًا ﴾، چـونکە لـە ئـەنجامی گێڕانـەوەی خەونەکەتـدا، کـە ئـەوانیش تێیدەگـەنو شـتێکی لـێ حـاڵی دەبـن: خەونەکـەت چـی دەگەیـەنێ؟ سـەرەنجام ئێرەیـیو حەسـوودییت پـێ دەبـەنو، پیلانو فێڵێکـت بـۆ سـاز دەکەنو، تووشی گرفتو بەڵایـەکت دەکـەن، بۆیـان مـەگێڕەوە، بـۆ ئـەوەی ئـەوان ئـەوە نەکـەنو، سـەرەنجام تووشـی گرفتـاریو زیـان نـەبی، ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ لِلْإِنسَـٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾، بێگومان شـەیتان بـۆ مـرۆڤ دوژمنێکی ڕوونو ئاشکرایە، دیـارە خەونەکـەی یوسـوف ﷺ ئەوە دەگەیەنـێ کە دیارە یوسـوف یـازدە (١١) بـرای بـوون یەکێکـیان لـە دایکی بـووە، کـە وەك پێشـتـر باسـمان کـرد، بـە نـاوی (بنیـامین) کـە دایکیـان نـاوی (راحیـل) بووەو، دە (١٠) برایەکەی دیکـەی لە دایکی خـۆی نەبوون، لە چەند دایکێکی دیکـە بوون، بە پێی ئـەوەی کە لـە پەیمـانی کۆنـدا هـاتوە، کـە یەکـیان نـاوی (لیئة) بووە، یـان نـاوی (لیـا) بـووە، وێڕای دوو کـەنیزەك کـە ناویـان (زلفة)و (بَلْهة)، بـووە، ئەگەر ئەوەی لە پـەیمانی کـۆندا هـاتوە، ڕاسـت بـێ، ئەگـەرنا دەگونجێ هەموویـان لـە دایکـێك بـووبن، چـونکە ئـافرەتی وا هەیـە نـەك دە (١٠) کـوڕ، بەڵکـو جـاری وایـە زیاتریشی دەبـن، هەڵبەتـە خەونەکەی یوسـوف ئـەوە دەگەیەنـێ، کـە ئـەو یـازدە (١١) ئەسـتێرەیە، یازدە (١١) برایەکـەی خۆینـی، واتـە: هەرچەنـدە برایـەکی لـە دایکیـەتیو دە (١٠) برایەگەی دیکـەی لـە دایکی خـۆی نـین، بـەڵام هـەموویان بـرانو لـە بابنـی، خـۆرو مانگەکەش بریتیـن لە دایكو بابی، خۆر دایکـیەتی، چونکە وشەی (شمس) لـە زمـانی عەرەبییـدا مێینـەی (مجـازي)یـە، دەگـوترێ: (طَلَعَـتِ الشَّـمْسُ)، (قَمَـر)یـش نێرینەی (مجازي)یە، دەگوتـرێ: (طَلَعَ القَمَرُ) لەبەر ئەوەش کە ئەسڵی بەهێـزتـر لـە پەیـدابوونی مرۆڤـدا، دایکـە، دایـك لـە سکی خۆیـدا نـۆ (٩) مانگـان هەڵیدەگـرێ، هەڵبەتە لـە هـەردووکیان دروست دەبێ، بـەڵام زۆربـەی زانایـان دەڵێن: لێرەدا هێمای (شمس) دایکی یوسوفە، هێمـای (قمر)یش بابیـەتی .

ئنجـا دوایی یەعقـووب ﷺ لە ئامۆژگـاریی کردنەکەی یوسوف دا بەردەوام دەبـێو، زیـاتر بەرچـاوی ڕۆشـن دەکاتـەوەو دڵیشـی خـۆش دەکـات، لەبـەر ڕۆشـنایی خەونەکـەدا، دەشگونجـێ خـوای پەروەردگـار جگـە لـەم خەونـەش کـە یوسـوف بینیویەتـی، بـە خورپـە (إلْهام)ش خسـتبیە دڵی یەعقووبـەوە، کە ئـەو کوڕەی (یوسـوف) ئایندەیـەکی

زۆر ڕۆشنی دەبێ‌و، کە تەماشای نەجابەت‌و هەڵس‌و کەت‌و قسەو ڕەفتاریشی کردوە، ئەوەی تێدا خوێندۆتـەوە، واتە: هەم دەگونجێ بە فیراسـەت‌و ڕۆشنبینیی خۆی، ئەوەی زانیبێ‌و، دەشگونجێ خوای کـارزان بە خورپە خستبیە دڵیەوە، بۆیەش - وەك دوایی دەردەکەوێ - گرنگیی زیاتری بە یوسـوف داوەو، زیاتر دڵی لەسەری بووە، کە بەداخەوە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئـان هەر ئەو ڕووە نەرێنییەی لێ دەگرن‌و دەڵێن: لەبەر ئەوەی یەعقووب جیاوازیی خستۆتە نێوان کوڕەکانی، بۆیە خوا سزای داوە، وەك ئەوەی کە بەسـەر پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دێ، هەر وەك ئەوە بێ، کە بەسەر خەڵکی دیکەی ئاسایی، دێ! بەڵام پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەوەی کە بەسەریان دێ، بەهۆی ئەوەوە نیە، کە گوناهیان کردوەو خوا سزایان بدات! بەڵکو بۆ ئەوەیە کە پلەیان بەرزتر بێ، واتە: نابێ ئێمە لە هەمبانەی خۆماندا گوێز بژمێرین، پێمان وابێ کە وەك چۆن ئێمە هەڵەیەك دەکەین، دوایی خوا سزامان دەدا لەسەری، پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەگەر ناڕەحەتییەکیان هاتبێتە پێش، بەهۆی سزایەکی خوایی بووە! نەخێر ئەوە مەرج نیە.

ئنجا یەعقووب عليه السلام یش خوای پەروەردگار هیچی لەوبارەوە باس نەکردوە، کە جیاوازیی خستبێتە نێوان یوسوف‌و کوڕەکانیەوە، بەڵکو ئەوە برایەکانی یوسوف دەڵێن: ﴿لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا ﴿٨﴾﴾ یوسف، ئنجا ئەوان کە ئامادەبن دەستیان بچێتە خوێنی برایەکەیان، بێگومان ئەوەشیان بۆ ئاسانە، کە بابیان تۆمەتبار بکەن بەوەی: یوسوف‌و برایەکەی لەوان خۆشتر دەوێن! بەڵام خۆیان دڵ‌و دەروونەکەیان تەواو نەبووە، ئنجا ئەوان بە تەئکید پێغەمبەر نەبوونە، (هەرچەندە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: هەموویان پێغەمبەر بوون)، یاخود ئەوکاتە پێغەمبەر نەبوون‌و دوایی بوونە پێغەمبەر، بەڵام من پێم وایە نە پێشێ‌و نە دوایی، پێغەمبەر نەبوون، چونکە ئەو ڕەفتارەی ئەوان بەدڵنیایی لە پێغەمبەران ناوەشێتەوە، ئنجا ئێمە ناتوانین تۆمەتبار کردنی ئەوان بۆ یەعقووب عليه السلام بکەینە بەڵگەی ئەوە کە: یەعقووب لایەنگریی کردوە بە لای یوسوف‌و برایەکەیدا، لەسەر حیسابی دە کوڕەکەی دی! بەڵکو ئەوان هەر گومانی خراپی خۆیان بووە، ئنجا وەك گوتم: کەسێك دەستی بچێتە خوێنی برای خۆی‌و

بیفەوتێنێ، ئاساییە کە زمانیشی بە تۆمەت بگەڕێ، بەرانبەر بە بابی، یان بەرانبەر بە دایکی، یان بەرانبەر بە هەر کەسێك .

ئنجا یەعقووب لەسەر ئامۆژگاریی کردنی یوسوف بەردەوام دەبێو دەفەرموێ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ ﴾، هەر بەو شێوە کە خوا ئەم خەونەی پێشانی تۆ داوەو، ئەو بەرچاوڕوونییەی خستۆتە بەرچاوی تۆ، ئاوا پەروەردگارت هەڵتدەبژێرێ، ﴿ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ﴾، هەروەها لە تەعبیرو مانا لێکدانەوەی، یاخود لە ڕوونکردنەوەی، مەبەستی قسان، یاخود لە ڕوونکردنەوەی مەبەستی خەونەکان، فێرت دەکات، شارەزات دەکات، ﴿ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ ﴾، هەروەها خوا چاکەی خۆی لەسەر تۆ تەواو دەکات، کە بریتییە لە چی ئەو چاکە تەواو کردنە؟ دوایی باسی دەکەین، ﴿ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ ﴾، هەروەها چاکەی خۆی لەسەر بنەماڵەی یەعقووبیش تەواو دەکات، ﴿ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ ﴾، وەك چۆن ئەو چاکەیەی خۆی لەسەر هەردوو بابت پێشتر تەواو کرد، کە ئیبراهیم‌و ئیسحاقن، کە بریتی بوو لە چی ئەو چاکەیە؟ زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن‌و واش پێ دەچێ هەروابێ: ئەو چاکەیە مادام بە ڕەهایی باسکراوە، چاکەی ڕەها بریتییە لە پێغەمبەرایەتیی، دەشگونجێ وێڕای پێغەمبەرایەتیی بریتی بێ، لە دەستڕۆیشتوویتیی‌و دەست ئاوەڵا کردن لە زەویداو، دەسەڵات پێدان، ئنجا دیارە ئیبراهیم‌و ئیسحاقیش هەر وابوون، وێڕای ئەوەی کە پلەی پێغەمبەرایەتییان بووە، دەست ڕۆیشتووو دەست کراوەو خاوەن دەسەڵات‌و توانای ماددییش بوون، ئەگەر خاوەن دەسەڵات‌و توانای سیاسییش نەبووبن، واتە: ئەو چاکەو نیعمەتەی کە خوا لەگەڵ هەردوو باپیرەت: ئیسحاق کە دەبێتە بابی یەعقووب‌و، ئیبراهیمیش کە دەبێتە بابی باپیری، وەك چۆن ئەو چاکە ڕەهایەو نیعمەتە گەورەیەی کە بریتییە لە بەخشینی پلەی پێغەمبەرایەتیی، بوانی داوە، بە تۆشی دەدات، ﴿ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، بێگومان پەروەردگاری تۆ زانایەو کارزانە، زانایە دەزانێ چی دەکات، کارزانیشە، دەزانێ چۆنی دەکات‌و، چۆن لەگەڵ بەندەکانیدا مامەڵە دەکات ؟

## چـەند مەسـەلەیەكی گرنـگ

**مەسـەلەی یەكـەم** : خـوا ﷻ دوای ئەوەی كە دەفەرموێ: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بە نـاوی خـوای بـە بـەزەیـی بەخشـندە، دەفـەرموێ : ﴿ الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴾.

١- پێشتـریش باسمان كرد: ئەو پیتە پچڕ پچڕانە، كە لێرەدا سـێ پیت هـاتوون: ﴿ الٓر ﴾، ئەوانـە لـە سـەرەتای بیسـتو نـۆ (٢٩)، لـە سـوورەتەكانی قورئانـدا هـاتوون، كۆی ئەو پیتانەش دوای ئـەوەی دووبـارە كراوەكان لادەبرێن، چـوارده (١٤) پیتـن، كـە بریتیـن لـە پیتەكـانی (أ، ل، م، ص، ر، ك، ه، ي، ع، ط، س، ح، ق، ن)، كە دەگونجێ لـە ڕسـتەیەكی ئـاوادا كـۆ بكرێنـەوە: (نَصٌ حَكِيمٌ، قَاطِعٌ، لَهُ سِرٌ)، واتە: دەقێكی كارزانانـەی ڕوونـە، نهێـنیی هەیـە، هەڵبەتـە دەشگونجـێ بـە شـێوەیەكی دیكـەش، ڕستەی دیكەشـی لـێ پێكبهێنرێ .

ئنجـا زۆر جـاری دیكـەش گوتوومـانە: كـە زانایـان زۆر قسـەیان كـردوە، دەربـارەی ئـەو پیتـە پچـڕ پچڕانە، كـە بۆچی لـە سـەرەتای ئـەو سوورەتانەوە هاتوون، كە (٢٩) سـوورەتن؟ بەڵام باشـترین ڕا – بەلامـەوە – هـەتا ئـەم كاتـەی مـن ئـەم دەرسـەی تێـدا دەڵـێمەوە، ئەوەیـە كـە خـوا ﷻ دەیـەوێ بـە مرۆڤـەكان بفەرموێ بە گـشتیو بەتایبەتیی بەوانـەی كە نكووڵـیی دەكـەن لە خوایی بوونی قورئـان، لەوە كە سـەرچاوەی قورئـان، خوای بـێ وێنـە بـێ، (ئەوانـەی نكووڵیی لـەو ڕاسـتییە دەكـەن)، پێیـان بفـەرموێ: ئـەو دەنـگو پیتانـەی قورئانیـان لـێ پێكهاتوە، فـەرموودەی بێوێنـەی خوایـان لـێ پێكهاتوە، لەبـەر دەسـتی ئێوەشدا هەن، دە فەرموون! ئێوەش قـورئـانێكی وا بڵێن، یان بنووسـن، یان بێنن، یاخـود دە (١٠) سـوورەتی وەك قورئـان، یاخود سـوورەتێكی وەك قورئـان، ئنجا ئەگـەر

نەتانتوانیو، دڵنیاش بن کە ناتوانن، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ وَلَن تَفْعَلُوا۟ ﴿٢٤﴾ ﴾، ئەگەر نەتانتوانیو نەتانکرد، هەرگیزیش نایکەن، ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾، خۆتان لە ئاگرێك بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی مرۆڤ و بەردە، بۆ بێبڕوایان ئامادە کراوە.

لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱلْكِتَـٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، بەڵام لە سوورەتی (یونس)دا: ﴿ تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱلْكِتَـٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ ﴾، ئەوانە ئایەتەکانی کتێبێکی ڕوونن، یان ڕوونکەرەوەن، ئەوانە ئایەتەکانی کتێبێکی کارزانو کاربەجێن. پێشتریش باسمان کرد: وشەی (مُبِين) لە (أَبَانَ)وە هاتوە، ئنجا (أبانَ)، چ (لازم) بێ، وەك (أَبَانَ الشَّيءُ يُبِين)، شتەکە ڕوون بوو، دەرکەوت، ئاشکرا بوو، یاخود (أَبَانَ الشَّيْءَ يُبِينُهُ)، شتەکەی ڕوون کردەوە، کەواتە: (مُبِين)، دەگونجێ بەمانای ڕوونو ڕۆشنو ئاشکرا بێ، دەشگونجێ بە مانای ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەر بێ، بەڵام بۆ ئێرە ئەوە گونجاوترە بڵێی: ئەم ئایەتانە ئایەتەکانی کتێبێکی ڕۆشنکەرەوەن، ڕوونکەرەوەن، چونکە لەم ئایەتانەدا لەم سەدو یازدە (١١١) ئایەتەی سوورەتی (یوسف)دا، بەسەرهاتی پڕ نهێنیی یوسوف ﷺو برایەکانی بابیو دایکیو، ئەو خەڵکانەی کە مامەڵەیان لەگەڵیدا بووە، لە زیندان داو، دوایی لە میسرو کاروانو... هتد، لە هەموو ئەوانەدا، خوای پەنهانزان ئەو بەسەرهاتە پڕ نهێنییە ڕوون دەکاتەوە .

٢- وشەی : ﴿ تِلْكَ ﴾: ئاماژەیە بۆ دوور، لەبەر پایەی بەرزی ئایەتەکانی قورئان، ئنجا بۆیە لە سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱلْكِتَـٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، ئەوانە ئایەتەکانی کتێبێکی کارزانن، چونکە: لە سوورەتی (یونس)دا - وەك پێشتر باسمان کرد - باسی سیفەتە بەرزەکانی خواو ناوە هەرە پەسندەکانی خواو، یەکتایی خوا: لە بەدیهێنەرایەتیو پەروەردگارێتییو تەنیا پەرستراوێتیی خواو، باسی ئەوە کە خوا ﷻ ئەو کەونو کائیناتو بوونەوەرەی

بە هەق خوڵقاندوە، پاشان باسی پێغەمبەرایەتیی و وەحیی و، باسی زیندوو کرانەوەو ڕۆژی ئاخیر زەمان و قیامەت کراوەو، ئنجا حیکمەت و زانایی و شارەزایی بێسنووری خوای پەروەردگار لەو شتانەدا بەرجەستە دەبێ، بۆیە وشەی: ﴿ ٱلْحَكِيمِ ﴾، لەوێدا کراوە بە سیفەت بۆ (کتاب)، کتێبێکی کارزان و لێزان و کارامە.

بەڵام بۆیە لێرەدا وشەی: ﴿ ٱلْمُبِينِ ﴾، ڕوونکەرەوە، یاخود ڕۆشن، کراوە بە سیفەت بۆ (کتاب)، چونکە گێڕانەوەی بەسەرهاتی (یوسف)و باب و دایکیی و برایەکانی، بەو هەموو نهێنیی و ڕاستییانەوە، سیفەتی ڕۆشن و ڕوونکەرەوە (مبین)ی لەگەڵ گونجاوترە، ئەگەرنا بە دڵنیایی: قورئان هەم (حکیم)یشەو هەم (مبین)یشەو، هەم (کریم)یشە هەم (عليَ)یەو، هەم (عَظیم)ەو هەم (مُبارك)ەو، هەموو خاوەنی ئەو وەسفانەی دیکەیە کە لە قورئاندا بۆی بەکارهێنراون.

**مەسەلەی دووەم** : کە دەفەرموێ : ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَـٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ۝٢ ﴾، ئێمە دامانبەزاندوە، واتە: ئەم کتێبانەمان دابەزاندوە، ﴿ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا ﴾، خوێنراوەیەکی ڕوونە، ﴿ لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾، بەڵکو بفامن، چونکە وشەی (قورئان) وەک خوای زانا لە سوورەتی (القیامة)دا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَـٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ۝١٨ ﴾، واتە: ئەگەر خوێندمانەوە، بە دوای خوێندنەوەکەی بکەوە، کەواتە: (قُرآن)، واتە: (مَقْروء)، خوێنراوە، یاخود (قِراءة) خوێندنەوە، بۆیەش ناو لە دوا پەیامی خوا نراوە: (کِتاب)، چونکە دەنووسرێتەوەو، نووسراوەتەوە، هەروەها ناوی لێنراوە: (قُرآن)، چونکە دەخوێنرێتەوەو، خوێنراوەتەوە، هەروەک بۆیەش ناوی لێنراوە: (ذِکْر)، چونکە ڕاستییەکان دەخاتەوە بیری ئینسان و، بۆیەش ناوی لێنراوە: (فُرقان)، چونکە هەق و ناهەق، ڕاست و چەوت، حەڵاڵ و حەرام، چاک و خراپ، بۆ مرۆڤ لێک جیادەکاتەوە .

کە تەنیا ئەو چوار ناوە سەرەکییە، بە بۆچوونی من، بۆ قورئان بەکارهاتوون، واتە: (١/ الكِتاب ٢/ القُرآن، ٣/ الذكْر، ٤/ الفرقان)، بەلاَم دیارە قورئان بە زۆر وەسف، وەسفکراوە، وەك لە مەوسووعەی: (الإسلامُ كما يتجلى في كتابِ الله)دا، لەو کتێبەدا کە تەرخانم کردوە بۆ باسی کتێبەکانی خواو، لە نێویاندا قورئان، بە تەفصیلْ لەوبارەوە دواوم .

کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ پێشێ پێناسەی قورئانی بۆ کردین، زۆر بە کورتیی: ئەی موحەممەد ! ئەو ئایەتانەی بەسەرتدا دەخوێنرێنەوە، ئایەتەکانی کتێبێکی ڕۆشنکەرەوەن، دوایی زیاتر بۆمان ڕوون دەکاتەوە، کە ئەو کتێبە لە کوێوە بۆمان هاتوە؟

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە پێنج برگەدا:**

١) - ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ ﴾: ئەسڵی خۆی (إِنَّنَا)یە، یانی: بە جەختکردنەوە، بە دڵنیایی ئێمە ئەم قورئانەمان دابەزاندوە، ئایا بۆچی خوا ﷻ جەخت دەکاتەوەو داکۆکیی لەسەر ئەوە دەکات؟ چونکە نەیارەکانی پێغەمبەر ﷺ، تۆمەتباریان دەکرد، دەیانگوت: (إِفتَرَاهُ)، خۆی هەڵیبەستوە، یان دەیانگوت: ﴿أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ۝٥﴾ الفرقان خەڵك پێیگوتوەو ئەویش نووسیویەتەوە، وەك لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ : ﴿لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ۝١٠٣﴾، زمانی ئەوەی کە ئاماژەی پێ دەکەن (کە قورئانی فێری موحەممەد ﷺ کردبێ، کە غولاَمێکی نەصرانیی، یان ڕۆمیی بووە)، زمانێکی ئەعجەمییە، بەلاَم ئەم (قورئان)ە، زمانێکی ڕۆشنی ڕۆشنکەرەوەیە، یان: زمانێکی عەرەبیی ڕۆشنکەرەوەیە، کەواتە: ئەو شوێنەی کە ئەم قورئانەی لێوە هاتوە، خوا دەفەرموێ: ئێمەین ( إِنَّآ )، واتە: سەرچاوەی لێوەهاتنی قورئان خوایە، نە شەیتانەو، نە مرۆڤەو، نە ڕۆمییەو، نە نەصرانییەو، نە هیچ کەسەو، نە موحەممەد ﷺ خۆشیەتی .

٢) - ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ ﴾: ئێمە دامان بەزاندوە، واتە: لەو پایەی بەرز خۆمانەوە قورئانمان دابەزاندوە، كە لێرەدا چ مەبەست پێی مەقامی مەعنەویی هەرە بەرزو بێ وێنەی خوای پەروەردگار بێ، كە خوا بەدیهێنەرەو جگە لە خۆی هەمووی بەدیهێنراوە: عەرش، ئاسمانەكان، زەویی، فریشتە، جند، شەیتان، مرۆڤ و ژیانداران و، ڕووەك و، ماددەی بێ ژیان و، هەرچی دیكە هەیەو ئێمە نایزانین، هەمووی دروستكراوی خوایە .

كەواتە: لە ڕووی مەقامی مەعنەوییەوە: بەس خوا ﷻ پەیداركەرو بەدیهێنەرەو جگە لە خۆی هەرچی هەیە، هەمووی دروستكراوو بەدیهێنراوی خوایە، هەمووی بوونی پەیوەستە بە ویست و دەستەڵاتی خوای پەروەردگارەوە.

چ لەو ڕووەشەوە كە خوا ﷻ لە سەرووی دروستكراوەكانی خۆیەتی، وەك زانایان گوتوویانە: (إِنَّ اللَّهَ مُسْتَوٍ عَلَى عَرْشِهِ، بَائِنٌ عَنْ خَلْقِهِ)، خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی، (بەو شێوەیە كە بۆ خوا شایستەیە)و، جیایە لە دروستكراوەكانی و لە نێو دروستكراوەكانی دا نیە .

هەندێ خەڵك لەوانەی كە ناوێكی تایبەت بۆ خۆیان بەكاردێنن، وەك سەلەفیی، {كە لە ڕاستییدا هەموو مسوڵمانان دەبێ لەسەر ڕێبازی پێشینی چاكیان بن و، هیچ كەس بۆی نیە، بە ناو لە خۆنان، شوێن كەوتنی پێشینی چاك لەسەر خۆی قۆرخ بكات و، خەڵكی دیكەی لێ بێ بەش بكات، چونكە گرنگ ئەوەیە تۆ بە كردەوە لەسەر ڕێبازی پێشینی چاك بی، نەك بە ناو لە خۆنان، هەروەك گرنگ ئەوەیە كە تۆ بە كردەوە خۆت ساف و ساغ بكەیەوە، نەك بە ناو لە خۆنان، كە من ئەهلی تەصەووفم، من: صۆفییم، هەروەك گرنگ ئەوەیە كە تۆ بە كردەوە پابەندبی بە ئیسلامەوە، نەك بە ناو لە خۆنان من: ئیسلامییم، هەروەها لە پێش هەموو ئەوانەشدا گرنگ ئەوەیە كە تۆ بە كردەوە بۆ خوا ملكەچ بی، من: مسوڵمانم، نەك بەناو لە خۆنان، چونكە بە هیچ ناو لە خۆنانێك، ئینسان هیچ كەسب ناكاو هیچ زیاد ناكات، ئەگەر ئەو ناو لە خۆنانە، نێوەڕۆكێكی وەك خۆی لەگەڵدا نەبێ} .

بەڵێ هەندێك لەوانەی كە ناوی سەلەفیی بۆ خۆیان بەكاردێنن، لەو بابەتەدا بە هەڵەداچوون و كە دەڵێن: خوا لە ئاسمانە، وا دەزانن وەك چۆن مانگ و

خۆر لە ئاسمانن، خواش ئاوا لە ئاسمانە! واتە: ئاسمان دەوری خوای پەروەردگاری داوە !!

کە لە ڕاستییدا ئەوە بۆچوونێکی هەڵەیە، بەڵێ خوا لە ئاسمانە، وەك وێڕای قورئان، لە فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا ﷺ ئاماژەی پێکراوە، بۆ نموونە: کەنیزەکێکی کەڕو لاڵ، نەیانزانی داخۆ مسوڵمانە یان نا؟ پێغەمبەر ﷺ بە ئاماژە پێی فەرموو: (أين الله؟) خوا لە کوێیە؟ ئەویش ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد، فەرمووی: ئەوە مسوڵمانە[1].

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿١٦﴾﴾ الملك، واتە: ئایا دڵنیان لەوەی کە لە ئاسمانە، بەڵام دەبێ بزانین ئاسمان، یانی: (فوق) سەروو، یانی: خوا لە سەرووی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیەو، خوا لەسەر عەرش و بارەگای خۆیەتی بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیە، ئەگەرنا ئەگەر بڵێی: خوا پێویستی بە عەرشە، لەسەری بێ، ئەوە کوفرە، ئنجا کاتێك بووە نە عەرش بووە، نە ئاسمان بووە، نە ئاو بووە، نە هیچ شتێك بووە، هەموویان دروستکراوەکانی خوان، ئنجا ئەو کاتە خوا چۆن بووە، ئێستاش هەر وایە، کەواتە: لەسەر عەرش و بارەگا بوونی خوای پەروەردگار، سیفەتێکی خوایەو، سیفەتەکانی خواش وەك خوان، ئەویش: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ﴿١١﴾﴾ الشورى، هیچ شتێك وەك وێنەی وی نیە .

کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿أَنزَلْنَٰهُ﴾، هەر دوو مانایەکەی ڕاستن :

١- خوا لە سەرووی دروستکراوەکانی خۆیەتی .

٢- خوا ﷻ لە ڕووی مەعنەوییەوە بەدیهێنەرو پەروەردگارو بالادەستە، بەسەر هەموو دروستکراوەکانی خۆیدا، ئنجا لەو مەقام و پایە بەرزەوە، ئەم قورئانەی دابەزاندوە.

---

١) رواه مسلم، برقم (١٢٢٧) عن معاوية بن الحكم السلمي .

٣) - ﴿قُرۡءَٰنًا﴾: ئێمە ئێستا وادەزانین قورئان، یانی: (مُصْحَفْ)، ئەوەی كە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هێناویەتی، بەڵام لە ئەسڵی زمانی عەرەبییدا، قورئان یانی: (مقروء) خوێنراوە، (كتاب)یش، یانی: (مكتوب) نووسراوە، قورئانیش هەم خوێنراوەو هەم نووسراویشە، (قُرآناً أَي: كتاباً يُقْرَأُ مُنَظّماً على أسلوبٍ، مُعَدٍّ لأَنْ يُقْرَأَ بِاسْتِمْرَارٍ)، ﴿قُرۡءَٰنًا﴾، واتە: كتێبێكە بەڕێكیی دەخوێندرێتەوە، بە شێوازێك ئامادە كراوە كە بەردەوام بخوێندرێتەوە .

٤) - ﴿عَرَبِيًّا﴾، واتە: بە زمانی گەلی عەرەب، ئەوە مانایەكی، یاخود بە شێوەیەكە زۆر بە ڕوونیی مەبەستەكان دەگەیەنێ، چونكە: (أَعْرَبَ عَنْ ضَمِيرِهِ)، واتە: ئەوەی كە لە دەروونیی دابوو، ئاشكرای كرد، زمانی عەرەبیی، بۆیە پێی دەگوترێ: زمانی عەرەبیی، چونكە زمانێكە ڕۆشنە، مەبەستەكان زۆر بە ڕۆشنی دەگەیەنێ، هەڵبەتە بۆ گەلی عەرەب وایە، وەك گوتم: گەلی عەرەب غەیری خۆیان ناو ناوە (عَجَمْ)، لەبەر ئەوەی لە زمانیان حاڵی نەبوون .

٥) - ﴿لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾: بەڵكو بفامن، بەڵكو تێبگەن، بەڵكو ژیربن، بەڵكو شارەزابن، هەموویان دەگرێتەوە: (رجاءَ حصولِ العِلمِ لكم من لَفْظِهِ وَمَعناهُ)، واتە: بە ئومێدی ئەوەی كە زانیارییتان پێی پەیدابێ، هەم لە ڕووی بێژەكەیەوە، هەم لە ڕووی ماناكەیەوە، ﴿لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾، لێرەدا (مفعول بِهِ)یەكەی، ئایا چی دەفامن؟ نەیفەرمووە، تاكو: (تَعْقِلُون مَعْنَاهُ)، (تَعْقلُون لَفْظَهُ)، (تَعْقِلُونَ محتَوَاهُ)، (تَعْقِلُونَ غايته)، هەموویان بگرێتەوە، بۆ ئەوەی: نێوەڕۆكەكەی بفامن، بێژەكەی بفامن، مەبەستەكانی، ئامانجەكانی بفامن‌و تێبگەن.

یاخود ﴿تَعۡقِلُونَ﴾، لێرەدا (لازم)ە، واتە: بۆ ئەوەی هۆش‌و ژیریی‌و تێگەیشتنتان بۆ پەیدابێ[١].

---

١) چونكە (عَقَلَ يَعْقِلُ) هەم بە (المتَعدّي) دێ كە بەركار (مفعول) بخوازێ ، هەم بە (لازم) كە (مفعول)ی پێویست نەكات .

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَٰذَا الْقُرْآنَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ ﴿٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە چوار بڕگەدا:**

١) - ﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ ﴾، ئێمە بەسەر تۆیدا دەخوێنینەوە، بۆ تۆی دەگێڕینەوە، باشترین گێڕدراوە، (قَصَص)، واتە: گێڕدراوە، دەگوترێ: (قَصَّ الأَثَرَ إِذَا تَتَبَّعَ مَوَاقِعَ الأَقْدَامِ، لِيَتَعَرَّفَ مُنتَهى سَيْرِ صَاحِبِهَا)[1]، (قَصَّ الأَثَرَ)، ئەگەر بە دوای شوێن پێیەکانی کەسێك کەوت، تاکو بزانێ خاوەنەکەی تا کوێ ڕۆیشتوە؟ {وَمَصْدَرُهُ: القَصُّ بِالإِدْغَامِ وَالقَصَصُ بِالفَكِّ: ﴿ فَارْتَدَّا عَلَىٰ آثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ ﴾الكهف، وَذَلِكَ أَنَّ حِكَايَةَ أَخْبَارِ الماضِين تُشْبِهُ اتِّبَاعَ خُطَاهُم، (أَحْسَنَ القَصَص) إِمَّا مَفْعُول مُطْلَق مُبَيِّن لِنَوعِ فِعْلِه، وَإِمَّا أَنْ يَكُونَ القصص بمعنى المفعول، من إطلاق المصدر وإرادة (المفعول)، كالخلق بمعنى المخلوق، وقد يكون وزن (فَعَلْ) بمعنى المفعول، كالنَّبَأ والخَبَر، بمعنى المُنْبَأِ به، والمُخْبَرِ به}.

واتە: چاوگی (قَصَّ يَقُصُّ) بریتیە لە (قَصّ)، واتە: بە (دغْم)و، ئەگەر (دَغْم) نەکرێ و پێکەوە جۆش نەدرێن، دەبێتە: (قَصَص)، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَارْتَدَّا عَلَىٰ آثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾ ﴾الكهف، واتە: بە شوێن پێی خۆیاندا گەڕانەوە، چونکە گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێشووانیش هەروەك شوێنکەوتنی شوێن پێیەکانیانە، بۆیە ئەو وشەیەی بۆ بەکارهاتوە .

١) دیارە من ئەو نەقڵانە بە زۆریی لە: (التّحْرِير والتنوير)ی (محمد الطاهر بن عاشور) دێنم، ئەوە کە ئاماژە ناکەم بە سەرچاوەکەی، زۆر جار بۆ ئەوێ دەگەڕێمەوە، هەڵبەتە زۆر جار لە تەفسیرەکانی دیکەشەوە دێنم، ئنجا ئیکتیفام بەوە کردوە کە لە کۆتایی ئەم تەفسیرەدا لیستی سەرچاوەکان دێنم‌و، هەموو جارێ بە پێویستیی نازانم بڵێم: ئەمە لە فلان سەرچاوەوە هاتوە، بەڵام ئەگەر ڕاوبۆچوونێکی تایبەتی زانایەك هەبێ ئاماژەی پێدەکەم، بەڵام ئەوەی زۆربەیان گوتبیان، بە پێویستیی نازانم پاڵبدەمە لای یەکێکیان بە تایبەت .

﴿أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ﴾یش یانی، باشترین گێڕدراوە، وشەی (قَصَص)یش، یان (مَفْعُولٌ مطلق)ە، کە دەرخەری جۆری کردەوەکەیە، یاخود (قَصَص) بە مانای (مَفْعُول)ەو وەك چاوگ بەکارهێنراوە، بەڵام مەبەست پێی (مفعول)ە، وەك (خَلْق)، کە بە مانای (مخلوق) دێ، جاری واش هەیە، کێشی (فَعَلْ)، بە مانای (مفعول) دێ، وەك (نَبَأ)، بە مانای (مُنبَأُ بە)، هەواڵ پێدراوو، (خَبر) بە مانای (مُخْبربِهِ)، واتە: ئەوەی کە هەواڵی پێدراوەو گێڕدراوەتەوە، دێ .

٢) – کە دەفەرمووێ : ﴿أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ﴾، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: مەبەست پێی بەسەرهاتی یوسوفە عليه السلام.

بەڵام دەڵێم: بەڵێ بێگومان بەسەرهاتی یوسوف دەگرێتەوە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی تێکڕای بەسەرهاتەکانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و گەلەکانیانو بەسەرهاتەکانی دیکەشە، کە لە قورئاندا باسکراون، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ ﴿٣﴾﴾، بەهۆی ئەوەوە کە ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ ناردوە، باشترین بەسەرهاتت بۆ دەگێڕینەوە، نەیفەرمووە: (بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَـٰذِهِ السورَة)، چونکە لەم سوورەتەدا بەسەرهاتی یوسوف گێڕراوەتەوە، بەڵام لە هەموو قورئاندا، کۆی بەسەرهاتەکانی دیکە گێڕراونەوە .

شایانی باسە هەندێك لە زانایان بۆتە مشتو مڕیان: ئەگەر ئەم بەسەرهاتی یوسوف: ﴿أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ﴾، بێ، ئایا ئەوانی دیکە وانین؟! بەڵام هەرچەندە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، یاخود ئەگەر بینیبیشم ئێستا لە یادم نیە، بەڵام وا پێدەچێو بە بەڵگەی: ﴿بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ﴾، {بەهۆی ئەوەوە کە ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ سروش کردوە}، مەبەست لێرەدا کۆی بەسەرهاتەکانی قورئان بێ، چونکە قورئان وێڕای بەسەرهاتی یوسوف، بەسەرهاتی پێغەمبەرانی دیکەشی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) تێدان،

بەسەرهاتەكانی دیكەشی تێدان‌و هی غەیری پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

كەواتە: مەبەست كۆی بەسەرهاتەكانی قورئانەو، هەموویان باشترین بەسەرهاتی گێڕراوە (أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ)ن.

٣) - ﴿بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ﴾، یانی: بە هۆی ئەوەوە كە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ سروش كردوە، باشترین بەسەرهاتە گێڕدراوەكان، بۆ تۆ دەگێڕینەوە، كەواتە: بەسەرهاتەكانی قورئان هەموویان‌و لە هەموو ڕوویێكەوە باشترین گێڕراوەن .

٤) - ﴿وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ﴾، واتە: بە تەئكید تۆ لە پێش ئەودا (واتە: پێش سروش كرانی قورئان‌و پێش ئەوەی قورئانت بۆ بێ)، لە بێئاگایان بووی، لە بێئاگایان بووی لە چی؟ هەندێكیان گوتوویانە: واتە: دەربارەی بەسەرهاتی یوسوف، بەلاَم نا، ئەوەش دیسان چەمك‌و واتایەكەی فراوانترە، واتە: تۆ لە بێئاگایان بووی، لە هەموو ئەو ڕاستییانەی كە لە ڕێی قورئانەوە بە تۆ گەیشتوون، لە هەموو ئەو ڕاستییانەی كە لە ڕێی وەحییەوە نەبێ، نازانرێن .

(الغَفْلَة: إِنْتِفَاءُ العِلْمِ لِعَدَمِ تَوَجّه الذهْنِ إِلى المَعْلُومِ)، (غَفْلَة)، بریتیە لە نەبوونی زانیاریی بەهۆی ئەوەوە كە زەین ڕوو ناكاتە ئەو شتە كە زانراوە، یانی: لێ بێ ئاگابوون‌و لێ نەشارەزابوون .

لێرەدا خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ ڕادەگەیەنێ، كە پێشتر بێ ئاگابووە، لەو ڕاستییانەی كە لە ڕێی قورئانەوە بۆی دێن، جا چ بەسەرهاتی یوسوف ﵇، چ بەسەرهاتی پێغەمبەرانی دیكە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لە چەند شوێنان لە قورئاندا خوای پەروەردگار ئەوەی دووبارە كردۆتەوە، كە تۆ لەو كاتەدا لەوێ نەبووی، وەك دەفەرموێ :

١ / ﴿ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ ﴿٤٤﴾ ﴾ آل عمران.

٢/ ﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الْغَرْبِيِّ ﴿٤٤﴾ ﴾ القصص .

٣ / ﴿ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الطُّورِ ﴿٤٦﴾ ﴾ القصص .

٤ / ﴿ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوا أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ یوسف .

واتە: تۆ لەوێ نەبووی، لەو کاتەدا ئامادە نەبووی، ئەدی چۆنی زانی؟ خوا پێی ڕاگەیاندووەو خوای شارەزا بەرچاوی ڕۆشن کردۆتەوە، لە ڕێی ئەو پەیامە تایبەتییەی خۆیەوە .

**مەسەلەی چوارەم :** کە دەفەرموێ : ﴿ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ ﴿٤﴾ ﴾.

**ئەم ئایەتە موبارەکە کە ئایەتی چوارەمە، لە سێ بڕگەدا دەتوێژینەوە:**

**١) -** ﴿ إِذْ قَالَ يُوسُفُ ﴾، یادبکەوە کاتێك یوسوف گوتی: بە کێی گوت؟ ﴿ لِأَبِيهِ ﴾، بە بابی گوت، واتە: یوسوف عليه السلام شتێکی بە بابی گوت، کە ئێمە نازانین چییە! هەمیشە قورئان ئەو شێوازە بەکاردێنێ، کە تۆ چاوەڕێ بکەی ئەو هەواڵە چییە کە دێ؟ سەرنجت ڕادەکێشێ بۆ گوێگرتن، سەرەتا ئێمە نازانین داخۆ یوسوف چ هەواڵێك بە بابی ڕادەگەیەنێ ؟!

**٢) -** ﴿ يَا أَبَتِ ﴾، پێشتریش باسمان کرد، ئەم (تاء)ە، لە جێی (یاء)ە، واتە: (یَا أَبي)، دەڵێ: {التاء فِي (أَبَتِ) تَاءٌ خَاصّةٌ بِكَلِمةِ الأب وكَلِمة الأُم، في النداءُ خاصةً، على نية الإضافة إلى المتكلّم، فمفادها مَفادَ: يا أَبي}، ئەم (تاء)ە تایبەتە بە وشەی (أب) و (أم)ەوە، ﴿ يَا أَبَتِ ﴾، لە کاتی بانگ کردندا، کە پاڵ

دەدرێتە لای (یاء)ی قسەکەر، وەك بڵێی: (یا أبي)، ئەی بابە گیان! بە هەمان شێوە ﴿يَٰٓأَبَتِ﴾، ئەم (تاء)ە، لە جێی (یاء) دانیشتوە، ئنجا زۆربەی قورئان خوێنەکان، لە حەوتەکانو دەیەکان بە: ﴿يَٰٓأَبَتِ﴾، خوێندوویانەتەوە، بەڵام (ابن جعفر) و (ابن عامر)، بە (یـأَبَتَ)، کە دیارە ئەو قیرائەتەشی هاتوە، هەردووکیان بە مانای ئەی بابە گیان ! دێن .

**٣)** – ئنجا دوای ئەوەی کە بابی دەدوێنێو ئاگاداری دەکاتەوە، هەواڵی پێدەدات: ﴿إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ﴾، بە دڵنیاییەوە من یازدە (١١) ئەستێرەو خۆرو مانگم بینین، دیتمن بۆ من کڕنووشیان برد بوو .

پێشتر باسمان کرد، کە ئەو یازدە ئەستێرەیە مەبەست پێیان یازدە برایەکاننی :

(١) (بنامین)ی برای بە پێی ئەوەی کە لە تەورات، لە پەیمانی کۆندا هاتوە، ئەگەرنا لە هیچ دەقێکی قورئانو سوننەتدا ناوی هیچ کام لە برایەکانی یوسوف نەهاتوە.

(٢) دە (١٠) برایەکەی دیکەی، کە لە جگە لە دایکی خۆینی، مەبەستیش لە خۆرو مانگ: دایكو بابنی .

ئنجا کە دەڵێ: ﴿رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ﴾، بینیمن کڕنووشیان بۆ برد بووم، واتە: سڵاویان لێکردم بە سڵاو لێکردنێك کە لە حوکمڕانان دەکرێ، بە سڵاو کردنێك کە زۆر ڕێز لێگرتنو حورمەت لێگرتن دەگەیەنێ، نەك سەریان خستبێتە سەر زەوی، کە بە تەئکید نە لە قورئاندا (سجود)، تەنیا ئەو مانایەی هەیەو، نە لە زمانی عەرەبییدا، ئنجا (سجدة)ی خواپەرستییش، بێجگە لە خوا ﷻ لە بۆ کەسی دیکە ڕەوانیە، ببردرێ .

زانایان دەڵێن: بۆچی یوسوف ﷵ گوتوویەتی: ﴿رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِى سَٰجِدِينَ﴾، ﴿رَأَيْتُهُمْ﴾، ناڵێ: (رَأَيْتُها)، دوایی دەڵێ: ﴿لِى سَٰجِدِينَ﴾، ناڵێ: (ساجِدة)، واتە: بۆچی بە (جمع المذكر السّالم)، هێناونیو ڕاناوی كۆی بۆ بەكارهێناون، كە (جمع المذكر السّالم)، بۆ خاوەن هەستو شعوورو عاقڵ مەندان بەكاردێ؟! زانایان دەڵێن: لەبەر ئەوەی كڕنووش بردن (سجود) كاری عاقڵانو خاوەن شعوورو هەستانە، بۆیە ئەو ڕاناوەی بۆ بەكارهێناون .

ئنجا ئەو خەونەی یوسوف ﷵ وەك پێشتر باسمان كرد، وا دیارە لە تەمەنی منداڵییدا بینیویەتی، لە تەمەنی (١٠-١٢)ساڵیی دا، كە دوای حاڵو بەسەرهاتو ڕووداوانێكی زۆر، ئەوەی كە لێرە لە ئایەتی چوارەمدا دەیفەرموێ، لە ئایەتی ژمارە سەد (١٠٠)دا، سەرەنجامیو هاتنە دی ئەو خەونە باس دەكات: دەفەرموێ: ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّوا۟ لَهُۥ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّى حَقًّا ۖ ﴿١٠٠﴾﴾، واتە: بابو دایكی بردە سەر تەختەكە (تەختی حوكمڕانیی، ئەو تەختو بارەگایەی كە لەسەری دادەنیشت، دیارە كاتی خۆی عادەتیان وابوو، چونكە ئێستا خەڵك لەسەر كورسی دادەنیشێ، بەڵام وا پێدەچێ ئەو عەرشە پانتاییەكەی زۆر بووبێ، جێی دایكو بابو خەڵكی دیكەشی لەسەر بووبێتەوە)، ئنجا هەموویان كڕنووشیان بۆ برد، واتە: بۆی چەمینەوە، یاخود سڵاویكیان لێ كرد كە ملكەچییو ڕێز لێگرتن، دەگەیەنێو گوتی: ئەی بابە! ئەمە سەرەنجامی خەونەكەمە كە پێشتر بینیبووم، ئێستا پەروەردگارم هێنایە دی .

**مەسەلەی پێنجەم:** كە دەفەرموێ : ﴿قَالَ يَٰبُنَىَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا۟ لَكَ كَيْدًا ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە لە چوار بڕگەدا:**

دوای ئەوەی كە یوسوف خەونەكەی بۆ بابی دەگێڕێتەوە، چۆنی بینیوە، ئاوا، ئەویش ئامۆژگاریی دەكات :

**١) –** ﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ﴾، (یەعقووب ﷺ، بابی یوسوف)، گوتی: ئەی ڕۆڵە گیان! بۆچی بچووکی کردۆتەوەو نەیفەرمووە: (يَا ابْنِي)، ئەی کوڕەکەم؟ چونکە: ﴿يَٰبُنَيَّ﴾، یانی: کوڕیژگەکەم، کوڕە بچووکەکەم، زانایان گوتوویانە: (التَّصْغِير كِنَايَةٍ عَنْ تحبيبٍ وَشَفَقَةٍ، نـزِّل الكَبِير مَنْزِلَة الصغِير، لأَنَّ شَأْنَ الصَّغِيرِ أَنْ يُحَبَّ وَيُشْفَقَ عَلَيْهِ)، لەبەر ئەوەی بچووك کردنەوە هێمایە بۆ خۆشویستن‌و سۆزو بەزەیی، جاری وایە مرۆڤی گەورەش دادەبەزێنرێ، بۆ پلەی بچووك، چونکە منداڵی بچووك عادەت وایە کە خۆش بویسترێ‌و سۆزو بەزەیی زیاتری لەگەڵدا بنوێنرێ .

واتە: ئەی ئەو کوڕەی کە زۆرم خۆش دەوێ! وەك چۆن منداڵێکی بچووك زۆر خۆشەویستەو مرۆڤ دەیخاتە ژێر چاودێریی خۆیەوەو ئاگای لێ دەبێ .

**٢) –** ﴿لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ﴾، خەونەکەت بۆ برایەکانت مەگێڕەوە، دەڵێ: (القَصُّ حِكَايَةُ الرُّؤْيَا)، (قَصٌّ)، گێڕانەوەی خەونە، (الرُّؤْيَا: رُؤْيَة الصور فِي النَّوْمِ فَرَّقُوا بَيْنَهَا وَبَيْنَ رُؤْيَةِ اليَقَظَةِ باختِلافِ عَلامَتي التأْنيثِ)، (رُؤْيَا) بریتییە لەوە کە ئینسان لە خەوندا دەیبینێ، (کاتێك کە دەنوێ، دەخەوێ هەندێك شت دەبینێ، ئەو وێنانەی کە دەیانبینێ، ئەوە پێی دەگوترێ: رؤيا)، لە زمانی عەرەبییدا (رؤيا)، لەگەڵ (رؤية)، کە یەکیان بە (أَلف)ەو ئەوی دیکەیان بە (تاء التأنيث)ە، جیاوازییان خستۆتە نێوانیان، بەوە کە ئەوەی لە کاتی بێدارییدا دەبینرێ، پێی دەگوترێ: (رؤية)، واتە: بینین‌و، ئەوەی لە کاتی خەوندا دەبینرێ، پێی دەگوترێ: (رؤيا)، کە دیارە یەکیان نیشانەی (تأنيث)ەکەی بە (ألف)ە، ئەوی دیکەشیان بە (تاء)ە، هەر بۆ ئەوەی کە جیاوازییان پێبکەن .

**٣) –** بۆچی یەعقووب ئامۆژگاریی یوسوفی کوڕی دەکات کە خەونەکەی بۆ برایەکانی نەگێڕێتەوە؟ ﴿فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًا﴾، ئەگەرنا پیلانێکت لە دژ

دەگێڕن، (الكَيْدُ: إِخْفاءُ عَمَلٍ يَضرُّ المَكِيدَ)، (كَيدْ) بریتیە لەوەی کارێك کە زیان بەو کەسە دەگەیەنێ کە کارەکەی لە دژ دەکرێ، بشارڕێتەوە .

وشەی ﴿ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيْدًا ﴾، ئەو (تنوین)ە، کە لەسەر ﴿ كَيْدًا ﴾ە، بۆ مەزن کردنو زەبەلاح کردنە، واتە: فێڵو پیلانێکی گەورەت لە دژ ساز دەکەن .

یەکێ بۆی هەیە بڵێ: باشە یەعقووب عليه السلام ئەوەی چۆن زانی ؟

دیارە کە گومانەکەی هاتە دیو برایەکانی یوسوف پیلانیان لە دژی یوسوف گێڕا، بەڵام چۆنی زانی ؟

دەڵێین: ئەگەر باب چ بڕ فیڕاسەتو بەرچاو ڕوونیی هەبێ، کوڕەکانی خۆی، منداڵەکانی خۆی دەناسێ، شارەزایان دەبێ، هەڵسوکەوتیان، قەناعەتیان بیرو بۆچوونیان، چییەو چۆنە؟ لەوەوە هەڵیهێنجاوە کە: ئەو برایانەی ئەگەر بێتو بزانن یوسوف خەونێکی وای بینیوەو، کەمو زۆر لە مانای خەونەکەشی تێدەگەن، کە چی دەگەیەنێ! کە یوسوف دەکەوێتە پێگەو پایەیەکەوە: هەم بابو دایکی ڕێزی تایبەتی لێ دەگرن، هەم یازدە (١١) برایەکەی، ئەوە دیارە ئێرەیی پێ دەبەن، ئەو حەسوودیی پێ بردنەش پاڵیان پێوە دەنێ، کە فێڵو پێلانێکی لە دژ بگێڕن، بۆ ئەوەی کە سەرنگوومی بکەنو سەری بە فەتارەت بدەنو، نەگاتە ئەو پایەو مەقامە، کە چاوەڕێ دەکرێ بیگاتێ .

دیارە زانیویەتی کوڕەکانی چۆنن؟ بۆیە ئاوا ئامۆژگاریی یوسوفی کوڕی دەکات، ئنجا ئەوەش کە شێمانەو ئەگەری بۆ داناوە، بەو شێوەیە هاتۆتە دی .

٤) - ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾، ئەمە دەگونجێ هەر قسەی یەعقوو عليه السلام بێ: بێگومان شەیتان بۆ مرۆڤ دوژمنێکی ئاشکرایە، واتە: شەیتان لە بۆسە دایە بۆ زیان گەیاندن، ئەو خەونەی یوسوفیش عليه السلام بیانووو پاساوێکە بۆ شەیتان کە لە ڕێی ئەوەوە خوتخوتەو خەیاڵو دنەدانی خراپ بۆ برایەکانی بکاتو پێیان بڵێ: تەماشا بکەن! ئەو برایەتان سەرەنجام ئاوای لێ دێ، ئێستا ڕێی لێ بگرن، با وای لێ نەیەتو پیلانی لە دژ بگێڕن .

دیارە قورئان نەیگێڕاوەتەوە کە ئەوە چۆن بووەو چۆن نەبووە؟ گرنگ ئەوەیە دەگونجێ ئەمە قسەی یەعقووب عليه السلام بێ، کە زیاتر وا پێدەچێ، دەشگونجێ یەکسەر خوای پەروەردگار وای فەرمووبێ: بێگومان شەیتان بۆ مرۆڤ دوژمنێکی ئاشکرایەو ئەو هەلو دەرفەتانەی کە بۆی هەڵدەکەون، بەسەریاندا باز نادات، ئنجا ئەگەر بێتو ئەی یوسوف! ئەو خەونەی تۆ بە برایەکانت بگاتەوە، شەیتان وەك دەرفەتێك دەیقۆزێتەوە، بۆ برایەکانت، کە بیکاتە مایەی ڕق هەڵساندنیانو، بیکاتە مایەی جووڵاندنی هەستی بوغزو حەسوودییان بەرانبەرت، سەرەنجام ئەو هەستە خراپە پاڵیان پێوە دەنێ، کە پیلانت لە دژ بگێڕن، پیلانێکی گەورەت بۆ ساز بکەن، فێڵێکت لێ بکەن، بۆ ئەوەی نەگەیە ئەو پێگەیەی بۆت چاوەڕوان دەکرێ، ئەو ئایندە ڕۆشنە .

لێرەدا قورئان تەنیا ئەوەندەی فەرمووە، بەڵام دیارە لە ئیسرائیلیاتدا، ئەوەی لە کتێبە پێشووەکانەوە نەقڵ دەکرێ، شت زۆر باسکراوە، بەڵام ئێمە مەگەر ئەوەی لەگەڵ ئایەتەکاندا تێکنەگیرێو، پەکمان لەسەری بکەوێ، بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر چەمکی ئایەتەکان، ئەگەرنا نایهێنین، بە تایبەتی هەندێك شت هەیە، کە هەر بە ئاشکرا لەگەڵ عەقڵو مەنتیقو، لەگەڵ قورئانو لەگەڵ واقیعیشدا تێکدەگیرێ، ئەوە هەر ئیهمالی دەکەین، چونکە زۆر لە تەفسیرەکان لاپەڕەی زۆریان ڕەش کردوونەوە، بە زۆر لەو حیکایەتانەی کە دوایی ئاماژەی بە هەندێکیان دەکەین .

**مەسەلەی شەشەمو کۆتایی :** کە لە ئایەتی شەشەم وەردەگیرێ :

یەعقووب هەر لەسەر ئامۆژگاریی کردنو دڵخۆش کردنی یوسوف بەردەوام دەبێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَعَلَىٰ آلِ يَعْقُوبَ كَمَا أَتَمَّهَا عَلَىٰ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ  ﴾.

**لە پێنج بڕگەدا ئەم ئایەتە موبارەکە، دەتوێژینەوە:**

**١) -** ﴿ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە پەروەردگارت تۆ هەڵدەبژێرێ، واتە: وەك چۆن تۆی هەڵبژاردوە، لەو تەمەنەی نابالغیی و بچووکییەدا، بەرچاو ڕوونییەکت بداتێ، دەربارەی ئاییندەی گەش و ڕوونی خۆت، هەر بەو شێوەیەش پەروەردگارت تۆ هەڵدەبژێرێ، بۆ ئەوەی کە لە داهاتوودا ببی بە مرۆڤێکی شایستە، ببی بە کەسێك کە شایستەی ئەوەبی پەیامی خوا بگەیەنی، ببی بە یەکێك لە پێغەمبەران .

(الإجتباءُ) دەگوترێ: (جَبَيْتُ الماءَ في الحَوْضِ: جَمَعْتُهُ)، ئاوەکەم لە حەوزەکەدا، یان لە گۆمەکەدا کۆکردەوە، (جباية)، بریتیە لە کۆکردنەوەی سەرانەو پیتاك، هەروەها (جابية)، بە حەوزێکی گەورە دەگوترێ، کە ئاوی زۆری تێدا کۆبکرێتەوە، (إجتباء)، بریتیە لە کۆکردنەوەو هەڵبژاردنی شتێك .

ئنجا یەعقووبیش - وەك پێشتریش ئاماژەم پێکرد - دیارە تەعبیری خەونی زانیوە، یاخود خوا بە وەحیی و ئیلهامێکی تایبەت پێی گوتوە: ئەو خەونەی یوسوف ﷺ چی دەگەیەنێ .

**٢) -** ﴿ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ ﴾، هەروەها لە مانا لێکدانەوەی خەونانت فێر دەکات، وشەی (أحاديث) کۆی (حديث)ە، بە مانای قسە دێ، بەڵام بە پێی سیاقی ئایەتەکە، لێرەدا دەزانین کە مەبەست لە (أحاديث)، واتە: خەونەکان ئەوەی کە خەڵك لە کاتی خەوتندا دەیبینێ و دەیبیستێ، ﴿تَأۡوِيلِ﴾یش بە مانای گێڕانەوەی شتێك بۆ ئەسڵ و بنك و ڕیشەی خۆی دێ.

بەڵام لێرەدا دەزانین بە مانای مانا لێکدانەوەو تەعبیرکردنی خەون دێ، بەپێی سیاق دەزانرێ، دەڵێ: (التَّأويلُ: إرْجَاع الشيءِ على حقيقته ودليله)، (تأويل)، بریتیە لە گێڕانەوەی شتێك بۆ حەقیقەتی خۆی، بۆ سەرەنجامەکەی و بۆ بەڵگەکەی، کە ئایا چی دەگەیەنێ و مەبەست پێی چییە؟ (والأَحَادِيث جَمْعُ

حَدِيث: الخَبَرُ المتَحَدَّثُ بِهِ)، (أحاديث)، - وەك گوتم - كۆی (حدیث)ە، واتە: ئەو قسەیەی كە باسكراوەو هەواڵی لەبارەوە دراوە، ئنجا: (تأويل)، هەرچەندە بە مانای گێڕانەوەی شتێك بۆ ئەسڵەكەی خۆی دێ، بەڵام لێرەدا بە مانای لێكدانەوەی خەون (تعبير)دێ.

٣) - ﴿وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ﴾، هەروەها چاكەی خۆی لەسەر تۆو، لەسەر بنەماڵەی یەعقووبو لەسەر دەوروبەرو نیزیكانی یەعقووب تەواو دەكات، (إتمام النعمة: هو إعطاءُ أفضلِ النعم وهي النبوةُ)، (إتمام النعْمَة)، تەواو كردنی چاكە بریتییە لەوەی چاكترین چاكە لەگەڵ ئینساندا بكرێ، چاكترین چاكەش بە ڕەهایی بریتییە لە پێغەمبەرایەتیی، چونكە پێغەمبەرایەتیی بەرزترین پلەیە كە بە مرۆڤەكان دراوە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ۝٥٩﴾ النمل، واتە: بڵێ: ستایش بۆ خواو سەلام لەسەر ئەو بەندانەی هەڵیبژاردوون، یان دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ۝٧٥﴾ الحج، واتە: خوا لە فریشتەكانو لە مرۆڤەكان نوێنەرانێك هەڵدەبژێرێ ...

چونكە هیچ چاكەو نیعمەتێك لە پێگەو پلەی پێغەمبەرایەتیی، بەرزترو چاكتر لە بوون (وجود)دا نییەو، نیعمەتی موتڵەقو ڕەها هەر ئەوە، هەر لەوەشەوە دەزانین لێرەدا كە دەڵێ: نیعمەتو چاكەی خۆی لەسەر تۆو لەسەر بنەماڵەی یەعقووبیش، تەواو دەكات، مەبەست پێ بەخشرانی پلەی پێغەمبەرایەتییە بە یوسوف ؑ.

وشەی ﴿ءَالِ يَعْقُوبَ﴾یش، چونكە پێشتر باسمان كرد كە ﴿ءَالِ﴾، بریتییە لە كەسانێك كە تایبەتن بە كەسێكەوە، چ لە ڕووی خزمایەتییەوە، چ لە ڕووی شوێنكەوتنەوە، ﴿ءَالِ يَعْقُوبَ﴾یش، مەبەست پێی كوڕانو دەوروبەری یەعقووبن، چونكە ئەو پلەی پێغەمبەرایەتیی كە بە یوسوف دەدرێ، مایەی

سەربەرزیی دنیاو قیامەتە، هەم بۆ بابیشی، هەم بۆ برایەکانیشیو، بۆ دایکی بۆ خزمو کەسو نزیکانیشی .

**٤) -** ﴿كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ مِن قَبۡلُ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ﴾، وەك چۆن ئەو چاكەیەی پێشتر تەواو كرد لەسەر هەردوو بابت: ئیبراهیم و ئیسحاق، واتە: بابو باپیرت (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ئەوانیش پلەی پێغەمبەرایەتییان پێبەخشراو ئەو نیعمەتە ڕەهایەیان پێدرا، ئنجا وەك چۆن بەوانی داوە، بە تۆشی دەدا .

**٥) -** ﴿إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾، بێگومان پەروەردگاری تۆ زانای كارزانە .

زانایە، دەزانێ چۆن كارەكانی دەكات، كارزانیشە دەزانێ چۆنیان ئەنجام دەدات .

ئنجا لێرەدا هیچ گومانی تێدا نیە، كە دەبێ خوای پەروەردگار تەواو یەعقووبی دڵنیا كردبێتەوە، كە خەونەكەی یوسوف چی دەگەیەنێ؟ بۆیە دێنێ لەبەر ڕۆشنایی خەونەكەیداو، بە دەم تەعبیركردنی خەونەكەیەوە، موژدەی پێدەداو دڵی خۆش دەكات، ئەوەش حیكمەتێكی گەورەی یەعقووب ﷺ دەردەخات، چونكە دەبێ یەعقووب پێشبینیی ئەوەی كردبێ، كە دوایی هەرچۆنێك بێ، ئەو خەونەو تەعبیرەكەی دەگاتەوە بە برایەكانیو یوسوف تووشی تەنگو چەڵەمە دێ، بۆیە لە سەرەتاوە بەرچاوی یوسوفی ڕۆشن كردۆتەوە، چونكە ئینسان ئەگەر ئایندەی ڕوون بێ، سەرەتای تاریكو لێڵ، ناڕەحەتی ناكاتو، زیاتر خۆڕاگر دەبێ، مادام ئاسۆی ڕوون دەبینێ، بۆیە لە سەرەتاوە یەعقووب ئاسۆیەكی ڕوون دەخاتە بەرچاوی یوسوفی كوڕی، تاكو ئەو ئاستەنگو لێڵاییانەی دێنە ڕێی، پەكی نەخەنو، تەماشای ئاسۆی ڕوون بكاتو، لە نێو بازنەی ئەو گرفتە تاریكو لێڵانەدا، كە دێنە پێشی چاوی، نەژیەت، بەڵكو بەرز بڕوانێو دوورتر ببینێ .

# کورتە باسێک لەبارەی خەونەوە

بە گشتی لە شەش تەوەردا دەربارەی خەون قسە دەکەین :

١ – پێناسەی خەون.

٢ – جۆرەکانی خەون.

٣ – حەقیقەت‌و ڕەوایی خەون، لە ڕووی واقیع‌و شەریعەتەوە.

٤ – بەرهەمی خەون، بە هۆی خەونەوە چیمان دەست دەکەوێ ؟

٥ – چۆن مامەڵە لەگەڵ خەوندا بکەین؟

٦ – شەش ئاگاداریی گرنگ لە بارەی خەونەوە.

## ١} پێناسەی خەون :

خەون دیاردەیەكی مرۆییەو، دیاردەیەكی جیهانییشە، واتە: دیاردەیەكە لە ژیانی هەموو مرۆڤێكدا كەم‌و زۆر بینراوەو دەبینرێ، گشتگیریشە بۆ هەموو مرۆڤ لەسەر ئاستی مرۆڤایەتیی لە ڕابردوواو ئێستاش‌و، لە هەموو گۆشەو كەنارەكانی زەمیندا، ئنجا وەك دوایی پێی دەگەین، لە ڕاستییدا خەون ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە ڕووحی ئینسانەوە هەیە، پەیوەندیی بە دیوی پەنهان‌و شێردراوەی مرۆڤەوە هەیە، بۆیە تا ڕاددەیەكی زۆر وەك مەتەڵێك، وەك ڕەمزو هێمایەك‌و شتێكی پەنهان، هەمیشە جێگای مشت‌و مڕ بووەو، بەو شێوە بووەو، هەر بەو شێوەیەش دەمێنێتەوە .

پاشان لە كەسێكەوە بۆ كەسێك، بەڵكو لە كەسێكیشدا لە حاڵەتێكەوە بۆ حاڵەتێك، دەگۆڕێ، ئەوە نیە كە خەڵك هەموو بە یەك شێوە خەون ببینن، ئەوەش نیە كە مرۆڤ خۆیشی هەموو خەونەكانی وەك یەك بن، واتە: هەر مرۆڤێكیش خەونی جۆراو جۆر دەبینێ، لە حاڵەتی جۆراو جۆردا .

هەروەها مرۆڤەكانیش بە پێی ئامادەیی ڕووحیی خۆیان‌و، بە پێی باری سروشتی دەروونیی‌و دیوی پەنهانی خۆیان، خەون دەبینن، ڕەنگە هەبێ خەونەكانی زیاتر ڕاست بن‌و، هەبێ كە خەونی ڕاست كەمتر ببینێ، وەك دوایی باسی دەكەین، ئەوە هەمووی پەیوەندیی بە جۆرو چۆنیەتیی ڕووح‌و، ئامادەیی ڕووحی مرۆڤەكانەوە هەیە.

ئنجا دوای ئەوەی گەڕام بۆ پەیدا كردنی پێناسەیەك بۆ خەون، پێم وایە باشترین پێناسە ئەوەیە كە (محمد الطاهر بن عاشور)، لە تەفسیرەكەی خۆیدا[١] هێناویەتی، كە ئەویش لە (إبن سینا)وە نەقڵ دەكات، لە كتێبەكەی بە ناوی (الإشارات)، (إبن سینا)ش پزیشك‌و فەیلەسووف‌و زانایەكی گەورە بووە، (محمد الطاهر بن عاشور)یش، وەك پشتگیریی كردن‌و وەك پێ ڕازی بوون، ئەو پێناسەیە

١) التحرير والتنوير، ج ١٢، ص٢١٠.

لە (إبن سینا)ەوە نەقڵ دەكات، ئنجا منیش ئەو پێناسەیەی (ابن سینا) بە ڕاست دەزانم، (إبن سینا)، دەڵێ :

(إنَّ النفس الناطقة وَهِي المُعَبَّرُ عَنْهَا بالروح، هي من الجواهر المجرّدة التي مَقرُّها العالم العلوي، فهي قابلةٌ لاكتشاف الكائنات، على تفاوتٍ فِي هذا القبول، وَأَنَّهَا تُودَعُ في جسم الجنين عند اكتمال طور المضغة، وأنّ للنفس الناطقة آثاراً من الإنكشافات إذا ظهرت، فقد ينتقش بعضها بمدارك صاحب النفس فِي لوح حسِّهِ المشترك، وقد يصرفه عن الإنتقاش شاغلان :

أحدهما : حِسّيّ خارجيّ.

والآخر: باطنيّ عقليّ أو وهميّ.

وقوَى النفس متجاذبة متنازعة، فإذا اشتدّ بعضُها ضَعُفَ البعضُ الآخر، كما إذا هاج الغَضَبُ، ضَعُفَتِ الشهوةُ، فكذلك إنْ تَجَرّدَ الحِسُّ الباطِنُ للعمل، شُغِلَ عن الحسّ الظاهر، والنوم شاغل للحسّ، فإذا قلّت شواغِلُ الحواس الظاهرة، فقد تتخلّص النفس عن شغل مُخَيَّلاتها، فتطلّع على أمورٍ مُغَيَّبة، فتكونُ المنامات الصادقة).

ڕەنگە (محمد الطاهر بن عاشور) تۆزێك تەعبیرو دەربڕینەكەی ئیبن‌و سینای دەستكاریی كردبێ، وەك لە تەفسیرەكەی دا ئاماژەی پێدەكات، بەڵام نێوەڕۆكەكەی پاراستوە .

دەڵێ: نەفسی گۆیا (النفس الناطقة)، (ئەوە زاراوەیەك بووە بەكاریان هێناوە بۆ ڕووح)، كە بە ڕووح تەعبیری لێكراوە، لەو دروست كراوە سەروو مادديیانەیە كە شوێنەكەی جیهانی سەرەوەیە، (واتە: جیهانی سەرووی مادديی)، ئەو نەفسە شایستەی ئەوەیە كە پەی ببات بە دروستكراوەكان، بە جیاوازیی ئەو شایستەییە لە كەسێكەوە بۆ كەسێك، ئەو ڕووحەش لە جەستەی كۆرپەلەدا دادەنرێ لە قۆناغی زارجوو (مضغة)دا، {واتە: ئەو كاتەی كۆرپەلە بە قەد گۆشتێكی لێ دێ، هێندەی پارووییەك‌و زار جوویەك}، كۆرپەلە لەو كاتەدا گیانی بە بەردا دەكرێ {وەك ئایەتەكەی سووڕەتی (المؤمنون)، ئاماژەی پێدەكات، ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ﴿١٤﴾ ﴾، كە زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەوە كە دەفەرموێ: كردمان بە دروست كراوێكی دیكە

مەبەست پێی ڕووح بە بەردا كرانە}، وە نەفسی گۆیا، (ڕووح)، چەند شوێنەوارێكی هەن لە پەی پێ بردنەكاندا، جاری وایە هەندێك لەو شتانە لەسەر هەستی هاوبەش (الحِسُّ المشترك)ی دەنەخشێن، {هەستی هاوبەش زاراوەیەك بووە كاتی خۆی زانایانی دروونناس كە لە دیوی پەنهانی مرۆڤیان كۆڵیوەتەوە، بەكاریان هێناوە، كە مەبەست پێی: دیوی پەنهانو نابەرهەستی مرۆڤە}، بە زۆریی وایە كە دوو شت، ڕێگا دەگرن لەوەی كە مرۆڤ لە ڕێی ڕووحەوە، كە عەقڵ بەكاردێنێ، پەی بە شتەكان بەرێ:

یەكەمیان: شتێكی دەرەكیی بەرهەستە، ئەویش ئەوەیە كە ئینسان هەستەكانی سەرقاڵبن .

دووەمیشیان: شتێكی دەروونیی عەقڵیی، یاخود وەهمییە .

هێزەكانی نەفسیش لە نێوان خۆیاندا جۆرێك لە پەلكێش كردنو ناكۆكییان هەیە، ئەگەر یەكێكیان بە هێز بوو، ئەوەی دیكەیان بێهێز دەبێ، بۆ وێنە: ئینسان كاتێك كە ڕقی هەڵدەستێو تووڕەیی دەجووڵێ: ئارەزووی كەم دەبێتەوە، (ئەوە شتێكی ئاشكرایە)، هەروەها كاتێك كە هەستی نێوەوە یەكلا دەبێتەوە بۆ ئەوەی كارێك بكاتو، سەرقاڵ نابێ بە هەستە دەرەكییەكانەوە، كە خەو مایەی سەرقاڵ كردنی هەستە دەرەكییەكانە {واتە: لە كاتی خەودا ئینسان چاوی نابینێ، گوێی نابیستێ، قسە ناكات، شت ناخوات، تا كۆتایی}، ئنجا دەڵێ: كاتێك كە سەرقاڵكەرەكانی هەستە ڕواڵەتییەكان، كەم دەبنەوە، لە كاتی خەودا، لەو كاتەدا ڕووح دەربازی دەبێ، لەوەی كە سەرقاڵ بێ بە خەیاڵو وەهمو شتە ڕواڵەتییەكانەوە، لەو حاڵەتەدا ڕووح پەی بە هەندێ شتی پەنهان دەباتو، لە ئەنجامی ئەوەدا خەونی ڕاست دێنە دی .

دوایی دەڵێ : خەونی ڕاست حاڵەتێكە كە خوا بە هەندێك لە بەندە هەڵبژاردەكانی خۆی، دەداتو، بەو هۆیەوە ڕێزیان لێدەگرێ، ئەوانەی كە نەفسیان پاك بۆتەوەو، دیارە ئینسان تاكو دەروونەكەی پاكتر بێ، لە شیركو كوفرو نیفاقو لە سیفەتە خراپەكان بژاری كردبێو، ڕازابێتەوە بە ئیمانو خوا بە یەكگرتنو تەقواو سیفەتە بەرزەكان، ئەو جۆرە كەسانە ڕووحەكەیان پەیوەست دەبێ بە هەندێك لەو شتانەوە، كە زانیاریی خوا پێیانەوە پەیوەستەو، هەندێك لەو شتانەی

کە ویستی خوا دەسەلاتی خوا پێیانەوە پەیوەستەو، فەرمانی هێنانەدی خوا، پێیانەوە پەیوەستە، ئیدی لە ئەنجامی ئەوەدا، هەندێك شتی بۆ دەدۆزرێتەوەو، هەندێك شتیشی بۆ ڕوون دەبنەوە، چ لە ڕووی کاتەوە: پێش ئەوەی ڕوو بدەن کە پەنهانن، ئەو هەندێ لە شتانەی بۆ ئاشکرا دەبن، یاخود لە ڕووی شوێنەوە: پێش ئەوەی خەڵکی دیکە بە شێوەی ئاسایی ئەو شتانە بزانێ، ئەو پێیان دەزانێ .

منیش دەڵێم: بە کورتیی: خەون بینین کاری ڕووحەو، لە کاتی خەوتندا ڕووح، لە سۆنگەی ئەوەوە کە سەرقاڵ نابێ بە هەستەکانەوەو سەرقاڵ نابێ بە کارە ڕواڵەتییەکانەوەو، بە جێبەجێ کردنی داخوازییە غەریزەییەکانی جەستەوە، لەو حاڵەتەدا ڕووح دەستی کراوەتر دەبێو، ئامادەیی زیاتر دەبێ بۆ وەرگرتنی زانیاریی جۆراو جۆر، بە شێوەیەك کە ئێمە نازانین چۆنە؟ وەك خوای پەروەردگاریش ئاماژە بەو ڕاستییە دەکات، کە لە کاتی خەوتندا، ڕووح حاڵەتێکی دیکەی جیا لە حاڵەتی بێداریی بۆ دروست دەبێ، وەك لە ئایەتی (٤٢)ی سوورەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾.

ئەم ئایەتە زۆر زۆر جێی سەرنجە، بۆ ئەو بابەتەی ئێمە، هەڵبەتە هەموو ئایەتەکان جێی سەرنجن، هەر کامیان بۆ ئەو بابەتەی کە لێی دەدوێ.

واتە: خوا ڕووحەکان وەردەگرێ لە کاتی مردندیانداو، ئەوەی نەمردبێ لە کاتی خەوتنیاندا، ئنجا ئەوەی کە مردنی بۆ بڕیار دابێ، دەیهێڵێتەوە، ئەوەی دیکەش دەنێرێتەوە تاکو کاتێکی دیارییکراو، بێگومان لەو دیاردەیەدا، نیشانەی زۆر هەن، بۆ کۆمەڵێك کە بیر بکەنەوە .

کەواتە: خوا ﷻ زۆر بە ڕاشکاویی دەفەرموێ: هەم لە کاتی مردندا، ڕووح یەکجاریی ئازادو دەرباز دەبێ لە داوی جەستە، هەم لە کاتی خەوتنیشدا، دیسان ڕووح شێوەیەك لە ئازادیی و دەربازیی بۆ دەڕەخسێ، ﴿يَتَوَفَّى﴾، یانی: وەریاندەگرێ، دیارە ئەوەی کە مردنی بۆ بڕیاردا بێو لە حاڵەتی مردندابێ، یاخود لە حاڵەتی

خەوتندا بێ، كە دەخەوێت و بە خەبەر نایەتەوەو دەمرێ، ئەوەی كە مردنی بۆ بڕیار دابێ، ڕووحەكەی دەگرێ (واتە: ناینێرێتەوە بۆ نێو جەستەی)، ئەوەی دیكەش دەینێرێتەوە تاكو كاتێكی دیارییكراو، كەواتە: وەك چۆن لە كاتی مەرگدا ڕووح لە جەستە دێتە دەرێ بە یەكجاریی، لە كاتی خەوو نووستنیشدا، دیسان ڕووح جۆرێك لە ئازادیی لە جەستە، بۆ دروست دەبێ، بە دەقی ئایەت .

بەڵام بە تەئكید ئەوەی كاتی خەو (نوم) بریتی نیە لە ئازادیی و دابڕانی یەكجاریی، چونكە ئەگەر دابڕانی یەكجاریی بێ، وەك چۆن ڕووح كە لە جەستە دێتە دەرێ، بە یەكجاریی، دەمرێ و ئەندامە ڕواڵەتییەكانی لە كار دەكەون، وەك: دیتن و بیستن و قسە كردن و .... هتد، بە هەمان شێوە دیارە ئەندامە نێوخۆییەكانیشی دەوەستن، واتە: دڵیشی دەوەستێ و، سییەكانیشی دەوەستن و گورچیلەشی و ... هتد، ئنجا بە هەمان شێوە ئەگەر لە كاتی خەوتندا ڕووح یەكجاریی لە بەدەن هاتبایە دەرێ، ئەو كاتە نەك هەر ڕواڵەتی لە كار دەكەوت، بەڵكو دیوی پەنهان و دەروونیشی لە كار دەكەوت، ئەو كاتەش لە حاڵەتی خەوتنەوە، دەبوو بە حاڵەتی مردن .

من لەوبارەوە زۆر شتم خوێندۆتەوە: چ ئەو كتێبانەی باسی دەروونزانیی دەكەن، چ ئەو كتێبانەی باسی مرۆڤ دەكەن، باسی دیوی پەنهانی مرۆڤ دەكەن، باسی دیوی دەرەوەی دەكەن، باسی پەیوەندیی ڕووح و جەستە دەكەن، تاكو ئێستا هەر حاڵەتی خەوتن بۆخۆی حاڵەتێكی زۆر نهێنییە، نەزانراوو پەنهانە: ئایا ڕووح لە كاتێكدا مرۆڤ دەخەوێ، چی لێدێ؟ ئایا وەرگیرانەكەی لە لایەن خوای پەروەردگارەوە چۆنە؟ كە بە تەئیكد دیارە گۆڕانێك بەسەر ڕووحدا دێ، كاتێك ئینسان دەخەوێ، هەر بۆیەش بە پەسند نەزانراوە كە مرۆڤ دەخەوێ، كتوپڕ بێدار بكرێتەوە، بەڵكو واباشە بە ئارامیی بێدار بكرێتەوە، كەواتە: لە كاتی خەوتندا ڕووح بواری زیاتری بۆ دەڕەخسێ كە زانیاریی تایبەت پەیدا بكات، لە ڕێی خەون بینینەوە، یانی: ئەو زانیاریی پەیداكردنەی ڕووح، لە كاتی خەوتندا ئێمە پێی دەڵێین: خەون، بە عەرەبی (رؤیا)، بەڵام لە ڕاستییدا بریتیە لە پەیداكردنی زانیاریی، هەروەها بریتیە لە هەڵسوكەوت كردنی ڕووح بە شێوەیەكی دیكەی جیا لە حاڵەتی بێداریی .

بەڵام لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین: فرۆید کە دێنێ هەموو خەونەکان دەگێڕێتەوە بۆ غەریزەی جینسیی‌و بە پاڵنەرێکی جینسیی لێکیان دەداتەوە، نەك هەر خەون، بەڵکو هەموو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ، تەنانەت هەڵسوکەوتەکانی منداڵێکی مەلۆتکەو شیرە خۆرەش، بە هاندەری سێکسی لێکدەداتەوە!! ئەوە لە ڕاستییدا زێدەڕۆییەکی زۆر بێ مانای کردووە، ئەوەی گوتوویەتی، شتێکی زۆر نامەنتیقیی‌و ناواقیعییە .

بۆ وێنە دەڵێ : منداڵ کە مەمکی دایکی دەمژێ، یان کە چی دەکات ... هتد، ئەوە هەمووی بە هاندەرو پاڵنەری غەریزەی جینسییە !

ئێمە دەڵێین: بێگومان غەریزەی جینسیی لە مرۆڤدا هەیەو، کاریگەریشی لەسەر بیرکردنەوەی هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ هەیە، بەڵام منداڵی شیرە خۆرە کە جارێ غەریزەی جینسیی تێدا بەو شێوە گەشەی نەکردوە، چونکە ئینسان تاکو باڵغ نەبێ غەریزەی جینسیی بەو شێوەیە بۆ دروست نابێ، کە فرۆید دەڵێ، ناڵێین: هەر نیە، بەڵام ئەوە کە ئینسان هەرچی هەڵسوکەوتیەتی‌و، هەرچی بیرو خولیایەتی، چ لە حاڵەتی بێداریی، چ لە حاڵەتی خەوندا، هەمووی بە جینس تەفسیر بکرێ، شتێکی زۆر ناعیلمیی‌و نامەنتیقییە، زانایانیش زۆر ڕەددیان داوەتەوەو قسەکانی فرۆیدیان زۆر لێك هەڵوەشاندوە، بەڵام بە تەئکید غەریزەی جینسییش وەك چۆن: غەریزەی خواردن‌و خواردنەوەو، غەریزەی شت هەبوون‌و، غەریزەی پەی بردن بە شت‌و، خۆشویستن‌و تووڕە بوون، ئەویش وەك هەموو ئەو شتانە کاریگەریی لەسەر مرۆڤ هەیە، بەڵام کە ئینسان هەرچی هەڵسوکەوت‌و هەرچی بیرو خولیایەتی، چ لە حاڵەتی بێداریی دا بێ، چ لە حاڵەتی خەوندا، هەمووی بە جینس تەفسیر بکرێ، شتێکی زۆر ناعیلمیی‌و نامەنتیقییەو پێچەوانەی واقیعیشە .

## ٢} جۆرەکانی خەون :

سەرەتا دەڵێین: خەون بریتییە لە دیاردەیەك کە بەسەر مرۆڤ دێ، مرۆڤ بە هەموو پێکهاتەکانیەوە، کە دوو پێکهاتەی سەرەکیی هەن: ڕووح‌و جەستە، بەڵام جەستەش چەندان جۆرە هەست‌و غەریزەی تێدان: جینسیی، خواردن‌و خواردنەوە، شت هەبوون، وەچە خستنەوە، زاڵ بوون، تووڕە بوون، ڕازیی بوون، خۆشویستن،

پەی بردن بە شت، خۆشویستنی خوای پەروەردگار، ترسان، خەفەت خواردن ... هتد، هەموو ئەو غەریزەو هەستانە لە مرۆڤ دا هەن‌و، زۆر هەستی دیكەش، چ لە دەروونیی دا، چ لە جەستەیدا، پەیوەندیی نێوان ڕووح‌و جەستەش زۆر پەیوەندییەكی ئاڵۆزو ڕازدارو پەنهانە، بۆ وێنە: ئینسان تووڕە دەبێ، تووڕەیی دیارە پەیوەندیی بە دەروونی ئینسانەوە هەیە، بەڵام یەكسەر دەم‌و چاوی سوور هەڵدەگەڕێ، یاخود ڕەشدا دەگەڕێ، یان كاتێك مرۆڤ خۆشحاڵ‌و ڕازیی دەبێ، یەكسەر دەموچاوی گەش دەبێتەوە، كاتێكیش ئینسان خەفەت دەخوا، دەموچاوی تاریكدا دێ، ئینسان برسیی دەبێ، ڕەنگی زەرد دەبێ، هەموو حاڵەتە دەروونییەكان دەبینین شوێنەواری جەستەییشیان هەیە، هەروەها حاڵەتە جەستەییەكانیش زۆر جار شوێنەواری دەروونییان هەیە، ئێستا ئەو زانایانەی كە لە نەخۆشییەكان دەكۆڵنەوە، دەڵێن: نەخۆشیی زەخت، شەكرە، هەندێك لە نەخۆشییەكانی گەدەو دوازدە گرێ، ئەوانە هەموویان بە پلەی یەكەم پەیوەستن بە حاڵەتی دەروونییەوە، وەك تووڕە بوون‌و هەڵچوون، خەفەت خواردن، دڵەڕاوكێ، كەواتە: ڕووح‌و جەستە زۆر تێكهەڵكێشن‌و، زۆر پەیوەندییەكی سەر سووڕهێنەریان پێكەوە هەیە، بۆیە خەونەكانی مرۆڤیش بە ئەندازەی جۆراو جۆریی هەست‌و غەریزەكانی‌و پاڵنەرەكانی، هەروەها جۆراو جۆریی پێكهاتە ڕواڵەتیی‌و دەروونییەكانی، جۆراو جۆر دەبن .

**چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ كە جۆرەكانی خەون پۆلێن دەكەن:**

یەك: { ...وَالرُّؤْيَا ثَلَاثٌ: فَالرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ بُشْرَى مِنَ اللهِ، وَرُؤْيَا تَحْزِينٌ من الشَّيْطَانِ، وَرُؤْيَا مما يُحَدِّثُ الْمَرْءُ نَفْسَهُ}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠٥٩٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٣)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٥٠١٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢٧٠) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالنَّسائي فِي الكبرى برقم: (١٠٧٤٦)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢١٤٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩٠٦)}.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خەون سێ جۆرە :

١- خەونی باش دڵخۆشكردنو موژدەیە لە خواوە.

٢- خەونێك كە بریتیە لە دڵتەنگ كردنو خەفەت پێدان لە شەیتانەوەیە.

٣- خەونێك كە بریتیە لەوەی مرۆڤ لەبەر خۆیەوە قسە دەكات، لەگەڵ خۆی دا قسە دەكات، یانی: خولیاو بیرەكانی خۆی كە لە حاڵەتی بێداریی دا بوونی، لە حاڵەتی خەودا، دێنەوە بەرچاوی .

دوو: {الرُّؤْيَا مِنَ اللهِ، وَالْحُلُمُ مِنَ الشَّيْطَانِ}، {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٧٠٤٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٢١)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٥٠٢١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢٧٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩٠٩)} .

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ ئەو خەونەی لە خواوەیە وشەی (رؤیا)ی بۆ بەكاردێنێ، دەفەرموێ: (الرُّؤْيَا)، واتە: خەون، كە مەبەست پێی خەونی باشە، لە خواوەیەو، ئەو خەونەی كە خراپەو مایەی دڵتەنگییو خەفەتو بێزار بوونە، پاڵیداوەتە لای شەیتان، وشەی (حُلُم)ی بۆ بەكارهێناوە: (وَالْحُلُمُ مِنَ الشَّيْطَانِ)، واتە: خەونی خراپ لە شەیتانەوەیە .

سێ: لەم فەرموودەیەدا بە تەعبیرێكی دیكە هێناویەتی، دەفەرموێ: {الرُّؤْيَ الصَّالِحَةُ مِنَ اللهِ، وَالرُّؤْيَا السَّوْءُ مِنَ الشَّيْطَانِ}،{أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٧٠٠٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٦٢٢)} .

واتە: خەونی باش لە خواوەیەو، خەونی خراپ لە شەیتانەوەیە .

لێرەدا بۆ هەردووكیان وشەی (رؤیا)ی بەكارهێناوە .

چوار: {وَالرُّؤْيَا ثَلاَثٌ: رؤيَا مِنَ اللهِ، و رؤيا مِنَ المَلَكِ، و رؤيا مِنَ الشَّيْطَانِ}،{أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٥٣٩)}.

واتە: خەون سێ جۆرە :

١- خەون هەیە لە خواوەیە .

٢- خەون هەیە لە فریشتەوەیە .

٣- خەون هەیە لە شەیتانەوەیە .

زانایانی شارەزای بواری خەون بینینو تەعبیری خەون دەڵێن: خەونێك كە لە خواوە بێ، پێویستیی بە تەعبیر ناكاتو مانایەكەی ڕۆشنە، شتەكە چۆنە ئاوا دەیخاتە بەرچاوت، بەڵام خەونێك لە فریشتەوە بێ، پێویستیی بە تەعبیرو مانا لێكدانەوە دەكات، كە ئەویش دیارە خەڵكی پسپۆڕی خۆی دەیزانن، خەونێكیش كە لە شەیتانەوە بێ، زیاتر خەونی بێزاركەرو ترسێنەرو دڵناڕەحەتكەرەو، ئەو خەونانەدا كە مایەی خەفەتو دڵەڕاوكەو ناڕەحەتیین .

ئنجا دیارە ئێمە دواتر زیاتر تیشك دەخەینە سەر جۆرەكانی خەون، بەڵام لێرەدا لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا كە ڕابرد، دەڵێین: بە شێوەیەكی گشتی چوار جۆرە خەون هەیە:

<u>یەكەم</u> : لە خواوەیە، كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {الرُّؤْيَا مِنَ اللهِ}، یان دەفەرموێ: {رُؤيَا مِنَ الله}، خەونێك كە لە خوا ﷻوە بێ، واتە: خوا شتێك پێشانی كەسێك بدات، ئنجا چ بۆ ئاگادار كردنەوەو هۆشیار كردنەوەی بێ، چ بۆ دڵخۆش كردنی بێ، یان بۆ وریاكردنەوەو ترساندنی بێ، یان بۆ موژدە پێدانی بێ، خەونێك كە لە خواوە بێ، پێویستیی بە تەعبیر ناكات، ڕێك شتەكە بەو شێوەیە دەبینێ، كە ڕوودەدات، كە دوایی لەوبارەوە نموونە دێنمەوە .

<u>دووەم</u> : ئەوەیە كە لە فریشتەوە بێو، پێویستیی بە تەعبیر دەكات، چونكە دەخرێتە قاڵبێكی ڕەمزییەوە، لەبەر ئەوەی فریشتەكان ناتوانن ئەو شتە پێشانی تۆ بدەن، وەك خۆی هەیە، وەك لە واقیعدا هەیەو، بۆت دەخەنە قاڵبێكی ڕەمزی یەوە، بۆیە پێویستیی بە تەعبیر دەكات، وەك چۆن نامەیەك بە شفرە دێ، دەبێ شفرەكە حەل بكرێ .

<u>سێیەم</u> : ئەوەیە كە لە شەیتانەوەیە، تەنیا بۆ دڵ ناڕەحەت كردنو بێزارییو خستنە حاڵەتی خەمو ناڕەحەتیی مرۆڤەوەیە، كە دوایی باسی دەكەین، هەروەها لە فەرموودەكانیش دا هاتوە .

چوارەم : بریتییە لە قسەی نەفس، واتە: قسەی تێکەڵو پێکەڵ، یاخود ئەو شتانەی کە ئینسان لە حاڵەتی بێداریيدا باسیان دەکاتو خولیاینیو پێیانەوە سەرگەرمە، هەر ئەوانە دێنەوە بەرچاوی لە حاڵەتی خەونداو، وشەی (حَدِيث النَّفْس)یان بۆ بەکارهاتوە، لە فەرموودەکەی پێغەمبەردا ﷺ: {وَرُؤْيَا مِمَّـ يُحَدِّثُ بِهِ الْمَرْءُ نَفْسَهُ} و، لە قورئاندا تەعبیری: (أَضْغَاثُ الأَحْلام)، واتە: خەونی تێکەڵو پێکەڵ، ئەوەی بۆ بەکارهاتوە.

## ٣} حەقیقەتو ڕەوایی خەون بە گشتی :

ئایا خەون، حەقیقەتو ڕەوایەتیی هەیە ؟

ئایا دەگونجێ لە ڕێی خەونەوە ئینسان پەی بە هەندێك شت بەرێ ؟

ئایا خەون، هیچ پشتی پێ دەبەسترێ؟

ئایا خەون، ئینسان هیچ لێی بەهرەمەند دەبێ؟

لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، ئنجا ئێمە سێ جۆرە بەڵگە لەوبارەوە دێنینەوە:

أ/ لە ڕووی واقیعییەوە :

دەڵێین: خەون بینین ڕاستییەكی نكوولیی لێ نەكراوەو، پێویستیی بە بەڵگەی نەقڵیی ناكات، چ شتێك پێویستیی بە بەڵگەی نەقڵیی دەكات؟ شتێك كە بە عەقڵ، بە ئەزموون، لە واقیعدا دیارو ڕوونو ئاشكرا نەبێ، ئایا ئێمە پێویستییمان بە بەڵگەی قورئانو سووننەت دەكات، كە خۆر هەیە؟ یان ئایا پێویستییمان بە بەڵگەی قورئانو سوننەت دەكات، كە ئینسان خەوی لێ دەكەوێ؟ یان ئینسان برسیی دەبێ؟ یان ئینسان توورە دەبێ؟ نەخێر، چونكە ئەوانە هەموویان شتی ئەزموونكراون، هەموویان شتی بەرهەستن، شتی واقیعیین، ئنجا لە ڕاستییدا – وەك پێشتر گوتمان: - كافرو مسوڵمان، خەڵكی پێشێو خەڵكی ئێستاو، هەموو جۆرە مرۆڤەكان، دیاردەو حاڵەتی خەون بینینیان هەیەو خەون دیتن: دیاردەیەكی جیهانییو دیاردەیەكی مرۆییەو، پێویستیی بە بەڵگەی نەقڵیی ناكات، بیسەلمێنین كە خەون هەیەو، حەقیقەتی هەیەو ڕەوایەتیی هەیە، ئەوە وەك بەڵگەی واقیعیی .

ب/ لە قورئـــانـدا :

ئنجا بۆ زیادە دڵنیایی، با تەماشای قورئانیش بکەین: جارێ لە قورئاندا، تەنیا لە سوورەتی یوسوفدا، باسی چوار خەونان کراوەو لە هەر کام لە سوورەتی (الفتح) و(الصافات)یش دا باسی دوو خەونی دیکە کراوە، کەواتە سەرجەم دەکاتە شەش (٦) خەون :

١- یەکێکیان خەونەکەی یوسوف ﷺ کە بۆ بابی دەگێڕێتەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ ﴾، واتە: یادبکەوە کاتێك یوسوف بە بابی گوت: ئەی بابە گیان! من یازدە ئەستێرەو خۆرو مانگم بینین، کە بۆ من کڕنووشیان بردبوو.

ئەمە لە ئایەتی ژمارە (٤) سوورەتی (یوسوف)دا، دوایی لە ئایەتی ژمارە (١٠٠)دا سەرەنجامو هاتنەدی ئەم خەونە باسکراوە، وەك خوای زانا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ٱدْخُلُواْ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا ۖ ﴿١٠٠﴾ ﴾، دوای ئەوەی یازدە برایەکەیو دایكو بابی سڵاوی لێ دەکەنو کڕنووشی بۆ دەبەن، {هەڵبەتە نەك کڕنووشی پەرستن، بەڵکو جۆرێك لە چەمینەوە، یاخود جۆرێ لە تەحییەی بۆ دەکەن، کە لە خەڵکی حوکمڕانو دەسەڵات دەکرێ)، دەڵێ: بابە گیان! ئەمە سەرەنجامی خەونەکەمە خوا هێنایە دی، کە پێشتر بینی بووم .

٢ و٣ - پاشان هەر لە سوورەتی یوسوفدا باسی دوو خەونان دەکرێ، هی دوو هاوەڵەکە یوسوف، وەك لە سوورەتی (یوسوف)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ ۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعْصِرُ خَمْرًا ۖ وَقَالَ ٱلْءَاخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحْمِلُ

فَوْقَ رَأْسِي خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُ ۖ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓ ۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾

واتە: دوو گەنج لەگەڵی چوونە زیندان، یەکێکیان گوتی: خۆمم بینی کە ترێم دەگوشی‌و دەمکردە شەڕاب بۆ گەورەکەم، ئەویدیکەش گوتی: خۆمم دی سینییە خواردنێك، کە لەسەر سەری خۆم هەڵگرتبوو، باڵندە لێیان دەخوارد، سەرەنجام‌و مانای ئەو دوو خەونەمان پێ بڵێ، ئێمە تۆ لە چاکەکاران دەبینین.

ئنجا دوایی لە ئایەتی ژمارە (٤١)دا، یوسوف خەونەکانیان بۆ تەعبیر دەکات، دەفەرموێ: ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجْنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسْقِى رَبَّهُۥ خَمْرًا ۖ وَأَمَّا ٱلْءَاخَرُ فَيُصْلَبُ فَتَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِن رَّأْسِهِۦ ۚ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ ٱلَّذِى فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ ﴾، واتە: ئەی دوو هاوەڵە زیندانییەکەم! یەکێکتان ڕزگاری دەبێ‌و، وەك جاران دەچێتەوە سەر ئیشی جارانی، کە بریتییە لەوەی: ترێ هەڵدەگوشێ‌و دەیکاتە شەڕاب بۆ گەورەکەی، ئەوی دیکەشتان هەڵدەواسرێ‌و ئیعدام دەکرێ‌و، تەرمەکەی بە هەڵواسراویی دەمێنێتەوە، (یاخود فڕێ دەدرێ)، باڵندە لە گۆشتی سەری دەخۆن، ئەوەی کە پرسیارتان لە بارەی دەکرد، تێپەڕی.

٤- هەروەها سووڕەتی (یوسف) خەونێکی چوارەمیشی تێدایە، کە ئەویش وەك چۆن خەونەکەی یوسوف هاتۆتە دی، هەروەها هی دوو هاوەڵە زیندانییەکەشی دێتە دی، هی پادشاش هەر دێتە دی، وەك لە ئایەتی ژمارە (٤٣)دا هاتوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلِكُ إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ ۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ أَفْتُونِى فِى رُءْيَٰىَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ ﴾، کورتەکەی ئەوەیە کە پادشا خەون دەبینێ: حەوت مانگای لەڕ، حەوت مانگای قەڵەو دەخۆن‌و، حەوت گوڵە گەنمی وشك‌و بێ دان، حەوت گوڵە گەنمی تەڕو پڕدان دەخۆن، ئنجا دەڵێ: ئەی ئەهلی مەجلیس! ئەی دەستڕۆیشتووان‌و قسە بە دەستان! هەواڵ‌و زانیاریم پێ بدەن دەربارەی خەونەکەم، ئەگەر دەتوانن خەون تەعبیر بکەن‌و مانای لێك بدەنەوە! ئەوانیش ئاوا وەڵام دەدەنەوە: ﴿ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ۖ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ ٱلْأَحْلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾

دەڵێن: ئەوە خەونی تێکەڵو پێکەڵە، ئێمەش ناتوانین خەونی تێکەڵو پێکەڵو ناڕاست، مانای لێکبدەینەوە .

دیارە ئەوان نەیانزانیوە، ئەگەرنا خەونەکەی ڕاست بووە، بەڵام زۆرجار کە کەسێك شتێك نازانێ، لە جیاتی ئەوەی خۆی تۆمەتبار بکات، کە نایزانێ، شتەکە تۆمەتبار دەکات، کە حەقیقەتی نیە!!

بەڵام یوسوف ﷺ دوایی لە ئایەتەکانی: (٤٧ و ٤٨ و ٤٩)دا، ئەو خەونەی پادشا تەعبیر دەکا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: حەوت ساڵی پڕ پیتو پێزو بەرەکەت دێن، حەوت ساڵی هەرزانیی، ئێوەش پێویستە دەغڵو دان پاشەکەوت بکەن، چونکە، دوایی حەوت ساڵی گرانییو قاتو قڕییو بێ بارانییو وشکە ساڵیی دێن، تاکو ئەوەی لەو حەوت ساڵە هەرزانییو پڕ بە پیتو فەڕەدا، پاشەکەوتتان کردوە، لە حەوت ساڵەی قاتو قڕییەکەدا، لێی بەهرەمەندبنو، پێی بژین، ئنجا دوایی ساڵی پازدەیەم: دووبارە دەرووی خێر لە خەڵك دەکرێتەوەو هەرزانیی دێو دووبارە دەگەڕێنەوە سەر عەیشو نۆشی جارانیان.

واتە: یوسوف ﷺ ئەو خەونەی کە پادشا بینیویەتیو لە ئایەتی ژمارە (٤٣)دا، باسکراوە، لە ئایەتەکانی: (٤٧ و ٤٨ و ٤٩)دا، یوسوف تەعبیری دەکاتو، دوایی لە دنیای واقیعیشدا دێتە دی، ئەمە چوار خەون، هەر لە سووڕەتی (یوسوف)دا.

٥- ئنجا خوا ﷻ لە سووڕەتی (الفتح)دا، دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: خوا خەونی پێغەمبەرەکەی ﷺ بە هەق هێنایە دیو، بە ڕاستی گێڕا.

پێغەمبەر ﷺ خەونی بینیبوو، کە دەچێت بۆ مەککەو، طەواف بە دەوری کەعبەدا دەکات، ئنجا ئەوە بوو لە ساڵی شەشەمدا بەرەو شاری مەککە چوو،

هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ وایانزانی ئەو ساڵە خەونەکەی دێتە دی، بەڵام ئەو ساڵە صولْحی حودەیبییەی لێکەوتەوەو، ئەوە بوو کە کافرەکانی مەککە نەیانهێشت، بەڵام ساڵی دواتر، واتە: ساڵی حەوتەم، کە ناوی لێنرا (عَام عُمْرَة القَضَاء)، ساڵی گێڕانەوەی عومرە، لەو ساڵەدا چوونو، خەونەکەی پێغەمبەریش ﷺ هاتە دی، واتە: هەمان ساڵی کە بینیبووی، نەهاتە دی، بەڵام ساڵی دواتر هاتە دی.

٦- هەروەها لە سووڕەتی (الصافات)دا، خوای پەروەردگار باسی خەونێکی ئیبراهیم دەکات، کە لە خەونی دا بینیویەتی: ئیسماعیلی کوڕی سەردەبڕێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾، واتە: ئیبراهیم گوتی: ئەی ڕۆڵە گیان! من لە خەونمدا دەمبینی کە تۆم سەر دەبڕی، ئنجا سەرنج بدە، بزانە ڕات چییە؟ ئەویش گوتی: ئەی بابە گیان! ئەوەی فەرمانت پێکراوە، ئەنجامی بدە، ئەگەر خوا بیەوێ لە خۆڕاگرانم دەبینیی.

دوایی لە ئایەتی ژمارە (١٠٥)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ ﴾، واتە: تۆ خەونەکەت بە ڕاست گێڕا، چونکە ئیبراهیم ئیسماعیلی هێنایە سەر سەربڕین، بەڵام ئەوە بوو کە خوای میهرەبان، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ ﴾، بەرانێکی گەورەی کردە بەلاگێڕەوەو قوربانیی، لە جیاتی ئیسماعیل.

کەواتە، هەر لە قورئاندا ئەوە شەش خەون، کە هەموویان هاتوونە دی.

ئنجا ئەگەر بگوترێ: خەونەکەی پێغەمبەری خاتەم ﷺو، خەونەکەی ئیبراهیمو، خەونەکەی یوسوف (علیهما السلام) هی پێغەمبەرانن، ئەوە ڕاستە، بەڵام سێ خەونەکەی دیکە: هەم دوو هاوەڵە زیندانییەکەی یوسوف، هەردووکیان کافر بوون، چونکە یوسوف موناقەشەیان لەگەڵدا دەکات:

﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٣٩ ﴾ یوسف، هەم پادشایەکەش هەر کافر بووە، واتە: ئەگەر خەونی ئەو سێ پێغەمبەرانە: موحەممەدو ئیبراهیمو یوسوف(علیهم السلام)، ڕاست دەرچووە، خەونی سێ کەسی کافریش هەر ڕاست دەرچووە، کەواتە: خەونی مسوڵمانو کافر، دەگونجێ ڕاست دەربچێ، بە پێی ئەوەی خوا لە قورئاندا بۆی باس کردووین .

ج/ لە سوننەتدا :

ئنجا با تەماشای چەند دەقێکی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بکەین، کە دیارە دەقی سوننەت لەوبارەوە زۆرنو، ئێمە بەس هەندێکیان لێ بە نموونە دێنینەوە :

یەك : پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبُوَّةِ إلا الْمُبَشِّرَاتُ، قَالُوا: وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ} (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٩٩٠) عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ)[1] واتە: لە پێغەمبەرایەتیی {یانی: لە وەحیو پەیبردن بە زانیاریی پەنهان لەلایەن خوای پەروەردگارەوە کە فێری مرۆڤی دەکات، چونکە پێغەمبەرایەتیی ئەوە گەورەترین، تایبەتمەندیەتییە، کە پێغەمبەر زانیاریی لە خوا وەردەگرێ، بە شێوەیەکی نائاسایی، لە ڕێیەکەوە کە ڕێیەکی ئاسایی نیە بۆ خەڵك}، نەماوەتەوە جگە لە دڵخۆشکەرەکان، گوتیان: دڵخۆشکەرەکان چین؟ فەرمووی: خەونی باشە، {خەونی چاك کە خاوەنەکەی پێی دڵخۆش دەبێ، خوای میهرەبان شادمانی دەکاتو هەندێ شتی دەخاتە بەرچاوو موژدەی پێدەدا}.

هەروەها لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە: (الرُّؤْيَا الصَّالحَة: يَرَاهَا الرَّجُلُ، أَوْ تُرَى لَهُ) واتە: خەونی باش، پیاو خۆی دەیبینێ، یاخود پێوەی دەبینرێ .

---

١) {عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: لاَ يَبْقَى بَعْدِي مِنَ النُّبُوَّةِ إلاَّ الْمُبَشِّرَاتُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ، يَرَاهَا الرَّجُلُ، أَوْ تُرَى لَهُ} {أخرجه أحمد برقم: (٢٥٠٢١)، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح، وهذا إسناد حسن، والبيهقي في شعب الإيمان برقم: (٤٧٥٠)}.

هەڵبەتە مەرجیش نیە هەر پیاو ببیبنێ، بەڵام دیارە كۆڕەكە كۆڕی پیاوان بووە، ئەگەرنا چ پیاو، چ ئافرەت، خەونەكە چ خۆی ببیبنێ، چ پێوەی ببینرێ، وەك یەكە.

دوو : {الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ: جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٥٨٨) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، وَأَخْرَجَهُ النَّسائي فِي الكُبْرَى برقم: (١٠٧٤٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٣) عَنْ أَبي هُرَيْرَة}.

واتە: خەونی باش، بەشێكە لە چلو شەش بەش لە پێغەمبەرایەتیی، {واتە: جۆرێكە لە جۆرەكانی سروشو وەحی} .

سێ : {رُؤْيَا الرَّجُلِ الصَّالِحِ: جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّة} (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٣)).

واتە: خەونی پیاوی باش، بەشێكە لە چلو شەش بەشی پێغەمبەرایەتیی، (واتە: بەشێكە لە چل شەش بەشی وەحیی، چونكە پێشتر باسمان كرد: شتێك كە تایبەتە بە پێغەمبەرایەتییەوە، بریتیە لە هاتنی وەحییو زانیاریی تایبەت لە خواوە بۆ ئەو كەسە كە پێغەمبەرە ﷺ).

چوار: {رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ} {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٥٨٧) عُبَادَة بْنِ الصَّامِتِ}.

واتە: خەونی بڕوادار، (جا چ پیاو بێ، چ ئافرەت)، بەشێكە لە چلو شەش بەشی پێغەمبەرایەتیی.

پێنج: {مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَام فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لا يَتَمَثَّلُ بِي}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٣٨٧٦)، وَابْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٠٤٦٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٥٩٣) عَنْ أَنَس بْنُ مَالِكٍ}.

واتە: هەر كەسێك لە خەوندا منی بینی، ئەوە بەڕاستی منی بینیوە، چونكە شەیتان نایەتە سەر شێوەی من.

كەواتە: دەگونجێ شەیتان بچێتە سەر شێوەی خەڵكی دی، بەڵام بە نسبەت پێغەمبەرانەوە، وەك چۆن لە حاڵەتی بێداریی لە دنیادا كە ژیاون، پارێزراو

بوون لەوە کە شەیتان زەفەریان پێ بەرێ، لە حاڵەتی خەونیشدا، پارێزراون لەوە، کە لەسەر شێوەی ئەوان شەیتان شتێك بە خەڵك بڵێ.

شەش: {مَنْ رَآنِي فِي النَّوْمِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي لِلشَّيْطَانِ أَنْ يَتَشَبَّهَ بِي} {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٣)، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ} .

واتە: هەر کەسێك لە کاتی نوستندا منی بینی، ئەوە بە دڵنیایی منی بینیوە، چونکە ناگونجێ شەیتان خۆی وەك من لێ بکات، ناگونجێ شەیتان بچێتە سەر شێوەی من .

شایانی باسە کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەك چۆن فەرموویەتی: خەونی باش، یان خەونی بڕوادار، یان خەونی ئینسانی باش، بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتیی، بەهەمان شێوەش: لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: بەشێکە لە چل بەش و[1]، لە فەرمودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: بەشێکە لە چل و نۆ بەشی پێغەمبەرایەتیی و[2]، لە دەقێکی دیکەدا دەفەرموێ: بەشێکە لە پەنجا بەشی پێغەمبەرایەتیی و[3]، لە دەقێکی دیکەدا دەفەرموێ: بەشێکە لە حەفتا بەشی پێغەمبەرایەتیی و[4]، لە دەقێکی دیکەدا دەفەرموێ: بەشێکە لە چل و چوار بەشی پێغەمبەرایەتیی و[5]، لە دەقێکی دیکەدا دەفەرموێ: بەشێکە لە بیست و شەش بەشی وەحیی و پێغەمبەرایەتیی[6].

---

١) {رُؤْيَا الْمُسْلِمِ جُزْءٌ مِنْ أَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ} أَخْرَجَهُ إِبْنُ حِبَّان برقم: (٦٠٤٩) قال شعيب الأرنؤوط: حديث حسن لغيره.

٢) {الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يُبَشَّرُهَا الْمُؤْمِنُ، هِيَ جُزْءٌ مِنْ تِسْعَةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنْ النُّبُوَّةِ} أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٠٤٤)، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره.

٣) {جُزْءٌ مِنْ خَمْسِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ} أَخْرَجَهُ الطبراني فِي الصغير برقم: (٥٨١٢)، قال الهيثمي: فيه ابن إسحاق وهو مدلس وبقية رجاله ثقات، والبزار برقم: (١٢٩٨).

٤) {رُؤيا الرَّجُلُ الْمُسْلِمِ الصّالح جُزْءٌ مِنْ سَبعِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ} أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٨٩٥)، قال البوصيري: هذا إسناد ضعيف، وأبو يعلى برقم: (١٣٣٥)، وَابْنُ أبي شَيْبَة برقم: (٣٠٤٦٥).

٥) {جُزْءٌ مِنْ أربع وأربعين جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ} أخرجه إبن جرير ج١١، ص١٣٥.

٦) {جُزْءٌ مِنْ سِتةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ} فتح الباري ج١٢، ص٣٦٣.

ئنجا یەکێك بۆی هەیە بڵێ : یانی چی پێغەمبەر ﷺ لە (چل)ەوە تاکو حەفتا دەفەرمویٚ: خەونی باش یەك لەسەر چلی پێغەمبەرایەتییە، تاکو یەك لەسەر چل‌و چوار، دوایی چل‌و شەش، دوایی چل‌و نۆ، دوایی پەنجا، دوایی تا حەفتا دەچێ، ئنجا تا بیست‌و شەشیش دێتە خوارێ؟ ئەمە یانی چی؟

دەڵێین: ئەمە ئیشکال‌و پرسیارێکە، دەبێ وەڵام بدرێتەوە:

(قرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] لە (ابن عبدالبرّ)ەوە وەڵامێکی جوان دێنێ، کە منیش زۆرم بە دڵە، دەبێ هەرواش بێ، واتە: ئەگەر (ابن عبدالبرّ)یش وای نەگوتبا، ئێمە هەر وامان دەگوت، چونکە زانایان وەك بنچینەیەك کە دایانناوە، کاتێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە چەند جۆرێ شتێك دەفەرمویٚ: مادام بۆمان ساغ بێتەوە کە هەموو ئەو جۆرانەی فەرموون، دیارە دەبێ ئەو جۆرانە دابەش بکرێن بەسەر حاڵەتی جیاجیادا، چونکە بێگومان بە ئیعتیباری جیاجیا، پێغەمبەری خوا ئەو شتانەی فەرموو ون.

لەوبارەوە (ابن عبدالبرّ) دەڵێ: {اخْتِلَافُ الآثَارِ فِي هَذَا البابِ فِي عَدَدِ أَجْزَاءِ الرُّؤيَا لَيْسَ ذَلِكَ عِنْدِي اخْتِلَافٌ مُتَضَادٌ مُتَدَافِعٌ (وَاللهُ أَعْلَم) لأَنَّهُ يَحْتَمِلُ أَنْ تَكُونَ الرُّؤيَا الصَّالِحَة مِنْ بَعْض مَنْ يَرَاهَا، عَلَى حَسَبَ مَا يَكُونُ مِنْ صِدْقِ الحَدِيثِ، وَأَدَاءِ الأَمَانَةِ، وَالدِّينِ المَتِينِ، وَحُسْنِ اليَقِينِ، فَعَلَى قَدَرِ اخْتِلافِ النَّاسِ فِيمَا وَصَفْنَا، تَكُونُ الرُّؤيَا مِنْهُم عَلَى الأَجْزَاءِ المُخْتَلِفَةِ العَدَدِ، فَمَنْ خَلَصَتْ نِيَّتُهُ فِي عِبَادَةِ رَبِّهِ وَيَقِينِهِ وَصِدْقِ حَدِيثِهِ، كَانَتْ رؤياهُ أَصْدَقَ، وَإِلَى النُّبُوَّةِ أَقْرَبَ، كَمَا أَنَّ الأَنْبِيَاءَ يَتَفَاضَلُونَ، قَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿وَلَقَدۡ فَضَّلۡنَا بَعۡضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعۡضٖۖ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ٥٥﴾ الإسراء}.

واتە: شوێنەوارەکان کە جۆراو جۆرن، لەوبارەوە لە دیاریی کردنی بەشەکانی خەوندا، بە نسبەت وەحییەوە، ئایا خەون چەند بەشی وەحیی‌و پێغەمبەرایەتییە؟ بە لای منەوە، ئەوە جیاوازیی، پێکەوە دژ بوون‌و پێکەوە ناکۆك بوون نیە،

---

[1]) الجامع لأحكام القرآن ج١، ص١٠١ و ١٠٢.

خواش زاناترە، چونکە دەگونجێ خەونی باش لە هەندێ لەو کەسانەوە کە دەیبینن، بە پێی ئەندازەی ڕاستگۆییانو، ئەمانەت پارێزییانو بەهێزیی دینداریانو، ئیمان پتەوییان بێ، کە خەڵك خەونەکانیان جۆراو جۆر دەبن، بۆیە پێغەمبەر بە تەعبیری جۆراو جۆر تەعبیری لێکردوە، چونکە کەسێك کە نیەتەکەی لە پەرستنی پەروەردگاریدا ساغتربێو، یەقینو بڕوا پتەویی و دڵنیایی، چاکتر بێو، قسە کردنی ڕاستتر بێ، ئەوە خەونەکەشی ڕاستتر دەبێو، لە وەحیی پێغەمبەرایەتییەوە نیزیکتر دەبێ. {چونکە وەحییو پێغەمبەرایەتیی لە لووتکەی هەموو سیفەتێکی بەرز دایەو، هەر کەسێ هەتا سیفەتەکانی بەرزتربن، وەك: ئیمانو یەقینو بەندایەتییو خواپەرستییو ڕاستبێژییو، ئەمانەت پارێزیی، هەتا هەموو سیفەتە بەرزەکانو، هەتا لە سیفەتی خراپ دوورتربێ، بە دڵنیاییەوە، خەونەکەی ڕاستتر دەبێو لە وەحیی پێغەمبەران نیزیکتر دەبێ}[1]، هەروەك چۆن پێغەمبەرانیش لە بەینی خۆیاندا پلەپلەییان هەبووە، {واتە: بەرزو بەرزتریان هەبووە} خوای بەرزیش لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدۡ فَضَّلۡنَا بَعۡضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعۡضٖۖ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿٥٥﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێمە هەندێ لە پێغەمبەرانمان بەسەر هەندێکیاندا بەرز کردۆتەوەو هەڵبژاردوەو، زەبوورمان بە داوود دابوو .

منیش دەڵێم: بەڵگەی ڕاستیی قسەکەی (ابن عبدالبرّ) – کە وەك گوتم: ئەگەر ئەویش واینەگوتبایە، دەبوو هەر وابڵێین – وێڕای واقیع، کە تۆ دەبینی ئەوانەی بۆ خوا صوڵحاوترن، خەونەکانیشیان ڕاستترن، ئەوەش کە لە خوا دوورترەو زیاتر گیرۆدەیە بە گوناهو تاوانو خراپەوە، خەونەکانی لە حاڵەتی تێکەڵیی و پێکەڵییو بێ سەرو بەریی نیزیکترن، هەرچەند جاری وایە ئینسانی زۆر گوناهباریش خەونی ڕاست دەبینێ، بەڵام ئەوە کەمەو دەگمەنەو، بە زۆریی وایە ئینسان تاکو خۆی ڕاستترو چاکتربێ، خەونەکانیشی ڕاستتر دەبن، بەڵێ: وێڕای واقیع، ئەم فەرموودانەش بەڵگەن لەسەر ئەوە:

---

١) ئەوەی نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە، بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی مەبەست .

أ/ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {أَصْدَقُكُمْ رُؤْيَا: أَصْدَقُكُمْ حَدِيثاً} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠٥٩٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٠١٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: ٢٢٧٠) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح}.

واتە: ڕاستبێژترتان، ڕاستگۆترتان لە قسەکردندا: خەونی ڕاستترە.

بەڵێ ئینسان تاکو ڕاستبێژتربێ‌و ڕاستتربێ‌و ساغتربێ، خەونەکانیشی ڕاستتر دەبن، ئەوەش شتێکی ئەزموون کراوە.

ب/ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لَم يَبْقَ بَعْدِي مِنَ الْمُبَشِّرَات إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ الصادقة، يَرَاهَا الرَّجُلُ الصَّالِحُ أَوْ تُرَى لَهُ} {أَخْرَجَهُ مالك برقم: (٣٥١٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٧٩) وغيرهما}.

واتە: لە دوای من لە موژدەدەرەکان، لە دڵخۆشکەرەکان، تەنیا خەونی چاك‌و ڕاست ماوە، کە پیاوی باش دەیبینێ، یان پێوەی دەبینرێ.

هەڵبەتە وەك گوتم: دیارە کۆڕەکە کۆڕی پیاوان بووە، ئەگەرنا وەك چۆن پیاوی باش خەونی باش‌و خەونی ڕاست دەبینێ، یان پێوەی دەبینرێ، ئافرەتی باشیش، خەونی باش‌و ڕاست دەبینێ، یاخود پێوەی دەبیترێ.

ج/ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : {رُؤْيَا الرَّجُلِ الصَّالِحِ، جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ}، {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٣)}.

واتە: خەونی پیاوی باش، بە شێکە لە چل‌و شەش بەش لە پێغەمبەرایەتیی.

د/ {رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ}، {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٥٨٧) عُبَادَة بْنِ الصَّامِتِ}.

خەونی بڕوادار، بەشێکە لە چل‌و شەش بەش لە پێغەمبەرایەتیی.

کەواتە: ئەگەر مرۆڤەکە بڕوادار بێ، یان ئینسانێکی باش بێ، مانای وایە ئەوجار خەونەکەی بەشێکە لە چل‌و شەش بەشی پێغەمبەرایەتیی.

ئنجا ئەوەیان کە دەفەرموێ : بەشێکە لە بیست‌و شەش (٢٦) بەشی پێغەمبەرایەتیی، دیارە ئەوە دەبێ ئینسانێکی هەر زۆر ڕاست‌و چاك بێ، یان دەبێ ئەو کەسە لەو حاڵەتەدا، حاڵەتی صەفاو ڕاستیی زۆر باشی هەبێ .

ئنجا ئەوەیان كە دەفەرموێ: چل (٤٠)، دیارە ئەندازەیەك كەمتر ساغییو صافییو ڕاستیی هەیە، ئیدی هەر بەو شێوەیە: هەتا ڕێژەكەی كەمتر دەبێتەوە: چلو چوار (٤٤)، چلو نۆ (٤٩)، پەنجا (٥٠)، حەفتا (٧٠) دیارە ئەندازەی ڕاستبێژییو چاكییو دینداریی مرۆڤەكە كەم دەبێتەوە، بۆیەش ئەندازەی ڕاستیی خەونەكەشی، یاخود ڕێژەی لە وەحیی بوونو لە پێغەمبەرایەتیی بوونی خەونەكەشی، كەمتر دەبێتەوە.

هەڵبەتە ئەوەش: شتێكی بەڵگە نەویستەو ڕوونو ئاشكرایە، كە ئینسان هەتا بۆ خۆی چاكتر بێ، كردەوەكانیشی باشتر دەبن، هەم كردەوە ڕواڵەتییەكانی، هەم كردەوە پەنهانەكانی، ئینسان هەتا پەیوەندیی لەگەڵ خوادا توندتر بێو بەندایەتیی بۆ خوا چاكتر بێ، ئەوە نەك هەر لە خەوندا، لە حاڵەتی بێدارییشدا، زمانی ڕاستتر دەبێو، ئەندامەكانی فەرمانبەرتر دەبن بۆ شەریعەتو، ڕەوشتی بەرزتر دەبێ، لە خراپە دوورتر دەبێ، ئەوە هیچ گومانی تێدا نیە.

حاڵەتی خەونیش دیارە ڕەنگدانەوەی حاڵەتی بێدارییەو ئینسان لە بێداریيدا چۆن بێ، لە خەونیشدا هەر وادەبێ، نەك ئینسان لە بێداریيدا خراپەكاربێو، لە خەوندا ببێتە فریشتە! یانی: خەونیش ڕەنگدانەوەی حاڵەتی بێدارییە، بۆیەش ئەو شێوە دابەشكردنەی پێغەمبەری خوا بۆ خەونان، جۆراو جۆرە، چونكە حاڵەتەكانی خەڵك جۆراو جۆرنو، دوورییو نیزیكیی خەڵك لە وەحییەوەو لەو سیفەتو ئاكارە بەرزانەوە، كە پێغەمبەران هێناویانن، لە ئیمانو، خوا بەیەكگرتنو، بەندایەتیی بۆ خواو، ڕاستبێژییو، ئەمانەت پارێزیی، نیزیكی خەڵك لەو سیفەتانەو، ڕێژەی هەبوونی ئەو سیفەتانە لە خەڵكدا، جۆراو جۆرە، بۆیە ڕێژەی لە پێغەمبەرایەتیی بوونو، لە وەحیی بوونی خەونەكانیشیان، جۆراو جۆرە.

### ٤} بەرهەمی خەون:

ئایا ئێمە بە هۆی خەونەوە چیمان دەستگیر دەبێ؟ ئایا خەون تا چ ڕاددەیەك جێی بەهرەو سوود لێ وەرگرتنە؟

دەڵێم: بە پێی ئەزموونی كردەیی خۆمو خەڵكی دیكەش، پاشان بە گوێرەی دەقەكانی قورئانو سوننەت، بەرهەمی خەونی ڕاستو چاك، بریتییە لە

دڵخۆشکردنو بەرچاو ڕوونیی لەلایەکەوەو، ئاگادارکرانەوەو هۆشیارکرانەوەو، زانیاریی پێدرانو بەرچاو ڕوون کران، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، لەلایەکی دیکەوە .

هەڵبەتە ئەوە بە ئەزموون دیارە، کە خەون - یانی: خەونی ڕاستو چاك - دەبێتە هۆی دڵخۆشکردنی ئینسانو شادمان کردنیو بەرچاوڕوونکردنیو موژدەپێدانی، جاری واشە: ئاگادارکردنەوەو تەمبێ کرانو سەرزەنشت کرانی، ئەمە وەك واقیع دیارە، ئنجا لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا، ناو لە خەونی باش نراوە: دڵخۆشکەرەکان، موژدەدەرەکان (المُبَشِّرات)، وەك دەفەرموێ: {لَم يَبْقَ بَعْدِي مِنَ الْمُبَشِّرَات إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ الصادقَة، يَرَاهَا الرَّجُلُ الصَّالِحُ أَوْ تُرَى لَهُ}[1] ، لە دوای من لە دڵخۆشکەرەکان، لە موژدەدەرەکان تەنیا خەونی چاكو ڕاست ماوە، پیاوی باش دەیبینێ، یاخود پێوەی دەبینرێ، (پیاوی باش، یان ئافرەتی باش).

هەروەها لە دەقێکی دیکەدا پێغەمبەر دەفەرموێ: {لَمْ يَبْقَ مِنَ النُّبُوَّةِ إِلا الْمُبَشِّرَاتُ، قَالُوا: وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ}،{أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٦٩٩٠) عَنْ أَبي هُرَيْرَة} .

واتە: لە پێغەمبەرایەتیی، تەنیا دڵخۆشکەرەکان، موژدەدەرەکان ماون، گوتیان: دڵخۆشکەرەکان چین؟ فەرمووی: خەونی باشە.

ئنجا ئەوە کە لە ڕێی خەونی ڕاستەوە، مرۆڤ ئاگادار دەبێتەوەو بەرپێی خۆی دەبینێو جاری واهەیە سەرزەنشت دەکرێو، جاری واش هەیە دڵخۆش دەکرێ، سەلماندنی ئەوە، پێویستیی بە دەق ناکات، هەرچەندە دەقەکانیش فەرموویانە، چونکە ئەوە بە ئەزموون دیارەو من دەتوانم هەر لە ئەزموونی خۆم، زۆر شت بێنمەوە، وەك لە یاداشتەکانمدا: (چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم) لەوبارەوە چەند شتێکم گێڕاوەتەوە، دەگونجێ بگەڕێنەوەو سەرنجی بدەن، لێرەدا تەنیا نموونەیەك دێنمەوە، کە زۆر جێی سەرنجە ! :

[1] ) رواه البيهقي في (شعب الإيمان) برقم (٤٧٥٠) عن عائشة رضي الله عنها .

كاتی خۆی كە لە ڕژێم قاچاغ بووم، لە ساڵی خوێندنی (١٩٨١ و ١٩٨٢)زدا، ئەو كاتە لە قۆناغی دووی زانكۆ بووم، فەرمانی گرتنم دەرچوو لە لایەن ڕژێمەوە، ئنجا دوای ئەوەی كە ئاگادار كرامەوە، هەم لەوێ لەلایەن هاوەڵێكمەوە، لە كۆلێژی شەریعە (فقه) لە نەجەفو، هەم دوایی كە گەڕامەوە، لەلایەن موختاری ڕانیەوە: مام صالح خوا لێی خۆشبێ، ئاگادار كرامەوە، ئەوەبوو كە قاچاغ بووم، چووم بۆ كوردستانی ئێران، شەش مانگێك لەوێ بووم، دوایی كە گەڕامەوە، نەنكم (واتە: دایكی دایكم) كە پوورە (بەس)یان، (بەسە خرە)یان پێ دەگوت، خوا لێی خۆش بێ، ئافرەتێكی زۆر دیندارو چاك بوو، زۆریش منی خۆشدەویست، وەك نەوەیەك، زۆرجار كە دادەنیشتین، دەیگوت: ڕۆڵە! وەرە قسەم بۆ بكەو قسەت بۆ دەكەم، مورید لە مورید ئیستیفادە دەكات، دیارە ئەو نەنكەم دوای ئەوەی كە هاوسەری دەمرێ {كە (ڕەسوە خرە)یان پێگوتوە، واتە: بابی دایكم}، شوودەكاتەوە بە (شێخ عبدالواحید) كە لە شێخەكانی سندۆڵان بووە، لە ڕووی دینداریی‌و تاعەتەوە لێیان بەهرەمەند بووە، ئنجا لەو كاتەدا كە قاچاغ بووم لە ڕژێم‌و لە كوردستانی ئێران، بووم، نەنكم وەفاتی كرد، كە هاتمەوە، دایكم ڕەحمەتی خوای لێبێ، گوتی: ڕۆڵە! نەنكت زۆر پێی خۆش بوو كە تۆ سوورەتی یاسینی لەسەر بخوێنی، هەر دەیگوت: فلانكەس لە كوێیە؟ هەرچەند مەلاو فەقێمان بۆ بانگكردن، بەڵام ئەو قورئان خوێندنی تۆی پێ خۆش بوو، تۆش لێرە نەبووی...

منیش گوتم : لە كوێ نێژراوە ؟

گوتی : لە گۆڕستانی گوندی (كونەسە) لە پشتی ڕانیە.

منیش لەگەڵ دایكم بە ڕەحمەت بێ، چووم‌و سەلامم لە قەبرەكەی كردو دوعام بۆ كردو، دوایی گوتم: نەنكێ! ئەگەر پێتخۆشە خەتمێك قورئانت بۆ بكەم، لەجیاتی ئەو یاسینەی كە لێرە نەبووم لەسەرت بخوێنم، ئەمشەو وەرە خەونم، پێم وایە شەوی جومعە بوو، ئەدی هەر ئەوشەوە نەنكم هاتە خەونم، نەنكم بوو بەڵام گەنج بوو بۆوە، زۆر شێوەیەكی جوانی هەبوو، منیش زۆر پێم سەیر بوو، گوتم: نەنكێ لە كوێی؟ گوتی: ڕۆڵە لە بەهەشتم، منیش گوتم: چۆنە ئاوای؟ گوتی: لێرە خەڵك لای ئێمە هەرئاوایە، (واتە: گەنج دەبێتەوە)، لە كاتێك دا لەگەڵ نەنكم ڕاوەستابووم پرسیاری بەهەشتم لێ دەكرد، كوڕە خاڵێكم هەبوو ناوی

ئەحمەد بوو[1]، ئەو کاتە پێشمەرگە بوو لە قەلاتووکان، بە لاماندا هات پارچە کاغەزێکی پێ بوو، بە تووڕەیی یەوە گوتی: ها...! ئەو هەقەم لاتانە بمدەنەوە، رووی لە من کرد، نەنکیشم گوتی: رۆڵە! لە شوێنی خۆی کە ئەو کاغەزەیان پێدای، گوتیان: بە لەباریی داوای هەقی خۆت بکە، نەك بە تووڕەیی، ئیدی من خەونەکەم ئاوا بوو، خەبەرم بۆوە .

بەیانی کە هەڵسام گوتم: دایە گیان! خەونێکی ئاوام بە نەنکمەوە بینیوە، دوایی دەستم کرد بە قورئان خوێندن بۆی بۆ تەواوکردنی خەتمەکە کە بەڵێنم دابوو، بەڵام هەر لێم دەپرسین: چی لێ تێدەگەن، ئەحمەدی خاڵ برایمم کە ئەو وەرەقەیەی پێ بووەو دەڵێ: هەقەکەم بدەنەوە، چی ئەوان لەلای ئێمەیە؟ دایکم گوتی: من هیچم پێ شك نایەت، پێم وایە ئەو خەونە ڕاست لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بووە، چونکە تەعبیرەکەی زۆر ڕوونەو بە هێماو ڕەمز نەبوو .

بەڵام ئەوان لە بیریان نەمابوو، چەند ڕۆژێ بیریان لێ کردەوە، دوایی مەڕیەمی خوشکم کە ئێستا ماوەوماڵیان لە گوندی (بۆسکێن)ەو، هاوسەری دکتۆر ئەحمەدە، بەبیری هاتبۆوە گوتبووی: دایە! ئەدی نەنکم گوارە زێڕەکانی خۆی بە تۆ نەدان، گوتی: رۆڵە! ئەو گوارە زێڕانەم با لەلای تۆ بن، ئەگەر ئەحمەدو عەبدوڵلا، {خاڵم خاڵ برایم، لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا کوژراوەو سێ منداڵی لە پاش جێماون: ئەحمەدو عەبدوڵلاو ئامینە، کە ئێستا عەبدوڵلاو ئامینە ماون، ئەحمەدیش کوژرا خوا لێی خۆش بێ}، موحتاج بوون گوارەکان بفرۆشەو بیانکە پارەو بۆیان بنێرە، ئەگەر ئەوانیش موحتاج نەبوون و، پێویستییان پێی نەبوو، گوارەکان بفرۆشەو بۆم بە فەرشێك بدەو لە مزگەوتێ دا ڕایخە؟ ئیدی دایکم، وەصیەتەکەی دەکەوێتەوە بیر، دوایی کە پرسیمان، گوتیان: ئەحمەد ماڵی لە قەلاتووکانەو هەژارو ئاتاجن، ئەوە بوو دایکم گوارەکانی نەنکمی فرۆشتن و، بۆی کردنە پارەو بۆی ناردن .

---

[1] ئەحمەد کوڕی گەورەی (خاڵ ئیبراهیم)م بوو، لە هەشتایەکانی سەدەی ڕابردوودا لە قەلادزێ کوژرا، خوا لێی خۆشبێ.

کە ئەوە خەونێکە زانیارییەکی تێدایە کە زیندووەکان لە بیریان نەمابوو، مردوو لەوێوە زیندووەکانی ئاگادار کردۆتەوە، هەڵبەتە لەوبارەوە من شتی زۆرم بینیوە، کە کەمێکم لە یادداشتەکانی خۆمدا، کە لەو قۆناغەی تەمەنم دا روویانداوە، باسم کردوون .

بەڵام لێرەدا دەپرسین: ئایا خەون بۆ بوارەکانی حەڵاڵو حەرامو حوکمە شەرعییەکان، پشتی پێ دەبەستریٚ؟ ئایا دەگونجێ بڵێی: من خەونم بینیوە کە فلاّن پارەیە حەڵاڵە؟ یان فلاّن پارەیە حەرامە؟ یان فلاّن شتە حوکمەکەی ئاوایە، لە رووی شەریعەتەوە، چونکە خەونم بینیوە ؟

دەڵێین: لە راستییدا پشت بە خەون نابەستریٚ بۆ زانینی حوکمی شەرعیی شتەکانو، دیار کردنی چاکییو خراپیی شتەکانو، دیار کردنی حەرامو حەڵاڵ، بەڵێ جاری وا هەیە شتێکی تایبەت دەبێ، کە تۆ لە رێگای خەونەوە ئاگادار دەکرێیەوە، کە ئەو شتە ئاوایە، من چەند جارێك ئەوەم بینیوە، بەڵام کە لە رێی خەونیشەوە ئاگادار دەکرێیەوە، دەبێ پشت بە دەقەکانی قورئانو سوننەت ببەستی، یانی: ئەوەی کە لە خەونیشتدا دەیبینی، دەبێ هەر ئاگادارکردنەوەت بێ، بۆ حوکمە شەرعییەکان کە لە قورئانو سوننەتدا هاتوون، بۆچی؟ چونکە لە دوای شەریعەتی پێغەمبەری خاتەم، رێگای وەحیی بەستراوەو حەڵاڵو حەرام کۆتاییان پێ هاتوە: (حَـلاَلُ مُحَمَّدٍ حَلاَلٌ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ، وَحَرَامُ مُحَمَّدٍ حَرَامٌ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ).

حەڵاڵێك کە موحەممەد لە قورئاندا، یاخود لە رێی سوننەتی خۆیەوە رایگەیاندوە کە حەڵاڵە، ئەوە تاکو قیامەت حەڵاڵە، حەرامێکیش کە پێغەمبەر لە قورئاندا، یان لە رێگای سوننەتی خۆیەوە، دیاریی کردوە کە حەرامە، ئەوە تاکو قیامەت حەرامە .

مەگەر ئەوە کە لە حاڵەتی نائاساییو رێزپەڕدا، جاری واهەیە حەرامێك حەڵاڵ دەبێ، یان حەڵاڵێك حەرام دەبێ، لە حاڵەتێکی تایبەتدا، ئەگەرنا وەك بنچینە: حەڵاڵ حەڵاڵە تاکو قیامەت، حەرامیش حەرامە تاکو قیامەتو، ئەوەی کە پشتی پێ دەبەستریٚ، تەنیا شەریعەتە، کە ئێمە لە تەوەری پێنجەمدا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو بابەتە .

## ٥} چـۆن مامەڵـە لەگـەڵ خـەوندا بکـەیـن ؟

بـۆ ئـەو بابەتـە، سـێ بنەمـا زۆر گـرنگـن، تاکـو بتـوانین مامەڵەیـەکی ڕاستو دروست لەگەڵ دیاردەی خـەون بینیـندا بکـەین :

أ/ بە هاوسـەنگیی مامەڵـە کردن لەگـەڵ دیـاردەی خـەون دا :

واتە: نە تێپـەڕێنی، نـە کـورتی بێـنی، نـە بڵـێی: خــەون هـەموو شــتێکە، نـە بڵــێی: هیچــەو بۆشــە، نــە خــەون لــە جێگــای شـەریعەت دابنـێیــنو، بیکــەینە بـەدیلو جێگرەوەی شــەریعەتو، پشـت بـە خـەون ببەسـتین، بـۆ زانینـی حـەڵاڵو حــەڕامو چــاکەو خراپـە، وەك هـەنــدێ لــە ئەهلـی تەصـەووفو خەڵـکی عـەوام دەیکەن. نە خەونیش لە دەرەوەی بازنەی شــەریعەت دابنێینو، هیچ ئیعـتیبــارێکی بـۆ نەکـەین! ئـا ئـەوە مامـەڵـەیەکی ڕاســتو دروســتە، وەك زانایـان گوتــوویانە: (خــەون مایــەی بەرچــاو ڕوونییـە بـۆ کەســێك کـە هیــچ دەقێکـی شـەریعـەتی لـەبــارەی شـتێکەوە چـنـگ نەکـەوێ، دەگونجـێ خـەونی ڕاســتو چـاك پشـتی پـێ ببەسـترێو سوودی لێ وەربگیـرێ، مادام دەقەکانی شەریعەتی لەبەر دەسـتدا نـەبن، بەڵام ئەوەش هەر بۆ خۆی، چونکــە خـەونی هیچ کـەس بـۆ خـەڵکی دیکە نابێتـە بنچینەو یاساو نابێتە بەرچاوڕوونیی).

بۆچی وا دەڵێین؟ چونکە پێغەمبـەر ﷺ بایـەخی بـە خـەون داوەو حیسابی بـۆ کردوە، با لەوبارەوە تەماشـای ئەم دوو فەرموودەیە بکەین:

یەکـەم: {عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا صَلَّى الصُّبْحَ، أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِهِ فَقَالَ: (هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمُ الْبَارِحَةَ رُؤْيَا)} {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٧٠٤٧)، ومسلم برقم: (٥٨٩٦)، والترمذي برقم: (٢٢٩٤)}.

واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب خوا لێی ڕازی بـێ (کە یەکێکە لـە هـاوەڵان) دەڵــێ: پێغەمبــەر کـە نوێژی بـەیانی دەکــرد {ســڵاوی دەدایـەوە، هەرچـەندە لێرەدا نەیفەرمووە، بەڵام بێگومان دوای زیکرو ویردەکان بووە کە لە سوننەت دا

هاتوون}، ڕووی لە هاوەڵانی دەکردو دەیفەرموو: ئایا هیچ کامێك لە ئێوە دوێنێ شەو خەونێکی بینیوە؟ واتە: با بۆم باس بکات، تاکو بۆی مانا بکەم.

دووەم: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ مِمَّا يَقُولُ لأَصْحَابِهِ: (مَنْ رَأَى مِنْكُمْ رُؤْيَا فَلْيَقُصَّهَا أَعْبُرْهَا لَهُ)} {أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (٥٨٩٠)}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا لەمیانەی ئەوەدا کە بە هاوەڵانی بەڕێزی دەگوت، جارجار پێی دەفەرموون: کامتان خەونێکی بینیوە با بیگێڕێتەوە، تاکو بۆی تەعبیر بکەم، ماناکەی بۆ لێکبدەمەوە.

ب/ هەر کات خەونمان بینی، با بۆ مرۆڤی عاقڵو دڵسۆز نەبێ، نەیگێڕینەوە:

لەوبارەوە چەند فەرموودەیەك هەن، بۆ نموونە:

یەکەم: {الرُّؤْيَا مُعَلَّقَةٌ بِرِجْلِ طَائِرٍ مَا لَمْ يُحَدِّثْ بِهَا صَاحِبُه، فَإِذَا حَدَّثَ بِهَا، وَقَعَتْ، فَلا تُحَدِّثُوا بِهَا إِلاّ عَاقِلاً، أَوْ مُحِبّاً، أو نَاصِحاً} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٢٢٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٢٧٩) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالحَاكِم برقم: (٨١٧٥) وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد}.

واتە: خەون بە پێی باڵندەیەك هەڵواسراوە، {وەك شتێك وایە کە بە پێی باڵندەیەکەوە هەڵواسرابێ}، هەتا خاوەنەکەی دەیگێڕێتەوە، ئنجا هەرکات گێڕایەوە، خەونەکە دێتە دی، بۆیە خەون مەگێڕنەوە، مەگەر بۆ کەسێك کە ژیر بێ، یان ئێوەی خۆش بوێ، یان دڵسۆز بێ.

کەواتە: خەون بۆ خەڵکی نەفام، یاخود نەزان، یاخود کەسێك کە ڕقی لە ئێوەیە، یان نادڵسۆزو موخنەتە، مەیگێڕنەوە.

دووەم: {عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَال لَقَدْ كُنْتُ أَرَى الرُّؤْيَا فَتُمْرِضُنِي، حَتَّى سَمِعْتُ أَبَا قَتَادَةَ يَقُولُ: وَأَنَا كُنْتُ لأَرَى الرُّؤْيَا تُمْرِضُنِي، حَتَّى سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: الرُّؤْيَا الْحَسَنَةُ مِنَ اللهِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يُحِبُّ، فَلا يُحَدِّثْ بِهِ إِلاَّ مَنْ يُحِبُّ، وَإِذَا رَأَى مَا يَكْرَهُ فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللهِ مِنْ شَرِّهَا، وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَلْيَتْفِلْ ثَلاثاً، وَلا يُحَدِّثْ بِهَا أَحَداً، فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ} {أَخْرَجَهُ البخاري برقم: (٦٦٣٧)}.

واتە: ئەبو سەلەمە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: خەونم دەبینی، نەخۆشی دەكردم، (واتە: خەونی ترسناكو ناخۆش)، هەتا گوێم لە ئەبو قەتادەبوو دەیگوت: منیش پێشتر خەونی وام دەبینی، نەخۆشی دەكردم، (واتە: بە هۆی خەونەكەمەوە باری دەروونییم تێكدەچوو، خەفەتم دەخوارد)، هەتا گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خەونی باش لە خواوەیە، ئەگەر یەكێك لە ئێوە خەونێكی بینی، كە حەزی لێ دەكردو پێی خۆش بوو، با تەنیا بۆ كەسێكی بگێڕێتەوە كە خۆشی دەوێ و بۆی دڵسۆزەو، متمانەی پێیە، بەڵام ئەگەر خەونێكی بینی كە پێی ناخۆش بوو، با پەنا بە خوا بگرێ لە خراپەی خەونەكەی و، با سێ جاران تف بكات (یانی: فوو بكات)و، پەنا بە خوا بگرێ و باسیشی نەكات، ئەو كاتە هیچ زیانێكی پێناگەیەنێ .

## ج/ پەنا بە خواگرتن و، لە خوا پاڕانەوەو، كەلەكە گۆڕین :

هەر كات مرۆڤ خەونی ناخۆش و خراپی دی، با پەنا بە خوا بگرێ و لە خوا بپاڕێتەوە، واتە: لە شەڕو خراپەی ئەو خەونەی بینیویەتی، پەنا بە خوا بگرێ ئەگەر خەونەكە ناخۆش بێ، ئەگەر چاكیش بێ سوپاسی خوای لەسەر بكات.

لەوبارەشەوە ئاماژە بەم دەقانە دەكەین:

<u>یەكەم</u>: {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ الرُّؤْيَا يَكْرَهُهَا ، فَلْيَبْصُقْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاثًا، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ ثَلاثًا، وَلْيَتَحَوَّلْ عَنْ جَنْبِهِ الَّذِي كَانَ عَلَيْهِ} {أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ بِرقم: (٢٩٥٤٥)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ برقم: (١٠٤٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٢)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٥٠٢٢)، وَالنَّسَائِي فِي الكُبْرَى بِرقم: (٧٦٥٣)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٣٩٠٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٠٦٠)}.

واتە: جابیری كوڕی عەبدوڵڵا خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێك لە ئێوە خەونێكی بینی كە پێی ناخۆش بوو، با سێ جاران تف لە لای چەپ بكات،و با سێ جاران پەنا بە خوا بگرێ لە شەیتان و بڵێ: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)و، با لەسەر كام تەنیشتەی خەوتوە، وەرسووڕێ بۆ تەنیشتەكەی دیكەی .

یانی: ئەگەر لەسەر تەنیشتی لای ڕاست بوو، وەربسووڕێ بۆ لای چەپو، ئەگەر لەسەر لای چەپ بوو، وەربسووڕێ بۆ لای ڕاست .

دووەم: {إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ، فَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ} {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي بِرقم: (٧٠١٧)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٢٦٣)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٥٠٩٩)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٢٨٠)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٣٩٠٦)}.

واتە: ئەگەر یەکێکتان خەونێکی بینی، کە پێی ناخۆش بوو، یان پێی قەڵس بوو، با هەڵسێ نوێژ بکات، یان با هەڵسێ دوعا بکاتو لە خوا بپاڕێتەوە .

دیارە مەبەستی پێغەمبەری خوا ئەوەیە کە ئەگەر خەونی چاکت بینی، تەنیا بۆ کەسێکی بگێڕیەوە، کە دڵسۆزەو دەزانی پێی خۆش دەبێو حەسوود نیەو موخنتنەت نیە، بەڵام ئەگەر خەونی خراپت بینی، هەر مەیگێڕەوەو پەنا بە خوا بگرەو دوعا بکەو، بەو شێوەیەش مامەڵە بکە کە لە فەرموودەکاندا هاتوە .

ئەمە چۆنیەتی مامەڵەکردن بوو لەگەڵ خەوندا، چ خەونەکە موژدەو دڵخۆشیی تێدابێو، چ ئاگادارکردنەوەو هۆشداریی تێدابێ، کە ئەوە بە باری ئەرێنیی دایە، وە چ بە پێچەوانەوە: ببێتە هۆی دڵتەنگیی‌و ناڕەحەتیی‌و، خەونی ترسناکو سامناك بێو، بە جۆرێك بێ، کە ئینسان پێی ناخۆش بێ. ئەوە پێویستە بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ کە باسمان کرد.

## ٦} شەش ئاگاداریی گرنگ لەبارەی خەونەوە:

ئاگاداریی یەکەم: خەون (رؤيا) دیاردەیەکی مرۆیی‌و جیهانییەو، وەك پێشتر گوتمان: پەیوەستە بە ڕووحو ناخی مرۆڤەوە، بۆیە دەگونجێ مرۆڤی مسوڵمانو مرۆڤی نامسوڵمان، مرۆڤی چاكو مرۆڤی خراپ، خەونی ڕاست، ئەگەر جارجاریش بێ - بە نسبەت مرۆڤی خراپەوە - ببینن، چونکە خەون بینین پەیوەستە بە ڕووحو دیوی نێوەوەو پەنهانی مرۆڤەوەو، هەموو مرۆڤێکیش ئەو دیوە پەنهانەو ڕووحی هەیە، بەڵگەش لەسەر ئەوە، وەك پێشتریش باسمان

كرد، خەونی هەردوو هاوەڵە زیندانییەكەی یوسوف‌و، خەونی پادشایە، كە هەرسێكیشیان بێبڕوا بوون، بەڵام خەونی ڕاستیشیان بینیوە.

ئاگاداریی دووەم: دیارە خەونی مرۆڤی بڕوادارو چاكەكارو ڕاستبێژو ئەمیندار، زیاتر ڕاست دەردەچێ، مرۆڤ تاكو ڕاستبێژتر بێ‌و چاكەكارتر بێ، یانی: هەتاكو لە حاڵەتی بێدارییدا، پابەندتربێ بە شەریعەتەوە، لە حاڵەتی خەوتنیشدا، ئەو زانیارییانەی كە ڕووحی وەریان دەگرێ، بە هۆی ئەو نیمچە ئازادبوونەی ڕووحەوە، لە جەستە، ئەو زانیارییانە تەواوترو ڕاستتر دەبن، بەتایبەت خەونی پێغەمبەران هەر بە جۆرێك لە وەحی دادەنرێ، وەك عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، گوتوویەتی: {رُؤْيَـ الأَنْبِيَاءِ وَحْيٌ} {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦٨٩)، قال الشيخ الألباني: صحيح، وَالحَاكِمُ برقم: (٨١٩٧)، والطبراني في معجمه الكبير برقم: (١٢٣٠٢)}.

باشترین بەڵگەش لەوبارەوە، ئەوەیە كە ئیبراهیم عليه السلام - وەك پێشتر باسمان كرد - لە سووڕەتی (الصافات)دا، بە ئیسماعیلی كوڕی دەفەرموێ: ﴿يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٠٢﴾، ئنجا دواتریش كە ئیسماعیل دێنێتە سەر سەربڕین، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٠٥﴾، واتە: خەونەكەت بەڕاست گێڕا، جێبەجێت كرد، ئێمە ئاوا پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوە.

دیارە بۆیەش خەونی پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلام) بە وەحیی دادەنرێ، چونكە پێغەمبەران هەروەك چۆن لە حاڵەتی بێدارییاندا، پارێزراو (معصوم)ن، لە شەیتان‌و وەسوەسەو دنەدانی شەیتان، بەتایبەت لەوەدا كە وەك دین ڕایدەگەیەنن، بە هەمان شێوە لە حاڵەتی خەوتنیشیاندا، هەر پارێزراون، لەوەدا كە وەك دین بە خەڵكی ڕادەگەیەنن، خوا سبحانه وتعالى دەیانپارێزێ لەوە كە بە هەڵەدابچن، یان شەیتان لە ڕێی خوتخوتەو دنەدانی خراپەوە، زەفەریان پێبەرێ .

ئاگاداریی سێیەم: خەون پێویستیی بە مانا لێدانەوە دەكات، كە پێی دەگوترێ: (تعبیر)، یانی: پەڕاندنەوە، ئەو كەسە كە دەتەوێ مانای خەونەكەی بۆ لێكدەیەوە بیپەڕێنیەوە، بە هۆی ئەو ڕەمزو هێمایانەوە كە لە خەونەكەیدا بینیونی، بۆ دنیای واقیع، ئایا ئەو ڕەمزو هێمایانەو، ئەو دیمەنانە كە لە خەونەكەیدا بینیونی، لە حاڵەتی بێداریی‌و لە دنیای واقیع دا، چی دەگەیەنن؟! لەوێوە دەیپەڕێنیەوە بۆ وێ، بۆیە پێی دەگوترێ: (تعبیر).

بەڵێ: خەون پێویستیی بە تەعبیر هەیە، بەلام بێگومان تەنیا خەونی ڕاست تەعبیرو مانا لێكدانەوە هەڵدەگرێ، ئەگەرنا خەونی تێكەڵ‌و پێكەڵ، كە قسەی نەفسە، یاخود هەندێ شتی بێ سەروبەر، كە زۆرجاران لە گاڵتە پێكردنی شەیتانەو هیچ مانای نیە، وەك لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە :

پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ گوتی: لە خەونمدا سەرم لێ‌بووبۆوەو خۆم یارییم پێدەكرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بۆچی یەكێكتان كە شەیتان گاڵتەی پێكردوە، دەیگێڕێتەوە، واتە: ئەوە كە ئینسان سەری لێببێتەوەو گاڵتە بەسەرەكەی خۆی بكات، وەك تۆپ، بە تەئكید ئەوە گاڵتە پێكردنی شەیتانە! بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆش بووە، ئەو هاوەڵە ئەو جۆرە خەونە بگێڕێتەوە .

هەر خەونێك دیاربێ كە ترساندنی شەیتان بێ، یاخود شتێك بێ، هیچ مانایەك هەڵنەگرێ، یاخود شتێكی بێجێ بێ، ئەوە تەعبیر هەڵناگرێ‌و، پێویست ناكات ئینسان خۆی پێوە سەغڵەت بكات.

ئنجا بێگومانیش هەموو كەس توانای مانا لێكدانەوەی خەونانی نیە، هەموو كەس ئەو شارەزاییەی نیە (مُعَبِّر الرؤى) بێ، واتە: مانا لێكدەرەوەی خەونان بێ، هەر بۆیەش موعجیزەی یوسوف عليه السلام تەعبیركردنی خەونان بووە، چونكە: نەمانبینیوە لە قورئاندا، جگە لە مانا لێكدانەوەی خەونان، موعجیزەیەكی دیكە بۆ یوسوف باسكرابێ، ڕەنگە هەشیبووبێ، بەلام باس نەكراوە، كەواتە: مانا لێكدانەوەی خەون‌و تەعبیر كردنی خەونان، زانستێكی زۆر گرنگەو، خوای كاربەجێ كردوویەتی بە موعجیزەو بەڵگەی پێغەمبەرایەتیی

یوسوف ﷺ وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ ﴿٢١﴾﴾، وەك دوایی دەیگەینێ لە تەفسیری سووڕەتی یوسوف دا، دەفەرموێ: ئاوا یوسوفمان بالآدەست کرد لە زەویدا، پێگەمان پێداو، بۆ ئەوەی کە مانای خەونانی فێر بکەین.

دیارە لە نێو زانایانی ئیسلامدا (إبن سیرین) زۆر مەشهوور بووە، کە زۆرباش مانای خەونانی لێکداوەتەوە، کتێبێکیشی هەیە بە ناوی: (تعطير الأنام فِي تفسير المنام)، هەروەها (نابلسي)و (إبن شاهين)، هەر کامێکیان کتێبێکی هەیە لەوبارەوە، زۆرجاریش هەرسێ کتێبەکان بەیەکەوە چاپ دەکرێن .

هەڵبەتە زانایانی دیکەش هەبوون و خەڵکی دیکەش هەبووەو هەیە، کە کەم و زۆر دەتوانن مانای خەونان لێکبدەنەوەو، تەعبیریان بکەن بە شێوەیەکی ڕاست و دروست، کە وەك گوتم: ئەوەش زانیارییەکی تایبەتەو، هەر کەسێك ڕاست بۆوە ناتوانێ، مانای خەونان بکات و تەعبیری خەونان بکات.

<u>ئاگاداریی چوارەم:</u> زۆر گرنگە ئینسان خەڵك قیاس نەکاتە سەر خۆی، وەك پێشینان دەڵێن: (لە هەمبانەی خۆیدا گوێز نەژمێرێ)، واتە ئەگەر بۆ خۆی خەونی ڕاست نابینێ، ئەگەر بۆ خۆی خەونی چاك نابینێ، ئەگەر بۆ خۆی لەو شتانە بێ بەش (محروم)ە، پێی وانەبێ خەڵکی دیکەش هەمووی هەروایەو لە هەر کەسێکی بیست گوتی: بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشتووم، یان خەونێکی ئاوام بینی و خەونەکەم ڕاست دەرچوو، با یەکسەر تۆمەتباری نەکات و، خەڵك قیاس نەکاتە سەر خۆی، ئنجا ئەو کەسە چاك بێ، یان خراپ بێ، چونکە جاری وایە ئینسانی چاکیش کەمتر خەون دەبینێ، بە هەر حاڵ ئینسان نابێ خۆی بکاتە چەقێك و، خەڵکی دیکە پێوانە (قیاس) بکاتە سەر خۆی، چونکە زانایان بنچینەیەکیان داناوە دەڵێ: (إنَّ عدم العلم لايستلزم علم العدَم) زانیاریی نەبوون بە شتێك، نابێتە بەڵگە لەسەر نەبوونی ئەو شتە.

کە تۆ زانیارییت بە شتێك نیە مانای وانیە ئەو شتە نیەو، شتێك کە تۆ نایزانی، مانای وانیە کە کەسی دیکە ئەو شتە نازانێ.

ئاگاداریی پێنجەم: دیارە خەونی بڕواداران بە درێژە پێدەری وەحیی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دادەنرێ، تەنیا هی بڕواداران، نەك هی كافران، بۆچی؟ چونكە بڕواداران مادام بەڕێی پێغەمبەراندا دەڕۆن‌و، پابەندن بە ڕەوشت‌و ئاكارەكانیانەوە، كەواتە كەم‌و زۆر ئەوەی بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەبووە، ئەوانیش هەر كەسە لە قەدەر خۆی شتێكی بۆ دەبێ، هەڵبەتە ناڵێین: وەك وەحیی، بە مانا زاراوەییەكەی، بەڵام بە مانا گشتییەكەی وەحیی، وەك پێشتر ئیمە باسێكمان دەربارەی وەحیی كرد، لە سووڕەتی (یونس)دا، وەحیی یانی: قسەی پەنهان، خرانە نێو دڵ، بەرچاو ڕوونكرانەوە، بە شێوەیەكی نا ئاسایی، ئا ئەم حاڵەتە، ئیماندارانیش هەر كەسە بە پێی ئیمانی خۆی لێی بەهرەمەند دەبن، چونكە ئەوانیش شوێنكەوتووی پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)، هەڵبەتە وەك گوتم ئەوەی پێغەمبەران بە مانا زاراوەییەكەی وەحیی، وەحییان بۆ دێ، بەڵام هی بڕواداران بە مانا گشتییەكەی وەحیی، كە لە ڕێی خەونی چاكەوەیە، لە ڕێی خورپەو ئیلهامەوەیە، شتێك خوا دەیخاتە نێو دڵیان لە ڕێی فیراسەت‌و وردبینیی‌و ڕوون بینییەوەیە، بڕوادارانیش هەر كەسە لە قەدەر خۆی، بەشی لەوەدا هەیە، بەڵام تەنیا هی پێغەمبەران لێی دڵنیاو مسۆگەرین، كە ئەوە پەیامی خوایە پێیان گەیشتوە، یان ئەوە لە خواوەیە، یان لە فریشتانەوەیە، پێیان گەیشتوەو، ئەگەری بە هەڵە داچوونی تێدا نیە، بەڵام هی بڕواداران، تۆ دڵنیانی كە تێیدا بەهەڵە دانەچووە، یاخود دڵنیانی كە ئایا ئەوە ئیلهامی فریشتەكانە، یان خوتخوتەی شەیتانەكانە؟ ئنجا لەبەر ئەوەی دڵنیانی بە مانا زاراوەییەكەی، بە وەحیی لە قەڵەم نادرێ، هەرچەندە فەرموودەكان ئەو وشەیان بۆ بەكارهێناوە، كە دەفەرموێ: لە پێغەمبەرایەتیی تەنیا خەونی باش ماوە، یان لە موژدەپێدانەكانی پێغەمبەرایەتیی، لە دڵخۆشكەرەكانی پێغەمبەرایەتیی، تەنیا خەونی باش ماوە، كە لێرەدا مەبەست پێی مانا گشتییەكەیەتی، وەك پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿رُؤْيَا الرَّجُلِ الصَّالِحِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٢٦٣)}.

واتە: خەونی پیاوی باش، بەشێكە لە چل‌و شەش بەشی پێغەمبەرایەتیی، واتە: جۆرێكە لە وەحیی بە مانا گشتییەكەی.

یـان کـه دەفـەرموێ: {أَصْدَقُكُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُكُمْ حَدِيثًا}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرَقْمِ: (١٠٥٩٨)، وَمُسْلِمٌ بِرَقْمِ: (٢٢٦٣)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرَقْمِ: (٥٠١٩)، وَالتِّرْمِذِيُّ بِرَقْمِ: ٢٢٧٠) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ}.

واته: ڕاستبێژترتان، ڕاستگۆترتان له قسـەکردندا، خەونی ڕاستتـره .

دیـاره لێـرەدا ڕاسـتبێژیی هێنـراوه، ئەگـەرنا هـەموو سـیفەته باشـەکان، کاریگـەرییان لەسـەر ئـەوه هەیـه کـه مـرۆڤ خـەونی ڕاسـتتـرو باشـتـر ببینـێ، چونکه مرۆڤ تا پاکتـرو باشـتربێ، زیاتر له فریشـتەکان بەهرەمەنـد دەبـێ، چ لـه حالّـەتی بێدارییـدا، وەك ئیلهـامو خورپـه، چ لـه حالّـەتی خەوتنـدا، وەك خـەونی ڕاسـتو باش.

<u>ئاگاداریـی شـەشـەمو کۆتایـی :</u> بـڕواداران لـه حالّەتی بێدارییشدا، لـه فریشـتەکان بەهرەمەنـد دەبـن، حالّـەتی خورپـه، (إلـهام)و خرانـه نێـو دڵ، بـۆ بـڕواداران هەیـه، هەر کەسە لە قـەدەر ئیمانی خۆی، وەك خوا ﷻ له سووڕەتی (فصلت)دا، له ئایەتەکانی: (٣٠ و ٣١ و ٣٢)دا باسی فەرمووه، ئەم ئایەتـه موبارەکانـه زۆر بـه ڕوونیـی ئـەوەیان لـێ دەفامرێتـەوەو لێوەردەگیـرێ، کـه بـڕواداران، بڕوادارانـی ڕاوەسـتاوو دامـەزراو لەسـەر ڕاسـته شـەقامی شـەریعەت، بـه ئەنـدازەی ئیمـانو تەقوایـان، لـه ئیلهـامو خورپـەی فریشـتەکان، بەهرەمەنـد دەبـن، دەفـەرموێ:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾﴾.

واته: بێگومان ئەوانەی گـوتیان: پەروەردگارمان خوایه، پاشـان ڕاوەستاو بوون (واته: پابەنـد بوون بـه شـەریعەتەوه)، فریشـتەکان دادەبەزنـه سەریان، (و دەیخەنـه نێـو دڵیـان) کـه مەترسـنو پـەژارەدارو خەمبـار مەبـنو، دڵخـۆش بـن بـەو بەهەشـتەی کە بەڵێنو گـفتتان پێدەدرا، ئێمـه دۆسـتی ئێوەو نیزیکی ئێوەین،

لە ژیانی دنیاو لە دوارۆژیشدا، بۆ ئێوە لە بەهەشتەکانی خوادا، هەرچی ئارەزووی بکەنو نەفستان بیخوازێو ئارەزوومەندی بێ، هەرچی کە داوای بکەن، هەیە، ئەوەش میواندارییەکە لەلایەن خوای لێبوردەیی بە بەزەییەوە.

هەروەها لەوبارەوە فەرموودەی پێغەمبەریش هەن، بۆ وێنە:

{عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: (قَدْ كَانَ يَكُونُ فِي الأُمَمِ قَبْلَكُمْ مُحَدَّثُونَ فَإِنْ يَكُنْ فِي أُمَّتِي مِنْهُمْ أَحَدٌ، فَإِنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ مِنْهُمْ)}، {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٣٩٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦٩٣)، وَالنَّسَائِي فِي الكُبْرَى برقم: (٨١١٩)}.

واتە: لە گەلانی پێش ئێوەدا کەسانێك هەبوون، کە قسەیان لەگەڵدا دەکرا[1] (بیرۆکەی باشیان دەخرایە نێو دڵ)، ئەگەر لە ئۆممەتی من کەسێك هەبێ، ئەوە عومەری کوڕی خەتتابە.

کە دیارە عومەر خوا لێی ڕازی بێ، ئەو سیفەتەی زۆر تێدا تۆخ بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە نموونەی هێناوەتەوە، ئەگەرنا هاوەڵانی دیکەش هەر کەسە بە ئەندازەی خۆیو، ئیماندارانیش هەر کەسە بە ئەندازەی خۆی، لەوە بەهرەمەند دەبێ، کە لەو سیفەتەدا پشكو بەشی هەبێ، کە بریتیە لە بەهرەمەندبوون لە فریشتەکان لە حاڵەتی بێداریی دا، کە خولیای باش، نیەتی باش، بیروبۆچوونی باش، هاندانی باش بخەنە نێو دڵو دەروونیانەوە، کە بە عەرەبیی پێی دەگوترێ: (إلهام)، بە کوردیی وشەی: (خورپە)، یاخود (خرانە نێو دڵ)ی بۆ بەکاردێ .

لێرەش دا کۆتایی بە توێژینەوەمان لەبارەی خەونەوە دێنین .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

١) (مُحَدَّثون)، واتە: (مُلْهَمون)، خورپەیان بۆ دەکرا.

# دەرسی دووەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئـەم دەرسـەمان دوازدە (١٢) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەكـانی: (٧ تـا ١٨)، ئـەم دەرسـە بریتیـە لـە ئاڵقـەی یەكـەمی زنجیـرەی بەسەرهاتی یوسـوف ﷺ، لـەو دوازدە ئایـەتەدا سـەرەتا باسـی ئـەمە كـراوە، كـە لـە بەسـەرهاتی یوسـوف و برایەكانیـدا، نیشانەی زۆر هـەن بۆ عەودالانی زانینی ڕاسـتییەكان، بۆ ئەو كەسانەی كە دەپرسن و، بە دوای شتاندا دەگەڕێن، پاشـان مشتو مڕی پڕ كینەو حەسـەدی برایەكانی یوسـوف، لە نێو خۆیاندا بـاس كراوە، كـە بـابی خۆیانیـان یـەعقووب ﷺ تۆمەتبـار كـردوە بـە لایەنگیـریی و بەلا داشـكاندن بۆ لای یوسـوف ﷺ، پاشـان بیـركردنەوەیان لـە پیلانێـك بـۆ قوتـار بوونیـان لـە چـارەی یوسـوف، تاكـو بابیـان ڕوویـان تێبكـاتو، چیدیكـە بەهـۆی یوسـوفەوە، لـەوان بـێ خـەمو بـێ ئاگـا نەبـێ، وەك گومانیـان بـردوە، كـە بـە دڵنیـایی وانـەبووە .

پاشـان تەگبیـركردنیـان بە هاویشتنە نێو بیری یوسـوف، دوایی گفتوگۆی فێڵـبازانە كردنیـان لەگـەڵ بابیـان، كـە یوسـوفیان لەگـەڵـدا بنێـرێ بـۆ دەشـتودەر، كـە یاریـی بكاتو، بە خۆشـیی بیگوزەرێنـێ.

پاشان بیانووهێنـانەوەی بابیان كە حـەز ناكات، یوسـوف لـێی دووربـێو، بۆی دڵ تـەنگ دەبـێو مەترسـیی ئەوەشی هەیـە: گـورگ بیخـوات! ئنجـا وەڵامدانـەوەی بـە ڕواڵـەت ئیقـنـاع كـەری كـوڕەكـان بـۆ بابیـان (یەعقـووب)، كـە ئـەوان بـۆ یوسـوف دڵسـۆزنو دەیپارێـزن، ئنجـا ئەگـەر بێـتو لـە حاڵێكـدا كە ئـەوان دەسـتە پیاوێكی تونـدو تۆكمەو تێرو تەواون، لە پەنـای واندا گـورگ بیخـوات، كەواتە: ئەوان زیانبـارو ڕەنج بە خەسـارن، هیچ لە دەست نەهـاتوو دەستەپاچەن، دیارە هەر مەبەستیان ئـەوە بووە، كە بابیـان هانبـدەنو یوسوفیان لەگـەڵ بنێـرێ.

سەرەنجام بردنی یوسوفو خستنیە نێو قووڵایی‌و تاریکایی بیرێك، دوایی گەڕانەوەیان لە شەودا دوای خەوتنان، یان دەمەوخەوتنان بە چاوی بە فرمێسکەوە، بەڵام دیارە فرمێسکی درۆین بووەو، ڕێکخستنی درۆی بە گورگان خواردنی یوسوف بۆ بابیان‌و، خوێنێکی درۆتێهەڵسوونی بۆ کراسەکەی یوسوف، کە هەندێ دەڵێن: خوێنی کاریلەیەك بووەو، هەندێ دەڵێن: هی بەرخێك بوو، هەندێ دەڵێن: هی نێچیرێك بووە، گرنگ ئەوەیە خوێنی خۆی نەبووە.

ئنجا تۆمەتبار کردنی بابیان بۆیان، چونکە بابیان بە دڵنیاییەوە باوەڕی پێیان نەهاتوە، بەڵام چی بکات؟ خۆڕاگریی کردۆتە پیشەو، پەنای بە خوا ﷻ گرتوە، لە بەرانبەر ئەو قسانەدا کە دەیکەن.

ئنجا بابیشیان بێگومان زانیویەتی کە ڕاست ناکەن، ئیدی مەرجیش نیە ئەوە کە زانیویەتی ڕاست ناکەن، تەنها لەوەوەبێ، وەك هەندێك لە توێژەرانی قورئان دەڵێن: کە کراسەکەیان بە ساغیی بۆ هێناوەتەوە، بەڵام خوێنیان بۆ تێهەڵسووە، مەرج نیە تەنیا لەوەوەبێ، وەك دوایی باسی دەکەین، بەڵکو هەر لە سیماو لە شێوەی گێڕانەوەی قسەکانیان‌و هەڵسوکەوتی پێشتریان، پاشان لە دڵنیابوونی یەعقووب ﵇ کە خەونەکەی یوسوف دێتەدی‌و، سەرەنجام یوسوف پێگەو پلەو پایەکی بەرزی دەبێ‌و، خوای پەروەردگار دەیکاتە پێغەمبەر، هەموو ئەوانە بەرچاو ڕوونیی بوون بۆ یەعقووب، کە ئەو کوڕانە ڕاست ناکەن، کە دەڵێن: یوسوف نەماوەو گورگ خواردوویەتی، نەك تەنیا بە هۆی ئەوەوە کە کراسەکەی بە ساغ‌و سەلامەتیی هاتۆتەوەو نەدڕاوە!

﴿لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ٧ إِذْ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ٨ ٱقْتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَٰلِحِينَ ٩ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ١٠ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ١١ أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ١٢ قَالَ إِنِّي لَيَحْزُنُنِيٓ أَن تَذْهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ ١٣ قَالُواْ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ١٤ فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓاْ أَن يَجْعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ١٥ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمْ عِشَآءً يَبْكُونَ ١٦ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَٰدِقِينَ ١٧ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍۚ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًاۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌۖ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ١٨﴾ .

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی (لە بەسەرهاتی) یوسوف و برایەکانیدا نیشانەی زۆر هەن بۆ پرسیارکاران (لەسەر ئەوە کە خوا مشووری بەندە چاکەکانی خۆی دەخوات و، زایەیان ناکات و، سەرەنجامیان خێر دەکات) ﴿٧﴾ (یاد بکەوە) کاتێك (برایەکانی یوسوف) لە نێوان خۆیاندا گوتیان: هەرچەندە ئێمە کۆمەڵە (کوڕێك)ێکی تۆکمەو بەهێزو پێزین، کەچی یوسوف و برایەکەی (بنیامین)، لە ئێمە، لەلای بابمان خۆشەویستترن، بێگومان بابمان لە هەڵەیەکی ئاشکرا دایە (لەو هەڵوێستەیدا) ﴿٨﴾ (لە بەینی خۆیان گوتیان :) بۆ ئەوەی ڕووی بابتان بەرەو لاتان وەرچەرخێ (و گرنگییتان پێبدات) یوسوف بکوژن، یان فڕێی بدەنە زەوییەك (ی چۆڵەوانیی)ەوە، دوای (لەکۆڵکردنەوەی) وی، دەبنە کۆمەڵێکی چاك، (حاڵ و گوزەرانتان چاك دەبێ) ﴿٩﴾ قسەکەرێکیان گوتی: یوسوف مەکوژن، ئەگەر هەر سوورن لەسەر ئەنجامدانی کردەوەیەك (لە دژی) بیخەنە نێو بنی بیرێکەوە، (کە سەرەنجام) هەندێك کاروانچیی هەڵیدەگرنەوە ﴿١٠﴾ گوتیان: ئەی بابی خۆمان ئەوە چیتە! بۆچی بەرانبەر بە یوسوف لێمان دڵنیانی، لە حاڵێکدا کە ئێمە زۆر دڵسۆزینی؟ ﴿١١﴾ سبەینێ لەگەڵماندا بینێرە، با بۆخۆی تێر بخواو یاریی بکات، ئێمەش بە دڵنیایی پارێزەرینی ﴿١٢﴾ (بابیان) گوتی: ئەگەر لەگەڵ خۆتانی بەرن و لێم دووربکەوێتەوە، ئەوە دڵتەنگم دەکات، دەشترسم لێی بێ ئاگابن و گورگ بیخوات، ﴿١٣﴾ گوتیان: مسۆگەر ئەگەر لە حاڵێکدا کە کۆمەڵێکی تۆکمەو بەهێزین، گورگ بیخوات (ئێمەش نەتوانین بیپارێزین) کەواتە: ئێمە زۆر زیانبارو هیچ لە دەست نەهاتووین ﴿١٤﴾ ئنجا کاتێك بردیان و بڕیاریاندا بیخەنە بنی بیرەکەوە (و کارەکەیان کرد)، ئێمە سروشمان بۆ لای یوسوف کرد: کاتێك دێ، بێئەوەی پێی بزانن، هەواڵی ئەو کارەیانیان

پێدەدەین‌و بیریان دەخەیەوە ﴿١٥﴾ ئنجا دەمەو خەوتنان بە گریان هاتنەوە لای بابیان ﴿١٦﴾ گوتیان: ئەی بابی خۆمان! ئێمە (لە کاتێکدا) چووین پێشبڕکە بکەین‌و یوسوفمان لەلای کەل‌و پەلەکەمان جێهێشت، گورگ خواردی، هەرچەندە ڕاستگۆش بین، هەر بڕوامان پێناکەی! ﴿١٧﴾ خوێنێکی بە درۆشیان لە کراسەکەی هەڵسوو، (بابیان) گوتی: بەڵکو نەفستان کارێکی لە دژی یوسوف بۆ جوان کردوون (و ئەنجامتان داوەو) هەڵوێستی منیش خۆڕاگرییەکی جوانە، هەر خواش پەنا پێبراوە، لە بەرانبەر ئەوەدا کە باسی دەکەن (کە گوایە یوسوف گورگان خواردوو بووە) ﴿١٨﴾}.

## شـیکردنـەوەی هـەندێـك لە وشــەکان

(عُصْبَةٌ ): (العُصْبَة: جَمَاعَةٌ مُتَعَصِّبَةٌ مُتَعَاضِدَةٌ) (عُصْبَة) بریتیـە لـە کۆمەڵـە کەسێك کە بە توندیی یەکدی بگرن‌و، پێکەوە تۆکمـە بن.

(ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ): (الضلال: العُدُول عَنِ الصّراطِ المُسْتَقِيم، وَعَنِ الصَّوَابِ)، (ضَلال) بریتیـە لـە لادان لـە ڕێـی ڕاسـت، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـتی کوڕەکـانی یـەعقووب کـە دەڵێن: بابمان لە گومڕاییەکی ڕووندایە، واتـە: بـە هەڵـەدا چـووە، مەبەسـتیان پێـی گومڕایـی دینیـی نیـە، ئەگـەرنا پێی کـافر دەبـوون، چونکە بابیـان پێغەمبـەرێکی خـوا بـووە، کەواتـە: (ضَـلال) لێـرەدا یـانی: نەیپێکـاوە، ڕێـی ڕاسـتی نـەگرتوە، لـە مامەڵە کـردن لەگـەڵ کوڕەکانیـدا.

(ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا ): (الطَّرْحُ: إِلْقَاءُ الشيءِ وَإِبْعَادُهُ) (طرح) بریتیـە لەوە کە شتێك فـڕێ بدەی‌و دووری بخەیەوە، دەگـوترێ: (رَأَيْتُـهُ مِنْ طَـرَحٍ، أي: مِنْ بُعْـدٍ) (طَـرَحْ)، واتـە: دووریی، بۆیە کە دەڵێن: (ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا) واتە: فڕێی بدەنـە دەشـتێکی چۆڵ، سـەر زەمینێکی دوور، کە کەسـی لـێ نەبـێ‌و لەوێ بفـەوتـێ.

(يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ ): واتـە: ڕووی بابتـان بـەرەو ئێـوە وەردەچەرخـێ، (خَـلاَ فُلاَن بفُـلاَنٍ: صَـارَ مَعَـهُ فِي خَلاءٍ، وَخَـلا الإِنْسَـانُ: صَـارَ خَالِيـاً)، (خَـلاَ فُلاَن بفُلاَنٍ)، واتە: لەگـەڵی بوو لە شـوێنێکی چۆڵ، (خَـلا الإِنْسَان)، واتـە: ئـەو ئینسانە چووە شـوێنێکی چۆڵ، مەبەسـتیان ئەوەیـە: (تَحْصـلُ لَكُـمْ مَـوَدَّةُ أَبـيكُمْ وَإِقْبَالُـهُ عَلَيْكُمْ)، خۆشـەویسـتیی بابتـان بـۆ ئێوە پەیـدادەبـێ‌و، بابتـان ڕووتـان تێـدەکات، بـە هـۆی ئەوەوە کە یوسوفی نامێنێ، خۆشـەویستییەکەی بۆ ئێوە یەکلادەبێتـەوە.

(غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ ): (الغَيَـابَةُ: مُنْهَبِط مِنَ الأَرْضِ جَمْعُهَا: غَيَابَات، وَهِيَ مَا غَابَ عَنِ البَصَرِ مِنَ الشيءِ، غَيَابَة الجبّ وَغَيَابَة القَبْرِ: قَعْرُهُمَا)، وشەی (غَيَابَة) کە بە (غَيَابَات) کۆدەبێتــەوە، بریتیــە لە زەوییەکی قووڵایــی نزم، (غَيَابَة) هــەر شتێکە کــە لــە چــاو دیــار نــەبێ، ئنجا (غَيَابَتِ الجبّ) واتــە: بنــی بیــرەکە، چونکە بنــی بیــرەکە دیــارنیە لە چاو، هەروەك (غَيَابَة القَبْرِ) واتــە: بنــی گۆڕەکــە، کــە لــە چاو دیــارنەبێو پەنهان بێ .

(الجُبُّ: البِئْرُ الَّذِي لَمْ تُطْو، أَي: لَمْ تُبْنَ بالحِجَارَةِ)، (جُب) بیــرێکــە کــە هەڵنەبەستــرابێ، واتە: ئەملاو لایەکەی بەردی تێنــەگیــرابێ، بەس هەڵقــەنرابێو تەواو.

(يَلۡتَقِطۡهُ ): واتــە: هەڵیــدەگرێتەوە، (لَقَطَ الشيءَ: أَخَذَهُ مِنَ الأَرْضِ والتَقَطَهُ أَيضاً، وَيُقَالُ: "لِكُلِّ سَاقِطَةٍ لاقِطَة")، (لَقَطَ الشيءَ) واتــە: شــتەکەی کــەوتبوو ئــەو هەڵــیگرتەوە لــە زەوی، (التَقَطَهُ)ش بــە هــەمان شــێوە واتــە: شــتەکەی دۆزیــەوەو هەڵــیگرتەوە، لــە پەندیشــدا هــاتوە: (لِكُلِّ سَاقِطَةٍ لاقِطَة) هــەموو کەوتوویــك هەڵگرەوەیەکی بۆ دەبێ.

(ٱلسَّيَّارَةِ ): (السَّيَّارَةُ: الجَمَاعَةُ، القَافِلَةُ)، (سَيَّارَة) کۆمەڵێکــن کــە بەرێــدا بــڕۆن، یــانی: (الجَمَاعَة السَّائِرَة فِي الأَرْضِ) کۆمەڵێــك کــە بــە زەویــدا بــڕۆن، کــە لــە کوردییدا پێی دەڵێن: (کاروان)، بە عەرەبیی دەگوترێ: (قَافِلَة).

(لَا تَأۡمَ۬نَّا ): واتە: تۆ لێمــان دڵنیانی، یاخود بە ئەمیندارمان دانانێی لەســەر یوســوف، (أَمِنَهُ عَلَيْهِ: عَدَّهُ أَميناً وَأَئْتَمَنَهُ عَلَيْهِ)، (أَمِنَهُ عَلَيْهِ) واتــە: بــە ئەمینــداری دانــا، بــە دەســت پاكو پارێــزەری دانــا بــۆی، (وَأَئْتَمَنَهُ عَلَيْهِ) هەمان مانای هــەیە.

(لَنَٰصِحُونَ ): واتە: ئێمە بۆی دڵسۆزو بە پەرۆشین، (النُّصْحُ: عَمَلٌ أَوْ قَوْلٌ فِيهِ نَفْعُ لِلْمَنْصُوحِ)، (نصح) بریتیــە لــە هــەر کــردەوەو هــەر قســەیەك کــە سوودی ئــەو کەســەی تێدابێ، کە نوصحەکەی ئاڕاستە دەکرێ .

(غَدًا): (الغُدْوَةُ وَالغَدَاةُ: أَوَّلُ النهَارِ، وَالغَدُ: اليَوْمُ الَّذِي يَلِي يَوْمَكَ الَّذِي أَنْتَ فِيهِ)، (غُدوَة) و (غَدَاة) بە سەرەتای ڕۆژ دەگوترێ، هەر وەك (عشي) یان (عشاء) بە دوای ئێوارە دەگوترێ، (غد) ئەو ڕۆژەیە كە بە دوای ئەو ڕۆژە دادێ، كە تۆی تێدای، تۆ لە چ ڕۆژێكدای، ڕۆژەكەی دوایی پێی دەگوترێ: (غد).

(يَرْتَعْ): (الرَّتْعُ: أَصْلُهُ أَكْلُ البَهَائِمِ وَللإِنْسَانِ: الأَكْلُ الكَثِير)، (رتع) لە بنەڕەتدا بە خواردنی ئاژەڵ دەگوترێ، دەگوترێ: (رَتَعَتِ الدَّابَّةُ) واتە: ئەو ئاژەڵە زۆر لەوەڕی كرد، یان زۆر لەوەڕا، بەڵام كە بۆ مرۆڤ بەكاردێ، واتە: خواردنی زۆر، یاخود كەیف كردنو ڕابواردنو هەوای باڵی خۆدان .

(وَيَلْعَبْ): یاریی دەكات، دەگوترێ: (لَعِبَ فُلانٌ، إِذَا كَانَ فِعْلُهُ غَيْرَ قَاصِدٍ بِهِ مَقْصَداً صَحِيحاً)، واتە: ئەگەر كەسێك كارێك بكات مەبستێكی جیددیی لە كارەكەدا نەبێ دەگوترێ: (لَعِبَ فُلانٌ)، بۆ وێنە: كەسێك ڕا دەكات، مەبەستی ئەوە نیە كە لە شتێك ڕا بكاتو لە شتێك بترسێ، بەڵكو ڕاكردنەكەی مەبەستی پێی ئەوەیە كە جۆرێك لە وەرزش، یان كەسێك كە باز دەدات، هەروەها هەموو ئەو كردەوانەی كە دیارە بە جیددیی نین، پێچەوانەی (جِدّ) بریتیە لە (لَعِب) یاریو گەمەو گاڵتە .

(وَأَجْمَعُوٓاْ): واتە: بڕیاری هەرەوەزییاندا، یاخود بڕیاریاندا، (اجْتَمَعَتْ آراؤُهُمْ عَلَيْهِ)، ڕایەكانیان لەسەر ئەو شتە كۆكردنەوە .

(عِشَآءً): (العِشَاءُ: مِنْ صَلاَةِ المَغْرِبِ إِلى العَتَمَةِ) (عشاء) لە كاتی خۆر ئاوابوونو نوێژی شێوانەوە تاكو نوێژی خەوتنان دەگرێتەوە، دەشگونجێ مەبەست لە (عشاء) كاتی تاریكایی شەو بێ، یان كاتی ماڵ خەوتنان .

(نَسْتَبِقُ): (الإِسْتِبَاقُ: التَّسَابقُ: افْتِعَالٌ مِنَ السَّبْقِ)، (إِستباق) و (تَسَابق) هەردووكیان بە مانای پێشبڕكە، غار غارێن دێن، كە (إفتِعَال)ە لە (سَبْق)، هاتوە.

(مَتَٰعِنَا): (المتَاعُ: مَا يُتَمَتَّعُ بِهِ أَي: يَنْتَفَعُ)، (مَتَاع) هەر شتێکە کە سوودی لێ ببینرێ، ئینسان کاتێکی کەمی لەگەڵ بگوزەرێنێ و لێی بەهرەمەند بێ، هەروەها بەو ماوە کەمەش کە ئینسان دەیگوزەرێنی لە ژیانی دنیادا، یان لە شوێنێك، ئەویش پێی دەگوترێ: (مَتَاع).

(ٱلذِّئْبُ): واتە: گورگ، خوێنراویشەتەوە: (ذیب)، (الذِّئْبُ: حَيْوَان مِنْ الفَصِيلَةِ الكَلْبِّي وَهُوَ كَلْبُ بَرِّي وَحْشِيٌّ)، (ذئب) گورگ ئاژەڵێکە لە جۆری سەگ، کە بریتیە لە سەگێکی دڕەندە کەماڵیی نیە .

(وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا): واتە: (بِمُصَدِّقٍ لَنَا) یانی: تۆ ئێمە بە ڕاست دانانێی.

(قَمِيصِهِۦ): (القَمِيصُ: الشِّعْارَ تَحْتَ الدِّثَار)، (قمیص) ئەو بەرگەیە کە یەکسەر بە پێستەوە دەنووسێ، (دثار) ئەوەیە کە لە سەرووی پۆشاکی نێوەوە بە خۆدادەدرێ، یان دەڵێ: (لِبَاس رَقِيق يُرْتَدى تَحْتَ السِّتْرَةِ غَالِبًا) بەرگێکی تەنکە کە لە بن پۆشاکی سەرەکیی لەبەر دەکرێ .

(سَوَّلَتْ): (سوَّلَتُ الشيء: زَيَّنْتُهُ) واتە: ئەو شتەم جوان کرد، ئاسانم کرد، ڕازاندمەوە .

(فَصَبْرٌ جَمِيلٌ): واتە: خۆڕاگرتنێکی جوان، (الجَمَالُ: الحُسْنُ الكَثِير، وَجَمِيلُ وَجَمَالُ وَجُمَّال، عَلَى التَّكْثِير)، (جمال)، واتە: جوانییەکی زۆر، هەر سێ وشەی: (جَمِيلٌ وَجَمَالٌ وَجُمَّالٌ) بە مانای جوانییەکی زۆر دێن.

(ٱلْمُسْتَعَانُ): پەنا پێبراو، داوای یارمەتیی لێکراو، (الإِسْتِعَانَةُ: طَلَبُ العَوْنِ)، (إستعانة) بریتیە لە داوا کردنی یارمەتی، کەواتە: (المُسْتَعَان)، (إسْم مَفْعُول)ە، پەنا پێبراوە، (المُسْتَعِين)، (إسْم فَاعِل)ە، پەنا پێبەر، یاخود داوای یارمەتییکەر.

# مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ لێرەدا دوای ئەو شەش ئایەتەی كە وەك پێشەكیی وابوون بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتی یوسوف و بابیو برایەكانی، ئنجا دەست دەكات بە چوونە نێو گێڕانەوەی بەسەرهاتی یوسوف ﵇، كە دیارە ئەم دەرسەمان - وەك پێشتر گوتم - ئاڵقەی یەكەمی زنجیرەی بەسەرهاتی یوسوف پێكدێنێ، كە هەمووی سێزدە ئاڵقەیە، ئەم دوازدە ئایەتە ئاڵقەی یەكەمی پێكدێنن، سەرەتا خوا ﷻ ئاوا دەست پێدەكات: ﴿لَّقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ﴾، بە جەخت كردنەوە، بە دڵنیاییەوە، لە یوسوف و برایەكانیدا، واتە: لە بەسەرهاتی یوسوف و برایەكانیدا، نیشانە هەن بۆ پرسیاركاران، بۆ كەسانێك كە لە شت دەكۆڵنەوە، عەودالن، دەیانەوێ لە شتەكان تێبگەن، دەیانەوێ ڕاستییەكانیان بۆ دەربكەون، یان بۆ كەسانێك كە دەیانەوێ لە بەسەرهاتی یوسوف ﵇ و برایەكانی تێبگەن .

كە دەفەرموێ: (ءَايَٰتٌ)، نیشانان، كۆی (آية) بە مانای (عَلامَة) نیشانە، دێ، بەڵام لێرەدا دەگونجێ بە مانای پەندو دەرس وەرگرتن بێو، دەشگونجێ بە مانای بەڵگەو دەلیل بێ، یانی: لە بەسەرهاتی یوسوف دا بەڵگە هەیە، لەسەر ئەوەی خوا بەندە چاكەكانی خۆی زایە ناكات، هەروەها بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە كە غەشو خیانەت هیچ سەرەنجامێكی نیە، جگە لە شەرمەزارییو عەیبداریی دنیاو قیامەت، دیسان بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە كە ئەگەر مرۆڤ پشت بە خوا ببەستێ، سەركەوتوو دەبێو، وە بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە كە مرۆڤ دوای ئەوەی تووشی میحنەتو نارەحەتیی دێ، بەرەو بەرزی دەچێ، هەروەها زۆر بەڵگە هەنو زۆر دەرسو پەندو عیبرەت هەن لە بەسەرهاتی یوسوف و دە برایەكەیدا، چونكە پێشتریش گوتمان كە یەعقووب ﵇، دوازدە كوڕی بوو ون، دووانیان لە دایكێك بوون، كە یوسوف و بنیامینن و، دایكیان ناوی ڕاحیل بووە، بەپێی ئەوە كە لە تەورات لە (سفر التكوين)دا هاتووە، دە (١٠)شیان دایكیان جیا بووە كە دیارە پێشتر ناومان هێناون، بۆیە جۆرێك لە حەسادەتو ئێرەیی پێبردن، لەلایەنی ئەو دە (١٠) برایەوە، بەرانبەر بەو دوو برایە هەبووە .

ئنجا خوای پەروەردگار بەسەرهاتەکەیان دەگێڕێتەوە، دەفەرمویٚ: ﴿ إِذْ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ ﴾، واتە: کاتێك گوتیان، کێ گوتی؟ ئەو دە (١٠) برایە، گوتیان: (لَيُوسُفُ)، ئەو (ل) لامە بۆ تەئکیدە، واتە: هیچ گومانی تێدانیە، یوسوف و برایەکەی، کە بە پێی (پەیمانی کۆن) ناوی بنیامین بووەو، هەردووکیان لە دایکێکن، ئەگەرنا هەموویان لە بابێکن، هەر دوازدەیان هی یەعقووبن، بەلاّم ئەو دە برایە، ئەو دووانە جیا دەکەنەوە، دەڵێن: ئەوان لە ئێمە جیان، چونکە دایکیان جودایە، جا دەڵێن: بێگومان یوسوف و برایەکەی، لەلای بابمان لە ئێمە خۆشەویستترن، (وَنَحْنُ عُصْبَةٌ)، کە ئێمەش کۆمەڵێکی تۆکمەو، دەستە پیاوێکین، دە کەسین بە پێی عەقڵ و مەنتیق بێ، دەبێ باب، دە کوڕان، بە دوو کوڕان نەدا، کەچی ئەو دووەی لە ئێمە خۆشتر دەوێن، لە حاڵێکدا ئێمە زیاتر بەکەڵکی دێین !!

هەڵبەتە ئەوە گومان و خەیاڵی ئەوان بووە، لە وەهمی ئەواندا وا بووە، ئەگەرنا بە دڵنیاییەوە یەعقووب ﷺ کە پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوایە، وا نەبووە کە لایەنگیری بکات بە لای دوو کوڕدا، لەسەر حیسابی دە کوڕان، بەلاّم لە وەهم و خەیاڵی خراپی خۆیاندا، بابیان بەو شێوەیە وێنا کردوە، دوایی دەڵێن: ﴿ إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، بێگومان بابمان لە گومڕاییەکی ڕوون دایە، کە مەبەستیان لە گومڕایی، واتە: لە کاروباری دنیاییو، لە هەڵس و کەوتی لەگەڵ ماڵ و خێزان و کوڕەکانی دا، بابمان نەیپێکاوەو بەهەڵەدا چووە، ئەگەرنا لێرەدا مەبەست پێی گومڕایی ئایینی نیە، چونکە ئەگەر وابڵێن، پێی کافر دەبن، چونکە بابیان پێغەمبەر بووە .

ئنجا دەکەونە کەین و بەین و تەگبیر کردن لە دژی یوسوف ﷺ، ﴿ ٱقْتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ ﴾، یوسوف بکوژن، یاخود فڕێی بدەنە سەر زەمینێکەوە، واتە: سەر زەمینێکی چۆڵەوانی، قاقڕو دێمەکار، بێ ئاوەدانیی، بۆ

ئەوەی لەوێ بفەوتێ، ﴿ يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ ﴾، ئەگەر واتان كرد، ئەوە ڕووی بابتان بۆ ئێوە یەكلادەبێتەوە، بەردەمی ڕووی بابتان بۆ ئێوە چۆڵ دەبێ.

پسپۆڕانی زمان دەڵێن: (الخِلُّ: الفراغ)، (حِلٌّ) بریتیە لە بۆشایی، واتە: بەرچاوی بەردەبێ، ئەو پەردەیە لەبەر چاوی لادەچێ‌و، ڕوو لە ئێوە دەكات‌و گرنگیی‌و بایەختان پێدەدا، ﴿ وَتَكُونُوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ قَوْمًا صَـٰلِحِينَ ﴾، ئنجا لەدوای وی، یانی: دوای یوسوف، دوای ئەوەی لە كۆڵی دەكەنەوە، دەبنە كۆمەڵێكی چاك، كە لێرەدا مەبەست لە كۆمەڵێكی چاك، واتە: حاڵ‌و باڵی دنیاتان باش دەبێ، ئێستا بابتان ڕووتان تێناكات، بابتان گرنگییتان پێنادات، لەبەر ئەو دوو كوڕە، ئنجا ئەگەر بێت‌و یوسوف لە كۆڵ بكەنەوە، ئەوە ئەو پەردەیە كە لەبەر چاوی بابتانە، لادەچێ‌و بابتان باش ئێوە دەبینێ، ڕوو لە ئێوە دەكات‌و گرنگییتان پێدەداو، حاڵ‌و باڵتان باش دەبێ، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نەبووە – وەك هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە – دوای ئەوەی یوسوف دەكوژن، ئنجا تۆبە دەكەن‌و دەبنە پیاوی باش ! نەخێر باسی ئەوە نیە، لێرەدا (صالح)، وەك چۆن بە مانای باشیی دێ، باشیی مەعنەویی، بە مانای باشیی دنیاییش دێ، واتە لە ڕووی دنیایی‌و كاروباری دنیاییتانەوە بارودۆختان باش دەبی، ئێستا بارودۆختان خراپە، چونكە بابتان گرنگییتان پێنادا.

﴿ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا۟ يُوسُفَ ﴾، قسەكەرێكیان گوتی: یوسوف مەكوژن، دیارە ئەوەیان لە وانی دیكە عاقڵتر بووە، بە ویژدانتر بووە، بە ڕەحمتر بووە، واش پێدەچێ، ئەو بۆچوونی: كوشتنی یوسوفی، هەر نەبووبێ، بەڵام كە نۆ كەس دێنە سەر قسەیەك، دیارە ئەو یەكەی دیكەش، لە دوای وان چووە، دەڵێ: یوسوف مەكوژن، ﴿ وَأَلْقُوهُ فِى غَيَـٰبَتِ ٱلْجُبِّ ﴾، ئنجا كە دەڵێ مەیكوژن، واتە: نە بەڕاستەوخۆ بیكوژن، نە فڕێی بدەنە سەر زەمینێكی چۆڵەوانیی، چونكە لە هەردوو حاڵەتاندا، هەر كوشتنە، هەر میكانیزمەكەی‌و شێوازەكەی جیایە، ئەگەرنا لە هەردوو حاڵاندا یوسوف هەر لە بەین دەچێ، چ ناڕاستەوخۆ لە دەشتێكی چۆڵەوانیی بەجێی بهێڵن، كە گورگ بیخوات، یان لە برسان بمرێ، یان لە تینوان بخنكێ، یان یەكسەر بیكوژن، وای لێمەكەن، ﴿ وَأَلْقُوهُ فِى غَيَـٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَـٰعِلِينَ ﴾، بەڵكو فڕێی بدەنە

تاریکایی بیرێکەوە، بیخەنە بنی بیرێکەوە، ئنجا هەندێك لە کاروانچییان هەڵیدەگرنەوە، ﴿ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴾، واتە: ئەگەر هەر ئەنجامدەری ئەوەن کە دەتانەوێ، واتە: ئەگەر نەیکەن باشترە، بەڵام ئەگەر هەر دەتانەوێو سوورن لەسەر ئەوە شتێك لە دژی یوسوف بکەن، بیخەنە نێو بنی بیرێکەوەو، کاروانچیی هەڵیدەگرنەوەو لە کۆڵ ئێوە دەبێتەوەو لێتان دوور دەکەوێتەوە، بەوە ئامانجەکە دێتە دی، ئیدی پێویست بەوە ناکات، ئەو گوناهە گەورەیە بکەنو یوسوف بکوژن، چ بە کوشتنی ڕاستەوخۆ، چ بە کوشتنی ناڕاستەوخۆ .

دیارە سەرەنجام ڕایان لەسەر ئەوە کۆدەبێتەوەو دێنە سەر قسەی ئەو قسەکەرەیان، ئنجا ئەوەیان هەندێك دەڵێن: برا گەورەکەیان بووە، کە (ڕەئوبین) بووە، یان (ڕائوبین)و، هەندێك دەڵێن: (یەهوزا) بووە، هەندێك دەڵێن: (شەمعون) بووە، بەڵام دیارنییەو لە قورئانیشدا دیاریی نەکراوە، بەڵام وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، واپێدەچێ برا گەورەکەیان بووبێ، کە لە پەیمانی کۆندا دەڵێ، ناوی ڕەئوبین، یان ڕائوبین بووە .

ئنجا دوای ئەوە کە لە بەینی خۆیاندا ئاوا ڕێك دەکەونو ئەو تەگبیرە دەکەن، دەچنە لای بابیان: ﴿ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾، گوتیان: ئەی بابی خۆمان! ئەوە چیتە؟ بۆچی لە ئێمە دڵنیانی بەرانبەر بە یوسوف؟ یاخود: ئێمە بە ئەمیندار دانانێی لەسەر یوسوف، ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴾، کە بێگومان ئێمە بۆ ئەو زۆر دڵسۆزینو بە پەرۆشینو بە خەمەوەین، شتێکی سەیرە کە تۆ متمانەت بە ئێمە نیە، بەرانبەر بە یوسوفو لێمان دڵنیانی! کە ئەوە جۆرێکە لە هەڵنانو هاندانی بابیان، ویستوویانە ڕقی هەڵسێننو بیوروژێنن، بڵێ: چۆن متمانەم بە ئێوە نیە؟

دوایی دەڵێن: ﴿ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ ﴾، بەیانی لەگەڵمان بینێرە، با بۆخۆی کەیفو صەفا بکات، بێتو بچێو گەمەو یاریی بکاتو خواردن بخوات، ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾، بە دڵنیاییەوە ئێمەش بۆ ئەو پارێزەر دەبین، دەیپارێزین ناهێڵین هیچی لێبێ.

﴿ قَالَ إِنِّي لَيَحْزُنُنِيٓ أَن تَذْهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ ﴾

یەعقووب ﷺ دوو پاساوان دێنیتەوە دەڵێ:

**یەکەم**: بێگومان ئەوە من دڵتەنگ دەکات کە لەگەڵ خۆتانی بەرن، پێی دڵتەنگ دەبم، لێم دوور بکەوێتەوە، هەڵبەتە بۆیەش دڵتەنگ بووە، چونکە دڵی خورپەی کردوە کە ئەوانە نیازێکی خراپیان هەیە، سەیری هەڵس‌و کەوتەکانی ئەوانی کردوە، پاشان هەموویان یەك دەنگ‌و یەك دەست هاتوون، گوتوویەتی: ڕەنگە نەخشەو پیلانێکیان لە بەرنامەدا هەبێ.

**دووەم**: پاساوی دووەمیشیان ئەوەیە کە دەڵێ: ﴿ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ ﴾، دەشترسم گورگ بیخوات، لە حاڵێکدا کە ئێوە لێی بێ ئاگان، یانی: ئەگەر ئێوە ئاگاتان لێی بێ، گورگ زەفەری پێ نابات.

﴿ قَالُواْ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴾، گوتیان: ئەگەر گورگ بیخواو ئێمەش دەستە پیاوێکین، کۆمەڵە پیاوێکی تۆکمەو توندو تۆڵین، ئەوە بێگومان ئێمە لە زیانمەندانین، واتە: خەڵکێکی دەستەپاچەو هیچ لە دەست نەهاتووین، ڕازیش نابین بەوە وەسف بکرێین کە ئێمە زیانبارین‌و هیچ لە دەست نەهاتووین‌و دەستە پاچەین، بۆیە دڵنیابە کە دەیپارێزین، چونکە ناهێڵین ئەو عەیبەمان بێتە سەر، کە بەو جۆرە وەسف بکرێین.

لێرەدا کە وشەی: ﴿ لَّخَٰسِرُونَ ﴾ بەکاردێنن، واتە: وەك چۆن بازرگانێك ئەگەربێت‌و دەستمایەکەی لە دەست بدات، خەسارەتمەند دەبێ، ئێمەش ئەگەر ئەو کەم‌و کوڕییە بێتەسەرمان‌و، برایەکەی خۆمان نەپارێزین، وەك ئەو بازرگانە سەرنەکەوتووە واین، کە دەستمایەکەی خۆی لە دەست دەدات .

﴿ فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓاْ أَن يَجْعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ ﴾، ئنجا کاتێك بردیان‌و بڕیاری یەکجارەکییاندا کە بیخەنە نێو بنی بیرەکە، یاخود: تاریکایی بیرەکە، کە نابینرێ، ئەوەیان کرد کە کردیان، دیارە لێرەدا ئەوە فڕتێنراوە، چونکە سیاقەکە دەلالەتی لەسەر دەکات‌و دەیگەیەنێ، ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ ﴾، لەو کاتەش دا ئێمە ئیلهام‌و سروشمان

بۆ کردو خستمانە دڵیەوە، یاخود لە ڕێی فریشتەیەکەوە ئاگادارمان کردەوە، ﴿ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾، کە بە دڵنیاییەوە – ئەی یوسوف!– تۆ لەم کارەیان ئاگاداریان دەکەیەوەو هەواڵیان پێدەدەی بێ ئەوەی ئەوان هەست پێبکەن، واتە: لە حاڵێکدا تۆ خۆتیان پێ دەناسێنیەوەو ئەو کارەیان بیردەخەیەوە، ئەوان هەست ناکەن کە تۆ یوسوفی، هەڵبەتە ئەوە دڵنیا کردنەوەی خوای پەروەردگارە بۆ یوسوف، کە تۆ نەك هەر لەو بیرو چاڵەدا نامری، بەڵکو دەربازت دەبێ‌و، دواییش برایەکانیشت دەبینیەوەو، ئەوەشیان بە چاودا دەدەیەوە .

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَجَاءُوا أَبَاهُمْ عِشَاءً يَبْكُونَ ﴾، هاتنەوە لای بابیان دەمەوخەوتنان بە گریانەوە، ﴿ عِشَاءً ﴾ کاتی نێوان شێوان‌و خەوتنانە، یاخود تاریکیی شەو، یانی: بە تاریکیی شەوێ‌و بە گریانەوە هاتنەوە لای بابیان، ﴿ قَالُوا يَا أَبَانَا إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَاعِنَا فَأَكَلَهُ الذِّئْبُ ﴾، گوتیان: ئەی بابە گیان! ئێمە چووین پێشبڕکەمان کرد، غارغارێنمان بە وڵاخەکانمان کرد، یوسوفیشمان لەلای کەل‌و پەلەکانمان بەجێ هێشتبوو، هەتا هاتینەوە، گورگ خواردبووی .

لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: یەعقووب گوتی: باشە شوێنەوارێکی، ئێسقانێکی، گوتیان: هەر هیچیان لێ نەهێشتبۆوە هەموویان خواردبوو، کە ئەو وردەکارییە لە قورئاندا نەهاتوە، گرنگ ئەوەیە گوتوویانە: گورگ خواردوویەتی، ئیدی مەرج نیە گوتبێتیان: هیچی لێ نەهێشتۆتەوە، ڕەنگە گوتبیان: گۆشتەکەی هەموو لێکردۆتەوەو خواردوویەتی‌و بە کەڵکی ئەوە نەهاتوە، بۆ تۆی بێنینەوەو لەوێ ناشتوومانە، ڕەنگە ئاوایان گوتبێ، ﴿ وَمَا أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَادِقِينَ ﴾، هەڵبەتە تۆ بۆ ئێمە، بەڕاست دانەرنی، بەڕاست دانەری ئێمە نی‌و بڕواو متمانەمان پێناکەی، هەرچەندە ڕاستیش بکەین، واتە: هەرچەند ئێمە ڕاست دەکەین، بەڵام تۆ هەر بڕوامان پێناکەی‌و متمانەت پێمان نیە، ئەمەش جۆرێکە لە هاندانی بابیان، کە بە گلەیی‌و سەرزەنشتەوە بە بابیان دەڵێن: تۆ بۆچی بڕوامان پێناکەی، کە ئێمە ڕاستگۆشین ؟

﴿ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖ ﴾، ئنجا خوێنێکی درۆشیان لە کراسەکەی هەڵسوو، خوێنێکی بەدرۆو ناڕاست، واتە: خوێنی خۆی نەبوو، گوتیان: ئەوەش کراسەکەی !

﴿قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗا ﴾، بابیان گوتی: بەڵکو نەفستان کارێکی بۆ جوان کردوون‌و ڕازاندوونەوە لە دژی یوسوف، کە دیارە لێی دڵنیا نەبووە ئەو کارەچییە، واتە: بە دڵنیاییەوە گورگ نەیخواردوە، بەدەستی گورگان نەچووە، گورگان خواردوو نەبووە، بەڵکو ئێوە شتێکتان لە دژ کردوە، بەڵام نەیزانیوە شتەکە چییە ؟

﴿ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ ﴾، واتە: هەڵوێستی منیش بریتیە لە خۆڕاگرییەکی جوان، خۆڕاگریی جوانیش بریتییە لەوەی سکاڵای تێدا نەبێ‌و، مرۆڤ دادو فیغان نەکات‌و، پرتەو بۆڵە نەکات، ﴿وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴾، لە بەرانبەر ئەوەشدا کە ئێوە وەسفی دەکەن‌و دەیڵێن، هەر خوا بۆ من پەنا پێبراوەو داوای یارمەتیی لێکراوەو، پشتم بە خوا قایمەو تەنیا داوای یارمەتیی لەو دەکەم .

دیارە دڵنیابووە لەوەی ئەوان گوتوویانە، وا نەبووە، بەڵام لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ناوەشێتەوە، وشەی بێ نەزاکەت‌و ناشیرین بەکاربێنن، تەنانەت بۆ کەسانێکیش کە شایستەیانە، ئەگەرنا ئەگەر یەکێکی دیکە بووایە دەیگوت: (والله المستعان على ما تَكْذِبون)، خوا پەنا پێبراوە لەسەر ئەو درۆیەی کە دەیکەن، زانیویەتی درۆ دەکەن‌و ڕاست ناکەن، بەڵام فەرموویەتی: ﴿عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴾، لەسەر ئەوەی کە ئێوە دەیڵێن‌و وەسفی دەکەن، پەنا دەبەمە بەر خواو داوای یارمەتیی لە خوا دەکەم .

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم : سەرەتاو دەستپێکی بەسەرهاتی یوسوف:**

کە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ۝٧﴾، بێگومان لە بەسەرهاتی یوسوف و برایەکانی دا، نیشانەی زۆر هەن، بۆ پرسیارکاران، یان بەڵگەی زۆر هەن بۆ بەدوادا گەڕاوان، یاخود عەودالانی زانست. ئەمە دەستپێکی بەسەرهاتی یوسوف و برایەکانیەتی .

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە پێنج بڕگەدا :**

**١) -** کە دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ كَانَ﴾، بۆچی بە جەخت کردنەوە وا دەڵێ؟ چونکە هەندێ لە زانایان دەفەرموون: ئەم (ل)ە، زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند، یانی: سوێند بە خوا لە یوسوف و برایەکانیدا بەڵگە هەن، نیشانە هەن بۆ پرسیارکاران، لێرەدا خوا ﷻ بۆیە ئەوەمان بۆ جەخت دەکاتەوە تاکو دڵنیابین، کە لە بەسەرهاتی یوسوف لەگەڵ برایەکانی دا، زۆر بەڵگە هەن، زۆر نیشانە هەن، زۆر دەرس و پەندو عیبرەت هەن، کەواتە: باش سەرنجی بدەن! باش لێی وردببنەوەو لێی بکۆڵنەوە! تاکو ئەو نیشانانە، ئەو بەڵگەو دەلیلانە، ئەو پەندو عیبرەتانەتان، دەستگیربن .

**٢) -** کە دەفەرموێ: ﴿فِي يُوسُفَ وَإِخْوَتِهِۦٓ﴾، لێرەدا شتێك قرتێنراوە، (أي: فِي قِصَّة يُوسُفَ وإِخوتِهِ أو فِي حَادِثَة يُوسُفَ وإِخْوَتِه) لە بەسەرهاتی یوسوف و برایەکانیدا، یاخود: لە ڕووداوی یوسوف و برایەکانیدا، یان: (فِي شَأن يُوسُفَ وإِخْوَتِه) لە حاڵ و باڵ و لە کاری یوسوف و برایەکانیدا .

٣) - کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِخْوَتِهِۦ ﴾، برایـەکانی، بێگومـان مەبەسـت پێـی دە (١٠) برایەکـانـی، چونکە (بنیامین) کێشەی لەگەڵ یوسـوف دا نەبووەو گچکەش بووە، دیـارە بنیـامین لـە یوسـوفیش گچکـەتر بـووەو بنیـامینیش بـە دەسـت دە برایەکـەیەوە، هەر گرفتـارو سـتەم لێکـراو بووە، بە بەڵـگەی چی؟ بە بەڵـگەی ئایەتی ژمارە (٦٩) هـەر لە سـوورەتی یوسـوف دا، کە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَخَاهُۖ قَالَ إِنِّيٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، کـاتێك برایـەکانی بـۆ جـاری دووەم چـوونە لای یوسـوف، (کـە بنیامینیشیان لەگەڵ خۆیان بردبوو لەسـەر داوای یوسـوف)، یوسـوف برایەکـەی وەخۆگـرت، هێنـایە لای خۆیو بە شـێوەی پەنامەکییو تایبـەت قسەی لەگـەڵدا کرد، پێی گـوت: دڵنیـابە من برای تـۆم، واتە: ئەو برایەتـم کە ون بووە، شوێنە ون بووە، ئنجـا نارەحەت مەبە بەوەی کە دەیـانـکرد .

کەواتە: دیـارە لە دوای یوسـوف ﷺ لەگـەڵ (بنیـامین)یش باش نەبوون!

ئنجا بەچی دەزانـین کـە یوسـوف یـازدە بـرای بـوونو یـەعقووبیش سـەرجەم دوازدە کــوڕی هـەبوون؟ بـەوە دەزانیــن: یوسـوف ﷺ یـازدە ئەسـتێرەی دیـون لەگەڵ خۆرو مانگدا، سـڵاویان لێکــردووەو لـە خەونیـدا کڕنووشـیان بۆ بـردوە: ﴿ إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ ﴾، کەواتـــە: خۆی دوازدەمینیان بووە، یازدە برایەکەشی، دە (١٠)یان بـوون کە پیلانیـان لـە دژ گێڕاوەو، برایەکەی خۆشی کە لە دایکی خۆی بووە (بنیـامین)، هـەروەها بـەوەش دەزانین یوسـوفو بنیامین دایکیان جیابووە، {مەبەستم ئەوەیـە: مـەرج نیـە لـەو شـتانەدا تەنیا پشـت بە پەیمـانی کۆن و تەورات (سفر تكوين) ببەستین، بەڵـکو هەر لە خودی قورئـان، ئەوە هەڵدەهـێنجین، کە یەعقـووب دوازدە کـوڕی بـوون، ئنجا یوسـوفو یەکێکی دیکـەیان – نـاوی هەرچی بوو بێ، چونکە لـە (پـەیمانی کـۆن)دا، دەڵێ: نـاوی بنیـامین بـووە – دایکـیان جیا بـووە}، بـە چی دەزانیــن دایکـیان جیـا بـووە؟ بـەوە کـە لـە ئایـەتی (٥٩)ی سـوورەتی یوسـوفدا، خــوا

دەفـــەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِي بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ﴾، واتـــە: کاتێك زادو زەخیرەکەی بۆ پێچانەوە گوتی: برایەکتانم بۆ بێنن لە بابتـان بێ.

ئاشکرایە هەموویان هەر لە بابیانن، کەواتە یانی: لە بابتان بێ، بەڵام دایکی جیابێ، کە دیارە مەبەست برا گچکەکەی یوسوفە، کە لەگەڵ یوسوف دا لە دایکێك بوون و لە (پەیمانی کۆن)دا دەڵێ: دایکیان ناوی ڕاحیل بووە .

٤) - ﴿ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ﴾، وشەی (ءَايَٰتٌ)، (الآيَات: حَقِيقَة فِي آيَات الطريق وَهِي عَلامَات يجعلونها فِي المفاوز تكون بادية لاتغمرها الرمال لتكون مرشدة للسائلين، ثم أُطلقت على جميع علامات الصدق، وأدلة المعلومات الدقيقة)، (آیات) بریتیە لەو نیشانانەی لەسەر ڕێ دا دەنرێن، کە عـادەتیان وابووە لە بیـابان نیشـانەیان چەقاندوون، کە بەرز بوون، بە شێوەیەك کە ئەگـەر با هەڵیکردو لمی لەگـەڵ خۆی دا هێنـا، ئەو نیشـانانە ون نەبـن، بۆ ئەوەی خەڵك بەو ڕێیە بزانـێ، {ئـەوە دیارە لە بیـاباندا وایانکـردووە، ئەوانەی کە کاروانچیی بوون و بەڕێدا ڕۆیشتوون، بە هۆی ئەو نیشانانەوە زانیویانە ڕێیەکە بە کـوێ دایە، ئەگـەرنا بیابان هەمیشە با هەڵدەکـاو گـەردەلوول و گێژەڵۆوکـە، لمەکە دێنـێ و دەبات و نیشانەکان ون دەکات} دوایی وشەی (آیات) بۆ هـەموو ئەو شـتانەی دەبنـە بەڵـگـە لەسەر ڕاستیی شتێك و، دەبنە دەلیل و بەڵـگـە لەسەر زانیـاریی ورد، بەکـارهـاتوون.

ئنجـا لێرەدا کـە دەفـەرموێ: ﴿ ءَايَٰتٌ لِّلسَّآئِلِينَ ﴾، نیشـانە هـەن، یـاخود بەڵـگـە هـەن بـۆ پرسیارکـاران، یـانی: دەگونجـێ زۆر بەڵـگـان لـە بەسـەرهاتی یوسوف و برایەکـانی، دەربێـنین، بۆ نموونـە:

١ - بەڵـگەی مشوورخۆریی خـوا، بـۆ بەنـدە ڕاستەکانی، لەبەسـەرهاتی یوسـوف و برایـەکانی دا، بەڵـگەمان دەست دەکـەوێ کـە: خـوا مشوور دەخـوات لـە بەنـدە ڕاستەکانی و سەرپەرشتییان دەکات و، ئاگای لێیانە و، سـەریان دەخـات و، دەربازیـان دەکـات و سـەرفرازیـان دەکـات .

۲- بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە درۆو دەلەسەو خیانەتو فرتو فێڵ، بێئاکامەو مایەی ڕوو زەردییو عەیبدارییو گوناهباریی خاوەنەکەیەتی.

۳- بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کەسانی ڕەوشت بەرزو ڕەوشت پاكو نیەت پاكو مەعدەن چاك، هەمیشە سەربەرز دەبن لە دنیاو دوارۆژدا.

٤- بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە سەرەنجامی چاك بۆ پارێزکارانو بۆ خوا صولحاوانە، هەر کەسێك بۆ خوا صولحاو پارێزکاربێو چاکەکاربێ، سەرەنجامو ئاکامی باشی دەبێ .

٥- بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کەسانی حەسوودو درۆزنو بە فرتو فێڵ، دوایی خەجاڵەت دەبنو شەرمەزار دەبنو، دەبێ داوای لێبوردن لە خەڵك بکەن .

٦- لە بەسەرهاتی یوسوفو برایەکانی دا، بەڵگە هەیە کە پێغەمبەرانعليه السلام لە لووتکەی هەرە بەرزی ڕەوشتی جوان دابوون، تۆ کە تەماشای هەڵوێستەکانی دوایی یوسوف دەکەی، کە برایەکانی دەبینێتەوەو برایەکانی بە خەجاڵەتییو شەرمەزاریی لەگەڵیدا ڕوو بەڕوو دەبنەوە، چەند ڕەوشت بەرزانە، چەند نەفس بەرزانە، چەند بە نەزاکەتانە، مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات !!

۷- لە بەسەرهاتی یوسوفو برایەکانی دا، بەڵگەی ڕاستێتیی موحەممەد ﷺ کە پێغەمبەری خوایەو، قورئان کە دوایین کتێبی خوایەو ئیسلام کە دوایین ئایینو بەرنامەی خوایە، دەست دەکەوێ .

هەروەها لە بەسەرهاتی یوسوفو برایەکانی دا، زۆر نیشانەی دیکەو، زۆر بەڵگەی دیکە لەسەر گەلێك ڕاستی دیکە هەنو، گەلێك دەرسو پەندو عیبرەتی گەورە هەن، وەك لە کۆتایی تەفسیری ئەم سوورەتەدا ئاماژەیان پێ دەکەین، کە سەرجەم شەست (٦٠) دەرس و پەند هەڵدەهێنجین .

٥) - ﴿لِّلسَّآئِلِينَ﴾، وشەی (سائل)، کۆیەکەی (سائلین)ە، یان (سائلون)، واتە: پرسیارکاران، یاخود داواکاران، (سائل) هەم بە مانای داواکار دێ، وەك لە کوردیی دا دەڵێن: سواڵکەر، بە عەرەبی دەڵێن: (سائل)، کەسێکە دێتە بەر

دەرگاتو داوات لێدەکات، دیسان (سائل) بە واتای پرسیارکاریش دێ، کەسێك کە پرسیار دەکات، داوا دەکات شتێکی بۆ ڕوون بکرێتەوە، واتە: داوای شتێکی مەعنەویی دەکات، کە بریتییە لە وەڵامی پرسیارەکەی، یاخود داوای شتێکی ماددیی دەکات، کە بریتییە لە هاوکاریی، هەردووکیان پێیان دەگوترێ: (سائل) .

ئنجا ئەمە وەك هەردوو ئایەتی (٩ و١٠) وایە لە سووڕەتی (فصلت)، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: تۆ بڵێ: (ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە موحەممەد ﷺ)، ئایە ئێوە بێبڕوان بەو کەسەی کە زەوی دروست کردوە، لە دوو ڕۆژان داو، هاوبەشانو هاوێنانی بۆ دادەنێن؟ ئا ئەو کەسە پەروەردگاری جیهانییانەو، لەسەر زەوی چیاکانی داناون، کە وەك لەنگەری کەشتی، لەنگەری زەوییان ڕاگرتوەو، پیتو پێزی خستۆتە نێو زەویو، بژیوو ڕۆزییەکانی تێدا داناون، لە شەش ڕۆژاندا، بە یەکسانیی بۆ ئەوانەی کە داوایان کردوە، (یاخود: ئەمە وەڵامێکە بۆ ئەوانەی کە پرسیاریان کردوە، خوا ئەم زەویو ئەم دنیایەی چۆن هێناوەتە بوون؟) کە لێرەدا : (السَّائِلِين أَي: الطَّالِبِين، القَاصِدِين لِمَعْرِفَة الأَسْرَارِ وَالمُهْتَدِين بِهَا)، وەك گوتم : (سائل) هەم بە مانای (داواکار) دێ، هەم بە مانای کەسێك دێ، کە پرسیار دەکاتو دەیەوێ ڕاستییەکی بۆ ئاشکرا بێ.

**مەسەلەی دووەم** : گومانی خراپ پێبردنو تۆمەتبارکردنی یەعقووب عليه السلام لەلایەن کوڕەکانیەوە، کە یوسوفو برایەکەی لەوان خۆشتر دەوێن :

ئەمە لە ئایەتی (٨)دا باسکراوە، کە ئاوا دەفەرموێ: ﴿ إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا :

١) - ﴿ إِذْ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ ﴾، کاتێك گوتیان: یوسوف و برایەکەی، برایەکەی کێیە؟ بە پێی پەیمانی کۆن: بنیامینە، کە هەردووکیان کوڕی دایکێکن بە ناوی: (ڕاحیل)، ئەویش کچی (لابان)ە وەك لە پەیمانی کۆندا هاتوە، لە قورئاندا ئەوانە نەهاتوون، لەبەرئەوەی پەکمان لەسەریان نەکەوتوە.

٢) - ﴿أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا ﴾، یوسوف و برایەکەی خۆشەویستترن لەلای بابمان، لە ئێمە، ئەو ئێمەیە کێن؟ دە (١٠) کوڕەکانن، ئەو دە کوڕانە لە پەیمانی کۆن دا، ناوەکانیان ئاوا هاتوون :

(ڕەئوبین، یاخود ڕائوبین، شەمعون، لاوی، یەهوزا، ئیسساخر، زایلون، یان زابلون)، ئەم شەشە دایکیان ناوی (لەیئە)، یاخود (لییا) بووە.

دووانەکەی دیکەش: (جاد)و (ئەشیر)، ئەوانیش لە (زولفە) بوون کە کەنیزەکی (لەیئە)، یاخود (لییا) بووە، لە دایك بوون.

دووانەکەی دیکەش: (دان)(نەفتالی)، ئەوانیش لە (بەلها)، کە ئەویش کەنیزەکی (ڕاحیل) بووە، لە دایك بوون.

دیارە ئەو دووانەش کە لە کەنیزەکەکەی ڕاحیلیش بوون، پاڵیان داوەتە لای ئەو هەشتانەی دیکەو، بە هەموویان بوونە دە (١٠)، ئنجا لەگەڵ یوسوف و بنیامین، ئەوە دوازدە (١٢) .

٣) - ﴿وَنَحْنُ عُصْبَةٌ ﴾، واتە: بابمان، یوسوف و برایەکەی، کە دوو کوڕن، لە ئێمە کە دە کوڕینو، کۆمەڵێکی تۆکمەو توندو تۆڵینو، دەستە پیاوێکی بەهێزین، خۆشتری دەوێن، ئەوە شتێکی زۆر نامەنتیقییە کە دوو لە دەیان گرنگییان زیاتر پێبدرێو، زیاتر خۆش بویسترێن.

وشەی (عُصْبَةٌ )، (العُصْبَةُ: جَمْعٌ لا وَاحِدَ لَهُ مِنْ لَفْظِهِ)، (عُصْبَة) کۆیە، لە بێژەکەی خۆی تاکی نیە، یانی: دەستەو کۆمەڵێکی توندو تۆڵو تۆکمە، هەروەها (عِصَابَة)شی بۆ بەکاردێ .

ئنجا زانایان دەڵێن: (عُصْبَة) یان (عِصَابَة) لە سێ (٣) وە تاکو دە (١٠)یە، هەندێکیان دەڵێن: لە دە (١٠)وە تاکو چل (٤٠)ە، بەڵام وا پێدەچێ: لە سێ(٣)وە، تاکو دە (١٠) بێ، کە ئەوانیش گەیشتوونە ئەوپەڕی ڕێژەی (عُصْبَة)، کە ژمارە دە (١٠) یە.

٤) - دەڵێن : ﴿إِنَّ أَبَانَا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، بێگومان بابمان لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرا دایە، هیچ گومانێکی تێدانیە کە لێرەدا مەبەستیان ئەوەیە: بابمان بە هەڵە داچووە لە کاروباری دنیایی دا، کە دوو کوڕان بەسەر دە کوڕان دا هەڵدەبژێرێ و، خۆشتری دەوێن، ئەوە بە هەڵەدا چوونە، کە ئەگەر ڕاستیان کردبایە وابوو، بەڵام بێگومان ڕاستیان نەکردوە .

ئنجا لێرەوە دەمەوێ سەرنجی هەموو لایەك بۆ ئەوە ڕابکێشم، کە :

زۆربەی تەفسیرەکان دێنن لەسەر قسەی ئەم دە کوڕە، زۆر شت هەڵدەچنن، لە دژی یەعقووب ﷺ، بۆ وێنە، دەڵێن :

مرۆڤ دەبێ ئاگای لە خۆی بێ، هەندێك لە کوڕەکانی بەسەر هەندێکیان دا هەڵنەبژێرێ! یەعقووب ئەو دوو کوڕەی هەڵبژاردوون بەسەر ئەو دە کوڕانەدا، بۆیە تووشی هەڵە بوون !!

یان دەڵێن: مرۆڤ دەبێ دادگەربێ لەگەڵ ماڵ و منداڵی خۆیدا، نەك وەك یەعقووب، واتە: لە پەنادا توانج و پلاری زۆر لە یەعقووب دەدرێ، لە حاڵێکدا کە یەعقووب، پێغەمبەرێکی پایەبەرزی خوایەو، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، پارێزراو بوون لە هەڵەی بە ئانقەستو، هەڵەی گوناهبارکەر .

بەڵێ لێرەدا گومانی تێدا نیە کە ئەوان دەڵێن: ﴿أَبَانَا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، مەبەستیان پێ بواری ئایین نیە، چونکە ئەگەر مەبەستیان پێ ئایین بووایە، پێی کافر دەبوون، پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوا وەك یەعقووب، بە هۆی پەیام و وەحیی خواوە لە ڕووی ئایینییەوە، لە ڕووی مامەڵەی لەگەڵ خوادا، لەسەر ڕێیەکی ڕاست بووە، بۆیە ئەگەر گوتبایان: لەسەر ڕێی هەڵەیە، ئەوە پێی کافر دەبوون، مەبەستیان پێی مامەڵەی دنیایی بووە، بەڵام ئایا لەوەشدا پێکاویانە؟

وەك هەندێك لە توێژەرەوانی قورئـان، بەڵكو زۆربەیـان، ئەگـەر نەڵـێم هـەموویان، ئاماژەی پێدەكـەن ؟

بێگومان نەخێر، بـەم سێ بەڵگانـەی خـوارێ :

<u>بەڵـگــەی یەكـەم:</u> چونكە جارێ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، پارێـزراو (معصوم)ن لە هەڵەو گوناهێك كە بە ئانقەسـت بیكەن‌و بیزانن گونـاهە، ئنجـا كەمێـك جیـاوازیی بخـاتە نێـوان كوڕەكــانی خۆیـەوە، دووان بەســەر دەیـان دا هەڵـبـژێری، یـاخود دەیـەكانیش بەسـەر دووان دا هەڵـبـژێری‌و، نادادگـەر بـێ لـە بەینیانــدا، ئەوە گوناهــە، گوناهێكی واشە كە پێچەوانەی عیصمەت‌و پارێـزراویی پێغـەمبەرانـە لە گوناهـو لە تـاوان .

<u>بەڵـگــەی دووەم:</u> هـیچ نیشـانەیـەك نیـە كـە یەعقــووب ﵇ ئـەو دوو كــوڕەی بەسـەر ئەوانـی دیكـەدا هەڵـبـژاردبن، جگـە لەوەی كە لەبــەر بچووكیــی، لەوانەیە یەعقووب سـۆزی زیاتری بـۆ یوسـوف‌و بنیـامینی بـرای بـوو بـێ، كـە بچووكـتـر بوونە لەوانی دیكـە، ئەوەش شتێكی زۆر سروشـتیی‌و ئاسـاییە !

وەك دەڵێن: ئافرەتێـك چـەند كـوڕێكی هـەبوون، لـێیــان پرسی: كــامەت لـە هەموویان خۆشتـر دەوێ؟ گوتی: كوڕەكانم وەك بازنەیـەكی داخـراو وان، لـە هـەر شــوێنێكیەوە دەست پێ بكـەی هەر دەبێ، واتـە: هـەموویان وەك یـەكن بـۆ مـن، گوتیـان: ئاخر هەر پێمان خۆشــە شتێك هەر بڵێی، گوتی: ئـەوەیان لـە سـەفەرە، تــاكو دەگەڕێتـــەوە، زیـاتر خۆشـم دەوێ، ئـەوەیان كـە نەخۆشـــە، تــاكو چـاك دەبێتــەوەو، ئەوەیان كە گچكـەیە تاكو گـەورە دەبـێ، كەواتە: وەك یـەكـن مەگـەر یەكێكیان حاڵـەتێكی تایبەتیـی بۆ بێتە پێش، كـە نـەخۆش دەبێ، لـە ســەفەر دەبێ، یان گرفـتێكی دەبـێ، یان گچكــەیە تاكو گــەورە دەبــێ .

<u>بەڵـگـەی سێیـەم:</u> قسـەی كوڕەكــان جگە لە تۆمـەت‌و گومـانی بـەد، هیچی دیكە نیـە، ئـەو دە (١٠) كـوڕە كـە دەڵێن: ﴿لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا﴾، هـیچ بەڵگەیەكیان نەهێنـاوتەوەو هەر ئیددیعـایەكی ڕووتـە، هەر بۆیە ئێمـە تەنیا بە لاف لێدان‌و بە بانگەشــەی ڕووتی ئەو دە كورە، بێنین یەعقووب ﵇ تۆمەتبـار

بکەین، کە جیاوازیی لە نێوان کوڕەکانی دا کردوە! بە ڕاستیی ستەم لە یەعقووب دەکەین‌و، خۆشمان تووشی هەڵەیەکی گەورە دەکەین، چونکە جارێ ئەو کوڕانە کوڕی ئەوەندە صالِح‌و چاك نەبوون، پشت بە قسەی وان ببەستی، بۆ تۆمەتبار کردن‌و تاوانبارکردنی پێغەمبەرێکی پایەبەرزی وەك یەعقووب (عليه السلام) !

بۆیە بە ڕاستیی من سەرم سوڕدەمێنێ، کاتێك قسەی توێژەرەوانی قورئان‌و قسەی مانا لێکدەرەوانی قورئان دەبینم: هەر لەو گۆڕە دەڵێن: دەبێ مرۆڤ لە خۆی وریابێ، جیاوازیی لە نێوان کوڕەکانی دا نەکات، ئەوەتا یەعقووب (عليه السلام) یوسف‌و برایەکەی لە برایەکانی دی خۆشترویستوون‌و جیاوازیی پێکردوون‌و، لە نێوانیاندا دادگەر نەبووە، بۆیە تووشی ئەو هەموو گرفت‌و کێشەیە بووە!

بەڵکو هەندێکیان دەڵێن: یەعقووب (عليه السلام) کە تووشی ئەو هەموو خەم‌و خەفەت‌و نارەحەتییە بووە، سەرەنجام چاویشی لەسەر داناوە، هێندە بۆ یوسف گریاوە، بۆی نارەحەت بووە، ئەوە سزای خوا بووەو خوا سزای داوە!

بەڵام بێگومان ئەو قسانە هەموویان بێجێن، چونکە ئەوەی کە بەسەر پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) دێ، نابێ قیاس بکرێتە سەر ئەوەی کە بەسەر خەڵکی دیکە دێ، خەڵکی دی هەڵەیەك دەکات، خوا سزایان دەدا بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە، بەڵام هی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) کە بەڵاو گرفتارییان بەسەرهاتوە، لەبەر ئەوە نەبووە خوا سزای داون‌و، لەبەر ئەوە نەبووە کە خوا (سبحانه وتعالى)، تۆڵەی لێکردبنەوە! بەڵکو بۆ ئەوە بووە کە بۆ خەڵك ببنە سەرمەشق، کە وەك ئەوان خۆڕاگربن‌و شوکرانەبژێر بن‌و، وەك ئەوان سکاڵا نەکەن لە دەست بەڵاو، وەك ئەوان پشت بەستووربن، بە خوا .

ئێستا ئێمە کە تەماشای بەسەرهاتەکەی یەعقووب (عليه السلام) دەکەین، ئەو هەموو خەم‌و گرفتارییە! کەچی دەبینین: ئەو کابرایە هەمیشە هەر پشتی بە خوا قایمە، هەرگیز وشەیەك نالێ کە بە کەڵك نەیەت، نە لەگەڵ کوڕەکانی، نە لە نێوان خۆی‌و خوادا، مانای وایە: یەعقووب بۆ ئێمە بۆتە سەرمەشق، بۆ خۆڕاگریی بەرانبەر بەڵاو گرفتاریی‌و پێشهاتە ناخۆشەکان.

لەلایەکی دیکەشەوە دەڵێین: یەعقووب (عليه السلام) ناهەقی نەبووە کە ئومێدی زیاتری بە یوسف (عليه السلام) بێ‌و، زیاتر پێی دڵخۆش بێ، بۆچی؟ چونکە

سەرەنجامەکەی وا دەرچووە، کە یوسوف خوا کردوویەتی بە پێغەمبەرو، ئەو دە (١٠) کوڕەی دیکەش وەك پێشتریش باسمان کردو دواتریش باسی دەکەین، بێگومان پێغەمبەر نەبوون، چونکە ئەو ڕەفتارانەی کردوویانن، لە مسوڵمانێکی باشیش ناوەشێنەوە، چ جای لە پێغەمبەرێکی پارێزراو لە هەڵە! بۆیە یەعقوو ﷺ کە زیاتر بە یوسوف ئومێدەوار بووەو زیاتر دڵی پێی خۆش بووەو، زیاتر بە تەنگییەوە بووە، ناحەقی نەبووە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکیش نیە لەوەدا کە یەعقووب جیاوازیی خستبێتە نێوان یوسوف و برایەکەی، لەگەڵ دە کوڕەکانی، بەڵکو ئەوە هەر تۆمەتێکە لەو گوڕە، لەلایەن ئەو دە کوڕەوە هەڵبەستراوە، ئەو دە کوڕەش هی ئەوە نین کە تۆ ئەو قسەیان لێ وەربگری و ئەو دەعوایەیان لێ بسەلمێنی، چونکە: دە کوڕانێك دەستیان بچێتە خوێنی برایەکەی خۆیان و، بتوانن بابیان ئاوا ناڕەحەت بکەن، پاشان ئاوا دڵڕەقانە لەگەڵ برایەکی خۆیان دا ڕەفتار بکەن، چۆن قسەیان لێ وەردەگیرێ؟ بە دڵنیاییەوە قسە لە کەسانێکی ئاوا وەرناگیرێ و، کەسانی وا، ئەو بانگەشەیەی کە دەیکەن، ماڵێکی قەڵپەو بەسەر خاوەنەکەیدا دەدرێتەوە.

**مەسەلەی سێیەم**: **تەگبیرکردنی کوڕەکانی یەعقووب، واتە دە کوڕەکەی بۆ کوشتنی یوسوفی برایان، بە پاساووی ڕووتێکردنی بابیان بۆیان، پاشان ڕاچەسپانیان لەسەر خستنیە نێو بنی بیرێکەوە:**

وەك دەفەرموێ: ﴿ ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا يَخۡلُ لَكُمۡ وَجۡهُ أَبِيكُمۡ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ ۝٩ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ يَلۡتَقِطۡهُ بَعۡضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ۝١٠ ﴾.

**توێژینەوەی ئەم دوو ئایەتە لە حەوت بڕگەدا:**

**١)** - ﴿ ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا ﴾، دیارە لێرەدا شتێك قرتێنراوە، واتە: دانیشتن و کۆبوونەوەو ڕاوێژیان کرد پێکەوە، ئنجا دوایی هاتنە سەر ئەوەی گوتیان: ﴿ ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا ﴾، یوسوف بکوژن، یاخود لەسەر

زەمینێکدا فڕێی بدەن، بـە واتایـەکی دی: یـان ڕاسـتـەوخۆ بیکوژن، یـاخود دووری بخـەنـەوە، یانـی : هەرچۆن بێ، بیفەوتێنن، ڕاستەوخۆ، یان ناڕاسـتـەوخۆ .

زانایان دەڵێن: لێرەدا (أَرْضًا)، بە یەکێك لە دوو هۆکـاران مەنصووب بـووە: {انْتَصَب (أَرْضاً) عَلَى تَضْمِين (اطرحُوه) مَعْنَى: أَوْدِعُوه، أو علـى نَـزْعِ الخَـافِضِ}،

واتە: (أَرْضًا)، بەوە مەنصووب بـووە، کـە مانـای (أَوْدِعُوه)ی خراوەتـە نێو، واتـە: بیبەنە سـەر زەمینێکی چۆڵـەوانیی، یاخود ئەسڵی خۆی ئـاوابووە: (اطرحوهُ فِي أَرْضٍ)، کە ئەوەش پێی دەگوترێ: (نَـزْعِ الخَـافِضِ)، لابردنـی (مجـرور)کـەر، ئنجـا ئـەو پیتـەی کـە (مجـرور)ی دەکـات، لات بـرد، ئـەو کاتـە (منصووب) دەبـێ، لـە جیاتی بڵێی: (أَرْضٍ)، دەڵێی: (أَرْضَـاً)، کە هەر یـەك واتـایان هـەیـە .

بێگومان لێرەدا کە دەڵێن: ﴿أَوِ ٱطْرَحُوهُ أَرْضًا﴾، واتـە: لە دەشتـو سارایەکی چۆڵـەوانیی، بەجـێی بهێڵـن، مەبەسـتیان ئـەوە بـووە کـە: ئـەو کـاتە یـان لــە تینوان دەخنکێ، یان لـە برسـان دەمـرێ، یـاخود دڕندەیـەك دەیخـوا، کەواتـە: دوو میکانیزمیـان دانـاون بۆ فەوتـاندنـی یوسـوف :

أ- کوشـتنی ڕاسـتەوخۆ .

ب- یاخود ناڕاسـتەوخۆ .

نەك مەبەسـتیان ئەوە بووبێ :

١- یان بیکوژن .

٢- یـاخود لەسـەر زەمینێك بـەجێی بهێڵـن بۆخـۆی لـەوێ پیاسـە بکـات! نـا، مەبەسـتیان ئەوە بووە کـە لەوێ بفـەوتـێ .

**٢) -** ﴿يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ﴾، واتـە: بۆیـە یوسـوف بـە یەکـێك لـەو دوو شـێوانە بفـەوتێنـن، تاکـو ڕووی باباتـان بـۆ ئێـوە چۆڵ بـێ، (الخِلّ: الفَرَاغ، وَيعني هُنَـ مَجَازاً: التوَجّه، أَي: يَخْلُو وَجْهُهُ مِن عَدَاكُمْ، فَيَنْفَرِدُ لَكُمْ)، ڕووی باباتان بۆ لاتان وەرچەرخـێ، وەرسـووڕێ لە غەیری ئێوەو تەنیا ڕوو لە ئێوە بکـات .

مەبەستیان ئەوە بووە: کە یوسوف بۆتە پەردەیەك‌و بەرچاوی بابمانی لە ئێمە گرتووەو ئێمە نابینێ، بۆیە دەبێ ئەو پەردەیە لابدەین‌و، ئەو کەسەی بۆتە پەردەیەك لەبەر چاوی بابمان‌و ئێمەی لێ شاردۆتەوە، لایبەرین تاکو ئێمە ببینێ .

ئەو کەسەی کە بە هۆی ئەوەوە بابمان نایپەرژێتە سەر ئێمە، نەیهێڵین، تاکو ئەو کاتە بابمان گرنگیی‌و بایەخمان پێبدات .

هەڵبەتە لێرەدا پاساوەکەیان زۆر بێجێ بووە، وەك پێشتر گوتمان، چونکە مەحاڵە پێغەمبەرێکی پایەبەرزی خوا، وەك یەعقووب ﷺ ستەمی لە رۆڵەکانی خۆی کردبێ، کە پێشتر باسمان کردو دووبارەی ناکەینەوە، بەڵام ئەوە هەر حەسەدو کینە بووە لە دڵیانداو، ویستوویانە پاساوو بیانوویەك بێننەوە بۆ لە بەین بردنی برایەکەیان، هەرکەسێك تاوانێك دەکات، حەتمەن هەوڵدەدا وەك گوتراوە: بیشەرعێنێ، رەشەرعی بخات، پاساوێکی شەرعیی، بە وەهم‌و خەیاڵی خۆی بۆ بدۆزێتەوە، بۆ ئەوەی کە ویژدانی خۆی ئاسوودە بکات، کە شتێکی ناشەرعیی‌و ناهەقیی نەکردووە !

**٣) -** ﴿ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ ﴾، ئنجا لە دوای وی، (واتە: لە دوای ئەوەی کە یوسوف دەفەوتێنن، بە یەکێك لەو دوو شێوازەی کە باسمان کرد)، ئێوە دەبن بە کۆمەڵێکی چاك، هەندێك لە زانایان وایان زانیوە کە صالح لە قورئاندا تەنیا بە کەسێك دەگوترێ: کە بە پێوەری خوا چاك بێ‌و، لە نێوان خۆی‌و خوادا چاك بێ، بۆیە ئەو زانایانە گوتوویانە: مەبەستیان ئەوەیە: ئەگەر یوسوف نەمێنێ، ئێوە بوغزو غەرەزتان نامێنێ‌و چاك دەبن، یاخود گوتوویانە: مەبەستیان ئەوەیە: دوای ئەوەی یوسوف دەفەوتێنین، ئنجا تۆبە دەکەین‌و دەگەرێینەوە بۆ لای خواو صالح دەبین !

بەڵام رایەکی دیکە هەیە کە بەلامەوە ئەو رایە راسترەو، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئانیش هێناویانە، واتە: دوای ئەوەی کە یوسوف دەفەوتێنن، ئێوە حاڵ‌و باڵی دنیاییتان لەگەڵ بابتاندا باش دەبێ، چونکە ئەو کاتە هەر ئێوەی دەبێ‌و بە چاکیی گرنگیی‌و بایەختان پێدەدا، مەبەستیان ئەوە بووە، ئەگەر نا مەبەستیان ئەوە نەبووە کە بە کوشتنی یوسوف‌و دوایی تۆبەکردنتان،

لە خوا نیزیك دەبنەوە! بەڵكو مەبەستیان ئەوە بووە كە حاڵو باڵی دنیاییان باش دەبێ .

(صالِح)، واتە: باش، باشیی ڕەهاش لە تەرازووی شەریعەت دا، ئەوەیە كە مرۆڤ لە تەرازووی خوادا باش بێو بە پێوەری مەعنەویی باش بێ، بەڵام كەسانێك كە بیردەكەنەوە لە كوشتنی برایەكیان، دیارە زۆر مەبەستیان لایەنی مەعنەویی‌و بۆ خوا صولْحان نەبووە، بەڵكو مەبەستیان ئەوە بووە كە حاڵو باڵی دنیاییان‌و ژیان‌و گوزەرانیان، بە تایبەتی لەلای بابیان، باش بێ .

ئەم واتایەش زیاتر لەو كوڕانە دەوەشێتەوە كە بیریان كردۆتەوە، بەڵكو بڕیاریان داوە : بۆ كوشتن‌و لەبەینبردنی برایەكی خۆیان، چونكە هەر كەسە كە وشەیەكی بۆ بەكاردێ، ئەگەر ئەو وشەیە زیاتر لە واتایەكی هەبێ، دەبێ بزانین كام واتای زیاتر بۆ ئەو كەسە گونجاوە، ئنجا بۆ ئەوان گونجاو نیە، بڵێین: لە لای خوا چاك دەبن، چونكە دەزانن كە مرۆڤ بە كوشتن لەلایەن خوا چاك نابێ‌و لە خوا نیزیك نابێتەوە، ئەوەش دوورە كە مەبەستیان پێی ئەوە بووبێ: دوایی تەوبە دەكەن‌و دەگەڕێنەوە لای خوا! چونكە باسی تەوبەكردنی تێدا نیە، كەواتە: ﴿ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ ﴾، واتە: حاڵو باڵی دنیاییتان باش دەبێ، چونكە چاك بوون هەر ئەوەنیە مرۆڤ لە ڕووی مەعنەوییەوە بێ، بەڵكو لە ڕووی ماددییشەوە، چاك بوون (صالِح) بوونی پێدەگوترێ‌و (صلاح)ی بۆ بەكاردێ .

هەڵبەتە ئەو برایانەی یوسوف پاڵنەرو هاندەرەكەیان زۆر خراپ بووە، چونكە بریتی بووە لەوە كە لەسەر كەلاوەی خەڵك، كۆشكی خۆیان بنیات بنێن، یاخود خەڵك وێران بكەن‌و خۆیان ئاوەدان بكەن، كە بە ڕاستیی ئەوە عادەتی مرۆڤی فاشیلە، كە بیەوێ خەڵك لە بەین بەرێ، بۆ ئەوەی جێی خۆی بكاتەوە، خەڵك ناشیرین بكات، بۆ ئەوەی خۆی جوان بێ.

٤) – ﴿ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ ﴾، قسەكەرێكیان گوتی: یانی: لەو دە (١٠) برایە، كە لە (سفر التكوين)دا دەڵێ: یەهوودا بووە، واتە: دوای (ڕەئووبین) برا گەورەكەیان، هەروەها هەندێكیش لە زانایانی ئیسلام گوتوویانە: یەهوودا بووە، بەڵام

هەندێك گوتوویانە: شەمعوون بووە، بەلام هیچیان بەڵگەیان لەسەر نەهێنراوەتەوە.

بەلام من وای بۆ دەچم: كە برا گەورەكەیان بووبێ، كە لە تەورات (سفر التكوین)دا بە (ڕەئووبین) ناوی هاتوە، بە بەڵگەی چی؟ بە بەڵگەی ئەوە كە لە ئایەتی ژمارە (٨٠)، لە سوورەتی (یوسف)دا، كاتێك كە ئەو پێوەرەی دەغڵیان پێ پێواوە (صواع، سقایة)ی پادشا، لە باری برا گچكەكەیان: (بنیامین)دا، دەدۆزرێتەوەو، یوسوف بڕیاردەدا كە بەپێی بڕاردەی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا بكات، ئەوانیش دەڵێن: ﴿جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحۡلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ﴾، سزای هەر كەسێك كە لە باری ئەودا بدۆزرێتەوە، خۆی دەبێتە پاداشتی، واتە: دەبێتە كۆیلەی ئەو لایەنە كە دزییەكەی لێكردوە، لەو كاتەدا داوا لە یوسوف دەكەن: كە یەكێكیان لە جیاتی بنیامین گلداتەوە، بەلام ئەو دەڵێ: پەنا بە خوا كە كەسێك گلدەینەوە، جگە لەوەی كە شتەكە لە بارەكەی دا دۆزراوەتەوە، لەو كاتەدا برا گەورەكەیان قسە دەكات: ﴿... قَالَ كَبِيرُهُمۡ أَلَمۡ تَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ أَبَاكُمۡ قَدۡ أَخَذَ عَلَيۡكُم مَّوۡثِقٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبۡلُ مَا فَرَّطتُمۡ فِي يُوسُفَ﴾، گەورەكەیان (ئەوەی لە هەموویان بە تەمەنتر بوو)، گوتی: ئایا نازانن كە پێشتر بابتان پەیمانێكی پتەوی لێوەرگرتبوون، كە ئەم برایە (بنیامین) بە سەلامەتیی بەرنەوەو پێشتریش كەمتەرخەمییتان كرد دەربارەی یوسوف ؟

كەواتە: برا گەورەكەیان ڕەخنەی گرتوە لە هەڵوێستەكەی ئەو كاتەشیان، واش پێدەچێ لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ﴾، قسەكەرێكیان گوتی: یوسوف مەكوژن، هەر ئەو برا گەورەیان بووبێ، چونكە دواتریش لە ئایەتی هەشتا (٨٠)دا بەبیریان دێنێتەوە، دەڵێ: پێشتریش كەمتەرخەم بوون بەرانبەر بە یوسوف، كە دیارە هەر بە پێشنیاری ئەویش ڕاستەوخۆ یوسوف نەكوژراوەو، فڕێیان داوەتە نێو

بیـرێکەوە، بۆ ئەوەی کاروانچیی دەریـبـێـنـنـەوە، گرنـگ ئەوەیـە نەفەوتـێ، ئەمـە بەڵگەیەکی بەهێزە کە دەبێ ئەو پێشنیارکەرەش هەر بـرا گەورەکـەیان بووبـێ، چـونکە لەوێشدا وەبیـریان دێنێتـەوە، کـە کـاتی خۆشـیی کەمتەرخـەم بـوون بەرانبـەر بە یوسـوف .

٥) - ﴿ لَا تَقْتُلُوا۟ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ ﴾، یوسـوف مەکوژنو، بیخـەنە نێو بنـی بیـرێکـەوە، تاریکایی بیـرێکـەوە.

(غيابت الجب) خوێنراوەیشەتەوە: (غيابات الجب)، یـانی: بنـی بیـر، یـاخود پەنهانەکانی بیر، چونکە بیـر لە بنەوەدا، ئەملاو لایەکانی پەنهانن، (الغِيَابَة: مَا غَابَ عَـنِ البَصَـرِ مِنَ الشـيء): (غِيَابَة) بـەوە دەگـوترێ، کـە شـتێك لەبەرچـاو نەبێو دیار نـەبێ، دیارە مرۆڤیش کە لەسـەرێ ڕا تەماشای بیـر دەکات، بنەکەی دیـارنیـە، بەڵکو ئەمـلاو لایەکانیشی دیـارنـابن.

ئــەدی (الجـب) یـانی چـی؟ (الجـب: البئـرُ غَيْـرُ مطويـة)، بیـــرێکە کـە هەڵنـەبەسـترابـێ، واتـە: بـە بـەردان ئەمـلاولای هەڵنەچنرابـێ، بـەڵام ئەگـەر هەڵبەسـترابـێ، پێـی دەگوتـرێ: (بئـر).

٦) - ﴿ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ ﴾، هەندێـــك کـــاروانچیی دەیدۆزنـــەوەو هەڵیـدەگرنــەوە، (الإلتقـاط: تَنَـاوُلُ شَـيء مِـنَ الأَرْضِ، اسـتُعِيرَ لأَخْـذ شـيءٍ مُضَـاعٍ)، (اِلتقـاط) بریتیـە لـەوە کـە شـتێك کـەوتبێتو هەڵیگریـەوە، لێـرەدا خـوازراوەتەوە بۆ هەڵگرتنـەوەی شـتێك، کـە زایـە بووە، خـەڵك لێـی ون بـووە، تـۆش هـەڵیگریـەوە بۆ ئـەوەی کە نەفـەوتـێ .

(السَّيَّارَةُ: الجَمَاعَةُ المَوصوفَةَ بحالَةِ السَّيْرِ وَكَثْرتِهِ) (سَيَّارَة): واتە: کاروان (القافلة)، چونکە (سيارة) بریتیـە لـە کۆمەڵێـك کـە وەسـف بکرێن بـەوەی زۆر بڕۆن، عـادەتیـان زۆر ڕۆیشـتن بـێ.

## چەند قسەیەك لەبارەی دۆزراوە (لقطة)وە :

زانایان لە تەفسیرەكانیان دا بە تایبەتی (القرطبي)، هەروەها (الزُّحيلي) خاوەنی (التفسير المنير)و زۆرێكی دیكە لە تەفسیرەكان، باسی دۆزراوە (لقطة)یان كردوە، واتە: شتێك كە بدۆزرێتەوە، لەو بارەوە قسەیەكی (القرطبي)م هێناوە، لە تەفسیرەكەی خۆیدا[1] دەڵێ :

(أَجْمَعَ العُلَمَاء عَلَى أن اللقطة ما لم تَكُن تافِهَاً يَسيراً أَو شَيْئَاً لا بقَاء لَهَا، فَإنَّهَا تُعَرَّفُ حولاً كَامِلاً، وَأَجْمَعُوا أَن صَاحِبهَا إن جاء، فهُوَ أَحَق بهَا مِن ملتقطِهَا، إذَا ثَبَتَ لَهُ أَنَّهُ صَاحِبهَا، وَأَجْمَعُوا أَن ملتقطها إنَّ أَكلها بَعْد الحَوْل، وَأَرَاد صَاحِبُهَا أَن يُضَمِّنَه، فَإنَّ ذَلِكَ لَهُ، وَإن تَصَدَّق بها فصَاحِبها مخَيَّرٌ بَيْنَ التضمِين وَبَيْنَ أن ينزل على أجرها، فأي ذَلِكَ تَخيَّر كان ذلك لَهُ، بإجْمَاع، ولا تنطلق يد ملتقطها عليها بصدقة، ولا تَصَرُّفٍ قَبْلَ الحَوْلِ، وَأَجْمَعُوا أَن ضالَّة الغَنَم المخوف عَلَيْهَا، لَهُ أَكْلُها).

واتە: زانایان یەكدەنگن لەسەرئەوە كە شتی كەوتوو (لقطة)، (شتێك كەوتبێ‌و لە خاوەنەكەی ون بووبێ)، ئەگەر شتێكی كەم بایەخ‌و كەم نەبێ‌و شتێك نەبێ كە نەمێنێتەوە، (بۆ وێنە: تەڕەكارێك، كەسێك شوتییەك، كاڵەكێكی لێكەوتبێ، دۆزەرەوە ناتوانێ هەڵیگرێ)، (ئەگەر لەو شتانەبێ، كە بگونجێ بمێنێتەوەو نرخ‌و بەهایەكی هەبێ)، ماوەی ساڵێك دەناسێنرێ، لەو شوێنە كە كەوتوە، (یان لە شوێنێكی قەرەباڵغ، كەسێك ڕادەسپێرێ، یاخود بۆ خۆی دەڵێ: چ كەسێك شتێكی ئاوای لێ ون بووە، با نیشانەكانی هەڵبدات تاكو بیدەینەوە، ئەگەر سەعاتە، ئەگەر پارەیە، ئەگەر هەر شتێكە، ماوەی ساڵێك پێویستە ماوە ماوە لەو شوێنە، یاخود لە شوێنێكی قەرەباڵغ كە خەڵكی لێ كۆدەبێتەوەو، مەزەندەی ئەوە دەكرێ كە خاوەنەكەی بەوێدا بێتەوە، ئەو

[1] الجامع لأحكام القرآن، ج٩، ص١١٢.

شتە پێناسە دەكرێ‌و، دەناسێترێ)[1]، هەروەها زانایان یەكدەنگن لەسەر ئەوە كە: ئەگەر خاوەنەكەی هاتەوە، ئەوە پێی شایستەترە لە هەڵگرەوەكەی (لەو كەسەی هەڵیگرتۆتەوە)، بە مەرجێك هەڵگرەوەكەی بۆی جێگیربێ‌و بسەلمێ كە ئەو كەسەی داوای دەكات، خاوەنەكەیەتی، (نیشانەكانی هەڵبدات).

هەروەها زانایان یەكدەنگن كە ئەگەر هەڵگرەوەكەی دوای ساڵێك ئەو شتەی خوارد {ئەگەر ئاژەڵ‌و پەڕەور بوو، خواردی، ئەگەر پارەبوو خەرجی كرد هەر شتێك بوو}و خاوەنەكەی ویستی پێی ببژێرێ، ئەوە بۆی هەیە، ئنجا ئەگەر كردبووی بە خێر، خاوەنەكەی سەرپشك دەبێ لە نێوان ئەوەدا كە پێی ببژێرێ، یانی: هەمان شتی بۆ بێنێتەوە (وێنەی ئەوە)، یاخود نرخەكەی بداتەوە، هەر كامێكیانی هەڵبژارد، ئەوە خاوەنەكەی بۆی هەیە.

وە هەڵگرەوەكەی بۆی نیە نەبیكاتە خێر، نە هیچ تەصەڕووفێكی تێدا بكات (مامەڵەیەكی پێبكات) پێش ئەوەی ساڵی بەسەردا وەرسووڕێ.

دیسان زانایان لەسەر ئەوەش یەكدەنگن كە مەڕی ون بوو، {وشەی (غنم): بۆ بزنیش بەكاریان هێناوە}، مادام بابای هەڵگرەوە مەترسیی لێی هەبێ: {كە نەخۆشبێ، یان گورگ بیخوا، یان بۆی بەخێو نەكرێ}، بۆی هەیە كە بیخوات، (دوایش وەك گوتمان: بۆ خاوەنەكەی ببژێرێ، ئەگەر لێی خۆش نەبوو)[2].

٧) - ﴿إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ﴾، ئەوە هەر قسەی ئەو قسەكەرەیانە، كە ئێمە ئەوەمان هەڵبژارد: برا گەورەكەیان بێ، دەڵێ: ﴿إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە هەر ئەنجامدەری شتێكن لە دژی یوسوف، ئەوە بكەن، واتە: بیخەنە بنی بیرێكەوە.

دەڵێ: {شَرْطٌ حُذِف جَوَابُهُ لِدَلاَلَة (وَأَلقُوه) عليه، أي: إِنْ كُنْتُم فَاعِلِين إِبْعَادَهُ عَن أَبِيهِ فَأَلْقوه فِي غَيَابَاتِ الجُبِّ وَلاَ تَقْتلوهُ}، واتە: ئەوە مەرجێكە وەڵامەكەی لابراوە چونكە (وَأَلقُوهُ) دەیگەیەنێ، ئەگەر ئێوە دەتانەوێ دووری

١) نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە، بۆ ڕوونكردنەوەی مەبەست .

٢) نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە، بۆ ڕوونبوونەوەی مەبەست .

بخەنەوە لە بابی، ئەوە فڕێی بدەنە تاریکایی بیرێکەوەو ڕاستەوخۆ مەیکوژن بەڵکو لەبیرێکی باوێن (بۆ ئەوەی کاروانچیی بێنو هەڵیگرنەوە، ئێوەش لە دەستی دەربازتان دەبێو ئەویش لەبەین ناچێو، ئێوەش تووشی ئەو گوناهە گەورەیە نابن)، هەڵبەتە ﴿إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ﴾، لێشی وەردەگیرێ، یانی: ئەگەر هەر سوورن لەسەر ئەوەی بیکەن، واتە: لە ئەسڵدا ڕای هەر نەبووە، واتە: مەیکەن، بەڵام ئەگەر هەر سوورن لەسەر ئەوەی شتێك بکەن، بە لای کەمەوە فڕێی بدەنە بیرێکەوە، نەك بیابانێکی چۆڵەوانیی کە بفەوتێ، یاخود ڕاستەوخۆ بیکوژن .

**مەسەلەی چوارەم : وتوێژی دە کوڕەکانی یەعقووب لەگەڵی دا، لەبارەی ناردنی یوسوفەوە بۆ دەشتو دەر بۆ یاریی و کەیف کردنو، پاساو هێنانەوەی بابیان بەوەی کە ناتوانێ لێی دووربێو دەترسێ گورگ بیخوات، ئنجا وەڵامدانەوەی کوڕەکانیو دڵنیا کردنەوەیان بۆیو ئیقناع کردنی بابیان:**

وەك دەفەرموێ: ﴿قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ قَالَ إِنِّى لَيَحْزُنُنِىٓ أَن تَذْهَبُوا۟ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُوا۟ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿١٤﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم چوار ئایەتە، لە دە بڕگەدا :**

**١) -** ﴿قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ﴾، لێرەشدا شتێك فڕتێنراوە، کە سیاقەکە دەیگەیەنێ، واتە: دوای ئەوەی دانیشتن، ڕاوێژیان کرد، پێشێ دوو ڕایان پێشنیار کردن، یان ڕاستەوخۆ بیکوژن، یان فڕێی بدەنە بیابانێکی چۆڵەوانیی، لەوێ بمرێ، بەڵام دوایی یەکێکیان، کە ئێمە هەڵمانبژارد: برا گەورەکەیان بووە، پێشنیارێکیان بۆ دەکات، وەك (أهون الشرّين)، دەڵێ: ئەگەر هەر سوورن

لەسەر ئەوەی شتێكی لە دژ بكەن، بیخەنە بنـی بیـرێكەوە، بۆ ئەوەی كـاروانچیی هەڵیبگرنـەوە.

ئیدی دوای ئەوەی لەســەر ئەو ڕایـە پێكـدێن، دەچنـە لای بابیـان : ﴿ قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾، گوتیـان: ئـەی بـابی خۆمـان! ئـەوە چیتــە، بۆچی بەرانبەر بـە یوسـوف لێمان دڵنیـانیو بـە ئەمینـدارمان دانانێـی ؟ لێــرەدا ئەمە پرسیاركردنێكی نكوولّیی لێكـەرانەیە، واتە: چ شتێك وات لێدەكـات بۆچی بـە ئەمینــداری یوســوفمان دانانێــی؟ یـانی: ئـەوە جۆرێكـە لـە گلـەیی كـردنو، جۆرێكیشە لە ورووژاندنی بابیان كە بڵێ: ڕۆڵـە گیان! من چۆن لێتـان ئەمیــن نیم خۆ ئێـوە كوڕی خۆمن! ئاوا بۆ ئەوەی كە بیورووژێنن، ئاوا پرسیاریان لێكـردوە.

٢) - ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَـٰصِحُونَ ﴾، واتە: ئەوە چیتـە؟ بۆچی ئێمە بە ئەمینداری یوسوف دانـانێی، لێمان دڵنیانـی، لـە حاڵێكیشـدا كـە ئێمـە بـە دڵنیاییــەوە بـۆ ئـەو زۆر دڵســۆزیـن ؟

لێــرەدا چــوار ئـامڕازی جــەخت كردنــەوەیان بەكارهێنــاون: (إِنَّـا، لَـهُ، لَـ، ـنَصِحُون)، بێگومـان ئێمــە بۆ وی، ئنجـا بـە لامـی تەئكیـدو، هەندێكـیان دەڵـێن: لامی سوێند خـواردن، یان لامێكـە ڕێخۆشكەرە بۆ سـوێند خواردن.

یـانی: ســوێند بــە خـوا ئێمــە بـۆ وی زۆر دڵســۆزین، بـە (اسـم فاعل)یـش هێناویەتی، یـانی: سیفەتی دڵسـۆزیی بۆ یوسـوف لە ئێمەدا، شتێكی زۆر ڕۆچوویە.

(نُصح)یش، زۆرجار گوتوومــانە: (النُّصْحُ: إِرَادَةُ الخَيْرِ لِلمَنْصُوحِ)، بریتیــە لەوە كە ئەو كەسـەی نوصحەكەی ئاڕاسـتە دەكرێ، خێرو خۆشییو چاكـەی بـۆی بـوێ، ئەو (نُصح)ەش، دەگونجـێ لە قسـەدا یان لە كردەوەدا، بەرجەسـتە ببـێ.

لێــرەدا دەبیـنین: ئـەو دە كـوڕەی یەعقــووب عليه السلام، خــوا لێیــان خۆشبــێ، گلەییەكیان لێكردوە، كە ناهـەق بووە، لەسـەر شـتێك كە یان نەبووە، كە بریتیـە لە دڵنیـانەبوونی لێیـان بەرانبەر بە یوسوف، واتە: هەر گومان بـووە، یـاخود ئـەو دڵنیا نەبوونە لە بابیانـدا هەبووە، بـەڵام هـەق بـووە، دوایـیش بۆیـان دەركـەوتوە:

هەقی بووە، کە لێیان دڵنیانەبووە، ئنجا ئەگەر نەشبووبێ‌و گومانی خراپیان پێ بردبێ، ئەوە هەر شتێکی خراپیان کردوە، ئەگەر بابیان لێشیان دڵنیا نەبووبێ، ئەوە گومانەکەی بابیان‌و، دڵنیا نەبوونەکەی بابیان، لێیان، بەرانبەر بە یوسوف، هەق بووە، چونکە دوایی دەرکەوتوە کە نیازیان بەرانبەر یوسوف خراپ بووە، بەڵکو کردەوەو ڕەفتاریشیان بەرانبەری زۆر خراپ بووە.

٣) - ئنجا دوای ئەوەی ئاوا بابیان دەوروژێنن‌و جۆرێك لە گلەیی لێدەکەن، داوای لێدەکەن، دەڵێن: ﴿أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا﴾، بەیانی لەگەڵمان بینێرە.

٤) - ﴿يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ﴾، بخوات‌و یاریی بکات، وشەی: (رتع) زیاتر بۆ ئاژەڵ بەکاردێ، ئەوەیە کە ئاژەڵەکە ئەوەندە بخوا لە لەوەڕگەدا، هەتا تێر دەبێ، دەڵێ: (رتع، أي: أقام في خصب وسعة من الطَّعَام)، یانی: بە کەیفی خۆی کەیفێ بکات‌و، بخوات، وەك چۆن خەڵك دەچێت بۆ گەشت‌و سەیران، لە حاڵەتی گەشت‌و سەیرانداو، ئەندازەیەکی زیاتر بخوات، لەوەی کە لە ماڵێیە.

(وَيَلۡعَبۡ)، یاریی‌و گەمە بکات، بێت‌و بچێ، وشەی: (یرتع)، خوێنراویشەتەوە: (یرتعِ)، واتە: شوانیی بکات لەگەڵمان، ئاژەڵ بلەوەڕێنێ.

هەروەها خوێنراویشەتەوە: (نرتَعْ) و (نَرتَعِ)، واتە: هەموومان پێکەوە کەیف‌و سەفا، یان: شوانیی دەکەین‌و مەڕ دەلەوەڕێنین.

هەروەها (یلعب)یش، بە (نَلعَب)یش، خوێنراوەتەوە، یانی: هەموومان پێکەوە یاریی دەکەین.

## قسەیەك لەبارەی یاریی کردنەوە:

لێرەدا زانایان هەندێکیان کێشەیەکیان دروست کردوە لەسەر ئەوەی: ئایا یاریی‌و گەمە، کەیف‌و سەفا، چوونە دەشت‌و دەر، ڕەوایە یان ڕەوانییە؟ کە لەڕاستیی دا من پێم وایە ئەسڵی پرسیارەکە لە خۆیدا شتێکی سەیرە! چونکە: (الأَصْلُ فِي الأَشْيَاءِ الإِبَاحَة)، (الأَصْلُ فِي الأَشْيَاءِ العَفو)، بناغە لە شتەکاندا

بریتییە لە ڕەوایی، بریتییە لە دەست کراوەیی، مەگەر بەڵگەیەك هەبێ لەسەر ئەوە کە ئەو شتە، ئەو جۆرە هەڵسوکەوتە، ناڕەوایە.

چونکە خوا ﷻ هەرچی لە بوونەوەردا هەیە، بۆ مرۆڤی دروست کردوە، وەك لە سوورەتی (الجاثیة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴿١٣﴾ ﴾.

لە سوورەتی (البقرة)شدا، دەفەرموێ: ﴿ ... خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ... ﴿٢٩﴾ ﴾البقرة.

کەواتە: هەرچی هەیە لە بنچینەدا بۆ مرۆڤ دروست کراوە، بۆ ئەوەی مرۆڤ لێی بەهرەمەند بێ، بۆیە هەر شتێکی زۆر سەیرە پرسیار بکرێ: ئایا دروستە مرۆڤ بچێتە دەر؟ دروستە مرۆڤ کەیفو سەفا بکات؟ یان بچێتە گەشتو سەیران؟

لەوبارەشەوە ئەم فەرموودەیە دێنین، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {كُلُّ مَا يَلْهُو بِهِ الْمَرْءُ الْمُسْلِمُ، بَاطِلٌ، إِلاَّ رَمْيَهُ بِقَوْسِهِ، وَتَأْدِيبَهُ فَرَسَهُ، وَمُلاعَبَتَهُ امْرَأَتَهُ}، {أَخْرَجَهُ الطيالسي برقم: (١٠٠٧)، وَأَحْمَد برقم: (١٧٣٣٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٦٣٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٨١١)، وَالحَاكِم برقم: (٢٤٦٧)، وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد، تعليق شعيب الأرنؤوط: حَدِيث حَسَن بطرقهِ وَشوَاهِدِهِ}.

واتە: هەر شتێك کە پیاوی مسوڵمان پێیەوە دەخافڵێ، پووچە، مەگەر ئەوە کە بە تیروکەوانەکەی تیردەهاوێو، مەشق بە ئەسپەکەی دەکاتو، لەگەڵ خێزانو هاوسەرەکەی خۆیدا یاریی‌و گەمە دەکات (ئەوانە لە هەقن)، (واتە: پاداشتیان لە بەرانبەردا هەیە، مەبەست ئەوەیە، باتڵیش ئەوەیە پاداشتی لە بەرانبەردا نەبێ)، دیارە بە قیاس بۆ سەر ئەمانەش: هەر جۆرە خافڵانێکی دیکەی مرۆڤ، کە سوودێکی تێدا هەبێ: بۆ جەستەی، بۆ عەقڵی، بۆ نەفسی، بۆ خۆی‌و ماڵو خێزانی، دیسان بە هەق‌و ڕەوا دادەنرێ، وەك لەم فەرموودەیەدا دەبینرێ:

{عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَامِلَ الْحُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ عَلَى عَاتِقِهِ، فَقَالَ رَجُلٌ: نِعْمَ الْمَرْكَبُ رَكِبْتَ يَا غُلَامُ! فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: وَنِعْمَ الرَّاكِبُ هُوَ}، {أخرجه الترمذي برقم: (٣٧٨٤) وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ لا نَعْرِفُهُ إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ، وَزَمْعَةُ بْنُ صَالِحٍ قَدْ ضَعَّفَهُ بَعْضُ أَهْلِ الْحَدِيثِ مِنْ قِبَلِ حِفْظِهِ، وأخرجه أيضا الحاكم برقم: (٤٧٩٤) تعليق الذهبي فِي التلخيص: ليس بصحيح}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ، حوسەینی کوڕی عەلی لەسەر شانی هەڵگرتبوو (لەسەر قەڵاندۆشی- وا پێدەچێ)، پیاوێکیش گوتی: ئەی کوڕیژگە! سواری باشترین شت بووی، (کە شانی پێغەمبەرە ﷺ)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەویش باشترین سوارە، (باشترین کەسە کە من هەڵم گرتبێ).

کە ئەوە مەدحێکی گەورەیە بۆ حوسەین خوا لێی ڕازی بێ، کەواتە: هەر جۆرە خافڵانێكو، هەرجۆرە هەڵسوکەوتێك، کە سوودو بەهرەیەکی تێدابێ، بۆ ماڵو منداڵ، بۆ خۆت، بۆ جەستە، بۆ ڕووح، بۆ عەقڵ، کە ببێتە هۆی بەهێزکردنی عەقڵو هۆشو شتێکی ڕەوابێ، ئەوە پاداشتی هەیە، ئنجا ئەگەر ئەوەش نەبێ مادام گوناهی تێدا نەبێ، ئەگەر پاداشتیشی نەبێ، بەڵام هەر شتێکی ڕەوایە، واتە کە دەفەرموێ: (باطل)، واتە: پاداشتی نیە، هەڵبەتە هەرشتێك کە سوودێکی نەبێ، بەڵێ پاداشتی نیە، بەڵام مانای ئەوە نیە کە گوناهیشت دەگاتێ.

٥) - ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾، دوای ئەوەی پێی دەڵێن: بەیانی لەگەڵمان بینێرە، با بۆ خۆی کەیفو یاریی بکات، بێگومان دەشڵێن: ئێمەش بۆ وی پارێزەرین.

دووبارە لێرەدا چوار ئامرازی جەخت کردنەوەیان بەکارهێناون: (إِنَّا، لَهُ، لَـ، حَافِظُون)، بێگومان ئێمە بۆ وی بە جەخت کردنەوەوە، پارێزەرین، واتە: هیچ گومانت نەبێ، زۆر بە دڵنیایی، ئێمە هەموومان ئەو دەپارێزین .

سبحان الله!

هەر کەسێکت بینی زۆر جەختی لەسەر شتێك کردەوە، مەگەر چۆن، ئەگەرنا نیشانەیەکی پرسیاری بخە سەر، چونکە کەسێك لە خۆی ڕاببینێ و متمانەی بە قسەی خۆی هەبێ، پێویست بەوە ناکات زۆر سوێند بخواو زۆر جەخت بکاتەوەو داکۆکیی بکات! هەڵبەتە ئەوانیش ڕاستیان نەکرد، بۆی پارێزەر نەبوون.

٦) - ﴿قَالَ إِنِّي لَيَحۡزُنُنِيٓ أَن تَذۡهَبُواْ بِهِۦ﴾، یەعقووب گوتی: بێگومان ئەوە من خەمبار دەکا، دڵتەنگم دەکات کە ئێوە لەگەڵ خۆتانی ببەن، واتە: بردنی یوسوف دەبێتە مایەی دڵتەنگیی من، لێرەدا مەبەستی ئەوە بووە: بەهۆی ئەوەوە کە لێم دوور دەبێ، دڵتەنگ دەبم، یاخود مەترسیی لێی هەبووەو لە برایەکانی دڵنیا نەبووە، چونکە ئەوان دوایی کە دەڵێن: ﴿مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ﴾، یەعقووب ﷺ، لە وەڵامیاندا ناکرێ شتێك بڵێ، وا نەبێ، ناکرێ شتێك بڵێ، باوەڕی پێنەبێ، بۆیە نەیفەرمووە: نەخێر، من بە ئەمیندارتان دادەنێم، کەواتە: دیارە لێیان دڵنیا نەبووە، هەقیشی بووە کە لێیان دڵنیا نەبووە، وەك باسمان کرد.

٧) - ﴿وَأَخَافُ أَن يَأۡكُلَهُ ٱلذِّئۡبُ﴾، هەروەها دەترسێم کە گورگ بیخوات.

لێرەدا وشەی (ٱلذِّئۡبُ)، کە ئەلیف و لام (أل)ی لەسەرە، (التعریف للجنس، وهو هنا مرادٌ به غیر معین من نوع الذئب) دیارە مەبەستی ئەوەیە گورگ بەگشتی، نەك گورگێکی دیارییکراو.

٨) - ﴿وَأَنتُمۡ عَنۡهُ غَٰفِلُونَ﴾، لە حاڵێکدا کە ئێوە لێی بێئاگان، یانی: بەهۆی بێئاگاییتانەوە، گورگ بیخوات، واتە: وا تێمەگەن: من پێم وایە کە ئێوە ناتوانن یوسوف بپارێزن، دەتوانن بیپارێزن، بەڵام دەترسم لێی بێئاگابن و گورگ بیخوا.

لێرەدا یەعقووب ﷺ دوو پاساو دێنێتەوە، بۆ ئەوەی یوسوف لەگەڵ خۆیان نەبەن:

یەکەم: دڵتەنگیی بەهۆی دووریی و دوورکەوتنەوەیەوە.

دووەم: ئەوە کە بە گورگان خواردوو بچێ.

**٩) -** ﴿ قَالُواْ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ ﴾، گوتیـان: ئەگـەر گـورگ بیخـواو ئێمـەش دەسـتەیەك پیاوین، (عُصْبَةٌ )، واتـە: كۆمەڵە پیاوێك، وەك پێشتـر گوتمان لە (سێ)وە تاكـو (دە)، هەندێكیش گوتوویانـە: لـە (دە)وە تـاكـو (چـل)، هەندێكیش گوتوویانە: لە (سـێ)وە تـاكـو (حەوت)، بـەڵام گرنگ ئەوەیـە ئەوان دە كەس بـوون‌و، بـە هـەموو واتایـەكان، عوصـبەیەك بـوون، واتـە: دەستە پیـاوی بەهێـزو پێـزو تۆكمـەو دامـەزراوبوون، ئنجـا (عُصْبة)، وشـەی (عصابة)شـی بۆ بەكـاردێ .

شـارەزایانی زمـان دەڵـێن: ڕسـتەی: ( قَالُواْ لَئِنْ)، ئـەو (ل)ە، (الـلاّمُ مُوَطِّئَةٌ للقَسَمِ)، ڕێخۆشـكەرە بۆ سوێند، واتە: سـوێند بە خوا، ئەگەر گورگ بیخوات، لـە حاڵێكدا كە ئێمـە دەستە پیاوێكی تۆكمـەو دامەزراویـن .

**١٠) -** ﴿إِنَّآ إِذًا لَّخَـٰسِرُونَ ﴾، لێرەشـدا دووبارە چوار ئـامرازی جەخـت كردنەوەو داكۆكییكردنیان بەكارهێنـاون: (إنا، إذاً (الجوابية)، لـ، خاسـرون)، هەڵبەتە لێرەدا مەبەسـت لە (خسران)، بریتیە لە: (إنتفـاء نَفْـع يُتَوقَّـعُ مـن الرِّجـال)، لاچوونـی سـوودێكە لە پیـاوان چـاوەڕێ دەكرێ، سوودێك كە لە پیاوان چـاوەڕێ دەكـرێ، چییـە؟ بریتیـە لە هێزو پێـزی توند، بە جۆرێك شتێك كـە پێیـان دەسپێردرێ، بیپارێزن‌و، خاوەنی قسەی خۆیان بن، یانی ئێمە كۆمەڵە پیـاوێكی فاشـیل‌و هـیچ لەبارانـدا نەبووین، ئەگـەر لە پەنای ئێمەدا گـورگ یوسـوف بخـوات، كـە دیـارە ڕاستیشـیان كـرد، بـە دڵنیاییـەوە زیانبـار بـوون، ئـەو سـوودەی كە بابیـان لێـی چـاوەڕێ دەكـردن، نەیـانـهێنایە دی .

**مەسـەلەی پێنجـەم :** بردنیـان بـۆ یوسـوف‌و، كـۆبوونـیان لەسـەر بڕیـاری فڕێـدانە بنـی بیـری‌و، ئیلهـامـكردنی خـواش بۆ یوسـوف كە دەربـازی دەبـێ‌و، ئەو ڕەفـتارە وەبیـر برایەكـانی دێنـێتـەوە، لە كـاتێـكـدا كە هەسـت ناكـەن:

وەك دەفـەرموێ: ﴿ فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓاْ أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَـٰبَتِ ٱلْجُبِّ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَـٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٥﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە سێ بڕگەدا :**

**١) -** ﴿ فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ ﴾، دوای ئەوەی بردیـان .

وەك پێشتریش گوتم: لێرەدا چەند قسەیەك قرتێنراون كە بەهۆی سیاقەوە، دەزانرێن، واتە: دوای ئەوەی خۆیان پێچایەوە، ئنجا بابیان قەناعەت پێهێنا، لە هەندێك تەفسیرەكاندا دەڵێ: بابیان ماوەیەك لەگەڵیاندا ڕۆیشتو هەرچاوی لە یوسوف بوو، چاوی لە دوایانەوە بوو، دڵی خەبەری داوە كە تازە یوسوف بە گچكەیی نابینێتەوە، بە پێی هەندێك ڕیوایەتان دەڵێ: چل (٤٠) ساڵی بەین بووە، كە دوایی یوسوفیان لە میسر بینیوەتەوە .

**٢) -** ﴿ وَأَجْمَعُوٓاْ أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ ﴾، هەروەها كۆبوون لەسەر ئەوە كە بیخەنە نێو تاریكایی بیرەكەوە، یاخود پەنهانی بیرەكەوە، چونكە هەندێ لە زانایان گوتوویانە: (غیابَة)، یان (غیابات)، كە بە هەردووكیان خوێندراوەتەوە: (غیابت الجب)، یان (غیابات الجب)، كاتی خۆی كە بیریان هەڵكەندوە، لە بنی بنەوەی، پێش ئەوەی بگاتە ئاوەكە، ئەو لاو لایان كۆڵیوە، بۆ ئەوەی ئەگەر كەسێك بیەوێ ئاو هەڵێنجێ، لەو پەنایەدا دابنیشێو دۆڵچەكە پڕبكا.

هەندێكیش گوتوویانە: (غیابَة)، یان (غیابات)، هەر بە بنی بیرەكە دەگوترێ، لەبەرئەوەی كە تاریكەو نابینرێ، پێشتریش گوتمان: (غِيَابَة أَي شيءٍ، ما لا تُبْصِرُهُ العَيْن)، غیابەتی هەر شتێك ئەوەیە كە چاو نایبینێ، واتە: بنەوەی كە قووڵەو تاریكەو نابینرێ .

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ وَأَجْمَعُوٓاْ ﴾، یانی: (اتَّخَذُوا قَرَارَهُمْ جَمِيعَاً) تێكڕا بڕیاریاندا، (أجمعوا)، هەم بە مانای بڕیاریانداو دڵیان لەسەر چەسپاند، دێ، هەم بە مانای ئەوە كە هەموویان كۆك بوون لەسەر ئەو بڕیارە .

لێرەدا شتێك قرتێنراوە كە بە لێوردبوونەوە دەزانرێ: دوای ئەوەی كە بڕیاریاندا بیخەنە تاریكایی بیرەكەوە، بنی بیرەكەوەو، ئەوەیان كرد كە بڕیاریان لەسەردا : (وَفَعَلُوا ما أَجمَعُوا عَلَيْهِ).

٣) - ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾، ئیدی سروشمان بۆ کرد، دیارە کە مەبەست پێی یوسوفە، واتە: سروشمان بۆ یوسوف کرد کە: بێگومان {بە لام (ل)ی تەئکید، بە نوون(ن)ی تەئکید}، دڵنیابە تۆ هەواڵیان پێدەدەی بەو کارەیان، بەو ڕەفتارەیان، کە ئێستا لەگەڵ تۆدا کردیان، ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەوان هەست ناکەن.

ئنجا ئایا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَيْنَآ﴾، مەبەست پێی چییە؟!

ئێمە پێشتریش لە سوورەتی (یونس)دا، باسێکی تایبەتمان کرد دەربارەی وەحیی، یەکێك لە مانایەکانی وەحیی، بریتییە لە ئیلهام، خوای پەروەردگار تەنانەت بۆ هەنگ دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ...﴿٦٨﴾﴾النحل، پەروەردگارت وەحیی کرد بۆ هەنگ، کە مەبەست پێی ئەو فێرکردنە غەریزییەیە کە خوا هەنگی وا ڕاهێناوە: شیلەی گوڵان بمژێو هەنگوین دروست بکات.

کەواتە: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ﴾، دەگونجێ مانایەکەی: (أَلْهَمْنَا إِلَيْهِ)بێ، واتە: خورپەمان خستە دڵیەوە، واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە خوا فریشتەیەکی ناردبێ لە شێوەی پیاوێکدا خۆی پێشان دابێو گوتبێ: یوسوف! من فریشتەیەکم لە لایەن خواوە هاتووم، ئاگادارت بکەمەوەو دڵنیات بکەمەوە، کاتێك دێ تۆ ئەو ڕەفتارە نالەبارە بیری برایەکانت دەخەیەوە، بێ ئەوەی ئەوان هەستی پێبکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا﴾، یانی: هەواڵی ئەم ڕەفتارە، ئەم کارە خراپە کە لەگەڵ تۆیاندا کرد، پێیان دەدەی، ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾، واتە: لەوکاتەدا کە تۆ ئەو شتەیان پێ دەڵێیەوە، ناتناسنەوەو هەست ناکەن کە تۆ برایانی، ئەمەیش هەڵبەتە هاتە دی، کە لە سوورەتی (یوسف)، ئایەتی (٨٩)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿قَالَ هَلْ عَلِمْتُم مَّا فَعَلْتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذْ أَنتُمْ جَٰهِلُونَ﴾، واتە: پێی گوتن: ئایا دەزانن وەبیرتان دێتەوە، ئەوەی کە کردتان بە یوسوفو بە برایەکەی، لە

کاتێکدا کە ئێوە نەفام بوون؟ کە ئەوە جۆرێك لە پۆزش هێنانەوەشە بۆیان، واتە: ئێوە ئەو کاتە نەفامو نەزان بوون، ئەگەرنا ئەو کارەتان نەدەکرد .

کەواتە: یەکسانە: خوای زاناو توانا لەو کاتەدا، چ وەحیی بۆ کردبێ، بە مانا زاراوەییەکەی وەحیی، واتە: فریشتەیەکی نارد بێ، یاخود وەك خورپەیەك خستبێتیە دڵیەوەو ئیلهامی بۆ کردبێو بەرچاو ڕوونییەکی دابێتێ، بە شێوەیەك لە شێوەکان، ئەمە لە هەردوو حاڵەندا دڵنیاکردنەوەی خوا بووە بۆ یوسوف ﷺ کە لەو بیرەدا نافەوتێو، چاویشت بە برایەکانت دەکەوێتەوەو، هەواڵیشیان پێ دەدەیو، ئەو شتەشیان دەخەیەوە بیر، لە حاڵێکدا کە ئەوان تۆ ناناسن، ئنجا بە دڵنیاییەوە ئەوەی خوا فەرمووی، لە ئایەتی (٨٩)دا باسکراوە، کە ڕێك خوا چۆنی فەرمووە، بەو شێوەیە هاتۆتە دی .

**مەسەلەی شەشەم: لە شەوداو بە گریانەوە گەڕانەوەی کوڕەکانی یەعقووب بۆ لایو، هەواڵ پێدانی کە لە کاتی پێشبڕکەو غارغارێندا (بە ئەسپەکانیان، یان بە حوشترەکانیان)، یوسوفیان لە لای کەلو پەلەکەیان جێهێشتوەو، گورگ هاتووەو خواردوویەتیو، تێهەڵسونی خوێنی درۆش لە کراسەکەی :**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ يَبۡكُونَ ١٦ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ وَتَرَكۡنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ١٧ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ١٨ ﴾.

**توێژینەوەو شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە بەپێزە لە حەوت بڕگەدا :**

١) ـ ﴿ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ ﴾، دەمەو خەوتنان هاتنەوە بۆ لای بابیان، (العِشَاءُ: وَقْتُ غَيْبُوبَةِ الشَّفَقِ البَاقِي مِنْ بَقَايَا شعاع الشَّمْسِ بَعْدَ غُرُوبِهَا) (عِشَاءُ)، ئەو کاتەیە کە سوورایيەك کە لە تیشکی خۆر پەیدا دەبێ، دوای ئەوەی کە خۆر

ئاوا دەبێ، ئەو سووراییە نامێنێ، پێی دەگوترێ: (عِشَاء)، واتە: لە تاریکایی شەودا، دوای خەوتنان هاتنەوە بۆ لای بابیان .

**٢) -** ﴿يَبۡكُونَ﴾، واتە: بە گریانەوە، جارێ بۆیە بە شەوێ گەڕاونەوە، چونکە بە شەو ڕووخساری مرۆڤ جوان دیار نابێ، بە تایبەتی ئەوکاتە کە دیارە هۆکارو ئامڕازەکانی ڕووناك کردنەوە: چراو فانۆس و گڵۆپ و ئەوەی کە ئێستا هەیە بە دڵنیاییەوە، ئەو کاتە نەبووە، بۆ ئەوەی ڕووخسارو ڕوویان دیارنەبێ و بشاردرێتەوە لە بابیان، تاکو ئەو درۆو دەلەسەیەی کە ڕێکی دەخەن، باش بەسەر ئەندامەکانیان و ڕووخساریانەوە، دیار نەبێ و بابیان بە ڕوونیی نەیخوێنێتەوە، هەرچەندە بابیان هەر پێشتریش زانیویەتی کە ڕاست ناکەن .

ئنجا ﴿يَبۡكُونَ﴾، واتە: دەگریان، دیارە بە (فعل المضارع)، هێناویەتی یانی: بەردەوام دەگریان، یان بۆ ئەوەی وێنەکەمان بخاتە بەرچاو، کە ئەوە بە گریانەوە هاتوونەوە لای بابیان .

سبحان الله !

دیارە ئەو کوڕانە زۆر هونەرمەند بوون لەوەدا کە گریان بێننە خۆیان! (بُكاء)، هەیەو (تَباكي)، (بُكاء)، ئەوەیە کە مرۆڤ بۆ خۆی بە هاندەرێکی دەروونی بگری، (تَباكي)، ئەوەیە کە خۆی بگریەنێ، کە بە دڵنیاییەوە هەموو کەس ناتوانێ خۆی بگریەنێ، دیارە ئەو کوڕانە هونەرمەند بوون لەوەدا، مەرجیش نیە هەمووشیان وابووبن، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە بە گشتی حاڵەتی گریانیان هەبووە، جا زانایان دەڵێن: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گریانی کەسێك بەڵگە نیە لەسەر ئەوە کە ڕاست دەکات، چونکە ڕێی تێدەچێ کە ئەوە بە (تَكَلُّف) و (تَصَنُّع)، گریانی هێنابێتە خۆی، هەر بۆیە لەوبارەوە عەرەب دەڵێن: (دُمُوعُ الفَاجِرِ بِيَدَيْهِ)، فرمێسکەکانی مرۆڤی خەتاکارو تاوانبار بەدەست خۆیەتی .

**٣) -** ﴿قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ﴾، گوتیان: ئەی بابی خۆمان! ئێمە ڕۆیشتین پێشبڕکەمان دەکرد.

(نَسْتَبِق: إفْتِعَال مِنَ السَّبْقِ وَهُوَ هُنَا بمَعْنَى التَّسَابُق)، (نَسْتَبِق) لەسەر کێشی (إفْتِعَال)ە، کە مەبەست پێی پێشبڕکێو غارغارێنە بە وڵاخەکانیان، ئنجا ئەگەر ئەسپ بوون، ئێستر بوون، حوشتر بوون، گوێدرێژ بوون، گرنگ ئەوەیە پێشبڕکێیان پێکردوون، واتە: لە حاڵێکدا کە ئێمە پێشبڕکێو غارغارێنمان دەکرد .

٤) - ﴿ وَتَرَكۡنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا ﴾، یوسوفمان لەلای کەلو پەلەکانمان بەجێهێشتبوو، دیارە لەبەر ئەوەی گچکە بووە، نەیتوانیوە ڕمبازێنو غارغارێنو پێشبڕکە بکات، گوتوویانە: ئاگات لە کەلوپەلەکان بێ، (المَتَاعُ: مَا يُتَمتَّعُ بِه والمُرَادُ هُنَا ثِقَالَةٌ مِنَ الثياب والآنية والذهب)، (متاع): هەر شتێکە کە کاتی لەگەڵ بگوزەرێنرێو سوودو بەهرەی لێ وەربگیرێ، لێرەدا مەبەست پێی ئەو شتە قورسانەیە کە نەیانتوانیوە لەگەڵ خۆیانیان بەرن، لە جلو بەرگو قاپو قاچاغو زادو زەخیرەو توێشوو، کە پێیان بووە.

٥) - ﴿ فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ ﴾، گورگ خواردی، وەك پێشتر گوتمان: (أل) ئەلیفو لامی سەر (ٱلذِّئۡبُ)، بۆ جینسە، واتە: جینسی گورگ، نەك مەبەست پێی گورگێکی دیارییکراو بێ.

# باسێک لە بارەی پێشبڕکە (مسابقە)وە

فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە هەیە کە دەفەرموێ: {لا سَبَقَ إلاّ فِي خُفٍّ أَوْ نَصْلٍ أَوْ حَافِرٍ}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٤٧٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٥٧٤)، وَالتِّرمِذِي برقم: (١٧٠٠) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٥٨٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٨٧٨) وصححه الألباني}.

واتە: دروست نیە پێشبڕکە بکرێ، مەگەر بە حوشتر، یاخود بە تیر (تیرئەندازی)، یاخود بە یەك سم، (واتە: وڵاخەبەرزە)، واتە: تەنیا لەوانەدا دەکرێ، هەڵبەتە ئەوکاتە بە گشتی ئەوانە هەبوون پێشبڕکەیان پێبکرێ، یان تیرئەندازیی بووە، یان بە سواری حوشتر غارغارێنیان کردوە، یان بە سواری ئەسپو یەك سمو ئەوانە بووە، ئەگەرنا مەبەست ئەوەنیە کە بە غەیری حوشترو وڵاخەبەرزە، پێشبڕکە دروست نەبێ، ئێستا بە سەیارە، بە فڕۆکە، بە ماتۆڕو پاسکیل، بە کەشتییو بە بەلەم، بە دڵنیاییەوە ئەو ئامڕازانە ئەو کاتە نەبوون، پێغەمبەر ﷺ ئەو چەند نموونەی هێناونەوە، بۆ ئەوەی شتی دیکەشیان قیاس بکرێتە سەر، کە دوایی پەیدادەبن .

ئنجا لێرەدا (قُرطُبي) دەڵێ: {وَقَدْ زَادَ أُبو البُخْتري القَاضِي فِي حَدِيث الخفّ والحافر والنصل (أَوْ جَنَاحٍ) وَهِيَ لَفْظَةٌ وَضَعَهَا للرشِيد، فَتَرَكَ العُلَمَاء حَدِيثَهُ لِذَلِكَ وَلِغَيْرِه مِنْ موضُوعاته، فلا يكتب العُلَمَاء حَدِيثه بحَال}[1].

واتە: قازی ئەبولبوختوریی (دیارە یەکێك بووە لەو جۆرە بە ناو زانایانەی کە لە دەوری دەسەڵاتدارانو شتیان بۆ ڕەشەرع دێخنو، فتوای هەڵەیان بۆ دەدەنو، بە هەوای وان هەڵدەپەڕن)، وشەی (أو جناح)ی خستە گەڵ ئەو فەرموودەیە (لا سَبَقَ إلاَّ فِي خُفٍّ أَوْ نَصْلٍ أَوْ حَافِرٍ)، ئەو ئەوەشی بۆ زیاد کرد

١) الجامع لأحكام القرآن، ج٩، ص١٢١.

(أو جَنَاحٍ)، واتە: خاوەن باڵ، دەڵێ: لەبەر ئەوەی هاڕوونە ڕەشید کۆتری هەبوون، پێی خۆش بووە کە پێشبڕکە بە کۆتران بکات، ئەویش هەڵسا ئەم (جناحٍ)ەشی بۆ هاڕوونە ڕەشید زیاد کرد، لەبەر ئەوە زانایان ئەو فەرموودانەی کە ئەو کابرایە (قاضي أبو البختري) گێڕاونیەوە، وازیان لێهێناون، لەبەر ئەوەو لەبەر ئەوەی شتی دیکەشی هەڵبەستوە، هەر بۆیە زانایان بە هیچ شێوەیەك ڕیوایەتەکانی ئەویان نەنووسیون، بەڵکو من لە سەرچاوەی دیکەدا خوێندومەتەوە کە هاڕوونە ڕەشید دوای ئەوەی کە ئەبول بوختوریی ڕۆیی، زانی کە لەبەر وی دەستکاریی ئەو حەدیسەی کردوە گوتی: بێنن ئەو کۆترانە هەموویان سەربڕن، چونکە بەهۆی ئەو کۆترانەی منەوە بوو کە ئەو کابرایە دەستکاریی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺی کرد، ئیدی هەموو کۆترەکانی سەربڕی، کە دیارە لەو هەڵوێستەدا، هاڕوونە ڕەشید لە قازییەکە مسوڵمانترو لە خواترستر بووەو، زیاتر سوور بووە لەسەر ئەوەی دین تێکنەدرێ‌و وەك خۆی بهێڵدرێتەوە.

هەر لە بارەی پێشبڕکەوە، ئەم فەرموودەیەش هەیە: {عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ كَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ نَاقَةٌ تُسَمَّى الْعَضْبَاءَ لاَ تُسْبَقُ، فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ عَلَى قَعُودٍ فَسَبَقَهَا، فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ حَتَّى عَرَفَهُ، فَقَالَ: حَقٌّ عَلَى اللهِ أَنْ لا يَرْتَفِعَ شَيْءٌ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ وَضَعَهُ}، {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٦٥٠١)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: ٤٨٠٥)، وَالنَّسَائِيُّ في الكبرى برقم: (٤٤٣٣)}.

واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حوشترە مێیەیەکی هەبوو پێی دەگوترا: (عَضْبَاء) کە هیچ حوشترێك پێشی نەدەکەوتەوە، زۆر خێرا بوو، عەرەبێکی خێڵەکیی هات سواری حوشترێك بوو کە بە کەڵکی سواریی دەهات، (چونکە هەموو حوشترێك بە کەڵکی سواریی نایە)و، پێشبڕکەی کرد لەگەڵ ئەو حوشترەی پێغەمبەردا ﷺ و پێشی کەوتەوە، ئەوەش لەسەر مسوڵمانان قورس بوو، هەتا پێغەمبەر ﷺ هەستی پێکرد (کە پێیان ناخۆش بوو)، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە هەقێکە لەسەر خوا، (واتە: خوای دادگەر ویستی وایە) کە هیچ شتێك بەرز نابێتەوە لە دنیادا، مەگەر نزمی دەکاتەوە.

یانی: ئەو حوشترەی من لەبەر ئەوەی پێتانوابوو هیچ حوشترێك پێشی ناكەوێتەوە، حوشتری ئەو عەرەبە خێڵەكییە هاتو پێشی كەوتەوە، چونكە نابێ هیچ شتێك بەرزیی ڕەهاو پێشكەوتنەوەی ڕەهای هەبێ، دروستكراوەكان هەموویان لە ئاستی یەكدان، ئەو پێشی ئەو دەكەوێ، ئەو پێشی ئەو دەكەوێتەوە، بەرزیی ڕەها تەنیا بۆ خوای بەرزو بێ وێنەیە .

٦) - ﴿ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴾، تۆش بۆ ئێمە بە ڕاست دانەر نی، هەرچەندە ڕاستگۆش بین.

(أبو جعفر الطبري)[1] دەڵێ: ئەو ڕستەیە دوو مانای هەڵە دەگەیەنێ: كە مەبەست نین :

یەكەم: ﴿ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴾، ئێمە ئەگەر لە ڕاستانیش بین تۆ بڕوامان پێ ناكەی، واتە: بەڵام ئێمە لە درۆزنانین، كە بە دڵنیاییەوە مەبەستیان ئەوە نەبووە، واتە: ئەم مانایە هەرچەندە ڕواڵەتی ڕستەكە دەیگەیەنێ، بەڵام مەبەست نیە لێرەدا.

دووەم: ﴿ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴾، واتە: ئەگەر ئێمە لەگەڵیشتدا ڕاست بكەین، تۆ هەر بە ڕاستمان دانانێی، كە ئەمەش لێرەدا مەبەست نیە، چونكە بە دڵنیاییەوە، ئەگەر ئەوان لەگەڵ بابیان ڕاستیان كردبایە، بابیان بە ڕاستی دادەنان.

ئەدی مەبەست چییە؟ مەبەست پێی ئەو مانایەیە: (وَمَا أَنْتَ تُصَدِّقنا وَلَو كُنَّا مِنْ أَهْلِ الصِّدْقِ الَّذِينَ لا يُتَّهمُونَ، لِسُوء ظَنِّكَ بنَا)، تۆ ئێمە بەڕاست دانانێی، هەرچەندە ئێمە خاوەن ڕاستییەك بین كە تۆمەتباریش ناكرێین، چونكە تۆ گومانی خراپمان پێ دەبەی.

---

١) جامع البيان ج٧، ص١٧١، رقم: ١٨٧٦٢.

هـەڵبەتە لـێرەدا ئەو پـەندە عەرەبییـەیان بەسـەردا دەچەسپێ، كە دەڵێ: (يَكَادُ المُرِيبُ أَنْ يَقُولُ: خُـذُونِي)، بابـای گومانـلێكراو خەریكـە بڵـێ: وەرن بمگرن، مـن ئەو خراپـەیەم كـردوە، ئنجا دزییـە، خراپەیـە، هـەر شـتێك هەیـە، ئـەوانیش هـەر لەڕێـوە گوتوویانە: تۆ ئێمـە بە ڕاست دانـانێی، ئەگەر ئێمـە خـاوەنی ڕاستییش بین، بۆچی؟ چونكە لـە قووڵایی نەفسی خۆیانـدا زانیویانـە كە درۆ لەگەڵ بابیان دەكەنو، بابیشـیان وا بە ئاسانیی كڵاوی ناچێتە سەر، هەموو پێغەمبـەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لە لووتكەی هۆشیاریی‌و عـەقڵ‌و شارەزایی‌و بلیمـەتیی‌و زیرەكیی دابوون، بەڵام زۆرجار نـەجابـەت‌و نەزاكـەت‌و ئـەدەبی پێغەمبـەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، ناچاری كردوون شـتێك كە دەشـزانن وانیە، خۆی لـێ بێدەنگ بكەن، یـان پشت گوێی بخـەن، یـان چاوپۆشیی لێبكـەن، بەرانبەرەكەشـیان كـە لـە هەمبانـەی خۆیـدا گـوێزی ژمـاردوە، وایزانیـوە ئـەو پێغەمبـەرە سادەیەو، توانیـویانە فێڵـی لێبكەن‌و هـەڵی خەڵەتێنـن .

٧) - ﴿ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍ ﴾، خـوێنێكی درۆشـیان لـە كراسـەكەی هەڵسـوو، لێرەدا دەڵـێ: (وُصِفَ الدَّم بالكَذِبِ، وَصْفَ المَصْدَرِ، وَالمَصْدَرُ هُنَـا بمَعْنَى المَفْعُول، كَالخَلْق بمَعْنَى المَخْلُوق، أَي: مَكْذُوبٍ، كَوْنُهُ دَم يُوسُف ﷺ، إِذْ هُوَ دَم جَدي فَهُوَ دَم حَقّاً، لَكِنَّهُ لَيْسَ الدم المَزْعُوم)، واتە: خوێنـێك كـە درۆی تێـدا كـراوە .

وشـەی (دَم)، لێرەدا كە بە (كَذِبِ) - كـە چاوگـە - وەسف كراوە، لێرەدا ئـەو چاوگە مەبەسـت پێـی (مَفعـول)ە، یـانی: (دمٍ مكذُوبٍ)، وەك: (خَلْق)، بـە مانـای (مَخْلُوق) دێ، واتە: دروست كراو، بۆچی؟ چونكە ئەو خوێنە درۆ بـووەو نـەدەبوو بڵـێن: خـوێنی یوسـوفە، خـوێنی كـاریلەیـەك بـوو، یاخـود بەرخۆڵـەیەك بـووە، سـەریان بڕیـوە، واتە: خوێن بووە، بەڵام ئەو خوێنـە نەبووە كە ئـەوان گوتوویانـە: كە خوێنـی یوسوفە، بۆیـە خوا دەفـەرموێ: ﴿ بِدَمٍ كَذِبٍ ﴾، خوێنێـكی درۆ .

**مەسـەلەی حـەوتـەمو کۆتـایی**: وەڵامدانـەوەی یەعقـووب بـەوە کــە: نەفســتان کـردەوەیـەکـی بۆ جـوان کـردوون و ئەنجـامـتان داوە، منـیش بە جـوانیـی خـۆم ڕادەگرم، پـەنـاش بـە خـوا دەگـرم لە بەرانبـەر قسـەکانتـاندا:

چـەند بـە نەزاکـەت و ئـەدەب و وشـەی جوان، وەڵامـی ئـەو هەڵوێسـتە خراپـەی کورەکانی دەداتــەوە !

﴿ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرًاۖ فَصَبۡرٌ جَمِيلٌۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ ﴾.

**لە سـێ بڕگــەدا، ئەو وەڵامـەی یـەعقـووب دەخـەینـەڕوو:**

**١) -** ﴿ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرًا ﴾، (یەعقــووب) فــەرمووی: بەڵکــو نەفسـتان کارێکی بۆ جـوان کـردوون.

نازانـێ ئـەو کـارەی کـە نەفسیان بـۆی جـوان کـردوون، چـییە؟ بـەڵام دەزانـێ ئەنجامەکەی دوورخستنەوەی یوسـوفە، بۆیـە دەفـەرموێ : (سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ)، بە نەزانراوی دەیهێڵێـتـەوە، (التَّسْوِيل: التَّسْهِيل وَتزيِين النَّفْس مَا تحْرِص عَلَى حصُولِه)، (تسْوِيل): بە مانای ئـاسـان کردن و جوان کردنـی نەفسە بـۆ شـتێك کە سوورە لەسەر ئەنجامدانی، کە دەفەرموێ: (أَمۡرًا)، مەبەست پێی شـتێکی نەزانراوە: نازانـێ کوشـتوویانە، فرۆشـتوویانە، دووریان خسـتۆتەوە، چییان لێکردوە؟.

**٢) -** ﴿ فَصَبۡرٌ جَمِيلٌ ﴾، واتـە: کـاری من بریتیە لە خـۆڕاگرتنێکی جـوان.

(الصَّبْرُ الجَمِيل: أَلاَّ تَشْكُو إِلى أَحَدٍ)، خۆڕاگـریی جـوان، خـۆڕاگریی بـاش و پەسـند، ئەوەیـە: کـە تـۆ سـکاڵای خـۆت لـەلای کـەس نەکـەی، وەك لـە سـوورەتی یوسـوف، لـە ئایـەتی (٨٦)دا، یـەعقووب ﷺ دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، بێگومان من تەنیا ئەو خەم و خەفەت و دڵنـاڕەحەتییـەی خۆم

(کە دەبێ بلاَو بکرێتەوە)، ئەو پەژارەو خەمبارییەی خۆم، تەنیا بۆ لای خوا سکالاَ دەکەم، کە دەلێ: ﴿فَصَبۡرٞ جَمِيلٞ﴾، یانی: (فَشَأْنِي وَدَيْدَنِي صَبْرٌ جَمِيل)، حالَی منو کاری من، بریتیە لە خۆڕاگرییەکی جوان .

٣) - ﴿وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾، واتە: هەر خواش پەنا پێبراوە لەسەر ئەوەی کە دەیلێن، واتە: هەر پەنا بە خوا دەگرم لە بەرانبەر ئەوەدا کە دەیلێن، تەماشا بکەن! چەند بە ئەدەبە، نافەرموێ: (عَلَى مَا تَكْذِبون)، دەشزانێ درۆ دەکەن، لەوەدا کە گوتوویانە، بەلاَم بە تەعبیرێك هێناویەتی، کە شایستەی پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) .

لێرەدا ئاماژە بەم دەقە بکەین باشە، کە دەفەرموێ: {اتَّقُوا فِرَاسَةَ الْمُؤْمِنِ فَإِنَّهُ يَنْظُرُ بِنُورِ اللهِ}، {أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ بِرقم: (٧٤٩٧)، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ، قَالَ الهَيْثَمِيُّ: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ}.

واتە: خۆتان لە وردبینییو پەنهان بینیی ئیماندار بپارێزن، چونکە بە ڕووناکیی خوا، دەڕوانێ .

دیارە یەعقووب ﷺ و هەموو پێغەمبەران(علیهم السلام) لە هەموو کەس زیاتر خاوەنی فیراسەتو ڕوونبینییو وردبینییو پەنهان بینیی بوون .

هەروەها بە بۆنەی ئەوەوە کە یەعقووب ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾، ئەم فەرموودەیە دێنین: {تَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنْ جَهْدِ الْبَلاَءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ}، {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٦٢٤٢)، وَالْحُمَيْدِيُّ بِرقم: (٩٧٢)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٧٠٧)، وَأَبُو يَعْلَى بِرقم: (٦٦٦٢)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (١٠١٦)}.

واتە: پەنا بە خوا بگرن لە بەلاَیەك کە نارەحەتتان دەکاتو، لەوە کە بەدبەختییو بێ مرادییتان تووش بێو، لەوە کە بڕیاری خراپتان لەبارەوە بدرێو، بەلاَی خراپتان بەسەربێو، لەوە کە دوژمن پێتان خۆشبێ.

هەروەها لەوبارەوە كە خوای كارزان بەندە چاكەكانی خۆی تاقی دەكاتەوەو مەرج نیە ئەوەی كە بەسەر یەعقووب ﷺدا هاتوە، سزای خوا بێ، وەك پێشتریش باسمان كرد، لەسەر ئەوە كە: – وەك كوڕەكانی دەعوایان كردوە – یوسوف و بنیامینی بەسەر ئەواندا هەڵبژاردبن! وەك هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان ئاماژەیان پێداوە، بێئەوەی بیر لەوە بكەنەوە، كە ئەوە جۆرێكە لە تانەدان لە عیصمەت و پارێزراویی پێغەمبەران لە گوناهەكان، كە بێگومان ئەگەر بابێك جیاوازیی بخاتە نێوان كوڕەكانی و هەندێكیان بەسەر هەندێكیاندا هەڵبژێرێ، ئەوە نادادگەرییەو زوڵمە، زوڵم و نادادگەرییش لەگەڵ پایەی بەرزی پێغەمبەراندا ناگونجێ، لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە دێنین :

{وَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى إِذَا أَحَبَّ قَوْماً ابْتَلاهُمْ ، فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَا، وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السُّخْطُ}، {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم : (٢٣٩٦)، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٠٣١)، وَالبَيْهَقِي فِي شعب الإيمان برقم: (٩٧٨٢) قال الألباني : حسن}.

واتە: بێگومان خوای بەرز ئەگەر كۆمەڵێكی خۆشویستن، تاقییان دەكاتەوە، ئنجا هەر كەسێك ڕازی بوو، ئەوە خوا لێی ڕازی دەبێ و، هەر كەسێك تووڕە بوو، تووڕەیی بۆ دەبێ، خوا لێی تووڕەدەبێ .

چونكە مادام خوا ئەوانەی كە خۆشی بوێن، تاقییان دەكاتەوە، دەبێ تۆ دڵت خۆش بێ بە تاقیكردنەوەكە، لەو ڕووەوە كە تاقیكردنەوەی خوایە.

# وەڵامی پرسیارێكی گرنگ

## ئایا كوڕەكانی یەعقووب  هەموویان پێغەمبەر بوون؟

لێرەدا بە باشی دەزانم لە كۆتایی ئەم دەرسەماندا، وەڵامی پرسیارێكی گرنگ بدەینەوە :

**ئایا كوڕەكانی یەعقووب  هەموویان پێغەمبەر بوون؟**

زۆرێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: كوڕەكانی یەعقووب  هەموویان پێغەمبەر بوون، چونكە خوا  بە لای كەمەوە لە سێ شوێنی قورئاندا: (الأسباط)ی لە ڕیزی پێغەمبەران دا هێناون :

١/ لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (١٣٦)دا، خوا دەفەرموێ : ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾.

واتە: بڵێن: بڕوامان بە خوا هێناوەو بەوەی كە بۆ لامان دابەزێنراوەو، بەوەی كە بۆ لای ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقووبو (أسباط)، دابەزێنراوەو، بەوەی كە بە مووساو عیسا دراوەو، بەوەی كە بە پێغەمبەران دراوە، لەلایەن پەروەردگاریانەوە، جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ كامیانو، ئێمە بۆ خوا ملكەچین .

٢/ لە سوورەتی (آل عمران)، ئایەتی (٨٤)دا، دەفەرموێ : ﴿قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ ...﴾.

٣/ لە سوورەتی (النساء)، لە ئایەتی (١٦٣)دا، دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ﴾.

ئنجا ئایا ئەم ئایەتانە، وەك ڕوونكەرەوانی ماناو مەبەستەكانی قورئان زۆربەیان گوتوویانە، بەڵگەن لەسەر ئەوە كە هەر دوازدە كوڕەكەی یەعقووب، یوسوف ئەوە دیارە، بەڵام یازدەكەی دیكەش هەموویان پێغەمبەر بوون ؟

لە وەڵامدا دەڵێم: نەخێر، بەم سێ بەڵگەیە :

یەكەم: لێرەدا كە خوای زانا (أسباط) لە ڕیزی پێغەمبەراندا دێنێ، واتە: لەو دوازدە تیرەو هۆزانەی بەنی ئیسرائیلدا، پێغەمبەران هەبوون، كەسانێك بوون كە وەحییان بۆ هاتوە، چونكە (أسباط)، كۆی (سَبْط)ە، واتە: تیرەو هۆز، ئنجا دوازدە هۆز (سبط)ەكان، لە كوڕەكانی یەعقووب پەیدابوون، واتە: لە نێو (أسباط)دا، پێغەمبەران بوون، ئەگەرنا بێگومان عەشیرەتەكە هەمووی نابێتە پێغەمبەر، كەواتە: لە وەچەی ئەو دوازدە كوڕانەدا، پێغەمبەرانێك بوون، ئەویش مەرج نیە لە هەموویان، ئنجا ئەگەر گریمان لە هەمووشیان بن، گرنگ ئەوەیە كە لە وەچەی وان پێغەمبەران پەیدا بوون، نەك خودی خۆیان، (ئەو كوڕانە)، چونكە وەك گوتمان: وشەی (أسباط)، كۆی (سَبط)ە، كە بە مانای تیرەو هۆز دێ، نەك بە مانای تاكێك، واتە: لەو تیرەو هۆزانەی كە لە یەعقووب وەپاش كەوتوون، پێغەمبەران بوون.

دووەم : بەڵگەیەکی دیکەمان ئەوەیە کە ڕەفتارەکانی ئەو کوڕانە، مسوڵمانێکی تۆزێک باشیش نایانکات، چ جای پێغەمبەران :

١ - حەسوودییو بوغزو غەرەزی زۆر، بەرانبەر بە برای خۆیان.
٢ - ئازاردانی دایكو بابیان.
٣ - هەڵخەڵەتاندنی بابیانو درۆ لەگەڵ کردنی.
٤ - هەوڵدان بۆ کوشتنی برای خۆیان، کە ئەمە ئەوپەڕی دڵڕەقییە.

ئەوانە بەڕاستی مسوڵمانێکی تۆزێك باشیش لە خۆییان ناوەشێنێتەوە، چ جای کەسێك کە پێغەمبەر بێ !

سێیەم : هیچ بەڵگەیەکیش نیە کە دوایی ئەوانە بوونە پێغەمبەر، وەك هەندێك لە زانایان گوتوویانە: تۆبەیان کردوەو بوونەتە پێغەمبەر عليهم السلام!! بەڵام هیچ بەڵگەیەك لەوبارەوە نیە، هەر لەخۆوەش نابێ خەڵك بکرێتە پێغەمبەر، بەڵکو ئەسڵ لە خەڵکی دا، ئەوەیە کە پێغەمبەر نیە، دەبێ بەڵگەیەکی ڕوونو بێ چەندو چوونو دڵنیاکەر هەبێ، کە ئەو کەسە پێغەمبەری خوایە، ئەگەرنا هەر لە خۆمانەوە بۆمان نیە لە ژمارەی پێغەمبەران زیاد بکەین .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# دەرسی سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان چوار (٤) ئایەت لە خۆی دەگرێ، ئایەتەكانی: (١٩ تا ٢٢)، ئنجا ئەم دەرسەمان ئاڵقەی دووەمی بەسەرهاتی یوسوف ﷺ دەخاتەڕوو، كە تێیدا باسی هاتنی كاروانێك و، هەڵگرتنەوەی یوسوف و، دەرهێنانی لە بیر، پاشان بە نرخێكی كەم فرۆشتنی، كراوە، هەروەها باسی ئەوە كراوە كە كڕیارەكەی یوسوف خەڵكی میسڕ بووەو، بە ژنەكەی خۆشی گوتوە كە خزمەتی بكات، هەڵبەتە دوایی بۆمان دەردەكەوێ كە ئەوە نەك هەر پیاوێكی ئاسایی بووە، بەڵكو عەزیزی میسڕ بووەو، بە پێی هەندێك سەرچاوە: والی میسڕ بووە، نەك حاكمی گەورە، بەڵام والی و سەرپەرشتیاری ئەو شارە بووە، هەندێكیش دەڵێن: وەك لە پەیمانی كۆندا هاتوە، (كَانَ رَئِیس حَرَسِهِ)، سەرۆكی پاسەوانەكانی، واتە: وەك وەزیری بەرگریی بووە، یاخود فەرماندەی سوپا، سوپاسالار بووە .

ئنجا ئەو پیاوە بە ژنەكەی خۆی گوتوە: كە خزمەتی یوسوف بكات و ڕێزی بگرێ، بە ئومێدی ئەوەی كە لێی بەهرەمەندبن، یاخود بیكەنە كوڕی خۆیان .

پاشان خوای كاربزان باسی ئەوەی كردوە كە یوسوفی لە بیرەوە هێناوەتە نێو كۆشك و، پێگەیەكی باشی بۆ ڕەخساندوە، دواتریش كە باڵغ بووەو گەیشتوە بە قۆناغی پیاوەتیی و تین و تاقەت، خوا حیكمەت و زانیاریی پێداوە .

﴿وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ وَأَسَرُّوهُ
بِضَٰعَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ١٩ وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۭ بَخۡسٖ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ
وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ٢٠ وَقَالَ ٱلَّذِي ٱشۡتَرَىٰهُ مِن مِّصۡرَ لِٱمۡرَأَتِهِۦٓ
أَكۡرِمِي مَثۡوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗاۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي
ٱلۡأَرۡضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ
ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٢١ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٢٢﴾.

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

(دوای ئەوەی یوسوف خرایە نێو بیر) کاروانێك هات ئاو کێشەکەیانیان نارد، ئەویش دۆڵچەکەی داهێشت (ە نێو بیرەکە)، گوتی: ئای موژدە! ئەوە مێر منداڵێکە، ئنجا وەك کاڵایەك (ی بازرگانیی) پەنهانیان کرد، خواش زانایە بەوەی کە دەیکەن ﴿١٩﴾ ئنجا بە نرخێکی داشکاو، چەند درەمێکی ژمێرراو، فرۆشتیانو بە کەم بایەخیان دانا ﴿٢٠﴾ ئەو کەسەش کە لە میسر کری، بە ژنەکەی خۆی گوت: قەدری جێگاو ڕێگای بگرە، بەڵکو سوودمان پێ بگەیەنێ، یان بیکەینە ڕۆڵەمان، ئاوا لەسەر زەمین (ی میسر)دا پێگەمان بە یوسوف دا، بۆ ئەوەی (دواتر) لە مانا لێکدانەوەی خەونانی فێر بکەین، خواش بەسەر کاری خۆیدا باڵادەستە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن ﴿٢١﴾ ئنجا کاتێك (یوسوف) گەیشتە هەرەتی لاوێتیی خۆی، حیکمەتو زانستمان پێداو، هەر ئاواش پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ﴿٢٢﴾.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(سَيَّارَةٌ) : (السيارة: القافلة)[1]، واتە: كاروانێك، یاخود (الجماعة السائرة) كۆمەڵە خەڵكێك كە بە ڕێدا بڕۆن، یان زۆر ڕێڕەویی بكەن.

(وَارِدَهُمْ) : (ساقيهُم) ئاوكێشەكەیان، (الوَارِدُ: الَّذِي يَتَقَدَّم القَوْم فَيْسقِي لَهُمْ)، (وارد) بە كەسێك دەگوترێ كە پێش كۆمەڵە خەڵكێك دەكەوێو ئاویان بۆ هەڵدەكێشێ.

(فَأَدْلَى دَلْوَهُ) : دەگوترێ: (دَلَوْتُ الدلو: إِذَا أَخْرَجتها) ئەگەر دۆڵچە لە بیری دەربێنی، دەڵێی: (دلوتُ)، بەڵام (أَدْلَيْتُ الدَّلْوَ: أي أرسلتُها)، (أدليتُ)، واتە: دۆڵچەكەم داهێشتە نێو بیرەكە.

(يَٰبُشْرَىٰ) : ئەی موژدە، (البَشارَةُ وَالبُشْرَى: الخَبَرُ السارُّ)، (بشارة وبشرى) بریتین لە خەبەری خۆش، كە مرۆڤ پێستی دەمو چاوی بە هۆیەوە گەش ببێ.

(هَٰذَا غُلَٰمٌ) : ئەمە كوڕیژگەیەكە، (الغُلامُ: الإِبن الصّغِير) بە كوردیی دەڵێین: كوڕیژگە، یان مێر منداڵ، كە بە (غلمة) یان (غلمان) كۆدەكرێتەوە.

(وَأَسَرُّوهُ) : واتە: پەنهانیان كرد، (الإِسْرارُ: خِلاَفُ الإِعْلاَن، السِّرُّ: الحَدِيث المكتَّمُ فِي النَّفْس)، (سر) بریتیە لە قسەیەك كە ئینسان لە دەرووی خۆیدا دەیشارێتەوە.

(بِضَٰعَةً) : (البضَاعَةُ: قِطعَة وَافِرَة مِنَ المَالِ تُقْتَنى للتجارة، وَأَصْلُها مِنَ البَضْع وَهُوَ القِطَع مِنَ اللَّحم)، (بضَاعَة) لە ڕیشەدا بریتیە لە شتێك كە بۆ

---

١) المصباح المنير، ص ١٥٦.

بازرگانیی بەكاردەهێنرێو، كرینو فرۆشتنی پێدەكرێ، لە بنچینەدا لە (بَضْع)ەوە هاتوە، كە بریتیە لەوەی پارچەیەك لە گۆشت ببڕی.

( وَشَرَوْهُ ) : واتە: فرۆشتیان (الشِّرَاءُ وَالبَيْعُ يَتَلازَمَانِ)، (شِراء) و (بَيْع) واتە: كرینو فرۆشتن، پێكەوە پەیوەستن، بۆچی؟ (فالمشتري دَافِعِ الثمَن وَأَخْذ المُثْمَن، والبائِع دافع المُثْمَن، وَأَخْذ الثمن)، كریار نرخ دەداو نرخ لەسەر دانراوەكە وەردەگرێ، فرۆشیاریش نرخ لەسەر دانراوەكە دەداو، نرخەكە وەردەگرێ .

(بِثَمَنٍ ) : (الثَّمَن)، (اسْم لما يأخذه البائِع فِي مقابلة المَبِيع، عَيْناً كانَ أَوْ سِلْعَةً)، (ثَمَن) بریتیە لەوەی فرۆشیار لە بەرانبەر فرۆشراوەكەیدا وەریدەگرێ، ئنجا پارە بێ، یاخود كەلوپەل بێ (وەك: گەنمو جۆو دەغڵو دانو قوماش) .

(بَخْسٍ) : (نَقْصُ الشيءِ عَلَى سَبيلِ الظُّلْم)، (بَخْس) واتە: كەمكردنەوەی شتێك بە ستەمو، ناهەق .

(دَرَاهِمَ) : (الدرهم: الفضَّة المطبوعةُ المتعامل بها، جَمْعُهُ دَرَاهِم) (دِرْهَم) بریتیە لە زیوێك كە كرابێ بە سكە، دراوو، مامەڵەی پێ بكرێ، كۆیەكەی (دراهم)ە .

(ٱلزَّٰهِدِينَ ) : (الزَّاهِدُ فِي الشيء: الرَّاغِبُ عَنْهُ)، (زاهدین) كۆی (زَاهِد)ە، (زَاهِد) بریتیە لەوە كەسێك شتێكی نەوێ، بەبێ بایەخو كەم تەماشای بكات، بۆیە (زُهْد) واتە: بە كەمگرتن، بە كەم تەماشا كردن .

(مَثْوَىٰهُ ): (الثَّواء: الإقَامة مَعَ الإِسْتِقْرَار)، (ثواء) واتە: نیشتەجێ بوونو سەقامگیر بوون لە شوێنێك، (مثوى)، واتە: ئەو شوێنەی كە ئینسان لێی نیشتەجێ دەبێ .

(مَكَّنَّا ): پێگەدارمان كرد، دەستڕۆیشتوومان كرد، (مَكَّنتهُ مِنَ الشيء تَمْكِيناً: جَعَلْتُ لَهُ عَلَيْهِ سُلْطاناً وَقُدْرَةً)، ئەگەر بگوترێ: (مَكَّنته من الشيء تَمْكِيناً) واتە: وام لێكرد كە دەستی بەسەریدا بڕوات‌و توانای بەسەریدا بشكێ .

(تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ ): (آلَ الشيء يَؤُول أَوْلاً وَمآلاً: رَجَعَ، والتأويل: الرُّجُوع إِلى الأَصْلِ وَمِنْهُ الموئِل للموضعِ الذي يُرْجَعُ إليه، وذلك هو ردُّ الشيء إلى الغَاية المرادةِ مِنْهُ)، (آلَ الشيء يَؤُول أَوْلاً وَمآلاً) واتە: گەڕایەوە، وشەی (تأويل) بریتییە لە گەڕانەوە بۆ بنەڕەت، هەر بۆیە (موئل) بەو شوێنە دەگوترێ كە خەڵك بۆ لای دەگەڕێتەوەو، (تأويل) بریتییە لە گێڕانەوەی قسەیەك بۆ ئەو مەبەستەی كە لێی دەویسترێ، واتە: سەرەنجامی كار، (أحاديث)یش كۆی (حديث)ە، (حديث) لێرەدا مەبەست پێی خەونە، واتە: ئەو قسانەی كە لە خەوندا فێری ئینسان دەكرێن‌و لەگەڵ ئینساندا دەگوترێن .

(أَشُدَّهُۥٓ ): (الأشد: القُوَّة، وَقِيل جَمْع شِدّة أو جمع: شَدّ)، (أَشُدّ) بە مانای هێزو پێز دێ، وەك لە كوردەواریی دا دەڵێن: گەیشتە توغیانی خۆی، تافی لاوێتیی، هەندێكیش دەڵێن: (أشد) كۆی (شدة)یە، هەندێكیش دەڵێن: كۆی (شد)ە.

(حُكۡمًا ): (الحُكْمُ وَالحِكْمة: عِلْم حَقَائِق الأَشْياء وَالعَمَل الصَّالِح واجْتِنابُ ضِدِّهِ)، هەندێكیان (حُكْم)یان لێرەدا بە حیكمەت لێكداوەتەوە، كە بریتییە لە دەرككردن‌و زانینی حەقیقەتی شتەكان‌و، ئەنجامدانی كردەوەی باش‌و، خۆپاراستن لە كردەوەی خراپ، هەندێكیش گوتوویانە: (الحِكْمة: إِصَابة الحَقّ بالعِلْم وَالعَمَلِ، قيل: مَعْرِفة الموجُودَاتِ وَفِعْل الخَيْرَات)، حیكمەت ئەوەیە كە ئینسان لە زانیاریی‌و لە كردەوەدا، هەق بپێكێ، هەندێكیش گوتوویانە: ئەوەیە كە ئینسان شتەكان بزانێ‌و، كردەوە باشەكان ئەنجام بدات .

هەندێكیش گوتوویانە: (حُكْم) لێرەدا بە مانای حوكمڕانیی‌و بالادەستیی‌و دەستڕۆیشتوویی دێ .

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی ئەوەی کرد: چۆن برایەکانی یوسوف، یوسوفیان خستە نێو بیرەوە، پاشان گەڕانەوە لای بابیانو، کراسە خوێناوییەکەی، کە خوێنێکی بە درۆیان تێ هەڵسوو بوو، بۆیان بردەوە، بابیشیان گوتی: بەڵکو نەفستان شتێکی بۆ جوان کردوونو، من بە شێوەیەکی جوان خۆڕادەگرمو، پەنا بە خوا دەگرم لە بەرانبەر ئەوەدا کە دەیڵێن، دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُواْ وَارِدَهُمْ فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ ﴾، ئنجا کاروانێك هات، ئاو کێشەکەی خۆیانیان نارد، ئەویش دۆڵچەکەی داهێشتە نێو بیر، بۆ ئەوەی ئاو هەڵێنجێ، ﴿ قَالَ يَـٰبُشْرَىٰ هَـٰذَا غُلَـٰمٌ ﴾، (دیارە یوسوف ؑ کاتێك ئاوكێشەكە ئەو دۆڵچەیەی داهێشتوە، چۆتە نێو دۆڵچەکەوە، یاخود دەستی پێوە گرتووەو هاتۆتە سەرێ)، ئەویش گوتوویەتی: ئای مۆژدە! ئەمە کوڕیژگەیەکە، مێر منداڵێکە، ﴿ وَأَسَرُّوهُ بِضَـٰعَةً ﴾، ئنجا وەك کەلو پەلێکی بازرگانیی، پەنهانیان کرد، واتە: نەیانگوت ئەوە لە بیرێدا دۆزیومانەتەوەو دەرمانهێناوە، گوتیان: ئەوە کۆیلەیەکی خۆمانەو دەیفرۆشین،﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴾، خواش زانایە بەوەی دەیکەن، کە بێنن کەسێك بە زوڵم خراوەتە بیرەوە، بیکەنە کۆیلەو بیفرۆشن، چونکە بە دڵنیاییەوە یوسوف گوتوویەتی: من کوڕی یەعقووبمو برایەکانم خستوومیانە نێو بیرەوەو، حەسوودیان پێبردوومو، حاڵو بەسەرهاتی خۆی باسکردوە، چونکە مێر منداڵ بووە، بە لای کەمەوە دە دوازدە (١٠ – ١٢) ساڵە بووە، بەڵام ئەوان گوێیان پێنەداوە، وەك کۆیلەیەك فرۆشتوویانە، بۆیە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: خواش زانایە بەوەی کە دەیان کرد.

ئنجا دەفەرمووێ: ﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ ﴾، ئنجا بە نرخێكی كەم، نرخێكی داشكاو فرۆشتیان، كە بریتی بوو لە چەند درەمێكی ژمێردراو، ﴿ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴾، بە بێبایەخ تەماشایان كرد، چونكە خوا خوایان بوو لە كۆڵیان بێتەوەو، دەیانزانی ئەو كوڕە جوانو نەجیبە، بێ خاوەن نیەو، یوسوفیش بە دڵنیاییەوە باسی خۆی كردوە، بەڵام ئەوە لە قورئان دا نەهاتوە، چونكە ئەو وردەكارییانە پێویست نین، ئەگەرنا ئەویش حاڵو بەسەرهاتی خۆی بۆ باسكردوونو، زانیویانە كەسانێك پەیسەری دەكەنو، وا باشترە زوو لە كۆڵ خۆیانی بكەنەوە، بۆیە لەلایان كەم بایەخ بووەو، خوا خوایان بووە، زوو لە كۆڵیان بێتەوە، ئیدی بە نرخێكی كەم فرۆشتوویانە، ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ ﴾، ئەو پیاوەی كە لە میسر كڕی، لێرەدا خوای زانا ئەو پیاوە ناناسێنێ، چونكە هونەری بەسەرهاتو چیرۆك گێڕانەوە، وایە كە تۆ چاوەڕێ بی، ئەو شتەی مەبەستتە دوایی بۆت حەل بێ، ئەو پیاوە دەبێ كێ بێ؟ كێ نەبێ؟ لە ئایەتەكانی دوایی دا باسی دەكات، كە ئەو پیاوەی كە لە میسر یوسوفی كڕی، عەزیزی میسرە.

ئەو پیاوەی كە لە میسر كڕی، بە ژنەكەی خۆی گوت : ﴿ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ ﴾، ڕێز لە جێگاو ڕێگاكەی بگرە، دیارە ئەگەر ڕێز لە جێگاو ڕێگاكەی بگیرێ (لە شوێنی پشوودانی)، بە دڵنیاییەوە دەبێ خۆی زیاتر ڕێزی لێ بگیرێ! ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ﴾، بەڵكو سوودمان پێبگەیەنێ، یاخود بیكەینە ڕۆڵەی خۆمان .

خوا دەفەرمووێ : ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئیدی بەو شێوەیە یانی: وەك چۆن لە بیرمان دەرهێنا، هەر بەو شێوەیەش یوسوفمان كردە خاوەن پێگە لە زەویدا، لەسەر زەمینی میسردا، لە بیرەوە هێنامانە نێو كۆشك، لە قەبرەوە هاتە نێو قەصر، ﴿ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ﴾، ئنجا بۆ ئەوەی لە مانا لێكدانەوەی خەونانی فێربكەین، یانی: ئەو هەموو زەمینە سازییە، بۆ ئەوە

بوو كە دوایی ئەو موعجیزەیەی بە یوسوف دراوە، كە بریتییە لە زانینی مانای خەونان، بێتە دیو بەرجەستە ببێ، ﴿ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ ﴾، خواش بەسەر كاری خۆیدا زاڵە، هەرچی بیەوێ دەیكات، باڵا دەستە، هیچ شتێك لە بەردەم ویستی خوادا، نابێتە پەرچو ڕێگر، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن، نازانن خوا هەرچی بیەوێ دەیكات، بەڵام بەم شێوەیە كە حیكمەتو لێزانییو كارامەیی بێسنووری خوا، دەیخوازێ .

﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ ﴾، ئنجا كاتێك گەیشتە تافی لاوێتیی، گەیشتە ئەوپەڕی تینو هێزی، هەم حوكممان پێدا، هەم زانیاریی، (حكم): دەگونجێ بە مانای حوكمڕانییو دەستڕۆیشتوویی بێ، كە دواترە، دەشگونجێ بە مانای حیكمەت بێ، واتە: لێزانییو كارامەیی .

دەگونجێ، حوكمو عیلم لێرەدا مەبەست پێیان پێغەمبەرایەتیی بێ، دەشگونجێ مەبەست پێیان ئەوەبێ كە خوا ﷻ هەر لە سەرەتاوە حیكمەتو داناییو شارەزایی فێری یوسوف كردوە، ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، هەر بەو شێوەیەش پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوە، واتە: ئەوە هەر بۆ یوسوف وانیە، بەڵكو هەر كەسێك چاكەكاربێ، خوا ئاوا لەگەڵی بە كەرەمو بە لوتفە، ئاوا لەگەڵیدا بەخشندەو بەخشەرە، خوا لەو كەسانەمان بگێڕێ كە بە هۆی چاكەكارییمانەوە، بە هۆی خۆڕازاندنەوەمانەوە بە سیفەتی باش، خوا لەگەڵمان بە كەرەمو لوتف دەبێ .

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم :** هاتنی كاروانێكو، ناردنی ئاوكێشەكەیانو، دەرهێنانەوەی یوسوف لە بیرو، پەنهانكردنی وەك كاڵایەكی بازرگانیی:

وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُوا۟ وَارِدَهُمْ فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ ۖ قَالَ يَـٰبُشْرَىٰ هَـٰذَا غُلَـٰمٌ ۚ وَأَسَرُّوهُ بِضَـٰعَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە لە هەشت بڕگەدا :**

**١) -** ﴿ وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ ﴾، واتە: كاروانێك هات، یانی: دوای ئەوەی یوسوف خراوەتە بیرو برایەكانی ڕۆیشتن، نازانین چەندی پێچووە؟ چەند سەعات؟ یان شەوێك، یان ڕۆژێك، یان كەمتر، یان زیاتر، دیاریی نەكراوە، گرنگ ئەوەیە دوای ئەوەی برایەكانی ڕۆیشتوون بە ماوەیەك، كاروانێك هاتوە .

ئنجا ئایا ئەو كاروانە لە كوێوە هاتوون؟ كێ بوون؟ ئێمە دوایی تیشكی زیاتری دەخەینە سەر، واش پێدەچێ كۆمەڵێكی عەرەب بووبنو لە مەدیەنەوە هاتبن، وەك لە پەیمانی كۆندا هاتوە .

**٢) -** ﴿ فَأَرْسَلُوا۟ وَارِدَهُمْ ﴾، ئنجا ئاوكێشەكەی خۆیانیان نارد، (الوَارِدُ: الَّذِي يَتَقَدَّمُ القَوْمَ فَيَسْقِي لَهُمْ)، (وارد) بە كەسێك دەگوترێ كە دەچێتە سەر ئاو، یان كەسێكە پێش ئەو كۆمەڵە خەڵكە دەكەوێ كە لەگەڵیان دایە كە ئاویان بۆ هەڵكێشێو بۆیان بێنێ، ئەگەر بیرە بۆیان هەڵكێشێ، ئەگەر كانیيو سەرچاوەیە، ئەو دەفرو شتانەی كە پێیانە، بۆیان پڕ بكات لە ئاو .

٣) – ﴿ فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ ﴾، واتە: ئنجا دۆڵچەکەی داهێشت، دۆڵچەکەی، شۆڕ کردەوە بۆ بنی بیرەکە، چونکە ئاو لە بنی بیر دایە .

(الإدلاء: إِرْسَالُ الدلْو فِي البئْرِ لِنَزْعِ الماءِ)، (إدلاء): بریتییە لە شۆڕ کردنەوەی دۆڵچە بۆ بنی بیر، بۆ هەڵکێشانی ئاو .

ئەگەر بگوترێ : (دَلَى دَلْوَهُ)، واتە: دۆڵچەکەی هەڵکێشایەوە، بەڵام: (أَدْلَى دلْوَه)، واتە : دۆڵچەکەی شۆڕکردەوە، (دلو)ش بە کوردیی (دۆڵچە)ی پێدەڵێن، بە عەرەبیی ئاوا پێناسەیان کردوە: (ظَرْفٌ كبير من جلدٍ مخيطٍ)، دەفرێکی گەورەیە لە پێست دووراوە، کە لە شێوەی قاپێکی گەورەدا، یان لە شێوەی کتریەکی گەورەدا، دروستکراوە، بۆئەوەی ئاوەکەی لێ نەڕژێ کە دێتەوە سەرێ .

٤) – ﴿ قَالَ يَٰبُشْرَىٰ ﴾، گوتی: ئەی موژدە! یانی: ئەی دڵخۆشییو موژدە ! وەرە بۆ لای من، ئەو شتە چاکەم بە نسیب بووە، (شُبِّهَت البُشْرَى بالعَاقِلِ الغَائِب، فَنُودِيَ)، لێرەدا موژدە وەك بابایەکی عاقڵ کە لەوێ نیە، نادیارە، بەوە چوێنراوەو بانگکراوە، ئەگەرنا لە بنەڕەتدا مەبەست پێی: دڵخۆش بوو، شادمان بوو، کە ئەو منداڵە جوانەی لەو بیرەدا بینیەوە .

ئنجا دیارە کە دۆڵچەکەی داهێشتوە، یوسوف چۆتە نێوی، یان خۆی پێوەگرتوە، بەڵام خوای پەروەردگار ئەو وردەکارییانە باس ناکات، لەبەر ئەوەی بە عەقڵو سەلیقە دیارن، هەر شتێك کە عەقڵی مرۆڤ پەی پێ ببات، خوای شارەزا بە پێویستیی نازانێ باسی بکات، کاتێك کە بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە، یاخود بابەتێك باس دەکات، چونکە بە عەقڵ زانراوە کە دۆڵچەکەی داهێشتوە، یوسوف دەستی پێوە گرتوە، یاخود چۆتە نێو دۆڵچەکە ئەگەر جێگای بوو بێتەوە، یاخود دەستی بە پەتەکەوە گرتووەو پێی هاتۆتەوە سەرێ.

٥) – ﴿ هَٰذَا غُلَٰمٌ ﴾، (الغُلام)، (مَنْ سِنُّه بين العشر والعشرين)، (غُلام): کەسێکە تەمەنی لە نێوان دە (١٠) بۆ بیست (٢٠) ساڵ دابێ، بەڵام هەندێك دەڵێن: (غُلام)، ئەوەیە کە نەگەیشتبێتە قۆناغی باڵغ بوون، واتە: سێزدە چواردە ساڵە، بە کوردیی پێی دەڵێن، مێر منداڵ، گرنگ ئەوەیە (غُلام)، زیاتر بە نێرینەیەك دەگوترێ، کە باڵغ نەبووبێ، بۆیە ئەوانەی گوتوویانە: (الغُلام: من كان سنُّهُ بين العشر والعشرين)، پێم دوورە، بەڵێ ڕاستە جاری وا هەیە بە هی گەورەتریش گوتراوە: (غُلام)، بەڵام بە نیشانەکان ئێمە دەزانین کە یوسوف لەوکاتەدا کە خراوەتە نێو بیر، باڵغ نەبووەو بچووك بووە، چونکە دوای ئەوەی لە کۆشکی عەزیزی میسڕدا نیشتەجێ دەبێو خوا لەوێ دەیحەوێنێتەوە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ ﴾، کاتێك گەیشتە کاتی هێزو پێزی، کەواتە: لە ماڵی ئەواندا باڵغ بووەو گەورە بووە .

٦) – ﴿ وَأَسَرُّوهُ ﴾، واتە: پەنهانیان کرد، کێ پەنهانی کرد؟، بێگومان کاروانەکە یوسوفیان پەنهان کردوە، یانی: هەواڵی هەڵگرتنەوەکەو دۆزینەوەکەی یوسوفیان شاردەوە، نەیانگوتوە: ئێمە لە بیردا دۆزیومانەتەوەو لەوێدا هەڵمان گرتۆتەوە، بەڵکو گوتوویانە هی خۆمانەو کۆیلەی خۆمانەو کاتێك ویستوویانە بیفرۆشن، حەقیقەتی یوسوفیان ئاشکرا نەکردوە، ئەگەرنا ڕەنگە خەڵك لێیان نەکڕیبان، یاخود ترساون لەوەی ئاشکرا ببێ .

٧) – ﴿ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةً ﴾، (بِضَٰعَةً: مَفْعولُ به)یەکەیەتی، یانی: وەك کاڵایەکی بازرگانیی، مامەڵەیان پێکرد، (البضاعة: عَرَضُ التجارة)، (البضاعة) شمەکی بازرگانییە .

٨) – ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴾، خوا زانایە بەوەی کە دەیکەن، هەڵبەتە ئەوەی کردیان، ئەوەبوو کە ڕاستییەکەیان نەخستەڕوو و وەك کۆیلەیەك مامەڵەیان لەگەڵدا کردو، کڕینو فرۆشتنیان پێوە کرد، خواش زانابوو بەو کارە ناڕەوایەی کە ئەو کاروانە دەیانکردو ئەنجامیان دەدا.

**مەسەلەی دووەم :** فرۆشرانی یوسوف لە لایەن کاروانەکەوە بە نرخێکی کەم (بە چەند درەمێك)، بە شێوەیەکی بە کەمگرانەو کەم بایەخانە:

وەك دەفەرموێ : ﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا :**

١) - ﴿ وَشَرَوْهُ ﴾، (أي: باعوه)، فرۆشتیان، وشەی (شَرى)، هەم بە مانای (باع) فرۆشتی، دێ، هەم بە مانای (اشترى) کڕی، دێ، بەڵام چۆن دەزانی کامەیان مەبەستە؟! بە پێی سیاق و بابەتەکەی ئەو وشەیەی تێدا دێ، بە پێی ئەوە دەزانین، لێرەدا ئەوان وەك کاڵایەکی بازرگانیی یوسوفیان بەکارهێناوە ﴿ وَشَرَوْهُ ﴾، یانی: فرۆشتیان، چونکە بە دەست وانەوە بووەو، دەیدەنە لایەنی بەرانبەر.

٢) - ﴿ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ ﴾، بە نرخێکی کەم، (ثَمَن)، نرخێکە، قەرەبوویەکە لە بەرانبەر شتێکدا وەردەگیرێ، بەرانبەرەکەی پێی دەگوترێ (مُثْمَنْ)، واتە: نرخ لەسەر دانراو، (مبیع)یش، فرۆشراو، یاخود نرخ لەسەر دانراوە.

وشەی ﴿ بَخْسٍ ﴾، (البَخْسُ: أَصْلُهُ: مَصْدَرُ بَخَسَهُ إِذَا نَقَصَهُ عَنْ قِيمَةِ الشَّيءِ، وَهُوَ هُنا بمعنى المبخوسِ، كالخلق بمعنى المخلوق). واتە: (بخس)، لێرەدا چاوگی (بَخَسَه)یە، واتە: (نَقَصَهُ)، کەمی کردەوە، یانی: شتەکەی بێبایەخ کرد، کەم نرخی کرد، لە بەهاو نرخی ڕاستەقینەی داشکاند، بۆیە خوا لە چەند شوێنێك لە قورئاندا ئەوەی قەدەغە کردووەو دەفەرموێ : ﴿ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ ﴿٨٥﴾ ﴾هود، واتە: هەروەها شتی خەڵك بێبایەخ مەکەن (کەم بایەخ مەکەن)، لە بەهای ڕاستەقینەی دامەبەزێنن .

ئنجا لێرەدا (بَخْس) بە مانای (مبخوس)ە، وەك: (خَلْق) بە مانای (مخلوق).

٣) - ﴿ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ ﴾، ﴿ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ ﴾، (بَدَل)ی (ثَمَن)ە، ئەو نرخە کەمە چەند بوو؟ چەند درەمێکی ژمێردراو، (دَراهم)، کۆی (درهَم)ە، کە پێشتر باسمان کرد (درهَم)، دراوێك بووە لە زیو پێکهاتوە، زیوێك کە شێوەی سکەو دراوی وەرگرتوە، ئنجا بە پێی ڕۆژگارو سەردەمەکان، نرخی درەم گۆڕاوە، لە سەردەمێك دا کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوە، دە (١٠) درەم، یان دوازدە (١٢) درەم بەرانبەری دیناریك بووە، دیناریش لە زێڕ دروست کراوەو ڕۆمەکان دروستیان کردوە، وەك چۆن درەم دراوی دەوڵەتی فارس بووەو لە زیو دروستکراوە، بەڵام وەك گوتم: بە پێی چاخ و سەردەم و ڕۆژگارەکان، دینارو درەم نرخیان هەڵداو پێداو بەرزیی و نزمیی کردوە، گرنگ ئەوەیە ئەو نرخەی کە یوسوفیان پێ فرۆشت، چەند درەمێکی ژمێردراو بوو، ژمێردراویش، واتە: کەم، چونکە عادەت وایە شتی کەم دەژمێردرێ، بەڵام شتی زۆر دەپێورێ، یان دەکێشرێ، عادەت نیە کەسێك بڵێ: ئەرێ ئەو نۆکانە چەند دەنکە نۆکن؟ چونکە نۆك دەکێشرێ، یان دەپێورێ، بەڵام دەگرێ، بڵێی: ئەوانە چەند کاڵەکن؟ یان چەند شووتیین؟ ئەو شتانەی کەم و درشت بن، دەژمێردرێن، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ ﴾، واتە: ئەو نرخە لێداشکێنراوە، چەند درەمێکی کەمی ژمێردراو بوو.

٤) - ﴿ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴾، ئەوان دەربارەی لە بەکەمگران بوون، واتە: لە یوسوف دا ئارەزوومەند نەبوون، (الزَّهَادَةُ: قِلَّةُ الرَّغْبَةِ فِي حصُولِ الشيءِ الَّذِي مِنْ شَأْنِهِ أَنْ يُرْغَبَ فِيهِ)، (زهادة) بریتیە لە هەبوونی ئارەزووی کەم لە پەیداکردنی شتێکدا، کە عادەت وایە ئەو شتە خەڵك ئارەزووی هەبێ بۆی، واتە: لە لای خەڵك شتێکی باش بێ، بەڵام ئەو بە کەمی تەماشا بکات، (أَوْ قِلَّةُ الرَّغْبَةِ فِي عِوَضِهِ)، یاخود بریتیە لەوە کە تۆ شتێکت هەبێ، زۆر ئارەزووی قەرەبووەکەی نەکەی، واتە: قەرەبووەکەی کەم دابنێی .

بە كوردیی (زُهد)، یانی: بە كەمگرتن، یاخود بە كەم تەماشا كردن، ئنجا لەبەرچی ئەوانە یوسوفیان بە كەم گرتووەو تێیدا بە كەم گربوون‌و، بە كەم بایەخ سەیریان كردوە؟ هۆكارەكەی ئەوە بووە كە ترسی ئاشكرابوونیان هەبووە، عادەتیش وایە مرۆڤ ئەگەر شتێك پشتی پێوە نەهێشابێ، زۆر قەدری نازانێ، هەروەها عادەت وایە كە مرۆڤ ئەگەر شتێكی لە رێیەكی ناشەرعییەوە دەست كەوتبێت، خوا خوایەتی زوو لەكۆڵی بێتەوە، بۆ ئەوەی ئاشكرانەبێ‌و لێی وەرنەگیرێتەوە، یاخود عەیبەی نەیەتەسەر.

**مەسەلەی سێیەم :** ڕاسپاردنی كڕیارەكەی یوسوف بۆ ژنەكەی كە جێگاو ڕێگای باشی بۆ دابین بكات، بە ئومێدی سوود لێ بینینی، یاخود بە كوڕ گرتنی :

وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشۡتَرَىٰهُ مِن مِّصۡرَ لِٱمۡرَأَتِهِۦٓ أَكۡرِمِى مَثۡوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗاۚ ﴿٢١﴾ ﴾.

**تویێژینەوەی ئەم ئایەتە لە شەش بڕگەدا :**

١) – ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشۡتَرَىٰهُ ﴾، ئنجا ئەو پیاوەی كە كڕی، كێی كڕی؟ یوسوفی كڕی، (إشتراء)، یانی: نرخەكەی داو بوو بە خاوەنی یوسوف.

ئایا ئەو پیاوە خەڵكی كوێ بوو؟!

٢) – ﴿ مِن مِّصۡرَ ﴾، لە شاری میسر، یان وڵاتی میسر، كە ڕەنگە ئەو كاتە شارێكی گەورە بوو بێت‌و ئەو كاتە عادەت وابوو، دەوڵەتە شارەكان (دویلات المدن) هەبوون، واتە: ئەو دەوڵەتانەی كە هەر كامیان لە شارێك پێكهاتبوون، شارێكی گەورە شوورایەكی گەورەی هەبووە، بۆ نموونە: ئەم هەولێرە، شوورایەكی هەبووەو قەڵایەكی هەبووە، ئەو قەڵایەش دەروازەی هەبوون، لە دەروازەكانەوە نەبا، خەڵك نەیتوانیوە بێتە ژووری .

جارێ خوای پەنهانزان ئاشکرای ناکات کە ئەو پیاوەی کە خەڵکی میسڕ بووەو، یوسوفی کڕیوە، کێ بووە؟ بەڵام دوایی بۆمان دەردەکەوێ کە عەزیزی میسر بووە، لە پەیمانی کۆندا هاتووە دەڵێ: ناوی (فوطیفار) بووەو والی میسڕ بووە، هەروەها لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: (کان رئیس الحَرَس)، سەرۆکی پاسەوانەکانی فیرعەون بووە، واتە: سەرۆکی پاسەوانەکانی پادشای میسڕ، کە دەبێتەوە بە وەزیری بەرگریی، یاخود سوپا سالار بە زاراوەی ئێستای ئێمە .

٣) - ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشۡتَرَىٰهُ مِن مِّصۡرَ لِٱمۡرَأَتِهِۦٓ ﴾، ئەو پیاوەی کە لە میسڕ کڕی، بە هاوسەرەکەی خۆی گوت، کە ئەو ژنەی عەزیزی میسڕ لە تەوڕاتدا دەڵێ: ناوی: (ڕاعیل) بووە، بەڵام لە هەندێك سەرچاوەی دیکەی مێژوویی دا هاتووە، دەڵێ: ناوی (زَلیخا) بووە، بە کوردیی دەڵێن: (زلێخا)، بەڵام بە هەر حاڵ دیارنیە ناوی چی بووەو، لە قورئاندا زۆر بە کەمیی ناوی کەسەکانو وردەکاریی دەربارەی شوێنەکانو کاتەکان باس دەکرێ، لەبەر ئەوەی پەندو عیبرەتێك پەیوەست نیە بەو شتانەوە .

٤) - ﴿ أَكۡرِمِى مَثۡوَىٰهُ ﴾، ئەو پیاوەی کە لە میسڕ کڕی بووی، بە ژنەکەی خۆی گوت: ﴿ أَكۡرِمِى مَثۡوَىٰهُ ﴾، واتە: ڕێز لە جێگاو ڕێگایەکەی بگرە، ڕێز لە شوێنی پشوودانی بگرە، (مَثْوَى)، نێوەڕۆکەکەی بریتیە لەو شوێنەی کە مرۆڤ پەنا دەدات، واتە: مرۆڤ بۆ لای دەگەڕێتەوەو تێیدا پشوو دەدات، (أَي: اجْعَلِي إِقَامَتَهُ عِنْدكِ كريمة، أَي كامِلة فِي نَوْعِها)، واتە: ئەی ئافرەت! با مانەوەو نیشتەجێبوونی ئەو مێرمنداڵە لەلای تۆ، بەڕێزو حورمەت بێ، واتە: باشترین جۆری (شوێنی) پشوودانو نیشتەجێکردن بێ، چونکە وشەی (کریم)، لە قورئاندا واتە: شتی تێرو تەواو، وەك دەفەرموێ: ﴿ أَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ٧ ﴾الشعراء، لە هەرجووتێکی، لە هەر ڕووەکێکی (کریم) واتە: تێرو تەواو و ڕێكو پێكو بەرهەمدارمان تێدا ڕواند .

ئنجا کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ أَكْرِمِي مَثْوَىٰهُ ﴾، جێگاو ڕێگایەکەی ڕێز لێ بگرە، شوێنی حەوانەوەکەی ڕێز لێ بگرە، واتە: با بەڕێزو حورمەتەوە بێو تێرو تەواوبێ، زانایان دەڵێن: ئەگەر ڕێز لە شوێنی پشوودانەکەی بگیرێ، کەواتە: خۆی زیاترو چاکتر دەبێ ڕێزی لێبگیرێ، کە بە دڵنیاییەوە لێرەدا مەبەست لە شوێنی پشوودانیو نیشتەجێبوونی یانی: جێگایەکەی، بەرگو پۆشاکی، خواردنی، پاكو خاوێنی...هتد. ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ، واتە: وەك کۆیلەیەك سەیری مەکە، زیاتر لە کۆیلەیەك تەماشای بکە، کە ئەمە لە بڕگەی پێنجەمو شەشەمدا هۆکارەکەی ڕوون کراوەتەوە .

٥) – ﴿ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ ﴾، نزیکە، ڕەنگە سوودمان پێبگەیەنێ، واتە: لێی بەهرەمەندبین بە گشتی .

٦) – ﴿ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ﴾، یاخود ئەگەر زۆر متمانەی پێبکەین، بیکەین بە ڕۆڵەی خۆمان، کە ئەمە لە هەموو تەفسیرەکاندا دەڵێ: عەزیزی میسر (فوطیفار)، لەگەڵ ئەو ئافرەتە منداڵیان نەبووە، هەندێکیان دەڵێن: عەزیزی میسر هەر ئارەزووی جینسیشی نەبووە، بەڵام من پێم وایە ئایەتەکە، نە ئەوە دەگەیەنێ کە ئارەزووی جینسیی نەبووبێو، نە ئەوەش دەگەیەنێ کە منداڵیشیان نەبووبێ، چونکە جاری وا هەیە کە ماڵێك منداڵیشیان هەیە، بەڵام منداڵێکی دیکەش تەبەننیی دەکەن، وەك کاتی خۆی عادەت وابووە، دەیکەنە منداڵی خۆیانو ڕۆڵەی خۆیانو، ڕەگەڵ ئەوانی خۆیانی دەخەن.

ئنجا ئەوە لە تەورات وەرگیراوە کە گوایە منداڵیان نەبووە.

بەو شێوەیە یوسوف لە کۆشکی عەزیزی میسردا نیشتەجێ بوو.

با سەرنجێکی پەیمانی کۆن بدەین لەو بارەوە، واتە: تەورات، لە ژێر ناونیشانی: (یوسف یباع لتجار المدیانیین)، {یوسوف بە بازرگانانی میدیانییەکان دەفرۆشرێ)دا، هاتوە :

(وَحِينَ جَلَسوا لِيأكُلُوا شاهَدُوا عَنْ بُعْدٍ قَافِلَة مِنَ الإِسْماعِيلِيِّينَ قَادِمِينَ مِنْ جِلْعَادَ فِي طرِيقِهِمْ إِلَى مِصْرَ ... وَعِنْدَما دَنا مِنْهُمُ التُّجارُ الْمِدْيانِيُّونَ، سَحَبُوا يُوسُفَ مِنَ الْبِئْرِ وَباعُوهُ لَهُمْ بِعِشْرِينَ قِطْعَةً مِنَ الفِضَّةِ، فَحَمَلُوهُ إِلَى مِصْرَ... وَباعَ المِدْيانِيُّونَ يُوسُفَ فِي مِصْرَ لِفُوطِيفارَ خَصِيٍّ فِرْعَوْنَ رَئِيسِ الحَرَسِ)[1].

کە دیارە من پچڕ پچڕو تەنیا شوێنی مەبەستم هێناوە .

واتە: ئنجا (برایەکانی یوسوف) کاتێك دانیشتن بۆ ئەوەی نان بخۆن، (دوای ئەوە کە یوسوفیان خستە نێو بیرەکەوە، بە پێی پەیمانی کۆن بێ، دەبێ لە دوورو نیزیکی بیرەکە دانیشتبن‌و، چاوەڕێیان کردبێ کاروانێك بێ‌و هەڵیبگرێتەوە، خۆشیان خەریکی نانخواردن بوون)، تەماشایان کرد لە دوورەوە کاروانێك هات، هی ئیسماعیلییەکان بوو، (واتە: عەرەبی ئیسماعیلیی)، لە جیلعادەوە دەهاتن، کە لەسەر ڕێیان بوو بەرەو میسڕ، کاتێك کە بازرگانە میدیانییەکان، (کە خەڵکی مەدیەن بوون)، لێیان نیزیك کەوتنەوە، ئەوانیش چوون یوسوفیان لە بیرەکە دەرهێنایەوە، (یانی: هەر برایەکانی خۆی)و، بە بیست پارچە زیو، (واتە: بیست درەم)، بە میدیانییەکانیان فرۆشت، ئەوانیش لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ میسڕو، میدیانییەکانیش یوسوفیان لە میسڕ بە (فوطیفار) فرۆشت، کە خەسێنراوی فیرعەون بوو، سەرۆکی پاسەوانەکانی بوو .

هەڵبەتە دوایی باسی دەکەین کە: پادشای میسڕ ئەو کاتە، فیرعەونی پێ نەگوتراوە، بەڵام تەورات وایهێناوەو قورئان ئەو هەڵەیەی تەوراتی ڕاست کردۆتەوە، هەڵبەتە ئەو تەوراتەی کە دەستکاریی کراوە، نەك ئەو تەوراتەی کە خوای زاناو شارەزا ناردوویەتی، کە بێگومان کتێبەکانی خوا، هەڵەو کەم‌و کورتییان تێدا نەبووە، بەڵام ئەهلی کیتاب دەستکارییان کردوون‌و لایان داون.

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح : ٣٧، ص ٩٦، ٩٧، ٩٨.

**مەسەلەی چوارەم : نیشتەجێبوونی یوسوف لە کۆشکی عەزیزی میسرداو، دەستکراوە بوونی لە کاروبارەکانی کۆشکدا:**

ئەمیش هەر لە ئایەتی (٢١)دا، خراوەتەڕوو، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ ۚ وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰ أَمْرِهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾.

**تیشك خستنە سەر ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا :**

١) - ﴿وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ﴾، ئاوا بەو شێوەیە، یانی: بەو شێوەیەی كە باسكرا، یان: وەك چۆن لەبیر هێنامانەدەر، بەهەمان شێوەش یوسوفمان دەستكراوە كرد لە زەوی دا، لە زەوی میسڕ (خاكی میسڕ)دا، كە مەبەست پێی كۆشكی عەزیزی میسڕە، كۆشكی سەرۆكی پاسەوانەكانی پادشای میسڕ .

ئەمەش بە دوو واتایان دێ :

یەكەم : وەك چۆن لە بیر دەرمانهێناو دەربازمانكرد، بەو شێوەیەش دەستڕۆیشتوومان كردو، كردمانە خاوەن پێگە لە میسڕدا، واتە: لە كۆشكی عەزیزی میسڕدا .

دووەم: بەو شێوەیە، پێگەمان پێداو دەستڕۆیشتوومان كرد .

٢) - ﴿وَلِنُعَلِّمَهُ مِن تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ﴾، بۆیەش یوسوفمان ئاوا دەست ڕۆیشتوو كرد لە كۆشكدا، كە سەرەنجام فێری مانا لێكدانەوەی خەونانی بكەین .

كە ئەوە موعجیزەی هەرە دیاری یوسوف بووە، چونكە هیچ كام لە پێغەمبەران نەبوون كە موعجیزەو بەڵگەیەكیان نەبێ بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتیی خۆیانو، بەنسبەت یوسوفەوە جگە لە تەعبیری خەونان گومانمان بۆ هیچ شتێكی دیكە ناچێ، كە جیای كردبێتەوە لە خەڵكی

ڕۆژگاری خۆیو، بوو بێتە هۆکاری ئەوەی باوەڕیان پێ هێنابێ، کە ئەو زانیارییەکی پێیە دەربارەی تەعبیری خەونان، ئەوان پێیان نیە، کەواتە: ئەو زانیارییەی لە خواوە پێدراوە، وەك بۆ خۆشی گوتوویەتی.

**٣) -** ﴿وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ﴾، خواش بەسەر کاری خۆیدا زاڵە، واتە: خوا چی بوێ دەیکاتو، دەست ڕۆیشتوویە بەسەر کاروبارە ئەندازەگیریی کراوەکانی خۆیدا، واتە: خوا ﷻ کە دەیەوێ یوسوف بەو هەموو قۆناغانەدا بێنێ: بە منداڵیی برایەکانی بەو شێوەیەی لێدەکەن، دەیخەنە بیرەوە، ئنجا خوا لەو بیرە دەری دێنێو دەیباتە کۆشك، دوایش لەو کۆشکەدا تووشی بەڵاو میحنەتێکی دی دەبێ، بوختانی پێ دەکرێو دەنێردرێتە زیندان، هەمووی بۆ ئەوەیە، کە ئەو زانیارییەی بە یوسوفە ﷺ، ئەو شتە تایبەتییەی کە خوا بە یوسوفی داوە، زەمینەیەکی بۆ بڕەخسێتو دەربکەوێ، چونکە ئەگەر نەچووبایە زیندانو، ئەو دوو هاوەڵەی خەونەکانیان بۆ نەگێڕابایەوەو، ئەویش بۆی تەعبیر نەکردبانو، پاشان ئەو ڕەفیقەی کە دەربازی بووە – کە دیارە مەیگێڕی پادشا بووە – ئەوەی بۆ پادشا باس نەکردبایە، تاکو خەونەکەی بۆ تەعبیر بکات، ئاوا بەو شێوەیە پلەو پێگەو جێگاو ڕێگاو تواناو شارەزایی یوسوف ﷺ بۆ پادشای میسر دەرنەدەکەوتو، سەرەنجام یوسوف ئەو پێگەو مەقامەی پێنەدەبڕا، کە لە میانی ئەوەش دا، موعجیزەکەیو شارەزاییە ناوازەکەی کە خوا پێیداوە، دەربارەی مانا لێکدانەوەی خەونان، ئاوا دەربکەوێ.

**٤) -** ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، واتە: نازانن کە: خوا عزوجل هیچ شتێك ڕێگرنیە لە بەردەم کارەکانی داو، هەرچی بیەوێ دەیکات، بەڵام خوا ﷻ پەنهانکار (لطيف)ەو کارەکانی خۆی بە شێوەیەك دەکات، کە خەڵك لێیان تێناگاتو هەستیان پێناکات، لە کاتێکدا کە خوا تەگبیری کردوە بۆ یوسوف کە بەو قۆناغانەی دا بێنێ، ئەگەر کەسێك سەیری ڕواڵەتی یوسوفی کردبایە، دەیگوت: ئای چەند مرۆڤێکی بەدبەختو چارەڕەشو کلۆڵە! بەڵام نەخێر ئەوە دیوی ڕواڵەتو دەرەوەی ڕوداوەکان بووە، دیوی پەنهانیان ئەوە بووە کە خوا ﷻ ویستوویەتی

یوسوف لەو تاقیکردنەوانەدا، بەڵێ تووشی نارەحەتیی دێ، لە ڕووی جەستەییەوەو لە ڕووی ڕواڵەتییەوە، بەڵام لە ڕووی مەعنەوییەوە، پێ بە پێو هەنگاو بە هەنگاو، بەرزدەبێتەوە بۆ لای خواو، شایستەی ئەوە دەبێ کە خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى بەرزی بکاتەوە، هەڵیبژێرێو، سەرەنجام بیکات بە پێغەمبەرێکی پایەبەرزی خۆی .

لێرەدا بەرلەوەی بچینە سەر مەسەلەی پێنجەمو کۆتایی لەم دەرسەدا، کە لەبەر تیشکی ئایەتی (٢٢)دا هاتووە، بە پێویستی دەزانم ئیعجازێکی مێژوویی قورئان ڕوون بکەینەوە :

# ڕوونكردنەوەی ئیعجازێكی مێژوویی قورئان

یوسوف دوای ئەوەی لە لایەن كاروانێكی عەرەبە ئیسماعیلییەكانەوە – بە پێی قسەی تەورات كە لە ڕاستییشەوە نیزیكەو وا پێدەچێ، چونكە ئەو ناوچەیە عەرەبنشین بووە – كە لە مەدیەن نیشتەجێبوون، لە بیر هێنراوەتە دەرێ ، نەك وەك تەورات دەڵێ: برایەكانی لە بیر هێنابیانە دەرو فرۆشتبیان، ئەوەیان بەڕاستی قورئان هیچ ئاماژەی پێناكات، بەڵكو زۆر بە ڕوونیی خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ ﴿١٩﴾ ﴾، زۆر بە ڕوونیی‌و ڕاشكاویی قورئان دەڵێ: كاروانێك هات، ئاوكێشەكەی خۆیان ناردو دۆڵچەكەی داهێشتە بیرەكەو گوتی: ئەی مژدە! مژدەتان لێبێ ! ئەوە مێر منداڵێكە، كەواتە: كاروانچییەكان خۆیان یوسوفیان لە بیر هێناوەتە دەرێ، نەك برایەكانی بیهێننە دەرو دوایی بە كاروانچییەكانی بفرۆشن، وەك تەورات دەڵێ .

ئنجا دوای ئەوە بردوویانە بۆ میسرو لەوێ وەك كۆیلەیەك لە بازاڕی پایتەختی میسر، {تەورات دەڵێ: لە (پایتەختی میسری خواروو) فرۆشتوویانە}، كە ئەو كاتە میسری سەرێ‌و میسری خوارێ هەبووە، میسری خوارێ ئەو كاتە لە ژێر حوكمڕانی كەنعانییەكاندا بووە، كە (عمالقة)شیان پێگوتراوەو بە (هەكسوس) یان (هەكصوص) ناسراون، كە وەك لە كتێبە مێژوویییەكان دا باس دەكرێ، دەڵێ: (١٥٠) ساڵ میسری خوارو بە دەست ئەو حوكمڕانانە بووە كە بە پادشایەكانیان گوتراوە: پادشا (مَلِكْ)، نەك فیرعەون، ئنجا ئەو كاتەی یوسوف لەوێ فرۆشراوە، لە ڕۆژگاری پادشا (أبو فیس) یان (أبیي)دا بووەو، لە دەوری ساڵی (١٧٢٩) پێش زایینیدا بووە .

ئنجا (١٧٢٩) پێش زایین، لەگەڵ (٢٠١٧)ی ئێستادا، دەکاتە (٣٧٤٦) ساڵ لەمەو پێش.

ئەو کەسەش کە یوسوفی کڕیوە ناوی (فوطیفار) بووە، (بە پێی قسەی تەورات، سەرۆکی شاریش بووە، بەلاَم لە تەوراتدا دەڵێ: (رئیس الحرس)، سەرۆکی پاسەوانەکان، واتە: سوپاسالار، یاخود وەزیری بەرگریی بووە، بە زاراوەی ئێستا .

ئنجا ئیعجازە مێژووییەکەی قورئان لێرەدایە، کە قورئان وشەی (ملك) بەکاردێنێ، بۆ ئەو پادشایە، بەلاَم تەورات وشەی فیرعەون بەکاردێنێ، لە حاڵێکدا کە سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: فیرعەون دەستەلاَتی بەسەر ئەو بەشەی میسردا، کە میسری خوارروویان پێ گوتوە، نەبووە، بەڵکو تەنیا میسری باکوور لەبەر دەستی فیرعەون دا بووە، بەلاَم میسری خواروو لەو سەروحەدەدا، لەبەر دەستی ئەو قەومەدابووە کە پێیان گوتراوە: (هەکسۆس)، یان (هەکصۆص)و (عەمالیقە)شیان پێگوتراوە، کە دیارە کەنعانیی بوون، واتە: گەلێکی دیکەی غەیری گەلی میسر بوونو گەلێکی غەریب بوون .

لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)[1] واتە: شەرحی کتێبی پیرۆزدا، هاتوە دەڵێ: (يثور جدل عنيف حَوْلَ تَحديد التأريخ الدَّقِيق لِوُصُولِ يُوسُف إلى مِصْر ، فَيَقُول كَثيرونَ مِنَ العُلَماء إنَّهُ وَصَل إلَيْها فِي أثْناء فَترة حُكْم الهَكْسوس، وَكانَ الهَكْسوس أجانِبَ جاءوا مِنْ مَنْطِقَة كَنْعَان، وَغَزَوا مِصْر وَحكَموها قُرَابة مائة وَخَمْسِينَ سَنَة).

واتە: مشتومڕێکی توند دەربارەی دیاریکردنێکی وردی مێژووی گەیشتنی یوسوف بە میسر هەیە، زۆرێك لە زانایان دەڵێن: کاتێك یوسوف گەیشتۆتە میسر لە سەردەمی حوکمی (هەکسۆس)دا بووە، هەکسۆسیش بێگانە بوون، لە ناوچەی کەنعانەوە هاتوون، میسریان داگیر کردوەو، ماوەی سەدو پەنجا (١٥٠) ساڵ حوکمی میسریان کردوە .

ئنجا ئایا تەنیا بەشی باشووری میسریان لە بن دەست بووە، وەك تەوراتو هەندێ سەرچاوە گوتوویانە، یان هەموو میسریان لە بن دەست بووە؟ گرنگ

١) حاشية التفسير التطبيقي ص١٠١.

ئەوەیە ئەو شوێنەی کە یوسوفی لێ فرۆشراوەو، یوسوف تێیدا نیشتەجێ بووە، لە ژێر دەسەڵاتی فیرعەونەکان دا نەبووە، بەڵکو لە ژێر دەسەڵاتی (هەکسۆس)دا بووە، ئەوانیش بە گەورەو سەرۆکی خۆیان گوتوە (ملک) نەك فیرعەون، هەر بۆیە لە هەموو بەسەر هاتی یوسوف دا، هەر باسی پادشا (ملک) دەکرێ، لە حالێکدا کە خوا ﷻ لە بەسەرهاتی مووساو هاروونی برای‌و فیرعەوندا، ناوی پادشای میسر بە وشەی فیرعەون، دێنێ، چونکە بە دڵنیاییەوە لە کاتێکدا کە مووسا لە میسر بووە، مووسا لەگەڵ فیرعەوندا ڕووبەڕوو بۆتەوەو پادشایەکانی میسر ئەو کاتە فیرعەونیان پێ گوتوون کە کۆیەکەی (فراعین)یە، بەڵام یوسوف ﷺ کە سەرەتای نیشتەجێبوونی وەچەی یەعقووب، (بەنی ئیسرائیل)ە، لە میسردا، ئەو کاتە سەردەمی حوکمی فیرعەونەکان نەبووە، ئەو ماوەیە کە سەدو پەنجا (١٥٠) ساڵ‌و هەندێك دەڵێن: (٢٠٠) ساڵ بووە، گەلێکی دیکەی بێگانە لە میسر بوونە حوکمڕانی میسر، کە بە گەورەی خۆیانیان گوتوە: مەلیك، نەك فیرعەون .

بەڵام تەورات، لەبەر ئەوەی کەسانێك کە دواتر نووسیویانەتەوە، وایان زانیوە هەرچی لە میسر حوکمڕان بووەو دەستی ڕۆیشتوە، هەر ناوی فیرعەونی بۆ بەکارهاتوە، بێئاگا لەوەی: ئەو ماوەی: (١٥٠ یان ٢٠٠) ساڵە گەلێکی بێگانە دەسەڵاتیان بەسەر میسردا گرتووەو میسریان خستۆتە ژێر دەستی خۆیانەوە، کە ناویان (هەکسوس) بووەو بە حوکمڕانەکانی خۆیان گوتوە: پادشا (ملک).

**مەسەلەی پێنجەم‌و کۆتایی** : پاش گەیشتنی یوسوف بە حاڵەتی پێگەیشتن‌و کامڵیی، خوا حیکمەت‌و زانیاریی پێدا:

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە سێ بڕگەدا :**

**١) –** ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ ﴾، ئنجا کاتێك گەیشتە، ئەوپەڕی توانای، لە کوردییدا دەگوترێ: تافی لاوێتیی، یان توغیانی خۆی، گەیشتە ئەوکاتەی کە بالّغ بوو، کاملّ بوو، تینو تاقەتی پەیداکرد.

(أبو عُبید) دەڵێ: (أَشُدّ)، (لا واحِدَة لَهُ مِنْ لَفْظه عِنْدَ العَرَب، وَمَعْنَاهُ: استكمال القُوَّة، ثُمَّ يكون النقصَان بَعْد)، یانی: (أَشُدّ) لە بێژەی خۆی (یەك)ی نیە لە زمانی عەرەبیی دا، واتایەکەشیی: تەواوبوونی هێزو پێزە، کە لە دوای وی نا تەواویی پەیدا دەبێ.

(سیبویە)یش دەڵێ: (أَشُدّ جَمْعٌ، وَاحِدَه شِدَّة)، (أشد) کۆیە، تاکەکەی بریتیە لە (شِدّة).

(کسائی)یش، دەڵێ: (واحده : شِدّ)، تاکەکەی بریتیە لە (شد)، هەرچۆنێك بێ (أَشُدَّهُۥ)، یانی: تافی لاوێتیی و هەرەتی تینو تاقەت.

ئنجا ئایا ئەوە لە چەند ساڵیی، بۆ چەند ساڵییە ؟

١ – هەندێکیان گوتوویانە: لە (١٥) بۆ (٢٠) ساڵیی .

٢ – هەندێکیان گوتوویانە: تاکو (٣٣) ساڵیی .

٣ – هەندێکیشیان هەتا (٤٠) ساڵیی ڕۆیشتوون .

ئاشکراشە هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام) وەك بۆمان گێڕدراوەتەوە، وەك پێغەمبەری خاتەم ﷺ دوای تەمەنی (٤٠) ساڵیی سروشیان بۆ کراوە، بۆیە ئەگەر مەبەست وەحیی پێدران بێ، لای کەم دەبێ لە سەرووی (٣٠) ساڵیی بووبێ .

**٢) –** ﴿ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾، (حُکم)و (عِلم)مان پێدا.

(حُکم)، زۆرێك لە زانایان دەفەرموون: مەبەست پێی حیکمەتە، واتە: کارامەیی و لێزانیی و شارەزایی، لە ڕووی کردەییەوە.

(وَعِلْمًا)، واتە: زانیاریی و بەرچاوڕوونیی، دەگونجێ مەبەست لە حوكم و عیلم لێرەدا ئەو دوو سیفەتە بەرزەبن كە سەرجەم پێغەمبەران هەیانبوون، وەك لە قورئاندا باسكراوە .

هەندێكیش دەڵێن: (حُكم)، بریتییە لە حوكمڕانیی و دەست كراوەیی و دەستڕۆیشتوویی .

(الشعراوي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا بە ناوی: (خواطر الشعراوي)[1]، گوتوویەتی: (وَالحُكْمُ: هُوَ الفَيْصَلُ بَيْنَ قَضْيَّتَيْنِ مُتَعَانِدَتَيْنِ مُتَعَارِضَتَيْنِ، حَقٍّ وَبَاطِلٍ، أي: التفرقة بَيْنَ الصَّوَابِ وَالخَطأِ).

واتە: (حُكْم) بریتییە لە جیاكردنەوە لە نێوان دوو بابەتدا كە پێچەوانەو دژی یەكدین، هەق و ناهەقن، واتە: جیاكردنەوەی ڕاست و چەوت .

٣) – ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، بەو شێوەیەش پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوە .

واتە: لەبەر ئەوەی یوسوف چاكەكار بوو، بۆیە ئاوا پاداشتمان دایەوە، حیكمەت و عیلممان، پێدا. یاخود حوكم و زانیاریی و شارەزاییمان پێدا .

دكتۆر (محمد راتب النابلسي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا بە ناوی: (تفسیر النابلسي)[2] لە زانایانی دەروونزانەوە دەگوازێتەوە، كە مرۆڤ هەریەك تەمەنی نیە، بەڵكو دەگونجێ پێنج جۆرە تەمەنی هەبن :

١ – (العُمُر الزَّمني)، تەمەنێكی كاتیی، واتە: بەساڵ، دەگوترێ: ئەو كەسە تەمەنی سی (٣٠) ساڵە، چل (٤٠) ساڵە، پەنجا (٥٠) ساڵە، دەڵێ: ئەوە سادەترین و كەم بایەخترین جۆری تەمەنە.

---

١) ج ١١، ص ٦٨٩٩.

٢) ج ٤ ، ص ٥٠٢ .

٢- (العُمُر العقلي)، تەمەنی عەقڵیی، کە بە ڕێژەو ئەندازەی پێگەیشتنی عەقڵ و هۆشی دیاریی دەکرێ، کە: ئایا ئەو مرۆڤە عەقڵ و تێگەیشتنی چەندە؟ لە ڕووی عەقڵ و تێگەیشتن و هۆشییەوە، دەبێ تەمەنەکەی دیاریی بکرێ.

٣- (العُمُر الإنفعالي)[1] تەمەنی کارلێکیی دەروونیی لەگەڵ دەوروبەردا، وەك: خۆشحاڵ بوون، خەمبار بوون و سەرجەم حاڵەتە دەروونییەکانی دیکە.

٤- (العُمُر الإجتماعي)، تەمەنی کۆمەڵایەتی، کە ئایا ئەو کەسە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی چۆنن؟ لەگەڵ دایك و بابی، لەگەڵ دۆست و هاوەڵانی، لەگەڵ دراوسێی، لەگەڵ خەڵکدا بەگشتی گونجاوە، یان نەگونجاوەو وەك بەردی خڕە، یاخود مرۆڤێکی گونجاوو تەبایە؟!

٥- (العمر التحصيلي)، تەمەنێك کە چەندەی زانست پەیدا کردوە؟ واتە: بە زاراوەی ئەم ڕۆژگارە: چ بڕوانامەیەکی هەیە.

کۆتا قسەم لەوبارەوە ئەوەیە کە (الإسكافِي)، لە کتێبەکەی خۆی: (دُرَّةُ التَّنْزِيل وَغُرَّةُ التأوِيْل)[2]دا، قسەیەکی جوان دێنێ، دەڵێ: بۆچی خوای پەروەردگار دەربارەی یوسوف دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ... ﴾؟ بەڵام بۆ مووسا لە سوورەتی (القَصَص)، لە ئایەتی (١٤)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ... ﴾، لە بارەی یوسوفەوە دەفەرموێ: کاتێك گەیشتە هەڕەتی توانای خۆی، حوکم و عیلممان پێدا، بەڵام لە بارەی مووساوە دەفەرموێ: کاتێك گەیشتە هەڕەتی لاوێتیی و تێرو تەواو بوو، ئنجا حوکم و عیلممان پێدا؟

١) لە سەرچاوەو فەرهەنگە دەروونزانییە کوردییەکاندا (الإنفعال) بە هەڵچوونیش وەردەگێڕدرێ، کە بە ئینگلیزییەکەی (emotion)ی پێدەڵێن، واتە: (emotional age)، تەمەنی هەڵچوونیی، کە هەڵچوون بریتیە لە ئیحساسات، وەك هەست کردن بە خەمباریی و ناسوودەیی و دڵەڕاوکێ و شەرم ... هتد.

٢) ص ١٧١ و ١٧٢.

وەڵامەکەی ئاوادەداتەوە، دەڵێ: لەبەرئەوەی یوسوف تووشی میحنەتو دەردەسەریی زۆر بووە، خوای کاربەجێ چاوەڕێی ئەوەی نەکردوە کە دوای ئەوەی گەیشتۆتە تافی لاوێتیی‌و هەڕەتی گەنجێتیی، بگاتە حاڵەتی (پێگەیشتن)، بەڵکو زووتر خوای پەروەردگار حوکم‌و عیلمی پێداوە، یاخود حیکمەتو عیلمی پێداوە، لەبەرئەوەی زووتر پێویستیی پێی بووە، بەڵام لەبارەی مووساوە، لەبەر ئەوەی ئەو شتانەی هاتوونە ڕێی یوسوف، نەهاتوونەتە ڕێی وی‌و، هیچ چاوەڕوانییەکی نەکردوەو شوان بووەو بە شوانێتیی لە مەدیەنەوە هاتوەو، ویستوویەتی سەردانی دایکی بکاتەوە لە میسر، ئیدی بەڕێوە خوای بەخشەر کردوویەتی بە پێغەمبەر، بۆیە تاکو نەگەیشتۆتە قۆناغی کامڵ بوون، خوای کارزان حوکم‌و عیلمی پێنەداوە، لەبەر ئەوەی حاڵەتەکەی وابووە، پەکی لەسەریان نەکەوتوە، بەڵام یوسوف حاڵەتەکەی وابووە، کە دەبوو زوو خوای پەروەردگار ئیلهامی بۆ بکاتو ئاگاداری بکاتەوە، لەبەرئەوەی کە لە میحنەتو بەڵاو گرفتاریی بەردەوامدا بووە .

منیش دەڵێم :

حیکمەتێکی دیکەش لێرەدا ئەوەیە کە :

مووسا عليه السلام نێرراوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی فیرعەون‌و دەربازکردنی گەلی چەوساوەی خۆی (بني إسرائيل)، ئەوەش ئەرکێکی هێندە گران بووە، پێویستیی بەوپەڕی پێگەییشتوویی هەبووە !

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناســەی ئەم دەرســە

لــەم دەرسەمــاندا ئایـەتـەکــانی: (٢٣ تــا ٢٩) کــە حــەوت (٧) ئایەتـــن، ڕوون دەکەینــەوەو، ئـەمــە ئـاڵقــەی سێیــەمی بـەسـەرهـاتی یوسوفــە ﷺ، لــەم حـەوت ئـایـەتـەدا خـوای بـەرزی مـەزن بـاس لـە میحنـەتو تاقیکردنـەوە گـەورەکـەی یوسـوف دەکـات، کـە بریتیـە لـە تـەمـاع تێکرانی دەست تێکـەڵیی، لـەلایـەن هـاوسـەری عـەزیزی میسرەوەو، بـەرهـەڵستیی کـردنی یوسوفو پەنـا بـە خـواگـرتنیو، سـەرەنجام ڕاکـردنی لـە دەست ئـەو ژنـەو دڕانی کـراسـەکـەی لـە پشتـەوەڕا، بـە دەستی ژنـەکـە، ئنجا لـەبـەر دەرگـا گـەیشتنیـان بـە مێردەکـەیو، مشتو مڕکـردنیـانو، تۆمـەتبـار کـردنی ژنـەکـە بـۆ یوسـوف، کـە نیـازی خراپی بـووە لـەگـەڵی داو، بـەرگـریی کـردنی یوسـوف لـە خـۆی، کـە ئـافـرەتـەکـە ویستـوویـەتی پـەلکێشی خراپـەی بکـاتو لــە خشتــەی ببـات، پاشـان شـایـەدیی دانی شـایـەدێك لـە نیزیکـان، کـە لـە بـازنـەی ئـافـرەتو پیـاوەکـەدایـە، واتـە: لـە خزمـانو نیزیکـانیـان، بـە قـازانجی یوسـوف .

ئنجا بـاوەڕکـردنی عەزیز بـەوەی کـە هـاوسـەرەکـەی تاوانبـارەو، فـەرمـانکـردن بـە هـاوسـەرەکـەی کـە داوای لـێبـوردن بکـات، داواشی لـە یوسـوف کـردوە، کـە بـێ دەنگیی لـەو بـابـەتـە بکـات .

﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢٣ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ٢٤ وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٢٥ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٢٦ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٢٧ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ٢٨ يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَاۚ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ ٢٩﴾.

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{ئنجا ئەو ژنەی ئەو (یوسوف) لە مالەکەی دابوو، هەولّی پەلکێش کردنی ویدا بۆ دەست تێکەلّ کردن‌و، قایم دەرگاکانی گالّەداو گوتی: وەرە پێش، (یوسوف) گوتی: پەنا بە خوا، ئەو (مێردەکەی تۆ) بەخێوکەرمەو بە باشی حاواندوومیەوە بە دلّنیایی ستەمکاران سەرفراز نابن ﴿٢٣﴾ بە دلّنیایی ژنەکە نیازی (پەلاماردانی) وی کرد، ئەویش نیازی پەلاماردانی وێی کرد، ئەگەر بەلّگەی پەروەردگاری نەدیبایە (ئازاری دەدا)، بەو شێوەیە (بەلّگەمان خستەوە یادی یوسوف) تاکو خراپەو شوورەیی لێ دووربخەینەوە، بە ڕاستیی ئەو لە بەندە هەلّبژاردەکانمان بوو ﴿٢٤﴾ ئنجا هەردووکیان بەرەو دەرگایەکە پێشبڕکەیان کرد، (ژنەکە بۆ گرتنی یوسوف‌و ئەویش بۆ ڕاکردن لە چنگی)، ئیدی ژنەکە کراسەکەی وی لە پشتەوە دادڕی‌و، لە نزیك دەرگایەکە بە مێردەکەی گەیشتن، ژنەکە گوتی: سزای کەسێك کە نیازی خراپی بەرانبەر بە هاوسەرت هەبووە، هەر ئەوەیە کە زیندانیی بکرێ، یان ئازارێکی بە ئێش بدرێ ﴿٢٥﴾ (یوسوف) گوتی: ئەو هەولّی پەلکێش کردنی دام بۆ دەست تێکەلّ کردن، ئنجا شایەدێك لە نیزیکەکانی وێ، شایەدیی دا: ئەگەر کراسەکەی (یوسوف) لە پێشەوە دڕابێ، ئەوە ئەو (ژنە) ڕاست دەکات‌و ئەو (یوسوف) لە درۆکارانە ﴿٢٦﴾ بەلاّم ئەگەر کراسەکەی لە پشتەوەڕا دادڕابێ، ئەوە (ژنەکە) درۆ دەکات‌و ئەو (یوسوف) لە ڕاستگۆیانە ﴿٢٧﴾ ئنجا کاتێك (عەزیز) بینی کراسەکەی (یوسوف) لە پشتەوەڕا دادڕاوە گوتی: (ئافرەت !) ئەوە لە فێلّی ئێوەومانانە، بێگومان فێلّ‌و پیلانی ئێوەومانان مەزنە ﴿٢٨﴾ (دوایی گوتی:) ئەی یوسوف! باسی ئەو (بابەت)ە مەکە، تۆش (ئەی ژنەکە) داوای لێبوردن بۆ گوناهەکەت (لە مێردی خۆت) بکە، مسۆگەر تۆ لە تاوانبارانی ﴿٢٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَرَٰوَدَتۡهُ ): واتە: هەوڵی پەلكێش كردنی دا، هەوڵی لە خشتە بردنی دا، هەوڵی لەگەڵدا لەسەر هەڵوێستی خۆی لایبداو بیهێنێتە سەر هەڵوێستی خۆیو، بە حەرامیی دەستی لەگەڵ تێكەڵ بكات، (الرَّوْدُ: التردُّدُ فِي طَلَبِ الشيءِ برِفقٍ، وَالـمُراوِدَةُ أَنْ تُنازِعَ غَيْرَكَ فِي الإرَادَة، فَتريدَ غَيْرَ ما يُريد، وَرادَ يَرُودُ سَعَى فِي طَلَبِ الشيء، تراوِدُ فَتَاها عَنْ نَفْسِهِ أي: تَصْرِفُهُ عَن رَأيِهِ)، (راودته) لە (رود)ەوە هاتوە، (رود) بریتیە لە هاتنو چوون لە داواكردنی شتێكدا بە نەرمیی (مُرَاوَدَة)ش، ئەوەیە تۆ بتەوێ بەرانبەرەكەت لە قەناعەتی خۆی لابدەیو بیخەیە سەر قەناعەتی خۆت، واتە: وای لێبكەی ئەوەی بوێ كە تۆ دەتەوێ، دەگوترێ: (رَادَ يَرُودُ) واتە: هەوڵی بەدەستهێنانی شتێكی دا، (تراوِدُ فَتَاها عَنْ نَفْسِهِ) واتە: دەیویست خزمەتكارەكەی كە لەسەر ڕای خۆی لابدات، {ڕای یوسوف بریتی بوو لە پاكیو عیففەت، ڕای ئافرەتەكەش بریتیی بوو لە دەست تێكەڵ كردن بە حەرامیی}، جا دەیویست یوسوف لەسەر ڕای خۆی، كە پاكییە، لابدات بەرەو ڕای خۆی، كە بریتیە لە دەست تێكەڵیی بە حەرامیی (زینا كردن).

(وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ): واتە: دەرگاكانی داخستن، (غَلَّقَ عَلَى التَّكْثِيرِ إِذَا أَغْلَقَ أَبوابا كَثِيرَة، أَوْ أَغْلَقَت بابا وَاحِداً مِرَاراً، أَوْ أَحكَمَت إِغْلاقَ بابٍ وَاحِد)، وشەی (غلَّق) بۆ زۆرییە، واتە: زۆر دەرگای داخستن، یاخود دەرگایەكی داخست بەڵام چەند جارێك دایخست، واتە: بە كلیلو پاشان شتێكی دیكەشی بە پشتەوەنا، یاخود دەرگاكەی زۆر بە مەحكەمی داخست، یان، چەند جارێك لە دوای یەك دەیكردەوەو دایدەخست .

بەلاَم زیاتر وا پێدەچێ كە چەند دەرگایەك بووبن‌و هەمووی داخستبن، چونكە (أبواب) كۆی (باب)ە، بۆیەش هەمووی داخستوون، بۆ ئەوەی خۆشی‌و یوسوفیش دڵنیابێ كە لەو كاتەدا كەس لێیان وەژوور ناكەوێ.

(هَيْتَ لَكَ): (هَيْتَ: قَرِيبٌ مِنْ هَلُمَّ، وَقُرِئَ: هَيْتُ لَكَ، أَي تَهَيَّئتُ لَكَ، وقُرِيءَ بعدة راءات أُخرى) بە هەموو خوێندنەوەكان (قراءات) واتە: وەرە پێش، دەستپێبكە، نیزیكبەوە، یانی: لەو كارە خراپەی كە ئافرەتەكە ویستوویەتی، (هَيْتُ لَكَ) یانی: من بۆت ئامادەم، دواتر زیاتر تیشك دەخەینە سەر، كۆی خوێندنەوەكان .

(مَعَاذَ اللَّهِ): یوسوف گوتوویەتی: پەنا بە خوا، (أَلْتَجِيءِ إِلَيْهِ وَأَعُوذُ بِهِ، وَأَسْتَغِيثُ بِهِ أَنْ أَفْعَلُ ذَلِكَ، معَاذَ مَصْدَرٌ أُضِيفَ إِلى اسم الجلالة إِضَافة المَصْدَرِ إِلى مَعْمُولِهِ)، (معاذ الله) واتە: (أعوذ به معاذاً) پەنا دەبەمە بەر خوا بە پەنا پێبردن، (معاذ) چاوگەو پاڵدراوەتە لای ناوی خوا، وەك پاڵوێدانی چاوگ بۆ لای ئەوەی ئەو كاری تێی كردوە .

(أَحْسَنَ مَثْوَايَ): واتە: جێگاو رێگای منی باش كردوە، شێوەی حاواندنەوەی منی باش كردوە، (آواني إِيوَاءً حَسَناً) واتە: باش رێزی لێگرتووم، جێگاو رێگاو بەرگ‌و پۆشاك‌و خواردنی باش‌و ... هتد بۆ دابین كردووم .

(وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ): هەم (ل)و هەم (قد) بۆ جەخت كردنەوەو دڵنیا كردنەوەن، واتە: بێگومان ئەو ئافرەتە نیازی زیناكردنی هەبوو بەرانبەر بە یوسوف، (الهَمُّ: العَزْمُ عَلَى الفِعْلِ)، (هَمّ) بریتیە لە عەزم جەزم كردن لەسەر ئەنجامدانی كارێك، بۆیە بە (لَقَد) تەئكید كراوەتەوە، تاكو دیاربێ كە بریتیە لە عەزم جەزم كردن لەسەر ئەنجامدانی كارێك، (وَأَكَّدَ هَمّها بِقَدِ وَلامَ القَسَم لِيُفِيدَ أَنَّها عَزَمَتْ عَزْماً مُحَقَّقاً) بۆیە بە (لقد) تەئكید كراوەتەوە، تاكو دیاربێ، كە ژنەكە زۆر بە تەواویی دڵی خۆی ساغ كردۆتەوە لەسەر ئەوەی لەگەڵ یوسوف دا ئەو كارە بكات، ئنجا زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: (هَمَّتْ بِهِ) واتە: نیازی بوو كە زینای لەگەڵدا بكات، بەلاَم وەك

دوایی باسی دەکەین، ڕایەکی دیکە هەیە، کە من ئەو ڕایەم پێ ڕاستە، دەڵێ: نیازی بوو پەلاماریی بداتو ئازاری بدات لەسەر ئەوەی بە قسەی ناکات بۆ هێنانەدی ئامانجەکەی .

(لِنَصْرِفَ عَنْهُ ): واتە: بۆ ئەوەی لێی لابدەین، (الصَّرْفُ: نَقْلُ الشيء مِنْ مَكانٍ إلى مَكان، وهُنا مَجازٌ عَنِ اللَّفْظِ) بۆ ئەوەی (سوء) و (فحشاء)ی لێ لابدەین، (صرف) بریتیە لە گواستنەوەی شتێك لە شوێنێك بۆ شوێنێكی دیكە، كە لێرەدا مەبەست پێی، پاراستنیەتی .

(ٱلسُّوٓءَ ): (السُّوءُ: كُلُّ ما يَغمُّ الإنْسان دُنياً وآخِرَةً، نَفْساً وبَدَناً)، (سوء) هەر شتێكە كە حاڵی ئینسان خراپ بكاتو ئینسان پێی ناخۆش بێو مایەی خەفەتو دڵتەنگیی بێ، لە دنیاو دوارۆژداو، لە ڕووی دەروونیی و جەستەییەوە، كە لێرەدا مەبەست پێی خیانەتو ناپاكییە .

(وَٱلْفَحْشَآءَ ): (الفَحْشاء: ما عَظُمَ قُبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ وَالأَقْوَالِ، كِنايةٌ عَنِ الزِّنَى)، (فَحْشاء) واتە: بێ شوورەیی، بێناموسیی، هەر كردەوەو قسەیەكە كە زۆر دزێوو ناشیرین بێ، كە لێرەدا مەبەست پێی زینایە .

(ٱلْمُخْلَصِينَ ): (الخالِصُ: كالصَّافِي إلاَّ أنَّ الخالِصَ هُوَ ما زَالَ عَنْهُ شَوْبُهُ بَعْدَ أنْ كانَ فِيهِ، وَالمُخْلَصُ: ما أُزِيلَ عَنْهُ الشَّوَائِبُ)، (مُخْلَصين) لە (خالص)ەوە هاتوە، (خالص)یش وەك (صافي) وایە، بەڵام بە هەر حاڵ (خالص) ئەوەیە شتێك كە لەگەڵی تێكەڵاو بووە، لێی لابچێ، دوای ئەوەی لەگەڵی تێكەڵ بووە، بەڵام (صافي) ئەوەیە كە هەر لە ئەسڵدا هیچی لەگەڵ تێكەڵ نەبووبێ، (مُخْلَص)یش شتێكە، یان كەسێكە، ئەو شتانەی كە لەگەڵی تێكەڵ بوون، لێی لابدرێن، هەڵبەتە خوێنراویشەتەوە: (مُخْلِصِين) واتە: دەربازكەران، ئەوانەی كە خۆیانو كردەوەكانی خۆیان دەرباز دەكەن، لە خڵتەو خاڵی شیركو غەیری خوا پێ مەبەست بوونو، ساغی دەكەنەوە بۆ خوا .

(﴿وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ﴾): پێشبڕکەیان کرد بەرەو دەرگایەکە، (السَّبْقُ: التَقَدُّمُ فِي السَّيرِ، وَاسْتَبَقَا أي: تَسابَقَا)، (سَبْق) بریتیە لەوە کە لە ڕۆیشتندا ئینسان پێشبکەوێتەوە، بەڵام لێرەدا (وَآسْتَبَقَا) لەگەڵ (تَسابَقَا) هەر یەك واتایان هەیە، واتە: هەر کامێکیان دەیویست پێش ئەوی دیکەیان بکەوێتەوەو پێشبڕکەیان کرد .

(﴿وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ﴾): واتە: کراسەکەی دادڕی، (القَدُّ: قَطْعُ الشيءِ طُولاً)، (قَدّ) ئەوەیە کە شتێك بە باری درێژییدا دادڕیە خوارێ، بۆیە من وشەی دادڕینم بۆ بەکارهێناوە .

(﴿مِن دُبُرٍ﴾): واتە: لە پشتەوە ڕا، (دبُرُ الشيءِ: خِلافُ القُبُلُ، وَالجَمْعُ أَدْبار)، (دُبُر) پێچەوانەی (قُبُل)ە، وشەی (دُبُر) واتە: پشتەوە، (قُبُل) واتە: پێشەوە، کە بە (أَدْبار) کۆدەکرێتەوە .

(﴿وَأَلۡفَيَا﴾): واتە: تووشی بوون، (الإِلْفَاءُ: لقاءُ شَيءٍ عَلَى حَالة خاصَّةٍ مِنْ غَيْرِ سَعيٍ لِوِجْدَانِهِ، مُفَاجَئاً)، (إلفاء) ئەوەیە کە تۆ بگەی بە شتێك بە شێوەیەکی تایبەت، ئەویش ئەوەیە کە نەتەوێ بیگەیەو هەوڵی بۆ نەدەی، بەڵام یەکسەر کتوپڕ بێتە بن لووتتو تووشی بی .

(﴿سَيِّدَهَا﴾): (السَيِّدُ: المُتولِّي للسوادِ، أَي: الجَماعَةِ الكَثِيرَةِ وَسُمّي الزَّوْجُ سَيّداً لِسياسة زَوْجَتِهِ)، (سید) لە ئەسڵی زمانی عەرەبییدا واتە: سەرپەرشتیکەری ئاپۆرایی، خەڵکێکی زۆر، بۆیەش بە هاوسەری ئافرەت گوتراوە (سید) چونکە سەرپەرشتیی ماڵو خێزانەکەی دەکات .

(﴿لَدَا ٱلۡبَابِ﴾): واتە: لە نیزیك دەرگایەکە، {(لَدَى) يُقَارِبُ (لَدُن) وَلَدُن أَخَصُّ مِنْ (عِنْد) لأَنَّهُ يَدُلُّ عَلَى ابتِداءِ نِهايَة)، (لدی) ماناکەی لە (لدن)ەوە نیزیکە، (لدُن)یش تایبەتترە لە (عند) چونکە وشەی (لدُن) بەکاردەهێنرێ بۆ سەرەتای کۆتایی شتێك .

(قُبُلٍ ): (ضِدّ الدُّبُر) واتـە: پێشەوە، کـە پێچەوانـەی پشتـەوەیـە .

( كَيْدَكُنَّ ): (الكَيْدُ: ضَرْبٌ مِنَ الإِحْتِيالِ مَذْمومٌ وَمَمْدُوحٌ، وَالمَذْموم أَكْثَر)، (كَيْد) جۆرێکـە لـە فێڵو کاری پەنهان، کـە هـەم بـە حاڵـەتی سـەرزەنشـت کـراویی و، هـەم بـە حاڵـەتی ستایش کـراویی، دێ، بـەڵام زیاتـر بـۆ حاڵـەتی سـەرزەنشت کـراویی بـەکاردێ، واتـە: حاڵـەتی خراپ، فێڵێکی خراپ، کـە لـە ڕێیـەکی خراپـەوە بـۆ ئـامانجێکی خـراپ بـێ .

(أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا ): واز لـەوە بێنـە، (أَعْرَضَ: وَلَّى مُبْدِيا عُرْضَهُ)، (عُرْض)، واتـە: لامل، ئینسان کـە ڕوو لـە شتێـك وەرگێڕێ، واتـە: لاملی تێدەکـات، واتـە: ئـەی یوسـوف! باسی ئـەم بابـەتە مـەکـە .

(ٱلْخَاطِـِٔينَ ): واتـە: تاوانبـاران، (الخـاطِيء: القَاصِدُ للذَّنْبِ)، (خـاطِيء) کـەسێکـە مـەبـەستی بێو بـە مـەبـەستـەوە گوناهێـك بکـات، واتـە: بشزانێ گوناهـەو بیکات، پێچەوانـەی: (أَخْطأ فَهُوَ مُخْطِيءٌ: أَصَابَ فِي الإِرَادَةِ وَأَخْطأ فِي الفِعْلِ) (مُخْطيء) ئـەوەیـە کـە مـەبـەستـەکـەی باشـبێ، بـەڵام نـەیپێکێو کـردەوەکـەی خراپ بێ، واتـە: ڕوو لـە شتێك بکـات، بـەڵام نـەزانـێ کـە ئـەوە خراپـە، بکـەر (فاعل)ەکـەی پێی دەگوتـرێ: (مُخْطِيء) .

# مانای گشتی ئایەتەكان

لە ئاڵقەی پێشێ، لە دەرسی پێشوودا، ڕوون بۆوە كە یوسوف لەلایەن پیاوێك كە خەڵكی میسرە، كڕدراو كابرای كڕیاری ئامۆژگاریی خێزانەكەشی كرد كە: ڕێزی لێ بگرێو جوان بیحەوێنێتەوەو خزمەتی بكات .

ئنجا لێرەدا باسی ئەوە دەكات كە یوسوف ﷺ چۆن دوای ئەوەی لە ماڵی ئەو ژنەدا گەورە دەبێو پێدەگاتو باڵغ دەبێ، وەك لە دەرسی پێشوودا باسكرا: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ﴾، واتە: كاتێك گەیشتە هەڕەتی لاوێتیی، تۆغیانی تینو تاقەتو پیاوەتییو كامڵ بوو، ئیدی دوای ئەوە ئەو ئافرەتە بە چاوێكی دیكە سەیری كرد، پێشتر وەك منداڵێكو كۆیلەیەك سەیری كردوەو تەماعیان تێیدا هەبووە: بیكەنە كوڕی خۆیان، یاخود خزمەتیان بكات، بەڵام دوایی كە یوسوف بووە بە پیاوێكی تەواوو گەنجێكی قۆزو جوان، ئەو ئافرەتە بە چاوێكی دی تەماشای كردوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ ﴾، ئنجا ئەو ژنەی كە یوسوف لە ماڵەكەیدا بوو، ویستی لە خشتەی بەرێ، ویستی پەلكێشی بكات، ویستی لە ڕای خۆی لایداتو، بیهێنێتە سەر ڕای خۆی .

(مُرَاوَدَة)، وەك پێشتر باسمان كرد، ئەوەیە كە كەسێك لەگەڵ كەسێك هەوڵبدات، ئەو كەسە لە ڕای خۆیو بۆچوونی خۆی لابداتو، بیهێنێتە سەر ڕاو بۆچوونی خۆی، دیارە بۆچوونی یوسوف، ئەوە بووە كە بە چاوی دایكو باب سەیری ئەو ژنو پیاوەی كردوە، یان بە چاوی ڕێزو حورمەتەوە سەیری كردوون، دوور لە هەر خولیاو بیرێكی دیكە كە پەیوەندیی بە لایەنی جینسییەوە هەبێ، یانی: یوسوف بە تەما بووە كە بە پاكییو چاكیی لەو ماڵەدا بەسەر بەرێ، بەڵام ئافرەتەكە ڕای وا بووە، كە: دەستی لەگەڵ تێكەڵ بكاتو، یوسوف لەو ڕایەی خۆی، كە عیففەتو پاكییە لابداتو، بیهێنێتە سەر ڕایەكەی خۆی، كە دەست تێكەڵكردنە بە حەڕامیی .

﴿ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ ﴾، ئنجا ژنەکە دەرگاکانی مەحکەم گاڵەداو دایخستن، ﴿ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ ﴾، گوتی: وەرە پێش، یان من بۆ تۆ ئامادەم، واتە: دەستم لەگەڵ تێکەڵ بکە، ﴿ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ ﴾، یوسوف گوتی: پەنا بە خوا، واتە: پەنا بە خوا دەگرم کە من کاری وا بکەم، ﴿ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ ﴾، لێرەدا یوسوف ﷺ بەپێی عەقڵی ژنەکە، ژنەکەی دواندوە، نەیگوتوە: حەرامەو قەدەغەیە، چونکە وا دیارە ئەوانە دینێکی ئاسمانییان نەبووە، شەریعەتێکی ئاسمانییان نەبووە، تاکو بە پێی ئەوە بیدوێنێ، بڵێ: ئەوە حەرامەو قەدەغەیە، ڕەنگە زینا لەلایان قەدەغەو حەرام نەبووبێ‌و، تەنیا لە ڕووی عەیبەی دنیاییەوە، عەیب بووبێ، بۆیە بۆ خۆی دەڵێ: پەنا بە خوا دەگرم، بەڵام بۆ ئەو دەڵێ: ﴿ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ ﴾، وشەی ﴿ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ ﴾، واتە: بێگومان ئەو پیاوەی تۆ، ئەو مێردەی تۆ خاوەنی منە، مشوورخۆری منە، ﴿ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ ﴾، جێگاو ڕێگاو خزمەتی منی باشکردوە، باش منی حاواندۆتەوە، باش خزمەتی کردووم، باش پەروەردەی کردووم

هەندێکیش لە زانایانیش گوتوویانە: ﴿ إِنَّهُۥ ﴾، دەچێتەوە بۆ لای خوا، واتە: خوا پەروەردگاری منە، منی باش لێرەدا حاواندۆتەوە، بۆیە من سەرپێچیی لە فەرمانی خوا ناکەم، بەڵام من پێم وایە سەرەتا فەرموویەتی: ﴿ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ ﴾، واتە: پەنا بە خوا دەگرم کە سەرپێچیی لە فەرمانی بکەم، دوایی وەك دنیایەتییش، ﴿ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ ﴾، مێردەکەی تۆ خاوەنی منە، مشوورخۆری منەو، منی باش حاواندۆتەوەو خزمەتی کردووم، منیش ناچم لە بەرانبەر چاکەدا، کە لەگەڵ منی دا کردوە، خراپەی لەگەڵدا بکەمو، خیانەت لەگەڵ هاوسەرەکەی دا بکەم .

﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، بێگومان ستەمکاران سەرفرازنابن، کە دیارە زیناش ستەمەو بابای زیناکار :

١ – هەم لە خۆی دەیکات .

٢ – هەم لەو ئافرەتەی دەکات کە لەگەڵیدا دەیکات .

٣- هەم لە کەس‌و کارەکەی دەکات، ئەگەر مێردە، ئەگەر برایە، ئەگەر کوڕە، ئەگەر هەر کەسێکی هەیە .

٤- هەم لە کۆمەڵگاشی دەکات .

٥- هەم لەو نەسل‌و وەچەیەشی دەکات، کە بە حەڕامیی پەیدا دەبێ،

یانی: کۆمەڵێك ستەم، لە داوێن پیسیی‌و زینادا کۆدەبنەوە، کە بەلای کەمەوە پێنجن !

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا ﴾، وە بێگومان ئەو ژنە، نیازی بوو پەلاماری بدات، ﴿ وَهَمَّ بِهَا ﴾، یوسوفیش نیازی بوو پەلاماری بدات، ﴿ لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَٰنَ رَبِّهِۦ ﴾، ئەگەر بەڵگەی پەروەردگاری خۆی نەبینیبایە (ئازاری دەدا)، دیارە ئێمە لە مەسەلە گرنگەکان دا زیاتر ئەوە دەتوێژینەوە، کە توێژەرەوانی قورئان زۆر مشتومڕیان لەسەر کردوەو، زۆربەی هەرە زۆریان ئەم: ﴿ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا ﴾یان، بەوە لێکداوەتەوە کە ئافرەتەکە ویستی زینای لەگەڵدا بکات، یوسوفیش (ئەگەر بەڵگەی پەروەردگاری نەبینیبایە) خراپەی لەگەڵدا دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی کە بەڵگەی پەروەردگاری بینی، ئەو خولیایەی بەسەر دڵی داهات، ئەو هەستی پیاوەتییەی کە تێیدا جووڵا بەرانبەر بەو ئافرەتە: ئیمانەکەی، ئەو بەڵگەیەی لە عەقڵ‌و دڵی دا بوو، یوسوفی لادا، بەڵام ئافرەتەکە دیارە عەزمی جەزم بوو لەسەر ئەو کارە .

هەڵبەتە من ئەم ڕایەم پێ ڕاستە کە لێرەدا: ﴿ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا ﴾، واتە: هەرکامێکیان ویستی پەلاماری ئەویدیکە بدات، ئافرەتەکە بە جەزمیی ویستوویەتی پەلاماری یوسوف بدات، واتە: پەلاماری بدات‌و سزای بدات، کە بۆچی گوێی بۆ ناگرێ‌و ئەوەی داوای لێدەکات، لەگەڵی دا ناکات؟ ﴿ وَهَمَّ بِهَا ﴾، یوسوفیش ئەگەر بەڵگەی پەروەردگاری نەبینیبایە، لە عەقڵ‌و دڵی خۆیدا، ئەویش ویستی پەلاماری بدات، وەك لە کۆڵ خۆکردنەوە، ئازاری ئافرەتەکە بدات‌و لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، بەڵام ئەوەی نەکردو بیری کردەوە، کە ئەگەر بێت‌و ئازاری ئەو ئافرەتە بدات،

دوایی چی بە مێردەکەی بڵێ؟ لەبەر ئەوە باشترین تەگبیرو چارەسەری ئەوە بوو، کە لەبەری ڕابکات .

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾، واتە: ئاوا ئەو بەڵگەیەمان پێشاندا، بەڵگەی پەروەردگاری خۆی بینیو خوا پێشانیدا، کە بریتیە لەو ئیمانو عەقیدەیەی کە لە دڵو عەقڵی دا بوو، بۆچی وایکرد ؟ دەفەرموێ : ﴿ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ﴾، بۆ ئەوەی خراپەو شوورەیی، کاری خراپو کاری بێ ناموسانەی، لێ دوور بخەینەوە، ﴿ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، بێگومان یوسوف، لە بەندە هەڵبژاردەکانو ساغ بووەوەکانی ئێمە بوو .

جێی سەرنجە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ﴾ یانی: (سوء و فحشاء) ڕوویان لە یوسوف کردوەو، خوا ویستوویەتی ئەوانەی لێ لابدات، نەك یوسوف ڕووی لە خراپەو شوورەیی بووبێ! بەڵکو خراپەو شوورەیی هێرشیان بۆ لای وی هێناو، ئەگەرنا یوسوف هەر لە بنەڕەتدا ڕووی لە خراپەو شوورەیی نەبووە.

﴿ وَٱسْتَبَقَا ٱلْبَابَ ﴾، ئنجا هەردووکیان بەرەو دەرگاکە بە خێرایی ڕۆیشتن، پێشبڕکەیان کرد، هەریەکەیان ویستی زووتر بگاتە دەرگایەکە، دیارە یوسوف بۆ ڕاکردنو، ئافرەتەکەش بۆ ئەوەی نەهێڵێ یوسوف دەرگاکە بکاتەوەو بچێتە دەر، بۆ ئەوەی سزای بدات .

یاخود ئەو مەبەستە کە لە دڵی دایە، جێبەجێی بکات، کە بریتیە لە دەست تێکەڵکردن بە حەرامیی .

﴿ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٍ ﴾، ئنجا کراسەکەی یوسوفی لە پشتەوەڕا دادڕی، (قَدّ)، ئەوەیە کە بە باری درێژییدا شتێك دادڕیە خوار، چونکە یوسوف ڕای کردوەو دیارە لە پێش ئافرەتەکەوە بووە، ئافرەتەکەش لە پشتەوەڕا گرتوویەتیو کراسەکەی دادڕیوە .

﴿ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِ ﴾، ئنجا لە لای دەرگایەکە تووشی گەورەکەی بوون، واتە: تووشی هاوسەری ئافرەتەکە بوون، ﴿ قَالَتْ مَا جَزَآءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، یەکسەر کتوپڕ گوتی: سزای ئەو کەسەی کە نیازی خراپەی بەرانبەر بە هاوسەری تۆ بووە، هەر ئەوەیە کە زیندانیی بکرێ، یان سزایەکی بە ئێش بدرێ، واتە: هەر لە ڕێوە یوسوفی تۆمەتبار کردو گوتی: ئەو ویستوویەتی: خراپە لەگەڵ من بکات .

﴿ قَالَ هِىَ رَٰوَدَتْنِى عَن نَّفْسِى ﴾، یوسوف بۆ بەرگریی لە خۆ کردنی، هەر ئەوەندەی گوت، کە ئەو ویستوویەتی: من لە خشتە بەرێ، ئەو ویستی من پەلکێش بکات، ئەو ویستی من لە ڕای خۆم لابداتو بمهێنێتە سەر ڕای خۆی، کە ڕای من بریتی بووە لە پاکییو، ڕای ئەویش بریتی بووە لە داوێن پیسییو زینا کردنو، دەست تێکەڵکردنی حەڕام، واتە: ئەو دەست پێشخەر بووەو من لە دەستی ڕام کردوە .

﴿ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ ﴾، ئنجا شایەدێك لە نیزیکانی ئافرەتەکە شایەدییدا : ﴿ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾، ئەگەر کراسەکەی یوسوف لە پێشەوە دادڕابێ، ئافرەتەکە ڕاست دەکاتو یوسوف لە درۆکارانە، ﴿ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، بەڵام ئەگەر کراسەکەی یوسوف لە پشتەوە دادڕابێ، ئەوە ئافرەتەکە درۆدەکاتو، ئەو (یوسوف) لە ڕاستگۆیانە .

چونکە ئەگەر یوسوف پڕکێشیی بۆ ئافرەتەکە کردبێو ویستبێتی خراپەی لەگەڵ دا بکات، دیارە ئافرەتەکە یوسوفی لە خۆی پچڕیوەتەوەو، سەرەنجام پێشەوەی کراسەکەی دەدڕێ، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە پڕکێشیی بۆ یوسوف کردبێ، دیارە یوسوف لەبەری ڕای کردوەو، ئەویش لە پشتەوەڕا دایهاتوتێو کراسەکەی دادڕیوە، ئەوەش شتێکی مەنتیقییە .

﴿ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّ ﴾، ئنجا کاتێك هاوسەری ئافرەتەکە، بینی کراسەکەی (یوسوف) لە پشتەوەڕا دادڕاوە، ڕووی لە ئافرەتەکە کردو گوتی: ﴿ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّ ﴾، ژنەکە! ئەوە لە فێڵی ئێوەیە، ﴿ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ﴾، بێگومان فێڵی ئێوە زۆر مەزنە، بۆچی بە (کۆ) هێناویەتی؟، واتە: تۆ فێلەکەت ئەوەندە گەورەیە، وەك ئەوەیە هی کۆمەڵە ئافرەتێك بێ، ئەوە واتایەکی، یاخود: تۆی ئافرەت وەك سەرجەم ئافرەتان فێڵو مەکرتان هەیەو، فێڵو مەکری ئێوەش مەزنە .

ئنجا لە کۆتایی دا پیاوەکە، چارەسەرێکی بۆ کێشەکە داناو گوتی: ﴿ يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَاۚ ﴾، ئەی یوسوف! واز لەو بابەتە بێنە، باسی مەکە، دیزەبەدەرخۆنەی لێبکە، بەردێکی لەسەر دانێ، ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ ﴾، بە ئافرەتەکەشی گوت: تۆش داوای لێبوردن بۆ گوناهەکەت بکە، واتە: داوای لێبوردن لە من بکە، داوای لێبوردنم لێبکە، کە تۆ بەرانبەر بە من هەڵەت کردوە، ویستووتە لەگەڵ ئەو غولامەی خۆمان، لەگەڵ ئەو کۆیلەیەی خۆماندا، دەست تێکەڵیی خراپ بکەی! ﴿ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ ﴾، بە دڵنیاییەوە تۆ لە تاوانبارانی، تۆ دەست پیشخەربووی، تۆ پڕکێشیی یوسوفت کردوە، هەم بۆ دەست تێکەڵییەکە، هەم بۆ دواییش کە لەبەر تۆ ڕای کردوە، تۆ پڕکێشیی ئەوت کردوەو، ویستووتە ئازاری بدەی، پەلامارت داوەو ویستووتە سزای بدەی .

بەو شێوەیە ڕوون بۆتەوەو، عەزیزی میسر تەواو دڵنیابووە کە یوسوف ﷺ پاكو بێگەردەو هاوسەرەکەی تاوانبارە .

هەڵبەتە ئەوە لێی وەردەگیرێ، کە ئەو پیاوە (عەزیزی میسر) پیاوێکی پیاوانەو جوامێر نەبووە، واش پێدەچێ کە کۆمەڵگای ئەو کاتە کە دینێکی ئاسمانییان نەبووە، غیرەتو بەتەنگ ناموسەوە بوونیان، بەو شێوەیە نەبووبێ، ئەگەرنا تۆ بزانی ئافرەتەکەت پڕکێشیی کۆیلەکەتی کردوە، بۆ ئەوەی داوێن پیسیی لەگەڵدا بکات، هەر ئەوەندە دەڵێی: داوای لێبوردنم لێ بکە؟! بێگومان ئەوە شتێکی زۆر کەم بووە .

ئنجا بەهەرحاڵ: هەرکەسە لە قەدەر خۆی، لە قەدەر شەڕەفو جوامێریی خۆی، هەستیاریی دەبێت بەرانبەر بە کاری شوورەییو بێ ناموسیی کە لە نیزیکانی ڕوودەداتو کەسانو کۆمەڵگایانی نامسوڵنانو بت پەرستو چی و چی پەرستیش، گیرۆدەی چەندان خووو خدەی نزمو پەست دەبن، کە یەکێکیان بێ غیرەتیی (بە تەنگ ناموسەوە نەبوون)ە !

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم :** هەوڵدانی ژنی عەزیزی میسر لەگەڵ یوسوف دا، بۆ لەخشتەبردنیو، پەلكێش كردنی بەرەو دەست تێكەڵییو، پەنا بە خوا گرتنی یوسوفو، مل نەدانی بۆ ئەو كارە خراپە:

وەك خوا دەفەرمووێ : ﴿ وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾.

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە لە حەوت بڕگەدا :**

١) – ﴿ وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ ﴾، ئەو ژنەی كە ئەو (یوسوف) لە ژوورەكەیدا، یان لەماڵەكەیدا بوو، ویستی یوسوف لە ڕایەكەی خۆی لابداتو بیهێنێتە سەر ڕای خۆی، ویستی یوسوف لەخشتە بەرێو پەلكێشی بكات بەرەو ئەو مەبەستە خراپەی هەیبوو، كە بریتی بوو لە دەست تێكەڵكردن بە حەرامییو داوێن پیسیی.

پێشتریش باسی وشەی (مُرَاوَدَة)مان كردو شیمان كردەوە، بەڵام لێرەش دەڵێین: {الـمُرَاوَدَةُ: مُشتقة مِنْ رَادَ يَرُودُ، إِذَا جَاءَ وَذَهَبَ، شُبِّه حَالُ المحَاوِلِ أَحَداً عَلَى فِعْلِ شَيءٍ مُكَرِّرًا ذَلِكَ، بحَالِ مِنْ يَذْهَب وَيَجِيءِ فِي المعَاوَدَة إِلَى الشَيءِ الـمَذْهُوبِ عَنْهُ، فَأُطْلِقَ رَاوَدَ بمَعْنَى حَاوَلَ، و (عن) للمُجَاوَزَةِ، أَي: رَاوَدَتْهُ

مُباعِدَةً لَهُ عَنْ نَفْسِهِ، أَي: بِأَنْ يَجْعَلُ نَفْسَه لَها، فَكأَنَّها تراوِدُهُ عَنْ أَنْ يُسْلِم إِلَيْها إِرادَتُهُ، وَحُكْمَهُ فِي نَفْسِهِ)(١) .

واتە: (مُراوَدَة)، وەرگیراوە لە (رادَ، يَرُودُ، إِذا جاءَ وَذَهَبَ)، كەسێك كە بێتو بچێ، پێی دەگوترێ: (رادَ، يَرُودُ)، هەڵبەتە كەسێك بێتو بچێ بۆ هێنانەدی ئامانجێكو، كەسێك كە شتێك دووبارە دەكاتەوە، بۆ ئەوەی ئامانجێك بهێنێتە دی، چوێنراوە بە حاڵی كەسێك كە دێتو دەچێ، دەچێ بۆلای شتێكو دەگەڕێتەوە بۆ لایو، لێی دووردەكەوێتەوە، كەواتە، (راود)، دەبێتە مانای (حاول)، واتە: هەوڵیدا، كە من ئاوا لێكم داوەتەوە: (هەوڵیدا پەلكێشی بكات، یان لە خشتەی ببات)، ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿عَن نَّفۡسِهِۦ﴾، وشەی (عَن)، (لِلمُجاوَزَة) بۆ تێپەڕاندنە، واتە: ئەو ئافرەتە هەوڵی لەگەڵ یوسوف دا، كە لە نەفسی خۆی دووری بخاتەوە، واتە: یوسوف خۆی تەسلیمی ئەو بكاتو ئیرادەو ویستی خۆی تەسلیمی ئافرەتەكە بكات، ئافرەتەكە چی بوێ، بۆی ئەنجام بدات، بە كورتیی: ﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ﴾، ئەو ژنەی كە یوسوف لە ماڵەكەی دا بوو، ویستی كە یوسوف پەلكێش بكاتو، لە خشتەی بەرێو، لەسەر ڕای خۆی لایبداتو بیهێنێتە سەر ڕای خۆی .

كە دەفەرموێ: ﴿هُوَ فِي بَيۡتِهَا﴾، یانی: (كونه فِي بيتها من شَأْنه أن يُطَوِّعَهُ لمُرادِها)، واتە: لەبەرئەوەی یوسوف لە ماڵی ئەودایە، ئەوە زیاتر ئەگەری ئەوە هەیە، شیمانەی ئەوە هەیە، وا لە یوسوف بكات، بە قسەی بكاتو فەرمانبەریی بۆ بكات .

ئنجا وشەی (بَیت)، كە دەفەرموێ: ﴿بَيۡتِهَا﴾، واتە: شوێنی نیشتەجێ بوونی ئافرەتەكە، ئەو شوێنەی كە شەوی تێدا دەكاتەوە، یاخود بە مانای هەموو ماڵەكەی دێ، وشەی (بَیت)، بە مانای خانوو (مَنزِل)و ماڵ (دار)، یش دێ، وەك چۆن بە مانای ئەو ژوورەش دێ كە مرۆڤ تێیدا دەخەوێ .

---

١) التحرير والتنوير ج١٢، ص٢٢٥.

**٢) -** ﴿وَغَلَّقَتِ ٱلْأَبْوَٰبَ﴾، واتـە: دەرگـاكانی داخستن بـە مـەحكـەمیـی، وەك گوتمـان: وشـەی (غَلَّقَت) بـە سـێ واتـا لێكـدراوەتـەوە :

أ/ زۆر دەرگــای داخســتن .

ب/ یـان یـەك دەرگــای زۆر بـە مـەحكـەمی داخسـت .

ج/ یـاخـود دەرگـایـەكی چەند جارێك داخسـت .

بـە هـەر حــاڵ لێرەدا مـەبـەسـت ئـەوەیـە كـە دەرگـایـەكانی داخستن‌و گاڵەی دان بـە مـەحكـەمیی، بۆ ئـەوەی لـەو كـاتـەدا كـەس لێیـان وەژوور نـەكـەوێ‌و، ئـەو كارە خراپەی كـە لـە یوسـوفی دەوێ، بـە ئـاسـوودەیی ئـەنجامی بـدەن .

**٣) -** ﴿وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ﴾، (هَيْتَ لَكَ: اسْمُ فَاعِلٍ بمَعْنَى: هَلُمَّ، أَقْبِل، بادِر)، بـە مـانـای: وەرە، وەرە پێش، دەست پێبكـە، دەست پێشخـەریـی بكــە .

شــایـانی بـاسـە ئـەم وشـەیـە بـە حـەوت جۆر خـوێنراوەتـەوە:

١- (هَيْتَ لَكَ). ٢- (هِيتَ لَكَ). ٣- (هَيْتُ لَكَ). ٤- (هِئْتُ لَكَ).

٥- (هِــتُّ لكَ). ٦- (هِــتَّ لكَ). ٧- (هيئتَ لَكَ).

كـە دیـارە ئـەوانــە هـەمـوویــان بــە مـانــای: وەرە، دەست پێبكـە، وەرە پـێش دێــن‌و، (هِيْتُ لَكَ)، یـان (هِيئتُ لَكَ)، واتـە: بـۆ تـۆ ئـامـادەم.

هـەندێك لـە زانـایـان دەڵێن: ئـەمـە ئـەوەی لێوەردەگیــرێ، كـە ئـەو ئـافرەتـە نـەچووە پێشتـر قسـەی دیكـەی لـەگـەڵـدا بكـات‌و موغـازەلـەی بكـات‌و ...هتـد، هــەر یـەكسـەر گوتـوویــەتی: وەرە ئــەو كــارەم لـەگــەڵ دابكـە! دەڵێــن: ڕەنگـە عـادەت‌و نـەریتـی ئـەو خـەڵكـانـەی ئـەو ڕۆژگـارەدا وابـووبـێ، وەك چۆن پیـاوەكـە بـۆی هـەبــووە لـەگــەڵ كـەنیزەكـەكــەی خـۆی دا جـووت بـێ، ئــافرەتیش بـۆی هـەبـووە لـەگـەڵ كۆیلـەكـەی خۆیدا جـووت بـێ! ئنجـا دوایی كـە ئـافرەتـەكـانی میسر ڕەخنـەیـان لێگـرتـوە، لـەبـەرئـەوە بـووە، كـە چۆن دەبێ كـە ئـافرەتێك كـە

خێزانی عەزیزی میسرە، لەگەڵ غولام و كۆیلەیەكی خۆی دا هەڵس و كەوتی ئاوا بكات و تەماعی تێبكات؟!

بەڵام پێم وایە : ئەوە ڕێ لەوەش ناگرێ كە پێشتر ئەو ئافرەتە چاوێكی لێداگرتبێ و، ئاماژەیەكی دابێتێ و جۆرە قسەیەكیشی لەگەڵ كردبێ، بەڵام یوسوف هەر گوێی پێنەدابێ، هەتا دوایی وەك دەڵێن: بە كوردیی شووتیی، داوای لێ كردوە: ئەو كارە خراپەی لەگەڵ دا بكات !

٤) - ﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ﴾، یوسوف گوتی: پەنا بە خوا، یانی: پەنا بە خوا دەگرم، هەر خوا پەنا پێبراوی منە، كە من كاری وا بكەم .

شیكردنەوەی وشەی : (مَعَاذَ) : (مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ اسْمٌ لِلعَوْذِ، وَهُوَ اللَّجَا إِلَى مَكَانٍ لِلتحصُّنِ، وَانْتُصِبَ هَذَا الـمَصْدَرُ عَلَى المَفْعُولِيةِ الْمُطْلَقَةِ نَائِبًا عَنْ فِعْلِهِ الـمَحْذُوفِ، وَالتقدِيرُ: أَعُوذُ بِاللهِ مَعَاذًا، فَلَمَّا حُذِفَ، الفِعْلُ جُعِلَ الإِسْمُ الـمَجْرُورُ بِبَاءِ التعْدِيَةِ مُتَّصِلاً بِالـمَصْدَرِ بِطَرِيقِ الإِضَافَةِ فَقِيلَ: مَعَاذَ اللهِ، كَمَا قَالُوا: سُبْحَانَ اللهِ، عِوَضًا عَنْ أُسَبِّحُ اللهَ)[1].

واتە: (مَعَاذ) چاوگێكی میمییە، ناوە بۆ (عَوْذ)، كە بە مانای پەناپێبردن دێ، پەنا بردن بە شوێنێك كە مرۆڤ لەوێ دا پارێزراو بێ، ئنجا ئەو چاوگە مەنصووب بووە لەسەر حاڵەتی (المفعول المطلق) كە لە شوێنی كردارێك دانیشتوە كە فرتێنراوە، تەقدیرەكەی بەم شێوەیە: پەنا بە خوا دەگرم بە پەنا پێگرتن، ئنجا دوای ئەوەی (فعل)ەكەی فرتێنراوە، ناوەكە {واتە: (أعوذ بالله)}ی یەكسەر پەیوەست كراوە بە چاوگەكەوە، بە شێوەی پاڵ وێدران و گوتراوە: (معاذ الله) وەك چۆن گوتراوە: (سُبْحَانَ الله) لە جیاتی بگوترێ: (أُسَبِّحُ الله) خوا بە پاك دەگرم، یەكسەر گوتوویانە: (سُبْحَانَ الله) واتە: خوا بە پاك دەگرم، بە بەپاك گرتن .

١) التحرير والتنوير ج١٣، ص٣٧.

٥) – ﴿ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ ﴾، بێگومان ئەو بەخێوکەری منە، کە ئەگەر مەبەست پێی مێردی ژنەکە بێ، واتە: ئەو هاوسەرەی تۆ، کە تۆ دەتەوێ بێمە سەر شوێنی ئەوو خیانەتی لێبکەم، ئەوە بەخێوکەری منە، مشوورخۆری منە، سەرپەرشتیارو خاوەنی منە .

هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی خوای پەروەردگارە، واتە: خوا ﷻ ئەو پەروەردگارەمە کە پەنای پێدەگرم، ئەو پەروەردگارو بەخێوکەرو مشوورخۆری منە .

بەڵام وادیارە مەبەست پێی مێردی ژنەکەبێ، واتە: مێردەکەی تۆ، هاوسەرەکەی تۆ، بەخێوکەرو مشوورخۆری منە، چونکە وشەی (رَبّ)، تەنیا بۆ خوای پەروەردگار بەکاردێ (الرَبّ)، ئەگەر (ال)، لەسەر بێ، یانی: پەروەردگارێك کە مانای تەواوی پەروەردگارێتیی تێدایە، بەڵام بەبێ (ال)، وشەی : (رَبّ) بۆ جگە لە خواش بەکاردێ، وەك (رَب البیت)، (رَب الإبل)، یانی: خاوەنی ماڵەکە، خاوەنی حوشترەکان .

٦) – ﴿ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ ﴾، باش منی حەواندۆتەوەو پەنای داوەو ڕێزی لێ گرتوم، جێگاو ڕێگاو نانو بەرگو پۆشاكو...هتد، بۆ دابین کردووم، ئنجا لە بەرانبەر خزمەتو چاکەی ئەودا، نابێ من خراپەی لەگەڵدا بکەم، ئەوە ئەگەر مەبەست پێی مێردی ژنەکە بێ، بەڵام ئەگەر مەبەست پێی خوای پەروەردگار بێ، واتە: دوا ڕۆژی منی باش کردوە، بەوەی کە لە گوناهـ لام دەدات، یاخود پەروەردگارم ئەو بارودۆخە باشەی بۆ ڕوخساندووم .

٧) – ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، بێگومان ستەمکاران سەرفراز نابن، واتە : من ئەگەر داوێن پیسیی لەگەڵ تۆدا بکەمو، بە حەرامیی لەگەڵ تۆدا جووت بم ، ئەوە ستەم دەکەم :

١ – هەم ستەم لە خۆم دەکەم .

٢ – هەم ستەم لە خاوەنەکەم دەکەم .

٣- هەم ستەم لە تۆ دەکەم .

٤- هەم ستەم لە کۆمەڵگا دەکەم .

٥- ئنجا ئەگەر منداڵێکیشمان پەیدابێ، کە زۆڵ دەردەچێ، ستەم لەویش دەکەم.

واتە: ئەوانەی زینا دەکەن، زیناکردن، ستەمێکی هەمەلایەنەیە، بێگومان سەرفرازنابن، منیش پەنا بە خوا دەبەم: لەو کەسانە بم، کە سەرفرازنابن، بە هۆی ستەم کردنەوە.

**مەسەلەی دووەم : عەزم جەزم کردنی ژنەکەی عەزیزی میسر، لەسەر پەلاماردانی یوسوفو، بڕیارنەدانی یوسوف بە پەلامارنەدانی ژنەکە، بەهۆی بینینی بەڵگەی پەروەردگاریەوەو بەهۆی ئەوەشەوە: لێ لادرانی خراپەو شوورەیی :**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَٰنَ رَبِّهِۦ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەتایبەت ڕستەی**

**﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا ﴾ لە چوار بڕگەدا :**

هەڵبەتە هەندێ لە بڕگەکانی مشتومڕێکی زۆریان لەسەرە، بۆ دەوری حەڤدە (١٧) لاپەڕەمان بۆ توێژینەوە لەبارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە، تەرخان کردوون :

**١) -** ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ ﴾، واتە: بە دڵنیاییی ژنەکە نیازی بۆ لای یوسوف کرد.

**٢) -** ﴿ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَٰنَ رَبِّهِۦ ﴾، هەروەها یوسوفیش ئەگەر بەڵگەی پەروەردگاری نەدیبایە، نیازی ڕووەو ژنەکە دەکرد .

زانـایـان دەربـارەی ئـەو دوو ڕسـتـەیـە، مشـتـومڕێکی زۆرو فراوانیـان بـووە، کـە ئـایا مـەبـەست لـەو: ﴿ هَمَّتۡ بِهِۦ ﴾، و ﴿ وَهَمَّ بِهَا ﴾ چییـە ؟

کـە ئێمـە پلـە پلـە بـە واتاکـەیاندا دەچینـە خـوارو، زانـایـان بـە گشـتیی بـە چوار مـانـایـان لێکیـان داونـەوە، بـەڵام سـەرەتا بـا ڕوونکـردنـەوەیـەك بدەین :

﴿ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦ ﴾، پیتـی (ل) لێـرەدا بـۆ جەختکـردنـەوەیـە، یـان بـۆ زەمینـە خـۆش کـردنـە بـۆ سوێند، (الـموطِّئة للقسم) .

( قد) کـە دەچێتـە سـەر کـرداری ڕابـردوو بـۆ تـەحقیقو دڵنیـا کـردنـەوەو جـەخت کـردنـە، ﴿ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦ ﴾، یـانی: بـە دڵنیـاییـەوە ئـەو ئـافرەتـە نیـازی یوسـوفی کـرد، نیـازی چی کـرد؟ دوایی بـاسی دەکـەین .

﴿ وَهَمَّ بِهَا ﴾، هـەروەهـا یوسـوفیش نیـازی ئـەوی کـرد، ﴿ لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦ ﴾، ئـەگـەر هـاتبـاو بـەڵگـەی پـەروەردگـاری نـەدیبـایـە .

## مـانـای یـەکـەم :

کـە من لـە هـەموویـان زیـاتـرم بـە دڵـە، ئـەوەیـە کـە (محمـد رشیـد رضا) لـە تـەفسیـرەکـەی دا (تفسیر القرآن الحکیم)[1]دا، بـە تـەفصیـلْ هێنـاویـەتی، کـە پێچەوانـەی ڕای زۆربـەی مـانـا لێکـدەرەوانی قورئـانـەو دەڵـێ: مـەبـەسـت لـە (هَمَّتۡ بِهِۦ) و (وَهَمَّ بِهَا) ئـەوە نیـە کـە ئـەو ئـافرەتـە ویستبێتی زینـا لـەگـەڵ یوسـوفدا بکـاتو، یوسـوفیش ئـەو مـەبـەستـەی بووبـێ، ئـەگـەر بـەڵگـەی پـەروەردگـاری نـەدیبـایـە، بـەڵکو مـەبـەسـت لـە (هَمّ) بـۆ هـەردووکیـان لێـرەدا، واتـە: ئـافرەتـەکـە بـە جـەزمیی ویستی پـەلامـاری یوسـوف بـدات بـۆ لێـدانو سـزادانیو، یوسـوفیش ویستی پـەلامـاری ژنـەکـە بـدات، بـۆ بـەرگـریی لـە خـۆ کـردنو دوورخستنـەوەو سـزادانی، ئـەگـەر بـەڵـگـەی پـەروەردگـاری نـەدیبـایـە، واتـە: مـانـایـەکـەی ئـاوای لێـدێ: (وَلَقَدْ هَمَّتْ بضَرْبِهِ وتأديبِهِ عَلَى مُخالَفَتِهِ

---

١) ج١٢ ص٢٤١– ٢٤٣.

أَمْرَهـا)، واتـە : بێگومـان ئـەو ئافرەتـە عەزمی جەزم کـرد کە لـە یوسـوف بداتو تـەمبێی بکات، لـەسـەر ئـەوە کـە سـەرپێچیی لـە فـەرمـانـەکـەی کـردوە، کـە پێی گوت: دەبێ ئـەو کـارەم لـەگـەڵـدا بکـەی، دەستم لـەگـەڵ تێکـەڵ بکـەی، بـەڵام یوسـوف نـەیکردو ئەویش ویستی: لـەسـەر ئـەوە لێی بداتو تـەمبێی بکات .

﴿ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ﴾، یوسـوفیش ویستی پەلامـاری بـداتو لێـی بـدات بـۆ لــە خـۆدوورخستنــەوەی، ئـەگــەر بـەڵگــەی پەروەردگــاری نـەبینیبـایـە، لـە عەقڵو دڵی خـۆیدا، یوسـوفیش بـە نیـاز بـوو دەستی لـەبـەر بکاتـەوە، هـەرچەندە ئـەو کۆیلـەی ئـەو ماڵـە بـوو، ئنجـا ئایـا بـەڵگـە لـەسـەر ئــەوە چییــە؟ (محمـد رشـید رضـا) چـوار جـۆرە بـەڵگـان دێنێتــەوە، کــە مــن قسەکانی کـورتو پوخـت دەکەمـەوەو، بـە تـەعبیری خـۆم دایاندەڕێژمـەوە :

<u>بـەڵگـەی یـەکـەم:</u> (أَجْمَعَ أَهْلُ اللُّغة عَلَى أَنَّ الـهَمَّ إِنَّمـا يَكونُ بـالأَعْمـال لا بـالشخوصِ والأعيـان)، پسـپۆڕانی زمـان لـەسـەر ئـەوە یـەك دەنگن، کـە وشـەی (هـمّ) (کـە لـە کـوردییـدا یـانی: ویستی، نیـازی بـوو) پەیوەست دەبێ بـە کـردەوانـەوە، نـەك بـە کـەسـەکـانو بـە شـتـەکـانـەوە، ئـەو چەند وێنـەیـەك دێنێتـەوەو، منیش چەند وێنـەیـەکم بـۆ زیـاد کـردوون :

١ – لـە سـوورەتی (التـوبـة) لـە ئـایـەتی (١٣)دا، خـوا دەفـەرمـوێ: ﴿ ... وَهَـمُّواْ بِإِخْـرَاجِ ٱلرَّسُولِ ... ﴾، واتـە: (کـافرەکـانی مـەککـە): ویستیـان پێغـەمبـەری خـوا ﷺ وەدەرنێـن، ویسـتیـان دەریبکـەن .

لێـرەدا (هـم) پەیوەسـت کـراوە بـە دەرکـردنی پێغـەمبـەرەوە ﷺ .

٢ – هـەر لـە سـوورەتی (التـوبـة) ئـایـەتی (٧٤)دا، دەفـەرمـوێ: ﴿ ... وَهَمُّواْ بِمَا لَمْ يَنَالُواْ ... ﴾، کـافرەکان شتێکیـان ویست، نیـازی شـتێکیـان بـوو، کــە دەستیـان نەیگەیشتێ، کە بریتی بـوو لە کوشتنی پێغـەمبـەری خـوا ﷺ و هەڵداشتنی لـە تەنگەبەرێك، لە دەروو (مضیق)یـەك، وەك لـە تـەفسیری سـوورەتی (التـوبـة)دا بـە ڕوونیی بـاسمـان کـردوە، کـە کۆمـەڵـە دووڕوویێك لـە شـوێنێکی تـەنگـەبـەرو

دەربەند، کە خوارەکەی شیوو دۆڵێکی قووڵ بوو، ویستیان پێغەمبەری خوا ﷺ کە سواری حوشترەکەی بوو، هەڵیدێرن و بەو شێوەیە بیفەوتێنن .

٣- لە سووڕەتی (آل عمران) ئایەتی (١٢٢)دا، دەفەرمووێ: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا ...﴾، واتە: یاد بکەوە کاتێك دوو کۆمەڵ لە ئێوە ویستیان: بترسێن، پاشەکشە بکەن.

ئەوەش کاتێك بوو کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییە بە خۆی و سێیەك (١/٣)ی سوپایەکەی پێغەمبەر ﷺەوە، کە هەموویان دڵ نەخۆش و ئیمان بێهێز، یاخود مونافیق و دەغەڵ بوون، بە بیانووی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ، بە قسەی گەنجەکانی کردووە و چۆتە دەر لە مەدینەو، بە قسەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەییەو ڕیش سپیەکانی نەکردوە، لە مەدینەدا بمێنێتەوە، بە خۆی و سێیەك (١/٣) سوپایەکەوە گەڕایەوە، ئنجا دوو کۆمەڵیش، دوو هۆزیش، لە سوپایەکەی پێغەمبەر ﷺ دابوون، ویستیان چاو لە وان بکەن، بەڵام دوایی هاوەڵان ئامۆژگارییان کردن و، لەگەڵ مونافیقەکان نەگەڕانەوەو، پێغەمبەری خوایان ﷺ، لەو مەیدانە بەجێ نەهێشت .

٤- لە سووڕەتی (النساء) ئایەتی (١١٣)دا، دەفەرمووێ: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ ...﴾، واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ)، ئەگەر بەخشش خوا لەسەر تۆ نەبووایە، کۆمەڵێکیان ویستیان، یان کۆمەڵێکیان دەیانویست تۆ گومڕا بکەن، سەرت لێبشێوێنن .

٥- لە سووڕەتی (غافر) ئایەتی (٥)دا، دەفەرمووێ: ﴿... وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ...﴾، واتە: هەر کۆمەڵگایەك، هەر ئوممەتێك، نیازی ئەوەیان بوو کە پێغەمبەرەکەیان بگرن، واتە: سزای بدەن، یاخود بیکوژن.

کەواتە: وەك دەبینین، وشەی (همّ) لە قورئاندا کە بەکارهاتووە، زیاتر پەیوەست بووە، بە کردەوەکانەوە، نەك بە کەسەکانەوە .

**بەڵگەی دووەم:** ئەوەیە کە ئافرەتەکە دڵی خۆی ساغ کردۆتەوەو بڕیاری یەکجارەکی داوە، کە ئەگەر یوسوف دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکات، لەگەڵیدا بە حەرامیی دەست تێکەڵ بکات، بەڵام وشەی (هَمّ) بۆ نیزیك کەوتنەوەی (مُقَارَبة)یە لە کارێك نەك بڕیاری تەواو: (كانَتِ المَرْأَةُ مُصَمِّمة عَلَى المواقَعَة، وَالهَمُّ للمُقَارَبَة!)، بەڵێ : وشەی (هَمّ)، واتە: ویستیو، بۆ نیزیککەوتنەوەیە لەو کارە، نەك بۆ بڕیاری یەکجارەکی .

کەواتە: لێرەدا (هَمّ) لەگەڵ ئەوە ناگونجێ کە مەبەست پێی دەست تێکەڵکردن بێ، چ بۆ ئافرەتەکە، چ بۆ یوسوف، ئەم وشەیە ئەوە ناگەیەنێ، چونکە وشەکەی پێشتر: ﴿ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ ﴾، زۆر ئاشکرایە لەوبارەوە: ژنەکە گوتی: وەرە پێش، خۆم بۆ ئامادە کردووی، ئەم تەعبیرە بەڕوونیی ئەوەی گەیاندوە، کەواتە: ئەوەی دیکەیان: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ ﴾، واتە: ویستی کە پەلاماری بداتو سزای بدات .

**بەڵگەی سێیەم:** (الوِقَاعُ لَيْسَ مِنْ فِعْلِ المَرْأَة حَتَّى تَهُمَّ بِهِ، وَإِنَّمَا نَصِيبُهَا مِنْهُ القَبُولُ والتَّمْكِين لِمَنْ يَطْلُبُهُ مِنْهَا)، دەست تێکەڵ کردنو جووت بوون، کردەوەی ئافرەت نیە، تاکو ئافرەت بیەوێ بیکات، بەڵکو بەشی ئافرەت لە جووت بووندا، هەر ئەوەیە کە ئامادەیی دەربڕێو، ئەو کەسەی کە ئەوەی لێ داوا دەکات، ئەو قبووڵی بکاتو لەگەڵی هاوکار بێ.

**بەڵگەی چوارەم:** (يُوسُفُ لَمْ يَهُمّ بذَلِكَ الفِعْل أَصْلاً، كَمَا تَدُلُّ عَلَيْهِ الآيَة وَالآيَات بعدها)، بە دڵنیاییەوە یوسوف نیازی ئەو کارەی هەر نەبووە، وەك ئایەتەکە باسی دەکات، {کە دەفەرموێ: ﴿ لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ﴾، چونکە بە پێی ڕایەکی دیکە، وەك دوایی دەیهێنین، یوسوف بە هۆی ئەوەوە کە بەڵگەی پەروەردگاری بینیوە، بەدڵنیاییەوە نیاز (هەم)ەکەی هەر نەبووە} هەروەها ئایەتەکانی دواییشی دەیگەیەنن .

ئنجا وەك پێشتریش گوتم: من ئەم ڕایەم بە دڵەو پێم وایە بە هیچ جۆرێـك: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا ﴾، پەیوەندیی بەوەوە نیە کە توێژەرەوانی قورئان، زۆر سەری خۆیان پێوە قاڵ کردوە، وەك دوایی باسی دەکەم، چونکە ڕستەکەی پێشێ کە دەفەرموێ : ﴿ وَرَٰوَدَتْهُ ٱلَّتِى هُوَ فِى بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلْأَبْوَٰبَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ ﴾، ئیدی ئەوە تێپەڕی: ئەو ژنەی کە یوسوف لە ماڵەکەی دابوو، ویستی لە خشتەی بەرێ، ویستی یوسوف لە ڕایەکەی خۆی لابداو بیهێنێتە سەر ڕای خۆی‌و، پێی گوت: وەرە پێش، یاخود دەست پێبکە، ئەوە من بۆت ئامادەم !

ئەوە تێپەڕی، بەڵام ئەوەی دیکە: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا ﴾، واتە: دوای ئەوەی کە یوسوف گوتی: ﴿ مَعَاذَ ٱللَّهِ إِنَّهُۥ رَبِّىٓ أَحْسَنَ مَثْوَاىَ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾، یانی: دوای ئەوەی یوسوف ملی نەداو بەرپەرچی دایەوە، کەواتە: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا ﴾، قۆناغێکی دیکەیەو، کاتێك یوسوف بەرپەرچی دەداتەوەو، پشتی تێدەکات، ئەو ئافرەتە دەیەوێ: سزای بدات، ئنجا یوسوفیش کە دەزانێ ئافرەتەکە دەیەوێ پەلاماری بدات، دێتە دڵی کە ئەویش بەرگریی لە خۆی بکات‌و لێی بدات، بەڵام دوایی کە بەڵگەی پەروەردگاری دەبینێ، کە لە عەقڵ‌و دڵی دایەو ئیمانەکەیەتی – وەك دوایی باسی دەکەین – لە جیاتی ئەوەی کە بەرگریی لە خۆی بکات‌و دەستەوکەریی لەگەڵ بکات‌و پەلاماری بداتەوە، ڕاکردن هەڵدەبژێری‌و دەزانێ کە ئەوەیانی سەلامەتترە.

**مانای دووەم :**

هەر کامیان ویستوویەتی، زینا بکات: هەرچی ژنەکەیە بە جەزمیی‌و بە دڵی خۆ لەسەر یەکلاکردنەوەو ساغ کردنەوەوە، بەڵام یوسوف بە خەتەرەی دڵ‌و بە ئارەزوو جووڵانی تەنیا، ئەویش بە هۆی بینینی بەڵگەی پەروەردگاریەوە، ئەو خەتەرەیەشی لە دڵدا لاچووە .

یەکێك لە زانایان کە (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] لێی نەقڵ دەکات، ئەم عیبارەتەی هێناوە، کە بۆ ئەم مانایە جوانی دارشتوە، دەڵێ :

(جَرَى مِنْ يُوسُفَ هَمٌّ، وَكَانَ ذَلِكَ الهَمُّ حَرَكَةَ طَبْعٍ مِنْ غَيْرِ تَصْمِيمٍ للعَقْدِ عَلَى الفِعْلِ ..، وَقَدْ يَخْطُرُ بِقَلْبِ المَرْءِ وَهُوَ صَائِمٌ : شُرْبُ المَاءِ البَارِدِ، وَتَنَاوُلُ الطَّعَامِ اللَّذِيذِ، فَإِذَا لَمْ يَأْكُلْ وَلَمْ يَشْرَبْ، وَلَمْ يُصَمِّمْ عَزْمَهُ عَلَى الأَكْلِ وَالشُّرْبِ، لا يُؤَاخَذُ بِمَا هَجَسَ فِي النَّفْسِ).

واتە: ئەوەی کە بۆ یوسوف هاتۆتە پێش، تەنیا جۆرێك لە جوولانی سروشتیی بووە، بەرەو ئەو کارە خراپە، بەبێ ئەوەی دڵی خۆی لەسەر ساغ بکاتەوە، (ئنجا وێنەیەك دێنێتەوە، دەڵێ) جاری وایە بابای بەڕۆژوو دڵی بۆ ئاوێکی ساردو خۆش دەچێ کە بیخواتەوەو، دڵی بۆ خواردنێکی بە تام دەچێ، وەك دڵ بۆچوون، بەڵام وە نەبێ نیازی وابێ کە ئاوەکە بخواتەوە، یان خواردنەکە بخوات، ئنجا دەڵێ: ئەگەر ئاوەکەی نەخواردەوەو خواردنەکەی نەخواردو دڵی خۆی لەسەر ساغ نەکردەوە، ئەوە بێگومان لەسەر ئەوەی وەك خەتەرە بە دڵیدا هاتوە، هیچ گوناهێکی ناگاتێو لەسەر ئەوە تووشی لێپرسینەوەو سزا نابێ .

لەوبارەوەش دوو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دێنین :

**یەکەم:** {قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : قَالَ اللهُ عَزَّ وجَلَّ: إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِسَيِّئَةٍ فَلاَ تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ، فَإِنْ عَمِلَهَا، فَاكْتُبُوهَا سَيِّئَةً، وإِذَا هَمَّ بِحَسَنَةٍ، فَلَمْ يَعْمَلْهَا، فَاكْتُبُوهَا حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا عَشْرًا}، {رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٣٣٠)، عَنْ أَبي هريرَةَ رضي الله عنه}.

واتە: پێغەمبەرخوا ﷺ فەرموویەتی: خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: هەر کات بەندەی من بەدڵی داهات خراپەیەك بکات، لەسەری مەنووسن، (هەر لەبەر ئەوەی بەدڵی داهاتوە)، ئنجا ئەگەر کردی، خراپەیەکی بۆ بنووسنو، هەر کاتێك چاکەیەکی بەدڵدا هاتو ئەنجامی نەدا، چاکەیەکی بۆ بنووسنو، ئەگەر ئەنجامیدا، دە (١٠) چاکەی بۆ بنووسن .

---

١) الجامع لأحكام القرآن، ج٩، ص١٣٧.

لێرەدا مەبەست لە خراپە بەدڵ داهاتن، ئەوەیە کە ئینسان بڕیاری لەسەر نەدابێ‌و، دڵی لەسەر نەچەسپاندبێ، ئەوەی هەروا هاکەزایی بە دڵی دادێت .

**دووەم**: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إنَّ اللهَ تَجاوَزَ لأُمَّتي عَما حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَها، ما لَمْ تَكَلَّمْ، أَو تعْمَلْ بهِ}، {أَخْرَجَهُ البُخارِيُّ برقم: (٢٥٢٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٢٧)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٣٤٣٥)، وَأَبو داوُدَ برقم: (٢٢٠٩)، والترمِذِيُّ برقم: (١١٨٣)، وَابن ماجَهْ برقم: (٢٠٤٠)، عَنْ أَبي هريرَةَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الجامع) برقم: (٤٤٥٠)}.

واتە: بێگومان خوا چاوپۆشیی لە ئۆممەتی من کردوە، لەوەی کە بە دڵیدا دێت، مادام قسەی پێ نەکردبێ‌و کردەوەی پێ نەکردبێ.

ئەوەی کە بەدڵیدا دێ، واتە: بە دڵی دادێ و پێی ناخۆشە، یان بە دڵی داهاتوە لە کاتی هەڵچوونێك دا، شتێکی بە دڵدا هاتوە، بەڵام دوایی نیەتی خۆی لەسەر ساغ نەکردۆتەوەو نەیکردوە بە بڕیار.

**مانای سێیەم :**

ئەوەیە کە یوسوف هەر خەتەرەشی نەکردوە، چونکە عیبارەتەکە وا دەخوازێ خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ ﴾، ئەوە بەنسبەت ئافرەتەکەوە دیارە، ئەگەر مەبەست لە ﴿ هَمَّتْ بِهِۦ ﴾، ڕاناوەکە لە (بِهِۦ)دا، بچێتەوە بۆسەر زیناو دەست تێکەڵیی، کە هەم بە (ل)و، هەم بە (قد) جەختی لەسەر کراوەتەوە، دیارە کە دڵی خۆی لەسەر ساغ کردۆتەوە، بەڵام لە بارەی یوسوفەوە: ﴿ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ﴾، هەروەها ئەویش ویستی‌و نیازی تێکەڵیی ئافرەتەکەی بوو، ئەگەر بەڵگەی پەروەردگاری نەدیبایە .

ئنجا زانایان گوتوویانە : (لولا: حَرْف امْتِناعٍ لوجُودٍ، وهذا اختيار أبي حيان)، وەك (الشنقيطي) لە (أضواء البيان)[١]دا، هێناویەتی، واتە: (لولا) پیتێکە بەکاردەهێنرێ بۆ نەبوونی شتێك، بەهۆی بوونی شتێکەوە، ﴿وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ﴾:)[٢]، ئەگەر بەڵگەی پەروەردگاری نەبینیبایە، ئەویش نیازی ئەو ئافرەتەی دەبوو.

کەواتە: بە دڵنیاییەوە لەلایەن یوسوفەوە، نیازو مەبەستێك – بۆ زیناکردن– پەیدا نەبووە، بەهۆی هەبوونی بەڵگەی پەروەردگارییەوە، کە ئەو ئیمانو عەقیدەیە، کە لە دڵو دەروونیدا بووە.

ئنجا لێرەدا وەڵامی (لولا) بە پێی هەندێك را: ﴿لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ﴾، (أي: لكان ما كان)، یانی: ئەگەر بەڵگەی پەروەردگاری نەدیبایە، ئەوە دەبوو کە دەبوو.

کەواتە: {لَمْ يَقَعْ مِنْ يُوسُف هَمّ أَصْلاً بناءً عَلَى أَنَّ الهَمّ مُعَلَّقٌ بِأَدَاةِ الإِمْتِنَاع الّتِي هِيَ (لَوْلا) عَلَى انْتِفَاء رُؤية البُرْهان، وَقَدْ رَأَى البُرْهان، فَانْتَفَى المُعَلَّق عَلَيْهِ}[٣]، کەواتە: بە دڵنیاییەوە نیازێك لەلایەن یوسوفەوە نەبووە، چونکە نیاز هەبوونەکە پەیوەست بووە بە نەبوونی بەڵگەی پەروەردگارییەوە، ئنجا کە بەڵگەکە بووەو بینیویەتی، مانای وایە نیازو مەبەستەکە نەبووە .

**مانای چوارەم :**

ئەویش کە زۆر نیزیکە لە مانای یەکەمەوەو (د. محمد راتب النابلسي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناویەتی، ئەویش جوانە، دەڵێ: (هِي هَمَّت بالزِّنا، وَهُوَ هَمّ بالدَّفْعِ) واتە: هەرکەسە (همّ)ەکەی، (نیازو مەبەستەکەی) بە پێی

١) ج ٢، ص ٢١٨.
٢) أضواء البيان للشنقيطي، ج ٢، ص ٢١٨.
٣) سەرچاوەی پێشوو .

خۆی بووە، شتێك بووە كە لەو بوەشێتەوە، ئافرەتەكە مەبەستی چی بووە؟ مەبەستی ئەوە بووە كە لەگەڵ یوسوف دا بە حەرامیی دەست تێكەڵ بكات، ئەدی نیازو مەبەستی یوسوف چی بووە؟ ئەوەی كە بەلایەوە گرنگ بووە، ئەوە بووە كە سەلامەت بێ‌و، ئەو ئافرەتە لە كۆڵ خۆی بكاتەوە، كەواتە: ﴿هَمَّتۡ بِهِۦ﴾، (أي: وَلَقَدْ هَمَّت بالزّنا مَعَهُ)، واتە: ژنەكە ویستی زینای لەگەڵ بكات، ﴿وَهَمَّ بِهَا﴾، (أي: هَمَّ بضَرْبها)، واتە: یوسوف ویستی لێیبدات، یان: لە خۆی دووری بخاتەوە، یان ئازاری بدات، تاكو لە كۆڵی بێتەوە، بەڵام ئەوەشی هەر نەكردوە، چونكە بەڵگەی پەروەردگاری لە عەقڵ‌و دڵی خۆی دا بینی، كە ئەو ئافرەتە هاوسەری ئەو پیاوەیە، كە خاوەنیەتی‌و ئەویش كۆیلەیە لەماڵیان دا، ئێستا ئەگەر لێی بدات‌و سزای بدات، ئەو كاتە قسەی ئەو ئافرەتە سوار دەبێ، لەوانەیە بڵێ: ئەو ویستوویەتی دەستدرێژییم بكاتە سەرو من ملم نەداوە، بۆیە لێی داوم .

كەواتە: ئەم چوار مانایە هەن، وەك گوتم: من مانای یەكەمیانم لە هەموویان زیاتر بە دڵەو، مانای چوارەمیش ڕێی تێدەچێ، دیارە ماناكانی دیكەش هەر گونجاون، بەڵام من مانای یەكەمیانم لە هەموویان زیاتر بە دڵەو بەڵگەكانیشم هێنانەوە .

## تیشك خستنە سەر سێ مەسەلەی گرنگ

١) برهان .

٢) پاكێتی یوسف .

٣) شكاندنی ژمارەی پێوانەیی لە پاكێتیی دا

مەسەلەی یەكەم: ئەو بەڵگە (برهان)ە چی بووە، كە یوسف بینیویەتی، كە دەفەرموێ: ﴿ لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ﴾؟

ئەگەر بەڵگەی پەروەردگاری نەدیبایە، یوسوفیش نیاز (هم)ی دەكرد، لەوبارەوە دوو ڕا هەن، كە من ڕای یەكەمیانم بە دڵە :

١ – ئەویش ئەوەیە كە ئەو بەڵگەیەی پەروەردگاری، بریتی بووە لەو ئیمانو عەقیدەو بەندایەتیی بۆ خواو خواناسییو خواپەرستییەی كە لە نێو عەقڵو دڵیدا هەبووە، یانی: ئیمانەكەی خۆی بینیوە، بە چاوی عەقڵو دڵ، وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ طَـٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ئەوانەی كە پارێز دەكەن، هەر كاتێك وەسوەسەیەك لە شەیتانەوە دەوری دان، یەكسەر دێتەوە بیریان، (واتە: ئیمانەكەیان هۆشیاریان دەكاتەوەو بێداریان دەكاتەوەو دەیانخاتەوە حاڵەتی هۆشداریی) یەكسەر دەبن بە بینەر بۆ فێڵو پیلانی شەیتان، بەلام برایەكانیان، (واتە: برای شەیتانەكان، ئەوانەی كە تەسلیمی ئیرادەی شەیتانەكان بوون)، شەیتانەكان ڕستیان بۆ درێژ دەكەن، لە بێمرادییو لە بێئاگامییو لە سەرگەردانیی داو، هیچ كەمتەرخەمییش ناكەن .

هەڵبەتە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە هەموو کەس زیاتر شایانی ئەوەن کە بەهۆی ئەو ئیمانو تەقوایەوە، کە لە دڵو دەروونیاندا هەیە، زوو بێدارو هۆشیاربنەوەو، شەیتان نەتوانێ کڵاویان لەسەر بنێو فریویان بداتو هەڵیان خەڵەتێنێ، چ شەیتانی مرۆڤ، چ شەیتانی جینن .

کە بێگومان ئەوە مانای ڕێكو ڕاستو بە عەقڵو دڵەوە نووساوە، بۆ وشەی: ﴿ بُرۡهَـٰنَ ﴾، کە دەفەرموێ: ﴿ لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَـٰنَ رَبِّهِۦ ﴾، چونکە: (رؤیة) لە زمانی عەرەبیی دا، دیتنی چاوی (الرؤیة البصریة) هەیەو دیتنی دەروونی (الرؤیة القلبیة)ش هەیە، واتە: بە چاوی عەقڵو دڵ ئەو ئیمانەی خۆی بینیو، ئەو خواناسینو پارێزکارییەی لە دڵی دا بوو، بوو بە مایەی بەرچاوڕوونییو دەربازبوونی .

٢- مانایەکی دیکە: کە من بە لامەوە ڕەتکراوەیە، ئەوەیە کە زۆر لە تەفسیرەکان بە شێوازو ڕیوایەتی جۆراوجۆر هێناویانە، بۆ وێنە: خاوەنی (أضواء البیان)، (محمد أمین الشنقیطي) لە تەفسیرەکەیدا[١]، بیستو چوار (٢٤) ڕیوایەتو حیکایەتی هێناون، کە من پێم سەیرە توێژەرەوانی قورئان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، ئەو حیکایەتانەیان چۆن هێناون! چۆن لە یوسوفیان وەشاندۆتەوە ئەو حیکایەتانەی بۆ بێنن! کە نە ئایەتەکە دەلالەتیان لەسەر دەکاتو، نە هیچ کامێکیان سەنەدێکیان هەیە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺو، هەموویان لە ئیسرائیلیاتەوە وەرگیراون یان بە عەقڵو خەیاڵو وەهمی خۆیان هەڵیان بەستوون، بۆ وێنە:

یەك : یەکێك لەوانە، دەڵێ: بەڵگە (برهان)ەکە ئەوەبووە کە یوسوف دۆخینی کردۆتەوەو دانیشتوە بۆ ئەو ئافرەتە کە خراپەی لەگەڵدا بکات، بەڵام دیوارەکە بۆتە شاشەیەكو وێنەی بابی خۆی بینیوە، کە پەنجەی خۆی گەزیوەو ئاماژەی بۆ کردوە: یوسوف! ئەوە خەریکی چی؟ چۆن شتی وا دەکەی؟!

---

١) ج٢، ص ٢١١ – ٢١٤.

دوو: بەڵكو لە هەندێك حیكایەتی دیكەدا مەسەلەكە زیاتر تۆخ كراوەتەوە، گوایە هەر چەند بابیشی خۆی پێشان داوە، یوسوف هەر وازی نەهێناوە، تاكو جبریل دەستی لە پشت داوەو مستێكی لێداوە، هەرچی ئارەزوو (شهوة) بووە لە بەدەنی دا نەماوە!

كە بێگومان بە پێی ئەو حیكایەتانە بێ، كەرە عەوامێكیش ئەگەر جبریل خۆی پێشان بداتو، بابی خۆی پێشان بدات لە دیواردا، ڕەنگە هەر شێت بێ، نەك هەر ئارەزووی نەمێنێ! بەڵام ئەوان دەڵێن: یوسوف بەو شتانەش هەر نەپرینگاوەتەوە!!

سێ: هەندێك دەڵێن: ئافرەتەكە كە ویستوویەتی ئەو خراپەیەی لەگەڵدا بكات، یوسوفیش كە خۆی بۆ ئامادە كردوە، بتێك لەوێ بووە، ئافرەتەكە چووە پەردەیەكی بەسەردا داوە، یوسوف گوتوویەتی: ئەوە چی دەكەی؟ ئافرەتەكە گوتوویەتی: با ئەو پەرستراوە ئێمە نەبینێ، ئنجا یوسوف گوتوویەتی: ئنجا ئەگەر تۆ بتێك بشاریەوە، ئەدی من خوای پەروەردگار! كە ئاگاداری هەموو شتێكە، چۆن خۆمی لێ بشارمەوە؟!

ئنجا من نامەوێ لەسەر باسكردنی ئەو جۆرە حیكایەتانە بەردەوام بم، پێشم وایە نەدەبوو توێژەرەوانی قورئان ئەو جۆرە حیكایەتانە بێنن، نازانم چۆنو بە چ پاڵنەرێك ئەوانەیان هێناوە، چونكە پیاوێكی وەك یوسوف عليه السلام كە پێغەمبەری خوایە، پێویستیی بەو هەموو شتانە ناكات تاكو واز لە زینا بێنێ، بەڵكو ئیمانو عەقیدەكەی، خواناسییەكەی، پەیوەندیی لەگەڵ خواو بەندایەتییەكەی بۆ خوا، دڵەكەی كە پڕبووە لە تەقوا، بەس بووە بۆ ئەوەی بیپرینگێننەوە، بە بەڵگەی ئەوە كە جگە لە یوسوفیش، كەسانی وابوون كە ئەو جۆرە حاڵانە لێیان ڕوویان داوە، بۆ وێنە:

بەندە وەك لە شوێنی دیكەش دا باسم كردوە، كاتێك لە تافی لاوێتیی دا بووم، چەند جارێك لەو حاڵەتانەم بۆ هاتوونە پێشو، خوای میهرەبانیش پاراستوومی، هەڵبەتە ئازایەتیی خۆم نەبووەو پاراستنی خوای بە بەزەیی بۆتە قەڵغانو پارێزەرم، ئیدی نازانم، ئایا هەندێك

لەوانە کە ئەو جۆرە حیکایەتانەیان هێناون، لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوە، یان هۆکار چی بووە ؟!

گرنگ ئەوەیە شتێکی بێ جێیە ئەو هەموو حیکایەتانە ڕیز بکەن‌و بڵێن: یوسوف بۆیە تووشی ئەو گوناهە نەبوو، چونکە ئاوا بووو ئاوا بووو ئاوا بوو، بەڵام ئەو حیکایەتانە هیچیان پێویست ناکەن، چونکە ئەگەر وابووایە[1]، ئەو کاتە هیچ ئازایەتیی نەدەبوو بۆ یوسوف، خوای کاربەجێ کە هێندە مەدح‌و ستایشی دەکات، ئەگەر دوای ئەوەی ئەو هەموو شتانەی پێشان درابێ، ئنجا وازی لەو گوناهە هێنابێ، چ ئازایەتییەکی یوسوفی تێدایە؟، ئەوە کەی مەدحە؟، لەڕاستیی دا ئەوە زەمم‌و ناشیرین کردنێکی زۆرە بۆ یوسوف!!

خوا لەو زانایانە خۆش بێ، کە ئەو حیکایەتانەیان هێناون، کە هەندێکیان سەنەدەکانیان دەگێڕنەوە بۆ سەر هەندێ لە هاوەڵان، وە هەندێکیان دەگێڕنەوە بۆ لای شوێنکەوتووان (تابعین) بەڵام بێگومان هەر کەسێك بێ، تەنیا قورئان هەقی ڕەهای تێدایەو، لە دوای قورئانیش سوننەتی صەحیحی پێغەمبەر ﷺ، ئەویش ئەوەی لێی دڵنیابین کە پێغەمبەر کردوویەتی، یان فەرموویەتی، یان دانی پێدا ناوە، بەڵام جگە لەو دوو سەرچاوە ڕوون‌و بێ چەندو چوونە، هەر کەسێکی دی هەر قسەیەك بکات، مادام لەگەڵ عەقڵ، یان لەگەڵ واقیع، یان لەگەڵ قورئان‌و سوننەتدا، تێکبگیرێ،ماڵی قەڵبەو سەر بە خاوەنیەتی، ئنجا ئەو خاوەنەی هەر کەسێك بێ، ئەگەر واش نەکەین، ئیسلام لە جیاتی دوو سەرچاوە ڕوونەکەی قورئان‌و سوننەت، پڕ دەبێ لە حیکایەت‌و ئەفسانەو شتی وەهمیی‌و خەیاڵیی .

<u>مەسەلەی دووەم:</u> ئەوەیە کە پاکێتیی یوسوف عليه السلام لە شەش لاوە (من ستة أطراف) دەرخراوە، ئەویش هەموو ئەوانەن کە پەیوەندییان بە

---

[1]) واتە: ئەگەر یوسوف لەبەر خۆپێشاندانی بابی، یان جبریل، یان... هتد، تووشی ئەو گوناهە نەبووابە، هیچ ئازایەتیی نەبوو .

بەسەرهاتی یوسوفەوە هەیە، کە هەموویان بەرائەتی یوسوفیان دەربڕیوە : ئەوانیش :

١) خوای پەروەردگار .

٢) ئیبلیس .

٣) ژنەکەی عەزیزی میسر .

٤) ئافرەتەکانی کە ویستیان گەلەکۆمەکێ لە یوسوف بکەن .

٥) مێردی ژنەکە .

٦) شەشەمیش شایەدەکە، کە خزمی ئافرەتەکە بوو .

با تەماشا بکەین :

١/ خوا ﷻ دەربارەی یوسوف، دوای ئەوەی ڕوونی دەکاتەوە، کە یوسوف تەسلیمی ئیرادەی ئەو ئافرەتە نەبوو، لە سوورەتی (یوسف) ئایەتی (٢٥)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾

واتە: ئاوا بەو شێوەیە ئەو بەلگەیەمان خستەبەر چاوو دڵی، تاکو خراپەو شوورەیی، (یان خراپەو بێ ناموسیی) لە یوسوف دوور بخەینەوە، چونکە بێگومان ئەو لە بەندە هەڵبژاردەکانمان بوو.

جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ﴾، خراپەو شوورەیی، چونکە دەڵێ: (سُوءْ)، هەر شتێکە کە مرۆڤ پێی ناخۆش بێ، (فَحْشَاءَ)یش هەر شتێکە کە مرۆڤ پێی ناشیرین بێو شوورەیی بێو، خەڵك بە بێ ناموسیی‌و بێ ئابڕوویی لە قەڵەمی بدات، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئێمە (سوء) و (فَحْشاء)مان لە یوسوف لادا، واتە: (سوء) و (فَحْشاء) ڕوویان لە یوسوف کرد بوو، نەك یوسوف ڕوو لەوان بکات، ئەوەش بەڵگەیەکی دیکەیە لەسەر ئەوە کە بە دڵنیاییەوە لەلای یوسوفەوە، نیازێکی

خراپ نەبووە، (سوء) و (فَحْشاء)ەکە لەلایەن ژنەکەوە دەستی پێکرد، بەڵام خوا دەفەرموێ: ئێمە لە یوسوفمان لادان، نەك یوسوف ڕوویان تێبکاتو یوسوف لێیان لابدرێ، بەڵکو (سوء) و (فَحشاء) خراپەو شوورەیی، ڕوویان لەو کرد بوو، خواش لایدان لێی .

٢/ لە بارەی ئیبلیسەوە: ئیبلیس لە سووڕەتی (الحجر)دا، دوای ئەوەی کە خوا ﷻ، لەسەر ئەوەی کە کڕنووشی ڕێز گرتنی بۆ ئادەم ﷺ، نەبردوە، نەفرینی لێدەکات، ئیبلیسیش هەڕەشە دەکاتو دەڵێ: ﴿... لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾﴾ واتە: لە زەویدا گوناهانیان بۆ دەڕازێنمەوەو تێکڕایان بێمرادو سەرگەردان دەکەم، جگە لەو بەندانەی تۆ کە هەڵبژاردەن، کە خوێنراویشەتەوە (مُخلِصِين)، واتە: ساغ کەرەوەن بۆ کردەوەکانی خۆیان، بۆ بەندایەتیی بۆ خوا .

کەواتە: یوسوف لە گوناهو تاوان دوور بووە، چونکە ئیبلیس گوتوویەتی: دەستەڵاتم بەسەر بەندە ساغەکانت دا نیە: ﴿إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾﴾، ئنجا خواش یوسوفی بەوە پێناسە کردوە کە لە بەندە ساغەکانیەتی: ﴿لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾.

کە ئەوەش دەربڕینی پاکێتیی یوسوفە، لەلایەن ئیبلیسەوە .

٣/ ژنەکەی عەزیز: وەك لە سووڕەتی (یوسف)دا، دەفەرموێ: ﴿... قَالَتِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ الْآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ أَنَا رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ وَإِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٥١﴾﴾، واتە: ژنەکەی عەزیز گوتی: ئێستا هەق دەرکەوت، زۆر بە ڕوونیی دەرەوشایەوە، من بووم داوای دەست تێکەڵیم لەو کردو ویستم ئەو لە خشتەبەرمو ڕازیبکەمو بیهێنمە سەر ڕای خۆمو لە ڕای خۆی

لایبدەم‌و، ئەو لە ڕاستگۆیانە، واتە: ڕاست دەكات كە هیچ خراپەیەكی لە دەست نەقەوماوەو، هیچ نیازی خراپەی نەبووە .

ئەوەش پاكیی دەربڕینی ئەو ئافرەتەیە بۆ یوسوف .

٤/ ئافرەتەكان ئەو ژنانەی كە ژنەكەی عەزیز كۆی كردنەوە، كاتێك كە سەرزەنشت‌و گلەییان ئاڕاستە كرد، وەك دوایی دەیگەینێ، هەر لە سووڕەتی (یوسف) ئایەتی (٥١)دا: ﴿قُلْنَ حَشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ﴾، واتە: ئافرەتەكان گوتیان: پاكیی بۆ خوا، یان دووریی لە عەیب‌و عار بۆ خوا، حاشا هیچ خراپەیەكمان لەبارەی یوسوفەوە نەزانیوە .

ئەو (مِنْ) كە دەچێتەسەر (سوء)، ﴿مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ﴾، یانی: هیچ جۆرە خراپییەك (نە كەم، نە زۆر)، خراپەمان لە یوسوف نەزانیوە .

٥/ مێردی ژنەكە، واتە: عەزیزی میسڕ، كە دەڵێ : ﴿قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا وَٱسْتَغْفِرِى لِذَنۢبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلْخَاطِـِٔينَ ﴿٢٩﴾﴾، واتە: مێردی ژنەكە گوتی: ئەوە لە پیلان‌و فێڵی ئێوەیە، بێگومان پیلان‌و فێڵی ئێوە مەزنە، یوسوف تۆ واز لەو باسە بێنە، تۆش – ئەی ئافرەت!– داوای لێبوردن بۆ گوناهەكەت بكە، {واتە: داوای لێبوردن لە مێردەكەت بكە}، بێگومان تۆ لە تاوانبارانی .

٦/ لایەنی شەشەم، شایەدەكە، وەك لە سووڕەتی (یوسف)دا هاتووە: ﴿... وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾﴾، واتە: شایەدێك لە نیزیكانی ئافرەتەكە شایەدیی دا، ئەگەر كراسەكەی لە پێشەوە دادڕابێ، ئەوە ژنەكە ڕاست دەكات‌و

یوسوف لە درۆکەرانە، بەڵام ئەگەر کراسەکەی لە پشتەوە دادڕابێ، ئەوا ئافرەتەکە درۆ دەکات‌و، یوسوف لە ڕاستگۆیانە .

دوایش سەیردەکەن کراسەکەی لە پشتەوە دادڕاوە .

کەواتە: ئەو شەش لایە هەموویان شایەدیی دەدەن بۆ پاکێتی یوسوف عليه السلام.

مەسەلەی سێیەم: کە گوتمان تیشکی دەخەینەسەر، پێش ئەوەی ئەم بڕگەیە بەجێ بهێڵین، ئەوەیە کە پاکێتیی یوسوف ژمارەی پێوانەیی شکاندوە، لەبەر دە (١٠) هۆکار، کە (د. محمد راتب النابلسي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، ئەو تێبینییە وردانەی هێناون :

١ ـ لەبەر ئەوەی خۆشویستنی ئافرەت‌و جووڵانی غەریزەی جینسیی لە پیاودا، بەرەو ئافرەت، شتێکی زۆر بەهێزە، بەڵام یوسوف ملی نەداوە بۆ ئەو پاڵنەرە بەهێزەی کە لە بوونیدا هەبووە .

٢ ـ یوسوف لەو کاتەدا لە تافی لاوێتیی‌و لە هەرەتی گەنجێتیی دا بووە، کە لەو کاتەشدا غەریزەی جینسیی بەهێزترە لە مرۆڤ دا .

٣ ـ یوسوف گەنجێکی زگورتیی‌و بێ هاوسەر بووە، کە دیارە ئەگەر مرۆڤ هاوسەری هەبێ، ئارەزوی جینسیی خۆی لەگەڵی دادەمرکێنێ‌و خۆی لێ تێردەکات، بەڵام ئەگەر بێ هاوسەربێ، مانای وایە زیاتر پێویستیی بە خۆ کۆنترۆڵ کردن هەیە .

٤ ـ یوسوف لەو شوێنە غەریب بووە، واتە: لە شوێنێك بووە کە کەس‌و کاری خۆی لەوێ نەبووە، لەو شوێنانەش عەیبە کەمتر لە مرۆڤ دیارەو گوناهکردن ئاسانتر دەبێ، وەك ئەوەی لە نێو خزم‌و کەسی خۆی دابێ، کە عەیبەی زیاتر لێ دەزانرێ .

٥ ـ ئەو ژنەش، ژنێکی جوان‌و خاوەن پێگەو پایەبووە .

٦ ـ ئەو ژنە بۆخۆی داوای لە یوسوف کردوە، واتە: ژنەکە یوسوفی هەڵپێچاوە .

---

١) تفسير النابلسي ج ٤، ص ٥٠٥.

٧ـ یوسوف کۆیلەی ئەو ژنە بووەو لەبەر دەستی ویدا بووە .

٨ـ ئافرەتەکە ماڵەکەی چۆڵ کردوە لەو کاتەداو، دەرگاکانیشی هەموو داخستوون، بۆ ئەوەی یوسوفو خۆیشی دڵنیابن، کە کەس بەسەریاندا ناچێ .

٩ـ مێردەکەشی زۆر نەرمو، کەم غیرەت بووە، بە پێی هەڵوێستەکەی دوایی، کە دوایی باسیشی دەکەین، چونکە هەموو قسەکەی بۆ ژنەکەی ئەوەیە کە دەڵێ: تۆ خەتاباری! بە یوسوفیش دەڵێ: ئەی یوسوف! باسی مەکە ! .

١٠ـ ئەو ژنەی عەزیز، هاوکاریی لە ژنەکانی دیکەش داوا کردوەو، داوای لێکردوون کە ئەوانیش هاوکاری بن .

٣) - ﴿ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە (ئەو بەڵگەیەمان خستە بەرچاوی عەقڵو دڵی)، تاکو خراپەو شوورەیی، خراپەو بێ ئابڕوویی، لە یوسوف دووربخەینەوە، کە ئەو ڕووی لەو خراپەو بێ ئابڕووییە نەبووە، بەڵکو خراپەو بێ ئابڕوویی بە مل ئەو داهاتوە، لە لایەن ئافرەتەکەوە .

٤) - بڕگەی چوارەمو کۆتایی: ﴿ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴾ بێگومان ئەو لە بەندە هەڵبژاردەکانمان بوو، لەو بەندانەمان بوو کە هەڵمان بژاردبوونو گوڵ بژێرمان کردبوون، ئەوە خوێندنەوەیەکی.

بە جۆرێکی دیکەش خوێندراوەتەوە: (إِنَّهُ مِنْ عِبادِنا الـمُخْلِصِين)، بێگومان ئەو لە بەندە خۆ ساغ کەرەوەکانمان بوو، لەو بەندانەمان بوو کە بەندایەتیی خۆیان بۆ خوا ساغ کردبۆوە، کردەوەو تاعەتی خۆیان بۆ خوا ساغ کردبۆوەو بەشی غەیری خوایان پێوە نەهێشتبوو .

هەڵبەتە ئەمە ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە ئەوە یاسایەکی گشتی خوایە ﷻ، کە هەر کەسێك (مُخْلِصْ) بێو (مخلَص) بێ، هەرکەسێ بەندایەتیی خۆی بۆ خوا ساغ کردبێتەوەو، خوا ساغی کردبێتەوە، خراپەو

شوورەیی لێ لادەدرێ، گوناهو تاوانی لێ لادەدرێ، بە ئەندازەی ئەوە کە مرۆڤ ئیمانو تەقوا لە دڵو دەروونی دا هەیە، خوای پەروەردگار خراپەو تاوانو بێ ئابڕوویی‌و، ئەو شتانەی کە دەبنە مایەی عەیبداریی‌و گوناهباریی، لێی لادەداتو دووریان دەخاتەوە .

خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ‌و، ئەو سیفەتەمان زیاتر تێدا بەهێزو تۆخ بکات .

**مەسەلەی سێیەم** : هەر کام لە ژنەکەی عەزیزی میسرو، یوسوف دوای ئەو تێکگیرانە، بەرەو دەرگا ڕادەکەن‌و پێشبڕکە دەکەن، سەرەنجام ژنەکە کراسی یوسوف لە پشتەوە دادەدڕێ‌و، دەگەنە مێردی ژنەکە لەلای دەرگا، ژنەکەش دەستبەجێ یوسوف تۆمەتبار دەکات، کە نیازی خراپەی لەگەڵی هەبووە، داواش دەکات کە یوسوف زیندانیی بکرێ، یان سزایەکی بە ئێش بدرێ، یوسوفیش بەرگریی لە خۆی دەکات: کە ژنەکە ویستوویەتی پەلکێشی بکاتو لە خشتەی بەرێ‌و توشی دەست تێکەڵیی حەڕامی بکات :

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَٱسْتَبَقَا ٱلْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٍ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِۚ قَالَتْ مَا جَزَآءُ مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٥﴾ ﴾.

**تـوێـژینـەوەی ئـەم ئایـەتـە بەپێـزە لـە پێـنـج بڕگـەدا :**

**١) –** ﴿ وَٱسْتَبَقَا ٱلْبَابَ ﴾، ئنجا بەرەو دەرگاکە پێشبڕکەیان کرد .

وشەی (البابَ)، لێرەدا کە (منصوب) بووە، لە دوو حاڵەت بەدەر نیە:

یەکەم: یان وەك زانایانی شارەزای زمانی عەرەبی دەڵێن: (بنزع الخافض)، واتە: دەبووایە (مجرور) بێ، بەم شێوەیە: (واستبقا إلى البابِ)، بەڵام کە ئەو (إلى)ی کە (باب)، (مجرور) دەکات لایان بردوە، (الباب)، بۆتە (مفعول به)و (منصوب) بووە، ئەگەرنا لە بنەڕەتدا ئاوا بووە: (واستبق إلى البابِ)، بەرەو دەرگاکە پێشبڕکەیان کرد، وەك ئەو ڕستە قورئانییەی کە لە سوورەتی (الأعراف)، ئایەتی (١٥٥)دا، هاتوە: ﴿ وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَا... ﴾، یانی: (وَاخْتَارَ موسَى مِن قَومِهِ)، ئەویش هەر بە (نزع الخافض) (منصوب) بووە.

دووەم: ئەوەیە کە (على تضمين استبقا معنى ابتدَرَا)، (استبقا)، مانای (فعل)ی (ابتدرا)ی خراوەتە نێوو نێواخنی کراوە، (ابتدرا)، واتە: هەرکامێکیان ویستی زوو بیگاتێ (بگاتە دەرگایەکە).

هەڵبەتە ژنەکەی عەزیزی میسر کە داوای دەست تێکەڵیی لە یوسوف کردوە، یوسوف ﷺیش، کە بەرەو دەرگاکە ڕایان کردوە، وەك پێشبڕکە بکەن هەر کامێکیان بۆ مەبەستێك بووە: یوسوف بۆ هەڵاتن لە چنگی ژنەکەو خۆ دەربازکردن لەو داوا ناڕەوایەی کە لێی کردوە، لەو دەورە هەڵاتنەی[١] ئەو ژنە، ژنەکەش بۆ ڕێ لێگرتنی یوسوف، کە نەهێڵێ دەرگایەکە بکاتەوەو، بچێتە دەرێ‌و، لە چنگی ڕزگاری بێ، دیارە ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەیە، لەسەر ئەوەی کە: وشەی (هم) کە لە ئایەتێکی پێشتردا هاتوە: ﴿ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا ﴾، کە پێشتر شیمان کردەوە، دەگونجێ دوو مانای جیاوازی هەبن، چونکە (استبقا)، واتە: پێشبڕکەیان کرد:

أ- یوسوف ڕای کردو پێشبڕکەی کرد، بۆ ئەوەی لە چنگی ژنەکە هەڵێ.

ب- بەڵام ژنەکە پێشبڕکەی کرد، بۆ ئەوەی نەهێڵێ یوسوف هەڵێ.

١) دەورە هەڵاتن : دەوروخول دان، لێ خەفتان، هەوڵ لەگەڵدان.

کەواتە: (استبقا)، بۆ هەردووکیان بەکارهاتووەو، بۆ هەرکامێکیان واتایەکی هەیە، کە لەگەڵی بگونجێ، ڕستەی: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا ﴾یش، بە هەمان شێوە: ئافرەتەکە ویستی پەلاماری بداتو لێی بدات، یوسوفیش ویستی ئەگەر بەڵگەی پەروەردگاری نەبینیبایە، بەرگریی لە خۆی بکاتو دووری بخاتەوە لە خۆیو ئازاری بدات.

٢) - ﴿ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٍ ﴾، ئافرەتەکە کراسەکەی یوسوفی لە پشتەوە دادڕی، قلیشاندی، (القَدُّ: القَطْعُ طُولاً)، (قَدّ): لە زمانی عەرەبی دا، بە بڕین بە باری درێژییدا دەگوترێ، (وَالقَطّ: القَطْعُ عَرْضَاً)، (قطّ)یش بڕینە بە باری پانیی دا، هەڵبەتە دەبێ کراس دادڕینەکەی ژنەکە، کە کراسەکەی یوسوفی دادڕیوە، پێشتر بووبێ، پێش ڕاکردنەکە، بەڵام لە باسکردندا دواخراوە، ئەگەرنا پێشێ کە تێکگیراونو ئافرەتەکە داوای لە یوسوف کردوە، ئەو داوا ناڕەوایە، ئنجا کە یوسوف پشتی تێکردوە، ئەو ئافرەتە پڕی داوەتێو دای هاتۆتێو کراسەکەی دادڕیوە، بۆ ئەوەی بەلای خۆی دا ڕای کێشێو نەهێڵێ دەربازبێ، ئنجا یوسوف بە کراس دڕاویی ڕای کردوە، هەڵبەتە جاری وا هەیە شتێك لە پێش شتێکدا دەقەومێ، بەڵام لە باسکردن دا دوادەخرێ .

٣) - ﴿ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلْبَابِ ﴾، تووشی گەورەی ژنەکە بوون، لەلای دەرگا، واتە: مێردەکەی .

(الإِلفاء: وجْدَان شَيء عَلَى حَالة خاصَّةٍ مِنْ غَيْرِ سَعيٍ لِوجْدَانه، فَالأَكْثَرُ أَنْ يَكونَ مُفَاجئاً)، وشەی (ألفا، يُلْفي، إلفاءً)، بریتیە لە بینینی شتێك لەسەر حاڵەتێکی تایبەت، ئەویش ئەوەیە کە هەوڵی نەدابێ کە ئەو شتە پەیدا بکاتو ئەو شتەی بێتە پێش، واتە: کتو پڕ ئەو شتەی بۆ پەیدابێ، یان بێتە پێشی، ئەوانیش چاوەڕێ نەبوون کە مێردی ژنەکە لەبەر دەرگا بێ، لە نیزیك دەرگابێ، بەڵام کە ئەوان بەرەو دەرگاکە ڕایان کردوە بە پێشبڕکە، لەوێ لووتو بزووت، کتو پڕ، تووشی مێردی ژنەکە بوون.

هەڵبەتە خوا ﷻ، ئەو مەبەستەی زۆر بە كورتییو پوختیی فەرمووەو، هەندێ شت كە بە فیكرو سەلیقە دەزانرێن، فرتاندوونی، ئەگەرنا بێگومان: یوسوف یەك بە یەك دەرگاكانی كردوونەوە، چونكە وەك پێشتر گوتمان: ﴿ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ ﴾، ژنەكە دەرگاكانی مەحكەم گاڵەدان، مەحكەم دایخستن، كەواتە: یوسوف دەرگا دەرگا كردوونیەوەو، ژنەكەش بە دوایدا چووە، هەتا دەرگای دەرەوە، ئنجا لە دەرگای دەری دەرێ، تووشی گەورەكەیان بوون، ئەگەرنا چۆن مێردی ژنەكە دەرگایەكان دەكاتەوە لە دیوی دەرێڕا، كە دیوی ژووریوە داخراون ؟

كەواتە: مەبەست لە (الباب) كۆتا دەرگایەو لەوانەیە مێردی ئەو ژنە ماوەیەكیش لەبەر دەرگا وەستابێ، تاكو یوسوف گەیشتبێتێو دەرگاكەی كردبێتەوە .

٤) – ﴿ قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، ژنەكە گوتی: سزای كەسێك چییە كە نیازی خراپی لەگەڵ هاوسەری تۆدا بووە، جگە لەوەی زیندانیی بكرێ، یان سزایەكی بە ئازار بدرێ .

سەیری مەكرو حیلەی ئەو ژنە بكەن! بەبێ ڕاوەستان، بەبێ زار تێكەڵ بوون، ڕاستەوخۆ یوسوف تۆمەتبار دەكاتو، دوو جۆرە سزاشی بۆ پێشنیار دەكات، ڕاستەوخۆ تۆمەتباری دەكاتو دەڵێ: ئەو ویستوویەتی خراپەم لەگەڵ دا بكات، سزایەكەشی بۆ دیاریی دەكات بە دوو جۆر: یان زیندانی كردن، یان ئەشكەنجەدان! ئنجا ئایا دەبێ زیندانیی كردنی ئەو كاتە چۆن بوو بێ! ئێستا دوای ئەو هەموو ڕێكخراوانەی مافی مرۆڤو، ئەو هەموو بانگەشە كردنە بۆ مافو ئازادیی مرۆڤەكانو، كەرامەتو ڕێزی مرۆڤەكان، ئنجا ئەمریكا لە (گوانتانامۆ) چی لە زیندانەكانی قاعیدە كرد، ئەوانەی كە لە ئەفغانستان گرتبوونی، هەروەها ئەوانەی (أبو غريب)و، ئەوەی كە لە زیندانەكانی دیكەی ئەمریكا لە (عێراق): (بووكا)، (كرووپەر)، – كە بەندەش دەوری دوو ساڵم تێدا بەسەر برد - بۆ نموونە: كابرایەكم بینی گوتی: هەموو ددانەكانیان شكاندووم، یەكێكی دیم بینی گوتی: نینۆكەكانی دەستو پێمیان

هەموو دەرهێناوم، ئێمەش تاڕاددەیەك ئەشكەنجە دراین، وەك لە كتێبی: (ئەشكەنجەو زیندان)دا باسم كردوە، شتی دیكەی زۆر خراپتریش هەبوو، بەسەر خەڵكیان هێنابوو، كاتی خۆی ڕۆژنامەكان باسیان كردبوو .

ئێستاش چی دەگوزەرێ لە زیندانەكانی (میسر)دا، لە زیندانەكانی (سووریا)دا، كاتی خۆی لە زیندانەكانی ڕژێمی بەعس دا، ئێستاش لە زیندانەكانی (عێراق)و (ئێران)دا، لە هی ئەملا، لە هی ئەولا، لە هی زۆربەی وڵاتاندا، بە داخەوە ئەشكەنجەدانی مرۆڤەكانو، بێڕیزیی پێكردنیان زۆر زۆرە[1] .

ئنجا كە ئەو ژنە پێشنیاز دەكات بۆ سزادانی یوسوف: یان زیندانیی بكرێ، كە هەر خوا دەزانێ زیندانی ئەو كاتە چۆن بووە!! یان ئەشكەنجە بدرێ، كە مێژوو دەڵێ: جۆرێك لە ئەشكەنجەكانیان ئەوە بووە، هەندێ لە ئەندامەكانی مرۆڤیان بڕیوە، دەستیان بڕیوە، چاویان دەرهێناوە، پێیان بڕیوە، ئەندامی دیكەیان بڕیوە !

ئنجا ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەش كە خۆشەویستیی ئەو ژنە، كە خۆشەویستی بۆ یوسوف دەربڕیوە، خۆشەویستییەكی جەستەیی ڕووت بووەو تەنیا خۆشەویستییەكی سێكسیی بووە، ئەگەرنا هەوڵی وردو خاش كردنی خۆشەویستەكەی خۆی نەدەدا، بەڵكو لە ڕاستییدا وەك خۆشەویستیی مرۆڤ بووە بۆ خواردن، یان خۆشەویستیی دڕندەیەك بووە بۆ نێچیرێك، كە دەیەوێ بیگرێو بیخوات! خۆشەویستیی ئەو ژنە بۆ یوسوف لەو شێوەیە بووە، خۆشەویستییەكی مەعنەوییو ڕووحیی نەبووە، بە پێچەوانەی ئەوەی كە زۆر لە حیكاتخوانو چیرۆك هەڵچنەكان، شتی سەیر هەڵدەبەستن: ئەو ژنە بۆ یوسوف هەر سووتابوو!! نەخێر بەڵكو هەر خۆشەویستییەكی جەستەیی ڕووت بووە، ویستوویەتی ئارەزووی خۆی بە یوسوف دامركێنێو هیچی دیكە ئنجا كە چنگی نەكەوتوە، ویستوویەتی لەبەینی بەرێو وردو خاشی بكات .

---

[1] ) هەروەها لە هەرێمیی كوردستانیش دا، لە ژێر حوكمی هەردووك لایەنی: پارتیو یەكیەتیی دا ئەشكەنجەدانو، بگرە سووكایەتیی پێكردنی زۆر خراپو دڕندانە، هەبووەو ئێستاش كەمو زۆر بەردەوامە.

هەڵبەتە هەرجۆرە پەیوەندییەکی پیاوو ئافرەت، کە تەنیا پەیوەندیی بە جەستەوە بێ، بەو شێوەیە، بۆیە خوا ﷻ، لە سووڕەتی (الروم)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: لە نیشانەکانی پەروەردگاریێتیی خوا، ئەوەیە کە لە خۆتان، (واتە: لە جۆری خۆتان، لە هاوسروشتی خۆتان)، هاوسەرەکانتانی بۆ دروست کردوون، (کە هەمان جۆرە جەستەو هەمان جۆرە سروشتو ڕووحیان هەیە)، بۆ ئەوەی کە بە هۆیانەوە ئارامییتان بۆ بێ، (پیاو بەهۆی ژنەوە ئارامیی بۆ دێو، ژنیش بە هۆی پیاوەوە)، ﴿ وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴾، هەروەها خۆشەویستییو بەزەیی لەنێوتان دا داناوە.

{ئا ئەوە بناغەی ژنو مێردایەتییو پێکگەیشتنی نێرو مێیە، بەشێوەی حەلاڵ، لە قاڵبی ژنو مێردایەتیی دا، کە تاکە قاڵبێکی ڕەوایە ژنو پیاو بە یەك بگەن، بە نیکاحێکی ڕاست، بە گرێبەستێکی ڕوونو بە مەبەستی ئەوە کە ببنە هاوسەری یەکدی}

دوایی خوا دەفەرمووێ: لەوەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك کە بیربکەنەوە.

ئنجا کە ژنەکە بەو شێوەیە یوسوف تۆمەتبار دەکاتو سزاشی بۆ پێشنیار دەکات، یوسوفیش وەڵامی خۆی دەداتەوە:

٥) - ﴿ قَالَ هِىَ رَٰوَدَتْنِى عَن نَّفْسِى ﴾، گوتی: ئەو ویستی من لە قەناعەتی خۆم کە پاکێتییە، لابدات بەرەو قەناعەتی خۆی، کە دەست تێکەڵ کردنی حەڕامو زیناو داوێن پیسییە، ئەو ویستی من لە خشتە بەرێ، ئەو لە دەوری من هەڵات، ئەو دەورو خولی منی دا، وشەی: ﴿ رَٰوَدَتْنِى ﴾، ئەو مانایانە هەموویان دەگرێتەوە .

لێرەشدا ئەوە دەردەکەوێ کە یوسوف ﷺ بە ناچاریی ئەو قسەیەی کردوە، وەك خوا لە سووڕەتی (النساء)، ئایەتی (١٤٨)دا دەفەرمووێ: ﴿ لَّا

يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴾، واتە: خوا حەز ناكات قسەی خراپ بە ئاشكرا بكرێ، مەگەر لەلایەن كەسێكەوە كە ستەمی لێكرابێ .

وەك كاتی خۆی لە بەرگی سێی ئەم تەفسیرەدا: (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)، ئەو ئایەتەمان لە تەفسیری سوورەتی (النساء)دا جوان شیكردۆتەوە، واتە: كەسێك كە ستەمی لێبكرێ، دەبێ باسی ستەمەكەی خۆی بكات، با قسەكەی ناشیرینیش بێ، ئەگەر لێیانداوە، ئەگەر تێیان هەڵداوە، ئەگەرماڵیان خواردوە، ئەگەر هەرجۆرە دەستدرێژییەكیان كردۆتە سەر، بۆی هەیە باسی ئەو ستەمە بكات، كە لێی كراوەو، بۆشی هەیە زەمو غەیبەتی ئەو كەسە بكات، كە ستەمەكەی لێكردوە، چۆنە ئاوای پێناسە بكاتو وەسفی بكات .

ئنجا دیارە یوسوف ﷺ بە ڕەوای نەزانیوە بەرانبەر بەو ستەمە، بێدەنگ بێ، چونكە بە دڵنیاییەوە بێدەنگ بوون لە بەرانبەر ستەمی ستەمكاراندا، هەر بۆ خۆی یارمەتییدانو هاوكاریی كردنی ستەمكارەكانە، كە لەسەر ستەمەكەی خۆیان بەردەوام بنو زیاتر شوولی لێ هەڵكێشن .

**مەسەلەی چوارەم :** شایەدیی دانی پیاوێك لە خزمانی ژنەكە، وەك ناوبژیوان ( حكم ) كە: ئەگەر كراسەكەی یوسوف لە پێشەوە قڵیشابێ، ژنەكە ڕاست دەكاتو یوسوف لە درۆكارانە، بەڵام ئەگەر كراسەكەی لە پشتەوە دادڕابێ، ژنەكە درۆ دەكاتو یوسوف لە ڕاستگۆیانە :

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ... وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە سێ بڕگەدا :

١) - ﴿ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ ﴾، ئنجا شایەدێك شایەدیی دا لـە نیزیکـانی ئـافرەتـەکـە .

ئـایا ئـەو شایـەدە کـە شایـەدیی دانـەکـەی بـۆتـە جـۆرێك لـە دادوەریی، کـێ بـووە ؟!

لـەوبـارەوە دوو ڕا هـەن :

ڕای یـەکـەم: هـەندێك لـە تـوێـژەرەوانی قورئـان گوتـوویـانـە: منداڵـێك بـووە لـە بێشکـەدا بـووە، قسەی کـردوە، لـەوبـارەوەش هـەندێك شـوێنـەوار دێتـەوە کـە یـەکێك لـەو سێ کـەسە، یـان یـەکێك لـەو چـوار کـەسە کـە لـە لانکـەدا قسـەیـان کـردوە، ئـەو منداڵـە بـووە، کـە شایـەدیی داوە لـەسـەر پاکێتیـی یوسـوف .

ڕای دووەم: ئـەوەیـە کـە پیاوێکی خزمـی ژنـەکـە بـووە .

ئنجـا مـن دوای ئـەوەی زۆر سـەرنجی تـەفسیـرەکـانم داوە، گەیشـتوومە ئـەو ئەنجامە کـە : هیچ بـەڵگـەیـەك نیـە لـەسـەر ئـەوە کـە ئـەو شایـەدە منداڵـێکی نێو لانکـە بووبێ، ئـەو شـوێنـەوارانـەش کـە لـەوبـارەوە هـاتـوون، سـەنـەدەکـەیـان بـەهێز نیـە، کـەواتـە : ڕای دووەم ڕاستـە کـە پیاوێکی خزمی ژنـەکـە بـووە .

شـایـانی بـاسـە کـە لـە (پەیمـانی کـۆن)دا، بـاسی ئـەو بـابـەتی شایـەدیی دانـە نـەکـراوەو ڕاستـەوخـۆ گـوتـراوە: (فوطیفار)، واتـە: عەزیـزی میسـر، بـەرپرسـی پاسـەوانـەکـانی فیـرعەون، بـە زاراوەی تـەوڕاتو، بـە زاراوەی قورئـان: (عەزیـزی میسـر)، ڕاستـەوخـۆ بڕیـاری بـەنـد کـردنی یوسـوفی داوە، وەك لـە (التفسیر التطبیقي للکتاب المقدس، العهد القدیم، سفر التکوین، الإصحاح ٣٩، ص١٠٢)دا، لـە ژێر نـاوونیشـانی: (یوسف یقاوم زوجة فوطیفار)دا، بـاسی ئـەوەی کـردوە کـە فۆتیفـار ڕاستـەوخـۆ بڕیـار دەدات یوسـوف زینـدانیی بکـرێ، کـە بێگومـان ئـەوەی کـە لـە قورئـاندا هاتـوە ڕاستـەو ئـەو شایـەدە شایـەدیی داوە، بـەڵام دیـارە ئـەوەش کـە لـە کتێبـەکـانی خـاوەن کتێبـان دا هـەیـە، لـە هێڵـە گشتییـەکـان دا لـەگـەڵ قورئـاندا تێك دەکـاتـەوەو، هـەندێ شتیش کـە لـەواندا ون

کراوە، قورئان باسی کردۆتەوە، وەك لە سوورەتی (النمل)دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾

النمل، واتە: بێگومان ئەم قورئانە زۆربەی ئەوە کە بەنوئیسرائیل تێیدا کەوتوونە ڕاجیایییەوە، ڕوونی دەکاتەوە (ئەوەی کە بە پێویستی بزانێ) .

ئنجا باسی چۆنیەتی شایەدیی دانی شایەدەکە دەکات :

٢) - ﴿ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾ (گوتی:) ئەگەر کراسەکەی لە پێشەوە دادڕابێ‌و قڵیشابێ، ژنەکە ڕاست دەکات‌و یوسوف لە درۆکارانە .

یانی: ئەگەر لە پێشەوە کراسەکەی دادڕابێ‌و قڵیشابێ، دیارە یوسوف ڕووی لەو ژنە کردوە، ئامبازی بووە، ئەو ژنەش یوسوفی لە خۆی دوورخستۆتەوە، لە ئەنجامدا بۆتە تێك نووسان‌و چنگە پرچەیان‌و کراسەکەی یوسوف بە هۆی توند پاڵپێوەنانی ژنەکەوە، لە پێشەوەڕا دڕاوە، بۆیە دەڵێ : ئەگەر لە پێشەوە دادڕابێ .

٣) - ﴿ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾، بەڵام ئەگەر کراسەکەی لە پشتەوە دادڕابێ‌و قڵیشابێ، ئەوە ژنەکە درۆ دەکات‌و، ئەو (یوسوف) لە ڕاستگۆیانە .

واتە: ئەگەر لە پشتەوە کراسەکەی دادڕابێ، دیارە یوسوف لە چنگ ژنەکە ڕایکردوەو، ژنەکەش ئامبازی بووەو ویستوویەتی پەلکێشی بکات‌و تووشی ئەو تاوانەی بکات، یوسوفیش لە چنگی ڕای کردوەو ئافرەتەکە شوێنی کەوتووەو، لە پشتەوە داهاتۆتە کراسەکەی‌و دایقڵیشاندووەو دڕاندوویەتی، ئنجا دوایی دەبێ یوسوف ڕای کردبێ، واتە: کە پشتی تێی کردوە، ئافرەتەکە داهاتۆتە یوسوف بۆ ئەوەی ڕای کێشێ بەرەو لای خۆی، یوسوفیش دواتر ڕای کردوە، کەواتە: مەنتیق‌و واقیع زۆر پشتگیریی ڕاستیی شایەدیی ئەو شایەدە دەکەن، کە لە خزمانی ئافرەتەکەشە، دیارە عەزیزی میسر لەوبارەوە ڕاوێژی کردووەو واپێدەچێ ئەو کەسە یەکێك بووبێ،

لەوانەی کە زۆر متمانە پێکراو باوەڕ پێکراوی بووبێ، پیاوێکی عاقڵو تێگەیشتوو دنیا دیدە بووە، وا دیارە نەشیزانیوە ڕووداوەکە چۆن بووە! چونکە دەڵێ: ئەگەر کراسەکەی لە پێشەوە دادڕابێ، ئەوە ژنە کە ڕاست دەکاتو، ئەگەر لە دواوەش دادڕابێ، ئەوە یوسوف ڕاست دەکات، دیارە پێشێ نەیزانیوە، چی بووەو چۆن بووە، بەڵام بیستوویەتی کە گوتوویانە: کراسی یوسوف دڕاوە، ئەویش بەو جۆرە دادوەریی کردوە .

**مەسەلەی پێنجەم :** کاتێک مێردی ژنەکە، ( عەزیزی میسڕ، فۆتیفار، وەك لە تەوڕاتدا هاتوە )، کراسەکەی یوسوف دەبینێ، کە لە پشترا دادڕاوە، بە ژنەکەی دەڵێ: ئەوە فێڵی ئێوەیە، فێڵی ئێوەش مەزنە :

وەك خـــوا فەرموویـــــەتی : ﴿ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ﴿٢٨﴾ ﴾، کاتێك مێردی ژنەکە، کراسەکەی یوسوفی بینی کە لە پشتەوە دا قڵیشاوەو دادڕاوە، ڕاستەوخۆ ڕووی لە ژنەکەی کردو گوتی: ئەوە لە فێڵو پیلانی ئێوەیە، بێگومان فێڵو پیلانی ئێوە مەزنە.

پێشتریش پێناسەی (کید)مان کردوە، دەڵێ: (الكيد: الإحتيال على إيقاع السوء بخفاءٍ، ويقوم به من لا يقوى على المواجهة، وكيد المرأة عظيم بسبب شعورها بالضعف)، (کید): بریتییە لە فێڵ کردنو بارلێدیتنەوە بە پەنهانیی، بە شێوەیەك کە خراپە تووشی بەرانبەر بکرێ، بە زۆریی کەسانێك بە فێڵ هەڵدەستن کە تواناو هێزی ڕوبەڕووبوونەوەیان نیە، بۆیەش فێڵی ئافرەت مەزنە، چونکە هەست بە بێهێزیی دەکات، لە بەرانبەر پیاودا، بۆیە پەنا دەباتە بەر فێڵو پیلانو پەنهانکاریی .

ئنجا کە دەڵێ : ﴿ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّ ﴾، دەگونجێ مەبەستی هەر ژنەکەی بێ بە تەنیا، یانی: فێڵەکەت هێندە گەورەیە، وەك فێڵی کۆمەڵە ژنێکە .

یان : ﴿ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّ ﴾، واتە: ئەی حورمێ! ئەی ژن! ئەی ئافرەت! ئێوەی ئافرەتان ئاوا فێڵو پیلانی مەزنتان هەیە لە بەرانبەر پیاواندا .

# كورتە باسێك لە بارەی حوكم كردنەوە بە نیشانان (قرائن)

تـوێژەرەوانی قورئـان زۆر هەڵوەستـەیـان كـردوە لـە بەرانبـەر ئـەوەدا، كاتێـك ئـەو شـایـەدە شـایـەدیی دەدات: ئـەگـەر كراسـەكـەی لـە پێشـەوە دڕابـێ، ئـەوە حوكمەكەیـەتیو، ئەگـەر لـە دواوەش دڕابـێ، ئـەوە حوكمەكەیـەتی، بـە هۆی نیشانـەكەوە حوكمـەكە دەگۆڕێ، (إبن الفرس)، وەك (جمال الدین القاسمي) لە (محاسن تأویل)ەكەی خۆیـدا[1]، لێیـەوە هێنـاوە دەڵـێ: (قال ابن الفرس: هذا دلیل على العمل بالقرائن)، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە كار بە نیشانەكان دەكرێ، بۆ حوكمو بڕیـاردان.

هەروەهـا گوتوویـەتی: (یَحْتَجُّ بالآیة من یرى الحكم بالأمارات والعلامات فیما لا تَحْضُرهُ البیِّنات)، واتـە: كەسێك ئەم ئایەتە بە بەڵگە دێنێتـەوە، كە ڕای وایـە: ڕەوایە بە پێی نیشانـەكانو لەبەر ڕۆشنایی ئەو هەلو مەرجانـەدا كە ئەو شتـەیان تێدا ئەنجام دراوە، مادام بەڵگەی ڕوونو ئاشكرا نەبێ، بڕیار بدرێ .

(القرطبي)یش لە تـەفسیرەكەی دا[2] دەڵێ : {وَلَیْسَ هَذَا بمُناقضٍ لِقَوْلِهِ ﷺ: الْبَیِّنَة عَلَى مَنِ ادَّعَى، وَالْیَمِینُ عَلَى مَنْ أَنْكر، وَالبَیِّنَة إِنَّما هِيَ البَیان وَدَرَجات البیان تَخْتَلِف بعَلامَةٍ تَارَة، وبأمارَةٍ تَارَةً أخْرَى، وبشاهدٍ أیْضاً، وبشاهِدَین، ثم بأَرْبعٍ)} .

---

١) محاسن التأویل، ج ٦، ص ٢١٦.

٢) الجامع لأحكام القرآن ج ٣، ص ٥٠، ٥١.

واتە: (ئەوە کە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کار بە نیشانانیش دەکرێ، لە کاتێکدا بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا نەبێ)، ئەمە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ، تێکناگیرێ کە دەفەرمووێ : {الْبَيِّنَة عَلَى مَنِ ادَّعَى، وَالْيَمِينُ عَلَى مَنْ أَنْكَر} {أَخْرَجَهُ البَيْهَقِيُّ برقم: (٢٠٩٩٢)، وَصَحَّحَهُ الأَلبانِي في (إرواء الغليل)}.

واتە: بەڵگە هێنانەوەی ڕوون و ئاشکرا لەسەر داواکەرەو، سوێند خواردنیش لەسەر کەسێکە کە نکووڵیی بکات، دوای ئەوەی کە داواکار بەڵگەی نابێ سوێند دەدرێ بە داوا لەسەر کراوو سوێند دەخوات و تۆمەتەکە ڕەت دەکاتەوە .

چونکە (البَيِّنة)، (بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا)، بریتیە لە ڕوونکردنەوەی ئەوە کە ئەو کارە بووە، ڕوونکردنەوەی ئەو شتانەش کە ڕوودەدەن، پلە پلەیە جاری وایە بە نیشانە دەزانرێ و، جاری وایە بە شوێنەوار دەزانرێ و، جاری وایە ئەو بەڵگەیە بریتیە لە شایەدێك، جاری واش بریتیە لە دوو شایەد، جاری واش بریتیە لە چوار شایەد .

کەواتە: کە دەڵێ: (البَيِّنة عَلَى مَنِ ادَّعَى)، (البَيِّنة)، واتە: بەڵگەی ڕوون و مەرج نیە تەنیا دوو شایەدبن، ئنجا بێگومان ئەوە قسەیەکی زۆر جوانە، چونکە ئێستا زانایانی هاوچەرخ لێیان کۆڵیوەتەوە، کە ئەو ئامرازانەی ئێستا پەیدابوون بۆ سەلماندنی تاوان، یان سەلماندنی پاکیی کەسێك، ئنجا: وێنەی ڤیدیۆییە، کامێرای شاراوەیە، دەنگە، پەنجەمۆرە، بەڵکو پشکنین (فحص)ی (dni)یە، یان جۆری خوێنە، ئەوانە هەموویان ئێستا لە دوو شایەدیش بەهێزترن، کەواتە: پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا (البَيِّنة)، ئەو کاتە توانیویانە دوو شایەدن بێنن، چواران بێنن، بەلام بە دڵنیاییەوە پێغەمبەر ﷺ، تەنیا مەبەستی دوو شایەدەکان نەبووە، ئەگەر ئێستا شتێك لە دوو شایەدان بەهێزتر بێ، باشترە، چونکە دەگونجێ کەسێك دوو شایەدان بەکرێ بگرێ، پارەیان بداتێ و شایەدیی بەدرۆ لەسەر کەسێك بدەن، بەلام پشکنینی خوێن، یان پەنجە مۆر، یان بە کامێرای شاراوە کە وێنەی دەگیرێ، یان دەنگ کە تۆمار دەکرێ، یان خەت، هەموو ئەوانەی کە ئێستا هەن و، بەکاریش دێن بۆ سەلماندنی تاوانی تاوانباران، ئەوانە هەموویان دەچنە نێو چەمك و واتای بازنەی: وشەی (البَيِّنة)ەوە .

**مەسەلەی شەشەم :** ئـامۆژگـاریی کـردنی عەزیـزی میسـرٍ بـۆ یوسـوف ﷺ، کـە بـەرد لـەسـەر ئـەو بـابـەتـە دابـنـێو بـاسـی نـەکـاتو، فـەرمـانـکـردنـی بـە ژنـەکـەی کـە داوای لـێبـوردن بکـات، چونکـە تاوانـبـارە :

وەك خـوا فـەرمـوویـەتی: ﴿ يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا ۚ وَاسْتَغْفِرِي لِذَنبِكِ ۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِئِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

**تـوێـژیـنـەوەی ئـەم دوو ئایـەتـە لە سێ بڕگـەدا :**

١) - ﴿ يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا ﴾، واتـە: عەزیـزی میسرٍ گوتی: ئـەی یوسـوف! واز لەو بـاسـە بێـنـە، باسی مەگـەو دیزە بـە دەرخـۆنـەی لـێبکـەو، بێدەنگـەی لـێبکـە .

٢) - ﴿ وَاسْتَغْفِرِي لِذَنبِكِ ﴾، ئـنجـا ڕوو دەکـاتـە ژنـەکـەیو دەڵـێ: تـۆش داوای لێبـوردن بـۆ گونـاهـەکـەت بکـە، داوای لێبـوردن لـە کێ بکـات؟ بێگومـان داوای لێبـوردن لـە مێردەکـەی بکـات، چونکـە بـاس نـەکـراوە بڵێ: (أستغفر الله)، دیـارە ئـەوان خـوایـان نـەپـەرسـتـوەو بتپـەرسـت بـوون، کـەواتـە: مـەبـەسـت ئـەوە بـووە: داوای لێبوردن لـە من بکـە، تـۆ بـەرانبـەر مـن کـەمتـەرخـەم بـووی، بـەڵام بـۆ یوسـوف ﷺ بـەس دەڵـێ: بـاسی مـەکـە، چونکـە ئـەو هیچـی نـەکـردوە، تاکـو داوای لـێبـوردن بکـات، یـان خـەتای بـە ملدا بکـەوێ، ئـەوە لـە لایـەك، لـەلایـەکی دیکـەوە: یوسـوف ﷺ تۆمـەتبـار کـراوەو سـتـەمی لێکـراوەو کـراسـی دڕێـنـراوەو ویسـتوویـەتی ڕابکـات، ئنجا تۆمـەتباریش دەکرێ، کـە ئـەو ژنـە زینـدانیـی کـردن، یـان ئـەشکـەنجـەدانی بـۆ پێشنیـار دەکـات ! وەك ئـەوەی کـە ئـەو یوسـوفـە مرۆڤـ نـەبێو خـاوەنی هیـچ مـافێـك بـێ !.

٣) - ﴿ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِئِينَ ﴾، بـە ژنـەکـەی دەڵـێ: بێگومـان تـۆ لـە تاوانـبـاران بـووی .

شارەزایانی زمان گوتوویانە : ﴿ٱلْخَاطِـِٔينَ﴾، (الخاطيء: فاعل الخطيئة وهي الجريمة،)، (الخاطيء)، كە بە (الخاطِئِين)، یان (الخاطِؤن) کۆدەکرێتەوە، بریتیە لە ئەنجامدەری (خطيئة)، کە بریتیە لە تاوان و گوناهێکی بە ئانقەست، ئنجا دەڵێ: (وَجَعْلُها فِي زُمْرَةِ الَّذِين خطئوا، تخفيفٌ فِي مُؤاخذتها، وَصِيغة الجمع المذكر السالم، تغليب للذكور على الإناث)، کە دەڵێ: ﴿إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلْخَاطِـِٔينَ﴾، واتە: خەڵکی دیکەش وەك تۆ تاوانی کردوە، ئەوە جۆرێکە لە سووککردنی سزادانی بۆی، بۆیەش بە (الجمع المزكر السالم)، هێناویەتی، {نەیگوتوە: (إِنَّكِ كُنْتِ مِنَ الخاطِئات)} چونکە: لە زمانی عەرەبییدا کاتێك نێرو مێ پێکەوە هاتن، لە کردارو راناوەکانیان، نێرینەکانیان زاڵ دەکرێن بەسەر مێینەکاندا، دیارە تاوانبارو خەتاباریش لە پیاوانیش هەن و لە ژنانیش هەن .

ئنجا لە کۆتایی ئەو هەڵوێستەی ئەو کابرایەدا دەڵێم :

لە ڕاستییدا بێغیرەتیی پیاوانە، ژنان بێ شەرم و ئابڕوو دەکات، ئەو ژنەی عەزیزی میسر لە پیاوەکەی ڕابینیوە کە ئاوا نەرمە پیاوەو، بەو شێوەیە کەم غیرەتە، ئەگەر نەڵێین بێغیرەت بووەو ناجوامێرو تەپە پیاو بووە، بۆیە بەو شێوەیە داوای لە غوڵامەکەی خۆی کە یوسوفە ﷺ کردوە، بە حەرامیی دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکات، ئەوە هیچ گومانی تێدا نیە کە عەزیزی میسر پیاوێکی ناجوامێرو بێغیرەت بووە ! کۆمەڵگایەکیش کە بتپەرست بێ و ئیمان و عەقیدەیەکی ڕاست و دروستی تێدا نەبێ و، بەندایەتیی تێدا بۆ خوا ئەنجام نەدرێ و، شەریعەتی خوای تێدا پیادە نەکرێ، هەرواي لێ چاوەڕێ دەکرێ، ئنجا ئەوە هەر تایبەتیش نەبووە بە میسری ئەو کاتەوە، بەڵکو میسری ئێستاو هەموو وڵاتانی دیکەی ئێستاو، هەر کۆمەڵگایەکیش کە پەیوەندییەکی ڕاست و دروستی بەندایەتییان لەگەڵ خوادا نەبێ و، پابەندنەبن بە شەریعەتی خواوەو، خەڵکەکەش لەسەر ئیمان و عەقیدەو، لەسەر ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامەتیی پەروەردە نەکرێ، بە نێرو مێ وە، بە وردو درشتەوە، پیاوان هەر ئاوا کەم غیرەت دەبن و، ئافرەتانیش بێ ئابڕوو دەبن.

ئنجا ئەو حاڵەتو دیاردەیە کە خوای کاربەجێ لەم سوورەتەدا باسی دەکات، ئەو هەڵوێستە نەرمو نیانو ناجوامێرانەیەی ئەو پیاوە، بەرانبەر بە ژنەکەی، کە بۆی دەرکەوتوە: ویستوویەتی دەستدرێژیی بکاتە سەر غوڵامەکەیو، غوڵامەکەی بخاتە سەرخۆیو داوێنپیسی لەگەڵدا بکات، کەچی هەر ئەوەندەی پێدەڵێ: تۆ گوناهباریو داوای لێبووردنم لێ بکەو بڕۆ بەخێرهاتی! ئنجا هەر پێکەوەشیان دەهێڵێتەوە لەو ماڵەدا !!

ئا ئەوە لە هەر کاتو شوێنو کۆمەڵگایەکدا بێ، نیشانەی بێ غیرەتییو ناجوامێریی پیاوانە! بۆیەش وادەڵێم، چونکە لە هەندێ لە تەفسیرەکاندا هاتوە، گوتوویانە : ئنجا ئایا عەزیز چی دیکەی کردبایە؟!

دەڵێین: هەر بەلای کەمەوە: دەیتوانی لە یەکیان جیا بکاتەوە، یان دەیتوانی بە جۆرێك سزای ژنەکەی بدات، یان دەستخۆشییەك لە یوسوف بکات کە تۆ دەستت خۆشبێو چاکت کرد، کە خیانەتت لێ نەکردم نەك تەنیا بڵێ: بێدەنگیی لێبکەو تەواو !

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پێنجەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە شەش (٦) ئایەت پێکدێ، ئایەتەكانی: (٣٠ تا ٣٥)، لەو شەش ئایەتەدا خوا ﷻ باسی مەكرو فێڵی كۆمەڵە ژنێكی نیزیك لە ژنەكەی عەزیزی میسر دەكات، كە ڕەخنەیان لێی گرتوە، بەهۆی خۆشویستنی كۆیلەكەیەوەو دەورو خول هەلاتنیو، داوای دەست تێكەڵیی لێكردنی، ئەویش بۆ سەلماندنی ڕاستیی هەڵوێستەكەی خۆی، كۆڕێكیان بۆ ساز دەكات، كە لەسەر كورسییان دابنیشن، یان باڵنجیان بۆ دادەنێ پاڵی وێ بدەن، پاڵبدەنەوە، چەقۆو میوەشیان بۆ دادەنێو چەقۆشیان دەداتە دەست، دیارە دەبێ میوەكە پێویستی بە قاشكردن یان سپی كردن بووبێ بە چەقۆ .

ئنجا لەو كاتەشدا بە یوسوف دەڵێ: لە ژوورەكەی خۆت وەرە دەرێو بچۆ با بتبینن، ئیدی كە یوسوف دەبینن، زۆر سەرسام دەبنو دەستو پەلی خۆیان بە چەقۆیەكان دەبڕنو دەڵێن: پاكیی بۆ خوا ئەوە مرۆڤ نیە، یان: نامە خوا ئەوە مرۆڤ نیە، بەڵكو ئەوە فریشتەیە .

ژنەكەش دەڵێ: ئا ئەوە ئەو كەسە بوو كە لەسەر خۆشویستنی وی، لۆمەی منتان دەكرد، كە من ویستم پەلكێشی بكەم، بەلام ملی نەدا، ئنجا ئەگەر فەرمانم جێبەجێ نەكات، زیندانیی دەكرێو لە زەبوونان دەبێ، یوسوفیش لە خوا دەپاڕێتەوە : كە لە فێڵی ئەو ژنانە لای بدات، یان فێڵی ئەو ژنانەی لێ لابداتو دەڵێ: خوایە! زیندانم لەلا خۆشترە لەوەی كە ئەوان داوای دەكەن، ئیدی خواش بەدەنگیەوە دێو لە پیلانی ئەوان دەربازی دەكاتو، فێڵی وانی لێ لادەدات، كەچی پاش ئەوەی نیشانانیش دەبینن، لەسەر پاكییو ڕاستیی یوسوف، بەلام هەر زیندانییشی دەكەن، بۆ ماوەیەكی دیارینەكراو .

﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً وَآتَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَا إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ الصَّاغِرِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ الْجَاهِلِينَ ﴿٣٣﴾ فَاسْتَجَابَ لَهُ رَبُّهُ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّن بَعْدِ مَا رَأَوُا الْآيَاتِ لَيَسْجُنُنَّهُ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٣٥﴾﴾.

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

{ئنجا ژنانێك لە شاردا گوتیان: ژنەکەی عەزیز (ی میسر)، دەوری غولامەکەی خۆی هەڵدێ، (هەوڵی پەلکێش کردنی دەدا بۆ زینا)، یوسوف دڵی لێوان لێو کردوە لە خۆشەویستیی، بە دڵنیاییەوە ئێمە لە سەرگەردانییەکی ڕووندا دەیبینین ﴿٣٠﴾ ئنجا کاتێك گوێبیستی فێڵ (و توانجو پیلان)ەکەیان بوو، بە دوایدا ناردن‌و باڵنج (و شوێنی پاڵدانەوەو شان دادان)ی بۆ دانان، هەرکامێکیشیان چەقۆیەکیشی وێدان (بۆ قاش کردن‌و سپی کردنی میوە)و، پێی گوت: (بە یوسوفی گوت)، بچۆ دەرێ بۆ لایان، ئیدی هەر کە بینییان، بە گەورەیان دانا (و پێی سەرسام بوون)و دەستی خۆیانیان بڕی‌و، گوتیان: پاکیی بۆ خوا، ئەوە مرۆڤ نیە، ئەوە تەنیا فریشتەیەکی بەڕێزە ﴿٣١﴾ ژنەکە گوتی: ئا ئەوە بوو کە لەسەر (شەیدا بوونی من بۆ) وی سەرزەنشتتان کردووم‌و، بە دڵنیایی من لە دەوری هەڵاتووم (کە لە ڕای خۆی لای بدەم‌و بیهێنمە سەر ڕای خۆم، بۆ دەست تێکەڵیی)، بەڵام ئەو بە سەختیی خۆی گرت‌و ملی نەدا، ئنجا ئەگەر ئەوەی فەرمانی پێ دەکەم بیکات، نەیکات، مسۆگەر زیندانیی دەکرێ‌و، بە دڵنیاییەوە لە زەبوونان دەبێ، ﴿٣٢﴾ (یوسوف) گوتی: پەروەردگارم! زیندانم لەوەی بۆی بانگم دەکەن، پێ خۆشترە‌و، ئەگەر پیلانی وانم لێ لانەدەی، بەلایاندا پەلکێش دەبم‌و لە نەفامان دەبم ﴿٣٣﴾ پەروەردگاری بەدەنگیەوە هات‌و، پیلانی وانی لێ لادا، بێگومان ئەو بیسەری زانایە ﴿٣٤﴾ ئنجا دوای ئەوەی کە نیشانەکانیان دیتن (لەسەر پاکیی‌و ڕاستیی یوسوف) بۆیان دەرکەوت کە (پێویستە بۆ هێنانەدی ئامانجەکەی خۆیان) تا ماوەیەك زیندانیی بکەن ﴿٣٥﴾} .

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(شَغَفَهَا حُبًّا ) : (أي أَصَاب شِغَافَ قَلْبِهَا، أَي: بَاطِنَهُ وَقِيلَ" وَسَطَهُ)، ئافرەتەكان دەڵێن: ژنەكەی عەزیز، ﴿ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦ ۖ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا ﴾، دەورو خولی غوڵامەكەی خۆی هەڵدێ و، داوای دەست تێكەڵیی لێ دەكات و، یوسوف دڵی وی پڕ كردوە، لێوان لێو كردوە لە خۆشەویستیی، چونكە: (شغاف)، واتە: دیوی پەنهانی دڵ، هەندێكیشیان دەڵێن: یانی: نێوەڕاستی دڵ، هەندێكیش گوتوویانە: (شغاف)، ئەو پێستە تەنكەیە كە بەسەر دڵەوەیە، ئەو توێژاڵە تەنكەی بەسەر دڵەوەیە، واتە: خۆشەویستییەكەی گەیشتۆتە وێ .

(سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ ) : یانی: فێڵەكەی وانی بیست، ئنجا وەك دوایی باسی دەكەین، (سَمِعَ) بۆ خۆی تەعەددا دەكات بۆ (مَفْعُول)، دەگوترێ: (سَمِعْتُ قَوْلَهُ)، بەڵام لێرەدا كە بە (ب) تەعەددای كردوە:

١ – یان مانای دیكەی خراوەتە نێو .

٢ – یان بۆ زیاتر تەئكید كردنەوەیە .

(المَكر: صَرْفُ الغَيْرِ عَمَّا يَقْصِدُهُ بحِيلَة)، (مكر): بریتییە لەوەی بەرانبەرەكەت لابدەی، لەوەی مەبەستیەتی، بە هۆی فێڵێكی پەنهانەوە، واتە: هەڵیخەڵەتێنی و لە خشتەی بەری.

ئنجا ئایا لێرەدا، بۆچی دەڵێ: (سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ )، لە كاتێك دا ئەوان بەس غەیبەتیان كردوەو توانج و پلاریان تێگرتوە؟ لەبەر ئەوەی كە مەبەستیان لەو باسكردن و توانج و پلارو سەر زەنشتە، فێڵێك بووە، كە بریتییە لەوەی (یوسف)یان پێشانبدا، بۆ ئیسپاتی ئەوە كە هەقیەتی، ئەوەندە هۆگری یوسوف بێت و، ئەوەندە لە دەورو خولی هەڵبێ !

(وَأَعۡتَدَتۡ ): (أَعْتَدَت)، لە ڕیشەدا (أَعْدَدَت)ە، لەوەوە هاتووە، (الإعْدَادُ: مِنَ العَدِّ كالإسْقَاءِ مِنَ السَّقِي، أَعْدَدَتْ أَي: هَيَّئَت)، واتە: بۆی ئامادە كردن، دەڵێ: (إعداد)، لە (عَدّ)ەوە، هاتوە، (عَدّ)، یانی: ژماردن، شتێك بۆ كەسێك بژمێری، وەك (إسقاء)، لە (سَقِي)یەوە، هاتوە، (سَقِي)، یانی: ئاو خواردنەوە، (إسقاء)، واتە: ئاو پێ خواردنەوە .

(مُتَّكَـٔٗا ) : (مَحَلّ الإتِّكَاءِ، وَالإتِّكَاءُ: جِلْسَةٌ قَرِيبَةٌ مِنَ الإضطجَاعِ عَلَى الجَنْب مَعَ انتصابٍ قَلِيلٍ فِي النصفِ الأَعْلَى)، (متكئاً)، یانی شوێنی پاڵ دانەوە، شوێنی شان دادان، دەڵێ: (إتكاء)، كە بە كوردیی دەڵێین: پاڵ دانەوە، یاخود شان دادان جۆرێكە لە دانیشتن، نیزیكە لە ڕاكشان لەسەر تەنیشت، بەڵام نیوەی دووەمی جەستە ڕاست دەبێتەوە، لاق ڕادەكێشی كە دیارە كورسیی و قەنەفە دانیشتنەكەیان بەو شێوەیە نەبووە، ئەگەرنا لەسەر كورسیی و قەنەفە پاڵدانەوە، بریتی نیە لە دانیشتنێكی نیزیك لە ڕاكشان (إضطجاع)، بەڵام كاتی خۆی باڵنج و شتیان داناوەو، شانیان وێ داوە، شانیان داداوەتە سەری .

(أَكۡبَرۡنَهُۥ) : (أَكبَرْتُ الشيءَ: رَأَيْتُهُ كَبِيراً)، (أَكۡبَرۡنَهُۥ)، واتە: (یوسوف)یان بە مەزن و بە گەورە هاتە بەرچاو، یانی: ڕەوشت و ئاكارو شێوەو دیمەنییان، بە گەورەو مەزن هاتۆتە بەرچاو.

(حَٰشَ لِلَّهِ ): دەڵێ: (تركِيب عَرَبِيٌّ يُرَادُ بِهِ إبْطَالُ شَيءٍ عَنْ شَيءٍ وَبَرَاءَتُهُ)، یانی: (حَاشَ للهِ عَنْ أَن يَعْجِزَ عَنْ خَلْق مِثْلِهِ)، كوردەوارییش هەر بەكاری دەهێنن: (حاشا ئەو شتە وابێ)، واتە: ئەو شتە دوورە لەوە، دەڵێ: ئەمە وشەیەكی عەرەبییە، مەبەست پێی پووچەڵكردنەوەی شتێكە لە شتێكداو، پاكیی دەربڕینی شتێكە لە شتێك، یان كەسێك لە شتێك .

ئنجا كە لێرەدا دەڵێ: (حَٰشَ لِلَّهِ )، واتە: پاكیی و دووریی بۆ خوا، كە نەتوانێ مرۆڤی وەك یوسف جوان و ڕێك و پێك دروست بكات، یاخود پاكیی بۆ خوا، كە ئا ئەو پیاوە بەو هەموو كەماڵ و جەماڵەیەوە، خراپەی لێ بوەشێتەوە.

(فَٱسْتَعْصَمَ): (عَصَمَ نَفْسَهُ)، واتە: خۆی پاراست، (فَٱسْتَعْصَمَ)، واتە: ملی نەداو خۆی گرت، ئنجا ئەمە وەك (مَسَكَ)، واتە: گرتی، (إسْتَمْسَكَ)، واتە: چاكو توند گرتی، (أَجابَ)، واتە: وەڵامی دایەوە، (إسْتَجابَ)، واتە: چاك وەڵامی دایەوە، (جَمَعَ)، واتە: كۆی كردەوە، (إسْتَجْمَعَ)، واتە: زۆر كۆی كۆكردەوە، ئەوانە هەموویان بۆ زێدەڕۆیی كردنن، لە ماناكەیاندا .

(ٱلصَّٰغِرِينَ): (الصاغر: الذَّلِيل)، واتە: زەبوونو ملكەچ .

(أَصْبُ إِلَيْهِنَّ): (أَصْبُ: أَمِلْ)، (الصَّبو: الميلُ للمحبوب)، (صبو)، بریتیە لە مەیل كردن، ئارەزووكردنی شتێك كە ئینسان خۆشی بوێ.

(ٱلْجَٰهِلِينَ): كۆی (جاهِل)ە، (جاهل)یش لێرەدا، مەبەست پێی پێچەوانەی (حليم)ە، هێدیو مەند، بەڵام (جاهِلْ)، پێچەوانەكەیەتی، واتە: ئەوەی زوو بە دەم شتەوە بچێو هەڵفریوێنرێ، (فالجَهْلُ هُنا مُقابِلُ الحِلْمِ)، لێرەدا (جَهْل) پێچەوانەو بەرانبەری (حِلْم)ە، (حِلْم)، واتە: هێدیو مەندیی، خۆ گرتن، بەڵام (جهل)، واتە: زوو بەدەم شتەوە چوونو، زوو هەڵچوونو، لە خشتە چوون .

## مانای گشتی ئایەتەكان

ئەم شەش ئایەتە، ئاڵقەی چوارەمی بەسەرهاتی یوسوف پێك دێنن، خوا ﷻ لەو شەش ئایەتەدا باسی ڕووداوی سەر زەنشت كردنی كۆمەڵێك ژن، بۆ ژنی عەزیز دەكات، كە دیارە دەبێ ئەو كۆمەڵە ژنە، ژنانی پیاوانی ناوداری میسڕ، بووبن، ئەوانەی كە ئاگاداری هەستو خوستی نێو كۆشكی حوكمڕانییو ماڵو حاڵی بەرپرسانن، دەبێ لەوانە بووبنو ئافرەتانی ئاسایی نەبوون .

﴿ وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ ﴾، ژنانێك لە شارەكەدا گوتیان: وا دیارە بۆتە دەنگو باسو بۆتە قاو لە نێو شاردا، كە ئەو هەواڵەی یوسوفو ژنەكەی عەزیز، دەبێ بڵاوبووبێتەوە، ﴿ وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ ﴾، ژنانێك لە شاردا گوتیان: ژنەكەی عەزیز، دەوری غوڵامەكەی خۆی هەڵدێ، واتە: داوای دەست تێكەڵیی لێ دەكات، داوای لێ دەكات هەوڵی لەگەڵ دەدا، لە قەناعەتی خۆی لایبدات بیهێنێتە سەر قەناعەتی خۆی، كە قەناعەتی غوڵامەكەی، كە (یوسوف)ە، بریتیە لە پاكێتییو قەناعەتی ژنەكەش بریتیە لە دەست تێكەڵیی بە حەڕامیی، دەیەوێ یوسوف لە قەناعەتی خۆی، لە بڕوای خۆی لابداتو بیهێنێتە سەر بڕوای خۆیو، لە خشتەی بەرێ، ﴿ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا ﴾، یوسوف دڵی ئەوی پڕ كردوە، دڵی وی لێوان لێو كردوە لە خۆشەویستیی، لە هۆگریی، {هەڵبەتە خۆشەویستییەكی جەستەیی، وەك پێشتر باسمان كرد} .

﴿ إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾، بێگومان ئێمە لە سەرگەردانییو لە بەهەڵەداچوونێكی ڕوونو ئاشكرادا دەیبینین، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست لە (ضَلَالٍ)، بە واتا ئیسلامییەكەیو واتا ئایینیەكەی نیە، چونكە پێوەری ئەوان،

تەرازووی ئەوان، بۆ کەسێك کە ئایا ڕێی ڕاستی گرتوە، یان ڕێی هەڵەی گرتوە؟ پێوەرێکی دنیایی بووە، واتە: ئێمە دەیبینین کە بەهەڵەداچووە، نەك لە مامەڵە لەگەڵ خوادا، بەڵکو لە مامەڵە لەگەڵ غوڵامەکەی خۆیدا، کە چۆن دەبێ ئافرەتێکی وا خانەدانو هاوسەری پیاوێکی گەورە، کە بریتیە لە والی میسر، چۆن دەبێ داوای دەست تێکەڵیی لە غوڵامەکەی خۆی بکاتو، تەماع لە کۆیلەکەی خۆی بکاتو لە دەوری کۆیلەکەی خۆی هەڵ بێو، بیەوێ قەناعەتی پێبێنێو ئەوەی کە دەیەوێ بۆی جێبەجێ بکات؟ ئاوا لە نێو شاردا بۆتە قاوو دەنگو دۆڵ .

بەڵام بێگومان {لە نێو شاردا}، واتە: لە نێو ژنانێك دا کە ئاگاداری ئەو هەستو خوستانەن، نەك ژنانو ئافرەتانی سادەی فەقیر، کە زۆرجار ئاگایان لە هیچ شتێك نیە، بەڵکو ئەوانەی کە ئاگاداری حاڵو باڵی ئەو ئافرەتانەن، کە هاو وێنەو هاو کوفی خۆیانن، واتە: ژنە بەرپرسو حوکمڕانەکان .

﴿ فَلَمَّا سَمِعَتۡ بِمَكۡرِهِنَّ ﴾، کاتێك ژنەکەی عەزیز ئەو مەکرو فێڵەی ئەوانی بیست، هەڵبەتە قسەکەی ئەوان بریتی بووە لە باسی پاشە ملەو توانجو پلار تێگرتنو سەرزەنشت کردن، بەڵام بۆیە ناوی لێناوە: (مکر)، چونکە ئامانجیان لەو قسانە: فێڵ کردن بووە لە ژنەکەی عەزیزی میسر، ئەویش ئەوەیە کە هانی بدەنو واداری بکەنو ناچاری بکەن، کە (یوسوف)یان پێشان بدات .

ئنجا ئەو ژنەش بۆیە ملی داوە بۆ نەخشەکەی ئەوان، تاکو بەرگریی بکات لە هەڵوێستەکەی خۆی، کە بریتیە لە عاشق بوونی یوسوف، کە: من نا حەقم نیە ئاوا شێتو شەیدای بووم! ها تەماشای بکەن .

ئنجا کاتێ فێڵەکەی ئەوانی بیست: ﴿ أَرۡسَلَتۡ إِلَيۡهِنَّ ﴾، بە دوای دا ناردن، دەعوەتی کردن، ﴿ وَأَعۡتَدَتۡ لَهُنَّ مُتَّكَـٔٗا ﴾، شوێنی پاڵ دانەوەو شوێنی شان دادانی بۆ ئامادە کردن، ئنجا ئایا کورسیو قەنەفە بوون، یان باڵنج بوون ! بۆی داناون بۆ ئەوەی شانی وێ بدەنو پاڵ بدەنەوە، ﴿ وَءَاتَتۡ كُلَّ وَٰحِدَةٖ مِّنۡهُنَّ سِكِّينٗا ﴾، ئنجا هەر کامێکیشیان چەقۆیەکی پێدان، هەڵبەتە چەقۆی ڕووت نا، چونکە دەزانین هیچ

کەس چەقۆیان دابەش ناکات بەسەر میواناندا! هەتا شتێکیان لە پێش دانەنێ کە پێویستیی بە چەقۆ هەیە .

ئنجا تەماشای نهێنیی ڕەوانبێژیی قورئان بکەن! هەموو کەس دەزانێ کە چەقۆ بۆ قاش کردن‌و سپی کردنی میوە پێویستە، خوا ﷻ یەکسەر دەفەرموێ: چەقۆی بەسەردا دابەش کردن‌و، هەر کامێکیان سەرو چەقۆی وێ دان، چونکە بە عەقڵ دەزانرێ کە چەقۆ بۆ چییە؟ بۆ قاش کردن‌و سپی کردنی میوەیە، بۆ ئەوەی میوەکەی پێ بخۆن، ئنجا ئایا مۆز بووە، خەیار بووە، خۆخ بووە، هەنار بووە؟ بە دڵنیایی شتێ بووە پێویستیی بە چەقۆ بووە، کە سپی بکرێ، یاخود قاش بکرێ، ئیدی ئەوەی کە بە عەقڵ پەی پێ دەبردرێ‌و بە سەلیقە دەزانرێ، خوای پەروەردگار باسی ناکات، بۆ ئەوەی ئەو فەرمایشتە، وشەکانی کەم بن‌و ماناکانی زۆر بن، ﴿ وَقَالَتِ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ﴾، ئنجا گوتی: وەدەرکەوە بۆ لایان .

لێرەدا وشەی: (اخْرُجْ)، مانای (أدخل)ی پێ (تضمین) کراوە، یانی: خراوەتە نێوی، بەم شێوەیە: (أخرُج مِنْ غُرْفَتِك وَادْخُل عَلَيْهِنَّ)، ئەگەرنا (خَرَجَ عَلَيْهِ)، (خَرَج)، بە (عَلَى)، تەعەددا ناکات، بەڵکو(خَرَجَ) بە (إلى) تەعەددا دەکات‌و دەبێتە: (خَرَجَ إِلَيْهِ)، بەڵام (أخرُج عليهن) یانی: (أخرُج مِنْ غُرْفَتِك، وَادْخُل عَلَيْهِنَّ)، واتە: (اخْرُجْ)، لێرەدا وشەیەکە دوو واتایان دەگەیەنێ، یەکێکیان بە ڕواڵەتی بێژەکەی، ئەوی دیکەش بەهۆی ئەو پیتەوە کە تەعەددای پێ کردووەو (مَفْعُول)ی پێ خواستووە، کە ئەگەر وشەیەك عادەت نەبێ بە پیتێك تەعەددا بکات، تەعەددای پێ بکات، مانای وایە : هەم مانای ئەسڵییەکەی خۆی هەیە، هەم مانای وشەیەکی دیکەشی هەیە، بەهۆی ئەو پیتەوە کە بەرکار (مفعول)ی پێ دەخوازێ، گوتی: لە ژوورەکەی خۆت بچۆ دەرێ‌و بچۆ بۆ لایان .

﴿ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ ﴾، بە (ف)ی (تَعْقِيب)، واتە: یەکسەر کە بینییان، بە گەورەیان گرت، پێیان گەورە بوو، یانی: سیفەتەکانی، جوانییەکەی، شەرم‌و شکۆیەکەی‌و، کەسایەتییە ڕووحیی‌و مەعنەوییەکەیان پێ گەورە بوو، چونکە وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین :

زۆرجار تـوێژەرەوانی قورئـان، کـە لـە حیکایـەت بێژەکـان وەریدەگـرن، بـە شێوەیەك وێنای یوسوف علیه السلام دەکەن، کە زیاتر شێوەی ئافرەتانی کردبێ، لە جوانییدا، کە لە ڕاستیی دا ئەوە وانیە، ئەها لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ ﴾، هەر کە دیتییان بە گەورەیان گرت! ئنجا ئەوەی کە ئافرەتان سەرسام دەکات لە پیاواندا، جیایە لەوەی کە پیاوان سەرسام دەکات لە ئافرەتان دا، ئەگەر پیاوان بە نەرمو ناسکیی‌و بە دەم‌و چاوو چاوو برۆو، قەدو قیافەو سەرو قژو پرچی ئافرەتان، سەرسام دەبن، ئافرەتان بە شتێکی دیکە لە پیاواندا سەرسام دەبن، کە بریتیە لە عیززەت‌و جوامێریی‌و شەرم‌و شکۆو شەخسیەتی بە هێزو، ڕێزو حورمەت‌و خۆ گرتن، دیارە وێڕای شکڵ‌و دیمەنی جوانیش، بەڵام نەك شکڵ‌و دیمەن جوانییەك بشوبهێتە هی ئافرەتانەوە، وەك لە لای حیکایەت خوانەکان هەیە !

﴿ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ﴾، زۆر بە گەورەیان گرت‌و پێی سەرسام بوون‌و، دەست‌و پەلی خۆیان بڕی، واتە: بریندارییان کرد، دیارە بە دەم میوە خواردنەوە، یوسوف لێیان وەدەرکەوتووەو، ئەوانیش خەریکی میوە سپی کردن‌و قاش کردن بوون، ئنجا لەبەرئەوەی وا سەرنجیان ڕاکێشراوە، بەلای یوسوف‌و لێ وردبوونەوەی دا، ئاگایان لە دەست‌و پەنجەیان نەماوەو چەقۆکە لە جیاتی ئەوەی بە میوەکەی دابێنن، جار جار بە دەست‌و پەنجەی خۆشیان داهێناوە، هەڵبەتە مەرجیش نیە هەموویان بووبن‌و، هەموویان دەست‌و پەنجەی خۆیان بڕی بێ .

کە لێرەشدا هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان زێدەڕۆییەکی عەجایب دەکەن! هەندێکیان دەڵێن: دەستی خۆیان لێکردەوەو لەوێیان دانا! کە ئەوە شتێکی زۆر دوورە لە عەقڵەوە، قورئان بە تەئکید مەبەستی ئەوەنیە بفەرموێ: دەست‌و پەنجەی خۆیان لێکردەوەو لە وێیان دانا! ئنجا ئەو کاتەی چۆن دەیانتوانی یوسوف ببینن؟ شتی وا نیە، بەڵکو یانی: دەست‌و پەنجەی خۆیان بڕی‌و بریندارییان کرد، ﴿ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ ﴾، گوتیان: پاکیی بۆ خوا، یان (حاش لله) وشەیەکە بەکاردەهێنرێ بۆ سەرسوڕمان، وەك دەڵێی: (ماشاء الله)، یان (نا مە خوا)، یان (تیاح)، بۆ سەرسام بوون، یان مەبەستیان بووە، بڵێن: پاکیی بۆ خوا لەوەی کە

نەتوانێ پیاوی ئاوا بە شانو شەوکەتو جوانو ڕێكو پێکی، وەك ئەم (یوسف)ە، دروست بکات، یاخود: پاکیی بۆ خوا، کە ئەم پیاوە پاكو چاکە، خراپەی لێ بوەشێتەوە، ﴿ مَا هَٰذَا بَشَرًا ﴾، ئەمە مرۆڤ نیە، واتە: مرۆڤێکی ئاسایی نیە ئەگەرنا هەر زانیویانە مرۆڤە، ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴾، ئەمە تەنیا فریشتەیەکی بەڕێزە.

کە من پێموایەو ئەم تەعبیرەش بەڵگەیە کە یوسوف زیاتر لە ڕووە مەعنەوییەکەیەوە، کاریگەریی خستۆتە سەر ئەوان، نەك تەنیا لە ڕووە جەستەییو ڕواڵەتییەکەیەوە، بۆیەش بە فریشتەی دەچوێنن، تەشبیهی دەکەن بە فریشتەوە، ئاشکراشە کە فریشتە لەگەڵ خەڵکدا لە ڕووی مەعنەوییەوە فەرقی هەیە، فریشتە پاكو چاكو بەڕێزو حورمەتو خاوەن سیفەتی بەرزن، لە ڕووی مەعنەوییەوە، بۆیە تەشبیهی دەکەن بە فریشتەوە، فریشتەیەکی بەڕێزیش، دیارە لە خەیاڵو هەستی هەموو میللەتاندا هەیە، کە فریشتە مەخلووقێکی بەڕێزو حورمەتو جوانو بە شانو شەوکەتن .

﴿ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ ﴾، ژنەکەی عەزیز گوتی: ئا ئەوەتانە کە لەبارەی ئەوەوە لۆمەو سەرزەنشتی منتان کرد، واتە: تەماشای بکەن، ئا ئەوە بوو کە لەسەر ئەوەی من ئەوم خۆشویستوەو، پەلکێشی بوومو ویستوومە پەلکێشی بکەم بۆ دەست تێکەڵیی، ئێوە سەرزەنشتی منتان کردوە، کەواتە: ئێوە ناهەقییتان بەرانبەر بە من کردوەو، من هەقم بووە، ﴿ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ ﴾، دان پێدادێنێ، دەڵێ: من ویستمو دەوری هەڵاتم، دەورو خولیمدا، ویستم پەلکێشی بکەم، هەوڵم لەگەڵدا کە لە قەناعەتی خۆی لایبدەمو بیهێنمە سەر قەناعەتی خۆم، (فَٱسْتَعْصَمَ)، بەڵام ئەو خۆی گرتو سەخت وەستا لە بەرانبەر ئەو ویستەی مندا، ﴿ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ ﴾، ئنجا ئەگەر ئەوەی فەرمانی پێ دەکەم، نەیکات، ئەنجامی نەدات، ﴿ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴾، بە دڵنیاییی زیندانیی دەکرێو، لە زەبوونانیش دەبێ، واتە: ئەشکەنجە دەدرێو

ناڕەحەت دەکرێ‌و زەبوون دەبێ، ئەو حاڵەتەی ئەم کۆشکەی ئێمەی نامێنێ، کە ڕێزو حورمەتێکی زۆری لێ دەگیرێ‌و، خزمەتی زۆری دەکرێ، لە ڕووی نان‌و خواردن‌و خوارنەوەو پۆشاك‌و جێگاو ڕێگاوە.

ئنجا یوسوف ﷺ پەنا دەباتە بەر خوا، ﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ ﴾، (یوسف) گوتی: پەروەردگارم! زیندانم لەلا خۆشەویستترە، لەوەی کە منی بۆ بانگ دەکەن، کە ئەوەی ئەویان بۆ بانگ کردوە، بریتی بووە لە دەست تێکەڵیی لەگەڵ ژنەکەی عەزیزی میسڕدا، یاخود هەر کامێکیان هەوڵی خۆی لەگەڵدا داوەو هەموویان تەماعیان تێکردوە، ﴿ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ ﴾، ئەگەر پیلانی ئەوان لە من لا نەدەی .

{یانی: یوسوف بەرەو لای وان نەچووە، بەڵکو پیلانی ئەوان‌و فێڵی ئەوان ڕووی لە یوسوف کردوە}!!

ئەگەر ئەو فێڵ‌و پیلانەی ئەوانم لێ لانەدەی، ﴿ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ ﴾، من بە لایاندا دەچم، واتە: مەگەر تۆ بمپارێزی، ئەگەرنا من بەشەرێکم، بەتایبەتی یوسوف لە تافی لاوێتیی‌و لە هەڕەتی گەنجێتیی‌و پیاوەتیی دابووە، لە بێ توانایی جینسیی‌و دەستە پاچەیی نەبووە، کە وەڵامی ژنەکەی عەزیزی نەداوەتەوە، بەڵکو لە پاکییەوە بووە، بۆیەش دەڵێ: پەروەردگارم! ئەگەر تۆ نەمپارێزی‌و فێڵی ئەوانم لێ لانەدەی، من بە لایاندا دادەشکێم، ﴿ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾، سەرەنجام لە نەفامان دەبم، واتە: لە کەسانێك کە شتێك دەکەن، پێچەوانەی عەقڵ‌و، فامیدەییە ﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنۡهُ كَيۡدَهُنَّ ﴾، ئنجا پەروەردگاری وەڵامی دایەوەو پیلان‌و فێڵی ئەوانی لێ لادا، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، بێگومان هەر خوا بیسەری زانایە .

﴿ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ ﴾، ئنجا دوایی بۆیان دەرکەوت، دوای ئەوەی ئەو هەموو نیشانانەیان بینین :

١- کراسەکەی یوسوف دڕاوە .

٢- ئافرەتەکان کۆبوونەتەوە .

٣ – دەستو پەنجەی خۆیان بڕیوە.

٤ – ژنەکەی عەزیزیش لە نێو ئەو هەمو ژنانەدا ئیعیترافی کردوە، کە من هەوڵم لەگەڵ داوە، کە پەلکێشی بکەم.

٥ – شایەدەکەش شایەدیی دا .

هەموو ئەو شتانەیان بینی.

کەچی دوای ئەوەش بۆیان دەرکەوت کە: ﴿لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٍ﴾، پێویستە زیندانیی بکەن، تاکو کاتێکی دیاریی نەکراو، بۆچی؟

بۆ ئەوەی عەیبەکەی خۆیان بپۆشن، ئیدی قیڕو سیا لە یوسوف، غولامێکەو تەواو!

ئنجا وەك پێشتریش باسم کرد: ئێستاش کە مافی مرۆڤ بە حیساب گەیشتۆتە لووتکە، هەزاران کەسی بێ تاوان هەیە کە لە زیندانەکاندا دەناڵێنیو، خەڵکی خراپەکارو تاوانکاریش هەیە، وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچیو، خەڵکی پاکیش هەیە کە بە درۆو بوختانو بە سیناریۆی ساختەو درۆ زیندانیی دەکرێ، بەڵکو میللەتان هەن بێبەش دەکرێن لە مافی بوونو ژیان، زلهێزانیش تەراتێن دەکەن لە وڵاتیاندا، ئنجا هەر کەسێکیش خۆ ببزێوێ، یەکسەر تۆمەتبار دەکرێ: ئەها ئەوە تیرۆرستە ئەوە خەتابارە ! هەر هێزێ بەرهەڵستیی بکات، پێی دەگوترێ: ئەوە تیرۆرستە ئەوە تاوانبارە، ئەوەش کە تەراتێن دەکات لە وڵاتەکەی ئەواندا و خێرو بیری ئەوان دەباتو، ئەوەی کە لەسەر زەوییەکەیە کە بەشەرەکانن، بە کۆیلەی خۆیان دەزانیو ئەوەش کە لەژێر زەوییەکەشە، بە موڵكو ماڵی خۆی دەزانیو زەوتی کردوە، ئائەوە پارێزەری مافی مرۆڤو پارێزەری خەڵکەو، لە لووتکەی شارستانیی دایە! ئەوانی دیکەش کە داوای هەقی خۆیان دەکەن، ئەوە خەتابارو تاوانبارن !!

ئنجا ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان بەرهەڵستییش بکەن، ئەوە تۆمەتی تیرۆیستو یاخیی بوون بۆ یان ئامادەیە !

ئیدی بەو شێوەیە یوسوف تاکو ماوەیەك کە دیار نیە تاکو کەنگێیە زیندانیی دەکرێ، دوای ئەوەی کە بوختانیشی بە ناهەق پێ دەکرێ !!

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** سەرزەنشت کردنی دەستەیەك لە ژنانی شار، بۆ ژنی عەزیزی میسر، لەسەر هەوڵدانی بۆ پەلکێش کردنی یوسوف‌و دەست تێکەڵیی، وەك پیلان گێڕانێك لەلایەن ئەو ژنانەوە، بۆ دیتنی یوسوف، (یوسوفـ)ـێك، کە ئەو ژنە وا شێت‌و شەیدای بووە، بزانن داخۆ کێیەو چۆنە؟

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦ ۖ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا ۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾﴾.

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە چوار بڕگەدا :**

**١)** ﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ﴾، ژنانێك لە شاردا گوتیان .

دیارە هەواڵەکە بە شێوەیەکی تایبەت بە نێو بەرپرسان‌و ژن‌و ماڵ‌و حاڵی بەرپرسەکاندا بڵاوبۆتەوە، ئنجا ژنانێك نەك هەموو ژنەکان، نەیفەرمووە: (وقال النسوة فِي المدينة)، هەرچی ژنانن لە شارەکەدا، گوتیان، بەڵکو ژنانێك لە شارەکەدا گوتیان، ژنانێکی تایبەت کە جۆرێك لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی تایبەتیان پێکەوە هەبووە، دەبێ ژنانی بەرپرسەکان بووبن .

لێرەدا شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: بۆچی خوا فەرموویەتی :

﴿وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ﴾، نەیفەرموە: (وَقَالَتْ نِسوةٌ فِي المَدِينة)؟

دەڵێن: (تذكير الفعل لأن الفعل المسند إلى ألفاظ الجموع غير الجمع المذكر السالم، يجوز تجريده من التّاءِ، باعتبار الجمع، وقَرْنُهُ بالتاءِ،

باعتبار الجماعة مِثْل: ﴿ وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ ﴾، واتە: کردارەکە (قال)، بۆیە بە نێرینە (مذكر) هاتوەو نەیفەرموە (قالت)، چونکە ئەو کردارانەی کە پاڵ دەدرێنە لای ئەو وشانەی مانای کۆ دەگەیەنن، جگە لە (جمع المذكر السالم)، دەگونجێ (ت)یەکەیان لێ دابڕنرێ، بە ئیعتیباری ئەوە کە ئەو کۆمەڵە، بێژەی (جمع)یان بۆ بەکاردێ، دەشگونجێ (ت)یەکەیان لەگەڵدا بێ، بە ئیعتیباری ئەوە کە بێژەی (جماعة)یان بۆ بەکارهاتوە، وەك: ﴿ وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ ﴾.

کەواتە: ﴿ وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ ﴾، ئەگەر قورئان نەبووایە، بە ئیعتیباری (جمع) بوونیان، دەگونجا بڵێی: (جاء سيارة)، وەك لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ ﴾.

**٢) –** ئنجا ئایا ژنانێك لە شاردا چییان گوت؟ ﴿ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦ ﴾، ژنی عەزیز (واتە: ژنی والی ئەو شارە، یاخود: ژنی بەرپرسی پاسەوانەکانی پادشای میسر، بە پێی قسەی پەیمانی کۆن)، دەوری گەنجەکەی خۆی هەڵدێ، کە لێرەدا (فتى) بە مانای گەنج دێ، بەڵام لە ڕاستییدا مەبەست پێی غوڵامە، کۆیلەیە، دەوری کۆیلەکەی خۆی هەڵدێ، دەیەوێ غوڵامەکەی لە قەناعەتی خۆی لابدا بیهێنێتە سەر قەناعەتی خۆی، قەناعەتی غوڵامەکە کە (یوسوف)ە، بریتیە لە بە پاکیی مانەوە، قەناعەتی ژنەکەش بریتیە لە دەست تێکەڵیی حەڕام، دەیەوێ پەلکێشی بکات، لە خشتەی بەرێ و بیهێنێتە سەر ڕای خۆی.

ئنجا ئێمە لێرەدا دەزانین کە ئەو ژنە هاوسەری عەزیزی میسرە، هەڵبەتە ئێمە کە پێشتر وامان گوتوە، بەهۆی ئێرەوە ئەوەمان زانیوە، ئەگەرنا لە سەرەتاوە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِي ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ ﴾، ئەو پیاوەی کە یوسوفی کڕی، بە ژنەکەی خۆی گوت: نازانین ئەو پیاوە کێیە؟

دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا ﴾، دیسان هەر نازانین ئەو ژنە کێیە؟ بەڵام لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو ژنە، ژنی عەزیزی میسرە، ﴿ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦ ﴾، وەك گوتم: (فتی)، بە مانای گەنج دێت، گەنجێ کە تازە دەگاتێ، بەڵام قورئان بەکاری هێناوە، یان ئەو کاتیش بەکاریان هێناوە بۆ خزمەتکارو کۆیلە، بۆ غوڵام، کە لە ماڵدا بووە خزمەتی کردوە، با بە تەمەنیش بووبێ، هەر وشەی (فتی) یان بۆ بەکارهێناوە .

ئنجا ئایا ئەو ژنانە کێ بوون ؟

وەك گوتم بە تەئکید ژنانێکی هاوئاست بوون لەگەڵ ژنی عەزیزی میسرداو، ژنانی بەرپرسەکانی شار بوون، ئەوانەش دیارە هاوکوفی خۆی بوونو، چینی سیاسییو حوکمڕانی ئەوکاتەی ئەو شارو وڵاتە بوون .

کە دەفەرموێ: ﴿ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦ ﴾، دیارە ئەو تەعبیرەمان بە چەند شێوەیەك مانا کردوە، لێرەشدا دەتوانین بڵێین:

١ – دەیەوێ کۆیلەکەی خۆی لە خشتە بەرێ .

٢ – لە غوڵامەکەی خۆی دەخەفتێ .

٣ – دەوری غوڵامەکەی خۆی هەڵدێ .

٤ – دەورو خولی کۆیلەکەی خۆی دەدات .

٥ – هەوڵی لادانی کۆیلەکەی دەدات، لە قەناعەتی خۆی کە پاکێتییە بۆ سەر قەناعەتی وێ، کە بریتییە لە دەست تێکەڵیی حەرام .

٣) – ﴿ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّا ﴾، ئەو ڕاناوەی کە شێردراوەتەوە لە (شَغَفَ)دا، بۆ یوسوف دەگەڕێتەوە: (قَدۡ شَغَفَهَا : أَي قَدْ شَغَفَ هُوَ إِياها حُبّاً)، یانی: یوسوف دڵی ئەوی لێوان لێو کردوە لە خۆشەویستیی .

(الشِّغَافُ: غِلافُ القَلْبِ أَوْ سُوَيْدَاؤُهُ وَحَبَّتُهُ، وَالجَمْعُ: شُغُف)[1]، (شِغَاف)، بریتیە لە پەردەی دڵ، یاخود نێوەڕاستی دڵ، یان عەینی چەقی دڵ، کۆی (شِغَاف)، بریتیە لە (شُغُف) .

ئنجا دەگوترێ: (شَغَفَهُ، شَغَفَ، يَشْغَفُ، شَغْفاً، وَشَغَفاً: أَصَابَ قَلْبَهُ)، واتە: چووە نێو دڵی، یاخود دڵی پڕ کرد، (وَشَغِفَ بِهِ، وَبِحبِّهِ، شَغِفَ بِحُبِّهِ، يَشْغَفُ، شَغَفاً، أَحَبَّهُ، وأُولِعَ بِهِ، فهو شَغِفٌ، وهي شَغِفَة)[2]، واتە: زۆری خۆشویست، زۆر هۆگری بوو، ئنجا ئەگەر پیاو بێ، دەڵێ: (فَهُوَ شَغِفٌ)و، ئەگەر ئافرەت بێ: (وَهِيَ شَغِفَة)، واتە: زۆر هۆگری بووە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (شێت و شەیدای بووە)، بەڵام وەك پێشتر باسمان کرد: شێت و شەیدا بوونەکەی ئەو ئافرەتە، کە هەندێکیان بە (زلێخا) ناوی دەبەن، شێت و شەیدا بوونەکەی و خۆشەویستییەکەی بۆ یوسوف، خۆشەویستییەکی جەستەیی و غەریزەیی ڕووت بووە .

٤) – دەڵێن: ﴿إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، بە دڵنیاییەوە ئێمە ئەو ژنە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا، دەبینین، واتە: دەیبینین کە بەهەڵەدا چووەو نەیپێکاوە، مەبەستیان ئەوە بووە: چۆن دەبێ ژنی پیاوی گەورە تەماع لە غوڵام و نۆکەرو خزمەتکارو کۆیلەی خۆی بکات ؟ مەبەستیان ئەوە بووە، ئەگەرنا مەبەستیان ئەوە نەبووە، کە ئەوە حەرامەو قەدەغەیەو زینایەو داوێن پیسییە، بەڵکو واتە: ئەو ژنە کە هاوسەری پیاوێکی گەورەیە، نەدەبوو تەماع لە کۆیلەی خۆی بکات، کە زۆر لە خوار خۆیەوەیەتی: لە ڕووی عورف و باوی کۆمەڵایەتییەوە پێیان هەڵە بووە، وەك چۆن ئێستا لە ڕۆژئاوا دەڵێن: ئەگەر پیاوو ئافرەتێك پێکەوە جووت بن، ئەگەر پیاوەکە زۆری لە ئافرەتەکە نەکرد بێ و، لەسەر جێی ژن و مێردایەتیی مێردەکەی نەبێ، مادام هاوسەردار بێ، ئەوە قەیدێ ناکات، یاخود کوڕێك کە لەگەڵ کچێك ڕادەبوێرێ، ئەگەر بێت و بە زۆریی نەبێ، ئەوە چ گرفت نیە !! لێرەش ئەوانە

---

١) مختار الصحاح، ص ٤٨٨.

٢) المعجم الوسيط، ص ٤٨٦.

گوتوویانە: ئێمە دەبینین بەهەڵەدا چووە، کە چۆن دەبێ ژنی پیاوی گەورە، تەماع لە خزمەتکارو کۆیلەو غولامی خۆی بکات؟ ئەگەرنا بە تەئکید مەبەستیان لە (ضَلَٰلٍ)، گومڕایی ئایینیی‌و بە پێوەری ئیسلامیی‌و شەرعیی، نەبووە، چونکە ئەوکاتە خەڵکی میصر خاوەن دینێکی ئاسمانیی نەبوون، ئەگەر هەشیان بوو بێ، دینێك بووە پڕ کراوە لە بت پەرستیی‌و شیرك‌و دوور لە خوایی .

**مەسەلەی دووەم :** گوێ بیست بوونی ئەو ژنە، بۆ سەرزەنشتی ژنەکان‌و بانگێشت کردنی بۆیان‌و، دانانی باڵنج‌و شوێنی پاڵدانەوەو، دانانی میوەو چەقۆ بۆیان‌و، فەرمان کردنی بە یوسوف، کە خۆیان پێشان بدات ئەوانیش یەکسەر بە دیتنی، زۆر بە گەورەی دەگرن‌و، پێی سەرسام دەبن‌و، دەست‌و پەنجەی خۆیان دەبڕن، لەبەر زۆر سەرنج ڕاکێشرانیان بە هۆی (یوسوف)ەوە :

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ۖ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾.

ڕوونکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە ، لە دە ( ١٠ ) بڕگەدا:

١) - ﴿ فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ ﴾، کاتێك پیلان‌و فێڵەکەی ئەوانی بیست، گوێبیستی پیلانەکەی ئەوان بوو.

پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: {سَمِعَ يَعْتَدِي بِنفسِهِ، فَتَعدِيته بالباء لأَنَّهُ ضُمنَ مَعْنَى (أُخبرت) أو (ب) مزيدةٌ للتوكيد، مثل: ﴿ وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ ﴿٦﴾ ﴾ المائدة}.

واتە: وشەی (سمع) بۆ خۆی تەعەددا دەكات، (سَمِعَ قولَهُ)، یانی: گوێی لە قسەكەی بوو، بەلاّم لێرەدا كە بە (ب)، تەعەددای كردوەو، بۆتە خوازیاری (مفعول بە)، مانای (أُخبرت)ی خراوەتە نێو، (هەواڵی پێدرا، هەواڵی پێگەیشت)، یاخود (ب) زیاد كراوە بۆ جەخت كردنەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ ⁽٦⁾﴾ المائدة ، ئەسڵی خۆی (وَامْسَحوا رُؤسَكُم)ە، دەستی تەڕ بە سەری خۆتان دابێنن، سەری خۆتان مەسح بكەن، بەلاّم ئەو (ب)ەیە، بۆ جەخت كردنەوەیە .

ئنجا ئایا بۆچی ناوی لە قسەكەی وان ناوە: (مكر)؟

١) چونكە ئەوان مەبەستیان لەو قسەو لەو توانجو پلار تێگرتنو سەرزەنشت كردنەی ژنەكەی عەزیز، هەر ئەوە بووە كە هانی بدەن (یوسوف)یان پێشان بدات.

٢) یاخود لەبەرئەوەی بە پەنهانیی گوتوویانە، شێوەی فێڵی وەرگرتوە .

٣) یاخود لەبەرئەوەی ئەوان بە شێوەی نكووڵیی لێكردن، گوتوویانە، بەلاّم پاڵنەریان بریتی بووە لە ئێرەییو حەسوودیی بردن بە ژنەكەی عەزیز، كە غولاّمێكی هێندە جوانی هەیە .

لەبەر ئەو هۆیانە بە وشەی (مكر)، تەعبیری لێكردوە .

٢) - ﴿أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ﴾، واتە: دەعوەتی كردن، بانگهێشتی كردن، بەدوایدا ناردن .

٣) - ﴿وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا﴾، شوێنی پاڵدانەوە، شوێنی شان دادان، شوێنی ئیسڕاحەت كردنی، بۆ دانان، پێشتریش گوتمان: (مُتَّكَأْ)، ئەو شوێنەیە كە ئینسان شانی لێ دادەدا، یان پاڵی لێ دەداتەوە، دەشگونجێ كورسیی بووبێ، كورسییو قەنەفە بووبێ، ئەو كاتە لەو كۆشكانەدا شوێنی ئیسڕاحەتو دانیشتنی ئەو حوكمڕانانە جیا بووە لە هی خەڵكی دیكە، دەشگونجێ باڵنج بووبێ، بۆی دانابن، پاڵی وێ بدەن .

٤) - ﴿ وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا ﴾، هەر کامێکیانیش چەقۆیەکی وێدان .

وەك پێشتر باسمان کرد: عادەت وایە کە میوە دادەنرێ، ئنجا چەقۆو چەنگاڵ دەگێڕدرێن، بەڵام خوای زاناو شارەزا ئەوەی کە بە عەقڵو سەلیقە دەزانرێ، باسی نەکردوە، چونکە دەزانرێ کە چەقۆ بۆ میوەیە، میوەی پێ سپی بکەن، پێی قاش بکەنو ئامادەی بکەن بۆ خواردن .

٥) - ﴿ وَقَالَتِ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ﴾، ئنجا گوتی: بۆیان بچۆ دەر، یان لێیان وەدەربکەوە .

زانایان دەڵێن: {عُدِّي فعل الخروج ب (على) لأَنَّه ضُمِّنَ مَعْنَى (أدخُلْ) لأن المقصود دخوله عليهن، لا مجرد الخروج من البيت}، ﴿ وَقَالَتِ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ﴾، تعني: (أُخرُج مِنْ غُرْفَتِكَ وَادخُل عَلَيْهِنَّ).

وادیارە یوسوف لە ژوورێك دابووەو، ئەوان لە ژوورێکی دیکەدا بوون، کۆشکێکی گەورە بووە، شوێنی غوڵامو کۆیلە جیا بووە، شوێنی ئیسڕاحەت کردنو شوێنی میوانان جیا بووە، یانی: لە ژوورەکەی خۆت وەرەدەرێ، بۆیەش (اخرُج) بە (على) تەعەددای کردوە، واتە: لە ژوورەکەی خۆت بچۆ دەرێو، لەوان وەژوور بکەوە، کەواتە: وشەی: (أخرج) هەم مانای چوونەدەری هەیە، کە ڕواڵەتی بێژەکەی خۆی دەیگەیەنێو، هەم بە هۆی (على)وە، (أدخل)یشی خراوەتە نێو، {(تَضْمِين)، واتە: خرانە نێو}، ئەو مانایەش دەگەیەنێ، چونکە مەبەست ئەوە نەبووە لە ژوورەکەی خۆی بچێتە دەرێ، بەڵکو مەبەست ئەوە بووە لە ژوورەکەی بچێتە دەرێو، بچێتە ژوورەکەی ئەوان، کە تێیدا دانیشتوونو ژووری میوانانو پێشوازیی بووە.

هەڵبەتە دەبێ پێشی گوتبێ: بەرگی جوان لەبەربکەو، خۆت ڕێك بکەو، میوانمان دێن، یوسوف چووزانێ، کە بۆ ئەوەیەتی پێشانی ژنانی بدات !

٦) - ﴿ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ ﴾، یەکسەر کە بینییان، بە گەورەیان گرت، ئەو (ف)ە، (ف)ی (تعقیب)ە، واتە: یەکسەر کە بینییان‌و چاویان پێی کەوت، بە گەورەیان گرت، (أَكْبَرْنَهُۥ: أي أَعْظَمْنَهُ)، دەڵێ: (أعظمن جمالَه وشمائلَه)، أو: أعددنه كبيراً لعظم صفاتِهِ)، یانی: جوانیی‌و سیفەتەکانییان بە مەزن زانین، یان: بەهۆی مەزنیی سیفەتەکانییەوە بە گەورەیان گرت .

یانی: کەسایەتییەکەی‌و لە ڕووە مەعنەوییەکەیەوە، ئەوەیان بە گەورە گرت .

٧) - ﴿ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ﴾، ئنجا دەستی خۆیانیان بڕی .

(أي: جَرَحْنَ)، واتە: دەست‌و پەلی خۆیان بریندار کرد، لە ئەنجامی سەرسام بوونیان بە یوسوف‌و چاو تێبڕینیان بۆ یوسوف‌و، لە دەست‌و پەنجەی خۆیان بێئاگابوونیان، ئافرەتەکەش زۆر مەکرۆو حیلە باز بووە، کاتێ کە ئەوان لە گەرمەی میوە قاش کردن‌و میوە سپی کردن دابوون، بە یوسفی گوتوە: کتوپڕ لە ژوورەکەی خۆت وەرەدەرێ‌و لێیان وەژوور بکەوە !

٨) - ﴿ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ ﴾، گوتیان: پاکیی بۆ خوا، واتە: پاکیی‌و دووریی بۆ خوا، کە نەتوانێ مرۆڤێکی ئاوا جوان‌و ڕێك‌و پێك خاوەن جەماڵ‌و کەماڵ دروست بکات، یاخود پاکیی‌و دووریی بۆ خوا، کە ئا ئەو کەسە، {ئەو (یوسف)ە کە لەبەرچاومانە} خراپەی لێ بوەشێتەوە .

٩) - ﴿ مَا هَٰذَا بَشَرًا ﴾، (لَيْسَ هَذا بشراً)، ئا ئەوە مرۆڤ نیە، هەڵبەتە زانیویانە کە مرۆڤە، بەڵام یانی: مرۆڤێکی ئاسایی نیە .

١٠) - ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴾، ئەمە تەنیا فریشەیەکی بەڕێزە، واتە: وەك فریشتە وایە، لە جوانیی‌و لە کەسایەتیی‌و ڕێزو حورمەت‌و هەیبەت‌و سیفەتە بەرزەکانیدا .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {أُعْطِيَ يُوسُفُ وَأُمُّهُ شَطْرَ الْحُسْنِ}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٠٨٢)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى

شَرْطِ مُسْلِم، وَابـن أَبـي شَيْبَـة بـرقم: (٣١٩٢٠)، وَالحَـاكِمُ بـرقم: (٤٠٨٢) وَقَـالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، وَأَبو يَعْلَى برقم: (٣٣٧٣)} .

واتە: یوسوف و دایکی، (کە دایکی ناوی ڕاحیل بووە، بەپێی ئەوەی کە لە تەوراتدا هاتوە) نیوەی جوانییان پێدراوە .

یانی: یەکجار زۆر جوان بوون، هەم دایکی زۆر جوان بووە، دیارە (یوسوف)یش دەبێ چووبێتەوە سەر دایکی .

ئنجا لە کۆتایی ئەم مەسەلەیەدا، ئەو تێبینییە دەخەمە ڕوو، کە ئافرەتەکان گوتوویانە: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾، ئەمە تەنیا فریشەیەکی بەڕێزە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە جوانیی یوسوف بەو جۆرە نەبووە کە چیرۆك گێڕەوەکان (قصّاصون)و حیکایەت خوانەکان باسی دەکەن، کە دەڵێن چاوی وابووە، برۆی وا بووە، کوڵمەی وا بووە، کە زیاتر جوانییەکی ژنانەی بۆ وێنا دەکەن، چونکە ژنەکان کە یوسوف دەچوێنن بە فریشتەیەکی بەڕێزەوە، زیاتر ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە جوانیی یوسوف، جوانیەکی مەعنەویی بووە، جوانیی ڕەوشت و ئاکاری بەرزی بووە، جوانی کەسایەتیی بووە، بەڵێ قەدو قیافەو ڕەنگ و ڕووشی جوان بووە، بەلام جوانییەکی پیاوانە، چونکە ئەو شێوە جوانییەی کە ئافرەتان سەرسام دەکات، لە پیاواندا، جیایە لەو شێوە جوانییەی کە پیاوان سەرسام دەکات، لە ئافرەتاندا.

وەك پێشتریش باسمان کرد : ئافرەت بە نەرم و ناسکیی و قەدو قیافەو سەرو پرچ و زوڵفی و کوڵمەو ڕوومەتی جوانەو، مەرج نیە ئەو جوانییەی کە سەرنجی پیاوان ڕادەکێشێ لە ئافرەتاندا، هەمان جۆرە جوانیی سەرنجی ئافرەتان ڕاکێشێ، لە پیاوان دا، بەڵکو پیاو لە لای ئافرەتان، زیاتر بە پیاوەتیی و سیفەتی بەرزو کەسایەتیی مەعنەویی و خۆڕاگریی و جوامێریی، سەرنجڕاکێش دەبێ، ئەو سیفەتانەی کە لە پیاواندا جوانن، جیان لەو سیفەتانەی کە لە ئافرەتاندا جوانن، بۆ نموونە :

١/ نەرم و ناسکیی، پیاو بە نەرم و ناسك، مەدح ناکرێ، بەڵکو بەهێزو پێز .

٢/ ئنجا ئافرەت ئەگەر ترسنۆكیش بێ زەم ناكرێ، بەڵام پیاوی ترسنۆك زەم دەكرێ، پیاو بە ئازایەتیی‌و زبریی‌و هێزو تواناو بە پشت بە خۆ بەستن، مەدح دەكرێ .

بەڵێ ئەو سیفەتانەی كە لە پیاواندا جوانن، جیان لەو سیفەتانەی كە لە ئافرەتاندا جوانن، هەر كامێكیان جۆرە سیفەتێك، كە لەگەڵ سروشتیاندا دەگونجێ، لێی جوانە، حەسسانی كوڕی سابیت دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە مەدحی دەكات دەڵێ :

وَأَجْمَلُ مِنْكَ لَمْ تَرَ قَطُّ عَيْنِي
وَأَكْمَلُ مِنْكَ لَمْ تَلِدِ النِّسَاءُ
خُلِقْتَ مُبَرَّءًا مِنْ كُلِّ عَيْبٍ
كَأَنَّكَ قَدْ خُلِقْتَ كَمَا تَشَاءُ

واتە :

لە تۆ جوانتر هەرگیز نەیبینیوە چاو
هیچ ژنێك لێی نەبووە پیاوی وەك تۆ تەواو
پاك و بێ خەوشی لە هەر كەم‌و كوڕیی نا تەواویی
هەر دەڵێی بەو جۆرە، كە خۆت ویستووتە دروستكراوی[١]

لێرەدا مەبەستم ئەوە بوو: ئەوەی كە لە بەسەرهات‌و چیرۆكەكاندا هاتووە، كە مەدحی یوسوف ﷺ دەكرێ، بە جوانییەك كە زیاتر لە ئافرەتاندا پەسندە، لە ڕاستییدا ئەوە وانیە، بە پێی ئەوە كە ئەوان لێرەدا مەدحی دەكەن، دەڵێن: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾، هەڵبەتە لە خەیاڵی

---

١) ئەم چوارینەیە خۆم كردومە شیعرێكی كوردیی‌و تۆزێك مانایەكەی لە دەقە عەرەبیەكە جیاوازە، بەڵام هەمان نێوەڕۆكم دەرهێناوە .

هەموو میللەتاندا وایە، كە فریشتەكان خاوەنی سیفەتی بەرزو جوانن، لە ڕووی مەعنەوییەوەو، من پێم وایە لە ڕووی ڕووحیی و مەعنەوییەوە، یوسوف ﷺ ئەو ئافرەتانەی خستۆتە ژێر كاریگەریی خۆی، كە تەماشایان كردوە، لە ڕووی مەعنەوییەوە كاری تێكردوون، بۆیەش تەشبیهیان كردوە بە فریشتە .

**مەسەلەی سێیەم : بە چاو دادانەوەی ژنی عەزیزی میسر بۆ ژنەكان :**

لەسەر گلەیی كردن و سەرزەنشت كردنیان بۆی، بەهۆی ئەوەوە كە دەورو خولی (یوسوف)ی داوەو، داوای دەستێكەڵیی لێكردوەو، دان پێداهێنانی، كە دەستپێشخەریی كردوە بۆ دەست تێكەڵیی لەگەڵ یوسوف ﷺ، بەڵام ئەو ملی نەداوەو بە سەختی بەرهەڵستیی كردوەو، هەڕەشەكردنی لە یوسوف بە زیندانیی كردنی و بە زەبوون كردنی :

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ ۖ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ ۖ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾ .

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە لە چوار بڕگەدا:**

١) - ﴿ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ ﴾، ئا ئەوە، ئەو پیاوەیە كە لەبارەی ئەوەوە سەرزەنشتی منتان كرد بوو، واتە: ئەو پیاوەی كە ئێوە بە بینینی، ئاوا سەرنجتان ڕاكێشرا، كە ئاگاتان لە دەست و پەلی خۆتان نەماو، بەو چەقۆیەی كە میوەكەتان پێ قاش دەكرد، یان سپی دەكرد، دەست و پەلی خۆتان بڕی، هێندە پێی سەرسام بوون، كەواتە: ناهەقم مەگرن، كە منیش ئەوەندە خۆشم ویستوەو ئەوەندە شێت و شەیدای بووم، دیارە هەموو ئەو كۆڕ ئامادە كردن و، ئەو باڵنج دانان و، ئەو چەقۆو میوە ئامادە كردنە بۆ ئەو ژنانە، لەلایەن ژنەكەی عەزیزی میسرەوە، (كە وەك گوتمان: هەندێكیان (زلێخا)ی پێ دەڵێن)، بۆ ئەوە بووە كە ئەو قسەیە بكات، واتە: ئێوە كە

سەرزەنشتو لۆمەی منتان کردوە، لەبەرئەوەی ئەو غولامەی خۆمم خۆشویستوە، ئاخر ئەوە بەو شێوەیەیە، کە ئێوەش ئەوەندە پێی سەرسامن !

٢) - ﴿ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ ﴾، بەدڵنیایی من هەوڵم لەگەڵدا، کە خۆیم تەسلیم بکات، ئەم تەعبیرە کە چەند جارێك لەم سوورەتەدا هاتوە، هەر جار کە دەمەوێ بە کوردیی مانای بکەم، دەگەڕێم لە زمانی کوردییدا چ وشەیەك هاو واتای بێ، چ وشەیەك ئەو مەبەستە بگەیەنێ، (هەوڵم لەگەڵدا خۆیم تەسلیم بکات)، واملێکرد لە خشتەی بەرم، هەوڵم لەگەڵدا کە واز لە نەفسی خۆی بێنێ بۆ من، ئیرادەی خۆی تەسلیمی ئیرادەی من بکات، واز لە ڕای خۆی بێنێ، بێتە سەر ڕایەکەی من .

بەڵام ئەو چی کرد ؟

٣) - ﴿ فَٱسْتَعْصَمَ ﴾، (عَصَمَ)، واتە: پاراستی، بەڵام (فاستَعْصَم)، پسپۆڕان دەڵێن: (زِيادَةُ المَبنى تَدُلُّ عَلَى زِيادَةِ المَعْنَى)، کە (س) و (ت)ی هاتۆتە سەری، واتە: زۆر خۆی گرتو، زۆر بە سەختیی ملی نەداو بەرهەڵستیی ئەو ئارەزوو و دەست پێشخەریی‌و دەوروەدانەی منی کرد، واتە: بە قسەی نەکردم .

٤) - ﴿ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴾، ئنجا ئەگەر ئەوەی فەرمانی پێ دەکەم، ئەنجامی نەدات (کە بریتیە لە دەست تێکەڵیی، کە لەگەڵیدا جووت بێ)، بە دڵنیاییەوە زیندانیی دەکرێ‌و، بە دڵنیاییشەوە لە زەبوونان‌و لە ڕیسوایان دەبێ .

کە ئەوە هەرەشەیەکی گەورەیە، چونکە یوسوف ﷺ بەڵێ لە زاتی خۆیدا بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێزە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، کە ڕۆژێك لێیان پرسی: کێ بەڕێزترینی خەڵکە؟ فەرمووی: {الْكريم اِبن الْكريم ابن الْكريم ابن الْكريم: يوسوف بن يَعْقُوب بن اِسْحَاق بن اِبْرَاهِيم}،{البخاري برقم: (٣٣٨٢)}.

واتە: بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێز، کوڕی بەڕێز یوسوفی کوڕی یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم (عليهم الصلاة والسلام)، واتە: لە

ڕووی ڕەچەڵەکەوە، هیچ کەسێك نەبووە کە ئاوا چوار پشتی پێغەمبەر بن خۆشیو سێ پشتیشی پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا بن، پێغەمبەرانێکی وەك (ئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقووب)یش .

ئنجا هەرچەندە یوسوف لە زاتی خۆیدا، هێندە پیاوێکی بەڕێزو خانەدانو بە حورمەت بوو، بەڵام لەو کاتەدا وەك واقیع: کۆیلەو غولامو خزمەتکارێك بووە، لەبەردەستی ئەو ئافرەتە، لەوماڵەدا، ئەوان کڕیویانەو، ئەو بەڵایەی بەسەرهاتوە، بۆیە لەبەردەستی ئەواندا بووە، ئنجا ئەگەر زیندانیی بکەن، یان سزاو ئەشکەنجەی بدەن، بە ڕواڵەت لەبەردەستی ئەواندا بووە، هەرچەندە خوای کاربەجێ پاراستوویەتی .

ئنجا کە ئەو هەڕەشەیەش دوایی هاتۆتە دی، بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو ژنە – وەك پێشتریش باسمان کرد– بەس وەك غەریزەی جینسیی عەوداڵی یوسوف بووە، واتە: کێشکرانەکەی بەرەو لای یوسوف، کێشکرانێکی جەستەییو غەریزەییو سێکسیی بووەو، خۆشەویستییەکیی ڕووحییو مەعنەویی نەبووە، وەك ئەوەی کە خوای پەروەردگار باس دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴿٢١﴾ ﴾الروم، بۆچی ؟

چونکە لە حاڵەتێکدا خۆشەویستیی (مودة) و بەزەیی (رحمة)، لە نێوان پیاوو ئافرەتدا پەیدا دەبێ، کە لەسەر بناغەی گرێبەستێکی شەرعییانەی ڕوونو حەڵاڵ پێك بگەن، بەڵام ئەو بیەوێ ئاوا لە ڕێی حەرامەوە دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکات، کەواتە: دیارە تەنیا بە هاندەرو پاڵنەرێکی جەستەییو غەریزەییە .

**مەسەلەی چوارەم :** **پاڕانەوەی یوسوف عليه السلام لە پەروەردگاری کە شەڕی ئەو ژنانەی لێ لابدات، پیلانو فێڵی ئەوانی لێ لابدات، ئەگەرنا گیرۆدەی داویان دەبێو لە نەفامان دەبێ :**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ ۖ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾ .

شیكردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا:

١) - ﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ ﴾، (یوسف) گوتی:

پەروەردگارم ! زیندان، بەندیخانە لەلام خۆشەویستترە، لەوەی كە منی بۆ بانگ دەكەن، كەواتە: دیارە بە هەرەوەزیی داوایان لێكردوە، ئنجا ئایا هەموویان داوایان لێكردوەو تەكلیفیان لێكردوە، كە ژنەكەی عەزیزی میسڕ چیت داوا لێدەكات، بۆی جێبەجێ بكە، واتە: بۆ وی داوایان لێكردوە، یاخود هەر كامێكیان جیا بە جیا داوایان لێكردوە بۆخۆیان؟ هەردوو واتایەكە دەگەیەنێ، واش پێدەچێ زیاتر داوایان لێكردبێ بۆ ژنەكەی عەزیزی میسڕ .

لێرەدا یوسوف ﷺ كە دەفەرموێ: ﴿ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ ﴾، بەندیخانە لەلام خۆشەویستترە لەوەی ئەوان منی بۆ بانگ دەكەن، بێگومان چوونە بەندیخانە، چوونە زیندان شتێكی خۆش نیە، بەڵام مانایەكەی وای لێدێتەوە: ئەوەم لەلا ئاسانترە لەوەی كە منی بۆ داوا دەكەن، كە بریتیە لە داوێن پیسیی، چونكە بەهۆی چوونە بەندیخانەوە، بەڵێ ئینسان تووشی ئەزیەت دەبێ، بەڵام ئەزیەتێكی جەستەیی و دنیاییە، بەڵام بەهۆی زیناو داوێن پیسییەوە، ئینسان تووشی ئەزیەت و ناڕەحەتیی مەعنەویی لای خواو دوارۆژ دەبێ، كە ئەوەیان بە تەئكید سەختترە، چونكە دنیا هەر چۆن بێ دەبڕێتەوە، بەڵام دوارۆژ نابڕێتەوە، ئنجا ئینسان ئەگەر شەرمەزاری لای خوا بوو، ئەو كاتە ڕازی بوونی بەندەكان، هیچی بۆ قەرە بوو ناكاتەوە، بەڵام ئەگەر خوا لێی ڕازی بوو، تووڕەبوونی بەندەكان، هیچ زیانی پێناگەیەنێ، وەك لەم دەقەدا هاتوە: {عَنْ عَائِشَة رَضِيَ اللهُ عَنْها قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسول ﷺ يَقُولُ : مَنِ الْتَمَسَ رِضَا اللهِ بِسَخَطِ النـاس، كَفَاهُ اللهُ مُؤْنَةَ النـاس، وَمَن الْتَمَسَ رِضَا الناسِ بِسَخَطِ اللهِ، وَكَلَهُ اللهُ إِلَى النـاس}، {أَخْرَجَهُ ابن المُبارَك برقم: (١٩٩)، وَالترمِذِيُّ برقم: (٢٤١٤)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً ابن حِبان برقم: (٢٧٦) قَالَ شُعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ، وَإِسْحَاق بن رَاهَوِيه برقم: (١١٧٥)، وَالقضاعي برقم: (٤٩٨)}.

واتە: هەر کەس بەهۆی تووڕەکردنی خەڵکەوە خوا ڕازی بکات، خوا خەمی خەڵکی لە کۆڵ دەکاتەوە، بەڵام هەر کەس لە پێناو ڕازیکردنی خەڵکی دا، خوا تووڕە بکات، خوا حەواڵەی خەڵکی دەکات.

﴿ ٱلسِّجْنُ ﴾: (اسْمٌ لِلْبَيْتِ الَّذِي يُسْجَنُ فِيهِ، مِثْل ذِبْح: مَذْبوح، وَخلق، أي مخلوق)، هەڵبەتە ئەگەر بە ﴿ ٱلسِّجْنُ ﴾، بخوێنرێتەوە، کە دیارە زۆربەیان وایان خوێندۆتەوە، واتە: زیندانو بەندیخانە لەلام خۆشەویستترە، لەلام خۆشترە لەوەی کە ئەوان منی بۆ بانگ دەکەن.

هەروەها خوێنراویشەتەوە: (السَّجْن)، (قَالَ رَبّ السَّجن)، (السَّجْنُ: مَصْدَرُ سَجَنَهُ، وَهُوَ الحَبْسُ فِي مكانٍ مُحيطٍ لايَخْرُجِ مِنْهُ)، (سَجْن: سَجَنَ يَسْجُنُ سَجْناً)، ئەو کاتە دەبێتە چاوگی (سَجَنَ)، (سَجَنَهُ)، واتە: بەندی کرد، خستیە بەندیخانەوە، کە بریتیە لەو شوێنە کە ئینسان تێیدا حەپس دەکرێو شوێنەکەی دەورە دەرەو ناتوانێ لێی بچێتە دەر، کەواتە: ئەگەر بە (سَجْن) بخوێنرێتەوە، یان: بەندکردن، بەڵام ئەگەر (سِجْن)بێ، یانی: چوونە بەندیخانە، واتە: چوونە بەندیخانە، یاخود بەند کران، ئاسانترە لەلام لە کەوتنە نێو گوناهەوە، ئەگەرنا وەك گوتم: بەندیخانە شتێك نیە لە خودی خۆیدا خۆشویستراو بێو خۆشبویسترێ .

٢) - ﴿ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ ﴾، ئەگەر پیلانی وان لە من لانەدەی .

(صَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ أي: دَفَعَهُ وَرَدَّهُ)، واتە: پیلانەکەی لێ لاداو لایبرد، واتە: ئەگەر تۆ پیلانی ئەوان کە بەرەو ڕووی من دێو، دژی من دەکرێ، ئەو نەخشەو فێڵە کە بۆ منی دادەنێن، ئەگەر تۆ ئەوە لە من لانەدەی .

وشەی (وَإِلَّا) لە ئەسڵدا (وإِن لا) بووە، بەڵام (إنْ) لە (لا)دا دەغم کراوە .

٣) - ﴿ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ ﴾.

ئەمە وەڵامی مەرجەکەیە (جَوَابُ الشَّرْطِ)، (أَصْبُ : أمِلْ)، واتە: مەیل دەکەم، بەلایاندا دەچم، (صَبا، يَصْبُو، صُبواً، وصَبوةً، أي: مالَ وَاشتاقَ)،

بەلایدا چوو، ئارەزووی کرد، واتە: بەلایاندا دادەشکێم، ئەگەر تۆ نەمپارێزی، لێرەدا ئەمە ئەو ئەدەبە بەرزە دەگەیەنێ، کە ئینسانی بڕوادار، دەبێ چاکەو خێر، هەربگێڕێتەوە بۆ لای خوا، یوسوف لە خۆی ڕا بینیوەو خوای پەروەردگار توانای داوەتێ، بەلام دەبوو بیگێڕێتەوە بۆ خوا، ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِ ۝٥٣ ﴾النحل، ئینسان دەبێ داوای هاوکاریی‌و پشتگیریی‌و پشتیوانیی لە خوای بە بەزەیی بکات‌و، بە هێزی خۆی سەرسام نەبێ، ئەوەتا لێرەدا یوسوف دەڵێ: ئەگەر تۆ نەمپارێزی‌و پیلان‌و فێڵی وانەم لێ لانەدەی، بەلایاندا دەچم، بەلایاندا دادەشکێم .

٤) - ﴿ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾، ئنجا سەرەنجام لە نەفامان دەبم، لێرەدا (جاهل) کۆیەکەی (جاهلين)ە، یان (جاهلون)ە، واتە: لە عەقڵ سووکان دەبم، لە نەفامان دەبم، یاخود (جهل) لێرەدا بەرانبەر (حلم)ە، (حِلْم) واتە: هێدیی‌و مەندیی‌و خۆ گرتن، بەلام (جهل)، واتە: پەلە پەل کردن‌و بەدەم شتێکەوە چوون‌و خۆ ڕانەگریی .

لێرەدا زانایان ئەوانەی کە لە حوکمە شەرعییەکان دەکۆڵنەوە، کە لە ئایەتە موبارەکەکان هەڵدەهێنجرێن، بە تایبەتی (القرطبي)، لە تەفسیرەکەی خۆی (الجامع لأحكام القرآن) هەروەها (إبن العربي) کتێبێکی هەیە بە ناوی (أحكام القرآن) کە (القرطبي) بە زۆری لە (إبن العربي)یەوە وەردەگرێ، ئنجا (القرطبي) لە تەفسیرەکەیدا[1] دەڵێ: {وَلَو أُكرِهَ رَجُلٌ بِالسِّجْنِ عَلَى الزِّنَى، ما جازَ لَهُ إِجْماعاً، فَإِنْ أُكرِهَ بِالضَّرْبِ، فَقَدِ اخْتَلَفَ فِيهِ العُلَماءُ، والصَّحِيحُ أَنَّهُ إِذَا كانَ فَادِحاً، فَإِنَّهُ يَسْقُطُ عَنْهُ إِثْمُ الزنَى وَحَدُّهُ، وَقَدْ قالَ بَعْض عُلَمائنا: إِنَّهُ لا يسقطُ عَنْهُ الحَدُّ، وَهُوَ ضَعِيفٌ، فَإِنَّ الله تَعالى لا يَجْمَعُ عَلَى عَبْدِهِ عَذابَيْنِ، وَلاَ يَصَرِّفُهُ بَيْنَ بَلاءَيْنِ، فَإِنَّهُ مِنْ أَعْظَمِ الحَرَجِ فِي الدِّينِ: ﴿ ... وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ ... ۝٧٨ ﴾الحج}.

١) ج ٩، ص ١٥٣.

واتە: ئەگەر پیاوێك زۆری لێ بكرێ‌و ناچار بكرێ، زینا بكات، بە یەك دەنگیی زانایان، بۆی نیە (بلێ: ناچارم دەكەن‌و زۆرییم لێ دەكەن)، بەلام ئەگەر زۆر لێكردنەكە چووە قالبی لێدان‌و ئەزیەت دانەوە، ئەوە زانایان تێیدا كەوتوونە ڕاجیاییی‌و، ڕای ڕاست ئەوەیە: كە ئەگەر لێدانەكە زۆر بەئێش‌و ئازار بوو، زۆر ئەشكەنجەیاندا، ئەو كاتە ئەگەر لە بن باری لێدان‌و ئەشكەنجەدانێكی زۆردا، مل بدا بۆ زینا، ئەوە نە گوناهی دەگاتێ‌و، نە سزای زیناشی بەسەردا دەچەسپێ، بەلام هەندێ لە زانایان گوتوویانە: سزایەكەی لەسەر لاناچێ، واتە: گوناهی ناگاتێ، بەلام دەبێ سزا بدرێ، بەلام ئەوە ڕایەكی بێهێزە، چونكە خوا دوو سزایان لەسەر بەندەكەی خۆی كۆ ناكاتەوە، {واتە: كە هەم لەلایەن ئەوانەوە كە زۆری لێ دەكەن، ئەشكەنجە بدرێ‌و ئازار بدرێ، هەم دواییش وەك سزای دنیایی سزای شەرعیشی بەسەردا بچەسپێ}و، خوا بەندەی خۆی ناخاتە نێو دوو بەلایانەوە، {هەم مرۆڤەكان ئەزیەتی بدەن، هەم دوایی بە حوكمی شەریعەتیش سزا بدرێ}، چونكە ئەوە گەورەترین سەغڵەت كردنە لە دیندا، خوای میهرەبانیش دەفەرموێ: ﴿ ... وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ... ﴿٧٨﴾ ﴾ الحج، واتە: خوا لە ئایینی خۆیدا، هیچ سەغڵەتییەكی لەسەر ئێوە دانەناوە.

قسەكەشی زۆر زۆر ڕاستە، بەلام دیارە ئەو لێدان‌و ئەشكەنجەدانەش، پلە پلەیەو لە حاڵێكدا مرۆڤ بۆی دروستە، كە ئەو ئازارو ئەشكەنجەیە، ئازارو ئەشكەنجەیەكی جیددیی بێ‌و، زۆر بە ئێش‌و ناڕەحەتكەر بێ، نەك هەر وا دوو سێ زللەی لێبدەن، بیكاتە بیانوو بۆ خراپە كردن.

**مەسەلەی پێنجەم :** بە دەنگەوە هاتنی پەروەردگاری بیسەرو زانای‌و لادانی پیلانی ئەو ژنانە لە یوسف علیه السلام :

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ ﴾.

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە لە سێ بڕگەدا:**

١) ﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ ﴾، دیارە (ف) جۆتە سەر (إستجاب)، (إستجاب) لە ئەسڵدا (أَجاب)یە، یانی: خوا وەڵامی دایەوە، بەڵام (إستجاب)، واتە: زۆر باش، زۆر بە خەستیی وەڵامی دایەوە، (ف)ش کە دەچێتە سەری، لێرەدا بەدوادا هاتن (تعقیب) دەگەیەنێ، یانی: یەکسەر دوا بە دوای پاڕانەوەکەی یوسوف، پەروەردگاری زۆر باش بە دەنگیەوە هات، بە دەمیەوە هاتو وەڵامی دایەوە .

٢) - ﴿ فَصَرَفَ عَنۡهُ كَيۡدَهُنَّ ﴾، ئەویش هەر بە (ف)ی (تعقیب)، واتە: پیلانی وانی لێ لادا، یەکسەر زیانی پیلانەکەی ئەوانی لێ لادا، هەڵبەتە پیلانەکەیان هەر هەبووە، بەڵام پیلانی ئەوان کاریگەریی نەرێنیی نەبوو بۆ سەر یوسوف، دەنا پیلانەکە هەر هەبووە، ئەوە نەبووە کە خوای باڵادەست پیلانەکە لابەرێ، بەڵام پیلانەکەیان کاریگەریی نەبوو بۆ سەری، لەبەرئەوەی یوسوف خۆڕاگرو دامەزراو بوو، وەك ئەوەی کە فێڵەکەیان هەر لاچووبێ‌و نەمابێ، وابووە .

٣) - ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، بێگومان ئەو (خوا ﷻ) زۆر بیسەرەو زۆریش زانایە، واتە: بیسەرە بۆ پاڕانەوەو لاڵانەوەو پەنا پێبردنی یوسوف، زاناشە بە نێو دڵ‌و دەروونیی‌و نهێنییەکانی نێو سینەی.

ئنجا خوا ﷻ لەبەرئەوەی پاکیی‌و ڕاستیی‌و، بە تەنگ پەیوەندیی نێوان خۆو خواوە بوونی، لە یوسوف بینیوە، زانیویەتی یوسوف چەند مەبەستیەتی خوای پەروەردگار لێی ڕازی بێ‌و، کارێك نەکات خوا لێی تووڕە بێ، کە ئەوەی لە دەروونیدا زانیوە، بۆیە دوعایەکەی وەرگرتوە، مەبەستم ئەوەیە کە جاری وا هەیە کەسێك دوعاش دەکاو دەشپاڕێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوە کە لە دڵ‌و دەروونێکی ساغ‌و صافەوە نیە، دوعای سەر زارەکییە، خوا وەریناگرێ، وەك لە فەرمایشی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، فەرموویەتی: {ادْعُوا اللهَ وَأَنْتُمْ موقِنُونَ بالإِجابَةِ، وَاعْلَمُوا أَنَّ اللهَ لا يَسْتَجِيبُ دُعَاءً مِنْ قَلْبٍ غَافِلٍ لاهٍ}، {أَخْرَجَهُ

الترمِذِيُّ برقم: (٣٤٧٩) وَقَالَ: حَدِيثٌ غَرِيب، وَالحَاكِم برقم: (١٨١٧)، وَقَالَ: مُسْتَقِيم الإِسْنَادِ، قَالَ الشيخ الألباني: حَسَنٌ}.

واتە: لە خوا بپاڕێنەوە لە کاتێك دا کە ئێوە دڵنیان خوا وەڵامتان دەداتەوە، (واتە: بە دڵێکی پاكو ساغو ڕاستەوە لە خوا بپاڕێنەوە، نەك دوعای سەرزارەکیی)، وە بشسزانن و دڵنیابن ! خوا وەڵامی دوعای دڵێکی بێئاگا ناداتەوە .

**مەسەلەی شەشەمو کۆتایی :** سەرەنجام زیندانیکرانی یوسوف، پاش دیتنی ئەو هەموو بەڵگانە لەسەر پاکێتییەکەی :

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ  ﴾.

**تویژینەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە دوو بڕگەدا:**

١) - ﴿ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ ﴾، دوایی بۆیان دەرکەوت، قەناعەتیان وای لێهات، دوای ئەوەی نیشانەکانیان بینین، دوای ئەوەی ئەو هەموو بەڵگانەیان بینین، لەسەر ئەوە کە یوسوف پاکەو بێ گوناهو بێ خەتایە .

لێرەدا وشەی ( ثُمَّ )، (للترتيب الرتبي) بۆ ڕیزبەندیی پلەیە، لەو پلەیە بۆ پلەیەکی بەرزتر، جاری وا هەیە ( ثُمَّ ) تەنیا بۆ بادانەوە (عطف)یە بادانەوەی شتێك بۆ سەر شتێك، بەڵام لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی پلەیە، چونکە دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوتوە، یوسوف چەند پاکە، ئنجا بڕیاری گرتنیان داوە، ئەوەش زۆر زۆر شتێکی سەرسووڕهێنەرەو سەرسووڕهێنەرترە لە شتەکانی پێشێ، ﴿ ثُمَّ بَدَا لَهُم ﴾، واتە: ئنجا دوای بینینی ئەو هەموو بەڵگانەش کەچی هاتنە سەر ئەو قەناعەتەو ئەوەیان بۆ دەرکەوت، کە بیگرن .

کە دەفەرموێ: ( لَهُم )، واتە: کۆمەڵی عەزیزی میسر، چونکە پێشتر هەر باسی ئافرەتان بوو، بەڵام ئەمجارە پیاوانیش هاتنە نێو بابەتەکەوە، دیارە وەك پیاوان بڕیاریان داوە کە بیگرن، ئەگەرنا بەڵێ ئافرەتەکە هەڕەشەی لێکردوە، بەڵام بڕیاردانەکە بڕیاری کۆتایی، لەلایەن پیاوەکانەوە بووە، بۆئەوەی بە حیساب سومعەی خۆیان دەرباز بکەن، چونکە ئافرەتەکە وازی لە یوسوف هەر نەهێناوە، پێشیّ بە تەنیا دوایی گەلە کۆمەکێی لێکردوە، دیارە عەزیزی میسرپش – وەك پێشتر باسمان کرد – پیاوێکی بە دەمارو جوامێر نەبووە، هێندە پیاوەتییەی نەبووە کە ئافرەتەکە دووربخاتەوە، یان سزای بدات، یان بیترسێنێ، یاخود یوسوف لەو دوور بخاتەوەو یوسوف بەرێتە شوێنێکی دیکە، لە جیاتی ئەوەی کە بیگرن، (یوسوف)یش دیارە بێکەس بووە، کۆیلەیەك بووە، بۆیە بڕیاری زیندانیی کردنیان داوە، بۆ ئەوەی کە خۆیان لەو عەیبو شوورەییە دەربازکەن .

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ ﴾، یانی: (مِنْ بَعْدِ مـ رَأَوا العَلامَاتِ الدالَّةِ عَلَى نَزَاهَةِ يُوسُف)، دوای ئەوە کە ئەو هەموو بەڵگانەیان بینین، لەسەر ئەوە کە یوسوف پاکە، لەسەر پاکێتیی یوسوف، ئنجا ئەو بڕیارەشیان دا، واتە: ئەوە شتێکی زۆر جێی سەرسوڕمانە .

ئایا ئەو بەڵگانە چی بوون ؟

یەکەم : کراسە دڕاوەکەی یوسوف بوو، کە لە پشتەوە ڕادڕابوو .

دووەم : شایەدییدانەکەی خزمەکەی ئافرەتەکە بوو، کە شایەدییدا وەك حەکەمێك .

سێیەم :کۆبوونەوەی ئافرەتەکانو گەلە کۆمەکیّ کردنیان بوو لە دژی یوسوف .

چوارەم : دەستو پەل بڕینی خۆیان بوو، لەو کۆڕو مەجلیسەدا .

پێنجەم : حاڵەتی ڕواڵەتی یوسوف بوو، کە هەر کەسێك تەماشای کردبایە، دەیزانی پیاوێکی پاكو چاکە، هەر وەك ئەو ئافرەتانە کە

بینییان، یەکسەر گوتیان: ﴿ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٞ كَرِيمٞ ﴿٣١﴾ ﴾، کە وەك پێشتر باسم کرد، هۆکاری سەرسوورمانو سەرسام بوونی ئافرەتەکان بە یوسوف، بەرلەوەی جوانیی ڕواڵەتیی بێ، جوانیی مەعنەویی بووە، ڕەوشت بەرزییەکەی بووە، حەیاو حیشمەتەکەی بووە، سامو هەیبەتەکەی بووە، پاکیی‌و چاکییەکەی بووە، جوانیی ڕووحو ناخی بووە، پێش جوانیی‌و بەرچاویی ڕواڵەتو جەستەیی .

٢) ﴿ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ ﴾، واتە: بۆیان دەرکەوت کە بێگومان دەبێ بۆ ماوەیەکی دیاریی کراو، بیخەنە بەندیخانەوە، زیندانیی بکەن .

(حِينٖ )، واتە: کاتێك، لێرەدا واتە: کاتێکی دیاریی نەکراو، هەتا کاتێك کە خۆیان بە پێویستی دەزانن، کە سەرەتاکەی دیارە، بەڵام کۆتاییەکەی دیار نیە، یوسوف بخەنە بەندیخانەوە، چ ستەمێکی گەورە، یوسوف ﷺ لەگەڵیدا ڕووبەڕووبۆتەوە!! دوای ئەوەش کە بوختانی پێکراوە، دوای ئەوە کە ئەو هەموو هەوڵەی لەگەڵدا دراوە، کە تووشی گوناهو تاوان بکرێ، کەچی ملی نەداوە، بەڵام لە جیاتی ئەوەی عەزیزی میسر ئەوەندە پیاوەتیی هەبێ، سزای هاوسەرەکەی خۆی بداتو، دەستخۆشیی لە یوسوف بکات، هەر ئەوەندەی بە یوسوف گوتوە: یوسوف باسی مەکەو بەردی لەسەر دانێ، بە ئافرەتەکەشی گوتوە: خەتای تۆیەو داوای لێبوردن بکە، واتە: لە مێردەکەت، ئنجا دواییش کە خێزانەکەی دیسان وازی نەهێناوەو، کۆمەڵێك ئافرەتی کۆکردوونەتەوەو، گەلە کۆمەکێی لە دژی یوسوف کردوە، بۆ ئەوەی تووشی داوی خۆی بکات، داوی شوورەیی نەنگیی‌و بەدڕەوشتیی، دوای ئەوەی یوسوف ملی نەداوە، لە جیاتی ئەوەی دەستخۆشیی لێبکات، کەچی ئەوی بەند کردوەو ئافرەتەکەش لە ماڵی خۆی، وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچووە !!

هەڵبەتە ئێستاش لەم ڕۆژگارەدا ئەو جۆرە ستەمانە هەر هەن، وەك لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {عَنْ أَبِي هريْرَةَ قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ ستكون قَبْلَ الساعةِ سِنُونَ خَدَّاعَةٌ، يُكَذَّبُ فِيها الصَّادِقُ، وَيُصَدَّقُ فِيها الْكاذِبُ، وَيُخونُ فِيها الأَمِينُ، وَيُؤْتَمَنُ فِيها الْخائِنُ}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم:

(٧٨٩٩)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ، وَابن مَاجَهْ برقم: (٤٠٣٦)، وَصَحَّحَهُ الألباني، وَالحَاكِمُ برقم: (٨٤٣٩) وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَاد﴾ .

واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێش دنیا تێکچوون، ساڵانێکی فریودەر دێن، کە بابای ڕاستبێژ بە درۆزن دادەنرێو، بابای درۆزنیش بە ڕاستبێژ دادەنرێ، هەروەها بابای ئەمیندارو پاك بە خائین لە قەڵەم دەدرێو، ئینسانی خائینو ناپاك، بە ئەمیندار دادەندرێ .

خوا پەنامان بدات، کە بێگومان ئەگەر ئەو کاتە وا بووە، ئێستا زۆر بە تۆختر ئەوە هەیەو، بەشەر لە ڕووی ڕەوشتو ئاکارو دوور کەوتنەوە لە بەها بەرزەکان، زۆر زیاتر تووشی خلیسکانو لادان بووە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان حەوت (٧) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (٣٦ تا ٤٢)، لەم (٧) ئایەتەدا، ئاڵقەی پێنجەمی زنجیرەی بەسەرهاتی یوسوف ﷺ هەیە، كە بریتیە لە بەسەرهاتی یوسوف لەگەڵ دوو هاوەڵە بەندییەكەی (دوو هاوەڵە زیندانییەكەی)، كە بەهۆی خەون دیتنیانەوە، دەچن بۆ لای یوسوف، تەعبیری خەونەكانیان بۆ بكات، ئەویش لەمیانی ئەوەدا كە خۆییان پێ دەناسێنێ، كە كێیەو لەسەر چ ئایین و بەرنامەیەكەو، باب و باپیرانی كێن و، چۆن بوون ؟ دوایی لەبارەی پووچەڵیی شیرك و، ڕاستیی خوا بەیەك گرتنەوە، قسەیان بۆ دەكات، ئنجا دێتە سەر تەعبیری خەونەكانیان و هەردوو خەونەكەیان بۆ تەعبیر دەكات، ئەوەیان كە لە خەوندا بینیویەتی: ترێی گوشیوەو كردوویەتی بە شەڕاب بۆ خاوەنەكەی خۆی، ئەوە دەربازی دەبێ و، دەچێتەوە سەر پیشەكەی خۆی، بەڵام هی دووەمیان كە خەونی بینیوە: خواردنێكی لەسەر سەر بووەو باڵندان لەو خواردنەیان خواردوە، هەڵدەواسرێ و، باڵندە (واتە: بازو داڵ و خەرتەڵ و داڵاش) لە گۆشتی سەرو گوێلاكی دەخۆن .

ئنجا لە كۆتایی دا بەوەیان دەڵێت كە پێی وایە دەربازی دەبێ: - كەوا پێدەچێ مەیگێڕی پادشا بووبێ، وەك دوایی باسی دەكەین - لەلای گەورەكەت، لەلای خاوەنەكەت باسم بكە، كە بە زوڵم لێرەمو بوختانم پێ كراوەو بە ناهەق بەند كراوم، كەچی شەیتان لەبیری ئەو هاوەڵەی دەباتەوە، كە باسی یوسوف بكات، بۆیە چەند ساڵێك لە زینداندا دەمێنێتەوە، ﴿ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ٤٢ ﴾ یوسف، (بِضۡعَ)یش، وەك دوایی باسی دەكەین، لە (٣ تا ٩)یە، ئنجا ئایا چوار ساڵ بووە ؟ پێنج بووە ؟ شەش بووە ؟ زۆرێك دەڵێن : حەوت ساڵ بووە، لە زینداندا دەمێنێتەوە بە ناهەق .

﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ
إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ
ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٦﴾ قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ
ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكۡتُ مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ
كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ
بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا
يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾
مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا
مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ
أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ
وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ
﴿٤١﴾ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ
ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾.

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{یوسوف چووە بەندیخانەوەو، دوو لاو (ی خزمەتکار)یش لەگەڵیدا چوونە گرتووخانە، (خەونیان دیبوو)، یەکیان گوتی : خۆمم (لە خەوندا) بینی، کە ترێی مەیم دەگوشی، ئەوی دیکەشیان گوتی : من خۆمم (لە خەوندا) بینی کە لەسەر سەرم نانم هەڵگرتبوو، باڵندان لێیان دەخوارد، ئەنجام (وتەعبیر)ەکەیمان پێ بڵێ: بە دڵنیاییی ئێمە لە چاکەکارانت دەبینین ﴿٣٦﴾ (یوسوف) گوتی : خواردنێك کە وەك بژێو (ی ڕۆژانە) بۆتان دێ، بەر لەوەی بۆتان بێ، من (تەعبیرو) ئەنجامەکەیتان پێ دەڵێم، ئا ئەو (تەعبیر زانین)ەش کە پێتان دەڵێم، لەو زانستەیە کە پەروەردگارم فێری کردووم، (لە سۆنگەی ئەوەوە کە) مسۆگەر من وازم لە ڕێبازی کۆمەڵێك هێناوە {خەڵکی وڵاتی میسر}، کە بڕوا بە خوا ناهێننو، بە ڕۆژی دوایش بێبڕوان ﴿٣٧﴾ هەروەها شوێن (بەرنامەو) ڕێبازی باوانم: ئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقووب کەوتووم، ئێمە بۆمان نیە کە هیچ شتێك بکەینە هاوبەشی خوا، ئەوەش چاکەو بەخششی خوایە لەسەر ئێمەو لەسەر خەڵکیش، بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاس (ی خوا) ناکەن ﴿٣٨﴾ ئەی دوو هاوەڵەکەی گرتووخانەم! ئایا چەند پەروەردگارێکی جیاواز باشترە (بپەرسترێن)، یان خوای تاکی (باڵا دەستو) مل پێ کەچکەر؟ ﴿٣٩﴾ ئێوە هیچ ناپەرستن جگە لە چەند ناوێك (ی بێ نێوەڕۆك)، کە خۆتانو باب و باپیرانتان کردووتانن بە ناو (بۆ چەند پەرستراوێکی ساختەو بێ نێوەڕۆك)، خوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەناردوونە خوارو، بڕیار بەس هی خوایە (لە بووندا)، فەرمانی کردوە کە جگە لەوی (هیچ شتێك) نەپەرستن، ئا ئەوە بەرنامەی ڕێكو ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن ﴿٤٠﴾ ئەی دوو هاوەڵەکەی بەندیخانەم! یەکێکتان (مانای ئەخەوتوەکە ئەوەیە کە: ڕزگاری دەبێو دەچێتەوە

سەر پیشەکەی پێشووی‌و) مەی بەسەر خاوەنەکەی دا دەگێڕێ، بەڵام (خەونی ئەوی دیکە (ئەوە دەگەیەنێ کە سزا دەدرێ‌و) هەڵدەواسرێ، ئیدی سەرەنجام باڵندە لە (گۆشتی سەرو گوێلاکی) دەخۆن‌و، ئەوەی لەبارەیەوە پرسیارتان دەکرد، تێپەڕی (و تەواو بوو) ﴿٤١﴾ ئنجا بە وەیانی گوت: کە پێی وابوو قوتار بوویە: لە لای خاوەنەکەت (واتە: پادشا) باسم بکە، (کە بە ناهەق زیندانیی کراوم)، بەڵام شەیتان لە بیری بردەوە، (کە بۆ خاوەنەکەی باس بکات)، بۆیە سەرەنجام چەند ساڵێك لە بەندیخانەدا مایەوە ﴿٤٢﴾ } .

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( فَتَيَانِ ): (الفَتَى: الطريُّ مِنَ الشَّبابِ وَالأُنْثَى فَتَاة، وَيُكَنَّى بِهِما عَنِ العَبْدِ وَالأَمة) (فَتَى)، واتە: لاو، گەنجێك كە تازە سمێڵی بۆر بووبن‌و، بە مێینەكەی دەگوترێ: (فتاة)، كچێك كە تازە عازەب دەبیٚ‌و پێدەگات، وشەی (فَتَى) و (فَتَاة)یش بەكار دەهێنرێن، بۆ كۆیلەو كەنیزەك، كاتی خۆی وەك كینایە بۆ ئەو دووانە بەكار هاتوون، وەك جۆرێك لە ڕێز لێگرتن، كە وەك دوایی ئاماژەی پێدەكەین، فەرمایشتی پێغەمبەری خوای ﷺ لەسەرە .

(أَعْصِرُ خَمْرًا ): واتە: شەڕابم دەگوشی، بەڵام مەبەست ئەوەیە: ترێ، یاخود خورمام دەگوشی‌و دەمكردە شەڕاب، دەڵێ: (العَصْرُ: مَصْدَرُ عَصَرْتُ، وَالمَعْصُور: الشيء العَصِيرُ، والعُصَارَةُ: نفَاية ما يُعْصَرُ، وأَصْلُ الخَمْرِ: سَتر الشيءِ، وَالخِمارُ ما يُسْتَر بهِ، والخَمْرُ سُمِّيت لِكونِها خامِرَةً لِمَقرّ العَقْلِ) .

(عَصْر) چاوگی (عَصَر)یە، دەگوترێ: (عَصَرْتُ العِنَبَ)، واتە: ترێیەكەم گوشی، (معصور) بریتیە لەو شتەی كە گوشراوە، لە ئەنجامی گوشراندا ئەو ئاوەی كە پەیدا دەبیٚ، ئەو شیلەیەی كە پەیدا دەبیٚ، پێی دەگوترێ: (عَصِير) یان (معصور)، (عُصارَة)یش، بریتیە لە تڵتی ئەو شتەی كە دەگوشرێ، تڵتەكەی كە فڕێ دەدرێ، پێی دەگوترێ: (عصارة)، یان (نفاية).

(خمر)یش، بۆیە پێی گوتراوە: (خمر)، چونكە یانی: داپۆشینی شتێك، (خِمار) كە كۆیەكەی (خُمُر)ە، بە سەرپۆش دەگوترێ، لەبەرئەوەی سینگ‌و بەرۆكی، یان سەرو قژی ئافرەتی پێ دادەپۆشرێ، (خمر)یش بۆیە پێی گوتراوە، چونكە داپۆشەری عەقڵە .

( خُبْزًا ): بە عەرەبی (رغيف)یشی پێ دەڵێن، واتە: نان، كولێرە، (اسْمٌ لِقِطْعَة مِنْ دَقِيقِ البُرِّ أَو الشَّعِير، أَوْ نَحْوِهِما، يُعْجَنُ بِالماءِ وَيُوضَعُ قُرْبَ النارِ، حَتَّى يَنْضَجَ

لیۆکەل)، بە پارچەیەك دەگوترێ لە ئاردی گەنم، یان جۆ، یاخود هاو وێنەکانیان، لەگەڵ ئاودا تێکهەڵدەشێلرێو دەکرێتە هەویر، دوایی پان دەکرێتەوەو لە نزیك ئاگرەوە ڕادەگیرێ تاکو تۆزێ دەبرژێو دەخورێ .

( تُرۡزَقَانِهِۦٓ ): (الرِّزْقُ يُقَالُ للعَطاءِ الجارِي تَارَةً، دُنيَوِيا كَانَ أَوْ أُخْرَوِيا، وللنّصِيبِ تَارَةً ، وَلِما يَصِلُ إلى الجَوْفِ وَيُتَغذَّى به تارة)، (رزق)، بەو بڕیوە دەگوترێ کە لە ڕووی دنیاییەوە تەرخان دەکرێ، یان لە ڕووی دواڕۆژەوە، جاری وایە (رزق) بەو پشكو بەشە دەگوترێ: کە بۆ ئینسان دادەنرێ، جاری واش هەیە بەو خواردنە کە دەچێتە نێو گەدەی ئینسانەوە .

( مِلَّةَ ): (المِلَّة: كالدِّينِ وَالفَرْقُ بَيْنَهُمْا أَن المِلَّة لا تُضَافُ إلاَّ إلى النبي الَّذِي تُسْنَدُ إِلَيْهِ)، وشەی (مِلَّة)، وەك دین وایە، واتە: ڕێبازو بەرنامە، بەلام (دین) پالدەدرێتە لای خوا، بەلام (مِلة)، پالّ دەدرێتە لای ئەو پێغەمبەرە (عليه الصلاة والسلام)، کە لەگەلّیدا باس دەکرێ، وەك: (میللەتی ئیبراهیم) .

( ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ ): (أرباب) کۆی (رب)ە، واتە: خاوەن، پەروەردگار، گەورە، ئنجا (الربّ: مَصْدَرٌ مُسْتَعَارٌ للفَاعِلِ، ولا يُقَالُ الربّ مُطْلَقاً، إلاَّ للهِ تَعَالى، وَمِنْ حَقّ (رَبّ) ألاّ يُجْمَع لكن جُمِعَ عَلَى حَسَبِ اعْتِقَادِهِم)، وشەی (رب)، چاوگە خوازراوەتەوە بۆ بکەر (فاعل) یانی: پەروەردەکەرو خاوەن، بە ڕەهایی بە کەس ناگوترێ: (رب)، بێجگە لە خوا، وشەی (رب)یش، نەدەبوو کۆ بکرێتەوە، وەك چۆن (الله) کۆ ناکرێتەوە، چونکە هەر یەك (رب) هەیە کە خوایە، بەلام بە پێی بۆچوونی خەلّك کە پێیان وابووە: چەند پەروەردگارێکیان هەن، لێرەدا کۆکراوەتەوە بە (أَرْباب).

( ٱلۡقَهَّارُ ): (القهر: الغلَبة وَالتَّذْلِيلُ مَعَاً، وَلِكُلّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا)، وشەی (قَهار) لە (قَهر)ەوە هاتوە، (قَهر)، بریتیە لە زالّ بوونو مل پێکەچ کردن پێکەوە، بە هەر کامێکیشیان، واتە: هەم بە زالّ بوونو، هەم بە مل پێکەچ کردن، دەگوترێ: (قَهر)، (قَهّار)یش، واتە: کەسێك کە زۆر بەرانبەرەکانی، یان دروستکراوەکانی، مل پێکەچ دەکاتو بەسەریاندا زالّە (کە خوای پەروەردگارە).

( سُلۡطَٰنٍ ): لێرەدا بە مانای بەڵگە دێ، بەڵام لە چیەوە هاتوە؟ (السَّلَاطَة: التَمَكُّنُ مِنَ القَهر)، (سَلَاطَة)، واتە: دەست ڕۆیشتوویەتی لە ڕووی مل پێکەچکردنەوە، (وَسُمِّي الحُجَّةُ سُلْطَاناً لِهُجُومِهِ عَلَى القُلُوبِ)، بەڵگە بۆیە پێی گوتراوە (سُلْطَان)، چونکە هێرش دەکاتە سەر دڵو عەقڵی خەڵكو داگیری دەکاتو، دەیخاتە ژێر ڕکێفو کۆنترۆڵی خۆیەوە، وەك کوردەواریی دەڵێن: (لە هەقێ ئاو ڕادەوەستێ) .

( ٱلۡحُكۡمُ ): (الحكْمُ بالشيء: أَنْ تَقْضِي بِأَنَّهُ كَذَا أَوْ لَيْسَ بكَذَا)، کە دەگوترێ: (حَكَمْتُ بالشيء، أو لشيء)، واتە: بڕیارمدا کە ئەو شتە وایە، یان وانیە.

( ٱلدِّينُ ): (المَنْهَج، الجزاء، الخضوع، الطاعة)، دیارە وشەی (دین) بە مانای بەرنامە دێو، بە مانای سزاو پاداشت دێ، بە مانای ملکەچیی دێ، بە مانای بە قسەکردن دێ، وە چەند مانایەکی دیکەشی هەن، بەڵام لێرەدا (دین) بە مانای بەرنامە دێ .

( ٱلۡقَيِّمُ ): (أَي: الثابتُ المقوّم لأمورِ مَعَاشِهِم وَمَعَادِهِم)، (قَيِّم)، بە مانای چەسپاوو نەگۆڕو ڕاگر دێ، بۆ کاروباری ژیانو دنیاو دواڕۆژیان .

( فَيُصۡلَبُ ): (الصَّلْبُ: تَعْلِيقُ الإِنْسَانِ بِالقَتْلِ، قِيلَ: هُوَ شد صَلْبِهِ عَلَى خَشَبٍ)، (صَلْب) بریتیە لە هەڵواسینی ئینسان بۆ ئەوەی کە بیکوژن، گوتراویشە بەوە دەگوترێ: کە پشتی ئەو کەسە لە تەختەیەك قایم بکرێ، (نەهێڵن بجووڵێ، تاکو گیانی دەردەچێ) .

( قُضِيَ ): واتە: تەواو بوو، تێپەڕی (القَضَاءُ: فَصْلُ الأَمْرِ، قَوْلاً ذَلِكَ كَانَ، أَوْ فِعْلاً)، (قَضَاء) بریتیە لە تێپەڕاندنی شتێك، ئەنجامدانی شتێك، بە قسە بێ، یان بە کردەوە .

( تَسۡتَفۡتِيَانِ ): واتە: دەپرسن، پرسیار دەکەن، داوای زانیاریی دەکەن، (الفُتْيا: الفَتوى: الجَوَابُ عَما يُشْكِلُ مِنَ الأَحْكَام)، (فُتيا)و (فَتوى)، وەڵامی حوکمێکە کە بۆ خەڵك نەزانراوەو لە خەڵك ئاڵۆز بووە، ئنجا بەهۆی فەتواوە، ڕوون دەبێتەوە.

# مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لێرەدا باسی ڕووداوی لەگەڵ یوسوفدا بەندکرانی دوو کەس دەکات، کە بە (فَتَيَانِ )، واتە: دوو گەنجەکان، یان دوو کۆیلەکان، یان دوو غولامەکان، ناویان دێنێ، بەڵام ناویان نەهاتوە لە قورئاندا، تەماشای پەیمانی کۆنیشم کرد، لەوێشدا ناویان نەهاتوەو، خوای پەروەردگار ئاوا دەست پێدەکات: ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ ﴾، لە دەرسی پێشوودا باسی ئەوە کرا کە عەزیزی میسرو دەوروبەرەکەی، دوای ئەوەی ئەو هەموو نیشانەو بەڵگانەشیان کەوتنە بەرچاو، لەسەر ڕاستییو پاکییو بێ خەتایی یوسوفو، بار بەلاداکەوتنی هاوسەرەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا بریاریان دا کە پێویستە یوسوف بۆ ماوەیەکی دیاریی نەکراو، بەند بکەن، بیخەنە بەندیخانەوە، بۆ ئەوەی عەیبی خۆیانی پێ داپۆشن، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ ﴾، دوو گەنج، دوو لاو لەگەڵی چوونە بەندیخانەوە.

(فَتَيَانِ ) دووانە(مُثَنَّى)ی (فتى)یە، (فتى): واتە: لاو، گەنجی تازە پێگەیشتوو، بۆ کوڕە کە تازە سمێڵی خەتێ دەدا، بۆ کچ (فتاة) کە تازە عازەب دەبێ، کوڕو کچ کە تازە عازەب دەبنو دەکەونە نێو قۆناغی باڵغ بوونەوە، بەڵام بە (كناية)یان وەك خواستنەوە (إستعارة)ش، وشەی (فتى) و (فتاة)، بەکاردەهێنرێن بۆ خزمەتکارو بۆ کۆیلە، هی نێر (فتى)، هی مێ (فتاة)، کە وا دیارە دوو کۆیلەو خزمەتکار بوونە، لەگەڵی چوونە بەندیخانەوە، ﴿قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرًا ﴾، (دیارە خەونیان دیوە)، یەکێکیان خەونەکەی وابوو گوتی: من خۆمم دەبینی کە شەڕابم دەگوشی .

هەندێك لە زانایان دەڵێن: (خمر)، بە مانای (عنب)ە، واتە: ترێم دەگوشیو دەمکردە شەراب، هەندێکیش دەڵێن: ﴿ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ ﴾، یانی: (أَعْصِرُ عِنَباً فَيَصِيرُ خَمْراً)، ترێم دەگوشیو دەبوو بە مەی، شەراب، خەونەکەی ئەوەندە بوو، ﴿ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ ﴾، ئەوەی دیکەشیان گوتی: ﴿ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ ﴾، من خۆمم بینی لەسەر سەرم نانم هەڵدەگرت، نانم هەڵگرتبوو لەسەر سەرم، باڵندە لێیان دەخوارد، ﴿ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ ﴾، هەواڵی سەرەنجامەکەیمان پێ بدە، هەواڵی ماناو مەبەستو تەعبیری ئەو خەونەمان پێ بڵێ، ﴿ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، بێگومان ئێمە تۆ لە چاکەکاران دەبینین، واتە: بەگشتی چاکەکاری، هەندێکیشیان گوتوویانە: واتە: لەوانەت دەبینین کە چاك تەعبیری خەونان دەکەی، بەڵام مانایەکەی گشتییتر بێ، ڕێکتر دێتەوە لەگەڵ کەسایەتی یوسوف ﷺ و لەگەڵ کۆی بەسەرهاتەکەشداو، هەڵبەتە یوسوف، پیاوێکی چاکەکار بووە بە گشتی، ڕووی خۆش بووە لەگەڵ خەڵکداو قسەی خۆش بووەو هاوکاریان بووەو لەگەڵیان بە ڕەحم بووە، بە دەمیانەوە چووەو، بە گشتی چاکەکار بووە لەگەڵیان، جا ئەوان گوتوویانە: مادام یوسوف بە گشتی چاکەکارە، مەزەندەی ئەوەشیان لێکردوە، کە دەشتوانێ واتاو هەواڵی ئەو خەونانەشیان پێ بدات .

بۆیەش گوتوویانە: (بِتَأْوِيلِهِۦ)، چونکە هەرچەندە (رؤيا)، (مؤنث)ە، بەڵام مێیتەی مەجازیی (المؤنّث المجازي)یە، یاخود: (بِتَأْوِيلِهِۦ)، یانی: (بتأويل المنام) یان (بتأويل حديث المنام)، ئەو قسەیەی کە لە خەوندا لەگەڵمان کراوە، یاخود کردوومانە، یان ئەوەی کە لە خەوندا بینیومانە، بەو شێوەیە دەچن بۆ لای یوسوف و خەونەکانی خۆیانی بۆ دەگێڕنەوەو داواشی لێدەکەن کە سەرەنجامو تەعبیری خەونەکەیانیان پێ بڵێ، کە دەشڵێن: ئێمە تۆ لە چاکەکاران دەبینین، واتە: ئەو ئومێدی خێرەی کە بە تۆمان هەیە، کە خەونەکانمان بۆ مانا بکەی، لەبەر ئەوەیە کە تۆ پیشەت چاکەکارییە .

یوسوف ﷺ وەلام دەداتەوە: ﴿ قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ﴾، یوسوف گوتی: خواردنێك كە بۆتان دیاریی كراوە وەك بژیو، بۆتان نایەت، مەگەر من هەواڵی خەونەكەی خۆتانتان پێ دەڵێم، پێش ئەوەی ئەو خۆراكە دیارییكراوە بۆتان بێ، دیارە ئەوانەی لە بەندیخانە دان، بە زۆریی كات بە ڕووداوەكان دیاریی دەكەن، چونكە زۆر جار بەندیخانەكان وان، كە نازانی كەی خۆر هەڵدێ، كەی خۆرئاوا دەبێ، شەوو ڕۆژ لێك ناكەیەوە، بۆیە بە ڕووداوەكان كات دیاریی دەكەن: كاتێ خواردنیان بۆ دێ، كاتێ دەرگا دەكرێتەوە...هتد، (یوسوف)یش، دەڵێ: بەر لەوەی : خواردنێ كە بۆتان دیارییكراوە ڕۆژانە وەك بژیو، بۆتان بێ، من تەعبیری خەونەكەتان پێ دەڵێم، واتە: دڵیان خۆش دەكات، یانی: بەرلەوەی كاتی ژەمە خواردنەكەتان بێ، من مانای خەونەكەتانم بە ئێوە گوتوە، بۆیەش وا دەڵێ، چونكە بە تەمایە هەندێ قسەی دیكەیان لەگەڵدا بكات، بەر لەوەی مانای خەونەكەیان پێ بڵێ، ئیدی لە سەرەتاوە دڵیان خۆش دەكات، بۆ ئەوەی وانەزانن دەیانخافڵێنێ‌و، دواییش مانای خەونەكەیان پێ نالێ، كە ئەم مانایە زیاتر بە عەقڵەوە دەنووسێ، هەڵبەتە توێژەرەوانی قورئان زۆریان خۆ ماندوو كردوە بۆ مانا لێكدانەوەی ئەم ڕستەیە: ﴿ قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ﴾.

١/ زۆربەیان وایان لێكداوەتەوە كە: هەر خواردنێكتان بۆ بێ، پێش ئەوەی بۆتان بێ، من پێتان دەڵێم چ جۆرە خواردنێكتان بۆ دێ، هەندێكیان وایان لێكداوەتەوە، واتە: هیچ خواردنێكتان بۆ نایەت، مەگەر من دەڵێم: كاتی نیوەڕۆ ئەو خواردنەتان بۆ دێ، ئێوارە ئەو خواردنەتان بۆ دێ، بەیانی ئەو خواردنەتان بۆ دێ، پێش ئەوەی بۆتان بێ، من پێتان دەڵێم: چیتان بۆ دێ، وەك عیسا ﷺ یەكێك لە موعجیزەكانی ئەوە بووە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى بُيُوتِكُمْ ﴿٤٩﴾ ﴾آل عمران، واتە: هەواڵتان پێ دەدەم بەو خواردنانەی كە لەماڵەوەتان پاشەكەوتتان كردوەو، ئەوەی كە ڕۆژانە دەیخۆن، ژەماو ژەم دەیخۆن، پێتان دەڵێم چییەو چۆنە؟ پێش

ئـەوەی بـۆتـان بـێ، واتـە: هـەواڵ پێـدان بـە نـادیـار بـە شـتێك كـە نـایزانن، هـەڵبـەتـە ئـەوە وەك مـوعجیزەیـەك خـوای پەروەردگار داویـەتی بـە عیسا لـە ڕیزی كۆمـەڵـێك مـوعجیـزەی دیكەشـدا، صـەڵاتو سـەلامی خـوای لـەسـەر بـێ، بـۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی .

٢/ هەندێكی دیكە وا مانایان لێكداوەتەوە، هەر خواردنێك لە خەوندا بینیوتانە، هەواڵتـان پـێ دەدەم، پێش ئـەوەی لـە دنیای واقیعدا ئـەو خواردنـەتـان بـۆ بـێ، واتـە: كـە خـەون بـە خـواردنێكەوە دەبینـن، من پێتـان دەڵێم مـانـایـەكەی چییـە؟ بەرلـەوەی لـە دنیای واقیعو لـە حاڵەتی بێدارییدا بـۆتـان بـێ.

٣/ بـەڵام ئـەو مـانـایـەی كـە سـەرەتا لێكمـان دایـەوە، ئـەوە زیـاتـر گونجاوە، دەڵێ: من بـەرلـەوەی خـواردنی ڕۆژانـە كـە بـۆتـان دانـراوە، وەك بـژیوی ڕۆژانـەو بـۆتـان دێ، یـاخـود لـە چەند كـاتێكی دیـارییكـراودا بـۆتان دێ، بـەرلـەوەی ئـەو خـواردنـەتان بـۆ بێ، من هـەواڵی مـانـای خـەونـەكـەتان پێ دەڵێم، بـێ خـەم بـن، خـاتـر جـەم بـن.

ئنجا دوایی دەڵێ: ﴿ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓ﴾، ئـا ئـەوەشتان، واتـە: زانینی مـانـای ئـەو خـەونـانـەتان، بـەشێكـە لـەو زانیارییـەی كـە پەروەردگـارم فێری كـردووم، واتـە: زانیـاریی من هـەر ئـەوەندەش نیـە، بـەڵكـو زانیـاریی دیكـەشم هـەیـە، ئـەوە تـەنیـا بـەشێكـە لـەو زانیارییـەی پەروەردگـارم فێـری كـردووم، دیـارە خـەڵـكی ئـەو كۆمـەڵگایـە خـوایـان نـاسیوە، بـەڵام وا پێدەچێ عەقیدەیـان وابووبـێ كـە خـوا ﷻ سـەروكـاری لـەگـەڵ بـەشـەردا نیـە، بـەڵكـو سـەروكـاری لـەگـەڵ ئـەو پەرسـتـراوانـەدا هـەیـە كـە پەرسـتوویـانن، نـەك ڕاستـەوخـۆ مـامـەڵـە لـەگـەڵ بـەشـەردا بكـات، بـۆیـە یوسـوف ؑ پێشـێ پێیـان دەڵـێ: ئـەو مـانـای خـەون زانینـە، بـەشێكـە لـەو زانیارییـەی كـە پەروەردگـاری مـن، خـاوەنو بـەخێوكـەری مـن، خـوای پـەروەردگـاری ڕاستـەقینـە، كـە هـەر ئـەو پەروەردگـارە، فێـری كـردووم .

ئنجا بـۆیـان بـاسی كـەسـایـەتیی خـۆی دەكـاتو بـاسـی ڕێبـازی خـۆیو، پێشینـانو بـابو بـاپیـری خـۆیو، ڕەچەڵەكی خـۆی، دەكـات، تـاكـو زیـاتـر متمـانـەی پـێ بكـەنو باشتـر گوێی بۆ بگرن، دەفەرموێ: ﴿إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْأٓخِرَةِ

هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴾، بێگومان من دەستبەرداری ڕێبازی كۆمەڵێك بووم كە بڕوایان بە خوا نیەو، ئەوان بە دواڕۆژیش بێبڕوان، واتە: پێیان وایە دواڕۆژ نایەت .

كە لێرەدا مەبەستی پێی گەلی میسرە، كە گەلو كۆمەڵگای ئەو دوو هاوەڵە زیندانییەكەیەتی، بەلاَم بۆیە ناوی گەلەكە ناهێنێ، تاكو هەستیان بریندار نەكات، نالێ: (إِنِّي تركْتُ مِلة قَوْمِكُم)، یان (قَوْم مِصْر)، بەڵكو دەڵێ: من وازم لە ڕێبازو ئایینی كۆمەڵێك هێناوە، یانی: بە لایدا نەچووم، ئەگەرنا بەو واتایە نا، كە لەسەری بوومو وازم لێ هێناوە! یانی: هەر بەلایدا نەچووم، چونكە وازلێهێنان (ترك)، وەك دوایی باسی دەكەین، دوو حاڵەتی هەن:

أ - یان لەسەر شتێكەو وازی لێدێنێ .

ب - یاخود هەر بەلای دا ناچێ .

﴿ وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ ﴾، وە كەوتوومە شوێن بەرنامەو ڕێبازی باوانی خۆم، پێشینانو بابو باپیرانم: ئیبڕاهیمو ئیسحاقو یەعقووب، واتە: بابیو باپیریو باپیری بابی .

﴿ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ ﴾، ئێمە بۆمان نیەو شایستەمان نیەو بۆمان ڕەوا نیە، كە هیچ شتێك بكەینە هاوبەشی خوا، ئەم تەعبیرە زۆر بەهێزە بۆ نەفی كردنی (شرك)، وەك دوایی باسی دەكەین، نالێ: (لا نُشرك بالله)، دەڵێ: هەر ئەسڵەن بۆمان نیە، یانی: شایستەمان نیەو لێمان ناوەشێتەوە، كە هیچ شتێك بكەینە هاوبەشی خوا، ﴿ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ ﴾، ئەوەش لە بەخششی خوایە لەسەر ئێمەو لەسەر خەڵكیش، واتە: ئەو ڕێبازی خوا بەیەك گرتنو، تەنیا خوا پەرستنو، تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا كردنو، هیچ كەس نەهێنانە ئاستو ڕیزی خوا لە پەرستنو لە بەندایەتیی بۆ كردندا، ئا ئەوە بەخششی خوایە لەسەر ئێمە، وەك بنەماڵەی ئەو زنجیرە پێغەمبەرە (علیهم الصلاة والسلام) و لەسەر خەڵكیش، چونكە بێگومان وەحییو پێغەمبەرایەتیی، نیعمەتی هەرە ڕەهاو گەورەو مەزنی خوایە لە ژیانی بەشەردا، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ

ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵكی سوپاس ناكەن، واتە: سوپاسی خوا ناكەن، لەسەر چاكەو نیعمەتو بەخششەكانی .

ئنجا دوای ئەوەی خۆی پێ ناساندن‌و، پێشینانی خۆی پێ ناساندن‌و، ڕێبازی خۆی بۆ پێناسە كردن، دێتە سەر ئامانجە سەرەكییەكەی لە قسەكانی، كە بریتیە لەوەی بیرۆكەی چەند پەرستراوێتیی لە مێشكی ئەوان دەربێنێ‌و، خوا بەیەكگرتن (توحید)و تەنیا خوا پەرستن، لە عەقڵ‌و دڵیاندا بچەسپێنێ.

دەڵێ: ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ﴾! ئەی دوو هاوەڵەكەی بەندیخانەم! ئەی دوو هاوەڵە زیندانییەكەم! كە ئەوە جۆرێكە لە لاواندنەوە (ملاطفة)و دڵخۆش كردن‌و ڕێز لێگرتن‌و خۆشەویستیی بۆ دەربڕین، واتە: منیش وەك ئێوە لە زیندان دام‌و بەند كراوم، ﴿ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴾، ئایا چەند خاوەن‌و پەروەردگارێكی جیاوازو جۆراو جۆر، باشترە بپەرسترێن، یاخود خوای تاكی مل پێ كەچكەر؟ خوایەكی تواناو دەستڕۆیشتوو بەسەر هەموو شتێكدا؟! ئاشكرایە: تەنیا خوا ﷻ كە تاكەو دەستڕۆیشتوویەو، هەمە كارەیەو، هەموو شت بەدەستە، تەنیا ئەو شایستەی پەرستنە، نەك چەند پەروەردگارێك‌و چەند پەرستراوێك كە لە وەهم‌و زەینی بە هەڵەدا چووی مرۆڤەكاندا، بە پەرستراوو پەروەردگار دانراون، ئەگەرنا فریان بەسەر پەرستراوێتیی‌و پەروەردگارێتییەوە نیە .

دوایی یەكسەر لە ئامانج دەداو دەڵێ: ﴿ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم ﴾، ئێوە لە خوار خواوە، یان: لە جیاتی خواو جگە لە خوا، تەنیا چەند ناوێك دەپەرستن، كە خۆتان‌و باب‌و باپیرانتان ئەو ناوانەتان بەكارهێناون، بۆ چەند شتێك، كە نێوەرۆكیان لە قەدەر ئەو ناوانە نیە، ﴿ مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍ ﴾، خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردوونە خوار، هەر عەقیدەیەكیش پشت ئەستوور نەبێ بە بەڵگەی خوایی، بە بەڵگەی وەحیی لەلایەن خواوە هاتوو، مانای وایە شتێكی پووچەو مالی قەڵبەو سەر بە خاوەنیەتی .

﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾، یاسادانانو بڕیاردان، یان: حوکمڕانیی بە مانای جێبەجێ کردنی کارەکانی گەردوون، تەنیا هی خوایە، ﴿أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾، ئنجا چونکە هەر ئەو بڕیار بە دەستەو کاروباری بوونی بە دەستە، بۆیە فەرمانی کردوە، کە تەنیا ئەو بپەرستنو جگە لەو کەس نەپەرستن، بەندایەتیی بۆ هیچ شتێکی دیکەو، هیچ کەسی دیکە، نەکەن، ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾، ئا ئەوە ئایینی ڕاستە، ئا ئەوە ئایینێکە کە ژیانی ئێوەو بەرژەوەندییەکانی ئێوە، لە دنیاو دواڕۆژدا جێگیر دەکاتو دێنێتە دی، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، زۆربەی خەڵکی ئەو ڕاستییە نازانن کە تەنیا خوا شایستەی پەرسترانە، بۆیە لە نێو دروستکراوەکانی خوادا، هاوبەشان بۆ خوا دادەنێن .

دووبارە جارێکی دیکە بە ناوونیشانی هاوبەندێتییو هاوپیشەییو هاوچارەنووسیی، بانگیان دەکاتو، دێتە سەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکەیانو، تەعبیر کردنی خەونەکانیان، دەفەرموێ: ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجْنِ﴾! ئەی دوو هاوەڵە زیندانییەکەم! ئەی دوو هاوەڵەکەی بەندیخانەم! ﴿أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسْقِي رَبَّهُۥ خَمْرًا﴾، هەرچی یەکێکتانە (ئەوە ئازاد دەبێ، قوتار دەبێ لەم بەندیخانەیەو دەگەڕێتەوە سەر ئیشی پێشێی)، شەڕاب دەدات بە گەورەکەی خۆیو، بە خاوەنەکەی خۆی، کە وەك دوایی باسی دەکەین: مەبەست پێی پادشا بووە، پادشای میسڕ، چونکە ئەو دووانە وەك لە پەیمانی کۆنیشدا هاتووە، یەکێکیان بەرپرسی ئاوگێڕەکانی کۆشکی پادشا بووە، ئەویدیکەش بەرپرسی چێشتخانەو بەرپرسی ئەوانە بووە کە نانو چێشتیان ساز کردوە، بەڵام بۆیان دیاریی ناکات کامەیانەو تەنیا دەڵێ: یەکێکتان دووبارە شەڕاب دەداتەوە بە خاوەنەکەی، بە پادشا، کە خاوەنو گەورەیەتی، ﴿وَأَمَّا ٱلْءَاخَرُ﴾، بەڵام ئەوی دیکەتان ﴿فَيُصْلَبُ فَتَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِن رَّأْسِهِۦ﴾، هەڵدەواسرێ، ئیعدام دەکرێو، باڵندە لە گۆشتی

سەرو گوێلاکی دەخۆن، ﴿ قُضِيَ ٱلْأَمْرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ ﴾، ئەو کارەی کە ئێوە تێیدا پرسیارتان کردو داوای زانیارییتان کرد، تەواو بوو، واتە: مانایەکەی بەو شێوەیەو کۆتایی هات.

﴿ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٍ مِّنْهُمَا ﴾، ئنجا بە یەکێك لەو دووانەی کە پێی وابوو دەرباز دەبێ، گوتی: ﴿ ٱذْكُرْنِي عِندَ رَبِّكَ ﴾، لەلای خاوەنەکەت، پەروەردگارەکەت، کە تۆ بە پەروەردگارتی دەزانی باسم بکە.

(ربّ)، بە مانای خاوەن‌و گەورەو سەروەر دێ، لەلای خاوەن‌و گەورەو سەروەرەکەی خۆت باسم بکە: کە من لێرەدا بە ستەم گیراوم، بوختانم پێکراوەو بە زوڵم لەو بەندیخانەیە دام، بۆ ئەوەی لێرە بێمە دەرێ.

﴿ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيْطَٰنُ ذِكْرَ رَبِّهِۦ ﴾، کەچی شەیتان ئەوە کە دەبووایە بۆ خاوەنەکەی خۆی باسی بکات، لەبیری بردەوە، واتە: لە بیر کابرای بردەوە، ﴿ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ ﴾، لە ئاکامی ئەوەدا، چەند ساڵێك لە بەندیخانەدا مایەوە.

(بِضْعَ) لە نێوان (سێ) تاکو (نۆ)یە، هەندێك گوتوویانە: (پێنج) بۆ (حەوت)ە، گرنگ ئەوەیە چەند ساڵێك، واتە: لە (سێ) بە پشتەوەو لە (نۆ) بە خوارەوە، ئەوەندە ماوەتەوە، ئنجا سێ ساڵ بووە، چوار بووە، پێنج بووە، حەوت بووە، گرنگ ئەوەیە لە نێوان: (٣ – ٩) ساڵ دا لە بەندیخانەدا ماوەتەوە.

ئنجا لێرەدا بەشێك لە توێژەرەوان جۆرێك لە ڕەخنە لە یوسوف عليه السلام دەگرن، هەندێك ڕیوایەت‌و شوێنەوار دێنن، گوایە یوسوف لەسەر ئەوەی پەنای بە جگە لە خوا بردوەو، داوای لەو هاوەڵە بەندییەی کردوە کە، لە لای گەورەکەی خۆی باسی بکات، لەسەر ئەوە خوا سزای داوە! ئنجا گوتوویانە: ﴿ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيْطَٰنُ ذِكْرَ رَبِّهِۦ ﴾، واتە: شەیتان لە بیر (یوسوف)ی بردەوە یادی پەروەردگاری خۆی بکات‌و، ئەو داوایە ئاڕاستەی خوای پەروەردگاری بکات، لە ئەنجامی

ئەوەشدا لە زینداندا ئەوەندە مایەوە، وەك سزادانێك!! بەڵام وەك لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، ئەوە شایستەی یوسوف عليه السلام نیە، سیاقی ئایەتەکانیش نایگەیەنێ و، من بەڵگەیەکم هێناوەتەوە لە تەفسیرەکاندا نەمبینوە ئاماژەی پێکرابێ، ئەویش ئەوەیە کە خوا سبحانه وتعالى لە ئایەتی ژمارە (٤٥)دا، دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ ٤٥﴾ يوسف، واتە: ئەو کەسەی لە دووەکان دەرباز بوو، دوای کۆمەڵە ساڵێك، وە بیری هاتەوە، گوتی کەواتە: ئەوەی کە لە بیری چۆتەوە، هاوەڵەکەی بووە، نەك یوسوف خوای لەبیر بچێتەوە، پەروەردگاری لە بیر بچێتەوە، بەڵکو هاوەڵەکەی بووە، لە بیری چۆتەوە، باسی یوسوف بکات لەلای گەورەکەی خۆی، چونکە خوا سبحانه وتعالى باسی (یوسوف)ی نەکردوە، شتی هاتبێتەوە بیر، بەڵکو لەوبارەوە باسی یەکێ لە دوو هاوەڵە زیندانییەکەی کردوە: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ ٤٥﴾ يوسف .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** گێرانی دوو خزمەتکاری لاو، یان دوو کۆیلەی لاو، لەگەڵ (یوسوفـ)داو، خەون دیتنیانو، گێڕانەوەی خەونەکانیان بۆ یوسوف ﷺ، بۆ ئەوەی بۆیان تەعبیر بکات.

وەك خوا فەرمووییەتی: ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعْصِرُ خَمْرًاۖ وَقَالَ ٱلْأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُۖ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا :**

١) - ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ ﴾، ئنجا دوو گەنج، یان دوو کۆیلە، یان دوو خزمەتکار لەگەڵیدا چوونە بەندیخانەوە - وەك دوایی باسی دەکەین - ئەو دوو گەنجە، یاخود ئەو دوو کۆیلە، یان ئەو دوو خزمەتکارە، سەرۆکی ئاوگێڕەکانی کۆشکی پادشاو، سەرۆکی چێشتخانەو ئەوانەی کە نانو خواردنیان ساز کردوە، بوون، کە دیارە پادشا بە هەر هۆیەکەوە بووە، لێیان تووڕە بووەو خستوونیە بەندیخانەوە، لەوبارەوەش هەندێ بەسەرهات هەن، دوایی ئاماژەیەکی کورت بە هەندێکیان دەکەین.

٢) - ﴿ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعْصِرُ خَمْرًا ﴾، یەکێکیان گوتی: من خۆمم دەبینی کە شەڕابم دەگوشی .

(العصر: الضَّغْط باليدِ أَو بِحَجَرٍ أو بنحوه على شيء فيه رطوبة لإخراج ما فيه من المائع)، (عصر): بریتیە لەوە کە بە دەست، یان بە بەرد، یان بە هەر شتێکی دیکەی ڕەق، شتێك کە تەڕە، یان شلەمەنییەکی تێدایە، یاخود تەڕاییەکی تێدایە، بیگوشیو فشاری بۆ بێنی، تاکو ئەو مادده شلە، یاخود ئەو تەڕایەتییەی لێ بێتە دەرو لێ بچۆڕێ، ئینسان کاتێك ترێ هەڵدەگوشێ، یاخود ئیسفەنجێك هەڵدەگوشێ، ئەو ئاوەی پێیەوەیە، ئەو تەڕاییەی تێیدایە، لێی دێتە خوارێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (عصر) .

کە دەڵێ: ﴿أَعۡصِرُ خَمۡرٗا﴾، واتە: شەڕابم دەگوشی، واتە: ترێ، یاخود خورما، یان ئەو شتانەی کە شەڕابیان لێ دروست دەکرێ، هەڵمدەگوشین، سەرەنجام دەبوو بە شەڕاب، هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: وشەی (خمر) هەر بە مانای ترێو خورماو ئەو شتانە دێ، کە دەگوشرێنو دوایی شەڕابیان لێ دروست دەکرێ .

٣) - ﴿وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ﴾، ئەوی دیکەیان گوتی: من خۆمم بینی: کە لەسەر سەرم خواردنێکم هەڵگرتبوو، نانم هەڵگرتبوو، {ئنجا ئایا هەر نانی بە تەنیا بووە، یان چێشتو پێخۆریشی لەگەڵدا بووە؟} لەسەر سەرم هەڵگرتبوو، ﴿تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ﴾، باڵندە لێیان دەخوارد، لەو نانەی کە لەسەر سەری خۆم هەڵمگرتبوو، {دیارە سینییە خواردنێك بووە} .

٤) - ﴿نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾، هەواڵمان پێبدە، هەواڵی مانای ئەو خەونەی کە بۆمان گێڕایەوە، پێمان بدە، ئەو سەرەنجامەی کە لێی وەدی دێ، پێمان بڵێ، ﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾، بێگومان ئێمە تۆ لە چاکەکاران دەبینین .

وەك گوتم : لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهدالقديم، سفر التكوين، الإصحاح : ٤٠، ص ١٠٣)یشدا هاتوە خەونەکانیان گێڕاوەتەوە، وەك ئەوەی کە لە قورئاندا هاتوە، هەر بەو شێوەیە، واتە: لە نێوەڕۆکدا وەك

یەکن‌و جیاوازییەکیان لە نێواندا نیە، بەلام لە پەیمانی کۆندا، دەڵێ: ئەو دووانە (رئیس السُّقَاة و رئیس الخَبّازِین)، سەرۆکی ئاوگێڕەکان، ئەوانەی سەرپەرشتیی ئاوو شەراب‌و ئەو شلەمەنیانەیان کردوە، کە خوراونەوە لە کۆڕو مەجلیسی پادشادا، یەکیان سەرۆکی ئەو ئاوگێڕانە بووەو (رئیس السُّقَاة)، ئەویدیکەش سەرۆکی نانەواکان (رئیس الخَبّازِین)، یاخود ئەوانەی کە سەرپەرشتیی نان‌و خواردن‌و خواردەمەنیی‌و چێشتیان کردوە، بوون .

ئنجا لە هەندێك لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: بەند کردنەکەشیان بە هۆی ئەوەوە بووە کە پادشا هەواڵی پێدەگات: ئەو دووانە دەیانەوێ دەرماناوی بکەن، ئەویش دێنێت هەردووکیان بانگ دەکات :

١- ئەوەیان کە سەرۆکی ئاوگێڕەکانە، لەو شەرابەی کە بۆ پادشای ئامادە کردوە، بۆی دادەنێن .

٢- بۆ ئەوی دیکەش لەو خواردنەی بۆ پادشای ئامادەکردوە، خواردن دادەنێ، ئنجا بە ئاوگێڕەکە دەڵێ: دەی لەو شەرابە بخۆوە، کە تۆ سەرپەرشتیی دروستکردنی شەراب‌و شلەمەنیەکان دەکەی، ئەویان دەیخواتەوە، چونکە دەزانێ کە هیچی تێنەکراوە، ئنجا بەوەی دیکەش کە سەرپەرشتیی نان‌و چێشت‌و یاخود نانکەران‌و نانەواکان دەکات، بەویش دەڵێ: لەو نان‌و چێشتە بخۆ، بەلام ئەو ئامادە نابێ لێی بخوات، دوایی ئەو خواردنە دەدەن بە ئاژەڵێك‌و مردار دەبێ، ئیدی دەزانن کە ژەهری تێکراوە، بۆیە دەیاننێرن بۆ بەندیخانە، ئنجا دوای ئەوەی دادگایی دەکرێن، سەرەنجام ئەوەیان کە بێ خەتا بووە، تەبریە دەبێ‌و دەچێتەوە سەر ئیشەکەی خۆی، بۆیە دەڵێ: من بینیم کە شەرابم هەڵدەگوشی، واتە: دەگەڕێتەوە سەر ئیشەکەی خۆی، ئەویدیکەشیان ئیعدام دەکرێ، کە گوتوویەتی: لە خەومدا خواردنم لەسەر سەرم هەڵگرتبوو، باڵندە لێیان دەخوارد، واتە: ئیعدام دەکرێ‌و باڵندە لە گۆشتی سەرو گوێلاکی دەخۆن، لە پەیمانی کۆندا هەندێ لەو شتانە هاتوون، بەلام لە تەفسیرەکاندا حیکایەت‌و وردەکاریی زۆر هاتوە .

لێرەدا پێویستە چەند سەرنجێك بخەینە ڕوو.

## پێنج وردە سەرنج

یەك: وشەی (فتی)، كە لە ئەسڵی زماندا بە مانای گەنج، لاو، تازە پێگەیشتوو، دێ، بەڵام خوازراویشەتەوە بۆ خزمەتكارو بۆ كۆیلە، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، فەرموویەتی: {لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ عَبْدِي وَأَمَتِي، كُلُّكُمْ عَبِيدُ اللهِ، وَكُلُّ نِسائِكُمْ إِماءُ اللهِ، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: غُلامِي وَجارِيَتِي، وَفَتَايَ وَفَتَاتِي}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٩٦٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: ٢٢٤٩)، وَالنَّسائِي فِي الكُبْرَى برقم: (١٠٠٧٠)، وَأَبو يَعْلَى برقم: (٦٥٠٦)}.

واتە: با یەكێك لە ئێوە نەڵێ: كۆیلەكەم و كەنیزەكەكەم، هەمووتان كۆیلەی خوان و، هەموو ئافرەتانتان بەندەی مێینەی خوان، بەڵكو با بڵێ: كوڕە لاوەكەم و كچە لاوەكەم !

واتە: لە ڕووی بانگ كردنیشەوە، هەست و نەستی ئەوانەی كە لەبەر دەستانن، بپارێزن، ئنجا ئێمە لە سووڕەتی (النساء)دا، بە درێژیی باسی حوكمی كۆیلەو كەنیزەك و بە كۆیلە كردنی مرۆڤ و، هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلام، لەوبارەوەمان كردوە .

دوو: وشەی (فتی) بۆ كوڕە، بۆ نێرینەیە، بەڵام (فتاة)، بۆ مێینەیە، بۆ كچ، پیشەكانیان بە پێی قسەی تەورات: یەكیان سەرۆكی ئاوگێڕو مەیگێڕەكان بووەو، ئەویدیكەشیان سەرۆكی چێشتخانەو نان و خواردن سازكردن بووە، ئنجا هەرچەندە ئەوە لە قورئاندا نەهاتووە، بەڵام زۆر پێدەچێ وابێ، بە بەڵگەی ئەوە كە یوسوف عليه السلام دەڵێ : ﴿ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ﴾، لەلای گەورەكەت، خاوەنەكەت باسم بكە، دەبێ ئەو خاوەنە حوكمڕان بووبێ و بە دەستی بووبێ: خەڵك زیندانیی بكات و خەڵك لە بەندیخانە بێنێتە دەرێ، كە ئەویش پادشا (ملك)ـە، چونكە پادشا كە خەون دەبینێ: ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ ٤٣﴾ یوسف، ئنجا پادشا كە

خەونەکەی دەگێڕێتەوەو، دەستڕۆیشتووەکانو ئەوانەی کە لە دەورنی، دەڵێن: ئێمە تەعبیرەکەی نازانین، ئەو دووەمەیان کە دەربازی بووە، کە ئاوگێڕەکەیە، وەك خوا فەرموویەتی : ﴿وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ ﴿٤٥﴾﴾ یوسف، واتە: من هەواڵی تەعبیرەکەیتان پێ دەدەم، بمنێرن، کەواتە: ئەو کەسە لەلای پادشا بووە، کە حوکمڕانی ئەو وڵاتە بووە، بۆیە دەڵێ: بمنێرن، ئنجا دوایی کە دەینێرن بۆ لای یوسفو، (یوسوف)یش خەونی پادشا لێکدەداتەوە، کەواتە: دیارە ئەو کابرایە لە بارەگای پادشاداو لە کۆشکی حوکمڕان دا خزمەتی کردوە، ئنجا بە پێی خەونەکەشی دیارە کە بەرپرسی نانو چێشتخانەو زادو زەخیرە بووە، هەروەك چۆن ئەوەی دیکەشیان بەرپرسی ئاوگێڕانو مەی گێڕان بووە .

سێ : - ئێمە پێشتر باسی خەونمان کرد، لە سەرەتای دەستپێکی سووڕەتی (یوسوف)دا، باسێکی تێرو تەسەلمان دەربارەی خەونو تەعبیری خەون کرد، خەون چ سوودێکی لێ وەردەگیرێ؟ تا چ ڕاددەیەك پشتی پێ دەبەسترێ؟ لێرە دووبارەی ناکەینەوە .

چوار : - لە بەندیخانەکاندا خەون زۆر ڕۆڵ دەگێڕێ، چونکە بە زۆریی وایە کە هیچ ڕێیەکی دیکە نیە بۆ گیراوەکان، بۆ بەندییەکان، کە ئاگاداری دەنگو باسی دەرەوە بن، بۆیە خوای میهرەبان لەو ڕێیەوە بەرچاو ڕوونییان پێدەدات، هەر کەسێك بەندیخانەی بینیبێ، دەزانێ کە بە کردەوە مەسەلەی خەون بینین، کاریگەریی زۆری هەیە بۆ بەندییەکانو، بە ناچاریی پشتی پێدەبەستن، چونکە ڕێیەکی دیکەیان نیە، خوای پەروەردگاریش لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا بە کەرەمو بە بەزەییە، مسوڵمان بن، یان نامسوڵمان، دەرووی خێریان لێدەکاتەوەو، بە دەنگیانەوە دێو، بەرچاو ڕوونییان پێدەدات، ئەگەر دەرگایەکیان لێ دابخات، دەرگایەکی دیکەیان بۆ دەکاتەوە .

پێنج :- ﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، ئەو دوو هاوەڵەی پێی دەڵێن: ئێمە تۆ لە چاکەکاران دەبینین، واتە: چاکەکار بە گشتی، هەندێکیان گوتوویانە: واتە: چاك خەونان تەعبیر دەکەی، (مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ : أَي مِنَ المُحْسِنِين فِي تَعْبِير الرؤيا)، بەلاّم بێگومان مانای یەکەمیان گونجاوترە لەگەڵ کەسایەتیی (یوسوف)دا ﷺ، چونکە لەوانەیە ئەوە یەکەم جار بووبێ کە یوسوف ﷺ خەونی ئەو هاوەڵەی بەندیخانەیەی تەعبیر دەکات، کەواتە: دەبێ چاکەکارییەکە شتێکی دیکە بێ، جیا لە تەعبیر کردنی خەونەکان، ئەویش وا پێدەچێ مەبەست پێی: ڕووی خۆش، قسەی خۆش، ڕەحم‌و بەزەیی، هاوکاریی بۆ هاوەڵەکانی بەندیخانەی، لەگەڵ دا بەڕێزبوونیان، بەدەمەوە چوونیان، کە بێگومان بابای گیراوو لە کونجی بەندیخانە بەندکراودا، هەموو جۆرە چاکەیەکی لەلا بە قیمەتە، ئەگەر ڕوویێکی خۆشە، ئەگەر قسەیەکی خۆشە، ئەگەر هاندانێکە، ئەگەر مەعنەوییات بەرزکردنەوەیەکە، ئەگەر سلاّو لێکردنێکی گەرم‌و گوڕە، ئەگەر هاوکاریی کردنێکی بچووکیشە، ئەگەر پێدانی شتێکی ماددییە، یاخود هاوکاری کردنێکی مەعنەوییە .

یوسوف ﷺیش کە دوو هاوەڵەکەی دەڵێن: ﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، بێگومان ئێمە تۆ لە ڕیزی چاکەکاراندا دەبینین، دیارە هەر زۆر زۆر چاکەکار بووە لە هەموو ڕوویێکەوە، لە بواری ماددیی‌و مەعنەویی دا، هەرچی لە دەستی هاتوە لە چاکە کردن لەگەڵ دەوروبەرەکەی خۆیدا، کردوویەتی، بە شێوەیەك کە ئەو سیفەتەی هێندە تێدا تۆخ بۆتەوە، چۆتە ڕیزو قووڵایی چاکەکارانەوە .

**مەسەلەی دووەم :** دڵنیا کردنەوەی یوسوف ﷺ بۆیان، کە بەر لە هاتنی خواردنەکەیان، کە ڕۆژانە بۆیان دیاریکراوە، تەعبیری خەونەکانیان بۆ دەکاتو، خۆ ناساندنی پێیان، وەك خوا پەرستێکی شوێنکەتووی ڕێبازی خوا بەیەکگرانەی بابو باپیرانی خۆی: ئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقووب :

وەك خوا دەفەرمووێ : ﴿ قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ ۚ إِنِّى تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ ءَابَآءِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشْرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۚ ذَٰلِكَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە بەپێزە لە هەشت بڕگەدا :**

١) - ﴿ قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ ﴾، یوسوف گوتی: خواردنێك کە وەك بژیو بۆتان دانراوەو، کاتێکی دیاریکراوی هەیە، بۆتان نایەت .

٢) - ﴿ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ﴾، مەگەر بەرلەوەی ئەو خواردنە دیاری کراوە، لەو کاتە دیاری کراوەی خۆیدا، کە ڕۆژانە بۆتان دێ، بۆتان بێ، من هەواڵو سەرەنجامو تەعبیری خەونەکەتانم بە ئێوە ڕاگەیاندوە .

کە دەڵێ: ﴿ طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ ﴾، دەڵێ: خواردنێك کە وەك بژیو بۆتان دانراوە، بەرلەوەی ئەوە بۆتان بێ، من تەعبیری خەونەکەتان بۆ دەکەم، دەڵێ: (جَعَلَ لَهُما وَقْتاً مَعْلُوماً، وَقْتَ إِحْضَارِ طَعَامِ المَسَاجِين)، کاتێکی دیاریکراوی بۆ دانان، ئەویش کاتی ئامادەکردنی خواردنی بەندییەکان،

زیندانییەکان، یانی: بەرلەوەی خواردنەکەتان بۆ بێ، من مانای خەونەکەتانم پێ گوتوون، خاترجەم بن‌و دڵنیابن .

٣) - ﴿ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓ﴾، یوسوف ﷺ زۆر لێزانانەو کارامانە دەیەوێ : هەم خۆی بەوان بناسێنێ‌و، هەم پێشینانی خۆیشی بەوان بناسێنێ‌و، هەم بەرنامەو ڕێبازی خۆشی بەوان بناسێنێ، بۆ ئەوەی زیاتر متمانەی پێ بکەن‌و، باش گوێی بۆ بگرن، نەك هەر بۆ تەعبیری خەونەکەیان، بەڵکو بۆ ئەو پەیامەش کە دەیەوێ پێیان ڕابگەیەنێ، وەك پێغەمبەرێکی خوا، کە دیارە بەندەکانی خوا، بە تایبەت پێغەمبەرانی خوا صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، هەر هەل‌و دەرفەتێك دەقۆزنەوە بۆ گەیاندنی پەیامی خواو، ڕوون کردنەوەی بەرنامەو ڕێبازی خۆیان بۆ خەڵك، بۆیە دەڵێ: ﴿ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓ﴾، ئا ئەوەتان، واتە: ئەم زانینی تەعبیری ئەو خەونەتان، ئەوە کە من ماناو سەرەنجامی خەونەکەتان بە ئێوە دەڵێم، بەشێکە لەوەی کە پەروەردگارم فێری کردووم، بۆیان ڕوون دەکاتەوە کە چۆن مانای خەونەکان دەزانێ؟ دەڵێ: پەروەردگارم فێری کردووم، کە بە زانیاریی تایبەتی خوایەو، وەك وەحیی‌و ئیلهامێکی خوایی بە منی ڕاگەیاندوە .

کەواتە: وەك پێشتر باسم کرد: ئەوەی کە زۆربەی تەفسیرەکان گوتوویانەو، تێیدا کەوتوونە کێشەو مشتوومڕەوە، ئەو دوو مانایە هیچ کامیان لەگەڵ ڕواڵەتی ئایەتەکانیش دا ناگونجێن :

١ - یەکەمیان ئەوەیە: هەر خواردنێکتان بۆ بێ، پێش هاتنی، هەواڵتان پێدەدەم، کە چییەو چۆنە ؟

٢ - دووەمیان ئەوەیە: هەر خواردنێکتان لە خەوندا، بووبێ‌و خەونی پێوە ببینن، من لە کاتی بێدارییدا هەواڵتان پێدەدەم، کە لە خەوندا واتان بینیوە، یان ئەوەی کە لە خەوندا بینیوتانە، ماناکەی ئاوایە .

لە ڕاستییدا ئەو دوو واتاو لێکدانەوەیە، هیچیان لەگەڵ سیاقی ئایەتەکان‌و ڕواڵەتی ئایەتەکاندا ناگونجێن .

ئنجا کە دەڵێ: (بِتَأْوِيلِهِۦ)، (أي: المنام، أو المرئي)، واتە: تەئویلی خەوەکەتان، یاخود بینراوەکەتان، واتە: وشەی (منام)، یان (مرئي)، لێرەدا ڕەچاو کراوە، بۆیە ڕاناوی نێرینە (مذکر) بۆ بەکارهاتوە، نەك وشەی (رؤيا)، تاکو ڕاناوی مێینەی (واتە: مێینەی مەجازیی)ی بۆ بەکاربێ، دیارە هەر کام لە :

أ- (منام)، یانی: خەو، نووستن .

ب- (مرئي)، واتە: لە خەودا بینراو.

هەردووکیان بێژەیەکن، لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە بە (المذکر المجازي) دادەنرێن، بۆیە ڕاناوی نێرینە، بەکارهێنراوە: (بِتَأْوِيلِهِۦ)، (أي: بتأويل المنام، أو بتأويل المرئي)، واتە: ئەو خواردنە کە عادەت وایە لە کاتێکی دیارییکراودا بۆتان بێ، بەرلەوەی خواردنەکەتان بۆ بێ، من مانای خەونەکەتانو سەرەنجامی خەونەکەتانم بە ئێوە گوتوە .

ئنجا کە دەڵێ: ﴿ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓ﴾، وەك پێشتر باسمان کرد، واتە: من تەنیا ئەوەندەش نازانم، بەڵکو زانیاریی دیکەش پەروەردگارم فێری کردوومو، ئەوە تەنیا بەشێکە لەو زانیارییە، ﴿ذَٰلِكُمَا مِمَّا﴾، چونکە ئەو (م)ی سەر (مِما) (مِن)ەو لە (ما)دا دەغم کراوەو بۆ (تبعيض)ە، واتە: بەشێکە لەو زانیارییەی کە پەروەردگارم فێری کردووم، زانیارییەکانی دیکەش، ئیمانو عەقیدەی ڕاستو دروست بووە، زانیاریی بە شەریعەتو حەڵاڵو حەرامو، زانیاریی بە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاو، کاروباری ئابووریی و، هەموو ئەو شتانەی دیکە بوون، کە دوایی لە ژیانی (یوسوف)دا، بەرجەستە بوون .

٤) - ﴿إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْأَخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ﴾، بێگومان من دەستبەرداری ڕێبازی کۆمەڵە خەڵکێك بووم، کە بڕوایان بە خوا نیەو بە دوارۆژیش، ئەوان بێبڕوان، لێرەدا یوسوف عليه السلام زۆر لێزانانەو وەستایانە، ویستوویەتی لە پەنای تەعبیری خەونەکانیاندا، هەم خۆییان پێ

بناسێنێ، هەم بانگیشیان بکات بۆ خوا بە یەکگرتن، چونکە دیارە ئەوانە ئەهلی شیرك‌و، هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون .

وشەی (مِلَّةَ )یش، هەر بە مانای (دین) دێ، واتە: بەرنامەی ژیان، ڕێباز، ئەوەندە هەیە (مِلَّةَ )، پالْ دەدرێتە لای بەشەر، بەلاَم (دین) پالْ دەدرێتە لای خوا، دەگوترێ: ﴿ دِينِ ٱللَّهِ ﴾، بەلاَم دەگوترێ: (ملة محمد)، یان ﴿ مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ ﴾.

وشەی (ترك)، کە دەڵێ: ﴿ إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٍ ﴾، واتە: وازهێنان لە شتێك، وازهێنان، دوو واتای هەن :

١ – یان ئەوەی لەسەری بووە، وازی لێهێناوە، کە بە تەئکید لێرەدا مەبەست ئەوە نیە، چونکە یوسوف ﷺ پێشتریش لەسەر ئەو ڕێبازی بێ بڕوایی‌و کوفرو شیرکە هەر نەبووە .

٢ – مانای دووەمی ئەوەیە کە وێڕای ئەوەی دەتوانێ وەریبگرێ، ئیهمالی بکات‌و وازی لێبێنێ‌و وەرینەگرێ، کە دیارە مەبەستی پشتگوێ خستن‌و وازلێهێنانی بووە، لە ڕێبازی میسرییەکان، کە بت پەرست بوون‌و بە ڕۆژی دواییش بێبڕوا بوون .

٥) - ﴿ وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ﴾، شوێن ڕێبازو بەرنامەی باوانی خۆم، باب‌و باپیرانی خۆم کەوتووم: ئیبراهیم‌و ئیسحاق‌و یەعقووب، صەلاَت‌و سەلامی خوایان لەسەر بێ، کە وەك زانایان دەڵێن: (حَصَلَ لَهُ الشَّرَفُ العِظَامِي مَعَ الشَّرَف العِصَامِي)، واتە: هەم لە ڕووی نەسەب‌و ڕەچەڵەکەوە، خاوەن شەرەف‌و پێگە بووە، هەم لە ڕووی ئەوەوە کە خۆشی خاوەن کەسایەتییەکی بەرزو ناوازە بووە، کەواتە: خۆییان پێ دەناسێنێ، کە ئەو پیاوێکی لە مێژینەو خاوەن ڕیشەیە لە خوا پەرستییداو، پێشینی چاکیشی هەن .

٦) - ﴿ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشْرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيْءٍ ﴾، بۆمان نیە هیچ شتێك بکەین بە هاوبەش بۆ خوا .

هەڵبەتە لێرەدا ئەم تەعبیرە: (أبلغ صیغة للمبالغة في انتفاء الوصف)، صیغەیەکە ئەوپەڕی مانایەکەی دەگەیەنێ، لەوەدا کە ئەوەی وەسف دەکرێ، ئەو وەسفە بە هیچ شێوەیەك قبوولْ ناکات، واتە: بە هیچ شێوەیەك لە ئێمە ناوەشێتەوە کە هاوبەش بۆ خوا دابنێین، هیچ جۆرە هاوبەشێك .

٧) - ﴿ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ﴾، ئا ئەوەش لە بەخششی خوایە، لەسەر ئێمەو لەسەر خەڵك، واتە: بەخششی خوا هەر ئەوەندەش نیە، ئەم (مِن)ەش، بۆ بەشکردن (تبعیض)ە، یانی: ئەوە بەخششی خوایە لەسەر ئێمەو لەسەر خەڵکیش، ڕەخساندنی پێغەمبەرایەتیی و وەحیی و، ئەوە کە خوا ﷻ بەرنامەی تایبەتی خۆی بنێرێ، بەڵکو گەورەترین بەخششی خوایە، بەڵکو بەخششی ڕەهای خوا لە ژیانی بەشەردا، بریتیە لە وەحیو پێغەمبەرایەتیی، چونکە هەموو نیعمەتو بەخششەکانی دیکە، لە سایەی ئەو نیعمەتو بەخششەدا، ئینسان لێیان بەهرەمەند دەبێ، بەلام مرۆڤ ئەگەر هەموو نیعمەتەکانی دیکەی هەبن: نیعمەتی لەش ساغیی، دەستەلات، سەروەتو سامان، چیوچی، ئەگەر نیعمەتی هیدایەتی خوای نەبێو، نیعمەتی شوێنکەوتنی بەرنامەی خوای نەبێ، کە ئەویش تەنیا لە ڕێی پێغەمبەرانەوە (علیهم الصلاة والسلام)و، لە ڕێی وەحیی خواوە دەزانرێ، ئەو کاتە لەسەر هەموو نیعمەتەکانی دیکە قەرزار دەبێتەوەو لێیان بەهرەمەند نابێ .

٨) - ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ﴾، بەلام زۆربەی خەڵکی سوپاس ناکەن، واتە: سوپاسگوزار نین بۆ خواو، قەدری نیعمەتەکانی خوا نازانن، واتە: زۆربەی خەڵکی ئەو چاکەیەی خوا کە پێغەمبەرایەتیی و وەحییە، وەرناگرن، چونکە شوکری نیعمەتی خوا ئەوەیە کە تۆ نیعمەتەکە لە خوا وەربگریو، لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاری بێنی .

**مەسەلەی سێیەم** : وتوویژی یوسوف ﷺ لەگەڵ دوو هاوەڵەکەیدا، واتە: دوو هاوەڵەکەی بەندیخانەی، لەبارەی خوا بە یەکگرتن و هاوبەش بۆ خوا دانانەوەو، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە (شیرك)، بیرۆکەیەکی بۆشی بێ بنەمایە، چونکە هەر خوا بڕیار بە دەست و هەمەکارەی بوونە، بۆیە پێویستە بەس ئەویش بپەرسترێ و بەندایەتیی بۆ بکرێ :

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٣٩ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٠ ﴾.

**توێژینەوەی ئەم دوو ئایەتە لە هەشت بڕگەدا:**

**١) -** سەرەتا یوسوف ﷺ دوو هاوەڵە زیندانییەکەی دەدوێنێ و دەڵێ :

﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ﴾، ئەی دوو هاوەڵەکەی بەندیخانەم! واتە: ئەی ئەو دوو کەسەی کە لەگەڵ مندا پێکەوە لە بەندیخانەین، زانایان دەڵێن: شتێکی ئاشکراو ڕوونیشە: زۆرجار هاوپیشەیی، هاومەشرەبیی، هاوەڵێتیی لە شتێکدا، لە ئیشێکدا، لە شوێنێکدا، هاودەردیی و هاوچارەنووسیی، جێگای پەیوەندیی خزمایەتیی و ڕەچەڵەك دەگرێتەوە، بەڵکو جاری وا هەیە بەهێزتریشە، هەروەك گوتراوە: (براش دەبێ برادەر بێ)، جاری وا هەیە دراوسێیەك، یان هاوەڵێك لە خزمێك، لە کەسێك، کە لە ڕووی خوێن و گۆشت و ڕەچەڵەکەوە، زۆر لە تۆ نیزیکە، باشتر کەلێنت بۆ دەگرێ، مادام هاوکارتر بێ و دڵسۆزتر بێ و چاکتر بێ .

دیارە دۆستی ڕۆژی تەنگانەو میحنەت، جیایە لە هی کاتی فەڕحانییو ئیسرِاحەت، هیچ گومانی تێدا نیە ئەوانەی لە تەنگانەیەك دا، لە دەروویەکدا، لە نارِەحەتییەکدا، پێك ئاشنا دەبن، ئەو پەیوەندییەی لە نێوانیاندا دروست دەبێ، جیایە لەو پەیوەندییە سادەیەی کە لە حاڵەتی ئاسایی دا دروست دەبێ .

٢) - پێشێ بانگیان دەکات : ﴿ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ﴾، ئایا چەند خاوەن (پەروەردگار، سەرپەرشتیار، مشوورخۆر)ێکی جۆراوجۆرو جیاوازو پرش و بلاو، باشترن، بپەرسترێن و بەندایەتیان بۆ بکرێ، یاخود خوای تاکی مل پێ کەچکەر؟

هەڵبەتە یوسوف ﷺ کە بەو شێوەیە دوو هاوەڵە زیندانییەکەی دەدوێنێ، لەبەر ئەوە بووە کە کۆمەڵگای میسر، کۆمەڵگایەکی هاوبەش بۆ خوادانەر بووە، مێژوو نووسان دەڵێن: زیاتر لە سی (٣٠) پەرستراوو پەروەردگاریان هەبووە، ئەوەی لە هەموویان گەورەتر، پێیان گوتوە: (ئامون ڕەع)، کە ئەوە گەورەترینیان بووە، هەروەها هەر کامێك لە: (أوزوریس، أزریس، هوروس)، ئەو سێیانەش هەر گەورە بوون، وردە پەرستراوی دیکەشیان زۆر بوون، هەتا ژمارەیان گەیشتۆتە سی (٣٠) دانە !

ئنجا لێرەدا کە دەفەرمووێ: ﴿ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ﴾، ئەم وشەی (خَيۡرٌ)، زانایان دوو واتایان بۆ لێکداونەوە :

یەك : ئایا چەند سەرپەرشتیارو پەروەردگارێك باشترن بۆ مرۆڤ ، سەرپەرشتیی بکەن و، ڕوویان تێبکات و، بیانپەرستێ و بەندایەتییان بۆ بکات، یاخود یەك، کە ئەویش بریتیە لە خوای تاکی مل پێ کەچکەرو باڵادەست ؟

دوو: ئایا برِوا بوون بە چەند پەروەردگارێك لە عەقڵدا زاڵترە، عەقڵ زیاتر پەسندی دەکات، یاخود یەك خوا، کە بریتیە لە خوای تاك و پاك و بێ وێنەو بێ هاوەڵ .

واتە: وشەی (خَيْرٌ) یان لەسەر ئەسڵی واتایەکەی خۆیەتی، واتە: باشترەو چاکترە، یاخود (خَيْرٌ)، واتە: لە ڕووی عەقڵەوە، عەقڵ زیاتر پەسندی دەکاتو زاڵی دەکات، کامیان زیاتر بە عەقڵەوە دەنووسێ؟ کەواتە: (خیر) یان بۆ (تفضیل)ە، واتە: باشتر، یاخود (خیر)، واتە: زیاتر دەچێتە عەقڵەوەو، لە ڕووی لۆژیکەوە، پەسندترە ؟

٣) - ﴿ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم ﴾،

ئنجا یوسوف ﷺ یەکسەر لە نیشانە دەدا، دوای ئەوەی ئەو پرسیارە ورووژێنەرەیان لێدەکات: کە ئایا ئینسان ڕوو بکاتە یەك پەروەردگاری ڕاستەقینە، کە خوایە ﷻ باشترە، یان کۆمەڵێك پەروەردگاری هەبن کە هەر کامێکیان مەشرەبێکە؟ هەڵبەتە ئەو پەروەردگارانە کە پەرستراون، ئەو پەرستراوانە، هیچ نەبوون، وەك دوایی یوسوف دەفەرموێ: ئەوانە هەر ناون، بەڵام هەر کامێك لەوانە (سادِن)ی هەبووە، خزمەتچییەکی هەبووە، وەك چۆن ئێستا زۆر لەو گۆڕو پیرو چاکانەی کە خەڵك دەچێ بۆ سەردانیانو، بە داخەوە تووشی جۆرێك لە (شیرك) دەبن بە هۆیانەوە: لێیان دەپاڕێنەوە، داوای شیفایان لێدەکەن، داواکاریی جۆراوجۆریان لێدەکەن، هەر کامێك لەو گۆڕو پیرو چاکانە، خزمەتچییەکی هەیە، کەسێك هەیە سەرپەرشتیی دەکاتو، ئێستاش هەر (سادِن)ی پێ دەڵێن بە عەرەبی، (سدنة) کۆی (سادِن)ە، کە کاتی خۆی سەرپەرشتیی ئەو بتانەیان کردوە، (کهنة)ش کۆی (کاهن)ە، ئەوانیش هەر جۆرێك لە پەیوەندییان هەبووە بە بتو صەنەمەکانەوەو، بە ناوی ئەوانەوە قسەیان کردوە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم ﴾، واتە: ئێوە هیچ ناپەرستن، جگە لە چەند ناوێك، کە خۆتانو باب و باپیرانتان ئەو ناوانەتان هەڵداوە لەو شتانە، واتە: ئەو شتانە وەك پەرستراوێتییو پەروەردگارێتیی، هیچ بوونێکی واقیعییو دەرەکییان

نیە، تەنیا لە وەهم و خەیاڵی ئێوەدا بوونیان هەیە، ئێوەش لاسایی کردنەوەی کوێرانەی پێشینانتان کردۆتە پیشە، بە شوێنکەوتنی بیرو بۆچوون و خەیاڵ و وەهمی باب و باپیرانتان، ئێوەش ئەو شتانە دەپەرستن، کە تەنیا ناوی ڕووتن و، هیچ نێوەڕۆکێکیان نیە .

٤) - یوسوف ﷺ زیاتر بەردەوام دەبێ بۆ پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی (شیرك)و هاوبەش بۆ خوا دانان، دەفەرموێ: ﴿مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ﴾، ئەو پەرستراوانەی ئێوە، کە تەنیا ناوی ڕووتن و، نێوەڕۆکیان نیە، واتە: نێوەڕۆکێك لە قەدەر ناوەکە، ئەگەرنا ئەوە دار بووە، ئەوە بەرد بووە، ئەوە هەیکەل بووە، ئەوە بەشەر بووە، یان وەك ئێستا: ئەوە مشکە، ئەوە مانگایە، ئەوە مارە، هەروەها : ئەوە حوکمێکی خۆسەپێنە، ئەوە حیزبێکی بەرنامە دژ ئیسلامە، ئەوە ڕژێمێکی طاغووتییە، دەپەرسترێن، ئەو شتانە نێوەڕۆکێکیان هەیە، بەڵام ئەو نێوەڕۆکە نا کە لە وەهمی ئەوان دایە، کە ئەوانە پەروەردگار بن و، پەرستراو بن و، کاروباری بوونیان بە دەست بێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ﴾، خوا هیچ جۆرە بەڵگەیەکی لەسەر نەناردوونە خوار، (سُلۡطَٰنٍ)، بە مانای خاوەن دەسەڵات و حوکمڕان دێ، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ بەڵگەو دەلیل، کە دەستەڵاتی هەیە بەسەر عەقڵ و دڵی مرۆڤدا، ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا ڕاست بکات و لە هەق لانەدا، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (لە هەقی ئاو ڕادەوەستێ)، وەك چۆن حوکمڕان و سوڵتانی ڕواڵەتیی دەستەڵاتی هەیە بەسەر خەڵك و وڵات (عباد و بلاد)دا، بە هەمان شێوە بەڵگەو دەلیلیش دەستەڵاتی هەیە بەسەر عەقڵ و دڵی مرۆڤەکاندا، بۆیە ناوی لێنراوە سوڵتان، دەفەرموێ: ئەو پەرستراوانەی ئێوە، خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردوونە خوار .

کەواتە: ئیمان و عەقیدە دەبێ لەلایەن خاوەنی بوونەوەرەوە دابنرێ و بەڵگەی خوای پەروەردگاری لەسەربێ، ئەگەرنا بە پووچ لە قەڵەم دەدرێ، چونکە ئیمان و عەقیدە، بریتیە لە مامەڵە کردن لەگەڵ خاوەنی بووندا،

کە ئەویش پەنهانو نادیارە، ئنجا نادیارو پەنهانیش، تۆ نازانی چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەی، مەگەر ئەو خاوەنەی پێت بڵێ، کە خوایە ﷻ، مەگەر خوا خۆیت پێ بناسێنێ، ئەگەرنا تۆ لە خۆوە ناتوانی بڵێی: ئاوایەو ئەوە سیفەتیەتیو ئەوە ناویەتیو، دەبێ بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێو، بپەرسترێو بەندایەتیی بۆ بکرێ .

٥) - ئنجا دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾، (حُكۡم)، لێرەدا یان بە مانای یاسادانانە لە بواری عەقیدەو عیبادەتو هەڵسوکەوتەکان دا، کە حوکمو یاسادانان تەنیا مافی خوایە .

یاخود (حُكۡم) ماناکەی گشتییەو، هەم یاسادانان دەگرێتەوە، هەم تەصەڕووف لە بووندا دەگرێتەوە، واتە: (حُكۡم)، لێرەدا دەگونجێ هەم مەبەست پێی حوکمی تەشریعیی بێ، هەم حوکمی تەکوینیی، حوکمی تەشریعیی ئەوەیە: کە خوا ﷻ دایدەنێ لە شەریعەتی خۆیدا، بەڵام دوایی مرۆڤەکان بە ئیرادەی خۆیان کاری پێ دەکەن، یان کاری پێ ناکەن، بەڵام حوکمی تەکوینیی ئەوەیە: کە خوا لە بووندا دایناوە، مرۆڤو غەیری مرۆڤیشو هەموو دروستکراوەکان، چار ناچار ملکەچن بۆ حوکمو بڕیاری تەکوینیی خوای باڵادەست .

﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾، دیارە (إِنِ) لێرەدا (إِنِ)ی (نافیة)یە، یانی: (ما الحكمُ إلاّ للّه)، یانی: حوکمو تەصەڕووف کردن لە بوونداو، لە ژیانی مرۆڤیش دا، لە بەشە ئازادو ئیرادییەکەی دا، (کە مەبەست پێی حوکمی تەشریعیی: دانانی حەڵاڵو حەڕامو یاساکانی ڕێکخستنی ژیانی تاكو خێزانو کۆمەڵگایە)، تەنیا هی خوایە، واتە: بێجگە لە خوا هیچ کەسی دیکە دەست وەرناداتە کاروباری بوون، هیچ کەسی دیکە هیچی بە دەست نیە، نە هیچ دروست دەکات، نە هیچ شتێك لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی دیکە دەگۆڕێ، جگە لە خوا هیچ کەس نە کاروباری وەدیهێنانی بە دەستە، نە کاروباری بەڕێوەبردنی بوونی بە دەستە، واتە: خوا هیچ هاوبەشی نین.

٦) - بۆیەش ﴿أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ﴾، فەرمانیشی كردوە كە جگە لەو نەپەرستن، واتە: مادام وەك بەدیهێنان (تكوین) هەر خوا ﷻ هەمەكارەی بوونە، پێویستە لە ژیانی ئێوەشدا، تەنیا خوا پەرستراو و بەندایەتیی بۆ كراو بێ، مادام خوا ﷻ بە تەنیا هەمەكارەی كەون و كائینات بێ، كەواتە: پێویستە تەنیا ئەویش بپەرسترێ: ﴿أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ﴾، فەرمانی كردوە كە جگە لەوی نەپەرستن .

٧) - ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾، ئا ئەوە (كە تەنیا خوا بەندایەتیی بۆ بكرێ، سەرەتا تەنیا خوا بە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی بوون بزانی، پاشان هەر بەندایەتیی بۆ وی بكەی)، ئا ئەوە ئایین و بەرنامەی ڕێك و ڕاست و چەسپاوە، یاخود ئایین و بەرنامەیەك كە ڕاگری كاروباری دنیا و دوارۆژی ئێوەیە .

(القَيِّم: أي الثابت)، نەگۆڕ چەسپاو .

یاخود (المُقَوِّم لأمور معاشهم و معادهم)، یانی: ڕاگری كاروباری ژیان و گوزەرانی دنیا و، دوارۆژیشتان .

٨) - ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن، هەڵبەتە لێرەدا كە دەفەرموێ: زۆربەی خەڵكی نازانن، هەرچەندە بە گشتی فەرموویەتی، زۆربەی خەڵكی نازانن، بەڵام بە پێی سیاق بۆمان دەردەكەوێ كە زیاتر مەبەستی خەڵكی میسر بووە، واتە: ئەو خەڵكەی میسر، زۆربەی هەرە زۆریان نازانن، واتە: ئەو ڕاستییە نازانن، بەشێكیشیان دیارە دەیزانن، بەڵام بەزم و بازاڕی فیرعەونانە و خۆسەپێنانەیان لێ تێكدەچێ، ئەگەر بێت و بەندایەتیی بۆ خوا بكەنە بەرنامەی ژیانیان، چونكە بە پێی بەندایەتیی بۆ خوا، مرۆڤەكان هەموویان یەكسان دەبنەوە، بەڵام لە سایەی (شیرك) و پەرستنی (طاغوت) و فیرعەونەكاندا، چینایەتیی و بەرزیی و نزمیی و ئیمتیازی ناشەرعیی پەیدا دەبێ، كەچی لە سایەی خوا بە یەكگرتن و تەنیا خوا پەرستندا: یەكسانیی و ئازادیی و وەك یەك بوون،

پەیدادەبێ، بۆیە هەمیشە فیرعەونەکان و خۆ بە پەرستراوو پەروەردگار زانەکان، دوژمنی سەرسەختی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بوون، چونکە ئەگەر پەیام و بەرنامەی پێغەمبەران بچەسپێ، ئەوان ئەو بەزم و بازاڕەیان لێ تێکدەچێ، خەڵك ئەو کاتە هۆشیار دەبێتەوەو دەڵێ: فیرعەون! نەمروود! قاڕوون! فلان! فلان! تۆش وەك من مرۆڤی و هەموومان بەندەی خواین، خوا بە یەکگرتن ئاوا بانگی ئازادیی بە گوێی خەڵکدا دەدات و، خەڵك حورمەت و ڕێزو کەرامەتی خۆی دەزانێ، بەڵام شیرك و بت پەرستیی، بەرزیی و نزمیی چیناپەتیی پەیدا دەکات: ئەوانە چینی سیاسیین، ئەو بنەماڵەیە، ئەو عەشیرەتە، ئەو حیزبە، ئەو شەخسە، بەرزترەو دەبێ تەقدیس بکرێ، بەڵام لە سایەی خوا بەیەکگرتن (توحید)دا: بە پیرۆز گیراو (مُقَدَّس)و، بە پاك گیراو، تەنیا خوایە، بێ هەڵە تەنیا خوایە، بەڵام مرۆڤەکان هەموویان هەڵەکارن، هەمووشیان یەکسانن، مەگەر کەسێك مرۆڤەکان لە نێوان خۆیاندا، ڕێزێکی زیادەی لێ بنێن و بیکەنە بەرپرسی خۆیان و، پێش خۆیانی بدەن، خۆیان دەستەڵاتی پێ بدەن، ئەگەرنا لە ئەسڵدا مرۆڤەکان هەموویان یەکسانن .

لێرەدا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین کە دەفەرموێ: {مَنْ جَعَلَ الْهُمُومَ هَمًا وَاحِدًا هَمَّ الْمَعَادِ، كَفَاهُ اللهُ هَمَّ دُنْيَاهُ، وَمَنْ تَشَعَّبَتْ بِهِ الْهُمُومُ فِي أَحْوَالِ الدُّنْيَا لَمْ يُبَالِ اللهُ فِي أَيِّ أَوْدِيَتِهِ هَلَكَ}، {أَخْرَجَهُ ابن أَبي شَيْبَة برقم: (٣٤٣١٣)، وَابن ماجَهْ برقم: (٢٥٧)، وَحَسَّنَهُ الألباني}.

واتە: هەر کەسێك هەموو جێی بایەخ پێدان و خەمەکانی خۆی کردنە یەك خەم، (یەك چەقی بایەخ پێدان) خەمی دوارۆژی، خوا ﷻ خەمی دنیای لە کۆڵ دەخات و، هەر کەسێك لە کاروباری دنیادا خەم و جێی بایە پێدانەکانی جۆراو جۆربن پرش و بڵاوبن، خوا ﷻ بایەخی پێ نادات، لە کام لەو دۆڵ و شیوانەی دنیادا دەفەوتێ .

ئێمە خوا پشتیوان بێ لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتی ژمارە (١٠٦)ی ئەم سوورەتەدا، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم

مُّشۡرِكُونَ ﴿١٠٦﴾﴾، زۆربەیان بڕوا بە خوا ناهێنن، مەگەر هاوبەش بۆ خوا دانەر بن، لەوێدا باسێکی تایبەت لەبارەی شیرکەوە دەکەین، بۆیە لێرەدا بەوەندە وازی لێدێنین .

**مەسەلەی چوارەم : لێکدانەوەی یوسوف بۆ خەونەکانیان، واتە: خەونی دوو هاوەڵە زیندانییەکەی، کە یەکەمیان دەربازی دەبێ‌و، دەگەڕێتەوە سەر پیشەی پێشووی، شەراب دەداتەوە گەورەکەی خۆی، ئەوی دیکەشیان لە سێدارە دەدرێ‌و باڵندە گۆشتی سەرو گوێلاکی دەخۆن :**

دوای ئەوەی یوسوف ﷺ ئەوەی کە زۆر بە لایەوە گرنگ بوو، کە گەیاندنی پەیامی خوایە، بەوانی ڕاگەیاند، ئنجا دێتە سەر جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنەی کە پێشتر پێیدان‌و گوتی: بەرلەوەی ژەمە خواردنی ڕۆژانە کە بۆتان دیاریکراوە، بۆتان بێ، من مانای خەونەکانتان بۆ لێك دەدەمەوە، دیارە دوای ئەوەی کە خۆی پێناساندن‌و، بەرنامەو ڕێبازی خۆی پێ ئاشنا کردن‌و، بۆی باسی حەقانیەتی خوا بە یەکگرتن‌و پووچەڵیی (شیرك)کردن، ئنجا دێتەوە سەر باسی وەڵامدانەوەی پرسیارەکەی ئەوان‌و، تەعبیرکردنی خەونەکانیان، دەفەرمووێ: ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە چوار بڕگەدا:**

١) - ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ﴾، یوسوف جارێکی دیکە بانگیان دەکاتەوە، کە دیارە لە تەنیشتیشنی، بەڵام ئەوە جۆرێکە لە دڵخۆشکردن‌و لاواندنەوە (ملاطفة)و نەرمیی لەگەڵ نواندن، وەك پێشتر گوتمان: لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا هاوچارەنووس بوون‌و هاودەرد بوون، هەموویان لە بەندیخانە بوون، هەرچەندە یوسوف ﷺ بە ستەم‌و بە ناهەق بەند کراوە، هی ئەوانیش

ڕوون نەکراوەتەوە کە چۆنە؟ گرنگ ئەوەیە کە یەکێکیان دەربازی دەبیٚ‌و یەکێکیان لە سێدارە دەدریٚ .

٢) - دەڵیٚ: ئەی دوو هاوەڵە زیندانییەکەم ! یەکێکیان (دەربازی دەبیٚ‌و) مەی بەسەر گەورەو خاوەنکەیەوە دەگێڕیٚ ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ ﴾، ئەمە کە خوا ﷻ لێرەدا وا بە کورتیی دەیگێڕێتەوە، وا پێدەچیٚ یوسوف ﷵ وەك ڕیٚ خۆش کردن‌و پێشەکیی هەندیٚ قسەی دیکەی بۆ کردبن، دوایی لە درێژەی قسەکانیدا دەفەرمویٚ: یەکێکتان شەڕاب‌و مەی دەدا بە سەرپەرشتیارەکەی خۆی، کە مەبەست پێی پادشایە، ئەو پیاوەش، دیارە پێشتر پیشەکەی بریتی بووە لە مەیگێڕان‌و سەرپەرشتیکردنی ئەوانەی کە ئاوو شەربەت‌و شەڕاب دابەش دەکەن لە کۆشکی پادشادا، واتە: یەکێکتان دەگەڕێتەوە سەر پیشەکەی پێشێی، کە بریتیە لە: مەی گێڕان بەسەر گەورەکەیەوە .

٣) - ﴿ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ ﴾، بەڵام ئەوەی دیکە، هەڵدەواسریٚ‌و باڵندە لەسەری دەخۆن، هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن: یوسوف ﷵ نەیویستوە کتوپڕ پێیان بڵیٚ: تۆ لە سێدارە دەدرێی‌و، تۆش دەرباز دەبی، بۆیە بەو شێوەیە گوتوویەتی: لەو دووانەتان یەکێکتان شەڕاب‌و مەی دەدا بە گەورەکەی خۆی، مانای وایە دەربازی دەبیٚ‌و دەچێتەوە سەر ئیشی پێشێی، یەکێکیشتان هەڵدەواسریٚ، لە سێدارە دەدریٚ‌و، باڵندە لە گۆشتی سەرو گوێلاکی دەخۆن .

٤) - ﴿ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴾، ئەو مەسەلەیەی ئێوە لەبارەیەوە پرسیارتان دەکرد، تەواو بوو، واتە: تەعبیری خەونەکە بەو شێوەیەیە .

(تَسْتَفْتِيَانِ)، (الإسْتِفْتَاءُ: مَصْدَرُ اسْتَفْتَى إِذَا طَلَبَ الإِفْتَاءَ، وَهُوَ: الإِخْبَارُ بِإِزَالَةِ مُشْكِلٍ، أَوْ إِرْشَادٌ إِلى إِزَالَةِ حَيْرَةٍ، وَفِعْلُهُ أَفْتَى مُلازَمٌ للهَمْزِ، والفَتوى والفُتوى والفُتْيَاءُ، اسمٌ للخبر الصادر مِنَ المُفْتِي).

(إستفتاء): چاوگی (إستفتى)یە، (إستفتى، يستفتي، إستفتاء)، (إستفتى)، یانی: داوای فەتوای کرد، فەتوا چییە؟ بریتییە لە هەواڵدان بە لابردنی ئیشکالێك، گرێ کوێرەیەك، یاخود ڕێنمایىو ڕێ پێشاندان بۆ کەسێك کە لە سەر سەراسیمەیی دەربازی بێ، کرداری (إستفتاء)یش، بریتییە لە (أَفْتَى)، (أَفْتَى) یانی: فەتوای دا، کە هەمیشە دەبێ (همزة)ی لە پێشەوە بێ، ئنجا ناوەکەشی، ئەو ناوەی کە لە (أَفْتَى)وە دێ، هەم فەتوای پێ دەگوترێ، هەم (فوتوای)ی پێ دەگوترێ، هەم (فوتیای)ی پێ دەگوترێ، کە ناوە بۆ ئەو هەواڵەی لە (موفتي)یەوە دەردەچێت، ئەو زانیارییەی کە لە فەتوادەرەوە دەردەچێ، پێی دەگوترێ: (فَتوى، فُتوى، فُتْيا) .

ئنجا یەکێك بۆی هەیە پرسیار بکات، بڵێ: یوسوف ﷺ چۆن وا بە زەقیی بەو کابرایەی گوتوە : دەکوژرێی؟ چونکە کە دەڵێ: یەکێکتان دەربازی دەبێ، دەبێ لە خۆیان حاڵی بووبن، کامەیان سەقاو بووە، یانی: سەرپەرشتیاری دابەشکردنی ئاوو شەڕاب بووە، لە کۆشکی پاشادا، یەکسەر ئەویان لە خۆی حاڵی بووە کە ئەو دەربازی دەبێ، ئەوەی دووەمیان کە دەڵێ: بەڵام ئەوی دیکەتان هەڵدەواسرێو باڵندەکان لە گۆشتی سەری دەخۆن، چۆن وا بە زەقیی پێی گوتوە ؟

وەڵامەکەی بە بۆچوونی من ئەوەیە کە هەق دەبێ بگوترێ، ئینسان نابێ لە کاتێکدا کە هەقێکی لەلایەو، پێویستە لە کاتو شوێنی خۆیدا بگوترێ، نابێ بهێڵێ ئارەزوو و عاتیفە تێکەڵی بێو، سەرەنجام ئەو زانیارییە بگۆڕدرێ، چونکە ئەوە :

یەکەم: پێچەوانەی ئەمانەتی زانستییەو، زانیاریی دەبێ وەك خۆی بگەیەنرێ .

دووەم: جۆرێکیشە لە ناپاکیی کردن لە لایەنی بەرانبەر، لایەنی بەرانبەر پێویستە بەرچاوی ڕوون بکرێتەوە .

(یوسف)یش ﷺ هەر ئەوەندەی پێکراوە کە پێشێ وەك گوتم: دەگونجێ زەمینە سازییەکی بۆ کردبێ، پێشەکییەکی گوتوە، بۆچیش پێشێ باسی

تەعبیری خەونەکەی بۆ نەکردوون؟ هەڵبەتە ئەوە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، پێشێ هەڵساوە بۆی باسی خواپەرستیی کردوون، بۆی باسی ڕۆژی دوایی کردوون، پاشان بۆی باسی خۆی کردوون کە خۆی کێیە؟ دوایی بۆی باسی خوا بە یەکگرتن کردوون‌و بۆی باسی پووچەڵیی (شیرك) کردوون‌و، هەوڵیداوە کە شیرکیان لە دڵ‌و مێشك دەربێنێ‌و، خوا بە یەکگرتنیان لە دڵدا بچەسپێنێ، چونکە ئەگەر ئینسان بوو بە خاوەنی ئیمان‌و عەقیدەی ڕاست‌و دروست‌و، پەیوەست بوو بە خوای پەروەردگارەوەو، زانی ڕۆژی دوایی هەیە، دنیای لەلا بچووك دەبێتەوە، واتە: یوسوف ﷺ ویستوویەتی پێشێ دەربازیان بکات لە چاڵی شیرك‌و کوفرو گومڕایی، بۆ ئەوەی کە دوایی ئەو هەواڵەی پێگوتن، مادام بوونە خاوەنی ئیمان‌و خوا بە یەکگرتن، ئەو کاتە زۆر دەربەستی مردن نابن، وەك چۆن جادووگەرەکانی کە فیرعەون هێنانی، بۆ دژایەتیی مووسا ﷺ پێشێ دەیانگوت: ﴿إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾﴾ الأعراف، واتە: ئایا کرێ‌و پاداشتمان دەبێ ئەگەر ئێمە زاڵبووین ؟

پێش ئەوەی ئیمان بێنن، چاوەڕێی تۆزە تەماعێك‌و زار چەور کردن‌و ئافەرینێکیان دەکرد لە فیرعەون، بەڵام دوای ئەوەی کە ئیمانیان هێناو فیرعەون هەڕەشەی لێکردن، کە نەك خەڵات‌و بەراتیان ناداتێ، بەڵکو گوتی: ﴿لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ الأعراف، هەمووتان هەڵدەواسم، ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾﴾ طه، واتە: بە گلۆفکی دارخورماوە هەڵتاندەواسم‌و، دەزانن کێ سزایەکەی بەهێزترەو زیاتریش دەمێنێتەوە !

ئەو کاتە نەك هەر هیچ چاوەڕوانییەکیان لە فیرعەون نەبوو، بەڵکو لە هەڕەشەو گوڕەشەو لە خراپترین جۆری کوشتنیش، کە پێشانی ئەوانی داو هەڕەشەی پێ لێکردن، کە بریتی بوو لەوەی دەست‌و پێیان ڕاست‌و چەببڕێ: ﴿لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٢٤﴾﴾ الأعراف، دەست‌و پێی ڕاست‌و چەپتان دەبڕم‌و، هەمووتان هەڵدەواسم، بە

کوێشەوە؟ بە گلۆفکی دارخورماوە، تاکو خوێنیان لێدەبڕێو، بە ئازارەوە دەمرن، کەچی ئەوان چییان گوت ؟ ﴿ فَٱقۡضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقۡضِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَآ ﴿٧٢﴾ ﴾طه، واتە: هەرچی لە دەستت دێ بیکە، تۆ هەرچی دەیکەی، لەم چوارچێوەی ژیانی دنیایەدا دەیکەی !

بۆیە من پێم وایە یوسوف ﷺ زۆر حەکیمانەو، لێزانانەو، زۆر میهرەبانانە بەرلەوەی کە خەونەکەیان بۆ تەعبیر بکات، هەڵساوە بۆی باسی ئیمانو تەوحیدو عەقیدە کردوون، بۆ ئەوەی کە پێشێ ئەوانە دەربازبن لە چاڵی شیركو کوفرو گومڕاییو، لە چوارچێوەی تەسکی دنیا، تاکو دوایی کە ئەو هەواڵەیان پێدەدا، کە بۆ یەکەمیان تۆزێ خۆشەو تۆزێکی دیکە دەژی لەم ژیانە دنیاییەدا، بەلام بۆ دووەمیان دیارە شتێکی زۆر ناخۆشە، بەلام ئەگەر ئیمانو عەقیدەی خوا بە یەکگرتن لە دڵو دەروونی دا بچەسپێ، دیارە ئەو کاتە مردنو مەرگی لەلا ئاسایی دەبێتەوە، چونکە دەزانێ کە ژیانی دنیا شتێکی زوو تێپەڕەو، مەنزڵگای دوا ڕۆژ، شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونو ئیسراحەتە .

**مەسەلەی پێنجەمو کۆتایی :** **داواکردنی یوسوف ﷺ لەوەیان کە پێی وابووە قوتاری دەبێ، لەو دوو هاوەڵەی، کە لەلای گەورەکەی، لەلای پادشایەکەی باسی بکات، واتە: باسی بکات کە: کابرایەك هەیە لە بەندیخانەدا، بە زوڵم گیراوەو بوختانی پێکراوەو هیچی لەسەر نیە، بەلام شەیتان لە بیری بردەوە کە باسی یوسوف ﷺ بکات، بۆیە یوسوف چەند ساڵێك لە بەندیخانەدا ماوەتەوە :**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە چوار بڕگەدا:**

١) - ﴿ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٍ مِّنْهُمَا ﴾، ئنجا بەوەیانی گوت : کە پێی وابوو دەرباز دەبێ لەو دووانە .

لێرەدا وشەی: ( ظَنَّ )، لە: ﴿ ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٍ مِّنْهُمَا ﴾دا، وەك پێشتریش باسمانکرد، لە قورئاندا جاری وایە ( ظَنَّ ) بە مانای ئەگەرێکی زاڵ دێ، جا بە باری بووندا، یان بە باری نەبووندا، (شك)، واتە: دوودڵیی، ئەوەیە کە لە نێوەڕاستێ دابی، بە هیچ لایاندا نەیخەی، نە بوونی، نە نەبوونی، بەڵام (ظَنَّ )، ئەوەیە کە بە باری بووندا بیخەی، یان بە باری نەبووندا، بە لایەکیاندا بیخەی، بۆیە دەگوترێ: (ظَنَّ )، بریتیە لە (إحتمال راجح)، یانی: ئەگەرێکی زاڵ، ئەوە ئەسڵی واتاکەیەتی، بەڵام جاری وایە (ظَنَّ ) بە پێی سیاقەکە بە مانای یەقین و عیلمیش دێ، کە لێرەدا وا پێدەچێ بە مانای زانیاریی و یەقین و دڵنیایی بێ، چونکە یوسوف ﷺ ئەو تەعبیری خەونەی کە کردوە، پێشتر گوتوویەتی: ﴿ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓ ﴾، ئا ئەوەتان لەوەیە کە پەروەردگارم فێری کردووم، کەواتە: وەحیی یان ئیلهامێکی خوایی بووەو، یوسوف ﷺ زۆر بە دڵنیایی: هەم خەونەکەی ئەو دووانە، هەم خەونەکەی پادشا تەعبیر دەکات، بەڵکو لەبەر ڕۆشنایی خەونەکەی پاشاداو بە بناغە گرتنی خەونەکەی پادشا، نەخشەیەکی ئابووریی پازدەساڵیی دادەنێ، ئنجا بێگومان ئەگەر دڵنیا نەبووبێ، ناچێت بەو شێوەیە ئەو خەونانە تەعبیر بکات .

کەواتە لێرەدا: ﴿ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٍ مِّنْهُمَا ﴾، هەرچەندە بە (ظَنَّ )ە هێناویەتی، بەڵام لێرەدا یانی: (وقال للذي إستيقن)، یاخود (قال للذي علم أنه ناج منهما)، بەوەیانی فەرموو کە دڵنیا بوو، یان زانی ، دەرباز بوویە، لەو دووانە .

ئنجا ئایا حیكمەتەكەی چییە، كە نەیفەرمووە: (وقال للذي إستيقن)، یاخود (علم أنه ناج منهما) !

پێم وایە حیكمەتەكەی ئەوەیە: كە لە بواری تەعبیری خەوناندا، دەبێ مرۆڤ وریا بێو ئەگەری بە هەڵەداچوون دابنێ، هەڵبەتە بۆ یوسوف ﷺ نا، بەڵام یوسوف سەرمەشقە، پێغەمبەران سەرمەشقن بۆ خەڵكی دیكە، بۆیە هەندێك شتیان كردوە، كە خەڵكی دیكە بەو شێوەیە چاویان لێبكات، پێغەمبەری خوا ﷺ جاری وایە شتێكی كردوە، مۆڵەت بووە، بۆ ئەوەی ئۆممەت چاوی لێبكات لە ئاسانگیرییدا، جاری واشبووە شتێك كە قورس بووە، نەیكردوە، نەوەك لەسەر ئۆممەتەكەی فەرز بێ، وەك نوێژی تەراویح كە دوای ئەوەی سێ شەوان لەسەر یەك كردوویەتی، شەوی چوارەم فەرموویەتی: بۆیە نەمكرد نەوەكو لەسەرتان پێویست بێ[1]، كەواتە: پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هەندێك شتیان فەرمووەو هەندێك شتیان كردوە، چونكە زانیویانە دوایی خەڵك تەماشایان دەكات، ئنجا بۆ ئەوەی خەڵك بە تەماشاكردنو پەیڕەویی كردن لە یوسوف، نەچێ هەر لەخۆوە مەسەلەی تەعبیری خەون لەلای خۆیەوە بكات بە شتێكی یەكلاییكەرەوە، بۆیە وشەی گومانی بەكارهێناوە، ئەگەرنا بە نسبەت خۆیەوە، ئەو گومانە بە مانای دڵنیاییو زانیارییە.

ئنجا ئایا چی پێگوت بە یەكێك لەو دووانە، كە پێی وابوو، دەرباز بوویە؟

**٢) -** ﴿اذْكُرْنِي عِندَ رَبِّكَ﴾، لە لای پەروەردگارت، باسم بكە .

وشەی (رب)، ئەگەر بە ڕەهایی بەكار بێ، تەنیا بۆ خوا بەكاردێ، چونكە تەنیا خوا پەروەردگارو مشوورخۆرو هەمەكارەیە، بەڵام ئەگەر (رَبّكَ، رَبّي، رَبّهُ، رَبّهِ) پاڵ بدرێتە لای نادیار، یان لای دوێنراو، یان بۆ خۆت، واتە: بە بەندداار (مُقَيَّد)یی بەكاربێ، ئەوە بۆ غەیری خوای پەروەردگاریش بەكاردێ، بۆیە لێرەدا دەڵێ: لە لای مشوورخۆرو خاوەنەكەت، باسم بكە، (أي: سيدك ومالكك) كە بریتییە لە پادشا، وەك پێشتر باسمان كرد.

---

١) وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتوە، بە ژمارە :

ئنجا ئایا چۆنی باس بکات ؟ لێرەدا تەفسیلی نەدراوەتێ، بەلاّم بە سیاق‌و سەلیقە دیارە کە: باسی ستەم لێکراویی‌و بە ناهەق گیراویی یوسوف بکات‌و، باسی ئەوە بکات کە ئەوە رِێی تێدەچێ یوسوف ﷺ گێرِابیەتەوە: من کاتی خۆی بەو شێوەیە برایەکانم لە بیرێیان هاویشتووم، دوایی کاروان هەلّیگرتوومەوەو کردوویانم بە کۆیلەو، فرۆشتوویانم، دوایی بوختانم پێکراوەو بە ناهەق زیندانیی کراوم، وادیارە ئەو باس‌و خواسانەی کردوون بۆ دوو هاوەلّەکانی، باسی مەزلوومیەتی خۆی کردوە، ئنجا گوتوویەتی: ئەوە باس بکە لە لای پادشا .

٣) - ﴿ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ ﴾، شەیتان باسکردنی (یوسوف)ی لەلای خاوەنەکەی لە بیر بردەوە، یانی: (فأنسى الشيطانُ الذي نجا، أن يذكر يوسف لربه)، شەیتان لەبیر ئەوەیانی بردەوە کە دەرباز بوو لە بەندیخانە، کە باسی یوسوف بکات لەلای گەورەو خاوەنەکەی .

ئەوە ئەو واتایەیە کە من جگە لەوەم بە دلّ نیە .

بەلاّم هەندێك لە توێژەرەوان، بەلّکو زۆربەیان، واتایەکی دیکەیان بۆ لێکداوەتەوە، کە من پێم وایە نەگونجاوە، ئەویش ئەوەیە دەلّێ: (أنسى الشيطانُ يوسفَ ذِكر الله تعالى)، شەیتان لە بیر (یوسوف)ی بردەوە کە باسی پەروەردگاری خۆی بکات‌و، یادی خوای بەرز بکات .

بەلاّم بێگومان هەر یەکەمیان مەبەستە .

بە بەلّگەی ئەوە کە دوایی یوسوف ﷺ نە داوای لێبوردنی لە خوا کردوە، بلّێ: خوایە! لێم ببوورە کە من لە بیرم چوو لە جیاتی ئەوەی یادی تۆ بکەم، داوام لەو هاوەلّە زیندانییەم کرد، کە بۆ خاوەنەکەی خۆی باسم بکات، ئەوە باس نەکراوە، بەلاّم ئەگەر هەلّەیەك بووایە یوسوف کردبای‌و لەسەری سزا درابایە، وەك هەندێ لە توێژەران دەلّێن! بە تەئکید داوای لێبوردنی لە خوای پەروەردگاری دەکرد، بۆ ئەو هەلّەیەی کە کردوویەتی، ئنجا هەر لە سوورەتی (یوسوف)دا کە دوایی دەیگەینێ، لە ئایەتی ژمارە (٤٥)دا هاتوە: ئەو کەسەی باسکردنی (یوسوف)ی لای خاوەنەکەی لەبیرچۆتەوە، هاوەلّە زیندانییەکەی

بووە، چونکە دەفەرموێ : ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ ﴿٤٥﴾ ﴾يوسف، ئنجا ئەوەی کە لەو دووانە دەربازی بووو، دوای چەند ساڵێك وە بیری هاتەوە، {واتە: (یوسوف)ی وە بیرهاتەوە}، گوتی: من تەعبیری ئەو خەونەتان پێدەڵێم، بمنێرن، واتە: بمنێرن بۆ لای (یوسوف)، دیارە بۆی باسکردوون: کابرایەك لە بەندیخانەدا گیراوە، بە ناوی (یوسوف کوڕی یەعقووب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم)، پیاوێکی ئاواو ئاوایە، هێندە چاکەکارە، کاتی خۆی منو هاوەڵێکم دوو خەونمان بینیبوون، خەونەکانی ئێمەی تەعبیر کردن، من دەربازم بوو ئەوەی دیکە ئیعدام کرا، تەعبیرەکەی ڕاست دەرچوو، ئێستاش من بنێرن بۆ ئەوەی تەعبیری ئەو خەونەی پادشاش بکات .

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ ﴾، {(وَٱدَّكَرَ)، ئەسڵی خۆی (واذتكر)ەیە}، یانی: ئەو کەسەی دەربازی بوو لە دوو کەسەکان ، دوای چەند ساڵێك وە بیری هاتەوە، گوتی: دیارە کەسێك وە بیری دێتەوە، کە لە بیری چووبێتەوە، کەواتە: هاوەڵە بەندییەکەی بووە، چونکە لە بیری چۆتەوە؟ ئەوەی کە وەبیری هاتۆتەوە، ئەو هاوەڵەی بەندیخانەی بووە، ئنجا دیارە ئەوەی لە بیریشی چۆتەوە، هەر ئەو بووەو لەبیری چۆتەوە: باسی یوسوف بکات بۆ پادشایەکەی .

کەواتە: ئەوەی کە ڕوونکەرەوانی واتایەکانی قورئان، بنیاتیان ناوە لەسەر ئەوەی گوایە: خوا سزای (یوسوف)ی داوە بەهۆی ئەوەوە کە لە جیاتی ئەوەی باسی خوا بکاتو یادی خوا بکاتو، هاوکاریی لە خوای پەروەردگار وەربگرێ، پەنای بردۆتە بەر ئەو هاوەڵە زیندانییەی، کە لای خاوەنەکەی باسی بکات، لە ڕاستییدا ئەوە هیچی وانیە، چونکە جارێ هۆکار وەرگرتن (الأخذ بالأسباب) هیچ گوناهی تێدانیە، پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ هەر وایکردوە، پێغەمبەرانیش هەر وایانکردوە .

پاشان ئەو ڕیوایەتانەی کە لەوبارەیەوە هاتوون، پسپۆڕانی فەرموودەناس هەموویان دەڵێن: هیچیان سەنەدیان ڕاست نیەو بەهێزنین، ئنجا یوسوف

عليه السلام خوا لەسەر ئەوە سزای نەداوە، کە پەنای بردۆتە بەر غەیری خوا، چونکە یوسوف عليه السلام شتێکی زۆر شەرعییو ڕەوای کردوە، کە ویستوویەتی داواکردن لەو برادەرەی، وەك هۆکارێك بگرێتەبەر، ئەگەرنا دڵی هەر بە خواوە پەیوەست بووە .

ئنجا ئەوەش کە بەهۆی لە بیرچوونەوەی ئەو هاوەڵە زیندانییەوە، کە بۆ خاوەنەکەی باسی یوسوف بکات، چەند ساڵی دیکە ماوەتەوە، ئەوە سزایەکی خوایی نەبووە، چونکە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە بەڵاو گرفتارییان بەسەردێ، سزا نیە لەسەر گوناهیان، بەڵکو بەرزییە بۆ پلەکانیان، وەك لەم دەقەدا هاتوە: {عَنْ مُصْعَبِ بن سَعْدٍ عَنْ أبيهِ قَالَ: قُلْتُ: يا رَسولَ اللهِ أيُّ النـاسُ أشد بَلاءً؟ قَالَ: الأنْبِياءُ، ثُمَّ الأمْثَلُ فَالأمْثَلُ}، {رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٤٩٤)، وَالترمِذِيُّ برقم: (٢٣٩٨)، وَابن ماجَهْ برقم: (٤٠٢٣)، وَابن حِبانَ برقم: (٦٩٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٢١)، وَقَالَ: الألباني حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٤٣)} .

واتە: ئەو هاوەڵە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! صلى الله عليه وسلم کێ لە هەموو کەس تاقیکردنەوەی قورسترە، یاخود: ناڕەحەتییەکانی کە دێنە ڕێی، بەمەبەستی تاقیکردنەوە، زەحمەتترن؟ فەرمووی: پێغەمبەران، دوایی پێ بە پێ (واتە: هەتا زیاتر مرۆڤ وەك پێغەمبەران بچێت، لە ئیمانو عەقیدەو دینداریی و مسوڵمانەتییدا، تاقیکردنەوەکەشی قورستر دەبێت) .

بەڵێ ئەوەی کە لە هەموو کەس تاقیکردنەوەی سەختترە، پێغەمبەرانن، دوایی زانایانن، دوایی پێ بە پێ، بۆچی تاقیکردنەوەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) سەختترە ؟ چونکە لە خوا نزیکترنو، تاقیکردنەوەکەشیان قورسترە، نەك تاقیکردنەوەکانیان بریتی بن لە سزادان، لەسەر ئەوەی کە گوناهیان کردوە! بەڵکو بۆ ئەوەیە بۆ خەڵك ببنە سەرمەشق، کە خۆڕاگر بن، ئنجا ئەگەر یوسوف هێندە لە سجندا نەمابایەوە، نەدەبوو بە سەرمەشق بۆ ئەوانەی کە بە ناحەق زیندانیی دەکرێنو، دەچنە بەندیخانەوەو دواییش بە عیززەتەوەو بە کەرامەتەوە، بەبێ ئەوەی پەیامو بەرنامەی خۆیانیان

لەبیر بچێ، تەنانەت لە ناڕەحەتترین کاتدا ! بەڵام ئێستا یوسف بۆیان دەبێتە سەرمەشق، کە ئەگەر ئەو چەند ساڵەیە لەوێدا نەمابایەوە، هەر چەند ڕۆژێك بووایە، نەدەبوو بە سەرمەشقی ئەوانەی کە بە ستەم دەخرێنە بەندیخانەکانەوەو، خۆڕاگرانەو سەربەرزانەش لێی دەردەچن .

٤) - ﴿فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ﴾، ئیدی چەند ساڵێك لە بەندیخانەدا مایەوە. (البضع من الثلاث إلى التسع)، پێشتریش باسمانکرد (بِضۡعَ) لە زمانی عەرەبییدا لە (٣) تا (٩) دەگرێتەوە، کە زۆربەیان دەڵێن: یوسوف حەوت ساڵ ماوەتەوە لە بەندیخانەدا .

لەم ئایەتەش وەردەگیرێ کە کاروباری بەندیخانەکانی ئەو کاتە، زۆر بێسەروبەرو ستەمکارانە بووەو، ماوەی زۆر لە خەڵك نەپێچراوەتەوە، ئەوەتا یوسوف حەوت ساڵان بە هەندێك ڕیوایەتان، پێنج ساڵان ماوەتەوە، هەر نەشیانزانیوە بۆچی لەوێیە، کە دیارە لە گرتووخانەکانی ئەم ڕۆژگارەی ئێستاشماندا، ئەو زوڵم و ستەمانە هەر هەن، بەڵام بە پێی شەریعەتی ئیسلام دەڵێ: (ينظر القاضي أول ما ينظر فيه، كلَّ يوم أمرَ المساجين)[1] واتە: دادوەر یەکەمین شتێك کە هەموو ڕۆژێ تەماشای دەکات، کاروباری گیراوەکانە، کاروباری بەندیخانەکانە .

ئایا هەر کەسە لەسەر چی هاتوە بۆ بەندیخانە ؟ چەند بەند کراوە ؟ چەندی ماوە ؟ چی کردوە ؟ چۆنی کردوە ؟ دەبێ هەموو ڕۆژێ یەکەمین شتێك کە قاضی تەماشای دەکات، ئەوە بێ .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) التحرير والتنوير، ج ١٢، ص ٢٧٩.

# دەرسی حەوتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە حەوت (٧) ئایەت پێك دێ، كە شەشەمین ئاڵقەی زنجیرەی بەسەرهاتی یوسوف ﷺ دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (٤٣ تا ٤٩)، كە تێیاندا باسی خەون دیتنی پادشا كراوە، بە حەوت ڕەشە وڵاخی قەڵەوو، حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوز، كە حەوت ڕەشە وڵاخی لەڕو، حەوت گوڵە دانەوێڵەی وشك، ئەو حەوتانەی دیكەیان خواردوون، داواشی كردوە لە قسە ڕۆیشتووان و ڕاوێژ پێكراوانی دەوروبەری كە هاونشینی بوون، لە كۆڕو مەجلیسەكەیدا بوون، كە بۆی تەعبیر بكەن، بەڵام ئەوان گوتوویانە: ئەم خەونانەی تۆ لە جۆری خەونانی تێكەڵ پێكەڵن، ئێمەش لێكدانەوەی ئەو جۆرە خەونانە نازانین .

بەڵام ئەو هاوەڵە زیندانییەی یوسوف ﷺ، لە دوو هاوەڵەكەی، كە قوتاری بووو دوای چەند ساڵێك (یوسوف)ی دەكەوێتەوە یاد، بە پادشا دەڵێ: بمنێرن من تەعبیرەكەیتان بۆ دێنم، كە مەبەستی ئەوەبووە، دەچێ لە یوسوف دەپرسێ و لێكدانەوەی خەونەكەیان بۆ دێنێ .

سەرەنجام دەچێتە لای یوسوف و خەونەكەی پادشای وەك خۆی بۆ باس دەكات، ئەویش لەمیانی تەعبیركردنی خەونەكەی پادشادا، نەخشەیەكی ئابووریی گرنگی پازدە ساڵەیان بۆ دادەڕێژێ، كە حەوت ساڵ لەسەر یەك دەغڵ و دان ڕەنێو بێنن و، ئەو دانەوێڵە لە گوڵەكانیدا عەمبار بكەن و هەڵگرن، پاشان حەوت ساڵی وشكە ساڵ و گرانیی و قات و قڕیی دێن، ئنجا پێیان دەڵێ: كە لەو ئازووخەو دانەوێڵە پاشەكەوت كراوە، پێویستیی خۆیان دابین بكەن، پاشان ساڵێكی دیكە، دێ، واتە: ساڵی پازدەیەم، ساڵێكی هەرزانیی و فەڕحانیی دەبێ و لەو قەیرانە ئابووریی و گرانییە ڕزگاریان دەبێ، بارانیان بۆ دەبارێ، تێیدا دەكەونەوە نێو عەیش و نۆش و ژیانی خۆش .

﴿وَقَالَ ٱلْمَلِكُ إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ ۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ أَفْتُونِى فِى رُءْيَٰىَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ ﴿٤٣﴾ قَالُوٓا۟ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ۖ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ ٱلْأَحْلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِى سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ لَّعَلِّىٓ أَرْجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِى سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴿٤٩﴾﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{پادشا گوتی: (خەونم بینی) من حەوت ڕەشە وڵاخی قەڵەوم دەبینین، حەوتی لەڕو لاواز دەیانخواردن، وە حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوزو حەوتی دیکەی وشك، (وشکەکان سەوزەکانیان دەخوارد)، ئەی برپیار بە دەستان‌و دەست ڕۆیشتووان! ئەگەر خەون لێکدەدەنەوە، لەبارەی خەونەکەمەوە، هەواڵ‌و زانیارییم بدەنێ ﴿٤٣﴾ گوتیان: (خەونەکەت لە جۆری) خەونانی تێکەڵ پێکەڵە، ئێمەش لێکدانەوەی خەونانی تێکەڵ پێکەڵ نازانین ﴿٤٤﴾ ئەو کەسەی کە قوتاری بوو بوو لە دوو {هاوەڵە بەندی}ەکە {ی یوسوف}و، پاش چەند ساڵێك وەبیری هاتەوە (کە یوسوف پێی گوتبوو: لە لای خاوەنەکەت باسم بکە!)، گوتی: من هەواڵی لێکدانەوەکەیتان دەدەمێ، بمنێرن (بۆ لای یوسوف) ﴿٤٥﴾ (چوو بۆ لای یوسوف‌و گوتی: ) یوسوف ئەی هەرە ڕاستبێژ! هەواڵمان بدەیە لەبارەی (لە خەوندا دیتنی) حەوت ڕەشە وڵاخی قەڵەو، کە حەوتی لەڕ دەیانخواردن‌و، حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوزو حەوتی دیکەی وشك، بەڵکو بگەڕێمەوە لای خەڵك بەڵکو بزانن، (چۆن لەگەڵ ئەو خەونەی پاشادا مامەڵە بکەن؟) ﴿٤٦﴾ (یوسوف) گوتی: (بە گوێرەی ئەو خەونە دەبێ بەم جۆرە بکەن)، حەوت ساڵان شێلگیرانە کشتوکاڵی دەغڵ‌و دان بکەن، ئنجا هەرچی ڕەنێوتان هێنا، (دروێنەتان کرد) جگە لە کەمێك لەوەی دەیخۆن، هەر لە گوڵەکەیدا بیهێڵنەوە، لە عەمبارەاندا هەڵیگرن (باشتر دەپارێزرێ) ﴿٤٧﴾ ئنجا دوای ئەوە حەوت (ساڵ)ی سەخت (و وشکە ساڵیی‌و بێ دەرامەت) دێن، کە هەرچی بۆتان پێشخستوون (و پاشەکەوتتان کردوە لە دەغڵ‌و دان لە عەمبارەکانتاندا هەڵتان گرتوە) جگە لەوەی هەڵیدەگرن‌و دەیپارێزن، هەمووی دەخۆن (و تەواوی دەکەن) ﴿٤٨﴾ ئنجا دوای ئەوە، ساڵێك (ی پڕ بەرەکەت) دێ، کە خەڵك هاوکاریی دەکرێن، بارانیان بۆ دەبارێنرێ‌و تێیدا میوە دەگوشن، (وە سرکەو شەربەت‌و شەراب دروست دەکەن) ﴿٤٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( بَقَرَاتٍ ): (جَمْعُ بَقَرَة، البَقَرَ اسْم جِنْسٍ، وَالبَقَرَةُ تَقَعُ عَلَى الذَّكَرِ والأُنْثَى)، وشەی (بقرات)، كۆی (بقرة)یە، وشەی (البقر)، ناوی جینسە بۆ ڕەشە وڵاخ بەگشتی، كە هەم گا، هەم مانگا، هەم كەڵ، هەم گامێش، هەر چواریان دەگرێتەوەو، وشەی (بقرة)، بۆ نێرو مێ بەكاردێ، وەك لە سووڕەتی (الأنعام)دا، لە بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرەدا: (تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێز) باسم كردوە، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا كە دەفەرمویٚ: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ ﴿١٤٣﴾﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ﴿١٤٤﴾﴾، لەوێدا باسم كردوە، كە نێرەی ڕەشە وڵاخ (ثور)ی بۆ بەكاردێ‌و، مێیەكەشی (ثورة)ی بۆ بەكاردێ، كە بە كوردیی ئێمە دەڵێین: (گا) بۆ نێر، (مانگا) بۆ مێ، بە نسبەت كەڵ‌و گامێشیشەوە دەگوترێ: (جاموس)و (جاموسة) .

( سِمَانٍ ): (السِّمَنُ: ضِدُّ الهُزَالِ، يُقَالُ سَمِين وَسِمَان، سِمان جَمْعُ سَمِين وَسَمِينَة)، (سِمَن)، واتە: قەڵەویی، دژی (هُزَال)ە، (هُزَال)، واتە: لەڕیی، لاوازیی، دەگوترێ: (سَمِين وَسِمان)، یانی: وشەی (سِمان)، كە كۆیە، دەگونجێ كۆی (سَمِين) بێ، واتە: ڕەشە وڵاخێكی نێری قەڵەو، دەشگونجێ كۆی (سَمِينَة) بێ، واتە: ڕەشە وڵاخێكی مێینەی قەڵەو، واتە: هەم بۆ گا، هەم بۆ مانگا، بۆ گایەكان، (سِمان)، واتە: چەند گایەكی قەڵەو، هەروەها دەشگونجێ مەبەست پێی چەند مانگایەكی قەڵەو بێ، بە كوردیی ئێمە دەڵێین: ڕەشە وڵاخ، ئەو كاتە نێرو مێی دەگرێتەوەو، وێڕای گاو مانگا گامێش‌و كەڵگامێشیش دەگرێتەوە .

( عِجَافٌ ): (جَمْعُ أَعْجَف وَعَجْفَاء)، (عِجاف) کۆی (أَعْجَف)ە، بۆ ڕەشە وڵاخی نێر کە لەڕو لاواز بێ‌و، (عَجْفَاء)یش، ڕەشە وڵاخی مێ، کە لەڕو لاواز بێ، واتە: گاو کەڵگامێشی لەڕو لاوازو، مانگاو گامێشی لەڕو لاواز .

( سُنۢبُلَٰتٍ ) و(سنابل) هەردووکیان کۆی (سنبلة)ن، یانی: گوڵ، گوڵە گەنمە، گوڵە جۆیە، گوڵە هەرزنە، گوڵە دارووجانە، گوڵە زوڕاتە، گوڵە مەرەزمیە، واتە: برنج، هەموویان دەگرێتەوە، دەگوترێ (سَنْبَلَ الزَّرْعُ: خَرَجَ سَنْبُلُهُ)، (سَنْبَلَ الزَّرْعُ) واتە: کشتوکاڵەکە گوڵیدا، گوڵی دەرکرد .

( تَعۡبُرُونَ ): (التعبير مُخْتَصٌّ بتعبير الرؤيا، وَهُوَ العَابِرُ مِنْ ظَاهِرِهَا إِلَى بَاطِنِهَا)، (تعبير) تایبەتە بە مانا لێکدانەوەی خەون، ئەویش ئەوەیە کە بابای مانا لێکدەرەوەی خەون، لە ڕواڵەتی خەونەکە، لە ڕواڵەتی ڕەمزو هێمایەکانەوە، دەچێ بۆ دیوی پەنهانیان .

( أَضۡغَٰثُ ): (جَمْعُ ضِغْث، وَهُوَ قَبْضَةُ أَو حُزْمَة مِنْ رِيحَانٍ أَوْ حَشِيشٍ أَوْ قُضْبَانٍ)، (أَضْغَاث)، کۆی (ضِغْث)ە، (ضِغْث)، بە چەپك دەگوترێ، یان بە دەسك، دەسکە ڕیحان، یان دەسکە گیا، یاخود دەسکە شوڕك .

( أَحۡلَٰمِ ): (جَمْعُ حُلُم وَحُلْم، حَلَمَ فِي نَوْمِهِ يَحْلُمُ حُلْما وَحُلُما وَحُلَما وَتَحَلَّمَ وَاحْتَلَمَ)، (أَحْلام)، کۆیە، کۆی (حُلُم وحُلْم وحُلَم)ە، هەرسێکیان هاتوون، واتە: خەون، دەگوترێ: (حَلُمَ فِي نَوْمِهِ يَحْلُمُ وَتَحَلَّمَ وَاحْتَلَمَ) هەموویان بەکارهاتوون، واتە: خەونی بینی .

( وَٱدَّكَرَ ): (أَصْلُهُ إِذْتَكر، وَهُوَ افْتِعَالٌ مِنَ الذِّكر)، (إِدَّكر) ڕیشەکەی بریتییە لە (إِذْتَكر)، کە لە (إفتِعَال)ەو، ئەویش لە (ذکر)ەوە هاتوە، (ذکر)، واتە: هاتنەوە بیر، یادکردن .

( أُمَّةٍ ): (المُدَّةُ الطَّوِلة، لأَنَّها زَمَنٌ يَنْقَرِض فِي مِثْلِهِ جِيلٌ، والجيل أُمة)، (بَعْدَ أُمة)، واتە: دوای چەند ساڵێك، (أمة)، لێرەدا، واتە: ماوەیەك كاتی درێژ، چونكە لە ماوەی چەند ساڵێكدا، پشتێك، جیلێك دەڕوا، (جیل)یش، ئۆممەتی پێ دەگوترێ، بەو ئیعتیبارە كە ئۆممەتێك لەو چەند ساڵەدا دەژی، بەو ئیعتیبارە بە چەند ساڵێك گوتراوە ئۆممەت .

( ٱلصِّدِّيقُ): (أَصْلُهُ صِفة مُبالَغة مُشتقة مِنَ الصدق)، (صِدّيق) لە ئەسڵدا بریتیە لە سیفەتێك كە زێدەڕۆیی تێدا كراوەو لە (صدق)ەوە هاتوە، واتە: زۆر ڕاست بێژ، {یاخود زۆر بەڕاست دانەر، یاخود كەسێك كە كردەوەكانی قسەكانی وەڕاست دەگێڕنو بە ڕاست دەزانن، كردەوەكانی پشتگیریی قسەكانی دەكەن، كە ڕاستن} .

( دَأَبًا ): (الدأبُ: العَادَةُ والإستِمْرَارُ عَلَيْها)، (دَأب)، بریتیە لە نەریتێك كە عادەتی پێوە گیراوەو، دەوامی لەسەر بكرێ .

( حَصَدتُّمْ ): (حَصَدتُّمْ)، واتە: ڕەنێوتان هێنا، یانی: هەڵتانگرتو درەوتان كرد، چونكە (أَصْلُ الحَصْدِ: قَطْعُ الزَّرْعِ)، (حَصْد)، ئەوەیە كە كشتوكاڵ ببڕدرێ واتە: درەو بكرێ .

( تُحْصِنُونَ): (أَي: تُحْـرِزُون فِي المَواضِع الحَصِينة الجارِية مَجْرَى الحِصْنِ، تَدَّخِرُون)، (تُحْصِنُون)، واتە: لەو شوێنانەدا كە وەك قەڵا وان، وەك چۆن قەڵا مرۆڤان دەپارێزێ، ئەو شوێنانەش، ئەو عەمبارانەش كە ئازووخەیان تێدا هەڵدەگیرێ، ئازووخەو دەغڵو دانەكە دەپارێزن، مەگەر لەوەی كە دەیپارێزن، واتە: پاشەكەوتی دەكەن .

( يُغَاثُ ٱلنَّاسُ ): واتە: خەڵك بارانیان بۆ دەبارێنرێ، یاخود خەڵك هاوكاریی دەكرێنو وەڵامیان دەدرێتەوە، (الغَوْثُ: يُقَالُ فِي النُّصْرَةِ وَالغَيْثُ : المَطر)، (غَوْث) بۆ هاوكاریی كردنو سەرخستن بەكاردێ، بەڵام (غَيْث)، بۆ باران،

کەواتە: (یغاث)، هەم دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ، کە وەڵامیان دەدرێتەوەو هاوکاریی دەکرێن، دوای ئەوەی بە زمانی وتار (مقال) یان بە زمانی حاڵ، داوای هاوکاریی‌و یارمەتییان لە خوا کردوە، یان واتە: بارانیان بۆ دەبارێنرێ، کە دیارە هاوکاریی کرانەکەش بەشێکی سەرەکیی هەر بریتی بووە لە ئاو دابەزێنران لە ئاسمانەوە، لە شێوەی باران‌و بەفرو تەرزەدا .

( **يَعۡصِرُونَ**): (العَصْرُ: مَصْدَرُ عَصَرْتُ، وَالمَعْصُورُ: الشيءُ العَصِيرُ، يَعْصِرون: يَسْتَنْبطونَ مِنْهُ الخَيْر، وقُرِئَ يُعْصَرُون، أَي: يُمْطرون)، (عصر) بریتیە لە چاوگی (عَصَرْتُ)، واتە: گوشیم (مَعْصُور)یش، ئەو شتەیە کە بگوشرێ‌و لە ئەنجامی گوشینەکەیدا، ئەو شیلەیەی کە لێی پەیدا دەبێ، پێی دەگوترێ: (معصور)، یاخود (عصیر)، واتە: گوشراو یان شیلە، هەروەها (یَعْصِرون)، واتە: خێرو چاکەی لێوەدەست دێنن، لەو ساڵەدا، خوێنراویشتەوە: (یُعْصَرُون، أَي: يُمْطرون)، واتە: بارانیان بۆ دەبارێنرێ .

## مانـای گـشـتـی ئایـەتەکـان

لێرەدا باسی خەونەکەی پادشا دەکرێ، کە دواتر یوسوف بۆی لێك دەداتەوە:

﴿ وَقَالَ ٱلْمَلِكُ إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبْعَ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ ۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ أَفْتُونِى فِى رُءْيَٰىَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ ﴾،

واتە: ئنجا پادشایەکە گوتی: من لە خەوندا حەوت ڕەشە ولاخی قەڵەوم دەبینین، حەوت ڕەشە ولاخی لەڕ دەیانخواردن، هەروەها حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوزم دەبینین، حەوت گوڵە دانەوێڵەی وشك دەیانخواردن، ئەی دەستڕۆیشتووان و قسە بەدەستان! هەواڵم پێبدەن دەربارەی خەونەکەم، ئەگەر ئێوە خەون لێکدەدەنەوەو، دەتوانن تەعبیری بکەن .

بێگومان (أل)ی سەر (ٱلْمَلِكُ )، بۆ ناساندن (تعريف)ە، بەڵام ناساندنی (عهد)، کە وەك پێشتریش گوتوومانە: (ألف) و (لام)ی (عهد)، لە کوردییدا دەکەوێتە بەرانبەر وشەی (کە)، ئەگەر گوتم: کتێبم بۆ بێنە، نازانی چ کتێبێکە، بەڵام کە گوتم: کتێبەکەم بۆ بێنە، واتە: ئەو کتێبەی کە زانراو (معهود)ەو دەزانین کامەیە، لێرەشدا: ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ﴾، یانی: پادشایەکە گوتی، واتە: پادشای میسڕ، کە وەك پێشتر گوتمان: ئەو پادشایە لە فیرعەونەکانی میسڕ نەبووە، بەڵکو لە هۆزی، یاخود لە گەلی هەکسۆس (الهكسوس) بووە، کە ئەویش لە (عمالقة) بووەو ئەوانیش یان (کەنعانیی) بوون، یاخود (عەرەب) بوون، کە مێژوو نووسانی یۆنانیی و ئیغریقیی گوتوویانە: گەلی هەکسۆس، ماوەی (٣٧٥) ساڵ، (میسڕ)ی باشووریان خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیانو، مێژوونووسانی یۆنانیی بە (الملوك الرعاة)، واتە: پادشا شوانکارەکان، یاخود پادشا مەڕدارەکان، یاخود پادشا بیابانییەکان، ناویان هێناونو، لە ساڵی (١٩٠٠) تاکو (١٥٢٥)ی پێش زایین، واتە:

(٣٧٥) ساڵ حوکمی (میسر)یان کردووە، ئەو کاتە پادشایەکانی گەلی (قبط)، پادشا قیبتییەکان {کە ئەوان وشەی فیرعەونیان بۆ پادشای خۆیان بەکارهێناوە ، یانی: فیرعەون ناوی شەخسیی نەبووە، بەڵکو نازناوی پادشایەتیی بووە، وەك چۆن دواتر ڕۆمەکان نازناوی پادشاییەتیان بریتی بووە لە (هیرەقل)و هی فارسەکان بریتی بووە لە (کیسرا) هەروەها هەر شوێنە نازناوێکیان هەبووە بۆ پادشایەکانیان}، کە فیرعەونیان پێ گوتراوە، تەنیا (میسر)ی سەروویان لە ژێر ڕکێفدا بووەو، شاری (طیبة)، کە پایتەخت بووە، بە دەستیانەوە بووە، بەڵام (میسر)ی خواروو (المصر السفلی)، لە ڕۆژگاری (یوسوف)داو پێش ئەوەش بەدەست ئەوانەوە بووە کە وەك گوتمان: پێیانگوتراوە: (هەکسوس)و پادشا شوانکارەکان، (الملوك الرعاة)، ئنجا چ لە کەنعانییەکان بووبن، چ لە گەلی عەرەب بووبن، مێژوونووسان لەوبارەوە ڕاجیاییان هەیە .

ئنجا ئەو گەلە، لە خێزانی سێزدەیەمەوە تاکو خێزانی هەژدەیەم، بە نسبەت حوکمی قیبتییەکانەوە، چونکە قیبتییەکان کە پادشاکەیان نازناوی فیرعەونی هەبووە، حوکمی میراتیی بووە، هەموویان بە خێزان خێزان ژماردوون، ئنجا ئەو ماوەی (٣٧٥) ساڵە، کەوتۆتە بەرانبەری حوکمڕانی خێزانی سێزدەیەم تاکو خێزانی هەژدەیەم، لە حوکمی قیبتییەکان، (واتە: فیرعەونیەکان لە (میسر)ی باکوردا)، بەڵام (میسر)ی باشوور بەدەست ئەو هۆزەوە بووەو، ڕووداوی (یوسف) علیە الصلاة والسلام، لە سەردەمی خێزانی حەڤدەیەمدا بووە، واتە: ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی کە کۆتایی بە حوکمی ئەو هۆزە بێ، کە (الهکسوس) یان (الملوك الرعاة)یان پێ گوتراوە .

ئنجا دوای ئەوەی پادشا خەونەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە، تاکو کۆڕی ڕاوێژکارانی بۆی مانا بکەن، دیارە ئەوانیش مانایەکەی نازانن، بەڵام پێشیان نەنگیی دەبێ بڵێن: نازانین، چونکە خۆیان بە شارەزا لە قەڵەم داوەو، ڕەنگە شارەزاش بووبن، بەڵام سەریان لەو خەونەی پادشا دەرنەچووە، بۆیە دەڵێن: ﴿ قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٍۖ ﴾، گوتیان: ئا ئەوانە خەونی تێکەڵ پێکەڵن، ﴿ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴾، ئێمەش بە مانا لێکدانەوەو تەعبیر کردنی ئەو جۆرە خەونانەی کە

تێکەڵو پێکەڵن، زانانین، زانایان گوتوویانە: بۆچی گوتوویانە: ﴿ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ﴾؟ لە حاڵێکدا پادشا تەنیا یەك خەونی بینیوە ؟

دەڵێن: لەبەر ئەوەی خەونەکەی بە چەند خەونێك دانراوە، چونکە هەم حەوت ڕەشە وڵاخی قەڵەوی بینیون، هەم حەوت ڕەشە وڵاخی لەڕی بینیون، کە لەڕەکان قەڵەوەکانیان خواردوە، پاشان حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوزی بینیون و حەوت گوڵە دانەوێڵەی وشکی بینیون، کە وشکەکان سەوزەکانیان خواردوە، کەواتە: کۆمەڵێك شتی بینیوە، بۆیە گوتوویانە: ﴿ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ﴾، ئەوانە خەونی تێکەڵ پێکەڵن .

دەشگونجێ بڵێین: گوتوویانە: ئەو خەونەی تۆ، لە جۆری خەونانی تێکەڵو پێکەڵە، ئێمەش لێکدانەوەو تەعبیری ئەو جۆرە خەونانە، نازانین .

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ ﴾، بەڵام ئەوەیان لە دووەکان، یانی: لە دوو هاوەڵە بەندییەکەی یوسوف، کە دەربازی بوو بووو، دوای چەند ساڵێك وەبیری هاتەوە، چی وەبیر هاتەوە؟ ئەوەی یوسوف پێی گوتبوو: ﴿ ٱذْكُرْنِى عِندَ رَبِّكَ ﴾، لە لای خاوەنەکەت، یانی: پادشایەکەت باسم بکە، کە من بە ستەم لێرەدا گیراوم و، تۆمەتم بۆ هەڵبەستراوەو بوختانم پێ کراوە، دوای چەند ساڵێك یەکێك لەو دووانەی کە دەربازی بوو بوو، ئەو داوایەی یوسوفی بیرکەوتەوەو گوتی: ﴿ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ ﴾، من سەرەنجامەکەیتان، لێکدانەوەیتان پێ دەڵێم، بمنێرن، واتە: بمنێرن بۆ لای یوسوف کە لە بەندیخانەیە.

بێگومان پادشا لێی پرسیوە، کێیەو چۆنە؟ حەتمەن ڕوونکردنەوەی لەبارەوە داوە، بەڵام خوای زاڵو زانا لە قورئاندا ئەو وردەکارییە باس ناکات، کە بە عەقڵو سەلیقە مرۆڤ دەتوانێ بیزانێ، بەڵکو تەنیا ئەو شتانە باس دەکات، کە جێی مەبەستن و پێویستە باس بکرێن .

ئنجا باسی ئەوە ناکات کە چۆن مۆڵەتی خواست‌و، ڕۆیشت‌و لە دەرگای بەندیخانەی داو، داوایکردو پادشا ناردوومی‌و، دەرگایان بۆ کردەوەو، ئەوانە هەمووی دەقرتێنێ، یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ ﴾! چوو بۆ بەندیخانەو، گوتی: یوسوف! ئەی پیاوی زۆر ڕاست بێژ! ﴿ أَفْتِنَا فِي سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ ﴾، هەواڵمان پێبدە، زانیارییمان بدەیە، دەربارەی خەونێك، کە بریتیە لەوەی حەوت ڕەشە وڵاخی قەڵەو، حەوتی لەڕو لاواز دەیانخۆن‌و، حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوزیش، حەوت گوڵە دانەوێڵەی وشك دەیانخۆن، لە بارەی خەونێکی ئاواوە هەواڵمان پێبدە .

کە بە تەئکید پێی گوتوە: پادشا خەونی وای بینیوە، بەڵام خوا ئەو وردەکارییانە باس ناکات، چونکە بە عەقڵ دەزانرێن ﴿ لَّعَلِّيٓ أَرْجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵکو بگەڕێمەوە بۆ لای خەڵك بەڵکو بزانن، واتە: خەڵکێکی زۆر چاوەڕێی تەعبیرو مانا لێکدانەوەی ئەو خەونەی پادشایە، چاوەڕێم دەکەن‌و شتێکی زۆر گرنگە، پێم بڵێ: با ماناو تەعبیرەکەی بزانم‌و، منیش بچم بەو خەڵکەی بڵێم کە چاوەڕێ دەکەن، تاکو بزانن چۆن لەگەڵ ئەو خەونەی پادشادا مامەڵە بکەن .

یوسوف ﷺیش دەفەرموێ: ﴿ قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا ﴾، ئیدی یوسوف ﷺ یەکسەر جێی ئامانج دەخاتە ڕوو، هەڵبەتە خوای پەروەردگار قسەکانی یوسوف کورت‌و پوخت دەکاتەوە، ئەگەرنا بێگومان چەند شتێکیان باسکردوەو پێشێ گوتوویەتی: خەونی پادشا ئەوە دەگەیەنێ، بەڵام یەکسەر خوای زاناو کارزان ئەوە دەخاتە ڕوو کە جێی مەبەستە، کە بریتیە لەوەی: یوسوف لەبەر ڕۆشنایی خەونەکەی پادشادا نەخشەیەکی ئابووریی پازدەساڵییان بۆ دادەنێ: یوسوف گوتی: سەرەنجامی خەونی پادشا ئەوەیە کە بێنن بەو شێوەیە بکەن :

﴿ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا ﴾، حەوت ساڵی ڕەبەق بەردەوام‌و شێلگیرانە کشتوکاڵ بکەن‌و دانەوێڵە ڕەنیو بێنن، ﴿ فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ ﴾، ئنجا

هەرچی درەوتان کردو ڕەنیوتان هێنا، لێی گەڕێن با هەر لە گوڵەکەی دابێ، ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ﴾، مەگەر کەمێك لەوەی کە دەیخۆن، واتە: ئەوەی پێویستتان پێیەتی، لە گوڵەکەی بیهێننەدەر، بە گاگێرە، یان هەر شێوازێکی دیکەو دانەکەی لە کایەکەی جیابکەنەوە، دوایی بیبەنە ئاشو وردی بکەنو بە شێوەی ساوارو گەنمە کوتاو ئاردو ... هتد بیخۆن .

جگە لە کەمێکی کە دەیخۆن، واتە: دەستی پێوە بگرن، ئەوی دیکە هەمووی لە گوڵەکەیدا هەڵبگرن، ﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ﴾، ئنجا دوای ئەوە، یانی: دوای ئەو حەوت ساڵە فەڕحانیو هەرزانییە کە باران باش دەبارێو کشتوکاڵێکی باش دەکەنو، دانەوێڵەیەکی باش ڕەنیو دێنن، ئنجا حەوت ساڵی سەختو قورس دێن، هەرچی کە بۆتان پێشخستوون، بۆ ئەو حەوت ساڵەو هەرچی هەڵتانگرتوەو پاشەکەوتتان کردوەو عەمبارتان کردوە، هەمووی دەخۆن، واتە: ئێوە لەو حەوت ساڵانەدا کە ساڵی گرانیین، ئەوەی کە هەڵتانگرتوە پێشتر، لە حەوت ساڵی فەڕحانییدا، خەلاسی دەکەنو دەیخۆن، ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ﴾، جگە لە کەمێك کە دەیپارێزنو، دەستی پێوە دەگرنو، هەڵیدەگرن .

﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾، ئنجا دوای ئەوە، واتە: دوای ئەو حەوت ساڵە گرانییو قاتو قڕییەش، ساڵێك دێ کە خەڵك بارانیان بۆ دەبارێنرێو، خەڵك لەو ساڵەدا میوە دەگوشن: کونجی دەگوشنو دەیکەنە ڕۆن، زەیتوون دەگوشن، زەیتی لێ پەیدا دەکەن، ترێ دەگوشن دۆشاوی لێ پەیدا دەکەن، هەنار دەگوشن، شەراب دروست دەکەن، چیو چی دروست دەکەن، دیارە یوسوف بە پێی عادەتو عەقڵی وان قسەی کردوە، واتە: دەکەونە نێو خۆشییو عەیشو نۆشو فەڕحانییو هەرزانییەوە، چونکە بە دڵنیایی میوە گوشینو بەرهەمی لەو جۆرە، بۆ کاتی فەڕحانییەو، زیاتر لە کەمالیاتی ژیان لە قەڵەم دەدرێو، لەو جۆرە شتانە نیە کە خەڵکی پێیان ناژیو لە پێداویستییەکانی ژیان (ضروريات الحياة)ن !

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** خەون دیتنی، پادشای میسر، بە حەوت ڕەشەو لاخی قەڵەوەوە، کە حەوتی لەڕ خواردوویانن‌و، حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوز، کە حەوتی وشک خواردوویانن‌و، داواکردنی لە بڕیار بە دەستان‌و ڕاوێژ پێکراوان کۆڕو مەجلیسەکەی دەوری، کە تەعبیرەکەی پێ بڵێن :

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە پێنج بڕگەدا:**

١) - ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ﴾، ئنجا پادشایەکە گوتی: پێشتریش گوتوومانە: کە ئەمە ئیعجازێکی مێژوویی قورئانەو، پەیمانی کۆن (تەوڕات)، تووشی ئەو هەڵەیە بووە، کە ناوی (ملك)ی بە (فیرعەون) هێناوە، لە حاڵێکدا کە ئەو هۆزەی، یاخود ئەو نەتەوەیەی کە پێیان گوتراوە: (الهكسوس) یان (الملوك الرعاة)، پادشا شوانکارەکان کە کەنعانیی بوون، یان عەرەب بوون‌و (عمالقة)یان پێگوتراوە، هیچ گومانی تێدا نیە کە لە (قبط) نەبوون‌و خەڵکی میسر نەبوون، تاکو نازناوی پادشایەتییەکەیان (فیرعەون) بێ، بەڵام پەیمانی کۆن لەوەدا بەهەڵەداچووە، هەڵبەتە ئەوانەی کە نووسیویانەتەوەو دەستکارییان کردوە، ئەگەرنا کتێبەکانی خوا، چ ئەوەی بۆ مووسای ناردوە، چ ئەوەی بۆ عیسای ناردوە، چ ئەوەی بۆ موحەممەدی ناردوە، بۆ هەموو

پێغەمبەران، فەرمایشتی خوا هەمووی وەك یەك ڕاستە، بەلاّم جگە لە قورئان كە خوا پاراستوویەتی، سەرجەم كتێبەكان، دەستكاریی كراون .

٢) - ﴿إِنِّىٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ﴾، من دەبینم، واتە: لە خەونمدا، دەمبینی حەوت ڕەشە ولاّخی قەڵەو، حەوت ڕەشەولاّخی لەڕ دەیانخواردن، پێشتر گوتمان: (سِمان) كۆی (سمین) و (سمینة)یە، كەواتە: هەم گا دەگرێتەوە، هەم مانگا، (عجاف)یش، كۆی (عَجیف)و (عَجْفاء)ە، (عَجیف)، واتە: ڕەشە ولاّخی نێری لەڕو، (عَجْفاء)، واتە: ڕەشەولاّخی مێی لەڕ، (عجاف)، هەردووكیان دەگرێتەوە، هەروەك چۆن (سِمان)یش، هەردووكیان دەگرێتەوە، واتە: بۆ نێرو مێ بەكاردێن، بۆیە ئەگەر بڵێین: حەوت ڕەشەولاّخی قەڵەو، حەوت ڕەشەولاّخی لەڕ دەیانخواردن، ئەوە ڕێكترە، نەك بڵێین: حەوت مانگای قەڵەو حەوت مانگای لەڕ دەیانخواردن، چونكە (بقرات)، وەك پێشتر گوتمان: كۆی (بقرة)یە، (بقرة)ەش، بە ڕەشە ولاّخ دەگوترێ، چ نێر بێ، چ مێ بێ، بەلاّم ئەگەر بیانەوێ نێرو مێی لێك جیاكەنەوە، دەڵێن: (ثور) و (ثورة) .

٣) - ﴿وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ﴾، هەروەها حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوزو، حەوت گوڵە دانەوێڵەی وشكیشم بینین، دیارە وشكەكان سەوزەكانیان خواردوە .

٤) - ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ﴾، ئەی ئەوانەی عەقڵ‌و چاوی خەڵك پڕ دەكەن لە سام‌و هەیبەت، دەست ڕۆیشتوون، قسە بە دەستن، كار بەدەستن! دەربارەی ئەو خەونەم هەواڵم پێبدەن، زانیارییم پێ بدەن .

٥) - ﴿إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ﴾، ئەگەر ئێوە مانای خەون دەكەن .

لێرەدا دەگونجێ ئەو (ألف) و (لام)ە، بۆ (أل)ی جینس بێ، واتە: ئەگەر ئێوە جینسی خەونان لێك دەدەنەوە، هەروەها دەشگونجێ (ألف)و (لام)ی، (عهد) بێ، واتە: ئەگەر خەونەكەی من دەزانن مانابكەن، هەواڵم پێبدەن،

هەڵبەتە کۆی (رؤیا)، (رؤی)یە، (رؤی)، یانی: خەونەکان، (رؤیا) یانی: یەك خەون: دەگوترێ: (عَبَرْتُ الرؤيا، أي: أَوَّلْتُها)، واتە: سەرەنجامەکەیم دەرخست، ماناو مەبەستەکەیم خستە ڕوو.

ئنجا لێرەدا کە دەڵێ: ﴿إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ﴾، وا پێدەچێ پادشا گومانی هەبووەو متمانەی تەواوی نەبووە، کە ئەوان بتوانن ئەو خەونەی تەعبیر بکەنو، سەرەنجامەکەیو ماناو مەبەستەکەی بخەنە ڕوو، بۆیە بە جۆرێك لە دوودڵییەوە گوتوویەتی: ئەگەر دەزانن مانای لێکبدەنەوە، هەواڵم پێبدەن: خەونەکەم چی دەگەیەنێ؟ هەڵبەتە دوودڵییەکەی پادشاو متمانە پێنەکردنەکەی، بەو دەستڕۆیشتووانەی دەوروبەری، لە شوێنی خۆیدا بووە، چونکە دوایی خۆیان گوتیان: ئەمە خەونی تێکەڵو پێکەڵەو، ئێمەش مانای خەونی تێکەڵو پێکەڵ نازانین .

**مەسەلەی دووەم :** **دەمڕاستانو بڕیار بە دەستانی دەوری پادشا، خەونەکەی پادشایان بە چەند خەونێکی تێکەڵو پێکەڵ داناو گوتیان: ئێمە تەعبیرو لێکدانەوەی ئەو جۆرە خەونانە، نازانین :**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿قَالُوٓاْ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ ۖ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ ٱلْأَحْلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە دوو بڕگەدا:**

1) – ﴿قَالُوٓاْ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍ﴾، دوای ئەوەی پادشا گوتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ أَفْتُونِى فِى رُءْيَٰىَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ ﴿٤٣﴾﴾یوسف، واتە: ئەی قسە بە دەستانو ڕاوێژ پێکراوان ! هەواڵم پێ بدەن دەربارەی مانای خەونەکەم، ئەگەر ئێوە

دەتوانن مانای خەون لێکبدەنەوە؟ ئەوانیش ئاوا وەلامیان دایەوە: ﴿ قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٍ ﴾، واتە: گوتیان: ئەوانە چەند خەونێکی تێکەڵو پێکەڵن .

(الأَضْغَاثُ: جَمْعُ ضِغْثٍ وَهُوَ ما جُمِعَ في حزمة واحِدَةٍ مِن أخلاط نَباتٍ وَأعواد الشَّجَرِ، وَإضافَتُهُ لِلأحلامِ على تقديرِ لامِ أَي: أَضغَاثٌ لِلأحلام)، وشەی (أَضْغَاث) کۆی (ضِغْث)ە، (ضِغْثٍ)، هەر چەپکێکە، هەر دەسکێکە، کە کۆکرابێتەوە لە ڕووەکی تێکەڵ پێکەڵ، واتە: لە ڕووەکی جۆراو جۆرو لە شوڕکی درەخت، شوڕکی باریك باریکی درەخت، ئنجا کە (أضغاث) پالدەدرێتە لای (أَحْلاَم)، (أَحْلاَم) کۆی (حُلُم)، یان (حُلْم)ە، واتە: خەون، ئنجا ئەمە (ل)لامێکی بۆ تەقدیر کراوە: (أي: أَضغَاثٌ لِلأحلام)، ئەوانە چەند چەپکێکن چەند دەسکێکن هی خەونان، واتە: چەند خەونێکی لە شێوەی چەپكو دەسکی گیاو گوڵو شوڕکی تێکەڵو پێکەڵن .

واتە: بۆ نەزانینی تەعبیری خەونەکەی پادشا، بیانوویان بەوە هێنایەوە گوتیان: ئەوانە خەونی تێکەڵو پێکەڵن، هەڵبەتە دوایی باس دەکەین کە پادشا چ خەونێکی بینیوە ! کە ئەوان بە: ﴿ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٍ ﴾، خەونی تێکەڵو پێکەڵیان ناساندوە !

٢) - ﴿ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴾، ئێمەش بە لێکدانەوەی ئەو جۆرە خەونانە زانانین .

(التَعريفُ لِلعَهدِ أَي: ما نَحْنُ بِتأويلِ أَحْلاَمِكَ بِعالِمِين، شُبِّهَ تِلكَ الرُّؤيا بالأَضغَاثِ وَجُمِعَت الأَحْلاَمُ باعتِبارِ تَعَدُّدِ الأَشْياءِ المَرئِيةِ فِي ذَلِكَ الحُلُمِ، فَهِيَ عِدَّةُ رؤى)، دیارە ئەو (ال) ئەلیفو لامەی چۆتەسەر (أحلام) کە دەڵێن: ﴿ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ ﴾، ئەوە بۆ (تعریف)ە، بەڵام (تعریف)ەکە بۆ (عهد)ە، واتە: ئێمە بە مانا کردنو تەعبیرکردنی ئەو جۆرە خەونەی تۆ، زانا نین، ئەو خەونەی پادشاش تەشبیە کراوە بە چەپکێکەوە لە ڕووەكو گیایی جۆراو

جۆر، وشەی (أحلام)یش، بۆیە بەکارهێنراوە بۆ خەونی پادشا، بە ئیعتیباری ئەوەی خەونەکەی پادشا چەند شتێکی تێدا بینراون، حەوت ڕەشە ولاخی قەڵەوو حەوتی لەڕو، حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوزو حەوت گوڵە دانەوێڵەی وشك، ئنجا ئەمان ئەوانیان خواردوە، ئیدی لەبەر ئەوەی کە کۆمەڵە شتێك بووە، بۆیە وەك کۆمەڵە خەونێك تەعبیریان لێکردوەو ناساندوویانە .

هەڵبەتە لێرەدا پێویستە ئەوە بزانرێ کە ئیددیعای ئەعیان و قسە ڕۆیشتووان و بڕیار بە دەستان، کە گوتوویانە: ئەو خەونەی تۆ لە خەونانی تێکەڵ و پێکەڵە، هەڵە بووە، زۆرجاریش وایە کەسێك کە لە شتێك نەشارەزایە، لە جیاتی دانپێدا هێنانی نەشارەزایی خۆی، ئەو شتە کە پێی ئاشنا نیەو پێی شارەزا نیە، تانەی لێدەدات و بە شێوەیەکی وا پێناسەی دەکات، کە بیکاتە پاساوو، نەزانین و نەشارەزاییەکەی خۆی، پێ دابپۆشێ، بۆ وێنە: کەسێك نازانێ مەسەلەیەك حەل بکات، وەلامی پرسیارێك بداتەوە، دەڵێ: کەی ئەوە پرسیارە! ئەوانیش لێرەدا وایان کردوە .

**مەسەلەی سێیەم :** **داواکردنی یەکێك لە دوو هاوەڵە گیراوەکەی یوسوف، کە دەربازی بووە، کە بینێرن بۆ لای یوسوف، بۆ زانینی تەعبیری خەونەکەی پادشاو، چوونی بۆ لای یوسوف و گێڕانەوەی خەونەکەی پادشا بۆ یوسوف، وەك خۆی :**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِى سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ لَّعَلِّىٓ أَرْجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٤٦﴾﴾ .

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە لە پێنج بڕگەدا:**

١) - ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا ﴾، ئەوەیان لە دووەکان کە دەربازی بوو بوو، واتە: لە بەندیخانە هاتبوە دەرێو ڕزگاری بوو بوو، کە یوسوف ﷺ خەونەکەی هەردووکیانی تەعبیر کرد، کە بریتیە لە مەی گێڕان، یاخود سەرپەرشتیکردنی ئاوو شەڕابو ئەوانە لە کۆشکی پادشادا، وەك لە پەیمانی کۆن دەڵێ: (رَئِيسُ السُّقَاة).

٢) - ﴿ وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ ﴾، ئنجا دوای چەند ساڵێك وە بیری هاتەوە: قسەکەی یوسوف ﷺی وە بیرهاتەوە، کە گوتی: ﴿ ٱذْكُرْنِى عِندَ رَبِّكَ ﴾، لەلای مشوورخۆرو خاوەنەکەی خۆت، (لەلای پادشا) باسم بکە کە من بە ستەم گیراومو، بە ناهەق تۆمەتبارکراومو لەم بەندیخانەیە دام.

﴿ بَعْدَ أُمَّةٍ ﴾، ﴿ أُمَّةٍ ﴾، یانی: کۆمەڵێك، کە لێرەدا مەبەست پێ کۆمەڵە ساڵێکە، جاری وایە مەبەست پێی کۆمەڵە خەڵکێکە، یان کۆمەڵە شتێکە، کە زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: ئەو ماوەیە لە سێ (٣) ساڵ زیاتر بووەو لە دەو نۆ (١٠و٩)ش کەمتر بووە، ئنجا زۆربەیان لەسەر حەوت (٧)ن، هەندێکیشیان دەڵێن: پێنج (٥) ساڵ بووە، ئنجا ئایا بۆچی کۆمەڵە ساڵێك ناویان لێنراوە ( أُمَّةٍ )؟

دەڵێ: (لأَنَّ كُلَّ جِيلٍ أُمة، وَالـمُدَّةُ الطَّوِيلة يَنْقَرِضُ فِيها جِيلٌ)، چونکە: هەر پشتێك لە بەشەر، بە کۆمەڵێك لە قەڵەم دەدرێن، ماوەیەکی زۆریش پشتێکی تێدا دەبڕێتەوەو وەفات دەکەنو لە بەین دەچن.

٣) - ﴿ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ ﴾، من هەواڵی تەعبیرو ماناو سەرەنجامی ئەم خەونەتان پێ دەڵێم، (ئەم خەونەی پادشا) ڕەوانم بکەن،

بمنێرن، بۆ کوێی بنێرن؟ بمنێرن بۆ بەندیخانە لەوێ من هاوەڵێکی زیندانییم هەبوو، بە ناوی یوسوف، پیاوێکی ئاواو ئاوا بوو، حەتمەن بۆی باسکردوون، پیاوێکی زۆر چاکەکار بوو، ئینسانێکی زۆر نەجیب بوو، باسی دەکرد کە بە ناحەق تۆمەتی پێکراوەو زیندانیی کراوەو بە منی گوتبوو کە: لەلای سەروەرو خاوەنەکەی خۆم باسی بکەم، بەلام من لە بیرم چوو بۆوەو، ئێستا هاتەوە یادم، کە زۆر لە تەعبیری خەونان شارەزایە، بە بەڵگەی ئەوەی منو هاوەڵێکم یەکێ خەونێکمان بینیبوو، خەونەکەی بۆ تەعبیر کردینو تەعبیرەکەی ڕاست دەرچوو: من دەربازم بوو بە پێی لێکدانەوەکەی وی کە گوتی: تۆ دەربازت دەبێو دەگەڕێیەوە سەر ئیشەکەی پێشێت، بە هاوەڵەکەشمی گوت: تۆش لە سێدارە دەدرێی، هەردوو تەعبیری خەونەکەش ڕاست دەرچوون.

حەتمەن ئەو وردەکارییانەی بۆ باس کردوونو بۆی ڕوون کردوونەوە، بەلام – وەك چەند جارێك باسمان کرد – لە قورئاندا خوا ﷻ هەرچی بە عەقڵو سەلیقە دەزانرێ، باسی ناکات، بۆ ئەوەی ئەو فەرمایشتەی خوا کورتو پوخت بێ، ئنجا ئەگەر هاتباو ئەو وردەکارییانەی بە عەقڵو سەلیقە دەزانرێن، هەموویانی باس کردبان، قورئان ئێستا چەندە، دەبوو بیست بەرانبەری ئەوە بووایە، ئەو کاتەش بێگومان لەبەرکردنیو مامەڵە لەگەڵ دا کردنیو هەڵگرتنی، زۆر بە زەحمەت دەبوو! بۆیە ئەوە هەمووی دەپێچرێتەوەو، یەکسەر دێتە سەر ئەسڵی مەبەست !

٤) – ﴿ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ ﴾، یوسوف ئەی پیاوی زۆر ڕاست بێژ! زۆر ڕاستگۆو، ئەو کەسەی کە قسەکەت بە کردەوە بە ڕاست دەگێڕی، چونکە (صِدِّيق):

١ – هەم بە مانای (الدائِمُ التَّصْدِيق)، ئەوەی کە هەمیشە هەق بە ڕاست دەزانێو نکوولیی لە هەق ناکات، دێ .

٢ – هەم بە مانای ئەو کەسەی زۆر ڕاستبێژەو درۆو خیلاف لە قسەیدا نیە .

٣- هەروەها بە مانای كەسێكیش كە قسەكانی بە كردەوە پشت ئەستوور دەكاتو پشت ڕاست دەكاتەوە، هەر قسەیەك دەكات، كردەوەی پێ دەكات .

وشەی (صِدِّیق)، بە هەر سێ واتایەكەیە.

هەندێكیش دەڵێن: (صِدِّیق)، كەسێكە زۆر ڕەوشت بەرز بێ، زۆر نەجیبو چاكەكار بێ، كە دیارە بە هەموو واتایەكانی: یوسوف ﷺ (صِدِّیق) بووە .

ئنجا ئەوە هەمووی دەپێچێتەوە كە: پادشا ناردیو، چوو بۆ بەندیخانەو، داوای كردو دەرگای بەندیخانەیان بۆ كردەوەو، لەگەڵ یوسوف دانیشتو...هتد، ئەوانە هەمووی دەپێچێتەوەو یەكسەر دەڵێ .

٥) - ﴿أَفْتِنَا فِي سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ﴾، هەواڵمان پێ بدە، زانیارییمان پێ بدە، دەربارەی ئەوە كە حەوت ڕەشە وڵاخی قەڵەو، حەوتی لەڕ لە خەوندا بیانخۆنو، حەوت گوڵە دانەوێڵەی وشك، حەوت گوڵە دانەوێڵەی سەوز بخۆن، هەواڵمان پێ بدە، ئەوە چی دەگەیەنێ ؟

وەك دەبینین ئەو نوێنەرە، ئەو هاوەڵەی یوسوف ﷺ كە كاتی خۆی هاوەڵی بووە لە زیندان دا، زۆر بە وردیی، وەك خۆی، خەونەكەی پادشای گێڕاوەتەوە، چونكە خەونو هەر قسەیەكی دیكەش، بە گۆڕینی وشەیەك مانایەكەی تێكدەچێو دەگۆڕێ، بۆیە وەك دەبینین زۆر بە ئەمانەتەوە: پادشا خەونەكەی چۆن بۆ گێڕاونەوە، ئەویش ئاوا بۆ یوسوفی گێڕاوەتەوەو گوتوویەتی پێم بڵێ: داخۆ تەعبیرەكەی چۆنە ؟

٦) - ﴿لَّعَلِّيٓ أَرْجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ﴾، بەڵكو بگەڕێمەوە بۆ لای خەڵك، بەڵكو ئەوانیش بزانن، واتە: بزانن چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو خەونەی پادشادا بكەن، بزانن ئەو خەونەی پادشا چی دەگەیەنێ ؟

**مەسەلەی چوارەم :** لێكدانەوەی یوسوف ﷺ بۆ خەونەكەی پادشاو هاوكات دانانی نەخشەیەكی ئابووریی پازدە ساڵیی، حەوت ساڵیان بە پیتو پێزو هەرزانیی دەبنو، دەبێ دانەوێڵەیان تێدا پاشەكەوت بكەن، حەوت ساڵیش بێ بەرهەمو گرانییو قاتو قڕیی، كە لەوەی لە حەوت ساڵی پێشوودا پاشەكەوتیان كردوە، لە دانەوێڵەو ئازووخە، بەهرەمەند دەبن، ساڵی پازدەیەمیش دەروولێكرانەوەو هاتنەوەی فەرحانییو هەرزانیی :

یوسوف ﷺ لێرەدا كە خەونەكەی پادشا تەعبیر دەكات، هەر بەوەندە لێیناگەڕێ یەكسەر لێكی بداتەوەو بڵێ ئاوایە، بەڵكو وێرایی ئەوە، وەك مشوورخۆرێكی ئەو وڵاتەو دڵسۆزێكی ئەو خەڵكو وڵاتە، دێنێ نەخشەیەكی ئابوورییشیان لەبەر ڕۆشنایی خەونەكەی پادشاو لێكدانەوەو تەعبیركردنی دا، بۆ دادەنێ .

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەكە لە حەوت بڕگەدا :**

**١) -** ﴿ قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا ﴾، هەڵبەتە پێشێ خەونەكەی بۆ لێكداونەوە: كە بە پێی ئەو خەونەی پادشا: حەوت ساڵی هەرزانیی دێن، دەبێ دانەوێڵەی زۆریان تێدا بكەن، ئەو دانەوێڵەش دەبێ لە گوڵەكانی خۆی دا هەڵبگیرێ، ئنجا پاش ئەو حەوت ساڵە هەرزانییو فەرحانییە، حەوت ساڵی گرانیی دێنو، ئەوەی كە لە حەوت ساڵی پێشوودا پاشەكەوتتان كردوە، لەو حەوت ساڵەی گرانییو قاتو قڕیی دا، لێی

بەهرەمەند دەبن، دوایی ساڵی پازدەیەم جارێکی دیکە هەرزانییو فەرحانیی دێتەوە پێشو، لەو گرانییو قاتو قڕییە دەربازتان دەبێ .

پێشێ خەونەکەی ئاوا بۆ تەعبیرکردوون، ئنجا هاتوە لەبەر ڕۆشنایی لێکدانەوەی خەونەکەدا، یەکسەر ڕێنماییشیان دەکاتو نەخشەیەکی ئابووریی پازدە ساڵییان بۆ دادەنێ، خوای پەروەردگاریش قسەکانی یوسوفی کورت کردۆتەوەو، نەخشە ئابوورییەکە کە بۆی داناون، وەك ڕێنمایی کردنو ئامۆژگاریی کردن، ئەوە دەگێڕێتەوە :

﴿ قَالَ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا ﴾، یوسوف گوتی: دەبێ حەوت ساڵی بەردەوام کشتوکاڵ بکەن، واتە: فەلاحەتی بکەن، دەغڵو دان ڕەنێوبێنن .

(الدَّأَبُ: إِدَامةُ السَّيرِ، دَأَبَ فِي السَيرِ دَأَبا، وَالدَّأَبُ: العَادَةُ المُستَمِرَّةُ دائِماً على حالة)، وشەی (دَأَب)، ئەوەیە کە بەردەوام ئینسان، یان وڵاخ، بەو ڕێیەدا بڕوات، (دَأَبَ في السَّيرِ دَأَباً)، واتە: بەردەوام بوو، لەسەر ڕۆیشتن، (دَأْب)، وێڕای بەردەوام بوونی ڕۆیشتن، بە عادەتو نەریتێکی بەردەوام دەگوترێ، کە هەر لەسەر یەك حاڵ بمێنێتەوە .

کە خوا دەفەرموێ: ﴿ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ ﴾، واتە: وەك عادەتو نەرێتی بەردەوامو سەقامگیریی دەستەو دایرەی فیرعەون .

٢) - ﴿ فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ ﴾، ئنجا ئەوەی کە دروێتان کرد لە بەروبوومو کشتوکاڵو دەغڵو دانی ئەو حەوت ساڵە هەرزانییە، ﴿ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ ﴾، (هەرچی درەوتان کردو ڕەنێوتان هێنا) لە گوڵەکەی خۆیدا لێی گەڕێن، وازی لێ بێنن .

دەگوترێ: (حَصَدَ الزَّرعَ أَي: قَطَعَ)، واتە: دەغڵەکەی بڕی، ئێمە بە کوردیی دەڵێین: درەو کردن، ڕەنێو هێنان، حاصەڵات هەڵگرتنەوە، ئنجا ئەو دەغڵو دانە، جۆو گەنم بووە، نیسكو نۆك بووە، هەرزن بووە، هەرچی بووە، لێی گەڕێن لە گوڵەکەی خۆی دا، بۆ ئەوەی سووس لێی نەدا،

(سووس)یش: (دودٌ يَقَعُ فِي الصوفِ وَالطَّعامِ)، جۆرە كرمێكە لە خوریی‌و لە خواردن دەدا، دیارە لە كوردەواریی دا پێی دەڵێین: ئەسپێ، ڕەنگە ناوی دیكەشی هەبن، بە پێی ناوچەو دەڤەرەكان، دیارە دانەوێڵە ئەگەر لە گوڵەكەی بێتە دەرێ، ئەسپێ لێی دەدا، بەڵام ئەگەر هەر لە گوڵەكەی دابێ، لەوە پارێزراو دەبێ .

٣) - ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ﴾، جگە لە كەمێكی كە دەیخۆن، ئەگەرنا ئەوەی دیكە، هەمووی با لە گوڵەكەی دابێ‌و بە گوڵەكەیەوە عەمباری بكەن‌و لە شوێنی تایبەت دا هەڵیبگرن، بۆ ئەوەی ئەسپێ‌و سووس‌و ... هتد، لێی نەدات‌و پارێزراو بێ، واتە: جگە لە كەمێك كە دەیخۆن، لە ماوەی ئەو حەوت ساڵە هەرزانییەدا، ئەوەی دیكە هەمووی پاشەكەوت بكەن‌و هەڵیبگرن، ئەمە ئامۆژگاریی‌و ڕێنماییشە كە كەمی بخۆن‌و، دەست پێوە بگرن، چونكە هەروا هەرزانیی نابێ‌و، دوای ئەو حەوت ساڵە هەرزانیی‌و فەرحانیی‌و بە بەروبوومە، حەوت ساڵی دی قات‌و قڕیی‌و گرانیی‌و بێ بارانیی دێن .

٤) - ﴿ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ﴾، ئنجا دوای ئەوە، واتە: دوای ئەو حەوت ساڵە هەرزانیی‌و بە باران‌و بە بەرهەمە، حەوت ساڵی سەخت دێن .

(شداد)، كۆی (شديدَة)یە، (وَصفُ لِسني الجَدْبِ، لِأنَّ الجَدبَ حَاصِلٌ فِيها، فوَصْفُها بالشدةِ على طريقِ المَجازِ العَقْلِي)، لەبەر ئەوەی گرانیی‌و قات‌و قڕییەكە لە ساڵەكاندا دێ، بۆیە خودی ساڵەكان بە شیددەت‌و سەختیی وەسف كراون، بە مەجازی عەقڵیی .

٥) - ﴿يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ﴾، ئەو حەوت ساڵە گرانیی‌و بێ بارانیی‌و وشكە ساڵییە، هەرچی كە بۆتان پێش خستوون، لە حەوت ساڵی هەرزانیی دا، هەمووی دەخۆن .

پسپۆڕانی زمان دەڵێن: (أُطْلِقَ الأَكْلُ على الإفْناءِ)، دیارە ساڵە گرانەكان ئازووخەكە ناخۆن، بەڵام یانی تەواوی دەكەن، ئێوە لەو حەوت ساڵە

گرانییەدا، هەرچی لە حەوت ساڵە هەرزانییەکەدا، حەوت ساڵە بەرهەم دارەکەدا، پاشەکەوتتان کردوە، تەواوی دەکەن .

٦) - ﴿إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ﴾، مەگەر کەمێك لەوەی کە هەڵیدەگرن و دەیپارێزن .

بۆیە دەفەرموێ: ﴿تُحْصِنُونَ﴾، وەك بڵێی لە قەڵادا هەڵگیراوە، وەك چۆن مرۆڤەکان ئەگەر بچنە نێو قەڵاوە، پارێزراوو سەلامەت دەبن، ئەو خواردنەش لەو شوێنانەدا کە ئەوان تێیاندا پاراستوە، پارێزراو بووە، وەك چۆن ئێستا دەغڵ و دان لە سایلۆدا دەپارێزرێ، کاتی خۆی ئەوانیش لە چاڵیان کردەو زەوییان بۆ هەڵکەندوە، یان بە شێوەیەك لە شێوەکانی ئەو کاتە، بەتایبەتی مادام لە گوڵەکەی دا بووە، شوێنێکی فراوانتری ویستوە، گرنگ ئەوەیە بە شێوەیەك لە شێوەکان کە ئێستا ڕەنگە بۆ ئێمە زۆر ڕوون نەبێ ئەو دەغڵ و دان و دانەوێڵەیان لە گوڵەکەی خۆیدا پاراستوە .

٧) - ﴿ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾ ئنجا دوای ئەوە، ساڵێك دێ کە خەڵك بارانیان بۆ دەبارێنرێ ﴿وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾، هەروەها لەو ساڵەدا دەگوشن، واتە: میوە دەگوشن، زەیتوون دەگوشن و ڕۆنەکەی و شیلەکەی وەردەگرن، یاخود ترێ و خورما دەگوشن و، دەیکەن بە شەڕاب، هەمووی دەگرێتەوە.

﴿يُغَاثُ النَّاسُ﴾: أي يُعْطَونَ الغَيْثَ وَيُمطرون)، (غَيث)، واتە: بارانێك کە لە فریای خەڵکی دێ، دوای ئەوەی خەڵك چاوەڕوانیی کردوە، ﴿يُغَاثُ النَّاسُ﴾، واتە: بارانیان بۆ دەبارێنێ بارانێك کە چاوەڕێیان کردوە، لە فریایان دێ، یاخود ﴿يُغَاثُ النَّاسُ﴾، واتە: هاوکاریی خەڵك دەکرێ و وەڵامی خەڵك دەدرێتەوە، ئەوەی کە چاوەڕێیان کردوەو بۆی پاڕاونەوە، بە زمانی حاڵ، یاخود بە زمانی قسەو گوتار .

کە دەفەرموێ: ﴿وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ﴾، دیارە خوا بە گشتی فەرموویەتی:

﴿وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ﴾، لەو ساڵەدا، لە ساڵی پازدەیەمدا دەگوشن، کە دەگونجێ مەبەست گوشینو ڕاپازنینی کونجی بێ، بۆ ڕۆنەکەی، یان زیتوون بێ بۆ زەیتەکەی، یاخود ترێو خورما بێ، بۆ شەرابەکەیان، یاخود بۆ سرکەکەیانو بۆ دۆشاوەکەیان .

هەندێکیش گوتوویانە: واتە: لەو ساڵەدا ئاژەڵەکان، مەڕو بزنو مانگاو حوشترو گامێش، گوانەکانیان پڕ دەبن لە شیرو چاك دەیاندۆشن .

بەڵام لە حەقیقەتدا هەموو ئەوانەش پێکەوە دەگرێتەوە، واتە: لەو ساڵەدا پیتو پێزو بەرەکەتو بەرهەم زۆر دەبێ، هەم هی دانەوێڵە، هەم هی ئاژەڵ، هەم هی میوە، هەمووی دەگرێتەوە .

هەروەها خوێنراویشەتەوە: (تُعْصَرُونَ) یان (يُعْصَرُونَ)، واتە: (تُمطرون)، (يُمْطرون)، چونکە خوا لە سوورەتی (النبأ)، لە ئایەتی (١٤)دا، دەفەرموێ:

﴿وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡمُعۡصِرَٰتِ مَآءٗ ثَجَّاجٗا ١٤﴾، واتە: لە هەورە گوشراوەکانەوە ئاوێکی بە خورزەممان ناردۆتە خوار، کەواتە: (تُعصَرُون) یان (يُعصَرُون)، یانی: بارانیان بۆ دەبارێنرێ، ئنجا ئەگەر وابێ، دەبێ ئەوەی پێشێ: ﴿فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ﴾، مانایەکەی ئاوا بێ : لە فریای خەڵکی دێن، هاوکاریی خەڵك دەکرێ، خەڵك وەڵامی داواکانیان دەدرێتەوە .

# حەوت سەرنجی گرنگ لە میانی تەعبیركردنی یوسوف بۆ خەونەكەی پادشادا

﴿ قَالَ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ ٤٧ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ٤٨ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ٤٩ ﴾:

سەرنجی یەكەم : دەگونجێ خەونی كافریش ڕاست دەربچێت، وەك پێشتر بینیمان خەونی دوو هاوەڵەكەی یوسوف، دوو هاوەڵەكەی بەندیخانەی، هەردووكیان خەونەكەیان ڕاست دەرچوون، خەونەكەی پادشاش هەر ڕاست دەرچوو، كەواتە: دەگونجێ ئینسانی بێبڕواش خەونەكەی ڕاست دەربچێ، ئێمە پێشتر لە سەرەتای دەست پێكردنی تەفسیری ئەم سوورەتی یوسوفەدا، باسێكی تێروتەسەلمان دەربارەی خەون كرد، بۆیە لێرەدا هەر بەو ئاماژەیە وازی لێ دێنین .

سەرنجی دووەم: ڕاوێژ كردن عادەتێكی لە مێژینەی گەلان بووە، كە پادشا دەڵێ : ﴿ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ ﴾، دەربارەی خەونەكەم هەواڵم پێ بدەن، كەواتە: ڕاوێژی پێكردوون پرس و ڕای پێكردوون، ئەمەش عادەتێكی لە مێژینەی گەلان بووە، وەك لە بۆنەی دیكەشدا گوتوومە، كەواتە: ئەوەی كە

ڕۆژئاواییەکان وا ڕەواجی پێدەدەن و بانگەشەی بۆ دەکەن و ئیددیعا دەکەن، کە هەتا دیموکراسی یۆنانییەکان پەیدا نەبووە، دوایی دیموکراسی لە فۆرمی تازەی دا نەهاتۆتەوە ئاراوە، حیساب بۆ خەڵك نەکراوە، ڕای خەڵك وەرنەگیراوە، لەلایەن حوکمڕانانەوە، ئەوە ئەسڵ و ئەساسی نیە، بەڵکو ئەوە عادەتێکی لە مێژینەی گەلان بووە، کە کەم و زۆر حیساب بۆ ڕای خەڵك کراوەو کۆڕو مەجلیسیان بووەو، لەو کۆڕو مەجلیسەدا، بابەتەکان توێژراونەوەو قسەیان لەسەر کراوە، بەڵێ هەبووە، وەك فیرعەون گوتوویەتی: ﴿مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾﴾ غافر، واتە: هەر ئەوەتان پێ دەڵێم کە خۆم دەیبینم و، هەرچی منیش دەیڵێم، هەمووی ڕاستە، بەڵێ هەندێ لە حوکمڕانەکان ئاوا فیرعەونانە بیریان کردۆتەوەو، هەر قسەی خۆیان پێ ڕاست بووەو هەر قسەی خۆیان سەپاندوە، بەلام بە گشتی لە نێو گەلاندا، حیساب کردن بۆ ڕاوێژو پرس و ڕاو، توێژینەوەو تاوتوێکردنی باس و بابەتەکان، کەم و زۆر هەبووە .

<u>سەرنجی سێیەم:</u> پادشایەکە متمانەی بە هاونشینەکانی خۆی، کە لە کۆڕو مەجلیسی حوکمڕانییەکەی دا بوون، بڕیار بەدەستەکان، متمانەی پێیان نەبووە، تەعبیری خەونەکەی بزانن، ڕایەکەشی ڕاست دەرچووە، بە بەڵگەی ئەوە، کە دەڵێ: ﴿أَفْتُونِي فِي رُءْيَىٰيَ إِن كُنتُمْ لِلرُّءْيَا تَعْبُرُونَ﴾، دەربارەی خەونەکەم هەواڵم پێ بدەن، زانیارییم بخەنە بەر دەست، ئەگەر ئێوە تەعبیری خەون دەزانن، ئەگەر دەتوانن مانای خەون لێك بدەنەوە، دیارە گومانی هەبووە کە بتوانن ئەو خەونەی لێکبدەنەوەو دواییش ئەوەی کە پێش بینیی کردوە، ڕاست دەرچووە .

<u>سەرنجی چوارەم:</u> هاوەڵە زیندانییەکەی هەرچەندە کەمتەرخەم بووە، بەرانبەر بە یوسوف، بەلام زۆر بە لە خۆ ڕادیتوویی چووە بۆ لای یوسوف و هەر لەوێوە گوتوویەتی: ﴿أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ ﴿٤٥﴾﴾، من هەواڵ و سەرەنجامی ئەو خەونەتان پێ دەڵێم، بمنێرن، وەك دەبینین هەر لەڕێوە دڵنیای

کردوونەوە، کە دەتوانێ تەعبیرو لێکدانەوەی ڕاستو دروستی خەونەکەی پادشایان بۆ بێنێ، کە بە تەئکید مەبەستیشی ئەوە نەبووە: خۆی دەیزانێ، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە کە دەچێ بۆ لای یوسوفو خەونەکەی پادشای بۆ دەگێڕێتەوەو لێکدانەوەو تەعبیری خەونەکەی پادشا لە یوسوف وەردەگرێو بۆیان دێنێتەوە، ئنجا ئایا ئەمە چی دەگەیەنێ ؟

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو کابرایە هەرچەندە ئەو داوایەی یوسوفی جێبەجێ نەکردوەو، بەهۆی لە بیرچوونەوەو کەمتەرخەمیی خۆیەوە، ئەو هاوەڵە زیندانییەی (یوسوف) شەش حەوت ساڵ لە زینداندا ماوەتەوە بە ناهەق، بەڵام هێندە لە یوسوفی ڕابینیوەو زانیویەتی هێندە جوامێرە، هێندە ڕەوشت بەرزە، هێندە ئینسانێکی باشە، کە هەر لە ڕێیەوە لێی دڵنیا بووە: ئەو داوایەی بۆ جێبەجێ دەکات، هەرچەندە ئەو (واتە: ئەو هاوەڵە زیندانییەی) داوایەکەی یوسوفی جێبەجێ نەکردوە!! هەڵبەت هەر ئەوەش لە کەسانی بۆ خوا صوڵحاو، دەوەشێتەوە، کەسانێك کە دنیا وەك شوێنی تێدا تاقی کردنەوە دەبینن، کەسانێك کە بۆ خوا دەژینو بە گرێو گۆڵی دەروونییو بە بوغزو کینەو تۆڵەستاندنەوەوە لەگەڵ خەڵکدا مامەڵە ناکەن، بەڵکو بە جوامێرییو ڕەوشت بەرزیی، وا لەگەڵ خەڵکدا مامەڵە ناکەن، کە چاکە بە دەستەوا بێ: چاکەم لەگەڵ بکەو، چاکەت لەگەڵ دەکەم، مادام خراپەت کرد، من چاکەت لەگەڵ ناکەم!! ئنجا ئەو کابرایە کە هێندەی لە خۆی ڕابینیوە، ئەو لە خۆ ڕابینینەی، بریتی بووە لەوە کە لە یوسوف ﷺ ی ڕابینیوەو زانیویەتی هێندە جوامێرە، هێندە ڕەوشت بەرزە، کاتێك کە چوو داوایەکەی ئاراستە کرد، نەك هەر ئەو کەمتەرخەمییەی بە چاو دانەداتەوە، بەڵکو یەکسەر داواکارییەکەشی بۆ جێبەجێ دەکات .

<u>سەرنجی پێنجەم:</u> یوسوف ﷺ هیچ گلەیی لێ نەکردوە، هەرچەندە شەش حەوت ساڵ بەهۆی لە بیرچوونەوەو کەمتەرخەمیی ئەو هاوەڵە زیندانییەیەوە، لە بەندیخانەدا ماوەتەوە، بەڵام هەر نابیسترێو نابینرێ کە یوسوف بە ئاماژەش گلەییەکی لێ کردبێ، ئەوەش ڕەوشت بەرزیی

پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و لە نێویاندا یوسوف ﷺ دەردەخات، کە ئینسان خۆش گلەیی نەبێ باشە، واباشە ئینسان هەمیشە مافی خۆی لە بیر بچێتەوەو، هەرگیز چاوەڕوانیی لە خەڵك نەبێ، یاخود بەلای کەمەوە چاوەڕوانیی کەم بێ لە خەڵك، ئەو کاتە هەم خەڵکیش لە دەستی سەلامەتو ئاسوودە دەبنو، هەم خۆیشی ئاسوودە دەبێ .

<u>سەرنجی شەشەم :</u> یوسوف ﷺ نەیگوتوە: مادام ستەمیان لێکردوومو ئەوانە بە ستەم منیان چەندان ساڵ لە بەندیخانەدا هێشتۆتەوە، مادام ئەوان خراپەیان لەگەڵ من کردوە، با منیش ئەگەر خراپەشیان لەگەڵ نەکەم، چاکەیان لەگەڵدا نەکەم، واینەگوتوە، چونکە خوای کاربەجێ لە سووڕەتی (المؤمنون) ئایەتی (٩٦)دا، دەفەرموێ: ﴿ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ﴾، بە کام سیفەتو ڕەوشتی باشترە، کردەوەو هەڵوێستو سیفەتی خراپی بەرانبەرەکەت پاڵ پێوە بنێ .

دیارە پێش هەموو کەس پێغەمبەران ئەو ڕەوشتە بەرزانەیان هەیە، بەڵکو پێغەمبەرانی خوا لە لووتکەی هەر بەرزی ڕەوشتو خووی پەسندو ئاکاری جوان دابوون، بۆیە یوسوف ﷺ هەر باسی نەکردوە کە: بۆچی لە زینداندامو بۆچی لە بەندیخانەدا منتان هێشتۆتەوە، لەسەر بناغەی بوختانێکی درۆ؟ بەڵکو یەکسەر نەك هەر تەعبیری خەونەکەشی بۆ کردوون، بەڵکو لە میانی تەعبیر کردنی خەونەکەشدا، نەخشەیەکی ئابووریی پازدە ساڵیی داناوە، بۆ کۆمەڵگایەك کە یەك تاکە مسوڵمانی تێدا نیە، بێجگە لە خۆی (یوسوف ﷺ) لەو کاتەدا بڕوادارێکی دیکە لە میسڕدا نەبووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە پیاوانی خوا، دەبێ بەبێ بەرانبەر چاکە لەگەڵ خەڵکدا بکەنو لە بەرانبەری خراپەشدا خراپەیان لەگەڵدا نەکەن .

<u>سەرنجی حەوتەمو کۆتایی :</u> هەرچەندە پێشێش ئاماژەمان پێدا: یوسوف ﷺ نەخشەیەکی ئابووریی پازدە ساڵەیی بۆ گەلو کۆمەڵگایەك داناوە، بۆ وڵاتێك داناوە کە بێجگە لە خۆی بڕوادارێکی دیکەی تێدا نەبووە،

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بۆ خوا صوڵحاوان، بەندەکانی خوا، دۆستەکانی خوا، هەوڵدەدەن بە گشتی چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکەن، نەك چاکەو خێریان قەتیس بکەن تەنیا بۆ بڕواداران، بەڵکو بە گشتی هەوڵ دەدەن سوود بگەیەنن بە بەندەکانی خوا، بگرە سوود بگەیەنن بە دروستکراوەکانی خوا، ئەوە زۆر گرنگە .

یوسوف ﷺ لە وڵاتێکدا کە ستەمی لێکراوە، لە وڵاتێکدا کە کراوە بە کۆیلە، دوایی بوختانی پێکراوە، دوایی چەند ساڵ خراوەتە بەندیخانەوەو کەس لێی نەپێچاوەتەوە، کەس نەهاتوە بڵێ: لەسەرچی گیراوی؟ کەچی لەو وڵاتەدا کە ئەو هەموو مەینەتییانەی بینیوون، ئەو هەموو ستەمەی لێکراوە، نەخشەیەکی ئابووریی پازدە ساڵیی، بۆ خەڵکی ئەو وڵاتە دادەنێ، بۆ ئەوەی ئەو گرانییو قاتو قڕییەو، ئەو کێشەو قەیرانە ئابوورییەی دێتە پێشیان، لێی دەرباز بن، بەڕاستیی ئەوە لووتکەی هەرە بەرزی ڕەوشتی جوانە، کە بێجگە لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و کەسانێك کە بە ڕێی پێغەمبەراندا دەڕۆن، هیچ کەس ناگاتە ئەو لووتکە بەرزە .

خوا بە لوتفو کەرەمی خۆی هیدایەتی ئێمەش بدات، کە ئێمەش چاو لە پێغەمبەران بکەینو، بیانکەینە سەر مەشقو پێشڕەوی خۆمانو، ڕەوشتو ئاکارو هەڵوێستو سیفەتە بەرزەکانیان لە خۆماندا بێنینە دی، هەڵبەتە هەر ئەو کاتەش لێمان دەوەشێتەوە بڵێین : بەندەی خواو شوێنکەوتووی پێغەمبەرانی خواین .

# دەرسی هەشتەم

## پێناســەی ئەم دەرســە

ئەم دەرسەمان هەشت (٨) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە بریتین لە ئایەتەکانی: (٥٠ تا ٥٧)، لەم دەرسەماندا ئاڵقەی حەوتەمی زنجیرەی بەسەرهاتی یوسوف ﷺ باس دەکەین، کە تێیدا باسی شەش بابەتی سەرەکیی کراوە :

١- ناردنی پادشا بە دوای یوسوف داو، نەچوونە دەری یوسوف لە بەندیخانە، هەتا پادشا لە ڕووداوی دەستو پەلی خۆ برینی ژنەکان، نەکۆڵێتەوەو، سەرەنجام پەرێز پاکیی یوسوف، دەرنەکەوێ .

٢- لێکۆڵینەوەی پادشا لەو ژنانەو، شایەدیی دانیان بەوە کە هیچی خراپیان لە یوسوف ﷺ نەبینیوەو، دان پێداهێنانی ژنی عەزیز کە ئەو هەوڵی لەگەڵ یوسوف داوە، پەلکێشی دەست تێکەڵیی بکاتو، یوسوف ڕاستگۆیەو بێ خەتایە، لەوەدا کە گوتوویەتی: من دەست پێشخەرییم نەکردوە، بەڵکو وەڵامی دەستپێشخەرییەکەی ئافرەتەکەشی نەداوەتەوە .

٣- پاساو هێنانەوەی یوسوف بۆ ئەو لێکۆڵینەوە کردنە، بەوە کە عەزیزی میسر بزانێ یوسوف ناپاکیی پێ نەکردوە، لە کاتێکدا کە خۆی ئامادەی ماڵ نەبووە، هاوکات دەربڕینی ئەو ڕاستییەش کە پاکانە بۆ نەفسی خۆی ناکات، کە هیچ هەڵەو پەڵەیەکی نیە، چونکە نەفس زۆر فەرمان بە خراپە دەکات، مەگەر کەسێك خوا ڕەحمی پێ بکاتو بیپارێزێ .

٤- دووبارە ناردنەوەی پادشا بە دوای یوسوفدا، کە بیکاتە هاوکاری تایبەتیی خۆی لە حوکمڕانیی داو، پاش دواندنی، پێ ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە:

یوسوف لەلای وی خاوەن پێگەی تایبەتەو، ڕێزو حورمەتی تایبەتیی هەیەو، متمانەو باوەڕی پێیەتی .

٥- پێشنیارکردنی یوسوف بۆ پادشا، کە بیکاتە بەرپرسی کاروباری ئابووریی، چونکە هەم پارێزەرە، بۆ شتێك کە پێی بسپێردرێ، هەم زاناو شارەزایە، لە چۆنیەتی سەرافەتییو سەرپەرشتیکردنو مشوورلێخواردنی دا .

٦- ڕاگەیاندنی خوای کارزان کە: وەك چۆن یوسوفی لە ڕێی کاروانەکەوە لە بیر هێنایە دەرو، لە کۆشکی عەزیزی میسردا حەواندیەوە، پاشان لە زیندان هێنایە دەر، هەر بەو جۆرەش یوسوفی لە میسردا دەست ڕۆیشتوو کردوەو، پاداشتی دوارۆژیشی باشترە، چونکە ئیماندارو پارێزکارو چاکەکار بووە .

﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ﴿٥٠﴾ قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٣﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴿٥٤﴾ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾﴾.

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{ئنجا پادشای میسڕ (گوتی) بۆمی بێنن، (واتە: یوسوف)، جا کاتێك نێردراوەکە هاتە لای یوسوف، پێی گوت: بگەڕێوە بۆ لای خاوەنەکەت لێی بپرسە: حاڵو بەسەرهاتی ئەو ژنانەی دەستو پەلی خۆیانیان بڕی بوو، چۆن بوو؟ بە دڵنیایی پەروەردگاری من (خوا ﷻ) بە پیلانەکەیان زانایە ﴿٥٠﴾ (پادشاش ژنەکانی کۆکردەوەو) گوتی: ئەو حاڵەتان چۆن بوو، مەبەستتان چی بوو کە هەوڵی پەلکێش کردنی یوسوفتان داو ویستتان لە خشتەی بەرن؟ گوتیان: پاکیی بۆ خوا، هیچ خراپەیەکمان لە بارەیەوە نەزانیوە، ژنەکەی عەزیز گوتی: ئا ئێستا هەق ئاشکرا بوو، من هەوڵی پەلکێش کردنی ویمدا بۆ دەست تێکەڵیی‌و، بە دڵنیایی ئەو لە ڕاستگۆیانە (کە هیچی خراپی لێ نەپشکوتۆتەوە) ﴿٥١﴾ یوسوف گوتی: بۆیە داوای ئەو لێکۆڵینەوەیەم کرد، تاکو ئەو (عەزیز) بزانێ‌و دڵنیابێ کە بە پەنامەکیی (کاتێك کە لە ماڵ نەبووە) ناپاکییم لەگەڵ دا نەکردووە، مسۆگەر خوا پیلانی ناپاکان بەرەو ئامانج ڕێنمایی ناکات ﴿٥٢﴾ پاکانەش بۆ نەفسی خۆم ناکەم، (کە هیچ هەڵەو پەڵەم نیە)، بێگومان نەفس زۆر دنەی خاوەنەکەی دەداتو فەرمان بە خراپە دەکات، مەگەر لە حاڵێکدا پەروەردگارم بەزەیی بنوێنێ‌و بمپارێزێ، بەڕاستیی پەروەردگارم لێبوردەی بە بەزەییە، ﴿٥٣﴾ پادشا گوتی بۆمی بێنن، تایبەتی دەکەم (بە هاوکاریی کردنی) خۆمەوە (لە حکومڕانیی دا)، ئنجا کاتێك هاتو دواندی، پادشا گوتی: بە دڵنیایی تۆ ئێستا لە لامان بەڕێزو پایەدارو جێی متمانەو باوەڕی ﴿٥٤﴾ یوسوف گوتی: لەسەر عەمبارەکانی ئازووخەی سەر زەمینی میسڕم دابنێ (بمکە بە بەرپرسی ئابووریی وڵات) چونکە من پارێزەر(ی هەر شتێك)م (پێم بسپێردرێ‌و) زاناو شارەزاشم (بۆ چۆنیەتی سەرپەرشتیکردنی) ﴿٥٥﴾ بەو شێوەیە کە باسکرا، یوسوفمان لەسەر زەمینی میسڕدا دەستڕۆیشتوو کرد، هەر کوێیەکی

مەبەست بووایە دەیکردە نشینگە، بەزەیی خۆمان دەکەینە پشکی هەر کەسێك بمانەوێ‌و پاداشتی چاکەکاران بە فیڕۆ نادەین‌و زایەناکەین، ﴿٥٦﴾ پاداشتی دوارۆژ چاکتریشە بۆ کەسانێك کە بڕوایان هێناوە (بەوەی پێویستە بڕوای پێ بهێنرێ)و، پارێزیان دەکرد (لە هەموو ئەو شتانەی پێویستە پارێزیان لێ بکرێ) ﴿٥٧﴾} .

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

( بَالُ ) : (البالُ: الحَالُ الَّتِي يُكْتَرِثُ بِها، ما بالَيْتُ بِكَذَا بالَةَ: ما اكترثت بِهِ، ﴿ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾ ﴾طه، أي: ما حَالُهُم وَخَبَرُهُم)، وشەی (بال) بە حاڵەتێك دەگوترێ كە گرنگیی پێ بدرێ، دەگوترێ: (ما بالَيْتُ بِكَذَا بالة)، واتە: هیچ بایەخم پێ نەداو گرنگییم پێ نەدا، خوا کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴾، واتە: حاڵو بەسەرهاتو هەواڵی سەدە پێشووەکان، (واتە: کۆمەڵگا پێشووەکان کە لە سەدەکاندا ژیاون) چۆن بوو؟

( خَطْبُكُنَّ ) : (الخَطْبُ: الأَمْرُ العَظِيمُ الَّذِي يَكْثُرُ فِيهِ التَّخاطُبُ)، (خَطْب)، بریتیە لە كارێكی مەزن كە قسەی زۆر تێدا دەكرێن، كارێك كە مەزن بێ، خەڵك زۆر مشتومڕو وتوویژی تێدا دەكەن.

( حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ ) : دوو واتای هەن :

١ – واتە: (وَضَحَ وتَبَيَّنَ)، هەق دەركەوتوو، ئاشكرا بوو .

بە مانای: (ثَبَتَ وَاسْتَقَرَّ)، واتە: چەسپاو سەقامگیر بوو .

ئنجا وشەی (حَصَّ)، لەگەڵ (حَصْحَصَ)، وەك (كَفَّ)، و (كَفْكَفَ)، (كَبَّ)، و (كَبْكَبَ)، وایە، (كَفَّ)و (كَفْكَفَ) یانی: وازی هێنا، (كَبَّ)، و (كَبْكَبَ)، واتە: لەپەڕوو خرایە دۆزەخەوە .

وشەی (حَصَّهُ: أَي قَطَعَهُ)، كەواتە: ﴿ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ ﴾، بریتیە لەوە كە بەشی هەق لە بەشی ناهەق جیابێتەوە: (أَن تَتَبَيَّنَ حِصَّةُ الحَقِّ مِنْ حِصَّةِ الباطِلِ)، هەندێك دەڵێن لەوەوە هاتوە .

( ٱلۡخَآئِنِينَ ): واتە: ناپاكان، (الخِيانة: مُخالَفة الحَقّ بنقض العَقد فِي السِّرّ، وَنَقيضُهُ: الأَمانة)، (خيانة)، بریتیە لە پێچەوانەی هەق جوولانەوە، بەوە كە بە پەنهانیىو بە پەنامەكیى پەیمان بشكێندرێو، پێچەوانەكەی بریتیە لە (أمانة)، واتە: دەست پاكیىو پاراستنی پەیمانو پاراستنی هەر شتێك، كە دەست پێردرێ .

( وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓ ): واتە: پاكانە بۆ خۆم ناكەم، نەفسی خۆم بە پاك نازانم، (أَصْلُ: البُرءِ وَالبَرَاءَةِ والتَّبَرِّي: التَّقَصِّي مَمَا يُكرهُ مُجاوَرَتُهُ)، وشەی (بُرْء وَبَرَاءَةِوتَبَرِّي)، هەر سێكیان واتە: دووریى گرتن لە شتێك كە پێت ناخۆش بێ، لێت نیزیك بێ، دەگوترێ: (بَرِئْتُ مِنَ المَرَض، وبَرِئتُ مِن فُلانٍ، وتَبَرَّأْتُ مِنْهُ، وَأبرَئتُهُ، وَبَرَّئتهُ مِن كَذا، وَرَجُلٌ بَرِيءٌ)، (بَرئت مِنَ المَرَضِ)، واتە: لە نەخۆشییەكەم چاك بوومەوە، واتە: دووریيم لە نەخۆشیى گرت .

(بَرِئت مِن فُلانٍ وتَبَرَّأتُ مِنْهُ)، واتە: دووریيم لە فلان كەس گرتو حاشام لێكرد، (وَأبرَئتُهُ)، واتە: ئەوم بە بەریى لە قەڵەمدا، هەروەك: (بَرَّئتهُ مِن كَذا)، بە هەمان شێوە، (وَأبرَئْتُهُ وَبَرَّئتهُ مِن كَذا)، واتە: ئەوم بە دوور دانا، بە كوردییش دەڵێن: تەبریەی كرد، (وَرَجلٌ بَرِيءٌ)، پیاوێكی پاك، واتە: دوور لە تۆمەتو تاوان .

( أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ ): (أَجْعَلُهُ خالِصاً لِنَفْسي وَخاصّاً بِي، أَخْلَصَهُ وَاسْتَخْلَصَهُ أَي: جَعَلَهُ خاصّاً بِهِ)، (أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ)، واتە: بۆ خۆمی ساغ دەكەمەوەو تایبەتی دەكەم بە خۆمەوە، كە بەشی كەسی دیكەی تێدا نەبێ، بە تەئكید مەبەستی پادشای میسر ئەوە بووە، كە تایبەتی دەكەم بە هاوكاریی خۆمەوە لە حكومڕانییداو، ڕاوێژی پێ دەكەمو لە خۆمی وە نیزیك دەخەم، بە شێوەیەك كە بە هیچی دیكەوە سەرقاڵ نەبێ، جگە لە ڕاپەڕاندنی ئەو كارانەی كە من پێی دەسپێرم، وەك هاوكارێكم لە حوكمڕانیی دا .

( مَكِينٌ ): (صِفة مُشَبَّهة مِن مَكُنَ إِذَا صَارَ ذَا مَكانة، وَهِيَ المَرتَبة العَظِيمة)، (مَكِينٌ)، (صِفة مُشَبَّهة)یە، واتە: سیفەتێكە دەشوبهێنرێ بە كردارەوە، لە چییەوە هاتوە؟ (مِنْ مَكُنَ إِذَا صَارَ ذَا مَكانة)، كە دەگوترێ: (مَكُنَ فُلانٌ)، واتە: بوو بە خاوەن پێگە، (مَكانة)، بریتیە لە پلەیەكی مەزن .

( أَمِينٌ ): (فَعِيلٌ بِمَعْنَى مَفْعُول، أَي: مَأمونٌ عَلَى شَيءٍ موثُوقٌ بِهِ فِي حِفْظِهِ)، (أَمِين) لەسەر كێشی (فَعِيل)ە، بەلام بە مانای (مَفعُول)ە، واتە: بە ئەمین دانراو، دەگوترێ: (فُلان مَأمونٌ عَلَى كَذَا)، واتە: متمانەی پێ دەكرێ كە بیپارێزێ .

( مَكَّنَّا ): (مَكَّنَهُ تَمكِيناً، جَعَلَهُ ذَا مَكانة أَو قَوَّاهُ عَلَيْهِ)، (مَكَّنَّا)، دەگوترێ: (مَكناهُ وَمَكَّنا لَهُ)، هەردووكیان، واتە: كردی بە خاوەن پێگە، دەستڕۆیشتووی كرد، بالادەستی كرد .

( يَتَبَوَّأُ مِنْهَا ): (التَبوُّأُ: إِتِّخاذُ مَكانٍ لِلبوءِ أَي الرُّجُوعِ، فَمَعْنَى التَّبوءِ: النزُولُ وَالإِقَامة)، (تَبَوَّأْ): بریتیە لە ئەوە كە ئینسان شوێنی بۆ لا گەڕانەوە دیاریی بكات، كەواتە: (تَبوأ)، واتە: دابەزین لە شوێنێكو نیشتەجێ بوون تێیدا .

## مانای گشتی ئایەتەکان

ئەم هەشت ئایەتە - وەك گوتمان - حەوتەمین ئاڵقەیی زنجیرەی بەسەرهاتی یوسوفیان گرتۆتە خۆیان، كە باسی ئەوەیە: پادشا لە دوای یوسوف ﷺ ناردوە، دوای ئەوەی كە تەعبیری خەونەكەی بۆ كردوون‌و، نەخشەیەكی پازدە ساڵەیی ئابووریی بۆ داناون.

خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦۖ ﴾، پادشایەكە (ئەوەی كە زانراوە (معهود)ە، واتە: پادشای میسرٍ كە پێشتر باسی كراوە)، گوتی: بۆمی بێنن، واتە: یوسوفم بۆ بێنن، كە دوایی دەردەكەویٚ بۆ چیەتی !

﴿ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ ﴾، كاتێك كە نێرراوەكە هاتە لای، ئایا ئەو نێرراوە كیٚ بوو ؟ باس نەكراوە كە كیٚ بووە، گرنگ ئەوەیە پادشا نوێنەرێكی خۆی ڕەوانەكردۆتە لای، وەك نێردەی خۆی، كاتێك كە نێردراوەكە هات بۆ لای یوسوف ﷺ: ﴿ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ ﴾، دیارە نوێنەرەكە هاتۆتە لای یوسوف‌و گوتوویەتی: لە زیندان وەرە دەر، پادشا لە دوایی ناردووی، لەگەڵم وەرە، بەڵام ئەو لەگەڵی نەچووەو گوتوویەتی: بگەڕێوە بۆ لای خاوەنەكەت (بۆ لای پادشا)، ﴿ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ ﴾، لێی بپرسە: حاڵی ئەو ژنانەی كە دەست‌و پەلی خۆیان بڕی (لە كاتی میوە سپی كردندا لە ماڵی عەزیز)، حاڵ‌و بەسەرهاتیان چی بووو چۆن بوو؟ با لێكۆڵینەوە لەو ڕووداوە بكات، ﴿ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ﴾، بێگومان پەروەردگاری من (كە خوایە ﷻ) بە پیلان‌و نەخشەو فێڵی وان زانایە .

بەڵام با خاوەنەکەی تۆ، {کە پادشایە}، لێبکۆڵێتەوە بزانێ داخۆ ئەو ڕووداوە چی بووە و چۆن بووە؟ لێرەدا یوسوف ﷺ نەجابەتو نەزاکەتی خۆی پیشان دەدا، کە باسی ژنەکەی عەزیز هەر ناکات، کە دەورو خولی یوسوفی داوەو، داوای دەست تێکەڵیی لێ کردوەو، ویستوویەتی لە خشتەی بەرێ، باسی ئەو هەر ناکات، بەڵکو ڕووداوەکە بە گشتی باس دەکات، دەڵێ: ئەو ژنانەی کە دەستو پەلی خۆیان بڕی، با پادشا لێ بکۆڵێتەوە، داخۆ بەسەرهاتەکەیان چی بووە؟ چییان بەسەرهات؟ چونکە لە دوای ئەو ڕووداوە، بڕیاردرا کە یوسوف بە ناهەق زیندانیی بکرێ .

لێرەش دا ئەوە هەمووی پێچراوەتەوە کە:

پادشا لە دوای، ئەو ژنانەی نارد کە فلانو فلانو فلان ...هتد بوون، بێگومان دیارییکراو بوون، ژنانی پیاوانی ناسراوی وڵات بوون، چونکە عەزیزی میسر، ئەگەر سەرۆکی پاسەوانەکانی پادشا بووبێ، یان سەرپەرشتیاری ئەو پایتەختە بووبێ، کە پادشا لێیەتی، هەر چۆن بێ، پیاوێکی ناودار بووە، پیاوێکی دەستڕۆیشتوو بووە، ئەو ئافرەتانەش کە لەگەڵ ژنەکەی ئەودا کەینو بەینیان بووەو، کۆی کردوونەوەو، کۆڕی بۆ سازکردوونو، میوەی بۆ داناون، ئنجا شوێنی پاڵدانەوەو شانداداننی بۆ داناون، دیارە ئەوانەش ئافرەتانی ناسراو بوون، هاوسەرانو ژنانی پیاوانی دەستڕۆیشتووی وڵات بوون، بۆیە دیار بوون کێو کێن ؟

باسی ئەوە هەمووی پێچراوەتەوە: لە دوای ناردنو کۆی کردنەوە: ﴿ قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ ﴾، پادشا پێی گوتن: هەواڵتان، ئیشو حاڵتان چی بووە؟ کاری ئێوە چی بوو؟ ﴿ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ ﴾، کاتێك کە ئێوە داوای دەست تێکەڵییتان لە یوسوف کرد ؟ داواتان لە یوسوف کردو هەوڵتان لەگەڵ یوسوفدا، کە لەسەر ڕای خۆی لای بدەنو خۆیتان تەسلیم بکاتو بیهێننە سەر ڕاوو قەناعەتی خۆتان، کە ڕای یوسوف بریتی بووە لە پاکیی، ڕای ئێوەش بریتی بوو لە کاروکردەوەی خراپ ؟!

مەرج نیە لێرەدا مەبەست ئەوە بێ، کە هەر کامێکیان داوای لە یوسوف کردبێ دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکات، بەڵام بێگومان هەموویان بوونە یەك تیمو بە هەرەوەزیی داوایان لە یوسوف کردوە، کە داخوازیی ژنەکەی عەزیز جێبەجێ

بکات، وەك کۆیلەیەك، ڕەنگە عورفو عادەتیان وا بوو بێ، کە کۆیلەو خزمەتکار نابێ لە قسەی گەورەی خۆی دەرچێو، مادام لە ماڵی وان دایە، هەر داوایەکی لێبکەن، دەبێ بۆیان جێبەجێ بکات ! بۆیە پادشا پاڵی دەداتە لای هەمووان، واتە: بە هەمووتان گەلە کۆمەکییتان لە یوسوف کرد، بۆ ئەو کارەو ئەویش ملی بۆ نەدا !

﴿قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ﴾، دوای ئەوەی پرسیاری لێکردن چی بوو؟ چۆن بوو؟ گوتیان: پاکیی بۆ خوا، واتە: ئێمە خوا بە دوور دەگرین، بە پاك دەگرین، لەوە کە قسەیەکی ناهەق بکەین، یاخود: خوا بە پاك دەگرین، لەوەدا کە پیاوی وەك یوسوف خراپەی لێ بوەشێتەوە، یان: ﴿حَٰشَ لِلَّهِ﴾، واتە: نا بە خوا، یان: ئەو شتە بەو شێوەیە نیە، ﴿مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖ﴾، ئێمە هیچی خراپمان لەبارەیەوە نەزانیوە، هیچی خراپمان لەسەر نەبیستوە، واتە: هیچ شتێك کە زیان بەخش بێ بۆ یوسوفو، حاڵی خراپ بکاتو، ناوو سومعەو ناوبانگی خراپ بکات، ئێمە لەبارەیەوە نەمانزانیوە .

﴿قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ﴾، ژنەکەی عەزیز گوتی: ئا ئێستا هەق چەسپا، هەق دەرکەوتو ڕوون بۆوە، ئەو هەقە چییە؟ ﴿أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ﴾، من ویستم ئەو پەلکێش بکەم، من ویستم ئەو دەستبەرداری نەفسی خۆی بێتو خۆی تەسلیمی من بکات، ئەوەی پێی دەڵێم ئەوەم بۆ جێبەجێ بکات، کە بریتی بوو لە دەست تێکەڵیی‌و داوێن پیسیی، ﴿وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾، بێگومان ئەو لە ڕاستگۆیانە، ئەوەی گوتوویەتی: کە من هیچی خراپم نەکردوە، ڕاستە، یانی : کە کاتی خۆی گوتی : ﴿هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِي﴾، ئەو ژنە ویستی من لە خشتە بەرێو من پەلکێش بکات، ڕاستی گوتوە، من دەست پێشخەر بووم، من ویستم ئەو پەلکێش بکەم .

ئنجا یوسوف عليه السلام پاساو دێنێتەوە کە بۆچی داوای لە پادشا کرد: لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوە بکات .

﴿ ذَٰلِكَ ﴾، ئەوەم بۆیە كرد، ئەوەم بۆ ئەوە بوو: ﴿ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ ﴾، بۆئەوەی بزانێ، (یانی: عەزیز بزانێ، كە یوسوف كۆیلەی ئەو بووەو لە ماڵی ئەودا بووە)، كە كاتێك ئەو لە ماڵ نەبووە، یان: بە پەنامەكیی، چونكە (بِالْغَيْبِ):

١ – دەگونجێ پەیوەندیی بە یوسوفەوە بێ، واتە: كاتێك كە من لە حاڵەتی پەنامەكیی دا بووم‌و عەزیزم لێ دیار نەبوو .

٢ – یان پەیوەندیی بە عەزیزەوە بێ، یانی: كاتێك عەزیز ئاگای لێ نەبووەو نادیار بووە لە ماڵ .

٣– یاخود پەیوەندیی بە شوێنەكەوە بێ، لە شوێنێكی پەنامەكیی دا، من خیانەت‌و ناپاكییم پێ نەكردوە، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت، كە هیچ لەسەر دەستی من ڕووی نەداوە، وەك خیانەت‌و ناپاكیی .

﴿ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ ﴾، ئەو لێكۆڵینەوەشم بۆ ئەوە بوو، بزانرێ كە خوا فێڵ‌و پیلانی ناپاكان ڕێنمایی ناكات‌و بە ئامانج ناگەیەنێ .

ئنجا یوسوف ﷺ بەردەوام دەبێ‌و دەڵێ : ﴿ وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي ﴾، نەفسی خۆشم بە پاك ناگرم، واتە: بۆیە وا ناڵێم، پاكانە بۆ خۆم بكەم، كە: من زۆر پاك‌و چاكم، چونكە ئینسان هەرچەندە زۆر پاك‌و چاك بێ، نابێ خۆی بە پاك‌و چاك بزانێ، ﴿ إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي ﴾، بێگومان نەفس زۆر فەرمان دەكات بە خراپە، مەگەر لە حاڵێكدا پەروەردگارم بەزەیی بنوێنێ‌و مرۆڤ لە شەڕی نەفسی، لە دنە دانی نەفسی بەرەو خراپە، بپارێزێ، ئەگەرنا نەفس زۆر فەرمانكەرە بە خراپە، ئەگەر خوا لە بەندەی خۆی بگەڕێ‌و وێڵی بكات، نەفس‌و شەیتان زەفەری پێ دەبەن‌و تووشی تەڵە‌و داوی خۆیانی دەكەن، ﴿ إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان پەروەردگاری من زۆر لێبووردەی بە بەزەیی‌و میهرەبانە .

هەڵبەتە وەك من تەفسیرم كرد، ئەوەم بە دڵە كە ئەم قسەیە، قسەی یوسوف ﷺە، چونكە وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا زیاتر تیشكی دەخەینە سەر، ئەم قسانە لە یوسوف دەوەشێنەوە .

هەندێك لە توێژەرەوانیش بەڵكو زۆربەیان گوتوویانە: ئەمە قسەی ژنی عەزیزەو، دەڵێ: بۆیەش ئەو شایەدییە دەدەم، تاكو یوسوف بزانێ كە كاتێك ئەو لێرە نەبووە، (پشتە ملە) ناپاكییم پێ نەكردوە، خواش ڕێنمایی پیلانو فێڵی ناپاكان ناكات، خۆشم بە پاك نازانم، چونكە نەفس زۆر فەرمان دەكات بە خراپە، مەگەر پەروەردگارم بەزەیی بنوێنێ، بێگومان پەروەردگارم لێبوردەی بە بەزەییە .

ئەم ڕایەش هەیەو زۆربەی توێژەرەوانی قورئان ئەم ڕایەی دووەمیان هەڵبژاردوە، بەڵام بە سەرنجدانی سیاقەكەو بە سەرنجدانی قسەكانو لێ وردبوونەوەیان، پێم وایە ئینسان دەگاتە ئەو قەناعەتەی كە ئەو قسانە لە یوسوف ﷺ دەوەشێنەوە، نەك لەو ژنە .

(طَبَري)یش، هەر ئەم ڕایەی هێناوەو ژمارەیەك لە توێژەرەوان ئەم ڕایەیان هێناوە، بەڵام زۆربەیان ڕایەكەی دووەمیان هێناوە : كە من پێم وایە نەگونجاوە، بەڵام هەر چۆنێك بێ، ئەویش هەر ڕێی تێدەچێ .

﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِي ﴾، بۆ جاری دووەم پادشا گوتی : بۆم بێنن، تایبەتی دەكەم بە خۆمەوە، هەڵیدەبژێرم بۆ خۆم، واتە: بۆ هاوكاریی خۆم لە حوكمڕانییدا .

﴿ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ ﴾، ئنجا باسی ئەوە هەمووی پێچراوەتەوە كە لە دوایان ناردو هاتو، پادشا قسەی لەگەڵدا كردو... هتد، یەكسەر هاتۆتە سەر ئەسڵی مەبەست: ﴿ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ ﴾، ئنجا كاتێك پادشا دواندیو تەماشای نەزاكەتو نەجابەتو حیكمەتو لێزانییو دامەزراویی یوسوفی كرد: ﴿ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴾، پێی گوت: تۆ ئەمڕۆ لەلای ئێمە زۆر بەڕێزو حورمەتو خاوەن پایەی، زۆریش ئەمینی، واتە: لەلای ئێمە متمانەو باوەڕ پێكراوی .

﴿ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴾، واتە: یوسوف گوتی: لەسەر عەمبارەكانی سەر زەمینی میسرِم دابنێ، واتە: كاروباری ئابووریی‌و دەرامەت‌و ئازووخەم پێ بسپێرە، بێگومان من پارێزەری زانام .

ئیدی باس نەكراوە كە پادشا وەڵامەكەی داوەتەوە، چونكە هەر لە سەرەتاوە دیارە، كە پادشا خوای بووە یوسوف هاوكاری بێ‌و دەستبار گری بێ، ئنجا وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەكانیشدا باس دەكەین: لە پەیمانی كۆندا وردەكاریی زیاتر لەوبارەوە باس كراوە، كە چ رێزو حورمەتێك لە یوسوف نراوە، لەلایەنی پادشاو حوكمڕانانی ئەو كاتی میسرەوە .

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە، واتە: بەو شێوە دەست ڕۆیشتوو كردنە، یوسوفمان دەست ڕۆیشتوو كرد، ئەوە واتایەكی، یاخود: ئاوا بەو شێوەیە وەك چۆن یوسوفمان لە بیر هێنایە دەرو، دوایی بردمانە كۆشكی عەزیزی میسرو، دوایی لە زیندان هێنامانە دەرو، دوایی پەرێز پاكییمان دەرخست، وەك چۆن ئەوانەمان بۆ كرد، ئێستاش دەستڕۆیشتوومان كرد لە زەوی دا، واتە: لەسەر زەمینی میسرو وڵاتی میسردا، دەستمان كردەوە، دەستڕۆیشتوومان كرد، پێگەو دەستەڵاتمان پێدا، ﴿ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ ﴾، لە هەر شوێنێكی پێی خۆش بوو بێت‌و ویستبێتی، كردوویەتی بە نشینگەو شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی .

كەواتە: لە چوارچێوەی وڵاتی میسردا، یوسوف ﷺ دەستڕۆیشتوو بووەو وەك حوكمڕانێك لە كوێی پێ خۆش بووە، لەوێ نیشتەجێ بووە، ﴿ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ ﴾، ئێمە هەر كەسێكمان بوێ بەهرەمەندی دەكەین لە بەزەیی خۆمان، واتە: بەزەیی خۆمان بە قسمەت هەر كەسێك دەكەین‌و، دەبەخشین بە هەر كەسێك كە بمانەوێ، ﴿ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، پاداشتی چاكەكارانیش بە فیڕۆ نادەین، ونی ناكەین‌و زایەی ناكەین .

﴿ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴾، بێگومان پاداشتی دوارۆژیش باشترە بۆ کەسانێك کە بڕوایان هێناوەو، بەردەوامیش پارێز دەکەن، ئەگەر بڕواهێنان یەکجار دەبێ، بێگومان تەقوا پێویستی بە حاڵەتێکی بەردەوام هەیە، بۆیە بە کرداری ڕابردوو، باسی ئیمانی کردوە : (ءَامَنُواْ)، واتە: ئیمانیان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، (وَكَانُواْ يَتَّقُونَ)، پارێزیشیان دەکرد، بە کرداری ئێستا (فعلِ المُضارِع)، هێناویەتی، کە ئێستاو بەردەوامیی دەگەیەنێ، چونکە پارێز کردن شتێکە تازە دەبێتەوە لەگەڵ هەموو هەڵوێستێکداو، لەگەڵ هەموو هەڵسو کەوتێکدا، مرۆڤ دەبێ لە خۆی وریا بێو، پارێز لە خوا بکاتو، شتێك نەکات کە خوا پێی ناخۆش بێ، چ بە چواندنی ئەرکێك، چ بە توخن کەوتنی قەدەغەو حەرامێك .

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم :** لە دوا ناردنی یوسوف لەلایەن پادشاوەو ڕەتكردنەوەی یوسوف كە لە بەندیخانە بچێتە دەرێ، هەتا لێكۆڵینەوە لەگەڵ ئەو ژنانەدا نەكرێ، كە دەستو پەنجەی خۆیانیان بڕی بوو، لە كاتی میوە خواردندا، لە ماڵی ژنەكەی عەزیزی میسر، تاكو پاكیەتیی خۆی دەربخات، لەو بوختانەی كە پێی زیندانیی كراوە :

وەك خوا دەفەرمویٚ : ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ  ﴾.

#### شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە لە پێنج بڕگەدا

١) – ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦ ﴾، پادشا گوتی: بە دوای دا بچن بۆمی بێنن، واتە: یوسوفم بۆ بێنن، دیارە بە پلەی یەكەم بۆ ئەوەی خۆی ڕاستەوخۆو ڕووبەڕوو گوێی لێ بێتو خەونەكەی بۆ تەعبیر بكات، چونكە ئەو خەونە پەیوەندیی بە پازدە ساڵی داهاتووی وڵاتی میسرەوە هەیە، بەتایبەت لە ڕووی ئابوورییەوە، پاشان تەماعی ئەوەشی لە یوسوفدا هەبووە، كە كاری پێ بسپێرێ، دوای ئەوەی دەیناسێو شارەزای دەبێو تواناكانی دەبینێ، بە بەڵگەی ئەوە كە لە ئایەتی (٥٤)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴾، واتە: دوای ئەوەی كە دواندیو لە نیزیكەوە ناسیو پێی شارەزا بوو، ئنجا گوتی: تۆ ئەمڕۆ لەلای ئێمە بەڕێزیو متمانەپێكراوی .

٢) - ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ ﴾، ئنجا کاتێك کە نێرراوەکە هاتە لای، ئەو نێردراوە کێ بووە؟ ناوی چی بووە؟ باس نەکراوە، گرنگ ئەوەیە پادشا نێردراوێکی تایبەتی خۆی بە دوای یوسوفدا ناردوە بۆ بەندیخانە، کە: وەرە دەرێ! پادشا لە دوای ناردووی‌و کاری پێتە .

٣) - ﴿ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ ﴾، یوسوف ﷺ بە نێردراوەکەی گوت: بگەڕێوە بۆ لای گەورەکەت .

(رَبّ)، لێرەدا بە مانای سەروەر(سید)و سەرپەرشتیار (متولّي الأُمور)و خاوەن (مالِك)و سەرۆك (رَئيس) دێ، بەڵام بە تەئکید بە مانای خوای پەروەردگار نایەت، چونکە وەك پێشتریش باسمان کرد: وشەی (رَبّ)، بە ڕەهایی تەنیا بۆ خوا بەکاردێ، بەڵام بە شێوەی گوێرەیی (نِسْبي)، بە پاڵدانە لای ڕاناوی دوێندراو، یاخود نادیار، یان قسەکەر: (رَبَّك، رَبَّهُ، ربِّي)، ئەوە دەگونجێ، چونکە خاڵی هاوبەشی بەینی پەروەردگارێتیی ڕەهای خوا ﷻ و سەرپەرشتیکردنی بەندەکان، بریتییە لە سەرپەرشتیکردن‌و کاروبار هەڵسووڕاندن، کەواتە: لێرەدا: ﴿ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ ﴾، دەگونجێ بڵێین، واتە: بگەڕێوە لای سەییدەکەت، لای سەرپەرشتیارەکەت، لای خاوەنەکەت، لای سەرۆکەکەت، لای پادشایەکەت، هەموویان دەگرێتەوە .

٤) - ﴿ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّ ﴾، لێی بپرسە: حاڵ‌و بەسەرهاتی ئەو ژنانەی دەستی خۆیانیان بڕی، چی بوو؟ چۆن بوو؟ واتە: ئەو ژنانەی دەست‌و پەنجەی خۆیان بڕی، لە کاتی میوە خواردنندا، کە میوەیان قاش کردوەو سپیان کردوەو ئامادەیان کردوە بۆ خواردن .

**لێرەدا ئێمە چوار هەڵوەستە دەکەین، لەبەردەم ئەم ڕستەیەدا:**

یەك/ یوسوف دەیەوێ لەو ڕێیەوە، پەرێز پاکیی خۆی دەربخات، بەڵام باسی ژنەکەی عەزیزو ماڵی عەزیز ناکات، سەرنج بدەن! یوسوف چەند جوامێرو بە نەزاکەت‌و چەند بە سەلیقەو لێزان بووە، باسی ژنەکەی عەزیزی

میسرِ ناکات، کە بوختانی پێکردوەو لەسەر داواو بوختان پێکردنی وی، تووشی زیندان بووە، کەچی ئاگاداری سومعەی ئەوانە، نایەوێ باسیان بکات، بەڵام دەشیەوێ پەرێز پاکیی خۆیو ئەستۆ پاکیی خۆی دەربخات، بۆیە بە گشتیی دەڵێ: لە گەورەکەت بپرسە! حاڵی ئەو ژنانەو ڕووداوو بەسەرهاتی ئەو ژنانە، کە دەستو پەنجەی خۆیان بڕی، با لێی بکۆڵێتەوە داخۆ چۆن بووە ؟!

دوو/ دیارە ئەو بەسەرهاتە: بەسەرهاتی دەستو پەنجەی خۆ بریندارکردنی ژنەکان، شتێکی زانراو بووە، یوسوف ﷺیش زانیویەتی لەو سەرە داوەوە، پاکیەتیی وی دەردەکەوێ، بۆیە بەو نێردراوەی پادشای گوتوە : با لەو ڕووداوە بکۆڵێتەوە .

سێ/ دیارە یوسوف ﷺ دڵنیاش نەبووە کە ژنەکەی عەزیز، لەسەر هەڵوێستی بوختان کردنی خۆی بەردەوام نابێ، بۆیە کەمو زۆر بە لای وێدا[1] نەچووە، بەڵام گوتوویەتی: ئەگەر ئەو ژنانە کۆبکاتەوەو پادشا لە ڕووداوەکە بکۆڵێتەوە، ئومێدی هەبووەو جۆرێك لە متمانەی هەبووە، ئەگەر هەمووشیان نەبێ، هەندێك لەو ژنانە ویژدانو ئینصاف لەگەڵ یوسوفدا بەکاردێنن و، حەقیقەتی ڕووداوەکە چۆن بووە، ئاوا باسی دەکەن .

چوار/ لە تەوراتدا ئەم بەسەرهاتە نەهاتوە، وەك لە: (التفسیرُ التَطبیقِي للكِتابِ المقَدَّسِ، سفرُ التكوین، الإصحاح: ٤١، ص ١٠٥و ١٠٦)دا، دیارە، باسی ئەو ڕووداوە نەکراوە، کە ڕووداوێکی زۆر گرنگیشە، ئەوەش یەکێکە لەو کەمو کوڕییانەی کە خاوەن کتێبەکان لە کتێبەکانی خۆیاندا پەیدایان کردوون، کە بریتیە لەوەی هەندێك شتیان فەرامۆش کردوە، یان لە بیر کردوە، بەڵام قورئان ئەوەی بە پێویستی زانیبێ، ڕاستیکردۆتەوە، وەك لە سوورەتی (النمل)دا خوا دەفەرموێ : ﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ

---

١) (وێ) بۆ ئافرەتو (وی) بۆ پیاو بەکاردێن لە زار (لهجة)ی موکریانیی دا.

أَكْثَرَ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾، ئەم قورئانە زۆرێك لەوەی بەنو ئیسرائیل تێیدا کەوتوونە ڕا جیایی، بۆیان باس دەکات.

هەروەها لە سوورەتی (المائدة)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: ئەی خاوەن کتێبینە! لە پەروەرگارتانەوە ڕەوانەکراوێك پێغەمبەرێکتان بۆ هاتوە کە (موحەممەد ﷺ) زۆرێك لەوەی کە لە کتێبی خوا پەنهانتان دەکرد، بۆتان ڕوون دەکاتەوە، زۆرێکیش (کە پێویست ناکات)، چاوپۆشیی لێدەکات‌و نادیدەی دەگرێ (و پێویست ناکات ڕاستی بکاتەوە).

٥) - ﴿إِنَّ رَبِّى بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ ﴾، یوسوف عليه السلام دەیەوێ پێیان بڵێ: کە پەروەردگاری من، کە هەر ئەو پەروەردگاری ڕاستەقینەیە، (خوا سبحانه وتعالى) بە پیلان‌و فێڵی ئەو ژنانە زانایە، خوا سبحانه وتعالى وردو درشتی پیلان‌و فێڵەکەی ئەوان دەزانێ، بەڵام گەورەکەی تۆ (پادشا) هەتا لێ نەکۆڵێتەوەو لێ ورد نەبێتەوەو، گوێیان لێ نەگرێ، بۆی دەرناکەوێ، بەڵام خوا پەروەردگاری ڕاستەقینە، تاکە پەروەردگار کە شایستەی ئەوەیە کە پێی بگوترێ: پەروەردگار، هەموو شتێك دەزانێ .

دەیەوێ ئاگاداریان بکاتەوە کە پەروەردگاری ڕاستەقینە، دەبێ زانیاریی خودیی‌و بێ سنووری هەبێ، بە هەموو کەس‌و بە هەموو شتێك، نەك تاکو نەپرسێ، نەزانێ !!

لەم بارەوە ئەم دەقە هاتوە کە یوسوف عليه السلام چەند لێزانانەو کارزانانە، چەند خۆڕاگرانە لەگەڵ لە دوانـاردنی پادشادا، مامەڵەی کردوە، یەکسەر نەچووە کە دەرگای زیندانیان لێکردەوە، بڵێ : زۆر چاکەو بە پەلە بچێتە دەرێ! بەڵکو ویستوویەتی پەرێز پاکیی خۆی دەربخات، خەڵك هەمووی بزانێ کە بوختانی پێکراوە، ئنجا لەو بەندیخانەیە بێتە دەرێ، تاکو دوایی کەس نەتوانێ پەنجەی خیانەتی بۆ درێژ بکات، لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :

{يَرْحَمُ اللهُ لُوطا، لَقَدْ كَانَ يَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ، وَلَوْ لَبِثْتُ فِي السِّجْنِ طُولَ مَا لَبِثَ يُوسُفُ، لأَجَبْتُ الدَّاعِيَ، وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالشَّكِّ مِنْ إِبْرَاهِيمَ، إِذْ قَالَ: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِنۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ...﴿٢٦٠﴾ ﴾ البقرة}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرَقم: (٨٣١١)، وَالبُخَارِيُّ بِرَقم: (٤٢٦٣)، وَمُسْلِمٌ بِرَقم: (١٥١)، وَالنَّسَائِي بِرَقم: (١١٠٥٠)} .

واتە: خوا بەزەیی بە لووط دا بێ، پشتی بە هێزێكی مەحكەمەوە بەستبوو، كاتێك كە گەلە خراپەكارەكەی هاتن دەورو خولی میوانەكانی هەڵهاتن، كە خراپەیان لەگەڵدا بكەن، لووط گوتی : ﴿ قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ ﴿٨٠﴾ ﴾، واتە: ئەگەر خۆم هێزێكم ببووایە، یاخود پشتم بە پاڵ پشتێكەوە بەستبایە، پێغەمبەر دەفەرموێ: خوا بەزەیی پێدابێ، پاڵ پشتێكی مەحكەمی لە پشت بوو، (بەلام لووط ﷺ نەیدەزانی كە ئەوانە فریشتەنو، هاتوون بۆ لە بەینبردنی گەلە خراپەكەی)و، ئەگەر ئەوەندەی كە یوسوف لە بەندیخانەدا ماوەتەوە، منیش هێندە مابامەوە، یەكسەر كە ئەو بانگكەرە بە دوامدا دەهات، دەچوومە دەرێ، {واتە: ڕانەدەوەستام تاكو لێكۆڵینەوە دەكرێ، لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ وەك خاكیی بوونو خۆ بە كەمگریی وا دەفەرموێ، ئەگەر نا بە تەئكید پێغەمبەری خاتەم، لە پێش هەموو پێغەمبەرانەوە بووە، لە هەموو ڕەوشتێكی بەرزو جوان دا، بەلام لێرەدا دەیەوێ مەدحی یوسوف بكات، كە یوسوف زۆر خۆڕاگر بووە} .

(القُرطُبي)، دەڵێ: مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە كە ئەگەر من بوومایە لە جێی یوسوف ، لە جیاتی ئەوەی داوا بكەم پادشا لێ بكۆڵێتەوە، بۆ خۆم دەچوومە دەرو بۆ پادشام ڕوون دەكردەوە، ئەوە باشتر بوو لەوەی كە یوسوف كردوویەتی، چونكە دەگونجێ پادشا ئیهمالیی كردبایە !

بەلام من پێم وایە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا وەك خۆ بە كەمگریی‌و مەدح كردنی یوسوف، كە زۆر خۆڕاگر بووە، ئەوەی فەرمووە، چونكە ئەوەی دیكەش هەر وا ئەوە دەگەیەنێ، كە دەفەرموێ :

(ونَحْنُ أَحَقُّ بالشَّكِّ مِنْ إِبْرَاهِيمَ)، ئێمە لە ئیبراهیم شایستەترین بە دوو دڵیی، کە کاتێك داوا لە پەروەرگاری دەکات: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، واتە: کاتێك ئیبراهیم بە پەروەردگاری فەرموو : پەروەردگارم پیشانم بدە ! چۆن مردووان زیندوو دەکەیەوە، خواش دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ تُؤْمِن ﴾، ئایا بڕوات نەهێناوە؟ ئەویش دەفەرموێ: ﴿ قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى ﴾، با بڕوام هێناوە، بەڵام دەمەوێ دڵم ئارام بگرێ، واتە: دوای ئەوەی زانیاریی دڵنیاکەر (عِلم اليقين)م، هەیە بەوە کە تۆ دەتوانی مردووان زیندوو بکەیەوە، دەمەوێ (عين اليقين)یشم، هەبێو بە چاوی سەریش بیبینم، بۆ ئەوەی دڵم زیاتر ئارام بگرێ .

کەواتە: ئیبراهیم لەبەر دوو دڵیی نەبووە، ئەگەرنا ئێمە لە ئیبراهیم شایستەترین بە دوو دڵیی، واتە: لێرەشدا پێغەمبەری خوا دیسان دەیەوێ: مەدحی ئیبراهیم بکات، کە لە ڕووی دوو دڵییو گومانەوە نەبووە کە گوتوویەتی: خوایە پیشانم بدە! بەڵکو وەك بۆخۆی ڕوونی کردۆتەوە، بۆ ئەوە بووە دڵی زیاتر ئارام بێ، ئینسانی ئیمانداریش دەبێ هەمیشە هەوڵبدات، زیاتر بە ئیماندا ڕۆ بچێو ئیمانەکەی کامڵترو دامەزراوتربێ .

**مەسەلەی دووەم : پرسیارکردنی پادشا لە ژنەکان، ئەو ژنانەی کە هاوسەری عەزیزی میسر بانگێشتی ماڵی خۆیانی کردبوون، لەبارەی ڕووداوی هەوڵدانی دەست تێکەڵییەوە لەگەڵ یوسوف داو، ڕاگەیاندنیان بۆ پاکیی یوسوفو، دانپێدانانی ژنی عەزیز کە خۆی هەوڵی ڕام کردنی یوسوفو پەلکێش کردنی داوەو، یوسوف ڕاست دەکات: هیچ خراپەیەکی لێ نەپشکوتۆتەوە:**

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ قُلْنَ حَـٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ ۚ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْـَٔـٰنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ﴾:

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بە پێزە لە نۆ بڕگەدا**

١) - ﴿ قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ ﴾، ﴿ مَا خَطْبُكُنَّ ﴾، (الخَطْبُ: الشأنُ المُهِمُّ مِنْ حَالَةٍ حَادِثَةٍ، قِيلَ سُمِّيَ خَطْباً لأنَّهُ يَكثُر فيهِ التَخاطُبُ، وَقِيلَ سُمِّيَ خَطْبا لأنَهُ يُخْطَبُ فِيهِ، وَإنَّما تَكونُ الخُطْبَة فِي أمْرٍ عَظِيمٍ)، پادشا لە ئافرەتەکانی پرسی : ﴿ مَا خَطْبُكُنَّ ﴾، واتە: حاڵتان چی بوو؟ چیتان کرد؟ چۆن بوو؟ چۆن گوزەرا؟ وشەی (خَطب) بریتیە لە کارێکی گرنگ، حاڵەتێك، ڕووداوێك، بۆیەش ناوی لێنراوە : (خَطب)، چونکە قسەکردنی تێدا زۆر دەبێ، یەکدی دواندنی تێدا زۆر دەبێ، هەندێکیش گوتوویانە: بۆیە پێی گوتراوە: (خَطْب)، چونکە گوتاری تێدا دەدرێ، گوتاریش لە کارو ڕووداوی گرنگدا نەبێ، نادرێ .

٢) - ﴿ إِذْ رَاوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ ﴾، واتە: حاڵی ئێوە چی بوو؟ ئەو ڕووداوە چۆن بوو؟ بۆچی واتان کرد، کاتێك کە هەوڵتان لەگەڵ یوسوف دا: خۆیتان تەسلیم بکات و ویستتان ڕامی بکەن و لە خشتەی بەرن؟!

٣) - ﴿ قُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ ﴾، ئافرەتەکان گوتیان: پاکیی بۆ خوا، یان وەك لە کوردیی دا دەڵێن: نا بە خوا، واتە: شتی وا نەبووە، یان: پاکیی بۆ یوسوف لەبەر خوا، (حَاشَ لِيوسُفَ عَنِ السوءِ لِلِه)، لەبەر خوا، ئێمە پاکیی یوسوف دەردەبڕین، کە هیچ خراپەیەکی نەهاتۆتەوە سەرێ، یان وەك پێشتریش باسمان کرد، یانی: پاکیی بۆ خوا ﷻ لەوەی کە بەندەیەکی وەك یوسوفی، خراپەیەکی بوو بێ، واتە: (تَنْزِيهاً لِلهِ عَن أن يَتَلَبَّسَ يُوسُفُ بالسوء)، پاکیی بۆ خوا، کە یوسوف خراپەیەکی هاتبێتەوە سەر .

٤) - ﴿ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ ﴾، هیچ خراپەیەکمان لەبارەیەوە نەزانیوە .

ئەم ڕستەیەش لە ئەسڵدا بریتیە لە: (ماعَلِمْنا عَنْهُ) یان: (ما عِلْمنا مِنْهُ)، بەڵام لێرەدا کە دەڵێ: ﴿ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ ﴾، لەبەر ئەوەیە کە وشەی:

(عَلِمْنا)، مانای (اِطَّلَعْنا)ی خراوەتە نێو، {(ضُمِّنَ عَلِمنا: مَعْنَى اطَّلَعْنا، أَيْ: ما عَلِمْنا مِنْهُ سوءً)، ولا اطَّلَعْنا عَلَى شيءٍ مِنَ السوءِ مِنْ جانِبِهِ}، هیچ خراپەیەکمان لەبارەیەوە نەزانیوەو، ئێمە ئاگاداری هیچ خراپەیەك نەبووین لەبارەی ئەوەوە.

ئەو (مِنْ)ەش لەسەر: (مِنْ سوءٍ)، واتە: هیچ جۆرە خراپەیەك، نە زۆر، نە کەم، بەو شێوەیە ئافرەتەکان شایەدیی دەدەن، کە ئەوان هیچ خراپەیەکیان لە بارەی یوسوفەوە، نەزانیوە .

٥) - ئنجا ژنەکەی عەزیز دێتە دەنگ : ﴿قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ﴾، ژنەکەی عەزیز، گوتی، دیارە لە تەوڕاتیشدا ناوی ئەو ژنەی عەزیزی میسرٍ نەهاتوە داخۆ ناوی چی بووە؟ ئیدی ئەوە کە لە هەندێك لە کتێبەکاندا، دەڵێ: ناوی زەلّێخا بووە، نازانم لە چ سەرچاوەیەکەوە هاتوە، گرنگ ئەوەیە لە پەیمانی کۆنیشدا، لە تەوڕاتیشدا، ئەوە نەهاتوە .

٦) - ژنەکەی عەزیز گوتی: ﴿ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ﴾، وشەی: ﴿ٱلۡـَٰٔنَ﴾، (ظَرف)ە، بۆ کاتی ئێستا، یانی: هەر ئائێستا، ﴿حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ﴾، هەق دەرکەوت، یاخود: هەق چەسپا، بۆچی گوتوویەتی: ﴿ٱلۡـَٰٔنَ﴾؟ واتە: ئائێستا نەك پێشتر، چونکە پێشتر کاتێکی ناهەق بوو، کاتێکی بە تاڵ بوو، کە یوسوفی تێدا تۆمەتبار کرا بوو، بەوە کە هەوڵی پەلکێش کردنی ئەو ئافرەتەی داوەو، لە دەورو خولی هەڵاتوەو هەوڵی ڕامکردنی داوە! بۆیە لێرەدا کە دەڵێ: ﴿ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ﴾، واتە: هەر ئائێستا، چونکە دیارە پێشتر: لەلایەکەوە: ژنەکەی عەزیز یوسوفی تۆمەتبار کردوەو، لەلایەکی دیکەوە: یوسوفیش گوتوویەتی: نەخێر، ئەو ویستوویەتی من ڕام بکاتو دەست پێشخەریی کردوەو، ویستوویەتی من پەلکێش بکات، بۆیە لەو کاتەدا هەق ون بووەو شێردراوەتەوە، بۆیە ئەو ئافرەتە دەڵێ: ئائێستا، کە هەم ئافرەتەکان بە کۆ دەنگیی، شایەدیی بۆ پاکیی یوسوف دەدەنو،

هەم ژنەکەی عەزیزیش شایەدیی بۆ یوسوف و بە زیانی خۆی دەدات، هەق زۆر بە زەقیی دەرکەوتوە .

٧) – ﴿أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ﴾، من ویستم ئەو ڕام بکەم، ویستم ئەو لە قەناعەتی خۆی لا بدەم و، بیهێنمە سەر قەناعەتی خۆم، کە دەستم لەگەڵ تێکەڵ بکات بە حەرامیی .

وشەی ﴿حَصۡحَصَ﴾، لە ڕیشەدا لە (حَصَصَ)ەوە هاتوە، واتە: دەرکەوت، ئنجا بۆچی گوتراوە: ﴿حَصۡحَصَ﴾؟ وەك چۆن (كَبَّ)، واتە: لەسەر دەم و چاو کەوت، بەڵام (كَبْكَبَ)، بۆ زێدەڕۆیی تێدا کردنی ماناکەیەتی، (كَفَّ)، واتە: وازی هێنا، (كَفْكَفَ)ش هەروایە، ئەوەش بە هەمان شێوە: ﴿حَصۡحَصَ﴾ و (حَصَصَ)، واتە: دەرکەوت، بەڵام ﴿حَصۡحَصَ﴾، واتە: زۆرباش دەرکەوت و زێدەڕۆیی زیاتری تێدایە .

هەندێکی دیکە گوتوویانە: وشەی ﴿حَصۡحَصَ﴾، لە (حَصَّ)ەوە هاتوە، (حَصَّ)یش، بریتیە لە ڕیشە کێش کردن و بنبڕ کردنی شتێك، دەگوترێ: (حَصَّ شَعْرَهُ، إِذَا اسْتَئْصَلَهُ جَزّاً)، واتە: کاتێك کەسێك قژی خۆی بە تەواویی لە بنەوە ببڕێ، دەگوترێ: (حَصّ شَعرَهُ).

هەندێکیش گوتوویانە: وشەی: ﴿حَصۡحَصَ﴾، (مُشتَقٌ مِنَ الحِصَّةِ، فَالْمَعْنَى: بانَتْ حِصَّةُ الحَقّ مِن حِصَّةِ الباطِل)، (حِصَّةُ) یانی: بەش و پشك، یانی: بەشی هەق لە بەشی ناهەق، جیا بۆوە.

٨) – ئنجا ئافرەتەکە بەڕاشکاویی دەڵێ : ﴿أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ﴾، من بووم ویستم ئەو لە ڕای خۆی لا بدەم بۆ ڕای خۆم، پەلکێشی زینای بکەم .

٩) – ﴿وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾، بە دڵنیاییەوە: ئەو (یوسوف) لە ڕاستگۆیانە، واتە: بێگومان ئەو لە ڕاستانە کە گوتبووی: من هەوڵم لەگەڵ ئەو ژنە

نەداوەو دەورم نەداوە، بۆ دەست تێکەڵیی، بەڵکو ئەو ویستوویەتی من پەلکێش بکاو من ڕام بکات، بۆ ئەو مەبەستە خراپەی خۆی.

**مەسەلەی سێیەم :** یوسوف ﷺ حیکمەت و هۆکاری داواکردنی ئەو لێکۆڵینەوەیە لە پادشا، بەوە دەخاتە ڕوو، کە مەبەستی دڵنیا کردنەوەی عەزیز بووە، کە ناپاکیی بە پەنامەکیی لەگەڵدا نەکردووەو ڕاشیدەگەیێنێ کە پاکانەی خۆی ناکات لە هەڵەو پەڵە، مەگەر خوا بەزەیی پێدا بێ‌و بیپارێزێ :

وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي ۚ إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي ۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٣﴾ ﴾.

**خستنە ڕووی چەمک و مەبەستی ئەم دوو ئایەتە لە حەوت بڕگەدا**

١) – کە (یوسوف) دەڵێ: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، ئا ئەوە، ئەمە ئاماژەیە بۆ دوور، واتە: ئەو داواکردنەی من کە لێکۆڵینەوە بکرێ دەربارەی ئەو ژنانەی دەست‌و پەنجەی خۆیان بڕیوە، لە کاتی میوە سپی کردن‌و میوە قاشکردن دا، ئا ئەوەم بۆچی بوو؟

٢) – ﴿ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ ﴾، بۆ ئەوەی بزانێ ! (کێ بزانێ؟ بە پێی سیاق دیارە: دیارە عەزیزی میسر بزانێ، چونکە یوسوف لە ماڵی ئەواندا بووە)، کە من بە پەنامەکیی خیانەت‌و ناپاکییم بەو نەکردووە .

وشەی: ﴿ بِالْغَيْبِ ﴾یش، لێرەدا سێ حاڵەتی هەن :

١ – دەگونجێ پەیوەست بێتەوە بە بکەر (فاعل)ەوە، یانی: کاتێك کە من لەو نادیار بووم، ناپاکییم پێ نەکردوە .

٢ – دەگونجێ ﴿بِٱلۡغَيۡبِ﴾، پەیوەست بێتەوە بە بەرکار (مَفۡعُول بـِهِ)ەوە، یانی: کاتێك کە ئەو نادیار بووەو لە ماڵ نەبووە، من ناپاکییم پێ نەکردوە .

٣ – یاخود پەیوەست بێتەوە بە شوێن (مکان)ەوە، یانی: لە شوێنێکدا کە ئەوی لێ نەبووە، من ناپاکییم پێ نەکردوەو، بە حەرامیی دەستم لەگەڵ ژنەکەی دا تێکەڵ نەکردوە، هەرچەندە ئەو زۆریش داوای کردوەو، دەورو خولم هەڵاتوەو، هەوڵی پەلکێشکردنی منی داوە !!

ئنجا دوای ئەو لێکۆڵینەوەیە، با بۆی دەربکەوێ، کە من ناپاکییم بەرانبەر نەکردوە .

٣) – ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ﴾، بۆ ئەوەش کە بزانرێ: خوا فێڵی ناپاکان ڕێنمایی ناکاو بە ئامانجی ناگەیەنێ، واتە: تاکو خەڵك ئەو یاسایەی خوای بۆ دەربکەوێ، کە هەر کەسێ بیەوێ: ناپاکیی بکات، بە ئامانج ناگاو فێڵو پیلانەکەی بێ ئاکام دەبێ، ئەوەش یاسایەکی خوایە، واتە: لێرەدا یوسوف دوو حیکمەتان دەخاتە ڕوو، کە داوای کردوە لێکۆڵینەوە لەو ژنانە بکرێ، کە دەستو پەلی خۆیان بڕیوە :

یەکەم : بۆئەوەی عەزیزی میسر دڵنیابێ کە: یوسوف ناپاکیی پێ نەکردوە .

دووەم : بۆ ئەوەی خەڵکیش بزانن: هەر کەسێك خیانەتو ناپاکیی بکا، فێڵو پیلانەکەی بە ئامانج ناگاو بێ ئاکام دەبێو، خوا ناهێڵێ ئەو فێڵو پیلانەی تا سەر بێت، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن : (مەیدانی درۆیە کورتە)، واتە: سەرەنجام بابای درۆکار، درۆیەکەی لێ ئاشکرا دەبێ .

٤) – ﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓ﴾، من نەفسی خۆشم بە پاك ناگرم، ئەمە جۆرێکە لە خۆ بە کەم گرتن لەلایەن یوسوفەوە، واتە: وەك ئیددیعایەك نالێم:

نەفسی من پاکەو چاکەو گوناهان ناکات، مەگەر لە کاتێکدا کە خوا بەزەیی بەو نەفسەی من دابێتەوەو بیپارێزێ، واتە: بە شان و شەوکەتی خۆم نانازم و، بە پشت و قوەتی خۆم نەبووە کە پاك بووم و، تووشی گوناهو تاوان نەبووم، بەڵکو خوا پاراستوومی .

٥) - ﴿إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾، بێگومان نەفس زۆر فەرمانکەرە بە خراپە: (كَثِيرَةُ الأَمْرِ بالسوء)، زۆر دنەدەرو هاندەری خاوەنەکەیەتی بۆ خراپەو تاوان، نەفسێك کە تەزکیە نەکرابێ و ئیمان و تەقوای تێدا نەچەسپا بێ، وەك حاڵەتی ئاسایی و سروشتیی خۆی، زۆر فەرمان دەکات بە خراپەو، زۆر هاندەرو دنەدەری خاوەنەکەیەتی بەرەو خراپە، بەڵام نەفسێك کە پاك بووبێتەوەو، ئیمان و تەقوای تێدا چەسپا بێ و تەزکیە بوو بێ، بێگومان حاڵەتەکەی لە زۆر فەرمان کردن بە خراپەوە، دەگۆڕێ بۆ حاڵەتی ئارامیی، چونکە خوا ﷻ لە قورئاندا، نەفسی بە سێ تەعبیر پێناسە کردوە :

أ- لێرەدا کە دەفەرموێ : ﴿إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾، نەفس زۆر فەرمان دەکات بە خراپە .

ب- لە سوورەتی (القيامة)دا، کە دەفەرموێ: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ٢﴾، واتە: نەخێر، سوێند دەخۆم بە ڕۆژی قیامەت و، سوێند دەخۆم بە نەفسێك کە زۆر سەرزەنشت و سەرکۆنەی خاوەنەکەی دەکات .

ج- لە سوورەتی (الفجر)یشدا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ٢٧﴾، واتە: ئەی نەفسی ئارامگرتوو!

کەواتە: نەفس لە ئەسڵی سروشتی خۆیدا: زۆر فەرمانکەرە بە خراپە، دوایی کە خاوەنەکەی لەگەڵی خەریك بوو، وای لێدەکات، هەر کات فەرمانی کرد بە خراپە، لۆمەی خۆی بکات و سەرزەنشتی خۆی بکات و پەشێمان بێتەوە .

ئنجا لە كۆتایی دا دەگاتە حاڵەتی ئارامگرتنو ئۆخژن بۆ هاتنو سەقامگیر بوون لەسەر جادەی شەریعەت، كە ئەوە حاڵەتی ئارامگرتنەو ئەوەش بەرزترینو چاكترین حاڵەتو قۆناغە، كە نەفسی بەشەر پێی دەگات، لە ئەنجامی ئیمانو تەقوادا.

٦) - ﴿إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓ﴾، واتە: نەفس زۆر فەرمانكەرە بە خراپە، مەگەر لەو كاتەدا كە پەروەردگارم بەزەیی بنوێنێ، یەكێك لە تەفسیرەكان دەڵێ: (إلاَّ وَقْتَ رَحمة رَبِّي عَبدَهُ بأَنْ يُفيضَ عَلَيْهِ من الإيمان والتقوى: ما يَصْرِفه عَنِ السوء)، مەگەر لەو كاتەدا كە پەروەردگارم بەزەیی بە بەندەكەی خۆیدا بێ، كە ئیمانو تەقوایەكی بەسەردا بڕێژێ: لە خراپە دووری بخاتەوە.

٧) - ﴿إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، بێگومان پەروەردگارم لێبوردەی بە بەزەییە، لێبوردەی میهرەبانە، واتە: لێبوردەیە بۆ كەسێك كە گوناه بكات، میهرەبانو بە بەزەییشە بۆ كەسێك كە بیەوێ هەر لە ئەسڵدا تووشی گوناه نەبێ، بەڵكو گوناهانی لێ لابداتو لە گوناهان لای بدات .

ئێمە وامان تەفسیر كرد، كە ئەوە قسەی یوسوف ؑە، كە دەڵێ: ﴿ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِيٓ﴾، بەشێك لە توێژەرەوانیش، كە زۆربەیانن، گوتوویانە: ئەوە قسەی ژنەكەی عەزیزەوە هەر درێژەی قسەكەی ئەوە، كە پێشتر گوتی : ﴿قَالَتِ امْرَأَتُ الْعَزِيزِ الْآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ أَنَا رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ وَإِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ ﴿٥١﴾ ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ﴾، ئنجا ئەگەر قسەی ژنەكە بێ، واتە: من بۆیە ئەو شایەدییە دەدەم بۆ یوسوف، تاكو بزانێ كە كاتێك ئەو لێرە نەبووە، من ناپاكییم بەرانبەر نەكردووەو بەرانبەری خائین نەبوومو، كاتێك هاتۆتە دەمی شایەدیی دان، بە هەق شایەدییم داوە .

دەڵێن: ئەوە هەر لەوێ دەوەشێتەوە بڵێ : ﴿ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ ﴾، من نەفسی خۆم بە پاك ناگرم، نەفس زۆر فەرمان دەكات بە خراپە، چونكە نەفسی ئەو فەرمانی پێ كرد بە خراپەو، ئەو قسەیە لەوێ دەوەشێتەوە، زۆر لە توێژەرەوانی قورئان وایان لێكداوەتەوە، بەڵام وەك پێشتریش باسم كرد: من پێم وایە ئەو قسەیە قسەی یوسوفە ﷵ بە چەند بەڵگەیەك:

بەڵگەی یەكەم : ئەو ژنە بۆی نیە بڵێ: ﴿ ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾، بۆیە ئەو شایەدییە دەدەم، تاكو یوسوف بزانێ كە كاتێ ئەو لێرە نەبووە، خیانەتم پێ نەكردوە، چونكە ئەو ژنە خیانەتی بە یوسوف كرد، لە غیابی وی داو بوختانی پێ كرد، چەند ساڵان یوسوف، بە هۆی بوختان پێكردنی ئەو ژنەوە، لە بەندیخانەدا مایەوە !

بەڵگەی دووەم : لە قورئاندا سیاق زوو زوو دەگۆڕێ‌و، بە سەلیقە دەزانرێ كە ئایا ئەو قسەیە، هی قسەكەرەكەی پێشێیە، یاخود هی قسەكەرێكی دیكەیەو، هەر كەسێك سەرنجی ئایەتەكانی قورئان بدات، ئەوە زۆر بە ئاشكرا دیارە .

بەڵگەی سێیەم : لەو ژنە ناوەشێتەوە بڵێ: ﴿ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، لەبەر چی! لەبەر ئەوەی ئەو خوای نەناسیوەو بتپەرست بووە، كەواتە: لێرەدا باس‌و خواسی خواو باسی سیفەتەكانی خوا وەك: لێبوردەیی‌و میهرەبانیی بەزەیی نواندن، ئەوە بەڕاستیی قسەی بابایەكی خواناسەو، ئەو ئافرەتەو قەومەكەشی بە گشتی، (واتە: خەڵكی میسر) بتپەرست بوون‌و، شتانی دیكەیان بە پەروەردگاری خۆیان زانیوە .

بەڵگەی چوارەم : (القُرطُبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] هەردوو ڕایەکەی هێناون، دوایی گوتوویەتی: (قُلْتُ: إِذَا احْتَمَلَ أَن يَكُونَ مِنْ قَولِ الْمَرْأَةِ، فَالقَولُ بِهِ أَولَى حَتى نُبَرِّئَ يوسُفَ مِن حَلِّ الإِزَارِ وَالسَّرَاوِيل)، واتە: گوتم: ئەگەر گوتمان: دەگونجێ ئەوە قسەی ژنەکە بێ، وا باشترە بە قسەی وێی دابنێین، تاکو یوسوف لەوە دوور بخەینەوە کە وەك لە هەندێ حیکایەتاندا، هاتوە: دۆخینی کردبێتەوەو، شەرواڵی دانابێ !

واتە: بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوە حیکایەتانە، ئەو ڕایە پەسند دەگرێ کە قسەی ژنەکە بێ.

بەڵام ئێمە وەك گوتمان ئەو حیکایەتو بەسەرهاتانە، هەرچەندە لە کۆمەڵێك ڕیوایەتیشدا هاتوون بەڵام هیچیان ئەسڵ و ئەساسیان نیەو، هەموویان لە خاوەن کتێبان وەرگیراونو، هیچیان سیاقی ئایەتەکانو بێژەی ئایەتەکان نایانگەیەنن، وەك پێشتر باسمان کردو دووبارەی ناکەینەوە، کەواتە: ئەگەر ئەوە پاساوی ئەوە بێ، کە ئەو قسەیە بە قسەی ژنەکە دابنرێ، تاکو ئەوەی لەو حیکایەتانەدا هاتوە، لە یوسوفی دوور بخەینەوە، کە گوایە: خەریك بووە لەگەڵ ئەو ئافرەتە دەست تێکەڵ بکات! ئەوە پاساوێکی بێهێزە، چونکە ئەو حیکایەتانە ئەسڵ و ئەساسیان نیە .

بەڵگەی پێنجەم: لەسەر ئەوە کە ئەو قسەیە قسەی یوسوفە ﷺ ئەوەیە کە : یوسوف مەبەستی بووە پاکیی خۆی بۆ عەزیزی میسر دەربخات، نەك ژنەکە، ژنەکە مەبەستی نەبووە پاکیی خۆی بۆ یوسوف دەربخات، چونکە دوای ئەوەی کە شەش حەوت ساڵان یوسوف لەسەر بوختانی ئەو ژنە گیراوە، ئێستا پاکیی چی بۆ دەردەخات! هەڵوێستەکەی زۆر ئاشکرایەو، پێویست بە حیکایەتان ناکات، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن : (پاش باران کەپەنەك)، دوای ئەوەی یوسوف شەش حەوت ساڵان لە زیندان دا بووە، بە هۆی بوختانی ئافرەتەکەوە، ئێستا ئەو ئافرەتە بە

١) الجامع لأحكام القرآن ، ج ٩، ص ١٧١.

دێرو ژوانەوە[1] بڵێ: من ناپاكییم پێ نەكردوە، ئەدی ئەوە نیە ناپاكیی پێ كردا بەڵێ یوسوف پێویستی بەوە بووە عەزیزی میسر بزانێ كە یوسوف پاكە، نەك ئەو ئافرەتە ویستبێتی یوسوف قەناعەت پێ بێنێ، كە خیانەتی پێ نەكردوە، چونكە یوسوف تازە قەناعەتی نایەتو بەهۆی ئەو خیانەتو بوختان پێكردنەی ئەوەوە، شەش حەوت ساڵ لە بەندیخانەدا ماوەتەوە .

ئنجا بێگومان ئەو قسەیەی یوسوف ﷺ هەر بریتیە لە خۆ بە كەمگریی‌و خاكیی بوونی، كە دەڵێ : ﴿ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓ ﴾، چونكە زۆر لە توێژەرەوانی قورئان ئەوەیان لێ بۆتە ئیشكال، كە چۆن یوسوف گوتوویەتی: نەفسی خۆم بە پاك ناگرم! بەڵام هیچ ئیشكال نیەو، مرۆڤی مسوڵمان نابێ خۆی پێ چاك بێ، دواییش كە دەڵێ: ﴿ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓ ﴾، نەفس زۆر فەرمان دەكات بە خراپە، مەگەر پەروەردگارم بەزەیی بنوێنێ، قسەكەی زۆر ڕاستەو، یوسوفیش ئەگەر خوا نەیپاراستبایە، تووشی گوناح دەبوو، هەر كامێك لە ئێمەش ئەگەر خوا نەمانپارێزێ، شەیتان‌و نەفس بەسەرماندا زاڵ دەبن، قسەكەی زۆر واقیعییە، ئەوە هەم بۆ پێغەمبەرانیش وایەو، هەم بۆ غەیری پێغەمبەرانیش، ئنجا بەڕاستییش ئەگەر هاتباو پێغەمبەران بە بێ زەحمەت‌و ئەرك كێشان، تاعەتیان ئەنجامدابایەو، لە گوناح دوور بوونایە، ئەو كاتە پاداشتیان نەدەبوو، وەك چۆن بۆ فریشتەكان ئازایەتیی نیە، كە گوناح ناكەن، چونكە هەر سروشتیان وایە گوناح نەكەن، كەواتە، گوناهـ نەكردنی كەسێك، ئازایەتییە، كە بتوانێ گوناح بكات، بەڵام كە گوناح كردنی لە ئەسڵ لە باراندا نەبێ، لە سروشتیدا نەبێ، ئەو كاتە ئازایەتیی نیە گوناح نەكات، هەروەك تاعەت كردنی كەسێك ئازایەتییە، كە بتوانێ تاعەت نەكات، بەڵام كەسێك كە نەتوانێ تاعەت نەكات، تاعەت كردنەكەی ئازایەتیی نیە، هی فریشتان ئازایەتیی نیە، كە تاعەت بۆ خوا ئەنجام دەدەن، سروشتەكەیان وایە كە دەبێ تاعەت بۆ خوا ئەنجام بدەن .

---

١) بە دێرو ژوانەوە : بە درەنگەوە، بەكاوەخۆ .

**مەسەلەی چوارەم :** دووبارە ناردنەوەی پادشا بە دوای یوسوف دا، تاکو بیکاتە هاوکاری تایبەتیی خۆی لە حوکمڕانیی دا، ئنجا پاش دواندنی : (دوای ئەوەی لە دوای ناردوەو دواندوویەتی و لەگەڵی دانیشتوە) ڕاگەیاندنی ئەوە کە یوسوف لەلای وی بەڕێزو ئەمیندارە :

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ٥٤﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا**

**١) -** ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ﴾، پادشایەکە، گوتی: بۆمی بێنن، واتە: بۆ جاری دووەم دوای ئەوەی پادشا لەسەر داوای یوسوف لێکۆڵینەوەی کرد، لە ڕووداوی دەستو پەنجەی خۆ بڕینی ژنەکان، لە ماڵی عەزیزی میسڕدا، لە کاتی میوە خواردندا، ئنجا چاوکەوتنیان بە یوسوف ﷺو سەرسام بوونیان پێی، کە گوتیان: ئەوە بەشەر نیەو فریشتەیەکی بەڕێزە، دوای ئەوەی پادشا لێکۆڵینەوەی لەوبارەوە کردو، پاکیەتیی یوسوف دەرکەوت، بە شایەدیی ئافرەتەکان هەموویان‌و، بە شایەدیی دانی ژنەکەی عەزیزی میسڕیش، لەسەر خۆی، وەك ئەستۆ پاکیی‌و پەرێز پاکیی بۆ یوسوف، دوای ئەوە دووبارە پادشا گوتی: بۆمی بێنن، یوسوفم بۆ بێنن .

**٢) -** ﴿أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ﴾، واتە: تایبەتی دەکەم بە خۆمەوە، بۆ خۆمی هەڵدەبژێرم، ﴿أَسۡتَخۡلِصۡهُ﴾، (أَي: أَجْعَلَهُ خالِصاً لِنَفسي خاصًّا، فلا يُشارِكُ فيهِ أَحَد)، واتە: تایبەتی دەکەم بە خۆمەوە، کە هیچ کەس بەشی پێوە نەبێ، واتە: تایبەتی دەکەم کە لەلای من بێ، بۆ ئەوەی ڕاوێژی پێ بکەم‌و هاوکارم بێ لە حکومڕانیی دا، وەك سەرۆك وەزیران، ئەگەر پادشا هەبێ، سەرۆك وەزیران هەموو کارەکان هەڵدەسووڕێنێ، وەك جێگری پادشا کاروبارەکان لە جیاتی پادشا هەڵدەسووڕێنێ‌و، دەبێتە هاوکاری.

٣) - ﴿ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ ﴾، دوای ئەوەی دواندی، واتە: دوای ئەوەی یوسوفی بانگ کرد، قسەی لەگەڵدا کردو دواندی، لە عەقڵ و سەلیقەی تێگەیشتن، زانی چەند کارامەو دانایە! چەند پاکە! چەند سیفەت بەرزو ئاکار پەسندە!

﴿ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ ﴾ ئەوە هەمووی دەگرێتەوە، بەڵام خوای شارەزا زۆر بە کورتیی فەرموویەتی، واتە: دوای ئەوەی دواندی، لێی تێگەیشت و پێی ئاشنا بوو .

٤) - ﴿ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴾، (پادشا) گوتی: تۆ ئەمڕۆ لە لای ئێمە خاوەن پێگەی‌و خاوەن پایەی‌و، تۆ ئەمینداریشی، متمانە پێکراوو باوەڕ پێکراوی .

﴿ مَكِينٌ ﴾، (صِفة مُشبَّهة مِنْ مَكُنَ، أَي صَارَذا مَكانَةٍ)، (مَكُنَ)، واتە: ئەو کەسە بوو بە خاوەن پێگە، خاوەن پایە، ئنجا ﴿ مَكِينٌ ﴾، (صِفة مُشَبَّهة بالفعل) لە کرداری (مَكُنَ) .

﴿ أَمِينٞ ﴾، (الأَمِين: فَعِيلٌ بِمَعْنَى مَفْعُول، أَي مأمونٌ عَلَى شيءٍ، أَي: موثَقٌ بِهِ فِي حِفْظِهِ)، (أَمِين) لە سەرکێشی (فَعِيل)ە، بەڵام بە مانای (مَفْعُول)ە، واتە: بە ئەمیندار دانراو، بە پاك دانراو، متمانەپێکراو بۆ پاراستنی شتێك .

هەڵبەتە پادشا کە بە یوسوف دەڵێ: ﴿ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴾، ئەم دوو سیفەتە کۆکەرەوەی هەموو خەسڵەتەکانی حوکمڕانیین، چونکە کەسێك خاوەن پێگەو پایەو دەستڕۆیشتوو بێ‌و، بەڕێزو بە حورمەت بێ‌و، متمانە پێکراو بێ، کە ئەو شتەی پێی دەسپێردرێ، پارێزەریەتی، ئەوە ئەم دوو سیفەتە کۆکەرەوەی هەموو ئەو سیفەتانەن، کە بۆ حوکمڕانیی پێویستن .

**مەسەلەی پێنجەم :** داواکردنی یوسوف عليه السلام لە پادشا کە کاروباری ئابووریی وڵاتی پێ بسپێردرێ، چونکە پارێزەری زانایە :

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ٥٥ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە دوو بڕگەدا**

**١) -** ﴿ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، یوسوف بە پادشای گوت: لەسەر عەمبارەکانی زەوی دامبنێ، بمکە بە بەرپرسی ئەو شتانەی کە ئازووقەیان تێدا عەمبار کراوەو هەڵگیراوە، هەڵبەتە لێرەدا کە دەڵێ : ﴿ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەم وشەیە: ﴿ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەلیفو لام (أل)ی تەعریفە، بەڵام بۆ (عهد)، واتە: سەر زەمینی وڵاتی میسڕ.

**٢) -** ئنجا پاساوو بەڵگە دێنێتەوە، کە بۆچی ببێتە بەرپرسی کاروباری ئابووریی‌و دارایی، دەڵێ: ﴿ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴾، بێگومان من پارێزەری زانام، واتە: پارێزەرم بۆ هەر شتێك کە پێم بسپێردرێ، زاناو شارەزاشم بە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی .

# کورتە باسێک لەبارەی ڕەوایی و ناڕەوایی داواکردنی بەرپرسیارێتییەوە

لێرەدا پێویستە کورتە باسێك بکەین، دەربارەی ڕەوایی و ناڕەوایی داواکردنی بەرپرسیارێتییەوە :

کە یوسوف ﷺ داوا دەکات بکرێتە بەرپرسی کاروباری دارایی وڵاتی میسڕ، بە زاراوەی ئێستا: بیکاتە وەزیری ئابووریی، یان وەزیری دارایی، کە ڕەنگە ئەو کارەی بە یوسوف سپێردراوە، هەر کام لە کاروباری ئابووریی و دارایی پێکەوە کۆبکاتەوە، زانایان ئیشکالێکیان بۆ پەیدا بووە، ئەویش ئەوەیە کە ئایا دەگونجێ ئینسان خۆی داوای بەرپرسیارێتیی بکات ؟

بۆ وێنە (إبن العربي) لە کتێبی (أحكام القرآن)[1]دا، دەڵێ: {كَيْفَ سَأَلَ الإمارَةَ وَطَلَبَ الْوِلايَة، وَقَدْ قَالَ ﷺ لِسَمُرَةَ: (لا تَسأَلِ الإمارَةَ، فَإنَّكَ إنْ سَأَلْتَها وُكِلْتَ إلَيْها ، وَإنْ لَمْ تَسأَلْها أُعِنْتَ عَلَيْها)[2] وَقَدْ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: (لَنْ أَوْ لا نَسْتَعْمِلُ عَلَى عَمَلِنا مَنْ أَرادَهُ) ؟![3]}.

واتە: چۆن یوسوف داوای بەرپرسیارێتیی کردوە، لە حاڵێکدا کە پێغەمبەر ﷺ بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەمورەی فەرمووە: داوای بەرپرسیارێتیی مەکە، چونکە ئەگەر تۆ بەرپرسیارێتیی و سەرپەرشتیارێتییت پێ بسپێردرێ، لەسەر بناغەی ئەوەی خۆت داوات کردوە، حەواڵەی ئیشەکەت دەکرێی، بەڵام

---

١) ج ٣ ، ص ٥٩.

٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٦٢٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٦٥٢).

٣) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٩٢٣).

ئەگەر بۆ ئەوەی خۆت داوای بکەی، بەرپرسیارێتییت پێ بسپێردرێ، لەسەری هاوکاریی دەکرێی .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرگیز ئێمە ئەو کارەی خۆمان بە کەسێك ناسپێرین کە بیەوێو داوای بکات .

لێرەدا (إبن العربي) ئەو پرسیارە دەکات، دوایی دەڵێ: {وَعَنْ ذَلِكَ أَرْبَعَةُ أَجْوِبَة :

الأَوَّلُ : أَنَّهُ لَمْ يَقُلْ: إِنِّي حَسِيبٌ كَرِيمٌ، وَإِنْ كَانَ، كَمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: (الْكَرِيمُ ابنِ الْكَرِيمِ ابنِ الْكَرِيمِ ابنِ الْكَرِيمِ يُوسُفُ بن يَعْقُوبَ بن إِسْحَاقَ بن إِبْرَاهِيمَ)[1]، وَلا قَالَ: إِنِّي مَلِيحٌ جَمِيلٌ، إِنَّمَا قَالَ: إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ، سَأَلَهَا بِالْحِفْظِ وَالْعِلْمِ، لا بِالْحَسَبِ وَالْجَمَالِ .

الثَّانِي : سَأَلَ ذَلِكَ لِيُوَصِّلَ إِلَى الْفُقَرَاءِ حُظُوظَهُمْ لا لَحَظِّ نَفْسِهِ .

الثَّالِثُ : إِنَّمَا قَالَ ذَلِكَ، عِنْدَ مَنْ لا يَعْرِفُهُ، فَأَرَادَ التَّعْرِيفَ بِنَفْسِهِ، وَصَارَ ذَلِكَ مُسْتَثْنَى مِنْ قَوْلِهِ : ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمْ﴾ النجم .

الرَّابِعُ : أَنَّهُ رَأَى ذَلِكَ فَرْضًا مُتَعَيِّنًا عَلَيْهِ، لأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ هُنَالِكَ غَيْرُهُ} .

واتە : بۆ ئەو پرسیارو ئیشکالە، چوار وەڵام هەن :

یەکەم: یوسوف نەیگوت : من خاوەن ڕەچەڵەکێکی بەرزمو پیاوێکی بەڕێزم هەرچەندە واشبووە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێز: یوسوفی کوڕی یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم، وەك لە صەحیحی بوخاریی دا هاتووە، هەروەها نەشیگوت: لەبەرئەوەی قۆزو جوانم، بەڵکو گوتی: من پارێزەری زانام، واتە: ئەو دوو سیفەتەی خۆی، کردنە پاساوی بەرپرسیارێتیی کردن، کە ئەو شتەی پێی بسپێردرێ، دەیپارێزێو لێشی شارەزایە، نەك بە ڕەچەڵەكو بە جوانییو دیمەنی خۆی داوای بەرپرسیارێتیی بکات .

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (١٩٦٨١)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٢١٤٢)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (١٧٣٣)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٣٥٧٩)، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكبرى) برقم : (٨).

دووەم : بۆیە داوای بەرپرسیارێتیی كرد، تاكو بەشی هەژارو نەدارەكان بگەیەنێتە ئەوان، نەك بۆ هێنانەدی ئامانجێكی تایبەتی خۆی .

سێیەم : بۆیە وایگوتوە تاكو خۆی بە كەسێك بناسێنێ‌و بە خەڵكێك بناسێنێ، كە نایناسن، كەواتە: لێرەدا ئەوە هەڵاوێردراوە لە حوكمی ئەو قسەیەی خوای دادگەر كە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ٣٢﴾ النجم، واتە: خۆتان بە چاك دامەنێن، خوا دەزانێ كێ پارێزی لێ دەكات .

چوارەم : یوسوف زانیویەتی كە لەو كاتەدا ئەو كارە لەسەر ئەو بۆتە پێویستییەكی تایبەت‌و بۆتە فەرزی عەین، چونكە كەسی دیكە نەبووە ئەو كارە وەئەستۆ بگرێ .

ئنجا كاتێك ئینسان بزانێ كارێكی پێویست‌و بەرژەوەندییەكی گشتی خەڵك، یەكی لەسەر وی كەوتوە، لەسەری پێویستە شانی بداتە بەر، با بە داواكردنی خۆشی بێ، مادام بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی نەبێ .

(القُرطبي) لەوبارەوە لە (الجامع لأحكام القرآن)دا،[1] هەندێ قسە دێنێ دەڵێ: {قَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: فِي هَذِهِ الآيَة ما يُبِيحُ للرَّجُلِ الفَاضِلِ أَنْ يَعْمَلَ للرّجُلِ الفَاجِرِ، وَالسُّلْطَانِ الكافِرِ، بشَرْطٍ أَنْ يَعْلَمَ أَنَّهُ يُفَوّضُ إِلَيْهِ فِي فِعْلٍ لا يُعَارِضُهُ فِيهِ، فَيُصْلِحُ مِنْهُ ما شاءَ، وَأَمَّا إِذَا كَانَ عَمَلُهُ بحَسَبِ اخْتِيَارِ الفَاجِرِ وَشَهَوَاتِهِ وَفجُورِهِ، فَلاَ يَجُوزُ ذَلِكَ} .

واتە: هەندێك لە زانایان گوتوویانە: لەم ئایەتەدا بەڵگەی ئەوە هەیە كە بۆ پیاوی باش دروستە كار بكات لە لای بەرپرسێكی تاوانبارو دەستەڵاتدارو حوكمڕانێكی كافر، بە مەرجێك بزانێ: لەو كارەدا كە پێی دەسپێرێ، دەستكراوەی دەكات‌و بەرهەڵستیی ناكات، ئەویش دەستی ئاوەڵا دەبێ، بە كەیفی خۆی ئەو شتەی كە بە چاكی دەزانێ بیكات، بەڵام ئەگەر كارەكەی بە پێی هەڵبژاردنی بابای حوكمڕانی خراپەكار بووو بە پێی ئارەزووی وی‌و تاوانەكانی بوو، ئەو كاتە بۆی نیە، هیچ كارێكی بۆ وەئەستۆ بگرێ .

---

١) ج ١٠، ص ١٧٥.

هەروەها (القرطبي) هەر لە سەرچاوەی پێشوو: (الجامع لأحكام القُرآن)[1]دا، دەڵێ: {وَدَلَّتِ الآيَة أَيْضاً عَلَى جَوَاز، أَنْ يَخْطُبَ الإِنْسَان عَمَلاً ، يَكونُ لَهُ أَهْلاً}، واتە: ئەو ئایەتە ئەوەش دەگەیەنێ کە دروستە مرۆڤ کارێك داوا بکات، کە شایستەی بێ، (واتە: مادام لە بارانیدا هەبێو لێی بوەشێتەوە، دروستە بۆ خۆی هەوڵی بۆ بدات) .

(محمد الطاهر بن عاشور)یش لە تەفسیرەکەی خۆی: (التحرير والتنوير)[2]دا دەڵێ : {وَهَذِهِ الآيَة أَصْلٌ لِوُجُوبِ عَرْضِ المَرْءِ نَفْسَهُ لِولاَيَة عَمَلٍ مِنْ أُمورِ الأُمةِ، إِذَا عَلِمَ أَنَّهُ لاَ يَصْلُحُ لَهُ غَيْرُهُ، لأَنَّ ذَلِكَ مِنْ النُّصْحِ للأُمةِ، وَخاصَّة إِذَا لَمْ يَكُنْ مِمّن يُتَّهَمُّ عَلَى إِيثَار مَنْفَعَة نَفْسه عَلَى مَصْلَحَةِ الأُمةِ}.

واتە: ئەم ئایەتە بنچینەیەکە بۆ ئەوە کە پێویستە (نەك هەر دروستە) مرۆڤ خۆی ڕابنوێنێو، خۆی پێشنیار بکات، بۆ وە دەستی خۆگرتنی کارێك لە کارەکانی کۆمەڵگا، مادام بزانێ کە ئەو کارە تەنیا بۆ ئەو باشەو تەنیا ئەو دەتوانێ وەك پێویست ڕایپەڕێنێ، چونکە ئەوە بریتیە لە دڵسۆزیی بۆ کۆمەڵگاو بۆ ئۆممەت، بە تایبەت ئەگەر ئەو کەسە لەو جۆرە نەبوو کە تۆمەتبار بکرێ، بەوەی بەرژەوەندیی‌و سوودی تایبەتی خۆی هەڵدەبژێرێ بەسەر بەرژەوەندیی گشتی خەڵك‌و کۆمەڵگادا .

**مەسەلەی شەشەم‌و کۆتایی : ڕاگەیانرانی ئەوە کە خوا یوسوفی لەسەر زەمینی میسردا دەستڕۆیشتوو کردوە، چونکە چاکەکار بووەو، پاداشتی دوارۆژیشی بۆ بڕوادارانی پارێزکار باشتریشە :**

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ بِرَحْمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَلَأَجْرُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾.

---

١) ج ٩، ص ١٧٥.

٢) ج ١٣، ص ٩.

## توێژینەوەی ئەم ئایەتە لە شەش بڕگەدا

١) - ﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾، واتە: هەر بەو شێوەیە، یانی: وەك ئەو چاكە لەگەڵدا كردنانەی پێشوو، چاكەمان لەگەڵ یوسوف كرد، كە بریتی بوو لە نیزیك خستنەوەی یوسوف لە دڵی پادشا، پێشتریش دەربازكردنی لە بیرو دەربازكردنی لە بەندیخانە، ئاوا بەو شێوەیە: یوسوفمان دەست ڕۆیشتوو كرد لەسەر زەمینی میسڕدا .

٢) - ﴿ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، واتە: یوسوفمان دەستڕۆیشتوو كرد لەسەر زەمیندا، كە مەبەست پێی وڵاتی میسڕە، واتە: كردمانە خاوەن دەسەڵات .

٣) - ﴿ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُ ﴾، لە هەر شوێنێك كە ویستبای، تێیدا نیشتەجێ دەبوو، واتە: دەهاتو دەچووو تەصەڕووفی دەكرد لە وڵاتی میسڕدا .

ئەمەش مەبەست ئەوەیە كە لە وڵاتی میسڕدا بە كەیفی خۆی تەصەڕووفی دەكرد: لە هەر شوێنێكی ویستبای، تێیدا نیشتەجێ دەبووو، كاروبارەكانی سەرجەم وڵاتەكەی بەڕێوەدەبرد .

٤) - ﴿ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُ ﴾، ڕەحمەتو بەزەیی خۆمان دەكەینە پشكو بەشی هەر كەسێك كە بمانەوێ .

بەڵام بێگومان ویستی خوای پەروەردگاریش بە دوای زانیاریی‌و حیكمەتەكەی دەكەوێ‌و، كاری خوا هیچی لە گۆترە نیە، لە خۆوە پشكو بەش نادات بە كەس‌و، لە خۆوەش كەس بێ بەش ناكات .

٥) - ﴿ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، پاداشتی چاكەكارانیش بە فیڕۆ نادەین‌و زایەی ناكەین .

٦) - ﴿ وَلَأَجْرُ ٱلْآخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴾، پاداشتی دواڕۆژیش باشترە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوەو بەردەوام پارێزیان دەکرد، بۆیەش ئیمانی بە کرداری ڕابردوو (فعل الماضي) هێناوە: ﴿ ءَامَنُوا۟ ﴾، چونکە: (فَهُوَ عَقْدُ القَلْبِ الجازِمِ دَفعَةً وَاحِدة)، ئیمان بریتیە لە دڵ چەسپاندنی یەکلاییکەرەوە، بە یەکجار، لەسەر بڕوا پێهێنانی هەموو ئەو شتانەی دەبێ بڕوایان پێ بهێنرێ‌و، بۆیەش باسی تەقوای بە (فعل المُضارِع) کردوە: ﴿ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴾، چونکە تەقوا هەمیشە تازە دەبێتەوە، بەهۆی تازەبوونەوەی هۆکارەکانی فەرمان‌و قەدەغەو، جیاوازیی کاتەکان‌و کردەوەکان‌و شوێنەکانەوە .

لە پەیمانی کۆندا ئاوا باسی ئەوە کراوە، کە چۆن یوسوف لە وڵاتی میسردا کراوە بە دەستڕۆیشتووو خاوەن دەستەڵات، لەلایەن پادشاوە، لە ژێر ئەم ناوونیشانەدا :

(يُوسُفُ يُصبِحُ حاكِمَ المِصر) {یوسوف دەبێتە حوکمڕانی میسر}:

{ثُمَّ قَالَ فِرعَونُ لِيُوسُفَ: ها أنا قد ولّيتُكَ عَلَى كُلِّ أَرْضِ المِصْر. وَنَزَعَ فِرْعَوْنُ خاتِمَهُ مِنْ يَدِهِ وَجَعَلَهُ فِي يَدِ يُوسُفَ، وَأَلْبَسَهُ ثِيابَ كَتَّان، وَوَضَعَ طَوْقَ ذَهَبٍ فِي عُنُقِهِ، وَطَوَّقَ عُنُقَهُ بِقِلادَة مِنْ ذَهَبٍ، ثُمَّ أَرْكَبَهُ مَرْكَبَتَه الثانية، ونادوا: اركعوا أمامَهُ، وَأَقَامَهُ فِرعَونُ عَلَى كُلِّ أَرْضِ مِصْر. وَقَالَ فِرعَونُ لِيُوسف: ((أَنا فِرْعَون، ولا أَحَدَ يمكن أن يُحَرِّك ساكنا فِي كُلِّ أَرْض مِصْر بغير إذنك، وَدَعَى فِرْعَوْن اسْمَ يُوسُفَ: (صَفْنات فَعْنِيحَة) ومعناه بالمصرية مُخَلصُ العالَم وحافِظ حياة))، وَزَوَّجَهُ مِنْ أَسْنَاتَ بنتَ فُوطِي فَارَع كاهِنَ أُونَ، فَدعى اسمَ يُوسُفَ فِي جَمِيع أَرْجاء مِصْر}[1].

واتە: دوایی فیرعەون بە یوسوفی گوت: ئەوە من هەرچی سەر زەوی میسرە خستمە ژێر ڕکێفی تۆ، ئنجا فیرعەون {پێشتر گوتمان: حوکمڕانی ئەو بەشەی

١) التفسير التطبيقي للكتاب المُقَدس العَهدُ القديم، سفرُ التَّكوين الإصحاح : ٤١، ص ١٠٦.

کە یوسوفی لێ بووە، فیرعەون نەبووە، پێی نەگوتراوە: فیرعەونو پێی گوتراوە: مەلیك، بەڵام بە هەر حاڵ لەوێدا وا هاتوە} ئەنگوستیلەکەی خۆی لە پەنجەی دارنیو خستیە پەنجەی یوسوفەوەو بەرگو پۆشاکێکی فاخیرو زۆر نایابی کەتانی کردە بەریو، گەردن بەندێکی زێڕی کردە گەردنی {دیارە عادەتی حوکمڕانو پادشایەکان وابووە}، وە لە دووەمین عارەبانەی خۆیدا سواری کرد، {واتە: لەوەی خۆی دا نا، لەوەی دوای خۆی}و، بانگیان کرد بۆ ئەوەی (خەڵك) لەبەردەم یوسوفدا بچەمێنەوەو، کردیە سەرپەرشتیاری هەموو سەرزەمینی میسڕ، ئنجا فیرعەون بە یوسوفی گوت: من فیرعەونم، هیچ کەسێك لەسەر زەمینی میسڕدا، بە بێ مۆڵەتی تۆ دەست ناداتە هیچ شتێكو هیچ شتێك ناجووڵێنێ، ئنجا فیرعەون ناوی لە یوسوف نا: صەفنات فەعنیحە، ئەمەش مانایەکەی لە میسڕی کۆندا، (واتە: دەربازکەرو ڕزگارکەری دنیاو پارێزەری ژیان)، ئەسناتی کچی فوتی فارەعیشی کردە هاوسەری، کە کاهینی ئوون بووەو، ناوی یوسوف لە هەموو سەر زەمینی میسڕدا بڵاوبۆوە .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی نۆیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان پێنج (٥) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئاڵقەی هەشتەمی زنجیرەی بەسەرهاتی یوسوف لەو پێنج ئایەتەدا خراوەتە ڕوو، كە ئایەتەكانی: (٥٨ تا ٦٢)ن، لەو پێنج ئایەتەدا باسی هاتنی برایەكانی یوسوف ﵇ كراوە، واتە: دە (١٠) برایەكانی كە لە دایكی خۆی نەبوون، هاتنیان بۆ میسر لە كاتێكدا كە حەوت ساڵی گرانیی دەستیان پێكردووەو، پاش ئەوەی كە حەوت ساڵی هەرزانیی پڕ بەرهەمو دەرامەت، تێپەڕیون، هاتوون بۆ میسر بۆ كڕینی ئازووقە، ئنجا كاتێك وەژوور كەوتوون لە یوسوف، لەو شوێنەی كە یوسوف لێی بووە، یەكسەر ئەوانی ناسیوەتەوە، بەڵام ئەوان بەو ئاشنا نەبوونو، نەیانناسیوەو نەیانزانی ئەوە یوسوفە .

ئنجا كاتێك بارەكانی ئازووقەی بۆ ئامادەكردوون، پێی گوتوون: دەبێ برایەك كە لە بابتانەو دایكتان جیایە، بۆم بێنن، ئەگەرنا جارێكی دیكە ڕوو لەم وڵاتە نەكەنەوە بۆ ئازووقە، كە بێگومان ئەو قسەیەی یوسوف، قسەی دیكەی لە پێشدا كراون، وەك دوایی لە درێژەی تەفسیركردنی ئەم ئایەتانەدا باسی دەكەین، ئەوانیش بەڵێنی پێدەدەن: هەوڵ لەگەڵ بابیان بدەن، بۆ ئەوەی ئیقناعی بكەنو، ئەو برایەیان لەگەڵ بنێرێ .

ئنجا یوسوف بە غولامە بەردەستەكانیشی دەڵێ: نرخی ئازووقەكەیان بۆ بخەنەوە نێو بارەكانیان، ئەو دەست مایەی كە ئازووقەیان پێ كڕیوە، بۆیان بخەنەوە نێو بارەكانیان، بەڵكو كە زانییان نرخەكەیان بۆ گێڕدراوەتەوەو،

دەست مایەكەیان خراوەتە نێو بارەكانیان، بگەڕێنەوە بۆ میسر، واتە: زیاتر متمانە پەیدا بكەنەوە، بەو حوكمڕانەی میسر، یاخود لەبەر ئەوەی بە حەرامی دەزانن ئەو ئازووقەیان بەبێ بەرانبەر وەرگرتوە، پێیان وابوو بێ: بە هەڵە خراوەتە نێو بارەكانیان، ئەوە هاندەریان بێتو پاڵنەریان بێ بۆ گەڕانەوە .

﴿وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ٥٨ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ أَلَا تَرَوۡنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ٥٩ فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ ٦٠ قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ٦١ وَقَالَ لِفِتۡيَٰنِهِ ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ فِي رِحَالِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ٦٢﴾.

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{{براکانی یوسوف هاتن بۆ میسر بۆ ئازووقە کڕین، کە لێی وەژوور کەوتن یەکسەر ئەو (یوسوف) ئەوانی ناسیەوە، بەڵام ئەوان ئەویان نەناسی ﴿٥٨﴾ ئنجا کاتێك ئەو ئازووقەو پێداویستییەی بۆی هاتبوون، بۆی ئامادەکردن، گوتی: برایەکتان کە لە بابتانە، {بەڵام دایکتان جیایە} بۆم بێنن، {بزانم ڕاست دەکەن کە دەڵێن: دوازدە برا بووین و یەکێکمان فەوتاوەو، دایکی جیابوو و برایەکی ماوە لە دایکی خۆی}، ئایا نابینن کە من پێوانە بە تەواویی بۆ کڕیاران دەپێوم ﴿٥٩﴾ هەروەها من باشترین خانە خوێم، ئنجا ئەگەر بێتو بۆمی نەهێنن، ئەوە لەلای من {ئازووقەتان چنگ ناکەوێ و} بۆتان ناپێوری و توخنی من (وولات)یش مەکەون ﴿٦٠﴾ گوتیان: بێگومان هەوڵ لەگەڵ بابی دەدەین ئیقناعی بکەین و، لەگەڵمان بینێری و ئێمە هەر دەیهێنین ﴿٦١﴾ یوسوف بە گەنجە خزمەتکارەکانی خۆی گوت: دەستمایەکەیان بۆ بخەنەوە نێو بارەکانیانەوە، بەڵکو کە گەڕانەوە لای کەسوکاریان، پێی بزانن، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ میسر {بۆ کڕینی ئازووقەی دیکە} ﴿٦٢﴾}} .

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(فَعَرَفَهُمْ)، واتە : ئەو یەکسەر ئەوانی ناسییەوە، (المَعْرِفةُ وَالعِرْفَانُ: إدْرَاكُ الشيءِ بِتَفَكُّرٍ وتَدَبُّرٍ لإثرِهِ، وَهو أخَصُّ مِنَ العِلْمِ، ويُضادُّهُ الإِنْكارُ، وَأصْلُهُ مِنْ عَرَفتُ أي: أصَبْتُ عَرْفَهُ أي: رِيحَهُ أو أصَبْتُ عُرْفَهُ، أي: خَدَّهُ)، دەڵێ: (مَعْرِفة) و (عِرفان)، بریتییە لە پەیبردن بە شتێكو زانینی شتێك لە ئەنجامی بیرلێکردنەوەو تێڕامانی شوێنەوارەکەی دا، (مَعرِفة)ە، لە (علم)، تایبەتترەو پێچەوانەی (مَعرِفة)، بریتییە لە نکوولّیی لێکردنو نەناسین، وشەی (مَعرِفة)ش، ئەسڵەکەی بریتییە لە (عَرَفتُ)، واتە: (أصَبتُ عرْفَهُ)، بۆنیم کرد، یاخود (أصَبتُ عُرفَهُ)، واتە: لە کولّمەیم دا، واتە: ناسیم، لەوەوە هاتوە.

(وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ) : بەڵام ئەوان بۆ ئەو نەزان بوون، نەناسەر بوون، (الإِنْكارُ: ضِدّ العِرْفَانِ وَيُقَالُ أنْكَرتُ كَذَا وَنَكَرتُ، وَأصلُهُ أن يَرِدَ على القَلبِ ما لا يَتَصوَّرُ)، ئینکار پێچەوانەی عیرفانە، عیرفان، واتە: ناسین، ئینکار، واتە: نەناسین، دەگوترێ: (أنْكَرتُ كَذا وَنَكَرت)، هەردووکیان بە یەك واتان، یانی: ئەو شتەم نەناسی، ئەسڵەکەشی ئەوەیە کە شتێك بێتە سەر عەقڵو دڵ، کە نەتوانێ وێنای بکاو پێی ئاشنا نەبێ .

(جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ) : (الجَهازُ: ما يُعَدُّ مِنْ مَتَاعٍ وَغَيرِهِ، وَالتَّجْهِيزُ: حَمْلُ ذَلِكَ أو بَعْثُهُ، الجِهازُ والجَهاز بِفَتحِ الجِيمِ أو بكَسْرِها: ما يَحْتَاجُ إلَيْهِ المُسافِرُ، وَأوَّلُهُ ما سافَرَ لِأجْلِهِ مِنَ أحمالٍ، وَالتَّجهِيز: إعْطاءُ الجِهاز)، وشەی (جِهاز)، یان (جَهاز)، بریتییە لە هەر کەلوپەلێك کە ئامادە دەکرێ، (تَجهیز)یش، بریتییە لە هەڵگرتنی ئەو شتە، یاخود ناردنی ئەو شتە، (جِهاز)، هەروەها (جَهاز)، (واتە: بە فەتحەی جیم، یان بە کەسرەی جیمەکەی) بریتییە لە هەر شتێك

کە بابای ڕێبوار پێویستیی پێیەتی، لە پێش هەموو شتێکدا، ئەو شتەی کە سەفەری بۆ کردوە، لە بارەکان، (تَجهِیز)یش، بریتیە لە پێدانی ئەو شتەی کە بابای ڕێبوار بۆی هاتوە، (تَجهِیز)ی کرد، واتە: پێداویستییەکەی بۆ ئامادە کرد .

(أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ) : واتە: من پێوان بە تەواویی دەکەم، (أُوفِي)، (أَي أُتِمُّهُ)، تەواوی دەکەم، (الكَيْل)، واتە: پێوان، (الكَيْلُ وَالمِكيالُ اسْمٌ، والكَيلُ: المَصدَرُ)، (كَيْلُ)و (مِكيال)، ناون، بۆ ئەوەی کە شتی پێ دەپێورێ، هەروەها (كَيل)، بە مانای چاوگیش دێ، واتە: پێوان .

(سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ) : واتە: هەوڵ لەگەڵ بابی دەدەین، (أَرَادَ الرَّجُلُ كَذَا إِرادَةً، وَهُوَ الطَّلَبُ والإِخْتِيارُ، وَإِسْمُ المَفعولِ: مُراد، وَرَاوَدتُهُ عَلَى الأَمْرِ مُرَاوَدَةً، وَرِوَاداً: طَلَبْتُ مِنْهُ فِعلَهُ، وَكَأَنَّ فِي المُرَاوَدَةِ مَعنَى المُخادَعَةِ، لأَنَّ الطالِبَ يَتَلَطَّفُ فِي طَلَبِهِ، تَلَطُّفَ المُخادِعِ وَيَحرِصُ حِرْصَهُ)، دەگوترێ: ئەو پیاوە ئەو شتەی ویست بە ویستن، کە بریتیە: لە داواکردنی شتێك و هەڵبژاردنی ئەو شتە، (إِسْمِ المَفْعولِ)ی (أَرادَ)ش، بریتیە لە (مُراد)، واتە: ویستراو، (وَرَاوَدتُهُ عَلَى الأَمْرِ مُرَاوَدَةً، وَرِوَاداً)، واتە: ئەو شتەم لێ ویست، لە (مُراوَدَة)دا، مانای هەڵخەڵەتاندن و فێڵ لێکردن هەیە، چونکە بابای داواکەر زۆر بە پەنهانکاریی و بە لێزانیی، داواکەی خۆی دەکات، وەك چۆن کەسێك بیەوێ کەسێك هەڵخەڵەتێنێ و فێڵی لێ بکات، ئنجا سووریشە لەسەر ئەوەی کە داواکەی خۆی بێنێتەدی .

(لِفِتۡيَٰنِهِ) : (فِتْيان)، کۆی (فَتَى)یە، دەڵێ: (الفَتَى)، لای کەمی کۆیەکەی بە (فِتْيَة)یە، ئەگەر بە زۆر کۆ بکرێتەوە، واتە: کۆمەڵە گەنجێکی زۆر، دەگوترێ: (فِتْيان)، (الفَتَى: الشابُ الحَدَث، وَاسْتُعِيرَ لِلعَبْدِ)، (فَتَى)، بە گەنجێك کە تازە پێدەگات و هەرەتی لاویەتی و، تازە دێتە نێو قۆناغی گەنجیەتییەوە، پێی دەگوترێ: (فَتَى)، خوازراویشەتەوە بۆ خزمەتکار و کۆیلە و، کەسێك کە لەبەر دەستە و ئیشێکی پێ دەکەی، کەواتە: ﴿لِفِتۡيَٰنِهِ﴾،

واتە: بە خزمەتكارەكانی، یاخود ئەو گەنجانەی كە لەبەر دەستی بوونو كاروبارەكانیان بۆ ڕادەپەڕاند، كە دیارە مەبەستی كاروباری پێوانی دەغڵو دانو ئازووقە بووە .

(بِضَٰعَتَهُمْ) : (البِضَاعَةُ: المالُ أَوِ المَتَاعُ المُعَدُّ للتِّجارَة)، (بِضَاعَة)، بریتیە لە ماڵێك، یاخود كەلوپەلێك كە ئامادە كراوە بۆ بازرگانیی، (والمُرَادُ: هُنا الدَّرَاهِم)، واتە: ئەو درەمە زیوانەی كە نرخی پێ كڕینی ئازووقەكە بوون، ئەومیان بۆ بخەنە نێو بارەكانیان .

(فِي رِحَالِهِمْ): (الرِّحَالُ: جَمْعُ رَحْل، وَهُوَ ما يُوضَعُ عَلَى ما البَعِير مِن مَتَاعِ الرَّاكِبِ، إذَ سُمِّي البَعيرُ رَاحِلة)، (رِحَال)، كۆی (رَحْل)ە، (رَحْل) ئەو بارەیە كە دەخرێتە سەر پشتی وشتر لە كەلوپەلی بابای سوار، كە سواری دەبێ، هەر بۆیەش وشترێك كە بە كەڵكی سواریی دێ، پێی گوتراوە: (رَاحِلة)، واتە: وشترێك كە بە كەڵكی بارو سواریی بێ، چونكە هەموو وشترێك بە كەڵكی ئەوە نایەت باری بخرێتە سەر پشتیو خەڵك سواری پشتی بێ .

(ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ): واتە: گەڕانەوە بۆ لای خاووخێزانیان، (الإنْقِلابُ: تَحَوّلُ شيء عَنْ وَجهِهِ)، (إنقلاب) بریتیە لەوە كە شتێك ڕووی لە كوێیە، پشت لەو شوێنە بكات، واتە: وەرسووڕانەوە، یانی: گەڕانەوە بۆ لای ماڵو خێزانیان، (إِنْقَلَبَ إِلَيْهِ)، یانی: (رَجَعَ)، بەڵام (إِنْقَلَبَ عَلَيْهِ)، یانی: (إِنْعَكَس) لێی هەڵگەڕایەوە .

# مانای گشتی ئایەتەکان

هەڵبەتە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾، لێرەدا شتی زۆر قرتێنراوەو باس نەکراوە، کە بە عەقڵو سەلیقەو سیاق دەزانرێن، واتە: حەوت ساڵەکەی هەرزانیی‌و فەڕحانیی هاتن، ئازووخەیەکی زۆر پەزمەندەکرا لە وڵاتی میسڕ، بە پێی ئەو نەخشەیەی کە یوسوف دایناب‌وو، بۆ وڵاتی میسڕو بۆ پادشای میسڕ، ئازووقەی زۆر لە عەمبارانـدا داکرا، دەغڵو دانو ئازووقە پاشەکەوت کرا، پاشان حەوت ساڵی گرانیی‌و قاتو قڕیی دەستیان پێکردو، خەڵك کەوتنە سەغڵەتی.

ئنجا بۆ کڕینی ئازووخەو بژیو، کوڕەکانی یەعقووب کە بیستیان لە میسڕ حوکمڕانێکی بەو شێوەیە هەیەو، ئازووخە دەفرۆشێ بە نرخێکی گونجاوو، ئازووخەی هەڵگرتووەو پێشتر پاشەکەوتی کردووەو پێشبینیی کردوە بۆ ئەو ساڵە گرانییانەی دێن، ئەوانیش ڕوویان کردە میسڕو، چوون بۆ ئەوەی ئازووخە بێنن.

ئەوە هەمووی بە عەقڵو سەلیقە دەزانرێ، بۆیە خوا ﷻ باسی نەکردووەو یەکسەر فەرموویەتی: ﴿ وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيْهِ ﴾، برایەکانی یوسوف هاتن لێی وەژوور کەوتن، (لێی وەژوور کەوتن) مانای وا نیە لە ژوورێکی تایبەتدا بووە، یانی: هاتنە ژووری کۆشکەکەیەوە، هاتنە ژووری ئەو شوێنەی کە یوسوف لێی دادەنیشتو، لەوێوە سەرپەرشتی فرۆشتنی ئازووخەی دەکرد، ﴿ فَعَرَفَهُمْ ﴾، یەکسەر یوسوف ئەوانی ناسییەوە، ئەو (فـ)یە، بۆ بەدوا داهاتن (تعقیب)ە، یانی: کە ئەوانی بینی، یەکسەر ناسینیەوە، چونکە ئەو کاتە کە یوسوفیان خستۆتە بیرێ، یوسوف بچووك بووە، مێر منداڵ بووە، دە (١٠)، دوازدە (١٢) ساڵە بووە، بەڵام ئەوان هەموویان پیاو بوون، ئنجا کە ئینسان کە دەکەوێتە قۆناغی پیاوەتیی، دوایی

کەمتر دەگۆڕێ، بەڵام لە قۆناغی منداڵیی دا، دوایی کە دەبێتە پیاو، زۆر دەگۆڕێ، پاشان یوسوف زانیویەتی برایەکانی هەر ماون، بەڵام ئەوان نەیانزانیوە، ئایا یوسوف ماوە، فەوتاوە چی لێهاتوە؟ بە هەر حاڵ یوسوف یەکسەر ئەوانی ناسی، ﴿ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾، بەڵام ئەوان بۆ یوسوف نەناس بوون، واتە: نەیاندەناسی، کە وەك دوایی باسی دەکەین، ﴿ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾، یانی: سیفەتی نەناسینی ئەوان بۆ یوسوفو نەناسینەوەی ئەوان بۆ یوسوف، زۆر ڕۆچوو بووە تێیاندا .

﴿ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ ﴾، ئنجا دوای ئەوەی ئەوەی کە بۆی هاتبوون، (ئەو پێداویستییە کە بریتی بوو لە ئازووخە) بۆی ئامادە کردن، ﴿ قَالَ ٱئْتُونِى بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ﴾، پێی گوتن: برایەکتان کە لە باوکتانە، بۆم بێنن، واتە: لە باوکتانە، بەڵام لە دایکتان نیە، دایکتان جیایە، ئەو برایەتانم بۆ بێنن، ﴿ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّىٓ أُوفِى ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴾، ئایا نابینن من چۆن پێوانە بە تەواویی دەکەم، بە تەواویی ئازووخە بۆ خەڵك دەپێوم، ﴿ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴾، هەروەها من باشترین خانە خوێم، باشترین کەسانێکم کە میوانان لەلای خۆم دادەبەزێنم، (مُنزِل)، یانی: (مُضیف)، کەسێك کە خەڵك دەکاتە میوانی خۆی .

هیچ گومانی تێدا نیە کە یوسوف ﷺ لێرەدا هەر یەکسەر بەبێ پێشەکیی نەیگوتوە: ئەو برایەتان کە دایکتان جیایەو، لە باوکتانە بۆم بێنن، ئەگەرنا دەکەوتنە گومان، ئەدی ئایا چۆن یوسوف ئەوەی گوتوە؟ وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، بێگومان ئەوە چەند پێشەکییەکی هەبوون :

ڕەنگە لێی پرسی بن :

١/ ئێوە کێن ؟

ئەوانیش گوتوویانە: ئێمە هەمووومان دە (١٠) کەسینو هەمووومان براین .

٢/ باشە کوڕی کێن ؟

گوتوویانە : ئێمە کوڕانی یەعقووبین .

٣/ باشە ئایا یەعقووب هەر ئەو دە کوڕەی هەن ؟

گوتوویانە: نەخێر دوو برای دیکەشمان هەبوون .

٤/ ئەوان لە کوێن ؟

یەکێکیان لە ئێمە بچووکترە، هەر لە لای بابیەتی

٥/ ئەدی ئەوی دیکە؟

گوتوویانە : ئەوی دیکەمان کاتی خۆی ون بوو .

٦/ ئنجا کێ دەڵێ: ڕاست دەکەن ؟

ئێمە ڕاست دەکەین .

٧/ باشە ئەو برایەتانم کە دەڵێن: برایەکی دیکەی هەیە لە دایکی خۆیەتی، ون بووە، ئەو برایەتانم بۆ بێنن، بۆ ئەوەی لێی بپرسم داخۆ ڕاست دەکەن، یان نا ؟

حەتمەن ئەو گفتوگۆو وتوێژەیان بووە، بەڵام خوای کارزان بە پێویستی نەزانیوە ئەو هەموو تەفاصیلو وردەکارییە باس بکات، وەك چەندان جار باسمان کردوە، یەکسەر هاتۆتە سەر شوێنی مەبەست، کە دەڵێ: برایەکتانم بۆ بێنن کە لە بابتانە، واتە: دایکتان جیایە، یانی: بە زمانی عەرەبی: (شَقِیق)، نیە (شَقِیق)، ئەوەیە کە بابو دایکیان یەکبن، بەڵام (غَیرَ شَقِیق)، ئەوەیە کە بابیان یەك بێ، دایکیان جیابێ، یاخود دایکیان یەك بێو، بابیان جیابێ، بەڵام لێرەدا واتە: ئەو برایەتان کە لە بابتانە، بەڵام دایکتان جیایە، بۆم بێنن، دیارە خۆیان پێشتر باسیان کردوە، کە ئێمە دوازدە برا بووینو، یەکێکمان بەو شێوەی لێهاتووەو، ئێستا لەو دایکەی کە ئەو برایەمان ون بووە، برایەکی دیکەمان هەیە، ناوی بنیامینە حاڵو حیسابی ئاوایە، ئەویش گوتوویەتی: بۆم بێنن .

ئنجا پێیان دەڵێ : ﴿ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِى وَلَا تَقْرَبُونِ ﴾، ئەگەر بۆم نەهێنن، لەلای من نە ئازووخەتان بۆ دەپێورێ، (واتە: ئازووخەتان پێ

نافرۆشین و بۆشتان ناپێوین)، ﴿ وَلَا تَقْرَبُونِ ﴾، هەروەها نیزیکیشم مەکەونەوە، واتە: مەیەنە وڵاتی منیشەوە، چونکە مانای وایە ئێوە ڕاست ناکەن، کە دەڵێن ئێمە وا بووین .

﴿ قَالُوا۟ سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴾، گوتیان: ئێمە هەوڵ لەگەڵ بابی دەدەین، ﴿ سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ ﴾، یانی: بە شێوەیەکی پەنهان هەوڵ دەدەین، کە وەك جۆرێك لە هەڵخەڵەتاندن، ئیقناعی بکەین و پەلکێشی بکەین، بۆ ئەو مەبەستەی کە ئێمە دەمانەوێ، ﴿ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴾، بێگومان ئێمە ئەنجامدەری ئەوە دەبین، واتە: پێشێ دەڵێن: هەوڵ لەگەڵ بابی دەدەین، دوایی دەڵێن: ئێمە بە تەئکید ئەو برایەمان هەر دێنین و هەر چۆن بێ بابمان ئیقناع دەکەین .

﴿ وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ ﴾، ئنجا یوسوف بە گەنجەکانی خۆی گوت، واتە: ئەو گەنجانەی کە لەبەردەستی بوون، ئەو خزمەتکارانە کە لەبەردەستی بوون: ﴿ ٱجْعَلُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ فِى رِحَالِهِمْ ﴾، دەستمایەکەیان (کەلوپەلەکەیان) کە هاتوون ئازووخەیان پێ کڕیوە، کە مەرج نیە تەنیا دراوو پارە بوو بێ، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿ بِضَٰعَتَهُمْ ﴾، چونکە ئەو کاتە مەرج نەبووە، شت تەنیا بە پارە بکڕدرێ، جاری وا بووە کەلوپەلێکیان هێناوەو، ئازووخەیان پێ کڕیوە، بۆ نموونە : پێستە، یان قوماشێکیان هێناوە، یاخود شتێکی دیکەیان هێناوە، شتیان پێ کڕیوە، بۆیە (بِضَاعَة)، واتە: دەست مایە، سەرمایە ئەو نرخەی کە هێناویانە ئازووخەکەی پێ بکڕن، بۆیان بخەنەوە نێو بارەکانی خۆیان، ﴿ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ ﴾، بەڵکو بیناسن، یانی: کە بارەکانیان دەکەنەوە، دەزانن ئەوە نرخەکەی خۆیانە بۆیان خراوەتەوە نێو بارەکانیان، ﴿ إِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ ﴾، کاتێك دەگەڕێنەوە بۆ لای ماڵ و خێزان و کەسوکاریان، ﴿ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾، ئەوە نیزیکە کە بگەڕێنەوە، واتە: وە تەماع بکەون کە ئەو حوکمڕانە چەندە لەگەڵیان بە لوتف بووە:

پارەکەشی وێداونەوە، یاخود لەبەر ئەوەی ئەوانە حەلاڵ خۆر بوون، گوتوویانە: ئەو نرخە بە هەڵە خراوەتە نێو بارەکانمان، ئێمەش حەڕام ناخۆین، با بۆیان بەرینەوە، هەر نەبێ لەبەر ئەوە دێنەوە، یاخود لەبەر ئەوەی هەرچۆن بێ، وای تەفسیر دەکەن کە بە باری چاکە دایە، ئنجا ئەوە دەبێتە هاندەرو پاڵنەریان بۆ ئەوەی هاتنەوەیان مسۆگەر بێ‌و، ئەو برایەیان بێنن، کە یوسوف دیارە پێویستیی بەو کارەیە، وەك دوایی لە دەرسەکانی داهاتوودا بۆمان دەردەکەوێ .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** هاتنی برایەکانی یوسوف بۆ کڕینی ئازووخە لە میسڕو، چوونیان بۆ لای یوسوفو، ناسینەوەی یوسوف بۆیانو، نەناسینەوەی ئەوان بۆ یوسوف :

خـــوا دەفەرمـــــوێ: ﴿ وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە چوار بڕگەدا**

١) – ﴿ وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ ﴾، ئنجا برایەکانی یوسوف هاتن .

وەك پێشتر باسمان کرد: یانی: حەوت ساڵی هەرزانیی تێپەڕینو، لە میسڕ ئازووخەیەکی زۆر پاشەکەوت کرا، دەغڵو دانێکی زۆر کراو، دوای ئەوەی ڕەنێو هێنرا، لە گوڵەکەی خۆیدا لە عەمباراندا هەڵگیراو پاشەکەوت کرا، ئنجا ساڵانی گرانیی هاتن، حەوت ساڵە گرانییەکان دەستیان پێکرد، لە هەموو ئەو دەڤەرو دەوروبەرە، بوو بە قاتو قڕیو گرانیی، ئنجا بیستیان کە لە میسڕ حوکمڕانێك هەیە ئازووخە دەفرۆشێ، بە نرخێکی گونجاو، ئەوانیش هەموویان بە دە (١٠) وڵاخەوە، هەر دە (١٠) برایەکە چوون بۆ میسڕو، لە یوسوف وە ژوور کەوتنو چوونە ژووری کۆشکەکەی .

کەواتە: ﴿ وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ ﴾، یانی: لەو شوێنەی کە لێی بوون، برایەکانی یوسوف لەوێوە لە بیابانەوە هاتن، ئەو برایانە کێ بوون؟ بە تەئکید دە (١٠) برایەکە بوون، چونکە دوایی بۆمان دەردەکەوێ: هەر دە

(١٠) برایەکە کە کاتی خۆی یوسوفیان خستۆتە نێو بیر، هەر دە (١٠)یان بوون کە بۆ ئازووخە هاتوون .

٢) - ﴿ فَدَخَلُواْ عَلَيْهِ ﴾، واتە: یەکسەر هاتنە ئەو شوێنەی کە یوسوف لێی بوو، لێی وە ژوور کەوتن، چۆن دەزانین یانی: (دَخَلُوا عَلى یوسُف)؟ چونکە پێشی دەفەرموێ : ﴿ وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيْهِ ﴾، یانی: (فَدَخَلُوا عَلى یوسُف)، برایەکانی یوسوف هاتن‌و لێی وە ژوور کەوتن، واتە: چوونە ئەو شوێنەی کە یوسوف لێی دادەنیشت، لەوێدا حوکمڕانیی دەکردو سەرپەرشتیی پێوان‌و فرۆشتنی ئازووخەی دەکرد .

٣) - ﴿ فَعَرَفَهُمْ ﴾، یەکسەر ناسینی، ئەو فاء (ف)ە، بۆ بەدواداهاتن (تعقیب)ە، (أَي : حَصَلَت مَعرِفَتُهُ إیّاهُم، بحدَثان رؤیتهِ إیاهُم دونَ توسُّم وتأمّل)، لە زمانی عەرەبی دا (ف):

١) جاری وایە بۆ (عطف)ە .

٢) جاری وایە بۆ (جزاء)ە .

٣) جاری وایە بۆ بە دوای یەکدا هاتن (تعقیب)ە .

یانی: کە بینینی، یەکسەر ناسینیەوە، بێ ئەوەی کە تێیانەوە ڕا بمێنێ‌و سەرنجیان بدا، پێشتر باسمان کرد کە یوسوف ئەو کاتە بچووك بووە، ئەوانە هەموو پیاو بوون، بۆیە بە ئاسانیی توانیویەتی بیانناسێتەوە .

٤) - ﴿ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾، بەڵام ئەوان بۆ ئەو نەناس بوون، نەناسەر بوون، واتە: سیفەتی نەناسینەوەی ئەوان بۆ یوسوف سیفەتێکی ڕۆچوو بوو، چونکە دەڵێ : (جاءَ بالجُملة الإسمية لِلدّلالة على أنَّ عَدَمَ مَعرِفَتِهِم بِهِ، أمرٌ ثابِتٌ مُتَمَكِّنٌ فِيهِم، وَتَقديمُ المَجرورِ ﴿ وَهُمْ لَهُۥ ﴾، للتنبيهِ على أن ذَلِكَ مِن صُنعِ اللهِ تعالى، وَإلاّ فَشَمائِلُ يوسُفَ ليسَ مِما شأنُهُ أن يُجهَلَ وَيُنسى)[1]، واتە:

١) التحرير والتنوير، ج ١٣.

بۆیە بە ڕستەی ناویی هێناویەتی: ﴿ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾، تاکو ئەوە بگەیەنێ کە نەناسینەوەی ئەوان بۆ یوسوف، سیفەتێکی ڕۆچوو بووە لەواندا، بۆیەش (مجرور)ەکە پێش خراوە، ﴿ وَهُمْ لَهُۥ ﴾، بۆ ئاگادار کردنەوەی لەوە، کە ئەوە هەر ساز کردنێکی خوای بەرز بوو، ئەگەرنا سیفەتەکانی یوسوفو حاڵو وەزعی یوسوف، ئەوە نەبوو کە نەزانرێو لە بیر بکرێ .

دەبوو بیناسنەوە، بەڵام وەك لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: لە کوولەکەی تەڕیشدا فکری ئەوەیان نەکردوە، کە ئەو حوکمڕانەی میسر ئەو کەسەی کە لەوێ بۆتە فەرمانڕەوای میسر، ئەو برایەیان بێ، کە کاتی خۆی بێ ڕەحمییان لەگەڵدا کردوەو، خستوویانەتە بیرەوە !

وەك گوتم: دوایی دەزانرێ: ئەو برایانەی کە هاتوون دە (١٠) بوونو بنیامینیان لەگەڵدا نەبووە، لەبەرئەوەی لەوان بچووکتر بووە، یاخود لەوانەیە بابیان بەهۆی ئەوەوە کە یوسوفیشی لێ ون بووە، دڵی بەو برایەیان خۆش بوو بێ، کە هەر ئەو لە دایکی خۆی ماوە، ئیدی ئەوە هەمووی دوایی دەردەکەوێ، بەڵام بە پێی سیاق دەزانرێ، کە ئەوانە دە (١٠) برا بوون، چونکە دوایی کە یوسوف دەڵێ: برایەکی دیکەی خۆتانم بۆ بێنن، برایەکان کە دەچنەوە دەڵێن: بابە ئەو برایەشمان لەگەڵ بنێرە، چونکە ئەو بارانەی ئێمە، کەمن .

**مەسەلەی دووەم : دابین کردنی ئازووخەو پێداویستیی سەفەر بۆ برایەکانی، لەلایەن یوسوفەوە، ئنجا داواشی لێکردن: برایەکیان کە لە بابیانەو لە دایکیان نیە، لەگەڵ خۆیان بیهێنن، ئەگەر نا ئازووخەیان پێنادا و ڕێگاش نادات بێنە وڵاتی میسر:**

خوا عزوجل فەرموویەتی: ﴿ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ قَالَ ٱئْتُونِى بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ۚ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّىٓ أُوفِى ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٥٩﴾ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِى بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِى وَلَا تَقْرَبُونِ ﴿٦٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە شەش بڕگەدا

١) - ﴿ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ ﴾، ئنجا کاتێك کە پێداویستیی سەفەری بۆ ئامادە کردن، واتە: ئەو دەغڵو دانو ئازووخەیەی کە بۆی هاتبوون، هەر کەسە باری خۆی بۆ ئامادە کردن، (جَهاز)، یان (جِهاز)، هەردووکیان هاتوون، (ما يَحْتاجُ إليهِ المُسافِرُ، وَما سافَرَ لأَجْلِهِ مِنَ الأَحْمالِ، وَالتجهيز: إعْطاءُ الجِهاز) .

(جَهاز) و (جِهاز)، هەر شتێکە کە بابای ڕێبوار سەفەری لە پێناودا دەکات، بە تایبەت ئەوەی کە بۆی چووە بۆ سەفەری، ئەو بارە کە لەگەڵ خۆی بیهێنێتەوە .

(تَجهِيز)یش بریتیە لە پێدانی بارو پێداویستیی سەفەر، بەو کەسەی کە بۆ ئەو مەبەستە هاتوە، کاتێك کە بارەکانی بۆ ئامادە کردن، واتە: ئازووخەی تەواوی بۆ پێوانو، ئەوەی کە بۆی هاتبوون، کە بریتی بوو لە کڕینی ئازووخە، بۆی ئامادە کردن .

٢) - ﴿ قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ ﴾، گوتی: برایەکتانم بۆ بێنن کە لە بابتان بێ، واتە: لە دایکتان نەبێ، وەك پێشتریش باسمان کرد: هیچ گومانی تێدا نیە کە پێشتر قسەو باسی دیکە کراون، هەڵبەتە ئێمە دوایی باس دەکەین کە لە پەیمانی کۆندا، لە تەوراتدا باس دەکات، کە بۆچی یوسوف ﷺ گوتوویەتی: برایەکی بابییتانم بۆ بێنن، یانی: لە دایکتان نەبێ؟ بەڵام ئەگەر ئەوەی تەوراتیش ڕاست نەبێ، گرنگ ئەوەیە هەندێك قسەو باس کراون .

بەم شێوەیە :

١) ئێوە کێن ؟

ئەوانیش گوتوویانە: ئێمە دە (١٠) براین .

٢) ئایا هەمووتان برای یەکدین ؟

بەڵێ .

٣) کوڕی کێن ؟

کوڕی یەعقووبین، یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم، ئێمە باب و باپیرانمان پێغەمبەرن .

٤) ئایا ئێوە هەر ئەو دە (١٠) برایەن ؟

نەخێر، ئێمە یازدە (١١) براین .

٥) برایەکەی دیکەتان لە کوێیە ؟

لەماڵەوەیە .

٦) هەر تەنیا ئەو یازدەیەن ؟

نەخێر ئێمە دوازدە برا بووین، بەڵام یەکێک لە برایەکانمان فەوتا ! لە بیابان فەوتا !

٧) ئەدی ئەو برایەی دیکەتان کە دەڵێن : دایکیان یەک بوو ، ماوە ؟

بەڵێ .

٨) ناوی چییە ؟

بنیامین .

٩) لە ماڵێیە ؟

بەڵێ .

١٠) ئەگەر ڕاست دەکەن ئەمجارە کە هاتنەوە بۆم بێنن ، بۆ ئەوەی بزانم کە ئێوە ڕاستگۆن و ڕاست دەکەن هەمووتان بران .

دەبێ ئەو قسەو باسانە کرابن، بە پێی سیاق دیارە، بەڵام لە (التفسير التَطبيقِي للكِتابِ الـمُقَدَّس، العَهـدُ القَـديم سفرُ التكوين)، لە لاپەڕە (١٠٨ و ١٠٩)دا، هاتوە: کە یوسوف تۆمەتباری کردوون : ئێوە بۆ سیخوڕیی هاتوون، هاتوون جاسووسیی بکەن، ئنجا لەوێدا دەڵێ : سێ ڕۆژان هەر دە (١٠) برایەکەی خستنە زیندانەوەو، دوای سێ ڕۆژان شەمعوونی بە بارمتە گرتو کەلەبچەی کردو، گوتی ئەمە لێرە دەبێ، هەتا ئێوە دەچنەوەو ئەو برایەی دیکەتان دێنن، تاکو بزانم ڕاست دەکەن، یان نا ؟ ئنجا ئەگەر ئەوتان هێنا، ئەو کاتە ئەم برایەشتان کە لێرەدا بە بارمتە گیراوە، وێتان دەدەمەوەو ئازادی دەکەم .

لە پەیمانی کۆن، لە تەوراتدا ئاوا دەڵێ، گرنگ ئەوەیە هەر چۆن بێ یوسوف ﷺ یەکسەر نەیگوتوە: برایەکتانم بۆ بێنن، بە بێ پێشەکیی‌و ڕێخۆش کردن، حەتمەن دیارە قسەو باسی دیکەش بوون‌و وەك دەڵێن: قسە قسە دێنێ، ئنجا لە ئەنجامی قساندا، گەیشتۆتە ئەوەی کە پێیان بڵێ: برایەکتانم کە لە بابتانەو دایکتان جیایە، بۆم بێنن، تاکو دڵنیابم کە ئێوە ڕاست دەکەن .

**٣) –** دوایی هانیان دەداو، دەفەرموێ: ﴿ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴾، ئایا نابینن من چۆن پێوانە تەواو دەکەم بە تەواویی‌و، بە چاکیی ئازووخە بۆ خەڵك دەپێوم، ﴿ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴾، هەروەها من باشترینی کەسانێکم کە میوانداریی دەکەن‌و خەڵك بە میوان لەلای خۆیان دادەبەزێنن؟ چونکە (مُنزِل)، واتە: دابەزێنەر، (مُضيف)، واتە: بەمیوانکەر، یانی: کەسێك کە خەڵك میوان دەکا لەلای خۆی، واتە: خانەخوێ، ئایا نابینن من باشترین خانەخوێم، واتە: مادام من هەم ئازووخەتان باش بۆ دەپێوم‌و، هەم خانەخوێیەکی باشیشم، ئەو برایەشتان بێنن‌و، جارێکی دیکەش وەرنەوەو ئازووخەی دیکە بەرن .

(كَيْـل)، هەم بە مانای ئەو دەفرە دێ، کە شتی پێ دەپێورێ‌و، هەم بە مانای پێوانیش دێ، لێرەدا بە مانای پێوانە .

٤) – ﴿فَإِن لَّمْ تَأْتُونِي بِهِۦ﴾، ئەگەر ئەو برایەتانم بۆ نەهێنن .

٥) – ﴿فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِى﴾، واتە: لە لای من بۆتان ناپێورێ .

لێرەدا ﴿كَيْلَ﴾، چاوگە بە مانای (الإكتيالْ)، (أي لا يُكالُ لَكُم)، بۆتان ناپێورێ، واتە: ئازووخەتان پێ نافرۆشین، تاکو دوایی بپێورێو نرخەکەی دیاری بکرێ، (الكيل هنا كِناية عَن ابتياعِ الطّعامِ)، واتە: لێرە ئازووخە ناگرنو ئازووخەتان پێ نافرۆشرێ .

٦) – ﴿وَلَا تَقْرَبُونِ﴾، (أيْ: لا تَقربوني بِدُخولِ بلادِي مَرة ثانية)، جارێکی دیکە نەیەنو نیزیکی من نەبن کە بێنە وڵاتی منەوە، بەڵام لێرەدا ﴿وَلَا تَقْرَبُونِ﴾، دەڵێ: (الياء: مَحذُوفة وَالنونُ نونُ الوِقاية)، یانی: ئەسڵی خۆی (وَلاَ تَقرَبوني)یە، بەڵام دیارە ئێستا (ي)ەکە قرتێنراوەو ئەو (ن)ەش، (ن)ی (وِقاية)ی پێ دەڵێن، لە کاتێکدا کە (الفعل المُضارع) جەزم دەبێ، (ي)کەی (حَذف) دەبێ .

**مەسەلەی سێیەم :** بەڵێندانی برایەکانی یوسوف بە هێنانی ئەو برایەیان (بنیامین)، کە هەر چۆن بووە بابیان ئیخفاڵ دەکەنو، بە تەئکید ئەو برایەیان دەهێنن .

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴿٦١﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە دوو بڕگەدا**

١) – ﴿قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ﴾، گوتیان: ئێمە بابی دێنینە سەر قەناعەتی خۆمانو هەر چۆن بی ئیقناعی دەکەین، یان: ئیخفاڵی دەکەینو فێڵی

لێدەگەین و، بە هەر شێوەیەك با هەوڵ دەدەین: ئەو كوڕەی لە دەست دەربێنین و لەگەڵ خۆمانی بێنین .

٢) - ﴿ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ﴾، ئێمە بێگومان ئەنجامدەری ئەوەین، واتە: ئەنجامدەری ئەو هەوڵ لەگەڵ دانەی بابمانین، یاخود: ئێمە ئەنجام دەری هێنانی ئەو برایەمانین، پێشان هەر بەڵێنیان پێدا، كە هەوڵ لەگەڵ بابیان بدەن و لەگەڵی تێبكۆشن، بابیان پەلكێش بكەن بۆ قەناعەتەكەی خۆیان، كە ئەو برایەیان لەگەڵ بنێرێ، دوایی چوونە سەرترو بە جەزمیی گوتیان: بێگومان ئێمە ئەو برایەمان هەر دەهێنین .

ئەگەر (فاعلون) بگەڕێتەوە بۆ هێنانی برایەكەیان، واتە: بە تەئكید ئێمە ئەو برایەمان هەر دێنین و ئەنجامدەری هێنانی برایەكەمان دەبین .

بەڵام ئەگەر بچێتەوە بۆ (نُراوِدَ)، واتە: بە تەئكید ئێمە ئەنجامدەری هەوڵدان دەبین لەگەڵ بابمان، كە ئیخفاڵی بكەین و قەناعەتی پێ بێنین و، ئەو برایەمان لەگەڵ بنێرێ .

**مەسەلەی چوارەم و كۆتایی :** فەرمانكردنی یوسوف بە گەنجە بەردەستەكانی كە سەرپەرشتیی فرۆشتن و پێوانی ئازووخەیان بۆ كردوە، كە دەستمایەكانیان، {دەستمایەكانی برایەكانیان: نرخەكەیان} بۆ بخەنە نێو بارەكانیان، بەڵكو پاش ناسینەوەی نرخی ئازووخەكەیان كە پێیان كڕیوە، لە نێو بارەكانیاندا، بگەڕێنەوە بۆ میسر :

وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ ٱجْعَلُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ فِى رِحَالِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾.

شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە لە چوار بڕگەدا

١) - ﴿ وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ ﴾، ئنجا بە گەنجەكانی خۆی گوت .

القاسمي دەڵێ: (أي لِخُدَّامِهِ الكَيّالين)، واتە: خزمەتکارەکانی کە ئازووخەیان دەپێوا .

(الفَتَى: مَن كانَ في مَبدَأ الشَّبابِ ومُؤَنَّثُهُ: فَتاة، وَيُطلَقُ عَلَى الخادِمِ تَلَطُّفاً)، (فَتَى)، گەنجێکە کە تازە پێدەگا لە سەرەتای تەمەنی گەنجیەتییدا، (فَتَى)، بۆ نێرە، (فَتَاة) بۆ کچە، بۆ مێیە، واتە: لاوی کوڕو کچ، بەڵام وشەی (فَتَى)، بۆ خزمەتکاریش بەکاردێ، وەك نەرمیی نواندن لە تەعبیرداو ڕێزلێگرتن کە لە جیاتی بڵێ: خزمەتکار، دەڵێ: گەنج، لاو، هەروەك بۆ کۆیلەش بەکارهاتوە، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {لا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي وَأَمَتِي، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: فَتَايَ وَفَتَاتِي} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٨١٨٢)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: ٢٤١٤)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٢٤٩)، وَأَبُودَاوُدَ بِرقم: (٤٩٧٥)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁}، واتە: با یەکێك لە ئێوە نەڵێ: بەندەکەمو کەنیزەکەکەم (بەندە نێرینەکەم، یان بەندە مێینەکەم) بەڵکو با، بڵێ: گەنجەکەمو کچەکەم .

بۆ ئەوەی وشەی (عَبْد)و وشەی (أمة) بەکارنەهێنرێ، چونکە خەڵك هەمووی تەنیا بەندەی خوایە.

**٢) - یوسوف چی پێگوتن؟** ﴿ اَجْعَلُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ فِى رِحَالِهِمْ ﴾، دراوەکەیان، یاخود ئەو شتەی کە ئازووخەکەیان پێ کڕیوە، بیخەنە نێو بارەکانیان، ئنجا ئەو (بِضَاعَة)یە :

پارەیە یان هەر شتێکە، (البِضاعَةُ: المالُ أو المُتاعُ المُعَدُّ للتِّجارَة)، (بِضَاعَة)، بریتیە لە سامانێك یاخود کەلوپەلێك کە ئامادە کراوە بۆ بازرگانیی .

لێرەدا وا پێ دەچێ زیاتر مەبەست پێی ئەو پارە زیوە بوو بێ، کە خواردنو ئازووخەکەیان پێ کڕیوە، ﴿ رِحَالِهِمْ ﴾یش، پێشتریش گوتمان (رِحَال)، (جَمعُ رَحْل: ما يُوضَعُ على البَعيرِ مِن مَتاعِ الراكِب)، لە شوێنێکی دیکە لە جیاتی (رِحَالهم) دەفەرموێ: (أمتِعتِهِم)، یانی: ئەو تێرو جەوالو

شتە کە کەلوپەلی تێ دەهاویشترێ‌و دەخرێتە سەر پشتی ولاخ، (رِحَال)یش، کۆی (رَحْل)ە، واتە: بار، ئەو شتەی دەخرێتە سەر پشتی ولاخ .

٣) - ﴿لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ﴾، بەڵكو بیناسنەوە، واتە: دراوەکەی خۆیان، نرخ‌و دەست مایەکەی خۆیان بناسنەوە، کاتێك کە گەڕانەوە لای ماڵ‌و خێزانیان، واتە: بزانن کە: ئەوە خودی دراوەکەو خودی دەستمایەکەی خۆیانە، چ لەبەر ئەوەی دراوی شوێنی خۆیان بووە، چ لەبەر ئەوەی ئەو پرێسکەو توورەکەی دراوەکەی تێدا بووە، دەیناسنەوە، وەك لە تەوڕاتدا واهاتووە، واتە: دەزانن کە ئەوە بە ئەنقەست خراوەتە نێو بارەکانیان، یاخود بە لەبیرچوون‌و لێیان تێکچووەو، دراوەکەیان خراوەتە نێو بارەکانیان .

ئنجا لەبەر ئەوەی ئەوانیش حەرام ناخۆن، دەگەڕێنەوە، یاخود لەبەر ئەوەی پێیان وابێ : عەزیزی میسر چاکەی لەگەڵدا کردوون‌و ڕێزی گرتوون، ئەوانیش پێویستە لە بەرانبەر چاکەدا چاکە بکەن‌و، جارێکی دیکە بگەڕێنەوە لای، ئەوە ببێتە هاندەریان، ئنجا بە هەر بارێکیان دابێ، ئەوە دەبێتە هاندەریان بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ میسر .

٤) - ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾، بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە .

دەشگونجێ بۆیە یوسوف دراوو نرخەکەی بۆ خستبنەوە نێو بارەکانیان، لەبەرئەوەی هەستی کردبێ، کە هەژارو نەدارن، ڕەنگە پارەیان نەبێ جارێکی دیکە بێنەوە، ئازووخەی پێ بکڕن، بۆیە گوتوویەتی: با پارەکەیان بۆ بخەینە نێو بارەکانیان، بۆ ئەوەی دەستمایەکیان هەبێ‌و بێنەوە جارێکی دیکە ئازووخەی پێ بکڕن، یاخود هەر لەبەرئەوە کە برای بوون‌و بەزەیی بەوان‌و بە بابیش‌و بە خزم‌و کەسی دا هاتۆتەوە .

هەر چۆن بێ، یوسوف مەبەستی ئەوە بووە، کە ئەوە ببێتە هاندەریان بۆ هاتنەوە، ئنجا :

١- چ وەك چاکە لەگەڵدا کردن .

٢- چ وەك هاوکاریی کردن .

٣- چ وەك منەت بارکردنیان .

٤- چ وەك ئەوەی واداریان بکات کە مادام ئەو دراوە خراوەتە نێو بارەکانیان، ئنجا بە لەبیرچوون بێ، یاخود بە پێ بەخشین بێ، ئەوە ببێتە هاندەریان کە جارێکی دیکە بێنەوە بۆ میسڕو، بێنەوە بۆ لای یوسوفو برایەکەشیان لەگەڵ خۆیاندا بێنن .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە شەش (٦) ئایەت پێك دێ، ئایەتەكانی: (٦٣ تا ٦٨)، ئەم دەرسەش ئاڵقەی نۆیەمی زنجیرەی بەسەرهاتی یوسوف ﵇ دەگرێتە خۆی، كە تێیدا باسی گەڕانەوەی دە (١٠) كوڕەكانی یەعقووب، واتە: دە (١٠) برایەكانی یوسوف كە لە دایكی خۆی نەبوون، گەڕانەوەیان بۆ لای بابیان، باسی ئەوە كراوە، كە پێیان ڕاگەیەنراوە: ئەگەر بێتو برایەكەیان، بنیامینی برای دایكیی‌و بابیی یوسوف، لەگەڵ خۆیان نەبەن بۆ میسڕ، ئازووخەیان پێ نادرێ، بەڵكو ئاگادار كراونەوە كە نابێ هەر نیزیكی میسڕیش بكەونەوەو بچنە نێو وڵاتی میسڕەوە، دیارە بابیشیان كەمتەرخەمییان لەبارەی یوسوفەوە، دەخاتەوە یادیان، كە چۆن بەحیساب زەمانەتیی پاراستنییان كرد، بەڵام دوایش نەیانپاراست، ڕاشیدەگەیەنێ كە هەر خوا دەیپارێزێ، ئەگەرنا متمانەم بە ئێوە نیە .

ئنجا كە كوڕەكان بارەكانیان دەكەنەوە، دەبینن دەست مایەكەیان ئەو نرخەی كە ئازووخەكەیان پێ كڕیوە، بۆیان گێڕدراوەتەوەو خراوەتە نێو بارەكانیانەوە، گفتیش بە بابیان دەدەن كە ئەگەر برایەكەیان لەگەڵ بنێرێ، بیپارێزن‌و بارێكیش ئازووخە زیاد دەكەن، كە زیادكردنی ئەو بارە ئازووخەیە، شتێكی كەمە بۆ ئەو بەرپرسەی ئازووخە لە میسڕو، بە ئاسانیی پێیان دەدات، بابیشیان پێیان دەڵێ: هەتا پەیمانێكم بە ناوی خواوە نەدەنێ، كە مەگەر بێ چارە بكرێن‌و دەورتان بگیرێ‌و، هیچ دەرفەتتان نەبێ، ئەگەرنا برایەكەتان هەر دێننەوە، لەگەڵتان نانێرم، ئەوانیش بەو جۆرە بەڵێنی پێدەدەن .

ئنجا بابیان ئامۆژگارییان دەکات کە لە یەك دەروازەوە نەچنە ژوور بۆ شار، بەڵکو لە دەروازەی جۆراوجۆرە، بچن، دیارە شارەکە چەند دەروازەیەکی هەبوون، وەك ئەو شارە لە مێژینانە، ئێستاش هەروانە .

پاشان خوای پەنهانزان رایدەگەیەنێ کە بەو جۆرەی بابیان فەرمانی پێکردن، چوونە نێو شارەوە، هەرچەندە ئەو رێنمایی‌و ئامۆژگارییەی یەعقووب بۆ کوڕەکانی لە بەرانبەر ویستی خوادا، سوودیان پێ ناگەیەنێ‌و، ئەگەر خوا بیەوێ شتێك بێتە پێش، هەر دێ، کە ئەمەش مەبەست پێی ئەوەیە، کە ئینسان هەمیشە چاوی لەسەر ئەوە بێ : ئیرادەی رەهای خوا ﷻ کارەکان هەڵدەسووڕێنێ، ئەگەرنا هۆکارەکانیش هەر خوا وای کردوە: کاریگەرییان هەبێ .

﴿فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾ قَالَ هَلۡ ءَامَنُكُمۡ عَلَيۡهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمۡ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبۡلُۖ فَٱللَّهُ خَيۡرٌ حَٰفِظٗاۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُواْ مَتَٰعَهُمۡ وَجَدُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ رُدَّتۡ إِلَيۡهِمۡۖ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا نَبۡغِيۖ هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتۡ إِلَيۡنَاۖ وَنَمِيرُ أَهۡلَنَا وَنَحۡفَظُ أَخَانَا وَنَزۡدَادُ كَيۡلَ بَعِيرٖۖ ذَٰلِكَ كَيۡلٞ يَسِيرٞ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنۡ أُرۡسِلَهُۥ مَعَكُمۡ حَتَّىٰ تُؤۡتُونِ مَوۡثِقٗا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأۡتُنَّنِي بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمۡۖ فَلَمَّآ ءَاتَوۡهُ مَوۡثِقَهُمۡ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَهُمۡ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغۡنِي عَنۡهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ إِلَّا حَاجَةٗ فِي نَفۡسِ يَعۡقُوبَ قَضَىٰهَاۚ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلۡمٖ لِّمَا عَلَّمۡنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٦٨﴾﴾.

# مانای وشـە بە وشـەی ئایەتەکان

{ئنجا کاتێك (دە کوڕەکان) گەڕانەوە بۆ لای بابیان، گوتیان: ئەی بابی خۆمان! پێشگیریی (کڕینو) پێوان (ی ئازووخە)مان لێکراوە، دەجا (ئەگەر دەتەوێ ئازووخەمان بدەنێ) برایەکەمانمان لەگەڵ بنێرە (ئازووخە دەکڕینو دەپێوینو، بێگومان ئێمە پارێزەریشی دەبین ﴿٦٣﴾ (بابیان) گوتی: (ئەگەر بە ئەمیندارتان دابنێم)، ئایا هەر بەو جۆرە بە ئەمیندارتان دابنێمو لەبارەیەوەو لێتان دڵنیابم، کە پێشتر بە ئەمیندارم دانان، لە بارەی برایەکەیەوە؟! (واتە: یوسوف)، هەر خوا باشترین پارێزەرەو، ئەویش بە بەزەیترینی بە بەزەییانە ﴿٦٤﴾ کاتێك بارەکانیان کردنەوە (ئازووخەی نێو بارەکانیان تەماشا کرد) دەستمایەکەیانیان بینی بۆ لایان گێڕدرابۆوە، گوتیان: ئەی بابی خۆمان! لەوە زیاتر چیمان دەوێ، (بۆ دڵنیایی لە سەلامەت بوون لەو سەفەرەماندا) ئەمە دەستمایەکەمانە بۆمان گێڕدراوەتەوە، (کەواتە: با بچین بۆ ئەو سەفەرە)، ئازووخەش بۆ کەسوکارمان دێنینو، برایەکەشمان دەپارێزینو باری پێوراوی حوشترێکیش زیاد دەکەین، ئەو بارە پێوراوە (زیادەیە) کەمە (بۆ ئەو بەرپرسەی ئازووخە لە میسرو، بە ئاسانیی دەمانداتێ) ﴿٦٥﴾ بابیان گوتی: هەتا لەلایەن خواوە (بە ناوی خواوە) بەڵێنو پەیمانم نەدەنێ کە: بە دڵنیایی بۆم دێننەوە، مەگەر بێ چارەو دەرەتان بن، ئابڵووقە بدرێن، هەرگیز لەگەڵتان نانێرم، ئنجا کاتێك بەڵێنی خۆیانیان پێدا، بەو جۆرەی بابیان داوای کردبوو، گوتی: خوا لەسەر ئەو قسەیەی دەیڵێین، کار پێسپێرراو (و شایەد) بێ ﴿٦٦﴾ (بابیان) گوتی: ئەی کوڕەکانم ! لە یەك دەروازەوە مەچنە ژوور (شار)و، لە چەند دەروازەیەکی جیا جیاوە بچنە ژوورو، من بەم ئامۆژگارییەم هیـ

سوودێکتان پێ ناگەیەنم لە بەرانبەر (بەڵای) خوادا، بڕیار هەر هی خوایە، پشتم هەر بەو بەستوە، پشت بەستووانیش با هەر پشت بەو ببەستن ﴿٦٧﴾ کاتێك لەو شوێنەوە کە بابیان فەرمانی پێ کردن، چوونە ژوور شار، (کە بێگومان ئەوەی پێی گوتبوون) لە بەرانبەر ویستی خوادا، هیچ سوودی پێ نەدەگەیاندن، ئەگەر خوا نەیویستبایە سەلامەت بن، تەنیا ئەوەندە بوو یەعقووب پێویستییەکی دەروونیی خۆی بوو، دەربڕیو جێبەجێی کردو، ئەو (یەعقووب) بەهۆی فێرکردنو شارەزاکردنی ئێمەوەو، خاوەن زانیارییەکی گرنگو مەزن بوو، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن. (کە زانیاریی ڕاستو بێخلْتە، تەنیا لە ڕێی وەحیی خواوە دەستگیر دەبێ) ﴿٦٨﴾} .

# شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلْكَيْلُ) : (الكَيلُ ما يُكالُ بهِ، وَكذلِكَ المِكيالُ، كالَ كَيْلاً: مَصْدَرٌ)، وشەی (كَیل)، بە دوو واتا بەكاردێ :

١- ئەو دەفرەی كە شتی پێ دەپێورێ، كە لە ولاتێكەوە بۆ ولاتێك، لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێك جیایە، بۆ وێنە: لە نێو كوردەواریی خۆماندا بە تەنەكە شت دەپێون، بە ڕبە دەپێون، وەك دەڵێ: (كەس بە ڕبەی كەس ناپێوێ)، یان دەڵێ: (فلان كەس بۆتە ڕبە شرە، كەس پێی ناپێوێ، لەخۆڕا دەڵێ: شازدەو نیو)، دیارە (ڕبە): ئەندازەیەك بووە، دەفرێك بووە، شتیان پێ پێواوە، كەواتە: (كیل) ئەو ئامرازەیە كە شتی پێ دەپێورێو (مِكیال)یشی پێ دەگوترێ، (مِكیال)یش یانی: پێوەر، دەفرێك كە دەغڵی پێ دەپێون، ئازووخەی پێ دەپێون، شتی شل، یان شتی وشكی پێ دەپێون .

٢- هەروەها دەگوترێ: (كالَ كَیلاً)، واتە: پێوای بە پێوان، كەواتە: (كَیْل) وەك چۆن بە پێوەر دەگوترێ، ئەوەی ئازووخەیەك، شتێكی پێ دەپێورێ، بە هەمان شێوە چاوگیشەو (كَیْل)، یانی: پێوان .

(نَكْتَلْ) : یانی: دەپێوین، ئازووخە دەكڕینو دەیپێوین، ئەو كاتە دیارە زیاتر لەو ولاتە عادەتی پێوانی ئازووخەو خواردەمەنی هەبووە، نەك كێشانی بە تەرازوو (میزان) كە بۆ كێشانەو (كَیل)یش بۆ پێوانە، چونكە شت یان دەبێ بكێشرێ، یان دەبێ بپێورێ، دیارە ئەو كاتە لەو شوێنە زیاتر عادەتیان وا بووە شتیان پێواوە .

(هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ): ئایا دڵنیابم، بە ئەمیندارتان دابنێم، لێتان دڵنیابم بەنسبەت بنیامینەوە، دەڵێ: (الإستِفهامُ لِلإنكارِ)، یانی: (ما ءَاتَمِنُكُم عَلَیهِ)،

ئەو هەمزە (أ)یە (إستِفهامية)یە، بۆ پرسیارکردنی نکوولێی لێکەرانەیە، واتە: من بە ئەمیندارتان دانانێم بەرانبەر بەو کوڕەم کە تەسلیمتان دەکەم، دەگوترێ: (آمَنَهُ عَلَيْهِ، وَائتَمَنَهُ عَلَيْهِ)، هەردووکیان بە یەك واتان، واتە: ئەو کەسەی بە ئەمیندار داناو، بە دەست پاکی دانا بەرانبەر بەو کەسە، یاخود بەرانبەر بەو شتە، کە پێی سپاردوە .

( مَتَٰعَهُمۡ ): (أَصْلُ المَتَاعِ ما يُتَمَتَّعُ بِهِ، وَأُطْلِقَ هُنا عَلَى أَعْدَالِ الطَّعَامِ، وَأَحْمَالِهِ مِن تَسْمِيَةِ الشَّيءِ بِاسمِ الحَالِّ فِيهِ)، (مَتَاع)، لە ئەسڵدا هەر شتێکە کە ئینسان بەهرەی لێوەربگرێ، سوودی لێوەربگرێ بە شێوەیەکی کاتیی، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی بارەکانی خواردنو ئازووخەیەو، ئەو بارانەیەو ئەو جەواڵو تێرو شتانەیە کە خواردنیان تێکراوە، وەك چۆن ئێستا لە لادێ ئازووخەو شت بە گونیەو تەلیسو جەواڵ، دەگوازنەوە، ئەوەش ناونرانی شتێکە بە ناوی ئەو شتەوە کە تێیدایە، ئەگەرنا (مَتَاع)، بریتیە لەو خواردنو ئازووخەیە کە لە نێو بارەکاندا بووە، ﴿فَتَحُواْ مَتَٰعَهُمۡ﴾، واتە: بارەکانیان کردنەوە کە خواردنەکەی تێدایە .

( مَا نَبۡغِي ): دەگوترێ: (بَغَى ضَالَّتَهُ يَبْغِيها: طَلَبَها، وَأَبغَاهُ الشَيءَ: طَلَبَها لَهُ)، (بَغَى ظَالَّتَهُ يَبْغِيها)، واتە: ئەو شتەی لێی ونبوو بوو، بە دوایدا گەڕا، داوای کرد، (وَأَبغَاهُ الشَّيءَ)، واتە: ئەو شتەی بۆ ئەو داوا کرد ﴿مَا نَبۡغِي﴾، واتە: چی دیکەمان پێویستە، چی دیکە داوا دەکەین ؟

هەندێکیش گوتوویانە: ﴿مَا نَبۡغِي﴾، یانی : (ما نَظلِمُ، ما نَتَجاوَز)، ستەم ناکەین، کە دەڵێ: برایەکەمان وێدە، زێدەڕۆیی ناکەین، بەڵکو هەق دەڵێین: بە بەڵگەی ئەوەی ئەو نرخو دراوەی کە ئازووخەکەمان پێ کڕیوە، بۆمان نێردراوەتەوە .

( وَنَمِيرُ أَهۡلَنَا ): واتە: ئازووخە بۆ ماڵو منداڵمان بۆ کەسوکارمان دێنین، (المِيرَةُ: الطَّعَامُ المَجْلُوبُ)، (مِيرَة)، واتە: ئازووخەیەکی هێنراو، کە لە

شوێنێکەوە هێنرابێ. ﴿وَنَمِيرُ﴾ واتە: ئازووخە دێنین، خواردن دێنین، هەندێکی عەرەبی هەیە، دەڵێ: (ما عِنْده خَيرٌ ولا مَيْرٌ)، واتە: فلان کەس نە خێرێکی لە لایە، نە ئازووخەیەکی لەلایە .

(مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ): واتە: پەیمانێك لە خواوە، دەڵێ: (الموثِقُ: المِيثاقُ)، (موثِقْ) بە مانای (مِيثاقْ) دێ، واتە: پەیمانێکی پتەو، (مَصْدَر مِيمِيٌّ مِنَ التوثِيق، وَأُطلِقَ هُنا على المَفعول)، (موثِق)، چاوگێکی (م) میمییە بۆ (توثِيق)، (وَثَّقَ، يُوَثِّقُ توثِيقاً وَموثِقاً)، واتە: بەڵێنێکی پتەوی دا، لێرە بە مانای (مَفعول) بەکارهاتوە (موثِق)، یانی: بەڵێنو پەیمانێکی مەحکەم کراو، بەهۆی سوێند خواردن بە خواوە، ﴿مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ﴾، واتە: پاڵدراوەتە لای خوا، سوێندی لەسەر خوراوەو، خوای لەسەر کراوەتە شایەد .

(إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ) : (الإحاطة: الأخذُ بالأَسْر والهَلاك مِما هُوَ خارِجٌ عَنْ قُدْرَتِهِم، إلا أَنْ يُحَاطَ بِكُم : إلا مُحَاطاً بِكُم)، (إحَاطة) بریتییە لە گرتن، ئەوە کە بە دیل بگیرێ، یاخود لە بەین ببرێ، بە شێوەیەك کە لە دەرەوەی ویستو توانای ئەوان بێ .

کەواتە: ﴿إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ﴾، یانی: (إلاَّ مُحَاطاً بِكُم) مەگەر دەورە بدرێن، لە حاڵێکدا کە بێ چارە بکرێنو بێ دەرەتان بن، هیچ دەستەڵاتتان نەبێ، ئەو کاتە ئەگەر برایەکەتان نەهێننەوە، ئەوە مانای وایە پەیمانتان نەشکاندوە .

(وَكِيلٌ) : (فَعِيلُ بِمَعْنَى المَفْعُولِ، أَي: موكَّلٌ إِلَيهِ)، لێرەدا (وَكِيل)، لەسەر ڕێژگەی (فَعِيل)ە، بەڵام بە مانای (مَفعول)ە، واتە: کار پێ سپێردراو (موكَّلٌ إِلَيْهِ).

(يُغْنِى) : دەگوترێ: (أَغْنَى عَنْهُم، يُغنِي عَنْهُم إِغْنَاءً، الإِغْنَاءُ مُشتَقٌّ مِنَ الغَنَاءِ وَهو الإجزاءُ والإصلاحُ وَكِفايةُ المُهِمّ، وَأَصْلُهُ مُرادِفُ غِنى، لأنَّ مَنْ أَجْزى وَكَفى، فَقَدْ أَذهَبَ عَنْ نَفسِهِ الحَاجَةَ إِلَى المُغْنِين)، (إغْناء)، واتە: دەفریا هاتن،

یاخود بێ نیاز کردن، لە (غَنَاءَ)ەوە هاتوە، (غَنَاء)، واتە: کەلێن بۆ گرتنو لە فریا هاتن، کەسێك کارێکی گرنگی بێ، ئنجا هۆکارێك لە فریای بێ، بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، ئەویش هاوواتای (غِنَى)یە، (غِنَى)، واتە: دەوڵەمەندیی، چونکە کەسێك لە فریای کەسێك بێو کەلێنی بۆ بگرێو دادی بدات، مانای وایە ئەو پێویستییەی هەبووە، جێبەجێ بووە .

(حَاجَةً) : (الحَاجَةُ: الأَمْرُ المَرْغُوبُ فِيهِ، سُمِّيَ حَاجَةً، لأَنَّهُ مُحْتَاجُ إِلَيْهِ، فَهِيَ مِنَ التَّسْمِيَةِ بِاسْمِ المَصْدَرِ (حَاجَةً فِي نَفْسِ يَعْقُوبَ)حِرْصُهُ عَلَى تَنَبُّهِهِم لِلأَخْطَارِ الَّتِي تَحْدُثُ لأَمْثَالِهِم)، وشەی (حَاجَة)، بریتیە لە شتێك کە خەڵك ئارەزووی بکات، یانی: ئارەزوو بۆلا کراو بێ، بۆیە پێی گوتراوە: (حَاجَة)، چونکە پێویستییان پێیەتی، کەواتە: ناونرانی شتێکە بە ناوی چاوگەکەیەوە، ئنجا ئەو پێویستییەی کە لە دڵی یەعقووبدا بووە، کە ئامۆژگاریی کوڕەکانی کردوە، ئەوە بووە کە سوور بووە لەسەر ئەوەی وریابن، هۆشیاربن، بۆ ئەو مەترسییانەی کە دێتە ڕێی ئەوانو هاو وێنەی ئەوان .

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ لێرەدا، هەموو ئەوەی – وەك پێشتریش گوتوومانە - کە بە عەقڵو سەلیقە دەزانرێ- باسی نەکردوە، دوای ئەوەی کە لە ئایەتەکانی پێشوودا، یوسوف ﷺ پێی گوتن: دەبێ برایەکتانم بۆ بێنن کە لە دایکتان نەبێ، واتە: دایکی جیا بێ، هەڵبەتە وەك پێشتر گوتمان: دەبێ ئەوان باسو خواسی خۆیان بۆ کردبێ، کە ئەوان دوازدە (١٢) بران، بەڵام یەکێکیان ون بووەو ئەو برایەیان کە ونبووە، یەك برای هەیە لە دایکی خۆی، ناوی (بنیامین)ەو هەمووشیان کوڕی یەعقووبن، دیارە یوسوفیش گوتوویەتی: دەبێ ئەو برایەم بۆ بێنن، بۆ ئەوەی دڵنیابم کە ڕاست دەکەن، ئنجا ئەوە کە لە میسرەوە بە ڕێکەوتنو، چۆن چوونەوەو گەیشتنەوەو، بارەکانیان خستنو چیو چییان کرد، هەمووی فرتێنراوە، چونکە بە عەقڵو سەلیقە دەزانرێ کە: لە میسر بەڕێ کەوتوون، بەرەو نشینگەی خۆیان، ئەو شوێنەی کە بابیان لەوێ بووە، سەر زەمینی کەنعان، گەڕاونەوە .

دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ ﴾، کاتێك گەڕانەوە بۆ لای بابیان، کێو کێ گەڕانەوە؟ دیارە دەزانین کە دە (١٠) برایەکان بوو، واتە: ئەو دە برایەی کە یوسوفیان خستە نێو بیرەوە، کاتێك گەڕانەوە بۆ لای بابیان، ﴿ قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ ﴾، گوتیان: ئەی بابی خۆمان! ئێمە پێوانمان لێ قەدەغەکراوە، پێشگیریی پێوانمان لێ کراوە، دیارە ئەو کاتە ئازووخە بە شێوەی پێوان پێوراوەو فرۆشراوە، کەواتە: لێرەدا لەجیاتی ئەوەی بڵێن: ئازووخەمان پێ نافرۆشن، ئەو ئازووخەیەی کە دەبێ بپێورێ، یەکسەر گوتوویانە: پێورانمان لێ قەدەغە کراوە، چونکە ئەگەر نەهێڵن بیپێون، دیارە پێیان نەفرۆشتوون، ئەگەر پێیان

بفرۆشرێ، بۆشیان دەپێورێ، واتە: ئازووخە هێنانمان لێ قەدەغە کراوە لە میسرەوەو ناهێڵن بیپێوین و بیهێنین، ﴿ فَأَرْسِلْ مَعَنَآ أَخَانَا نَكْتَلْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴾، دەجا برایەکەمانمان لەگەڵ بنێرە (ئەگەر دەتەوێ ئازووخەمان هەبێ و، ئازووخە بێنین) تاکو بپێوین، (واتە: ئازووخە بکڕین و بیپێوین، یاخود بۆمان بپێورێ)، بێگومان ئێمە بۆ وی (بۆ برایەکەمان)یش پارێزەر دەبین .

هەڵبەتە لێرەشدا ئەو وردەکارییە باس نەکراوە، ئەگەرنا دیارە دە (١٠) کوڕەکان بۆ بابیان گێڕاوەتەوە، کە ئەو بەرپرسەی ئازووخە لە میسر، لێی پرسیووین : ئێوە کێن؟ ئێمەش خۆمانمان پێ ناساندوە .

چەند بران ؟ ئێمەش گوتمان: دوازدە (١٢) برا بووین .

ئەدی بۆچی ئێستا تەنیا دە (١٠)ن؟ گوتمان: ئاخر یەکێکمان لە ماڵێیە .

گوتی: ئەدی ئەوی دیکە ؟

گوتمان: ئەوی دیکەمان ونبووە، دیارە یان بەو شێوەیە لێی پرسیون، یان وەك لە پەیمانی کۆندا هاتوە، تۆمەتبار کراون، بەوەی هاتوون سیخوڕیی بکەن، ئەوانیش گوتوویانە: سیخوڕ نین و، لێمان ناوەشێتەوە .

بۆچی لێتان ناوەشێتەوە؟ لەبەر ئەوەی ئێمە بابمان پێغەمبەرێکی خوایە، ناوی یەعقووبە، یەعقووبیش کوڕی ئیسحاقە ئەویش کوڕی ئیبراهیمە، کە دیارە خەڵکی دنیای ئەو کاتە، مەگەر لە گۆشەو کەنارێکی دووری دنیا، ئەگەرنا ناوو ناوبانگی ئیبراهیمیان بیستوە، ئەگەر هی ئیسحاق و یەعقووبیشیان نەبیستبێ .

ئنجا یوسوف گوتوویەتی: من چۆن دڵنیابم کە ئێوە ڕاست دەکەن؟ دەبێ ئەو برایەتانم بۆ بێنن .

یان وەك پەیمانی کۆن دەڵێ: تۆمەتبار کراون کە سیخوڕو جاسووسن، ئیدی بۆ پاکانەی خۆیان، داوای لێکردوون کە برایەکەیان بێنن .

ئنجا کە ئەوە بە بابیان دەڵێن، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە: ﴿ قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ ﴾، یەعقووب، بابیان، گوتی: ئایا بە ئەمیندارتان دابنێم لەسەری، لە بەرانبەر بنیامیندا لێتان دڵنیابم، ﴿ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ ﴾، مەگەر بەو شێوەیە کە لێتان دڵنیابووم‌و بە ئەمیندارم دانان، سەبارەت بە برایەکەی، لەمەو پێش، واتە: یوسوفی برای؟ ﴿ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًا ﴾، خوا باشترین پارێزەرە، هەروەها خوێنرایشەتەوە: (فَاللهُ خَيْرُ حِفْظاً)، واتە: خوا باشترین زاتێکە کە شت دەپارێزێ، ﴿ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، هەروەها ئەو بە بەزەییترینی بە بەزەییانە، واتە: ئەگەر دڵنیابم، هەر لە پاراستنی خوا دڵنیام‌و هەر پشتم بەو بەستوە، ئەگەرنا ئێوەم ئەزموون کردوە، کە ئەهلی ئەمانەت نین، بۆیە منیش بە ئەمیندارتان دانانێم‌و، ئەگەر برایەکەتانتان لەگەڵ بنێرم، لەبەر ئەوەی زۆر پێویستییمان بە ئازووخە هەیەو ناچارین، ئەوە بە پشت بە خوا بەستن‌و، بە ئومێدی خێر بە خوا بوون، کە کوڕەکەم بپارێزێ، لەگەڵتان دەنێرم، نەك بە متمانە بە ئێوە بوون، چونکە وەك گوتراوە: (مَنْ جَرَّبَ الـمُجَرَّبَ حَلَّتْ بِهِ النَّدَامَة) هەر کەسێك ئەزموونکراو ئەزموون بکاتەوە، پەشێمانیی دەکێشێ .

هەڵبەتە یەعقووب ﷺ ناهەقی نەبووە، لە کوڕەکانی بکەوێتە دوو دڵیی‌و گومانەوەو متمانەی پێیان نەمێنێ، چونکە جارەکەی دیکەش هەر بە هەمان تەعبیر گوتیان: ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ١٢ ﴾، بە نسبەت یوسوفەوە: ئێمە بێگومان پارێزەر دەبین بۆی، لێرەش دەڵێن: بێگومان ئێمە پارێزەر دەبین بۆ بنیامین! ئنجا جاری پێشێ ڕاستیان نەکردو، ئەو درۆو سیناریۆیەیان بۆ بابیان ڕێك خست، ئێستاش دوورنیە دیسان لەگەڵیدا ڕاست نەکەن‌و، دووبارە سیناریۆیەکی دیکە بۆ بنیامینی برای یوسوفیش ڕێك بخەن‌و، ئەو کوڕەشی لێ دوور بخەنەوە، یان بیفەوتێنن، ناهەقی نەبووە، هەرچەندە دیارە ئەمجارە کوڕەکان مەبەستیان فێڵ‌و فەرەج نەبووەو، مەبەستیان پیلان نەبووە، بەڵام

گوتراوە: (ئەگەر كراسێكی پیست دڕی، سەدی پاكی پێوە دەچێ)، بۆیە بابیان ناهەقی نەبووە، متمانەی پێیان نەبێ.

﴿ وَلَمَّا فَتَحُواْ مَتَٰعَهُمْ ﴾، ئنجا كاتێك ئازووخەكەیانیان كردەوە (كە لە بارەكاندا بوو) تەماشایان كرد، ﴿ وَجَدُواْ بِضَٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ ﴾، تەماشایان كرد ئەو كەلوپەلەی كە لە بەرانبەر ئازووخەكەدا دابوویان، (ئەگەر دراو بوو، ئەگەر هەرچی بوو، زۆربەی زانایان دەڵێن: درەمی زیو بووە، ئەو دەستمایە كە ئازووخەكەیان پێ كڕی بوو)، تەماشایان كرد، بۆیان خراوەتە نێو ئازووخەكەوە، لە نێو بارەكانداو بۆ لایان گێڕدراوەتەوە .

وشەی (مَتَاعَ)یش هەر شتێكە كە ئینسان سوودی لێ ببینێ، ئنجا لێرەدا: ﴿ فَتَحُواْ مَتَٰعَهُمْ ﴾، بێگومان ئازووخەكە نەكراوەتەوەو بارەكە كراوەتەوە، بەلام ئەوە وەك زانایان گوتوویانە: (مِن تَسمية الشيء باسم الحالِّ فيهِ)، لەبەر ئەوەی ئازووخەكە لە نێو بارەكەدا بووە، ئەگەرنا بارەكەیان كردۆتەوە، ئنجا كە بارەكەیان كردۆتەوە: تەماشا دەكەن ئەو نرخو دەستمایەی كە ئازووخەكەیان پێ كڕیوە، خراوەتەوە نێو بارەكەیانو بۆ لایان گێڕدراوەتەوە .

﴿ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا نَبْغِي ﴾، گوتیان: ئەی بابی خۆمان! چی دیكە داوا بكەین، یاخود ئێمە سنووربەزێنیی ناكەین كە دەڵێین: برایەكەمانمان لەگەڵ بنێرە، مەبەستمان ستەم نیە، مەبەستمان سنوورشكێنیی نیە، بە بەڵگەی چی ؟ ﴿ هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا ﴾، ئا ئەمە دەستمایەكەی خۆمانە كە بازرگانییمان پێكردوە، ئازووقەمان پێ كڕیوە، نرخو بەهایەكەیە، بۆ لامان گێڕدراوەتەوە .

كەواتە: ئەو بەرپرسەی ئازووخە لە میسر، بابایەكی هێندە باشە، كە ئەوەتا دەستمایەكەشی بۆ خستووینە نێو بارەكان، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە لەو سەفەرەدا، ئێمە سەلامەت دەبینو، هیچ مەترسییەكمان لەسەر نیە .

﴿ وَنَمِيرُ أَهْلَنَا ﴾، واتە: تۆ برایەکەمانمان لەگەڵمان بنێرە، ئازووخەش بۆ ماڵو خێزانمانو بۆ خزمو کەسمان دێنین، ﴿ وَنَحْفَظُ أَخَانَا ﴾، برایەکەشمان دەپارێزین، ﴿ وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ﴾، پێوراوی حوشترێکیش زیاد دەکەین، بارێك کە دەپێوریو دەخرێتە سەر پشتی حوشترێك، ئەوەندەش زیاد دەکەین، ﴿ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴾، ئا ئەو بارە پێوراوە، ئەو باری حوشترە، شتێکی کەمەو ئاسانە کە بماندرێتێ .

دیارە زۆریان لە بەرپرسی ئازووخەی میسر ڕا بینیوە، کە ڕەوشتو ڕەفتارو ئاکاریان بینیوەو، خانە خوێیەکی زۆر باش بووە، باش بارەکانی بۆ پێواون، دیارە زۆر لەگەڵیان بە لوتفو بەڕێز بووەو، زۆریان تێڕا بینیوە، بۆیە گوتوویانە: ئەوە شتێکی ئاسانە بۆ وی .

هەندێکیش ئاوایان لێکداوەتەوە: ﴿ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴾، واتە: ئەو دە (١٠) بارەی دیکە، کەمن‌و بەشمان ناکەن، با بارێکی دیکەی یازدەمینیان بخەینە گەڵ، کە باری بنیامینی برامانە .

بەڵام ئەو مانایەی دیکە بەهێزترە، چونکە دە (١٠) بار کەم نین، بەڵام بارێك کەمە، ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، ئەو بارە پێوراوەی کە زیادی دەکەین، بە هۆی بنیامینی برامانەوە، ئەوە شتێکی کەمەو ئاسانەو بە ئاسانیی بەرپرسی ئازووخەی میسر، دەماندانێ .

﴿ قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ اللَّهِ لَتَأْتُنَّنِي بِهِ إِلَّا أَن يُحَاطَ بِكُمْ ﴾، (یەعقووب ﷺ بابیان)، گوتی: هەرگیز لەگەڵتاندا نایینێرم، مەگەر لەلایەن خواوەو بە ناوی خواوە پەیمانێکی پتەوم پێ بدەن، کە هەر دەبێ بیهێننەوە لەگەڵ خۆتان، مەگەر بێ چارە بکرێن‌و، ئابڵووقە بدرێن.

لێرەدا مەبەست لە ئابڵووقە دران، ئەوە نیە کە بە کردار ئابڵووقە بدرێن، بەڵام مەبەستی ئەوەیە: کە وەك چۆن کەسێك ئابڵووقە دەدرێو ڕێی دەرەتانو ڕاکردنی نیەو هیچ چارەی نیە، مەگەر ئێوەش ئاوا بێ چارەو بێ دەرەتان بکرێن،

وەزعێك بێتە پێش لە توانای خۆتاندا نەبێو، هیچ چارتان نەبێ، ئەگەرنا هەر دەبێ لەگەڵ خۆتانی بێننەوە، ئەگەرنا ئەگەر بەو شێوەیە نەبێو، کەمتەرخەمیی بکەن، لە هێنانەوەی دا، ئەوە مانای وایە ئەو پەیمانەی بە ناوی خواوە بە منتان داوە، پەیمانەکەتان شکاندوە، دوایی دەڵێ: ﴿ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ ﴾، ئنجا دوای ئەوەی پەیمانەکەی خۆیانیان پێدا، واتە: بەو شێوەیەی کە بابیان داوای کرد بوو، بە ناوی خواوەو پەیمانێکی پتەویان پێدا، کە مەگەر بێ چارەو بێ دەرەتان بینو، هیچ دەرفەتمان نەبێ، ئەگەرنا برایەکەمان دێنینەوە، ﴿ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴾، (یەعقووب) گوتی: خوا لەسەر ئەوەی دەیڵێین: کار پێ سپێردراوە، واتە: شایەدو ئاگادارەو سەرپەرشتیاری هەموو لایەکمانەو ئاگای لێیە .

ئنجا یەعقووب ﵇ ئامۆژگاریی یازدە (١١) کوڕەکەی دەکات، چونکە ئەو جارە بنیامینیشیان کەوتە پاڵ: ﴿ وَقَالَ يَٰبَنِىَّ لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ ﴾، گوتی: ئەی کوڕەکانم ! لە یەك دەروازەوە مەچنە ژوور .

دیارە ئەو کاتە ئەو شارەی کە پایتەختی میسر بووە، دەبێ چەند دەروازەیەکی بووبن، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، کە یەکێك بووە لە شارە هەرە قەرەباڵغو گەورەکانی دنیاو، چەندان دەروازەی بوون، ﴿ وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ ﴾، بەڵکو لە چەند دەروازەیەکی جیاجیاوە بچنە ژوور، یەك لەولا، یەك لەولا، یەك لەولا،...هتد، نەك هەر یازدەتان لە یەك دەروازەوە بچنە ژوور .

زانایان زۆر قسەیان لەوبارەوە کردوە: بۆچی یەعقووب وایگوتوە؟ دەگونجێ مەبەستی پێ ئەوە بووبێ، کە گومانی خراپیان لێ نەکەن، یازدە برا کە هەمووشیان شێوەی یەکدییان کردوە، بە شانو شەوکەتو نەجیب دیار بوون، ئەوە چییە ئەو یازدە کەسە هەموویان وەك یەك دەچن ! لێشیان بپرسن: کێن ؟ دەڵێن : ئێمە براین! یاخود مەترسییان لێ بکەن: ئایا دەبێ بۆ ئاژاوەیەك، کودەتایەك، هاتبن ؟ ئەو واتایە زۆر دەچێتە عەقڵو دێتە بەرچاو .

هەندێكیش گوتوویانە: لە چاوو زار لێیان ترساوە كە بە چاوەوە نەبن، بە هەر حاڵ هەر دووك لای دەگرێتەوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ ﴾، من لە بەرانبەر خوادا، هیچ سوودتان پێناگەیەنم، بەو ڕێنماییو ئامۆژگارییەم، ﴿ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ ﴾، حوكم تەنیا هی خوایە، یانی: بڕیاردانو كاروبار بەڕێوەبردنی گەردوون، ﴿ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ ﴾، پشتم تەنیا بەو بەستوە، ﴿ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴾، با پشت بەستووانیش هەر پشت بەو ببەستن، هەر ئەو شایستەی ئەوەیە، ئینسان كاری خۆی پێ بسپێرێو پشتی خۆی پێوە بدات.

﴿ وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَهُمۡ أَبُوهُم ﴾، ئنجا كاتێك لەو شوێنەوە كە بابیان فەرمانی پێكرد بوون، چوونە ژوور شار، واتە: لە دەروازەی جیاجیاوە، چوونە نێو شارەكەوە، ﴿ مَّا كَانَ يُغۡنِي عَنۡهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ ﴾، دیسان خوا ﷻ دووبارەی دەكاتەوە، دەفەرموێ: یەعقووب بە ڕێنماییەكەیو ئامۆژگارییەكەی (كە گوتی: لە یەك دەروازەوە مەچنە ژوور) هیچ سوودی پێ نەدەگەیاندن لە بەرانبەر خوادا، واتە: لە بەرانبەر بڕیارو ویستی ڕەهای خواو لە بەرانبەر بەڵای خوادا، ئەگەر خوا ویستبای بەڵایان بۆ بنێرێو، نەیویستبێ سەلامەتیان بكات، بەو ڕێنماییو ئامۆژگارییەی یەعقووب، بە تەنیا سەلامەت نەدەبوون، بەڵێ هۆكار بوو، بەڵام لە پشت هۆكارەكانەوە، بەدیهێنەری هۆكارەكانیش هەیە، هۆكارساز (مسبِّب)ەكەش هەیە، كە خوایە ﷻ، ئەدی بۆچی ئەو ڕێنماییەی كردن؟ ﴿ إِلَّا حَاجَةً فِي نَفۡسِ يَعۡقُوبَ قَضَىٰهَا ﴾، ئەوە تەنیا پێویستییەك بوو لە دەروونی یەعقووب دا، كە جێبەجێی كرد، كە بریتی بوو لەوەی ئاگاداریان بكاتەوە: هۆشیاربنو ئاگاداربن، لە مەترسییەكان كە دێنە ڕێیان، دیارە كوڕو جگەر گۆشەی خۆی بوو ون، بە تەنگیانەوە بووەو پەرۆشی بوون، چی بە چاكی زانیوە، پێی گوتوون، بەڵام زانیوشیەتی كە سەرەنجامەكان تەنیا بەدەست خوان، ئنجا دواییش هەر وا دەركەوتوەو، بنیامینی كوڕی كە یوسوف عليه السلام لەلای خۆی گلی

دەداتەوە، هەروەها برا گەورەکەشیان، – وەك دوایی باسی دەکەین – چاوو ڕووی نابێ بچێتەوە لای بابیو لە میسر دەمێنێتەوە .

﴿وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلۡمٖ لِّمَا عَلَّمۡنَٰهُ﴾، بێگومان ئەو خاوەن زانیاریی بوو، واتە: خاوەن زانیارییەکی تایبەتو گەورە بوو، ﴿لِّمَا عَلَّمۡنَٰهُ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە ئێمە فێرمان کرد بووو شارەزامان کرد بوو، لە ڕێی وەحییەوە، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾، بەلام زۆربەی خەڵکی نازانن، واتە: زۆربەی خەڵکی نازانن کە باشترین جۆری زانست، ئەو جۆرەیە کە لە ڕێی وەحییەوە دێو لەلایەن خوای زاناو تواناوە، چونکە خوا ﷻ هەموو شتێك دەزانێو خاوەنی زانیاریی بێ سنوورە، کەواتە: لەو زانیارییە بێ سنوورو ڕەهایەی خۆی کە بە یەکێك لە بەندەکانی دەبەخشێ لە ڕێی وەحییەوە، ئەوە بێگومان باشترین پشكو بەشی لە زانیاریی دا هەیە، بەلام زۆربەی خەڵکی ئەو ڕاستییە نازانن .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** گەڕانەوەی کوڕەکانی یەعقووب، واتە: دە (١٠) کوڕەکەی بۆ لای باییان و ئاگادارکردنەوەی: کە ئەگەر بنیامینی برایان لەگەڵ نەنێرێ، ئازووخەیان نادرێتێ و، ناهێڵن ئازووخە بکڕن و بپێون، ئنجا داواکردنیان لە باییان کە لەگەڵیان بنێرێ و بەڵێندانیشیان: کە پارێزەری برایەکەیان دەبن:

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە پێنج برگەدا**

١) - ﴿ فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ ﴾، وەك گوتم: ئەوەی دیکە هەمووی پێچراوەتەوەو قرتێنراوە، چونکە: بە عەقڵ و سەلیقە دەزانرێ، واتە: لە میسرِ بەڕێکەوتن و بەس خوا دەزانێ چەند شەوو ڕۆژیان پێچوون ! سەرەنجام لەگەڵ کاروانی خەڵکی دیکەدا، کاروانەکەیان گەڕایەوە بۆ سەر زەمینی کەنعان و ناوچەی شام، ئنجا کاتێك گەڕانەوە بۆ لای باییان.

٢) - ﴿ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ ﴾، گوتیان: ئەی بابی خۆمان! پێوانمان لێ قەدەغەکراوە، پێشگیریی ئازووخە پێوانمان لێ کراوە، واتە: ناهێڵن بپێوین و پێمان نافرۆشن، کە نەفرۆشرا یانی: ناشپێورێ .

﴿ مُنِعَ مِنَّا ٱلْكَيْلُ ﴾، یانی: (مُنِعَ مِنّا أنَ نَكِيلَ، أو أنْ يُكالَ لَنا)، ﴿ مُنِعَ مِنَّا ٱلْكَيْلُ ﴾، یان پەیوەندیی بە (فاعِل)ەوە هەیە، واتە: كە ئێمە بپێوین، (أنَ نَكِيلَ) یاخود بە (مَفعول)ەوە هەیە، واتە: كە بۆمان بپێورێ (أنَ يُكالَ لَنا)، بەلاّم دیارە لێرەدا بەمانای پاڵدانیەتی بۆ لای (مَفعول) واتە: لێمان قەدەغە كراوەو پێشگیریی ئەوەمان لێكراوە، كە بۆمان بپێورێ، چونكە پێوانەكە بەدەست وان نەبووە، بەڵكو بەدەست ئەو كەسە بووە كە پێیان دەفرۆشێ، ئنجا ئەگەر پێیان نەفرۆشێ، مانای وایە ناشهێڵێ كە بۆیان بپێورێ .

لێرەش بە كورتیی باسكراوە، ئەگەرنا بێگومان بە تەفصیلْ قسەیان بۆ باباین كردوە، كە چی گوزەراوەو؟ چی بووەو؟ چۆن بووەو؟ چۆن ئەو بەرپرسەی ئازووخە لە میسرٍ لێی پرسیون؟ بە چ بەڵگەیەك‌و بە چ بیانووێكەوە گوتوویەتی: دەبێ برایەكەتانم بۆ بێنن، دیارە وردەكارییەكەیان بۆ بابی گێڕاوەتەوە، كە كورتەكەی ئەوە بووە: ئەگەر بێت‌و برایەكەیان لەگەڵ خۆیان نەبەن، ئازووخەیان چنگ ناكەوێ .

٣) - ﴿ فَأَرْسِلْ مَعَنَآ أَخَانَا ﴾، مادام وایە برایەكەمانمان لەگەڵ بنێرە (بۆ ئەوەی ئازووخەمان چنگ بكەوێ، گرانیی‌و قات‌و قڕیی بووەو، لە میسرِیش نەبێ ئازووخە چنگ نەكەوتوە).

٤) - ﴿ نَكْتَلْ ﴾، واتە: دەپێوین، یانی: ئازووخە دەكڕین‌و، دەیپێوین‌و باری دەكەین‌و دەیهێنینەوە .

خوێندراویشەتەوە: (يَكْتَلْ)، واتە: برایەكەشمان لەگەڵ ئێمەدا ئازووخە دەكڕێ‌و دەپێوێ، تاكو ئێستا دە (١٠) بار بووین، ئەوجار ئەویش دەپێوێ‌و باری یازدەیەمیش دێنینەوە لەگەڵ خۆمان.

٥) - ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾، بێگومان ئێمە بۆ وی پارێزەر دەبین .

لێرەدا پێنج جۆرە جەختكردنەوە بەكارهێنراون :

١ ـ هەم بە ڕستەی ناوی دەستی پێکردوە: ﴿ وَإِنَّا ﴾، کە چەسپاویی دەگەیەنێ .

٢ ـ بە پیتی تەئکید: ﴿ وَإِنَّا ﴾، چونکە لە ئەسڵ دا (إِنَّنا)یە .

٣ ـ ئنجا: ﴿لَهُۥ﴾، ئێمە بۆ وی .

٤ ـ ﴿لَحَٰفِظُونَ ﴾، (ل)، لامەکەش بۆ تەئکیدە .

٥ ـ هەروەها (حَافِظُون)یش، ئێمە پارێزەری وی دەبین .

پێنج جۆرە جەخت کردنەوەی تێدان، واتە: زۆر بە دڵنیاییەوە دڵنیابە کە ئێمە ئەو برایەمان دەپارێزین و پارێزەری دەبین و بە سەلامەتیی بۆت دێنینەوە، لەگەڵمان بنێرە، بۆ ئەوەی زەخیرەو ئازووخە بۆ ماڵو خێزانمان بێنینەوە .

**مەسەلەی دووەم :** وەڵامدانەوەی بابیان (یەعقووب ﷺ) بە تاڵیی و نیگەرانییەوەو بیرهێنانەوەی یوسوف بۆیان و، خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە کە تەنیا متمانەی بە پاراستنی خوا هەیە، خواش باشترین پارێزەرە، هەروەک بە بەزەیترینی خاوەن بەزەییانیشە :

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿قَالَ هَلۡ ءَامَنُكُمۡ عَلَيۡهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمۡ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبۡلُ فَٱللَّهُ خَيۡرٌ حَٰفِظٗاۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾﴾ .

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە سێ بڕگەدا**

١) - ﴿قَالَ هَلۡ ءَامَنُكُمۡ عَلَيۡهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمۡ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبۡلُ﴾، لێرەدا ﴿هَلۡ﴾، هەرچەندە ئامرازی پرسیارکردنە، بەڵام پرسیار کردنەکە بۆ نکووڵیی لێکردنەو، مانای لابردن (نفي)ی تێدایە .

دەگوترێ: (أَمِنتُكُم وَائتَمَنتُكُم أَي: اعتَبَرتُكُم أُمَناءَ عَلَيْهِ)، (أَمِنتُكُم وَائتَمَنتُكُم)، هەردووكیان یەك واتایان هەیە: من ئێوەم بە ئەمیندار دانا، واتە: لە بەرانبەر ئەودا، ئێوەم بە ئەمیندار دانا .

لێرەدا یەعقووب عليه السلام فەرموویەتی: ئەگەر بە ئەمیندارتان دابنێم بەرانبەر بە بنیامین، هەروەك بە ئەمیندار دانانی ئێوەیە بەرانبەر بە یوسوف، واتە: ئەگەر من لێتان دڵنیابم‌و متمانەتان پێ بكەم، هەروەك دڵنیابوون‌و متمانە پێكردنتانە، كاتێك بە نسبەت یوسوفەوە، ئێوەم بە ئەمیندار داناو متمانەم پێتان كرد، كە گوتتان: دەیپارێزین، یانی: ئەگەر بە تێرا دیتنی ئێوەو متمانە پێكردنی ئێوە بینێرم، ئەوە لە ڕاستییدا مانای وایە: من پەندم لەو هەڵوێستەی پێشوو وەرنەگرتوە، لەو هەڵەیەی پێشووم، كە ئێوەم بە ئەمیندار دانا بەرانبەر بە یوسوف‌و، ئەمیندارو پاكیش دەرنەچوون !

٢) - ﴿ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًا ﴾، هەر خوا باشترین پارێزەرە.

خوێنراویشەتەوە: (فاللهُ خَيرٌ حِفْظَاً)، واتە: خوا باشترین زاتێكە كە خاوەن پاراستن بێ، خاوەن پارێزگاریی بێ‌و پارێزگاریی لە شت بكات، واتە: ئەگەر خوا بیپارێزێ، ئەوە دەپارێزرێ، بەڵام ئەگەر خوا نەیپارێزێ، ئەوە متمانەم بە ئێوە نیە، كە بیپارێزن .

٣) - ﴿ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، ئەویش (خوا) بە بەزەییترینی بە بەزەییانە .

بێگومان بەزەیی خوا ﷻ بێ سنوورە، وەك لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: بەزەیی خوا بەرانبەر بە بەندەكەی، لە بەزەیی دایك بەرانبەر بە منداڵە شیرە خۆرەكەی، جگەر گۆشەكەی، زیاترە: (أَللَّه أرحم من هذه بولَدِها) متفق عليه .

هەڵبەتە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ كە یەعقووب دڵی نەرم بووە بینێرێ لەگەڵیان، ئاشكراشە كە ئاتاجیی‌و بێ ئازووخەیی پاڵنەر بووە، چونكە قات‌و قڕیی‌و گرانیی بووەو، دیارە دەبێ گرانییەكە ئەو ناوچەیەی هەموو

گرتبێتەوە، نازانین تاکو کوێی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست ئەو کاتە ڕۆیشتووە! بەڵام دیارە گرانییەکە شامی گرتۆتەوە، ڕەنگە عێراقو حیجازو ئەو ناوچانەی هەموو گرتبێتەوە، بە دڵنیایی حەوت وشکە ساڵیی و بێ دەرامەتیی و بێ کشتوکاڵیی، زەحمەتو فشارێکی گەورەی لەسەر دروست کردوون .

لە قسەکانی دا وا پێدەچێ کە دڵی نەرم بوو بێ، کە بە ناچاریی کوڕەکەیان لەگەڵ بنێرێ، بەڵام نەك بە دڵخۆشیی ئەوەوە کە ئەوان دەیپارێزن، لەبەر ئەوەی بەڵێن دەدەن، بەڵکو بە پشت بەستنی بە خواو، دڵخۆش بوونی بە بەزەیی خواو، پاراستنی خوا بۆی .

**مەسەلەی سێیەم :** کوڕەکان – دە (١٠) کوڕەکە - کاتێك بارەکانیان دەکەنەوەو دەستمایەکانیان لە نێو ئازووخەی کە لە نێو بارەکاندا بووە، دەبینن، ئەوە دەکەنە بەڵگەی ئیقناع کردنی باییان و دووبارە باسی پاراستنی برایەکەیان و، زیادکردنی بارێك ئازووخە بۆ ماڵو خێزانیان دەکەن، دەشڵێن: زیادکردنی ئەو بارە بۆ ئەو بەرپرسەی ئازووخە لە میسر، شتێکی ئاسانە، پیاوێکی سەخی تەبیعەتەو، پیاوێکی زۆر بە ماریفەتو جوامێرە، ئاسانە بارێکی یازدەیەممان بۆ زیاد بکات و، خۆیشی داوای کردوە ئەو برایەمان بەرین :

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا فَتَحُواْ مَتَٰعَهُمْ وَجَدُواْ بِضَٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْۖ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا نَبْغِيۖ هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَاۖ وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍۖ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴿٦٥﴾ ﴾ .

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە هەشت بڕگەدا**

**١) –** ﴿ وَلَمَّا فَتَحُواْ مَتَٰعَهُمْ ﴾، واتە: کاتێك بارەکەیان کردەوە .

هەر دە (١٠) بارەکانی بە بارێك لە قەڵەم داون، وا دیارە پێکەوە بارەکانیان کردۆتەوە .

(مَتَاعَ) بە هەر شتێك دەگوترێ کە بەهرەی لێوەربگیرێ، کەواتە: (مَتَاعَ)ەکە، ئەو ئازووخەیە بووە کە لەنێو بارەکەدا بووە، ئنجا ئازووخە ناکرێتەوە، بەڵکو (رَحْلَ)ەکە، کراوەتەوە، واتە: بار، ئنجا تێر بووە، جەواڵ بووە، شتێك بووە، ئازووخەکەیان تێدا هەڵگرتوە، دەمەکەیان کردۆتەوە بۆ ئەوەی ئازووخەکە سوود لێ ببینن‌و بیکەنە ئاردو باراش، یان: ساوارو گەنمە کوتاوو برۆیش، بیکەن بە خۆراك، کاتێك کە بارەکەیان کردۆتەوەو ئازووخەکەیان بینیوە .

لێرەدا کە دەفەرموێ : ﴿فَتَحُواْ مَتَٰعَهُمۡ﴾، یانی: ئەو بارەیان کردەوە کە (مَتَاعَ)ەکەی تێدایە، کە ئازووخەکەیە، ئەمە وەك پێشتریش گوتمان: (مِن تَسمِيةِ الشيءِ باسم الحَالِّ فِيهِ)، ناونرانی شتێکە، بەو شتەوە کە تێیدایە، وەك چۆن ناوی ئاوەدانییەك دەهێنرێ‌و مەبەست پێی خەڵکەکەیە: (فَسأَل القَريَة)، (قَريَة) بە خانووەکان دەگوترێ، کەسیش لە خانووو دیوار ناپرسێ، بەڵکو مەبەست پێی ئەو خەڵکەیە کە لە نێو دێیەکە دان .

جاری واش هەیە ئەو شتەی کە لە نێو شتەکە دایە دەکرێتە ناو: (﴿وَلَمَّا فَتَحُواْ مَتَٰعَهُمۡ﴾: أَي: فَتَحُوا رَحلَهُم الَّذِي فيهِ مَتَاعَهُم)، یانی: ئەو بارەیان کردوە، کە ئەو شتەی لێی بەهرەمەند دەبن، کە ئازووخەکەیە، تێیدایە .

٢) - ﴿وَجَدُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ رُدَّتۡ إِلَيۡهِمۡۖ﴾، دەستمایەکەیانیان بینی، ئەوەی بازرگانییان پێ دەکرد، بۆیان گێڕراوەتەوە، (بِضَاعَة)، دراوە، یان هەر کەلوپەلێکە کە بۆ بازرگانیی پێکردن دادەنرێ، هەم پارەو دراو دەگرێتەوە، هەم ئەو شمەکەش کە لە بەرانبەر ئەو شتەدا کە دەیکڕی، دەدرێ، ئەویش دەگرێتەوە، یانی ئەمە دەق نیە لەسەر ئەوە کە (بضاعة)کە حەتمەن دراوو پارە بوو بێ، وەك لە پەیمانی کۆندا هاتوە دەڵێ: درەمی زیو بوون‌و لە نێو پرێسکەیەکەوە بەستراون، دەڵێ: کە دەمی جەواڵەکانیان، بارەکانیان

كردۆتەوە، تەماشا دەكەن: پڕێسكەكانیان كە درەمەكانیان تێدایە، لە زاری جەواڵەكە دان.

٣) - ﴿قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا مَا نَبْغِى﴾، گوتیان: ئەی بابی خۆمان ! ئێمە چی دیكە دوای ئەمە داوا بكەین ؟ واتە: چی دیكەمان دەوێ، یانی: (ما) بە مانای پرسیاركردنی نكوولێیكەرانە (الإستِفهامِ الإنكاري)یە، ﴿مَا نَبْغِى﴾، واتە: (أيَّ شيءٍ نَطلُب بَعدَ هَذَا ؟)، چی دیكە دوای ئەو داوا بكەین، تاكو تۆ دڵنیابی كە ئێمە ئەو سەفەرەمان بە سەلامەتیی دەكەین ؟

دەشگونجێ (ما)، (نافية)، بێ ﴿مَا نَبْغِى﴾، یانی: (ما نطلب شيئاً)، دوای ئەوەی ئەو دەستمایەشیان بۆ ناردووینەوەو بۆیان خستووینە نێو بارەكان، هیچی دیكە داوا ناكەین، بۆ دڵنیا بوون لەوەی كە ئەم سەفەرەمان (إن شاء الله) سەفەرێكی سەلامەت دەبێو، برایەكەمان بە سەلامەتیی دەهێنینەوەو بارێكیش زیاد دەكەینو، بیانووی ئەو بەرپرسەی ئازووخەی میسریش دەبڕین، چونكە گوتوویەتی: تاكو برایەكەتان نەهێنن، چاوەڕێی ئازووخەو ئازووخە پێوران‌و پێفرۆشران مەكەن .

٤) - ﴿هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا﴾، ئا ئەمە دەستمایەكەمانە، بۆ لامان گێڕدراوەتەوە، یوسوف عليه السلام وەك لە دەرسی پێشوودا گوتمان : ﴿وَقَالَ لِفِتْيَٰنِهِ ٱجْعَلُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ فِى رِحَالِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٦٢﴾﴾، بە گەنجە بەردەستەكانی خۆی گوت: دەستمایەكەیانیان بۆ بخەنە نێو بارەكانیان، بەڵكو بیناسنەوە كە گەڕانەوە بۆ لای ماڵو خێزانیانو كەسوكاریان، بەڵكو بگەڕێنەوەو ببێتە هاندەریان .

ئەوەتا كوڕەكانی یەعقووب ئەو نرخ بۆ گێڕانەوەیان، دەكەنە بەڵگەو پاساوی ئەوەی بابیان دڵنیابێ، كە ئەو سەفەرەیان سەفەرێكی سەلامەت دەبێ، كەواتە: با برایەكەیان لەگەڵ بنێرێ .

٥) - ﴿وَنَمِيرُ أَهْلَنَا﴾، واتە: (أي نأْتيهِم بالميرة)، (المِيرة: الطّعام المَجلُوب)، (حيرة) خۆراكى هێنراوە، واتە: ئازووخەش بۆ ماڵو خێزانو کەسوکارمان دێنین .

٦) - ﴿وَنَحْفَظُ أَخَانَا﴾، برایەکەشمان دەپارێزین، ئەمە وەك دڵنیاکردنەوەو جەخت کردنەوەیە، کە زۆر مەبەستیشیانە برایەکەی خۆیان بپارێزن .

٧) - ﴿وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ﴾، باری حوشترێکیش زیاد دەکەین، دیارە ئەو وڵاخانەی کە پێیان بوون، حوشتر بوون، ڕێیەکەیان ڕێیەکی دوور بووە، ئەو ڕێیە دوورەش هەر بە حوشتر دەبڕدرێ، چونکە بیابانیش بووە، ئنجا تاکو لە میسرەوە دەچن بۆ شام، ئەوە بە حوشتر نەبێ نابڕدرێو، بە حوشتریش گوتراوە: (سَفينة الصَّحراء)، کەشتیی بیابان، چونکە حوشتر چەند ڕۆژان دەتوانێ بە بێ خواردنو ئاو بژی، تواناو تەحەممولێکی زۆری هەیە بۆ بە ڕێ دا ڕۆیشتن، بۆ سەرما، بۆ گەرما، بۆ بە نێو لمو بیاباندا ڕۆیشتن، کوڕەکان دەڵێن: ئێمە باری حوشترێکیش زیاد دەکەین، بەڵام لێرەدا نەیانگوتوە: (وَنَزدَادُ حِمْلَ بَعِيرٍ)، (حِمْلْ)، واتە: بار، بەڵکو گوتوویانە: ﴿كَيْلَ بَعِيرٍ﴾، واتە: ئەو بارە ئازووخەیەی دەپێورێو دەخرێتە سەر پشتی حوشترێك، کە بریتیە لەو بارەی کە بەهۆی بنیامینەوە چنگیان دەکەوێ، کە تاکو ئێستا دە (١٠) بار بوون، ئنجا دەبنە یازدە (١١) بار.

٨) - ﴿ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ﴾، ئا ئەو باری یازدەیەمە، ئەو ئازووخەیە کە دەپێورێ بۆ بنیامین، ئەوە بارێکی ئاسانو کەمە، واتە: کەمە بە نسبەت ئەو بەرپرسەی ئازووخە لە میسر، کە بماندارتێو پێمان ببەخشێ، کەواتە :

١- ئەمجارەش دەچینەوە بۆ ئازووخە .

٢- برایەکەشمان دەپارێزین .

٣- بارێکیش زیاد دەکەین .

٤- ئاسانیشە ئەو بارەی کە زیادی دەکەین، چنگمان بکەوێ، دیارە زۆریان لەو بەرپرسەی ئازووخەی میسر ڕا بینیوەو تێڕابینینەکەشیان لە جێی خۆیدا بووە .

**مەسەلەی چوارەم :** مەرج گرتنی بابیان کە سوێندی بۆ بە خوا بخۆن‌و بەڵێنی پێبدەن کە مەگەر هیچ چارەیان نەبێ، ئەگەرنا برایەکەیان بهێننەوەو بەڵێندانیان بە بابیان بەو شێوەیە کە داوای لێکردوون :

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ اللَّهِ لَتَأْتُنَّنِي بِهِ إِلَّا أَن يُحَاطَ بِكُمْ ۖ فَلَمَّا آتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ اللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٦٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا**

1) - ﴿ قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ اللَّهِ لَتَأْتُنَّنِي بِهِ ﴾، واتە: (یەعقووب، بابیان ﷺ) گوتی: هەرگیز لەگەڵتاندا ناینێرم، ﴿ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ اللَّهِ لَتَأْتُنَّنِي بِهِ ﴾، هەتا بە ناوی خواوەو لەلایەن خواوە، بەڵێنێکی پتەوم پێ نەدەن، کە بە دڵنیاییەوە بۆم دەهێننەوە .

2) - ﴿ إِلَّا أَن يُحَاطَ بِكُمْ ﴾، مەگەر دەورتان بدرێ، ئابڵووقە بدرێن .

کە لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە ئەگەر هیچ چارەو دەرەتانتان نەبێ‌و، هۆکارێکی لە تواناو بڕستی خۆتان بەدەر بێ‌و بێ چارەتان بکات، ئەو جار ئەگەر نەیهێننەوە، مانای وایە پەیمانتان نەشکاندوە، ئەگەرنا بە پەیمان شکێن لە قەڵەم دەدرێن‌و بەڵێنەکەتان نەبردۆتە سەر.

پێشتریش هێنامان: (محمد الطاهر بن عاشور) دەڵێ: {المَوثِقُ: مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ للتوثيق، أُطْلِقَ هُنا عَلَى المَفْعُول، وَهُوَ ما بِهِ التوثِيق، يَعْنِي اليَمِين،

وَمِنَ اللّٰهِ صِفَةٌ لـ (مُوثِقاً) صَادِراً مِنَ اللّٰهِ تَعَالَى، بأَن يَجْعَلُوا اللّٰه شَاهِداً عَلَيْهِم فِيمَا وَعَدُوا بِهِ، بأَن يَحْلِفُوا بِاللّٰهِ، فَتَصِير شَهَادَةُ اللّٰهِ عَلَيْهِم كَتَوثِيق صَادِر مِنَ اللّٰه تَعَالَى بِهَذَا الإعْتِبَار، وَذَلِكَ أَن يَقُولُوا: لَكَ مِيثَاقُ اللّٰهِ أَو عَهْدُ اللّٰهِ}[1].

واتە: (موثِق) چاوگێکی میمییە لە (توثیق)ەوە هاتوە، یانی: (وَثَّقَ يُوَثِّقُ توثِيقاً وَموثِقاً)، ئەویش هەر چاوگە وەك چۆن (توثیق) چاوگە، واتە: پتەوکردن، (موثِق)یش، بە هەمان شێوە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی پەیمانێکی پتەوەو بە مانای (مَفعول) بەکارهاتوە، ئنجا لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە کە پەیمانەکەی پێ پتەو دەکرێ، کە بریتیە لە سوێند، کە دەڵێ: (مِنَ اللّٰه)، ئەوە سیفەتە بۆ ئەو بەڵێنو پەیمانە پتەوەیە، واتە: ئەو بەڵێنو پەیمانە پتەوە لە خواوە پەیدا دەبێ، کە خوا ﷻ بکرێتە شایەد لەسەر ئەوەی بەڵێنی لەسەر دەدەن بە بابیان، کە سوێند بە خوا بخۆن، بە شێوەیەك کە شایەدییدانی خوا لەسەریان، وای لێ دێتەوە کە: ئەو پەیمانە پتەوە، لە خواوە ﷻ دەرچووە، بۆ وێنە کە بڵێن: (لَكَ ميثاقُ اللّٰهِ أو عَهدُ اللّٰهِ)، پەیمانی خوا، بەڵێنی خوا بۆ تۆ بێ، لەسەر ئێمە، (کە ئێمە ئەو کوڕە بە سەلامەتیی بێنینەوە).

کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمۡ ﴾، وەك پێشتریش گوتمان: مەگەر دەورە بدرێن، عادەت وایە کە شتێك دەورەو ئابڵووقە درا، ڕێی هەڵاتنو دەربازبوونی نیە، واتە: مەگەر بێ چارەو بێدەرەتان بکرێن، بارودۆخێکی واتان بۆ بێتە پێشێ، هیچ چارتان نەبێ، نەك بەهۆی کەمتەرخەمییتانەوە: کوڕەکەم شتێکی لێبێ، ئەگەر هیچ کەمتەرخەمییتان نەبوو، ئەو کاتە مانای وایە ئەوە هەڵداوێردرێ لەوە، کە ئێوە پەیمان شکێن بوون، ئەو کاتە بە پەیمان شکێن لە قەڵەم نادرێن .

---

١) التحرير والتنوير ج ١٣، ص ١٩.

٣) - ﴿فَلَمَّآ ءَاتَوۡهُ مَوۡثِقَهُمۡ﴾، کاتێك کە پەیمانەکەی خۆیانیان پێدا، واتە: بەو شێوەیەی کە بابیان داوای لێکرد بوون، ئاوا بەڵێنو پەیمانیان پێدا .

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە دروستە ئەگەر ئینسان لە کەسێك لە کۆمەڵێك دڵنیا نەبوو، سوێندیان پێ بخواتو پەیمانیان لێوەربگرێو لێیان جەخت بکاتەوەو، چۆن دڵنیا دەبێ ئاوا شتیان پێ بنووسێ، وەك دیکۆمێنت لای بێ، ئەمە هەرچەندە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە باسی کرابێ، بەڵام ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەیە کە ئینسان ئەگەر لە کەسێك، یاخود لە کۆمەڵێك دڵنیا نەبوو، بۆی هەیە چۆن دڵنیای بکەنەوە، داوایان لێبکات کە دڵنیای بکەنەوە .

کە لەم ڕۆژگارەشدا شێوەی (توثیقُ)و دیکۆمێنت کردن هەر زۆر زۆر بووە :

١ – پەنجە مۆریان پێ بکات .

٢ – پێیان ئیمزا بکات .

٣ – بە دەنگو وێنە قسەکانیان لێوەربگرێ .

٤ – بارمتەیان لێوەربگرێ .

٥ – سوێندیان پێ بخوات .

٦ – پێیان بنووسێ .

هەرچۆنێکی ببێتە مایەی زیاتر دڵنیاکردنی وی، بۆی هەیە، چونکە ئەوەتا پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوا کە یەعقووبە ﷺ بەرانبەر بە کوڕەکانی خۆی، ئاوا بەو شێوەیە دوور بینیی کردوەو ویستوویەتی دڵنیای بکەنەوە، کەواتە: دروستە کەسێك هۆکارەکانی دڵنیایی بۆ خۆی برەخسێنێ، لە کاتی مامەڵەکردن یان هەر جۆرە هەڵسوکەوت کردنێك، لەگەڵ هەر کەسێکدا، کە پێویستیی بەوە بێ دڵنیای بکاتەوە، داوای دڵنیا کردنەوەی لێ بکات .

ئنجا دواى ئەوەی بەو شێوەیە پەیمانەکەیانو بەڵێنەکەیان پێدا، کە بابیان داوای کرد بوو.

٤) - ﴿قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾، (یەعقووب) گوتی: خوا لەسەر ئەوەی کە ئێمە دەیڵێین: (وَكِيل) بێ، واتە: کار پێسپێردراوو شایەدو ئاگادار بێ، کە نەچن کارێك بکەن، دوایی وێڕای پەیمان شکاندن لەگەڵ من دا، خوای پەروەردگاریش لە خۆتان تووڕە بکەن .

**مەسەلەی پێنجەم :** ئامۆژگاریی کردنی یەعقووب ﷺ بۆ کوڕەکانی کە هەموویان لە یەك دەروازەوە نەچنە نێو شارو، جەخت کردنەوەی لەسەر ئەوە کە بڕیار هەر هی خوایە، هەرچی خوا بیەوێ، دێتە دیو، ڕێنمایيو ئامۆژگاریی وی بۆ کوڕەکانی، هیچ لەو نەخشەو پلانە ناگۆڕێ کە بە ویستی ڕەهای خوای پەروەردگار جێبەجێ دەبێ، بەڵام دیارە دەست بە هۆکار گرتنیش، هەر لە نێو ویستی ڕەهای خوای توانا دایە :

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدْخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدْخُلُواْ مِنْ أَبْوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغْنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍۖ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُۖ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ٦٧﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە حەوت بڕگەدا

١) - ﴿وَقَالَ يَٰبَنِيَّ﴾، (یەعقووب) گوتی: ئەی کوڕەکانم! یانی: ئەی یازدە کوڕەکەم! جگە لە یوسوف کە لەگەڵیاندا نەبووە، ئەو جار بنیامینیشیان کەوتە گەڵ، ئەی کۆمەڵە کوڕەکەم !

٢) - ﴿لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ﴾، لە یەك دەرگاوە، كە ئەو كاتە بە كوردیی زیاتر دەروازەی پێ گوتراوە، بەڵام دەرگاشی هەر پێ دەگوترێ، لە زمانی عەرەبی دا: (باب) هەم بە مانای دەرگای ژوورێك بەكاردێ، هەم بە مانای دەروازەی شارێكیش دێ، بەڵام ئێمە لە كوردییدا كەمتر وایە بڵێین: لە دەرگای شارەكەوە چووە ژوورێ، دەرگا زیاتر بۆ ژوور بەكاری دێنن، بۆیە ئەگەر بڵێین: دەروازە باشترە .

كوڕەكانم ! لە یەك دەرگاوە مەچنە ژوور، واتە: مەچنە ژوور شار، دیارە ئەو شارە كە پایتەختی میسری خواروو بووە، ئەو كاتە بە دەست ئەو نەتەوەیە بووە، كە هەكسۆسیان پێگوتراوە، یان پادشا شوان كارەكانیان پێ گوتراوە، پایتەختەكەی شاری (مەنفیس) بووە، كە لە گەورەترین شارەكانی دنیا بووە، لەو كاتەداو، چەندان دەروازەی هەبوون، ئنجا ئەو كاتە شارەكان، هەموویان وا بوون: قەڵایان بە دەورەوە كراوە، ئنجا شوورەیان هەبووەو، شوورەكان بورجیان لەسەر بووەو، بورجەكانیش ئێشكچیی‌و پاسەوانیان لەسەر بووە، لە دەروازەكانەوە نەبێ هیچ كەس نەیتوانیوە بێتە ژوور، دیارە بۆ خۆ پاراستن لە دوژمنان وایان كردوە .

٣) - ﴿وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖ﴾، ئنجا لە چەند دەروازەی جیا جیاوە، وە ژوور بكەون، بچنە ژووری شارەكە، هەر یەكێك لە دەروازەیەكەوە، دیار نەكراوە ئەو شارە چەند دەروازەی هەبوون؟ بەڵام بە تەئكید هێندەی دەروازە هەبوون كە بە كۆ ناو بهێنرێن، ئنجا سێ بوون، چوار بوون، دە بوون، كەمتر بوون، دیار نیە .

٤) - ئنجا كە ئەو ئامۆژگاریی‌و ڕێنماییەشیان دەكات، ئەو ڕاستییەشیان دەخاتەوە یاد، كە هەر ئەوە شایستەی پێغەمبەرێكی پایە بەرزی وەك یەعقووبە عليه السلام، كە هەمیشە ئاگای لەلایەنی خوای پەروەردگار بێ‌و، هەمیشە ئاگای لەوە بێ، كە خەڵك پێی وا نەبێت لەگەڵ هۆكارەكانی ڕەچاوكردن، تازە بە مەرام دەگات‌و بە ئامانج دەگات ! بەڵكو ئەوە ویستی

ڕەهای خوایە كە هۆكارەكانیش كار پێ دەكات، ئنجا كاتێك تۆ هەندێ هۆكاران دەگری، ڕەنگە ئاگات لێ نەبێ: هەندێ هۆكاری دیكەی پەنهانی پێچەوانەی ئەو هۆكارانە، مەفعوولی ئەو هۆكارانە هەڵبوەشێننەوە، بۆ وێنە: كەسێك هەموو هۆكارەكانی تەندروستیی دەگرێتە بەر، بەڵام ئاگای لێ نیە هۆكارێكی دیكەی پەنهانی دژی ئەو هۆكارانەی تەندروستیی هەیە، لەوان بەهێزترەو بەسەر ئەو هۆكارانەدا زاڵ دەبێ ! بەڵام هەموویان: چ هۆكارە ئاشكرایەكان كە تۆ دەیانگریەبەر، چ هۆكارە پەنهانەكان، كە تۆ نایانگریە بەرو لێیان بێئاگای، ویستی خواو زانیاریی خواو دەسەڵاتی خوا، دەورەی هەموویانی داوە، بۆیە دەڵێ: ﴿ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ ﴾، من لە بەرانبەر خوادا، لە بەرانبەر ویستی ڕەهای خوادا، هیچ سوودێكتان پێ ناگەیەنم .

واتە: لە پشت هۆكارەكان (أسباب)ەوە هۆكارساز (مُسَبِّبُ الأسباب) هەیە، ڕەخسێنەری هۆكارەكانیش هەیە، وەك هۆكارەكان هەن، ڕەخسێنەری هۆكارەكانیش هەیە .

هەڵبەتە دوایی كورتە باسێك لەوبارەوە دەكەین، كە مەبەست ئەوە نیە هۆكارەكان سوودیان نیە، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە یەعقووب دەیەوێ ئاگاداریان بكاتەوە: ئەوەی كە من پێتان دەڵێم، هۆكارێكە بیگرنەبەر، بەڵام دیسان ئەگەر خوا بیەوێ شتێكتان بەسەر بێنێ، هەرچەندە ئەو هۆكارەی ئێوە ڕۆڵی خۆی دەبینێ، بەڵام دەبینێ هۆكارێكی دیكەی، یان چەند هۆكارێكی دیكەی پەنهان هەن، كە كاریگەریی ئەو هۆكارەی ئێوە گرتووتانەتە بەر، هەڵیدەوەشێنێتەوەو پووچەڵی دەكاتەوە، مەبەست پێی ئەوەیە، كە دەڵێ: ﴿ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ ﴾: (أُغْني)، لە (غَناءَ)ەوە هاتوە، (غَناء)یش، واتە: كەلێن بۆ گرتن، قەرەبوو كردنەوە، دەور بۆ بینین، واتە: من هیچ سوودێكتان پێ ناگەیەنم لە بەرانبەر ویستی خوادا، لە بەرانبەر بەڵاو نەخشەو پلانی خوادا، ئەگەر خوا بیەوێ سەلامەت نەبن، تەنیا بەو ئامۆژگارییەی من سەلامەت نابن، بەڵام ئەوەش هۆكارێكە، دەبێ بیگرنە بەر .

کە دەفەرموێ: ﴿ مِن شَیْءٍ ﴾، (مِن)ی بۆچی خراوەتە سەر؟ تاکو هەموو جۆرە شتێك بگرێتەوە، یانی: هەر شتێك هەرچەندە بچووکیش بێ، سوودتان پێ ناگەیەنێ، سوودێکی بچووکیشتان پێ ناگەیەنێ، لە بەرانبەر ویستی ڕەهای خوادا .

٥) - ﴿ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ﴾، بڕیار تەنیا هی خوایە، لێرەدا (ٱلْحُكْمُ)، بە مانای: (التَصَرُّفُ والتقدیر)، دەست تێوەردان و بڕیاردان و هەڵسووڕاندن و ئەندازەگیریی کردن، ئەوە تەنیا هی خوایە ﷻ .

لێرەدا (حُکم)، بە مانای حوکمی شەرعیی نیەو، بێگومان بە مانای حوکمی قەدەرییە، واتە: بڕیارو تەصەڕڕوف تەنیا هی خوایە .

کە دەشفەرموێ: ﴿ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ﴾، (إن نافیة)یە، یانی: (ما الحُکمُ إلاّ للهِ)، بڕیار بەس هی خوایە ﷻ، بڕیار نیە مەگەر بۆ خوا، ئەم تەعبیرەش بڕیارو تەصەڕڕوف لە خوای پەروەردگاردا کورت هەڵدێنێ .

٦) - ﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ﴾، مادام بڕیار هەر هی خوا بێ، خوا هەمەکارەی کەون و کائینات بێ، کەواتە: شایستەی ئەوەیە کە هەر پشت بەو ببەسترێ و، هەر دڵ بەو خۆش بکرێ، ﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ﴾، ئنجا لێرەدا (جارّو مجرور) کە پێش (فعل) و (فاعل) دەکەوێ، کورت هەڵهێنان دەگەیەنێ، واتە: بەس پشتم بەو قایمەو بەس پشتی خۆم بەو سپاردوەو بەستوە، تەنیا ئەوم کردوە بە کار پێسپێردراوی خۆم .

٧) - ﴿ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴾، هەروەها پشت بەستووان با تەنیا پشت بەو ببەستن، تەنیا کاری خۆیان بەو بسپێرن .

لێرەشدا دیسان کە (جارّو مجرور) پێش خراون، مانای کورت هەڵهێنان دەگەیەنێ .

**مەسەلەی شەشەم‌و کۆتایی :** چوونە نێو شاری، هەر یازدە (١١) کوڕەکە، بە گوێرەی ڕێنمایی بابیان (یەعقووب) واتە: لە دەروازەی جیا جیاوە، کە بێگومان ئەو ڕێنماییەی هیچ سوودی لە بەرانبەر ویستی خوادا پێ نەدەگەیاندن، بەڵام ئەوە هەر پێویستییەک بوو یەعقووب لە دڵی دابوو کە بە کوڕەکانی بڵێ، تاکو بە وریایی مامەڵە بکەن، هەر ئەوەی ئەنجام داوە، ئەگەرنا هیچ لە بڕیاری خوا ناگۆڕێ، چۆن خوای بەرز ویستی بوو، چۆن لە بڕیاری خوادا هەبوو، هەر ئەوە هاتە دی، کە بریتی بوو لەوەی یەعقووب بنیامینی کوڕیشی لە میسرِ گل بدرێتەوە، بەڵکو کوڕە گەورەکەشی {کە ناوی (یەهوزا) بووە بە پێی پەیمانی کۆن}، ئەویش دیسان گل بدرێتەوە، واتە: ئەو هەر لە بنیامین دەترسا، بەڵام یەهوزاش گل درایەوە لە میسرِو ئەویشی لێ دوورکەوتەوە، پاشان خوا ڕایدەگەیەنێ کە یەعقووب زانا بوو بەهۆی فێرکردنی تایبەتی خواوە، هەرچەندە زۆربەی خەڵکی نازانن :

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغْنِي عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِي نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَاۚ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە پێنج بڕگەدا**

**١) -** ﴿ وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم ﴾، ئنجا کاتێك وەژوور کەوتن، واتە: چوونە نێو شارەکە بەو جۆرەو لەو شوێنەوە کە بابیان فەرمانی

پێکرد بوون، (حَيْثُ )، دەڵێ: (ظَرفُ مَكانٍ بِمَنزِلَة حِين فِي الزَّمان، وَهِيَ اسْمُ مَبني)، (حَيْثُ )، ناوە بۆ شوێن هەروەك چۆن (حين)، ناوە بۆ كات، واتە: كاتێكی نەزانراو، یاخود شوێنێك كە نەزانراو بێ‌و، (مَبني)یشە، واتە: هەمیشە هەر دەگوترێ: (حَيْثُ )، (حين)ش، بە هەمان شێوە هەر دەگوترێ: (حينَ)، هەردووكیان (مَبنيّ)ن، واتە: یەك حاڵەتی (إعراب) بە خۆوە دەگرن .

كاتێك چوونە نێو شارەكەوە لەو شوێنەوە كە بابیان فەرمانی پێكرد بوون، ئەو شوێنە كوێ بوو؟ دەروازەی جیا جیا بوون، نەك یەك دەروازە، (أَي دَخَلوا مِنَ الجِهَة أَو الجِهاتِ الَّتِي أَمَرَهُمْ بِها أَبوهُم، وَهِيَ الأَبوابُ المُتَعَدِّدَة)، یانی : لەولایەوە یان لەو لایانەوە كە بابیان فەرمانی پێكردبوون، كە دەروازە جۆراو جۆرەكان بوون، چوونە ژوور، ئنجا ئەو ڕستەیەی كە پاڵ دەدرێتە لای (حَيْثُ )، ماناو چەمكی (حَيْثُ )، كە ناوی شوێنە، ڕوون دەكاتەوە .

كە دەفەرموێ: ﴿مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم﴾، لەو شوێنەوە كە بابیان فەرمانی پێكردن، بابیشیان فەرمانی پێكرد بوون كە لە دەروازەی جۆراو جۆرەوە بچنە ژوور، نەك لە یەك دەروازەوە، واتە: ئەمجارە فەرمانی بابیان، زۆر پیاوانەو جوامێرانە جێبەجێ كرد .

**٢) -** ﴿مَّا كَانَ يُغْنِي عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ﴾، واتە: ئەو شێوە چوونە ژوورە، كە بە پێی فەرمانی بابیان بوو، هیچ سوودی لەلایەن خواوە پێ نەدەگەیاندن، واتە: ئەگەر خوا سەلامەتیی بۆ بڕیار نەدابان، بەو چوونە ژوورەی كە فەرمان پێكراوی بابیان بوو، ئەو چۆنیەتییە چوونە ژوورە، سەلامەت نەدەبوون .

مەبەست لەم ڕستەیە ئەوەیە كە شتەكان هەموو ببەسترێنەوە بە ویستی ڕەهای خوای پەروەردگارەوەو، چاو لەسەر هۆكارەكان چڕدا نەگرین، دەستیان پێوە بگرین، بەڵام دڵیان پێوە نەبەستین، دڵنیا بین كە لە پشت

هۆكارەكانـەوە، هۆكـار سـازیش هـەیـە، كـە خـوایـە ﷻ، هـەروەهـا جگـە لـەو هۆكارانـەی كە ئێمـە دەیـانـبیـنیـن، هۆكاری دیكـەی پەنهانیش هـەن، كـە خـوا دەیـانزانـێ‌و ئێمـە نـایـانزانیـن، ئنجا تۆ ئـەگـەر هـەمـوو هۆكـارە زانراوەكـانیش بگریـە بـەر، ئـەدی هۆكـارە پەنـهانـەكـان! كـە زۆرجـار هۆكـارە پەنهانـەكـان مـەفعـوولی هۆكارە زانـراوو بـەرهـەستـەكان نـاهێڵن، بۆیـە ئـەو دەرەنجامـەی كـە بـە ڕواڵـەت دەبـێ بكـەوێتـەوەو، ببێتـە بـەرهـەمی ئـەو هۆكـارە دەستـەبـەر كـراوانـە، ئـەو ئـەنجامـە نـایـەتـەدی، لـەبـەرچی؟ نـەك لـەبـەرئـەوەی هۆكـارەكـان سـوودیـان نیـە، وەك دوایـی بـاسـی دەكـەین، بـەڵكو لـەبـەر ئـەوەی هۆكـاری دیكـە پەنهـان هـەن، كـە ئێمـە لـێیـان بـێ ئـاگـا بـووین .

**٣) -** ﴿إِلَّا حَاجَةً فِي نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَا﴾، واتــە: هــیچ ســـوودی پـێ نـەدەگـەیـاندن، ئـەو شێوە چوونـە ژوورە، (یـان ئـەو ئـامۆژگـارییـەو ڕێنمـایـیـەی بـابیـان)، لـە بـەرانبـەر ویسـتی خـوادا، بـەڵام پێویستییـەك بـوو لـە دڵی یـەعقووبـدا جێبـەجێی كـرد .

پسـپۆڕانی زمـان گوتوویانـە: {الإِسْتِثْنَاءُ فِي (إلاَّ حَاجَةً) مُنقَطِعٌ، لأنَّ الحَاجَةَ الَّتِي فِي نَفْسِ يَعقُوب، لَيْستْ بَعْضَاً مِن الشيءِ المَنْفيِّ إغناؤه عَنْهُم مِنَ اللّٰهِ، فَالتَّقْدِيرُ: لكِنْ حَاجَةً فِي نَفسِ يَعقُوبَ ﵇ قَضَاهَا)، واتــە: ئـەو هـەڵاواردنـەی كـە لـە ﴿إِلَّا حَاجَةً﴾دا هـەیـە، هـەڵاواردنێكی دابڕاوی پـێ دەڵێن، نـەك پەیوەست، {چونكـە (الإستثناءِ المنقطع)، ئـەوە یـەكـە ئـەوەی جیـا دەكرێتـەوە، لـە جینسی ئـەوە نـەبـێ كـە لـێی جیاكراوەتـەوە، بـەڵام (الإستثناءِ المُتَّصل)، ئـەوەیـە كـە جیـاكـراوەكـە، لـەگـەڵ لـێ جیـاكـراوەكـەدا، یـەك جـۆر بـن، بـۆ نـموونـە: ئـەگـەر گـوتـرا: (جَاءَ القَومُ إلاَّ مُحَمَّدٌ)، ئـەوە هـەڵاواردنـی پەیوەستی پـێ دەڵێن، بـەڵام ئـەگـەر گـوتـرا: (جَاءَ القَومُ إلاَّ الحِمار)، دیـارە (حِمار)، لـە جۆری خـەڵكـەكـە نیـە، بۆیـە پـێی دەگوترێ: هـەڵاواردنێكـی لـێـك پچـڕاو، یـاخـود هـەڵاواردنێكـی لێـك دابـڕاو} ئنجا لـە ئـایـەتـەكـەشدا :

چونکە ئەو ﴿ حَاجَةً ﴾، کە لە دڵی یەعقووب دا بووە، بریتی نەبووە لەو شتەی نەفی کراوە، کە لە بەرانبەر خوادا سوودیان پێ بگەیەنێ، {واتە: شتە نەفی کراوەکە لە بەرانبەر ویستی خوادا، کە سوود ناگەیەنێ، ئەو پێویستییەی لە دڵی یەعقووب دا بووە، بەشێك نەبووە لەو}، کەواتە: هیچ سوودی پێ نەگەیاندن ئەوەی کە یەعقووب ﷵ گوتی: لە بەرانبەر ویستی خوادا، بەڵام تەنیا یەعقووب پێویستییەك لە دڵی دا بوو، جێبەجێی کرد .

کە بریتی بوو لە دڵسۆزیی نواندن بۆ کوڕەکانی‌و ئامۆژگاریی کردنیان‌و سوور بوون لەسەر سەلامەتییان، ئیدی ئەو چی لە توانای دا هەبوو جێبەجێی کرد، بەڵام هەر ئەوە هاتە دی کە خوا ﷻ دەیویست، نەك لەبەر ئەوەی ئەو هۆکارەی یەعقووب گوتبووی، ناکاریگەر بووو سوودی نەبووو! نا، بەڵکو لەبەر کۆمەڵێ هۆکاری دیکە، کە یەعقووب‌و کوڕەکانیشی‌و هیچ کەس ئاگای لێیان نەبوو، تەنیا خوای زاناو تواناو پەنهانزان ئاگای لێیان هەبووو، لە نەخشەی ئەزەلیی‌و گشتگیری وی دا هەبوون .

کە دەفەرمووێ: ﴿ إِلَّا حَاجَةً فِي نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَاهَا ﴾، گوتراوە: (القَضَاء: الإِنْفَاذُ، وَمَعْنَى قَضَاهَا أَنْفَذَهَا، يُقَالُ: قَضَى حَاجَةً لِنَفْسِهِ، إِذَا أَنْفَذَ مَا أَضْمَرَهُ فِي نَفْسِهِ، أَي: نَصِيْحَةً لأَبْنَائِهِ، أَدَّاهَا لَهُم وَلَم يَدَّخِرْهَا عَنْهُم، لِيَطْمَئِنَّ قَلْبُهُ بِأَنَّهُ لَمْ يَتْرُك شَيْئاً يَظُنُّهُ نَافِعاً إِلاَّ أَبْلَغَهُ إِلَيْهِم) .

(قضاء) لێرەدا بە مانای جێبەجێ کردنە، {هەڵبەتە (قضاء)، جاری وایە بە مانای بڕیاریش دێ}، (قضاهُ)، واتە: جێبەجێی کرد، دەگوترێ: (قَضَى حَاجَةً لِنَفْسِهِ)، ئەگەر شتێك کە لە دڵی دا پەنهانی کرد بوو، جێبەجێی کردو دەریخست، کە لێرەدا مەبەست دڵسۆزیی نواندنی یەعقووب بووە بۆ کوڕەکانی، دڵسۆزییەکەی پێ گەیاندن‌و لەلای خۆی نەیهێشتەوە، بۆ ئەوەی دڵی ئارام بێ، کە هیچ شتێك کە پێی وابێ سوودیان پێ دەگەیەنێ، کەمتەرخەمیی نەکردوە لە گەیاندنیدا پێیان.

(حَاجَةً)ش، وەك پێشتر گوتوومانە: (الحَاجَة: الأَمْرُ المَرْغُوب فِيهِ)، (حَاجَةً)، یانی: شتێك كە ئارەزووی بۆ بكرێ، بۆچی پێی گوتراوە: (حَاجَةً)؟ لەبەر ئەوەی پێویستیی پێیەتی، بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە .

ئەو پێویستییەش كە لە دڵی یەعقووبدا بووە، بریتی بووە لە سوور بوونی لەسەر ئەوەی كوڕەكانی ئاگادار بكاتەوە، لەو مەترسییانەی كە لە ڕێیان دان .

٤) - ﴿ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَٰهُ ﴾، بێگومان ئەو خاوەن زانیارییەكی تایبەت بوو، بە هۆی فێركردنی ئێمەوە، واتە: بە هۆی ئەوەی كە ئێمە فێرمان كرد بوو، ئایا خوا چۆنی فێركردبوو؟ بێگومان لە ڕێی وەحییەوە، زانیاریی تایبەتی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وەحییە، پێغەمبەران بەوە لە خەڵكی دیكە جیادەبنەوە، كە خوا زانیاریی تایبەتییان پێ دەدات، ئەگەرنا ئەوانیش وەك خەڵكی دیكە، دەستیان لە زانیاری دیكەش گیر دەبێ، كە خەڵكی دەستی لێ گیر دەبێ، لە ڕێی ئاساییەوە: لە ڕێی ئەزموون و بەكارهێنانی عەقڵ و هەستەوەرەكانەوە، بەڵام پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بەوە لە خەڵكی دیكە جیادەبنەوە، كە زانیاریی تایبەتی خوایان پێ دەدرێ، ئنجا یان لە ڕێی فریشتەوە بۆیان دێ، یان خوا دەیخاتە دڵیان، یان لە ڕێی خەونەوە، گرنگ ئەوەیە زانیارییەكی تایبەتییان لە خواوە پێ دەدرێ.

كە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَٰهُ ﴾، واتە: بێگومان ئەو (یەعقووب)خاوەن زانیاریی بوو، زانیارییەكی تایبەت و مەزن و گرنگ، بەهۆی ئەوەوە كە ئێمە فێرمان كردبوو .

٥) - ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن .

ئەمە دەگونجێ بە زۆر شێوە مانا بكرێ، زۆربەی خەڵكی چی نازانن ؟

١ – من ئاوام مانا کردوە، واتە: زۆربەی خەڵکی نازانن کە باشترینو ڕاسترینو ساغترینو بێ خڵتەترین زانیاریی، ئەو زانیارییەیە کە لە وەحییەوە سەرچاوە دەگرێ، لەلایەن خواوە بە تایبەت دەدرێ بە پێغەمبەران، من ئەو مانایەم پێ گونجاوترە، کە نەمبینیوە لە تەفسیرەکاندا باس کرابێ، بۆ وێنە :

٢ – هەندێکیان گوتوویانە: زۆربەی خەڵك پێیان وایە: کاروبارەکان تەنیا لە ژێر ڕکێفی ویستی ئەواندانو، پێیان وایە کە هۆکارەکان مەبەستەکانیان بۆ دێننە دی .

بەڵام من پێم وایە ئەوەی کە گوتم چاکتر دێتەوە لەگەڵ سیاقی ئایەتەکەدا، چونکە خوا ﷻ مەدحی یەعقووب عليه السلام دەکات کە پێی گوتن: ڕۆڵەکانم ! هۆکارەکان بگرنە بەر، هەمووتان لە یەك دەروازەوە مەچنە نێو شارەوە، لە دەروازەی جۆراو جۆرەوە بچن، هەر خۆشی گوتوویەتی: من هیچ سوودێکتان پێ ناگەیەنم لە بەرانبەر ویستی ڕەهای خوادا، دواییش خوا مەدحی دەکاتو دەفەرموێ: ئەو چوونە ژوورەی کوڕەکانی یەعقووب بۆ نێو شارەکە، بەو شێوەیەی بابیان فەرمانی پێکرد بوون، یان ئەو ڕێنماییو ئامۆژگارییەی یەعقووب بۆ کوڕەکانی، لە بەرانبەر ویستی خوادا، هیچ سوودی پێ نەدەگەیاندنو، ئەو خاوەن زانیارییەکی تایبەت بوو، بە هۆی ئەوەوە کە ئێمە فێرمان کردبوو، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، چی نازانن؟ ئەوە نازانن کە باشترین زانیاریی، بێ خڵتەترینو، ڕاسترین زانیاریی ئەوەیە کە خوا لەڕێی وەحییەوە دەیدا بە هەندێك لە بەندەکانی خۆی، داویەتی بە هەندێك لە بەندەکانی خۆی، کە پێغەمبەرانن صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ .

# کورتە باسێک لە بارەی هۆکارەکان و کاریگەریانەوە

هەندێك لە زانایان وا لەم ڕستەیە حاڵی بوون کە دەفەرموێ: ﴿مَّا كَانَ يُغۡنِي عَنۡهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ إِلَّا حَاجَةٗ فِي نَفۡسِ يَعۡقُوبَ قَضَىٰهَا﴾، واتە: ئەو قسەیەی یەعقووب ﷺ کە بە کوڕەکانی، دەڵێ: لە یەك دەروازەوە مەچنە نێو شارو، لە چەند دەروازەیەکی جیاوازەوە بچن، ئەوە هیچ سوودی پێ نەدەگەیاندن لە بەرانبەر ویستی خواو قەدەری خواداو، تەنیا پێویستییەکی نێو دڵو دەروونی یەعقووب بوو خستیە ڕوو، وا لەو ڕستەیە حاڵی بوون کە هۆکارەکان هیچ کاریگەرییان نیە !

لە بەرانبەریشدا هەندێکی دیکەش وا حاڵی بوون، کە کاریگەریی هۆکارەکان کاریگەرییەکی خودی سەربەخۆیە، بەو واتایە کە پەیوەست نین بە ئیرادەو ویستی ڕەهاو بێ سنووری خوای باڵادەستو تواناوە !

بەڵام ئێمە دەڵێین: لە ڕاستییدا ئەو دوو ڕایە یەکێکیان بریتیە لە کورت هێنان، ئەوی دیکەش بریتیە لە تێپەڕاندن، ئەوەیان کە دەڵێ: هۆکارەکان هیچ کاریگەرییان نیە لە بەرانبەر ویستی خوادا، ئەوە کورت هێنانە، وەك مەلای گەورەی کۆیی لە شیعرێکی دا دەڵێ :

چونکە سەلبی تەئسیریان لە قودرەتی عەبدی کرد

ئوممەتی وا زەبەلاح هەمووی بە زیندوویی مرد

کە مەبەستی جەبرییەکان بووە کە گوتوویانە: هۆکارەکان کاریگەریی خود (ذاتي)یيان نیە، بۆیە دەڵێ: چونکە سەلبی تەئسیریان لە قودرەتی مرۆڤ کردو، گوتیان: بەندە تواناو دەسەڵاتەکەی کاریگەریی خودیی نیە، بەڵکو هەر کاتێك مرۆڤ شتێك ئەنجام دەدات، ئیرادەی خوا بۆی دەکات، دەڵێ: لە ئەنجامی ئەوەدا ئۆممەتی وا زەبەلاح (گەورەو زۆر)، هەمووی بە زیندوویی مرد! قسەکەی تا رادەیەکی زۆر راستە، ئەو بیرۆکەی جەبرییەکانو، مورجیئەکانە کە گوتوویانە: کردەوە بەشێك نیە لە ئیمان، ئیمانی ئیبلیسو ئیمانی فریشتان وەك یەکن ! ئیمانیان تەنیا بە زانینو بە راستزانینو دانپێداهێنان زانیوە، ئەوە کاریگەریی خراپی زۆری بووە .

هەروەك بە بارەکەی دیکەش دا: قەدەرییو موعتەزیلەش کە زێدەڕۆییان کردوە لەوەدا کە گوتوویانە: هۆکارەکان کاریگەرییەکی زاتییان هەیە، بە نادیدەگرتنی ویستی خواو تواناو دەستەڵاتی بێسنووری خوا، ئەوەش بێگومان تێپەڕاندنە.

هەق ئەوەیە کە هۆکارەکان چ پەیوەندییان بە مرۆڤەوە هەبێ، یان گشتی بن، هۆکارەکان کاریگەریی زاتییان هەیە، بەڵام لە چوارچێوەی ویستو تواناو سیفەتە بێسنوورو رەهایەکانی خوای پەروەردگاردا، وانیە کە ناکاریگەر بن، مرۆڤ دەستە پاچە نیە، پەڕە مریشکێك نیە ویستی خوای پەروەردگار بیجووڵێنێ، بێ ئەوەی بۆخۆی هیچی لە توانادا هەبێ، بەڵام ویستی مرۆڤ و سیفەتەکانی مرۆڤ ، هەروەها هۆکارەکان بە گشتی کاریگەرییەکی زاتیی سەربەخۆ (مستقل) بەدەر لە ویستی خوای پەروەردگاریشیان نیە، چونکە خوا ﷻ ویستوویەتی ئەو هۆکارانە کاریگەرییان هەبێ، ئنجا هەر کاتێکیش ویستی خوا کەوتە کار، بۆ ئەوەی هۆکارێك ئەو کاریگەرییەی کە هەیەتی، نەیبێ، پەکی دەخا، وەك دوایی باسی دەکەین، ئەدی مەبەست لەو تەعبیرە قورئانییە چییە، کە خوا دەفەرموێ:

﴿مَّا كَانَ يُغْنِي عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ﴾، دوای ئەوەی کە یەعقووب دەڵێ: ﴿وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدْخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدْخُلُواْ مِنْ أَبْوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ

﴿أُغْنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ﴾، کە خۆشی هـەروا دەڵـێ: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾﴾، دوایـــی دەفـەرمـــوێ: ﴿وَلَمَّا دَخَلُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغْنِي عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِي نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَا﴾، یـانی: کـاتێ کـە بـەو شێوەیـەو لـەو شـوێنـەوە کـە بـابیـان فـەرمـانی پێکردبـوون، چوونـە ژووری شـارەکە، لـە شـارەکە وەژوور کـەوتن، کە ئەوە هیچ سـوودی پێ نەدەگـەیـاندن، واتـە: بـەو شێوە چوونـە ژوورە، یـاخـود ئەو فـەرمـانەی بـابیـان، هیـچ سـوودی پێ نـەدەگـەیـانـدن، لـە بـەرانبـەر ویستی خـوادا، بـەڵام ئـەوە هـەر شـتێك بـوو یـەعقـووب لـە دڵـی دا بـوو، ویسـتی دەریـبـبـڕێ .

مـەبـەسـت لـەو تـەعـبیـرە ئـەوەیـە کـە: مرۆڤ تـەنیـا دەبـێ پشتی بـە خـوا ببەستێو، دڵی تـەنیـا بـە خـواوە پەیوەسـت بـێو، دڵـنیـا بـێ کـە بـەبـێ ویستی ڕەهـای خـوا، هیچ شـتێك ڕوونـادات، ئـەگـەرنـا مـەبـەسـت ئـەوە نیـە کـە هۆکـارەکـان هیچ دادی مرۆڤ نـەدەنو، هیچ کـاریگـەرییـان نـەبـێ، چونکـە ئێمـە دەقی قورئـانمـان زۆرن، هـەروەهـا دەقـی سـونـنـەتی پێغـەمبـەر ﷺیـش، کـە هۆکـارەکـان دەبـێ بگیـرێنـە بـەرو، دەسـت بـە هۆکـارەکـانـەوە بـێ، بـەڵام دەبـێ دڵ بـە خـواوە پەیوەسـت بـێ، هـەم وەك واقیعـیش دیـارەو، ئـەوە پێویسـتیی بـە بـەڵگـەی نـەقڵیش نـاکـات، مـادام بـە عـەقڵو ئـەزمـوونو لـە واقیعدا دیـارە، بـۆ نموونـە:

١ـ کـەسێك تینووی بـێ، دەبـێ ئـاو بخواتـەوە، بـۆ ئـەوەی تینوویـەتی بشکـێ .

٢ـ کـەسێك برسیی بـێ، دەبـێ خـواردن بخـوات، بـۆ ئـەوەی برسیـەتییـەکـەی لابچـێ .

٣ـ ئـەگـەر سـەرمـای بـوو، دەبـێ بـە بـەرگو پۆشـاك خـۆی داپـۆشـێ، یـان بـە ئـاگر خۆی گـەرم بکاتـەوە،... هتـد، ئنجا هـەر شـتێك کـە عـەقڵـی سـەلیمو ئـەزمـوون، بیسـەلـمێننو لـە واقیـع دا بـەرجەسـتـە ببـێ، پێویسـتییمـان بـە بـەڵگـەی نـەقڵیی نـاکـات بـۆ سـەلـمـانـدنی ڕاستیی ئـەو شـتـە، کـە عـەقـڵ بـە ئـاشکـرا دەلالـەتی لـەسـەر دەکـاتو، بـە شـێوەیـەکی بـەرهـەسـت (محسوس) دیـارە .

بەڵام وێڕای ئەوەش: با تەماشا بکەین :

یەکەم: خوا ﷻ لە بەسەرهاتی (ذِی ٱلْقَرْنَیْنِ)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ ﴾الكهف، واتە: دەربارەی (ذِی ٱلْقَرْنَیْنِ)، پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: لەمەو دوا هەواڵیتان بەسەردا دەخوێنمەوە: ئێمە دەستڕۆیشتوومان کرد بوو لە زەوییداو بۆ هەر کارێك، هۆکارێکمان پێ دابوو (واتە: بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك، هۆکارێکمان بۆ ڕەخساند بوو)، ﴿ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴾، شوێنی هۆکارەکە دەکەوت، بۆ ئەنجامدانی کارەکەی .

ئنجا دوایی باس دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ ﴿٨٦﴾ ﴾ الکهف، دوایی دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ ﴿٩٠﴾ ﴾الکهف، دوایی دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ ﴿٩٣﴾ ﴾الکهف، کەواتە: بە هۆی شوێنکەوتنی هۆکارەکانەوە (ذِی ٱلْقَرْنَیْنِ)، گەیشتۆتە ئەو شوێنەی کە خۆری لێ ئاوا دەبێ، هەروەها ئەو شوێنەی کە خۆری لێ هەڵدێ، هەروەها گەیشتۆتە نێوان دوو چیایەکان، کە وەك دوو بەنداو (سد) وا بوون، ئەوە لە سووڕەتی (الکهف)دا .

دووەم : لە سووڕەتی (الأنفال) لە ئایەتی (٦٠)دا، خوا ﷻ فەرمان بە ئێمەی مسوڵمان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ﴾، واتە: ئنجا هەرچی لە تواناتاندا هەیە لە هێز بۆیان ئامادە بکەن، {واتە: بۆ دوژمنو ناحەزانتان}، هەروەها لە ئەسپی

بەستراوە، ڕاگیراوو ئامادە، (بۆچی؟) بۆ ئەوەی دوژمنی خواو دوژمنی خۆتانی پێ بترسێنن .

کەواتە: لێرەشدا فەرمانکراوە بە ئامادەکردنی هێز، کە بێگومان هێزیش هۆکارە .

سێیەم : ئنجا لە سوورەتی (النساء) لە ئایەتی (٥)دا، خوا ﷻ لە باسی ماڵو سامانداا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَـٰمًا ﴾، واتە: ئەو ماڵو سامانەتان کە خوا گێڕاویەتی بە مایەی ڕاوەستانتان، (واتە: ژیانتانی پێوە بەندەو ڕاوەستاوە)، مەیدەن بە نەفامەکان .

ئنجا ئایا پشت بە خوا بەستن و، خوا کردنە وەکیلی خۆمان، مانای وایە ئێمە گوێ نەدەینە هۆکارەکان؟ نەخێر، وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێ:

{عَنْ أَنَسِ بنِ مالِكٍ ﷺ قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إلى النَّبِيِّ ﷺ وَأَرادَ أَنْ يترك ناقَتَهُ وَقَالَ: أَأَعْقِلُها وَأَتوكَّلُ أَوْ أُطْلِقُها وَأَتوكَّلُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إعْقِلْها وَتوكَّلْ}، {أَخْرَجَهُ ابنُ حِبانَ برقم: (٧٣١)، والترمِذِي برقم: (٢٦١٧)، وَابنُ ماجَه برقم: (٤١٦٤)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَحَسَّنَهُ الألباني}.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ ویستی حوشترەکەی بەڕەڵڵا بکات لە دەرێو، بە پێغەمبەری ﷺ گوت: ئایا بیبەستمەوەو پشت بە خوا ببەستم، یاخود بەرهەڵدای بکەمو پشت بە خوا ببەستم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیبەستەوەو پشت بە خوا ببەستە .

کەواتە: بەستنەوە، پێچەوانەی پشت بە خوا بەستن نیە، بەڵکو ئەگەر پشتت بە خوا بەست، دەبێ دڵت بە خواوە پەیوەست بێ، بەلام دەبێ دەستت بە هۆکارەکانەوە بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ وایکردوە، کەواتە: ئەوەی کە هەندێ لە ئەهلی تەریقەت و تەصەووف بە هەڵە تێیگەیشتوون، پێیان وایە کە بابای پشت بە خوا بەستوو، کەسێکە کە هۆکارەکان وێڵ بکات! ئەوە لە ڕاستیی دا هەر لە بنچینەدا لە مانای (تَوکّل) حاڵی نەبوون، چونکە:

ئـەوەی كـە دەستـی بـە هۆكـارەكـانـەوە نـەبێ، ڕاست نـاكـات بڵـێ: دڵـی بـە خـواوە پەیوەستـە، لـە سـۆنگـەی ئـەوەوە ئـەو خـوایـەی كـە دڵـت پێوەی پەیوەستـە، ئـەو پێت دەفـەرمـوێ: هۆكـارەكـان ڕەچـاو بكـە، وەك پێشتـر گـوتمـان خـوای پەروەردگـار دەربـــارەی (ذو القـرنين) دەفـەرمـــوێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ ﴾الكهف، واتـە: پرسیـارت لێدەكـەن دەربـارەی (ذو القـرنين) پێیـان بڵـێ: هەواڵی ئەوتـان بـۆ دەخوێنمـەوە، ئێمە ئـەومـان دەستـەڵاتدار كـردبـوو لـە زەویداو، بۆ هـەمـوو شـتێك هۆكـارێكمـان پێدابـوو، ئنجا بـە دوای هۆكـارەكـە دەكـەوت ...

كـەواتە: پشت بـە خـوا بەستن لـەگـەڵ پەنا بـۆ هۆكـار بردن دا، نـەك هـەر ناكـۆك نیـە، بـەڵكـو تـەواوكـەری یـەكـدین، چونكـە ئینسان تـەنیـا لایـەنە مـەعنـەوییـەكـەی نیـە، هەروەك تـەنیـا لایەنە جەستـەییـەكـەش نیە، بەڵكو بە لایەنە جەستـەییەكـەی هۆكار پەیدا دەكاتو، بە لایەنە مـەعنەوییـەكـەشی، دڵ پەیوەست دەكات بە خـواوە .

ئنجا ئـەگـەر ئێمـە تـەمـاشـای سـیـرەو ژیـانـی پێغـەمبـەری خـاتـەم ﷺ بكـەین بۆ نمـوونـە: كـاتێـك كـە لـە مـەككـەوە كـۆچ دەكـات بـۆ مـەدینـە، هـەرچـی هـۆكـارەو بـە زەینـی مرۆڤـ دادێ، پێغـەمبـەری خـوا ﷺ ڕەچـاوی كـردوە :

١ـ پێشـێ ڕەفیـق پەیـدا دەكـا، كـە ئـەبـو بـەكـری صیددیقـە نیزیكتـرینو متمـانـە پێكـراوتـرین هـاوەڵـیو دڵسـۆزتـریـن هـاوەڵـی .

٢ـ پاشـان وڵاخ دابیـن دەكـات دوو وڵاخ .

٣ـ ئنجا كـەسێك كـە دەلیـلـەو، بـە ڕێیـە دەزانـێو شـارەزایـە (عبدالله ابـن أُريقط)، كـە هـەرچـەنـدە ئـەو كـاتـە موشـریك بـووە، بـەڵام شـارەزا بـووەو، متمـانـە پێكـراویش بـووە، پێغـەمبـەر ﷺ نـەچـووە مسولمـانێكی دڵسۆزی متمـانـە پێكـراو، بـەڵام نـەشـارەزا بكـات بـە دەلیـل، هـەڵسـاوە كـافرێكـی متمـانـە پێكـراو كـە شـارەزایـە، ئـەوی كـردوە بـە ڕێ پێشـاندەر .

٤- دوایی چۆنیەتی خواردنو خۆراکیان چۆن چۆنی بۆ بێ ؟ ئامادەکاری بۆ کردوە .

٥- ئنجا هەواڵو دەنگو باسیان چۆن بۆبێ ؟ لە ڕێی کورو کچەکانی ئەبوبەکری صیددیقەوە خوا لێی ڕازی بێو لە ڕێی شوانەکەیەوە، شوانی ئەبوبەکری صیدیق کە مێگەلە مەڕێکی پێ بووە، هەموو ئەو زەمینەسازیانەی کردوون .

٦- ئنجا سێ شەوو سێ ڕۆژان لە ئەشکەوتی (ثَور)دا ماوەتەوە، کە کەوتۆتە خوارووی شاری مەککە، لە حاڵێکدا کە مەدینە دەبێ بەرەو ڕۆژهەڵاتی باکووری مەککە بڕۆی، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بۆ شوێنە ونیی، چۆتە شوێنێك کە ئاڕاستەکەی پێچەوانەی ئاڕاستەی ئامانجی سەفەرەکەیەتی، بۆ ئەوەی فیکری ئەوێ هەر نەکەن .

٧- هەروەها بە شەو لە ماڵ دەرچووە .

کەواتە: هەرچی هۆکارە پێغەمبەری خوا ﷺ گرتوویەتە بەر، هیچ کەسیش گومانی لەوەدا نیە کە پێغەمبەری خوا، گەورەی پشت بە خوا بەستووان (سیدُ المُتوکّلین) بووە .

هەروەها جەنگەکانی کە کردوونی، هەرچی هۆکارە ڕەچاوی کردوە :

١/ هاوەڵانی باش پەروەردە کردوە .

٢/ هەوڵی داوە نەخشەی جەنگەکە زۆر بە وردیی دابنێ .

٣/ هەواڵو زانیاریی باشی لە بارەی دوژمنەوە پەیداکردوە: ژمارەی دوژمن چەندە؟ هی کوێن؟ چۆنن؟ توانایان چەندە؟ هەموو ئەو هۆکارانەی کە پێویستن بۆ بردنەوەی جەنگەکە، ڕەچاوی کردوونو، بێگومان لە هەموو کەسیش زیاتر پشتی بە خوا قایم بووە .

## ئـایا کـاریگـەریی هۆکـارەکـان کـاریگـەرییـەکی خـودییـە یـان نـا؟

ئـایا هۆکـارەکان کـاریگـەریی (تأثیر)ەکـەیان، شـتێکە لـە خـودی خـۆیـان دایـە، یـاخـود لـەو کـاتـەدا کـە کـارەکـە ئـەنجام دەدرێ، خـوای بـەدیهێنـەر کـاریگـەرییـان پێدەدا؟ لـەوبـارەوە سـێ ڕا هـەن :

ڕای یـەکـەم : دەڵـێن: کـاریگـەریی هۆکـارەکـان خـودیی نیـە، زاتیـی نیـە، جـەبرییـەکـان وا دەڵـێن، واتـە: نـە ئـاو تینوێتـی دەشکێنـێ، نـە ئـاگـر دەسووتێنـێ، نـە هیچ شتێك هیچ ئـەنجامێکی دەبێ، مـەگـەر خـوا لـەو کـاتـەدا شتـەکـەی پێ بکاتو بۆ بکات، کـە ئـەوە کورت هێنـانـە .

ڕای دووەم : دەڵێن: کـاریگـەریی هۆکـارەکـان کـاریگـەرییـەکی خـودییو سـەربـەخۆیـە، بـە ڕەهـایی، وەك سروشتو هیچ پـەیوەسـت نیـە بـە ویستی خـوای پـەروەردگـارەوە، هـەڵبـەتـە نـاڵێن: خـوا دروستی نـەکـردوون، بـەڵام دەڵێن: خـوا ﷻ کـاریگـەریی خستۆتـە نێـو ئـەو هۆکـارانـەوەو، هـەقی بـە سـەریـانـەوە نیـە، کـە ئـەوەش قسـەی موعتـەزیلـەکـانـەو پێچـەوانـەی قسـەی جـەبرییـەکـانـە .

ڕای سێیـەم : کـە قسـەی ڕاستـە، نـە تێپـەڕانـدنـی تێدایـە، نـە بـەزایـەدانی تێدایـە، قسـەی زۆربـەی هـەر زۆری زانـایـانی ئیسلامـە، کـە بـە ئـەهلـی (سوننـەتو جـەمـاعـەت)، نـاسـراون، دەڵـێن :

یـەك: کـاریگـەریی هۆکـارەکـان کـاریگـەرییـەکی خـودییـە، بـەڵام خـوا ئـەو کـاریگـەرییـەی لـەوێ دا دانـاوە .

دوو: هـەر کـاتێـك خـوا ویستی لـە هـەر حـاڵێکـداو لـە هـەر کـاتێکـدا، ئـەو کـاریگـەرییـەیان لـێ وەردەگـرێتـەوە.

١ – بـە بـەڵگـەی ئـەوەی کـە ئـاگـر دەسـووتێنـێ، بێگومـان، بـەڵام خـوا ﷻ هـەرچـەنـدە ئیبـراهیم خـرایـە نێو ئـاگـر، بـەڵام نـەیـهێشـت بسـووتێ، وەك دەفـەرمـوێ : ﴿ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾الأنبياء، واتـە:

گوتمان: ئەی ئاگر! سارد بەو سەلامەت بە لەسەر ئیبڕاهیم، كەواتە: ئاگر دەسووتێنێ، بەڵام ئەگەر خوا بیەوێ نەسووتێنێ، ناسووتێنێ، ئاگر وەك خۆی دەسووتێنێ خوای باڵادەست ئەو كاریگەرییەی تێدا ناوە، بەڵام هەتا ئەو كاتە، ئەو كاریگەرییەی دەبێ، تاكو خوا دەیەوێ، ئەگەر خوا نەیەوێ، ئەو كاریگەرییەی لێ دەستێنێتەوە، وەك ئاگرەكەی ئیبراهیمی خرا بووە نێو، كاریگەریی سووتاندنی لێ ستاندەوە .

٢- ئاو خەڵك دەخنكێنێو نقووم دەكات، نغرۆ دەكات، بەڵام ئەگەر خوا بیەوێ، ئەو كاریگەرییەی لێ وەردەگرێتەوە، وەك دەریای سوور بۆ مووسا ﷺو گەلە ستەم دیدەكەیو ڕاوەدونراوەكەی لەلایەن فیرعەونو سوپایەكەیەوە، شەق بوو، لە جیاتی ئەوەی نغرۆیان بكات، ئاوەكە بۆیان شەق بوو، ئەوان لێی دەرباز بوونو فیرعەونو سوپایەكەی نغرۆ كردو خنكان .

جیاوازیی ئەم ڕایەش لەگەڵ ئەوەی موعتەزیلەكان، هەر ئەوەیە كە ڕای موعتەزیلەكان زیاتر دەشوبهێتە ڕای فەیلەسووفەكانی یۆنانەوە، كە ئەوان گوتوویانە: بوون (وجود) وەك سەعاتێك وایە، خوا قوڕمیشی كردووەو لێی گەڕاوە، ئیدی هەقی بەسەریەوە نیە، بەڵام حەقیقەت ئەوەیە كە: بەڵێ خوا گەردوونی دروستكردوە، بەڵام وەك سەعاتێك قوڕمیشی نەكردووەو لێی بگەڕێ، بەڵكو بەردەوام خوا ﷻ ئاگاداری وردو درشتیەتی. ئاگاداری هەموو گەردیلەكانو لە گەردیلەش بچووكترە، ئنجا لە هەر كاتێكو لە هەر حاڵێكدا خوای پەروەردگار بیەوێ، تەدەخخول دەكاتو كاریگەریی هۆكارەكان پەك دەخاو ڕادەگرێ، وەك نموونەمان هێنایەوە.

بەڵگەمان لەسەر ئەوە چیە ؟

١) خوا ﷻ لە سووڕەتی (المؤمنون)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: بەدڵنیاییی لە سەرووی ئێوەوە حەوت چینمان دروست كردوون، حەوت ئاسمانو، ئێمە لە دروستكراوەكان بێ ئاگا نین .

٢) هەروەها لە سووڕەتی (الرحمن)دا، خوا دەفەرمووێ: ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾﴾، واتە: هەموو كاتێك ئەو (خوا) لە كاردایە، هەموو كاتێك خوای پەروەردگار لە كاردایە، بەو واتایە وەك زانایان تەفسیریان كردوە: یەكێك بەرز دەكات، یەكێك نزم دەكات، یەكێك هەژار دەكات یەكێك، دەوڵەمەند دەكات، یەكێك ساغ دەكات، یەكێك نەخۆش دەكات، یەكێك سەردەخات، یەكێك ژێر دەخات، یانی: خوا بەردەوام لەگەڵ دروست كراوەكانی خۆیدا خەریكە، سەرافەتیان دەكاتو سەرپەرشتییان دەكاتو، ئاگای لێیانە، ئەوە نیە كە دروستی كردبنو لێیان گەڕابێ[1].

بەڵێ سروشت كارەكانی خۆی دەكات، خوای بەرزو مەزن داو، وای داناوە، بەلاّم لە چوارچێوەی ویستی ڕەهای خوای پەروەردگاردا، وە هەر كاتێك خوا بیەوێ یەكێك لە هۆكارەكان كاریگەریی نەبێو پەكی بخات، پەكی دەخاتو، خوا لە بەرانبەر دروستكراوەكانی خۆیدا، دەستە پاچە نیە، واتە: وانیە كە خوا ئەو شتانەی دروست كردبنو وەگەڕی خستبنو، دوایی لە دەستی دەرچوو بن! نا هەر لە ژێر ڕكێفی ئیرادەی بێ سنوورو ڕەهای خوای تاكو پاك دان .

كەواتە: پوختەی قسان ئەوەیە گرتنەبەری هۆكارەكان فەرزە، كە ئەوە كاری جەستەیە، بەلاّم كاری دڵو دیوی پەنهانی مرۆڤ، بریتیە لە پشت بە خوا بەستن، واتە: دەست بە هۆكارەكانەوە گرتن، لەگەڵ دڵ بە خواوە پەیوەست كردنو، پشت بە خوا بەستن، نەك هەر پێچەوانە نین، بەڵكو تەواوكەری یەكدین، پێغەمبەرانیش (علیهم الصلاة والسلام) كە بێگومان لە هەموو كەس باشتر خوایان ناسیوەو، لە هەموو كەس باشتر لە ئایینو بەرنامەی خوا، تێگەیشتوون، هەر وایان كردوە: ویستبیان هەر كارێك بكەن، هۆكاریان

---

١) وشەی (طبیعة) وەك لە كتێبی یەكەمی مەوسووعەی (الإسلام كَما يَتَجَلّى في كتاب الله)دا، باسم كردوە: (طبیعة) لەسەر كێشی (فَعیلَة)یە، بەلاّم بە مانای (مَطبُوعَة)یە، چونكە (طبیعة) واتە: (طبع) كراو، كەواتە: (فَعیلة)یە، بەلاّم بە مانای (مَفعُول)، (مَطبُوع)، یانی: (طبع) كراو، ئنجا ئایا كێ ئەو سروشتەی سروشتاندوە؟! بێگومان خوا ﷻ ؟ كێ ئەو (طبیعة) جوانەی ئەو (وجود)ەی كردوە؟ بێگومان خوا ﷻ .

بۆ گرتوونە بەر، هەروەها خوا ﷻ مەدحی (ذي القَرنين)، دەكاتو لە مەقامی مەدحو سەنادا دەفەرموێ: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾﴾ الكهف، بۆ هەر شتێك، بۆ هێنانەدی هەر ئامانجێك، هۆكارێكمان بۆ ڕەخساند بوو، بە دوای هۆكارەكە دەكەوت، كەواتە: ئا ئەوە شێوازی ڕاستی مامەڵەكردنە لەگەڵ دنیای هۆكارەكاندا، بەڵام دەبێ دڵیشت بە خواوە پەیوەست بێو، پێت وانەبێ كە هۆكارەكان بۆخۆیان سەربەخۆ كار دەكەنو، دڵنیابی كە لە پشت هۆكارەكانەوە، هۆكارسازیش هەیە (أسباب) هەن، بەڵام (مُسَبِّبُ الأسباب)یش، هەیە، كە ئەو كاریگەرییە زاتییەی بە هۆكارەكان بەخشیوەو، هۆكارەكان لە سنووری ویستو دەستەڵاتی ڕەهاو بێ سنووری خوای پەروەردگاردا، كار دەكەن .

# کورتە باسێک لە بارەی چاووزار (العین)ەوە

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا کە یەعقووب ﷵ بە کوڕەکانی دەڵێ: ﴿ وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ ﴾، ئەی کوڕەکانم! لە یەك دەروازەوە مەچنە ژوور شارەکە، بەڵکو لە چەند دەروازەیەکی جیا جیاوە بچن .

هەندێك لە توێژەرەوان وایان لێکداوەتەوە، گوتوویانە: (خافَ عَلَيْهم مِنَ العَيْنِ وَالحَسد)، مەترسیی بە چاوەوە بوونو چاوێتیی بوونی، لێیان هەبووە، ترسی هەبووە کە بە چاوەوە ببن، خەڵك لە چاویان بەرێ، چاوو زار کاریگەریی خراپیان لەسەر دابنێ .

هەڵبەتە من وام تەفسیرکرد کە پەیوەندیی بە چاوو زارەوە نەبێ، بەڵکو گوتم: – وەك هەندێك لە توێژەرەوان وایان لێکداوەتەوە – کە یەعقووب ﷵ ئامۆژگاریی کوڕەکانی خۆی دەکات، یازدە کوڕەکەی کە ئەو جارە بنیامینیشیان کەوتە گەڵ، دەڵێ: ڕۆڵەکانم! کوڕەکانم! لە یەك دەروازەوە مەڕۆنە نێو شار، یازدە کوڕی هەڵکەوتوو، کوڕانی یەعقووبو نەوەی ئیسحاقو نەوەی ئیبراهیم ﷵ دەبێ زۆر بە شانو شەوکەتو جوانو ڕێكو پێك بوو بن، نەوەك دەسەڵاتی ئەو شارو وڵاتە گومانی خراپتان پێ بەرێو تۆمەتبارتان بکات، یان لێتان بترسن بڵێن: ڕەنگە ئەوانە بۆ کودەتایەك هاتبنو، پیلانێکیان بە دەستەوە بێ، ئەو کوڕە بە شانو شەوکەتانە.

زۆر پێدەچێ مەبەستی ئەوە بووبێ، کە دەستەڵاتی ئەوێ گومانی خراپیان پێ نەباتو تۆمەتباریان نەکات، کە بۆ مەبەستێکی خراپ چوون، بەڵام لە پاڵ ئەوەدا، ئەوەش دەگرێتەوە – هەرچەندە من بۆ ئێرە بە دووری دەزانم – کە

ترسی ئەوەشی بوو بێ: بە چاوەوە ببن، چاوێنیی ببن، چاوو زار لێیان بدات، بۆیە من لێرەدا ئەو کورتە باسە دەکەم، کە ئایا مەسەلەی (چاوو زار) کە لە هەندێ شوێنان وا دەڵێن، بەڵام لە هەندێك شوێن دەڵێن: چاوێنیی بووە، چاو لێیداوەو، لە هەندێ شوێن دەڵێن: بە چاوەوە بوو، یان چاوی پیس کاری لێکرد .

لە دوو بڕگەی سەرەکیی دا، باسی ئەو بابەتە دەکەم :

**بڕگەی یەکەم : چەند بەڵگەیەك لەسەر ڕاستیی چاو لێدان، بە چاوەوە بوون، چاوێنیی بوون، چاوو زار کاری خراپ تێکردن :**

بەڵگەی یەکەم: ئایەتی ژمارە (٥١)ە، لە سووڕەتی (القَلَم)، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾ ﴾، واتە: نیزیکە ئەوانەی بێبڕوان، بە چاوەکانیان تۆ بخلیسکێنن، کاتێك کە گوێیان لە قوڕئان (ٱلذِّكْرَ)، دەبێو دەڵێن: ئەو (موحەممەد) شێتە.

(إبن كَثِير) ئاوای تەفسیر دەکات، دەڵێ: (أَي: لِيُعِينُونك بأبْصَارِهِم، بمَعْنَى: يحسدونَك لِبغضهِم إِياك، لولا وِقَاية الله لَك، وَحِمايتهُ إِياك مِنْهُمْ. وَفِي هذه الآية دليل على أن العَيْن إصابتها وتأثيرها حق، بأمر الله، عز وجل، كما وردت بذلك الأحاديث المروية من طرق متعددة كثيرة)[1]، واتە: کە دەفەرموێ : ﴿ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ ﴾، واتە: چاوت لێدەدەن، چاوێنییت دەکەن بە چاوەکانیان، یانی: حەسوودییت پێ دەبەن، چونکە ڕقیان لە تۆ هەڵدەستێ، ئەگەر خوا تۆ نەپارێزێو چەپاڵەت نەدا لەوان (ئەوان بەهۆی کاریگەریی چاویان تۆ دەخلیسکێننو، زیانت پێ دەگەیەنن)،

١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص ١٤٣٤.

لـەم ئـایـەتـەدا بـەڵـگـە هـەیـە لـەسـەر ئـەوە كـە چـاو هـەقـە، (چـاو لێـدان، بـە چـاوەوە بـوون، چـاوو زار لـێدان ڕاسـتـە)و، كـاریگـەرییـەكـەی ڕاسـتـە بـە فـەرمـانی خـوای بـاڵا دەسـتـی مـەزن، هـەروەك لـەوبـارەوە فـەرمـوودەی زۆر، لـە زۆر ڕێـوە هـاتـوون .

بـەڵـگـەی دووەم : چەند فـەرمـوودەیـەك، كـە من سـەرجـەم نـۆ (٩) فـەرمـوودە ئـامـاژە پـێ دەكـەم، بـۆ ئـەوەی بـاش تـیشـك بخرێـتـە سـەر ئـەم مـەسـەلـەیـە:

فـەرمـوودەی یـەكـەم : {لا رُقْيَـةَ إلاَّ مِـنْ عَـيْنٍ أَوْ حُـمَـةٍ} {أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٢٤٤٨)، وَابـن مـاجَـهْ بـرقم: (٣٥١٣)، وَابـن حِبـان بـرقم: (٦٤٣٠)، وَأَخْرَجَـهُ أَيْضَـاً مُسْلِم بـرقـم : (٢٢٠) مـوقُـوفَـاً عَـنْ بُـرَيْـدَةَ بـن حُصَـيْبٍ الأَسْـلَمِـيِّ}.

واتـە: پـێغـەمـبـەری خـوا فـەرمـوویـەتـی : نـزا كـردن نیـە، مـەگـەر بـۆ چـارەسـەر لـە كـاریگـەریـی چـاوو، بـۆ پـێـوەدان (پـێـوەدانی دووپشـك) .

چونكە: (الحُمَةُ: العَقْرَبُ)، دوو پشـك، یـانی دوعـا تـەنیـا بـۆ ئـەو دووانـە زۆر كـاریگـەریی هـەیـە، یـەكـەم: بـۆ چـاو، كـە كـەسـێك چـاوی خـراپ لـێی بـداتو بـە چـاویـەوە بكـات، دووەم: كـەسـێك كـە دوو پشـك پـێـوەی بـدا.

فـەرمـوودەی دووەم: {عَنِ ابـن عَبـاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمـا عَنِ النَّبِـيِّ ﷺ قَـالَ: (الْعَـيْنُ حَـقٌّ وَلَـوْ كَـانَ شَـيْءٌ سَـابِقَ الْقَـدَرِ، سَـبَقَتْهُ الْعَـيْنُ، وَإِذَا اسْتُغْسِـلْتُمْ فَاغْسِـلُوا)} {أَخْرَجَـهُ مُسْـلِمٌ بـرقم: (٢١٨٨)، وَابـن حِبـانَ بـرقم: (٦١٠٧)، وَأَخْرَجَـهُ أَيْضَـاً: التـرمِذِيُّ بـرقم: (٢٠٦٢) وَالنَّسـائِي فِـي (الكبـرى) بـرقم: ٧٦٢٠)، وَالـدَّيْلَمِيُّ بـرقم: (٤٢١٦)}.

واتـە: عەبدوڵڵای كوڕی عەببـاس خـوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ دەڵێ: پـێغـەمـبـەر ﷺ دەفـەرمـوێ: چـاو هـەقـە، (واتـە: كـاریگـەریـی چـاو هـەقـە)و، ئـەگـەر شـتێك پـێش قـەدەر كـەوتبـایـەوە، چـاو (كـاریگـەریی خـراپـی چـاو) پـێشی دەكـەوتـەوەو، ئـەگـەر داواتـان لـێكرا خـۆتـان بشـۆن، خـۆتـان بشـۆن .

(دوایـی زیاتر ڕوونـی دەكـەینـەوە، كـە مـەبـەسـت لـەو خـۆ شـۆردنـە چییـە ؟).

فەرمـوودەی سێیـەم: {عَنِ ابنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعَوِّذُ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ: (أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ، مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لاَمَّةٍ)، ثُمَّ يَقُولُ: (كَانَ أَبُوكُمْ يُعَوِّذُ بِهِمَا إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ)} {أَخْرَجَهُ بِرقم: (٣١٩١)، وَابنُ حِبَّانَ بِرقم: (١٠١٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٣٩) وَاللَّفْظُ لَهُ}.

واتـە: عـەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خـوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ دوعـای پاراسـتنی بەسـەر حەسـەنو حوسـێن دا دەخـوێند، دەیفـەرمـوو: ئێـوە دەپـارێزم، ئێـوە چەپاڵـە دەدەم، بـە وشـە تـەواوەکانی خـوا، (واتـە: بـە نـاوەکانی خـوا)، لـە هـەر شـەیتانێکو لـە هـەر زینـدەوەرێکو، لـە هـەر چاوێکی پیسی کـە کاریگـەریی خراپی هـەبێ، ئنجا دەیفەرمـوو: بـەم شێوەیـە ئیبـراهیم ؑ : ئیسحاقو ئیسماعیلی کـوڕی چەپاڵـە دەداو دوعـای بەسـەردا دەخـوێنـدن، بۆ پاراسـتنیـان .

فـەرمـوودەی چوارەم : {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بنِ سَهْلِ بنِ حُنَيْفٍ، قَالَ: مَرَّ عَامِرُ بنُ رَبِيعَةَ بِسَهْلِ بنِ حُنَيْفٍ وَهُوَ يَغْتَسِلُ، فَقَالَ: لَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ، وَلاَ جِلْدَ مُخَبَّأَةٍ، فَمَا لَبِثَ أَنْ لُبِطَ بِهِ، فَأُتِيَ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، فَقِيلَ لَهُ: أَدْرِكْ سَهْلاً صَرِيعًا، قَالَ: مَنْ تَتَّهِمُونَ بِهِ؟ قَالُوا: عَامِرَ بنَ رَبِيعَةَ، قَالَ: عَلاَمَ يَقْتُلُ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ! إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مِنْ أَخِيهِ مَا يُعْجِبُهُ، فَلْيَدْعُ لَهُ بِالْبَرَكَةِ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَأَمَرَ عَامِرًا أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيَغْسِلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ وَرُكْبَتَيْهِ وَدَاخِلَةَ إِزَارِهِ، وَأَمَرَهُ أَنْ يَصُبَّ عَلَيْهِ} {أَخْرَجَهُ إِبنُ مَاجَهْ بِرقم: ٣٥٠٩)، قال الشيخ الألباني: صحيح}.

واتـە: لـە ئـەبی ئومامـە کـە نـاوی سەهـلی کـوڕی حونـەیفـە دەڵـێ: عامیـری کـوڕی ڕەبیعـە بـە لای سەهلـی کـوڕی حونـەیفدا تێپـەڕی، کـە سـەهلی کوڕی حونـەیف لەو کاتـەدا خۆی دەشۆرد (دیـارە لـە دەشـتێک، لـە شـوێنێک خـۆی شـۆردوە، جەستـەی دیـار بـووە) عامیـری کـوڕی ڕەبیعـە، گوتی: ئـەمرۆ تا ئێستـا بـە دەنی وا سپیو جـوانم نـەدیوە، تـەنانـەت پێستی کچی پشت پـەردەش، ئـاوا سپیو جوان نیـە، (واتـە: زۆر پێی موعجەب بـووە،

کە جەستەیەکی سپیو جوانی هەیە)، ئیدی زۆری نەبرد، یەکسەر کەوتە عەرزێ، (واتە: سەهلی کوڕی حونەیف کەوت)، بردیان بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێیان گوت: فریای سەهل بکەوە، ئەوە کەوتوە (وەك دەڵێن: سەرو ملی شکاوە، ئاگای لە خۆی نیە)، فەرمووی: کێ تۆمەتبار دەکەن؟ گومانتان لە کێیە؟ گوتیان: عامیری کوڕی ڕەبیعە، ئەو بە لایدا ڕۆیشتوەو ئەو قسەیەی کردوە.

فەرمووی: بۆچی یەکێك لە ئێوە برایەکەی خۆی دەکوژێ؟ ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە برایەکەی خۆی شتێکی بینی، کە سەرسامی کرد، (ئەگەر سپیەتیی جەستەی بوو، ئەگەر بەهێزیی جەستەی بوو، ئەگەر جوانیی دەموچاوی بوو، ئەگەر ماڵو سامانی بوو، هەر شتێکی لێ بینی، کە پێی سەرسام بوو) با دوعای بۆ بکات خوا پیتو پێزی بۆ تێبخات، (ئەو کاتە ئەو پێ سەرسامبوونەی کاریگەریی خراپی بۆی نابێ)، دوایی داوای کرد، ئاوێکی بۆ بێننو، فەرمانی کرد بە عامیری کوڕی ڕەبیعە کە دەستنوێژ بگرێ، دەموچاوی بشواو، هەردوو دەستەکانی تاکو ئەنیشکەکانیو، پێیەکانیشی تاکو ئەژنۆیەکانیو، لە پشتێن بەرەو ژێری ئاو بە خۆی دا بکات، (ئنجا ئەو ئاوە چۆڕاوەتەوە نێو تەشتێك)و فەرمانی پێکرد کە ئەو ئاوە بە سەهلی کوڕی حونەیف دا بکات، دەڵێ: یەکسەر سەهلی کوڕی حونەیف هەڵسایەوە .

وشەی (لُبِطَ)، دەڵێ: (لَبَطَ: فُلانا يَلبِطُ لَبْطا: صَرَعَهُ)، واتە: خستی، کەوت، (لُبِطَ بِفُلانٍ: سَقَطَ على الأرضِ مِن قِيامٍ فَهُوَ مَلْبُوطٌ بِهِ)، دەڵێ: (لُبِطَ بِه)، خرایە سەر زەوی، یانی: کەسێك چۆن تیرێکی لێ دەدرێ، جا کوردەواریی خۆمان دەڵێن (تیری چاوو زار لێی داوە)، چۆن کەسێك کە فیشەکێك، تیرێکی لێ بدرێ، یەکسەر دەکەوێ، ئەوەش ئەزموون کراوەو هەبووە، کابرا چاوی پیسی ئاڕاستەی شتێك کردوە، یەکسەر خستوویەتی .

فەرموودەی پێنجەم : {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَيْنِ الْجَانِّ، ثُمَّ أَعْيُنِ الإِنْسِ، فَلَمَّا نَزَلَتْ الْمُعَوِّذَتَانِ، أَخَذَهُمَا

وَتَرك مَا سوى ذَلِكَ} {أَخْرَجَهُ الترمِذِيّ برقم: (٢٠٥٨)، وَالنَّسائِي برقم: ٥٤٩٤)، وَابن ماجَهْ برقم: (٣٥١١) قال الشيخ الألباني: صحيح}.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای بە خوا دەگرت، دوعای دەكرد بۆ ئەوەی كە چاوی جندەكان كاریگەریی خراپی بۆ سەری نەبێ، هەروەها چاوی مرۆڤەكانیش، بەڵام دوای ئەوەی (معوِّذتان) هاتنە خوار، (واتە: سووڕەتی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١﴾)، ئەو دووانەی بەكارهێنانو، دوعایەكانی دیكەی واز لێهێنان. (چونكە: ئەو دووانە كەلێنی ئەو دوعایانەش دەگرن).

**فەرمووودەی شەشەم:** {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ جِبْرِيلَ عليه السلام أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: اشتكَيْتَ يا مُحَمَّدُ! قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: بِسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ وَعَيْنٍ يَشْفِيكَ، بِسْمِ اللهِ أَرْقِيكَ} {أَخْرَجَهُ ابن أبي شَيْبة برقم: (٢٣٥٧٦)، وَأَحْمد برقم: (١١٥٧٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢١٨٦)، وَالترمِذِيُّ برقم: (٩٧٢)، وَقَالَ حَسَنٌ صَحِيح، وَابن ماجَهْ برقم: (٣٥٢٣)}.

واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: جبریل هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی موحەممەد! نەخۆشی (تووشی حاڵ تێكچونێك، بووی)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش ئەو دوعایەی بۆ خوێند: بە ناوی خوا دوعات بۆ دەكەم، لە هەر شتێك كە ئازارت دەداو، لە خراپەی هەر نەفسێكو، هەر چاوێك كە ڕقی لە تۆ هەڵدەستێ، خوا تۆ چاك بكاتەوە، بە ناوی خوا بۆت دەپاڕێمەوەو داوای چارەسەرت بۆ دەكەم.

**فەرمووودەی حەوتەم :** {عن أبو هريرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قَالَ: (إن العَيْنَ حَق)} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٢٢٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٤٠٨) وَلِمُسْلِمٍ مِن حَدِيثِ ابن عَباسٍ (الْعَيْنُ حَقٌّ، وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ سابَقَ الْقَدَرَ، لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ، وَإِذَا اسْتُغْسِلْتُمْ فَاغْسِلُوا)}.

واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: بێگومان چاو هەقە. (چاو لێدان، کاریگەریی خراپی هەیەو چاو هەقەو، شتێکی چەسپاوە).

فەرموودەی هەشتەم: {عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ قُلْتُ: أَيْ رَسُولَ اللهِ! إِنَّ بَنِي جَعْفَرٍ تُصِيبُهُمُ الْعَيْنُ، أَفَأَسْتَرْقِي لَهُمْ؟ قَالَ: (نَعَمْ، وَلَوْ كَانَ شَيْءٌ يَسْبِقُ الْقَدَرَ لَسَبَقَتْهُ الْعَيْنُ)} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٢٧٥١٠)، وَالترمِذِيُّ بِرقم: (٢٠٥٩)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالطَّبَرَانِي بِرقم: ٣٧٩)، وَالبَيْهَقِيُّ بِرقم: (١٩٣٧١)}.

واتە: ئەسمائی کچی عومەیس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! منداڵەکانی جەعفەر، چاو کاریان تێدەکات، (دیارە جوانو بەرچاو بوون) بە چاوەوە دەبن چاوێنیی دەبن، ئایا دوعایان بۆ بکەم، (واتە: دوعایەکیان بۆ بکەم لە چاو پارێزراو بن)[1]، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، (واتە: دوعایان بۆ بکە، دوعای پاراستن لە چاو)، چونکە ئەگەر شتێك پێش قەدەری خوا کەوتبایەوە، چاو پێشی دەکەوتەوە، یانی: کاریگەرییەکەی هێندە خێرایە .

بەڵێ: نەفەرێك لەو سەری دنیا بێ، یەکێکی دیکە لێرە بێو بۆی باس بکەن، مەرج نیە بیبینێ، وەك دوایی باسی دەکەین، بەڵکو لە زەینی خۆیدا، لە خەیاڵی خۆیدا، وێنای بکاتو، نەفسی خۆی ئاڕاستە بکات، لەوێ لەو کاتەدا کە ئەو لە نەفسی خۆیدا ئامادەی دەکات، دەگونجێ کاریگەریی خراپی تێبکات، واتە: کاریگەریی چاو، ڕەنگە لە تیشکیش خێراتر بێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر هەر شتێك پێش قەدەر کەوتبایەوە، ئەوە چاو پێشی دەکەوتەوە، واتە: کاریگەریی چاو، هەڵبەتە

١) (استرقى رُقيةً)، واتە: داوای دوعای کرد، زانایان بە گشتی دەڵێن: دروستە دوعا بە زارەکیی بخوێندرێو، ئەوە هیچ ئیشکالی تێدا نیە، بەڵام ئایا دروستە بشنووسرێ؟ لەوبارە ڕاجیایی هەیە، هەندێکیان ڕایان وایە، کە بەڵێ دروستە بشنوسرێ، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: دەبێ تەنیا بەسەریدا بخوێنرێ .

کاریگەریی چاویش هەر بەشێکە لە قەدەری خوا، چونکە هیچ شتێك لە قەدەرو لە چوار چێوەی ویستی خوای پەروەردگار ناچێتە دەری.

فەرموودەی نۆیەمو کۆتایی : {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَهَا أَنْ تَسْتَرْقِيَ مِنَ الْعَيْنِ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٧٥١٠)، وَمُسْلِمٌ: ٥٨٤٩)، وَإبن حِبان برقم: (٦١٠٣)}.

واتە: دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوە کە داوای دوعا بکات بۆ چاو .

واتە: ئەگەر چاوی پیس لێیداو کاریگەریی خراپی لەسەری بوو، دوعا بکات، داوای دوعا بکات بۆ ئەوەی چاك ببێ، یاخود بۆ خۆی دوعا بکات بۆ ئەوەی چاك ببێ، دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ: بۆ ئەوەی چاوی پیس کاریگەریی لەسەری نەبێو بە چاوەوە نەبێ، چاوێتیی نەبێ چاوو زار کاریگەریی خراپی لەسەری نەبێ، دوعای پاراستن بکات، واتە: ئەو دوعایە هەم دەگونجێ دوای کاریگەریی چاوەکە بێ، هەم دەشگونجێ پێش ئەوە بێ، وەك قەڵغانێكو سوپەرێك لەسەر سەری خۆی ڕایبگرێ.

ئەمەش بەڵگەی دووەم لەسەر ڕاستیيو کاریگەریی چاو .

بەڵگەی سێیەم: کە بریتیە لە قسەی زانایان لەسەر کاریگەریی چاو، یان چاوو زار، ئێمە قسەی دوو لە زانایان بۆ نموونە دێنینەوە :

یەکەمیان : (الشوكاني) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] دەڵێ: (وَقَدْ أَنْكَر بَعْضُ الْمُعْتَزِلَة كَأَبِي هاشم والبَلْخِي أَن للعَيْن تَأثِيراً، وبالجُمْلَة: فَقَول هَؤلاءِ مَدْفُوعٌ بالأَدِلَة المتَكاثِرَة وإجْماع من يُعْتَدُّ بهِ ، مِنْ هَذِهِ الأُمة سَلَفاً وَخَلَفاً، وَبِما هُوَ مُشاهَدٌ فِي الوُجُودِ، فَكَمْ مِنْ شَخْصٍ مِنْ هَذَا النَّوْعِ الإنْسانِي وَغَيْرِهِ مِنْ أَنْوَاعِ الحَيْوَان، هَلَكَ بهَذَا السَّبَبِ) .

---

١) فَتحُ القَدير: ج ٣، ص ٤٨ .

دوای ئەوەی باسی کاریگەریی چاو دەکاتو، لەوبارەوە ئاماژە بە هەندێ فەرمووده دەکات، دەڵێ: هەندێك لە موعتەزیلەکان، وەك ئەبو هاشمو بەلخیی، نکووڵییان لەوە کردوە، کە چاو کاریگەریی خراپی هەبێ، دوایی دەڵێ: بە کورتیی: قسەی ئەوانە ڕەتکراوەیە، بە بەڵگەی زۆرو بە یەکدەنگیی هەموو ئەوانەی لە زانایانی پێشینو پاشین کە لە ئۆممەتی ئیسلام، ئیعتیبار بە قسەیان دەکرێو بایەخیان پێ دەدرێ .

بەوەش کە دەبینرێ لە دنیای واقیعدا، {واتە: ئەگەر زانایانیش، وا نەڵێنو بەڵگەش لەوبارەوە نەبێ، بەڵگەی نەقڵیی}، ئەوەندە بەسە کە لە دنیای واقیعدا ئەوە دەبینرێ، چەندان کەسی وا هەبوون لەم جۆری مرۆڤ، هەروەها لە جۆری ژیاندارانی دیکە، کە بەهۆی چاو لێدانەوە، {بەهۆی بە چاوەوە بوونەوە} لە بەین چووە .

دووەمیان: (إبن القَيِّم) کە ئەو وردترو ڕوونتر باس دەکات لە کتێبی (زاد المعاد فِي هَدي خير العباد)، لە ژێر ناوونیشانی: (البحث مِن هَديه فِي عِلاج العَيْنِ)، باسێك دەربارەی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بۆ چارەسەری چاو، واتە: بۆ چارەسەری چاو لێدانو بە چاوەوە بوون .

(جمال الدين القاسمي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، چەند قسەیەکی زۆر جوان لە (إبن القيم)ەوە، لە کتێبی : (زادُ المَعاد)ەوە، نەقڵ دەکات، دەڵێ :

{فأبطلت طائفة ممن قلَّ نصيبُهم مِن السمع والعقل، أمْرَ العَيْن، وقالوا: إنما ذلك أوهامٌ لا حقيقة لها، وهؤلاء مِن أجهل الناس بالسَّمعِ والعقل، ومِن أغلظهم حِجاباً، وأكثفِهم طِباعاً، وأبعدِهم عن معرفة الأرواح والنفوسِ، وصفاتها وأفعالِها وتأثيراتها، ولا يمكن لعاقل إنكارُ تأثير الأرواح في الأجسام، فإنَّه أمر مُشاهَدٌ محسوس، وأنت ترى الوجهَ كيف يحمَرُّ حُمرةً شديدة ، إذا نظر إليه مَن يحتشِمُه ويَستحي منه، ويَصْفَرُّ صُفرةً شديدة، عند نظر مَن يَخافُه إليه، ولشدَّة ارتباطها بالعَيْن، يُنسب الفعل إليها، وليست

١) محاسن التأويل: ج ٦، ص (٢٥٣، ٢٥٤، ٢٥٥).

هي الفاعلة، والتأثيرُ غيرُ موقوف على الإتصالات الجسمية، كما يظنُّه مَن قلَّ علمُه ومعرفته بالطبيعة والشريعة، بل التأثيرُ يكون تارةً بالإتصال، وتارةً بالمقابلة، وتارةً بالرؤية، وتارةً بالوهم والتخيُّل، ونفسُ العائن لا يَتَوقَّفُ تأثيرُها على الرؤية، بل قد يكون أعمى، فيُوصف له الشيُء، فتؤثِّرُ نفسه فيه، وإن لم يره، وقد قال تعالى لنبيه: ﴿وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾﴾ القلم، وقال: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾﴾، فكلُّ عائنٌ حاسد، وليس كلُّ حاسد عائناً، فلما كان الحاسد أعمَّ من العائن، كانت الإستعاذةُ منه، استعاذةً من العائن}.

واتە: كۆمەڵێك لەوانەی كە پشكو بەشیان كەم بووە، هەم لەو زانیارییەی كە لە ڕێی بیستنەوە وەردەگیرێ، (واتە: زانیاریی نەقڵو وەحیی)، هەم لەو زانیارییەی كە لە ڕێی عەقڵو ئەزموونەوە پەیدا دەبێ، نكوولّییان كردوە لە كاریگەریی چاوو گوتوویانە: ئەوە هەر هەندێ وەهمو خەیاڵەو هیچ ڕاستییو نێوەڕۆكێكی نیە، ئنجا ئەوانە لە نەزانترینی خەڵكین، هەم بەو زانیارییانەی لە ڕێی بیستنەوە وەردەگیرێن، هەم بەو زانیارییانەی بە عەقڵ وەردەگیرێن، ئەوانە لە هەموویان زیاتر پەردەیەكی ئەستووریان لەبەر چاوەو لە هەموویان سروشتیان زبرترە، (واتە: سروشتیان وا نیە كە زانیاریی وەربگرێو ڕوون بێ) لە هەمووشیان دوورترن لە شارەزایی بە ڕووحەكانو نەفسەكانو سیفەتیانو كردەوەیانو كاریگەرییان، هەروەها هیچ كەسێكی ژیر ناتوانێ كاریگەریی ڕووحەكان لە جەستەكاندا، نكوولّیی لێبكات، چونكە شتێكی بینراوو هەست پێكراوە، تۆ مرۆڤ دەبینی: ئەگەر كەسێك كە شەرمی لێدەكات، تەماشای بكات، ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕێو، ئەگەر كەسێك تەماشای بكات، كە لێی دەترسێ: ڕەنگی ڕەنگی زەرد دەبێ، {ڕەنگی سوور دەبێتەوە لە كاتی شەرم كردنداو، لە كاتی ترساندا، ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ، ئاشكراشە: ڕووحەكەیە كە شەرم دەكات یان دەترسێ بەڵام كاریگەرییەكە لەسەر ڕووی دەردەكەوێ} ئنجا لەبەر ئەوەی ئەو كاریگەرییەی ڕووح زۆر پەیوەندیی بە چاوەوە هەیە،

بۆیە پاڵدراوەتە لای چاو، ئەگەرنا چاوەکە نیە کە کاریگەرییەکەی دەبێ {لە کاتێکدا کە زیان بە شتێك دەگات، کە دەڵێن: بە چاوەوە بوو، چاوێنیی بوو چاوو زار لێیدا، بەڵکو کاریگەرییەکە هی ڕووحە، قسەکەشی زۆر ڕاستە، زانایانی پێشێ، هەڵبەتە هی ئێستا بۆیان دەرکەوتوە: وانیە، بەڵام هی پێشێ گوتوویانە: ماددەیەك لە چاوەوە دەچێ لەو شتەی بەرانبەر دەدا، هەندێکی دیکە گوتوویانە: نەخێر ڕسمێك لەوەو دێ بۆ نێو چاو، ئنجا ئەویش لە وەهمی خۆی دا وێنەی دەکات، بەڵام بە حەقیقەت کاریگەرییەکە هی ڕووحە، بەڵام لە ڕێی چاوەوە کە دەیبینێو سەرسام بوونەکەو ئیعجابەکە دەردەبڕێ}، ئنجا کاریگەرییەکە پەکی نەکەوتوە لەسەر ئەوە کە جەستەکان، بە یەکدی بکەونو ماددە بە ماددە بکەوێ، وەك هەندێك لەوانەی کە زانیارییان کەمە، سەبارەت بە سروشتو شەریعەت وا دەڵێن، بەڵکو کاریگەرییەکە جاری وا هەیە بە هۆی پێکەوە پەیوەست بوونێك دەبێو، جاری وایە بە هۆی ڕووبەڕوو بوونەوەوە دەبێو، جاری وایە بە هۆی هێنانە نێو وەهمو خەیاڵەوە دەبێ، نەفسی بابای چاو لێدەریش کاریگەرییەکەی لەسەر بینین پەکی نەکەوتوە، بەڵکو جاری وایە بابایەکی کوێر شتێکی بۆ وەسف دەکرێ، یەکسەر نەفسی کاریگەریی خراپی لەسەر دادەنێ، با نەشیبینێ، {یان جاری وایە چاویشی هەیە، بەڵام شتێکی بۆ وەسف دەکەن کە لەوێ نیە، دەڵێن: فلان کەس گایەکی وای هەیە، یان فلان کەس ماڵێکی وای هەیە، فلان کەس کوڕێکی وای هەیە، ئەویش دەیهێنێتە نێو وەهمو خەیاڵی خۆیو دەتوانێ کاریگەریی خراپی لەسەر دابنێ}، بۆیەش خوای بەرز بە پێغەمبەری خۆی ﷺ فەرمووە: ﴿ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ ... ﴿٥١﴾ ﴾القلم، واتە: ئەوانەی بێبڕوان خەریکە بە چاویان تۆ بخلیسکێنن ...، هەروەها بۆیە خوا پێی فەرمووە : ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾الفلق.

واتە: بڵێ: پەنا دەبەم بە پەروەردگاری لێك جیاكەرەوەی بوون‌و نەبوون، (یان تاریكیی‌و ڕووناكیی) لە خراپەی هەر شتێك كە دروستی كردوەو، لە خراپەی شەوی تاریك كە دادێ‌و، لە خراپەی ئەو ئافرەتە جادووگەرانەی كە فوو لە گرێیەكان دەكەن‌و، لە خراپەی بابای حەسوود كە ئیش بە حەسەدەكەی دەكات. {حەسوودییەكەی دەخاتە بواری جێبەجێكردنەوە} هەموو چاو لێدەرێك، هەموو چاو پیسێك (عائن)، {واتە: ئەو كەسەی كە بە چاو، كاریگەریی خراپ لەسەر بەرانبەر دادەنێ} حەسوود (حاسد)یشە، بەڵام هەموو حەسوودی بەر(حاسد)ێك، مەرج نیە چاو پیس بێ، ئنجا لەبەر ئەوەی حەسوودیی، گشتییترە لە چاو پیس بوون، بۆیە پەنا بردن بە خوا، لە خراپەی حەسوودیی، شەڕو خراپەی چاویش دەگرێتە نێو خۆی .

## بڕگەی دووەم: حوكمی بابای چاو پیس چییە ؟

دیسان قسەیەكی (إبن القَیمِّ)، دێنین هەر لە (زادُ المَعادَ)ەكەی خۆی دا، كە (القاسمي)[١] لێی دەخوازێتەوە، دەڵێ: (وَقد قَالَ أصحابنا وَغَیرُهُم مِن الفُقَهاءِ: إنَّ مَنْ عُرِفَ بِذلِكَ، حَبسَهُ الإِمامُ وأجرَى لَهُ ما یُنفَقُ عَلیهِ إلى الموتِ، وَهَذَا هَوَ الصَّوابُ قَطعاً).

دەڵێ: هاوەڵانی ئێمەو غەیری ئەوانیش لە شەرعزانان، {هاوەڵانی ئێمە، واتە: حەنبەلییەكان، چونكە هەم (إبن تَیمیة)، هەم (إبن القَیُم) حەنبەلیی مەذهەب بوون، واتە: شوێنكەوتووانی قوتابخانەی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل بوون، خوا لە هەموویان ڕازی بێ‌و لێیان خۆش بێ}، گوتوویانە: هەر كەسێك بەوە بناسرێ كە بە چاو كاریگەریی خراپ لەسەر خەڵك دادەنا، یان لەسەر شتەكان دادەنێ‌و بە چاویانەوە دەكات، دەبێ حوكمڕان، بیخاتە بەندیخانەوەو نەفەقەیەكی بۆ ببڕێتەوە، بژیوێكی بۆ دیاریی بكات‌و نەیەتە دەرێ، بۆ ئەوەی خەڵك بەهۆیەوە تووشی زیان نەبن، تاكو مەرگی دەگاتێ، هەرئەوەش قسەی ڕاستە بە دڵنیاییەوە .

---

[١] ج ٦، ص ٢٥٦.

هەڵبەتە کەسێك کە ئەزموون کراوبێ وایە، دەڵێن: هی وا هەیە کە چاوی لە مرۆڤدا، ڕەنگە هەر بیشیکوژێ، کاریگەرییەکەی هێندە بەهێزە، یاخود تووشی نەخۆشییەکی خراپ، یان تووشی بەڵایەکی زۆر خراپی دەکات، کە ئەوە لە نێو هەموو میللەتاندا شتێکی باوەو شتێکی بە ئاشکرا زانراوە .

(الشوکاني) لە (الفَتحُ القَدیرَ)ەکەی، خوای دا[1]، دەڵێ: {وَقَدِ اخْتَلَفَ العُلَماء فِيمَن عُرِفَ بالإصَابة بالعَيْنِ، فَقَالَ قَوْمٌ: يُمْنَعُ مِنَ الإتِّصَالِ بالناسِ دَفْعاً لِضَرَرِهِ بحبْسٍ أَوْ غَيْرِه، مِنْ لُزُومِ بَيْتِهِ، وَقِيْلَ: يُنْفَى، وَأَبْعَدَ مَنْ قَالَ: إنَّهُ يُقْتَلُ إلاَّ إذَا كَانَ يَتَعَمَّدُ ذَلِكَ، وَتَتَوقَّفُ إصَابَتهُ عَلَى اخْتيارِهِ وقَصْدِهِ، وَلَمْ يَنْزجر عَنْ ذَلِكَ، فَإِنَّهُ إِذَا قَتَلَ، كَانَ لَهُ حُكْمُ القَاتِلِ} .

واتە: زانایان کەوتوونە ڕاجیاییەوە، لەبارەی کەسێکەوە کە بەوە ناسراوە: خەڵك بە چاوەوە دەکات، چاو لە خەڵك دەدا، خەڵك چاوێنیی دەکات، کۆمەڵێك گوتوویانە: ڕێی لێدەگیرێ بچێتە نێو خەڵك، بۆ ئەوەی زیان بە خەڵك نەگەیەنێ، جا چ بخرێتە بەندیخانەوە، چ لە ماڵی خۆیدا، دەستبەسەر بێ {بڵێن: مەچۆ دەرێو ڕێی لێبگیرێ}، هەروەها هەندێ گوتوویانە: لەو وڵاتە نەفی دەکرێو دوور دەخرێتەوە بۆ شوێنێکی دی .

بەڵام هەندێکی دیکە دوورتر ڕۆیشتوون، (یانی: نەیانپێکاوە) کە گوتوویانە: دەبێ بکوژرێ، مەگەر بە ئەنقەست وا بکات، چاو لە خەڵك بداو، چاو لە خەڵك دانەکەشی پەیوەست بێ بە ویستی خۆیەوە، پاشان هەرچەندە پێی گوترا بێو سەرزەنشت کرابێ، وازی نەهێنا بێ، ئەوە ئەگەر لەسەری چەسپا کە خەڵکی کوشتوە (بە هۆی چاو لێدانیەوە) ئەو کاتە حوکمی بکوژی هەیە .

هەڵبەتە پێویستە ئەوەش بزانرێ کە: چاوو زار، چاو لێدان، جاری وا هەیە ئەو مرۆڤە ئاگای لە خۆ نیەو بەبێ ویستی خۆی، چاو لە خەڵك دەدات، ئنجا ئەگەر بەبێ ویستی خۆی بێ، ئەو کاتە حوکمێکی دیکەی هەیە .

---

١) فتح القدير، ج ٣، ص ٤٨.

من بیستوومە: ئافرەت، پیاو گوتوویەتی: جاری وا هەیە زیان بە منداڵەکانی خۆشم دەگەیەنم، زیان بە مەڕوماڵی خۆم دەگەیەنم، زیان بە بەرژەوەندییەکانی خۆشم دەگەیەنم، دوایی بۆم دەرکەوتووەو هەستم پێ کردوە کە چاو لە شتی خۆشم دەدەم، لە کوردەواریی دا بەو حاڵەتە دەروونیە دەڵێن: پێی هەڵکاڵی، واتە: پێی سەرسام بوو، مرۆڤ کە بە شتێك زۆر سەرسام بوو، سەرنجی ڕاکێشا، ئەو کاریگەرییەی لەسەر دادەنێ، بەڵام هەیە بە خۆی دەزانێ‌و ویست‌و ئیرادەی خۆی ئاڕاستەی ئەو شتە دەکات، ئەو کاتە حوکمەکەی جیایە، لەوەی بە خۆی نەزانێ‌و ئەو کاریگەرییە خراپەی هەبێ، ئەو کاتە ئەگەر گریمان خەڵك بە دەستی بچێ، ئەوە وەك کوشتنی هەڵە وایەو، دیارە حوکمەکەی دەگۆڕێ، بەڵام ئەوەی هەستی بە خۆی کرد، کە ئەو حاڵەتەی هەیە، دەبێ حیسابی خۆی بکات‌و، ئاگای لە خۆی بێ، ئەگەرنا بەرپرسیار دەبێ .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٦٩ تاکو ٧٩)، کە ئاڵقەی دەیەمی زنجیرەی بەسەرهاتی یوسوف عليه السلامی گرتۆتە خۆی، لەو یازدە ئایەتەدا، باسی دووبارە چوونەوەی برایەکانی یوسوف بە بنیامینیشەوە، بۆ میسر کراوە، کە یوسوف خۆی بە بنیامینی برای دەناسێنێ.

پاشان لە کاتی ئامادەکردنی ئازووخەدا بۆ برایەکانی، دوای ئەوەی کە بارەکانیان بۆ ئامادە دەکەن، پێوەری ئازووخە (سقاية)، کە جامێك بووە، قاپێك بووە، پادشا ئاو یان شەرابی پێ خواردۆتەوەو، دوایی کراوە بە پێوەر بۆ ئازووخە، دەخاتە باری بنیامینی برایەوە، دواتر جارچیی جاڕ دەدا: ئەی کاروان! ئێوە دزن، ئەوانیش بەرەو ڕوویان دێن و دەڵێن: بۆچی؟ چیتان لێ ونبووە! دەڵێن: ڕبە، یان ئاو خۆری پادشامان لێ ون بووە، ئەو شتەی کە ئازووخەکەی پێ دەپێورێ، هەر کەسێکیش بیهێنێتەوە، باری حوشترێکی ئازووخە دەدەینێ وەك خەڵات و دیاریی و، جارچییەکە دەڵێ: منیش کەفیلی ئەوەم کە ئەو ئازووخەیەی دەدەینێ بە خەڵات، ئەگەر ئەو قاپەمان بۆ بێنێتەوە.

ئەوانیش سوێند دەخۆن کە بۆ خراپەکاریی نە هاتوون بۆ میسرو، هەرگیز دزییشیان نەکردووەو دەڵێن: ئێوەش ئێمە دەناسن، لایەنی بەرانبەریش یوسوف عليه السلام و جارچییەکە پێیان دەڵێن: ئەدی ئەگەر ڕاستتان نەکرد، ئایا ئەو کەسەی ئاو خۆرەکە لە بارەکەیدا دۆزرایەوە سزای چییە ؟! دەڵێن: هەر کەسێ لە بارەکەی دا دۆزرایەوە، خۆی دەبێتە سزای دزییەکەی، واتە: دەبێتە کۆیلە بۆ ئەو کەسەی کە دزییەکەی لێ کردوە.

ئیدی بە فەرمانی یوسوف دەست دەگرێ بە پشکنینی بارەکانو لە بارەکانی برایەکانیەوە دەست پێ دەکات، (بۆ ئەوەی هیچ گومانیان بۆ ئەوە نەچێ کە ئەوە شتێکی پلان بۆ دارێژراوو نەخشە بۆ کێشراوی پێشێیە) .

سەرەنجام دوای ئەوەی کە لە پشکنینی بارەکانی برایەکان هەموویان دەبێتەوە، دەفرەکە لە باری بنیامینی برای دەردێنێ، ئەوانیش دەڵێن: ئەگەر ئەمە دزیی بکات، برایەکی دیکەشی پێشتر دزیی کردوە، یوسوفیش ئەوە لە دڵی خۆیدا پەنهان دەکات، واتە: پێناخۆش بوونی ئەو قسەیە، کە تۆمەتبارکردنی خۆشیەتیو بنیامینیشە .

ئنجا یوسوف دەڵێ: ئێوە لەوە خراپترن، هەر خواش زانایە بەوەی کە دەیڵێن، ئایا ڕاستە، یان درۆیە؟ ئنجا زۆر داوا لە یوسوف دەکەن کە : لەبەر ئەوەی بنیامین بابێکی پیری بەساڵداچووی هەیە، با یەکێکمان لە جێی بین، واتە: یەکێکمان لە جێی بنیامین گل بدەوە، لەبەر ئەوەی بابمان زۆر دڵی پێوەیە، بەڵام یوسوف قبووڵ ناکاتو دەڵێ: پەنا بە خوا دەگرم کە جگە لەو کەسەی شتەکەمان لە بارەکەی دا دۆزیوەتەوە، گل بدەینەوە، چونکە ئەو کاتە ئێمە بە ستەمکار لە قەڵەم دەدرێین، ئێمەش خۆمان لە ستەم بە دوور دەگرین .

﴿ وَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَخَاهُۖ قَالَ إِنِّيٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٦٩ فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِي رَحۡلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلۡعِيرُ إِنَّكُمۡ لَسَٰرِقُونَ ٧٠ قَالُواْ وَأَقۡبَلُواْ عَلَيۡهِم مَّاذَا تَفۡقِدُونَ ٧١ قَالُواْ نَفۡقِدُ صُوَاعَ ٱلۡمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمۡلُ بَعِيرٖ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٞ ٧٢ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ عَلِمۡتُم مَّا جِئۡنَا لِنُفۡسِدَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ٧٣ قَالُواْ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمۡ كَٰذِبِينَ ٧٤ قَالُواْ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحۡلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ٧٥ فَبَدَأَ بِأَوۡعِيَتِهِمۡ قَبۡلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسۡتَخۡرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِۚ كَذَٰلِكَ كِدۡنَا لِيُوسُفَۖ مَا كَانَ لِيَأۡخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلۡمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ وَفَوۡقَ كُلِّ ذِي عِلۡمٍ عَلِيمٞ ٧٦ ۞ قَالُوٓاْ إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفۡسِهِۦ وَلَمۡ يُبۡدِهَا لَهُمۡۚ قَالَ أَنتُمۡ شَرّٞ مَّكَانٗاۖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ٧٧ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبٗا شَيۡخٗا كَبِيرٗا فَخُذۡ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٧٨ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأۡخُذَ إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّظَٰلِمُونَ ٧٩ ﴾.

## مانای وشـه بە وشـەی ئایەتەکـان

{ کاتێك (یازده برایەکە) چوونە ژوور ئەو شوێنەی یوسوف، برایەکەی خۆی (بنیامین)ی بردە لای خۆی (و بە پەنامەکیی) گوتی: من برایەکەی خۆتم، دەجا بەوەی کاتی خۆی (برایەکانمان دژ بە هەردووکمان) کردیان، خەمبارو پەژموردە مەبە ﴿٦٩﴾ ئنجا لە کاتی ئازووخە بۆ ئامادەکردنیاندا، ئاوخۆر (ی پادشا)ی خستە نێو باری برایەکەی (بنیامین)ەوە، پاشان جارچییەك جاڕی دا: ئەی کاروان! بە دڵنیایی ئێوە دزن ﴿٧٠﴾ بە ڕوو تێکردنیانەوە گوتیان: چیتان لێ ونبووە؟ (چ شتێکتان دیار نیە) ﴿٧١﴾ گوتیان: پێوانەی پادشامان لێ ون بووەو هەر کەسێك بیهێنێتەوە، بارێکی حوشتر (ئازووخە)ی وەك خەڵات هەیە، منیش ئۆباڵداری (دابینکردنی) ئەو (خەڵات)ەم ﴿٧٢﴾ (یازده برایەکە) گوتیان: بە خوا ئێوە دەزانن کە ئێمە نەهاتووین خراپەکاریی و تێکدان لە زەمین (ی میسر)دا بکەین، ئێمەش هەرگیز دز نەبووین، ﴿٧٣﴾ گوتیان: ئەگەر ئێوە درۆکار بوون (لە بارەکانی ئێوە دابوو) سزاو تۆڵەی چییە؟ ﴿٧٤﴾ (کوڕەکانی یەعقووب) گوتیان: سزایەکەی ئەوەیە هەر کەسێك ئەو (پێوانەیە) لە نێو بارەکەیدا دۆزرایەوە، بۆ خۆی دەبێتە تۆڵەو قەرەبووی (یانی دەبێتە کۆیلەی بابای دزیی لێکراو، ئێمەی کوڕانی یەعقووب بە بۆچوونی خۆمان) بەو شێوەیە سزای ستەمکاران دەدەین ﴿٧٥﴾ {ئیدی (یوسوف) دەستیکرد بە پشکنینو} لە (پشکنینی) جەواڵەکانی ئەوانەوە، (دە برایەکانیەوە) دەستی پێکرد، پێش جەواڵی برایەکەی (بنیامین) دوایی لە جەواڵی برایەکەی دەریهێنا، بەو شێوەیە پلانمان بۆ یوسوف دانا، چونکە بە پێی بەرنامەو ئایینی پادشا، بۆی نەبوو برایەکەی لە لای (خۆی) گل بداتەوە (بیکاتە کۆیلە) مەگەر خوا بیەوێ کارێك بکات (ئەو کاتە هەر جێبەجێ دەبێ) هەر کەسێکمان بوێ چەندان پلە بەرزی دەکەینەوەو، لە

سەرووی هەر خاوەن زانیارییەکەوە، زاناتر هەیە ﴿٧٦﴾ (دە برایەکانی) گوتیان: ئەگەر (بنیامین) دزیی بکات بێگومان برایەکیشی لەوەو بەر دزیی کردوە، یوسوفیش لەبەرخۆیەوە بە پەنهانیی، بۆ ئەوەی بۆیان ئاشکرا بکات، گوتی: ئێوە خراپترن (لەو دوو برایەتان کە بە ناهەق تۆمەتباریان دەکەن بە دزیی) خواش زاناترە بەوەی باسی دەکەن، ﴿٧٧﴾ (دە برایەکان) گوتیان: ئەی عەزیز! بە دڵنیایی ئەو (برایەمان کە پێوانەکەی پادشا لە بارەکەی دا بوو) بابێکی پیری بەساڵداچووی هەیە، دەجا یەکێك لە ئێمە لە شوێنی بگرە (گل بدەوە) بەڕاستیی ئێمە لە چاکەکارانت دەبینین (ئەو چاکەیەشمان لەگەڵدا بکە) ﴿٧٨﴾ (یوسوف) گوتی: پەنا بە خوا کە هیچ کەس بگرین، جگە لەو کەسەی کە کەلوپەلی خۆمان لەلای دۆزیوەتەوە، ئەگەر وا بکەین کەواتە: ئێمە ستەمکارین ﴿٧٩﴾} .

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَخَاهُ )، واتە : برایەكەی لە خۆی نیزیك خستەوە، (ضَمَّ أَخاهُ إِلَيهِ، أَوَى إِلَى كَذا: إِنضَمَّ إِليهِ، يأوي أُوِيّاً وَمأوىً، وَآواهُ غَيرُهُ يُؤْوِيهِ إِيواءً)، (أَوَى إِلَى كَذا)، واتە: چووە پاڵی، لێی نیزیك بۆوە، (يأوي أويا وَمأوى) هەردووكیان چاوگن، (وَآواهُ غَيرُهُ يُؤْوِيهِ إِيواءً)، واتە: غەیری خۆی ئەوی پەناداو پەنای دەداو پەنادان .

( فَلَا تَبۡتَئِسۡ ) : (أَي لاَ تَلزَمِ البؤسَ وَلا تَحزَن، البؤسُ والبأسُ والبأساءُ: الشدة وَالمكروهُ)، (فلا تبتئس) واتە: خەمبار مەبە، پەیوەست مەبە بە پەژموردەییو خەمبارییەوە، وشەی (بؤسُ وبأسُ وبأساءُ)، هەر سێكیان بە مانای سەختییو، بە مانای شتێكن ناخۆشویستراو دێن .

( فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ ) : (جِهازوجَهاز: ما يُعَدُّ مِن مَتاعٍ وَغَيرِهِ)، (جِهاز وجَهاز) هەر شتێكە كە ئامادە بكرێ لە كەلوپەل، كە لێرەدا بە تەئكید مەبەست پێی ئازووخەیە، كاتێك كە ئازووخەكەی بۆ ئامادە كردن، (التَجهيزُ: حَملُ ذلِكَ أَو بَعثُهُ)، (تَجهيز)، بریتیە لەوەی كە ئەو شتەی بۆ بار بكرێ، یاخود بنێردرێ .

( ٱلسِّقَايَةَ ) : (تَسمية السِّقَاية تَنبيهاً على أَنَّهُ كان يُسقَى بِهِ)، (سقاية) دەگونجێ بڵێین: ئاوخۆر، یان ئاو پێخۆرەوە، دەفرێكە كە ئاوی پێدەخورێتەوە، بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە، چونكە هەرچەندە ئێستا ئازووخەی پێ پێوراوە، پێوانە بووە بەڵام پێشتر دیارە ئاو پێخوراوە بووە، ئاوخۆر بووە، پادشا ئاوی یان مەی پێ خواردۆتەوە .

( مُؤَذِّنٌ ) : (المُؤَذِّنُ: كُلُّ مَن يُعْلِمُ بِشيءٍ نِداءً)، (مؤذّن) هەر كەسێكە كە بەهۆی بانگ كردنەوە، خەڵك لە شتێك ئاگادار بكاتەوە .

( أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ ) : وشەی (العیر) بە مانای کاروان دێ، بەڵام لێرەدا بە (مؤنث) هاتوە، لەبەرئەوە، دەڵێ: (العِيرُ: القَومُ الَّذِينَ مَعَهُم أحمالُ المِيرَةِ، وذلِكَ سمُ للرجالِ وَالجِمالِ الحَامِلة للمِيرَةِ)، (عِیر) کۆمەڵە خەڵکێکن کە باری ئازووخەیان هەڵگرتوە، ئازووخەیەك کە دەبرێتەوە بۆ کەسوکاریان، لێرەدا وشەی (عِیر) ناوە بۆ پیاوەکانیش و بۆ حوشترەکانیش کە بارەکانیان هەڵگرتوون، بۆ خودی بارەکانیش، بۆ هەر سێکیان.

(تَفْقِدُونَ ) : (الفَقدُ: عَدْمُ الشيءِ بَعدَ وُجودِهِ، فَهُو أخَصُ مِنَ العَدَمِ)، (فَقْد)، بریتیە لەوەی شتێك دوای ئەوەی بووە، نەمێنێ، کەواتە: تایبەتترە لە نەمان . (عَدَمْ)، ئەوەیە کە شتێك هەر نەبووبێ، بەڵام (فَقْد)، ئەوەیە کە شتێك بووبێو دوایی نەمابێ، ﴿ مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴾، واتە: چیتان نەماوە، چیتان لێ ونبووە ؟

( صُوَاعَ ) : (صُوَاعَ)، و (صَاع) هەر یەکن، ﴿ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ ﴾، واتە: پێوانەی پادشا، ئەوەی کە دەغڵو دانەوێڵەکەی، ئازووخەکەی پێ پێوراوە، گوتراوە: (كانَ إناءً يَشرَبُ بِهِ وَيُكالُ بِهِ)، قاپێك بووە، دەفرێك بووە پادشا هەم ئاوی پێخواردۆتەوە، یاخود شەڕاب، هەم ئازووخەو دانەوێڵەشی پێ پێوراوە، ئنجا وشەی (صَاع) یان (صُوَاع)، هەم بە (مُذكر)، (المُذكر المجازي)، هەم بە (مؤنثِ)یش دێ، ﴿ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ ﴾، لێرەدا مەبەست پێی پێوانە (مكيال)ە، ئەو جامو دەفرەی کە پێی دەپێوردرێ، جاری واش هەیە (صَاع) بە خودی پێوراوەکە دەگوترێ، وەك پێغەمبەر ﷺ کە باسی فیدیەی کردوە، یان کەفارەت فەرموویەتی: {صَاعٍ مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعٍ مِنْ شَعِيرٍ)، (صاع)ێك لە خورما، یاخود (صاع)ێك لە جۆ، (صاع) واتە: ڕبەیەك، (صاع)ێکیش چوار مستە .

( حِمْلُ بَعِيرٍ ) : واتە: بارێکی حوشتر، (الحِملُ: المَحمولُ على ظَهرِ البَعِيرِ)، واتە: ئەو ئەندازەیەی کە لەسەر پشتی حوشتر بار دەکرێ، بارێکی حوشتر، ئازووخەو دانەوێڵە .

( زَعِيمٌ ) : واتە: کەفیل، ئۆ بالّدار، (الزَّعامة: الكَفالة).

( بِأَوۡعِيَتِهِمۡ ) : (أَوعِيَه)، كۆی (وِعاء)ە، هەر شتێكە كە شتی تێ بكرێ، كە من لێرە بە جەوالّم هێناوە، چونكە كاتی خۆی جەوالّ هەبووە بە دەست چنراوەو، دەغلّو دانەوێڵەو گەنمو جۆو ئەوانەی تێكراوە، بۆ ڕێی دوور زۆر قایمو پتەوە، یان هەر شتێكی دیكە بوو بێ، گرنگ ئەوەیە هەر توورەكەیەك هەر شتێك، كە شتی تێبكرێ، پێی دەگوترێ: (وِعاء)، كە بە (أَوعِيَة)، كۆدەكرێتەوە، ئەویش لە چیەوە هاتوە؟ (الإيعاء: حِفظُ الأمتِعَةِ فِي الوِعاءِ، وَهُوَ الظَّرْفُ، مُشتَقٌّ مِنَ الوَعي وهو الحِفظُ)، (إيعاء)، بریتیە لەوەی كەلوپەلێك، شتێك، دانەوێلەیە، خواردنە هەر شتێكە لە (وعاء)دا، كە بریتیە لە زەرفێك توورەكەیەك بپارێزرێ، ئەویش لە (وعي)ەوە هاتوە، (وعي)، واتە: پاراستن، لە فەرموودەدا هاتوە: (أن يحفظ القَلبُ وَما وَعَاهُ)، واتە: لە دڵو ئەوەی كە دڵ دەیپارێزێو وەریدەگرێ، بیپارێزێ .

( شَرٌّ مَّكَانًا ) : (شَرّ) (إسم تَفضيل) لە (أَشَرّ)ەوە هاتوە، (ومكاناً : التمييزُ لِنِسبةِ الأَشَرِّ، أي: أَنتُم شَرٌّ حالةً مِنهُما، أو شَرُّ المكان)، واتە: ئێوە حاڵتان خراپترە لەوان، یاخود ئێوە دزیی خراپترتان كردوە، كە مەبەستی ئەوە بووە: ئێوە برایەكەی خۆتانتان لە بابتان دزیو شوێنە ونتان كرد (كە مەبەست یوسوف خۆیەتی) .

(شَيۡخًا ) : بە مانای پیر دێ، (كبیر)یش هەر بە مانای بە تەمەن گەورە دێ، بەلام یانی: زۆر بە تەمەن لە پیرییدا، زۆر بە ساڵداچوو، یان (شیخ)، یانی: بە تەمەن، پیر، (كَبیر)یش، یانی: گەورەی ئەو خەڵكو بنەماڵەو هۆزەی خۆی.

(مَعَاذَ ٱللَّهِ ) : (إنتُصِبَ هذا المَصدَرُ على المَفعولِيةِ المُطلَقَةِ نائِباً عَن فِعلِهِ المَحذوف، والتقدير: أَعوذُ بِاللهِ مَعاذاً، كَما قال: سُبحانَ اللهِ، عِوضاً عن أُسَبِّحُ لله..)، (مَعَاذَ ٱللَّهِ )، (مَعاذ) چاوگە، مەنصووب بووە، وەك (المَفعُول

لمُطلَقَ)و لە جێی کردارەکە دانیشتوە کە قرتێنراوە، ئەسڵی خۆی ئاوا بووە، (أَعُوذُ باللهِ مَعَاذًا)، وەك چۆن گوتراوە: (سُبحانَ الله)، واتە: (أُسَبّحُ اللهَ)، لە جیاتی ئەوەی بڵێن: (أُسَبِّحُ اللهَ)، گوتوویانە: (سُبحانُ الله)، ئنجا (سُبحانَ)، یان (مَعَاذًا)، هەردووکیان چاوگن، بەڵام لە شوێنی (مَفعول بِهِ)، دانیشتوونو پاڵدراونە لای (الله) .

## مانای گشتی ئایەتەکان

دوای ئەوەی یوسوف ﷺ برایەکانی بە ئازووخەوە ڕەوان دەکاتەوە، بەڵام داوایان لێدەکات، کە برایەکەیان لەگەڵ خۆیان بێنن، دەچنەوەو هەر چۆن بێ (بنیامین) لە بابیان دەستێننو، بابیان ئیقناع دەکەن بنیامینیان لەگەڵ بنێرێ، دێنەوە بۆ میسر.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَخَاهُ ﴾، کاتێك هاتنە ژوور ئەو شوێنەی یوسوف تێیدا دادەنیشت: کۆشکەکەی، ئەو شوێنەی لێیەوە سەرپەرشتیی فرۆشتنو پێوانی دەغڵو دانو ئازووخەی دەکرد لە میسرِ، ﴿ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَخَاهُ ﴾، برایەکەی، واتە: برایەکەی کە لە دایکیو لە بابیشیەتی، خستە پاڵ خۆیو لە خۆی وە نیزیکی خست، ﴿ قَالَ إِنِّيٓ أَنَا۠ أَخُوكَ ﴾، خۆی پێ ناساندو گوتی: من برایەکەتم، یانی: ئەو برایەت کە برایەکانت گوتیان: گورگ خواردوویەتی، من ئەوم، یوسوفم، ﴿ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، ئنجا دڵتەنگو خەمبار مەبە، بەهۆی ئەوەوە کە ئەو کاتە دەیانکرد، نەزانانەو نەفامانە، کە دەرهەق بە منو تۆ کەم لوتف بوون، دڵتەنگ مەبە، ئەوە بەسەرچوو .

﴿ فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِي رَحۡلِ أَخِيهِ ﴾، دوای ئەوەی ئەوەی کە بۆی هاتبوون، پێداویستیی سەفەری بۆ پێچانەوەو بۆ ئامادەکردن، کە بریتی بوو لە ئازووخەو دەغڵو دان، ئاوخۆرەکەی خستە نێو باری برایەکەیەوە، ئەو دەفرەی کە پادشا ئاوی پێ دەخواردەوە، کە دوایی بۆمان دەردەکەوێ، کە هی پادشا بووە، هەندێك دەڵێن: زیو بووە، هەندێك دەڵێن: زێڕ بووە، خستیە نێو باری برایەکەیەوە، کە مەبەست (بنیامین)ە .

﴿ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلۡعِيرُ إِنَّكُمۡ لَسَٰرِقُونَ ﴾، دوایی بانگ کەرێك، بانگی کرد جاڕچییەك جاڕیدا، هۆی کاروان! بێگومان ئێوە دزن، ﴿ قَالُواْ وَأَقۡبَلُواْ عَلَيۡهِم مَّاذَا

تَفۡقِدُونَ ﴾، ئەوانیش ڕوویان تێكردن، بەرەو ڕوویان هاتن و گوتیان: چیتان ون كردوە؟ چیتان دیار نیە، بۆچی بە دز تۆمەتبارمان دەكەن؟ ﴿ قَالُواْ نَفۡقِدُ صُوَاعَ ٱلۡمَلِكِ ﴾، گوتیان: پێوانەی پادشامان دیار نیەو ون كردوە، ﴿ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمۡلُ بَعِيرٖ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٞ ﴾، هەر كەسێك بیهێنێتەوە، باری حوشترێكی بۆ هەیە، باری حوشترێك چی؟ بە پێی سیاق دەزانین: ئازووخەو دەغڵ و دانە، ﴿ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٞ ﴾، جاڕچییەكە دەڵێ: منیش ئۆ باڵداری ئەوەم، من بەڵێندەری ئەوەم، ئەو داوایەی بۆ جێبەجێ دەكەم، هەر كەسێك ئەو (پێوانە)یە بهێنێتەوە، كە كاتی خۆی دەفری ئاو پێخواردنەوە، یان شەڕاب پێ خواردنەوەی پادشا بووەو، ئێستا كردوویانە بە پێوانە بۆ دەغڵ و دان، ﴿ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ عَلِمۡتُم مَّا جِئۡنَا لِنُفۡسِدَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، (برایەكان) گوتیان: سوێند بە خوا، ئێوە دەزانن كە ئێمە نەهاتووین تێكدان و خراپەكاریی بكەین لە زەوی دا، واتە: سەر زەمینی میسڕ، ﴿ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴾، هەروەها ئێوە دەشزانن كە ئێمە دز نەبووین، یانی: جاری دیكەش هاتووین و ئەوە جاری دووەممانە، ئێمە دزییمان لێ دەرنەكەوتوە، بەڵكو ئێمە ئەو پارەیەی بە هەڵە خرابووە نێو بارەكانمان، ئەویشمان هێناوەتەوە، ئەگەر دزباین، ئەومان پەنهان دەكرد، ﴿ قَالُواْ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمۡ كَٰذِبِينَ ﴾، گوتیان: ئایا سزاو تۆڵەی چییە، ئەگەر ئێوە درۆكەر بوون، ئەگەر ئێوە درۆتان كرد، سزای ئەو كردەوەیە چییە؟ سزای دزینی ئەو پێوانەی پادشا چییە؟ ﴿ قَالُواْ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحۡلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ﴾، گوتیان: سزایەكەی: هەر كەسێك ئەوە لە بارەكەی دا بدۆزرێتەوە، ئەوە خۆی دەبێتە تۆڵەو سزای ئەو كردەوەی خۆی، واتە: دەبێتە كۆیلەی ئەو كەسەی كە دزییەكەی لێكردوە، {كە ئێوەن، حوكمڕانانی میسڕ}، ﴿ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ئێمە بەو شێوەیە سزای ستەمكاران دەدەین، ئەوانەی كە دزیی دەكەن، واتە: بە ڕای ئێمەی كوڕانی یەعقووب عليه السلام، سزای دزیی ئاوایە .

﴿ فَبَدَأَ بِأَوۡعِيَتِهِمۡ قَبۡلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ﴾، ئیدی دەستیکرد بە پشکنینی بارەکانیان پێش باری برایەکەی، هەڵبەتە یوسوف بۆ خۆی نا، ئەمە مەجازیی عەقڵییە، یانی: ئەو کەسەی یوسوف ڕای سپارد بوو، دەستیکرد بە پشکنینی جەواڵەکانیان، یان ئەو شتانەی کە دانەوێڵەو ئازووخەکەیان تێکرد بوون، پێش جەواڵی برایەکەی (بنیامین)، ﴿ ثُمَّ ٱسۡتَخۡرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ ﴾، دوای ئەوەی هی هەمووانی پشکنی، گەیشتە سەر هی بنیامین‌و، لەوێدا، ئەو دەفرە، ئەو پێوانەیەی پادشای دەرهێنا، ﴿ كَذَٰلِكَ كِدۡنَا لِيُوسُفَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە ئێمە پلانمان بۆ یوسوف دانا، کە هەر بە زاری خۆیان مەحکوومیان بکات، کە دەبێ بنیامین لەلای خۆی گل بداتەوە، ﴿ مَا كَانَ لِيَأۡخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلۡمَلِكِ ﴾، یوسوف بۆی نەبوو بەپێی ئایین‌و بەرنامەی پادشای میسڕ، برایەکەی بگرێتە لای خۆی، لەلای خۆی گلی بداتەوە، چونکە وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا باسی دەکەین، سزای دزیی لە حکوومەتی ئەو کاتی میسڕدا، جۆرێکی دیکە بووە، ئەوە نەبووە کە دز ببێتە کۆیلەی بابای دزیی لێکراو، یاخود ببێتە بەردەستی ئەو کەسەی کە دزیی لێکردوە، ﴿ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾، بۆی نەبوو کە برایەکەی بە پێی ئایین‌و بەرنامەی پادشا لەلای خۆی گل بداتەوە، مەگەر خوا بیەوێ شتێك بکات، ئەگەر خوا ویستی شتێك بکات، ئەگەر ئەو تەگبیرو پلانەش نەبووایە، خوای کارزان پلانێکی دیکەی دادەنا، بۆ ئەوەی یوسوف برایەکەی لەلای خۆی گل بداتەوە، ﴿ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُ ﴾، بە چەندان پلە هەر کەسێك بمانەوێ بەرزی دەکەینەوە، خوێنراویشەتەوە: (نَرفَعُ دَرَجاتِ مَنْ نَّشاء)، بە پاڵدان (إضافة)ی (درجات) بۆ لای (مَنْ)، واتە: پلەکانی هەر کەسێك کە بمانەوێ، بەرز دەکەینەوە، ﴿ وَفَوۡقَ كُلِّ ذِي عِلۡمٍ عَلِيمٞ ﴾، لە سەرووی هەر خاوەن زانستێکەوە، زاناتر هەیە، شارەزاتر هەیە، تاکو دەگاتە خوا ﷻ.

﴿ قَالُوٓاْ إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُ ﴾، دە برایەکان کە ئەوەیان بینی، هیچیان پێنەما، مەگەر داخی دڵی خۆیان بە دوو برایەکەیان برێژن، کە لە دایکی خۆیان نین، دیارە هەر لەسەر نەفامیی خۆیان مابوون، گوتیان:

ئەگەر ئەم برایە دزیی بکات، (واتە: بنیامین)، ﴿ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ﴾، برایەکی دیکەشی پێشتر دزیی کردوە، مەبەستیان یوسوف بووە، کە ئەوە تۆمەتبار کردنی یوسوف بووە، بە ناهەق، ﴿ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِى نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ﴾، ئەو قسەیەی کە ئەوان کردیان، زۆر تاڵ بوو لەسەر دڵی یوسوف، بەڵام یوسوف تاڵییەکەی لە دڵی خۆیدا پەنهان کرد، کاریگەرییە خراپەکەی لە دڵی خۆیدا پەنهان کردو، بۆی دەرنەخستن، بەسەر خۆی نەهێنا، ئەوە واتایەکی .

واتایەکی دیکەی ئەو قسەیەی کە یوسوف ئەوەی لە دڵی خۆیدا پەنهان کردو بۆی دەرنەخستن : ﴿ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ﴾، گوتی: ئێوە خراپترن، حاڵتان خراپترە، ﴿ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴾، خواش زاناترە بەوەی کە باسی دەکەن، ئایا ئەو برایەی دیکەی پێش بنیامین، دزیی کردوە، یان نەیکردوە، خوا زاناترە، ئێوە وا پێدەچێ هەر تۆمەتی بۆ هەڵببەستن، ﴿ قَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا ﴾ گوتیان: ئەی عەزیز! بێگومان ئەو برایەمان بابێکی پیری بە ساڵداچووی هەیە، بابێکی پیری گەورەی هەیە، ﴿فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ﴾، ئنجا یەکێك لە ئێمە لە شوێنی ئەو بگرە، لەلای خۆت گلی بدەوە، ﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، بێگومان ئێمە تۆ لە چاکەکاران دەبینین، ئەو چاکەیەشمان لەگەڵدا بکە، ﴿ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ ﴾، گوتی: پەنا بە خوا دەگرم، کە جگە لەوەی شتی خۆمانمان لەلا دۆزیوەتەوە، کەلوپەلی خۆمانمان (کە ئاو خۆرەکەیە، پێوانەکەی پادشایە) لە بارەکەیدا دۆزیوەتەوە، جگە لەو لەلای خۆمان گل بدەینەوە، ﴿إِنَّآ إِذًا لَّظَٰلِمُونَ ﴾، ئەگەر وا بکەین ئەو کاتە، کەواتە: ئێمە ستەمکارین، ئێمەش ستەم ناکەین، بۆیە نەخێر ڕازی نابین، هیچ کام لە ئێوە لەلای خۆمان گل بدەینەوە، چونکە ئەوەی ئێمە هەقمان لەسەریەتی، ئەو برایەتانە کە کەلوپەلەکەی ئێمە لە بارەکەیدا دۆزراوەتەوە .

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم :** چوونی یازدە كوڕەكەی یەعقووب ﷺ بۆ لای یوسوفی برایان و، خۆ گرتنی یوسوف بۆ بنیامینی برای و دڵدانەوەی :

وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە چوار بڕگەدا

١) - ﴿ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾: ئنجا كاتێك لە یوسوف وە ژوور كەوتن، واتە: چوونە ئەو دیوەخان و هۆڵ و شوێنە، كە جێگای تایبەتیی یوسوف ﷺ بوو، لەوێوە سەرپەرشتیی فرۆشتن و پێوان و دابەشكرنی دەغڵ و دان و ئازووخەی دەكرد.

٢) - ﴿ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ ﴾، برایەكەی لە خۆی نیزیك خستەوە، برایەكەی خستە پاڵ خۆی، لە خۆی وە نیزیكی خست، دەڵێ: (أَوَى)، واتە: پەنای برد، (أوَى)، واتە: پەنایدا، (الإيواءُ: الإرْجاعُ، وَأُطْلِقَ هُنا عَلَى الإِدْنـاءِ والتَّقْرِيب)، (إيواء)، بە مانای گێڕانەوەیە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی لەخۆ وە نیزیك خستن و خستنە پاڵ خۆیە، دیارە بە شێوەیەك لە شێوەكان، لە هەندێك سەرچاواندا هاتوە كە یوسوف گوتوویەتی: ئێوە ئەو یازدە كەسەتان دوو دوو بچنە ژوورێكەوە، یان دوو دوو پێكەوە بن، دیارە ئەوانیش یازدە بوون، دە برایەكە كە كاتی خۆی یوسوفیان خستە نێو بیر، دوو دوو پێكەوە بوون،

مایەوە بنیامین، بنیامین بە تەنیا تاق كەوتەوە، یوسوف گوتی: با ئەوتان بێتە لای من، هەندێك وا دەڵێن، بە هەر حاڵ بە شێوەیەك لە شێوەكان یوسوف ﷺ ئەو برایەی بردۆتە پەنایەك‌و خۆی پێ ناساندوە .

٣) - ﴿ قَالَ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ ﴾، پێی گوت: بێگومان من براتم، واتە: ئەو برایەتم كە هەواڵیان پێدا بوون، گورگ خواردوویەتی، شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: ئەم تەعبیرە ئاوای لێ دێتەوە: (﴿ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ ﴾: أَي: أَنا المَقصُورُ عَلى الكَونِ أَخاكَ، لاَ أَجنَبِيٌّ عَنْكَ)، واتە: من لەسەر ئەوە كورت هەڵاتووم، برات بم، من بە تۆ بێگانە نیم، دەڵێ: (أَكَّدَ الخَبَرَ بِإِنَّ، وَبِالجُمْلَةِ الإِسْمِيَةِ، وَبِالقَصْرِ الَّذِي أَفَادَهُ ضَمِيرُ الفَصْلِ)، هەواڵی ئەوە كە برایەتی، تەئكیدی كردۆتەوە بە (إِنَّ)، كە دیارە بۆ تەئكیدو جەختكردنەوەیەو، بە ڕستەی ناویی: ﴿ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ ﴾، ئنجا بە كورت هەڵێنان: ﴿ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ ﴾، كە دیارە (أَنا)، ڕاناوی جیاكردنەوە (فَصْل)یە، كە ئەمەش كورت هەڵێنان دەگەیەنێ، دەڵێ: (أَفَادَهُ أَنَّهُ هُوَ أَخوهُ الَّذِي ظَنَّهُ: أَكَلَهُ الذِّئْبُ)، لێی حاڵی كردوە كە ئەو ئەو برایەیەتی كە گومانی وابووە، پێی وابووە كە گورگ خواردوویەتی، چونكە دە برایەكە دوای ئەوەی كە چووبوونەوە، وەك كاتی خۆی باسمان كرد، وایان كردە بانگەشە كە یوسوف گورگ خواردوویەتی، هەرچەندە بابی یوسوف بڕوای نەكردو، هیچ خاوەن عەقڵێكیش بڕوای بەوە نەكردوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بۆتە جۆرێك لە بانگەشەو دەنگۆ كە یوسوف گورگ خواردوویەتی .

٤) - ﴿ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، واتە: پەژارەدارو خەمبار مەبە بەوەی كە كاتی خۆی دەیانكرد .

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە ئەو دە (١٠) برایە، خراپەكەیان تەنیا یوسوفی نەگرتۆتەوە، بەڵكو بنیامینیشی گرتۆتەوە .

کە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَبْتَئِسْ﴾، هەرچەندە (لا)، بۆ (نهي)یە، یانی: ناڕەحەت مەبە، هەڵبەتە ئینسان ئەگەر ناڕەحەت بوو، بە دەست خۆی نیە، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە: واز لە ناڕەحەتیی بێنەو خۆتی لێ دوور بگرە .

کە دەفەرموێ: ﴿بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە دەیانکرد، بە (فعل)ی (مضارع)، هاتوە، کە دلالەت لەسەر ئێستاو بەردەوامیی دەکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەو کوڕانە، تەنیا جارێك یوسوفو برایەکەیان ئەزیەت نەداوە، یاخود: لە دوای یوسوفیش، لەگەڵ بنیامینی برایان دا، هەر بێ لوتف بوون، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، چونکە ئەگەر یەکجار بووایە، تەنیا خستنە بیرەکە بووایە، دەیفەرموو: (بِما عَمِلوا)، بەوەی کە کردیان، بەڵام بە پێی: ﴿بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾، دیارە لەسەر ئەو بێ لوتفییەیان بەردەوام بوون، وەك دوایی دەیبینین، کە دواییش پاش ئەوەی ئەو دەفرە کە ئاوی پێخوراوەتەوەو ئازووخەی پێ پێوراوە، لە باری بنیامین دا ئاشکرا دەبێ، دیسان ئەو کۆنە غەرەزو قینەیان، هەر لێ دەردەکەوێتەوە، کە دەڵێن : ﴿قَالُوٓاْ إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ﴾ ئەگەر ئەمە دزیی بکات، برایەکیشی پێشتر هەر دزیی کردوە، کە مەبەستیان پێی یوسوفە ، کەواتە: دیارە ئەوانە لەسەر کینەو بوغزو غەرەزی خۆیان هەر بەردەوام بوون .

**مەسەلەی دووەم :** ئامادەكرانی ئازووخەی یازدە برایەكە، لەلایەن یوسوف ﷺەوەو، ئاو خۆری پادشا خستنە نێو باری بنیامینەوە، ئەو دەفرەی پادشا پێشتر ئاوی پێ خواردۆتەوە، بەڵام دوایی كراوە بە پێوانە، وەك ڕبە، بۆ پێوانی دەغڵ و دانو ئازووخەو، تۆمەتباركرانیان بە دزینی پێوانەی پادشاو، داكۆكیی كردنی كوڕەكانی یەعقووب، لەسەر ڕەتكردنەوەی ئەو تۆمەتەو بڕیار هاتنە سەر ئەوە، كە ئەگەر ئەو پێوانەیە لە باری هەر كامێكیاندا دۆزرایەوە، لە تۆڵەیدا بكرێتە كۆیلە :

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِى رَحْلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا۟ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِى رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم شەش ئایەتە لە یازدە بڕگەدا**

١) - ﴿ فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ ﴾، ئنجا كاتێك ئەوەی بۆی هاتبوون، پێداویستییەكەی بۆ ئامادەكردن .

(إِسْنَادُ التجهِيزِ إِلَى يوسُفَ مَجَازٌ عَقْلِيٌّ ، إِذْ هُوَ عَمَلُ الفِتيَانِ)، كە دەفەرموێ: ئەوەی بۆی هاتبوون، كە دەغڵ و دان ئازووخەیە، بۆی ئامادە كردن، ئەمە كە پاڵدراوەتە لای یوسوف، ئەوە مەجازێكی عەقڵییە، ئەگەرنا كاری ئەو گەنجانە بووە كە لەبەر دەستی بوون، كاری غوڵامەكانی

بووە، بەڵام پاڵدراوەتە لای یوسوف، چونکە ئەو سەرپەرشتیاری کۆی پرۆسەی فرۆشتنی دەغڵو دانو ئازووخە پێوانو ئامادە کردنی بووە .

وشەی (جِهاز)، کە بە (جَهاز)یش، هاتوە، هەردووکیان بە مانای ئەو شتەیە کە بابای ڕێبوار سەفەری لە پێناودا کردوە، واتە: ئەو شمەکە، ئەو کەلوپەلە، کە لێرەدا مەبەست پێی دەغڵو دانو ئازووخەیە، بۆی ئامادە کردن.

٢) - ﴿ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِي رَحۡلِ أَخِيهِ ﴾، (سِقایة)کەی خستە باری برایەکەیەوە، واتە: ئەو برایەی کە هەم لە دایکیەتیو هەم لە بابیەتی، کە بنیامینە، (السِّقَايَة: إناءٌ كَبير يُسقَى بِهِ المـاءُ والخَمْرُ)، (سقاية) قاپێکی گەورە بووە، کە هەم ئاوی پێ خوراوەتەوە، هەم شەڕاب، بە کوردیی: تاس، دەفر، قاپ، جام، ئاو خۆر، ئەو وشانە هەموویان بەکاردێن، ئنجا ئایا بۆچی ئەو دەفرە کە ئاوی پێ دەخورێتەوە، پێی گوتراوە: (سِقایة) ؟ دەڵێین :

١ - وشەی (سقَایة)، هەم بە مانای ئاو پێدان دێ، وەك لە سوورەتی (التوبة) لە ئایەتی (١٩)دا دەفەرموێ: ﴿أَجَعَلۡتُمۡ سِقَايَةَ ٱلۡحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ كَمَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ ﴾، واتە: ئایا ئاو پێدانی حاجییانو ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی حەرامتان بەراورد کرد، یەکسان کرد، خستە تەرازووەوە لەگەڵ (کردەوەی) کەسێکدا کە بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیەو لە پێناوی خوادا جیهاد دەکات؟...، کەواتە: (سِقَاية)، بە مانای ئاو پێدان دێ .

٢ - (سِقَاية)، بە مانای شوێنی ئاو لێ خواردنەوەش دێ، یان شوێنی ئاو پێدان، دێ .

٣ - (سِقَاية)، بە مانای ئەو قاپو دەفرەش، دێ، کە ئاوی پێ دەخورێتەوە، یان هەر شلەمەنیەکی پێ دەخورێتەوە، ئاو بێ، شەڕاب بێ، شەربەت بێ، هەرچی بێ.

(وَإِسْنادُ جَعْلِ السِّقَايَة فِي رَحْلِ أَخِيهِ إِلَى يُوسُفَ أَيْضاً من المَجاز العَقلِيِّ)، ئەوە کە دەڵێ: یوسوف ئاو خۆرەکەی خستە باری برایەکەیەوە، کە دیسان پاڵدراوەتە لای یوسوف، ئەوەش هەر مەجازێکی عەقڵییە، چونکە خۆی لە

ئەسڵدا کاری ئەو غوڵامو بەردەستانەو ئەو گەنجانە بووە، کە لەبەر دەستیدا کاریان کردوە .

شایانی باسیشە : (سِقَايَة)، لە تەوراتدا[1] بە (كَأس)، هاتوە، بە (الكَأْسِ الفِضِّي)، هاتوە، واتە: قاپە زیوینەکە .

٣) – ﴿ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ﴾، دوایی جارچییەك جاڕیدا، بانگکەرێك بانگی کرد : هۆ کاروان ! بێگومان ئێوە دزن، واتە: دزیتان کردوە .

بۆیەش فەرموویەتی: ﴿أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ﴾، (لأَنَّ العِيرَ مُؤَنَّثٌ)، دیارە کاروان لێرەدا بە مێینەی مەجازیی دانراوە، بۆیە ڕاناوی مێینەی بۆ بەکارهاتوە: ﴿أَيَّتُهَا﴾، ئەگەرنا دەیفەرموو: (أَيُّها العِيرُ) .

﴿ٱلْعِيرُ﴾: (العِيرُ: إِسْمٌ لِلحمولة مِنْ إِبْلٍ وَحَمِيرٍ وَما عَلَيْها مِنَ أَحْمالٍ وَما مَعَها مِن رُكّابِها، فَهَو اسْمٌ لِمَجموعِ هَذِهِ الثَّلاثَة)، وشەی ﴿ٱلْعِيرُ﴾، لێرەدا ناوە بۆ ئەو بارە بەرانەی کە وەك حوشترو گوێدرێژو وڵاخانە کە باریان لێدەنرێ، هەروەها ناوە بۆ ئەو بارانەی کە لەسەر پشتیانن، وە ناویشە بۆ ئەو سوارو کاروانچییانەی کە لەگەڵ کاروانەکەن، واتە: وشەی ﴿ٱلْعِيرُ﴾، ناوە بۆ هەر سێکیان: هەم بۆ وڵاخەکانو، هەم بۆ بارەکانی سەر پشتیانو، هەم بۆ ئەو خەڵکەی کە بارەکانیان خستوونە سەر پشتیانو وڵاخەکان لێ دەخوڕن .

کە دەفەرموێ : ﴿أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ﴾، (التأذِينُ: النِّدَاءُ المُتَكرر)، (تأذِينُ)، یانی: ئاگادارکردنەوە، بانگدان، جاڕدان، بەڵام لێرەدا بە مانای بانگکردنی دووبارە دێ، کەواتە: بە پێی ئەمە، دوای ئەوەی بارەکانیان خستوونە سەر پشتی وڵاخەکانیانو ڕەنگە بەرێش کەوتبن، ئنجا بانگکەرەکە، جارچییەکە بە دوایان کەوتوە: هۆی کاروان ! ئێوە دزن ! دیارە دەبێ تۆزێك دووریش کەوتبنەوە، وەك وشەی (أَيتها) دەیگەیەنێ.

١) التفسير التَّطبيقي للكِتاب المُقَدَّس، العَهْدُ القَدِيم، سِفرُ التكوين، الإصحاح: ٤٤، ص ١١٢.

لە تەوراتدا دەڵێ: ماوەیەکیش دووركەوتبوونەوە، ئنجا جارچیی بە دوایان کەوتن‌و، لەوێڕا گێڕایانەوەو بارەکانیان پێ خستن‌و ...هتد، بەلام مادام وشەی: ﴿ ٱلۡعِيرُ ﴾، ناو بێ، بۆ بارەبەرەکان، وڵاخەکان، ئنجا حوشتر بن، یان ئێستر، یان گوێدرێژ، هەروەها بۆ بارەکان‌و، بۆ کاروانچییەکانیش، دەگونجێ هەر لەوێ بووبن‌و، پێش ئەوەی بارەکان بخەنە سەر پشتی وڵاخەکانیان، بانگیان کردبن .

٤) - ﴿ قَالُواْ وَأَقۡبَلُواْ عَلَيۡهِم مَّاذَا تَفۡقِدُونَ ﴾، واتە: کوڕەکانی یەعقووب عليه السلام، مەبەست یازدە کوڕەکانن، چونکە ئەمجارە بنیامینیشیان لەگەڵە، ڕوویان تێکردن‌و بەرەو ڕوویان هاتن‌و گوتیان: چیتان لێ ونبووە؟ چیتان دیار نیە؟ دەگوترێ: (فَقَدْتُهُ فَهوَ مَفقُودٌ)، یانی: لێم ونبوو، کە ئەو ونبوویە، بزربوویە، لێم دیار نیە، بەلام (تَفَقَّدْتُهُ)، واتە: داوام کرد، بە دوایدا گەڕام .

٥) - ﴿ قَالُواْ نَفۡقِدُ صُوَاعَ ٱلۡمَلِكِ ﴾، جارچییەکەو ئەوانەی لایەنی یوسوف عليه السلام بوون، ئەوانەی کە سەرپەرشتیی دابەشکردنی دەغڵ‌و دان‌و، فرۆشتن‌و پێوانیان دەکرد، گوتیان: پێوانەی پادشامان دیار نیە، ﴿ صُوَاعَ ﴾، هەروەها (صَاعِ)یش، هەر هاتوە، وەك پێشتریش گوتمان: هەردووکیان هەر مەبەست پێیان: (سِقَایة)ی پێشێیە، کە دیارە پێشتر ئاوی پێ خوراوەتەوە، (سِقَایة)، واتە: ئاو خۆر، ئاو پێ خوراوە، ﴿ صُوَاعَ ﴾و (صَاعِ)یش، واتە: پێوانە، هەڵبەتە ئەو دەفرە، دەبێ دەفرێکی گران قیمەت بووبێ‌و، دەفرێکی ناسراو زانراویش بوو بێ، کە پێشتر پادشا بۆ ئاو پێ خواردنەوە، یان شەڕاب پێ خواردنەوە، بەکاری هێناوەو دواتر بۆ پێوانی ئەو ئازووخەیە کە فرۆشتوویانە، بەکارهاتوە، یانی: وێڕای ئەوە کە ئاوی پێ خوراوەتەوە، پێوانە (مِکیال)یش، بووە، وەك پێوانەش بەکارهاتوە .

٦) – ﴿ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمۡلُ بَعِيرٖ ﴾، هەر کەسێك ئەو پێوانەیە بهێنێتەوە: باری حوشترێکی هەبێ، باری حوشترێك خەڵاتی دەدرێتێ، واتە: باری حوشترێك ئازووخە، دەبێتە خەڵاتیو دەبێتە موڵکی وی .

٧) – ﴿ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٞ ﴾، جارچییەکە، دەڵێ: منیش زامینی ئەوەم، ئۆباڵداری ئەوەمو گرەنتیی ئەوە دەکەم، کە ئەو بارە ئازووخەیەی بە خەڵات بدەینێ، لە بەرانبەر ئەوەدا کە ئەو دەفرەمان بۆ دێنێتەوە .

# کورتە باسێک دەربارەی ڕەوابوونی (جعالة) و (کفالة)

ئێستاش پێش ئەوەی بچینە سەر بڕگەکانی دیکە، لەم بڕگەیەدا هەندێك قسەی (القُرطُبي)، دێنین لە (الجامع لأحكام القُرآن)[1]، کە گوتوویەتی: ئەم ئایەتە بەڵگەی هەر کام لە (جعالة)و (کفالة)ی تێدان، دەڵێ :

(قَالَ بَعْض العُلَماء: فِي هَذِهِ الآية دَلِيلان، أَحَدهُما: جَوَازُ الجُعْلِ وَقَد أُجِيزَ للضرورَةِ، فَإِنَّهُ يَجُوزُ فِيهِ مِنَ الجهالة ما لاَ يَجُوزُ فِي غَيْرِهِ، فَإِذَا قالَ الرَّجُلُ: مَنْ فَعَلَ كَذَا فَلَهُ كَذَا صَحَّ، وَشَأنُ الجعْلِ أَنْ يكونَ أَحَدُ الطرفَيْنِ مَعْلوما وَالآخَر مَجْهُولاً للضرورَةِ إِلَيْهِ، بِخِلافِ الإجارَةِ، فَإِنَّهُ يَتَقَدَّرُ فِيهَا العِوَضُ وَالمُعوّض مِنَ الجِهَتَيْنِ، وَهُوَ مِنَ العُقُودِ الجائِزَة الَّتِي يَجُوزُ لأَحَدِهِما فَسْخَهُ، إلاَّ أَنَّ المَجْعُولَ لَهُ، يَجُوزُ أَنْ يَفسخَهُ قَبْلَ الشروع وبَعْدَهُ، إذَا رَضِيَ بإسْقَاطِ حَقِّهِ، وَلَيْسَ للجاعِلِ أَنْ يَفسخَهُ إذَا شَرَعَ المَجْعُول لَهُ فِي العَمَلِ، وَلا يُشترطُ فِي عَقْدِ الجعْلِ حُضُورُ المُتَعاقِدِين، كَسائِر العُقودِ، لِقَوْلِهِ: ﴿ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمۡلُ بَعِيرٍ ﴾.

الدّليلُ الثّاني: جَوازُ الكفَالة عَلَى الرَّجُل لأن المؤَذِّن الضّامِنَ هُوَ غَيْرُ يُوسُف عليه السلام، قَالَ عُلَماؤُنا: إذَا قَالَ الرَّجُل: تَحمَّلْتُ، أَوْ تَكفَّلْتُ، أَو ضَمِنْتُ، أَو وَأَنا حَمِيل لَكَ، أَو زَعِيم، أَو كَفِيل، أَو ضَامِن، أَو قَبِيل، أَو هُوَ لَكَ عِنْدِي، أَو عَلَيَّ، أَو إِلَيَّ، أَوْ قِبَلِي، فَذَلِكَ كُلُّهُ: حَمالة لازِمة).

---

[1] ج ٩، ص ١٨٨ و ١٨٩.

واتە: لەم ئایەتەدا دوو بەڵگە هەن :

بەڵگەی یەکەم : یەکێکیان کە لەم ئایەتە وەردەگیرێ بە پێی قسەی هەندێك لە زانایان بریتیە لە دروست بوونی (جَعَالَة)، (جَعْل)، ئەوەیە: کەسێك ئەندازەیەك پارە، یان ئەندازەیەك خەڵات، ئەندازەیەك دیاریی دابنێ، بۆ کەسێك کە کارێکی بۆ دەکات، ئنجا دیارە (جاعِل)ەکە، کە (جَعْلَ)ەکەی، داناوە، واتە: شتەکەی دیاریی کردوە، تەرەفێکی دیارە، بەڵام تەرەفی بەرانبەر جارێ دیارە نیە، {داخۆ کێ ئامادە دەبێ ئەو کارە بکات، بۆ وێنە: دەڵێ: هەر کەسێك ئەو میوەیەم بۆ بچنێ، هەر کەسێك ئەو دەغڵەم بۆ بدروێتەوە، یان هەر کەسێك کە ئەو وڵاخەم بۆ بدۆزێتەوە، یان هەر کەسێك سەیارەکەم بۆ بدۆزێتەوە، کە لێم ون بووە، فلان شتەی دەدەمێ}لەبەر ناچاریی (جعالة) بە دروست دانراوە کە (جَعْلُ)یشی پێ دەڵێن، چونکە تێیدا نەناسینی تەرەفی دووەم بەرەوا دانراوە، کە لە گرێبەستەکانی دیکەدا، ئەوە دروست نیە، ئەگەر پیاوێك گوتی: هەر کەسێك فلان کارە بکات، فلان شتەی دەدەمێ، ئەوە سەوداو مامەڵەیەکی دروستە، (جَعْل)یش، ئەوەیە کە یەکێك لە دوو لایەنەکان دیارە زانراوە، بەڵام لایەنەکەی دیکە نەزانراوە، ئەویش لەبەر ناچاریی لەبەر ئەوەی پێویستیی دەبێ بەو جۆرە مامەڵەیە، دروستە، بە پێچەوانەی (إجارَة)ەوە، کە هەم ئەو شتە کە دادەنرێ، دیارە، هەم ئەو کەسە کە دایدەنێ، دیارە، هەم تەرەفە بەرانبەرەکەش، دیارە، {بۆ نموونە: یەکێك بە یەکێك دەڵێ: ئەو خانووەت دەدەمێ ساڵانە بە کرێ بەوەندە، نەفەرەکە دیارە کە خانووەکە بە کرێ دەدا، تەرەفەکەی بەرانبەریش دیارەو، ئەندازەی پارەکەش دیارەو، خانووەکەش دیارو لەبەرچاوە}، ئنجا ئەو (جَعالة)یە، لەو گرێبەستە دروستانەیە کە بۆ یەکێك لە دوو لایەکە هەیە، هەڵیوەشێنێتەوە، بەڵام ئەو کەسەی کە شتەکەی بۆ دادەنرێ: خەڵاتەکە، دیارییەکە، هەقەکەی بۆ دادەنرێ، لە بەرانبەر ئەوەدا کە کارەکە بکات، ئەو بۆی هەیە پێش ئەوەی دەست بە هەوڵدان بکات بۆ کارەکە، هەڵیوەشێنێتەوە، دواییش کە دەستیشی پێکرد، هەر

بۆی هەیە هەڵیبوەشێنێتەوە، بە مەرجێك چاوپۆشیی لە هەقەکەی خۆی بکات، ئەوەندە ئیشەی کە کردوویەتی لێی دەچێتە بەلاش، بەڵام بابای (جاعِل)، کە شتەکە دادەنێ، هەقەکە دادەنێو دەڵێ: ئەو هەقە دەدەم بە هەر کەسێك فلان کارەم بۆ بکات، ئەو کەسە دوای ئەوەی بابای هەق بۆ دانراو دەست بە کارەکەی دەکات، بابای هەق دانەر (جاعِل)، بۆی نیە هەڵیبوەشێنێتەوە، بە مەرجیش نەگیراوە کە هەردوو تەرەفەکە ئامادەبن، وەك باقی گرێبەستەکان، چونکە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمۡلُ بَعِيرٖ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٞ ﴾، هەر کەسێك هێنای (دیار نیە کێیە) باری حوشترێك ئازووخەی هەبێو من ئۆباڵدارمو گرەنتیی دەکەم .

بەڵگەی دووەم : بریتیە لە ڕەوا بوونی کەفالەت کە بریتیە لەوەی کەسێك ببێتە کەفیلی کەسێكو لە جیاتی وی کارێك بکاتو ببێتە ئۆباڵداری، چونکە بابای جارچیی کە جاڕی داوەو بۆتە کەفیل، غەیری یوسوف ﷺ بووە، واتە: لە جیاتی یوسوف گوتوویەتی: من ئەوە دەکەم، کەواتە: ڕەوایە کەسێك ببێتە کەفیلی کەسێکی دی، بەڵام بە مەرجێك مۆڵەتی ئەو کەسەی پێ بێت، کە دەبێتە کەفیلیو ڕازی بێ ببێتە ئۆباڵداریو دەستی کراوە بێ، زانایانمان گوتوویانە: ئەگەر پیاوێك گوتی: (تَحَمَّلْتُ أَوْ تَكَفَّلْتُ أَو ضَمِنْتُ أَو وَأَنَا حَمِيل لَكَ، أَو زَعِيم أَو كَفِيل أَو ضَامِن أَو قَبِيل، أَو هُوَ لَكَ عِنْدِي أَو عَلَيَّ أَو إِلَيَّ أَوْ قِبَلِي فَذَلِكَ كُلُّهُ حَمَالَة لازِمَة)، ئەو وشانە هەموویان کە مانایان زۆر لێك نیزیکە، واتە: من ئەو بەرپرسیارییەتەم هەڵگرت، من بوومە ئۆباڵدار، من ئەو شتەم خستە ئەستۆی خۆم، من کەفیلی تۆم، ئەو شتە عایدی من بێ، یاخود لەسەر من بێ، ئەو شتە بێ بۆ لای من بێ، ئەو شتە بێ لەسەر من بێ، ئەوە هەموو دەبێتە کەفالەتێك، لەسەر بابای کەفیل پێویست دەبێ ئەو جۆرە مشوورە بخوات، لە جیاتی ئەو کەسەی کە مۆڵەتی داوە .

٨) - ﴿ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ عَلِمۡتُم مَّا جِئۡنَا لِنُفۡسِدَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴾، دوای ئەوەی کە ئەوان تۆمەتباریان دەکەن، بەوەی کە دزن، کوڕەکانی

یەعقووب هەر یازدە کوڕەکە دەڵێن: سوێند بە خوا ! ئێوە دەزانن کە ئێمە نەهاتووین لە زەویدا خراپەکاریی‌و تێکدان بکەین، واتە، لەسەر زەمینی میسردا، ﴿ وَمَا كُنَّا سَـٰرِقِينَ ﴾، هەروەها ئێمە هەرگیز دز نەبووین دەزانن کە ئێمە جاری دیکەش هاتووین‌و دز نەبووین .

لێرەدا ئەوانە دوو شتیان لە خۆیان دوورخستوونەوە: (الإفساد والسَرِقة)، تێکدان‌و خراپەکاریی‌و دزیی، بەڵام بۆ خراپەکارییەکە تەنیا گوتوویانە: ﴿ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئێوە دەزانن کە ئێمە نەهاتووین خراپەکاریی بکەین لە زەویدا، بەڵام زۆر جەختیان نەکردۆتەوەو بەس گوتوویانە: ئێوە دەزانن ئێمە بۆ خراپەکاریی‌و تێکدان نەهاتووین، بۆچی ؟

زانایان دەڵێن: چونکە خراپەکاریی‌و تێکدان، چەمکێکی فراوانی هەیە، ڕەنگە هەندێك لە دەستەڵاتدارو حوکمڕانان، هەر جۆرە جموجۆڵێ بە تێکدان لە قەڵەم بدەن، بۆیە زۆر جەختیان نەکردۆتەوە، گوتوویانە: نەوەك هەر هاتنەکەی ئێمەیان بە تێکدان لە قەڵەم دابێ، پاشان عەیب‌و عاریش نیە، جاری وا هەیە کابرا شانازیی پێوە دەکات، دەڵێ: بەڵێ، من بووم ئەو کارەم کرد، من شۆڕشم کرد، من کودەتام کرد، من ڕاپەڕیم، کە بەرانبەرەکە بە خراپی دەزانێ، بەڵام دیارە ئەو کەسەی دەیکات بە خراپی نازانێ .

بەڵام بە نسبەت دزییەکەوە، چونکە شتێکی نەنگەو عەیبە، لەوێ زۆر جەختیان کردۆتەوە: ﴿ وَمَا كُنَّا سَـٰرِقِينَ ﴾، ئێوە دەزانن کە ئێمە پێشتریش دز نەبووین، دیارە ئەو کوڕانەی یەعقووب ﷺ بەڵگەشیان ئەوەیە کە لە سەرەتاوە دەیڵێن : ﴿ لَقَدْ عَلِمْتُم ﴾، مەبەستیشیان دوو شتن:

یەکەم: ئێمە پێشتریش هاتووین، ئنجا ئەگەر دزییمان کردبایە، تێکدان‌و خراپەکارییمان کردبایە، جاری پێشێش دەمانکرد .

دووەم: ئێوە خۆتان ئاگادارن جاری پێشێ کە دەستمایەکە، خرابۆوە نێو بارەکان بە هەڵە، یان بە ئەنقەست، ئێمە هێنامانەوە، کەواتە: ئێمە

ئەگەر دزبایـن، نەدەهاتینەوەو پارەكەمان دەخوارد، یاخود دەشهاتینەوە، بەڵام نكووڵییمان دەكرد كە ئەو دراوە، یاخود ئەو دەستمایە، لە بارەكانی ئێمەدا بووە، چونكە ئێوە بەڵگەو شایەدتان لەسەر نەگرتووین، كە ئەو شتانەتان خستۆتە ئەو بارانەوە .

٩) - ﴿قَالُواْ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمۡ كَٰذِبِينَ﴾، (تەڕەفی یوسوف ﷺ تەڕەفی جاڕچیی) گوتیان: ئەدی سزای چییە، ئەگەر ئێوە درۆكار بوون، قسەكەتان ڕاست نەبوو، ئەو پێوانەیە ئەو ئاوخۆرەی پادشا، لە بارەكانی ئێوە دابوو ؟

١٠) - ﴿قَالُواْ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحۡلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ﴾، گوتیان: هەر كەسێك ئەو پێوانەیە لە بارەكەی دا بدۆزرێتەوە، خۆی دەبێتە تۆڵەی‌و دەبێتە سزای .

كە دەڵێین: ﴿فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ﴾، یانی: (فَهُوَ ذَاتُهُ جَزَاؤُهُ، أي: هُوَ عِوَضٌ عَن هَٰذِهِ الجَرِيمَةِ فَيَصِيرُ رَقِيقاً لِصَاحِبِ الصواعِ)، واتە: خودی خۆی دەبێتە تۆڵەی دزییەكەی، دەبێتە سزای دزینی ئەو دەفرە ئەو پێوانەیە .

ڕستەی: ﴿فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ﴾، {توكِيدٌ لَفظِيٌّ لِجُملة: ﴿جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحۡلِهِۦ﴾}، واتە: ئەوە جەختكردنەوەیەكی بێژەیی یە بۆ ڕستەی ﴿جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحۡلِهِۦ﴾، یانی: سزایەكەی هەر كەسێك ئەو پێوانەیە لە بارەكەی دا دۆزرایەوە، خۆی دەبێتە سزاو تۆڵەی دزینی ئەو دەفرە .

١١) - ﴿كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، ئاوا بەو شێوەیە ئێمە سزای ستەمكاران دەدەین، كە لێرەدا مەبەست لە ستەمكاران، ئەوانەن كە ستەمیان لە خۆیان‌و لە خەڵك كردوە بەهۆی دزییەوە .

ئەمەش لێرەدا دوو واتای هەن :

١ / واتە: ئێمەی كوڕانی یەعقووب ﷺ ئایینەكەمان‌و بەرنامەكەمان وایە، كە بەو شێوەیە سزای دز بدەین: هەر كەسێك دزیی لە كەسێك كرد،

دەبێتە بەردەستو خزمەتکارو کۆیلەی ئەو کەسە کە دزیی لێکردوە، واتە: دزەکە دەبێتە کۆیلەی دزیی لێکراوەکە، ئەوە واتایەکی .

٢/ واتایەکی دیکە، کە من ئەوەی دووەمیانم پێ ڕاستترە، هەرچەندە زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی قورئان، مانای یەکەمیان هێناوە، بەلام من پێموانیە لە هیچ ئایینو بەرنامەیەکی خوای پەروەردگاردا، سزای دزیی بریتی بووبێ لە بە کۆیلەکردنی بابای دز، بەڵکو وا پێدەچێ لەوێ ئەو بۆچوونو ئیجتهادەیان بۆ پەیدا بوو بێ، یانی: ئێمە ئاوا بڕیار دەدەین: هەر کەسێك ئەو دەفرە، ئەو پێوانەیە لە بارەکەیدا دۆزرایەوە، با بکرێتە کۆیلە بۆ ئەو لایەنەی دزییەکەی لێکراوە .

**مەسەلەی سێیەم : فەرمان کردنی یوسوف بە پشکنینی باری برایەکان، پێش باری بنیامین، پاشان دەرهێنانی پێوانەکە، دەفرەکە لە باری برایەکەی، خوای کارزان ﷻ بەو جۆرە پلانی لە لای خۆ هێشتنەوەو گلدانەوەی برایەکەی بۆ یوسوف ؑ دانا، چونکە بە پێی بەرنامەی پادشا، ئەوە سزای دز نەبووە :**

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَاءِ أَخِيهِ ثُمَّ اسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَاءِ أَخِيهِ ۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَّن نَّشَاءُ ۗ وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بەپێزە لە حەوت بڕگەدا**

**١) –** ﴿ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَاءِ أَخِيهِ ﴾، لێرەدا کە پشکنینی چەواڵەکان پاڵدراوەتە لای یوسوف، ئەوە مەجازێکی عەقڵییە، واتە: ئەوەی کە یوسوف ڕایسپارد بوو، دەستی کرد بە پشکنینی (وِعَاءِ )کانیان، پێش (وِعَاءِ )ی، برایەکەی .

(أَوْعِيَة جَمْع وِعَاء، وَهُوَ الظرف) (أَوعِيَة) كۆی (وعاء)ە، بریتیە لە هەر شتێك، كە شتی تێبكرێ، ئنجا گونیەیە، جەواڵە، تێرە، كەندوویە، كووپەیە، هەر شتێك شتی تێ بكرێ، پێی دەگوترێ: (وعاء)، بەڵام لێرەدا بە پێی سیاقو مەقام، دەزانین كە ئەو شتە وا پێدەچێ جەواڵ بوو بێ، بە زاراوی ئێستا تەلیس یان گونیە بوو بێ، هەڵبەتە جەواڵ لە دێر زەمانەوە هەبووە، لەبەرئەوە كە بە دەست چنراوە، ئەو كاتە وەك ئێستا كارگە نەبووە، تاكو گونیەو تەلیسو ئەوانە بچنن، بەڵكو هەرچی بووە بە دەست چنراوە .

دەفەرموێ: دەستیكرد بە پشكنینی جەواڵەكانی ئەوان، (برایەكان)، پێش هی برایەكەی، (بنیامین).

(وعاء)، دەڵێ: (مُشتقٌ مِنَ الوَعيِ وَهوَ الحِفظُ)، (وعي) واتە: لەبەر كردن، پاراستن، وەك لە شوێنەوارێكدا هاتوە: ئەبو ئومامە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ :

{اقرَؤُوا الْقُرْآنَ وَلا تَغُرَّنَّكُمْ هَذِهِ الْمَصَاحِفُ الْمُعَلَّقَةُ، فَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يُعَذِّبْ قَلْباً وَعَى[1] الْقُرْآنَ} {أَخْرَجَهُ تمام برقم: (١٦٩٠)، وَابن أَبي شَيْبة برقم: (٣٠٠٧٩)، وَالدَّارِميُّ برقم: (٣٣١٩)}.

واتە: قورئان بخوێننەوەو بەو پەڕە هەڵواسراوانە - كە قورئانیان تێدا نووسراوەتەوە – فریوتان نەدەن، چونكە خوا دڵێك ئازار نادات قورئانی لەبەر كردبێ .

**٢) -** ﴿ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ ﴾، دوایی لە جەواڵی برایەكەی خۆی دەریهێنا .

پێشێ بە ڕاناوی نێرینەی مەجازیی هێناویەتی: ﴿ مَن وُجِدَ فِى رَحْلِهِۦ ﴾، ﴿ وُجِدَ ﴾، ڕاناوی نێری بۆ بەكارهێناوە، لێرەدا وشەی (صُوَاعَ)، لەبەرچاو گیراوە، واتە: هەر كەسێك كە ئەو پێوانەیە لە جەواڵەكەیدا، لە بارەكەیدا دۆزرایەوە،

١) وعی القرآن: أي حَفِظَهُ وتدبَّره وعمِلَ بما فيه، واتە : قورئانی لەبەركردو تێوەی ڕاماو كاری پێكرد .

بەڵام لێرەدا ڕاناوی مێینەی مەجازیی بۆ بەکارهاتوە: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا ﴾، چونکە لێرەدا ڕاناوەکە دەچێتەوە بۆ (سقَاية)، واتە: بۆ ئەو دەفرو پێوانەیەی کە لە ئەسڵدا دەفرێك بووە، ئاوی پێخوراوەتەوە .

خاوەنی (التَحريرُ والتَنوير)[1]، دەڵێ: (وَهَذا التأنيث فِي تَمام الرشاقة إِذ كانَت الحَقِيقة أَنَّها سِقَاية جعلت صواعاً، فَهُوَ كردّ العجز على الصَّدْر).

واتە: ئەم ڕاناوی مێینە بۆ بەکارهێنرانە بۆ ئەو دەفرە، لێرەدا زۆر شتێکی جوانو ڕێکە، چونکە ئەو دەفرە پێشتر ئاوی پێخوراوەتەوە، دوایی کراوە بە پێوانە بۆ ئازووخەو دەغڵو دان، کەواتە: ئەوە وەك گێڕانەوەی دواوەیە بۆ پێشەوە .

٣) - ﴿ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ﴾، ئەمە قسەی خوای پەروەردگار خۆیەتیو، لێرەدا خوا ئەو قسەیەی خۆی نێو ئاخن دەکات، دەفەرموێ: ئاوا تەگبیرمان بۆ یوسوف کرد، پلانمان بۆ دانا .

(الكَيدُ: فِعلٌ يُتوصّلُ بِظاهرِهِ إِلى مَقْصَدٍ خَفيٍّ، والمَقْصودُ بهِ إِلهامُ يوسف...)، (كَيد)، بریتییە لە کردارێك کە بەهۆی ڕواڵەتەکەیەوە ئامانجێکی پەنهان دەستەبەر دەکرێ ، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەو خورپەیە کە خوا خستیە دڵی یوسوفەوە، کە بەو شێوەیە دەتوانێ براکەی گل بداتەوە .

٤) - ﴿ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلْمَلِكِ ﴾، (یوسوف) بۆی نەبوو بە پێی بەرنامەو ئایینی پادشا کە وڵاتی پێ بەڕێوە دەبرد، براکەی لەلای خۆی گل بداتەوە، بیکاتە کۆیلە، یان لە لای خۆی بیهێڵێتەوەو بیگرێ .

خاوەنی (التَحريرُ والتَنوير)[2]، دەڵێ: (ولولا ذلك لما كانت شريعة القبط تُخوِّلْهُ ذلك، فقد قيل: إن شرعهم في جزاء السارق، أن يؤخذ منه شيء ويضرب ويُغَرَّمَ ضِعْفَي المسروق أو ضِعْفَي قيمته) .

١) ج ١٣، ص ٣١.
٢) ج ١٣، ص ٣٢.

واتە: ئەمە لە بەرنامەی قیبتییەکاندا (کە لە میسرِ بوون) سزای دزیی نەبوو، گوتراوە: سزای دز ئەوە بووە کە شتەکەی لێ وەربگیرێتەوە (ئەو شتەی کە دزیویەتی)و، لێی بدرێ و، دوو بەرانبەریش شتە دزراوەکەشی پێ ببژێردرێ، یاخود نرخەکەی .

واتە: ئەگەر مەڕێکی دزیوە، دوو مەڕانی لێ بستێنن، ئەگەرنا دوو بەرانبەری نرخی ئەو مەڕەی لێ بستێنرێ، ئەوە سزای دز بووە لە ئایینو بەرنامەی پادشای میسرِدا، ئنجا ئەگەر بە پێی ئەوە ڕەفتار کرابایە، یوسوف بۆی نەبوو، بنیامین لەلای خۆی گل بداتەوە، بەلام یوسوف دێنێ تۆپ دەخاتە گۆلی ئەوانەوەو دەڵێ: سزایەکەی چییە؟ ئەوان سەرپشك دەکات، ئەوانیش دەڵێن: سزایەکەی ئەوەیە هەر کەسێك دەفرەکە لە بارەکەی دا دۆزرایەوە، خۆی ببێتە تۆڵەو سزای دزییەکەی خۆی، واتە: بە زمانی خۆیان دەیانگرێ، ئەگەر وا نەبووایە، بە پێی بەرنامەو یاسای پادشا بۆی نەبوو برایەکەی لەلای خۆی گل بداتەوە، هەڵبەتە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە: وشەی (دین) کە لە قورئان دا بەکارهاتوە، یەکێك لە مانایەکانی ئەو بەرنامەو سیستم (نظام)ەیە، کە وڵاتی پێ بەڕێوەدەچێو مەرج نیە (دین) تەنیا لە خواوە هاتبێ، چونکە ئەوە مەفهوومە عورفییو باوەکەیەتی، ئەگەرنا (دین)، واتە: بەرنامەی ژیان، ئەوەی ژیانو کۆمەڵگای پێ بەڕێوە دەچێت .

٥) – ﴿ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾، مەگەر خوا بیەوێ، واتە: خوا ویستی کە سزای دۆزرانەوەی ئەو دەفرە، لە باری بنیامیندا بریتی یە لەوەی کە برایەکانی یوسوف بە زمانی خۆیان بیڵێن، کە سزایەکەش جۆرێك بوو ئامانجی یوسوف بێنێتەدی.

٦) – ﴿ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ ﴾، بە چەندان پلە هەر کەسێك بمانەوێ بەرزی دەکەینەوە، واتە: لە ڕووی زانستو شارەزاییو حیکمەتو کارامەییەوە .

خوێنراویشەتەوە: (نَرفَعُ دَرَجاتِ مَن نشاء)، واتە: (دَرَجات)، پاڵ بدرێتە لای (مَن) هی پێشی: ﴿ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ ﴾، ئەمە (دَرَجاتِ مَن نشاء)، واتە: پلەکانی هەر کەسێك کە بمانەوێ، بەرزیان دەکەینەوە .

٧) – ﴿ وَفَوۡقَ كُلِّ ذِي عِلۡمٍ عَلِيمٞ ﴾، لە سەرووی هەموو خاوەن زانستێکەوە، زانایەك هەیە، واتە: زاناتر هەیە، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ كە زۆریی زانست، مایەی بەرزبوونەوەیە، چونكە دەفەرموێ: ﴿ وَفَوۡقَ كُلِّ ذِي عِلۡمٍ عَلِيمٞ ﴾، لە سەرووی هەر خاوەن زانیارییەكەوە، زاناتر هەیە .

كەواتە: ئینسان بەهۆی زانیارییەوە بەرزدەبێتەوەو لە خوا نیزیك دەبێتەوەو لە ژیانیدا بەرز دەبێتەوە، بەلاّم بە ئەندازەی ئەوە كە زانیارییەكەی ڕاستەو كاریشی پێ دەكات .

**مەسەلەی چوارەم :** داخی دڵی خۆ ڕشتنی برایەكانی یوسوف ﷺ بە خۆیو بنیامینی برای، كە لە دزیی كردندا وەك یەكنو، وەلاّمدانەوەی یوسوف لە دڵی خۆیدا بەبێ دەربڕین: كە ئێوە خراپترن: كردەوەتان خراپترە، هەڵوێستتان خراپترە، خواش زاناترە بەوەی كە دەیڵێن، ئایا ڕاستە یان نا؟ بە تایبەت تۆمەتباركردنی یوسوف ﷺ بە دزیی :

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ قَالُوٓاْ إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفۡسِهِۦ وَلَمۡ يُبۡدِهَا لَهُمۡۚ قَالَ أَنتُمۡ شَرّٞ مَّكَانٗاۖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ٧٧ ﴾.

شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە لە چوار بڕگەدا

١) – ﴿ قَالُوٓاْ إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُ ﴾، واتە: دە برایەكانی یوسوف، دە كوڕەكەی یەعقووب ﷺ كە دایكیان جیایە لە دایكی یوسوفو بنیامین، گوتیان: ﴿ إِن يَسۡرِقۡ ﴾، ئەگەر ئەم برایە، واتە: برایەكەی كە لە

دایکی یوسوفە (بنیامین) دزیی بکات، ﴿فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ﴾، ئەوە بێگومان برایەکی خۆشی، (برایەکی دایکیی)، پێشتر دزیی کردوە .

لێرەدا ئەوان بەوە پاساوو پۆزشیان هێناوەتەوە، کە ئەو (بنیامین)ە، برایەکی هەبوو (لە دایکی خۆی)، ئەویش پێشتر دزیی کردوە، دەیانەوێ تانە لە دایکیان بدەن، واتە: هەردووکیان لەو ئافرەتە بوون، کە بریتیە لە (راحیل)ی کچی (لابان)، کە خاڵی یەعقووب بوو، کە لە سەرەتای تەفسیری ئەم سوورەتەدا باسمان کرد، واتە: ئەوانە کوڕی ئەو ئافرەتەن، کوڕی ئەو دایکەنو عادەتیانە دزیی بکەن .

پێش ئەوەی زیاتر ئەمە شی بکەینەوە، با جارێکی دیکە سەرنجی ئەوە بدەینەوە کە هاوسەرەکانی یەعقووب چەند بوونو کوڕەکانی هەر کامیان لە کام دایکە بووە؟ بە گشتی وەك لە : (التفسير التطبيقي للكِتابِ المقدس، لعَهد القَديم، سِفرُ التَكوين، الإصحاح: ٣٥، ص٩٣)، دا هاتوە کە پێشتریش هێناومانە، یەعقووب ؑ بە گشتی چوار هاوسەری بوون :

یەکێکیان (راحیل) کە کچی (لابان)ە کە خاڵی یەعقووب بووە، واتە: کچی خاڵی خۆی هێناوە، کە (راحیل) دایکی یوسوفو بنیامینە، ئەوە دووان.

هاوسەری دووەمی بریتی بووە لە (لەیئە)، یان (لییا)، ئەویش هەر کچی (لابان) بووە، واتە: ئەویش هەر کچی خاڵی خۆی بووە، ئەو کاتە دروست بووە، دوو خوشك ببنە هاوسەری مرۆڤ، لە یەك کاتدا، هەندێکی دیکەش گوتوویانە: دایکی یوسوفو بنیامین، دەبێ پێش ئەو لەیئە وەفاتی کردبێو دوایی ئەوی هێنابێ .

بەڵام ئەوە بە پێی شەریعەتی پێغەمبەری خاتەم ﷺ وایە، وا پێدەچێ هەردووکیانی پێکەوە هەبوو بن، وەك پێشتر بەسەرهاتەکەیمان هێنا: کە دوای ئەوەی یەعقووب حەوت ساڵ شوانیی دەکات بۆ خاڵی، (لەیئە)ی دەداتێ، دوایی حەوت ساڵی دیکە شوانیی دەکات، چونکە زیاتر دڵی بە (ڕاحیل)ەوە دەبێ، ئنجا ئەویشی دەداتێ .

ئنجا (لەیئە) دایکی هەر کام لە (ڕەئووبین، شەمعوون، لاویی، یەهووذا، یەساکیر، زەبوولوون)ە، کەواتە: دایکی شەش کوڕان بووە، ئەو شەشەیان دیارە لە (لەیئە) بوون .

هاوسەری سێیەمی (بولهە)، بولهەش کەنیزەکی (ڕاحیل) بووە، ئەویش دایکی (دان، نەفتالی)، ئەویش دوو کوڕی بوون، ئەوە بوونە دە (١٠) .

هاوسەری چوارەمی (زولفە)، زولفەش کەنیزەکی لەیئە بووە، دیارە کە (بولهەو زولفە)، هەردووکیان کەنیزەکی راحیلو لەیئە بوون، هەر کام لە راحیلو لەیئە، کەنیزەکەکانی خۆیان داوە بە یەعقووب کە لەگەڵیاندا وەك ژنو مێرد ڕەفتار بکات، بۆ ئەوەی منداڵیان ببێ، زیاتر هاندەرەکەیان ئەوە بووە، زولفەش دایکی (جاد، ئەشیر) بووە، ئەو دووانەش کە کوڕانی یازدەیەمو دوازدەیەمن .

ئنجا کە گوتوویانە: ﴿إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُۚ﴾، ئەگەر ئەو (یوسوف) دزیی بکات، برایەکیشی پێشتر دزیی کردوە .

بێگومان ئەوە بوختانێك بووە، بە یوسوفیان کردوەو ویستوویانە ئەو عەیبە لە خۆیان دووربخەنەوە، بەوەی کە بڵێن: ئەو بنیامینە کە دزیی کردوە، برایەکیشی هەبووە هەر وا بووە، یانی: ئەوە لەلایەن دایکیانەوە ئەو عەیبەیان بۆ ماوەتەوە، ئیدی ئەو عەیبەیان لە خۆیان دوورخستۆتەوە !

واتە: ئێمە کە دایکمان جیایە، ئەو عەیبەمان تێدا نیە! هیچیان بۆ نەماوەتەوە، ئەوە نەبێ کە نەك هەر بنیامین، یوسوفیش تۆمەتبار بکەنو دایکیشیان تۆمەتبار بکەن، بۆ ئەوەی ئەو عەیبە لە خۆیان دوور بخەنەوە، یانی: ئەوە لە دەماری ئێمەوە نیەو، ڕەچەڵەکی ئێمە وا نیە .

ئنجا لەو بارەوە لە پەیمانی کۆندا هەندێ حیکایەت هاتوونو، هەندێ لە توێژەرەوانی قورئانیش هەندێك حیکایەتی دیکەیان بۆ زیاد کردوون !

بۆ وێنە: یەکێك لە حیکایەتەکان دەڵێ: یوسوف کاتی خۆی کە منداڵ بووە، بتێکی دزیوە لە باپیری، واتە: بابی دایکی، بتێکی زێڕ بووە، شکاندوویەتیو فڕێی داوە !

هەندێکی دیکە گوتوویانە: یەعقووب پشتێنێکی هەبووە، پشتێنەکە زێڕ بووە، یان زیو بووە، ئنجا نەنکی یوسوف، یوسوفی زۆر خۆشویستوە، بەڵام یوسوفیان وێ نەداوە، لەلای بێ، ئەویش هەڵساوە پشتێنەکەی لە بن جلان لێ بەستوە، دوایی گوتوویەتی: ئەو پشتێنەم دیار نیە، ئنجا یوسوفی پشکنیوەو گوتوویەتی: پشتێنەکەم یوسوف بردوویەتی، کەواتە: بۆم هەیە مادام ئەو پشتێنەی دزیوە، یوسوف لەلای من بێو ببێتە کوڕی من !

ئەو جۆرە ئەو حیکایەتانە هەن .

بەڵام من پێم وایە: کۆمەڵە برایەك دەستیان بچێتە برای خۆیانو بیخەنە بیرێوەو بیفەوتێنن، بە تەئکید ئەوەشیان لە دەست دێ، بوختانی دزییشی بۆ بکەن، ئیدی پێویست بەو حیکایەتانە ناکات، چونکە ئەگەر گریمان یوسوف بە بچووکیی شتێکی دزیی بێ، دیارە منداڵ هیچی لەسەر حیساب نیە، تاکو تەمەنی پازدەساڵیی، بە تایبەتی ئەوەی دووەمیان، ئەگەر نەنکی پشتێنەکەی لێ بەستبێ، یاخود ئەگەر بتێکی دزیی بێ، بۆ ئەوەی بیشکێنێ، ئەوە بێگومان کارێکە (یُشَرِّفُهُ)، شەرەفە بۆ یوسوف، کە بتێك بدزێو بیشکێنێ بە بچووکیی! بەڵام بە هەر حاڵ، پێم وایە ئێمە پەکمان لەسەر ئەو حیکایەتانە نەکەوتوە، چونکە ئەو برایانە هێندە هەڵوێستێکی ڕێكو پێکیان نەبووە، ئێمە بێنین یوسوف تۆمەتبار بکەین: گوایە بە منداڵیی دزییەکی لێ واقیع بووە، تاکو بڵێین: ئەوان تۆمەتیان پێ نەکردوە، چونکە ئەوان کە ئامادەبن برای خۆیان بکوژن، حەوجار حەوجار ئامادەن تۆمەتی پێبکەن، بۆ ئەوەی ئەو عەیبەیە لە خۆیان دووربخەنەوەو بڵێن: هەر ئەمە وای نەکردوە (هەڵبەتە بنیامینیش کە دزیی نەکردوە) ئەوە برایەکەشی کاتی خۆی، هەر دزیی کردوە، بۆ ئەوەی ئەو شتە لە خۆیان دووربخەنەوە، کە ئەوە لە ڕەچەڵەكو نەسەبی ئێمە دوورە، ئێمە دایکمان جیایەو شتی وامان لە نێودا نەبووە، بەڵام ئەوانە دایکیان جیایە، بۆیە ڕەفتاریشیان لە ئێمە جیا بووە !

**٢) -** ﴿فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ﴾، ئەم ڕستەیە سێ مانای هەن :

١ ـ یوسوف لەلای خۆی ئەوەی پەنهان کرد، {بە ڕاناوی مێینە هێناویەتی، مێینەی مەجازیی}، واتە: ئەو تۆمەتە، یانی: (فَأَسَرَّ یوسوف هذِهِ لتهمة فِي نَفسِهِ)، یوسوف ئەو تۆمەتە کە درایە پاڵ خۆی و برایەکەیشی، لەلای خۆی پەنهانی کردو بۆی دەرنەخستن، یاخود بۆی دەرنەخستن کە ئەوە من یوسوفم و ڕاست ناکەن، ئێوە تۆمەتم پێ دەکەن، ئەوە واتایەکی .

٢ ـ یاخود: ئەو تووڕەیی و ڕق هەڵسان و پێناخۆش بوونەی کە لە دڵیدا پەیدا بوو، بەهۆی ئەو قسەیانەوە، ئا ئەو پێناخۆش بوون و حاڵناخۆش بوونەی، لەلای خۆی پەنهان کردو کپ کردو بۆی دەرنەخستن، واتە: وای نەکرد کە هەست پێ بکەن کە زۆری پێ قەڵسەو پێی ناخۆشە، چونکە ئەو کاتە لێی دەکەوتنە گومان .

( لإسَرارُ: إخفاءُ الكَلامِ عَن أَن يَسمَعَهُ السامِعُ)، (إسَرار)، بریتییە لە شاردنەوەی قسە بە شێوەیەك كە بیسەر نەیبیستێ، بەڵام بە دڵنیایی لێرەدا مەرج نیە هەر قسە بێ، واتە: ئەو پێناخۆش بوونە، ئەو حاڵەتە کە بۆی دروست بوو، لە ئەنجامی تۆمەتبار کرانیدا، ئەو حاڵەتەی لەلای خۆی پەنهان کرد، یانی: تووڕەییەکەی، دڵتەنگیی و ناڕەحەت بوونەکەی لەلای خۆی پەنهان کرد .

٣ ـ واتایەکی دیکەی سێیەمی ئەم ڕستەیە: ﴿فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ﴾، ئەوەیە کە قسەکەی خۆی: ﴿أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًاۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ٧٧﴾ ئائەوەی پەنهان کردووە و لەبەرخۆیەوە یان لە دڵی خۆیدا گوتوویەتی و ئاشکرای نەکردوە، وەك لە بڕگەی سێیەم دا دەیخەینە ڕوو :

٣) – ﴿قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا﴾، گوتی: حاڵەتی ئێوە خراپترە، پێگەی ئێوە، لە هی ئەو دوو برایەتان، کە ئاوا تۆمەتباریان دەکەن، خراپترە .

پسپۆڕانی زمان دەڵێن: (أُطلِقَ المكان عَلى الحَالة، وَهيَ السَّرِقة، وَإطلاقُ لمكانِ والمكانة على الحَالة، شائِعٌ)، ﴿أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا﴾، وشەی (مَكان)، واتە: جێگا، بەکارهێنراوە بۆ حاڵەت کە لێرەدا بریتییە لە دزیی‌و، بەکارهێنانی وشەی (مَكان)و (مكانة)، بۆ حاڵەت، شتێکی باوە .

کەواتە: یوسوف چی پەنهان کرد؟ ئەوە کە گوتی: ﴿أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا﴾، ئا ئەوە یوسوف ئەو قسەیەی لە دڵی خۆیدا کرد، کەواتە: ﴿فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ﴾، واتە: ئەو گوتراو (مَقول)ەی، لە دوای گوتی: (قَالَ)یەوە، دێ، قال: ﴿أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا﴾، یوسوف ئائەوەی لە دڵی خۆیدا، شاردەوەو پەنهان کردوەو بۆی دەرنەخستوون .

ئنجا مەبەست لە گوتنی : ﴿قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا﴾، {گوتی: ئێوە حاڵتان خراپترە} دوو ئەگەری هەن‌و دەشگونجێ لە یەك كات دا هەردووکیان مەبەست بن :

یەکەم : ئەو دوو برایەتان هەرچەندە لە دایکێکی دیکەش بن، مادام هەمووتان کوڕی بابێکن، ئنجا ئێوەش لەوان گەورەترن، ئێوە دەبوایە نەتانهێشتبایە – ئەگەر ڕاست دەکەن – ئەوانە عادەتی دزیی بگرنە بەر.

دووەم : ئێوە خراپترن کە لێرە لەلای بێگانە زەمی برای خۆتان دەکەن، چونکە: بنیامین بەڵێ پێوانەکەی لە بارەکەدا دەرکەوتوە، بەڵام خۆ یوسوف ئێمە نایناسین، ئێوە لێرە باسی عەیبی برای خۆتان بکەن‌و زەم‌و غەیبەتی برای خۆتان بکەن، کە دیاریش نیەو لێتان ونبووە ! مانای وایە ئێوە بەو کردەوەیەتان لەوانیش خراپترن، ئەگەر ڕاست بێ ئەوان دزییشیان کردبێ.

٤) – ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ﴾، خواش زاناترە بەوەی ئێوە باسی دەکەن .

واتە: ئەوەی كە دەیڵێن دەربارەی ئەو برایەتان كە ونبووە، گوایە ئەویش دزیی كردووە، دەربارەی ئەمەشتان كە ئەو شتە لە بارەكەی دا دۆزراوەتەوە، بە دزی دادەنێن‌و دەڵێن دزیی كردوە، خوا زاناترە بەوەی كە دەیڵێن، چونكە :

أ ـ جاریّ بە نسبەت یوسوفەوە: دیار نیەو وەك گوتراوە: درۆی پاش مردوویە .

ب ـ بە نسبەت بنیامینیشەوە: ئەو شتە تەنیا لە بارەكەی داو لە نێو جەواڵەكەی دا دۆزراوەتەوە، ئەوەندەش بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی دزیوەتی، بە بەڵگەی ئەوە كە ئەدی ئێوەش دەستمایەكە لە نێو بارەكانی خۆتاندا نەبوو، كاتێك چوونەوە لە ماڵیّ جەواڵەكانتان كردەوەو بارەكانتان كردوە، دەستمایەكانتان نەدۆزیەوە ! ئایا ئەوەش بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی ئێوە ئەو پارەیەتان دزیوە؟ نەخێر، ئەدی چۆن ئەوە دەكەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە بنیامین ئەو پێوانەیەی دزیوە ؟

ئەوەی باسم كرد هەرچەندە نەمدیوە لە تەفسیرەكاندا باس كرابیّ[1]، بەلام بە سەرنجدانی سیاقی ئایەتەكان‌و لیّ وردبوونەوەی وشەكان، دەفامرێتەوە، چونكە یوسوفعليه السلام كە دەڵیّ: ﴿ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ﴾، ئێوە حاڵتان خراپترە لەو دوو برایەتان، دەبیّ مەبەستێكی هەبیّ‌و پاساوێكی هەبیّ ئەو قسەیەی كردبیّ، كە پێم وایە مەبەستەكەی هەر ئەوەیە كە پێیان دەڵیّ: ئێوە نەدەبوو زەم‌و سەرزەنشتی دوو برای خۆتان بكەن‌و، نەدەبوو هەروا لەوگۆڕە، بە دز ناوزەدیان بكەن، كە ئەگەری شتی دیكەش هەیە، دیارە وەك واقیعیش هەر وابووەو، بنیامین دز نەبووەو شتەكە خراوەتە نێو بارەكەی، یانی: ئەگەر هەر كەسێك شتێك لە هەگبەكەیدا، شتێك لە جەواڵەكەیدا، شتێك توورەكەكەیدا دۆزرایەوە، بەڵگە بووایە لەسەر دزیی كردنی، ئێوەش هەر دە (١٠)تان ئەو دەست مایەی كە جاری پێشوو ئازووخەكەتان پیّ كڕی بوو، خرابووە نێو جەواڵەكانتان، نێو بارەكانتان، كەواتە: دەبوو ئێوەش بە

---

[1] ) ڕەنگە هەشبیّ‌و من نەمدیبیّ و پێم نەزانیبیّ، وەك : (بەرچاوڕوونییەك)دا باسمان كردوە .

دز لە قەڵەم بدرێن، کە ئەگەر ئەو یەکێکە، ئێوە دە (١٠) کەس بوون! کەواتە: ئەگەر دە (١٠) کەس پێکەوە دزیی بکەن، زۆر خراپترە لەوەی کە یەك نەفەر بە تەنیا دزیی بکات، یاخود بە دز ناوزەند بکرێ .

هەروەها دەشگونجێ بگوترێ: کە ئەوان دەڵێن : ﴿ إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ﴾، ئەگەر ئەمە دزیی بکات، برایەکی پێشتریش دزیی کردوە .

دەیانەوێ بڵێن: ئەمە بۆیە دزیی کردوە، چونکە برایەکەشی پێشتر وا بووە، واتە: خەتایەکە دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەی دایکیان، ئنجا ئەگەر بەڵگەی خراپیی ئەم (بنیامین)ە، ئەوە بێ کە برایەکەی پێشتر دزیی کردوە، بێگومان ئەو دووانەش هەردووکیان برای ئێوەن، ئنجا ئەگەر برایەك کە پێشتر دزیی کردوە، ببێتە هۆی ئەوەی ئەو برایەش دزیی بکات، ئەدی دە (١٠) برا کە دوو برایان دزیی بکەن، بە تەئکید لە پێشترن کە ئەوانیش بە دز لە قەڵەم بدرێن، چونکە ئەگەر دزیی کردنی برایەك ببێتە هۆی تۆمەتبارکردنو بە دز دانانی برایەکی دیکەی، ئەدی دزیی کردنی دوو برایان، چۆن نابێتە هۆی تۆمەتبارکردنو بە دز دانانی دە (١٠) برایەکانی دی ؟!

**مەسەلەی پێنجەم :** **داواکردنی برایەکانی یوسوف کە لەبەرئەوەی بنیامین بابێکی پیری بە ساڵداچووی هەیە، با یەکێکیان لە جیاتی وی بگرێو گل بداتەوەو، ڕەتکردنەوەی یوسوف بۆ داواکەیان، بە بەڵگەی ئەوە کە ستەمە ئێمە جگە لەو کەسەی پێوانەکە لە بارەکەی دا دۆزراوەتەوە، گل بدەینەوە :**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبٗا شَيۡخٗا كَبِيرٗا فَخُذۡ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٧٨﴾ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأۡخُذَ إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە لە حەوت بڕگەدا

١) - ﴿ قَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ ﴾، گوتیان: ئەی عەزیز! (عزیز) لە زمانی عەرەبیی دا بە مانای زاڵ، دەستەڵاتدار، دەستڕۆیشتوو، دێ، بەڵام لێرەدا دوو حاڵەت هەن :

١ – یان مەبەست هەر بەرپرسێکە، وەك بڵێی: ئەی خاوەن شکۆ، دەستەڵاتدار، بەڕێز، گەورە .

٢ – یاخود مەبەست ئەوە بووە کە یوسوف ﷺ وێڕای بەرپرسیاریەتیی سەرپەرشتیی کاروباری ئابووریی‌و ئازووخە لە میسڕدا، بەرپرسیاریەتیی کاری عەزیزیشی پێ سپێردراوە، کە لە پەیمانی کۆندا هاتوە: سەرۆکی پاسەوانەکانی پادشا بووە .

٢) - ﴿إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا﴾، بێگومان ئەم کوڕە، کە ئەو شتە لە بارەکەی دا دۆزراوەتەوە، بابێکی بە تەمەنی گەورەی هەیە .

وەك دەبینین، سێ وشەیان بەکارهێناون: (إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا)، (أَبًا)، واتە :

أ – بابێکی هەیە کە ڕەحم‌و عەطفی بابیش زۆر بەقوەتە .

ب – (شَيْخًا )، بابەکەی بە تەمەنەو بە ساڵداچوویە .

ج – (كَبِيرًا)، زۆریش کەوتۆتە تەمەنەوە، یاخود (كَبِيرًا)، واتە: سەرۆکی بنەماڵەو خزمەکانی خۆشیەتی، ئەو واتایەشی هەیە، ئنجا کەسێکیش سەرۆك بێ‌و گەورەی قەومێك بێ، دەبێ زیاتر دڵی ڕابگیرێ‌و موراعاتی بکرێ‌و ڕێزی بگیرێ .

٣) - ﴿فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ﴾، دەجا یەکێك لە ئێمە لە شوێنی ئەو بگرەو گلی بدەوە، با لێرە بێ، یەکێك لە ئێمە بێ لە شوێنی ئەو برایەمان بێ.

﴿ مَكَانَهُۥٓ ﴾، (المكانُ: أَصْلُهُ مَحَلُّ الكونِ، أَي: ما يَسْتَقِرُّ فيهِ الجِسْمُ، وَهَوَ هُنا مَجازٌ في العِوَضِ لأَنَّ العِوَضَ يَضَعُهُ آخِذهُ فِي مَكانِ الشيءِ المُعَوَّضِ عَنْهُ)، وشەی (مَكانَ)، یانی: شوێن، لە بنەڕەتدا بریتیە لە شوێنی تێدا بوون، واتە: ئەو شوێنەی کە جەستەیەك تێیدا سەقامگیر دەبێ، بەڵام لێرەدا بە مەجاز بەکارهێنراوە لە جیاتی قەرەبوو، چونکە قەرەبوو بابای وەرگر لە شوێنی شتە قەرەبووکراوەکە دایدەنێ، واتە: یەکێك لە ئێمە لە شوێنی ئەو بگرەو لە جیاتی وی لەلای خۆت بیهێڵەوە .

٤) - ﴿ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، بێگومان ئێمە تۆ لە چاکەکاران دەبینین .

ویستوویانە یوسوف هانبدەن بۆ ئەوەی داوایەکەیان وەربگرێ، واتە: تۆ مادام چاکەکاریو ئێمە لە چاکەکارانت دەبینین، بابای چاکەکار کە داوایەکی لێ دەکرێ، ڕەتی ناکاتەوە، واتە: تۆش ئەو داوایەمان ڕەت مەکەوە، یەکێك لە ئێمە لە جیاتی ئەو برایەمان لەلای خۆت بهێڵەوە، بەڵام ئەو مۆڵەت بدە لەبەر بابمان .

٥) - ﴿ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ ﴾، یوسوف ﷺ گوتی: پەنا بە خوا، یانی: (أَعُوذُ بِاللهِ مَعَاذاً)، پەنا بە خوا دەگرم، بە پەنا گرتن، واتە: پەنا بە خوا دەگرم کە شتێکی وا بکەم .

٦) - ﴿ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَـٰعَنَا عِندَهُۥٓ ﴾، (پەنا بە خوا دەگرم) کە ئێمە جگە لەوەی کەلوپەلی خۆمان لە لای دۆزیوەتەوە، بگرینو گل بدەینەوەو بیکەینە کۆیلە، ئێمە پەنا بە خوا دەگرین کە کاری وا بکەین، واتە: بابای بێ خەتا لە شوێنی بابای تاوانبار بگرین .

٧) - ﴿ إِنَّآ إِذًا لَّظَـٰلِمُونَ ﴾، ئەگەر وا بکەین، کەواتە: ئێمە لە ستەمکارانین، ئێمەش ستەم ناکەین، بۆیە ئەو داوایەی ئێوە ڕەت دەکەینەوە، نەك لەبەر ئەوەی من چاکەکار نیم، لەبەر ئەوەی کە ستەمکار نیم، ئەوەش کە ئێوە بە چاکەی دەزانن، ئەگەر بیکەم، دەبێتە ستەم لەو کەسەی لەلای خۆمان

گلی دەدەینەوەو، کە هیچیشی نەکردوە بەرییەو بێ تاوانە، ئەوەش کە شتەکەمان لە بارەکەیدا دۆزیوەتەوەو تاوانبارە، ئەویان وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێ !

(الظُّلْمُ: وَضْعُ الشيءِ فِي غَيرِ موضِعِهِ)، (ظُلم)، بریتیە لە دانانی شتێك کە لە شوێنی خۆیدا نەبێ، هەروەها (ظُلم) بە مانای سنوور شکاندن دێو، (ظُلم) بە مانای موتڵەقی گوناحکردنو تاوانکردنیش دێ .

کەواتە: داواکەیان ڕەت دەکاتەوەو بەڵگەشیان بۆ دێنێتەوە، کە جێبەجێکردنی ئەو داوایەی ئێوە، دەبێتە ستەم، ئێمەش ستەم لە خۆمان ناوەشێنینەوە، کە ئەوە هۆشداریی پێدانو، ئاگادار کردنەوەیەکیشە بۆ ئەوان، کە ئێوەش ئاگاداربن! ئەو ستەمانەی تا ئێستا کردووتانن لە یوسوفو، لەو برایەتان کە بە ناهەق تۆمەتباری دەکەنو، هەروەها لە بابتانو لە دایکتان، ئێوەش دەست لەو ستەمانە هەڵبگرن، ئەوەتا ئێمە ستەم لە خۆمان ناوەشێنینەوە، ئێوەش هەوڵبدەن بەو شێوەیە بن .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دوازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان هەشت (٨) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٨٠ تاکو ٨٧)، ئەم دەرسە ئاڵقەی یازدەیەمی زنجیرە بە سەرهاتی یوسوف ﷵ دەگرێتە خۆی.

لەم هەشت ئایەتەدا خوا ﷻ باسی ئەوەی کردوە، کە پاش نائومێدبوونی دە (١٠) کوڕەکانی یەعقووب ﷵ کە بنیامینی برایان ڕزگار بکەن‌و، یوسوف لەگەڵیان بنێرێتەوەو، یەکێکی دیکەیان لە جیاتی بگرێ‌و گل بداتەوە، دوای ئەوەی کە لە ئەوە نائومێد دەبن کە برایەکەیان ڕزگار بکەن، خۆیان کەنار دەگرن‌و کۆدەبنەوە: برا گەورەکەیان کە لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: ناوی (ڕەئوبین) بووە، بە سەرزەنشت کردنەوە پێیان دەڵێ: مادام بابتان پەیمانی لێ وەرگرتبوون، پێشتریش لە بارەی یوسوفەوە کەمتەرخەمییتان کرد، (کە خستتانە بیرەوە)، من ئێرە بەجێ ناهێڵم، هەتا بابم مۆڵەتم نەدات، یاخود خوا بڕیارم بۆ نەدا، داخۆ چی بکەم ؟

ئنجا پێیان دەڵێ: ئێوە بگەڕێنەوە لای بابتان‌و ڕووداوی دزیی کردنی کوڕەکەی، واتە: بنیامینی بۆ بگێڕنەوە، پێشیبڵێن: ئێمە چیمان بینیوە ئەوەمان گوتوە، ئەگەر بڕواش ناکات، با لە خەڵکی ئەو شارەی کە لێی بوون‌و، لەو کاروانەش کە لەگەڵی بوون، پرسیار بکات، دڵنیاش بێ کە ئێمە ڕاستگۆین .

دیارە بابیشیان تۆمەتباریان دەکات بەوەی : خۆیان شتێکیان پێ چاك بووەو کردوویانە، دوایی ڕوویان لێ وەردەگێڕێ‌و پشتیان تێدەکات‌و، یادی یوسوف دەکات ﷵ و خەفەتی ئەویشی بۆ تازە دەبێتەوەو، کۆنە برینی دەکولێتەوەو، لە داخان

چاوەکانیشی سپی هەڵدەگەڕێن، یانی: پەردەی سپیان دەچێتە سەر، کوڕەکانیشی لەسەر ئەو باسکردنەی یوسوفو زۆر خەفەت خواردنەی، سەرزەنشتی دەکەنو، پێی دەڵێن: تۆ بەهۆی یادکردنی یوسوفەوە، بە بەردەوامی کەنەفت دەبی، یاخود دەمری.

ئەویش پێیان دەڵێ: من سکاڵای خەفەتو پەژارەی زۆری خۆم تەنیا بۆ لای خوا دەکەم، ئەوەی منیش دەیزانم، ئێوە نایزانن .

دیارە یەعقووب ﷺ هەمیشە گەشبین بووە وەك پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوا، خوای پەروەردگاریش بە گشتی شتێکی لێ حاڵی کردوە، کە یوسوف نەفەوتاوەو، کاتێك دێ پێك شادببنەوە، بۆیە گوتوویەتی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن .

لە کۆتایی دا پێیان دەڵێ: بچن لە یوسوفو برایەکەی بخەفتێنو بە دوایاندا بگەڕێنو، لە دەرووی خوا، لە دەرووکردنەوەی خواو لە بەزەیی‌و سۆزی خوا، نائومێد مەبن، چونکە جگە لە کافران، هیچ کەس لە بەزەیی بێسنوورو ڕەهای خوای بەرز، نائومێد نابێ .

﴿ فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُوا۟ مِنْهُ خَلَصُوا۟ نَجِيًّا ۖ قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ ۖ فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِى ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَـٰكِمِينَ ﴿٨٠﴾ ٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُوا۟ يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَـٰفِظِينَ ﴿٨١﴾ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ۖ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَـٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٨٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُا۟ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَـٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُوا۟ بَثِّى وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ يَـٰبَنِىَّ ٱذْهَبُوا۟ فَتَحَسَّسُوا۟ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَا۟يْـَٔسُوا۟ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ لَا يَا۟يْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{ئنجا دوای ئەوەی لێی نائومێد بوون، (کە برایەکەیان لێ گل نەداتەوە)، بۆ ڕاوێژکردن بە چپە، کەناریان گرت، گەورەکەیان گوتی: ئایا نازانن کە بابتان پەیمانی لە خواوە لێ وەرگرتن (کە کوڕەکەی بۆ ببەنەوە)، پێشتریش کە لە بەرانبەر یوسوفدا کەمتەرخەمییتان کرد، (ئێستا بە چ ڕوویێك بچمەوە لای بابم!) هەتا بابم مۆڵەتم نەدات، یان خوا بڕیارم بۆ نەدات، کە ئەو چاکترینی بڕیاردەرانە ﴿٨٠﴾ ئەم زەمینەی میسرِ بە جێ ناهێڵم، ئێوەش بگەڕێنەوە لای بابتان بڵێن: ئەی بابی خۆمان! بێگومان کوڕەکەت دزیی کرد، ئێمەش هەر بەوە شایەدیی دەدەین کە زانیومانەو، پارێزەری نادیار نەبووین (تاکو سوور نەبین لەسەر بردنی برایەکەمانو، تووشی ئەو بەڵایە ببێ) ﴿٨١﴾ ئەگەر بڕواشمان پێ ناکەی، لە خەڵکی ئەو شارەی کە لێی بووینو، ئەو کاروانەی لەگەڵی هاتین، لەوبارەوە پرسیار بکەو، بە دڵنیایی ئێمە لە ڕاستگۆیانین ﴿٨٢﴾ بابیان گوتی: بەڵکو نەفسەکانتان کارێکیان بۆ جوانو ئاسان کردنو کردتان، خۆڕاگرییەکی جوان (شایستەی منە)، بەڵکو خوا هەموویانم بۆ بێنێتەوە، بێگومان هەر ئەو زانای کارزانە ﴿٨٣﴾ ئیدی ڕووی لێوەرگێڕانو گوتی: هەی داخو خەفەت بۆ یوسوفو، بەهۆی خەمبارییەوە هەردوو چاوی سپی هەڵگەڕان (پەردەیەکی سپییان پەرییە سەرو) خەمو تووڕەیی خۆی کپ کردەوە (پیشی خواردەوە) ﴿٨٤﴾ کوڕەکانی گوتیان: بە خوا بەردەوام یادو باسی یوسوف دەکەی (هەتا لە زۆر نەخۆشییان) کەنەفت دەبی، یان لە فەوتاوان دەبی ﴿٨٥﴾ یەعقووب گوتی: سکاڵای پەرێشانییو مەراقی خۆم، تەنیا بۆ لای خوا دەبەمو، لە خواوە شتێك دەزانم، ئێوە نایزانن (لەبارەی پێك شادبوونەوەی هەموو لایەك) ﴿٨٦﴾ گوتی: ئەی کوڕەکانم! بڕۆن بە دوای یوسوفو برایەکەیدا بگەڕێن (لێیان بخەفتێنو) لە بەزەییو دەروو کردنەوەی خوا، نائومێد مەبن، بە دڵنیایی جگە لە کۆمەڵی بێبڕوایان، کەس لە بەزەییو دەرووکردنەوەی خوا، بێ هیوا نابێ ﴿٨٧﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( ٱسْتَيْـَٔسُوا۟ ) : واتە: زۆر نائومێد بوون، (اليَأسُ: إنقطاعُ الطمَعِ، يَئِسَ وَاستَيأَسَ، مِثْلُ سَخِرَ وَاستَسْخَرَ)، (يَأْسْ)، بریتییە لەوە كە ئینسان تەمای نەمێنی، ئومێدی نەمێنی، دەگوترێ: (يَئسَ وَاستَيأَسَ)، وەك (سَخِرَ وَاسْتَسْخَرَ)، (سَخِرَ)، گاڵتەی پێكرد، (اسْتَسخَرَ)، واتە: زۆری گاڵتە پێكرد، (يَئِسَ)، نائومێد بوو، (وَاستَيأَسَ)، واتە: زۆر نائومێد بوو .

( خَلَصُوا۟ ) : (إنفَرَدُوا خالِصِينَ عَن غَيْرِهِم)، واتە: تاك كەوتنەوە، كەناریان گرت، خۆیان لە خەڵكی دیكە جیاكردەوە لە پەنایەكدا .

( نَجِيًّا ) : (أَصْلُ النَجاءِ: الإنْفِصَالُ مِنَ الشيءِ وَمِنْهُ: نَجا فُلانٌ مِنْ فُلانٍ، وَأَنْجَيْتَهُ وَنَجَيّتُهُ، وَالتَّناجِي: المُحَادَثَةُ سِرَّاً، وَالنَّجِيُّ: المُناجِي، وَيُقَالُ: للوَاحِدِ، وَالجَمْعِ، قَرَّبْناهُ نَجِيّاً)، لە ڕیشەدا (نَجاءَ)، بەمانای جیاكردنەوەی شتێك لە شتێك دێ، دەگوترێ: (نَجا فُلانٌ مِنْ فُلانٍ)، واتە: فلانكەس لە فلانكەسی دەربازی بوو، (وَأَنْجَيْتَهُ وَنَجَيّتُهُ)، هەردووكیان بە مانای دەربازم كرد، ڕزگارم كرد، دێن، (وَالتَّناجِي: المُحَادَثَةُ سِرَّاً)، (تَناجِي)، ئەوەیە كە بە پەنهانییو بە چپە قسە بكرێ، سركە سرك بكرێ، (وَنَجِيٌّ)، یانی: (المُناجِي)، كەسێك كە بە سركە قسەی لەگەڵدا دەكرێ، كە بۆ تاكو بۆ كۆ بەكاردێ، (قَرَّبْناهُ نَجِيّاً)، واتە: لە خۆمانمان نیزیك خستەوەو بە چپەو بە پەنهانیی قسەمان لەگەڵدا كرد .

( فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ ) : واتە: كەمتەرخەمییتان كرد دەربارەی یوسوف، (التَّفْرِيطُ: أَن يُقَصِّرَ فِي الفَرْطِ)، (فَرْط)، واتە: پێشكەوتن، (تَفرِيط) ئەوەیە كە ئینسان كەمتەرخەمیی بكات لە پێشكەوتندا، دەڵێ: (ما فَرَّطتُ فِي كَذَا، أي: ما قَصَّرتُ)، لەو شتەدا كەمتەرخەمییم نەكرد، كورتم نەهێنا.

( فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ ) : واتە: ئەم زەمینە بەجێ ناهێڵم، كە مەبەست پێی وڵاتی میسرە، (لا أَزَالُ: أَثْبُتُ)، واتە: بەردەوام دەبم، لێرە دەچەسپێم، یانی (لَنْ أُفَارِقَ أَرْضَ مِصْر)، سەر زەمینی میسر بەجێ ناهێڵم .

(يَٰأَسَفَىٰ ) : واتە: هەی داخ و خەفەت وەرە، ئێستا كاتیەتی من خەفەتان زۆر بخۆم، (الأَسَفُ: الحُزنُ وَالغَضَبُ مَعَاً)، (أَسَف)، بریتیە لە خەمباریی و تووڕەیی پێكەوە .

( كَظِيمٌ ) : (الكَظَمُ: مَخرَجُ النَّفَسِ)، (كَظَم)، بریتیە لەو شوێنەی كە ئینسان هەناسەی لێوە دەدات، ئنجا (كَظْمُ الغَيْظ)، ئەوەیە كە ئینسان تووڕەیی خۆی، پەستی خۆی قوتبداتەوەو ڕایبگرێ، (وَيُعَبَّرُ بِهِ عَنِ السُّكوتِ)، مەبەست پێی بێ دەنگییە، (كَظْم)، ئەوەیە ئینسان پەست و تووڕە بێ، بەڵام دەری نەبڕێ.

( تَفْتَؤُاْ ) : واتە: تۆ بەردەوام دەبی، دەڵێ: (ما فَتِئتُ أفعَلُ كَذا، أي: ما زِلتُ) واتە: بەردەوام دەبم لەسەر ئەوە، (وَما فَتَئتُ، وفَتِئتُ)، هەردووكیان هاتوون، (تَفْتَؤُاْ : تَذكر يوسف، والمَعنى: لا تَفتر عَنْ كونِكَ تَذْكر يُوسُف)، واتە: تۆ دانابڕێی لەوەی كە باسی یوسوف بكەی، یانی: هەمیشە باسی دەكەی .

(حَرَضًا) : واتە: زۆر نەخۆش و كەنەفت، (الحَرَضُ: مَصْدَرٌ وَهُوَ شِدَّةُ المَرَضِ، لِمُشْفِي عَلَى الهلاكِ)، نەخۆشییەك كە ئینسان بەرێتە كەناری مردن .

( أَشْكُواْ ) : (الشَّكوى وَالشكو وَالشِكاية وَالشَّكاةُ: إِظْهارُ البَثِّ)، ئەو چوار وشەیە: (شَكوى، شَكو، شكاية، شَكاة)، هەمووی دەرخستنی خەفەت و ناڕەحەتییە، كە مرۆڤ نەتوانێ لە دڵی خۆیدا ڕایبگرێ و، بڵاوی بكاتەوە .

( بَثِّي ) : (البَثُّ: أَصلُ البَثِّ : التَّفْرِيقُ وَإِثَارَةُ الشيءِ، وَبَثُّ النَّفْسِ: ما انطوت عَلَيهِ مِنَ لغَمِّ)، وشەی (بَثّ)، یانی: بڵاوكردنەوە، پرش و بڵاوكردنی شتێك، (بَثُّ النَّفْسِ) ئەوەیە ئەو خەفەتەی دەروون دەیگرێتە خۆی، ئینسان تاقەتی پێ ناشكێ و دەبێ بڵاوی بكاتەوە، ئنجا عادەت وایە كەسێك خەم و ناڕەحەتیی زۆر و پەژارەی زۆری هەبێ، وەختێ بۆ كەسێكی باسكرد، یان لەبەر خۆیەوە باسی كرد، یان لە

موناجاتو ڕازو نیاز لەگەڵ خوادا، باسی کرد، باری شانو دڵو دەروونی سووك دەبێ.

(وَحُزْنِيٓ) : (الحُزْنُ: الغَمُّ عَلَى الشيءِ الفَائت، وَيُضَادُّهُ الفرَحُ)، (حُزْن)، بریتیە لە خەمو پەژارە بۆ شتێك كە ڕابردوە، پێچەوانەی شادمانییە، (وَالحُزْنُ: الأَسَفُ عَلَى الفَائِتِ)، هەروەها (حُزْن) بە (أَسَف)یش دەگوترێ، واتە: زۆر خەفەت خواردن لەسەر شتێك كە ڕابردوە.

(فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ) : واتە: لە یوسوف بخەفتێن، لێی بگەڕێن، لە خۆیو لە برایەكەی بگەڕێن، واتە: بە دوایاندا بچن، (التحَسُّسُ: شِدَّةُ الطَلَبِ وَالتعَرُّفِ وَهُوَ عَمٌّ مِنَ التَجَسُّسِ: فَهُوَ تَطَلُّبُ مَعَ اخْتِفَاءٍ وَتَسَتر)، (تَحَسُّس)، بریتیە لەوەی ئینسان زۆر بەدوای شتێكدا بگەڕێو بیەوێ بیبینێتەوەو (تَحَسُّس)، گشتیترە لە (تَجَسُّس)، چونكە (تَجَسُّس) بریتیە لەوەی كە ئینسان بە شێوەیەكی پەنهانو پەنامەكیی لە شتێك بگەڕێ، بەڵام (تَحَسُّس)، گشتییە، چ بە پەنامەكیی، چ بە ئاشكرا.

(رَّوْحِ ٱللَّهِ) : دەڵێ: (الرَّوْحُ: النَّفَسُ)، (رَوْح)، بە مانای هەناسەدان دێ، (واسْتُعِيرَ لِكَشْفِ الكربِ، لأَنَّ الكربَ وَالهَمَّ يُطْلَقُ عَلَيْهِما: الغَمُّ وَضِيقُ النَّفسِ وَضِيقُ لصَّدْرِ، وَمِنْهُ قَوْلُهم: تَنَفَّس الصبْحُ، إذا زَالَت ظُلْمَة اللَّيْلِ)، (رَوْح) بە مانای هەناسەیە، بەڵام لێرەدا بە مانای لاچوونی خەمو خەفەتو دەروو لێكرانەوەیە، چونكە خەفەتو دڵ ناڕەحەتیی، وشەی: تەنگەنەفەسییو، وشەی سینە تەنگیی، بۆ بەكاردێن، لەوەشەوە گوتراوە: (تَنَفَّس الصُّبْح)، بەرە بەیان هەناسەیدا، واتە: تاریكیی شەو لاچووو بەرەبەیان دەركەوت.

(راغب الأصفهاني)یش گوتوویەتی: (الرَّوحُ وَالرُّوحُ فِي الأَصْلِ وَاحِدٌ)، وشەی (رَوح) و (رُوح) لە ڕیشەدا هەر یەكن، گوتوویەتی: (الرَّوحُ: التَّنَفُّسُ، وَقَدْ رَاحَ الإنْسَانُ إذَا تَنَفَّسَ)، (رَوح)، بە مانای هەناسەدان دێ، دەگوترێ: (أَرَاحَ لإنْسانُ)، ئەگەر هەناسەیدا (وَمِنَ رَوْحِ اللهِ أي: مِنْ فَرَجِهِ وَرَحْمَتِهِ، وَذلِكَ بَعْضُ لرَّوْح) كە دەڵێ: ﴿مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ﴾، واتە: لە دەروو لێكرانەوەی خواو بەزەیی خوا، كە بەشێكە لە هەناسەدانو بەشێكە لە دڵخۆشییو دەروو لێكرانەوە.

## مانای گشتی ئایەتەکان

لە دەرسی پێشوودا باسی ئەوە کرا: دوای ئەوەی ئەو دەفرەی پادشا ئاوی پێخواردۆتەوەو دواتر کراوە بە پێوانە (مکیال) بۆ ئازووخەو دەغڵو دان، لە باری بنیامیندا دەدۆزرێتەوەو، یوسوف ﷺ وەك سەرپەرشتیاری ئازووخە لە میسر، برایەکانی بنیامین سەرپشك دەکات، کە ئایا سزای چی بێ ؟ ئەوانیش دەڵێن: سزای ئەوەیە کە هەر کەسێك ئەو دەفرە لە بارەکەی دا دۆزرایەوە، خۆی دەبێتە سزاو تۆڵەی، واتە: دەبێتە کۆیلە، یان دەگیرێ لە بەرانبەر ئەو دزییەدا کە کردوویەتی .

دوایی هەرچەندە برایەکانی زۆر داوای لێدەکەنو، دەڵێن: لەبەر ئەوەی بابێکی پیرو بە ساڵداچووی هەیە، یەکێك لە ئێمە لە جیاتی وی بگرە، بەلام ئەو دەڵێ: پەنا بە خوا کە ئێمە جگە لەو کەسەی کە کەلوپەلەکەی خۆمان لە لای دۆزیوەتەوە، یەکێکی دیکە بگرینو گل بدەینەوە، ئەگەر وا بکەین ئێمە لە ستەمکاران دەبین .

ئنجا لێرەدا دەفەرموێ : ﴿ فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُوا۟ مِنْهُ خَلَصُوا۟ نَجِيًّا ﴾، ئنجا کاتێك بە تەواویی لێی نائومێد بوون، ڕۆیشتنو، چوونە کەنارێکەوە، چوونە پەنایەکەوەو، پێکەوە دەستیان کرد بە چپە چپ، واتە: ڕاوێژێك کە تەنیا خۆیان لە بەینی خۆیاندا بزانن چی دەڵێن! بۆیە چوونە کەنارێکەوەو دەستیان بە ڕاوێژ کرد، بەلام بە چپە، ﴿ قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، گەورەکەیان، واتە: ئەوەی کە لە هەموویان بە تەمەنتر بوو، کە لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: ناوی (ڕەئوبین)یان (روبین) بووە، بەلام لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: ناوی (شەمعوون) بووە، بە هەر حاڵ ئەوەیان کە لە هەموویان بە تەمەنتر بوو، کە لە قورئاندا ناوی نەهاتووە، پێی گوتن: ﴿ أَلَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ أَبَاكُم قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، ئایا نازانن کە بابتان پەیمانێکی پتەوی بە

ناوی خواوە لە ئێوە وەرگرتبوو، واتە: پەیمانی لێ وەرگرتبوون کە کوڕەکەی بە سەلامەتیی بۆ ببەنەوە، ﴿ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِي يُوسُفَ ﴾، دەشزانن پێشتر کەمتەرخەمییتان کرد لە بارەی یوسوفەوە، {کە بردتانە دەشتو، بە بیانووی پیاسەو گەشتو گەڕانەوە، خستتانە چاڵو بیرەوەو دوایش ئەو سیناریۆیە درۆیەتان ڕێکخست لە لای بابتان: کە گورگ خواردوویەتیو کەمتەرخەمییەکی گەورەتان کرد}.

﴿ فَلَنْ أَبْرَحَ الْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِي أَبِي ﴾، بۆیە من ئەم سەر زەمینە، (سەر زەمینی میسر)، بەجێ ناهێڵم هەتا بابم مۆڵەتم نەدا، وەك لە کوردەوارییدا دەڵێ: (ڕووم نیە بچمەوە لای بابم)، (بە چ چاوو ڕوویێك بابم ببینمەوە)، هەتا بابم مۆڵەتم نەدا، نایەمەوەو لێرە دەبم، ﴿ أَوْ يَحْكُمَ اللَّهُ لِي ﴾، یان ئەوەتا خوا بڕیارم بۆ بدات، واتە: خوا ﷻ دەروویێکم لێ بکاتەوەو بە بارێکی دیکەدا هەلومەرجەکە بسووڕێنێ، کە ئێمە نازانین چۆنە؟ ﴿ وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ ﴾، خواش باشترینی بڕیاردەرانە، باشترینی کەسانێکە کە تەصەڕڕوف دەکەنو بڕیار دەدەن، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە غەیری خوا (حاکم) هەبێ، بە واتای دەستوەردانە کاروباری بوونو بڕیاری ڕەها بە دەست بوون، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا تەعبیرەکە بەو شێوەیە هاتوە، وەك: ﴿ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾المؤمنون، هەمووشمان دەزانین جگە لە خوا بەدیهێنەرێکی دیکە نیە: ﴿ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴿١٦﴾ ﴾الرعد.

یان هەر لەو سووڕەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ﴾، خوا بە بەزەیترینی بە بەزەییانە، لە حاڵێکدا بەزەیی ڕەهاو بێسنوور، تەنیا هی خوایە ﷻ، و بەزەیی دروستکراوەکان لەگەڵ هی خوای پەروەردگاردا ناچێتە تەرازووەوە، تاکو پێکەوە هەڵبسەنگێنرێنو بگوترێ: بەزەیی خوا لە هی ئەوان زیاترە، بەڵام تەعبیرەکە وا هاتوە.

کەواتە: کوڕە گەورەی یەعقووب دوو مەرجان دادەنێ بۆ گەڕانەوە:

یەکەم: دەبێ بابم مۆڵەتم بدات کە بگەڕێمەوە.

دووەم: یاخود خوا بڕیارم بۆ بدات، کە خواش باشترین بڕیاردەری بڕیاردەرانە.

ئنجا برا گەورەکەیان ئامۆژگارییو، ڕێنماییان دەکات دەڵێ: ﴿ ٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ ﴾، بگەڕێنەوە بۆ لای بابتان، بگەڕێنەوەو دەنگو باسی بۆ بگێڕنەوە، ﴿ فَقُولُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ ﴾، بڵێن: ئەی بابی خۆمان! بێگومان کوڕەکەی تۆ دزیی کردوە، واتە: بنیامین، بۆیە نەهاتۆتەوەو گل دراوەتەوە لە میسر، چونکە دزیی لێ ئاشکرا بووە، هەڵبەتە لێرەدا ئەو تەعبیرەیان زۆر زەقو ڕەقە، چونکە یەکسەر برای خۆیان تۆمەتبار کردوە کە دزیی کردوە، هەر لەبەر ئەوەی ئەو دەفرە لە بارەکەی دا دۆزراوەتەوە، کە ئەوە لە ڕاستییدا تفەنگ بە تاریکییەوە نانە، چونکە ئەگەر وا بێ، ئەوانیش هەر دە برایەکە، دەبێ بە دز لە قەڵەم درابن، لەبەر ئەوەی ئەو دەست مایەی کە جاری یەکەم دەغڵو ئازووخەکەیان پێ کڕی، خرابۆوە نێو بارەکانیان، ئنجا ئەگەر ئەو بەوە ببێتە دز، ئەوانیش هەر بوونە دز ! ﴿ وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا ﴾، ئنجا ئێمە شایەدییمان تەنیا بەوە داوە، کە زانیومانە، واتە: ئەوەی کە بە ڕواڵەت بۆ ئێمە دەرکەوتوە: ئەو دەفرە، ئەو پێوانەیە لە باری بنیامیندا دۆزرایەوە، ﴿ وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَٰفِظِينَ ﴾، ئێمەش پارێزەری نادیارو پەنهان نەبووین، تاکو بزانین حەقیقەت چۆنە؟ ئەوە واتایەکی .

یاخود ئێمە غەیبزانو پەنهانزان نەبووین، ئەگەر پەنهانمان زانیبایە، هێندە سوور نەدەبووین لەسەر تۆ، کە بنیامینمان لەگەڵ بنێریو، لەوێ بە داوی کۆیلایەتییەوە ببێ !

ئنجا برا گەورەکەیان پێیان دەڵێ: بە بابتان بڵێن: ﴿ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ﴾، وە لەو شارە بپرسە، واتە: لە خەڵکی ئەو شارە بپرسە، کە ئێمە تێیدا بووین، نەفەر بنێرە : ئەرێ ڕووداوێکی ئاوا بووە، ئەوە چۆن بووە؟ ﴿ وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ﴾، هەروەها لەو کاروانەش کە ئێمە لەگەڵیان هاتینەوە

بۆ ئێرە، بپرسە، ئەو کاروانەش کە لە میسرەوە هاتۆتەوە بۆ سەر زەمینی کەنعان، کە یەعقووبو کوڕەکانی لێی نیشتەجێ بوون، کاروانێکی گەورە بووە، ﴿ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾، وە دڵنیاش بە ئێمە لە ڕاستگۆیانینو، هیچ درۆو خیلاف لە قسەکەماندا نیە .

بۆیەش هێندە داکۆکیی دەکەن، چونکە پێشتر درۆیان لەگەڵ بابیان کردووەو، لە خۆیان بە گومانن، چونکە لە قەفەسی تۆمەتباریی دان .

ئنجا ئەوە هەمووی قرتێندراوە کە برایەکان مانەوە نۆ (٩)، چونکە یوسوف خۆیو بنیامینی برای، ئەوە دووانو، ئنجا برا گەورەکەشیان (رەئوبین) ئەوە سێ، مانای وایە: لە دوازدان (١٢) نۆ (٩) ماونەوە، دوایی چوونەوەو بۆ بابیان گێڕایەوەو، هەموو ئەوەی کە برا گەورەکەیان پێی گوتبوونو ئامۆژگارییانی پێ کرد بوون، هەموویان عەرزی بابیان کرد، ئەویش ئاوا وەڵامی دانەوە: ﴿ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ﴾، (بابیان) گوتی: بەڵکو نەفسەکانتان شتێکی بۆ ئاسانو جوان کردن، ئێوەش ئەنجامتاندا .

لێرەدا یەعقووب بە نەزانراویی دەیڵێ، چونکە نازانێ چییان بەسەر بنیامین هێناوەو، بنیامین بۆچی لەوێ گل دراوەتەوەو، ئەو مەسەلەی شت دۆزرانەوە لە بارەکەی ئەودا، چۆن بووە؟ کوڕەکەی خۆی ناسیوە، کە کوڕی دزیی نیە، بۆیە قسەیەکی گشتی دەڵێ: ﴿ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ﴾، بەڵکو نەفسەکانتان شتێکی بۆ جوانو ئاسان کردن (ئێوەش ئەنجامتانداوە)، ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ﴾، کاری منیش بریتیە لە خۆڕاگرییەکی جوان، یاخود هەڵوێستی منیش بریتیە لەوە کە بە جوانیی خۆڕاگربم، خۆڕاگریی جوانیش ئەوەیە کە سکاڵاو ئاخو ئۆفو، دەربڕینی ناڕەحەتی تێدا نەبێ، ﴿ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا ﴾، نیزیکە خوا هەموویانم بۆ بێنێتەوە، وێکڕا بە هەموویان شاد ببمەوە، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، بێگومان هەر ئەو زانای کارزانە .

وەك دەبینین یەعقووب ﷺ لە ناڕەحەتترین کاتدا، ئومێدی خێرو چاوەڕوانیی خێر، لە دەست نادات، دڵی بە خوای پەروەردگارو بەزەیی خوا هەر خۆشە .

بەڵێ چەندان بەڵای بەسەر هاتوون: ئەوە یوسوفی ونبووە، ئنجا ئەوە بنیامینیش بەو دەردە چووە، ئەویش دزیی لێ ئاشکرا بووو بە کۆیلە کراوە، ئنجا ئەوە کوڕە گەورەکەشی لەوێ ماوەتەوە، لەلایەکی دیکەوەش: قاتو قڕیی‌و گرانیی‌و وەزعێکی قورس بەسەر دەڤەرەکەدا هاتوە، بەڵام ئومێد بەرنادا، هەمیشە بە بەزەیی خوا دڵخۆش‌و شادمان‌و گەشبینە .

﴿ وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ ﴾، ئیدی ڕووی لێوەرگێڕان‌و ڕووی لێ وەچەرخاندن، ﴿ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾، گوتی: ئەی داخ‌و خەفەت بۆ من، لەسەر یوسوف .

(الأَسَفُ: الحُزنُ الشديد) (أسف) بریتیە لە دڵ تەنگییەکی سەخت، هەندێك لە شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: (أسَفِي) بووە، ئەی خەفەت‌و داخی من! وەرن، هەندێکیش دەڵێن: ئەوە هەر وەك (نُدْبَة)، وایە: (وا محمداه)، بەڵام بزوێنەکەی فڕتێنراوە: ﴿ يَٰٓأَسَفَىٰ ﴾، ئەی هاوار! ئەسەف‌و خەفەت‌و ناڕەحەتیی، ﴿ عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾، لەسەر یوسوف .

لێرەدا بۆیە باسی یوسوف دەکات بە تایبەت، هەرچەندە بنیامینیش‌و کوڕە گەورەکەشی لەوێ ماونەوە، چونکە هەرچی بنیامینە، ئەوە چارەنووسی دیارە، کە لەلای عەزیزی میسر گل دراوەو کراوە بە کۆیلە، کوڕە گەورەکەشی دیارە بۆ خۆی نەهاتۆتەوە، بەڵام ئەوەی کە زۆر جێی داخ‌و خەفەتە، یوسوفە، کە هیچ سەرەنجامی دیار نیە، سۆراخی نیە، لەلایەك، ئنجا بە هۆی یوسوف ﷺیشەوە ئەو خەم‌و شتانەی دیکەش بوونە سەر بارو، ئەگەر ئەو ون نەبووانە، بنیامینش نەدەچوو بۆ وێ‌و، ئەویش گل نەدەدرایەوەو، کوڕە گەورەکەشی بەو شێوەیە سوێندی نەدەخوارد، کە نەگەڕێتەوە تاکو بابی مۆڵەتی نەدات، یان خوا بڕیارێکی بۆ نەدا، ﴿ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ ﴾، ئنجا هەردوو چاوی

سپی هەڵگەڕان، لە خەفەتان ﴿ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴾، واتە: زۆر تووڕەو پەست بوو، یاخود زۆر خەفەتبار بوو، خەفەتخان بوو .

وشەی ﴿كَظِيمٌ ﴾، یان (فَعِیل)ی بە مانای (فَاعِل)ە، واتە: زۆر خەفەتی خوارد، زۆر خەفەتخانو دڵتەنگ بوو، یاخود (فَعِیل)ی بە مانای (مَفعُول)ە، واتە: پڕ بوو بوو لە تووڕەییو پەستییو دڵتەنگیی، (فَهُوَ مَملوءٌ غَضَباً وَغَيظاً)، بەڵام تووڕەییو پەستییو خەفەتەکەی خۆی کپ دەکردەوە .

کە دەفەرموێ: دوو چاوی سپی هەڵگەڕان، پەردەی سپی پەرییە سەر چاوان، واتە: کوێر بوو، هەموو زانایان وایان لێکداوەتەوە، دوایی باسی دەکەین لە مەسەلە گرنگەکاندا، لە ڕووی پزیشکییەوە چۆنە ؟

﴿قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفۡتَؤُا۟ تَذۡكُرُ یُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَـٰلِكِینَ ﴾، کوڕەکانی پێیان گوت: سوێند بە خوا، تۆ بەردەوام باسی یوسوف دەکەیو یادی دەکەیەوە، تاکو زۆر نەخۆش دەبی، ﴿حَرَضًا﴾، یانی: نەخۆشیی کەلەلا، کەنەفت، یانی: زۆر نارەحەت دەبی لە ئەنجامی زۆر خەفەت خواردندا، نەخۆش دەبی، نەخۆشێکی کەنەفتی کە لەلای کەوتوو لە جێگادا، ﴿أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَـٰلِكِینَ ﴾، یاخود: هەر لە بەین دەچی .

﴿ٱلۡهَـٰلِكِینَ ﴾، (جمع هالك، هَلَكَ أي: ماتَ)، لێرەدا مەبەستیان پێ ئەوەیە: گیان دەسپێری، نەك هەر نەخۆشو کەنەفت دەبی، بەڵکو یەکجارییش ماڵئاوایی لە دنیا دەکەی، گلەیی لێدەکەن کە بۆچی هێندە باسی یوسوف دەکەیو، هێندە خەفەتی لێ دەخۆی ؟

﴿ قَالَ إِنَّمَاۤ أَشۡكُوا۟ بَثِّی وَحُزۡنِیۤ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، یەعقووب ﷺ گوتی: بێگومان خەفەتی زۆری خۆمو دڵتەنگییو پەژارەی خۆم، تەنیا بۆ لای خوا سکاڵا دەکەم، ﴿ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾، لەلایەن خواوەش شتێك دەزانم، کە ئێوە نایزانن .

وشەی (بثّ)، بریتیە لە خەمو خەفەتێك كە ئینسان نەتوانێ لە دڵی خۆیدا پەنهانی بكاتو، ناچار بێ بڵاوی بكاتەوە، دەفەرموێ: من سكاڵای ئەو خەفەتە زۆرانەی خۆم بۆ لای خوا دەبەم، واتە: تەنیا لە ڕازو نیاز لەگەڵ خوادا، خەمەكانی خۆم بڵاودەكەمەوەو، ناڕەحەتییەكانی خۆم دەردەبڕم، نەك بۆ لای بەندەكان، ﴿ وَحُزْنِيٓ ﴾، (حُزن) بریتیە لە خەفەت خواردن لە شتێكی ڕابردوو، واتە: پەژارەی خۆمو خەفەتو مەراقی خۆم، تەنیا بۆ لای خوا دەردەبڕمو، ئەوەی من لە لایەن خواوە دەیزانم، ئێوە نایزانن .

ئنجا لە كۆتایی دا ئامۆژگارییان دەكات، دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ ﴾، ئەی ڕۆڵەكانم! ئەی كوڕەكانم! بڕۆن لە یوسوفو لە برایەكەی بخەفتێن، بە دوایاندا بگەڕێن، سۆراخیان بكەن، بزانن چییان لێهاتووەو سەرەنجامیان چۆنە؟ ﴿ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ ﴾، لە بەزەیی خواش، یاخود لە دەرووی خێری خواش، نائومێد مەبن، (رَّوۡحِ )، یان بە مانای ڕەحمەتە، یان بە مانای دەرووی خێرە، لە ئەسڵدا وشەی: (رَّوۡحِ ) بە مانای نەفەس كێشانو هەناسە هەڵمژینە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ١٨ ﴾التكویر، چونكە ئینسان لە ئەنجامی نەفەس وەرگرتندا، جۆرێك لە فەرەحنایی بۆ دێ، هەروەها بە پێچەوانەوە، ئەگەر مەجالی نەفەس كێشانو هەناسەدانی نەبوو، لە ئەنجامی نەمانی ئۆكسجین، یان كەمیی ئۆكسجیندا، بەدەنی ڕێك دێو، چاوی تاریك دادێ، واتە: لە دەرووی خێری خوا، نائومێد مەبنو، لە بەزەیی خوا نائومێد مەبن، ﴿ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾، بێگومان تەنیا كۆمەڵی بێبڕوایان لە بەزەیی خوا نائومێد دەبن، چونكە ئەوان خوا ناناسن كە بەزەییەكەی چەند فراوانو مەزنو ڕەهایە، چەند بێ سنوورە، بەشی هەمووكەسو هەموو شتێك دەكات، بۆیە ئەوان نائومێد دەبن، بەڵام ئەوانەی خوا بناسنو خوا پەرست بن، هەرگیز لە بەزەییو لوتفی خواو، لە بەخششو كەرەمی بێ سنووری خوا، لە دەرووی خێری خوا، نائومێد نابن، لە تەنگانەترین كاتیشدا .

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم :** پاش نائومێد بوونی دە (١٠) برایەكانی یوسوف عليه السلام لەوەی كە بنیامینیان لەگەڵ بنێرێ، بە چیە، پێكەوە ڕاوێژیان كردو برا گەورەكەیان سەرزەنشتی كردن، كە بابیان بە ناوی خواوە پەیمانی لێ وەرگرتوون، كە دەبێ بنیامین بە سەلامەتیی بهێننەوە، پێشتریش بەرانبەر بە یوسوف كەمتەرخەم بوون، بۆیە گوتی: ئێستا ناگەڕێمەوە، هەتا بابم مۆڵەتم نەدا، یاخود خوا بڕیارم بۆ نەدا، بۆیەش بگەڕێنەوە لای بابتان و، مەسەلەی دزیی كردنی بنیامینی بۆ باس بكەن، بڵێن با لە خەڵكی شارەكەو لەو كاروانەش پرسیار بكات، كە لەگەڵیان گەڕاینەوەو، با دڵنیابێ كە ئێمە لە ڕاستگۆیانین :

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا اسْتَيْأَسُوا مِنْهُ خَلَصُوا نَجِيًّا قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوا أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُمْ مَوْثِقًا مِنَ اللَّهِ وَمِنْ قَبْلُ مَا فَرَّطْتُمْ فِي يُوسُفَ فَلَنْ أَبْرَحَ الْأَرْضَ حَتَّى يَأْذَنَ لِي أَبِي أَوْ يَحْكُمَ اللَّهُ لِي وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ ﴿٨٠﴾ ارْجِعُوا إِلَى أَبِيكُمْ فَقُولُوا يَا أَبَانَا إِنَّ ابْنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدْنَا إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَافِظِينَ ﴿٨١﴾ وَاسْأَلِ الْقَرْيَةَ الَّتِي كُنَّا فِيهَا وَالْعِيرَ الَّتِي أَقْبَلْنَا فِيهَا وَإِنَّا لَصَادِقُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە لە شازدە بڕگەدا

١) - ﴿ فَلَمَّا ٱسۡتَيۡـَٔسُواْ مِنۡهُ ﴾، واتە: کاتێك کە زۆر لێی تەمابڕاو بوونو نائومێد بوون. (اليأسُ: إنْقِطاعُ الطمَعِ)، (يأس) ئەوەیە کە ئینسان تەمای بە شتێك نەمێنێو لێی دەستبڕاو بێ، لێی نائومێد بێ .

ئنجا ﴿ فَلَمَّا ٱسۡتَيۡـَٔسُواْ ﴾، یانی: (فَلَما يَئِسوا)، بەڵام ئەو (س) و (ت)یە، بۆ زیاتر تۆخ کردنەوەو جەخت کردنەوەی مانایەکەیەتی، چونکە لە زمانی گەلی عەرەبدا بنچینەیەکە کە دەڵێ: (إنَّ زِيادَةَ المَبنى تَدُلُّ عَلى زِيادَةِ لمَعْنَى)، وشەیەك تاکو پیتەکانی زیاتر بن، ماناکەی بەهێزتر دەبێ .

ئایا کوڕەکانی یەعقووب لە چی نائومێد بوون؟ ﴿ فَلَمَّا ٱسۡتَيۡـَٔسُواْ مِنۡهُ ﴾، لە یوسوف نائومێد بوون، یانی: نائومێد بوون لەوەی کە یوسوف برایەکەیان بۆ بەربدات، دەڵێ: (فَهُوَ مِنْ تَعْلِيقِ الحُكْمِ بالذَّاتِ، وَالمُرادُ بَعْضُ أَحْوالِها بقَرينةِ المَقامِ لِلمُبالَغةِ)، واتە: حوکمەکە بەستراوەتەوە بە خودی یوسوفەوە، بەڵام مەبەست پێی هەندێك لە حاڵەکانی یوسوفە، واتە: نائومێد بوون، لەوەی کە یوسوف برایەکەیان بۆ بەر بداتو، یەکێك لە خۆیان لەجیاتی وی بگرێ .

٢) - ﴿ خَلَصُواْ نَجِيًّا ﴾، (خَلَصُوا: اعْتَزَلُوا وَانْفَرَدُوا، وَأَصْلُهُ مِنَ الخُلُوصِ، وَهُوَ لصَّفَاءُ مِنَ الأَخْلاَطِ)، واتە: گۆشەگیر بوونو پەنایان گرت، تاق بوونەوەو لە خەڵکی جیابوونەوە، وشەی (خَلَصُوا)، لە ئەسڵدا لە (خُلُوص)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە ساف بوونەوە لە خڵتە، ساف بوونەوەی شتێك لەو خڵتەو شتانەی کە ڕەگەڵی کەوتوون .

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ نَجِيًّا ﴾، (النجيُّ: اسْمٌ مِنَ المناجاةِ، وَانْتِصابه على لحال والتَّناجي: المحادثة سِرًّا، أي: مُتَناجين)، وشەی (نَجِي) ناوە لە (مُناجاة)ەوە، ﴿ خَلَصُواْ نَجِيًّا ﴾ (منصوب) بووە لەسەر (حالية)، واتە:

خۆیان جیاکردۆتەوە تاك کەوتوونەوە، لە حاڵێکدا کە پێکەوە بە پەنهانیی چپەیان دەکرد، دەڵێ: (تَناجي) بە پەنهانیی بە چپە پێکەوە قسەکردنە، واتە: بە چپە پێکەوە کردنەوە، خۆیان جیاکردەوە لە خەڵك و کەناریان گرت و، چوونە پەنایەك و دەستیان کرد بە ڕاوێژکردن، وشەی ﴿نَجِيًّا﴾، هەم بۆ تاك بەکاردێ، هەم بۆ کۆ .

٢) - ﴿قَالَ كَبِيرُهُمْ﴾، گەورەکەیان گوتی، وشەی (كَبِير)، لە زمانی عەرەبیدا هەم بۆ تەمەن بەکاردێ، کەسێك تەمەنی لە بەرانبەرەکانی زیاتر بێ، هەم بۆ پلەو پایە بەکاردێ، کەسێك کە لە ڕووی پلەو پایەو بەرپرسێتییەوە، لە بەرانبەرەکانی پلەی زیاتر بێ، بۆ هەردووکیان بەکاردێ .

لێرەدا دیارە مەبەست پێی لە ڕووی تەمەنەوەیە، ئەوەیان کە بە تەمەنتر بوو، لە پەیمانی کۆن لە تەوراتدا دەڵێ: ناوی (ڕەئوبین) یان (ڕوبین) بووە، لە هەندێ لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: ناوی (شمعوون) بووە، هەر چۆن بێ لە قورئاندا ناوی نەهاتوە، تەنیا دەفەرموێ: ئەوەیان کە لە هەموویان بە تەمەن گەورەتر بوو، کە وەك پێشتریش باسمان کرد، هەر ئەو برا گەورەیەشیان بووە کە کاتی خۆشی هەڵوێستی هەر جیاواز بوو: ﴿اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضًا يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْمًا صَالِحِينَ ۝٩﴾، واتە: برایەکان گوتیان یوسوف بکوژن (ڕاستەوخۆ) یاخود فڕێیدەنە دەشت و بیابانێك چۆڵەوانییەك (با لەوێ بفەوتێ: لە تینووان بخنکێ، یان لە برسان بمرێ، یان درندەیەك بیخوا)، بەڵام ئەو برا گەورەیە هەڵوێستی جیا بوو: ﴿قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَتِ الْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ السَّيَّارَةِ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ ۝١٠﴾، واتە: بێژەرێکیان گوتی: یوسوف مەکوژن، بەڵکو بیخەنە بیرێکەوە، هەندێ لە کاروانان هەڵیدەگرنەوە، ئەگەر هەر دەتانەوێ شتێکی لە دژ بکەن، (ئاوە بکەن)، لێرەش برا گەورەکەیان گوتی :

٤) - ﴿أَلَمْ تَعْلَمُوٓاْ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ﴾، لێرەوە دیارە سەرزەنشتیان دەكات، چونكە ئەم پرسیاركردنە پرسیاركردنی تەقریری پێ دەڵێن، واتە: دەیەوێ كە دانی پێدابێنن، ئایا نازانن كە بابتان پەیمانێكی لە خواوە لێ وەرگرتن، پەیمان لێ وەرگرتن لە خواوە، پێشتر باسمان كرد ئاوا بوو: ﴿ قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأْتُنَّنِى بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ ۖ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴿٦٦﴾ ﴾، (یەعقووب) گوتی: هەرگیز ئەو (بنیامین)تان، لەگەڵ نانێرم، تاكو پەیمانێكی پتەوم بە ناوی خواوە پێ نەدەن، {واتە: خوا بكەنە شایەد بەسەر خۆتانەوە، یاخود سوێندم بۆ بە خوا بخۆن}، كە هەر بۆم دێننەوە، مەگەر دەورتان بگیرێ‌و ئابڵووقە بدرێن‌و بێ چارەو بێ دەرەتان بن، ئنجا كاتێك كە پەیمانەكەیان پێدا گوتی: خوا چاودێرو ئاگادارە بەسەر ئەو بەڵێن‌و پەیمانەی ئێوەوە، كە بە منتاندا، ئاوا برا گەورەكەیان ئەوەیان بە چاودا دەداتەوە: بابتان پەیمانێكی ئاوای لێ وەرنەگرتن ؟!

٥) - ﴿وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ﴾، پێشتریش كە دەربارەی یوسوف كەمتەرخەمییتان كرد .

(مَا)، لە: (مَا فَرَّطتُمْ)دا، {(مـا) مَصْدَرِيـة، أَي: تَفـريطكم فِـي يُوسُـف عليه السلام كـانَ مِن قبل الـموثق)، كەمتەرخەمییشتان دەربارەی یوسوف عليه السلام پێشتر ئەویشتان بوو، ئێستا ئەوەش بوو بەسەر بار، بۆیە لەبەر ئەو دوو هەڵوێستە :

٦) - ﴿فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ﴾، ئەم سەرزەمینە بە جێ ناهێڵم.

(لقُـرطُبي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا[1] دەڵێ: (فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ: أَي: أَلْـزَمُهـا وَلاَ أَبْـرح مُقِيمـاً فِيهـا، يُقَـال: بَـرِحَ بَراحـاً وبروحـاً أَي: زَالَ، فَـإِذَا دَخَـلَ

١) الجامع لأحكام القرآن، ج ٩، ص ٢٤٢.

لنَفِي صَارَ مُثْبَتَاً)، من وازی لێناهێنم لەم سەر زەمینە، هەر دەبێ لێرە بم، (بَرِحَ بَرَاحَاً بروحَاً)، واتە: (زَالَ)، یانی: لاچوو، (فَإِذَا دَخَلَ النَّفِيُ صَارَ مُثْبَتَاً)، (بَرِحَ)، واتە: لاچوو، (لا أَبرَحُ)، واتە: لا ناچم، (لَن أَبرَحَ)، ئەوە بۆ زیاتر جەخت کردنەوەیە، یانی: هەرگیز ئەم سەر زەمینە بەجێ ناهێڵم، مەبەست پێی سەر زەمینی میسرە، ئەو شارەیە کە لێی بوون .

٧) - ﴿حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِيٓ أَبِيٓ﴾، هەتا بابم مۆڵەتم دەدا، واتە: مۆڵەتم دەدا کە بگەڕێمەوە بۆ لای، چونکە من شەرمی لێدەکەم، ڕووم نیە، بە چ چاوو ڕوویێك بچمەوە بۆ لای، کە ئەو دوو کوڕی بەهۆی ئێمەوە فەوتان: یەکێکیان شوێن بزر بوو، ئەوی دیکەشیان کرا بە کۆیلە، بۆیە تاکو مۆڵەتم نەدا، ناگەڕێمەوە .

٨) - ﴿أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِي﴾، یان خوا بڕیارم بۆ بدات، واتە: نازانێ خوا ﷻ چی بۆ بڕیار دەدات؟ چی لە قەدەری خوادا هەیە؟ بۆیە بە شێوەیەکی نادیارو نەزانراو باسی دەکات، کە دەڵێ: ﴿أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِي﴾، (وَاللَّامُ للأجلِ، أَي: يَحْكُم الله بما فِيهِ نَفْعِي)، واتە: خوا بڕیارێك دەدا کە سوودی منی تێدابێ، مادام من بەو شێوەیە، خۆم دەپارێزم لەوەی بچمەوە بۆ لای بابم، ئەو هەواڵە ناخۆشەی بۆ بەرمەوە .

ئەوەش هەر چۆن بێ هەڵوێستێکە نواندوویەتی .

٩) - ﴿وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ﴾، ئەو (خوا)یش باشترین بڕیاردەرە .

دەگونجێ لێرەدا مەبەست لە حوکم کە لە (ٱلْحَٰكِمِينَ)دا، شێردراوەتەوە، مەبەست پێی حوکمی تەشریعیی بێ، واتە: خوا باشترین کەسێکە کە یاسا دادەنێ، یاخود مەبەست پێی حوکمی تەکوینییو قەدەریی بێ، واتە: خوا باشترین بڕیاردەرە، تەصەڕووف دەکات لە بووندا .

١٠) - ئنجا برا گەورەکەیان پێیان دەڵێ: ﴿ٱرْجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ﴾، بگەڕێنەوە بۆ لای بابتان، واتە: بگەڕێنەوە، بارو ئازووخەکانیش بەرنەوەو هەواڵەکانیشی بۆ بەرنەوە .

١١) - ﴿فَقُولُوا۟ يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ﴾، بڵێن: ئەی بابی خۆمان! بێگومان کوڕەکەت دزیی کرد.

یانی: بە پێی ڕواڵەتێك کە ئێمە بینیومانە، وامان لێحاڵی بووە، کە بنیامینی کوڕی تۆ دزیی لێ ئاشکرا بووە، لێرەدا جێی سەرنج ئەوەیە کە دەڵێن: ﴿إِنَّ ٱبْنَكَ﴾، بێگومان کوڕەکەی تۆ، دەشیان توانی بڵێن: (إِنَّ أَخَانَا) برایەکەمان، چونکە وەك چۆن کوڕی یەعقووبە، برای ئەوانیشە، بەڵام مەبەستیان بووە بڵێن: ئەو کوڕەی تۆ کە زیادە مەحەببەتت لەگەڵی هەیەو، پەیمانت لە ئێمە وەرگرت، کە بۆت بێنینەوە، ئەوەتا دزیی لێ ئاشکرا بوو، واتە: شایستەی ئەوە نەبوو هێندەت خۆش بوێ‌و، هێندە بە تەنگیەوە بی !!

من ئاوا لەو تەعبیرە تێدەگەم، هەرچەندە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، باسیان کردبێ .

ئنجا کە دەڵێن: ﴿يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ﴾، لە ڕاستییدا ئەوە تەعبیرو دەربڕینێکی زۆر زەق‌و ڕەق‌و بێ ئینصافانەشە، چونکە وەك پێشتریش باسم کرد لە مانا گشتییەکەیدا: خۆ ئەگەر کە ئەو پێوانەیە، (پێشتر ئاو پێخۆرەوەی پادشا بووە) لە باری بنیامیندا دۆزراوەتەوە، بەڵگە بووایە لەسەر ئەوەی بنیامین، دزە، دەبووایە ئەوانیش کە یەکەمجار ئازووخەو دەغڵ‌و دانەکەیان بردەوەو، دەستمایەو بەهایەك کە دەغڵەکەیان پێ کڕی بوو، خرا بووە نێو بارەکانیان، دەبووایە ئەوانیش دز بن، کە دیارە خۆیان بە دز نەزانیوە، ئەدی چۆن برایەکەیان بە دز دەزانن، کە لە تاریکێن‌و جاریێ نازانن داخۆ مەسەلەکە چۆن بووە؟ ئایا ناگونجا وەك چۆن دەستمایەکە خرابووە نێو بارەکەی ئەوان، هەر بەو شێوەیەش، ئەو پێوانەیە خرابێتە نێو بارەکەی بنیامینەوە، واتە: بۆیان نەبوو ئەو تەعبیرە بەکاربێنن، بەڵام بە هەر حاڵ جۆرێك لە غەلل‌و غەش‌و بوغزو غەرەزیان هەر لە دڵدا بووە، بەرانبەر بە یوسوفیش‌و بە برایەکەشی، وەك لە دەرسی پێشووتریشدا باسمان کرد، بە بەڵگەی ئەوە کە لە ئایەتی

(٧٧)دا، گوتیان: ﴿إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ﴾، ئەگەر ئەوە دزیی بکات، برایەکیشی پێشتر دزیی کردبوو .

١٢) - ﴿وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا﴾، ئێمەش تەنیا بەوە شایەدیی دەدەین (کە دەڵێین: کوڕەکەت دزیی کردوە) بەوەی کە زانیومانەو بۆ ئێمە دەرکەوتوە .

١٣) - ﴿وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَـٰفِظِينَ﴾، ئنجا ئێمە پارێزەری پەنهان نەبووین، واتە: نازانین لە پەنهاندا، چۆنە؟ بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە دەرکەوتوە، ئەوەیە کە دزیی لێ ئاشکرا بووە .

واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە ئێمە پارێزەری پەنهان نەبووین، تاکو ئیلحاح لە تۆ نەکەین کە بنیامینمان لەگەڵ بنێریو، سەرەنجام بە داوی کۆیلایەتییەوە ببێ .

واتە: کە دەڵێن : ﴿وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَـٰفِظِينَ﴾، یان پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە دەڵێن: ﴿إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ﴾، واتە: کە دەڵێین کوڕەکەت دزیی کردوە، ئێمە ئاگاداری پەنهان نین، ئەگەر ئەو ماستە مووێکی تێدا بێ، وەك چۆن دەستمایەکان خرابوونە نێو بارەکانمان، ئەو دەفرەش بەبێ ئاگاداری بنیامین خرابێتە بارەکەیەوە، مانای وایە ئێمە ناڵێین: دزیی کردوە .

یاخود: ﴿وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَـٰفِظِينَ﴾، پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە کاتی خۆی داوایان لە بابیان کردو ئیلحاحیان لێکردو، بەڵێنیان بە یوسف داو گوتیان: ﴿سَنُرَٰوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَـٰعِلُونَ ٦١﴾یوسف، دوایی ئەوە بوو کە زۆر داکۆکییان لە بابیان کردو جەختیان لێ کردەوە، کە دەبێ بنیامینیان هەر لەگەڵدا بنێرێ، دەڵێن: ئەوەی ئێستا دەیبینین، ئەگەر ئەوەمان زانیبایەو پارێزەری نادیار بووینایە، ئەو کاتە ئێمە زۆرمان لە تۆ نەدەکرد کە بنیامینمان لەگەڵ بنێریو، تووشی ئەو شەرمەزارییە ببین .

دەشگونجێ کە گوتوویانە: ﴿وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَٰفِظِينَ﴾، هەر جۆرێك بێ لە تەعبیری جوان بەکارهێنان لەگەڵ بابیاندا، وەك رێزی بابو گوڕایەتیی، یاخود بە جۆرێك خۆیان پاراستوە لەوەی برایەکەیان یەکجاریی تۆمەتی دزیی بخەنە پاڵ، چونکە متمانەیان پێی بووەو زانیویانە: بنیامین لەو کوڕانە نیە، لەو پیاوانە نیە کە دزیی بکات .

١٤) - ﴿وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا﴾، لەو شارەش بپرسە کە تێیدا بووین .

کە دیارە مەبەست پێی خەڵکەکەیە .

(وَسُؤَال القَرية: مَجاز عَن سُؤَال أَهْلِها، وَالمُرَادُ بها مَدِينة مِصْر)[1]، دیارە مەبەستیان پێی خەڵکی شارەکەیە، واتە: لە خەڵکی میسڕ بپرسە، پرسیار بکە .

١٥) - ﴿وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا﴾، هەروەها لەو کاروانەش بپرسە کە لەگەڵیان هاتینەوە، واتە: ئەو کاروانەش کە لەگەڵ واندا گەڕاینەوە، بەرەو ئەم دەڤەری خۆمان، سەر زەمینی کەنعانو شام، لەوانیش پرسیار بکە، واتە: دوو جۆرە پرسیار کردن بۆ بابیان پێشنیار دەکەن :

أ/ دەتوانی خەڵکی بنێری بۆ میسڕو لەوێ بپرسن: داخۆ ئەو ڕووداوە چۆن بووە ؟

ب/ لە کاروانەکەش کە لەگەڵیان هاتووینەوە، لەوانیش بپرسی .

١٦) - ﴿وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾، دڵنیاش بە ئێمە لە ڕاستانین، واتە: هیچ گومانت لەوەدا نەبێ کە ڕاست دەکەین، بۆیەش وایان گوتوە، چونکە پێشتر درۆیان لەگەڵ بابیان کردوە، بۆیە پێویست بەوە بووە کە زۆر داکۆکیی بۆ بکەنو، زۆر بۆی جەخت بکەنەوە، تاکو متمانەیان پێ بکات .

١) التحرير والتنوير ج١٣، ص٤٠.

دیارە ئەم ئایەتە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە هەر کاتێك مرۆڤ لەسەر هەق بوو، زانیشی کە گومانی خراپی پێ دەبردرێ، مافی خۆیەتی کە لایەنی بەرانبەر دڵنیا بکاتەوەو چۆن قەناعەتی دێ، ئەو شێوازە بەکاربێنێ، ئەگەر سوێندی بۆ بخوا، ئەگەر بڵێ: فەرموو پرسیار بکەو بێ منەتی بکات، بۆ ئەوەی دڵنیابێ‌و دڵ لە دڵدان‌و دوو دڵیی نەمێنێ .

**مەسەلەی دووەم:** تۆمەتبار کردنی یەعقووب بۆ کوڕەکانی‌و، ڕاگەیاندنی ئەوە کە خۆڕاگرییەکی جوانی دەبێ‌و، ئومێدەوار بوونی بە دیتنەوەی کوڕەکانی‌و، پێ شاد بوونەوەیان‌و، دەروو لێکرانەوەی لەلایەن خوای بەبەزەییەوە :

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ عَسَى اللَّهُ أَن يَأْتِيَنِي بِهِمْ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا

١) - ﴿قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا﴾، یەعقووب عليه السلام گوتی: بەڵکو نەفسەکانتان کارێکیان بۆ ڕازاندنەوەو بۆ ئاسان کردوون، ئێوەش ئەنجامتان داوە، ئایا ئەو کارە چی بووە؟ یەعقووب عليه السلام هەر گومانی پێ بردوون، ئەگەرنا نازانێ چییان کردوە، بەڵام بە قیاس لەسەر ئەوە کە کاتی خۆی خیانەتیان بە یوسوف کردوە، یوسوفیان خستۆتە بیرەوەو گوتیان: گورگ خواردوویەتی‌و ڕاستیشیان نەکرد بوو، ئنجا بە قیاس لەسەر ئەوە، هەقی بووە کە گومانی خراپیان پێ بەرێ، گوتراوە: (هەر کەس کراسێکی پیسی دڕاند، سەدی پاکی پێوە دەچێ)، بابای گەزراو، ئەگەر گومانی خراپ بەرێ بە تەرەفی بەرانبەری کە گەزتوویەتی‌و فێڵی لێکردوە، ناهەقی نیە، وەك دەڵێ: (ئەگەر جارێك هەڵتخەڵەتاندم خوا بتگرێ، ئەگەر دووجار هەڵتخەڵەتاندم خوا بمگرێ)، یانی: جاری دووەم دەبێ وریا بی .

هەڵبەتە ئەوە کە برا گەورەکەیان ئاوا ڕێنماییان دەکاتو ئامۆژگارییان دەکات: بچنەوە لای بابتانو ئاوای پێ بڵێنو، ئاوای پێ بڵێن، ئەوە هەمووی پێچراوەتەوەو قرتێنراوە، چونکە بە سیاقو سەلیقە دیارە، واتە: کوڕەکان چوونەوە بۆ لای بابیانو، هەموو شتەکەیان بۆ گێڕایەوەو جوان بۆیان ڕوون کردەوە، ئنجا ئەویش گوتی: بەڵکو نەفسەکانتان شتێکیان بۆ ڕازاندوونەوە، واتە: گومانی خراپی پێ بردوون، کە ئێوە شتێکتان بەسەر کوڕەکەم هێناوە، بە پاڵنەرو هاندەری بوغزو غەرەزێك، کە لە نەفسەوە هەڵدەقوڵێ .

ئنجا هەرچەندە گومانە خراپەکەی یەعقووب ﷺ لێرەدا نەیپێکاوە لێرەدا، بەڵام گوناهباریش نیە، چونکە پێشتر لەو جۆرە کارانەی لێ بینیون، هەڵبەتە خوای پەروەردگار تەنیا باسی یوسوفمان بۆ دەکات کە خستوویانەتە چاڵەوە، بەڵام وەك پیاو چاکان دەڵێن: کەسێك خراپەیەکت لە لای بینی، بزانە کە دەستە خوشکی دیکەشی لەلا هەن، وە کەسێك چاکەیەکت تێدا بینی، بزانە دەستە خوشکی دیکەشی لەلا هەن، واتە: کەسێك کە چاکەیەکت لێ بینی، بزانە کە چاکەی دیکەشی هەنو، کەسێکیش خراپەیەکت لێ بینی، بزانە خراپەی دیکەش هەن، یەعقووب ﷺ یش کوڕەکانی چاك ناسیوەو ئەو کوڕانە خراپەکەیان هەر ئەوە نەبووە، کە یوسوفیان خستۆتە بیرەوە، دیارە هەڵەی دیکەو کەمو کوڕیی دیکەشیان هەر بووە، ئیدی بە قیاس لەسەر هەموو ئەو شتانە، گوتوویەتی: ئێوە نەفسەکانتان شتێکی بۆ جوان کردوونو ئەنجامتانداوە .

ئەدی ئایا هەڵوێستی چییە ؟

**٢) -** ﴿فَصَبۡرٞ جَمِيلٞ﴾، خۆڕاگریەکی جوان، هەڵوێستمە. واتە: (شأني صَبرٌ جَمِيلٌ، أَوْ صَبرٌ جَمِيلٌ أَولى بِي)، (شأنِي)، دەبێتە (مُبتَدأ)، (صبرُ جَمِيل)، دەبێتە (خَبَر)ەکەی، واتە: هەڵوێستی من، حاڵی من بریتیە لە خۆڕاگریی، جوان، یاخود خۆڕاگرییەکی جوان، بۆ من شایستەترە .

**٣) -** ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًا﴾، نیزیکە خوا هەموویانم بۆ بێنێتەوە، تێکڕاو وێکڕا بە دیداریان شاد ببمەوەو پێك شادبینەوە، ئیماندار

دەبێ هەمیشە گەشبینو هیوادار بێ، بە ڕەحمەتی خواو، هیچ کات دەست لە پچکی ئومێد بەرنەدا .

٤) - ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، بێگومان هەر خوا زانای کاربەجێیە، واتە: خوا زانایە هەموو شتەکان دەزانێ، کاربەجێشە دەزانێ چۆن کارەکانی خۆی دەکا ؟

لێرەدا کە دەڵێ: ﴿ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗا ﴾، خاوەنی (مَحاسِنُ لتأويل)[1] دەڵێ: (قَالَ الزَّمَخْشَرِيُّ: أَرَدْتُمُوهُ وَإِلاَّ فَما أَدْرى ذَلِكَ الرَّجُلَ، أَنَّ لسارِقَ يُؤْخَذُ بسَرِقَتِهِ، لَوْلاَ فَتْواكُمْ وَتَعْلِيمُكُم)، واتە: (زەمَخْشەري) گوتوویەتی: ئەوە کارێك بوو هەر خۆتان ویستتان بیکەن، ئەگەرنا ئەو پیاوە چۆنی زانی کە بابای دز بەهۆی دزییەکەیەوە، دەکرێتە کۆیلەو دەگیرێ، ئەگەر ئێوە فەتواتان بۆ نەدابایەو فێرتان نەکردبایە؟

واتە : دیارە ئێوە پێشی کەوتوون، بۆیە ئەو بڕیارەی بەسەر بنیامیندا جێبەجێ کردوە، کەواتە: هەر چۆن بێ شتەکە سەری ئێوە دەگرێتەوە .

**مەسەلەی سێیەم : ڕوو وەرگێڕانی یەعقووب (علیه السلام) لە کوڕەکانیو یادکردنەوەی یوسوف (علیه السلام) و چاو سپی هەڵگەڕانی لە خەمانو خەفەتخان بوونی :**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٨٤﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا**

١) - ﴿ وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ ﴾، کاتێك یەعقووب (علیه السلام) ئەو هەواڵەی بنیامینی کوڕی بیست لە کوڕەکانی، ئەو قسانەی پێشێی کردن، ئنجا ڕووی لێ وەرگێڕان،

١) ج ٦، ص ٢٦٤.

واتە: وەك چۆن كەسێك لە كەسێك تووڕە دەبێ‌و لێی بە گلەییە، ڕووی لێ وەردەگێڕێ‌و ڕوو لەولا دەكات، ئەویش ڕووی لێ وەچەرخاندن .

٢) - ﴿ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾، هەروەها گوتی: ئەی خەفەتی زۆرم لەسەر یوسوف !

(الأَلِفُ بَدَل مِن ياءِ المُتَكَلِّمِ للتخْفِيفِ)، لە جیاتی بفەرموێ: (يا أَسَفي)، گوتوویەتی: (يَٰٓأَسَفَىٰ) تاكو سووكتر بێ لەسەر زمان.

هەندێكیش گوتوویانە: (يَٰٓأَسَفَىٰ)، بۆ (نُدبة)یە، بەلام هایەكەی (هـ)، قرتێنراوە، (وا مُحَمَّداه)، یانی: ئەی موحەممەد ! لە فریام وەرە، (يَٰٓأَسَفَىٰ)، یانی: ئەی داخ‌و خەفەتەكەم لەسەر یوسوف، وەرە، ئێستا كاتیەتی زۆر خەفەتان بخۆم .

دیارە دووبارە باسكردنەوەی یوسوف ﷺ، بەڵكو هەمیشە لە یادی بووە، بەلام لێرە كە باسی دەكات، لەبەر دوو هۆكاران بووە :

یەكەم : یوسوف ﷺ هیچ سۆراخی نەبووەو شوێن بزر بووە، نەیزانیوە لە كوێیە؟ ئێستا كوڕەكانی دی دەزانێ : هەرچی بنیامینە، كراوەتە كۆیلە لەلای عەزیزی میسر، لە بەرانبەر ئەوەدا كە ئەو پێوانەیە لە بارەكەیدا دۆزراوەتەوە، كوڕە گەورەكەشی دەزانێ كە بۆخۆی نەهاتۆتەوە، لەبەر ئەوەی چاوو ڕووی نیە بێتەوە، بەلام یوسوف بێ سەرو سۆراخە .

دووەم : ئەوەیە كە شوێن بزربوونی یوسوف، كانگای هەموو خەم‌و خەفەتەكانی دیكەی یەعقووب ﷺ بووە، ئەگەر یوسوف ون نەبوو بایە، دوایی ئەوانە بنیامینیان نەدەبرد بۆ ئەوێ‌و، بنیامین نەدەكرایە كۆیلەو ئەو بەلایەی بەسەر نەدەهات، دوایی كوڕە گەورەكەشی بەو دەردە نەدەچوو، كە ڕووی نەبێ بێتەوە لای بابی .

٣) - ﴿ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ ﴾، ئنجا (یەعقووب) چاوەكانی سپی هەڵگەڕان لە خەم‌و پەژارە، (ٱلۡحُزۡنِ)، خەمێكە پەیوەندیی بە ڕابردووەوە

هەیە، واتە: شتێك كە لە ڕابردوودا لە دەست چووە، بۆچی دەفەرمویٚ: ﴿ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ ﴾، چاوەکانی سپی هەڵگەڕان؟ چونکە دیارە زۆر گریان دەبێتە مایەی زیان گەیاندن بە چاو، بە تایبەتی زۆر گریانی بە خەمو پەژارەوە .

٤) - ﴿ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴾، سەرەنجام یەعقووب ( كَظِيمٌ ) بوو، ( كَظِيمٌ )، (أي مَمْلُوءٌ مِنَ الغَيظِ مِنْ أولادِهِ، فَعِيل بِمَعْنى مَفعول)، یانی: پڕ بوو لە تووڕەییو پەستیی لە کوڕەکانی، کەواتە: لێرەدا ( كَظِيمٌ )، (فَعِيل)ی بە مانای (مَفْعُول)ە، واتە: (مَكْظُوم)، واتە: پڕ بوو لە تووڕەیی (غَيْظ) .

دەشگونجیٚ ( كَظِيمٌ )، هەر (فَعِيل)ی بە مانای (فَاعِل)بیٚ، (أي شَدِيدِ لِتوجُّعِ للغَيْظِ أو الحُزْنِ، لأَنَّهُ لَمْ يَشْكُهُ إلى أحَد)، یاخود زۆری خەفەت خوارد، زۆری پەژارە لە دڵی خۆیدا جیٚ کردەوە، چونکە سکاڵای بۆ لای کەس نەکرد .

# کورتە باسێک لەبارەی گریانەوە، بەهۆی خەم و پەژارەوە

لێرەدا توێژەرەوانی قورئان باسی ئەوەیان کردوە: ئایا دەگونجێ ئینسان کە شتێکی دنیایی بەسەر دێ، خەمو پەژارەیەك ڕووی تێدەکات، ببێتە هۆی زۆر خەفەت خواردنی، پاڵی پێوە بنێ بگری ؟

بەڵام ئەوە شتێکی زۆر ئاساییە، یانی: نەدەبوو زۆر لە خۆیانی بکەن بە ئیشکال، بڵێن: چۆن یەعقووب کە پێغەمبەری خوایە ﷺ، دەبێ بگری؟! چونکە پێغەمبەرانیش هەر بەشەرن، گەورەیی پێغەمبەران لەوە دایە کە بەشەر بوون، ئەوانیش وەك خەڵك هەموو هەستو نەستەکانی دیکەی بەشەریان هەبوون: تووڕە بوون، ڕازی بوون، ئازاریان پێگەیشتوە، خەویان هاتوە، ناڕەحەت بوون، ماندوو بوون، یانی: هەموو ئەو شتانەی کە بەسەر بەشەران هاتوون، بەسەر وانیش هاتوون، بەڵام پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو شتانەی بەسەر خەڵکی هاتوون، بەسەریان هاتوون، لە شیرازەی شەریعەت دەرنەچوونو، هەمیشە پەیوەندییان لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، پەیوەندیی دۆستانەو دڵسۆزانە بووەو، بەندەیەکی ڕاستو ساغ بوون، جیاوازیی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ئەوە بووە، ئەگەرنا وەنەبێ ئەوان دڵیان نەبوو بێو، خەفەتیان نەخوارد بێو، ئازاریان پێ نەگەیشتبێو، خەویان نەهاتبێو، سەرمایان نەبوو بێو، گەرمایان نەبوو بێو، سەریان نەئێشا بێو، ناڕەحەت نەبوو بن! ئەگەر وا بووایە، ئەو کاتە ئازایەتیی نەبوو بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە لە خەڵکی دیکە خۆڕاگرتربن .

لەوبارەوە ئەم دوو فەرموودەیە ئاماژە پێ دەکەین:

یەك : {بكى رسولُ الله ﷺ على وَلده إبراهيم، وقال: إنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ، وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلاَ نَقُولُ إِلاَّ ما يَرضى رَبُّنا، وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ، يا إِبْراهِيمُ لَمَحْزُونُونَ} {أخرجه البخاري برقم: (٦٩٢)، ومسلم برقم: (٦٢)} .

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئیبراهیمی كوڕی گریا، كە وەفاتی كرد، {دیارە پارچەڵە بووە، ڕەنگە پێنج، شەش ساڵە بووبێ}و، فەرمووی: چاو فرمێسكی لێدێو، دڵ خەمبار دەبێ، بەڵام ئێمە هەر ئەوە دەڵێین: كە پەروەردگارمان لێی ڕازییەو، ئێمە ئەی ئیبراهیم! بە هۆی جیابوونەوەی تۆوە، دڵتەنگو خەمبارین .

دوو : {عن عَبْدِ اللهِ بن عُمَرَ، قَالَ: اشتكى سَعْدُ بن عُبادَةَ شكوى لَهُ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ، يَعُودُهُ، مَعَ عَبْدِ الرَّحْمنِ بن عَوْفٍ، وَسَعْدِ بن أَبِي وَقَّاصٍ، وَعَبْدِ اللهِ بن مَسْعُودٍ، فَلَما دَخَلَ عَلَيْهِ، فَوَجَدَهُ فِي غاشِيَةِ أَهْلِهِ، فَقالَ: قَدْ قَضَى قَالُوا: لا يا رَسولَ اللهِ، فَبَكَى النَّبِيُّ ﷺ فَلَما رَأى الْقَوْمُ بُكاءَ النَّبِيِّ ﷺ بَكوا، فَقَالَ: أَلاَ تَسْمَعُونَ، إِنَّ اللهَ لاَ يُعَذِّبُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ وَلاَ بِحُزْنِ الْقَلْبِ، وَلكِنْ يُعَذِّبُ بِهذَا وَأَشَارَ إِلَى لِسانِهِ، أَوْ يَرْحَمُ} {أخرجه البخاري برقم: (٩٢٤)، ومسلم برقم: (١٢٤٢)} .

واتە: سەعدی كوڕی عوبادە نەساغ بوو پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ (عبدالرحمن بن عوف)و (سعد بن أبي وقاص)و (عبدالله بن مسعود)دا سەردانی كرد، كە چوو قەرەباڵغیی خزمو كەسی بە دەورەوە بوو، فەرمووی: تەواو بووە؟ گوتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا ! ئنجا پێغەمبەر ﷺ گریاو كاتێك خەڵكەكە گریانی پێغەمبەریان بینی، گریان، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بێگومان خوا بەهۆی فرمێسكی چاوو بەهۆی پەژارەی دڵەوە، خەڵك سزا نادات، بەڵكو بەهۆی ئەمەوە سزایان دەدا، ئاماژەشی كرد بە زمانی، یاخود بەزەیی پێیاندا دێ .

ئەگەر زمانەكەی لە كاتی بەڵاو موصیبەتو ناڕەحەتییدا بە خراپە بگەڕێو، سكاڵا بۆ لای غەیری خوا بكاتو ناشوكریی بكات، ئەوە خوا سزای

دەدات، بەڵام ئەگەر زەمانەکەی بە چاکە بگەڕێو، بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، بڵێ: هەرچی بەسەرم بێ، لەو ڕووەوە کە لەلایەن خواوەیە، خوایە! من ڕازییم بەندەی تۆم، چۆنم تاقی دەکەیەوە ڕازییم، ئەوە خوا بەزەیی پێدادێ، وەك لە فەرموودەیەكی صەحیح دا هاتوە كە پێشتریش هێناومانە:

{إنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ قَوْمـا ابْتَلاهُمْ، فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَا، وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السُّخْطُ } {أخرجه الترمذي برقم: (٢٣٩٦)، وقال: حسن غريب، وابن ماجه برقم: (٤٠٣١)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم: (٩٧٨٢) عن أَنَسِ بن مالِكٍ}.

واتە: هەر کاتێك خوا کۆمەڵێکی خۆشویستن تاقییان دەکاتەوە، ئنجا هەر کەسێك ڕازی بوو، خوا لێی ڕازییەو، هەر کەسێك تووڕە بوو، تووڕەیی خوای دێتە سەری .

دەربارەی چاو سپی هەڵگەڕان، لە ئەنجامی خەمو خەفەتو گریانو ناڕەحەتی دا، (د. محمد راتب النابلسي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، دەڵێ:

{وَأَما ابيضَاضُ العَيْنِ، فَهُوَ المَرَض الذي سَماه عُلَماءُ الطِّبِّ: (دَاءُ الزَّرق) فَالقَرنية مادَّةٌ شَفَافة تَتَغذَّى بالحُلول، وَحينَما يَرتَفِعُ ضَغْطُ الدَّم بسَبَبِ إجتِماعِ الهَمِّ، تَضْطربُ الأَوْعِية الشَّعْرية فِي العَيْنِ وَتُصبحُ القَرَنية الشَّفَّافة لامِية بَيْضَاءَ وَتُعِيقُ الرؤية، فيُصابُ الإنسانُ بالعَمَى بِسَبَبِ الحُزنِ}[1] .

واتە: چاو سپی هەڵگەڕان، نەخۆشییەکە زانایانی پزیشکی پێی دەڵێن: (دَاءُ الزَّرق)، واتە: دەردی شین هەڵگەڕان، چونکە (قَرنية)، گلێنەی چاو، ماددەیەکی ڕوونە کە بە جۆرە ماددەیەك لە بەدەندا (کە دەچێتە نێو چاوەوە) دەژی، جا کاتێك فشاری خوێن بەرز دەبێتەوە بەهۆی خەمو دڵ ناڕەحەتییەوە ئەو مولوولانەی کە ئەو خۆراکەیان لێوە دەچێ بەرەو چاو (ئەوانەی لە چاودا هەن) ئەوانە حاڵەتی ئاساییان نامێنێو، گلێنەی چاو لەجیاتی ڕوونیی تاریکدا دێو سپی هەڵدەگەڕێ، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوە کە ئینسان نەبینێو، ئینسان بەهۆی ئەوەوە (بەهۆی خەمو پەژارەوە) تووشی کوێریی دێ .

١) (التفسير النَّابلسي) ج ٤، ص ٥٣٢.

**مەسەلەی چوارەم:** گلەیی كردنی كوڕەكانی یەعقووب لە بابیان، كە هەر یادی یوسوف دەكات، هەتا نەخۆش و كەنەفت دەبێ، یاخود دەفەوتێ:

وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفۡتَؤُا۟ تَذۡكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە لە سێ بڕگەدا**

١) - ﴿ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفۡتَؤُا۟ تَذۡكُرُ يُوسُفَ ﴾، گوتیان: بە خوا تۆ هەر بەردەوام باسی یوسوف دەكەی، یادی یوسوف دەكەی.

(تَفۡتَؤُا۟ )، (لا تَفتَؤُا)، (تَفۡتَؤُا۟ تَذۡكُرُ يُوسُفَ )، یانی: (لا تَفتَؤُا تَذكر یوسوف)، واتە: تۆ واز ناهێنی، هەر باسی یوسوف دەكەی.

٢) - ﴿ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا ﴾، هەتاكو زۆر نەخۆش دەبی.

(حَرَضْ: مَصْدَرٌ، هُوَ شِدَّةُ الـمَرَضِ الـمُشْفِي على الهَلاَكِ: أي بالِياً لا شُعُورَ لَك)، وشەی (حَرَضْ) چاوگە، مەبەستیش پێی نەخۆشییەكە نیزیكە ئینسان بەرێتە سەر كەناری فەوتان، واتە: وات لێدێ شڕو كەنەفت دەبیو، هەستو ئاگات لە خۆت نامێنێ.

٣) - ﴿ أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَٰلِكِينَ ﴾، یاخود لە فەوتاوان دەبی، واتە: لە پەلو پۆ دەكەویو دەمری.

مەبەستیان پەرۆشیی دەربڕینو سەرزەنشت كردنو گلەیی بووە، هەموویان پێكەوە، چونكە ئەو قسەیە كە ئەوان بەرانبەر بە بابیان كردوویانە، هەم جۆرێك لە دڵسۆزییو پەرۆشیی پێوە دیارە، هەم گلەییو سەرزەنشتی پێوە دیارە، واتە: هەردوو شتەكە بە تێكەڵیی دیارن: لە لایەكەوە گلەیی لێدەكەن،

کە بۆچی هێندە باسی یوسوف دەکەی، کە بێگومان تا ئەو کاتەش بوغزو خەرەزو حەسەدیان بەرانبەر بە یوسوف هەر هەبووە .

ئنجا کە دەڵێن: تۆ بەردەوام دەبی لەسەر باسکردنی یوسوف، تاکو زۆر نەخۆش‌و کەنەفت دەبی، یاخود دەفەوتێی، گلەیی لێدەکەن کە شتێك بکات، ببێتە هۆی زۆر نەخۆش‌و کەنەفت بوونی، یاخود فەوتانی، کەواتە: ئەو قسەیان لە بەزەیی‌و سۆزو پەرۆشەوەیە .

**مەسەلەی پێنجەم: ڕاگەیاندنی یەعقووب کە سکاڵای خەم‌و پەژارەی خۆی، تەنیا لەلای خوا دەکات‌و، ئەوەی ئەو دەیزانێ لە خواوە، کوڕەکانی نایزانن :**

وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە دوو بڕگەدا**

١) - ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، (یەعقووب) گوتی: بێگومان من تەنیا سکاڵای (بَثّ و حُزن)ی خۆم تەنیا بۆ لای خوا دەبەم .

پێشتر باسمان کرد (شَکوی)، بە کوردیی سکاڵایە، (بَثّ)یش، بریتییە لە خەمێکی زۆرو دڵتەنگەییەکی زۆر، (البَثُّ: الهَمُّ الشدیدُ، وَهُوَ التَّفکیرُ فِي لشيءِ المُسِيءِ)، بیرکردنەوەیە لە شتێکی خراپ، شتێك کە خراپت بکا، دڵتەنگت بکات .

بەڵام (حُزن)، (الحُزنُ: الأسَفُ علی الفائِتِ)، بریتییە لە خەفەت‌و پەژارەدار بوون بۆ شتێکی ڕابردوو .

کەواتە: خەفەتی زۆر، بۆیە ناوی لێنراوە (بثّ)، کە (بث)، یانی: بڵاوکردنەوە، (بَثَّهُ یَبُثُّهُ یعني: نَشَرَهُ یَنشُرَهُ، أو فَرَّقَهُ یُفَرِّقُهُ)، چونکە

خاوەنەکەی، خاوەنی ئەو خەفەتە زۆرە، هیچ چاری نیە، هەر دەبێ باسی بکات، بەلاّم یەعقووب ﷺ دەڵێ: من ئەو خەمە زۆرەی خۆم کە ئێستا هەمە، سکالاّیەکەی دەبەمە لای خوا، بۆ خوای باس دەکەم، هەروەها پەژارەو دلّتەنگییەکەی خۆشم، کە پەیوەندیی بە ڕابردووەوە هەیە، ئەویش هەر سکالاّیەکەی دەبەمە لای خوا، واتە: خەمەکەی ئێستام و پەژارەکەی ڕابردووم، هەردووکیان سکالاّیەکەیان تەنیا دەبەمە لای خوا، چونکە ﴿إِنَّمَآ﴾ (أَدَاةُ الحَصْرِ والإِثْبات)ە، ئامرازی کورتهەڵهێنان و چەسپاندنە.

**٢) -** ﴿وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، لە خواوەش شتێك دەزانم، كە ئێوە نایزانن، كە مەبەستی ئەوەیە، خوا لە ڕێی ئیلهام و وەحییەوە، جۆرێك لەبەر چاوڕوونیی داوە بە یەعقووب ﷺ، كە هەم یوسوفیش دەبینیەوە، هەم بنیامینیش و هەم ئەو كوڕەی دیكەشت و، ئەو بەلاّیە كۆتاییەكی هەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ۝٣٨﴾ الرعد، واتە: هەموو شتێك هەموو كاتێكی دیارییكراوو نووسینێكی هەیە، یانی: كاتێكی هەیە لێی كۆتایی دێ .

بێگومان خوا ﷻ هەر لە سەرەتاوە بەر چاوڕوونییەكی داوە بە یەعقووب ﷺ، ئنجا بێگومان ئەو بەرچاو ڕوونیی پێدانەی خوا، بۆ یەعقووب ﷺ و، بۆ بەندەكانی، دیكەشی زۆر هاوكارو یارمەتییدەریان دەبێ، كە خۆ ڕاگرین لە بەرانبەر بەلاّو گرفتەكاندا، چونكە بەرچاویان ڕوونە، هەڵبەتە بەرچاو ڕوونیی ڕەها، هەر ئەوەیە كە ئینسان لە قیامەتدا پاداشتی ئەو خەم و نارەحەتییانەی خۆی دەبینێتەوە، ئەوەیان مسۆگەرە، بەلاّم جاری وایە خوا ﷻ هەر لە دنیاشدا، جۆرێك لە بەرچاوڕوونیی دەدا بە هەندێك لە بەندەكانی، كە هەر لە دنیاشدا، ئەو خەمەی كە تۆ ئێستا تێیدای و، ئەو هەورازەی تۆ ئێستا بە بەریەوەی، كاتێك دێ، لێی دەربازو ڕزگار دەبی، ئەوەش زۆر یارمەتیدەری مرۆڤە كە ڕاوەستاوو خۆڕاگر بێ و بە چۆكدا نەیەت .

**مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:** ئامۆژگاریی کردنی یەعقووب بۆ کوڕەکانی، کە بچن بە دوای یوسوف و برایەکەی دا بگەڕێن و، لێیان بخەفتێن و، لە بەزەیی و دەرووی خێری خوا نائومێد نەبن:

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾.

**تویژینەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا**

١) - ﴿ يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ ﴾، ئەی کوڕەکانم! بڕۆن، بۆ کوێ بچن؟ یانی: (اذهَبوا إلى مِصرَ)، بچنەوە بۆ میسر، بچنەوە بۆ ئەو وڵاتەی هەر سێ کوڕەکانی لێ گرفتار بوون، دیارە یەعقووب ﷺ گومانێکی زاڵی بووە، یان ڕەنگە لەلایەن خواوە دڵنیا کرابێتەوە، کە یوسوفیش هەر لە میسرە، بۆیە دەڵێ: ﴿ يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ ﴾، ئنجا یان گومانێکی زاڵی بووە، یاخود خوا دڵنیای کردۆتەوە کە یوسوفیش هەر لە میسرە ماوە.

٢) - ﴿ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ ﴾، بخەفتێن، بگەڕێن بە دوای یوسوف و برایەکەی دا.

(التحَسُّسُ: شدَّةُ الطَّلَبِ وَالتعَرُّفِ، وَهُوَ أعَمُّ مِنَ التَجسُّسِ، فَهُوَ تَطلُّبٌ مَعَ خْتفَاءٍ وَتَستَر)، (تَحَسُّس)، بریتییە لە زۆر بەدوای شتێکدا گەڕان و، هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی، بەڵام (تَحَسُّسُ)، گشتییترە لە (تَجَسُّس)، چونکە (تَجَسُّس) بریتییە لەوەی کە ئینسان لە کاتی پەنهان داو، بە شێوەیەکی پەنهان و پەنامەکی لە شتێك بگەڕێ، بەڵام (تَحَسُّسُ)، گشتییە، چ بە پەنامەکیی، چ بە ئاشکرا.

هەڵبەتە بۆیە باسی برا گەورەکەیان ناکات، چونکە ئەو بۆ خۆی نەهاتۆتەوەو لە میسرەو، دەزانن ئەوە لەوێ ماوەو سەرەنجامی دیارەو، بۆ خۆی نەگەڕاوەتەوە، بۆیە یەعقووب ﷺ باسی کوڕە گەورەکەی ناکات .

٣) - ﴿ وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ ﴾، لە بەزەیی خواش، لە دەرووی خێری خوا، نائومێد مەبن .

(رَّوْحِ ٱللَّهِ ): (الـرَّوْحُ: الـنَّفَسُ، واسْـتُعِيرَ لِكَشْفِ الكـربِ، لأَنَّ الكـربَ وَالـهَـمَّ يُطْـلَقُ عَلَيْهِـما الغَـمُّ وَضِـيقُ الـنَّفَسِ وَضِـيقُ الصَّـدْرِ، وَمِنْـهُ قَوْلُـهِـمْ: تَـنَفَّس لصبْحُ، إذا زَالَـت ظُلْمَـة اللَّيْـلِ)، واتـە: (رَوْح) بـە مانـای هەناسەدانـەو، خوازراوەتـەوە بـۆ لاچوونی خـەمو خـەفـەتو دەروو لـێکرانـەوە، چونکـە خـەفـەتو دڵ نـاڕەحـەتیـی، وشـەی (غـم)یـان بـۆ بـەکـاردێو، وشـەی تـەنگەنـەفەسیی‌و، سینـە تـەنگیی‌و تـەنگە نـەفەسییان بۆ بەکاردێ، ئنجا (رَوح)، بریتیـە لـە هەنـاسـەدان، (چونکـە ئینسـان بـەچی دڵی تـەنگ دەبـێ‌و پشووی سوار دەبێ ؟ بێگومان بـە هۆی کـەمیی هـەواوە، کـە مـەجالـی نیـە هەناسـە هەڵکێشـێ، بـەڵام کـە هەنـاسـەی هـەڵکێشا، کـە ئۆکسجینـە، ئـەو کاتـە جۆرێك لـە فـەڕاحـنـایی بۆ دێ، ئـەگەر پێشـێ سینـەی هاتـۆتـەوە یـەك‌و پشووی سوار بـووە، ئنجـا دڵی دەکرێتـەوەو سینـەی گوشـاد دەبـێ)، یـاخـود مـەبـەسـت لـە (رَوح)، بـەزەیـی خـوایـە، چونکـە بـەزەیی خـوا هۆکـارە بـۆ ئـاسوودەیی مرۆڤـو فـەڕاحـنـایی هاتن بـۆ مرۆڤ، بۆیـە تـوێـژەرەوانی قـورئـان وشـەی (رَوح)یـان بـە دەرووی خێـر، یـان بـە بـەزەیـی خـوا، لێك داوەتـەوە، کـە لـە ئـەسڵدا وشـەی (رَوح)، یـانی نـەفـەس کێشانو هـەنـاسـە هـەڵمژیـن .

٤) - ﴿ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴾، بێگومـان هیچکـەس لـە دەرووی خێـری خـواو فـەڕەحنـایی خـواو لـە بـەزەیی خـوا، نـائومێـد نـابـێ، بێجگە لـە کۆمـەڵی کـافران، چونکـە ئیمانـدار خـوای پەروەردگـار دەنـاسـێ، کـە خـاوەنی بـەزەیی‌و کـەرەمی بێسنوورو لـوتفـو بـەخشـشی بێسـنـوورە، بۆیـە هـەرگیـز نـائومێـد نـابـێ، دەستی لـە هـەمـوو پچکـان نـابڕێ‌و، قـەت پـێی وانیـە

کە لە ژێر درەختێکە هیچ گەڵای پێوە نین ! ئەوانەی کە نائومێد دەبن لە بەزەیی خوا، لەبەر ئەوەیە کە خوا ناناسن، هەر کەسێك خوا بناسێ، دەزانێ کە سیفەتەکانی خوا، چ بەزەیی خوا، چ زانیاریی خوا، چ حیکمەتی خوا، چ دەستەڵاتی خوا، چ کەرەمو بەخششی خوا، سنووری نیە، ئنجا کە سنووری نیە، یانی: بەشی هەموو کەسو هەموو شتێك دەکاتو، بەشی هەموو حاڵان دەکات، ﷻ خوا لە بەزەییو بەخششو کەرەمی بێسنووری خۆی زیاترمان پێ بدات.

خوایە ! هەمیشە بە ڕەحمەتی خۆتەوە بمانژیێنەو، هەمیشە بە کەرەمو سۆزو بەزەیی خۆت، مامەڵەمان لەگەڵدا بکەو، بە خراپەو بە کردەوە خراپەکانی ئێمە، لەگەڵ ئێمەدا مامەڵە مەکە.

ئیدی بەو شێوەیە یەعقووب عليه السلام ئامۆژگاریی کوڕەکانی دەکات، کە بچن خەفتان بکەن لە یوسوفو لە برایەکەیو سۆراخیان بکەن، کە لە دەرسی داهاتوودا ، ئاکامی ئەو سۆراخ کردنو لێ خەفتانەمان بۆ دەردەکەوێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێزدەیەم

## پـێـنـاسـەی ئـەم دەرسـە

ئـەم دەرسـەمـان ئـاڵقـەی دوازدەیـەمی زنجیرەی بـەسـەرهـاتی یوسـوفی تێدایـەو، لـە یـازدە (١١) ئـایـەت پێك دێ، ئـایـەتـەکانی: (٨٨ تاکو ٩٨)، لـەو یـازدە ئـایـەتـەدا: بـاسـی چوونـەوەی کوڕەکانی یـەعـقـووب ﷺ بۆ میسڕ، بۆ جاری سـێیـەم کـراوە، کـە بـۆ ئـازووخـە چـوو بـوونو، بـە دەسـتـمـایـەیـەکی خـراپو کـەمو کـورتـەوە چـوو بـوون، یوسـوف ﷺیـش خـۆیـیـان پـێ دەنـاسـێنـێو، نـەرمـە گـلـەیـەکیشیـان لـێدەکـاتو، ئـەوانیش پۆزشـی بـۆ دێنـنـەوەو، دان بـە هـەڵـەی خـۆیـانـدا دێـنـن، ئـەویش دەڵـێ: گـلـەییـتـان لـێناکـەم لـەمڕۆ بـە دواوەو، خـواش لـێتـان ببووری .

دوایی کـراسـەکـەی خـۆیـیـان دەداتـێ کـە بـۆ بـابـی ببـەن، تاکو چاوی چاکبـتـەوەو، پێشـیـان دەڵـێ: کـە هـەمـوویـان بێـن بـۆ میسـڕ، لـەبـەر ئـەوەی لـە وڵاتـی خـۆیـان گـرانیـیو قـاتو قـڕیـی بـووە.

پاشـان بـابـیـان لـە دوورەوە بۆنـی کـراسـەکـەی یوسـوف دەکـات، بـەڵام کوڕەکـانی ڕەخـنـەی لـێ دەگـرن، کـە تـۆ هـەر لـە بـە هـەڵـەداچـوونی پێشـووت دای، بـەڵام کـە مزگێنییـدەر دێو، کـراسـەکـەی یوسـوف بـەسـەر دەمـوچـاوی یـەعـقـووبـدا دەدا، یـەکسـەر چاوەکـانی چـاك دەبـنـەوەو، کوڕەکـانیشـی داوای لـێبـوردنی لـێ دەکـەن، داواشی لـێدەکـەن کـە داوای لـێبـوردنیـان لـە خـوا بـۆ بکـات، ئـەویش گـفـتیـان پـێ دەدات کـە لـە کـاتی گونجاودا، داوای لـێبوردنیـان لـە خـوا بۆ دەکـات، چونکـە خـوا خـاوەنی ئـەوپـەڕی لـێبـوردەییو میهرەبـانیـیـە .

﴿ فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ قَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهْلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئْنَا بِبِضَـٰعَةٍ مُّزْجَىٰةٍ فَأَوْفِ لَنَا ٱلْكَيْلَ وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجْزِى ٱلْمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾ قَالَ هَلْ عَلِمْتُم مَّا فَعَلْتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذْ أَنتُمْ جَـٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ قَالُوٓا۟ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُ ۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَـٰذَآ أَخِى ۖ قَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَـٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ ۖ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ٱذْهَبُوا۟ بِقَمِيصِى هَـٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِى يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّى لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ ۖ لَوْلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِى ضَلَـٰلِكَ ٱلْقَدِيمِ ﴿٩٥﴾ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلْبَشِيرُ أَلْقَىٰهُ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ فَٱرْتَدَّ بَصِيرًا ۖ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَـٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾ ﴾.

## مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{ئنجا کاتێك (برایەکانی یوسوف) لێی وە ژوور کەوتن، (چوونە ئەو شوێنەی کە یوسوف تێیدا دادەنیشت بۆ سەرپەرشتیکردنی فرۆشتنو پێوانی ئازووخە)، گوتیان: ئەی عەزیز! خۆمانو کەسوکارمان برسیەتییو نەدارییمان تووش بووەو، دەستمایەیەکی کەمو نەویستراومان پێیە، دەسا بەتەواویی ئازووخەمان بۆ بپێوەو خێرمان پێ بکە، بەدڵنیایی خوا پاداشتی بەخشەران دەداتەوە ﴿٨٨﴾ (یوسوف) گوتی: ئایا دەزانن چیتان بەسەر یوسوفو برایەکەی هێنا، لە کاتێکدا کە ئێوە نەزان بوون! ﴿٨٩﴾ گوتیان: ئایا بەڕاستیی تۆی یوسوف؟ گوتی: من یوسوفمو ئەمەش برایەکەمە (بنیامین) مسۆگەر خوا چاکەی لەگەڵمان دا کرد، بە دڵنیایی هەر کەس پارێز بکاتو خۆڕاگر بێ، بێگومان خوا پاداشتی چاکەکاران نافەوتێنێ ﴿٩٠﴾ گوتیان: بە خوا خوا تۆی بەسەرماندا هەڵبژاردو، بێگومان ئێمە خراپەکار بووین ﴿٩١﴾ (یوسوف) گوتی: ئەمڕۆ (لەلایەن منەوە) هیچ گلەییو سەرزەنشتتان لەسەر نیە، خواش لێتان ببووریو، ئەو بە بەزەییترینی بە بەزەییانە ﴿٩٢﴾ ئەم کراسەم ببەن بەسەر ڕووی بابمی دا بدەن (کوێرییەکەی نامێنێو) بینا دەبێتەوەو، تێکڕای کەسوکارتانم بۆ بێنن (بۆ میسر) ﴿٩٣﴾ کاتێك کاروانەکە (لە سنووری شار دەرچوو و) جیابۆوە، بابیان گوتی: ئەگەر بە خەڵەفاوم دانەنێن، بە دڵنیایی من بۆنی یوسوف دەکەم ﴿٩٤﴾ (خزمو کەسەکانی) گوتیان: بە خوا هەر لە بە هەڵەدا چوونەکەی پێشووت دای! ﴿٩٥﴾ ئنجا کاتێك مزگێنی هێن هاتو کراسەکەی (یوسوفی) بەسەر دەموچاوی دادا، یەکسەر یەعقووب بینا بۆوە، گوتی: ئەدی پێم نەگوتن: شتێك لەلایەن خواوە دەزانم، کە ئێوە نایزانن! ﴿٩٦﴾ گوتیان: ئەی بابی خۆمان! بێگومان ئێمە تاوانبار بووین، دەجا داوای لێبوردنمان لە گوناهەکانمان (بۆ لە خوا) بکە ﴿٩٧﴾ گوتی: بە دڵنیایی داواتان بۆ لە پەروەردگارم دەکەم، بە ڕاستیی ئەو لێبوردەی بە بەزەییە ﴿٩٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(مَسَّنَا): واتە: تووشمان بوو، بەسەرمان هات، (الـمَسُّ: يُقَالُ فـي كُلِّ ما يَنالُ لإِنسانَ من أذىً)، وشەی (مَس)ی بەکاردێ بۆ هەر ئازارێك کە تووشی مرۆڤ دێ، ﴿مَسَّنَا وَأَهْلَنَا ٱلضُّرُّ﴾، خۆمانو ماڵو خێزانمان، یان خۆمانو کەسوکارمان زیانمان پێ گەیشت، ئازارمان پێ گەیشت، واتە: ئازاری برسیەتیی‌و نەداریی‌و تەنگ دەستیی.

(وَجِئْنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزْجَىٰةٖ): واتە: بەهایەکی، دەستمایەیەکی نەویستراومان هێناوە، (البِضَاعَةُ: قِطعَةٌ وافِرَةٌ مِنَ المالِ تُقتَنَى للتِّجارة)، واتە: (بضَاعَة) بریتیە لە ئەندازەیەك لە ماڵو سامان کە بۆ بازرگانیی پێکردن هەڵدەگیرێ.

(والتَزجِيَة: دَفعُ الشيءِ لِيَنساق)، (تَزْجِية) بریتیە لە پاڵ پێوەنانی شتێك بۆ ئەوەی بڕوا، (الـمُزْجاةُ: القَليلة التي لا يُرغَبُ فيها، فكَأَنَّ صاحِبَها يُزْجيها ي يدفعها بكُلْفَةٍ لِيُقْبَلَ)، (مُزْجاة) شتێکی کەم‌و نەویستراوەو خەڵك ئارەزووی بۆ نیە، خاوەنەکەی هەر پاڵی پێوە دەنێ، بۆ ئەوەی وەربگیرێ.

(وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَآ): واتە: خێرمان پێ بکە، چاکەمان لەگەڵ دا بکە، (صَدَّقَ وَتَصَدَّقَ، لصَّدَقة: ما يُخرجُهُ الإِنْسانُ مِن مالِهِ على وَجهِ القُرْبة)، (صَدَقة)، بریتیە لەو ماڵو سامانەی کە مرۆڤ بە شێوەی لە خوا وەنیزیك کەوتنەوە، لە ماڵی خۆی دەیبەخشێ.

(ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيْنَا): واتە: خوا تۆی بەسەر ئێمەدا هەڵبژاردوە، چونکە دەڵێ: (الإيثَارُ: التَّفْضيلُ بالعَطاء)، (إيثار) ئەوەیە کە تۆ لە بەخشیندا، کەسێك بەسەر کەسێکدا هەڵبژێری، خوا دەفەرموێ: ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾﴾ الأعلى، واتە: بەڵکو ئێوە ژیانی دنیا بەسەر دواڕۆژدا هەڵدەبژێرن.

(لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ): واتە: ئا ئەمڕۆ هیچ گلەییو سەرزەنشتتان لەسەر نیەو، لۆمەو سەرکۆنە ناکرێن، دەڵێ: (التَّثْرِيبُ: التَّقْرِيعُ والتَقرِيرُ بالذَّنْبِ، والثَّرْبُ: شَحْمَةٌ رَقِيقَةٌ)، (تثريب)، بریتیە لەبەر چاودادانەوەو سەرکۆنە کردنو سەرزەنشت کردن، وابکەی کە کەسی بەرانبەر دان بە هەڵەکەی دابنێ، وشەی (ثَرْب)یش بە چەورییەکی تەنك دەگوترێ .

(تُفَنِّدُونِ): (التَفْنِيدُ: نِسبة الإنْسان إلى الفَنَدِ وَهُوَ ضَعْفُ الرَّأي)، (تَفنيد) بریتیە لەوە کە ئینسان پاڵبدرێتە لای (فَنَد)، (فَنَد)یش، بریتیە لەوە کە ئینسان ڕایەکەی بێهێز بێ، بۆچوونەکەی بێهێز بێ، یان تێگەیشتنەکەی بێهێز بێ، لە مەسەلەیەکی دیاریی کراودا، یان بە گشتی .

(ٱلْبَشِيرُ): (البَشيرُ: فَعِيلٌ بمَعْنى مُفْعِلْ: المُبَشِر)، (بشیر)، (فَعِيل)ە، بەڵام بە مانای (مُفْعِل)ە، واتە: موژدەدەر، یاخود مزگێنیی هێن، لە کوردیی دا هەردووکیان بەکاردێن، موژدانە ئەوەیە کە لە بەرانبەر موژدە پێدانێکدا دەدرێ .

(رِيحَ): (الرِيحُ والرَّائِحَةُ: هِيَ ما يَعْبَقُ مِن طِيبٍ تُدْرِكُه حَاسة الشَّمِ)، (ريح) یانی: (رَائِحَة)، بریتیە لەو بۆنە خۆشەی کە هەستی بۆنکردن، دەرکی پێدەکات .

# مانای گشتی ئایەتەکان

لێرەشدا دیسان قرتێنراوی بە سیاق و سەلیقە زانراو زۆرە، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ ﴾، کاتێک لێی وەژوورکەوتن، واتە: دوای ئەوەی بابیان ئامۆژگاریی کردنو ڕێنمایی کردن، ڕۆڵە گیان! بچن لە یوسوفو لە برایەکەی بخەفتێن، سۆراخیان بکەن، پرسیار بکەن، ئەوە هەمووی قرتێنراوە کە: کوڕەکان ئامۆژگاریی بابیان وەرگرتو دووبارە خۆیان پێچایەوەو، لە کەنعانەوە بە ڕێکەوتن بەرەو میسرِو، گەیشتنە وێ، ئنجا کە گەیشتنە وێ، بارو ولاخەکانیان تاقەت کردو... هتد، بەڵام هیچ پێویستی نەکردوە باس بکرێ، چونکە بە سیاقو سەلیقە دەزانرێو، یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ ﴾، کاتێک لێی وە ژوور کەوتن، واتە: چوونە ژوور ئەو شوێنەی کە یوسوفی تێدا بوو، کە دیارە بارەگایەک بووە، مەنزڵگایەک بووە، بۆ یوسوف ﷺ وەک عەزیزی میسرِ، وەک بەرپرسی ئازووقە لە وڵاتی میسرِداو، سەرپەرشتیاری دابەشکردنو کۆکردنەوەو پاراستنیو فرۆشتنیو پێوانی .

کاتێک لێی وە ژوور کەوتن، ﴿ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ ﴾، گوتیان: ئەی عەزیز! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لەو کاتەدا یوسوف ﷺ بۆتە عەزیری میسرِ، ئنجا وەک زانایان دەڵێن: یان هەر بەرپرسێک وشەی عەزیزی بۆ بەکارهێنراوە، عەزیز یانی: دەسترۆیشتوو، بالا دەستو، زاڵ، یان ئەوەتا: (عەزیز) بەرپرسیارێتێکی ئیداریی بووە، پلەو پۆستێک بووە، کە بە یوسوف دراوە ﷺ، دەبێ وێڕای ئەو ئیشەی خۆی، کە بریتی بووە لە سەرپەرشتییکردنی ئازووخەو دەغڵو دانو کاروباری ئابووریی لە میسرِدا، ئەو پلەیەشی وەرگرتبێ، یاخود بە حوکمی ئەو پلەیە، سەرپەرشتیی ئازووخەو دەغڵو دانی کردوە لە میسرِدا.

گوتیان: ئەی عەزیز! ﴿ مَسَّنَا وَأَهْلَنَا ٱلضُّرُّ ﴾، زیان تووشی خۆمان و ماڵ و خێزانمان بووە.

وشەی (ٱلضُّرُّ)، هەر ئازارێکە کە تووشی مرۆڤ دێ، بەڵام بە پێی سیاق و شوێن دەردەکەوێ، کە ئەو (ٱلضُّرُّ)ە، لێرەدا مەبەست پێی برسیەتیی و هەژاریی و نەدارییە، خۆمان و ماڵ و خێزانمان و کەس وکارمان، تووشی هەژاریی و نەداریی بووین، ﴿ وَجِئْنَا بِبِضَٰعَةٍ مُّزْجَىٰةٍ ﴾، دەستمایەیەکی نەویستراوو کەم و کورتمان هێناوە، دیارە ئەو دەستمایەی پێیان بووە، کە ئازووخەو دەغڵ و دانی پێ بکڕن، کەم بووەو، بارتەقای ئەو دەغڵ و دانە نەبووە، کە ویستوویانە لەگەڵ خۆیانی بەرنەوە، بۆیە گوتوویانە: کەلوپەلێك، یاخود دراوێك، یاخود دەستمایەیەکی نەویستراوو پاڵ پێوەنراوو کەم و کورتمان هێناوە، ﴿ فَأَوْفِ لَنَا ٱلْكَيْلَ وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَآ ﴾، بەڵام تۆ پێوانەمان بۆ تەواو بکە، خێریشمان پێ بکەو چاکەمان لەگەڵدا بکە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَجْزِى ٱلْمُتَصَدِّقِينَ ﴾، بێگومان خوا پاداشتی خێرکەران و بەخشەران و چاکەکاران دەداتەوە، واتە: لێی دەپاڕێنەوە! بێگومان حاڵ و مەقامەکە، حاڵ و مەقامێکی زۆر هەست جووڵێن بووە، زۆر ورووژێنەر بووە، بۆیە یوسوف وا پێدەچێ عاتیفەو سۆزی برایەتیی و، سۆزو پەرۆشی مرۆڤایەتیی و خزمایەتیی، بۆ ئەوان و بۆ باب و دایك و خزمەکانی، لەوێ بەسەریدا زاڵ بووە، کە هێندە باسی هەژاریی و نەداریی و کولە مەرگیی خۆیانیان بۆ کردوە، ئیدی یەکسەر خۆییان لێ ئاشکرا دەکات.

﴿ قَالَ هَلْ عَلِمْتُم مَّا فَعَلْتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذْ أَنتُمْ جَٰهِلُونَ ﴾، (یوسوف ﷺ) گوتی: ئایا دەزانن چیتان بەسەر یوسوف و برایەکەی هێنا، لە کاتێکدا کە نەزان بوون؟ ئەمە جۆرێکە لە پۆزش بۆ هێنانەوەشیان، جۆرێکە لە ئاگر بڕلێکردنیان، واتە: ئەو کاتەی ئەوەتان کرد: ئێوە نەزان بوون، نەتاندەزانی، نەفام بوون، تازە دەگەیشتنێ، هەر خوا دەزانێ: چل (٤٠) ساڵ، یان سی (٣٠) ساڵی کەوتۆتە

بەینیٚ، یان لانی کەم: بیست (٢٠) ساڵی کەوتۆتە بەینیٚ، چەندی کەوتۆتە بەین، کە دیارە ئەوانیش ئەو کاتە گەنج بوونو، بە تەئکید دوای ئەو بیست، سی، چل (٢٠ – ٣٠ – ٤٠) ساڵە، کە یوسوف لێیان دوورکەوتۆتەوە، عەقڵو هۆشیان کامڵتر بووەو ئەزموونیان زیاتر وەرگرتوە، واتە: لێرەدا یوسوف جۆرێك لە ئاگر بڕیان بۆ دەكات، کە ئێوە ئەو کاتە نەزان بوونو نەتاندەزانی بۆیە واتان لە یوسوفو برایەکەی کرد، ئایا دەزانن چیتان بەسەر هێنان؟ ﴿ قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُ ﴾، گوتیان: ئایا تۆ یوسوفی؟ ﴿ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِي ﴾، گوتی: بەڵێ من یوسوفمو ئەوەش برایەکەمە، واتە: برای دایکیمە، دەنا ئەوانیش لە باببییەوە هەر برایێنی، ﴿ قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآ ﴾، بە مسۆگەریی خوا چاکەی لەگەڵ ئێمەدا کرد، ﴿ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، بێگومان هەر کەسێك پارێز بکاتو، خۆڕابگریٚ، بەدڵنیایی خوا پاداشتی چاکەکاران ون ناکات، زایەی ناکات، نافەوتێنیٚ .

﴿ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا ﴾، گوتیان: بە خوا، خوا تۆی بەسەر ئێمەدا هەڵبژارد، واتە: بەهۆی ئەو کردەوە چاکانەو، بەهۆی ئەو سیفەتە بەرزانەو، بەهۆی ئەو مەعدەنە پاکەتەوە، خوا تۆی بەسەر ئێمەدا هەڵبژاردووەو لە ئێمە چاکتری، ﴿ وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴾[1]، ﴿ وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴾، یانی: بە تەئکیدیش ئێمە تاوانبارو گوناهبار بووین بەرانبەر بە تۆ، ﴿ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ ﴾، (یوسوف) گوتی: ئەمڕۆ هیچ سەرزەنشتو گلەییتان لیٚ ناگریٚ، واتە: لەلایەن منەوە، نابیستن گلەییتان لیٚ بکەمو سەرزەنشتتان بکەم، ئەوەی پێشێشی لە ڕاستییدا، ئاگر بڕبوو لێیان .

سبحان الله! تەماشای ئەو کەرەمەی یوسوفو، ئەو ڕەوشتە بەرزەی یوسوف ﷺ بکەن! خوا لە خۆوە ڕێز لە کەس نانیٚ !

---

[1] ئەم (إِن)ە، (إِن)ی (مُخَفَّفَة)یە لە (مُثَقَّلَة)و بۆ تەئکیدە.

ئەوەی پێشێشی کە دەڵێ: ﴿ هَلْ عَلِمْتُم مَّا فَعَلْتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ ﴾، ئایا دەزانن چیتان کرد بە یوسفو بە برایەکەی، چیتان بەسەر هێنان ! ئەمە تەنیا بە بیرهێنانەوەیەو هیچی دی، ئنجا ئاگر بڕیشیان لێ دەکات، ﴿ إِذْ أَنتُمْ جَٰهِلُونَ ﴾، ئەو کاتە ئێوە نەزان بوون، نەفام بوون، ئەگەر زانیباتانو وەك ئێستا تێگەیشتووبان، پێگەیشتووبان، ئەوەتان نەدەکرد، یانی: گلەیی لێکردنەکەشی بریتی بووە لە ئاگربڕ !

ئنجا دەڵێ: ﴿ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ ﴾، لە مڕۆ بەدواوە گلەییتان لێ ناگرێ، واتە: لەلایەن منەوە، ﴿ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ ﴾، یانی: بە نسبەت هەقی خۆمەوە، گلەییتان لێ ناکەم، بە نسبەت مافی خواشەوە: داواتان بۆ دەکەم کە خوا لێتان ببووری، ﴿ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴾، خواش بە بەزەییترینی خاوەن بەزەییانە .

ئەوە بە نسبەت خۆیانەوە .

پاشان دەفەرموێ: ﴿ اذْهَبُوا بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيرًا ﴾، ئەم کراسەم بەرن، بەسەر دەم وچاوی بابمی دا بدەن، یەکسەر بینەر دەبێتەوەو چاوەکانی چاك دەبنەوە، ﴿ وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، ئنجا تێکڕای ماڵو خێزانو کەسوکارتانم بۆ بێنن، لەو دەشتو بیابانی کەنعانە مەمێنن، شوێنێکی بێ دەرامەتو قاقڕو دێمەکارە، وەرنە میسرەوە، ﴿ وَلَمَّا فَصَلَتِ الْعِيرُ ﴾، ئنجا کاتێك کاروانەکە جیابۆوە، واتە: لە دەروازەی شار، لە سنووری شار هاتە دەرو جیابۆوە لە شار، بەرەو کەنعان، هەر خوا دەزانێ چەند ڕۆژە ڕێ بووە! ﴿ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلَا أَن تُفَنِّدُونِ ﴾، بابی (کوڕەکان) گوتی: من بۆنی یوسف دەکەم، ئەگەر ئێوە بە خەلەفاوم دانەنێنو پاڵم نەدەنە لای بەهەڵەداچوون.

(فَنَد)، بریتیە لە ڕای بێهێز، بۆچوونی بێهێزو، نەزانییو نەفامیی لە مەسەلەیەکی دیارییکراودا .

﴿ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِى ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ ﴾، گوتیان: بە خوا تۆ هەر لە بەهەڵەداچوونەکەی پێشووت دای .

لێرەشدا وشەی (ضَلال)، وەك لەم سوورەتەدا بە گشتی، وشەی (ضَلال) بە مانای بەهەڵەداچوون هاتوە، نەك گومڕا بوون لە ڕێی خوا، چونکە بە تەئکید کوڕەکانی ئەگەر بابیان بە گومڕاو سەرگەردانو سەرلێشێواو بە نسبەت خواوە، دانابایە، پێی کافر دەبوون، بە تەئکید مەبەستیش ئەوە نیە، واتە: تۆ هەر لەسەر هەڵەی پێشووت دەڕۆی، کە پێتوایە یوسوف هەر ماوە، یوسوف فەوتاوە، گورگ خواردوویەتیو، چی دیکە بە دوای کڵاوی خوار مەگەوەو، لە دوای چووان مەچوو .

ئنجا بە (ف)ی (تَعقِیب)، واتە: یەکسەر دوای ئەوە: ﴿ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ ﴾، کاتێك کە مۆژدەدەر، هات، ﴿ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ ﴾، فڕێیدایە سەر دەموچاوی، واتە: کراسەکەی یوسوفی هاویشتە سەر دەموچاوی یەعقووب، ﴿ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗا ﴾، یەکسەر بینەر بوو، یەکسەر گەڕایەوە بۆ حاڵەتی بینینو حاڵەتی کوێرییەکەی لاچوو، هەڵبەتە ئەوە وەك حاڵەتێکی موعجیزە بووە، ئنجا بێگومان بە نسبەت خوای پەروەرگارەوە کە موعجیزەکانیش ڕوودەدەن، ئەویش بێگومان یاسای خۆی هەیە، بەڵام بۆ ئێمە: یاسا دڕ (خارق العادة)ە، یانی: وەك: حاڵەتی ئاسایی: کەسێك کوێر بێ، کراسێك بەسەر دەموچاوی دابدرێ، چاك نابێتەوە لە ڕووی پزیشکییەوە.

کەواتە: موعجیزەیە، بەڵام موعجیزەش مانای وانیە لەلای خوای باڵادەستو زاڵ، یاسایەکی نیە، هەیەتی، بەڵام بێگومان بۆ ئێمە، شتێکی نادیارە، بۆیە ئێمە بە موعجیزەکان دەڵێین: یاسادڕ (خارق العادة)، واتە: ئەو یاسایەی کە ئێمە دەیزانینو بۆ ئێمە زانراوە، ئەو یاسایە دەدڕێو، ڕوودانی موعجیزە بە پێی جۆرە یاسایەکی دیکەیە، کە ئێمە نازانین چۆنە ؟

﴿ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، (یەعقووب ﷺ) پێی گوتن: ئەدی پێم نەگوتن: من لەلایەن خواوە شتێك دەزانم، كە ئێوە نایزانن؟ من دەمزانی كە یوسوف هەر ماوە.

﴿ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ ﴾، گوتیان: ئەی بابی خۆمان! داوای لێبوردنمان لە خوا بۆ گوناهەكانمان بكە، بێگومان ئێمە خەتابار بووین، تاوانبار بووین: بە نسبەت تۆوەو بە نسبەت یوسوفەوە، واتە: دان بە هەڵەی خۆیاندا دێنن، ﴿ قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، گوتی: بێگومان داوای لێبوردنتان بۆ لە پەروەردگارم دەكەم، بە دڵنیاییەوە ئەو لێبوردەی بە بەزەییە، بۆیە: لێتان دەبووریٚ و بەزەیی پێتان دادیٚ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** چوونی برایەکانی یوسف عليه السلام بۆ میسرو، لێ وە ژوور کەوتنیو، داوا لێکردنی کە هەرچەندە دەستمایەیەکی کەمو کورتیان پێیە، بەڵام ئازووخەی تەواویان بداتێو، بە تەواویی بۆیان بپێوێو، خێرو چاکەیان لەگەڵدا بکات:

وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ قَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهْلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئْنَا بِبِضَـٰعَةٍ مُّزْجَىٰةٍ فَأَوْفِ لَنَا ٱلْكَيْلَ وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجْزِى ٱلْمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە حەوت بڕگەدا

١) - ﴿ فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ ﴾، ئنجا دوای ئەوەی لێی وە ژوورکەوتن، چوونە ژوور ئەو شوێنەی کە ئەو لێی بوو، واتە: یوسف لێی بوو، شوێنی حوکمڕانیی.

بۆچی بە (ف) دەستی پێکردوە؟ دەڵێ: (الفاءُ عاطِفة لكَلامٍ مُقَدَّرٍ دَلَّ عَلَيهِ لمَقَامِ)، (ف)ی سەر ﴿ فَلَمَّا ﴾، ئەو ڕستەیە دەگێڕێتەوەو بای دەداتەوە، بۆ سەر قسەیەکی پێشوو، کە بە پێی سیاقو مەقام دەزانرێ، واتە: لە کەنعانەوە بە ڕێکەوتنو ڕێگایان بڕی، ڕۆیشتن گەیشتنە میسرو لە دەروازەکان چوونە ژوور، ﴿ فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ ﴾، ئنجا دوای ئەو قۆناغانە: کاتێك لێی وەژوور کەوتن.

٢) - ﴿ قَالُواْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ ﴾، گوتیان: ئەی عەزیز! عەزیز لە زمانی عەرەبیدا بە مانای دەستڕۆیشتوو و حوکمڕانو باڵادەست دێ، ئنجا ئایا مەبەستیان هەر ڕێز لێنان بووەو، ئەو کاتە لە میسر هەر کەسێك کە بەرپرس بووبێ، حوکمڕانو دەستڕۆیشتوو بووبێ، لە هەر پلەیەکدا بووبێ، پێی گوتراوە: عەزیز، یاخود یوسوف وێڕای ئەوەی کە بەرپرسی کاروباری ئابووریی‌و داراییی بووە، لە میسردا، ئەو پێگەیەی عەزیزی میسریشی پێ سپێردراوە، کە بە پێی پەیمانی کۆن بێ، دەڵێ: سەرۆکی پاسەوانەکانی پادشا بووە، هەردوو لای ئەگەریان هەیە، گوتیان: ئەی عەزیز! واتە: پیاوی دەستڕۆیشتوو، یان ئەو کەسەی کە ئەو پێگەو پۆستە دیاریکراوەت هەیە، لە میسردا .

٣) - ﴿ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ ﴾، خۆمانو خاوو خێزانمان، خۆمانو کەسوکارمان زیانو ئازارمان پێگەیشتوە .

(ٱلضُّرُّ)، بریتیە لە هەر ئازارێك کە تووشی ئینسان دێ، بەڵام بە پێی سیاقو شوێن دیاریی دەکرێ، ماناکەی چییە؟ کە لێرە بە تەئکید مەبەست پێی: هەژاریی‌و نەداریی‌و کەم دەرامەتییە، واتە: خۆمانو خاووخێزانمانو کەسوکارمان، تووشی هەژاریی‌و نەداریی بووین .

٤) - ﴿ وَجِئۡنَا بِبِضَـٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ ﴾، ئنجا کەلوپەلێکی نەویستراومان هێناوە .

(بِضَاعَة) پێشتریش باسمان کرد: بە مانای کەلوپەلێکە کە بۆ بازرگانیی پێکردن، دانراوە، ئنجا چ دراوو پارەی نەختینە بێ، چ کەلوپەلو شمەك بێ، هەردووکیان دەگرێتەوە، واشپێدەچێ، زیاتر مەبەست پێی دراوو پارە بوو بێ .

(مُزْجَاة)، یانی: نەویستراو، (المُزْجَاةُ: القَلِيلَةُ الَّتِي تُدْفَعُ إِلَى الطَالِبِ دَفْعاً لِيَقْبَلَهُ)، (مُزْجَاة) ئەو پارەو بەهاو دەستمایە کەمەیە کە بە پاڵ پێوەنران پاڵ پێوەدەنرێ، بۆ لای بەرانبەر، ئەو کەسەی داوای دەکات، بۆ ئەوەی قبووڵی بکاتو وەریبگرێ، واتە: دەستمایەیەکی کەممان هێناوە، پارەیەکی کەمو کورتمان هێناوەو، زۆریش ئاتاجو موحتاجین .

٥) - ﴿ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ ﴾، پێوانەمان بۆ تەواو بکە، یانی: (أَتِمَّ لَنا الكَيْلَ)، ئنجا (ٱلۡكَيۡلَ)، یان چاوگە (مصدر)ە، یاخود (مَفعُولٌ بِهِ)یە :

١ - ﴿ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ ﴾، واتە: پێوانمان بۆ تەواو بکە.

٢ - یاخود ﴿ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ ﴾، یانی: ئەوەی پێوراومان بۆ تەواو بکە، ئەوەی کە دەپێورێ، کە هەر یەك مانایان هەیەو، دەچنەوە سەر یەك واتا .

٦) ﴿ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآ ﴾، چاکەشمان لەگەڵ بکە، لێرەدا ﴿ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآ ﴾، یانی: خێرمان پێبکە، چاکەمان لەگەڵ بکە، (صَدَقَة)ش، بریتیە لە بەخشینێك بە بێ بەرانبەر، بەبێ ئەوەی ئەو کەسەی پێی دەبەخشرێ، مافی بێ، لە کوردییدا پێی دەڵێن: خێرکردن، چاکەکردن، بەخشین .

ئنجا لێرەدا کە دەڵێن : ﴿ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآ ﴾، دوو واتای هەن :

یەکەم : واتە: باش بۆمان بپێوە، هەرچەندە دەستمایەکەمان، پارەکەمان، بایی ئەوەندە نیە، بەلام تۆ وەك ئەوەی قیمەتو دەستمایەی تەواومان هێنابێ، ئاوا ئازووخەمان بۆ بپێوە.

دووەم : ﴿ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآ ﴾، یانی: چاکەو خێرمان پێ بکەو، برایەکەمان کە لە لای خۆت گلتداوەتەوەو کردووتە بە کۆیلە، بۆمان ئازاد بکە، یاخود لەگەڵمان بنێرە .

# ئیشكالێك و وەڵامەكەی

(إبن العَرَبي)، لە (أحكامُ القُرآن)[1]دا، پرسیارێك دەورووژێنێ، دەڵێ: (فَإنْ قِيلَ: فَكَيْفَ جازَ لَهُمْ أَنْ يَطْلُبوا الصَّدَقة وَهُم الأَنْبِياءُ؟).

چۆن بۆیان دروست بووە داوای خێر پێكران بكەن، لە حاڵێكدا كە ئەوانە پێغەمبەرن؟ (قُلْنا: عَنْهُ خَمْسَة أَجْوِبة:

أَحَدُها: لا يَعْلَمُ الْعُلَماءُ أَنَّهُمْ أَنْبِياءٌ، وَآمَنا بِاللهِ وَمَلائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ.

الثَّانِي: أَنَّهُمْ لَمْ يكونُوا بَعْدُ أَنْبِياءَ.

الثَّالِثُ: أَنَّهُ لا يُعْلَمُ حالُهُمْ مَعَ الصَّدَقة فِي شَرْعِهِمْ، فَلَعَلَّ ذَلِكَ كانَ مُباحاً لَهُمْ.

الرَّابِعُ: مَعْنَى تَصَدَّقْ: سامِحْ، لا أَصْلُ الصَّدَقة.

الْخامِسُ: قِيلَ: تَصَدَّقْ عَلَيْنا بِأَخِينا.

وَبِالْقَوْلَيْنِ الأَخِيرينَ أَقُولُ).

پێنج جۆرە وەڵام دەداتەوە بۆ پرسیاری: چۆن ئەوانە داوای خێرپێكرانو چاكە لەگەڵ كرانیان كردوە لە حاڵێك دا كە پێغەمبەریش بوون ؟!

**یەكەم**: زانایان نەیانزانیوە، كە ئەوانە پێغەمبەر بوو بنو بڕواسمان بە خوا و فریشتەكانیو كتێبەكانیو پێغەمبەرەكانی هەیە.

**دووەم**: ئەوانە ئەو كاتە كە داوای خێر پێكرانیان كردوە، جاری نەبوونەتە پێغەمبەرو دوایی بوون بە پێغەمبەر.

---

١) ج ٣، ص ٧٧.

**سێیەم**: نازانرێ لە شەرعو بەرنامەی یەعقووبدا ﷺ کە لە بارەی بەخشینو خێر پێکردنەوە، حاڵیان چۆن بووە؟ ڕەنگە لە بەرنامەی ئەواندا ڕەوا بووبێ.

**چوارەم**: کە دەڵێن: (تَصَدَّق)، واتە: لێمان ببوورە، نەك خێرمان پێبکە، واتە: چاوپۆشیمان لێبکە، کە ئەوەش لەگەڵ هەموو کەسدا دەگونجێ ببێ.

**پێنجەم**: گوتراوە: چاکەمان لەگەڵ بکە، بەهۆی برایەکەمانەوە، واتە: برایەکەمان وێبدەوە، پێمان ببەخشەوە.

ئنجا (إبن العَرَبي) دەڵێ: (وَبالقَوْلَيْنِ الأَخِيرِينَ أَقُولُ)، واتە: من ڕام لەگەڵ دوو قسەی کۆتایی دایە، واتە: چوارەمو پێنجەم.

منیش دەڵێم: ئەو دووانە گونجاون، بەڵام وەك پێشتر باسمان کرد: ئەو کوڕانە ناگونجێ پێغەمبەر بووبن، نە ئەو کاتەو نە دواییش، هیچ بەڵگەیەك نیە لەوبارەوە، چونکە بۆ بە پێغەمبەر لەقەڵەم دانی کەسێك، دەبێ بەڵگەی دڵنیاکەری لەسەر بێ، ئەسڵ ئەوەیە کە پێغەمبەر نینو بۆ ئیسپاتی ئەوە کە فلانکەس پێغەمبەرە، دەبێ بەڵگەیەکی دڵنیاکەرو یەکلایی کەرەوەمان هەبێ، کە بۆ کوڕەکانی یەعقووب جگە لە یوسوف ﷺ بەڵگەیەکی ئەوتۆ نیە، کەواتە: ئەو ئیشکالە هەر ئەسڵدا دروست نابێ، چونکە ئەو ئیشکالە لە کاتێکدا دروست دەبێ، کە دەڵێ: چۆن بۆیان دروست بووە داوای صەدەقە بکەن، کە پێغەمبەرن؟ بەڵام کە سەلماندمان پێغەمبەر نین، کەواتە: وەك خەڵکی دیکەنو، چۆن خەڵکی دیکە بۆی ڕەوایە داوای خێر پێکرانو چاکە بکات، ئەوانیش بۆیان هەبووە.

کەواتە: هەر ئەسڵەن ئیشکالەکە ـ بە بۆچوونی من ـ لە جێی خۆیدا نیە، چونکە ئیشکالەکە لەسەر ئەوە دروست دەبێ، کە ئەوانە پێغەمبەر بن، بەڵام مادام پێغەمبەر نەبوون، ئیشکالەکە دروست نابێ.

هەرچەندە مەرجیش نیە کە لەو وردەکارییانەدا، بەرنامەکانی پێغەمبەران وەك یەك بن، بە تایبەتیش پێغەمبەری کۆتایی (محمد)

کۆمەڵێك تایبەتمەندیی هەبوون‌و، دوورنییە صەدەقە پێ نەشیانیش لەو تایبەتمەندییانەی بوو بێ .

**بڕگەی حەوتەم :-** ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِى ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ ﴾، بێگومان خوا پاداشتی خێرکەران، چاکەکەران، بەخشەران دەداتەوە، ئەمە بەڵگە هێنانەوەو هۆکار هێنانەوەیە، بۆئەوەی چاکەیان لەگەڵدا بکات‌و، خێریان پێبکات‌و، هاوکارییان بکات .

( لقُرطُبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، لەوبارەوە کە خوا دەفەرموێ:

﴿ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ ﴾، برسیەتیی‌و ئاتاجییمان تووشبووە، دەڵێ: (وَفِي هَذَا دَلِيل عَلَى جوَازِ الشَّكوى عِنْدَ الضرّ، أَي الجُوعِ، بَل وَاجِبٌ عَلَيْهِ، إِذَا خَافَ عَلَى نَفْسِهِ الضرّ مِنَ الفقْرِ وَغَيْرِهِ، أَن يُبْدِي حَالَتَهُ إِلى مَنْ يرجو مِنْهُ النَّفْع، كَما هُوَ وَاجِبٌ عَلَيْهِ أَنْ يَشْكو ما بِهِ مِنَ الأَلَمِ إِلى الطَّبِيبِ لِيعالِجَه، وَلاَ يَكون ذَلِكَ قَدْحَاً فِي التوكّل، وَهَذا ما لَمْ يَكُن التَشَكّي عَلَى سَبيلِ التَسَخُّطِ، وَالصَّبْرُ وَالتجلُّدُ فِي النَوَائِب أَحْسَنُ وَالتَعَفُّفُ عَنِ المَسألَة أَفْضَلُ، وَأَحْسَنُ الكَلاَمِ فِي الشكوى: سُؤَالُ المولَى: زَوَال البَلْوَى) .

واتە: لەوەدا کە دەڵێن: ﴿ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ ﴾، بەڵگە هەیە لەسەر ئەوە کە دروستە لە کاتی ئاتاجیی‌و هەژاریی‌و برسیەتییدا، ئینسان سکاڵا بکات، باسی برسیەتیی خۆی بکات، بەڵکو لەسەری پێویستە، بە تایبەت ئەگەر مەترسیی هەبوو لە نەفسی خۆی کە لە برسان، بمرێ، بەهۆی هەژارییەوە، یان ئەگەر مەترسیی هەبوو لەوەی تووشی هەر شتێکی دیکە ببێ، لەسەری پێویستە سکاڵا بکات‌و، داوا بکات، بۆ ئەوەی کە ئەو بەڵاو گرفتارییە لە خۆی دووربخاتەوە، بەڵام سکاڵاکەی خۆی بۆ کەسێك بکات‌و حاڵی خۆی بۆ کەسێك دەربڕێ، کە بزانێ سوودێکی پێ دەگەیەنێ، هەر وەك چۆن لەسەری پێویستە ئەگەر ئازارێکی هەبوو ئازارەکەی بۆ پزیشك باس بکات، بۆئەوەی

١) الجامعُ لأحكامُ القُرآن، ج ٩، ص ٢٠٥.

چارەسەری بکات، ئەوەش زیان بە پشت خوا بەستن (توكلّ) لە مرۆڤدا ناگەیەنێ، بەلاّم بە مەرجێك كە ئەو سكالاّكردنە بە شێوەی نارەزایی دەربڕینو تووڕە بوون نەبێ لە بەلاّو تاقی كردنەوەی خوا، ئنجا بێگومان خۆڕاگریی‌و دامەزراویی لە بەرانبەر بەلاّو گرفتارییەكاندا باشترە، هەروەك خۆ پاك ڕاگرتن‌و نەفس بەرزیی لە سوالّ كردن‌و داواكردن، باشترە .

ئنجا دەڵێ: باشترین قسەیەكیش كە لە بارەی سكالاّكردنەوە گوتراوە: ئەوەیە كە گوتراوە: (سُؤَالُ المولَى: زَوَالُ البَلْوَى)، داواكردن لە سەرپەرشتیار (خوا ﷻ) مایەی لاچوونی بەلاّو گرفتارییە .

هەروەها (القُرطُبي)، لە تەفسیرەكەیدا[1]، دەڵێ: (يُكرهُ لِلرَّجُلِ إن يَقُولَ في دُعائهِ: اللّهُمَّ تَصَدّقْ عَلَيَّ، لأَنَّ الصَّدَقة إنّما تكونُ مِمَّن يَبتَغي الثّوابَ، وَاللّهُ تَعالى مَتَفضِّلٌ بالثّوابِ وَبجَمِيعِ النِّعَمِ) .

واتە: ناپەسندە بۆ پیاو، (هەروەها دیارە بۆ ئافرەتیش بەلاّم لێرەدا مەقامەكە باسی پیاوان بووە) كە لە پاڕانەوەكەیدا بڵێ: خوایە! خێرم پێبكە، چونكە خێر پێكردن لە كەسێكەوە دەبێ، كە چاوەڕێی پاداشت بێ، خوای بەرزیش پاداشت دەبەخشێ، نەك چاوەڕێی پاداشت بێ، هەموو نیعمەتەكانیش خوا بەخشەریانە.

**مەسەلەی دووەم :** **نەرمە گلەییەكی تێكەڵ بە پۆزشی یوسوف لە برایەكانی‌و، خۆ ناساندنی پێیان‌و، دان بە هەڵەی خۆداهێنانی برایەكانی‌و، ڕاگەیاندنی یوسوف كە هیچ گلەیی‌و سەركۆنەی لێیان نیەو، داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا دەكات :**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ قَدۡ مَنَّ

---

١) الجامعُ لأحكام القُرآن ج ٩، ص ٢٠٧.

ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم چوار ئایەتە بەپێزە لە یازدە بڕگەدا**

**١) -** ﴿ قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ ﴾، یوسوف گوتی: ئایا دەزانن چیتان کرد بە یوسوفو برایەکەی! ئەمە سەرزەنشتێکی زۆر نەرمو نیانە، بۆیە من گوتوومە: نەرمە گلەیی، یانی سەرزەنشتێکی تێکەڵ بە پۆزش بۆ هێنانەوەشیانە، وەك دوایی باسی دەکەین .

بێگومان شێوازی پرسیارکردنیش: ﴿ هَلۡ عَلِمۡتُم ﴾، ئایا دەزانن؟! مەبەست لەو پرسیارکردنە، ئەوە نیە چاوەڕێی وەڵام بێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: بە دڵنیایی ئێوە ئاگادارن چیتان بە یوسوفو بە برایەکەی کرد .

ئنجا ئەمە لێشی وەردەگیرێ، کە تەنیا ئەوە نەبووە یوسوف بخەنە بیرەوە، بەڵکو دیارە پێشتریش هەر ناڕێك بوون، بەرلەوەی یوسوفیش بخەنە بیرەوە، هەروەها وێڕای یوسوف : بێ لوتفییان لەگەڵ بنیامینیشدا هەر کردوە !

**٢) -** ﴿ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ ﴾، لە کاتێکدا لە حاڵێکدا کە ئێوە بێئاگا بوون، نەزان بوون، ئەمە جۆرێکە لە پۆزش بۆ هێنانەوەیان، یانی: ئەو کاتە سادەو گەنجو نەزان بوون، یاخود: نەتاندەزانی: ئەو خستنە بیرە، ئەو هەموو میحنەتو گرفتارییەی بە دوا دادێ .

هەڵبەتە لێرەدا کە یوسوف ﷺ ئاوایان پێ دەڵێ، کتوپڕ، کە دیارە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بووە بۆیان، ئەوە هاتنەدی ئەو فەرمایشتەی خوای بەرزە، کە لە ئایەتی (١٥)ی، سووڕەتی (یوسوف)دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا ذَهَبُواْ

بِهِۦ وَأَجْمَعُوٓا۟ أَن يَجْعَلُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمْرِهِمْ هَٰذَا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٥﴾﴾، واتە: كاتێك بردیانو هەموویان ڕایان هاتە سەر ئەوەی: بڕیاریاندا بیخەنە بنی تاریكی بیرەكەوەو، وەحییمان بۆ كردو پێمان ڕاگەیاند، كە تۆ ئەم كارەی ئێستایان، هەواڵیان پێ دەدەیو بیریان دێنیەوە، بێئەوەی هەست پێ بكەن (كە تۆ یوسوفی)، ئنجا ئەوەتا یوسوف ﷺ وەك تەحقیقی ئەو بەڵێنەی خوای پەروەردگار، ئەو هەواڵەیان پێدەدا: ئایا دەزانن چیتان بە یوسوفو بە برایەكەی كرد، لە كاتێكدا كە ئێوە نەزان بوون؟ ئەوەش وەك گوتم: دوو واتای هەن :

١/ یانی: سادەو گەنجو نەزان بوون، كە ئەمە جۆرێكە لە پۆزش بۆ هێنانەوەیان .

٢/ نەتاندەزانی كە ئەو خستنە بیرە، ئەو هەموو میحنەتو گرفتارییەی بۆ بابتانو بۆ دایكتانو بۆ خۆتانو بۆ یوسوفو بۆ برایەكەیو بۆ هەمووان، بە دوا دادێ .

٣) - ﴿قَالُوٓا۟ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُ﴾، واتە: (دە برایەكان)، گوتیان: ئایا تۆی یوسوف! ئایا تۆ یوسوفی! (بە سەرسوڕمانەوە!).

٤) - ﴿قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِى﴾، گوتی: بەڵێ من یوسوفم، ئەمەش برایەكەمە، واتە: برای دایكییمە، ئەگەر نا ئەوانیش هەر برای بوون، یانی: ئەو برایەمە كە لە سۆنگەی ئەوەوە دایكی لە دایكی ئێوە جیابوو لەگەڵ من، ئەو هەموو بێ لوتفییەتان لەگەڵدا كردین !

٥) - ﴿قَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَآ﴾، ئەوە بێگومان خوا چاكەی لەگەڵ كردین .

لێرەدا بێگومان یوسوف ﷺ مەبەستی ئەوە نەبووە خۆی بەسەر ئەواندا هەڵكێشێ، بەڵكو مەبەستی ئەوە بووە كە چاكەی خوا باس بكات، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ ﴿١١﴾﴾الضحى، بەڵام چاكەی

پەروەردگارت باس بکە، لێرەدا یوسوف ﷺ ویستوویەتی چاکەی خوا لەسەر خۆیو لەسەر برایەکەی بخاتە ڕوو، کە ئەوە چاکەی خوایە، لەسەر ئێمە کە ئاوا ئێمەی ڕزگار کرد، ئێمەی دەرباز کردو، منی بەو پێگەو مەقامە گەیاند.

٦) - ﴿ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی کەسێك پارێز بکاتو خۆڕاگر بێ، ئەوە مسۆگەر خوا پاداشتو، کرێی کردەوەی چاکی چاکەکاران، بزر ناکات، نافەوتێنێ .

هەندێك لە زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە: ﴿ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ ﴾، وەك یوسوف کە پارێزی کرد، ﴿ وَيَصۡبِرۡ ﴾، وەك بنیامین کە خۆڕاگر بوو.

بەڵام من دەڵێم: بەدڵنیایی یوسوف ﷺ هەم ئەهلی تەقوا بووە، هەم ئەهلی صەبریش بووە، دیارە بنیامینیش دەبێ هەر وا بوو بێ.

ئنجا ئەمە ئەوەشی لێوەردەگیرێ، کە بێگومان یوسوف ﷺ نەیویستوە خۆی بەسەرواندا هەڵکێشی، کە: ئێمە ئەهلی تەقواو صەبر بووین، نا، بەڵکو ویستوویەتی فێریان بکات کە ئەی برایەکانم! ئەوە ئازایەتیی خۆمان نەبوو، بەڵکو چاکەی خوا بوو لەسەرمان، کە خواش ﷻ لە گۆترە چاکە لەگەڵ کەسدا ناکاو، منەت نانێتە سەر کەسو نیعمەت بە کەس نابەخشێ، بەڵکو لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئێمە پارێزکار بووینو خۆڕاگر بووین، بۆیە خوا ﷻ ئەو چاکەیەی لەگەڵ ئێمەدا کردوە، چونکە خوا پاداشتو کرێی چاکەکاران نافەوتێنێو زایە ناکات .

هەڵبەتە لێرەدا یوسوف ﷺ وەك یاسایەکی گشتییش دەیخاتە ڕوو، نالێ: منو برایەکەم ئەهلی تەقواو صەبر بووین، بەڵکو بە گشتی وەك یاسایەك دەیخاتە ڕوو، کە هەر کەسێك ئەهلی تەقواو صەبر بێ، ئەوە خوا پاداشتەکەی زایە ناکاتو، بە چاکەکار لە قەڵەم دەدرێ، خواش پاداشتی چاکەکاران زایە ناکات، کە وەك گوتم: ئەمە بە حەقیقەت مەقامی باسکردنو یادکردنی چاکەی خوایە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثۡ ﴿١١﴾ ﴾ الضحى، واتە: بەڵام چاکەی پەروەردگارت باس بکە، یادی بکە، ئنجا ئەمە وەك

فەرمایشتەكەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ وایە، كە دەفەرموێ: {وَاللهِ إِنِّي لأَتْقَاكُمْ لـلهِ وَأَعْلَمُكُمْ بِهِ}، {أخرجه مسلم برقم: (١١٠٨)، والبيهقي برقم: (٧٨٩٤)}.

واتە: بێگومان من لە هەمووانتان زیاتر پارێز لە خوا دەكەمو، لە هەمووشتان بە خوا زاناترمو خواناسترم.

**٧) -** ﴿ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدْ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيْنَا ﴾، واتە: (برایەكان)ی گوتیان: سوێند بە خوا، تۆ خوا بەسەر ئێمەی دا هەڵبژاردی.

(الإِيثَارُ: التَفضِيلُ بالعَطاء)، (إیثار)، بریتیە لە زێدەیی پێدان، زێدەیی پێ بەخشین، واتە: خوا ﷻ زێدەیی بە تۆ داوەو تۆی بەسەر ئێمەدا هەڵبژاردوە، لە پێ بەخشیندا، لەبەر ئەوەی لێوەشاوەو شایستە بووی.

**٨) -** ﴿ وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴾، بێگومان ئێمەش لە تاوانباران بووین، ئێمە لە خەتاكاران بووین، (الخاطِيءُ: فَاعِلُ الخَطِيئَةِ أي: الجَرِيمَة)، (خاطِيء)، واتە: كەسێك كە (خَطِيئَة) ئەنجام دەدا، (خَطِيئَة)یش، واتە: گوناهو تاوان، لێرەدا هەم دان بە چاكەی یوسوف دادێنن، كە تۆ خاوەن چاكە بوویو، خوا تۆی هەڵبژاردوەو خواش ﷻ لە گۆترە كەس هەڵنابژێرێ، خوا زێدەیی بە تۆ داوەو، خواش لە گۆترە زێدەیی بە كەس نادات، هەم دان بە هەڵەی خۆشیان دا دێنن، ﴿ وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە هەموومان تاوانبار بووین، خەتابار بووین، (دەرهەق بە تۆ).

كەواتە: هەم دانیان بە چاكەی یوسوف داهێناوە، هەم پێشیان لە هەڵەو گوناهی خۆیان ناوە، بۆیە لێرەدا وەك عەرەب دەڵێن: (العُذرُ عِندَ كرام لناسِ مَقبولٌ)، پۆزش هێنانەوە لەلای خەڵكی بەڕێز، قبووڵ دەكرێ، یوسوفیش پیاوێكی بەڕێزە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {الْكَرِيمُ ابْنُ الْكَرِيمِ، ابْنِ الْكَرِيمِ، ابْنِ الْكَرِيمِ: يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ، ابْنِ إِسْحَاقَ، ابْنِ إِبْرَاهِيمَ}، {البخاري برقم: (٣٣٨٢)}.

واتە: بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێز کوڕی بەڕێز: یوسوفی کوڕی یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم .

**٩) -** ﴿ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ ﴾، یوسوف گوتی: ئەمڕۆ هیچ سەرزەنشتو گلەییو سەرکۆنەتان لەسەر نیە، واتە: لەلایەن منەوە، هیچ گلەییو سەرزەنشتێکتان لەسەر نیەو لێناگرێ، تەنانەت نەرمە گلەییەکەشی کە لێی کردن، بە شێوەی پرسیار بوو، نەك ڕووشکێن کردن، وەبیرهێنانەوەیان بوو، بۆ خۆ پێناساندنی پێیان، ئنجا جۆرێك لە پۆزش هێنانەوەشی تێدا بوو، کە فەرمووی: ﴿ إِذْ أَنتُمْ جَٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾، لەو کاتە نەتاندەزانی، بێئاگا بوون، سادە بوون، گەنج بوون .

یاخود نەتاندەزانی کە ئەو خستنە بیرەی من، ئەو هەموو بەلاو میحنەتەتان بەسەر دێنیو بە دوای دادێ .

**١٠) -** ﴿ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ ﴾، خوا لێتان ببووریّ .

لێرەدا دەگونجیّ یوسوف عليه السلام خوا سبحانه وتعالى ئاگاداری کردبێتەوە بە وەحیی، کە تۆ مادام لە هەقی خۆت لێیان دەبووری، خواش لێیان دەبووریّو لێیان بوردوە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە دانیان بە هەڵەی خۆیاندا هێناوە، چونکە: دان بە هەڵەی خۆ داهێنان، بریتیە لە تۆبەو گەڕانەوە، دەگونجیّ یوسوف عليه السلام بەس ئاگاداری کردبنەوە کە: ئەوە خوا لێتانی بورد، خوا چاوپۆشیی لێکردن، چونکە ئێوە دانتان بە هەڵەی خۆتاندا هێناو، پێتان لە گوناهی خۆتان نا.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە کە: ﴿ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ ﴾، کە (يَغْفِرُ ) کرداری ئێستا (فِعل المُضارِع)ە، بۆ داهاتوو و بۆ ئێستایە، بەڵام مەبەست پێی دوعایە، واتە: خوا لێتان ببووریّو چاوپۆشییتان لیّ بکات .

**١١) -** ﴿ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، بێگومان ئەو (خوا) بە بەزەییترینی خاوەن بەزەییانە .

لەوبارەوە ئەو شوێنەوارە دێنین :

{عَنِ إبن عَباسٍ رضي الله عَنهُ أنَ رسول اللهِ ﷺ أخَذَ بعُضادَتَي البابِ يَوْمَ فَتحِ مكة وَقَد لاذ الناس بالبيت، فقال: الحَمدُ لِلَهِ صَدَقَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ، ثُمَّ قَالَ: ماذا تَظُنُّون يا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ؟ قَالُوا: خَيْراً، أَخٌ كريمٌ وَابن أَخٍ كريمٍ، وقد قَدَرْتَ، قال: فَإنّي أَقُولُ كَما قَالَ أَخِي يُوسُفُ: ﴿لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ﴾، فقال عمر: فَفِضْتُ عَرَقاً من الحياء من قول رسول الله ذلك، أنّي قد كنت قلت لهم حين دخلنا مكة: اليوم نَنْتَقِم منكم وَنَفْعَلُ، فَلَما قال رسول الله ما قال، استحييت من قولي}، {رواه البيهَقي في لسُنَن الكُبرى ج ٩، ص ١١٨، والطحاوي فِي شَرح مَعاني الآثار ج ٣ ص ٣٢٥} .

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس دەڵێ: پێغەمبەر خوا ﷺ هەردوو شیپانەی دەرگای مزگەوتی (كە لە دەوری كەعبەیە) گرتن، لە ڕۆژی ئازادكردنی مەككەدا، لە حاڵێكدا خەڵك پەنایان برد بوو بۆ كەعبە، ئنجا فەرمووی: ستایش بۆ ئەو خوایەی كە بەڵێنی خۆی هێنایە دی‌و، بەندەی خۆی سەرخست‌و، بە تەنیا پێڕو كۆمەڵەكانی ئەهلی كوفری تێكشكاند، دوایی فەرمووی: ئەی كۆمەڵی قوڕەیش! چ گومانێك دەبەن، (واتە: پێتان وایە چیتان لێ دەكەم؟) گوتیان: هەر گومانی چاكەت پێ دەبەین، برایەكی بەڕێزی‌و برازایەكی بەڕێزی‌و خاوەن دەستەڵاتیشی، فەرمووی: هەر ئەوە دەڵێم، كە یوسوفی برام گوتی: ﴿لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ﴾، ئەمڕۆ هیچ گلەیی‌و سەركۆنەتان لەسەر نیە، گلەییتان لێ ناكەم، عومەر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرموو، وە سەر ئارەقە[1] گەڕام لە شەرمان، چونكە كاتێك كە چووینە نێو مەككەوە، بە قوڕەیشییەكانم گوت: ئەمڕۆ تۆڵەتان لێ دەستێنینەوەو ئاواو ئاواتان لێ دەكەین، ئنجا كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی فەرموو، شەرمم لە قسەكەی خۆم كرد، {كە شتێكم گوتوە، پێچەوانەی هەڵوێستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە} .

١) وەسەر ئارەقە گەڕام : ئارەقەم زۆركرد ، ئارەقەم لێ چۆڕا .

**مەسەلەی سێیەم :** کراسی خۆ ناردنی یوسوف بە برایەکانیدا بۆ بابی، تاکو چاوی چاک ببنەوەو، داواکردنی لێیان کە بە خاوو خێزانیانەوە بێن بۆ میسرو، لەوێدا نیشتەجێ بن :

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ اَذْهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا**

**١) ـ** دوای ئەوەی کە یوسوف ﷺ لەگەڵ برایەکانی ئاشت بۆوەو، بەو شێوە بەڕێزو حورمەتانەیە مامەڵەی لەگەڵدا کردن، ئنجا پێی فەرموون: ﴿ اَذْهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا ﴾، ئەم کراسەی من بەرن، ئەو کراسە چ کراسێك بووە ؟

هەندێك دەڵێن: ئەو کراسە بووە کە کاتی خۆی هی ئیبراهیم ﷺ بووە، بۆ ئیسحاق بەجێماوە، ئیسحاق بۆ یەعقووبو یەعقووبیش داویەتی بە یوسوف! بەڵام لەڕاستییدا ئەوە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو کراسی خۆی بووەو کراسێکی ئاسایی بووە، چونکە ئەوەی دیکە دەبێ بەڵگەی هەبێ، کە بەڵگە نەبوو، مانای وایە هەر ئەو کراسەیە کە خۆی لەبەری بووە لەو کاتەدا .

بۆیەش کراسەکەی دەنێرێ، تاکو یەکەم بابی دڵنیابێ کە ئەمجارە کوڕەکانی ڕاست دەکەن، چونکە هەر جارێ کە قسەیان لەگەڵی کردوە، ڕاست نەبووە! هەروەها بۆ ئەوەی دڵیشی خۆش بێ .

**٢) ـ** ﴿ فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِي ﴾، ئەم کراسە فڕێدەنە سەر ڕووی بابم، لەناکاو فڕێدەنە سەر دەمو چاوی .

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: لەبەر ئەوەی (یەعقووب) چاوی بەهۆی دڵتەنگیی‌و خەم‌و پەژارەی دووریی یوسوفەوە كوێر بووە، ئەگەر بێت‌و كتوپڕ ئەو كراسەی یوسوف بخرێتە سەر دەم‌و چاوی‌و بۆنی بكات، یەكسەر چاوی چاك دەبێتەوە، بەڵام بە حەقیقەت ئەو چاك بوونەوەی چاوی یەعقووب ﷺ بەو كراسەی یوسوف ﷺ، هەروەها بۆن كردنی كراسەكەی لە دوورڕا، وەك دوایی باسی دەكەین، هەمووی دەچێتە قاڵبی موعجیزەوەو، هیچ پێویست ناكات شیكردنەوەی زانستییانەی بۆ بكەین، چونكە موعجیزە یاسادڕەو لە سەرووی ئەو یاسایانەوەیە كە ئێمە پێیان ئاشناین، بۆیەش پێی دەگوترێ موعجیزە، واتە: دەستەوسانكەر، چونكە ئەگەر بە پێی ئەو یاسایانە بێ كە ئێمە دەیانزانین، خەڵكی دیكەش دەتوانێ وا بكات، هەر شتێك كە خەڵكی دیكە توانی بیكات، ئەو كاتە ئەو شتە بە موعجیزە لەقەڵەم نادرێ، موعجیزە، واتە: دەستەوسانكەر، واتە: شتێك بكەی، كە كەس نەتوانێ ئەو شتە بكات .

٣) - ﴿يَأْتِ بَصِيرًا﴾، واتە: یەكسەر چاوی چاك دەبنەوە .

بە تەئكید یوسوف ئەوەی لە ڕێی وەحییەوە زانیوە، لە ڕێی وەحییەوە خوا پێی ڕاگەیاندوە، كە ئەو كراسەی خۆت بنێرە، با بیخەنە سەر دەم‌و چاوی بابت، یەكسەر چاوی كە كوێر بوون‌و سپی هەڵگەڕاون، چاك دەبنەوە .

٤) - ﴿وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ﴾، ئنجا هەموو كەسوكارو خاوو خێزانتانم بۆ بێنن، واتە: لەوێڕا بگوازنەوە (كە لە بیابان بوون، لە ناوچەی كەنعانییەكان)، وەرن لە میسرِ نیشتەجێ بن .

جا هەندێك لە توێژەروانی قورئان دەڵێن: هەموویان حەفتاو شەش (٧٦) كەس بوون، واتە: خۆیان‌و خێزانەكانیان‌و كە یازدە كوڕ بوون، جگە لە یوسوف‌و یازدە ئافرەت كە خێزانەكانیان، بوون، باب‌و دایكیان، ئنجا چەند كوڕو كچیان بوون‌و، ڕەنگە پوورو خاڵ‌و... هتدیشیان لەگەڵدا بووبن، بەڵام بە هەر حاڵ ئەوەش دیسان زۆر جێی دڵنیایی نیە، قسەیەكە كراوە، دەگونجێ (٧٦) بووبن‌و دەگونجێ كەمتر بووبن، دەگونجێ زیاتر بووبن .

**مەسەلەی چوارەم :** بۆنکردنی یەعقووب بۆ یوسوف، پاش هاتنەوەی کاروان بەرەو کەنعانو، باسکردنی ئەو بۆنکردنە بۆ کورەکانی بە ترسەوە، کە ڕەخنەی لێبگرنو، ڕەخنە لێگرتنی کوڕەکانی، کە هەر لەسەر هەڵەی پێشووی سوورە :

وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٩٥﴾ ﴾.

**تویژینەوەی ئەم دوو ئایەتە لە سێ بڕگەدا**

**١) -** ﴿ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ ﴾، کاتێك کاروانەکە جیابۆوە، واتە: لە سنووری وڵاتی میسر جیابۆوە، بەرەو سەر زەمینی شامو کەنعان، وەك ئێستا دەڵێن: لە سنووری شارەوانی میسر ترازا بەرەو کەنعان .

**٢) -** ﴿ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴾ بابیان گوتی: من بۆنی یوسوف دەکەم، ئەگەر ئێوە من بە عەقڵ سووك، یان من بە خەڵەفاو دانەنێن .

دیارە کە دەفەرموێ: ﴿ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴾، وەڵامەکەی قرتێنراوە، واتە: ئەگەر ئێوە من بە خەڵەفاو دانەنێنو نەڵێن: عەقڵی تێکچووەو ڕایەکەی هەڵەیە، دڵنیا دەبوون کە من ڕاست دەکەمو بۆنی یوسوفم بۆ دێ .

(التَّفْنِيدُ: نِسبة للفَنَدِ وَهُوَ اختِلاَلُ العَقْلِ مِنَ الخرفِ)، (تَفْنِيد)، بریتیە پاڵدرانی کەسێك بەرەو لای (فَنَد)، (فَنَد)یش، بریتیە لە تێکچوونی عەقڵ بەهۆی زۆریی تەمەنەوە، بە کوردیی پێی دەڵێن: خەڵەفاوە، کە لە ئەسڵدا لە (خرف)ەوە، هاتوە لە زمانی عەرەبییدا، کە بریتیە لەوەی لە ئەنجامی تەمەندا، ئینسان عەقڵی بگۆڕێ .

٣) - ﴿ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِى ضَلَـٰلِكَ ٱلْقَدِيمِ ﴾، کوڕەکان گوتیان: سوێند بە خوا تۆ هەر لە بەهەڵە داچوونەکەی پێشووت دای .

لێرەدا وشەی (ضَلاَل)، وەك لە سووڕەتی یوسوفدا هەمووی، وشەی (ضَلاَل)، کە کوڕەکانی یەعقووب بۆ بابیانی بەکاردێنن، واتە: بە هەڵەداچوون، چونکە: (الضَّلاَلُ: البُعْدُ عَنِ الطريقِ الموصلة) (ضَلاَل)، بریتیە لە دوورکەوتنەوە لە ڕێیەك کە ئینسان بە ئامانج دەگەیەنێ، بەڵام لێرەدا، یانی: (إِنَّكَ مستَمِرٌ في التَّلَبُّسِ بِتَطَلُّبُ شَيء مِن غَيرِ طريقِهِ الصَّحِيحِ، ووَصفُهُ بالقَدِيمِ، لطُولِ مُدَّتِهِ)، لێرەدا کە دەڵێن: ﴿إِنَّكَ لَفِى ضَلَـٰلِكَ ٱلْقَدِيمِ ﴾، واتە: تۆ بەردەوامی لەسەر ئەوەی تۆ چاوەڕوانیی شتێك دەکەی‌و شتێك داوا دەکەی، بەڵام لە ڕێیەکی نادروستەوە، بۆیەش دەڵێن: تۆ لە بە هەڵەداچوونێکی لە مێژینەدای، چونکە ماوەیەکی زۆرە، لەوەتی یوسوف ﷺ لێی دوورکەوتۆتەوەو گوتوویانە: گورگ خواردوویەتی، یەعقووب ﷺ هەر گوتوویەتی: یوسوف ماوە، دەیبینمەوەو پێی شاد دەبمەوە، بە دوای دا بگەڕێن، کە هەندێك گوتوویانە: ئەو ماوەیەی لێك دابڕانە بیست‌و دوو (٢٢) ساڵ بووەو، هەندێکی گوتوویانە: سی‌و پێنج (٣٥) ساڵ بووەو، هەندێکی کە گوتوویانە: چل (٤٠) ساڵ بووەو، هەندێکی دیکە گوتوویانە: هەشتا (٨٠) ساڵ بووە.

**مەسەلەی پێنجەم:** هاتنی مزگێنیدەرو، کراسی یوسوف هەڵدانە سەر ڕووی یەعقووب‌و، چاکبوونەوەی چاوەکانی‌و، گوتنی: ئەدی نەمگوت: لە خواوە شتێك دەزانم ئێوە نایزانن ؟

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلْبَشِيرُ أَلْقَىٰهُ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ فَٱرْتَدَّ بَصِيرًا ۖ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە لە دوو بڕگەدا

١) - ﴿ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلْبَشِيرُ أَلْقَىٰهُ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ فَٱرْتَدَّ بَصِيرًا ﴾، كاتێك موژدەدەر هات.

( ٱلْبَشِيرُ )، كەسێك كە موژدە دێنێ، بە كوردیی دەڵێین: موژدەهێنەر، موژدەپێدەر، ﴿ أَلْقَىٰهُ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ ﴾، فڕێیدایە سەر دەمو چاوی (یەعقووب)، هاویشتیە سەر دەمو چاوی، چی هاویشتە سەر دەموچاوی؟ بە سیاق دەزانرێ مەبەست پێی كراسەكەیە، یانی: (أَلقَى قَمِيصَ يوسفَ عَلَى وَجهِ يَعقُوب)، كراسەكەی یوسوفی هەڵدایە سەر دەمو چاوی یەعقووب، ﴿ فَٱرْتَدَّ بَصِيرًا ﴾، یەكسەر گەڕایەوە بۆ حاڵەتی بینین، بۆوە بە بینەر.

﴿ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلْبَشِيرُ ﴾، وشەی (أن)، بۆ تەئكیدی ئەوە زیاد كراوە، كە ئەو حالەتە، كە بە كراس هەڵدانە سەر ڕووی یەعقووب، چاوی چاك ببنەوە، ئەوە كەرامەتێكە بۆ یەعقووب پەیدا بووە، لە نێوان یەعقووبو یوسوف: بابو كوڕدا پەیدا بووە، ئەگەرنا شتێكی یاسادڕەو پێچەوانەی عادەتە: بە كراس هەڵدرانە سەردەمو چاو، چاوی كوێر چاك بێتەوە.

ئنجا ئایا ئەو موژدەدەرە، كامەیان بووە؟ هەندێك گوتوویانە: (رەئوبین) بووە، كوڕە گەورەكەی یەعقووب، هەندێك گوتوویانە: (شەمعوون)بووەو، هەندێك گوتوویانە: (یهوذا) بووە، چونكە دەڵێن: (یهوذا) ئەو كەسە بووە كە كراسە خوێناوییەكەی بۆ یەعقووب بردۆتەوە، ئنجا گوتوویەتی: كاتی خۆی هەواڵێكی ناخۆشم بۆ بابم بردەوەو، گوتم: یوسوف گورگ خواردوویەتی، كراسە خوێناوییەكەیم بۆ بردەوە، با ئێستاش هەر من كراسەكەی یوسوفی بۆ بەرمو موژدەی خۆشی پێ بدەم، بە هەر حاڵ گرنگ ئەوەیە موژدە دەر بە تەئكید هەر یەكێك بووە لە كوڕەكانو قبوولیان نەكردوە ئەو موژدە خۆشە، جگە لە خۆیان هیچكەس بۆ بابیانی بباتەوە.

٢) - ﴿قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، (یەعقووب) گوتی: ئەدی پێم نەگوتن: ئەوەی من لە خواوە دەیزانم ئێوە نایزانن!

لێرەدا ئەوەی بیرخستوونەوە کە کاتی خۆی پێی گوتن، وەك لە ئایەتی (٨٦)دا، هاتووە: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، واتە: گوتی من خەم و پەژارەی خۆم هەر بۆ لای خوا ڕادەگەیەنم و، ئەوەی من لە خواوە دەیزانم، ئێوە نایزانن.

لێرەدا بابیان ئەوەیان دەخاتەوە بیر کە کاتی خۆی پێی گوتوون.

**مەسەلەی شەشەم:** داواکردنی کوڕەکانی لە بابیان کە داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکات و بەڵێن پێدانی ویش:

وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّيٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا

١) - ﴿قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ﴾، گوتیان: ئەی بابی خۆمان! داوای لێبوردن بۆ گوناهەکانمان (لە خوا) بکە.

٢) - ﴿إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ﴾، بێگومان ئێمە خەتاکارو تاوانبار بووین.

ئەمەیان دان پێداهێنانیانە بە گوناهەکانیان، کەواتە: هەر دان بە گوناهی خۆداهێنان و خۆ بەخەتابارزانین، خۆی تۆبەیە، بەڵام داوا لە بابیشیان دەکەن کە داوای لێبوردنیان بۆ لە خوای لێبوردە بکات، چونکە بەوە کە دانیان بە هەڵەو تاوانی خۆیاندا هێناوە، لە نێوان خۆیان و خوادا، پاك دەبنەوە، مادام

لێی پەشێمان بن و، بڕیاربدەن نەگەڕێنەوە سەری، بەڵام هەقی بابیان هەر لەسەر دەمێنێ، بۆیە داواشیان لە بابیان کردوە کە داوای لێبوردنیشان بۆ لە خوا بکات، واتە: خۆشی بیانبەخشێ و داوای لێبوردنیشیان بۆ لە خوا بکات .

٣) - ﴿ قَالَ سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ ﴾، گوتی: بێگومان لەمەو دوا، یاخود (سَوۡفَ)، بۆ تەئکیدە، بێگومان داوای لێبوردنتان بۆ لە پەروەردگارم دەکەم، واتە: بۆ گوناهەکانتان .

٤) - ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾، کە بێگومان ئەو زۆر لێبوردەی میهرەبانی بە بەزەییە، ئنجا ئایا بۆچی گوتوویەتی: ﴿ سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ ﴾، هەندێك لە توێژەرەوان هەر لەخۆوە هەندێ قسە دەکەن، کە لە ڕاستییدا جێی نیە !

بۆ وێنە دەڵێن: تەماشا بکەن! گەنج بەخشندەترە لە پیاوی بە تەمەن، یوسوف یەکسەر گوتی : ﴿ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ٩٢ ﴾ بەڵام بابیان دەڵێ : ﴿ سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ ﴾!! بەڵام هیچ پێویست بەوە ناکات، بەڵکو ئەو دوو قسەیە هەر یەك واتایان هەیە، ئەوەی یوسوفیش دوعا بووە، یاخود لە خواوە هەواڵی پێداون، وەك باسمان کردو، ئەوەی یەعقووب ﷺیش دەزانێ کە هەقی باب و دایك زۆرە لەسەر منداڵ، کوڕو کچ، ئەوانەش زۆر دڵی بابیان هێشاندوەو ماوەی چەندان ساڵ، بابیان لەو ئازارو میحنەت و ناڕەحەتییەدا بووە، ویستوویەتی بەتەئکید کردنەوە لە خوای میهرەبان بپاڕێتەوە، کە لەو هەموو گوناهو تاوانەو، لەو هەموو هەق و مافەی بابیان کە خواردوویانە، خوا لێیان خۆش بێ .

هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: کاتی پاڕانەوەکەی دواخستوە بۆ کاتی سەحەر، واتە: پێش بەرەبەیان .

هەندێکیش گوتوویانە: بۆ ئەوە بووە: ئاگاداربنەوە کە ئەوانە تاوانێکی گەورەیان کردوە دەرهەق بە بابیان و، وا نەزانن هەروا شتێکی سادەیەو یەکسەر بە دوعایەکی سادە گوناهەکەیان لە کۆڵ دەکەوێ !

کۆتایی ئەم دەرسەش بەو فەرمایشتەی پێغەمبەر دێنین ﷺ کە دەفەرمویٰ: {مَنْ كَانَتْ عِنْدَهُ مَظْلَمَةٌ لأَخِيهِ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ مَالِهِ، فَلْيُؤَدِّهَا إِلَيْهِ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ، لاَ يُقْبَلُ فِيهِ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ، إِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ وَأُعْطِيَ صَاحِبُهُ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ، أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ، فَحُمِلَتْ عَلَيْهِ} {أخرجه البخاري برقم: (٢٦٤٩)} .

پێغەمبەری ﷺ فەرمووییەتی: هەر کەسێك ستەمی برایەکی لایە، (واتە: ستەمی لە برایەکی کردوە،) لە کەسایەتییدا، یان لە سامانی دا، (واتە: حەقێکی مەعنەویی لەلایە، یان حەقێکی ماددیی) با ئەمڕۆ گەردنی خۆی پێ ئازاد بکاو، خۆی دەرباز بکات لەو مافەی، پێش ئەوەی ڕۆژێك بێتە پێش، نە دینار هەبێ‌و نە درەم، (واتە: نە زێڕو نە زیو هیچیان نەبن)، ئەگەر کردەوەی باشی هەبێ، لە کردەوە باشەکانی بە ئەندازەی ستەمەکەی کە کردوویەتی لە برایەکەی، هەڵدەگیرێ‌و دەدرێ بەو، ئەگەر چاکەشی نەبن، لە خراپەی برایەکەی (کە هەقی لە لایەتی) وەردەگیرێ‌و دەخرێتە سەر شانی وی)، {پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە بێ، با ئێستا مرۆڤ خۆی لە هەق‌و مافی ئەو خەڵکانە، کە هەقیان لەسەریەتی دەرباز بکاو، گەردنی خۆییان پێ ئازاد بکات} .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چواردەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئـەم دەرسـەمـان لـە سێ (٣) ئـایـەت پێکدێ، ئـایـەتـەکـانی: (٩٩،١٠٠،١٠١)و، ئـاڵقـەی سـێزدەیـەمو کۆتـایی لـە زنجیرەی بـەسـەرهـاتی یوسوفو برایـەکـانی گرتۆتـە خـۆی، کـە بـۆ جاری چوارەمو کـۆتـایی بـاسی چوونی برایـەکـانی یوسـوف ﷺ بـۆ میسـرو، هـاورێ لـەگـەڵ بـابو دایکیو سـەرجـەم مـاڵو خێزانو کـەسوکاریـان، دەکـات، کـە یوسـوف بـابو دایکی بـەرزکـردۆتـەوە بـۆ سـەر تـەخـتو بـارەگـایـەکـەی خـۆی، ئـەو شـوێنـەی کـە لـەسـەری دانیشـتـووەو شـوێنـێکی بـەرز بـووە .

ئنجا دوایی بـابو دایکیو یـازدە برایـەکـەی، کـڕنووشی ڕێـزگـرتنیـان بـۆ یوسـوف بـردووەو، یوسـوف گـوتـوویـەتی: ئـەی بـابـە گیـان! ئـەمـە تـەعبیـرو سـەرەنجـامی خـەونـەکـەی پێشـوومـە، پەروەردگـارم هێنـایـە دیو چـەسـپـاندی .

پاشـان یوسـوف ﷺ یـادی چـاکـەکـانی خـوا لـەسـەر خـۆیو بـابو دایکیو برایـەکـانی دەکـاتـەوە، ئـامـاژەش بـە بـەین تێکچوونی خـۆیو برایـەکـانی دەکـات، بـەهـۆی خـوتخـوتـەی شـەیتـانـەوە .

لـە کـۆتـایی دا یوسـوف ﷺ لـە پەروەردگـاری دەپـاڕێتـەوەو، چـاکـەو نیعمـەتـەکـانی یـاد دەکـاتـەوە، بـەتـایبـەتی ئـەوە کـە کـردوویـەتی بـە حوکمـڕان، بـەشـێك لـە حوکمـڕانی پێـداوە لـە میسـرداو، فێـری تـەعبیـری خـەونـانی کـردووەو، لێـی دەپـاڕێتـەوە کـە بـە مسوڵمـانیی بیمـرێنـێو بیخـاتـە ڕیزی صـاڵحـانـەوە .

﴿ فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ٱدْخُلُوا۟ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّوا۟ لَهُۥ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّى حَقًّا ۖ وَقَدْ أَحْسَنَ بِىٓ إِذْ أَخْرَجَنِى مِنَ ٱلسِّجْنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلْبَدْوِ مِنۢ بَعْدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيْطَٰنُ بَيْنِى وَبَيْنَ إِخْوَتِىٓ ۚ إِنَّ رَبِّى لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِى مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِى مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِىِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ﴾.

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەكان

{ئنجا كە لە شوێنی تایبەتی یوسوف وەژووركەوتن، یوسوف بابو دایكی لە باوەش گرتنو گوتی: ئەگەر خوا بیەوێ بە دڵنیاییو ئاسوودەیی وەرنە میسڕەوە (٩٩) ئنجا بابو دایكی بردنە سەر تەختەكەی خۆیو، هەموویان بۆی بە كرنووشی ڕێزگرتندا كەوتنو، گوتی: ئەی بابە گیان! ئەمە تەعبیرو ئاكامی خەونەكەی پێشوومە، پەروەردگارم هێنایە دیو چەسپاندی، خواش چاكەو میهرەبانیی لەگەڵدا كردم، كە منی لە بەندیخانە دەرهێناو، ئێوەشی لە بیابانەوە هێنا بۆ شار، دوای ئەوەی شەیتان بە دنەدانو خوتخوتەكەی، بەینی منو برایەكانمی تێكدا، بە دڵنیایی پەروەردگارم بۆ هەر چییەك بیەوێ بیهێنێتە دی، پەنهانكارە، مسۆگەر هەر ئەو زانای كاربەجێیە (١٠٠) پەروەردگارم! بەشێك لە حوكمڕانییو دەستەڵاتت پێداوەو، لە تەعبیری خەونان شارەزات كردووم، بەدیهێنەری ئاسمانەكانو زەوی! هەر تۆ دۆستو پشتیوانمی لە دنیاو دواڕۆژدا، هەر كات مراندتم بە ملكەچیی تەواو بۆ خۆت، بممرێنەو، بە كاروانی چاكانم بگەیەنە (١٠١)} .

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ ): واتە: بابو دایكی لە خۆی وە نیزیك خستن، لە باوەش گرتن، بردنیە تەنیشت خۆی، هەر سێ واتایەكان دەگەیەنێ، (أَوَى، يَأْوِي، أُوِيّاً، وإِيواءً)، واتە: پەنایدا، لە خۆی وە نیزیك خست، لە باوەشی گرت، ئەگەر بگوترێ: (آوَى غيرَهُ إِيواءً، أي: أَنْزَلَهُ عنده)، واتە: بەرانبەرەكەی، یان یەكێكی دیكەی پەناداو لە خۆی وە نیزیك خست، بەلاّم ئەگەر بگوترێ: (آوَى فُلانٌ أَخاهُ، أَو أَباهُ، أو فُلانٌ فُلاناً)، یانی: فلاّنكەس برایەكەی، یان بابی، یان دایكی، یان فلاّن كەسی لە خۆی وە نیزیك خست، یان لە باوەشی گرت، یان لە تەنیشت خۆی داینا.

( ءَامِنِينَ ): واتە: بە دڵنیایی، (الأَمْنُ: طُمْأَنِينَةُ النَّفْسِ وزَوَالُ الخوفِ)، (أَمْنُ)، بریتیە لە دڵ ئارامیی‌و، لاچوونی ترس‌و دڵە ڕاوكە.

( ٱلۡعَرۡشِ ): (العَرْشُ: شَيٌ مَسْقَّفٌ، وَسُمِّي مَجلِسُ السُّلْطانِ عَرْشاً، اعتباراً بعلُوِّهِ، وُكُنِّي بِهِ عَنِ العِزِّ والسُّلْطان)، وشەی (عرش) لە بنچینەدا هەر شتێكە كە سەربانێكی هەبێ، ئەو شوێنەی كە حوكمڕان لێی دادەنیشێ، ناوی لێنراوە (عَرْش)، بەو ئیعتیبارەی كە بەرزترە لە ئاستی ئەوانەی دادەنیشن لەسەر كورسییەك، یان لەسەر تەختەیەك، وشەی (عَرْش) بە كینایە بەكارهێنراوە بۆ بالاّدەستیی‌و حوكمڕانیی .

( وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗا ): واتە: بۆی بە سەجدەدا كەوتن، بۆی بە كڕنووشدا كەوتن، (خَرَّ: سَقَطَ سُقُوطاً يُسْمَعُ مِنْهُ خَرِيرٌ، وَالخَرِيرُ: هُوَ صَوْتُ الماءِ وَالريحِ، وَغَيْرِ ذَلِكَ)، (خَرَّ) كەوتنێك كەوت، دەنگێكی وەك خوڕەی ئاوو دەنگی (با)ی، لێهات، یانی: بە خێرایی كەوتنە سەر زەوی، (سُجَّدٗا) كڕنووش بردن، (خَرِير) بە دەنگی (با)و خوڕەی (ئاو)و هاو وێنەیان دەگوترێ .

( تَأْوِيلُ رُءْيَـٰىَ ): (التَّأْوِيلُ: الرُّجُوعُ إِلَى الأَصْلِ)، (تأويل): گەڕانەوەیە بۆ بنچینە، بنەڕەت، (الموئِل: الموضع الَّذِي يُرْجَعُ إِلَيْهِ)، (موئِل) واتە: ئەو شوێنەی كە خەڵكی بۆ لا دەگەڕێتەوە، (وَذَلِكَ هُوَ رَدُّ الشيء إِلَى الغَايَة المُرَادَة مِنْهُ، عِلْماً كَانَ أَوْ فِعْلاً)، دەڵێ : (تأويل)، بریتییە لە گەڕانەوەی شتێك بۆ ئەو مەبەستەی كە بۆی ویستراوە، جا چ لە ڕووی زانیارییەوە بێ، چ لە ڕووی كردەوەوە بێ، لە ڕووی زانیارییەوە: قسەیەك دەكرێ، واتایەكەی ڕوون نیە، دوایی دەگێڕدرێتەوە بۆ ئەو مەبەستەی كە لەو قسەیەدا لەبەر چاو گیراوە، بۆیە دەگونجێ ﴿تَأْوِيلُ﴾ بە سەرەنجامو ئاكام لێك بدرێتەوە.

( حَقًّا ): (أَصْلُ الحَقِّ المُطَابَقة والموافقة، وَالحَقُّ: الشَيءُ الثَّابِتُ المُتَحَقِّق)، (حَق) بە مانای ئەوە دێ: شتێك لەگەڵ شتێكدا جووت بێ‌و، بە پێی ئەو بێ، هەروەها هەق بە شتێكی چەسپاوی هاتووەدی، دەگوترێ .

( ٱلْبَدْوِ ): (الحَضَرُ خِلَافُ البَدْوِ)، (حَضَر)، واتە: نیشتەجێ بوو، (بَدو)، واتە: كۆچەریی‌و بیابانیشین، (البَادِي: المُقِيمُ في البادية)، لە قورئانیش دا هاتوە، خوا دەفەرمووێ: ﴿سَوَآءً ٱلْعَـٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِ﴾[1]، واتە: ئەوەی كە نیشتەجێیە (لە حەرەمی بەیتدا)، ئەوەش كە لە دەرەوە دێ، هەموویان تێیدا یەكسانن، (باد)، واتە: كەسێك كە نیشتەجێیە لە بیابان (بادية)، دەڵێ: (بادية)یش، بۆیە پێی گوتراوە: (بادية)، لەبەر ئەوەی ئەو خەڵكەی كە لەوێیە، ئاشكراو دیارن، دیوارو خانوو نایان شارێتەوە.

(نَّزَغَ ): (النَّزْغُ: دُخولٌ فِي أَمْرٍ لإِفْسَادِهِ)، (نَزْغ) بریتیە لەوەی شتێك بچێتە نێو شتێك بۆ تێكدانی، هەر بۆیەش بە نەقیزە كە لە ئاژەڵ دەدرێ، بۆ ئەوەی بڕوا، پێی دەڵێن: (نَزغ)، یان (نَخْس)، هەردووكیانی پێ دەگوترێ، وەسوەسەی شەیتانیش وەك تێوە ژەنینێك‌و دنەدانێكە، بۆ مرۆڤ بەرەو خراپە .

---

١) سورة الحج، الآية : ٢٥.

# مانای گشتی ئایەتەکان

زۆر جاران گوتوومانە: خوای زاناو شارەزا لە گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەو، بەسەرهاتەکانی دیکەشدا، ئەوەی کە بە سیاق‌و سەلیقەو عەقڵ دەزانرێ، باسی ناکات، بەڵکو دەیپێچێتەوە دەیقرتێنێ، لێرەش کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾، دوای ئەوەی کە لە یوسوف وەژوور کەوتن، واتە: پاش ئەوەی: باب‌و دایك‌و برایەکانی‌و ماڵ‌و خێزان‌و کەسوکاریان، لە کەنعانەوە، لەسەر زەمینی شامەوە، خۆیان پێچایەوەو بەڕێکەوتن‌و ڕێیان بڕی، بەرەو میسڕ هاتن‌و لە دەروازەکانی میسڕ ئەو دیوو بوون‌و، چوونە نێو شار، قۆناغ بە قۆناغ: ﴿ فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾، ئنجا دوای ئەوەی لە یوسوف وە ژوور کەوتن، واتە: چوونە ئەو شوێنەی کە یوسوف تێیدا دادەنیشت، بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی خۆی، کە ئەو کاتە یوسوف عەزیزی میسڕ بووەو سەرپەرشتیی کاروباری ئابووریی‌و ئازووخەی کردوە لە میسڕو، پێگەو دەسەڵاتێکی زۆری بووە، شوێنێکی بووە کە وەك شوێنی حوکمڕانیی تێیدا دانیشتوە، هاتنە ئەو شوێنە، ﴿ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ ﴾، یوسوف باب‌و دایکی لە خۆی وەنیزیك خستن، یاخود لە تەنیشت خۆی داینان، یاخود لە باوەشی گرتن، هەموو مانایەکانی هەن‌و، هەموویان دەگرێتەوە، واتە: لە خۆی وەنیزیکی خستن، یان لە تەنیشت خۆی داینان، لەملاولای خۆی، ﴿ وَقَالَ ٱدْخُلُوا۟ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴾، ئنجا پێی گوتن : وەرنە میسڕەوە، ئەگەر خوا بیەوێ، بە دڵنیایی بەبێ ئەوەی کە ترس‌و بیمتان لەسەر بێ، واتە: بۆ خۆتان دەربازتان بوو لە ژیانی سەخت‌و کولەمەرگیی بیابانتشین، ﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى

﴿ٱلۡعَرۡشِ﴾، باب‌و دایكی بەرزكردنەوە بۆ سەر تەختەكە، ئەو تەختەی كە خۆی لەسەری دادەنیشت، كە دیارە لە ئاستی مەجلیسەكە بەرزتر بووە، بۆیە پێی گوتراوە: (ٱلۡعَرۡشِ)، ئەگەرنا كورسییەك نەبووە، چونكە كورسییەك كە جێی نەفەرێكە، جێی سێ نەفەری لەسەر نابێتەوە، ئنجا ئەو تەخت (عرش)ەش، دیارە شوێنێكی فراوان بووە، باب‌و دایكی بەرزكردنەوە بۆ سەر ئەوێ‌و لە تەنیشت خۆی دانان، ﴿وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا﴾، ئنجا هەموویان بۆی بە كڕنووشدا كەوتن، (خَرُّوا)، واتە: (سَقَطُوا) كەوتن، (سُجَّدًا)، كۆی (ساجِد)ە، واتە: هەموویان بۆی بە كڕنووشدا كەوتن، هەموویان كێ ؟ باب‌و دایكی‌و هەر یازدە برایەكەی .

ئنجا یوسف قسەی دڵی خۆی دەكات: ﴿وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ﴾، (یوسوف)یش گوتی: ئەی بابە گیان! ئەمە سەرەنجامی خەونەكەی پێشوومە، ﴿قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا﴾، بێگومان پەروەردگارم، بەڕاستی گێڕاو چەسپاندی، وەك لە سەرەتای سووڕەتی یوسوفەوە باسمان كرد، كە یوسوف خەونی بینیبوو: ﴿إِذۡ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبًا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ ٤﴾یوسف، واتە: كاتێك یوسوف بە بابی گوت: ئەی بابە گیان! من یازدە ئەستێرەو خۆرو مانگم بینین، كە كڕنووشیان بۆ من برد بوو .

ئنجا ئەمە هاتنە دی ئەو خەونەیەتی، كە كاتی خۆی پێش باڵغ بوون بە منداڵیی ئەو خەونەی بینیبوو، ئێستا دوای ئەو تەمەنە، خەونەكەی هاتە دی، ئەوەتا هەر یازدە برایەكەی‌و باب‌و دایكی كڕنووشی، ڕێز گرتنی بۆ دەبەن، كە وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا باسی دەكەین، وشەی (سَجْدَة) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای ملكەچیی، دێ‌و، بە مانای ڕێزلێنان لە بەرانبەر، دێ، هەروەك چۆن بە مانای نێوچەوان‌و تەوێڵ خستنە سەر زەوی، دێ، كە ئەوە بێجگە لە خوا ﷻ بۆ كەسی دیكە دروست نیە، هەروەها بە مانای چەمینەوەش دێ‌و، بە مانای ئاماژە كردنیش، دێ‌و، بە مانای سڵاو لێكردنیش، دێ، وەك دوایی

باسی دەکەین، کە بە تەئکید ئەوەی کە باب و دایك و یازدە برایەکە بۆ یوسوف کردوویانە، ڕێز لێگرتن بووە، سڵاو لێکردن و حورمەت لێنان بووە، ﴿وَقَدْ أَحْسَنَ بِيٓ إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجْنِ﴾، چاکەشی لەگەڵ کردم، واتە: پەروەردگارم چاکەی لەگەڵ کردم، لوتفی لەگەڵ کردم، کە کاتێك منی لە بەندیخانە دەرهێنا.

تەماشای ئەو جوامێرییەی یوسوف ﷺ، بکەن! باسی هێنرانە دەری لە بیرەکە ناکات، چونکە ئەوە برینی برایەکانی دەکولێنێتەوە، پێشتریش یوسوف گوتی: ﴿قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ﴾، ئەمڕۆ، واتە: لە مڕۆ بە دواوە گلەییتان لەسەر نیە، کە ئەو کاتەش هەر گلەیی لێنەکردن و سەرزەنشتی نەکردن، هەر شتێك بووە بە بیری هێنانەوە، ئایا لە بیرتانە ئەوەتان لەگەڵ یوسوف و برایەکەی دا کرد، کاتێك کە ئێوە نەزان بوون؟! ئنجا کە ئەو بەڵێنەی داوە، تازە ناچێ قسەی خۆی بشکێنێ، بۆیە باسی لە بیر هێنرانەدەری خۆی هەر ناکات، باسی ئەوە ناکات کە چۆن لە بیر هێنراوەتە دەر، کە ئەوە بەڵای گەورە بووە بەسەری هاتوە، بەڵکو دەڵێ: ﴿إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجْنِ﴾، کاتێك پەروەردگارم منی لە بەندیخانە هێنایەدەر، ﴿وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلْبَدْوِ﴾، ئێوەشی لە بیابانەوە هێنا، ﴿مِنۢ بَعْدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيْطَٰنُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِيٓ﴾، دوای ئەوەی کە شەیتان خوتخوتەی خراپی خستە نێوان من و برایەکانمەوە، خۆیشی پێش دەخات و، تاوانەکەش لە ملی شەیتان دەکات، وەك برایەکانی هیچ دەستیان تێیدا نەبوو بێ! بۆ ئەوەی بە هیچ جۆرێك ئەوە لە قسەکانی نەفامرێتەوە، کە لێرەدا گلەیی لە برایەکانی دەکات و سەرکۆنەیان دەکات، ﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُ﴾، بێگومان پەروەردگارم بۆ هەر شتێك کە بیەوێ، زۆر پەنهانکارە، زۆر بە پەنهانیی و بە لە باریی دەیکات، ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ﴾، بێگومان هەر ئەو زانای کارزانە.

تەماشا بکەن! چەند بە پەنهانکاریی و کارامەیی خوا ﷻ یوسوفی لە کوێوە هێنا بۆ کوێ؟!

ئنجا یوسوف لە كۆتایی دا، لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە، دەڵێ : ﴿ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِى مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِى مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ﴾، پەروەردگارم! لە موڵكو حوكمڕانیی پێت داوەو، لە تەعبیرو لێكدانەوەی خەونانت فێر كردووم .

ئەمانە دوو نیعمەتی هەرە گەورەی خوای پەروەردگار بوون بۆ یوسوف كە:

١ – كردوویەتی بە حوكمڕانو بەشێك لە حوكمڕانیی لە میسڕدا كەوتۆتە دەست یوسوف .

٢ – ئەویش لە ڕێی ئەوەوە بوو، كە خوا لێكدانەوەی خەونانی فێر كردبوو، چونكە زانستەكەی، ئەو زانستە تایبەتییەی كە خوا پێی دابوو، بوو بە هۆكاری ئەوەی ئەو موڵكو حوكمڕانییەشی دەست بكەوێ، بۆیە دەڵێ: ﴿ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بەدیهێنەرو پەیداكەری ئاسمانەكانو زەوی، ﴿ أَنتَ وَلِىِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ﴾، هەر تۆ سەرپەرشتیارو مشوورخۆرو دۆستو یاوەری منی ، لە دنیاو لە دوارۆژدا، ﴿ تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، بە ملكەچیی بممرێنەو، بمخە ڕیزی صاڵحانەوە، واتە: كاتێك كە دەممرێنی با وا بمرم بە تەواویی ملكەچبم بۆ تۆ، ئنجا كە مراندیشتم، بمخە ڕیزی ئەو مرۆڤە صاڵحو چاكانەوە، كە لە تەرازووی تۆدا بە شایستەو چاك لە قەڵەم دراون .

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** چوونی باب‌و دایك‌و برایەکانی یوسوف‌و سەرجەم خاوو خێزانیان، بۆ میسرٍ بۆ لای یوسوف، ئنجا لە خۆوە نیزیك خستن‌و لە باوەش گرتنی یوسوف بۆ باب‌و دایكی‌و فەرمووو لێکردنیان بۆ نیشتەجێ بوون بە ئاسوودەیی لە میسڕدا :

وەك خوا فەرموویەتی : ﴿ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ وَقَالَ ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ٩٩ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە چوار بڕگەدا

١) - ﴿ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾، واتە: دوای ئەوەی لە یوسوف وەژوور کەوتن، واتە: لەو شوێنەی کە تێیدا نیشتەجێ بووو لەوێوە حوکمڕانیی دەکرد، واتە: لە شوێنی تایبەتیی یوسوف وە ژوور کەوتن.

٢) - ﴿ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ ﴾، باب‌و دایکی لە خۆی وەنیزیك خستن‌و بردنیە تەنیشت خۆی‌و لە باوەشی گرتن .

مەبەست لە باب‌و دایکی : بابی ئەوە دیارە یەعقووب ﷺە، دایکیشی وەك پێشتر باسمان کرد، لە پەیمانی کۆندا بە (راحیل) ناوی هاتوە، کچی (لابان)، لابانیش خاڵی یەعقووب بووەو، یەعقووب کچی خاڵی خۆی هێناوە .

هەندێکیش گوتوویانە: (راحیل)، کە دایکی یوسوفە، لەسەر بنیامین وەفاتی کردوە (جاری وایە ئافرەت لەسەر منداڵ دەمرێ) دوایی یەعقووب (لەیئە)ش دێنێ، کە هەر خوشکی (راحیل) بووەو ئەو کاتەش دوو خوشك دروست بووە لە لای پیاوێك ببن، ئەویش هەر هاوسەری یەعقووب ﷺ بووە، کەواتە: ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿أَبَوَيۡهِ﴾، ئەوە یەعقووبو لەیئەن، کە دەکاتە پووری یوسوفو بنیامین، واتە: خوشکی دایکیان، (خالة)ی، یوسوفو بنیامین، لە پەیمانی کۆندا ئاوا دەڵێ، بەڵام لە ڕاستییدا هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوە نیە، بۆیە ئێمە هەر دەڵێین: ﴿أَبَوَيۡهِ﴾، دایكو بابی، ئیدی هیچ پێویست ناکات تەئویلی بکەین، بینا لەسەر قسەی پەیمانی کۆن ، کە جێی متمانە نیە، نەگۆڕدرا بێ .

٣) - ﴿وَقَالَ ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ﴾، (یوسوف) گوتی: وەرنە میسڕەوە، ئەگەر خوا بیەوێ، هەڵبەتە خوا ویستوویەتیو تازە هاتوونە میسڕەوە، بۆیە زانایان گوتوویانە: یانی: خوا ویستوویەتیو بە ویستی خوا، هاتوون، هەندێکیش گوتوویانە: ئەوە بۆ بەپێزکردن (تبرُّك)ە .

٤) - ﴿ءَامِنِينَ﴾، بە دڵنیاییو با ئەوەی ترستان لەسەر بێ.

(الأمنُ: حَالة اطمِئنانِ النَّفسِ وَراحَةِ البالِ، وَانتِفاءِ الخوفِ مِن كُلِّ ما يُخافُ منهُ)، (أمن) بریتیە لە حاڵەتێکی ئارامیی بۆ دەروونی مرۆڤ و، دڵ ئاسوودەییەكو، لاچوونی ترس لە هەموو ئەو شتانەی کە جێگای مەترسیین، یانی: نە لە قاتو قڕیو برسیەتیی، کە لە ژیانی بیابانشینیی دا تووشتان بووەو، نە لە هیچ دوژمنێك بترسێن، چونکە ئێستا یوسوف کە کوڕی ئەو بابو دایکەیەو، برای ئەو برایانەیە، خاوەن پێگەو دەسەڵاتە لە میسڕدا، بۆیە هیچ مەترسییەکتان لەسەر نیە، وەرن نیشتەجێ بن .

**مەسەلەی دووەم :** بەرزکردنەوەی یوسوف عليه السلام بۆ باب و دایکی بۆ سەر تەختەکەی خۆی و، بە کڕنووشدا کەوتنی باب و دایکی و، یازدە برایەکەی بۆی و، یاد کردنەوەی یوسوف بۆ چاکەکانی پەروەردگاری: وەك هاتنە دی خەونەکەی و، ڕزگار بوونی لە زیندان و، هێنانی کەسوکاری لە بیابانەوە بۆ شارو، چاکبوونەوەی لەگەڵ برایەکانیدا :

وەك خوای بەخشەر فەرموویەتی : ﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّى حَقًّا ۖ وَقَدْ أَحْسَنَ بِىٓ إِذْ أَخْرَجَنِى مِنَ ٱلسِّجْنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلْبَدْوِ مِنۢ بَعْدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيْطَٰنُ بَيْنِى وَبَيْنَ إِخْوَتِىٓ ۚ إِنَّ رَبِّى لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ﴾ .

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە دە بڕگەدا**

١) – ﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴾، ئنجا باب و دایکی بەرزکردنەوە بۆ سەر تەختەکەی.

(العَرشُ: سَرِيرٌ للقُعُودِ فيكون مُرتَفِعاً على سوق، وَفيهِ سعة تُمَكِّنُ الجالِسَ مِنَ الإتِكاءِ، أي: أجلَسَهما مَعَهُ على سَرِيرِ المُلك تَكريماً لَهُما) .

(عرش) بریتیە لە تەختێك كە حوكمڕان لەسەری دانیشتووەو بەرزتر بووەو لەسەر چەند پێیەك، بووە، لەسەر چەند گۆشەیەك وەستاوەو فراوانیش بووە، شوێنی ئەوەی تێدا هەبووە كە ئینسان پاڵی لێبداتەوە، (یان چەند كەسێك لە تەنیشت خۆی دابنێ)، واتە: لەسەر تەختەكەی خۆی دایان لە تەنیشت خۆی، وەك ڕێز لێگرتنیان ، كە مەبەست لە باب و دایكی – وەك پێشتر گوتمان – یەعقووب و ڕاحیلـن، هەندێكیش گوتویانە:

لەیئەیە کە دەکاتە پلك (خالة)ی، واتە: خوشکی دایکی یوسوف، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە کە هەر دایکی خۆی بووە .

٢) - ﴿وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا﴾، ئنجا بۆی بە کڕنووشدا کەوتن .

(الخُرور: الـهُويُّ والسقوط مِن عُلوٍّ إلى الأرضِ)، (خرور)، بریتیە لە کەوتنو لەپەوڕو کەوتن لە بەرزییەوە بۆ نزمیی، یانی: بۆی بە کڕنووشدا کەوتن .

﴿سُجَّدًا﴾، یان (حال)ە، لەبەر ئەوەی (خرور) واتە: کەوتنە سەر زەوی، چەند حاڵەتێکی هەنو، ئەمەیان بە شێوەی چوونە کرنووشە، یاخود ﴿سُجَّدًا﴾، (حال) نیە، بەڵکو کۆی (ساجِدْ)ە، (، أي: ساجِدِينَ)، یانی: هەموویان کەوتنە سەر زەویو لەپەو ڕوو بۆی بە کڕنووشدا کەوتن، دیارە کڕنووش بردووەکان یەعقووبو ڕاحیلو یازدە کوڕەکانیان بوون، کە پێشتر ناوەکانیانمان هێنان .

٣) - ﴿وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ﴾، یوسوف گوتی: ئەی بابە گیان! ئەمە سەرەنجامی خەونەکەمە، خەونە پێشووەکەمە، کە کاتی خۆی بینیبووم، کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، لە ئایەتی ژمارە (٤)دا : ﴿إِذۡ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ ۝٤﴾، واتە: ئا ئەم کڕنووش بردنە سەرەنجامو هاتنەدی خەونەکەی پێشوومە، یاخود ئەم حاڵەتەی ئێستا کە ئێوە هاتوونو ڕێز لە من دەگرن، ئەم وەزعە، سەرەنجامی خەونەکەی پێشوومە .

ئنجا ئایا لە نێوان خەون بینینەکەیو هاتنەدی خەونەکەیدا، چەند ساڵ بووە؟ توێژەرەوان زۆریان قسە لێکردوە، کە پێم وایە هەمووی لە گۆترەیەو هەر دیاریشە شتێك کە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەی لەسەر نەبوو، قسەی جیا جیای تێدا دەبن :

١ - هەندێکیان گوتوویانە: (١٨) ساڵ بووە .

٢ - هەندێکیان گوتوویانە: (٢٠) ساڵ بووە .

٣ – هەندێکیان گوتوویانە: (٢٣) بووە .

٤ – هەندێکیان گوتوویانە: (٣٠) بووە .

٥ – هەندێکیان گوتوویانە: (٣٥) بووە .

٦ – هەندێکیان گوتوویانە: (٤٠) بووە.

٧ – هەتا (٨٠)ش ڕۆیشتوون، لە تەفسیرەکاندا، ئەو قسانە هەموویان هەن، بەڵام هیچیان بەڵگەی یەکلایی کەرەوەیان پێ نیە، بەڵام بە لای کەمەوە بیست سی (٢٠ ـ ٣٠) ساڵێك هەر بووە، چونکە: یوسوف چەند ساڵان لە ماڵی عەزیزی میسرِدا ماوەتەوە، بەر لەوەی باڵغ بێو گەورە بێو ژنەکەی عەزیز تەماعی تێبکاتو دەورو خولی هەڵبێ، پاشان ماوەیەکیش لە بەندیخانەدا ماوەتەوە، دوای بەندیخانەش ماوەیەك وەك بەرپرسی ئازووخە لە میسرِدا ماوەتەوە، تاکو برایەکانی چەندجاران چوون، ئەوە بە لای کەم: بیست سی (٢٠ ـ ٣٠) ساڵێکی پێچووە، بە تەقدیرو بە مەزندە، دەتوانین ئەوەندە هەر بڵێین .

٤) – ﴿قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا﴾، ئەوە خەونەکەم پەروەردگارم هێنایە دی.

(حَقًّا)، (أي: صِدْقاً مُطابِقاً لِلواقِعِ في الحس)، واتە: بەڕاستی داناو خەونەکەم، ڕێك هاتە دی، لەگەڵ واقیعێکی بەرهەست دا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لە خەونەکان هەیە کە هەقە، هەشە کە پووچەو بێ بنەمایەو نایەتە دی.

٥) – ﴿وَقَدْ أَحْسَنَ بِيٓ﴾، هەروەها پەروەردگارم چاکەی لەگەڵ مندا کرد .

(أَحْسَنَ بِيٓ)، (أي: أَحسَنَ إِلَيَّ)، لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ : (أَحْسَنَ بِيٓ)و (أي أَحسَنَ إِلَيَّ)، (مِن غَيْرِ تَضمينِ مَعنَى فِعلٍ آخِر)، کە دەگوترێ: (أي أَحسَنَ إِلَيَهِ)، ئەوە دیارە چاکەی لەگەڵدا کرد، (أَحْسَنَ بِهِ)، دیسان بە مانای

چاکەی لەگەڵدا کرد، ئەمجارە بەبێ ئەوەی کە مانای کردەوەیەکی دیکە خرابێتە نێو (أَحۡسَنَ)، بۆیە تەعەددای کردوە بە (ب)، لە جیاتی بە (إلـی)، تەعەددا بکات، جاری واش هەیە دەگونجێ بڵێین: (أَحۡسَنَ بِیٓ)، مانای (لَطَفَ)ی، خراوەتە نێو، (أي: أَحسَنَ إلَيَّ ولَطَفَ بي)، چونکە لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەك هەیە، کە جاری وایە (فِعل)ێك، کە بە پیتێك تەعەددا دەکات بۆ (مَفعولُ بِهِ) کە عادەت نیە، بەو پیتە تەعەددا بکات، ئەو کاتە: هەم مانای ئەسڵیی خۆی دەگەیەنێ، هەم مانایەکی دیکەش دەگەیەنێ، بە پێی ئەو پیتە کە تەعەددای پێ کردوە، ئێستا (أَحۡسَنَ)، یانی: چاکەی لەگەڵدا کردم، (أَحۡسَنَ بِیٓ)، واتە: چاکەی لەگەڵدا کردمو لوتفی لەگەڵدا نواندم .

٦) - ﴿إِذۡ أَخۡرَجَنِی مِنَ ٱلسِّجۡنِ﴾، کاتێك کە منی لە بەندیخانە دەرهێنا، وەك پێشتر باسمان کرد، نالێ: منی لە بیر دەرهێنا، چونکە ئەوە دەکاتە جۆرێك لە برین کولاندنەوەی برایەکانیو، شەرمەزار کردنەوەیانو، پاشان برین کولاندنەوەی بابو دایکیشی، کە چەند خەفەتیان خواردوە، لەو زوڵمو ستەمەی کە برایەکانیان لێیان کردوە، یەکسەر دەڵێ: خوا چاکەی لەگەڵ کردم، لوتفی لەگەڵ نواندم، کە منی لە بەندیخانە دەرهێنا، بە لای بیردا هەر ناچێ !!

٧) - ﴿وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ﴾، ئێوەش لە بیابانەوە هێنا .

(البَدو: ضِدُّ الحضَرِ، سُمِّيَ بَدواً، لأنَّ سُكانَهُ بادون، أي: ظاهِرون لِكُلِّ وارِدٍ)، (بَدوْ)، دژی (حَضَرْ)ە، (حَضَر)، واتە: شارنشین، (بَدوْ)، واتە: بیابانشین، یان دەشتو کۆسار نشین، لادێی، بۆیەش ناوی لێنراوە (بدو)، چونکە دانیشتووانی بیابان، بیابانشین، ئاشکران، خەڵك هەمووی دەیانبینێ، خانووو دیوارو پەنهانیان ناکات .

٨) - ﴿مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِی وَبَيۡنَ إِخۡوَتِیٓ﴾، دوای ئەوەی شەیتان خوتخوتەی خستە نێوان منو برایەکانم، واتە: نێوان منو برایەکانمی تێکدا،

(النَّزْغُ: مَجازٌ فِي إدْخالِ الفَسادِ فِي النَّفسِ شُبِّهَ بنَزْغِ الراكِبِ الدابةَ وَهُوَ نَخْسُها)، (نَزْع) خوازراوەتەوەو مانایەکی مەجازیی هەیە، بۆ ئەوە کە شتێکی خراپ بخرێتە نێو نەفسەوە، هەروەك چۆن باباى سوار لە وەڵاخەکەیەوە دەژەنێ، بۆ ئەوەی بڕوا، نەقیزەی تێوە دەژەنێ، یاخود قامچی لێدەدا، شەیتانیش کە خوتخوتە دەخاتە دڵی مرۆڤەوە، وەك ئەوە وایە دنەی بداو پاڵی پێوە بنێ‌و، لێی بخوڕێ بەرەو خراپە .

ئنجا لێرە یوسوف ﷺ هۆکاری ئەو دوژمنایەتیی‌و ناکۆکییە، کە دوژمنایەتیی‌و ناکۆکییەکی یەك سەرە بووەو، دوو سەرە نەبووە ! چونکە ئەو ڕقی لە برایەکانی نەبووەو ئەوان ڕقیان لەو بووە، ئەوان حەسوودییان بەو بردوە، ئەوان پیلانیان لە دژی ئەو گێڕاوە، بەڵام تەماشای ئەو هەموو جوامێرییەی یوسوف بکەن! جارێ پێشێ خۆی پێش دەخات ﴿مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓ﴾، وەك بڵێی: شەیتان پێشێ زەفەری بەو بردبێ، لە بەرانبەر برایەکانیدا، کە ناکۆکیی هەبێ لەگەڵیانداو، دژایەتییان بکات! کە ئەو هیچیشی نەکردوە لە دژی برایەکانی، ئنجا خەتایەکەش لە ملی برایەکانی دێنێتە دەرو دەیخاتە ملی شەیتانەوە، کە بە تەئکید هەر خراپەیەك مرۆڤ دەیکات، شەیتان پێی دەکا، بەڵام مرۆڤ خۆیشی پشك‌و بەشی تێیدا هەیە، ئنجا لێرەدا ئەهلی تەزکیەو تەسەووف قسەیەکی جوانیان هەیە دەڵێن: (ذِكر الجفاءِ فِي وَقتِ الصفاءِ جَفَاءٌ)، واتە: باسی جەفاو دووریی، لە کاتی ئاشتیی‌و صاف بوونەوەدا، بە جەفاو لێك دووریی لە قەڵەم دەدرێ، بۆیە یوسوف ﷺ بە لای هیچ وشەیەك دا نەچووە، کە مایەی نیگەرانیی برایەکانی‌و دڵ کولاندنەوەیان‌و شەرمەزار کردنەوەیان بێ .

٩) - ﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُ﴾، بێگومان پەروەردگارم، بۆ هەر شتێك کە بیەوێ، زۆر پەنهانکارە، زۆر بە پەنهانیی‌و لێزانیی‌و کارامەیی، دەیکات، بەبێ ئەوەی خەڵك هەر هەستی پێ بکات :

١ - خوای پەروەردگار ئەو کەسەیە کە یوسوف لە چاڵ‌و بیرەوە دێنێ‌و، لە بەندیخانەوە دەیهێنێ‌و، دەیکاتە حوکمڕان لە میسر .

٢ – پەروەردگار ئەو کەسەیە کە مووسا ﷺ لە ماڵی فیرعەوندا پەروەردە دەکات، دواییش تەختو تاجی فیرعەونیشی پێ لە بەین دەباتو، بەنی ئیسرائیلی پێ لە چنگاڵی زۆردارانەی فیرعەون دەرباز دەکات !!

(اللُّطْفُ: التَدْبیر الملائِمُ، وَهُوَ یَتَعدّى بِاللّام عَلَى تَقدیرِ: لَطِیفٌ لأَجلِ ما یَشاءُ اللُّطْفَ بِهِ، وَیَتَعدَّى بِالباءِ: لَطَفَ بِهِ)، (لُطْف) بریتیە لە نەخشەدانانێکی گونجاوو لە بار، وشەی (لَطَفَ)یش تەعەددا دەکات :

١/ بە لام (ل) : ﴿إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُ﴾، یانی: (لَطِیفُ لأَجلِ ما یَشاءُ اللُّطْفَ بِهِ)، خوا پەنهانکارە، بۆ کەسێك کە بیەوێ لوتفی لەگەڵدا بکات، میهرەبانیی لەگەڵ بنوێنێو هاوکاری بێو پشتیوانی بێ .

٢/ جاری واش هەیە بە باء (ب)، تەعەددا دەکات: (لَطَفَ بِهِ)، واتە: لەگەڵیدا میهرەبانو هاوکار بوو .

١٠ – ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ﴾، بێگومان هەر خوا زانای کارزانە، دەزانێ چۆن کارەکانی دەکاتو، کارزانە دەزانێ چۆن جێبەجێیان دەکات .

# کورتە باسێک لەبارەی چۆنیەتی سەجدەبردنی باب و دایکی یوسف و یازدە برایەکانی، بۆ یوسف

بەرێزان !

پێویست دەکات ئێمە ڕوونکردنەوەیەکی باش بدەین، لە بارەی ئەو ئایەتەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا﴾، باب و دایکی یوسف و یازدە برایەکەی بۆی بە کڕنووش دا کەوتن، کە ئایا ئەو کڕنووش بردنە چۆن بووە؟ لە چەند بڕگەیەکدا شی دەکەینەوە :

**١) -** مانای (سُجُود)، (سَجْدَة)، لە زمانی عەرەبیدا :

أ/ فەرهەنگەکانی زمان[1] دەڵێن: (سَجَدَ سُجُوداً: تَطامَنَ، وَكُلُّ شَيء ذلَّ، فَقَد سَجَدَ.. وَسَجَدَ البَعيرُ: خَفَضَ رَأسَهُ عِنْدَ الرُّكُوبِ، وسَجَدَ الرَّجُلُ: وَضَعَ جَبهَتَهُ عَلَى الأَرْضِ وَالسجُودُ لِلَّهِ فِي الشَّرْعِ: عِبارَةٌ عَن هَيئَة مَخصُوصة)، وشەی (سَجَدَ سُجُوداً)، واتە: خۆی بە کەمگرت، یاخود ملی نەوی کرد، هەر شتێك کە ملکەچ بێ، وشەی (سَجَدَ)ی بۆ بەکاردەهێنرێ، دەگوترێ: (سَجَدَ البَعير)، کاتێك کە حوشتر ملی خۆی نەوی دەکات بۆ ئەوەی بابایەك کە دەیەوێ سواری بێ و، بچێتە سەر پشتی، ئەگەر خۆی دانەنوێنێ و یەخ نەبێ، کەس ناتوانێ بچێتە سەر پشتی .

١) المصباحُ المنِير، ص١٤٠، ومختارُ الصحاح، ص٢٨٦، والمُعجَم الوَسِيط، ص٤١٦.

هەروەها دەگوترێ : (سَجَدَ الرَّجُلُ)، پیاوەکە سەجدەی برد، ئەگەر نێوچەوان و تەوێڵی خۆی بخاتە سەر زەوی و، سەجدە بردن بۆ خوا لە زاراوی شەرعدا بریتیە لە حاڵەتێکی دیاریکراو (ئەویش ئەوەیە کە ئینسان تەوێڵی خۆی، نێوچەوانی خۆی، بخاتە سەر زەوی و، هەردوو لەپە دەستی، لەگەڵ هەردوو ئەژنۆی و، هەردوو سینگی دوو پێی)، ئەوە لە فەرهەنگەکانی زماندا .

ب/ لە قورئاندا سێ نموونە دێنینەوە، بۆ مانای وشەی (السجدة) :

نموونەی یەکەم :

ئایەتەکانی: (٤٨ و ٤٩ و ٥٠) لە سوورەتی (النحل)دا، کە خوا دەفەرمووێ:

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلَالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مِن دَابَّةٍ وَالْمَلَائِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾.

واتە: ئایا ناڕوانن بۆ هەر شتێك خوا دروستی کردوە، کە سێبەرەکەیان لەلای ڕاست و چەپیان کڕنووش بۆ خوا دەبەن و بۆ خوا ملکەچن و، هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە، لە ئاژەڵ و لە فریشتە، کڕنووش بۆ خوا دەبەن و خۆیان بە زل ناگرن، ترسی پەروەردگاریان هەیە لە سەروویانەوەو، هەر شتێك کە فەرمانیان پێبکرێ، ئەنجامی دەدەن.

وەك دەبینین خوا ﷻ لێرەدا نوشتانەوەی سێبەری شتەکان لە لای ڕاست و چەپ، کاتێك کە خۆر هەڵدێ لەولاوە لەلای ڕاستەوە سێبەر دەردەکەوێ و، وەختێك ئاواش دەبێ، لەولاوە لەلای چەپەوە سێبەر دەردەکەوێ[1]، خوای پەروەردگار ئەو هاتن و چوونەی سێبەری بە جۆرێك لە کڕنووش بردن بۆ خوا، لە قەڵەم داوە.

---

١) لە کاتێك دا مرۆڤ ڕووەو کەعبە بووەستێ و، لە عێراق و دەوروبەری بێ .

نموونەی دووەم :

هەروەها لە سوورەتی (الحج)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: ئایا سەرنج نادەی! چۆن هەر کەسێك کە لە ئاسمانەکانو، هەر کەسێك کە لە زەویدا هەیە، کڕنووش بۆ خوا دەباتو، خۆرو مانگو ئەستێرەکانو، چیایەکانو درەختەکانو ئاژەڵەکانو، زۆرێك لە خەڵكی، (واتە: زۆر لە خەڵکیش کڕنووش دەبەن کە بڕوادارانن)و، زۆرێکیشیان سزای خوایان لەسەر پێویست بووەو، هەر کەسێك خوا بێ ڕێزی بکات، هیچ ڕێزگرێکی بۆ نابێ، (هیچ کەسێك ناتوانێ ڕێزی لێ بگرێ)، بێگومان خوا هەر شتێ بیەوێ دەیکات .

کەواتە: لێرەدا خوا کڕنووش بردنی، بۆ هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، ناو بردوە، هەروەها بۆ خۆرو مانگو ئەستێرەکان، دیسان بۆ چیایەکانو درەختەکانو ئاژەڵەکانو، بۆ زۆرێك لە خەڵکی، ئنجا ئەگەر زۆرێك لە خەڵکی کە بڕوادارانن، نێوچەوانیان بخەنە سەر زەویو، ئەوە کڕنووش بردنەکەیان بێ، فریشتەکانیش بەو شێوەیە کڕنووش بەرن کە خوا دەزانێ چۆنە؟ بێگومان کڕنووش بردنی خۆرو مانگو ئەستێرەکانو درەختو چیاکانو ئاژەڵەکان، بریتیە لە ملکەچییان بۆ خوا، کەواتە: ملکەچیی یانی: سەجدە بردن .

نموونەی سێیەم :

لە سوورەتی (الرعد)دا، دەفەرموێ : ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە، چارو ناچارو بەپێخۆش بوونو بەپێناخۆش بوون، کڕنووش بۆ خوا دەبەن، هەروەها سێبەرەکانیشیان بەیانیانو ئێواران .

یانی: کە خۆر هەڵدێ لە لای ڕاستەوە سێبەر پەیدادەبێ‌و، ئەو سێبەرە بە کڕنووش بردنی درەختەکان دادەنێ، چونکە سێبەرەکەیان لە زەوییە، ئێوارانیش کە خۆرئاوا دەبێ، سێبەرەکانیان لەلای چەپەوە بە زەوییەوە دەنووسێن، ئەوەشی بە کڕنووش بردن ناو بردوە .

کەواتە: لە ڕاستییدا کڕنووش، بردن هەم لە زمانی عەرەبیداو هەم لە بەکارهێنانی قورئاندا، تەنیا ئەوە نیە کە نێوچەوان بخرێتە سەر زەوی، بەڵکو (سجود) بریتیە لە ملکەچیی، هەروەها بریتیە لە ڕێزلێگرتن لە بەرانبەرو، ملکەچ کردن‌و، لە بەرانبەری دا خۆ بە کەم پێشاندان، ئەوە مانای کڕنووش بردنە، هەم لە زمانی عەرەبی‌و هەم لە بەکارهێنانی قورئاندا .

**٢) – چۆنیەتی سەجدە بردنی باب‌و دایکی یوسف‌و برایەکانی بۆی:**

زانایان لەوبارەوە مشتومڕی زۆریان کردوە کە : ئایا چۆن باب‌و دایکی یوسوف کە بابی یەعقووب ﷺ کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە، یەکێکە لە پێغەمبەرە پایە بەرزەکانی خواو، دایکیشی کە دایکی یوسوفەو، یوسوفیش خۆی پێغەمبەرەو، خێزانی[1] پێغەمبەرێکیشە، هەروەها یازدە برایەکەی، چۆن کڕنووشیان بۆ بردوە؟ چۆن بۆی بە سەجدەدا کەوتوون ؟

بەڵام ئێمە پێشتر باسمان کرد کە: (سجدة)و (سُجُود)، {(سجود)، یانی: کڕنووش بردن‌و (سَجْدَة)، یانی: یەکجار کڕنووش بردن}، بە مانای ملکەچیی دێ‌و، بە مانای نوشتانەوە دێ‌و، بە مانای سڵاو لێکردن‌و ڕێز لێگرتن دێ، بە گشتی لە قورئانداو لە زمانی عەرەبییدا .

بۆیە ئەو مشتومڕو ئیشکالەی کە بۆ زانایان دروستبووە، ئەگەر تەماشای مانای وشەی (سُجُود) و (سَجدَة)یان کردبایە، پێموایە دروست نەدەبوو، چونکە مانای عورفیی‌و باوی سەجدە بردن، ئەوەیە: مرۆڤ نێوچەوانی خۆی بخاتە سەر زەوی، لە بەرانبەر کەسێك یان شتێکدا، کە ئەوە تەنیا بۆ خوا دروستە، بەڵام لە ڕووی زمانەوانییەوە، وەك پێشتر باسمان کرد، سەجدە بریتیە لە ڕێز لێگرتن، مل بۆ کەچکردن، یا مل بۆ کەچکردنی مەعنەوییش بێ، ئەگەرنا

١) واتە: دایکی یوسوف (راحیل) کە هاوسەری یەعقووب بووە .

مانگو خۆرو ئەستێرەكان، كە خوا وشەی سەجدەی بۆ بەكارهێناون، چیایەكان كە خوا وشەی سەجدەی بۆ بەكارهێناون، درەختەكانو ئاژەڵەكان، ئاشكرایە هیچیان تەوێڵو نێوچەوان ناخەنە سەر زەوی، ئەدی مەبەست چییە؟ مەبەست ملكەچییانە بۆ ئەو یاساو سیستەمەی كە خوا بۆی داناون .

ئنجا زانایان سێ ڕای گشتییان هەن، دەربارەی چۆنیەتی سەجدە بردنی بابو دایكی یوسوفو برایەكانی بۆ یوسوف، صەڵاتو سەلام لەسەر یەعقووبو یوسوف بێ‌و، خوا لەوانی دیكەش ڕازی بێ‌و لێیان خۆش بێ .

ڕای یەكەم :

(قَالَ سَعِيد بن جُبير عَنْ قَتَادَة عَن الحَسَن، فِي قَوْلِهِ: ﴿ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا ﴾ قَالَ: لَمْ يَكُنْ سُجُوداً، لَكِنَّهُ سُنة كَانَتْ فِيهِم يُومِئُونَ برءوُسِهِم إِيمَاءً، كَذَلِكَ كَانَتْ تَحِيَّتُهُمْ)[1].

واتە: سەعیدی كوڕی جوبەیر ئەویش لە قەتادەوە لە حەسەنی بەصرییەوە هێناویەتی، دەربارەی قسەی خوای بەرز كە دەفەرموێ: ﴿ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدًا ﴾، لەپەوڕوو بۆی كەوتنە كڕنووش، دەڵێ: مەبەست كڕنووش بردن نیە، بە مانا باوو عورفییەكەی كە تەوێڵو نێوچەوان بخرێتە سەر زەوی، بەڵكو ئەوە یاسایەكو عادەتێك بووە لە نێویاندا، كە بریتی بووە لەوەی بە سەریان ئاماژەیان بۆ یەكدی كردوە، وەك چۆن ئێستا لە نێو میللەتاندا باوە: یەكێكیان دەست دەخاتە سەر چاو، یان هەیە دەست دەخاتە سەر سەر، یان دەست بە سینگەوە دەنا، یان بەسەر ئاماژەیەك دەكات، دەڵێ: ئەوەش سڵاو لێكردنی ئەوان بوو، وەك عورفو عادەتی خەڵكی میسر، یاخود ئەو خەڵكەی كە لەو كاتەدا بوون .

كەواتە: ئەسڵەن سەجدە بردنێك بە مانای تەوێڵو نێوچەوان خستنە سەر زەوی، لە ئارادا نەبووە، بەڵكو بریتی بووە لە ئاماژەی سەر .

---

١) الجَامع لأحكامِ القُرآن ج ٩، ص ٢١٥ – ٢١٧.

رِای دووەم:

(وَقَالَ الثَّورِيُّ وَالضَّحَّاكُ وَغَيْرُهُما: كَانَ سُجُوداً كَالسجُودِ المَعْهُودِ عِنْدَنا، وَهُوَ كَانَ تَحِيَّتهُمْ).

واتە: (ثَوريُ وَضحَاك)و جگە لەوانیش گوتوویانە: کڕنووش بردنەکە، وەك کڕنووش بردنی زانراوی لای ئێمە بووە، بەلاّم ئەوە سلاّو لێکردنی ئەوان بووە.

واتە: نەك مەبەستیان پێ کڕنووش بردنی عیبادەتو پەرستن بێ، کە تەنیا بۆ خوای پەروەردگار دروستە.

رِای سێیەم:

(وَقِيلَ: كَانَ انحِناءً كَالرّكوعِ وَلَمْ يكُنْ خُرُوراً عَلَى الأَرْضِ، وَهكَذَا كَانَ سَلاَمُهُم بالتكفّي والإِنْحِناء، وَقَدَ نَسَخَ اللهُ ذَلِكَ كُلَّهُ فِي شَرْعِنا، وَجَعَلَ الكَلامُ بَدَلاً عَنِ الإِنْحِناءِ).

واتە: گوتراوە: ئەوە تەنیا چەمانەوە بووەو بریتی نەبووە لە کەوتنە سەر زەوی، ئەوەش عادەتی وان لە سلاّو لێکردندا بووە، کە دەستیان لە دەستی یەکدی داوە (وەك ئێستا سوودانییەکان بە زۆریی بەو شێوەیە دەکەن)و، بۆ یەکدی چەماونەوەو دەستیان بە سینگەوە ناوەو، سەریان بۆ یەکدی نەوی کردوە، کە ئەوە هەمووی خوا لە شەرعی ئێمەدا، لە دوایین بەرنامەی خۆی دا، هەمووی نەسخ کردۆتەوەو، قسەی داناوە لە جیاتی چەمینەوەو، لە جیاتی دەست لە دەست دان: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ الله)، ئەوەی داناوە، وەك دوایی باسی دەکەینو، تەوقە کردنیش هەر هەیە.

ئنجا (القُرطُبي)، دەڵێ: (وَأَجْمَعَ المُفَسّرونَ أَنَّ ذَلِكَ السُّجُودَ عَلَى أَي وَجْهٍ كَانَ، فَإِنَّما كَانَ تَحِية لا عِبادَةً، قَالَ قَتَادَةَ: هَذِهِ كَانَت تَحِية المُلُوكِ عِنْدَهُمْ وَأَعْطَى اللهُ هَذِهِ الأُمة: السَّلاَم، تَحِية أَهْلِ الجَنة، قُلْتُ: هَذَا الإِنْحِناء وَالتَكَفّي الَّذِي نُسِخَ عَنا، قَدْ صَارَ عَادَةً بالديارِ المِصْرِية، وَعِنْدَ العَجَم، وَكَذَلِكَ قِيامُ بعْضِهِم إِلى بَعْضٍ، حَتَّى أَنَّ أَحدَهُمْ إِذَا لَمْ يُقم لَهُ، وَجِدَ فِي نَفسِهِ كأَنَّهُ لا يُؤْبَهُ بِهِ، وَأَنَّهُ لاَ قَدرَ لَهُ، وَكَذلِكَ إِذَا التقَوا: انْحَنَى بعْضُهُمْ لِبَعْض، عَادَةٌ مُسْتَمِرَّةٌ،

وَوِرَاثَةٌ مُسْتَقِرَّةٌ، لا سِيَّما عِنْدَ التِقَاءِ الأُمَرَاءِ والرُّؤَسَاءِ، نَكَبوا عَنِ السُّنَن وَأَعْرَضُوا عَنِ السُّنَن) .

واتە: ڕوونكەرەوانی ماناو مەبەستەكانی قورئان، یەك دەنگن لەسەر ئەوەی ئەو كڕنووش بردنە، هەر چۆنێكی بووبێ، (ئاماژەی سەر بوو بێ، چەمینەوە بوو بێ، یاخود سەر خستنە سەر زەوی بوو بێ)، هەر چۆنێك بێ سڵاو لێكردن بووە، نەك پەرستن، كە تەنیا بۆ خوا دروستە، قەتادە گوتوویەتی: ئەوە نەریتی پادشایەكان بووە، لە لای وان، خواش ﷻ سەلام كردنی كردوە بە سڵاو لێكردنی ئەم ئۆممەتە، ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ كە ئەویش سڵاو لێكردنی خەڵكی بەهەشتەو، ئەو چەمینەوەیە، {واتە: سەر زۆر نەوی كردن، كە ئێستا بەداخەوە خەڵكی وڵاتی مەغریب بۆ پادشایەكەیان، بۆ مەلیكەكەیان وا دەكەنو زۆر بە داخەوە بۆیان دەچنە ڕوكووع}، هەروەها ئەو دەست لە دەست دانە كە لەلای ئێمە نەسخ كراوەتەوە، ئێستا {لە سەردەمی (قُرطُبي)دا}، لە وڵاتی میسرو لەلای عەجەمەكان، (واتە: غەیری عەرەب)، بۆتە نەریتێك، هەروەها هەڵسانی هەندێكیان بۆ هەندێكیان، ئەوەش بۆتە نەریتێك كە كەسێك دێتە مەجلیسێك، ئەوانەی دیكە دەبێ لەبەری هەڵسن، هەتا ئەگەر یەكێكیان خەڵك لەبەری هەڵنەستێ، دڵی پێی ناڕەحەت دەبێ، وەك بڵێی ڕێزی نەگیرابێو حورمەتی لە لای ئەو كەسە نەبێ، كە لەبەری هەڵنەستاوە، هەروەها كاتێك دەگەنە یەكدی هەندێكیان بۆ هەندێكیان دەچەمنەوە، ئەوە بۆتە نەریتێكی بەردەوامو، بۆتە میراتێكی سەقامگیر لە نێویاندا، بە تایبەت لە كاتی پێكگەیشتنی بەرپرسانو سەرۆكەكاندا، لە ڕاستە شەقام لایانداوەو، وازیان لە ڕێو شوێنی پێغەمبەر ﷺ هێناوە .

ئەوە هەمووی قسەی (القُرطُبي)یە، كە لەم ڕۆژگاری ئێمەشدا، ئەو جۆرە نەریتانە هەر هەن .

**٣) – چەند دەقێكی سوننەت لە بارەی چۆنیەتی چاكو چۆنی پێكەوە كردنەوە :**

لەوبارەوە پێنج دەق دێنینەوە :

١) {عن أَنَس بن مالِكٍ رَضِي اللهُ عَنْهُ، قَالَ قِيلَ: يا رَسولَ اللهِ! أَيَنْحَنِي بَعْضُنا لِبَعْضٍ إِذَا الْتَقَيْنا؟ قَالَ: (لا)، قِيلَ: فَيَلْتَزِمُ بَعْضُنا بَعْضاً؟ قَالَ: (لا)، قِيلَ: فَيُصَافِحُ بَعْضُنا بَعْضاً؟ قَالَ: (نَعَمْ)}، {أخرجه عبد بن حميد برقم: (١٢١٧)، والترمذي برقم: (٢٧٢٨)، وابن ماجه برقم: (٣٧٠٢) والبيهقي في الكبرى برقم: (١٣٣٥١)، وحسنه الألباني} .

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! کاتێك دەگەینە یەکدی، پێکدەگەین، ئایا هەندێکمان بۆ هەندێکمان بچەمێینەوە؟ فەرمووی: نەخێر، گوترا: ئەدی هەندێکمان دەست لە ملی هەندێکمان بکەین؟ فەرمووی: نەخێر، گوترا: ئەدی هەندێکمان دەست بخەینە نێو دەستی یەکدیو تەوقە بکەین، فەرمووی: بەڵێ.

٢) {مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَتمثَّل لَـهُ الرِّجالُ قِياماً، فَلْيَتَبوأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النارِ}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٩٦٢)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنادُهُ صَحِيح رجالُهُ ثِقَات رِجال الشَّيْخَين، وَعَبْدُ بن حُمَيْد برقم: (٤١٣)، وَالبُخارِيُّ في (الأدب المفرد) برقم: (٩٧٧)، وَأَبو دَاوُدَ برقم: (٥٢٢٩)، وَالترمِذِيُّ برقم: (٢٧٥٥) وَصَحَّحَهُ الألباني} .

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: هەر کەسێك پێی خۆش بێ، خەڵك بە پێوە بۆی بوەستن، با جێگای خۆی لە ئاگردا دابنێ .

واتە: ئەگەر ئەو دابنیشێو خەڵکیش دەستەو نەزەر بەپێوە بوەستن، نەك کە هات، لەبەری هەڵسن، کە ئەوە حوکمێکی دیکەی هەیە، وەك دوایی باسی دەکەین .

بەڵێ مەبەست ئەوەیە کەسێك کە دانیشتوە، ئەوانی دیکە دەستەو نەزەر بوەستن، وەك بە داخەوە هەندێك لە شێخەکان ئاوایان بۆ دەکرێ، بەڵکو هەندێك لە بەرپرسەکان ئاوایان بۆ دەکرێ، هەڵبەتە ڕاوەستانی تازیە جیایە، کەسوکاری مردووەکە خاوەنی تازیەکە ڕادەوەستن، خەڵك دێ سڵاویان لێدەکەن، بۆیان دەوەستن وەك ڕێز لێگرتن، چونکە ناکرێ هەموو جارێ هەڵسنو دانیشن، ئەوە جیایە، بەلام ئەوە کە کابرا دانیشتبێو، ئەوانی دیکەش دەستەو نەزەر، یان جاری وایە ملیش نەوی دەکەن، جاری وایە دەستیش دەخەنە سەر سینگ، بە تەئکید ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ

نەهی لێکردووەو، هەڕەشەشی لەو کەسە کردوە، کە ئەوەی پێ خۆش بێ‌و فەرموویەتی: با جێگای خۆی لە ئاگری دۆزەخدا دابنێ .

٣) {قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ أَوْ إِلَى خَيْرِكُمْ} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٨٧٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٤)، وَأَبو دَاوُدَ برقم: (٥٢١٥)).

دیارە ئەم دەقەش بەسەرهاتێکی لەگەڵ دایە: دوای جەنگی خەندەق، دوای ئەوەی کە (بنو قريظة) پەیمانیان شکاند، پێغەمبەری خوا ﷺ لە دژیان جەنگا، تاکو تەسلیم بوون‌و، ڕازی بوون بە دادوەریی سەعدی کوڕی موعاذ، ئنجا سەعدی کوڕی موعاذیش بریندار بوو بوو، لەو شەڕەدا، لە شەڕی خەندەقداو تیرێك بە قۆڵی کەوتبوو، پێغەمبەر ﷺ بە دوای سەعدی دا نارد، سەعدیش بریندار بووە، بەڵام بە سواری گوێدرێژێك هاتوە، کە نیزیك بۆتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ أَوْ إِلَى خَيْرِكُمْ)، هەڵسن بۆ گەورەکەتان یان چاکترینتان، واتە: بیهێننە خوارو هاوکاریی بکەن .

هەندێك لە زانایان دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە وای فەرمووە، چونکە سەعد بریندار بووەو پێویستی بە هاوکاریی بووە، دەبوو هەڵسن‌و بیهێننە خوار، هەندێکیش دەڵێن: وەك ڕێز لێگرتنی بووە، هەردووك ڕایەکەش دەگونجێن .

کەواتە: گەر ئینسان هەڵسا بۆ گەورەیەك، بۆ کەسێك کە ڕێزی لێبنێ، وەك دوایی باسی دەکەین، بە مەرجێك بزانێ، کە پێی ناگۆڕێ‌و پێی لە خۆی بایی نابێ، ئەوە دروستە .

٤) {عَنِ الْبَرَاءِ بن عازب، قَالَ: لَقِيتُ رَسولَ اللَّهِ ﷺ فأخذ بيدي فَقُلْتُ: يا رَسولَ اللَّهِ! إِنْ كُنْتُ لأَحْسَبُ أَنَّ الـمصافحة للأَعَاجِم، فقَالَ: (نَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُصَافَحَةِ مِنْهُمْ، ما مِنْ مُسْلِمَيْنِ يلتَقِيان فيأَخُذُ أَحَدُهُما بيدِ صَاحِبِهِ مودَّةً بَيْنَهُما وَنَصِيحَةً، إِلاَّ أُلْقِيَتْ ذُنُوبُهُما بَيْنَهُما)}[1].

---

١) الإخوان لاَبنُ أبي الدنيا، ص١١٠.

واتە: بەرائی کوڕی عازیب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: بە پێغەمبەری خوا گەیشتم ﷺ دەستی گرتم (یان تەوقەی لەگەڵ کردم) منیش، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من پێم وابوو کە تەوقە کردنو دەست خستنە نێو دەستی یەکدی، بۆ غەیری مسوڵمانان (أعاجِم)ە [1]، فەرمووی: ئێمە شایستەترین بە تەوقە کردن پێکەوە، چونکە نیشانەی مەحەببەتو خۆشەویستییە پێکەوە، ئنجا فەرمووی: هیچ کاتێك دوو مسوڵمان پێك ناگەن، یەکێکیان دەستی ئەوی دیکە بگرێ، وەك یەکدی خۆشویستنو دڵسۆزیی بۆ یەکدی نواندن، مەگەر گوناهەکانیان لە بەینیاندا هەڵدەوەرێن .

٥) {مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ، فَيَتَصَافَحَانِ، إِلا غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَتَفَرَّقَا} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرَقم: (١٨٥٧٠)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرَقم: (٥٢١٢)، وَالتِرمِذِيُّ بِرَقم: (٢٧٢٧) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيب، وَابن مَاجَهْ بِرَقم: (٣٧٠٣)، وَصَحَّحَهُ الألبَانِي}.

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کاتێك دوو مسوڵمان پێك ناگەن، {دیارە دوو مسوڵمانی پیاو، یان ئافرەت، یان دوو مسوڵمان کە پێکەوە مەحرەم بن، وەك دایكو کوڕ، خوشكو برا، هیچ کاتێك دوو مسوڵمان پێك ناگەن} و بەیەکەوە تەوقە ناکەن، مەگەر لێیان دەبووردرێ، بەر لەوەی لە یەکدی جیاببنەوە .

لە فەرموودەی دیکەدا هاتوە کە دەفەرموێ: هەتا دەستیان لە نێو دەستی یەکدی دا بێ، گوناهیان لێ دەوەرێ، وەك چۆن درەختی پایز گەڵای لێ دەوەرێ[2] .

(إبن العَربي) لە کتێبەکەی خۆیدا[3] دەڵێ: (أَنَّ رَدَّ السَّلَامِ فَرْضٌ، وَابْتِدَاؤُهُ سُنَّة فِي مَشْهُورِ الأَقْوَالِ، وَلَكِنْ يَجُوزُ القِيَامُ لِلرَّجُلِ الكَبِيرِ بِدَاءَةً، إِذَا لَمْ يُؤَثِّر

١) لەبەر ئەوەی ئەو کاتە بە غەیرە عەرەبیان گوتوە: عەجەم کۆیەکەی (أعاجِم)، ئەوانەش بە زۆریی نامسوڵمان بوون.

٢) تحاتَّت عنهما ذنوبهما كما يتحات الورق من الشجر في الخريف} هـ.

٣) أحكامُ القرآن، ج ٣، ص ٧٨.

ذَلِكَ فِي نَفْسِهِ، كَمَا قَالَ النَّبِيُّ لِجُلَسائِهِ حِينَ جاءَ سَعْدٌ: (قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُمْ) فَإِنْ أَثَّرَ فِيهِ، لَمْ يَجُزْ عَوْنُهُ عَلَى ذَلِكَ) .

واتە: وەڵامدانەوەی سڵاوکردن فەرزەو، دەست پێکردنی سڵاو کردن، {واتە: کە لە سەرەتاوە کەسێك سڵاو دەکات} سوننەتە بە پێی قسەی باوی زانایان، بەڵام دروستە بۆ پیاوی بە تەمەن، {هەڵبەتە باسی پیاوی بە تەمەنی کردوەو ئافرەتی بە تەمەنیش هەروایە} دروستە کە لەبەری هەڵسن بە مەرجێك کە ئەوە کاریگەریی خراپی نەبێ بۆ سەر نەفسیو پێی لە خۆبایی نەبێو لە کەوڵی خۆی دەرنەچێ، وەك پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی کە لە خزمەتی دانیشتبوون، کاتێك سەعدی کوڕی موعاذ هات پێی فەرموون: (قُومُوا إِلَى سَيِّدِكُم)، واتە: هەڵسن لەبەر گەورەکەتان، کە سەعدی کوڕی موعاذ بوو.

کەواتە: وەك زانایان گوتوویانە: هەڵسان (قِيام)، بۆ هاتوو (قَادِم)، دروستە، ئەگەر سوننەتیش نەبێ، بەڵام (قِيام)، بۆ دانیشتوو (قَاعِد)، نەهی لێکراوە، (قَاعِد)، کەسێکە دانیشتوەو خەڵك ڕابوەستێ دەستەو نەزەر لە خزمەتی دا، ئەوە نەهی لێکراوە، بە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام (قِيام)، بۆ (قَادِم)، کەسێك کە دێ، ئەگەر بە پیریەوە بچیو ڕێزی لێبگریو پێشوازیی بکەی، دیارە دروستە .

هەڵبەتە دەستکردنە ملی یەکدیو، یەکدی ماچ کردنیش، وەك لە هەندێك فەرمووداندا هاتوە، ئەویش لە هەندێ حاڵەتی هەڵاوێردراودا دروستە، وەك دایکمان عائیشە دەگێڕێتەوە: هەر جارێك کە فاتیمەی کچی دەهات، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەستا پێشوازیی دەکردو ماچی دەکرد .

هەروەها کاتێ کە جەعفەری کوڕی ئەبی طالیب لەگەڵ ئەوانەی کە لە حەبەشە بوون، لە ڕۆژی گرتنی خەیبەردا، گەیشتنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {مـا أَدْرِي بِأَيِّهِمَا أَنَا أَفْرَحُ ، بِفَتْحِ خَيْبَر، أَوْ بِقُدُومِ جَعْفَر}[1]. واتە:

---

١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٧٧٩٨)، وَالطَّبَرَانِي فِي الكبير برقم ١٤٧٠)، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً فِي الأوسط برقم: (٢٠٠٣)، وفي الصغير برقم: (٣٠)، قال الهيثمي: في رجال الكبير أنس بن سلم، ولم أعرفه، وبقية رجاله ثقات .

نازانم من بە کامیان دڵخۆشتر بم، بەوە کە خەیبەرمان گرت، (کە شارێکی جولەکەکان بوو)، یاخود بە هاتنەوەو گەڕانەوەی جەعفەرو کۆمەڵەکەی کە لە حەبەشە بوون !

کە کاتی خۆی لە قۆناغی مەککەدا کۆچیان بۆ ئەوێ کرد بوو.

بە هەر حاڵ ئەوە باسێکە چەند لق و پۆپێکی دیکەی هەن، بەڵام لێرەدا هەر ئەوەندە بە پێویست دەزانین بیڵێین .

**مەسەلەی سێیەم :** لە خوا پاڕانەوەی یوسوف ﷺ و یادکردنەوەی چاکەو نیعمەتەکانیو، داوا لێکردنی کە بە مسوڵمانیی بیمرێنێو بیخاتە ڕیزی چاکان :

وەك خوا فەموویەتی: ﴿ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِى مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِى مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِىِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە شەش بڕگەدا**

**١) –** یوسوف ﷺ لە کۆتایی بەسەرهاتەکەی دا، خوای پەروەردگار ئەو پاڕانەوەیەی لێ دەگێڕێتەوە: ﴿ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِى مِنَ ٱلْمُلْكِ ﴾، پەروەردگارم! بێگومان تۆ لە موڵك و حوكمڕانیی بە منت بەخشیوە .

﴿ مِنَ ٱلْمُلْكِ ﴾، یانی: (بَعْضاً مِنَ المُلْكِ)، هەندێك لە حكومڕانییت بە من داوە، بە نسبەت موڵكی خواوە، ئەوە دیارەو، بەنسبەت موڵك و حوكمڕانیی میسرەوە، كە ئەوەیان زیاتر پێ دەچێ، چونكە یوسوف ﷺ لە قورئاندا دیار نیە بووبێ بە حاكم و حوكمڕانی ڕەهای میسر، بەڵكو لە سەرووی ئەوەوە پادشا هەر هەبووە، بەڵام ئەویش هاوكاری پادشا بووەو، دەستكراوەو

دەستڕۆیشتوو بووەو، کاروباری ئابووریی بە دەست بووە، ڕەنگە زۆر کاروباری دیکەشی بە دەست بووبێ‌و، زۆر جێی متمانەی ئەو پادشایە بووە.

هەڵبەتە وشەی: ﴿ رَبِّ ﴾، لە ئەسڵدا (رَبِّيْ)یە، (ي)ی هەیە، بەڵام لێرەدا (ي)ەکەی، پەڕێنراوە لە کاتی دوعاداو، لە قورئاندا ئەوە زۆر هاتوە.

**٢) -** ﴿ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ﴾، (ئەی پەروەردگارم!) هەروەها تۆ منت لە مانا لێکدانەوەو تەعبیری خەونان فێرکردوەو شارەزات کردووم، لێرەش دا دیسان (مِنْ)ی چۆتە سەر، واتە: مەرج نیە ئەویش تەعبیری هەموو خەونانی زانی بێ، هەڵبەتە هەر خوا ﷻ هەموو شتێك دەزانێ .

**٣) -** ﴿ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، پەیداکەری ئاسمانەکان‌و زەوی، ئاوای لێدێتەوە: (يا فَاطِرَ السَّمواتِ وَالأَرْضِ)، ئەی پەیداکەری ئاسمانەکان‌و زەوی! چونکە ئەوە لە مەقامی دوعاو پاڕانەوە دایە .

وشەی (فَاطِرَ)، (الفَطْرُ: الإبتداءُ والإختراع)، (فَطر)، بریتیە لە دەست پێکردنی شتێك‌و وەدیهێنانی، بەبێ ئەوەی کە پێشینەی هەبووبێ .

لەوبارەوە ئەم شوێنەوارە هەیە: (عَنِ ابنِ عَبَاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ لا أَدْرِي مَا: ﴿ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، حَتَّى أَتَانِي أَعْرَابِيَانِ، يَخْتَصِمَانِ فِي بِئْرٍ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا: أَنَا فَطرتُها أَيْ: أَنَا ابْتَدَأْتُها)[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بی دەڵێ: من نەمدەزانی مانای: ﴿ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، چییە؟ هەتا ڕۆژێك دوو عەرەبی دەشتەکیی (بیابانشین) هاتن بۆ لام، لە بارەی بیرێکەوە ناکۆکیی‌و مشتومڕیان بوو، یەکێکیان گوتی: (أَنَا فَطرتُها أَيْ: أَنَا ابْتَدَأْتُها)، من

١) تفسير الطبري، الآية ١٤ من سورة الأنعام، وابن كثير: أول سورة فاطر، ومختار الصحاح ٧٨١/٢، وانظر: العين ٤١٧/٧، ٤١٨، ولسان العرب ٥٥/٥، ٥٨، المصباح المنير ٤٧٦/٢ – ٤٧٧.

یەکەمجار ئەو بیرەم لێداوە، کەواتە: (فَاطِرَ)، یانی: پەیداکەری شتێك لە نەبوونەوە، بەبێ ئەوەی کە پێشینەی هەبووبێ.

٤) - ﴿أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ﴾، تــۆ سەرپەرشتیـــارو دۆســـتو مشوورخۆری منی (ئەی خوایە! ئەی پەروەردگار!) لە دنیاو لە دوارۆژدا.

کە هەر واشبووەو سەرپەرشتیارێتیی خوا ﷻو مشوورخۆریی خواو دۆستایەتیی خوا بۆ یوسوف ؑ، وەك مانگی چواردە لە شەودا دروشاوەتەوە.

هەڵبەتە خوا ﷻ لە گۆترە مامەڵە لەگەڵ خەڵكدا ناكات، هەڵبەتە یوسوف شایستە بووە کە خوا بەو شێوەیە مشووری لێ بخوا، بۆیە چاك مشووری لێ خواردوە، چاك پشتی گرتوە، چاك سەرپەرشتیی کردووەو ئاگای لێی بووە، ئەگەر تووشی ناڕەحەتییانیشی کردوە، ناڕەحەتییەکانیش هەر پلە بوون بۆ سەرکەوتن، ئەگەر خوا لوتفی بوو لەگەڵ بەندەی خۆی دا، ئەو ناڕەحەتییانەی دێنە ڕێی ، بۆی دەبن بە قادرمە بۆ بەرزبوونەوە، بۆی دەبن بە پەیژە بۆ هەڵكشین، ئەگەر لوتفیشی لەگەڵیدا نەبێ، بۆی دەبن بە قادرمە بەرەو خوار، لە جیاتی (دَرَجْ) بن، بۆی دەبن بە (دَرَكْ)و شۆڕدەبێتەوە، هەڵبەتە خوای دادگەر لە گۆترە نە لەگەڵ خەڵكدا لوتف دەنوێنێ، نە لە گۆترەش لەگەڵیاندا پێچەوانەی لوتف دەنوێنێ، کە بریتیە لە تووڕەییو گوێ پێنەدانو ئیهمال کردن.

٥) - ﴿تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا﴾، یوسوف ؑ هەر لەسەر پاڕانەوەکەی بەردەوام دەبێ دەڵێ: بە مسوڵمانەتیی بممرێنە، واتە: بە ملکەچیی، یانی: با تەواو ملکەچ بم بۆ تۆ .

کەی ئینسان بە مسوڵمانەتییو بە ملکەچیی بۆ خوا گیان دەسپێرێ؟ کاتێك کە ژیانەکەی هەموو ملکەچیی بووبێ بۆ خوا، کەسێك لە ژیانیدا بۆ خوا ملکەچ بێ، دیارە کۆتایی ژیانەکەشی هەر بە ملکەچیی بۆ خوا، دێ، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا﴾، یانی: خوایە ! هەر بە مسوڵمانەتییو بە

ملکەچییەوە بۆ خۆت، بمژیێنە، بۆ ئەوەی کە کۆتایی تەمەنەکەشم هەر بەو شێوەیە بێ .

٦) - ﴿ وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ ﴾، هەروەها بمخە ڕیزی چاکانەوەو، بمگەیەنە بە کاروانی چاکان .

(الإلحاقُ: جَعلُ الشَّيء لاحِقاً، أي: مُدرِكاً ما سَبَقَه في السَّيرِ، وَالصَّالِحُون المتَّصِفُونَ بالصَّلاح)، (إلحاق): ئەوەیە کە شتێك بگەیەنی بە شتێك، کە لە ڕۆیشتندا پێشی کەوتۆتەوە، (صَالِحُونَ)یش، واتە: ئەوانەی کە سیفەتی صەلاح و چاکیەتیی و پەسندییان هەیە .

کەواتە: یوسوف ﷺ هەم چاکەکانی خوا، یاد دەکاتەوە، هەم بە سیفەتی زۆر گەورەی خوا، کە بریتیە لە: پەیداکردنی بۆ ئاسمانەکان و زەوی و سەرپەرشتییکردنی بۆ بەندەکانی لە دنیاو دواڕۆژدا، بەوە مەدح و ستایشی خوا دەکات، دوایش لێی دەپاڕێتەوە کە بە ملکەچیی بۆ خۆی بیمرێنێ و، بە کاروان و قافڵەی چاکانیشی بگەیەنێ .

ئێمە لە کۆتایی بەسەرهاتی یوسوفدا، ئەم قسەیە لە پەیمانی کۆنەوە[1] نەقڵ دەکەین، دەڵێ: (وأقَامَ يوسف في مصرَ هو وأهلُ بَيتِ أبيهِ، وَعَاشَ يوسف مِئة وَعَشرَ سِنِينَ حَتَّى شَهِدَ الجِيلَ الثَّالِثَ مِن ذُرِّيةِ أفرايم)، واتە: یوسوف و کەسوکاری بابی، (واتە: برایەکانی و هەموو ئەوانەی لە بابیەوە هاتبوون) لە میسر نیشتەجێ بوون و، یوسوف (١١٠) ساڵان ژیا، {تەمەنەکەی هەمووی (١١٠)} ساڵ بوو تاکو وەچەی سێیەمی ئەفرایمی بینی {ئەفرایم دیارە کوڕی یوسوف بووە، بە پێی پەیمانی کۆن، واتە: نەك هەر کوڕی ئەفرایمی بینی، بەڵکو کوڕی کوڕی و، بگرە نەوەی کوڕی ئەفرایمیشی بینی} .

هەڵبەتە لە هەندێك لە سەرچاوەکاندا دەڵێ: یوسوف (١٢٠) ساڵ ژیاوە، هەندێکیش گوتوویانە: (١٨٠)، ساڵ بەڵام ئەوە هیچی جێی دڵنیایی نیەو ئینسان لێی مسۆگەر نیە، گرنگ ئەوەیە دوای ئەوەش، کە باب و دایکی و

---

١) التَّفسير التطبيقي لِلكِتابِ المقَدَّس العَهدُ القَديم، سفرُ التكوين، ص١٢٥.

برایەکانی هاتوونە میسڕ، تەمەنێکی بردۆتە سەر، ئیدی (١١٠)ساڵ، بووە (١٢٠)، بووە، کەمتر بووە، زیاتر بووە؟ بەس خوای پەروەردگار دەزانێ، ئنجا خۆیشی‌و هەموو کەسوکارەکەشی لە میسڕ نیشتەجێ بوون‌و، بوونەتە گەلی (بەنو ئیسڕائیل) کە فیرعەون چەوساندوونیەوەو، دوایی خوا مووسای لە نێو پەیداکردوون‌و بۆ ڕەخساندوون، لەگەڵ هارونی برای سەلامی خوایان لێ بێ، کە گەلی بەنو ئیسڕائیلیان دەرباز کردوە لە چنگی فیرعەون، چونکە (بنو إسرائیل) دەچنەوە سەر یەعقووب، ئیسڕائیل بە زمانی عیبریی: (ئیسڕا) واتە: (عبد)، (ئیل) واتە: (الله)، واتە: (عبدالله)و ئیسڕائیل نازناوی یەعقووب ﷺ بووە، کەواتە: بەنو ئیسڕائیل، واتە: وەچەی ئیسڕائیل، کوڕانی ئیسڕائیل، کە دیارە ئەوە وەك زاڵکردنی نێرینەیە بەسەر مێینەداو بنچینەیەکە لە زمانی عەرەبییدا، ئەگەرنا مەبەست هەموو ئەو وەچەیەیە کە لە یەعقووب پەیدا بوون، بە نێرو مێ وە، کە وەك خوا لە ئایەتی: (١٦٠)ی سووڕەتی (الأعراف)دا باس دەکات: ﴿ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا ﴾، دوازدە تیرە بوون، هەر تیرەیەی لە کوڕێکیان بوون، چونکە یەعقووب دوازدە کوڕی بوون، یوسوف‌و بنیامین‌و دە (١٠) کوڕەکانی دیکە، هەر کامێکیان وەچەی بووە، ئنجا ئەو وەچەیەی ئەو دوازدە کوڕە، زۆر بووەو، نەتەوەیەکیان لێ پێکهاتوە بە ناوی (بەنو ئیسڕائیل) .

ئنجا کاتێك کە گەلی بەنو ئیسڕائیل زۆر بوون لە وڵاتی میسڕدا، فیرعەون چەوساندوونیەوەو، نێرینەکانی سەربڕیون‌و، مێینەکانی هێشتوونەوە، تاکو خوا مووسا ﷺی بۆ ڕەخساندوون لەگەڵ هارونی برایو، لە چنگی فیرعەون دەربازیان کردوون، فیرعەون‌و سوپایەکەشی لە دەریای سووردا خنکاون، وەك لە بەرگی شەشەمی ئەم تەفسیرەدا، کە بۆ سووڕەتی (الأعراف) تەرخان کراوە، بە وردیی باسمان کردوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەكانی: (١٠٢ تاكو ١١١)، واتە: (١٠) ئایەت دەگرێتە خۆی، كە ئایەتەكانی كۆتایی سووڕەتی (یوسف)ن، وەك چۆن شەش ئایەتی سەرەتای سووڕەتەكە ئایەتی (١ تاكو ٦)، پێشەكی بوون بۆ بەسەرهاتی پڕ پەندو عیبرەتی یوسوفو یەعقووبو كوڕەكانی دیكەی یەعقووب ﷺ، ئەم دە ئایەتەش، وەك ئەنجامگیریی‌و كۆتایی پێهێنانی ئەم بەسەرهاتە وان، كە چەند بابەتێكیان گرتوونە خۆیان‌و، سەرجەم دە (١٠) بابەتن :

١) ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە بەسەرهاتی یوسوفو برایەكانی لە هەواڵی نادیارەو خوا بە وەحیی بە پێغەمبەری خاتەمی ﷺ ڕاگەیاندوە، بەو وردەكارییەوە، بەو شێوە ڕاستو دروستە، كە لە پەیمانی كۆنیشدا بەو شێوەیە نیە .

٢) ڕاگەیاندنی ئەوە كە هەرچەندە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ سووریش بێ لەسەر بڕوا هێنانی خەڵك، زۆربەی خەڵكی هەر بڕوا ناهێنن .

٣) ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هیچ كرێ‌و پاداشتێك لە خەڵك داوا ناكاتو، هیچ چاوەڕوانییەكی لێیان نیە، لەسەر گەیاندنی پەیامی خوا پێیان‌و، بە بێ بەرانبەر ئەو دڵسۆزییەیان بۆ دەنوێنێ .

٤) ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە زۆر نیشانەو بەڵگە لە ئاسمانەكان‌و زەویدا هەن، لەسەر خواناسیی، لەسەر بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگارێتیی‌و

خاوەنداریێتیی خوا، بۆ بوون، بەڵام بێبڕوایەکان سەرنجی ئەو بەڵگەو نیشانانە نادەن .

٥) ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە زۆربەی خەڵکی لە خوا ناسیینیاندا، تووشی شیرك دەبنو، هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، چ لە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگاریێتیی خوادا، چ لە ناووسیفەتەکانی دا، چ لە پەرستنی پەروەردگاردا .

٦) ترساندنی خەڵك لە هاتنی سزای دنیایی خوا، یاخود هاتنی ئاخیر زەمان، بەبێ ئەوەی هەست بکەن .

٧) فەرمان کردنی خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە ڕێبازی خۆیو، شوێنکەوتووانی بۆ خەڵکی پێناسە بکات، بەوە کە بە بەرچاوڕوونییەوە بانگەواز بۆ لای خوا دەکاتو، خوا بە پاك دەگرێو، هاوبەش بۆ خوا دانانێ .

٨) ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە سەرجەم پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام) لە پیاوان بوونو، خەڵکی ئاوەدانییە قەڕەباڵغەکان بوونو، داواکردن بە سەرنجدانی شوێنەوارەکانیانو، پەند وەرگرتن لە سەرەنجامیان .

٩) ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە لە کاتی بێ هیوایی پێغەمبەراندا، کاتێك پێیان وابووە گەیشتوونە بن بەست، یارمەتی خوایان بۆ هاتووەو، دەربازکراون .

١٠) ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە لە بەسەرهاتی پێغەمبەراندا (علیهم الصلاة والسلام) زۆر پەندو عیبرەت هەنو، قورئان هەڵبەستراو نیە، بەڵکو بەڕاست دانەری کتێبەکانی پێش خۆیەتیو، ڕوونکردنەوەی هەموو ئەو بابەتو باسانەیە، کە مرۆڤ بۆ ژیانی دنیای پەکی لەسەریان کەوتووەو، ڕێنماییەو، مایەی ڕەحمەتو بەزەیی خوایە بۆ بڕواداران .

﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۖ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوٓا۟ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَمَا تَسْـَٔلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ أَفَأَمِنُوٓا۟ أَن تَأْتِيَهُمْ غَٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوْ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٠٧﴾ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰٓ ۗ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۗ وَلَدَارُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا۟ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّىَ مَن نَّشَآءُ ۖ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١١٠﴾ لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ ﴾.

# مانای وشە بە وشەی ئایەتەکان

{ئەوە (ی کە باسکرا) لە هەواڵەکانی نادیارە، بۆ تۆی سروش دەکەین‌و، تۆ لەلایان نەبووی کە (برایەکانی یوسوف) بڕیاریاندا (یوسوف بخەنە بیرەوە)، هەروەها کاتێك کە پیلانیان لە دژی دەگێڕا، لەوێ ئامادە نەبووی ﴿١٠٢﴾ زۆربەی خەڵکی هەرچەندە لەسەر بڕواهێنانیان سووریش بی، هەر نابنە بڕوادار ﴿١٠٣﴾ تۆش لەسەر گەیاندنی ئەو پەیامە هیچ کرێ‌و پاداشتێکیان لێ داوا ناکەی، ئەم (قورئان)ە تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان ﴿١٠٤﴾ زۆر نیشانەو بەڵگەش (لەسەر ڕاستیی خواو ئاینەکەی) لە ئاسمانەکان‌و زەویدا هەن، بێبڕوایەکان بە ڕوو وەرگێڕانەوە بە لایاندا ڕەت دەبن ﴿١٠٥﴾ زۆربەشیان بڕوا بە خوا ناهێنن، مەگەر لە حاڵێکدا کە هاوبەشدانەر بن ﴿١٠٦﴾ ئایا ئەو بێبڕوایانە دڵنیا بوون، کە بەڵایەکی داپۆشەر لە سزای خوایان بۆ بێ، یاخود کتوپڕ بێ ئەوەی هەست پێ بکەن، ئاخیر زەمانیان بەسەر دابێ؟ ﴿١٠٧﴾ بڵێ: ئا ئەمە ڕێبازی منە، خۆم‌و ئەوانەی شوێنم کەوتوون، لەبەر ڕۆشنایی دا بانگەواز بۆ لای خوا دەکەین‌و، پاکیی بۆ خواو، من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم ﴿١٠٨﴾ لە پێش تۆشدا (ئەی موحەممەد ! ﷺ) تەنیا پیاوانێکمان لە خەڵکی ئاوەدانییەکان بە پێغەمبەر ڕەوانە کردوە، ئنجا ئایا بە زەمیندا نەڕۆیشتوون، سەرنج بدەن! داخۆ سەرەنجامی ئەوانەی پێش وان چۆن بووە؟ مەنزڵگای دوارۆژیش بۆ ئەوانەی پارێز دەکەن لە ژیانی دنیا، باشترە ئایا نافامن ! ﴿١٠٩﴾ (ئیدی حاڵ‌و بەسەرهاتی پێشووان هەر وابووە)، کە هەتا کاتێك کە پێغەمبەران لە سەرکەوتن‌و دەروو لێکرانەوە نائومێد بوون‌و، خەڵکەکەش پێیان وابوو پێغەمبەران درۆیان لەگەڵدا کراوە، (کە بەڵێنی دەربازبوونیان پێدراوە)، یارمەتی ئێمەیان بۆ هات، ئنجا ئەوەی

ویستمان ڕزگار کرا لە سزاو بەڵای خواو، بەڵاو سزای ئێمە لە کۆمەڵی تاوانباران ناگێڕدرێتەوە ﴿١١٠﴾ بە دڵنیایی لە بەسەرهاتی ئەوان (پێغەمبەران)دا بۆ خاوەن عەقڵان پەند هەیە، قورئان قسەیەکی هەڵبەستراو نیە، بەڵکو بە ڕاست دانانی هەر کتێبێکی خوایە کە لە پێشیەوە بووەو، ڕوونکردنەوەی هەموو شتێکە (کە پێویست بێ بۆ بەشەر ڕوون بکرێتەوە لەلایەن خواوەو) ڕێنمایی‌و بەزەیی خوایە بۆ کۆمەڵێك کە بڕوا بێنن ﴿١١١﴾} .

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

( حَرَصْتَ ): واتە: سووربی، مكوڕ بی، (الحِرْصُ: فَرْطُ الشَّرَهِ وَفَرْطُ الإِرَادَةِ)، (حرص) بریتیە لەوە كە ئینسان زۆر ئارەزووی بۆ شتێك بیَ‌و، زۆر شتێكی بویَ، لە كوردییدا دەڵێین: سوور بوون مكوڕ بوون لەسەر شتێك، (وَلَوْ حَرَصْتَ) هەرچەندە سوور بی، مكوڕ بی سامەرەستوو بی .

( أَجْرٍ ): (الأَجْرُ والأُجْرَةُ: ما يَعُودُ مِنْ ثَوَابِ العَمَلِ دُنيوياً كانَ، أَوْ أُخْرَوِياً)، (أجر) و (أجرة) هەردووكیان بریتین لە بەرهەم‌و پاداشتی كردەوە، كە دەگەڕێتەوە بۆ لای مرۆڤ ، چ لە ڕووی دنیاییەوە، چ لە ڕووی ڕۆژی دواییەوە .

( ذِكْرٌ ): یان بە مانای بیرخەرەوە دێ، یان بە مانای شەرەف‌و پێگەو پایەبەرزی دێ.

( وَكَأَيِّن ): {اسْمٌ مُرَكَّبٌ مِنْ كافِ التشْبيهِ، وَأَيٍّ المنَوَّنة، يُفِيدُ تَكْثِيرَ العَدَدِ وَبِمَعْنَى (كَم) الخَبَرِية}، (كأينَّ) وشەیەكی لێكدراوە، لە (ك) تەشبیە، و(أَيٍّ)ی تەنوینتدار، مانای زۆریی ژمارە دەگەیەنیَ‌و، ماناكەی لە (كَم)ی هەواڵپێدانەوە نیزیكە، وەك دەفەرمویَ: ﴿ وَكَم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا فَجَاءَهَا بَأْسُنَا بَيَاتًا أَوْ هُمْ قَائِلُونَ ﴿٤﴾ ﴾ الأعراف.

(غَاشِيَةٌ ): (أي: نائِبة تَغْشاهُمْ وَتُجَلِّلهُم، كِناية عَنِ القِيامة، جَمْعُها غَواشٍ)، (غاشیة) بەڵایەك كە دایان بپۆشیَ‌و، دایان بگریَ، كە كینایەیە لە قیامەت، كۆیەكەی (غَوَاش)یە.

( ٱلسَّاعَةُ ): (الساعَةُ: جُزْء مِنْ أَجْزَاءِ الزَّمانِ، وَيُعَبَّرُ بِهِ عَنِ القِيامة)، ڕاغیبی

ئەصفەهانیی دەڵێ: (ساعة) بەشێکە لە بەشەکانی کاتو، تەعبیری پێ دەکرێ لە قیامەت، جاری دیکەش باسم کردوە، کە لێرەدا ڕاغیب هەڵەی کردوە، چونکە (قیامة) و (ساعة) هەردووکیان لە قورئاندا هاتوون، (ساعة) واتە: ئاخیر زەمان، ئەو کاتەی کە دنیای تێدا کۆتایی دێ، (قیامة) واتە: سەرەتای ڕۆژی دوایی، ڕۆژی هەڵسانەوەی خەڵك بۆ سزاو پاداشت .

( بَغۡتَةً ): (البَغْتُ: مفاجَئة الشيء مِنْ حيْثُ لاَ يُحْتَسَب)، (بغة) بریتیە لە کتوپڕو لە نەکاو هاتنی شتێك، بە شێوەیەك کە چاوەڕوان نەکرێ .

( بَصِيرَةٍ ): واتە : ڕۆشنایی، (مَعْرِفة وَتَحقّق) واتە: زانینو دڵنیابوون لە شتێك .

( ٱلۡقُرَىٰ ): (جَمْعُ قَرِية،وَهِيَ اسْمٌ للموضعِ الّذِي يَجْتَمِعُ فِيهِ الناسُ ولِلناسِ جَمِيْعاً)، وشەی (قُری) کۆی (قریة)یە، (قریة) ئەو شوێنەیە کە خەڵك لێی کۆدەبنەوە، بە شوێنەکەو خەڵکەکە پێکەوەو، بە هەر کامێکیشیان بە تەنیا : دەگوترێ، بەڵام وشەی (قریة) لە قورئاندا، واتە: شاری گەورە، قەڵەباڵغ، پێچەوانەی مانا باوو عورفییەکەی، کە بە مانای لادێو ئاوەدانیی بچووك دێ، مەککە پێی گوتراوە: (أم القرى) واتە : دایکی ئاوەدانییەکان، لەبەر ئەوەی شارێکی گەورە بووە .

( بَأۡسُنَا ): (البأسُ وَالبؤسُ والبأساءُ: الشدَّةُ وَالمكروه)، وشەکانی: (بأس، بؤس، بأْساء) بە مانای توندییو سەختییو ناڕەحەتییەك دێ، کە ئینسان پێی ناخۆش بێ .

( قَصَصِهِمۡ ): (القَصَصُ: الأَخْبار المُتَتَبَّعَة) واتە: هەواڵەکان کە شوێنیان بکەوترێ، واتە: بە دواداچوونیان بۆ بکرێ .

( عِبۡرَةٌ ): (الإعْتِبارُ والعِبْرَةُ: الحَالة الّتِي يُتوصَّلُ بها مِنْ مَعْرِفة المُشاهَدِ إلى ما لَيْسَ بمُشاهَدٍ)، (إعتبار) و (عبرة) هەردووکیان مانایان حاڵەتێکە کە بەهۆی شتی زانراوەوە بگەی بە شتێك کە نەزانراوە .

# مانای گشتی ئایەتەكان

خوا ﷻ - وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەشدا گوتمان - ئەم دە (١٠) ئایەتە دەكاتە ئەنجامگیریی‌و، كۆتایی پێهێنانی بەسەرهاتەكەی یوسوف‌و یەعقووب بابی یوسوف (علیهما السلام) هەروەها دایكی‌و، برایەكانی كە بەسەرهاتی هەموویانە، وەك چۆن شەش ئایەتی سەرەتای سووڕەتی (یوسف) پێشەكیی بوون، ئەمانەش ئەم دە (١٠) ئایەتەش ئەنجامگیریین، ئیدی خۆی سووڕەتەكە (١١١) ئایەتە، شەشی پێشەكییە، مایەوە (١٠٥)و، (١٠)شی ئەنجامگیرییە، مایەوە (٩٥) كەواتە: (٩٥) ئایەت تەرخانكراون بۆ بەسەرهاتی یوسوف ﷺ بابی‌و برایەكانی، دیارە لەم (١٠) ئایەتەدا، خوا ﷻ (١٠) بابەتی گرنگ بەڵكو دەگونجێ زیاتریش بكرێن، دەخاتەڕوو .

سەرەتا دەفەرمووێ: ﴿ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَ ﴾، ئا ئەوە، یانی: گێڕانەوەی بەسەرهاتی یوسوف ﷺ ئەو باس‌و خواسە، لە هەواڵەكانی نادیارە، كە بۆ تۆی سروش دەكەین، (ئەی موحەممەد!) بە شێوەی پەنهان بۆ تۆی دەنێرین .

ئەمە ئاماژەیە بەوە كە تۆ ئەگەر پێغەمبەی خوا نەبی، ئەو هەواڵە نادیارە كە زیاتر لە دوو هەزارو پێنج سەد ساڵ پێش سەردەمی پێغەمبەر (محمد) ﷺ بووە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ نەخوێندەوار، نە شارەزا لە كتێبەكان، چۆن ئەوە بزانی! ئەگەر خوا بە شێوەی تایبەت پێیڕانەگەیەنێ؟ كەواتە: وردەكارییەكانی ئەو بەسەرهاتەو، گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە بەڕێ‌و جێ، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تۆ ئەی موحەممەد! پێغەمبەری خوای‌و پەیوەندیی تایبەتییت لەگەڵ خوادا هەیە، ﴿ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ أَجۡمَعُوٓاْ أَمۡرَهُمۡ وَهُمۡ يَمۡكُرُونَ ﴾،

هەروەها تۆ لە لایان نەبووی (لەلای برایەکانی یوسوف) کە بڕیاریان دەداو پیلانیان دەگێڕا، نە کاتێك بڕیاریان دەدا لە لایان بووی، نە کاتێك لە لایان بووی کە پیلانەکەیان دەگێڕاو پیلانەکەیان جێبەجێ دەکرد، {کە بریتی بوو لەوەی یوسوف بخەنە بیرەوە}، ئەدی کێ ئەو بەسەرهاتەی وا بە وردیی بۆ گێڕایەوە؟ بەڵکو هەستو نەستی مرۆڤەکانیشی بۆ تۆ گێڕایەوە؟ ئەوە دیارە خوای پەنهانزان ئەو خوایەی کە ئاگای لە هەستو خوستی مارو مێروو هەیە .

هەروەها دەشگونجێ – وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین – کە دەفەرموێ: ﴿إِذۡ أَجۡمَعُوٓاْ أَمۡرَهُمۡ وَهُمۡ يَمۡكُرُونَ﴾، تەنیا برایەکانی یوسوف نەگرێتەوە کە پیلانیان لە دژی یوسوف عليه السلام گێڕاو، بڕیاریان لە بارەیەوەدا، بەڵکو ئافرەتەکانیش بگرێتەوە کە پیلانیان گێڕا، بۆ ئەوەی یوسوف بە تەڵەو داوی گوناهو تاوانەوە بکەن، هەروەها ئەوانەی کە بڕیارياندا، یوسوف بخەنە بەندیخانەوە بە ناهەق، هەموو ئەوانەی کە فێڵیان کردو پیلانیان گێڕا، تۆ لە لای هیچ کامیان نەبووی، بەڵام کە هەواڵەکانیانت زۆر بە ڕاستیی و دروستیی و بە ڕوونیی بۆ دەگێڕدرێنەوە، دیارە ئەوە لە لایەن خوایەکەوەیە، کە ئێستاو داهاتووو ڕابردوو، بۆ وی هەمووی ڕوونە .

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾، زۆربەی خەڵکی هەرچەندە تۆ سوورو مکوڕ بی، لەسەر بڕوا هێنانیان، لەسەر هیدایەت دانیان، هەر بڕوا ناهێنن و لە بڕواداران نابن.

وشەی ﴿ٱلنَّاسِ﴾یش، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ﴾، (ال)ی سەر (ناس) کە دیارە (ال)ی تەعریفە، بەڵام دەگونجێ مەبەست پێی : (ال)ی (جِنْس) بێ، واتە: زۆربەی خەڵکی سەر زەوی، بڕوا ناهێنن، دەشگونجێ مەبەست پێی : (ال)ی (عَهد) بێ، واتە: ئەو خەڵکەی ڕۆژگاری تۆ، ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، زۆربەیان بڕوا ناهێنن، هەرچەندە مکوڕیش بی لەسەر بڕوا هێنانیان، ﴿وَمَا تَسۡـَٔلُهُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾، ئنجا کە بڕواش ناهێنن، وە نەبێ لەبەر بارگرانییەك بێ، کە تۆ دەیخەیە سەر شانیان و، داواو تەکلیفێکت لێیان

هەبێ، بەڵكو تۆ هیچ كرێو پاداشتێكیان لێ داوا ناكەی، لەسەر ئەم قورئانە، لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾، ئەم قورئانە ئەم ئیمانو ئیسلامە: تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییانو، شەرەفو ڕێزو حورمەتە بۆ جیهانییان، بۆ هەر كەسێك بڕوای پێ بێنێو لە باوەشی بگرێ، واتە: خوا ﷻ بەبێ بەرانبەر ئەو خەڵاتەی بۆ ناردوون، ئەو بیرخەرەوەیەی بۆ ناردوون .

كەواتە: كە بڕوا ناهێنن، سووچی تۆ نیە، هیچی ناگەڕێتەوە بۆ تۆ، كە تۆ بارگرانییەكت لەسەریان هەبێ، لەبەرئەوەی چاوەڕوانییەكت لێیان هەیە، بڵێن : ئەگەر بێتو بڕوا بێنین : باری شانمان گران دەبێ، نەخێر، بە بەلاش ئەو هیدایەتەی خوایان دەخەیە بەردەست .

پاشان دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾﴾، {پێشتر باسی وشەی: (كَاَيِّن)مان كرد (كَأَيِّن) واتە: زۆر}، یانی: زۆر نیشانە هەن لە ئاسمانەكانو زەویدا، ئەوانە بە لایاندا ڕەت دەبن، تێدەپەڕن، گوزەر دەكەن، بەڵام لە حاڵێكدا كە ڕوویان لێ وەرگێڕاونو ڕوویان لێ وەرچەرخاندوون .

هەڵبەتە مەرج نیە تەنیا مەبەست: ڕوو وەرچەرخاندنی بەرهەست بێ، واتە: ڕوو لەولا بكەنو سەرنج نەدەنە: مانگو خۆرو بارانو دەریاو چیاو گوڵو گوڵزارو باغو باغاتو میوەجاتو دارو درەختو دانەوێڵەو ئاژەڵو چیىو چی!! كە هەموویان نیشانەی خوان، وەك دوایی ئاماژە بە هەندێكیان دەكەین، بەڵكو مەبەست ئەوەیە: وەك چۆن كەسێك كە بەرەو ڕووی شتێك بێت، ئەگەر ڕووی لێ وەرگێڕێ، نایبینێ، ئەوانەش لەو دروستكراوانەی خواو، لەو بەڵگەو نیشانانەی بەهرەمەندن نابن، كە بیانكەنە بەڵگەی ناسینی خاوەنەكەیان، كە خوای پەروەردگارەو، بەڵگەی بەندایەتیی كردن بۆ خاوەنەكەیان، وەك چۆن كەسێك كە ڕوو لە شتێك وەرچەرخێنێو ڕووی لێ وەرگێڕێ، نایبینێ، ئەوانیش وان، واتە: مەبەست لێرەدا ڕوو وەرگێڕانی مەعنەوییە، یانی: سەرنجیان نادەن، لێیان ورد نابنەوەو، وەك نیشانەی خوا تەماشایان ناكات .

﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴾، زۆربەیان بڕوا بە خوا ناهێنن، مەگەر لە حاڵێکدا هاوبەش بۆ خوا دانەرن، واتە: کە دانیش بە بوونی خوادا دێنن، خوا دەناسن، بەڵام لە پەرستنیدا، لە بەندایەتیی بۆ کردنیدا، هاوبەشی بۆ دادەنێن، یاخود دان بە بوونی خوادا دێنن، وەك پەروەردگارو خاوەن، بەڵام هاوبەشی بۆ دادەنێن لە بەدیهێنەرایەتییو پەروەدگارێتییو خاوەنداریێتییدا، یان ناوو سیفەتەکانی خوا، بۆ خوا بەکاردێنن، بەڵام هاوبەشی بۆ دادەنێن لە ناوو سیفەتەکانیدا، ئەو ناوو سیفەتانە بۆ غەیری خواش بەکاردێنن، یان بەندایەتیی بۆ خوا دەکەن، بەڵام وێڕای خوا، بەندایەتیی بۆ شتەکانی دیکەش دەکەن، واتە: هاوبەش بۆ خوا دادەنێن لە پەرستراننیو بەندایەتیی بۆ کرانیدا .

ئنجا خوا ﷻ هەڕەشەیان لێدەکات، دەفەرمووێ: ﴿ أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأْتِيَهُمْ غَٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ ﴾، ئایا دڵنیا بوون، ئەمینن، پشتێنیان لێ کردۆتەوە، مەترسیی ئەوەیان نیە، کە داپۆشەرێك لە سزای خوا بەسەریان بێ، واتە: بەڵایەك کە دایانپۆشێو دەوریان بداو، ئابڵووقەیان بداو ڕێی دەرباز بوونو هەڵاتنیان نەبێ، ئایا دڵنیان کە ئەوەیان بەسەر نەیەت لە دنیادا؟! ﴿ أَوْ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾، یان ئایا دڵنیان ئەگەر بەڵایەکی دەورەدەرو داگیرکەرو داپڵۆسێنەریشیان بەسەر نەیەت! دڵنیان کە ئاخیر زەمان (ساعة) کتوپڕ نەیەت، (دنیا تێکچوون) بەبێ ئەوەی کە هەستی پێ بکەن، یانی: ئەویان، یان ئەمیان، یەکێکیان هەر دێ، یان بەڵایەکیان بۆ دێو دەوریان دەداو ئابڵووقەیان دەداو دایاندەپۆشێ، یاخود ئاخیر زەمان (ساعة) هەر دێو، ئەم دنیایە هەر تێك دەچێ، کەواتە: دەبوو وا بە دڵنیایی پشتی لێ نەکەنەوەو، ئاوا بێباك نەبن .

ئنجا دوایی فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات: کە ڕێبازی خۆیو شوێن کەوتووانی، بە مرۆڤایەتیی بناسێنێ: ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، بڵێ: ئا ئەمە ڕێبازی منە، (ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ چییە؟!) بانگەواز بۆ لای خوا دەکەم، (نەك بۆ لای

خۆی)، بانگەواز بۆ لای خوا، واتە: خەڵك بانگ دەكەم، كە بێن بەندایەتیی بۆ خوا بكەن، ئنجا چۆنیش ئەو بانگەوازە دەكات؟ ﴿عَلَىٰ بَصِيرَةٍ﴾، لەبەر ڕۆشنایی داو بە بەڵگەوە، هەروا لە گۆترە نیە، لەبەر ڕۆشنایی داو بە بەرچاو ڕووونیی دەربارەی بەرنامەكەی خۆی، دەزانێ خەڵك بۆچی بانگ دەكات! بە بەرچاوڕوونیی لە شێوازی بانگەوازەكەی، دەزانێ چۆنیان بانگ دەكات! بە بەرچاوڕوونیی دەربارەی خەڵكەكە، دەزانێ ئەوانەی كە بانگیان دەكات چین و چۆنن؟ كەم و كوڕییەكانیان، نەخۆشییە فیكریی و دەروونییەكانیان چین؟! نەخۆشییە كۆمەڵایەتیی و سیاسییەكانیان چین؟ ﴿أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي﴾، خۆم و ئەوانەش كە شوێنم كەوتوون، هەموومان هەر واین، خۆم و شوێن كەوتووانیشم لەبەر ڕۆشناییدا، خەڵك بەرەو خوا بانگ دەكەین، ﴿وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ﴾، (تۆ بڵێ): پاكیی بۆ خوا یانی: (أُسَبِّحُ الله) یانی: من خوا بە پاك دەگرم، بە دووری دەگرم لە هەر كەم و كوڕییەك، لە هەر ناتەواوییەك، ﴿وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾، (ئنجا بشڵێ): من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم، لەوانە نیم كە كەسێك، شتێك دێننە ئاستی خوا، چ لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتییدا، چ لە ناوو سیفاتەكانیدا، چ لە پەرسترانیدا .

ئنجا بۆ ئەوەی بۆ مرۆڤایەتیی دەربخات، كە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ بیدعەتێك نەبووە، لەو گۆڕە پەیدابێ، تەنیا خۆی بوو بێ، ڕوونی دەكاتەوە كە موحەممەد ﷺ ئاڵقەیەكە لە زنجیرەیەك و، كۆتا ئاڵقەی زنجیرەی كاروانی پێغەمبەرانە صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا﴾، لە پێش تۆدا تەنیا پیاوانێكمان ڕەوانە كردوە .

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەران تەنیا لە ڕەگەزی نێر بوون، تەنیا پیاوان بوون، ﴿نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم﴾، كە ئێمە پەیاممان بۆ دەناردن، سروشمان بۆ دەكردن، بە شێوەی پەنهان فەرمایشتمان لەگەڵدا كردوون، ﴿مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓ﴾،

لە خەڵکی ئاوەدانییە گەورەکان، شارە قەرەباڵغەکان، لەبەر ئەوەی مرۆڤ لە چ ژینگەیەکدا بژی، ئەو ژینگەیە، ئەو هەلومەرجە کاریگەریی هەیە لەسەر کەسایەتیی، لەسەر جۆری بیرکردنەوەو ئاسۆی فیکریی، کەسێك کە لە دێیەکی بچووکدا، یان لە پەڕگەیەکدا، لە بیابانێکدا بژی، بێگومان ئەو ژینگەو دەوروبەرو هەلومەرجە، کاریگەریی هەیە لەسەر جۆری بیرکردنەوەی، بۆیە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە شارە قەرەباڵغەکان، لە ئاوەدانییە گەورەکاندا ڕەوانە کراون‌و، ئاسۆی فیکرییان فراوانتر بووەو شارەزاتر بوون، وردتر بوون، سەرناستر بوون، زیاتر شارەزای خەڵك‌و دنیا بوون .

ئنجا دەفەرمووێ: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۗ﴾، ئایە بە زەمیندا نەڕۆیشتوون، سەرنج بدەن، سەرەنجامی ئەوانەی پێش خۆیان چۆن بووە ؟!

وەك زانایان دەڵێن: (سَیر)، ڕۆیشتن، ڕۆیشتنی بەرهەست هەیەو، ڕۆیشتنی مەعنەویی هەیە، ڕۆیشتنی بەرهەست ئەوەیە کە ئینسان بڕوا بە زەویدا، وڵاتان ببینێ، شوێنەوارەکان ببینێ، ڕۆیشتنی مەعنەوییش ئەوەیە کە ئینسان مێژوو بخوێنێتەوەو سەرنجی مێژوو بدات، سەرنجی بەسەرهاتی پێغەمبەران‌و گەلەکانیان بدات، ئەوەش هەر ڕۆیشتنە، بەڵام ڕۆیشتنی مەعنەویی‌و فیکریی .

ئنجا بۆیەش دەبێ بە زەویدا بڕۆن، جا چ ڕۆیشتنی بەرهەست‌و ماددیی، یان چ ڕۆیشتنی مەعنەویی‌و فیکریی، کە سەرنج بدەن: سەرەنجامی پێش ئەوان چۆن بووەو پەندیان لێ وەربگرن، ﴿وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾، بێگومان مەنزڵگای دواڕۆژ بۆ ئەوانەی کە پارێز دەکەن، باشترە لە دنیا، ئایا نافامن !

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەگەڵ کۆسپ‌و تەگەرەو لەمپەرو ناڕەحەتیی‌و نسکۆو ناسۆری زۆردا، ڕووبەڕوو دەبنەوە، دەفەرمووێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ﴾، واتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة

والسلام) ڕەوانە کران لەگەڵ گەلەکانیاندا لەگەڵ کۆمەڵگاکانیاندا خەریك بوون، مشووریان لێ خواردن، پەیامی خوایان پێگەیاندن، بەبێ ئەوەی کە هیچ چاوەڕوانییەکیان لێیان هەبێ، دڵسۆزییان بۆ نواندن، بەڵام ئەوانە بە دەنگیانەوە نەهاتن و، لەگەڵیاندا زۆر بێ نەزاکەتانە – زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵگاکان – لەگەڵ پێغەمبەراندا مامەڵەیان کرد، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ ﴾، تاکو کاتێك کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) نائومێد بوون، لە چی نائومێد بوون ؟!

دیارە هەر لەم سووڕەتەدا هاتوە: ﴿ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾ يوسف، بێگومان تەنیا کۆمەڵی بێبڕوایان لە بەزەیی خوا نائومێد دەبن، لە دەرووی خێری خوا نائومێد دەبن .

کەواتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەوە بەرزتر بوون، کە لە بەزەیی خواو، لەوە کە خوا دەرووی خێریان لێ دەکاتەوە، نائومێد بن، ئەدی لە چی نائومێد بوون؟! لە بڕوا هێنانی گەل و کۆمەڵگاکانیان نائومێد بوون، یاخود لە سەرکەوتنی دنیایی نائومێد بوون، چونکە خوا ﷻ بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)ی نەفەرمووە، حەتمەن لە دنیادا سەرتان دەخەین، هەندێ لە پێغەمبەران شەهید کراون، هەندێکیان گیراون، هەندێکیان کەس بڕوای پێ نەهێناون، کەواتە: لە شتێك نائومێد بوون، کە دیار نەبووە خوای پەروەردگار گفت و بەڵێنی پێدابن، ئەگەرنا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) شتێك خوا پێی فەرموون: ئاواتان بۆ دەکەم، بێگومان هەرگیز نائومێدیی و بێ هیوایی لەو ڕووەوە، ڕووی تێ نەکردوون.

﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ ﴾، خەڵکەکەش وایانزانی: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) درۆیان لەگەڵ کراوە، لەلایەن خواوە، واتە: ئەو بەڵێنەی کە پێیان دراوە، بۆیان نابرێتە سەر، لەگەڵیاندا نابرێتە سەر، هەڵبەتە ئەم ئایەتە مشت و مڕی زۆری زانایانی لەسەرە، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، چونکە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ ﴾،

واتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەوە نائومێد بوون کە خوا سەریان بخات، یان لەوبارەوە: خەتەرەی خراپیان بە دڵدا هاتو، خوتخوتەی شەیتانیی بە دڵیاندا هات، نەك دڵیان لەسەر چەسپاندبێ، مرۆڤیش شیاوە بۆ ئەو جۆرە حاڵەتانە لە کاتی تەنگانەو سەغڵەتیی زۆردا، ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ ﴾، پێغەمبەران وە پێیان وابوو کە ڕاستیان لەگەڵ نەکراوە، یانی: خەتەرەی شەیتانیی بە دڵیاندا هات .

بەڵام من ئەو مانایە بە دوور دەزانم، بەڵکو: ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ ﴾، خەڵکەکە وایانزانی کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، ڕاستیان لەگەڵ نەکراوە، لە لایەن خواوە .

خوێنراویشەتەوە: (وَظَنُّوا أَنَّهُم قَدْ كُذِّبوا)، ﴿ وَظَنُّوٓاْ ﴾، یانی: (إستَيْقَنوا) یان (عَلِموا) پێغەمبەران (علیهم السلام) دڵنیا بوون، زانییان کە بە درۆ دانراون لە لایەن گەلەکەیانەوە .

هەروەها خوێنراویشەتەوە: (وَظَنُّوا أَنَّهُم قَدْ كَذَبوا)، پێغەمبەران یەقینیان وا بوو کە خەڵکەکە درۆیان لەگەڵدا کردوون، ئەوانەی کە گوتوویانە: بڕوامان پێ هێناون، ڕاستیان نەکردوە .

یاخود: ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ ﴾، واتە: خەڵکەکە گومانیان وابوو، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ڕاستیان لەگەڵ نەکردوون، کە گوتوویانە: سزاو بەڵای خواتان بۆ دێ، ئەگەر ئیمان نەهێنن.

ئا لەو حاڵەتەدا: ﴿ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا ﴾، یارمەتی ئێمەیان بۆ هات، هاوکاریی ئێمەیان بۆ هات، ﴿ فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُ ﴾، ئەوەی کە ویستمان دەرباز کرا، ڕزگار کرا، لەو بەڵایەی خوا ناردوویەتی، ﴿ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُنَا عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾، بەڵای ئێمە، سزای ئێمە لە کۆمەڵی تاوانباران بەرپەرچ نادرێتەوەو ناگێڕدرێتەوە، دەبێ بیچێژن .

لـە کۆتایی دا خـوا دەفـەرمـوێ: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾، بێگومـان لـە بـەسـەرهـاتـەکـانیـاندا، واتـە: بـەسـەرهـاتی پێغـەمبـەراندا (علیهم الصلاة والسلام) پەند هـەیـە بـۆ خـاوەن عـەقڵان .

عیبـرەت لـە (عَبَر)ەوە هـاتـوە، واتـە: پەڕییـەوە، عیبـرەت ئـەوەیـە کـە ئینسـان لـە شتێکـەوە کـە دەیبینـێ، بپـەڕێتـەوە بـۆ شـتێك، کـە نـایبینـێ، لـە شـتێکـەوە کـە دەیـزانـێ بپـەڕێتـەوە، بـۆ شـتێك کـە نـایـزانـێ .

کـە بەسـەرهـاتی پێغـەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) دەخـوێنیـەوە، دەزانـی کـە ئـەوان چییـان هـاتۆتـە ڕێ، بـەهـۆی وانیشـەوە دەزانـی بـۆ خـۆشـت چیت دێتـە ڕێ! گـەلـەکـانیـان کـە بێبـڕوا بـوونو بڕوایـان پێ نـەهێنـاونو، دژایـەتییـان لـەگـەڵ کـردوون، سـەرەنجـامیـان چـۆن بـووە؟ تـۆ دەبـێ خـۆتو حـاڵو وەزعـەکـەی خـۆت قیـاس بکـەی لـەسـەر هی ئـەوان .

کـەواتـە: خـەڵکی ڕۆژگـاری تـۆش ئـەی مـوحـەممـەدو ئـەی خـوێنـەری قورئـان! کـە دژایـەتیی ئـاییـنو بـەرنـامـەی خـوا دەکـەن، سـەرەنجـامیـان هـەروەك ئـەو خـەڵکـە دەبـێ، کـە دژی پێغـەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) وەسـتاونو لـەگـەڵیـانـدا ڕووبـەڕوو بـوونـەوە .

﴿ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ ﴾، واتـە: ئـەم قورئـانـە قسـەیـەك نیـە هـەڵبـەسـترابێو، گوتـرابـێ بـە نـاوی خـواوە، ﴿ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، بـەڵکـو بـەڕاست دانـانی ئـەو کتێبو پەیـامـانـەیـە کـە لـە پێشیـەوە بـوون، لـە پێش قورئـانـدا هـاتـوون، واتـە: هـەمـوو کتێبـەکـانی پـێش خـۆی، هـەمـوو پەیـامو بـەرنـامـەکـانی پێغـەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) کـە لـە پێش قورئـانـدا هـاتـوون، هـەمـووان بـە ڕاست دەزانـێ، ﴿ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ ﴾، هـەروەهـا ڕوونکـردنـەوەو شیکـردنـەوەی هـەمـوو شـتێکـە، واتـە: هـەمـوو شـتێکـە کـە ژیـانی مرۆڤ پێویستی پێی بێ، چونکـە کـەسێك کـە بـەسـەر کێڵیی تـەمـاشای ئەم ئـایـەتـە بکات، دەڵـێ : چـۆن ؟! قـورئـان کـوا بـاسی دروسـتکـردنی شـەمـەنـدەفـەرو سـەیـارەو تـەیـارەو چیو چی تێدایـە ؟ بـەڵام :

﴿كُلِّ شَيۡءٖ﴾، واتە: هەر شتێك كە ڕوونكردنەوەی لەلایەن خواوە پێویست بێ بۆ ژیانی مرۆڤو، لە مەودای عەقڵی مرۆڤدا نەبێ، مرۆڤ نەتوانێ پەی پێ بەرێ، ئەوە خوای كارزان لە قورئاندا ڕوونی كردۆتەوە، چ پەیوەندیی بە بووناسییەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە ئیمانو عەقیدەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە خوا پەرستییەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی ڕەوشتو باری كەسێتیو خێزانییەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە حەڵاڵو حەرامەوە هەبێ، چ بە حوكمو سیاسەتەوە هەبێ، هەمووی ڕوون كراوەتەوە، ئەوەی پێویست بكات بە كورتیی، بە كورتییو، ئەوەی پێویست بكات بە درێژیی، بە درێژیی ڕوونكراوەتەوە، ﴿وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾، هەروەها ئەم قورئانە ڕێنماییەو بەزەییە بۆ كۆمەڵێك كە بڕوا بێنن .

ئەوەی كە بڕوا نەهێنێ، دیارە لە قورئان بەهرەمەند نابێو، خەتای خۆشیەتی كە لێی بەهرەمەند نابێ، وەك چۆن كەسێك كە كوێر بێ، یان كەڕ بێ، دیارە كوێر ڕەنگەكان نابینێو، كەڕ دەنگەكان نابیستێ، لە حاڵێكدا كە دەنگەكانو ڕەنگەكان هەن، بەڵام ئەو خەتای خۆیەتی، كەسانی كەڕو كوێر سووچ لە خۆیانە، كە دەنگەكان نابیستنو ڕەنگەكان نابینن .

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم :** باسکردنی ئەو ڕاستییە کە بەسەرهاتی یوسوف ﷺ لەو هەواڵە پەنهانانەیە، کە لە ڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن:

وەك خـــوا فەرموویـــەتی: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۖ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوٓا۟ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە چوار بڕگەدا

١) - ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ ﴾، واتە: ئەوەی باسکرا، لە هەواڵەکانی نادیارە .

بۆیە ئاماژەی دوورە، چونکە لە مێژە باسکراوە، لە قووڵایی مێژوودایەو ماوەیەکیشی بەسەرداچووە، کە ئەو بەسەرهاتە دەگێڕدرێتەوە، لە میانەی (٩٥) ئایەتی پێشوودا، بۆیە بە ئاماژەی دوور ئاماژەی بۆ دەکات.

وشەی: ﴿ أَنۢبَآءِ ﴾ کۆی (نبأ)ە، کە بریتییە لە هەواڵێك گرنگ بێو، مرۆڤ بگەیەنێ بە ئەنجامێك .

(الغَيْبُ: ما غابَ عَنْ عِلْمِ الناسِ، وَأَصْلُهُ مَصْدَرُ غابَ، فَسُمّي بهِ شيءٌ لا يُشاهَد)، (غَيب) ئەوەیە کە لە زانیاریی خەڵك پەنهان بێ، ئەسڵەکەشی لە چاوگی (غابَ)ەوە هاتووە، (غابَ يَغيبُ غَيْباً) واتە: پەنهان بوو، پەنهان دەبێ، پەنهان .

ئنجا ئەو شتەی کە نابینرێو، هەستی پێ ناکرێو، نازانرێ، ناوی لێنراوە: (غَیب)، ﴿ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ ﴾، واتە: ئا ئەوەی باسکرا، لە هەواڵەکانی نادیارو پەنهانە .

**٢) -** ﴿ نُوحِيهِ إِلَيۡكَ ﴾، ئێمە بۆ تۆی سروش دەکەین، ﴿ نُوحِيهِ إِلَيۡكَ ﴾، واتە: ئێمە بەشێوەیەکی پەنهان بۆ لای تۆی دەنێرین، بۆچی فەرموویەتی: ﴿ نُوحِيهِ إِلَيۡكَ ﴾و نەیفەرمووە، (نوحیها إلیک)؟ چونکە: ئەوە ڕەچاو کراوە کە: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، لە ڕووی زمانەوانییەوە بە: (المُذَكر المجازِي) دادەنرێ، ئنجا (هـ) لە وشەی ﴿ نُوحِيهِ ﴾دا، دەچێتەوە بۆ ﴿ ذَٰلِكَ ﴾.

**٣) -** ﴿ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ أَجۡمَعُوٓاْ أَمۡرَهُمۡ ﴾، ئنجا تۆ لەلایان نەبووی، کە بڕیاری خۆیانیان دەدا، ئایا مەبەست کێیە لێرەدا؟ چەند ئەگەرێکی هەن :

١- ئەوەی زیاتر دێتە زەینەوە : برایەکانی (یوسوف)ن کە بڕیاریان لە دژدا .

٢- دەشگونجێ مەبەست پێی ژنەکان بێ، کە بڕیاریان دەداو پیلانیان لە دژی یوسوف دەگێڕا .

٣- دەشگونجێ مەبەست پێی کاروانەکە بێ، کە بڕیاریاندا: یوسوف ﷺ وەك کۆیلەیەك مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، وەك ماڵێکی بازرگانیی .

٤- دەشگونجێ مەبەست ژنەکەی عەزیز بێ .

٥- دەشگونجێ مەبەست ئەوانە بێ کە خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێ : ﴿ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ ٣٥ ﴾یوسف، واتە: ئنجا دوای ئەوەی نیشانەکانیان دیتن، بۆیان دەرکەوت کە هەتا ماوەیەك بەندی بکەن .

ئەوانەی بڕیاریاندا یوسوف بخەنە بەندیخانەوە، بۆ ئەوەی بەرگریی لە سومعەو کەرامەتی ڕووشاوی خۆیان بە دەستی خۆیان، بکەن، یوسوفیان بە ناهەق خستە زیندانەوە .

٤) - ﴿وَهُمْ يَمْكُرُونَ﴾، لە حاڵێکدا کە پیلانیان دەگێڕا، (وَهُمْ يَمْكُرُونَ: حَالٌ مِنْ ضَمِيرِ أَجْمَعُوا)، لە حاڵێکدا کە پیلانیان دەگێڕا، دەچێتەوە بۆ ڕاناوی: (أَجْمَعُوا) بەڵام بۆیە بە شێوەی (مُضارِع) هاتوە، بۆ ئەوەی وێنەکە بخاتە بەرچاوو خەیاڵ تێوەی ڕابمێنێ .

ئنجا ئەگەر بشگوترێ: ئەدی ئەگەر مەبەست پێی ئافرەتەکان بێ، کە لەگەڵ ژنی عەزیزدا ئەوەیان کردوە، بۆچی فەرموویەتی: ﴿وَهُمْ يَمْكُرُونَ﴾و نەیفەرمووە: (وَهُنَّ يَمكرنَّ) ؟

دەڵێین: لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەك هەیە پێی دەگوترێ: (تَغْلِيب الذكور على الإِناث) زاڵ کردنی نێرینە بەسەر مێینەدا، لە کاتێکدا کە پێکەوە باس دەکرێن، ڕاناوی نێرینە بەکاردێ، بەڵام مێینەکانیش دەگرێتەوە .

وەك پێشتریش باسمان کرد: لەم ئایەتە موبارەکەدا، ئاماژە هەیە بە ئیعجازی مێژوویی، واتە: ئا ئەوەی باسکرا بەو وردەکارییە، بەو ڕوونییە، سەرچاوەکەی وەحیی‌و پەیامی خوای پەروەردگارە .

کەواتە: با ئەوانەی کە ئەو بەسەرهاتە دەبیستن، بزانن کە ئەوە لە لایەن خوای پەنهانزانەوە، ئەم بەسەرهاتە بەسەر تۆدا خوێنراوەتەوەو بۆ تۆ گێڕدراوەتەوە .

**مەسەلەی دووەم :** ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە زۆربەی خەڵکی، یان زۆربەی خەڵکی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ باوەڕ ناهێنن، وێڕای هەوڵدان‌و سوور بوونی‌و، داوا نەکردنی کرێ‌و پاداشتیش لێیان :

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَمَا تَسْأَلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٤﴾﴾.

## توێژینەوەی ئەم دوو ئایەتە لە سێ بڕگەدا

١) - ﴿ وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴾، زۆربەی خەڵکی هەرچەندە تۆ مکوڕ بی لەسەر بڕوا هێنانیان، نابنە بڕوادار .

لێرەدا زۆربەی خەڵکی، دەگونجێ مەبەست پێی تێکڕای خەڵك بێو، ئەلیفو لام (أل)ی سەر: ﴿ ٱلنَّاسِ ﴾، دەگرێ ئەلیفو لامی (تعریف) بێ بۆ جینس، واتە: خەڵکی سەر زەوی، زۆبەیان بڕوا ناهێنن، یاخود (أل)ی سەر ﴿ ٱلنَّاسِ ﴾، (أل)ی (عهد) بێ، واتە: ئەو خەڵکە زانراوەی لە ڕۆژگاری تۆدا هەن، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، زۆربەیان بڕوا ناهێنن، هەرچەندە تۆ سووریش بی .

(الحِرصُ: شِدَّةُ الطَّلَبِ لِتَحْصِيلِ شيءٍ وَمُعَاوَدَتُهُ) (حِرْص) بریتیە لە زۆر بە دوای شتێکدا گەڕان، بۆ پەیدا کردنی شتێكو، جار لە دوا جار هەوڵ بۆ دانی .

حیکمەت لەم ئایەتە موبارەکەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نائومێد بێ لە بڕوا هێنانی هەموویان، بۆ ئەوەی کە هەموویان بڕوایان نەهێنا، لە خۆیو پەیامەکەی نەکەوێتە گومان:

١- لە خۆی، کە کەمتەرخەمیی کردوەو، چاك پەیامەکەی نەگەیاندوە .

٢- لە پەیامو بەرنامەکەی کە کەمو کوڕیی تێدایە .

بەڵێ بۆ ئەوەیە کە: هەرچەندە بڕوا ناهێنن، بەڵام ڕێبازەکەی تۆ، بەرنامەکەی تۆ هیچ عەیبی نیەو، تۆش ئەرکی خۆت ئەنجام داوەو جێبەجێ کردوە، کەواتە: کە بڕوا ناهێنن، خەتا لە خۆیانەوەیە، وەك چۆن بابایەك کە ئاوی شیرینو زوڵاڵ دەخواتەوە، لە زاری تاڵە، لەبەرئەوەیە نەخۆشەو گرانەتای گرتوەو میزاجی تێکچووە، خەتای ئاوەکە نیە، خەتای خۆیەتی .

٢) - ﴿ وَمَا تَسْـَٔلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾، تۆ لەسەر گەیاندنی ئەم قورئانە، لە بەرانبەر ئەم پەیامو قورئانەدا کە پێیان دەگەیەنی، هیچ کرێیەکیان لێ داوا ناکەیو، هیچ پاداشتێکیان لێ چاوەڕوان ناکەی .

ئەمەش لێی وەردەگیرێ: کە لە پەنای دیندا ژیان، تاوانەو، نابێ دین بکرێتە ئامرازی ژین، بەڵام مەبەست ئەوە نیە: ئەوانەی بانگخوازنو خزمەتی دینی مسوڵمانان دەکەن، لەسەر مسوڵمانان پێویست نەبێ، کە ئەوانیش مشووری ژینەکەیان بخۆن، ئەوانیش پێویستە مشووری ژینەکەیان بخۆن، بەڵام بابایەك کە دەبێتە پێشەوای ئیسلامو دەبێتە بانگخوازو شارەزاکەری خەڵك لە ئایینو بەرنامەی خوادا، نابێ بە بەرانبەر ئەوەیان بۆ بکات، بەڵام خەڵك دەبێ هەست بە ئەرکی سەرشانیان بکەن لە بەرانبەریدا، ئنجا ئەگەر مامۆستایەکە، ئەگەر بانگخوازێکە، ئەگەر نووسەرێکە، هەرکەسێك بێ، کەسێك کە خۆی یەکلایی دەکاتەوە بۆ خزمەتی دینی خوا، نابێ هیچ چاوەڕوانییەکی لە خەڵکی هەبێ، بەڵام دەبێ خەڵك دەستبارێکی بگرنو هاوکاریی بکەن، ئەوەش ئەرکی سەرشانی خۆیانە، بەڵام ئەو نابێ بە بەرانبەر بیکات، چونکە ئەوەتا خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا تَسْـَٔلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ﴾، هەروەها لە شوێنی دیکەدا دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ص، واتە: بڵێ: من هیچ کرێیەکتان لێ داوا ناکەمو، من هیچ بارگرانییەکتان ناخەمە سەرشان .

بەڕاستیی ئەوەش زۆر گرنگە، وەك من لە کتێبی: (زانایانی ئیسلام کێنو چۆنن)دا، باسم کردوە لەوبارەوە، کە بەڵێ خەڵك بەرپرسیارە بەرانبەر بە ژیانو گوزەرانی مامۆستایانو زانایانی میراتگرانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام ئەوان نابێ هیچ چاوەڕوانییەکیان لە خەڵك هەبێو، نابێ لە بەرانبەر دابینکردنی ژیانو گوزەرانو هێنانە دی بەرژەوەندییەکدا، ئایینو بەرنامەی خوای پەروەردگاریان بۆ شی بکەنەوەو ڕوون بکەنەوە .

٣) - ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ﴾، ئەم قورئانە تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان، دەشگونجێ مەبەست لە: ﴿ذِكْرٌ﴾، شەرەفو رێزو پایەو حورمەت بێ، واتە: هەر کەسێك لە جیهانییان دەست بەم قورئانەوە بگرێ، پێی بەرز دەبێتەوە، رێزو حورمەتی پێ پەیدا دەکات، دەشگونجێ مانایەکەی ئەوە بێ کە بیرخەرەوەیە بیریان دەخاتەوە، ئەو ڕاستییانەی کە خوا لەگەڵ فیطرەتیاندا تێکی هەڵشێلاون، ئەو ڕاستییانەیان بیر دەخاتەوە .

لێرەدا چەند قسەیەکی (محمد متولّي الشعراوي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەکەی خۆیدا، بە ناوی (خواطر)[1] کە تەعبیری جوانی هێناون، دەهێنم، دەڵێ :

(إنَّ الإنْسانَ لَهُ آلاتُ اسْتِقْبالٍ هِيَ الحَواسّ الإنْسانِية، وَتنْتَقِلُ المَعْلُوماتُ أَوِ الخُبُراتُ مِنْها إلى العَمَلِيات العَقْلِية، وَتَمُرُّ تِلْكَ المَعْلُومات ببؤرَةِ الشعُورِ، لِتُحْفَظَ لِفَترة فِي هَذِهِ البؤرَة، ثُمَّ تَنْتَقِلُ إلى حَاشِية الشعُورِ، إلى أن تَسْتَدعِيها الأَحْداثُ، فَتَعُودُ مَرَّةً أُخْرَى إلى بؤرَةِ الشُّعُور).

واتە: بێگومان مرۆڤ چەند ئامرازێکی هەن، کە زانیارییان پێ وەردەگرێ، کە بریتین لە هەستەوەرەکانی کە لە مرۆڤدا دانراون {هەستی بیستنو دیتنو بۆنکردنو تامکردنو دەست لێکوتان، هەروەها خەیاڵ} ئنجا ئەو زانیارییانە، یاخود ئەو شارەزاییانە لە هەستەوەرەکانەوە دەگوازرێنەوە بۆ پرۆسە عەقڵییەکانو بیرکردنەوەو ڕامانو هەڵهێنجان، دوایی ئەو زانیارییانە دەچنە نێو نێوەڕاستی هەستکردن (واتە: لە نێو مێشکدا) دەپارێزرێن بۆ ئەوەی بۆ ماوەیەك لەوێدا هەڵبگیرێن، دوایی ئەو زانیارییانە دەچنە پەراوێزی هەستەوە، هەتا ڕووداوێك، بەسەرهاتێك، دێتە پێشێ، پێویست بەوە دەکات کە ئەو زانیارییانە بهێندرێنەوە، دووبارە دێنەوە نێو چەقی دەماغو مێشك (واتە: مرۆڤ بەکاریان دێنێ) .

١) ج ١٢، ص ٧١٠٨ و ٧١٠٩.

دوایی دەڵێ : (فَالذِّكر إذَن يكونُ لِلْعَاقِلِ مَعْونة لَهُ، وَهُوَ مِنْ ضِمْنِ رَحْمَة اللهِ بِالخَلْقِ، فَلَمْ يَتركِ الخَلْقَ مُنْشَغِلِينَ بِالنِّعْمة عَنْ مَنْ أَنْعَمَهَا عَلَيْهِ، فَهَذَا الكونُ مُنْظَّم بِدِقة بَدِيْعَة، وَفِيه كُلّ مُقوِّمات حَياة البَشَرِ، وَمِنْ فَضْلِ اللهِ عَلَيْهِم أَنَّهُ أَرْسَلَ الرُّسُلَ مُذَكِّرين لَهُمْ بِهَذَا العَطَاءِ الرباني، وَقَدْ قَدَّرَ اللهُ غَفْلَة الأَحْدَاثِ، فَجَعَلَ لَهُمْ الذكر كُلَّهُ فِي القُرآن الكريم) .

دەڵێ : کەواتە: (ذِکر) بیرخستنەوەیە بۆ بابای عاقڵ‌و، هاوکاریی کردنیەتی، هەروەها لە ڕەحمەت‌و بەزەیی خوایە بە خەڵك، کە خوا وازی لە خەڵك نەهێناوە: سەرقاڵبن بە نیعمەتەکانەوەو، ئەو زاتەی کە چاکەکانی لەگەڵدا کردوون، لێی بێ ئاگابن‌و، ئەم بوونەوەرە زۆر بە وردییەکی سەرسووڕهێنەر ڕێکخراوەو، هەموو پێداویستییەکانی ژیانی بەشەری تێدان‌و، لە چاکەی خوا بەسەر خەڵکەوە ئەوەیە، کە پێغەمبەرانی ناردووون کە ئەو بەخششەی پەروەردگاریان بیر بخەنەوەو، خوا ﷻ ڕووداوەکانی وا لێکردووون کە مرۆڤەکان جارجار بێ ئاگا دەبن، بۆیە هەرچی مەبەستی گرنگ‌و پێویستە کە بیریان بکەوێتەوە، لە قورئاندا دایناوە، بۆیە یەکێك لە ناوەکانی قورئان بریتییە لە (ذِکر) واتە: بیرخەرەوە .

چونکە لە ڕاستییدا مرۆڤ خوای خۆی دەناسێ‌و، خۆی دەناسێ‌و، ڕاستییەکان لەگەڵ فیطرەتی مرۆڤدا تێك هەڵشێلدراون، بەڵام پێغەمبەران هاتوون ئەو ڕاستییە بنەڕەتییانەیان بیر بخەنەوەو، لە ڕێی وەحییشەوە تەفاصیل‌و وردەکاریی ئەوەی کە لە ڕێی عەقڵەوە پەی پێ نابردرێ، فێریان بکەن‌و بیانخەنە بەر چاویان .

**مەسەلەی سێیەم : بەڵگەو نیشانەکانی ناسینی خوا (عز و جل) لە ئاسمان‌و زەویدا زۆرن، بەڵام بێبڕوایان لێیان بێ ئاگان‌و، سەرنجیان نادەن‌و تێیانەوە ڕانامێنن :**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾﴾ .

**توێژینەوەی ئەم ئایەتە لە دوو بڕگەدا**

**١) -** ﴿ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، واتە : زۆر نیشانەو بەڵگە هەن لە ئاسمانەکانو زەویدا، نیشانەو بەڵگە هەن، لەسەر چی؟ لەسەر ناسینی خوا، لەسەر پەروەردگارێتیی خوا، لەسەر خاوەنداریێتیی خوا بۆ بوون.

پێشتریش باسمان کرد: وشەی: (كَأيِّن) کە بە مانای {زۆر} دێ، لە (ك)ی (تَشبیه)و (أي) پێکهاتوە، کە مانای (كَمْ) دەگەیەنێ، واتە: زۆر هەن .

(آیة)یش بە مانای نیشانە دێو، بە مانای بەڵگەش دێ، واتە: زۆر بەڵگەو نیشانە هەن، لەسەر تەنیا پەرستراوێتیی خوا، پەروەردگارێتیی خوا، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ: مەبەست پەروەردگارێتییو تەنیا پەرستراوێتیی خوا بێ، نەك بوونی خوا ﷻ، بە بەڵگەی ئەوەی دوای ئەم ئایەتە باسی هاوبەش بۆ خوا دانان کراوە : ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾.

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴾، بە لایاندا ڕەت دەبن بە لای ئەو نیشانەو بەڵگانەدا، لە حاڵێکدا ڕوویان لێ وەرچەرخاندوون، پێشتریش باسمان کرد، ئەو ڕوو لێ وەرچەرخاندنە، مەرج نیە مەبەست پێی ڕوو وەرچەرخاندنی بەرهەستو جەستەیی بێ، بەڵکو دەگونجێ مەبەست پێی ڕوو وەرچەخاندنی مەعنەویی بێ، چونکە ئەگەر ئینسان لە دەروونەوە، بە قەلبو قەناعەتەوە، سەرنجی شتێك نەدا، با تەماشاشی بکاتو تێشی ڕابمێنێ، هەروەك ئەوە وایە ڕووی لێ وەرگێڕابێ .

ئنجا بۆیەش وا گوتراوە، چونکە کاتێك کە ئینسان ڕووی لە شتێك وەردەگێڕێ، نایبینێ، کاتێك ئینسان سەرنجی شتێك نەداو تێوەی ڕانەماو، لێی ورد نەبووەوە، وەك سەرنجی نەدابێو تەماشای نەکردبێ، بە چاوی سەر وایە، کەواتە : ﴿ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴾ یانی :

بەلایاندا دەگوزەرێن‌و ڕەت دەبن، لە حاڵێكدا كە ڕوویان لێ وەرگێڕاون، واتە: گرنگیی‌و بایەخ نادەنە ئەو ئایەتانەو ئەو دیاردەو دیمەنانە كە نیشانەو بەڵگەن، لەسەر تەنیا پەرستراوێتیی خوا، لەسەر پەروەردگارێتیی خواو لێیان بەهرەمەند نابن، چونكە لێیان ورد نابنەوە .

هەڵبەتە ئێمە پێشتریش بە پێی موناسەبەتی هەندێك لە ئایەتەكان، ئاماژەمان كردوە بۆ ژمارەیەك لە نیشانەو بەڵگەكانی پەروەردگارێتیی خوا، ئەو دیاردەو دیمەنانەی كە سیفەت‌و ناوە بەرزو بێ وێنەكانیانی خوای پەروەردگاریان تێدا دەدرەوشێنەوە، وەك من كاتی خۆی لە شیعرێكدا گووتومە :

سروشت ئاوێنەی تەجەللای خوایە

باش سەرنجی بدە بزانە چی تیایە

لە ڕێی (كر)ەوە كرگار دەناسرێ

سروشت (كر)ێكەو كردگاری خوایە

# چەند زانیارییەك لەبارەی هەندێك لە دیاردە گەردوونییەكان

(د. محمد راتب النابلسي) لە تەفسیرەكەی[1]دا، ئاماژەی بە هەندێك شت داوە، منیش بە كورتیی لێم وەرگرتوون :

## خۆر

كە پێشتریش لە چەند شوێنێكدا باسمان كردوە: ملیۆنێك‌و سێ سەد هەزار (١,٣٠٠,٠٠٠) جار هێندەی زەوییە، واتە: ئەو خۆرەی كە ئێمە دەیبینین‌و لە پێش چاوی ئێمە بە قەد بێژینگێكە، ملیۆنێك‌و سێ سەد هەزار زەوی وەك ئێمە دەگرێتە خۆی .

## مانگ

(٣٦٣,٠٠٠ كلم - ٤٠٦,٠٠٠ كلم) (معدّل)ەكەی (٣٨٤,٤٠٠) كلم لە زەوییەوە دوورەو بە كەمتر لە چركەیەك‌و (٤/١)ی چركەیەك تیشكەكەی دەگاتە زەوی، چونكە تیشك لە چركەیەكدا (٣٠٠,٠٠٠) سێ سەد هەزار كیلۆمەتر دەبڕێ، ئنجا ڕووناكیی مانگ، بە كەمتر لە چركەیەك‌و چواریەكی چركەیەك دەگاتە سەر زەوی .

---

١) ج ٤ ، ص ٥٤١ و ٥٤٢.

## کەهکەشان

ئەوەی کە بە کوردیی پێی دەڵێن: ڕێی کاکێشان، بە عەرەبی پێی دەڵێن: (دَرْبُ التَّبّان) واتە: ڕێی کا پێدا کێشراو، وا دیارە کوردیش هەر لەوەوە وەریانگرتووە، یان بە پێچەوانەوە عەرەب لە کوردیان وەرگرتووە، بە ئینگلیزیی پێی دەڵێن: (Milk Way)، بە فارسی پێی دەڵێن: (ڕاهی شیری) ڕێی شیری، کە دیارە ئەوانیش لە زمانیی ئینگلیزییەوە وەرگرتووە، یان بە پێچەوانەوە، گرنگ ئەوەیە ئەوانە وایان تەصەووڕ کردوە کە ئەوە (کا)ی پێداکێشراو لێی ڕژاوە، یان ڕێیەکەو شیری پێدا براوەو، شیری پێدا ڕژاوە بۆیە سپی دەچێ .

ئنجا کەهکەشانەکەی ئێمە، کە یەکێکە لە ملیۆنان کەهکەشان کە پێشتر باسمان کردوە، درێژیی (طول)ی سەدو پەنجا هەزار (١٥٠,٠٠٠)ساڵی تیشکییە، یانی تیشك بە (١٥٠,٠٠٠) هەزار ساڵ ئنجا ئەو سەرو ئەو سەری کەهکەشانەکەی خۆمان دەکات .

## ئەستێرەی قوتب

کە دوای خۆر نزیکترین ئەستێرەیە لە ئێمەوە، واتە: لەو کەهکەشانەدا کە ئێمە تێیداین، چونکە خۆریش بۆخۆی ئەستێرەیەکەو نیزیکترین ئەستێرەیە لێمانەوە، ئنجا ئەستێرەی (قطب) چوار هەزار (٤,٠٠٠) ساڵیی تیشکی دوورە لە زەوی، یانی: دوای چوار هەزار ساڵ، ئنجا تیشکەکەی دەگاتە ئێمەو، ئەو تیشکەی ئێستا دەیبینین، هی چوار هەزار ساڵ لەمەو پێشە!

## کەهکەشانی دیکە

کەهکەشانی وا هەیە کە هەژدە ملیار (١٨,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵی تیشکیی لە ئێمەوە دوورە، ساڵی تیشکییش وەك پێشتر باسمان کردوە، واتە: ئەو ماوەیەی کە تیشك لە ساڵێکدا دەیبڕێ، کە ئەویش چۆن بۆمان دەردەکەوێ ؟

ئاشكرایە كە تیشك لە چركەیەك دا سێ سەد هەزار (٣٠٠,٠٠٠) كلم، دەبڕێ، ئنجا دەبێ ئەو (٣٠٠,٠٠٠) جارانی (٦٠) بكەین بۆ ئەوەی بزانین داخۆ لە خولەكێكدا، چەندە؟ چونكە خولەكێك (٦٠) چركەیە، پاشان ئەنجامەكەی كە هەژدە ملیۆن (١٨,٠٠٠,٠٠٠)ە، جارێكی دیكە جارانی (٦٠) بكەین، بۆ ئەوەی بزانین لە سەعاتێكدا چەندە؟ كە (١,٠٨٠,٠٠٠,٠٠٠) ئنجا دوایی ئەنجامەكەی جارانی (٢٤) بكەین كە دەكاتە (٢٥,٩٢٠,٠٠٠,٠٠٠) چونكە شەوو ڕۆژێك (٢٤) سەعاتە، دوایی ئەنجامەكەی جارانی (٣٦٥) بكەین، كە ژمارەی ڕۆژەكانی ساڵە، ئنجا ئەنجامەكەیمان بۆ دەردەكەوێ كە لە ساڵێكدا تیشك چەند دەبڕێ؟ كە نۆ تریلیۆن‌و چوار سەدو شەست ملیارو هەشت سەد ملیۆنە، بەم شێوەیە :

٣٠٠,٠٠٠×٦٠×٦٠×٢٤×٣٦٥=٩,٤٦٠,٨٠٠,٠٠٠,٠٠٠.

واتە : تیشك (ضوء) لە ساڵێك دا نیزیكەی نۆ ترلیۆن‌و نیو كیلۆمەتر دەبڕێ .

## ئـــاو

ئاوی شیرین تەنیا لە ڕێی ئاوی ئاسمانەوەیە، هەرچی ئاوی شیرینەو بەكەڵكی خواردنەوە دێ، هەمووی دەبێ لە ئاسمانەوە بێ : پێشێ هەڵمی دەریاكان كە تیشكی خۆر لێی دەداو بەرز دەبێتەوەو، دەبێتە هەور، پاشان لە ڕێی باران‌و بەفرو تەرزەوە دێتە خوار، بە شێوەی باران‌و بەفرو تەرزە، ئاوی شیرین تەنیا ئەوە ڕێگەكەیەتی، ئەگەرنا ئاوی ئۆقیانووسەكان (المحیطات) هەمووی تاڵ‌و سوێرە، تاكە ڕێگای وەدەستكەوتنی ئاوی شیرین، ئەوەیە كە باسمان كرد، دەبێ خوای بەرز بیپاڵێوێ‌و، لە شێوەی بەفرو تەرزەو باراندا بێتە خوار، تەنیا ئەوە ڕێگەكەیەتی.

## شـــیر

ئەو شیرەی كە لە ئاژەڵان دەدۆشرێ، ئێستا بە مەزندە، لە هەر چركەیەكدا سێ سەد هەزار مەتر سێجا (٣٠٠,٠٠٠)م٣ شیر دەدۆشرێ، كە ئەوە ئەگەر كۆبكرێتەوە، بە ئەندازەی ڕووبارێكی گەورەیە، بە ئەندازەی

ڕووباری (ئەمازۆن)ە، کە ڕووبارێکی زۆر گەورەیە، ئەو شیرەی کە لە دنیادا دەدۆشرێ‌و، مرۆڤ لێی بەهرەمەند دەبێ، هێندە دەبێ !

## خوێن و گۆشتی ئاژەڵ

ئنجا تەنیا (گۆشتی ئاژەڵ) مەڕو بزن (ئاژەڵی ورد) کە سەر دەبڕدرێن، دەڵێ: ئەگەر هەر (٥,٠٠٠) هەزار کەس ڕۆژانە مەڕێکیان بگاتێ، یەك سەر مەڕ، دەبێ ڕۆژانە یەك ملیۆن سەر مەڕ سەر ببڕدرێ، ساڵانە دەکاتە: (٣٦٥,٠٠٠,٠٠٠) ملیۆن، ئنجا ئەوە ئەگەر بێت‌و خوێنەکەیان ڕووبارێکیان لێ پێکبێ، ڕووبارێکی قەبەی دنیا دەبێ .

## میوەو دانەوێڵە

ئەگەر باسی میوە بکەین، میوەو دانەوێڵە ئێمە لە یەك پارچە زەوی دەبینین یەك زەویمان هەیە، سەدان جۆرە، میوە، دانەوێڵە، درەخت، تەڕەکاڵ، وەك: شووتی‌و کاڵەك‌و ترۆزیی‌و خەیار، کە هەریەکەی تامێك، هەریەکە ڕەنگێك، هەریەکەی بۆنێك، هەریەکەی جۆرە ڤیتامینێك‌و ئەو ماددانەی کە جەستەی مرۆڤ پێویستی پێیانە، لە خۆیدا جێ دەکاتەوە، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (الرعد)دا ئاماژەی پێداوە: ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ٤ ﴾ الرعد، هەڵبەتە بەڵگەو نیشانە لەسەر پەروەردگارێتیی خواو تەنیا پەرستراوێتیی خواو، لەسەر ئەوە کە چاکەکانی خوا نایەنە ئەژمار، وەك لە سووڕەتی (إبراهیم) لە ئایەتی (٣٤)دا، فەرموویەتی: ﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآ ﴾، کە بێگومان هەموو نیعمەتەکانی خوا نیشانەن لەسەر پەروەردگارێتیی‌و پەرستراوێتیی خوا .

**مەسەلەی چوارەم** : ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە زۆربەی خەڵکی بڕوا ناهێنن، مەگەر لە حاڵەتی هاوبەش بۆ خوا داناندا :

وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾، واتە: زۆربەیان بڕوا بە خوا ناهێنن، مەگەر لە حاڵێکدا کە هاوبەش بۆ خوا دانەر بن .

(الشوكاني) ئاوا ئەم ئایەتە موبارەکە مانا دەکا: (أَي: وَما يُصَدِّقُ وَيُقِرُّ أَكْثَرُ الناسِ باللّهِ مِنْ كونِهِ الخالِق الرَّزاق المحيي المميت ﴿إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾، باللّهِ، يَعْبُدونَ مَعَهُ غَيْره)[1].

واتە: زۆربەی خەڵکی بڕوا بە خوا ناهێنن، کە هەر ئەو بەدیهێنەرو ڕۆزیدەرو ژیێنەرو مرێنەرە، مەگەر لە حاڵێکدا کە جگە لە خۆی لەگەڵیدا دەپەرستن .

ئێمە لێرەدا باسێکی گرنگ لە بارەی هاوبەش بۆ خوا دانان (الشرك)ەوە، دەخەینە ڕوو، کە من ئەو باسەم لە مەوسووعەی: (الإسلامُ كما يتجلّى في كِتاب الله) هێناوە، کە لە چاپی یەکەمیدا، بەرگی هەشت، لاپەڕەکانی: (١٩٦ تا ٢٥٤) واتە: نیزیکەی (٦٠) لاپەڕەم بۆ تەرخان کردوە، ئێمە لەبەر ڕۆشنایی ئەو سەرچاوەیەدا بە کورتو پوخت کردنەوەوە، ئەو باسە دەخەینە ڕوو:



١) فَتحُ القديرج ٣، ص ٦٩.

# باسێكی گرنگ لەبارەی هاوبەش بۆ خوادانان (شرك)ەوە

**دەستپێك:**

سەرەتا دەڵێین: هاوبەش بۆ خوا دانان (الشرك باللّه) ڕێكو ڕاست : دژو پێچەوانەی خوا بە یەكگرتنە، خوا بەیەكگرتن (توحیداللّه) واتە: تەنیا خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن زانینو، ئەو ناوو سیفەتانەی بۆ خوا بەكاردەهێنرێن، بۆ جگە لە خوا بەكارنەهێنرێنو، بەندایەتیو پەرستش تەنیا بۆ خوا ئەنجام بدرێ .

(شرك) واتە: هاوبەش بۆ خوا دانان، ڕاست دژو پێچەوانەی خوا بە یەكگرتن (توحید)ە، واتە:، هەڵبەتە خوا بە یەكگرتن، بریتیە لە چەقو بناغەی ئایینو بەرنامەی خوا، ئەو ئایینو بەرنامەیەی خوا كە بۆ هەموو پێغەمبەرانی ناردوەو بە هەموو پێغەمبەراندا ناردوویەتی صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، بەڵكو خوا ﷻ كتێبەكانی نەناردوەو، پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) ڕەوانە نەكردوون، مەگەر ئامانجو مەبەستی سەرەكیی: دابەزێنرانی كتێبەكانی خواو، ڕەوانە كرانی پێغەمبەران، ئەوە بووە كە خوا بە یەك بگیرێ، تەنیا خوا وەك تاكە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن، هەروەها وەسفكراوو ناوبراو بەو ناوو سیفەتانەی كە تەنیا شایستەی ئەون، دابنرێو، پەرستشو بەندایەتیی تەنیا بۆ وی ئەنجام بدرێ، هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆ ئەوە هاتوونو، كتێبەكان تەنیا بۆ ئەوە دابەزێنراون، هەر بۆیە دوا كتێبی خوا

کە قورئانە، گرنگیی و بایەخێکی زۆری داوە بە ڕوونکردنەوەی خوا بەیەکگرتن و، پووچەڵکردنەوەی پێچەوانەکەی و دژەکەی، کە بریتیە لە هاوبەش بۆ خوا دانان، ئنجا ئێمە هەوڵ دەدەین لە حەوت تەوەردا، باسی هاوبەش بۆ خوا دانان بکەین :

**تەوەری یەکەم :**

نێوەڕۆك و کرۆکی هاوبەش بۆ خوا دانان (حَقيقة الشِّرْكِ بالله تعالى):

**تەوەری دووەم :**

هاوبەش بۆ خوا دانان، ئەو گوناهە مەزنەیە کە هەرگیز خوا لێی نابووریٚ.

**تەوەری سێیەم :**

پێناسەی هاوبەش بۆ خوا دانانی گەورەو، هاوبەش بۆ خوا دانانی گچکە.

**تەوەری چوارەم :**

هۆکارە ڕاستەقینەکانی هاوبەش بۆ خوا دانان و، پاساوەکانی هاوبەش دانەران، بۆ هاوبەش بۆ خوا دانانیان و، پووچەڵ کردنەوەیان.

**تەوەری پێنجەم :**

جۆرەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران .

**تەوەری شەشەم :**

هەڵوێستی هاوبەش بۆ خوا دانەران، لە بەرانبەر ئیسلام و مسوڵمانانداندا .

**تەوەری حەوتەم :**

گیرۆدە بوونی هەندێك لە مسوڵمانان بە هاوبەش بۆ خوا دانان (الإشراك بالله)ـەوە .

**تەوەری یەکەم:**

## نێوەڕۆك و كرۆكی هاوبەش بۆ خوا دانان

## (حَقيقَة الشِّرْكِ بِالله تعالى):

لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (شَرِكَ فُلانٌ فُلاناً فِي كَذَا، إِذَا اشترك مَعَهُ فِي أَمْرٍ وَسَاهَمَهُ فيهِ، ويُقَالُ: أَشْرَكَ فُلانٌ فُلاناً فِي كَذَا، إِذَا جَعَلَهُ سَهِيماً وَشَرِيكاً لَهُ فيهِ)[1].

واتە: دەگوترێ: فڵانکەس بوو بە هاوبەشی فڵانکەس لە فڵان شتەدا، واتە: بوو بە خاوەن پشك و بەش لەگەڵی لەو شتەدا، هەروەها دەگوترێ: فڵانکەس فڵانکەسی کردە بەشدارو هاوبەش لە فڵان شتەدا، واتە: کردیە خاوەن پشك و بەش و هاوبەش .

ئنجا کتێبی کاربەجێی پەروەردگار، وشەی (شِرك)ی هەر لەسەر بناغەی مانا زمانەوانییەکەی بەکارهێناوە، کەواتە: (الشِّرْكُ بِالله) یان (الإِشْرَاكُ بِالله) دەبێتەوە بە چی ؟

دەبێتەوە بەوە کە: خوا ﷻ هاوبەشێك، یاخود پشکدارێك، یاخود کەسێك کە لەگەڵیدا یەکسانە لە کارێك لە کارەکانی دا، کە تایبەتن بە خواوە، بۆی دابنرێ، ئنجا چ کەسێك بکرێتە هاوبەشی، چ کەسێك لەگەڵیدا یەکسان بکرێ، لە شتێکدا کە تایبەتە بە خواوەو، بکرێتە خاوەن پشك و بەش .

هاوبەش بۆ خوا دانانیش بە گشتی سێ جۆرە :

---

١) مُفردات ألفاظ القُرآن، ص ٤٥١ و ٤٥٢.

جۆری یەکەم: هاوبەش بۆ دانانی لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەدگاریێتیی و خاوەنداریێتییدا :

ئەویش بریتییە لەوەی جگە لە خوا، (کە جگە لە خواش، تەنیا دروستکراوەکانی خوانو، تەنیا ئەو شتانەن کە خوا دروستیکردوونو، بەخێویان دەکاتو، سەرپەرشتییان دەکاتو، خاوەنداریێتییان دەکات)، جگە لە خوا بە جۆرێك لە بەدیهێنەرایەتیی، یان پەروەردگاریێتیی، یان خاوەنداریێتیی وەسف بکرێ .

جۆری دووەم: بریتییە لە هاوبەش بۆ خوا دانان لە ناوو سیفەتەکانی، یان لە کارەکانیدا، ئەویش ئەوەیە کە کەسێك یان شتێك، وەصف بکرێ، بە یەکێك لە ناوو سیفەتە هەرە بەرزو چاکەکانی خوا، یاخود کەسێك یان شتێك یەکێك لە کارەکانی خوای پاڵ بدرێتە لا .

جۆری سێیەم: بریتییە لە هاوبەش بۆ خوا دانان، لە پەرستراویێتیی و سەرپەرشتیاریێتیی و بڕیار بە دەستێتیی دا :

ئەویش ئەوەیە کە جگە لە خوا بکرێتە پەرستراو، یان بکرێتە سەرپەرشتیار، یان بکرێتە بڕیار بە دەستو حوکمڕان، بە مانای دانەری حەڵاڵو حەرام، لە شتێك لە شتەکاندا، مەرج نیە بە ڕەهاییش .

هەڵبەتە جگە لە خوا کردن بە پەرستراو، چەمکەکەی فراوانەو هەمیشە پەرستراویێتیی (الألوهية) هەر کام لە :

١- سەرپەرشتیاریێتیی (الولاية).

٢- بڕیار بە دەستێتیی (الحاكمية)ش پەلکێش دەکاتو خوازیاریانە .

مەبەست لە جگە لە خوا پەرستنیش، ئەوەیە کە شتێك لەو پەرستشە کە تایبەتە بە خواوە، بۆ غەیری خوا پێشکەش بکرێ، وەك: لێ پاڕانەوە، هاوار تێبەستن، فەرمانبەریی ڕەها، ئەوپەڕی خۆشویستن، ئەوپەڕی لێترسان، ئەوپەڕی پشت پێ بەستن، ئەوپەڕی بە مەزن گرتن، نەزر بۆ کردن، ئاژەڵ بۆ سەربڕین، سوێند پێ خواردن ... هتد .

لە قورئانی بەرزو مەزندا خوا ﷻ زۆرباش تیشکی خستۆتە سەر مەسەلەی پووچەڵ کردنەوەی شیرك و هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی هاوبەش بۆ خوا دانان، بەڵام ئێمە دەرفەت نیە هەموو ئەو ئایەتانە بێنین، کە من لەو سەرچاوەیەی ئاماژەم پێدا، لە پازدە (١٥) بڕگەدا هێناومن و بڕگەی واش هەیە حەوت هەشت ئایەتی تێدان، بۆیە یەکسەر ئێمە دێینە سەر ئەو ئەنجامگیرییەی کە لە ئایەتەکانی قورئان وەردەگیرێ، بۆ پێناسەکردنی هاوبەش بۆ خوا دانان، بە کورتیی و پوختیی وەریدەگرین، کە ئایا هاوبەش بۆ خوا دانان یانی چی ؟!

دەڵێین: هەروەك چۆن خوا بە یەکگرتن لە پەرستراوێتیی دا، ئەوە کە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ، (يستند إلى التوحيد) پاڵ وە خوا بەیەکگرتن دەدا لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەنداریێتییدا، بە هەمان شێوەش، هاوبەش بۆ خوا دانانیش لە پەرستراوێتیی و لە بەندایەتیی کردن دا، لە هاوبەش بۆ خوا دانانەوە پەیدا دەبێ، لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەنداریێتییدا، واتە: وەك چۆن خوا بە یەکگرتن لە پەرستراوێتییدا لەسەر بناغەی خوا بە یەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەنداریێتییدا، بنیات دەنرێ، بە هەمان شێوەش هاوبەش بۆ خوا دانانیش لە پەرستراوێتییدا، لەسەر بناغەی هاوبەش بۆ خوا دانان لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەنداریێتییدا، بنیات دەنرێ، یانی: کەسێك هاوبەش بۆ خوا دادەنێ لە پەرستنیدا، کە پێشتر هاوبەشی بۆ دانابێ، لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەنداریێتییدا، ئەگەرنا بۆچی دەیکاتە هاوبەش بۆ خوا؟ بۆچی دەیهێنێتە ئاستی خوا؟ دیارە یان بەدیهێنانی شتێك لە شتەکان لەو شتە، یان لەو کەسە، دەزانێ، یان پەروەردەکردن و سەرپەرشتییکردن، لەو کەسە یان لەو شتە دەزانێ، یان خاوەنداریێتیی لەو کەسە یان لەو شتە دەزانێ، بۆیە دەیهێنێتە ئاستی خوا، لە بەندایەتیی بۆ کردن و پەرستندا.

ئنجا ئەوە کە: خوا بە یەکگرتن لە پەرستنی خواو تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن دا، لەسەر بناغەی : تەنیا خوا بە بەدیهێنەرو، بە پەروەردگارو، بە خاوەن، زانین، بنیات دەنرێ، ئەمە لە زۆر ئایەتاندا ڕوونکراوەتەوە، بۆ وێنە:

١- لە ئایەتەکانی (٢١ و ٢٢)ی سوورەتی (البقرة)دا، خوا ﷻ دەفەرمووێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە:

ئەی خەڵکینە! ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن کە ئێوەو ئەوانی پێش ئێوەی هێناوەتە دی، بەڵکو پارێز بکەن، ئەو (خوا) پەروەردگارەتان کە زەوی بۆ ڕاخستوونو، ئاسمانی بۆ کردوونە سەربانو، لە سەرێوە ئاوی بۆ ناردوونە خوار، جۆرەها میوەی پێ دەرهێناوە، کە ببێتە بژیو بۆتان، کەواتە: هاوتایان بۆ خوا دامەنێن، لە کاتێکدا دەزانن .

واتە: لە کاتێکدا دەزانن کە تەنیا خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنو مشوورخۆرتانە، هاوتاو هاوویَنانی بۆ دامەنێن لە پەرستنیدا .

٢- لە ئایەتەکانی: (١٦٣ و ١٦٤ و ١٦٥) لە سوورەتی (البقرة)دا، کە خوا ﷻ لە ئایەتی (١٦٣) دا تاکیەتیی (وحدانیة)ی خۆی لە پەرستراوێتییدا، ڕادەگەیەنێو دەفەرمووێ: ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾ ﴾، واتە: پەرستراوی ئێوە، یەك پەرستراوە، جگە لەوە هیچ پەرستراوێك نیە، خاوەنی ئەوپەڕی بەزەییە لە دنیاو دواڕۆژدا .

ئنجا دوایی لە ئایەتی (١٦٤)دا واتە: ئایەتی دوای وی، بۆ سەلماندنی ئەوە کە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێو بەندایەتیی بۆ بکرێ، بەڵگە بەوە دێنێتەوە کە خوا ﷻ دە (١٠) جۆرە نیشانە لەسەر تەنیا بەدیهێنەرایەتیی‌و، تەنیا پەروەردگارێتیی ڕەهای خۆی، لە هەموو شتێك دا دەخاتە ڕوو:

وەك فەرموویەتی : ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِى تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ

﴿وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾﴾، کە ئەو دە (١٠) نیشانانەش ئەمانەن :

١و٢ – دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی.

٣و٤ – جێ گۆڕکێو جیاوازیی شەو ڕۆژانو، بە دوای یەکدا هاتنیان .

٥ – ئەو کەشتییانەی کە بە دەریاکاندا دێنو دەچن .

٦ – ناردنە خواری ئاو لە ئاسمانەوە .

٧ – زیندوو کردنەوەی زەوی بە ڕووەكو دانەوێڵەو میوەی جۆراوجۆر.

٨ – بڵاوکردنەوەی زیندەوەرو ئاژەڵانی جۆراو جۆر لە هی ئاوییو هەواییو زەمینیی، کە بە هەزاران جۆر دەژمێردرێن .

٩ – جیاوازیی هەڵکردنی بایەکان .

١٠ – ئەو هەورانەی کە لە نێوانی ئاسمانو زەوییدا ڕام کراونو هەڵدەگیرێن .

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾، ئایا نافامن، واتە: ئەگەر عەقڵتان هەبێو فامیدە بن، خوایەك کە ئەو هەموو کارانە بۆ ئێوە دەکات، ئەو هەموو مشوورەی ئێوەی خواردوە، دەبێ هەر ئەویش بپەرستن .

هەر بۆیەش لە ئایەتی ژمارە (١٦٥)دا، خوا ﷻ ئاماژە دەکات بە لادانی هەندێك لە خەڵك لە تەنیا پەرستنی خواداو، تەنیا تایبەت کردنی خوا بە بەندایەتییو پەرستنەوە، ئەویش بەوە کە جگە لە خوا، دەکەن بە هاوتای خوا، لە خۆشویستنیاندا، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ﴿١٦٥﴾﴾البقرة، واتە: لە خەڵکی کەسانێك هەن: جگە لە خوا هاوتایان دەگرن،

وەك خۆشویستنیان بۆ خوا، خۆشیان دەوێن، بەڵام ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە، خۆشەویستی ئەوان بۆ خوا، زیاترە لە خۆشەویستی ئەو جۆرە کەسانە بۆ پەرستراوەکانی خۆیانو، ئەگەر ئەوانەی ستەمیان کردوە دەیانبینی کاتێك کە ئازاری دۆزەخ دەبینن کە هێز هەمووی هی خوایەو ئازاری توندی هەیە (بۆ ستەمکاران) {بێگومان زۆر پەشێمان دەبنەوە} .

لە کۆتایی ئەم تەوەری یەکەمەش دا دەڵێم :

پێم وایە ڕوونترین پێناسە بۆ هاوبەش بۆ خوا دانان (الإشراك بالله) ئەو ڕستە قورئانییەیە، کە خوای زاناو شارەزا لەسەر زمانی هاوبەشدانەرەکان (المشركين) فەرموویەتی: ﴿ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾الشعراء، واتە: بە خوا بە دڵنیایی ئێمە لە گومڕاییەکی ڕووندا بووین، کە ئێوەمان لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییاندا یەکسان دەکردو دەمانهێنانە ئاستی خوا.

بەڵێ، شیرك بریتیە لە یەکسان کردنو، وەك یەك تەماشاکردنی دروستکراوێك یان زیاتر لە دروستکراوەکانی خوا، لەگەڵ خوادا، چ بە ڕەهاییو لە هەموو ڕوویێکەوە، چ لە بوارێك لە بوارەکان دا، یان یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی خوادا سبحان و تعالى .

تەوەری دووەم :

## هاوبەش بۆ خوا دانان، ئەو گوناهە مەزنەیە کە هەرگیز خوا لێی نابووریٚ :

ئەوە کە خوا ﷻ لە شیرك نابووریٚ، هەروەك چۆن لە کوفرو لە نیفاقی گەورەش نابووریٚ، لە چەندان ئایەتدا ڕوون کراوەتەوە، بۆ وێنە:

١) لە ئایەتی ژمارە (٤٨)ی سوورەتی (النساء)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: بێگومان خوا لەوە نابووریٚ هاوبەشی بۆ دابنریٚو، جگە لەوە لە هەر کەسێك دەبووریٚ کە بیەویٚ، هەر کەسێکیش هاوبەش بۆ خوا دابنیٚ، ئەوە بوختانێکی مەزن، یاخود گوناهێکی مەزنی هەڵبەستوە .

٢) هەر لە سوورەتی (النساء)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ ﴾، واتە: بێگومان خوا لەوە نابووریٚ هاوبەشی بۆ دابنریٚ، بەڵام لەوە خوارو جگە لەوە، بۆ هەر کەسێك بیەویٚ، لێی دەبووریٚ، هەر کەسێکیش هاوبەش بۆ خوا دابنیٚ، گومڕاییەکی دوور گومڕا بووە .

٣) لە سوورەتی (الزمر)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ ﴾، واتە: بێگومان سروش بۆ لای تۆ کراوەو، بۆ لای ئەوانەی پێش تۆش کراوە، {واتە: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە لە پێش تۆدا هاتوون} کە ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی، کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوەو، لە زیانباران دەبی .

٤) لە سوورەتی (الحج)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ، وەك ئەوە وایە لە ئاسمانێ کەوتبێتە خوارو، باڵندە ڕفاندبیان، یاخود با خستبیە خوارو بردبی بەرەو شوێنێکی دوور .

٥) هەروەها لە سوورەتی (الروم)دا، دەفەرموێ: ﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَـٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: خوا لە خۆتاندا وێنەیەکی بۆ هێناونەوە: ئایا ئەوانەی کە لەبەر دەستتانن : دەبنە هاوبەش لەو بژیوەدا کە پێمان داون، ئێوە تێیدا یەکسان بن، لێیان بترسێن، مەترسییتان لە بەرانبەریاندا هەبێ، وەك ترستان بەرانبەر بە خۆتان هەیە؟! ئاوا ئایەتەکانمان ڕووندەکەینەوە بۆ کۆمەڵێك کە بفامن .

ئنجا ئێمە لەم پێنج ئایەتە موبارەکەدا چوار ڕاستیی گرنگ، دەربارەی ئەوە کە گوناهی هاوبەش بۆ خوا دانان (الشرك بالله) هەرگیز قەڵەمی عەفووی بەسەردا نایەت، وەردەگرین :

### چوار ڕاستیی گرنگ دەربارەی هاوبەش دانان بۆ خوا ﷻ

ڕاستیی یەکەم : هاوبەش بۆ خوا دانان، تاکە گوناهێکە کە ناچێتە نێو بازنەی بەخشران و لێبوردرانەوە .

کە ئایەتەکانی: ژمارە (٤٨ و ١١٦) لە سوورەتی (النساء)، هەروەها ئایەتی (٦٥) لە سوورەتی (الزمر)و، ئایەتی (٨٨) لە سوورەتی (الأنعام)، زۆر بە ڕوونیی و جوانیی ئەوەیان گەیاندوە .

راستیی دووەم: هاوبەش بۆ خوا دانان، گەورەترین درۆ هەڵبەستنە بە ناوی خواوەو، گومڕاییەکی دوورە، کە لەوە گومڕایی دوورتر نیە.

ئەمیش دیسان هەر لە ئایەتی ژمارە (٤٨)ی سوورەتی (النساء)و، لە ئایەتی ژمارە (١١٦)ی (النساء)دا هاتوە، لە ئایەتی ژمارە (٤٨)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا ﴾، هەروەها لە ئایەتی ژمارە (١١٦)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴾، هەڵبەتە بۆیە هاوبەش بۆ خوا دانان، بە درۆ هەڵبەستنێکی مەزن دانراوە، چونکە بابای هاوبەش بۆ خوا دانەر، شتێك دەڵێ کە لە ڕاستییدا لە جگە لە وەهم و خەیاڵی ئەودا، بوونی بناغەیەکی نیە، چونکە چۆن دروستکراو دەچێتە ئاستی بەدیهێنەرەوە؟ کە بێگومان ئەوە درۆ هەڵبەستن و ئیفتڕایەکی گەورەیەو، گومڕاییەکی دووریشە، واتە: زۆر دوور کەوتۆتەوە لە ڕاستە ڕێ.

راستیی سێیەم: هاوبەش بۆ خوا دانان، یەکسانە لەگەڵ کەوتنە خواری مرۆڤ لە ئاسمانەوە، بەهۆی ئەوەوە کە باڵندەیەك بیرفێنێ، یاخود بایەك بیباتە شوێنێکی دوورو قووڵ:

ئەمیش لە ئایەتی ژمارە (٣١)ی سوورەتی (الحج)دا زۆر بە ڕوونیی ئەو وێنەیە هێنراوەتەوە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: بابای هاوبەش بۆ خوا دانەر، وەك ئەوە وایە لە ئاسمان کەوتبێتە خوار، کە باڵندەیەك بیرفێنێ، یاخود بایەك بیباتە شوێنێکی دوورو قووڵەوە.

هەڵبەتە بابای هاوبەش بۆ خوا دانەریش، کە جڵەوی خۆی دەداتە دەست شەیتان و وەسوەسەکانی شەیتان و طاغووت و خۆ بە پەروەردگارو بە پەرستراو زانەکان و، پیلانەکانیان، ئەویش دیارە وەك ئەو کەسەی لێدێ کە لە ئاسمان دەکەوێتە خوار، یاخود باڵندەیەك دەیرفێنێ، وەك پارچە گۆشتێك، یاخود بایەك بایدەداو ڕایدەماڵێ و دەیباتە شوێنێکی دوورو قووڵەوە.

راستیی چوارەم: خوا ﷻ زۆر وێنەی هێناونەوە بۆ دەرخستنی ناقۆڵایی هاوبەش بۆ خوا دانان و، خراپیی سەرەنجامی هاوبەش بۆ خوا دانان،

یەکێك لەو وێنانەش: ئایەتی ژمارە (٢٨)ی سوورەتی (الروم)ە، کە پێشتر باسمان کرد .

خوا ﷻ دەفەرموێ: ئایا ئێوە لەگەڵ ئەوانەی کە لەبەر دەستتانن (ئنجا ئەگەر کۆیلەتان، یان خزمەتکارتانن) ئایا ئەو سامانو موڵکەی کە بە ئێوەمان داوە، لەگەڵ ئەوانەدا کە لەبەر دەستتانن، بە یەکسانیی دابەشی دەکەن، کە ئێوە هیچ پلەو ئیمتیازتان بەسەریاندا نەبێ؟ وەڵامەکەی ئاشکرایە، کە هیچ کەس قبووڵ ناکات، ئەو کەسەی لەبەر دەستیەتیو خزمەتکاریەتیو، خۆی خاوەنو گەورەیەتی، ببێتە هاوبەشی لە هەموو شتێکداو لەگەڵیدا یەکسان بێ .

کەواتە: ئێوە کە هەمووتان دروستکراونو بەندەی خوان، قبووڵ ناکەن بەردەستەکانتان، خزمەتکارەکانتان بێنە ئاستی ئێوەو لەگەڵتاندا یەکسان بن، لە خاوەنداریێتیی دا، ئەدی چۆن ئەوە بە خوا ڕەوا دەبینن، کە هەندێ لە دروست کراوەکانی ببەنە ئاستی خواوە ؟!

بۆیە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾﴾ الروم، ئاوا ئایەتەکان ڕوون دەکەینەوە، بۆ کۆمەڵێك بفامن .

یانی: ئەگەر بفامن هەرگیز توخنی هاوبەش بۆ خوا دانان ناکەونو، شتێکی زۆر نامەنتیقییو پێچەوانەی لۆژیکە .

## تەوەری سێیەم:

## هاوبەش بۆ خوا دانانی گەورەو، هاوبەش بۆ خوادانانی گچكە :

دیارە ئەم تەعبیرە: هەردووكیان پێكەوە، نە لە قورئان نە لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ – ئەوەندەی من بزانم – پێكەوە نەهاتوون، هەڵبەتە لە هەندێك لە فەرمایشتاندا وشەی (الشرك الأصغر) هاتوە، بەڵام وەك گوتم: هەردووكیان پێكەوە: (الشِّرْك الأَكْبَر والشِّرْك الأَصْغَر) ئەوە هیچ لە قورئاندا نەهاتوە، لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺیشدا نەهاتوە، بەڵكو زاراوەیەكە زانایان دایانهێناوە، بۆ جیاوازیی خستنە نێوان ئەو شیركەی كە جۆرێكە لە جۆرەكانی كوفرو، خاوەنەكەی لە بازنەی ئیسلام دەباتە دەرو، ئەو جۆرە شیركەی، كە بە گوناح دادەنرێ، بەڵام بە وەدەرخەری خاوەنەكەی دانانرێ لە بازنەی ئیمانو ئیسلام، ئەویش بریتییە لە هەندێك وشەو، هەندێك هەڵسوكەوت، كە بە شیرك ناونراون، بەڵام بە وەدەرخەری خاوەنەكانیان دانانرێن، لە بازنەی ئیمانو ئیسلام، كە ئێمە دەتوانین لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ لەوبارەوە چەند وێنەیەك بێنینەوە: واتە بۆ شیركی گچكە، چونكە شیركی گەورەمان پێشتر پێناسە كردو، دواتریش زیاتر تیشكی دەخەینە سەر .

**جۆرەكانی شیركی گچكە :**

**دەتوانین ئاماژە بە پێنج جۆر لە جۆرەكانی شیركی گچكە بكەین:**

<u>یەك</u> : سوێند خواردن بە جگە لە خوا، واتە: بە جگە لە ناوو سیفەتەكانی خوا: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ، فَقَدْ كَفَرَ أَو أَشْرَكَ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٠٧٢)، وَالترمِذِيُّ برقم: (١٥٣٥) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (٤٥) وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَيْخَين، وَأَبو دَاوُدَ برقم: (٣٢٥١)، وَأَبو عَوَانة برقم: (٥٩٦٧)، وَابن حِبانَ برقم: (٤٣٥٨) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عُمَرَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني} .

واتە: هەر كەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات، ئەوە كوفری كردوە، یاخود شیركی كردوە.

یانی: كوفرو شیركی گچكە، بەڵام بە مەرجێك نیەتەكەی وانەبێ، كە ئەو شتەی پێ وەك خوا، یان پێی لە خوا گەورەتر بێ، ئەگەر نا ئەو كاتە بە شیركی گەورە دادەنرێ.

دوو : بریتیە لە هەندێ قسەو هەڵسوكەوت كە لە سەر زمانو ئەندامەكان دەردەكەونو، بۆنی ئەوەیان لێدێ، كە غەیری خوا، وەك خوا تەماشا بكرێ؟ بۆ وێنە: ئەم حەدیسە دێنینەوە: {عَنِ ابنِ عَباسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، قَالَ: جاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ: فَحَدَّثَهُ بِبَعْضِ الْكَلامِ، فَقَالَ: ما شاءَ اللهُ وَشِئْتَ، فَقَالَ: أجعَلْتَنِي للّهِ عِدْلاً، بَلْ ما شاءَ اللهُ} {أَخْرَجَهُ الطَّبَرَاني برقم: (١٣٠٠٥)، وَالبُخارِيُّ في (الأدب المفرد) برقم: ٧٨٣، وَصَحَّحَهُ الألباني}.

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەندێ قسەی بۆ كرد، پاشان گوتی: مەگەر خوا بیەوێو تۆ بتەوێ، فەرمووی: ئایا منت كردە هاوتای خوا؟! بڵێ: مەگەر خوا بیەوێ بە تەنیا .

سێ : پێغەمبەری خوا ﷺ ڕیابازی (ئەنجامدانی كردەوەیەكی باش بۆ سەرنج ڕاكێشانی خەڵك بە ڕووپامایی)، بە شیركی بچووك داناوە، لەو بارەوەش ئەم فەرمایشتە هەیە: {عَنْ مَحْمودِ بن لَبِيدٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ أَخوفَ ما أَخافُ عَلَيْكُمْ: الشِّرْكُ الأَصْغَرُ! قَالُوا يا رَسولَ اللهِ وَما الشِّرْكُ الأَصْغَرُ؟! قَالَ: الرِّياءُ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٦٨٦)، والطَّبراني والبَغَوي في (شرح السُنة)، وَقَالَ: شُعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحيح}.

واتە: مەحموودی كوڕی لوبەید دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شتێك كە زۆر مەترسییم لێی هەیە بەرانبەرتان، شیركی بچووكە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! شیركی بچووك چییە؟ فەرمووی: ڕیابازی (ئەوەیە شتێك بكەی، بە ڕواڵەت بۆ خوا بێو بەشی غەیری خوای تێبخەی).

چوار: زانایان بۆ شیرکی بچووك ئەوەشیان بە وێنە هێناوەتەوە، کە کەسێ بڵێ: (لولا اللهُ وفلانٌ) ئەگەر خواو فلانکەس نەبوونایە، ڕاست ئەوەیە کە بگوترێ: (لولا اللهُ ثُمَّ فُلانٌ) ئەگەر خوا نەبووایە، پاشان فلان کەس .

پێنج: پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك لە هەڵسوکەوتەکانی بە شیرك داناون، بۆ وێنە: فەرموویەتی: {إِنَّ الرُّقَى وَالتَّمائِمَ وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٦١٥)، وأبو داود برقم: (٣٨٨٣)، وَابن ماجَهْ برقم: (٣٥٣٠)، وَالحاكِمُ برقم: (٨٢٩٠)، وَقَال: صَحِيح الإِسناد عَلَى شَرْطِ الشَيْخَين، وَابن حِبانَ برقم: (٦٠٩٠)، وَأَبو يَعلى برقم: (٥٢٠٨) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ، وَصَحَّحَهُ الألباني}.

واتە: ڕوقیەکانو تەمیمەکانو تیوەلە، شیرکن .

١/ {(رُقى) کۆی (رقیة)یە، واتە: دوعایەکی نووسراوو نوشتەیەك کە شەرعیی نەبێ، یانی: لە قورئانو سوننەت وەرنەگیرابێ، وەك ئەوەی کە جادووگەرو نوشتەچییەکان دەیکەن، ڕەمزو هێمای تێدان، یان هەندێك ناوی تێدان، نازانرێ ناوی شەیتانانن، ناوی چین؟

٢/ (تَمائم)یش، کۆی (تَمیمة)یە، ئەویش ئەوەیە کە بەخۆوە هەڵبواسرێ .

٣/ (تولة)ش، نوشتەیەکە بۆیە دەکرێ: ژن لە لای مێرد خۆشەویست بێ، یان مێرد لە لای ژن، خۆشەویست بێ، یاخود ئافرەتێك لە لای پیاوێك، یان پیاوێك لە لای ئافرەتێك، خۆشەویست بکرێ}.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەی هەموو بە شیرك داناوە، بۆچی؟ چونکە بە زۆریی ئەو شتانە کە دەکرێن، بە هاوکاریيو پشت بەستن بە شەیتانەکانن، ناوی شەیتانانیان تێدا دەنووسرێ، یاخود هەندێ ژمارەو ڕەمزو هێمایان تێدا دەنووسرێ، کە مەبەستی ناشەرعیيو خراپیان گرتۆتە خۆیان .

هەروەها لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە: {عَنْ عَبْدِ اللهِ ابن مَسْعُودٍ رضي الله، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: الطِّيَرَةُ مِنَ الشِّرْكِ، وَما مِنّا إِلاَّ، وَلكِنَّ اللهَ يُذْهِبُهُ بِالتوكُّلِ} {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٦١٥)، والترمذي برقم: (٢٠٧٢)، وَصَحَّحَهُ الألباني}.

واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (طیرة) لە شیرکە، {(طیرة) یانی: ڕەشبینیی، کاتی خۆی عەرەب عادەتیان وا بووە کە ویستوویانە کارێك، سەفەرێك بکەن، باڵندەیان هەڵفڕاندوە، ئەگەر بە لای ڕاستدا ڕۆیبێ، گوتوویانە: (تیامنوا) کارەکەمان، سەفەرەکەمان بەرەو خێر (یُمن)و بەرەکەتەو، ئەگەر بە لای چەپدا ڕۆیبێ، گوتوویانە: (تَشائموا) کارو سەفەرەکەمان بەرەو نەگبەتییە با نەکرێ}، دەفەرموێ: (وَما مِنّا إلا، وَلكِنَّ اللهَ يُذْهِبُهُ بالتوكُّلِ) هیچ کامێك لە ئێمە نیە، مەگەر (جار جار خەتەرەیەکی خراپی بە دڵدا دێ)، بەڵام خوا عزو جل بە پشت بە خوا بەستن، ئەو خەتەرەو خوتخوتەو خەیاڵە خراپانە لە دڵی ئینسان، دەر دەکات .

ئنجا من پێم وایە: ئەو جۆرە ڕەفتارو هەڵسوکەوتانە، شێوەی شیرکیان هەیە، بەڵام شیرك نین، مەگەر خاوەنەکەیان نیەتو عەقیدەیەکی وەك هی موشریکەکانی هەبێ، ئەو کاتە بە شیرك لە قەڵەم دەدرێن، بەڵکو دەبنە شیرکی گەورەش، ئەگەر نا خودی ئەوانە شیرك نین، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئۆممەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە، کە لەو شتانەش وریا بن، هەرچەند وردە شتن، چونکە ئەوانە دەروازەو هۆکارن بۆ ئەوەی ئینسان بەرەو شیرك بچێ .

## تەوەری چوارەم:

## هۆکارە ڕاستەقینەکانی هاوبەش بۆ خوا دانان و، پاساوەکانی لەلای هاوبەش بۆ خوا دانەران:

کەواتە: ئێمە ئەم تەوەرە لە دوو بەشدا دەخەینە ڕوو :

**بەشی یەکەم:**

### هۆکارو پاڵنەرە ڕاستەقینەکانی هاوبەش بۆ خوا دانانی هاوبەش بۆ خوا دانەران:

خوا ﷻ لە قورئاندا باش ئەوەی ڕوون کردۆتەوە، بۆ ئەوەی دیار بێت کەسانێك کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، هۆکاری چییە؟ چ شتێك پاڵیان پێوە دەنێ‌و دەبێتە هاندەریان؟! لەوبارەوە ئایەت زۆر زۆرن، بەڵام ئێمە تەنیا ئەو ئایەتانەی سوورەتی (النجم) دێنین، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّـٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَـٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ ﴾.

واتە: ئایا لات‌و عوززاتان بینیون، هەروەها مەنات (پەرستراو)ی سێیەمی دیکە؟ ئایا ئێوە خۆتان نێرینەتان دەوێ‌و، ئەو (خوا)یش مێینەی بۆ دادەنێن! بەڕاستیی ئەوە دابەشکردنێکی نادادگەرانەیە، ئەو پەرستراوانەی ئێوە تەنیا چەند ناوێکن خۆتان‌و باب‌و باپیرانتان ئەو ناوانەتان هەڵداون، خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردوونە خوار، ئەوانە تەنیا شوێن گومان‌و ئەوەی کە نەفسیان ئارەزووی دەکات، دەکەون، بە دڵنیایی لە پەروەردگاریشیانەوە ڕێنمایییان بۆ هاتوە .

ئەگەر سەرنجی کۆی ئەو ئایەتانە بدەین کە لەبارەی هۆکارەکانی شیرکەوە دەدوێن، دەبینین کە هۆکارەکانی هاوبەش بۆ خوا دانان و پاڵنەرو هاندەرەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران، کە هاوبەش بۆ خوا دابنێن، لەو دە (١٠) هۆکارەدا خۆیان دەبیننەوە، کە ڕەنگە زیاتریش بن، بەڵام بەپێی سەرنجدانی من ئەو دە (١٠) یەن :

یەکەم و دووەم : شوێنکەوتنی گومان و، ئارەزوو :

کە لە ئایەتی (٢٣)ی سوورەتی (النجم)دا خراونە ڕوو، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ﴾، ئەوانە تەنیا شوێنی گومان دەکەون و، تەنیا شوێنی ئەوە دەکەون کە نەفسیان پێی خۆشەو ئارەزووی دەکات.

سێیەم : گومڕا کردنی هاوبەشە گومڕاکەرەکان بۆ پەرستەرەکانیان و فریودان و ئیغفاڵ کردنیان .

وەك لە ئایەتی ژمارە (١٣٧)ی سوورەتی (الأنعام)دا خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَـٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ﴾، واتە: هەر ئاوا بۆ زۆرێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، هاوبەشەکانیان (ئەوانەی کە کردوویانە بە هاوبەش بۆ خوا) کوشتنی منداڵەکانیان لەلا جوان کردبوون و، بۆیان ڕازاندبوونەوە .

چوارەم و پێنجەم: نەفامیی و نەزانیی، نەفامیی پێچەوانەی عاقڵێتییەو نەزانییش پێچەوانەی زانیارییە :

وەك لە ئایەتی ژمارە (١٤٠)ی سوورەتی (الأنعام)دا خوای تاك و پاك ڕوونی کردۆتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا۟ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّوا۟ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾﴾، واتە: بە ڕاستیی ئەوانەی کە منداڵەکانی خۆیان کوشتن، نەفامانە بەبێ زانیاریی، زیانبارن (هەم نەفام بوون، هەم بێ زانیاریی بوون) .

شەشەم: دنەدان و خوتخوتەی ڕازێنراوەی شەیتانە فریودەرەکان :

وەك لە ئایەتی (١١٢)ی سوورەتی (الأنعام)، هەروەها لە ئایەتی (١٢١)ی سوورەتی (الأنعام)دا هاتوە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ... ﴾، واتە: هەر بەو شێوەیە بۆ هەر كام لە پێغەمبەران دوژمنێكمان لە مرۆڤ و جند، ڕەخساندوە كە هەندێكیان قسەی ڕازاوەو بریقەداری فریودەرانە فێری هەندێكیان دەكەن .

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾ ﴾، واتە: وە لەوە مەخۆن كە ناوی خوای لەسەر نەهاتوە (واتە: سەربڕاو)وە ئەوە لادان، وە بەدڵنیاییی شەیتانەكان خوتخوتە بۆ دۆستەكانی خۆیان دەكەن تاكو شەڕە قسەتان لەگەڵ بكەن و، ئەگەر بە قسەیان بكەن (لە بەحەڵاڵ دانانی حەرام دا) ئێوەش دەبنە هاوبەشدانەر.

حەوتەم و هەشتەم و نۆیەم و دەیەم: خۆ بە زلگرتن لە بەرانبەر وەرگرتنی هەقداو، ئارەزوو هەبوون بۆ ناكۆكیی و دووبەرەكیی و، لاسایی كردنەوەی كوێرانەی پێشینان و، ئێرەیی و حەسوودیی بردن :

ئەم چوار هۆكارەش لە ئایەتەكانی : (١ ــ ٨) لە سوورەتی (ص)دا، خوا ﷻ ڕوونی كردوونە، وەك دەفەرموێ :

بسم الله الرحمن الرحيم : ﴿ صٓ ۚ وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ ﴿١﴾ بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴿٢﴾ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴿٣﴾ وَعَجِبُوا أَن جَاءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ۖ وَقَالَ الْكَافِرُونَ هَٰذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ وَانطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَىٰ آلِهَتِكُمْ ۖ

إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَٰذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ ﴿٧﴾ أَؤُنزِلَ عَلَيْهِ الذِّكْرُ مِن بَيْنِنَا ۚ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّن ذِكْرِي ۖ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا عَذَابِ ﴿٨﴾﴾.

واتە :

بەناوی خودای بە بەزەیی بەخشندە .

صاد، سوێند بە قورئانی خاوەن بیرخستنەوە ﴿١﴾ .

(بڕوانەهێنانی بێبڕوایان هیچ بەڵگەو پاساوی نین) بەڵكو ئەوانەی بێبڕوان لە خۆ بەزلگریی‌و ئارەزووی دووبەرەكیی دان ﴿٢﴾ .

لەپێش وان دا گەلێك سەدەمان فەوتاندوون، (لە كاتی هاتنی بەڵادا) بانگیان كرد (هاواریان كرد) بەڵام كاتی دەرباز بوون تێپەڕیبوو ﴿٣﴾ .

سەریان سوڕما كە خۆیان وریاكەرەوەیان بۆ هات‌و ئەوانەی بێبڕوا بوون گوتیان : ئەمە جادووگەرێكی زۆر درۆزنە ﴿٤﴾ .

ئایا هەموو پەرستراوەكانی كردوونە یەك پەرستراو ؟ بێگومان ئەوە شتێكی زۆر سەرسوڕهێنەرە ﴿٥﴾ !

مشوورخۆرو بڕیاربەدەستەكانیشیان دەستبەكاربوون (بۆ دژایەتیی)و بە خەڵكەكەیان گوت : بەردەوام بن‌و لەسەر پەرستراوەكانتان خۆڕاگربن، ئەو ئایینە نوێ)ە پیلانێكە مەبەستی دیكەی لە پشتەوەیە ﴿٦﴾.

لە خاوەن كتێبە پێشووەكان شی وامان نەبیستوە، ئەمە تەنیا شتێكی هەڵبەستراوە (بەناوی خواوە) ﴿٧﴾ .

ئایا لەنێو هەموو ئێمەومانان‌و، پەیامی بیرخەرەوە (ی خوا) لە سەروی (: موحەممەد) دابەزیوە ؟! بەڵكو ئەوان لەبارەی كتێب‌و پەیامی منەوە لە دوودڵیی دان، بەڵكو (هۆكاری بێبڕواییەكەیان ئەوەیە كە) جاری سزای منیان نەچێژتوە ﴿٨﴾ .

٧و٨ : خۆ بە زلگرتنو ئارەزوومەندیی دوو بەرەکیی: ﴿ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴾.

٩ : لاسایی کردنەوەی کوێرانەی پێشینان: ﴿ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْأَخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ ﴾، ئێمە ئەوەمان پێشتر نەبیستوە لە پێشینانی خۆمان، ئەوە هەر شتێکی هەڵبەستراوە .

١٠ : حەسوودییو ئێرەیی بردن: ﴿ أَءُنزِلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا ﴾، ئایا لە نێو ئێمەدا ئەو (موحەممەد) بەرنامە (ذِکر)ی بۆ دابەزێنراوە ؟

واتە: ئایا لە هەمووومان چاکترە؟ حەسوودییان پێ بردوە .

ئەمانە هۆکارو پاڵنەرو هاندەرە ڕاستەقینەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەرانن، کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن .

**بەشی دووەم:**

**پاساوەکانی هاوبەشدانان لەلای هاوبەش بۆ خوا دانەران:**

بزانین داخۆ موشریکەکان بیانوویان چییەو چی بە بیانوو دێننەوە، بۆ هاوبەش بۆ خوا دانانیان ؟ خوای زاناو زاڵ باسی برِو بیانووەکانی ئەوانیشی کردوە، کە ئێمە لە پێنج برگەدا ئەوانیش دەخەینە ڕوو:

برگەی یەکەم : - پێیان وابووە هاوبەشەکانیان، (واتە: ئەوانەی کە کردوویانن بە هاوبەش بۆ خوا، یان هێناویاننە ئاستی خوا) لە خوایان نیزیك دەخەنەوە :

وەك لە ئایەتی ژمارە (٣)ی سوورەتی (الزمر)دا خوا ﷻ لەسەر زمانی ئەوان فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا

﴿ لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ﴾، واتە: ئەوانەی پەرستراوانێك لە جیاتی خوا دەكەنە سەرپەرشتیارو دۆستو پشتیوانی خۆیان، دەڵێن: ئێمە نایانپەرستین، مەگەر بۆ ئەوەی لە خوامان نیزیك بخەنەوە .

بڕگەی دووەم :- گومانیان وابووە كە ئەو پەرستراوە وەهمییانە، تكایان بۆ لە لای خوا بەرز دەكەن :

وەك خوا لە ئایەتی (١٨)ی سوورەتی (یونس)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: لە خوار خواوە (جگە لە خوا) شتانێك دەپەرستن، كە نە زیانیان لێدەدەن، نە سوودیان پێ دەگەیەننو، دەڵێن: ئا ئەوانە تكاكارمانن لە لای خوا .

بڕگەی سێیەم :- گوایە : ئەوانە شوێن پێشینانی خۆیان دەكەونو، ڕێبازی ئەوان دەپارێزن :

وەك لە ئایەتەكانی (٥ و ٦ و ٧) لە سوورەتی (ص)و، ئایەتی (٧٤) لە سوورەتی (الشعراء)دا باسكراوە :

أ- لە سوورەتی (ص)دا، خوا لەسەر زمانیان دەفەرموێ: ﴿ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ۝٥ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ أَنِ ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ ۝٦ مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ۝٧ ﴾، واتە: گوتیان: ئایا پەرستراوەكانی كردنە یەك پەرستراو! ئەوە شتێكی زۆر سەیرە، ئنجا قسە ڕۆیشتووەكانیان، بڕیار بەدەستەكانیان، دەرچوونو گوتیان: بڕۆنو بەردەوام بن، خۆڕاگربن، لەسەر پەرستراوەكانتان ئەوە پیلانێكە لە دژی ئێمەو مەبەستی خراپی لە پشتەوەیە، ئێمە شتی وامان نەبیستوە لە پێشووانمان، بێگومان ئەوە شتێكی هەڵبەستراوە.

ب- لە سوورەتی (الشعراء)یشدا، دەڵێن: ﴿ قَالُواْ بَلْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾، واتە: بەڵكو ئێمە باب و باپیرانی خۆمان وا بینیو وایان دەكرد، ئێمەش وەك وان دەكەین، (ئەوەش لاسایی كردنەوەی كوێرانەیە).

بڕگەی چوارەم :- چاوەڕێ كردنی زیان، لە كاتی تووڕەیی پەرستراوەكاندا، ئومێدەواربوونی سوود وەرگرتنو بەهرە وەرگرتن، لە كاتی ڕازی بوونیاندا.
واتە: ترساون كە پەرستراوەكانیان ئەگەر لێیان تووڕە بن، زیانیان پێ بگەیەننو، ئومێدیان پێ بوون، ئەگەر لێیان ڕازی بوون، سوودیان پێ بگەیەنن :

وەك لە ئایەتەكانی: (٥٣ و ٥٤)ی سوورەتی (هود)دا هاتوە: ﴿ قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍ ۗ قَالَ إِنِّيٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾.

واتە : (گەلی عاد) گوتیان : ئەی هوود ! هیچ بەڵگەیەكی ڕوونت بۆ نەهێناوینو، ئێمە بەهۆی قسەی تۆوە دەستبەرداری پەرستراوەكانمان نابینو بۆ تۆ نابینە بڕوادار، ئێمە تەنیا دەڵێین: (پێمان وایە) پەرستراوەكانی ئێمە تۆیان تووشی زیان كردوە ، (هوود) فەرمووی : من خوا بە شایەد دەگرمو ئێوەش شایەدبن كە من لەوەی دەیكەنە هاوبەشی خوا، بەریم .

هەروەها لە ئایەتەكانی: (٦٩ – ٨٢)ی سوورەتی (الشعراء)دا، كە ئیبراهیم ﷺ موناقەشە لەگەڵ گەلە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكەی خۆیدا دەكات : ﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُواْ نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُواْ بَلْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾ ﴾.

وەك دەبینین :

ئیبراهیم ﷺ دوای ئەوەی سەرزەنشتی گەلە هاوبەشدانەرەکەی دەکات لەسەر پەرستنی شتانێك کە :

أ ـ نە پاڕانەوەی پەرستەرەکانیان دەبیستن، چ جای وەڵامدانەوەو بەدەنگەوە هاتنیان !

ب ـ نەسوودیان پێدەگەیەنن ، ئەگەر گریمان لێیان ڕازی بوون !

ج ـ نە زیانیان لێ دەدەن ، ئەگەر گریمان لێیان توڕە بوون !

دوای ئەوە : پێناسەی پەروەردگاری شایستەی پەرسترانی خۆی دەکات بە هەشت (٨) لە کردەوەو سیفەتەکانی کە جگە لەو هیچ شتێك و هیچکەس نینی :

١ ـ بەدیهێنان ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَنِى ﴾.

٢ ـ ڕێنمایی کردن و ڕاستەڕێ کردن ﴿ فَهُوَ يَهْدِينِ ﴾.

٣ ـ خۆراك بۆ دابین کردن ﴿ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى ﴾.

٤ ـ خواردنەوە بۆ دابین کردن ﴿ وَيَسْقِينِ ﴾.

٥ ـ شیفادان دوای نەخۆشبوون ﴿ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴾.

٦ ـ مراندن ﴿ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ﴾.

٧ ـ زیندووکردنەوە ﴿ ثُمَّ يُحْيِينِ ﴾.

٨ ـ ئومێدەواربوون بە لێبوردن لە ڕۆژی دوایی دا ﴿ وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴾.

برگەی پێنجەم :- بیانوو هێناوەنەوە بە ویستی خوا گوایە : خوا ویستی وابووەو ئەو پەرستراوانە بپەرستن و تێكەڵكردنی ویستو ڕەزامەندیی خواو، گەیشتن بەم ئەنجامگیرییە هەڵەیە : ئەگەر خوا لەم كردەوانەی ئێمەو لەو پەرستنانەی ئێمە، ڕازی نەبووایە، نەیدەویستن، ئنجا مادام ویستوونی، دیارە لێشیان ڕازییە :

ئەمە كە لە ئایەتی ژمارە (١٤٨)ی سووڕەتی (الأنعام)و ئایەتی (٣٥)ی سووڕەتی (النحل)دا هاتوە .

١) بۆ وێنە: لە سووڕەتی (الأنعام)، ئایەتی (١٤٨)دا دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ ... ﴾، واتە: ئەوانەی كە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە دەڵێن: ئەگەر خوا ویستبای ئێمە هاوبەشمان بۆ دانەدەنا، نە خۆمانو نە بابو باپیرانمانو، هیچ شتێكیشمان قەدەغە نەدەكرد .

یانی: خوا ویستوویەتی بۆیە ئێمە هاوبەشمان بۆ خوا داناوەو شتانێكیش قەدەغە دەكەین، مەبەستیشیان ئەوە بووە كە مادام خوا ویستوویەتی، دیارە لێشی ڕازییە، پێیان وا بووە كە خوا هەر شتێكی بوێ، لێشی ڕازییە، كەواتە: خوا لەو كارو كردەوانەی ئێمە ڕازییە .

٢) هەروەها لە سووڕەتی (النحل)یشدا هەر هاتوە لە ئایەتی ژمارە (٣٥)دا كە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ﴾، واتە: ئەوانەی كە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، گوتیان: ئەگەر خوا ویستبای : ئێمە هیچ

شتێکمان جگە لەو نەدەپەرست، نە خۆمانو نە بابو باپیرانمانو، هیچ شتێکیشمان بەبێ مۆڵەتی خوا قەدەغە نەدەکرد .

وەك گوتم ئەوانە گوتوویانە: خوا ئەو شتانەی ویستوە، بۆیە ئێمە دەنکەین کە بێگومان ئەوە ڕاستەو، هیچ شتێك بەبێ ویستی خوا نابێ، بەلاَم مەرج نیە خوا هەر شتێکی ویست، لێی ڕازی بێو پێی خۆش بێ، وەك لە ئایەتی (٧)ی سووڕەتی (الزمر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُواْ يَرْضَهُ لَكُمْ ﴾، واتە: خوا بۆ بەندەکانی، کوفری پەسند نەکردوە، کوفری پێ خۆش نیە بۆ بەندەکانی، بەلاَم ئەگەر شوکرانە بکەنو سوپاسگوزاریی بکەن، خوا ئەوەی بۆ ئێوە پێ خۆشە .

کەواتە: ویستی خوا جیایە لە ڕەزامەندیی خوا، شایانی باسیشە : ئێمە هەم مەوسووعەی : (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی)دا[1]، هەم لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا[2] بە تەفصیل باسمان کردوە، کە ڕەزامەندیی خوا بە پێی شەریعەتی خوا، بۆمان دەردەکەوێ: ئایا خوا لە چی ڕازییەو چی پێ خۆشە؟ بەهۆی وەحیی خواوە ئەوە دەزانرێ، بەلاَم ویستی خوا وەك ئاسمان وایە: ئینسان هەرچی بیکات، هەر لە ژێر ئاسماندا دەیکات، فەرمانبەریی (طاعة) بکات، یان سەرپێچی (مَعصية) بکات، چاکە بکات، یان خراپە، ویستی خوای بالاَدەست وەك چەترو سایەیەك وایە کە ئینسان لە ژێری ناچێتە دەر، ئینسان کوفر بکات، هەر بە ئیرادەی خوا دەیکاتو، ئیمان بێنێ هەر بە ویستی خوایە، بەلاَم چۆن دەزانین ئایا خوا لە چی ڕازییەو لە چی ناڕازییە ؟ بەهۆی شەریعەتو بەرنامەکەیەوە دەزانین .

دیارە خوا ﷻ وەلاَمی ددان شکێنی ئەو بیانوو پاساوانەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەداتەوە، کە پاساوی هاوبەش بۆ خوا دانانی، پێ دەدەنەوە :

---

١) لە بەرگی پێنجەم دا .

٢) لە کتێبی هەشتەم (الكتاب الثامن) ی، لە چاپی دووەمی / ٢٠١٨ ز دا .

## هەڵوەشاندنەوەی بیانوو و پاساوی یەکەم :

کە دەڵێن: ئێمە بۆیە ئەو پەرستراوانەمان دەپەرستین، تاکو لە خوامان نیزیك بخەنەوە !

١/ خوا ﷻ هەر لە سووڕەتی (الزمر)دا یەکسەر کە دوا بە دوای قسەی ئەوان کە دەیلێن، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ٣﴾، واتە: بێگومان خوا دادوەرییان لە بەیندا دەکات، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە کێشەوە، یاخود: بڕیاریان بۆ دەدات، بێگومان خوا ڕێنمایی کەسێك ناکات، کە درۆزنەو زۆر بێبڕوایە، یاخود: زۆر سپڵەیە .

کەواتە: ئەوەی کە ئەوان دەیکەن لە ڕاستییدا ناکۆکیی‌و دووبەرەکییە لەگەڵ پێغەمبەراندا، لەگەڵ وەحیی خواداو، ئەوانەی ئەو قسەیە دەڵێن: درۆزنن‌و زۆر سپلەو ناسوپاسیشن .

٢/ لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمۡلِكُونَ كَشۡفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمۡ وَلَا تَحۡوِيلًا ٥٦ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا ٥٧﴾، واتە: تۆ بڵێ: لەوانە بپاڕێنەوە کە پێتان وایە: جگە لە خوا پەرستراون، کە ئەوان ناتوانن نە زیانێك کە تووشتان دێ، لایبەرن‌و، نە لێشتان لا بدەن، پێش ئەوەی بتانگاتێ، ئا ئەوانەی کە لێیان دەپاڕێنەوە، هەر کامێکیان هۆکار بەرەو پەروەردگاری دەگرێتەبەر، کامەیان لە خوا نیزیکترە، {خوا خوایەتی تۆزێك لە خوا نیزیك بێتەوە}، بە ئومێدی بەزەیی خوان‌و لە سزای خوا دەترسێن، بێگومان سزای پەروەردگارت جێگای مەترسییە .

کەواتە: ئەوانەی کە ئێوە لێیان دەپاڕێنەوە، ئەگەر پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)، ئەگەر دۆستانی خوان، هەر کامێك لەوانە، کامەیان لە خوا نیزیکترە، زیاتر ئومێدی بە ڕەحمەتی خوا هەیەو، زیاتر مەترسیی سزاو تۆڵەی خوای دادگەری هەیە .

## هەڵوەشاندنەوەی بیانوو و پاساوی دووەم:

پاساوێکی دیکە کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کردوویانەتە بیانووی ئەوە کە هاوبەشەکانیان پەرستوە، ئەوەیە کە تکاو ڕجایان بۆ لە لای خوا بکەن !

ئنجا خوا ﷻ لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا، ئەوەی هەڵوەشاندۆتەوە، بۆ وێنە :

١/ لە سووڕەتی (الروم)دا دەفەرموێ : ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمْ شُفَعَـٰٓؤُا۟ وَكَانُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ كَـٰفِرِينَ ﴿١٣﴾ ﴾

واتە: ئنجا ڕۆژێك کە ئاخر زەمان (ساعة) دێ، تاوانبارەکان نائومێد دەبن و، هاوبەشەکانیان بۆیان نابن بە تکاکار، بەڵکو هاوبەشەکانیان بێبڕوا دەبن و، حاشا دەکەن لەو کەسانەی کردوویانن بە هاوبەش بۆ خوا، (ئەو درۆو بوختانەیان بۆ هەڵبەستوون) .

٢/ لە سووڕەتی (الزمر)یشدا خوا دەفەرموێ: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَـٰعَةُ جَمِيعًا ۖ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾.

واتە: یان ئایا جگە لە خوا تکا کاریان پەیدا کردوون، بڵێ : ئەدی ئەگەر ئەوانەی ئێوە پێتان وایە تکاتان بۆ لە خوا دەکەن، هیچیان بە دەست نەبێ و، نەشفامن و، ئاگاشیان لە هیچ نەبێ!! (ئایا کەڵکی ئەوەیان هەیە بپەرسترێن ؟!) (کە دیارە مەبەست پێی بت و صەنەمەکانن کە لە ماددەی بێ ژیان دروستیان کردوون)، بڵێ تکاکردن هەمووی هی خوایە، موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایەو هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە.

## هەڵوەشاندنەوەی بیانووو پاساوی سێیەم :

کە گوتوویانە: ئێمە هەر لەسەر ڕێبازی پێشینانمان دەڕۆین !

هەڵبەتە لاسایی کردنەوەی کوێرانەی پێشینانیش، کردنە پاساوی پەرستن جگە لە خوا، لە زۆر شوێندا خوای زاناو توانا هەڵیوەشاندۆتەوە، بۆ وێنە :

١ – لە سووڕەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۗ أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ ﴾.

واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: شوێن ئەوە بکەون کە خوا ناردوویەتە خوار، دەڵێن: بەڵکو دەکەوینە شوێن ئەوەی باب و باپیرانمان لەسەری بینیوە (بڵێ:) ئایا ئەگەر باب و باپیرانیان هیچیان نەفامیبێ و، ڕێی ڕاستیشیان پێ نەزانیبێ، (هەر بە دوایان دەکەون)؟!

٢ – لە سووڕەتی (الزخرف)یشدا، هەر لەوبارەوە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾.

واتە: هەروەها بەو شێوەیە لە پێش تۆشدا، لە هیچ ئاوەدانییەکدا، هیچ ترسێنەرێکمان ڕەوان نەکردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ئێمە باوباپیرانمان لەسەر ڕێیەك بینیوە، بۆیە ئێمە هەر بە دوای شوێن پێی ئەواندا دەڕۆین .

ئنجا کورتەی ئەو بەرپەرچدانەوەیە ئەوەیە : کە چاو لێکردنی پێشینانێك، کە گومڕاو سەرگەردان بوون، لە ڕاستییدا شتێکی بێ بەڵگەیەو مایەی نەزانیی و نەفامییە، باشە باب و باپیرانت، پێشینانت لە شتی چاکدا

شوێنیان بکەوەو ڕێزیان بگرەو بە دوایاندا بڕۆ، بەڵام ئەگەر خۆیان بە ڕێیان نەزانیبیّو، تۆش بە دوایان بکەوی، خۆیان لە چ چاڵێك کەوتوون، تۆش لە هەمان چاڵ دەکەوی! کە ئەوەش هەر لە ئاژەڵ دەوەشێتەوە، لە ئاژەڵیشدا لە هەمووان، نا، تەنیا لە هەندێك جۆریان، بۆ نموونە: مەڕ[1]، بەڵام لە مرۆڤ ناوەشێتەوە، بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ :

﴿ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً ۚ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾ ﴾.

واتە: وێنەی بێبڕوایان، وەك کەسێك وایە کە لە ئاژەڵانێکەوە دەخوڕێ، تەنیا گوێیان لە دەنگەکەیەو هیچی لێ تێناگەن کەڕن، لاڵن، کوێرن، نافامن .

## هەڵوەشاندنەوەی بیانووو پاساوی چوارەم:

کە بریتیە لەوەی: ئەو پەرستراوانە بتوانن زیانیان لێ دوور بخەنەوە، یاخود سوودیان پێ بگەیەنن !

خوا ﷻ لە زۆر شوێنی قورئاندا ئەو گومانو وەهمەیان دەڕەوێنێتەوە، بۆ وێنە :

١/ لە سوورەتی (الفرقان)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً لَّا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ وَلَا يَمْلِكُونَ لِأَنفُسِهِمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا وَلَا يَمْلِكُونَ مَوْتًا وَلَا حَيَوٰةً وَلَا نُشُورًا ﴿٣﴾ ﴾.

واتە: جگە لە خوا پەرستراوانێکیان پەیدا کردوون، کە هیچ دروست ناکەنو، خۆشیان دروستکراونو، بۆ خۆشیان زیانو سوودیان بە دەست نیە، هەروەها مردنو ژیانو زیندووکردنەوەیان بە دەست نیە .

---

١) ئەگەر مەڕێك ڕێ هەڵە بکات، ڕانە مەڕەکە هەمووی بەدوای دا دەچێ، ئەگەر هەڵدێران لە چیاش بێ !!

واتە: ئەوانە هیچ کام لەو شتانەی کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بە وەهمو خەیاڵ تێیاندا دەبینین، هیچیان کام لەو سیفەتانەیان تێدا نین .

٢ – لە سوورەتی (الحج)دا خوا وێنەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش دێنێتەوە، بۆ ئەو کەسانەی غەیری خوا دەپەرستن‌و، بە تەمان لێیان بەهرەمەندبن، یاخود زیانیان لێ دووربخەنەوە، یاخود قازانجیان پێ بگەیەنن، دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ ٧٣﴾.

واتە: ئەی خەڵکینە! وێنەیەك هێنراوەتەوە، گوێی بۆ بگرن ! ئەوانەی کە جگە لە خوا، لێیان دەپاڕێنەوە، تەنانەت مێشێکیش دروست ناکەن، ئەگەر هەمووشیان بۆی کۆببنەوەو ئەگەر مێشەکەش شتێکییان لێ بستێنێ، ناتوانن لێی بستێننەوە، هەم ئەوەی کە بە دوای مێشەکە کەوتوە بێهێزەو، هەم داوا لێکراوەکەش (کە مێشەکەیە) ئەویش هەر بێهێزە !

هەڵبەتە لە زۆر جێی دیکەشدا خوا ﷻ ئەو وەهمە دەڕەوێنێتەوە، کە پەرستراوانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، هیچیان بە دەست بێ‌و هیچ کارە بن .

## هەڵوەشاندنەوەی بیانووو پاساوی پێنجەم :

کە گوتوویانە: ئەوەی دەیکەین لە هاوبەش بۆ خوادانان‌و، جگە لە خوا پەرستن‌و، حەڵاڵ حەرامکردن، مادام بەویستی خوایە، کەواتە: خوا لێی ڕازییەو لەلای پەسندە !

بەڵام لە ڕاستیی دا بیانووگرتن بۆ شیرك‌و گوناه ، بە ویستی ڕەهای خواو پاشان تێکەڵکردنی ویست‌و ڕەزامەندیی خوا، عادەتی ئیبلیسە، چونکە: کاتی خۆی ئیبلیس دوای ئەوەی بۆخۆی بە ویستی خۆی کڕنووشی ڕێزگرتنی بۆ ئادەم نەبرد، کەچی بیانووی بە ویستی خوا گرت :

﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ﴾الأعراف .

واتە: (ئیبلیس) گوتی: بەهۆی ئەوەوە کە تۆ منت گومڕاو بێمراد کرد، منیش لەسەر ڕاستە شەقامی تۆ بۆیان دادەنیشم! خۆی کڕنووشی بۆ ئادەم نەبردوە، کڕنووشی ڕێزگرتن، دوای ئەوەی خوا فەرمانی پێ کردوە، کەچی شتەکەی گەڕاندۆتەوە بۆ خوا !!

ئنجا خوا ﷻ لە چەند شوێنێك دا ، بەرپەرچی ئەو بیانووەیان دەداتەوە، بۆ وێنە :

١ – لە سووڕەتی (النحل)دا، دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ ﴾.

واتە: ئەوانەی پێش وانیش هەر وایانکرد، ئایا پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) جگە لە گەیاندنی ڕوونکەرەوە، ئاشکرا[١]، شتێکی دیکەیان لەسەرە! واتە: هەر کات پێغەمبەران پێیان ڕاگەیاندن کە خوا ئەو شتەی پێ خۆشەو ڕقی لەو شتەیە، تۆش ئەوەی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) گەیاندوویانە، وەریبگرە، چونکە لە ئاوێنەی وەحیی خوادا بۆت دەردەکەوێ: خوا چی پێ خۆشەو، چی پێ ناخۆشە؟ نەك بیانوو بە ویستی خوا بگری، چونکە هەموو شتێك بە ویستی خوایە، ئەو شتانەی کە خوا پێی خۆشن و، ئەو شتانەش کە پێی ناخۆشن، هەموویان هەر بە ویستی خوان، ویستی خوا هەر وەك ئاسمان وایە، تۆ ناتوانی لە ژێر سایەی ئاسمان بچیە دەرێ، بەلام تۆ بەهۆی ئەو پەیامەوە کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) گەیاندوویانە، ئەو پەیامە ڕوونکەرەوەو ڕوونە، کە خوا پێیدا ناردوون، ئەوە ئاوێنەیەکە لەوێدا بۆت دەردەکەوێ: خوا چی پێ خۆشەو چی پێ ناخۆشە؟ حەلالەکەی پێ خۆشەو، حەرامەکەی پێ ناخۆشە،

١) چونکە وشەی (مبین) ئەگەر لە (أبان)ی (لازم) بێ، یانی : ڕوونو ، ئەگەر لە (أبان)ی (متعدّي)یش بێ ، یانی: ڕوونکەرەوە .

فەرمانپێکراوەکان (مامورات)ی پێخۆشن، بۆیە فەرمانی پێکردوونو، ڕێ لێگیراوەکان (منهیات)ی پێناخۆشن بۆیە نەهی لێکردوون .

٢ - لە سووڕەتی (الأنعام)دا، دوای ئەوەی کافرەکان دەڵێن: ﴿لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ﴾.

واتە: ئەگەر خوا ویستبای (هاوبەشدانەر نەبین) خۆمانو باب و باپیرانمان هاوبەشمان (بۆ خوا) دانەدەناو هیچ شتێکیشمان قەدەغە نەدەکرد .

خوا ﷻ ئاوا بەرپەرچیان دەداتەوە : ﴿كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا ۗ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ ۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾﴾.

واتە: ئەوانەی پێش وانیش هەرئاوا پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، تاکو سزای ئێمەیان چێژت، بڵێ : ئایا لەوبارەوە زانیارییتان لەلایە بۆمان بێننە دەرێ ! بەڵکو ئێوە تەنیا شوێن گومان دەکەونو، تەنیا درۆ دەکەن {کە دەڵێن: خوا پێی خۆشە: ئێمە هاوبەشی بۆ دابنێینو خوا پێی خۆشە: ئێمە ئەو شتانە لە خۆمان قەدەغە بکەین}.

دوایی دەفەرموێ: ﴿قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ ۖ فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾﴾ الأنعام، واتە: بڵێ: خوا بەڵگەی تەواوی هەیە، ئەگەر ویستبای هەمووتانی وێکڕاو تێکڕا ڕێنمایی دەکردو دەیخستنە سەر ڕێی ڕاست.

واتە: ئەگەر ویستبای زۆرتان لێ بکاتو تۆپزییتان لێ بکات، بە زۆر هەمووتانی دەکردە ئیماندار، بەڵام نەیویستوە زۆرتان لێ بکاتو، ویستوویەتی ئازادتان بکات، ئنجا کە ئازادی کردوون: هەتان بووە بە ویستی خۆی ڕێی ڕاستی گرتووەو، پابەند بووە بە حەڵاڵو حەڕامی خواوەو، هەشتان بووە بە ویستی خۆی، ڕێی چەوتی گرتووەو، پابەند نەبووە بە حەڵاڵو حەڕامی خوای پەروەردگارەوە .

## تەوەری پێنجەم:

## جۆرەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران و، خاڵە هاوبەشەکانی نێوانیان:

ئێمە پێشتر پێناسەی هاوبەش بۆ خوا دانانمان کرد، ئێستا دووبارە بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەی چەمك و واتای هاوبەش بۆ خوا دانان، پێناسەی هاوبەش بۆ خوا دانەر (مُشرِك) دەکەین:

هاوبەش بۆ خوا دانەر (مشرك): بابایەکە کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێ و شتێك، یان کەسێك، یان شتانێك، یان کەسانێك دێنێتە ئاستی خواو، وەك خوا ﷻ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، لە یەکێك یان زیاتر لەو سێ بوارەدا :

١- بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتیی و خاوەنداریێتیی (الخالقیة والربوبیة والمالکیة) .

٢- پەرستراویێتیی (الألوهیة) .

٣- ناوو سیفەتە هەرە چاك و پەسندەکان (الأسماء الحُسنی والصفات العلیا).

١/ <u>بواری بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتیی و خاوەنداریێتیی :</u>

وەك کەسێك کە شتێك لە دروستکردن، یاخود مشوور خواردن لەسەر ئاستی بوونەوەر، یان خاوەنداریێتیی لەسەر ئاستی بوون، پاڵدەداتە لای غەیری خوا، بۆ وێنە: ئەوانەی کە کاتی خۆی لە فەیلەسووفەکانی یۆنان، بەدیهێنانی هەندێك شتیان، یان خاوەنداریێتیی و سەرپەرشتییکردنی هەندێك لە دروستکراوەکانیان، پاڵ دەدایە لای ئەستێرەو خڕۆکەکان، ئەوەی لە ئەفسانەی نۆ فەلەکەکان (الأفلاك التسعة) و دە عەقڵەکان (العقول العشرة)دا، هاتوە .

هەروەها وەك مەجوسییەكان كە ئەوانیش دروستكردنی زیانو خراپە، پاڵ دەدەنە لای ئەهریمەن، یاخود (ئاهوڕامەزدا)، كە ڕەمزو هێمایەكەی بریتیە لە تاریكییو، خێرو چاكە پاڵ دەدەنە لای (یەزدان) كە ڕەمزەكەی بریتیە لە ڕووناكیی، بۆیەش ناویان لێنراوە: (الثنویّة) چونكە بڕوایان بە دوو بەدیهێنەرو پەروەردگاران هەبووە .

هەروەها نەصڕانییەكان شوێنكەوتووانی بەرنامەی مەسیح ﷺ دوای ئەوەی تێكدراو دوای خۆی گۆڕدرا، ئەوانیش دیسان گیرۆدەن بە شێوەیەك لە شێوەكانی ئەم جۆرە شیركەوە: هاوبەش بۆ خوا دانان لە بواری بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەنداریێتییدا، چونكە وێڕای ئەوەی كە مەسیح ﷺ و بگرە دایكیی و (رُوح القُدُس)یش، دەپەرستن و دیانهێننە ڕیزی خوا، وێڕای ئەوە عیساش وەك پەروەردگارو بەدیهێنەر دادەنێن و دەڵێن: كوڕی خوایەو، دەڵێن: عیسا لە دوو حەقیقەتان پێكهاتوە: لاهووت و ناسووت، ئنجا وەدیهێنان و شیفادان و لێخۆش بوون لە گوناهان، پاڵ دەدەنە لای عیسا ﷺ، كە ئەوانە هەموویان تایبەتن بە خوای بەرزی بێ وێنەوە، ئەوە زۆر بە زەقیی لە چوار ئینجیلەكاندا: (مـتَّی، مَرْقُس، لُوقا، یوحنـا) دا، هەیەو دیارە .

كەواتە: مەسیحییەكانیش، {یان نەصڕانییەكانیش كە ڕاستترە بڵێین: نەصڕانییەكان، چونكە لە قورئاندا هەر ئەو ناوە بۆ ئەوان بەكارهاتوە (النَصاری)، چونكە ئەوانە شوێنكەوتووی مەسیح ﷺ نین، مەسیح هیچ كاتێك ئیدعای پەروەردگارێتیی و پەرستراوێتیی بۆخۆی نەكردوە، هەر گوتوویەتی: من بەندەی خوام}، بەڵێ نەصڕانییەكان وێڕای هاوبەش بۆ خوا دانان لە پەرستندا، هاوبەشیشی بۆ دادەنێن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەنداریێتییشدا، بەڵكو لە ناوو سیفەتەكانیشیدا، چونكە ئەوان وێڕای ئەوەی كە عیسا بە كوڕی خوا دادەنێن، وشەی (الله)شی بۆ بەكاردێنن و، وشەی (رَبّ)یشی بۆ بەكاردێنن و، وشەی (مالك المَلَكوت)یشی بۆ بەكاردێنن، چونكە كە كوڕی خوا بێ، بە پێی وەهم و گومانی ئەوان، كەواتە: هەموو ئەو ناوانەی كە خوا هەینی، نەقڵ دەبن

بۆ ویش[1]. ئەوە بواری یەکەم کە کەسێك پێی دەبێتە هاوبەش بۆ خوا دانەر، ئەویش ئەوەیە کە هاوبەش بۆ خوا دابنێ :

أ- لە بەدیهێنەرایەتییدا .

ب- لە پەروەردگارێتییدا .

ج- لە خاوەنداریێتییدا .

**٢/ بواری دووەم: ئەوەیە کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ، لە پەرستراوێتیی (الأُلوهية)دا :**

هەڵبەتە هەموو ئەوانەی جگە لە خوا دەپەرستن، ئنجا بەرد بێ، بەشەر بی، مانگا بێ، (شیطان) بێ، فریشتە بێ، ئەستێرە بێ، ڕووەك بێ، ئاژەڵ بێ، هەموو ئەوانە بە هاوبەش بۆ خوا دانەر، (مُشرِك) دادەنرێن، پەرستنیش ئەوەیە کە بەشێك لە پەرستنەکان، کە تەنیا بۆ خوا ﷻ شایستەن، بۆ جگە لە خوا پێشکەش بکرێن، چ لە بواری بووناسییدا، چ لە بواری ئیمانو عەقیدەدا، چ لە بواری دروشمەکانی خواپەرستییدا، چ لە بواری بەرنامەکانی ژیانو گوزەراندا .

ئنجا ئەم جۆرە لە شیرك، یاخود ئەم بوارەی هاوبەش بۆ خوا دانان، کە بریتیە لە هاوبەش بۆ خوا دانان لە پەرستنیدا، هەموو جۆرەکانی هاوبەش بۆ خوا دانان بە تێکرا دەگرێتەوە، بۆچی ؟

چونکە هاوبەش بۆ خوا دانان لە پەرستنیدا، هەمیشە پەلکێشی هاوبەش بۆ خوا دانان دەکات، لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و ناوو سیفەتەکانیشیدا، چونکە هەروەك چۆن: ئەو کەسەی کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێ، لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەنداریێتییدا، بە هەمان شێوە هاوبەشی بۆ دادەنێ لە پەرستنیشدا، بە هەمان شێوەش: هەر کەسێك

---

١) لە (الكتاب الخامس : الإيمان بكتب الله عزّ وجلّ) لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)دا بە درێژیی باسی ئەو بابەتە کراوەو لە چوار ئینجیلەکانو کۆی (پەیمانی نوێ)دا بەڵگەی لەسەر هێنراونەوە .

جگە لە خوا بپەرستێ، دیارە ئەو پەرستراوەی خۆی: شتێك لە وەدیهێنان ، (خالقیة) یان پەروەردەکردن، (ربوبیة) یان خاوەنداریێتیی، (مالکیة) کە تایبەتن بە خواوە، پاڵی داوەتە لای ئەو پەرستراوەی خۆی، هەروەها هەر کەسێکیش بەو جۆرە مامەڵە بکات لەگەڵ کەسێكو لەگەڵ شتێکدا، دیارە ئەو ناوو سیفەتانەش کە تایبەتن بە خواوە، هەموویانی یان هەندێکیانی بۆ بەکاردێنێ .

ئنجا کە پێشتر وەك دوو نموونەی هاوبەش بۆ خوا دانەران، باسی مەجووسییەکانو نەصرانییەکانمان کرد، لەبەرئەوەیە کە : مەجووسییەکان ئاگر دەپەرستنو بە پیرۆزی دەزانن، هەروەها نەصرانییەکانیش عیسا دەپەرستنو، چەند جۆر لە پەرستشی پێشکەش دەکەن، بۆ وێنە: لێی دەپاڕێنەوە لە گوناهەکانیان خۆش بێ، لێی دەپاڕێنەوە کە شیفایان بدات، لێی دەپاڕێنەوە کە لە قیامەتدا لە فریایان بێ !!

٣/ <u>بواری سێیەم: کە بریتیە لە ناوو سیفەتو کارە تایبەتیەکانی خوای پەروەردگار .</u>

کە دیارە ئەمیش دەگەڕێتەوە نێو بواری یەکەمو دووەمو، پەیوەندیی بە هەردووکیانەوە هەیە، بەڵکو هەر کەسێك هاوبەشێك بۆ خوا دابنێ، لە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگاریێتییو خاوەنداریێتییدا، ئەوە بێگومان دەشیپەرستێو، ئەو ناوو سیفەتانەشی بۆ بەکاردێنێ، کە تایبەتن بە خوای پەروەردگارەوە، چونکە هەر کەسێك جگە لە خوا بپەرستێ، دیارە بە پەرستراو (إلـە)ی داناوە، (إلـە)یش خوا دەفەرموێ: (لا إله إلا الله) بێجگە لە خوا (الله) هیچ پەرستراو (إلـە)ی دیکە نین، کەواتە: تەنیا بەوە کە جگە لە خوا دەپەرستێ، سیفەتی پەرستراوێتیی (أُلُوهیة)ی بۆ داناوە، چونکە: سیفەتی (أُلُوهیة)و، ناوی (إلـە)یش تایبەتە بە خواوە ﷻ .

ئنجا دیارە کەسێك کە جگە لە خوا دەپەرستێ، بە تەمایە :

١) گوێی لە پاڕانەوەکەی بێ .

٢) شیفای نەخۆشییەکەی بدات .

٣) زیانی لێ دوور بخاتەوە .

٤) سوودی بۆ بێنێ .

٥) بەسەر دوژمنانیدا سەری بخات .

٦) لە فریای بێ .

٧) پشتی بگرێ .

هەموو ئەو جۆرە مامەڵانەش دەبێ تەنیا لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بکرێن‌و، هەموو ئەو سیفەتانەش کە بریتین لە: وەڵامدانەوەی پاڕانەوەو، شیفادانی نەخۆش‌و، دوورخستنەوەی زیان‌و، هێنانی بەرژەوەندیی‌و، سەرخستنی بەسەر دوژمنانداو، پشت پێ بەستران، تایبەتن بە خوای بەرزی بێ وێنەوە .

## خاڵە هاوبەشەکانی نێوان هاوبەش بۆ خوا دانەران، بە هەموو جۆرەکانیانەوە :

ئەگەر تەماشای قورئانی بە پێز بکەین، بە لایەنی کەم، حەوت جۆر لە هاوبەش بۆ خوا دانەرانمان دەکەونە بەرچاو، بەڵام پێنج خاڵی هاوبەش هەن، لە نێوان هەموو جۆرەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەراندا، کە بریتین لە :

**١/ هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، دان بە بوونی خوادا دێنن و، دان بە بەدیهێنەرایەتیی و خاوەندارێتیی خوای پەروەردگاردا دێنن، بۆ بوون:**

ئەمەش لە زۆر ئایەتان لە قورئاندا، جەختی لەسەر کراوەتەوەو ڕوونکراوەتەوە، بۆ وێنە :

أ) لە سوورەتی (الزخرف)دا، خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴿٨٧﴾ ﴾، واتە: ئەگەر پرسیاریان لیٚ بکەی: کیٚ دروستی کردوون؟ زۆر بە جەخت کردنەوە دەڵێن: خوا ﷻ، واتە: دان بە بەدیهێنەرایەتیی خوادا دێنن، کە هەر خوا بەدیهێنەرە .

ب) لە سوورەتی (الزخرف)دا، خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ﴾، واتە: وە ئەگەر لێیان بپرسی: کیٚ ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی؟ زۆر بە داکۆکیی کردنەوە دەڵێن: خوای زاڵی زانا، هێناونیە دی .

ج) لە سوورەتی (المؤمنون) لە ئایەتەکانی: (٨٤ تا ٨٩)دا، خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرمویٚ: چەند پرسیارێك ئاراستەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکە، دەفەرمویٚ: ﴿ قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾

﴿قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾﴾.

واتە: پێیان بڵێ: زەوی‌و هەر کەسێك لە زەویدا هەیە هی کێیە، ئەگەر بزانن؟ بە جەختکردنەوە دەڵێن: هەمووی هی خوایە، بڵێ: ئەدی بیر ناکەنەوە؟! بڵێ: کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکانەو پەروەردگاری بارەگای مەزنە؟ دەڵێن: هەر هی خوان، بڵێ: ئەدی بۆچی پارێز ناکەن؟! بڵێ: موڵکی فراوانی هەموو شتێك، بە دەست کێیەو، کێیە تەنیا خۆی پەنا دەداو، هیچ کەسێك ناتوانێ لە دژی وی کەس پەنا بدات، ئەگەر بزانن؟! بە جەخت کردنەوە دەڵێن: هەمووی هی خوایە، بڵێ ئەدی بۆچی جادووتان لێ دەکرێ (وەك جادووتان لێ بکرێ ئاوا بە لاڕێدا دەبردرێن) ؟!

کەواتە: خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ئەوەیە کە : وەدیهێنانو لە نەبوون هێنانە دیو، پەروەردگارێتیی‌و خاوەنداریێتیی بوون، تەنیا بە هی خوا دەزانن .

هەڵبەتە تەنیا مەجووسییەکان لێرەدا جیادەبنەوە، کە ئەوان لە جیاتی یەك بەدیهێنەر، دوو زات بە بەدیهێنەر دەزانن :

١ – (یەزدان) کە دەڵێن: تەنیا چاکەکانی دروست کردوون .

٢ – (ئەهریمەن) کە دەڵێن: تەنیا خراپەکانی دروستکردوون.

**٢/ هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەران، پەرستراوێك، یاخود زیاتر لەگەڵ خوادا دەپەرستن، هەر بۆیەش ناویان لێنراوە: هاوبەش بۆ خوا دانەر (مشرك ) :**

(أَشْرَكَ يُشْرِكُ إِشْرَاكاً، فَهُوَ مُشْرِكٌ) (مُشرِك) دیارە (إسْم الفَاعِل)ە، واتە: کەسێك کە شتێکی کردۆتە هاوبەش، ئنجا لێرەدا دیارە کە مەبەست پێی کەسێکە کە شتێك، یان کەسێك، دەکاتە هاوبەش بۆ خوا ﷻ، لە هەر کام لەو شتانەدا کە تایبەتمەندیی خوای بەرزی مەزنن، وەك :

١ – بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگارێتیی‌و خاوەنداریێتیی .

۲- پەرستراوێتیی .

۳- ناوو سیفەتە بەرزو بێ وێنەکان .

ئنجا وەك پێشتریش گوتمان: هەمیشە بە پەرستراو (معبود - إلە) تەماشاکردنی کەسێك، شتێك: پەلكێشی هەموو یان بەشێك لە تایبەتمەندییەکانی دیکەی وەك: بەدیهێنەرایەتیی و خاوەنداریێتیی و... هتدیش دەکات، چونکە: دەبێ بابای هاوبەشدانەر (مشرك) کەسێك، یان شتێك جگە لە خوا بە بەدیهێنەر بزانێ، یان بە خاوەن بزانێ، یان بە پەروەردگار بزانێ... هتد، ئنجا لە بەرانبەر ئەوەدا کە بەدیهێنەر یان پەروەردگار یان خاوەنی دەزانێ، بەو شێوەیەش مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، کە دەبێ لەگەڵ بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەندا بکرێ .

ئەو ڕاستییەش لە زۆر ئایەتی قوڕئاندا خراوەتەوە ڕوو، واتە: ئەوە کە جگە لە خوا پەرستن (عبادة غیرالله) خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، بۆ وێنە :

لە سوورەتی (الحجر) ئایەتەکانی: (۹٤ و ۹٥ و ۹٦)دا، خوا ﷻ دەفەرمویٚ:

﴿ فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَاكَ الْمُسْتَهْزِئِينَ ﴿٩٥﴾ الَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾.

واتە: ئەوەی فەرمانت پێ کراوە، بە دەنگی بەرزو بە زەقیی ڕایبگەیەنە، {بە شێوەیەك ڕایبگەیەنە هەموو لایەك بیبیستن} و پشت لە هاوبەش بۆ خوا دانەران بکە، {ڕوویان لێ وەرگێڕە}، گاڵتە پێکەران، بە ئێمە بسپێرە {ئێمە ئەوانەت بۆ چارە دەکەین، یان: زیانی ئەوانت لێ دوور دەخەینەوە}، ئەوانەی کە لەگەڵ خوادا ﷻ پەرستراوێکی دیکە دادەنێن، لەمەودوا دەزانن .

کەواتە: هاوبەشدانەران (مُشرکین) ئەوانەن کە لەگەڵ خوادا پەرستراوێکی دیکە دادەنێن .

لێرەدا دەمەوێ ئەوە ڕوون بکەمەوە کە زۆرجار لە کتێبە کوردییەکاندا، هەتا هەندێك لە بانگخوازو مامۆستایەکانیش کە وتار دەدەن، جیاوازیی ناخەنە

نێوان وشەی : (الله)و (إلـه)، کە ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە: (الله) ﷻ یانی: خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن‌و، ئەوەی کە دەبێ هەر ئەو بپەرسترێ، بەڵام (إلـه) یانی پەرستراو، ئنجا وشەی (الله) نە دەکرێتە دووان‌و نە کۆش دەکرێتەوە، بەڵام (إلـه) دووانە (تَثنية)ەش دەکرێ‌و کۆ (جمع)یش دەکرێتەوە (إلـهين ، إلاهان ، آلِهة)، بەڵام (الله) نە دەکرێتە دووان‌و نە کۆش دەکرێتەوە، چونکە هەریەك خوا هەیە، بەڵام دەگونجێ چەندان پەرستراو (إلـه) هەبن، هەڵبەتە یەك پەرستراوی ڕاستەقینەی شایستەی پەرستران هەیە، کە خوایە ﷻ (لا إله إلا الله) یانی: (لا إله بحقٍّ إلا الله) یەك پەرستراوی بە هەق هەیە، ئەویش خوایە ﷻ، بەڵام بە ناهەق دەگونجێ پەرستراوی زۆر هەبن، بۆیە وشەی (إلـه) واتە: پەرستراو، بەڵام (الله) یانی: خوا ﷻ .

**٣/ هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەران، یان زۆربەی هەرە زۆریان، بڕوایان بە زیندوو کرانەوەو بڵاو کرانەوەی مرۆڤەکان‌و، جند نیە، یان بەلای کەمەوە لێی دوودڵن:**

لە زۆر ئایەتەکانی قورئاندا ئەو ڕاستییە خراوەتە ڕوو، بۆ وێنە :

لە سوورەتی (المؤمنون)دا، خوا ﷻ لە سیاقێکدا کە باسی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەکات، دەفەرموێ : ﴿ بَلْ قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓا۟ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَـٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَـٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّآ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾.

واتە: بەڵکو گوتیان: وەك چۆن پێشووەکانیان، گوتیان: ئایا ئەگەر ئێمە مردین‌و بووینە گڵ‌و ئێسقان، (واتە: ئیسقانی پرتووکاوو ڕزیو) ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوە؟ ئا ئەم گفتە بە ئێمەش‌و بە باب‌و باپیرانی پێشووشمان درابوو، ئەمە جگە لە ئەفسانەی پێشینان، هیچی دیکە نیە .

دواییش خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم ئایەتانەداو، لە ئایەتی ژمارە (٩٢)دا دەفەرموێ : ﴿ عَـٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ فَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾

المؤمنون، واتە: (خوا) زانای پەنهانو ئاشكرایە، بەرزی بۆ وی لەوەی كە دەیكەنە هاوبەشی .

كەواتە: ئەوانە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانن، كە بڕواشیان بە ڕۆژی دوایيو زیندووبوونەوەو، ڕۆژی سزاو پاداشت، نیە، یان بەلای كەمەوە : لێی لە گومانو دوودڵیی دان .

**٤/ هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان لە حاڵەتی دۆگمایی فیكرییو دەمارگیرییو لاسایی كردنەوەی كوێرانەی پێشینانیان دان، هەرچەندە بۆشیان دەركەوتبێ كە هەڵەیە :**

بۆ وێنە: خوا ﷻ لەوبارەوە لە سووڕەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿١٠٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسۡبُنَا مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ شَيۡـًٔا وَلَا يَهۡتَدُونَ ﴿١٠٤﴾﴾.

١) واتە: خوا ﷻ هیچ (بَحیرة)یەكو (سائبة)یەكو (وَصیلة)یەكو (حام)ێكی دانەناوە، {ئەوانە چوار جۆرە ئاژەڵ بوون، هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، بە بڕو بیانووی جۆراو جۆرەوە، سوود لێ وەرگرتنیانیان لە خۆیان قەدەغە دەكرد: وەك: سەربڕینو دۆشینو بارلێنانو... هتد}، بەڵام ئەوانەی بێبڕوان درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستنو، زۆربەیان نافامن، ئنجا ئەگەر پێیان بگوترێ: وەرن بۆ ئەوەی خوا ناردوویەتە خوارو، بۆ شوێن كەوتنی پێغەمبەر ﷺ دەڵێن: ئەوەمان بەسە كە بابو باپیرانی خۆمانمان، (پێشینانی خۆمانمان) لەسەر بینیوە (هەر بە دوای ئەوە دەكەوین)، ئایا ئەدی ئەگەر بابو باپیرانو پێشینانیان شتێكیان نەزانیبێو، ڕێی ڕاستیان نەگرتبێ، (هەر دەبێ شوێنیان بكەون) ؟!

٢) هەروەها ئەم ڕاستییە، لە ئایەتەکانی: (١٩ـ ٢٥)ی سووڕەتی (الزُخرف)یش دا هاتووەو، ئەوە دەگەیەنن، کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، حاڵەتێکی دۆگمایی فیکرییان هەیەو دەمارگیرن بۆئەوەی لەسەرنیو، لاسایی پێشینانی خۆیان دەکەنەوە، هەرچەندە بۆشیان دەرکەوتبێ، کە لەسەر ڕێیەکی پووچو هەڵە بوون .

﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَـٰدُ ٱلرَّحْمَـٰنِ إِنَـٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَـٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَـٰنُ مَا عَبَدْنَـٰهُم ۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ ءَاتَيْنَـٰهُمْ كِتَـٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ قَـٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ ۖ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَـٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

**٥/ هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەران، یان زۆربەی هەرە زۆریان، دەستی خۆیان دەدەنە دەست ئەو هاوبەشە وەهمییانەی کە بە هاوبەشی خۆیانیان دادەنێن لە طاغووتەکان و سەرۆکەکان و سادینەکان :[1]**

با لەوبارەوەش سێ نموونە لە ئایەتەکانی قورئان بهێنینەوە :

---

١) (سادن) کە کۆیەکەی (سَدنة)یە.

(سادن) کە کۆیەکەی (سدنة)یە، واتە: ئەوانەن کە مەزارگەوان بوون، بتەوان بوونو خزمەتی بتەکانیان کردووە، بتپەرستەکانیان ئیخفاڵ کردووەو فریو داوە: فەرمانیان پێ کردوونو نەهیان لێ کردوون، شتیان بۆ حەڵاڵ کردوونو شتیان لێ قەدەغە کردوون، بە پێی ئارەزووی خۆیان، بتپەرستەکانیش ڕێشمەی خۆیان داوەتە دەستیان .

١) لە ئایەتی (٢١)ی سوورەتی (الشورى)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾.

واتە: یان ئایا هەندێ هاوبەشیان هەن، کە شتێکیان بۆ لە دین داناون، خوا مۆڵەتی پێ نەداوە ؟!

کەواتە: هەر کەسێك ڕوو لە کەسێك بکات، کە بەرنامەی ژیانی بۆ دابنێ‌و حەڵاڵ‌و حەرامی بۆ دابنێ، ئەوە لە ڕاستییدا کردوویەتی بە هاوبەش بۆ خوا، کە بێگومان خوا هاوبەشی نین لەسەر ئەرزو لە دنیای واقیعدا، بەڵکو بەس لە وەهم‌و خەیاڵی ئەواندا، ئەوانە هاوبەشی خوا بوون .

٢) هەروەها لە سوورەتی (التوبة) لە ئایەتی (٣١)دا، خوا ﷻ دەربارەی جوولەکەو نەصرانییەکان دەفەرموێ: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَٰهًا وَٰحِدًا لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾ ﴾.

واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان، زانایەکان‌و ڕەبەنەکانی خۆیان، لە جیاتی خوا، کردنە پەروەردگارو پەرستراو و مشوورخۆری خۆیان، هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیشیان کردە پەروەردگارو پەرستراوی خۆیان، لە حاڵێکدا کە فەرمانیشیان پێ نەکرا بوو، جگە لە یەك پەرستراو، هیچی دیکە بپەرستن، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، پاکیی بۆ وی، لەوەی دەیکەنە هاوبەشی خوا .

٣) هەروەها لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی (٦٧)دا، خوا ﷻ دەربارەی ئەوانەی کە سەرۆك‌و دەمڕاستەکانی خۆیان‌و، حوکمڕانە ناشەرعیی‌و ناڕەوایەکانی خۆیان، دەکەنە پەرستراوو پەروەردگاری خۆیان، فەرموویەتی :

﴿ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ ﴾.

واتە: (بێبڕوایەکان لە کاتێکدا لە دۆزەخدا سزا دەدرێن) گوتیان: پەروەردگارمان ! ئێمە بە قسەی سەرۆکەکانو گەورەکانی خۆمانمان کرد، {کە تۆمان نەپەرست}، ئەوانیش لە ڕێی ڕاست لایان داینو ونیان کردین .

لەوێ دان پێدا دێنن کە: ئەوانە بە قسەی (سادة) و (کُبراء)، یان کردوە، (سادة) کۆی (سَیّد)ە، (کُبراء)یش کۆی (کَبیر)ە، کە دەگونجێ مەبەست لە (سادة) ئەوانە بن، کە لە بەرگی سیاسییدا پەرستراون، وەك ئەو طاغووتو فیرعەونو حوکمڕانە خۆ بە زل گرانەی، خۆیان بەسەر خەڵکدا دەسەپێنن، لە ڕێی کودەتایەکی سەربازیی، یان حوکمێکی میراتیی، یان خۆ فەرز کردنەوە، یان لە ڕووی ئیددیعاو لاف لێدانێکەوە، کە: ئێمە لە خەڵك جیاین، بنەماڵەی ئێمە، عەشیرەتی ئێمە، حیزبی ئێمە، نەتەوەی ئێمە، جیایە !!

(کُبراء)یش کە کۆی (کَبیر)ە، لەوانەیە مەبەست پێی ئەوانە بن، کە لە بەرگی دیندا خۆیان لە خەڵك دەکەنە پەرستراو، خۆیان بە موقەددەسو پیرۆز ڕا دەنوێنن لەسەر خەڵك، دەشگونجێ بە پێچەوانەوە بێ، گرنگ ئەوەیە هەموو ئەوانەی کە بە جۆرێك لە جۆرەکان خۆیان لە خەڵك دەکەنە گەورەو، خۆیان بەسەردا فەرز دەکەنو، خەڵك ناچارو وادار دەکەن، بیانپەرستنو بە پیرۆزیان بگرنو، بۆیان ملکەچ بن، بە ڕەهایی هەموو ئەوانە بە هاوبەش (شریک) بۆ خوا دادەنرێن، بەڵام دیارە ئەوە تەنیا لە خەیاڵو وەهمی ئەوانەدا وایە، کە دەیانپەرستن، نەك لە دنیای واقیعدا .

## جۆرەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران :

دوای ئەوەی زۆر سەرنجی ئایەتەکانی کتێبی کارزانی خوای پەروەردگارم داوەو، تەماشای واقیعیشم کردوە، گەیشتوومە ئەو قەناعەتە، کە سەرجەم هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، حەوت جۆرن، هەڵبەتە دەشگونجێ لە هەر جۆرێکیشدا، زیاتر وردبیەوەو، چەند جۆرێکی دیکەی لێ پەیدا بکەی، بەلاّم بە بۆچوونی بەندە ئەو حەوت جۆرە، هەموویان کۆ دەکەنەوە :

<u>جۆری یەکەمیان</u> : ئەوانەی شەیتانو شەیتانەکان دەپەرستن (عَبَدَةُ الشَّيْطانِ والشَّياطِين):

واتە: ئەوانەی ڕاستەوخۆ شەیتانو شەیتانەکان دەپەرستن، ئەگەرنا هەرکەسێك جگە لە خوا بپەرستێ، بە شێوەی ناڕاستەوخۆ هەر شەیتانی پەرستوە، چونکە هەر شەیتانە کە پەرستنی جگە لە خوا، بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان جوان دەکات، هەروەها جۆرەکانی کوفرو تاوانو خراپەیان بۆ جوان دەکات، ئنجا ئەوەش لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا هاتوە، کە هەموو بێبڕوایەکان، نەك هەر هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بەڵکو هەموو جۆرەکانی ئەهلی کوفر، بە پەرستاری شەیتان دادەنرێن، بۆ وێنە :

١ – لە سووڕەتی (یس) لە ئایەتی (٦٠)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَـٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾﴾.

واتە: ئەی وەچەی ئادەم! ئەدی پێم ڕانەگەیاندن کە: شەیتان نەپەرستن، ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکراو ڕوونە !

کەواتە: هەرکەسێك جگە لە خوا بپەرستێ، بە شێوەیەکی ناڕاستەخۆ، شەیتانی پەرستوە، بەلاّم ئێمە لێرەدا مەبەستمان ئەوانەیە، کە ڕاستەوخۆ شەیتان دەپەرستن .

٢– هەروەها لە سووڕەتی (النحل)دا، خوا دەفەرمووێ: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

واتە: هەر کاتێك قورئانت خوێند، پەنا بە خوا بگرە، لە شەیتانی دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوا، بێگومان ئەو دەسەڵاتی نیە بەسەر ئەوانەدا کە بڕوایان هێناوەو پشت بە پەروەردگاریان دەپەرستن، ئەو تەنیا دەسەڵاتی بەسەر ئەوانەدا دەشکێ، کە شوێنی دەکەون،و، ئەوانەی کە دەیکەنە هاوبەش، (واتە: دەیکەنە هاوبەش بۆ خوا).

٣– هەروەها لە سووڕەتی (سبأ)دا، خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ ﴾.

واتە: ئەو ڕۆژەی کە خوا کۆیان دەکاتەوە، پاشان بە فریشتەکان دەفەرمووێ: ئا ئەوانە ئێوەیان دەپەرست (ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە)؟! (فریشتەکان) گوتیان: پاکیی بۆ تۆ، تۆ لە جیاتی ئەوان سەرپەرشتیارو پەرستراوی ئێمەی، بەڵکو ئەوانە جندیان دەپەرست، (واتە: شەیتانەکانی جینتیان دەپەرست)، زۆربەیان پێیان بڕوادار بوون .

دیارە پاساو هێنانەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش، کە شەیتانە جینەکانیان[1] پەرستوە، ئەوە بووە کە گوتوویانە: جند (واتە: شەیتانەکان)، کوڕانی خوان، وەك خوا ﷻ لەوبارەوە لێیان دەگێڕێتەوەو، لە سووڕەتی (الأنعام)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

---

١) من هەر کام لە وشەی (جینن ) و (جند) بەکاردێنم، چونکە هەردووك بێژەکان بۆ واتای (جن) بەکاردێنێ

واتە: (کافرەکان) هاوبەشانی جندیان بۆ خوا بڕیاردان، هەرچەندە خواش دروستیکردبوون، هەروەها کوڕان و کچانیان بەبێ زانیاریی بۆ خوا هەڵبەستن، (دەیانگوت: شەیتانەکان کوڕەکانی خوان و، فریشتەکانیش کچانی خوان)، پاکیی و بەرزیی بۆ خوا لەوەی ئەوان خوای پێ وەسف دەکەن .

٤ – هەروەها لە سووڕەتی (الصافات)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُواْ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًاۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ ﴾، دەفەرموێ: (کافرەکان) ڕەچەڵەکێکیان لە نێو خواو جینن دا دانا، (گوتیان: جین کوڕانی خوان)، جندەکانیش دەزانن کە ئەوان ئامادە دەکرێن، (واتە: لە ڕۆژی دوایی دا ئامادە دەکرێن و دەهێترێن بۆ دادگایی کران و لێپرسرانەوە)، پاکیی بۆ خوا لەوەی کە ئەوان خوای پێ وەصف دەکەن (کە کوڕو کچی هەبن)، جگە لە بەندە هەڵبژاردەکان و بەندە ساغەکانی خوا (ئەوانە لە سزاو لێپرسینەوەی خوا دوورن) .

کەواتە: هەموو کافرەکان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ، شەیتان و شەیتانەکان دەپەرستن، بەڵام مەبەست لێرەدا، ئەوانەن کە ڕاستەوخۆ شەیتان دەپەرستن، وەك یەزیدییەکان، کە بە شەیتان دەڵێن: (طاوس مَلَك)، هەروەها ئێستا لە ڕۆژئاوا (غرب)دا کەسانێك پەیدا بوون، کە هەر ڕاستەوخۆ شەیتان دەپەرستن و پەرستشی (تَعَبُّد)ی بۆ دەکەن و، شتانێك دەکەن کە پێیان وایە لە شەیتان نیزیکیان دەخەنەوە، هەروەها جادووگەرەکانیش مەگەر چۆن، دەنا شەیتان دەپەرستن و، شتانێك دەکەن کە لە شەیتانیان نیزیك بخەنەوە، بۆ ئەوەی بەهرەی خراپیان لێ وەربگرن .

<u>جۆری دووەمیان :</u> ئەوانەی فریشتەکان دەپەرستن (عَبَدَةُ الملائکة) :

دیارە ئەمیش لە چەند شوێنێکی قورئاندا خوا باسی کردوە، کە هەندێ لە موشریکەکان، فریشتەکان دەپەرستن، بۆ وێنە :

١ – لە سوورەتی (الزخرف)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَـٰدُ ٱلرَّحْمَـٰنِ إِنَـٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَـٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَـٰنُ مَا عَبَدْنَـٰهُم ۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾.

واتە: (کافرەکان) ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوای خاوەن بەزەیین، بە مێینەیان لە قەڵەم دان، ئایا ئاگادار بوون، کە دروستکراون، (یان: ئایا دەیانبینن، کە مێینەن، یاخود نێرینەن)؟! ئەو شایەدیی دانەیان دەنووسرێ (کە بە ناهەق شایەدیی دەدەن بەبێ زانیاریی)، لێشیان دەپرسرێتەوەو، گوتیان: ئەگەر خوای خاوەن بەزەیی ویستبای: نەیانپەرستین، نەمان دەپەرستن، (فریشتەکانمان نەدەپەرستن) لەوبارەوە هیچ زانیارییەکیان نیە، بەس درۆ دەکەن .

بەڵێ هەموو شتێك بە ویستی خوایە، وەك پێشتر گوتمان، بەڵام ئەوان مەبەستیان ئەوە بووە: خوا پێی خۆشە ئێمە فریشتەکان بپەرستین، بۆیە ڕێی لێی نەگرتووین!! نەیانزانیوە کە خوا ﷻ بە مەبەستی تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان، دەستی مرۆڤەکانی ئاوەڵا کردوەو، زۆریی لێ نەکردوونو ناچاری نەکردوون، کە فڵان شتە بکەن، یان نەیکەن، بەڵکو ئازادی کردوونو سەرپشکی کردوون، بۆیە ئەوان بە ویستی ئازادانەی خۆیان فریشتەکان دەپەرستن، مەرجیش نیە هەرشتێك بە ویستی خوا بوو، بە ڕەزامەندیی خواش بێ، خوا ﷻ هیچ شتێکی خراپی پێ خۆش نیەو، لە هیچ کردەوەیەکی خراپ ڕازیی نیە، بە تایبەتی لە شیرك، ئنجا ئەو شیرکە، ئەو پەرستنە، کە بۆ جگە لە خوا ئەنجام دەدرێ :

١) چ بۆ فریشتان ئەنجام بدرێ .

٢) چ بۆ شەیتانان ئەنجام بدرێ .

٣) چ بۆ دارو بەرد .

٤) چ بۆ مرۆڤ .

٥) چ بۆ هەر شتێك .

بە تەئكید خوا پێی ناخۆشە، وەك لە ئایەتی (٧)ی سوورەتی (الزمر)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ وَإِن تَشْكُرُواْ يَرْضَهُ لَكُمْ ﴾، واتە: خوا ڕازیی نیە بۆ بەندەكانی كە بێبڕوابن، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاربن (و تەنیا بەندەی خوابن)، خوا ئەوەی پێ خۆشە .

هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان كە گوتوویانە: (ئەگەر خوا ویستبای نەماندەپەرستن) مەبەستیان ئەوە بووە: دیارە خوا پێی خۆشە! خواش بە درۆیان دەخاتەوەو دەفەرمووێ: زانیارییان نیە لەوبارەوە، واتە: درۆ دەكەن، خوا پێی خۆش نیە، بەڵام هەموو شتێك بە ویستی خوایە، چونكە هیچ شتێك بەبێ ویستی خوا نایەتە دی .

٢ – هەروەها خوا لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، هەر لەوبارەوە، كە هەندێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، فریشتەكان دەپەرستن، دەفەرمووێ : ﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًاۗ سُبْحَٰنَهُۥۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾ وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

واتە: (هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان) گوتیان: خوای خاوەن بەزەیی ڕۆڵەی هەیە، پاكیی بۆ خوا، بەڵكو ئەوانە بەندەی ڕێز لێگیراوی خوان، (مەبەست فریشتەكانن) هیچ قسەیەك لە پێش خوادا ناكەن‌و، بە فەرمانی خوا دەجووڵێنەوەو كار دەكەن، خوا هەموو شتێك لە بارەی ئەوانەوە دەزانێ: ئەوەی لە پێشیانەوەیەو ئەوەی لە دوایانەوە هەیە، (یان: ئەوەی جارێ نەهاتووەو، ئەوەی كە ڕابردوە، هەموو شتێكیان لەبارەوە دەزانێ)و، ئەوان تكا ناكەن مەگەر بۆ كەسێك كە خوا لێی ڕازی بێ تكای بۆ بكرێ‌و، ئەوان لە ترسی خوا هەڵدەلەرزن، (ترس‌و سام‌و بیم‌و هەیبەتی خوای پەروەردگاریان لە دڵدایە)و، هەركەسێك لەوان بڵێ: من پەرستراوم جگە

لە خوا، ئا ئەوە بە دۆزەخ سزای دەدەین، بەو شێوەیە ئێمە سزای ستەمکاران دەدەین .

کەواتە: بەشێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، فریشتەکانیان پەرستوون‌و، لە ڕاستییدا عەرەبەکان کە (هُبل و لات و مناة عُزَّى)یان هەبووە، وەك شارەزایانی زمان دەڵێن: (لات) (مُؤنَّث)ی (إله) بووەو، (عُزَّى) (مُؤنث)ی (عزیز) بووەو، (مناة) (مُؤنث)ی (مَنّان) بووە، ئەوانەش هەموویان سیفەتی خوای پەروەردگارن .

ئنجا نەك هەر ئەوەندە، بەڵكو میسرییەکان‌و یۆنانییەکان‌و هیندییەکان‌و کلدانیی‌و ئاشوورییەکان، ئەگەر تەماشای مێژوو بکەین، زۆرجار پەرستراوەکانیان بە مێیینە وەسف کردوون، کە وا پێدەچێ ئەوانیان هەموو بە فریشتە لە قەڵەم دابێ‌و، فریشتەکانیشیان بە مێیینە لە قەڵەم داون، بە کچانی خوایان لە قەڵەم داون، بەو وەهمە پەرستوویانن .

<u>جۆری سێیەم:</u> ئەوانەی کە خۆرو مانگ‌و خڕۆکەو ئەستێرەکان دەپەرستن :

لەوبارەوەش دوو نموونە لە ئایەتەکانی قورئان دێنینەوە :

١) وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (فصلت)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

واتە: هەروەها لە نیشانەو بەڵگەکانی پەروەردگارێتیی خوا : شەوگارو ڕۆژگارو خۆرو مانگە، ئێوە کڕنووش بۆ خۆرو بۆ مانگ مەبەن، بەڵکو کڕنووش بۆ ئەو خوایە ببەن کە دروستیکردوون، ئەگەر بەڕاستیی دەتانەوێ خوا پەرست بن، (نابێ هاوبەشی بۆ پەیدا بکەن) .

٢) هەروەها لە ئایەتەکانی: (٧٥ – ٧٩)ی سوورەتی (الأنعام)دا، کە لە بەرگی پێنجی تەفسیرە کوردییەکەی خۆماندا، بە تەفصیلێ شەرحمان کردوون، خوا ﷻ باسی ئیبراهیم دەکات‌و دەفەرمووێ :

﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلۡمُوقِنِينَ ٧٥ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيۡهِ ٱلَّيۡلُ رَءَا كَوۡكَبٗاۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ ٧٦ فَلَمَّا رَءَا ٱلۡقَمَرَ بَازِغٗا قَالَ هَٰذَا رَبِّيۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمۡ يَهۡدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلضَّآلِّينَ ٧٧ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمۡسَ بَازِغَةٗ قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكۡبَرُۖ فَلَمَّآ أَفَلَتۡ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ٧٨ إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٧٩ ﴾.

لێرەدا خوا ﷻ باسی ئیبراهیم دەکات، کە لە سەرەتای تەمەنیەوە، بە فیطرەتو دڵو دەروونو عەقڵی سەلیمی، زانیویەتی: ئەم بوون (وجود)ە، خاوەنێکی هەیە، پەروەردگارو مشوورخۆرێکی هەیە، بەڵام جارێ نەبۆتە پێغەمبەر ﷺ و نەیزانیوە کە ئەو خوایە، ئەو بەدیهێنەرە ئەو خاوەنو پەروەردگارە کێیەو ؟ چۆنەو ؟ سیفەتەکانی چیین ؟

خوا دەفەرموێ: بەو شێوەیە ئێمە موڵکی ئاسمانەکانو زەوییمان پێشانی ئیبراهیم دا، بۆ ئەوەی لە دڵنیایان بێ (لەوانە بێ کە دەبنە خاوەنی دڵنیاییو ئیمانی دامەزراو سەبارەت بە خوا) ٧٥.

کاتێك شەوگاری لێ داهات: ئەستێرەیەکی بینی، گوتی: ئا ئەوە پەروەردگارمە، کاتێ ئاوا بوو، گوتی: من ئاوا بووانم خۆش ناوێن ٧٦ .

کاتێك مانگی بینی، درەوشاوە بوو، گوتی: ئا ئەوە پەروەردگارمە، کاتێك ئەویش ئاوا بوو، گوتی: ئەگەر پەروەردگارم (کە بە عەقڵو فیطرەتم دەزانم: خاوەنی هەموو شتێکە) ڕێی ڕاستم پیشان نەدا، من لە گومڕایان دەبم ٧٧ .

کاتێك کە خۆری بینی، درەوشاوە بوو، گوتی: ئا ئەمە پەروەردگارمە، ئەمە لە هەموویان گەورەترە، کاتێك خۆریش ئاوا بوو، گوتی: ئەی خەڵکەکەم!

گەلەكەم! من بەریم، دوورم لەو شتانەی ئێوە دەیانكەن بە هاوبەش بۆ خوا، (ئەوانەی ئەستێرەیان پەرستوە، مانگیان پەرستوە، خۆریان پەرستوە، من دوورم لەو شتانەی كە ئێوە دەیانكەنە هاوبەش بۆ خوا) ﴿٧٨﴾ .

من ڕووی خۆم بە پاكیی كردە ئەو كەسەی كە ئاسمانەكان‌و زەوی هێناونە دی‌و، من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم ﴿٧٩﴾ .

كەواتە: جۆرێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرانیش، ئەوانە بوون كە خڕۆكەكانیان پەرستوون‌و، ئەستێرەكان‌و مانگ‌و خۆریان پەرستوون .

جۆری چوارەم: ئەوانەی كە بت‌و صەنەمەكانیان پەرستوون، ئەو پەیكەرانەی كە دروستیان كردوون (عَبَدَةُ الأصنامِ والأوثان) :

وا پێدەچێ ئەم پۆلە، ئەم جۆرە لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، زۆرینەی هاوبەش بۆ خوا دانەران بن، هەر بۆیەش كتێبی كاربەجێی خوا ﷻ زۆر باسی ئەم جۆرە لە هاوبەش بۆ خوا دانەرانی كردوەو، زۆربەی وتوێژو مشتومڕی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)یش لەگەڵ ئەم جۆرە لە هاوبەش بۆ خوا دانەران دا بووە، وەك خوا ﷻ بۆی گێڕاوینەوە، بە تایبەت لە بارەی ئیبڕاهیمەوە ﷺ كە بەسەرهاتی ئیبڕاهیم‌و وتوویژو شەڕە قسەی ئیبڕاهیمی بۆ گێڕاوینەوە، لەگەڵ بتپەرست‌و پەیكەر پەرستەكاندا، لە هەركام لە سووڕەتەكانی: (الأنعام)و (مریم)و (الشعراء)و (العنكبوت)و (الصافات)و (الزخرف)دا، لە هەر كام لەو سووڕەتانەدا، خوا ﷻ باسی شەڕە قسەو وتوویژو دیالۆگی ئیبڕاهیم ﷺی لەگەڵ ئەو بتپەرست‌و پەیكەر پەرستانەدا، بۆ گێڕاوینەوە .

با بۆ نموونە ئایەتەكانی سووڕەتی (الصافات) ببینین، كە تێیان دا (إبراهیم) وتوویژ و شەڕەقسە لەگەڵ بتپەرستەكانی گەلەكەی دا دەكات:

﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبۡرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذۡ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلۡبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦ مَاذَا تَعۡبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفۡكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ

﴿فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي النُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰ آلِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًا بِالْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوا إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَانًا فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾﴾ الصافات .

هەڵبەتە ئەو بتانەی کە لە قورئاندا ناویان هاتوە، ئەم نۆ (٩)یەن :

أ/ {(١– لات، ٢– عزَّى، ٣– مناة) لە سوورەتی (النجم)}دا.

ب/ {(٤– وَدّ، ٥– سواع، ٦– يغوثُ، ٧– يعوقُ، ٨– نَسر) لە سوورەتی (نوح)}دا.

ج/ {٩– (بَعل) لە سوورەتی (الصافات)}دا.

ئنجا ئەوانە عادەتیان وا بووە بتەکانی خۆیانیان لە ماددەی جۆراو جۆر دروست کردوون: وەك: بەرد، قوڕ، ئاسن، مس، تەختە، بەڵکو جاری وابووە لە جۆرێك لە (خورما)و شیریان بەسەردا کردوە، هەر کات برسیشیان بووە، خواردوویانە، بەتایبەت عەرەبەکان ئەو جۆرە عادەتەیان هەبووە .

<u>جۆری پێنجەم:</u> ئەوانەی هەواو ئارەزوو دەپەرستن (عَبَدَةُ الهَوَى) :

لەوبارەوەش دوو ئایەت بە نموونە دێنینەوە:

١– وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (الفرقان) ئایەتی (٤٣)دا، دەفەرمووێ: ﴿أَرَءَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ ...﴾، واتە: ئایا ئەو کەسەت بینیوە، کە ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی !

٢– هەروەها لە سوورەتی (الجاثية) ئایەتی (٢٣)دا، دیسان دەفەرمووێ: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ ...﴾، واتە: ئایا ئەو کەسەت بینیوە، کە ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی!

هەڵبەتە پەرستنی ئارەزوو (هوی) بە چەمکە گشتییەکەی، (هوی)، هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەران دەگرێتەوە، چونکە بابای هاوبەش بۆ خوا دانەر، کە جگە لە خوا دەپەرستێ، بینا لەسەر شوێنکەوتنی ئارەزووی خۆی، جگە لە خوا دەپەرستێ، بەلاّم چەمکێ کە زیاتر پڕ بە پێستە بە بۆ چوونی من، پڕ بە پێستی ئەو کەسانەیە کە: پەیکەرێكو پەرستراوێکی ڕواڵەتیی و دەرەکیی، وەك: مانگو خۆرو مرۆڤو دارو بەردو ئاژەڵ، ناپەرستن، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا خوا ناپەرستن، بەڵکو هەرچی نەفسیان ئارەزووی کرد، ئەوە دەکەن، ئنجا وەك شاعیر دەڵێ :

وَمَنْ أَبَاحَ النَّفْسَ ما تَهْوَاهُ فَإِنَّما إِلَهُهُ هَوَاهُ

هەر کەسێك نەفسی چی ئارەزووی کرد، پێی داو بۆی ڕەوا کرد، ئەو بێگومان ئارەزووی خۆی کردوە بە پەرستراوی خۆی .

کەواتە: زۆرێك لەوانەی پەرستراوێکی ڕواڵەتیی ناپەرستن، پەرستراوێکی بەرهەست (محسوس) ناپەرستن، بەلاّم خواش ناپەرستن، ئەوانە لە ڕاستییدا ئارەزوو پەرستن، ئارەزووی خۆیان، بۆچوونی خۆیانو، خۆیان دەپەرستنو، لە چوارچێوەو لە سوورگەی خۆیاندا دەخولێنەوە، خۆیان چییان پێ خۆش بوو، وا دەکەن، نەفسیان چی پێگوتن بەو شێوەیە ڕەفتار دەکەن، کەواتە: ئەوانە پەرستاری ئارەزووەکانی خۆیانن .

جۆری شەشەم : ئەوانەی طاغووتو لە خوا یاخییەکان دەپەرستن، لە سەرۆکە دنیاییەکان، وەك پادشاو حوکمڕانەکان، یاخود لە بەرپرسە دینییەکان، وەك: زانایانو ڕەبەنەکان :

واتە: هەموو ئەوانەی کە لە بەرگی: حیزب دا، عەشیرەت دا، حوکمو سیاسەتدا، دینداریيەکی موزەییەفو ساختەدا، خۆیان لە خەڵك دەکەنە پەرستراوو، خەڵك وادار دەکەن کە بە بەرزیان بگرن، بە پیرۆزیان بگرنو، بە ڕەهایی بۆیان ملکەچ بنو، هەرچی ئەوان گوتیان: ڕەتی نەکەنەوە، کە لە ڕاستییدا ئەوەش جۆرێکە لە پەرستراوێتیی، ڕەفتاری پەیڕەوانی ئەو جۆرە کەسانەش جۆرێکە لە پەرستنی غەیری خوا .

لە زۆر جێگای قورئانیش دا باسی ئەو جۆرە شیرکە کراوە، بۆ وێنە :

١- خوا ﷻ لە سوورەتی (آل عمران)دا، لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا۟ رَبَّٰنِيِّۦنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّۦنَ أَرْبَابًا ۗ أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾.

وەك لە بەرگی دووی ئەم تەفسیرەدا، بە تەفصیل ئەم ئایەتانەمان شی کردۆتەوە، لە تەفسیری سوورەتی (آل عمران)دا .

واتە: هیچ مرۆڤێك بۆی نیە خوا ﷻ کتێب و حیکمەت و پێغەمبەرایەتیی پێ بدات، پاشان بە خەڵك بڵێ: ببنە بەندەی من جیا لە خوا، بەڵكو دەبێ پێیان بڵێ: ببنە كەسانی ڕەببانیی (سەر بە پەروەردگارو پەرستاری خوا) بەهۆی ئەوەوە كە كتێب فێری خەڵك دەكەن و، بەهۆی ئەوەوە كە موتاڵای كتێب دەكەن و لێی دەكۆڵنەوە .

هەروەها هیچ مرۆڤێك بۆی نیە فەرمانتان پێ بكات كە فریشتەكان و پێغەمبەران لە جیاتی خوا، بكەنە پەروەردگارو پەرستراو، ئایا دەبێ فەرمانتان پێ بكەن، بە كوفر دوای ئەوەی ئێوە بۆ خوا ملكەچن ؟!

٢- هەروەها لە سوورەتی (التوبة) - كە پێشتریش هێنامان - لە ئایەتی ژمارە (٣١) دا، خوا دەربارەی خاوەن كتێبەكان، بەگشتیی و جوولەكەو نەصرانییەكان بە تایبەت، دەفەرموێ : ﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾ ﴾.

واتە: ئەوان {جوولەکەو نەصرانییەکان} زانایەکانی خۆیان و ڕەبەن و گۆشەگیرەکانی خۆیان لە جیاتی خوا، (لە خوار خواوە) کردنە پەروەردگارو پەرستراوی خۆیان، هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیشیان کردە پەروەردگاری خۆیان، لە حاڵێکدا کە فەرمانیان پێ نەکرابوو، جگە لە یەك پەرستراو کەسی دیکە بپەرستن، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، پاکیی بۆ وی لەوەی دەیکەن بە هاوبەش بۆ خوا .

٣- هەروەها لە سووڕەتی (الشورى)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴿٢١﴾ ﴾.

واتە: یان ئایا هەندێك هاوبەشیان هەن، بەبێ ئەوەی خوا مۆڵەتی لەسەر بێ، ئایین و بەرنامەیەکیان بۆ داناون ؟!

ئنجا ئێمە پێشتریش باسمان کرد کە (طاغوت) هەر کەسێکە بەرنامە بۆ خەڵك دادەنێ و، فەرمانیان پێ دەکات و، شتیان لێ قەدەغە دەکات، بە ئارەزووی خۆی، یان ئارەزووی غەیری خۆی، هەر بۆیە دەتوانین لە پێناسە کردنی (طاغوت)دا بڵێین : (هُوَ كُلُّ مُطاعٍ مِنْ غَيْرِ إِذْنِ الشَّرْعِ) هەر فەرمانبەریی بۆ کراوێکە بەبێ مۆڵەتی شەرع، ئنجا ئەمە هەم سەرۆکە دنیاییەکان دەگرێتەوە، لە پادشاو سەرکردەو حوکمڕانان، هەروەها ئەوانەی کە بەرنامە بۆ خەڵك دادەنێن، تیۆریستەکان (المُنَظِّرون)، هەروەها سەرۆکە دینیی و ڕووحییەکان لە زانایان و شێخەکان و، ئەوانە کە بە حیساب هەر خەریکی گۆشەگیریی و ڕەبەنایەتیین، ئەوانەی کە شوێنکەوتووانی خۆیان، بە پێی بۆچوونەکانی خۆیان و ئارەزووی خۆیان ، ڕێنمایی دەکەن، بەبێ گەڕانەوە بۆ شەریعەت و وەحیی خوا، کە ئێستا لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیەو، بەبێ پابەندیی بەو شتانەوە، کە شەریعەت وەك خەتی سوور دایناون .

هەڵبەتە ئێمە پێشتریش باسمان کرد کە چەمکی پەرستن (عبادة) لە زاراوی قورئاندا، تەنیا لەسەر دروشمەکانی پەرستن (شعائر التعبُّد) کورت

هەڵنەهاتوە، وەك: پاڕانەوەو ڕكووعو سەجدەو تەحییاتو طەوافو قوربانیی سەربڕینو نەزرو... هتد، بەڵكو عیبادەت هەموو جۆرەكانی ملكەچیی‌و فەرمانبەریی بۆ كردن، دەگرێتەوە، هەمووی بە پەرستن لە قەڵەم دەدرێ، چ پەیوەندیی بە درووشمەكانەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە یاساكانی ڕێكخستنی ژیانەوە هەبێ، پێش ئەوانیش: چ پەیوەندیی بە بوونناسیی‌و بیروبۆچوونەكان‌و، بەهایەكان‌و، ئیمان‌و عەقیدەوە هەبێ، هەر بۆیە: هەر كەسێك ملی كەچ بكات بە ڕەهایی بۆ كەسێك، یان بۆ لایەنێكو بەبێ مۆڵەتی شەرع، بە قسەی بكاتو فەرمانبەریی بكات، ئەوە ئەو ملكەچ بۆ كراوەی پەرستوەو، جگە لە خوا، ئەوی پەرستوە، چونكە مانای پەرستن (تعبُّد) لە ئەسڵی زمانی عەرەبییدا، بریتیە لە ملكەچ كردن‌و فەرمانبەریی بۆ كردن‌و زەبوونیی، هەروەك ئایەتەكانی قورئان زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنن، بۆ وێنە :

أ) ئایەتی ژمارە (٢٢) لە سوورەتی (الشعراء) كاتێك فیرعەون منەت دەكات لەسەر مووسا ﷺ: ﴿ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: (فیرعەون) گوتی: ئایا لە ماڵی ئێمەدا تۆمان بە منداڵیی بەخێو نەكردو، چەند ساڵان لە نێو ئێمەدا نەمایەوە ؟!

مووساش ﷺ لە وەڵامی ئەو منەت كردنەیدا، دەفەرموێ: ﴿ وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: ئەو چاكەیەش كە تۆ بە چاوی منیدا دەدەیەوە، بەهۆی ئەوەوە بوو، كە تۆ بەنی ئیسرائیلت كردبۆ بەندەی خۆت، واتە: ملكەچی خۆتو ژێر دەستەی خۆت.

ئەگەرنا بەنی ئیسرائیل نەچوون ڕكووعو سەجدە بۆ فیرعەون بەرن، بەڵكو ناچاری كردوون‌و سۆغرەو بێگاری پێ كردوون‌و، ملی پێ كەچ كردوون بە ناچاریی، كەواتە: هەر كەسێك مل بۆ لایەنێك كەچ بكات، بە خۆشیی یان بە ناخۆشیی، ئەوە ئەو كردەوەیەی ئەو، بە پەرستن لە قەڵەم دەدرێ[1].

---

١) بەڵام ئەگەر لە سەری ناچار بكرێ، گوناهی ناگات، مادام پێی ناخۆش بێ .

ب) هەروەها هەر لەوبارەوە لە سوورەتی (المؤمنون) ئایەتی (٤٧)دا، کاتێك کە مووساو هاروون صەلاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، دەچن بۆ لای فیرعەونو، پەیامی خوای پێ رادەگەیەننو، داوای لێ دەکەن کە: چی دیکە گەلەکەیان (گەلی بەنو ئیسرائیل) نەچەوسێنێتەوە، فیرعەونو دارودەستەکەی دەڵێن: ﴿ فَقَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا وَقَوۡمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾.

واتە: ئایا ئێمە بڕوا بۆ دوو کەسی وەك خۆمان بێنین، کە گەلەکەشیان بۆ ئێمە ملکەچن ؟!

کە بە تەئکید فیرعەونو دارودەستەکەی مەبەستیان لە ملکەچیی و بەندایەتیی بەنی ئیسرائیل ئەوە بووە، کە بە قسەمان دەکەنو، لە قسەمان دەرناچنو ملکەچی ئێمەن، ئەگەرنا مەبەستیان ئەوە نەبووە: لێیان بپارێنەوەو ڕکووعو سەجدەو تەحییاتیان بۆ ئەنجام بدەن !

بەلام بێگومان هەر کەسێك بەبێ ئەوە کە ئازادیی هەبێ، بەبێ ئەوە کە بە دەستی بێ، بەبێ ئەوەی سەربەست بێ لەوەدا، کە ملی پێ کەچ دەکرێو، فەرمانبەریی پێ دەکرێ، وەك بەنی ئیسرائیل، ئەو کاتە بەو ملکەچیی و ژێردەستەیی و فەرمانبەرییە ناچارییەی، گوناهبار نابێ، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە بە ویستی ئازادانەی خۆیو، بە هەڵبژاردنی خۆی مل بۆ کەسێك کەچ دەکاتو، فەرمانبەریی ڕەهای بۆ دەکات .

هەڵبەتە ئەوەش کە: ملکەچ کردنو فەرمانبەریی بۆ کردنی ڕەها، بۆ هەر کەسێكو هەر لایەنێك: حیزب بێ، ڕژێم بێ، شەخص بێ، لە بەرگی دیندا بێ، لە بەرگی دنیادا بێ، بریتییە لە پەرستن، مادام بە ویستی ئازادانەوە بێ، ئەوە ڕاستییەکی گەورەو گرنگەو لە قورئاندا زۆر ڕوونکراوەتەوە، هەر بۆیەش هەموو ئەو مسوڵمانانەی کە بە داخەوە ڕێیان لێ تێکدەچێو، فیرعەونو طاغووتەکان وایان لێ دەکەن کە بکەونە شوێن ئەو بەرنامە طاغووتییانەی لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواوە هاتوون، وەك: سیکۆلاریزمو سوسیالیزمو کاپیتالیزمو لیبڕالیزمو... هتدو، بێگومان ئەو جۆرە کەسانە ئەگەر ویستی ئازادانەیان لە ئارادا هەبێ، بە پەرستەری ئەو بەرنامانەو

ئەو كەسانەو ئەو لایەنانە، كە ئەو بەرنامانەیان بۆ داناون، دادەنرێن، بەڵام دیارە ئەگەر ناچاربن، ئەو كاتە ناچاریی، حوكمێكی دیكەی هەیە، مادام قەلبو قەناعەتی لەگەڵدا نەبێ، واتە: ئەو میللەتانەی كە ناچار دەكرێن، ملیان پێ كەچ دەكرێ‌و پێیان ناخۆشە، بەڵام بێچارەو بێ دەرەتانن‌و، بە پێی تواناش خۆیان دەپارێزن لەوەی كە ملكەچ بكەن بۆ غەیری خواو كاتی كە بۆشیان دەگونجێ: هەڵوێست وەردەگرن‌و دژایەتیی ئەو لایەنانە دەكەن، كە دەیانەوێ خۆیان لێ بكەنە پەرستراوو پەروەردگار، ئەو كاتە حوكمەكەیان جیایە .

<u>جۆری حەوتەم‌و كۆتایی :</u> ئەوانەی ژیانداران دەپەرستن (عَبَدَةُ الحیوانات) :

دیارە ئەوانیش زۆر جۆرن، لەم ڕۆژگارەی ئێستای ئێمەداو، لە مێژووشدا هەر زۆر بوون، بۆ وێنە: هیندۆسەكان كە لە (هند) مانگا دەپەرستن‌و، بە پیرۆزی دەزانن، هەڵبەتە هەم لە هیندو هەم لە وڵاتانی دیكەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو، لە ئەفریقیا زۆر گەل‌و نەتەوە هەن كە جۆرەكانی ئاژەڵ‌و زیندەوەران‌و ژیانداران دەپەرستن، وەك: مارو مشك .

من سەفەرێكم كرد لە ساڵی (٢٠١٠)ز دا، بۆ بەشداریی كردن لە (كۆنگرەی پەرلەمانتارە ئاسیاییەكان) كە بە مالیزیادا تێپەڕین، بە (كوالالامپور) پایتەختی مالیزیادا، پاشان چووینە (فنوبنە) كە پایتەختی كەمبۆدیایە، ئنجا چ لە پایتەختی كەمبۆدیا، چ لە كوالالامپوور دەمبینی چۆن كەسانێك ماری كوبرا دەپەرستن، پەیكەریان بۆ دروست كردووەو، لە بەرانبەر پەیكەرەكەدا، یان لە بەرانبەر پەیكەری (بوذا)دا بە چۆكدا دەهاتن‌و كرنووشیان بۆ دەبرد، لێی دەپاڕانەوەو بخوورو، جۆرێك لە بۆنی خۆشیان بۆ دەسووتاند! ئنجا قسەم لەگەڵدا كردن، ئەوان پێیان سەیر بوو كە ئێمە پێمان سەیرە، ئەو شتانە بپەرستن، واتە: پێ سەیر بوونی ئێمەیان پێ سەیر بوو، گوتم: ئەو پەیكەرە هیچ نابیستێ! دەیانگوت: ئاخر ئەوانە تكامان بۆ دەكەن، ڕووحەكەیان داواكانی ئێمە دەگەیەنن بە خوا! بە هەر

حاڵ جۆری حەوتەمی ئەوانە کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، ئەوانەن کە ژیانداران دەپەرستن .

ئنجا وەك گوتم: هەیە مشك دەپەرستێ، هەیە مار دەپەرستێ، هەیە مانگا دەپەرستێ، هەندێکیان هەندێك جۆرە ڕووەك دەپەرستن! کاتی خۆشی گەلی بەنو ئیسرائیل (گوێلك)یان پەرستوە، ئەو گوێلکەی کە سامیریی لە زێڕ، لەو خشڵەی کە پێیان بوو، بۆی دروست کردن، لە سەردەمی مووسادا عليه السلام وەك خوا سبحانه وتعالى لە ئایەتی (٥٤) سوورەتی (البَقَرة)، هەروەها لە سوورەتی (الأعراف) و سوورەتی (طه)دا بە تەفصیل بەسەرهاتەکەی هاتوە، کە دەفەرمویْ: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾﴾.

واتە: کاتێك مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: ئەی گەلەکەم! ئێوە ستەمتان لە خۆتان کرد کە گوێلکتان کردە پەرستراو، بەرەو بەدیهێنەرتان بگەڕێنەوەو خۆتان بکوژن، (واتە: هەندێکتان هەندێکتان بکوژن)، ئا ئەوە چاکترە لەلای بەدیهێنەرتان، ئنجا پەروەردگارتان گەڕایەوە سەرتان، تەوبەی لێ قبووڵ کردن، بێگومان ئەو زۆر تەوبە وەرگری میهرەبانە .

## بەرپەرچدانەوەی کتێبی خوا بۆ شیرکی هاوبەش بۆ خوادانەران:

ئێستاش کە جۆرەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەرانمان باسکردن، کە وەك گوتمان : حەوت جۆری سەرەکیین‌و، خاڵە هاوبەشەکانی نێوانیانمان باس کردن، کە پێنج خاڵی هاوبەشی بنەڕەتیی بوون، با بزانین کتێبی بێ وێنەی خوا ﷻ چۆن بەرپەرچی بیرۆکەی هاوبەش بۆ خوا دانان‌و، سەرجەم هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەداتەوە :

هەڵبەتە ئێمە لەوبارەوە لە قورئاندا ئایەتمان زۆر زۆرن، بەڵام ئیکتیفا دەکەین بە هێنانەوەی :

یەکەم: دوو ئایەت لە سووڕەتی (الأنعام)، کە خوا ﷻ بیرۆکەی پەرستنی (شەیتانەکان‌و، پەرستنی فریشتەکان، پێکەوە هەڵدەوەشێنێتەوەو پووچەڵی دەکاتەوە، واتە: ئەوانەی کە (شەیتانەکانیان دەپەرست بە بیانووی ئەوەی کە کوڕانی خوان‌و، ئەوانەی کە فریشتەکانیان دەپەرست بە بیانووی ئەوەی کە کچانی خوان)، خوا ﷻ بەرپەرچیان دەداتەوە .

دووەم: دوایش دوو ئایەت لە سووڕەتی (سبأ) دێنینەوە، کە خوای زاڵی باڵادەست بەرپەرچی سەرجەم هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەداتەوە، بە هەموو شێوەکانیانەوەو، بیرۆکەی شیرك‌و هاوبەش بۆ خوا دانان لەبەر یەك هەڵدەوەشێنێ .

يـەكـــــەم :

سـەرەتا بـا دوو ئـایـەتـەكـەی سـوورەتی (الأنعـام) بێـنـیـن :

﴿ وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يَصِفُونَ (١٠٠) بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُنْ لَهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (١٠١) ﴾.

واتـە: هـاوبـەشـیـان لـە جـنـد بـۆ خـوا دانـان، لـە حاڵێـكـدا كـە خـوا جنـدەكـانیشـی هـەر دروسـت كـردوون (وەك بـاقی دروستكراوەكـانی دیكـە)، هـەروەهـا كوڕان‌و كچانیـان بـۆ هـەڵبـەستن بە بێ زانیاریی، پاكیی‌و بـەرزیی بـۆ خـوا، لـەوەی خـوای پـێ وەسـف دەكـەن، پەیداكـەری ئاسـمانەكان‌و زەوییـە، چۆن ڕۆڵـەی دەبێ لە حاڵێكدا هـاوسـەری نیـە؟! هـەمـوو شـتێكی وەدیهـێنـاوەو بـە هـەمـوو شـتێكیش زانـایـە .

**لـێرەدا هـەڵوەشـانـدنـەوەی خـوای زاڵـی زانـا بـۆ بیرۆكـەی ئـەفسانـەیی شیرك‌و هـاوبـەش بۆ خوا دانان، لە شـەیتانـەكان‌و لـە فریشتـەكـان لـە شـەش بڕگـەدا دەخـەینـە ڕوو:**

١) - خـوا ﷻ سـەرەتـا ئـەوە ڕوون دەكـاتـەوە، كـە هـاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەكـان، واتـە: ئـەوانـەی كـە هـاوبـەشـیـان بـۆ خـوا دانـاوە لـە پـەروەردگـارێتـیـی‌و لـە پەرستـراوێتییـدا، ئـەوانـەی كـە هـاوبـەشـیـان لـە نێو جندەكـانـدا بـۆ خـوا دانـاوە، ئەوانیـش هـەر خـوا دروسـتیـكردوون، سـەرەتا خـوا دەفـەرمـوێ: ﴿ وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ﴾، واتـە: لـەگـەڵ ئـەوەشـدا كـە خـوا جنـدو شـەیتـانـەكـانی دروسـتكـردوون، كـەچـی هـاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەكـان، دەیـانكـەنـە هـاوبـەشـی خـوا، یـانی: دروستكـراو چۆن دەچێتـە ئـاستی دروستكـەرو بـەدیهـێنـەرو، چۆن دەبێتـە هـاوبـەشـی خـوا ﷻ ؟!

کەواتە: فیکرەکەیان هەر لە بناغەوە هەرەس دێنێ، کە ئەوان دروستکراو (مخلوق) دەبەنە ئاستی بەدیهێنەرەوە!

٢) - دەفەرموێ: ﴿وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ﴾، هەروەها (هاوبەش دانەرەکان) کوڕان و کچانیان بۆ (خوا) هەڵبەستن بەبێ زانیاریی .

(خَرَقُوا) یانی : (إفتروا واختَلَقُوا) هەڵیانبەست، کە مەبەست لە کوڕا، شەیتان (شیطان)ەکانن و، مەبەست لە کچان، فریشتەکانن، واتە بەبێ ئەوەی کە زانیارییان لەوبارەوە هەبێ، کەواتە: قسەکەیان لە ڕیشەدا درۆو هەڵبەستنەو، شتێکە لە وەهمی خۆیاندا هەڵیانبەستوە، واتە: لە دنیای واقیعدا بوونی نیە، بیناش کراوە لەسەر نەزانیی و نەفامیی و بێئاگایی .

٣) - دەفەرموێ: ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ﴾، (خوا) پاکەو بەرزە لەوەی کە ئەوان خوای پێ وەسف دەکەن، واتە: ئەو شتانەی ئەوان خوای پێ وەسف دەکەن، ئاستی خوا زۆر لەوە پاکترو بەرزترو دوورترە، لە ئاستی ئەو وەسفانەی بۆ خوای پەروەردگاریان بەکاردەهێنن، واتە: بە جۆرێك خوا وەسف دەکەن و، بە جۆرێك باسی خوا دەکەن، ئاستی خوا زۆر لەوە بەرزترو پاکترە .

٤) - دەفەرموێ: ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، پەیداکەرو وەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە .

وشەی ﴿بَدِيعُ﴾ واتە: پەیداکەر بەبێ پێشینە، یانی: خوا ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناون، نەك تەماشای شتێکی پێشتر بکات، جاری وایە کەسێك شتێك دروست دەکات، بەڵام لاسایی پێش خۆی دەکاتەوە، هەڵبەتە لە نێوان ئاسمانەکان و زەویشدا، شەیتانەکان هەن و فریشتەکانیش هەن، کەواتە: خوا ﷻ هەموویانی لە نەبوونەوە پەیدا کردوون .

٥) – دەفەرموێ: ﴿أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَـٰحِبَةٌ﴾، خوا ﷻ چۆن ڕۆڵەی دەبێ لە حاڵێکدا کە هاوسەری نیە؟ یانی: ڕۆڵە لە ئەنجامی پێکگەیشتنی نێرو مێیەك، ژنو مێردێك، بابو دایکێکدا، پەیدا دەبێ، بەڵام خوا ﷻ هاوسەری نیە.

ئنجا بۆیەش وشەی: ﴿صَـٰحِبَةٌ﴾ی بەکارهێناوە، چونکە هەر کام لە (زوج) و (زوجة) یان (زوجین) دەبێ هاوەڵی ئەوەی دیکە بێو وەك ئەو بێو هاوتای بێ، بەڵام خوا ﷻ لە نێو دروستکراوەکانیدا، هیچ شتێك هاوتای نیە، هیچ شتێك هاوەڵی نیە، کەواتە: ئەگەر خوا هاوسەری نەبێ، چۆن ڕۆڵەی دەبێ؟ بەڵکو هەرچی هەیە، هەمووی دروستکراوی خوایەو، هەمووی موڵکی خوایەو، هەمووی پەروەردەکراوی خوایە ﷻ .

٦) – لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾، (خوا) هەموو شتێکی وەدی هێناوەو بە هەموو شتێکیش زانایە.

خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، کەواتە: ناگونجێ هیچ شتێك وەك خوا بێ لە ئاستی خوادا بێ، ئنجا بە هەموو شتێکیش زانایەو کاتێك کە دەفەرموێ: من هاوبەشم نین، ئەگەر هەبووایە خوا دەیزانی .

دووەم :

بێینە سەر دوو ئایەتەکەی سوورەتی (سبأ) کە خوا ﷻ لەو دوو ئایەتەدا، وەك پێشتر گوتمان، بیرۆکەی هاوبەش بۆ خوا دانان و ڕێبازی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بە گشتی، هەڵدەوەشێنێتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا لَهُمۡ فِيهِمَا مِن شِرۡكٖ وَمَا لَهُۥ مِنۡهُم مِّن ظَهِيرٖ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ﴾.

ئێمە سەرەتا ئەم دوو ئایەتە بە کورتیی مانا دەکەین، دوایی شەش بەڵگان لە شەش بڕگەدا، لەو دوو ئایەتە دەردێنین، لەسەر هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی هاوبەش بۆ خوا دانان .

خوا بە پێغەمبەر (محمد) ﷺ دەفەرموێ: بڵێ: ئێوە لەوانە بپاڕێنەوە کە پێتان وایە لە جیاتی خوا دەپەرسترێن، ئەوانە بەقەدەر گرانایی گەردێکیان، نە لە ئاسمان، نە لە زەویدا بە دەست نیەو، هیچ هاوبەشێتییەکیشیان نیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، لە نێو ئەوانەشدا (کە لە نێو ئاسمانەکان و زەویدان) هیچ کەس پشتگیریی (خوا) ناکات .

(ئنجا نەك هەر ئەوەندە) بەڵکو تکا کردن لەلای خوا سوودی نیە (هی هەر کەسێك کە تکای لەلا بکات) مەگەر بۆ کەسێك کە خوا مۆڵەتی بدا (کە تکا بکات)، هەتا کاتێك ترس لە دڵیان ڕەوییەوە (کە مەبەست پێی فریشتەکانن، فریشتەکان لە نێو خۆیاندا) دەڵێن: (خوا) چی فەرموو؟ گوتیان: (خوا) هەقی فەرمووو، خوا بەرزی گەورەیە .

ئنجا با ئەو شەش بەڵگەیەی گوتمان: لەم دوو ئایەتە وەردەگیرێن، بە کورتیی بخەینە ڕوو:

بەڵگەی یەکەم :ـ سەرەتا خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، کە تەحەددای هەمووی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکات، هەموویان وێکڕاو تێکڕا : ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، بڵێ: ئەوانەی پێتان وایە لە جیاتی خوا پەرستراون، بانگیان بکەن، واتە: داوایان لێ بکەن و لێیان بپاڕێنەوە، هەموو ئەوانەی کە ئێوە پێتان وایە بەشیان لە: پەرستراوێتیی، یاخود بەشیان لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا هەیەو، لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، بە گومان و بۆچوونی خۆتان، بانگیان بکەن، لێیان بپاڕێنەوەو داوایان لێ بکەن، با لە فریاتان بێن .

دیارە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانەی کە پێتان وایە لە جیاتی خوا پەرستراون، دەپەرسترێن، ئەو تەعبیرە هەموو پەرستراوەکان دەگرێتەوە، هەموو پەرستراوە درۆو ساختەکان کە لە جیاتی خوا دەپەرسترێن، ئنجا بەرد بن، مرۆڤ بن، مانگا بن، خرۆکەبن، ڕووەك و درەخت بن، ئاژەڵ بن، زیندەوەر بن، هەرچی بن، هەموویان دەگرێتەوە .

بەڵگەی دووەم :ـ دوایی خوا ﷻ حەقیقەت و چییەتی ئەو پەرستراوە ساختەو ناڕاستانە دەخاتە ڕوو، کە تەنیا لە وەهم و گومانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکاندا هەن، دەفەرموێ: ﴿ لَا يَمۡلِكُونَ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، بە قەدەر گرانایی گەردێك، خاوەنی هیچ شتێك نین، نە لە ئاسمانەکان نە لە زەویدا .

واتە: ئەو پەرستراوانە کە لە گومان و وەهمی ئێوەدا هەن، هێندە پووچن، هێندە دەستە پاچەن، کە بە هەموویان خاوەنی گەردێك نین، نە لە ئاسمانەکانداو نە لە زەویدا، کە پڕن لە دروستکراوو، هێندەیان دروستکراو تێدا هەن، کە هەر بەدیهێنەریان ژمارەیان دەزانێ، کەچی ئەوان خاوەنی تەنانەت گەردێکیش نین، واتە: خاوەنی بچووکترین شت نین، هیچ شتێکیان بە دەست نیە، کەواتە: کەسێك هیچ شتێکی بە دەست نەبێ و،

خاوەنی هیچ شتێك نەبێ، بە تەئكید بەكەڵكی پەرستران نایەتو بەكەڵكی ئەوە نایەت، كە وەك پەرستراو (إِلە) مامەڵەی لەگەڵدا بكرێ، چونكە پەرستراو دەبێ خاوەن بێ، بەدیهێنەر بێ، حوكمڕان بێ، باڵادەست بێ، دەسەڵاتی ڕەهای هەبێ، ئەویش تەنیا خوایە ﷻ .

بەڵگەی سێیەم :- ﴿وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ﴾، هەروەها (ئەو پەرستراوە وەهمییانە) خاوەنی هاوبەشێتییش نین، لە دروستكرانی ئاسمانەكانو زەویدا .

واتە: ئەوە هیچ كە خاوەنی ڕاستەوخۆو سەربەخۆی هیچ شتێك نین، بەڵكو هەر هاوبەشیش نین، لە موڵكایەتیی هیچ شتێكدا، پشكیان نیە، جاری وایە كەسێك خاوەنی سەربەخۆی (مُستَقِلّ)ی شتێكەو بە سەربەخۆیی ئەو شتە هی ئەوە، دەربەست هی ئەوە، بەڵام جاری وایە، خاوەنێكی دەربەستو سەربەخۆ نیەو، خاوەنێكی هاوبەشە، دەڵێ: فڵان شتە، منیش بەشم تێیدا هەیە، پشكم تێیدا هەیە، ئنجا ئەوانە نە خاوەنی سەربەخۆی هیچ شتێكن، لە ئاسمانەكانو زەویدا، بگرە تەنانەت پشكو بەشیان نیە لە هیچ شتێكیشدا .

بەڵگەی چوارەم :- ﴿وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ﴾، خوا ﷻ لە نێو ئەو پەرستراوانەدا (كە لە وەهمی ئێوەدا پەرستراون)، هیچ پشتیوانێكی نیە، واتە: خوا ﷻ بێنیازە لێیان، ئەوانە هیچ شتێكیان بە دەست نیە، هیچیان لە باراندا نیە، كە هاوكاریی خوای پەروەردگار بكەن، لە هیچ شتێكدا .

بەڵگەی پێنجەم :- ئەوانە نەك هەر خاوەنی هیچ شتێك نینو، تێشیدا خاوەن پشكو بەش نینو، پشتیوانو هاوكاریی خوای پەروەردگاریش نین، بەڵكو ناتوانن تكاش لەلای خوا بكەن: ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾، تكا كردن لەلای خوا سوودی نیە، مەگەر بۆ كەسێك كە خوا مۆڵەتی بدات، دیارە خواش بۆ كەسێك مۆڵەت دەدات، شایستەی ئەوە بێت

تکا بکات، کە پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)و فریشتەکانن‌و، بۆ خوا صوڵحاوانن، بەڵام ئەو پەرستراوە ساختەو وەهمییانە، هی ئەوە نین‌و شایستە نین کە خوا مۆڵەتیان بدات: تکای لە لا بکەن .

کەواتە: ئەوانە تەنانەت توانای ئەوەیان نیە لای خوای بەرزو مەزن تکاش بکەن، بۆیە شایستەی پەرستران نین .

بەڵگەی شەشەم :- ئنجا خوا ﷻ دوایی باسی ئەوە دەکات، کە تەنانەت ئەو فریشتە پاك‌و بێگەردانەی تکا لای خوا دەکەن‌و، خوا مۆڵەتیان دەدا تکا بکەن، ئەوانیش حاڵەتی تکا کردنەکەیان‌و، حاڵەتی مامەڵە کردنیان لەگەڵ خوای پەروەردگاری بالادەستی بێ وێنەدا، یەکجار ملکەچانەو بەندانەیە: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ﴾.

واتە: ئەو فریشتانە کاتێك کە خوا ﷻ فەرمانێك دەکات، فەرمایشتێك دەفەرموێ، دڵیان پڕ دەبێ لە سام‌و هەیبەت، دوایی کە ترس‌و سام‌و هەیبەتەکە لا دەچێ، لە بەینی خۆیاندا دەڵێن: ئەرێ پەروەردگارتان چی فەرمووٴ دوایی ئەوانەیان کە لە خوا نیزیکترن، دەڵێن: پەروەردگارتان هەقی فەرموو، هەر ئەویش بەرزی گەورەیە .

کەواتە: ئەوە هەڵوێست‌و حاڵی فریشتەکانە، کە پاکترین دروست کراوانی خوان، نیزیکترین دروستکراوانی خوان لە خواوە ﷻ، بۆیە: ئێوە بە تەما مەبن، ئەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان ! ئەوانەی کە لە وەهمی ئێوەدا هاوبەشی خوان، هیچ سوودێکتان پێ بگەیەنن، چونکە لە ڕاستییدا بەس لە وەهم‌و گومانی ئێوەدا هاوبەشی خوان، بە پێی زەعم‌و بۆچوونی ئێوە، ئەگەرنا لە دنیای واقیعدا، خوای بالادەست هیچ هاوبەشێکی نیەو، هەرچی کە هەیە، جگە لە خوا، هەموو دروستکراوی خوایەو، موڵکی خوایەو، هەمووی خوا دەیژیێنێ‌و دەیمرێنێ‌و، هەموو کاروبارێکی بەدەست خوای بەرزی بێ وێنەیە .

**تـەوەری شـەشـەم :**

## هـەڵـوێـسـتی هـاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکـان، لـە بـەرانـبـەر ئیسـلامو مسـوڵـمـانـانـدا :

خـوا ﷻ لـە زۆر لـە ئـایـەتـەکانی قـورئـانـدا، بـاسـی هـەڵوێستی هـاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکـانی کـردوە، لـە بـەرانـبـەر ئیسـلامو مسـوڵمـانـانـدا، کـە ئێمـە لـە سـێ بڕگـەدا، هـەندێك ئـایـەت بـە نموونـە دێنینـەوە، لـەوبـارەوەو، دواتـریش هـەشـت (٨) سیفـەتی خـراپی مـوشـریکـەکان لـە بـواری مـامـەڵـە لـەگـەڵ ئـەهلی ئیمـانـدا، لـەو سـێ کـۆمـەڵـە ئـایـەتـە هـەڵدەهێـنجین :

**١) –** لـە ئـایـەتی (١٠٥)ی سـوورەتی (البقـرة)دا، خـوا رقو قینـی خـاوەن کـتێبـەکانو هاورەسدانـەکان، بەرانبـەر بە مسوڵمانانو حـەز لـە بـەرژەوەندیی نـەکردنییـان، دەخـاتـە ڕوو و، دەفـەرمـوێ: ﴿مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾﴾.

واتـە: ئـەوانـەی کـە بێبـڕوان لـە خـاوەن کـتێبـەکـان، هـەروەهـا هـاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکـانیش، حـەز نـاکـەن لـە پـەروەردگـارتـانـەوە هیچ خێـرو چاکـەیـەك بـۆ ئێـوە دابـەزێ، خـواش هـەر کـەس بیـەوێ، تایبـەتی دەکـات بـە بـەزەیی خـۆیـەوەو، خـوا خـاوەن بـەخششی مـەزنـە .

**٢) –** لـە ئـایـەتی (٨٢)ی سوورەتی (المـائدة)دا، خـوا ﷻ بـاسـی ئـەوە دەکـات کـە ئـایـا کـێ زۆر دوژمنـی سـەرسـەخـتی مسـوڵمـانـانـە؟ دەفـەرمـوێ: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾.

واتە: تۆ دەبینی ئەوانەی كە لە هەموو كەس زیاتر دوژمنی سەرسەختی ئەوانەن، كە بڕوایان هێناوە (مسوڵمانان): جوولەكەكانو ئەوانەن كە هاوبەشیان بۆ خوا پەیدا كردوە .

٣) – لە سوورەتی (التوبة)شدا خوا ﷻ باسی هاوبەش بۆ خوا دانەرانو هەڵوێستیان بەرانبەر ئەهلی ئیسلامو مسوڵمانانندا دەكاتو، دەفەرموێ:

﴿ كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ اللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِ إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدتُّمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ فَمَا اسْتَقَامُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴿٧﴾ كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٨﴾ اشْتَرَوْا بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَصَدُّوا عَن سَبِيلِهِ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُعْتَدُونَ ﴿١٠﴾ ﴾.

واتە: چۆن دەبێ هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان پەیمانیان هەبێ لە لای خواو لە لای پێغەمبەرەكەی! (ﷺ) جگە لەوانەی كە لە لای مزگەوتی حەڕام پەیمانتان لەگەڵدا بەستن، هەتا ئەوان ڕاوەستاو بن لەسەر پەیمانەكەیان، ئێوەش ڕاوەستاو بن بۆیان، بێگومان خوا پارێزكارانی خۆشدەوێن ﴿٧﴾ .

چۆن دەبێ هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان پەیمانیان لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا هەبێ ! لە حاڵێكدا ئەگەر بەسەرتاندا زاڵ بنو زەفەرتان پێ بەرن، هیچ پەیمانێكو هیچ خزمایەتییەك، لەگەڵ ئێوەدا ڕەچاو ناكەن، بەزاریان ڕازییتان دەكەن، بەڵام بەدڵیان پێیان ناخۆشە، زۆربەشیان لاڕێن ﴿٨﴾ .

ئایەتەكانی خوایان بە نرخێكی كەم كڕیوەو، خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەن، خراپترین كردە ئەوەیە كە دەیكەن ﴿٩﴾ .

لە هیچ بڕواداریێكدا ڕەچاوی هیچ خزمایەتییەكو هیچ بەڵێنو پەیمانێك ناكەنو، هەر ئەوانە دەستدرێژكارن ﴿١٠﴾ .

كەواتە: خوا ﷻ بە هەشت (٨) سیفەت هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان وەسف دەكات، كە بەو جۆرە دژایەتیی ئیسلامو موسوڵمانان دەكەن :

**یەكەم : هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، هیچ خێر و سوودێك بۆ موسوڵمانان بە ئاوات ناخوازن و، ئەگەر بەدەستوانبێ، هیچ قازانج و هیچ خێرو خۆشییەكیان پێ ناگات :**

وەك لە ئایەتی ژمارە (١٠٥)ی سوورەتی (البقرة)دا، خوا ﷻ زۆر بە ڕوونو ڕاشكاویی ئەوەی ڕاگەیاندوە: ﴿مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾، هەڵبەتە (مِصداق)و هاتنە دیو بەرجەستە كردنی ئەو فەرمایشتەی خوای بەرزی بێ وێنەش، لە مێژووی موسوڵمانانی ڕابردووو لە واقیعی ئێستاشیاندا، لە خۆر درەوشاوەترە، كە هەمیشە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، بە هەموو جۆرەكانیانەوە، بەتایبەتیی بتپەرستەكانو، بە گشتی تێكڕای ئەوانەی جگە لە خوا دەپەرستن، وێڕای جوولەكەكان، دوژمنی هەرە سەرسەختی ئیسلامو موسوڵمانانن .

**دووەم : هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان و جوولەكەكان، سەرسەختترین دوژمنی موسوڵمانانن :**

ئەویش ئایەتی ژمارە (٨٢)ی سوورەتی (المائدة)، زۆر بە ڕوونی ڕایگەیاندوە: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾.

كەواتە: هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، نەك هەر ئەوەندە كە هیچ چاكەو خێرو خۆشییەك بۆ موسوڵمانان بە ئاوات ناخوازن، بەڵكو هەر كاتێك هەلو دەرفەتیان دەست بكەوێ، زۆر سەرسەختانە دژایەتییان دەكەن، وەك بینیمان بوودیییە بتپەرستەكان: لە هەرێمی ئەراكان {لە بۆرماو میانمار} چۆن موسوڵمانان دەسووتێنن ! هەروەها لە ئەفریقیا، بتپەرستەكان چۆن موسوڵمانان قەتڵعام دەكەنو دەسووتێنن، ئەو دڵڕەقییەی كە لەو بت

پەرستانەدا هەیە، بەرانبەر بە ئەهلی ئیسلام، مەگەر هەر لە جوولەکەکاندا هەبێ!! ئەوەش هەم لە مێژووی کۆن و هەم لە واقیعی ئێستاماندا، زۆر بە ئاشکرا، دیارە، کە بەڕاستیی هەم جوولەکەکان، هەم هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ئنجا چ هیندۆسە گا پەرستەکان، چ بتپەرستەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، هەروەها بتپەرستەکانی ئەفریقیا، هەروەها بەشێك نەصرانییەکانی کە عیسا ﷺ دەپەرستن، چەند دڵ پڕ لە قین و بوغزن بەرانبەر بە مسوڵمانان .

**<u>سێیەم</u> : هەر کاتێك بوارێك و دەرفەتێکیان دەست بکەوێ، بۆ زیان گەیاندن بە مسوڵمانان، ئەوە ڕەچاوی هیچ جۆرە خزمایەتیی و پەیوەندییەك، هەروەها هیچ جۆرە بەڵێن و پەیمانێك ناکەن :**

وەك ئایەتی ژمارە (٨) لە سووڕەتی (التوبة)دا ڕوونی کردۆتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ لَا يَرْقُبُواْ فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾، کە وشەی (إلّ) بە مانای : صیلەی ڕەحم و پەیوەندیی خزمایەتیی دێ، هەروەك ﴿ ذِمَّةً ﴾ەش بەمانای : بەڵێن و پەیمان دێ، واتە: ئەوانە: نە ڕەچاوی خزمایەتیی دەکەن، نە بەڵێن و پەیمان، کاتێك کە دەرفەتیان دەست بکەوێ، بۆ زیان گەیاندن بە مسوڵمانان .

**<u>چوارەم</u> : بە زمان و زار دەیانەوێ مسوڵمانان قەناعەت پێ بێنن و، ڕازییان بکەن، بەڵام دڵیان پڕە لە ڕق و کینە بەرانبەریان :**

وەك ئایەتی (٨) لە سووڕەتی (التوبة)دا، زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: ﴿ يُرْضُونَكُم بِأَفْوَاهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ ﴾، بە زاریان ڕازییتان دەکەن، (واتە: بە موجامەلە و قسەی سەر زارەکیی)، بەڵام دڵیان پێی ناخۆشە، واتە: دڵیان پڕە لە کینە و بوغز و غەرەز بەرانبەرتان .

**پێنجەم و شەشەم : ئایەتەکانی خوا بە بەرانبەریکی کەم دەگۆڕنەوە، خەڵکیش لە ڕێی ڕاستی خوا لا دەدەن :**

وەك لە ئایەتی ژمارە (٩)ی سوورەتی (التوبة)دا هاتوە، کە دەفەرموێ:

﴿ اشْتَرَوْا بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَصَدُّوا عَن سَبِيلِهِ ﴾.

واتە: ئایەتەکانی خوا بە نرخێکی کەم دەکڕن، یان نرخێکی کەم بە ئایەتەکانی خوا دەکڕن، واتە: ئایەتەکانی خوا دەدەن، لە بەرانبەر نرخێکی کەمدا، خەڵکیش لە ڕێی خوا لادەدەن .

کە بە تەئکید لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەسەڵاتیان هەیەو دەستیان دەڕوات، ناهێڵن خەڵك ڕوو بکاتە ئیسلامو ئیمان، ئنجا جاری وایە ڕاستەوخۆ، جاری واش هەیە ناڕاستەوخۆ، هەندێ گرووپو خەڵك دروست دەکەن، کە ئیسلامیان پێ ناشیرین بکەن، کە ئەوەش فێڵێکی زۆر شەیتانانەی کافرەکانە: کەلەکەیان بۆ قووڵ دەکەنو[1]، زەمینە خۆش دەکەن، بۆ گەشەکردنی هەندێك گرووپو خەڵکی توندڕەوو لاڕێو پەڕگیر، کە مایەی ناشیرین کردنی ئیسلامو مسوڵمانانن، مایەی سڵەماندنەوەی خەڵکن لە ئیسلام، کە ئەوەش جۆرێکە لە دژایەتییکردنی ئەهلی کوفرو شیرك، بۆ ئیسلامو مسوڵمانان .

**حەوتەم و هەشتەم: ڕەچاوی هیچ خزمایەتیی و هیچ پەیمانێك ناکەن، لەبارەی هیچ بڕوادارێکەوە و ، هەمیشە دژایەتییکردن و دەستدرێژیی و سنوور بەزێنیی ، دەکەنە عادەت ، لە مامەڵەیان لەگەڵ ئیسلام و مسوڵمانانەدا :**

ئایەتی پێشتر باسی ئەوەی کرد، کە بەگشتی لە مامەڵەیان لەگەڵ ئیسلامو مسوڵمانانەدا، ڕەچاوی هیچ خزمایەتییو هیچ پەیمانێك ناکەن، بەڵام ئەمەیان لە مامەڵە لەگەڵ هەر مسوڵمانێکدا بە تاك، ڕەچاوی هیچ

١) کەلەکە : تەنیشت، کەلەکەیان بۆ قووڵ دەکەن، واتە: بواریان بۆ دەڕەخسێننو ناڕاستەوخۆ هاوکارییان دەکەن .

خزمایەتییو، هیچ پەیمانێك ناكەن، پاشان دژایەتییو، دەستدرێژییو، سنوورشكێنیی، لە مامەڵەیان لەگەڵ ئیسلامو موسوڵماناندا، دەكەنە عادەتو نەریتی چەسپاوی خۆیان، وەك لە ئایەتی (۱۰)ی سوورەتی (التوبة)دا، دەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُعۡتَدُونَ﴾، هەر ئا ئەوانە دەستدرێژكارو سنوور بەزێنن (لە مامەڵەیان لەگەڵ ئیسلامو موسوڵماناندا) .

## تەوەری حەوتەم و کۆتایی:

### جاری وا هەیە مسوڵمانانیش گیرۆدە دەبن بە هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردنەوە: (قَدْ يَتَلَبَّسُ الْمُسْلِمُونَ بِالشِّرْكِ):

هەڵبەتە خوا بە یەکگرتن (التوحيد) لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردن (الشرك)، دوو شتی پێچەوانەی یەکدین، واتە: هەر دڵێك خوا بە یەکگرتنی تێدا بێ، جێگای هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردنی، تێدا نابێتەوە، هەروەك هەر دڵێك بڕوای تێدا بێ، جێگای بێبڕوایی، تێدا نابێتەوە، چونکە: کوفرو ئیمان پێچەوانەی یەکدیین، هەروەها (شِرك) و (توحيد)یش، دژی یەکدیین، بەڵام جاری وا هەیە: جۆرێك لە شیرك ـ کە مەرج نیە یەکسەر ئیمانەکە هەڵبوەشێنێتەوە ـ زەفەر بە دڵو دەروونی هەندێك لە مسوڵمانان دەبات، لە کاتێکدا کە وەك پێویست، ئیمانو خوا بە یەکگرتن لە دڵو دەروونیاندا سەقامگیرو جێگیر نابێ، وەك ئایەتەکەی سووڕەتی (یوسف) ـ کە ئێمە ئەم بابەتی لێکۆڵینەوە دەربارەی هاوبەش بۆ خوا پەیداکردنمان، هەمووی لەبەر ڕۆشنایی ئەودا هێنا ـ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾.

واتە: زۆربەیان بڕوا بە خوا ناهێنن، مەگەر لە حاڵێکدا کە هاوبەش بۆ خوا دانەر بن.

کە دیارە ئەگەر لێرەدا مەبەست پێی مرۆڤەکان بێ بەگشتی، یاخود هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بێ، بەتایبەت ئەو کاتە مەبەست لە (إِيمان)، لە:

﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ ﴾دا، چەمكو واتای زاراوەییو باوی ئیمان نیە، مانا عورفییو زاراوەییە ئیسلامییەکەی، چونکە ئەوە لەگەڵ شیرکدا ناگونجێ، بەڵکو مەبەست پێی مانایەکی زمانەوانیی ئیمانە، واتە: قەناعەت هەبوون (إعتقاد) بە بوونی خوا، یانی: ئەوانە بڕوا ناهێنن بە بەدیهێنەرایەتییو پەروەردگارێتیی خوا، مەگەر لە حاڵێکدا کە هاوبەشی بۆ دادەنێن، لە بەندایەتیی بۆ کردنیو پەرستنیدا .

ئنجا جاری وا هەیە مسوڵمانان لە ئەنجامی بێئاگاییان لە ئیمانو لە خوا بە یەکگرتنەکەی خۆیانو، چاك ڕۆ نەچوونو دانەمەزرانی ئیمانو خوا بە یەکگرتن لە عەقڵو دڵیاندا، کەمو زۆر جۆرێك، یان چەند جۆرێك لە شیرك، کە مەرج نیە یەکسەر ئیمانو تەوحیدەکەیان هەڵبوەشێنێتەوە، دەچێتە عەقڵو دڵیانەوە، هەر بۆیەش خوا ﷿ لە زۆر ئایەتدا، هەروەها پێغەمبەری خواش لە کۆمەڵێك لە فەرمایشتەکانیدا، ئێمەیان ئاگادار کردۆتەوە، ئێمەیان وریا کردۆتەوە، لە گیرۆدە بوون بە شیرکەوە، با چەند ئایەتێك بە نموونە بێنینەوە .

# دە (١٠) نموونە لە ئایەتەکانی قورئان، لەبارەی وریابوون لە شیرکەوە

١) خوا ﷻ لە سوورەتی (الزمر)دا، لە ئایەتەکانی: (٦٤و٦٥ و٦٦)دا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ (٦٤) وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ (٦٥) بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ (٦٦) ﴾.

{دیارە خوا بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەفەرموێ:} بڵێ: ئایا ئەی نەفامەکان ! فەرمانم پێ دەکەن، کە جگە لە خوا بپەرستم (٦٤) ؟

بە دڵنیاییەوەش سروش کراوە بۆ لای تۆو بۆ لای ئەوانەی پێش تۆش (پێغەمبەرانی پێش تۆش) کە ئەگەر هاوبەش دابنێی (واتە هەر شتێك، یان هەر کەسێك بکەیە هاوبەش لە پەرستنی خوادا) کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوەو تۆ لە زیانباران دەبی (٦٥).

بەڵکو تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەو، لە سوپاسگوزاران بە (٦٦).

٢) هەروەها لە سوورەتی (القصص)، لە ئایەتەکانی: (٨٦ و٨٧ و ٨٨)دا، خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێو دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنْتَ تَرْجُو أَنْ يُلْقَىٰ إِلَيْكَ الْكِتَابُ إِلَّا رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِلْكَافِرِينَ (٨٦) وَلَا يَصُدُّنَّكَ

عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ ۖ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ ۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ۚ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾﴾.

واتە: تۆ هیچ ئومێدەوار نەبووی کە کتێبت بۆ لا بهاویشترێ، (کتێبت بۆ لا سروش بکرێو بنێردرێ) مەگەر بەهۆی بەزەیی پەروەردگارتەوە (ئەم قورئانەت بۆ هات، ئەگەرنا تۆ هیچ ئومێدەوارییەکت نەبوو، هیچ چاوەڕوانییەکت نەبوو)، بۆیە بە هیچ جۆرێك پشتیوانیی لە بێبڕوایان مەکە ﴿٨٦﴾.

با هیچ شتێك تۆ لە ئایەتەکانی خوا لانەدات، دوای ئەوەی ئایەتەکانت بۆ نێردراونەتە خوارو، بانگەواز بۆ لای پەروەردگارت بکەو، لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبی ﴿٨٧﴾.

لەگەڵ خوادا، لە هیچ پەرستراوێکی دیکە مەپاڕێوە، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، هەموو شتێك لە بەین دەچێ، تەنیا ڕووی خوا، (تەنیا زاتی خوا) دەمێنێتەوە، بڕیار هەر هی ئەوەو هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە ﴿٨٦﴾.

٣) وە لە سووڕەتی (یونس)، لە ئایەتەکانی: (١٠٤ و ١٠٥ و ١٠٦ و ١٠٧)دا، لەو چوار ئایەتەدا، کە ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (یونس)دا، بە درێژیی توێژیومانەوە، دیسان خوا ﷻ ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکاتو دەفەرمووێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾﴾.

واتە: بڵێ: ئەی خەڵكینە! ئەگەر ئێوە لە دوو دڵییدان دەربارەی دینداریی‌و بەندایەتیی كردن‌و بەرنامەی من، من ئەو شتانە ناپەرستم كە ئێوە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، بەڵكو بەس ئەو خوایە دەپەرستم، كە ئێوە دەمرێنێ‌و، فەرمانم پێ كراوە كە لە بڕوادارن بم (١٠٤).

فەرمانم پێكراوە كە: ڕووی خۆت ڕێك بكە، بەرانبەر بە ئایین‌و بەرنامەی خوا، بە ساغیی (بە لادانەوە لە هەرچی بەرنامەی ڕێچكەو كوێرە ڕێ هەیە)و، پێم گوتراوە: لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نەبی (١٠٥)!

هەروەها پێم گوتراوە: لە جگە لە خوا، مەپاڕێوە، (لە شتێك یان لە كەسێك) كە نە سوودت پێ دەگەیەنێ، نە زیانت لێ دەدات، ئەگەر وا بكەی، بێگومان تۆ لە ستەمكاران دەبی (١٠٦).

ئنجا ئەگەر لە خواوە زیانت پێ بگات، جگە لە خۆی هیچ لا بەرێكی نیەو ئەگەر خوا بیەوێ چاكەیەكیشت بێنێتە ڕێ، ئەوە هیچ بەرپەرچدەرەوەیەك بۆ چاكەو بەخششی خوا نیە، (خوا) هەر كەسێك كە بیەوێ لە بەندەكانی تووشی (خێرو چاكەی) دەكات، ئەو لێبوردەی بە بەزەییە (١٠٧).

٤) هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)، لە ئایەتەكانی: (١٤ و١١٤ و ١٦٤)دا، خوا ﷻ هەر كام لە :

أ- بە دۆستگرتنی ، خوا .

ب- بە حەكەم‌و دادوەرو بڕیار بە دەست ، گرتنی خوا .

ج- بە پەروەردگار گرتنی خوا ﷻ بە تەنیا .

بە پێكهێنەرەكانی ئیمان‌و مسوڵمانەتیی‌و خوا بە یەكگرتن دادەنێ :

١/ لە ئایەتی (١٤)دا، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا ﴾، واتە: بڵێ: ئایا جگە لە خوا بكەم بە دۆست‌و پشتیوان‌و مشوورخۆرو هاوكاری

خـۆم ؟ واتـــە: دەبـێ هـــەر خـــوا ﷻ دۆســـتو پشـتیـــوانو هاوكـــارو خۆشەویستو سەرپەرشتیارم بێ .

٢/ لە ئایەتی (١١٤)شدا، دەفەرموێ: ﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِى حَكَمًا ﴾، واتە: ئایا جگە لە خوا بكەم بە حەكەمو دادوەرو بڕیار بەدەستی خۆم ؟ یانی: هەر دەبێ خوا بە حەكەمو بڕیار بەدەستو بە دادوەر دابنرێ .

٣/ لە ئایەتی (١٦٤)شدا، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِى رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَىْءٍ ﴾، واتە: بڵێ: ئایا جگە لە خوا، بە پەروەردگارو خاوەن بخوازم، كە ئەو پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێكە ؟!

٥) وە لە سووڕەتی (الروم) ئایەتەكانی: (٣٠ و ٣١)دا، خوا ﷻ ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم دەكات، یاخود ڕوو لە هەر كەسێك دەكات كە قورئان دەخوێنێ، دەفەرموێ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ ﴾.

واتە: دەجا ڕووی خۆت ڕێك بكە بەرەو بەرنامە (بەرنامەی خوا)، بە پاكیی‌و بێ خەوشیی ئەو سروشتەی كە خوا خەڵكی لەسەر سروشتاندوە (واتە: ئەو ئایینو بەرنامەیە، پڕ بە پێستە لەگەڵ ئەو سروشتە (فِطرة)ی خوا خەڵكی لەسەر دروست كردوە) گۆڕین نیە بۆ دروستكراوی خوا، ئا ئەوە ئایینو بەرنامەی ڕێكو ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن ﴿٣٠﴾.

بۆ لای خوا بگەڕێنەوەو پارێزی لێ بكەنو، نوێژ بەرپا بكەنو، لە هاوبەش بۆ خوا دانەران مەبن ﴿٣١﴾.

كەواتە: دەگونجێ مسوڵمانان گیرۆدە ببن بە جۆرێك لە هاوبەش بۆ خوا دانانەوە، چ جۆری گەورەی، كە پێچەوانەی خوای بە یەكگرتنە، كە دیارە ئەو

کاتەش ئەهلی ئیمان نامێنن‌و، لە بازنەی ئیمان‌و ئیسلام دەچنە دەرێ، - مەگەر مەرجەکان (شروط) نەچەسپابن‌و پەرچەکان (موانع) لانەچووبی - چ جۆری بچووکی، کە ئەو کاتە وەك نەخۆشییەك دادەنرێ، بۆ ئیمان‌و خوا بە یەکگرتن، بەلاّم یەکجاریی نابێتە هۆی لەبەینبردنی ئیمان‌و خوا بە یەکگرتن .

٦) لە سوورەتی (لقمان) ئایەتی (١٣)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾.

واتە: وە کاتێك لوقمان بە کوڕەکەی خۆی کە ئامۆژگاریی دەکرد، گوت: ئەی کوڕیژگەکەم! ئەی ڕۆڵە شیرینەکەم! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، بێگومان هاوبەش (بۆ خوا) دانان، ستەمێکی مەزنە .

کە بێگومان کوڕەکەی ئیماندار بووەو لوقمان ئامۆژگاریی کردوە، کە خۆی بپارێزێ لە هاوبەش بۆ خوا دانان .

٧) لە سوورەتی (یوسف) ئایەتی (١٠٨)دا، کە پێشتر تەفسیرمان کرد، دەفەرموێ:

﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾.

واتە: بڵێ: ئا ئەمە ڕێبازی منە، بانگەواز بۆ لای خوا دەکەم لەبەر ڕۆشنایی دا (بە بەڵگەوە) خۆم‌و ئەوانەی شوێنم کەوتوون‌و، پاکیی بۆ خواو، من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم .

٨) لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٣٦)دا، خوا ﷻ ڕوو لە مسوڵمانان دەکات‌و دەفەرموێ: ﴿ وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ﴾.

واتە: خوا بپەرستن‌و هیچ شتێك مەكەنە هاوبەشی‌و، چاكە لەگەڵ باب‌و دایكتاندا بكەن‌و، لەگەڵ ئەوانەی كە نیزیكایەتییتان لەگەڵیان هەیەو لەگەڵ هەتیوان‌و، لەگەڵ نەداران‌و، لەگەڵ دراوسێیەك كە خزمایەتی لەگەڵتان هەیەو، لەگەڵ دراوسێیەك كە بە تەنیشتانەوەیە، {یاخود دراوسێیەكی نیزیك‌و، دراوسێیەكی دوور} و، هاوەڵێك كە هەمیشە لە تەنیشتتەو، ڕێبوارو، ئەوانەی كە لەبەر دەستتانن (دیارە بە پلەی یەكەم كۆیلەو كەنیزەكەكان دەگرێتەوەو، دەشگونجێ هەركەسێك كە لەبەر دەستتە، وەك خزمەتكارو شاگردو بەردەست بگرێتەوە)، بێگومان هەر كەسێك كە بەفیزو كەشخە بێ‌و، شانازییكەر بێ، بەسەر خەڵكەوە، خوا خۆشی ناوێ .

كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ﴾، دیارە دەگونجێ كە ئینسانی مسوڵمانیش گیرۆدە ببێ بە شیرك‌و هاوبەش بۆ خوا دانانەوە .

٩) هەر لە سووڕەتی (الزمر) ئایەتەكانی: (١١ و ١٢ و ١٣ و ١٤ و ١٥)دا، خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ١١ وَأُمِرۡتُ لِأَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ١٢ قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ١٣ قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصٗا لَّهُۥ دِينِي ١٤ فَٱعۡبُدُواْ مَا شِئۡتُم مِّن دُونِهِۦۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ١٥﴾.

واتە: بڵێ: من فەرمانم پێكراوە، كە خوا بپەرستم، ملكەچیی خۆمی بۆ ساغ بكەمەوەو خڵتەی پێوە نەهێڵم (١١) .

هەروەها فەرمانم پێكراوە یەكەمینی مسوڵمانان بم، یان: یەكەمینی ئەوانە بم كە بە تەواویی گەردن كەچن بۆ خوا (١٢) .

بڵێ: ئەگەر من سەرپێچیی لە پەروەردگارم بكەم، مەترسیی سزاو ئازاری ڕۆژێكی مەزنم هەیە (١٣) .

بڵێ: من خوا دەپەرستم، گەردن کەچیی خۆمی بۆ ساغ دەکەمەوە ﴿١٤﴾.

ئێوەش ئەوەی کە دەتانەوێ جگە لە خوا (لە خوار خواوە) بیپەرستن، بڵێ: بێگومان زیانبارانی ڕاستەقینە، ئەوانەن کە لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا خۆیانو کەسوکاریان (خۆیانو ماڵو خێزانیان) لە دەست دەدەن، ئاگادار بن ! هەر ئەوە زیانباریی ڕوونو ئاشکرایە ﴿١٥﴾.

١٠) دەقی کۆتایی ئایەتی (٨٢)ی سوورەتی (الأنعام)ە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾﴾.

واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو ستەمیان تێکەڵ بە ئیمانەکەیان نەکردوە، ئا ئەوانە هێمنیی‌و دڵنیاییان بۆ هەیەو ئا ئەوانە ڕێگای ڕاستگرتووانن .

وەك دوایی باسی دەکەین: مەبەست لە ستەم (ظُلْم) کە دەفەرموێ: ﴿وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾، ستەمیان لەگەڵ ئیمانەکەیان تێکەڵ نەکردوە، هاوبەش بۆ خوا دانان (شرك)ە.

بێگومان ڕووی دواندن لەم ئایەتانەدا هەموویان، بەگشتی لە ئەهلی ئیسلامو ئەهلی ئیمانە، یان هەر مرۆڤێکە کە دەویستری ببێتە ئەهلی ئیمانو ئەهلی ئیسلامو بەندایەتیی ڕاستەقینە بۆ خوا بکات، یاخود بە تایبەت ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، بەڵام بێگومان پێغەمبەرەکەی خاتەم لە لووتکەی خوا بە یەکگرتنو ئیماندا بووە، کەواتە: کە خوا عزّوجل پێغەمبەری ﷺ دەدوێنێ، مەبەست پێی شوێن کەوتووانتی، یاخود مەبەست پێی خەڵکە بەگشتی، کە: ئەوەتا خوا ﷻ لە پێغەمبەری خاتەمیش، کە سەروەری پێغەمبەرانەو باشترین ئینسانەو، چاکترین بەندەی خوا بووەو، لە هەموو کەس لە خوا نیزیکتر بووە، لەویش قبووڵ ناکات، کە کەمو زۆر گیرۆدە ببێ بە هاوبەش بۆ خوا دانانەوە، کەواتە: خەڵکی دیکە لە پێشترە کە لێیان قبووڵ نەکرێ، ئنجا دیارە ئەگەر هاتباو نەگونجابایە: بڕواداران کەمو زۆر گیرۆدە ببن بە هاوبەش بۆ خوا دانانەوە، ئەو کاتە هیچ پێویستیی

نەدەکردو، هیچ پاساو نەبوو، کە خوا ﷻ بەو شێوەیە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و بڕواداران بدوێنێ .

هەڵبەتە وەك پێشتریش گوتمان: مەبەست لە وشەی (ظُلم) لە قسەی خوای بەرزدا، کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾، شیرکە، وەك لەو بارەوە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە ئێمە دوو ڕیوایەتی لێ دێنین :

یەکەم: {عَن عبدالله بن مَسْعُودٍ رضي الله عَنْهُ، قَالَ: لَما نَزَلَتْ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾﴾، قَالَ أَصْحابهُ وَأَيُّنا لَمْ يَظلِم نَفْسَهُ! فَنَزَلَت: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾} {أَخْرَجَهُ البُخارِيُّ برقم: (٤٨٢٨)}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کاتێك ئەم فەرموودەیەی خوا هاتە خوار: (ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، ئیمانەکەیان لەگەڵ ستەمدا تێکەڵ نەکردوە)، هاوەڵەکانی (پێغەمبەر ﷺ) گوتیان: ئنجا کام لە ئێمە ستەمی لە خۆی نەکردوە! (وایانزانیوە مەبەست لە زوڵم، گوناح کردنە، بۆیە گوتوویانە: کام لە ئێمە گوناهێکی نەکردوە؟! ئنجا ئەگەر ئەوانە دڵنیاییان بۆ نەبێ، مانای وایە کەسمان دەرناچین)، بۆیە ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾لقمان، بێگومان هاوبەش بۆ خوا دانان ستەمێکی مەزنە .

دووەم: {عَنْ عَبْدِ اللهِ قَالَ: لَما نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾﴾، شَقَّ ذَلِكَ عَلَى النَّاسِ، وَقَالُوا: يا رَسولَ اللهِ! فَأَيُّنا لا يَظْلِمُ نَفْسَهُ، قَالَ إِنَّهُ لَيْسَ الَّذِي تَعْنُونَ، أَلَمْ تَسْمَعُوا ما قَالَ الْعَبْدُ الصَّالِحُ: ﴿يَـٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾لقمان، إِنَّما هُ وَ

الشِّرْكُ﴾، {أخرجه أحمد برقم: (٣٥٨٩) تعليق شعيب الأرنؤوط : إسناده صحيح على شرط الشيخين }.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ ﴿٨٢﴾﴾، ئەوە لەسەر دڵی خەڵك زۆر قورس بوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! کام لە ئێمە ستەمی لە خۆی نەکردوە ! (واتە: کام لە ئێمە تووشی گوناح نەبووە !)، ئەویش فەرمووی: مەبەست پێی ئەوە نیە کە ئێوە لێی تێگەیشتوون، ئایا گوێتان لێ نەبووە بەندە چاکەکەی خوا (مەبەست لوقمانە) چی گوتوە ! (ئەی ڕۆڵە شیرینەکەم ! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، بێگومان هاوبەش دانان ستەمێکی مەزنە) ؟!

مەبەست لە (ظُلم) لە ئایەتەکەدا شیرك‌و هاوبەش بۆ خوا دانانە، هەڵبەتە وشەی (ظُلم) وەك پێشتریش باسمان کردوە، بە مانای گوناح دێ، بە ڕەهایی، چ گوناهێك کە ئینسان لە مابەینی خۆی‌و خوای خۆیدا بیکات، چ لە نێوان خۆی‌و خەڵکدا بیکات، کە ئەو کاتە دەبێتە دەستدرێژیی، هەروەها بە مانای شیرکیش دێ، کە دیارە شیرك گەورەترین جۆری گوناحە، بەڵام بە پێی سیاق دەزانین کە ئایا (ظُلم) گوناهێکە لە نێوان بەندەو خوای پەروەردگاردا، یاخود لە نێوان بەندەو بەندەکانی دیکەدا، یاخود مەبەست پێی شیرکە، کە گەورەترین جۆری گوناهە .

ئەمانە دە (١٠) نموونە بوون لەو ئایەتانەی قورئان، کە زۆر بە ڕوونیی دەریدەخەن: دەگونجێ مسوڵمانان گیرۆدە ببن بە جۆرێك لە هاوبەش بۆ خوا دانانەوە، کە وەك گوتم ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دانانی گەورە بێ (الشرك الأكبر)، ئەو کاتە ئیمانەکەیان هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام ئەگەر شیرکی گچکە بێ، هەرچەندە تێکەڵ بە ئیمانەکەیان دەبێ، بەڵام ئیمانەکەیان لەبەین نابات‌و بەس نوقسانی دەکات .

## حەوت فەرموودە وەك نموونە لە بارەی شیركەوە :

با چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺیش بێتینەوە لەوبارەوە، كە من حەوت فەرموودەم بە نموونە هێناون :

یەكەم: {مَنْ ماتَ يُشْرِكُ باللهِ شَيْئاً دَخَلَ النارَ}،{مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخارِيُّ برقم: (١١٨١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٧٨)}.

واتە: هەر كەسێك بمرێ لە حاڵێك دا هاوبەش بۆ خوا دابنێ، شتێك بكاتە هاوبەشی خوا، دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە .

كەواتە: بابای هاوبەش بۆ خوا دانەر، دەربازی نابێ و، لە دوارۆژدا شوێنی دۆزەخە، كە بە تەئكید لێرەدا مەبەست پێی شیركی گەورەیە .

دووەم: {أَنا أَغْنَى الشُّرَكاءِ عَنِ الشِّرْكِ، فَمَنْ عَمِلَ لِي عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ غَيْرِيْ، فَأَنا مِنْهُ بَرِيْءٌ}،{أَخْرَجَهُ مُسْلِم برقم: (٢٩٨٥)، وَابن ماجَهْ برقم: (٤٢٠٢)}.

واتە: من دەوڵەمەندترینی دەوڵەمەندانم، لە هاوبەشێتیی دا، هەر كەسێك كردەوەیەك بكات بەشی جگە لە منی تێبخات، ئەوە من بەریيم لەو، (بەشەكەی خۆشم دەدەم بەو).

واتە: خوای پەروەردگار ڕازی نابێ عیبادەتێك بۆ خوا بكرێ، بەشی غەیری خوای تێبخرێ، هەر كردەوەیەك شیرك و ڕیای تێكەڵ بوو، ئەوە خوای پایەدار نایەوێ .

سێیەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {أَللَّهُمَّ لا تَجْعَلْ قَبْرِي وَثَنا، لَعَنَ اللَّهُ قَوْما اتَّخَذُوا قُبورَ أَنْبِيائِهِمْ مَساجِدَ}،{أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٣٥٢)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي}.

واتە: ئەی خوایە! گۆڕەكەی من مەكە بە بت و صەنەم، نەفرینی خوا لە كۆمەڵێك بێ كە گۆڕەكانی پێغەمبەرانی خۆیانیان ﷺ كردنە مزگەوت .

چوارەم: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {أَللَّهُمَّ لا تَجْعَلْ قَبْرِي وَثَنا يُعبَدُ} {أَخْرَجَهُ مالِك برقم: (٥٩٣)، عَن عطاءِ بن يسار مرسلاً، وَصَحَّحَهُ الألباني}.

واتە: ئەی خوایە! گۆڕەکەم مەکە بە صەنەمێك کە بپەرسترێ.

ئەمە مالیك لە (عطاء)ەوە بە مورسەلیی هێناویەتی.

پێنجەم: {لَعَنَ اللهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى، اتَّخَذوا قُبورَ أَنْبِيائِهِمْ مَساجِدَ}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٨٤)، وَالبُخارِيُّ برقم: (٤٢٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٣١)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٧٠٣)}.

واتە: نەفرینی خوا لە جوولەکەو نەصرانییەکان بێ، کە گۆڕەکانی پێغەمبەرانی خۆیانیان کردنە مزگەوت.

واتە: کردنە پەرستگاو وەك بتو صەنەمێك مامەڵەیان لەگەڵدا کردن.

شەشەم: {لا تُشرِك باللهِ شَيْئاً، إن عُذِّبتَ وحُرِّقتَ}،{أَخْرَجَهُ البَيْهَقِيُّ برقم: (١٤٥٥٤)، وَعَبْدُ بن حُمَيْد برقم: (١٥٩٤)، وَالبَيْهَقِيُّ فِي (شعب الإيمان) برقم: (٧٨٦٥) وَحَسَّنَهُ الألباني في (صحيح الترهيب والترغيب) رقم (٥٦٩)}.

واتە: هیچ شتێك مەکە هاوبەشی خوا، ئەگەر ئەشکەنجەش بدرێیو بشسووتێنرێی.

حەوتەم: کۆتا دەق کە لەوبارەوە دەیهێنین، ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرمووێ: {أَللَّهُمَّ! إنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنا أَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ لِما لا أَعْلَمُ}،{أَخْرَجَهُ البُخارِيُّ في (الأدب المُفرد) برقم: (٥٥٤)، وَصَحَّحَهُ الألباني}.

واتە ئەی خوایە! من پەنات پێ دێنم کە شتێکت بکەمە هاوبەش، کە بیزانمو، داوای لێبوردنت لێ دەکەم بۆ شتێك کە نەیزانم.

هەڵبەتە لێرەدا ئەو پاڕانەوەیەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەیە کە ئێمە فێربکات، ئەگەرنا بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەمیشە زانیویەتی کە شیرك

پەنهانەکەی‌و ئاشکرایەکەی، جۆری گەورەی جۆری بچووکی چییە؟ بەڵام ویستوویەتی ئێمە فێری ئەو دوعایە بکات .

یاخود پێغەمبەر ﷺ دووربینیی کردوەو زێدە (إحتیاط)ی کردوە لەوەدا کە نەوەك خەتەرەیەك قسەیەك، ڕەفتارێکی لێ بپشکوێتەوە، بۆنی شیرکی لێ بێ، با شتێکی زۆر بچووکیش بێ، ئنجا هیچ گومانی تێدا نیە کە مسوڵمان هەتا ئیمان لە عەقڵ‌و دڵیدا ڕۆچووتر‌و دامەزراوتر بێ‌و، خوا بە یەکگرتن لە دەروونییدا ڕیشەدارتر بێ، بەهۆی شوێنکەوتنی بۆ کتێبی خوا ﷻ و پەیڕەویی کردنی لە ڕێبازی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ، دوورتر دەبێ لە بۆنی شیرك‌و لە هەموو جۆرەکانی شیرك، چ ئاشکرا بن، چ پەنهان بن، چ گەورە بن، چ گچکە بن، بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە: تاکو ئینسان ئیمانەکەی بێ هێزتر بێ‌و، خوا بە یەکگرتن لە عەقڵ‌و دڵیدا دانەمەزراوتر بێ، بێگومان لە هاوبەش بۆ خوا دانانەوە، نیزیکتر دەبێ .

شایانی باسیشە: لە مێژووی ئۆممەتی ئیسلامیی دا، بەشێك لە مسوڵمانان: کەم‌و زۆر جۆرەکانی شیرك بە گەورەو بە بچووکیانەوەو بە ئاشکراو بە پەنهانیانەوە، هاتۆتە نێو دینداریيانەوە .

دوو ڕێی سەرەکییش کە شیرك لێیانەوە، هاتۆتە نێو دینداریی مسوڵمانانەوە، بریتین لە: شیعەگەریی‌و صۆفییگەریی، شیعە بەگشتی جگە لە زەیدیی‌و، ئەو ئەهلی تەصەووفەش کە پابەند نەبوون بە قورئان‌و سوننەت‌و شەریعەتەوەو، داهێنان‌و لادانیان کردۆتە پیشە، لەو دوو ڕێیەوە، خڵتەو خاڵی زۆر هاتۆتە نێو دینداریی مسوڵمانانەوە، بەڵام دووبارەی دەکەمەوە: صۆفییگەرییەکی دوور لە قورئان‌و سوننەت، ئەگەرنا زۆرێك لە پێشەوایانی بواری تەزکیەو تەصەووف، لە لووتکەی هەرە بەرزی خوا بە یەکگرتندا بوون‌و، بە هەموو شێوەیەك دوور بوون لە هەموو جۆرەکانی شیرك بە گەورەو بچووکیەوە، بەڵام لە ئەنجامی لادانی شوێنکەوتووانیاندا، یاخود زێدەڕۆیی‌و تێپەڕاندنیان لە خۆشویستن‌و بە ڕێزگرتن‌و بە بەرزو پیرۆزگرتنی شێخەکانیاندا، تووشی شیرك بوون .

بە نسبەت شیعەشەوە: ئەوە هەر دیارە کە ئەسڵی بیرۆکەو ڕێچکەکەیان بە داخەوە، بریتیە لە تێپەڕاندن لە خۆشویستنی ئەهلی بەیتو لە زانایانی بنەماڵەو خانەوادەی پێغەمبەری خوادا ﷺ، کە ئەوانیش هەروەك زانایانی دیکە بوون، بەڵام ئەوانە دوازدەیانیان بە پارێزراو زانیون لە گوناهو هەڵەو، زۆر بە بەرزیان گرتوون، بەڵکو هەندێکیان، هەندێك لە زاناو پێشەوایەکانی خۆیانیان پێ وابووە لە پێغەمبەرانیش بەرزترنو پێیان وایە: پایە (شان)ێکیان هەیە، گوتوویانە: هیچ فریشتەیەکی لە خوا نیزیكو، هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراو، نایگاتێ (لَهم مقامٌ لا يَبْلُغُهُ ملَكٌ مُقَرَّب ولا نبيٌّ مُرسَلٌ)[1] کە ئەوە قسەیەکی بێ بنەمایەو، لە ڕاستییدا خەیاڵو وەهمێکەو، پشت ئەستوور نیە بە هیچ بەڵگەیەکی شەرعیی !.

لە کۆتاییدا دەڵێم: زۆر خوێندنی هەردووك سوورەتی خوا بەیەکگرتن (التوحيد)، (الكافرون) و (الإخلاص) لەگەڵ تێوە ڕامانو لێوردبوونەوەدا، کاریگەرییەکی زۆر مەزنی هەیە، لەوەدا کە خوا بە یەکگرتن، هەم لە ڕووی زانستییو هەم لە ڕووی کردەییو حاڵەوە، زیاتر لە عەقڵو دڵی ئینساندا بچەسپێو، تارمایی هاوبەش بۆ خوا پەیدا کردن، بە هەموو شێوەکانیەوە، دوور بکەوێتەوە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەو دوو سوورەتەی لە نوێژە سونەتە (مَندوب)ەکانی دا، زۆر دەخوێندن .

سوورەتی (الإخلاص)یش ئەمە دەقەکەیەتی :

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ① ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ② لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ③ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ④﴾.

١) بڕوانە (الحكومة الإسلامية) للخميني، ص ٥٢ ، ط : القاهرة : ١٩٧٩، کە ئەوە دەقی قسەکەیەتی : { وقد ورد عنهم عليهم السلام : إن لنا مع الله حالاتٍ لا يَسَعُها مَلَكٌ مقرَّب ولا نبيٌّ مرسل} .

سوورەتی (الکافرون)یش ئەمە دەقەکەیەتی :

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴿١﴾ لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾﴾.

سوورەتی (الإخلاص) بە بێ (بسم الله الرحمن الرحیم)، چوار ئایەتەو سوورەتی (الکافرون) بە بێ (بسم الله الرحمن الرحیم)، شەش ئایەتە.

ئنجا سوورەتی (الإخلاص) خوا بە یەکگرتنی زانیاریی (التوحید العلمي) دەگرێتە خۆی، بە باشترین شێوە، مانایەکەشی بە کورتیی بەم شێوەیە :

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە .

بڵێ: ئەو خوایەکی تاکە (خوایەکە) ﴿١﴾، جێی نیازەو بێ نیازە ﴿٢﴾ ، کەسی لێ نەبووە، لە کەسیش نەبووەو ﴿٣﴾، هیچ کەسیش هاوتای وی نیە ﴿٤﴾ }.

مانای کورتیی: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾یش، بەم شێوەیە :

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە .

بڵێ: ئەی ئەوانەی بێبڕوان ! ﴿١﴾، ئەوە ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن﴿٢﴾، ئێوەش پەرستەری ئەوە نین، کە من دەیپەرستم ﴿٣﴾، منیش پەرستەری ئەوە نابم (لە داهاتوودا) کە ئێوە پەرستووتانە ﴿٤﴾، ئێوەش پەرستەری ئەوە نابن، کە من پەرستوومە، (یان دەیپەرستم لە داهاتوودا) ﴿٥﴾، بەرنامەی خۆتان بۆخۆتان، بەرنامەی خۆشم بۆخۆم ﴿٦﴾ .

هەڵبەتە ئەم ئایەتەی کۆتایی سوورەتی (الکافرون) کە دەفەرموێ:

﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾، کە پێشتر کافرەکانی دواندوون، ئەوە دەگەیەنێ کە هەرچی مرۆڤی کافرو بێ بڕوایە، هەمووی دینێکی هەیە، بەرنامەیەکی

هەیە، لەسەری دەڕوات، چونكە مانا عورفییەكەی (دین)، واتە: دینێك كە لە خواوە هاتبێ، بەڵام (دین) لە ئەسڵی زمانی عەرەبییداو لە بەكارهێنانی قورئاندا، كە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، یانی: بەرنامەی ژیان، ئنجا ئەو بەرنامەی ژیانە، ئەگەر لە خواوە هاتبێ، ئەوە دەگوترێ: ئایین‌و بەرنامەیەكی خوایی، ئنجا ئەگەر لە خواوە هاتبێ‌و وەك خۆی مابێتەوە، ئەوە دەگوترێ: دینی ڕاست‌و ساغ‌و دەستكاریی نەكراو، كە لەم ڕۆژگارەدا تەنیا ئیسلامە، بەڵام ئەگەر دەستكاریی كرابێ، وەك هەموو ئەو بەرنامە ئاسمانییانەی كە دەستكاریی كراون، كتێبەكانیان گۆڕدراون، بەتایبەت جووایەتیی (یهودیة)و گاورایەتیی (نصرانیة)و هەموو ئەوانەی دیكە كە خۆیان بە خاوەنی ئایینی خوایی‌و ئاسمانیی دەزانن، ئەوە دەگوترێ: ئایینێكی خوایی‌و ئاسمانیی هەیە، بەڵام شێوێنراوەو تێكدراوە .

ئەگەر لە ئەسڵیشدا خوا داینەنابێ‌و مرۆڤ داینابێ، پێی دەگوترێ: دینێكی مرۆڤكرد، كە بێگومان هەر كام لە: لیبرالیزم‌و سۆسیالیزم‌و كاپیتالیزم‌و سیكۆلاریزم‌و گڵۆبالیزەیشن، دەچنە نێو ئەو چوارچێوەیەوە، چونكە هەموویان بەرنامەی ژیانن، هەروەها سەرجەم ئەو بیرۆكانەی كە دەكرێنەی بەرنامەی ژیان‌و، جۆرێك لە بووناسیی (جیهانبینیی) بە مرۆڤ دەدەن‌و، جۆرێك لە ئیعتیقادو عەقیدەی پێدەدەن، هەروەها چەند بەهایەكی پێ دەدەن، كە بە بەهای بەرزیان دەزانێ‌و، حەڵاڵ‌و حەرامی بۆ دیاریی دەكەن‌و، چاكەو خراپەی بۆ دیاریی دەكەن، ئەوانە هەموویان بە دین‌و بە بەرنامەی ژین، لەقەڵەم دەدرێن .

بەڵێ وەك گوتمان: خوێندنی ئەم دوو سوورەتە، سوورەتی (الكافرون)، سوورەتی (الإخلاص) زۆر دەبنە مایەی ئەوە، كە خوا بە یەكگرتن (توحید) لە عەقڵ‌و دڵی ئینساندا ڕۆ بچێ‌و ڕیشەدار بێ، بۆن‌و تارمایی‌و سێبەری شیرك‌و هاوبەش بۆ خوا دانانی لێ دوور بكەوێتەوە .

ئنجا دیارە زانیاریی (علم) لە پێش كردەوە (عَمَل)ەوەیە، زانین لە پێش توانینەوەیە، بەڵام ئایا بۆچی سوننەتە: سوورەتی (الكافرون) لە ڕكاتی یەكەمداو لە ڕكاتی دووەمدا سوورەتی (الإخلاص) بخوێندرێ، لە نوێژە سوننەتەكاندا ؟!

چونکە : ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ئینسان بە کردەوە خوا بە یەکگر (موحِّد)بێو، بە کردەوە بەندایەتیی تەنیا بۆ خوا بێ، ئنجا لە ڕاستییدا زانینەکەش هەر بۆ توانینەکەیە، بۆیە پێویستە مرۆڤ حەق بزانێ، بۆ ئەوەی حەق بتوانێو، ئینسان پێویستە حاڵی بێ، تاکو حاڵی بوونەکە لە خۆیدا بکاتە حاڵ، ئنجا ئەوەیان کە گرنگترە، کە خوا بەیەکگرتنی کردەیی (التوحید العَمَلِيّ)یەو، لە سوورەتی (الکافرون) دایە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشی خستوەو، ئەوی دیکە کە خوا بە یەکگرتنی زانستییو ئیعتقادیی ڕوون دەکاتەوە، کە سوورەتی (الإخلاص)ە، خستوویەتە ڕکاتی دووەمەوە .

لێرەشدا دێینە کۆتایی توێژینەوەمان دەربارەی هاوبەش بۆ خوا دانان .

**مەسەلەی پێنجەم** : هەڕەشە کردنی خوای بالادەست لە بێبڕوایان، کە نەدەبوو دڵنیابن لە بەڵای داپۆشەری خوا لە دنیادا، یان: کە ئاخیر زەمانی کتوپڕیان بەسەردابێ :

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأۡتِيَهُمۡ غَٰشِيَةٞ مِّنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوۡ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٠٧﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە لە سێ بڕگەدا**

**١)** - ﴿ أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأۡتِيَهُمۡ غَٰشِيَةٞ مِّنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوۡ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾، دیارە ئەم هەمزەیە (أ) پێی دەگوترێ: هەمزەی پرسیار کردنی نکووڵیی لێکەرانە، واتە: ئایا دڵنیان کە داپۆشەرێك لە سزای خوا بەسەریاندا بێ؟ یانی: نەدەبوو دڵنیابن .

(الغاشیة: الحادثة التي تحیط بالناس، والعرب یؤنّثون هذه الحوادث: الطامة، الصاخة، الداهیة، المصیبة)، وشەی (غاشیة) ناوێکە کە دەورەی خەڵك دەداتو خەڵك دادەپۆشێ، عەرەب عادەتیان وایە کە ئەو کارەساتە

مەزنانەی خەڵك لە دەستیان ڕزگاری نابیٚو لە بەینیان دەبات، بە شێوەی مێینەی مەجازیی دەیانهێنن، وەك:

١/ (الطامة) بەڵایەك كە زۆر گەورەو بیٚ ئامانە .

٢/ (الصاخة) دەنگێكو بەڵایەكی گەورە كە گوێی خەڵك كەڕ بكات .

٣/ (الداهیة) كارەساتێكی بیڕەزا .

٤/ (المصیبة) بەڵایەكی گەورە .

ئەو جۆرە وشانەش زۆرن.

كەواتە: ﴿ أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأۡتِيَهُمۡ غَٰشِيَةٞ مِّنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ ﴾، ئایا دڵنیان كە بەڵایەكی داپۆشەر لە سزای خوا بۆیان بیٚ؟ واتە: نەدەبوو دڵنیابن؟ ئەوان ئەگەر لەسەر ئەو بێبڕواییە بەردەوام بن، دەبیٚ چاوەڕوانی ئەوە بكەن: خوا سزایان بدات، بەڵایەكیان بۆ بنێریٚ كە دایان بپۆشیٚو، لە چنگی قوتار نەبن .

٢) – ﴿ أَوۡ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ ﴾، یاخود ئاخیر زەمان (ساعة) كتوپڕ بۆیان بیٚ، زۆربەی تەفسیرەكان وشەی (ساعة) هەر بە (قیامة) لێكدەدەنەوە، كە لە ڕاستییدا (ساعة) ئەو كارەساتەیە كە دەبێتە هۆی تێكچوونی ئەو سیستەمەی دنیا، كە ئێستا هەیە، ئەم كەونو كائیناتە هەمووی لەبەین دەچیٚ، (ساعة)ش بەهۆی فووی یەكەمی ئیسرافیل بە كەڕەنادا، دێتەدی، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ٦٨ ﴾الزمر، واتە: فوو بە كەڕەنادا كرا (یانی : بۆ جاری یەكەم) یەكسەر هەر كەس لە ئاسمانەكانو زەویدایە، بێهۆش كەوتن، جگە لەوانەی خوا بیەوێ، (بێهۆش نەبن) دوایی بۆ جارێكی دیكە فووی پێدا كرا، یەكسەر هەموویان هەڵسانەوە، تەماشایان دەكرد .

كەواتە: (قیامة) یانی: هەڵسانەوە، بەڵام (ساعة) واتە: ئەو كاتە دیاریی كراوەی، كە دنیای تێدا كۆتایی دیٚ .

ئنجا دەفەرموێ: یاخود ئایا دڵنیان کە کتوپڕ، لەنەکاو، دنیایان بەسەردا وێران بێ ؟!

ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (الأعراف)، لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا، کە دەفەرموێ: ﴿لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ١٨٧﴾، واتە: ساعەتان بۆ نایەت، مەگەر زۆر بە کتوپڕیی و لەنەکاو بەبێ چاوەڕوان کردن، لەوێدا بە تەفصیلێ، باسمان کردووەو فەرمایشتی پێغەمبەرمان ﷺ لەوبارەوە هێناون .

(البغتة: الفجأة وإصابة من حيث لم يُتوقَّعْ)، (بغة) واتە: کتوپڕ، بەڵایەك کە تووشت ببێ، بەبێ ئەوەی پێشبینیی بکەی .

**٣) -** ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾، واتە: لە حاڵێکدا کە ئەوان هەست پێناکەن، پێشبینیی ناکەن، ئەمە هەر وەك جەخت کردنەوەو تۆخکردنەوەی ئەوەی پێشێیە، کەواتە: یان بەڵای دەورە دەری قوتار نەکەر، یاخود ئاخیر زەمانی ناگەهان، دڵنیا مەبن کە یەکێك لەم دووانەتان بەسەر نەیەت، چ لە دنیادا سزای داپۆشەری دەورە دەرتان بۆبێ، چ دواتان بخات تاکو (ساعة) دێ، کە بە تەئکید ئەگەر ئەوەی یەکەمیشیان نەیەت، ئەوەی دووەمیان دێو مسۆگەرە .

کە دیارە ئەوەش هەمووی بۆ هۆشداریی پێدانو وریا کردنەوەو ڕاچڵەکاندنیانە، لە خەوی بێئاگایی .

**مەسەلەی شەشەم : فەرمان کردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە ڕێبازی خۆیو شوێنکەوتووانی بە خەڵك بناسێنێ، کە بریتیە لە: بانگەوازکردن بۆ لای خوا، بە بەڵگەوەو لەبەر ڕۆشنایی داو خوا بە پاکگرتنو، دووریی گرتن لە هاوبەش بۆ خوا دانان :**

وەك خوا فەرموویەتی : ﴿قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ١٠٨﴾.

## توێژینەوەی ئەم ئایەتە لە پێنج بڕگەدا

١) - ﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: تۆ بڵێ: ئا ئەمە ڕێبازی منە، واتە: ئەوەی کە ڕابردو باسکرا، ئا ئەوە ڕێبازی منە، یاخود ئەوەی کە دوایی دێ، ئەوە ڕێبازی منە، ئنجا لێرەدا وشەی (سبیل) بە مێینە (مؤنَّث) هاتوە، لە زمانی عەرەبییدا هیچ وشەیەك نیە کە بە نێرینە، یان مێینە لە قەڵەم نەدرێ، بەڵام (مُذكَّر) و (مؤنَّث)ی مەجازیی، ئنجا لێرەدا وشەی (سبیل) بە مێینە هاتوە، جاری واش هەیە ئەم وشەیە بە نێرینە هاتوە، وەك لە سووڕەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلْغَىِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا ﴿١٤٦﴾ ﴾، واتە: ئەگەر ئەوانە سەر ڕاستیی ببینن، نایکەنە ڕێبازی خۆیانو نایگرنە بەر، بەڵام ئەگەر ڕێی بێمرادیی ببینن دەیکەنە ڕێبازیان .

لێرەدا وشەی (سبیل) بە نێرینە (مذكَّر) هاتوە .

٢) - ﴿ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ ﴾، بانگەواز بۆ لای خوا دەکەم بە بەڵگەوە، بە بەرچاو ڕۆشنییەوە .

(البَصِيرَةُ: فَعِيلَة بمعْنَى فَاعِلَة، أي: الحُجَّة الواضحة)، (بصيرة) لەسەر کێشی (فعیلة)یە، بە مانای (فاعلة) دێ، (بصيرة) واتە: بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرا، یاخود (البصيرة: المعرفة التي يتميَّز بها الحق من الباطل)، (بصيرة) بریتیە لەو زانستەی کە بەهۆیەوە هەقو بەتاڵ، ڕاستو چەوت، لێك جیادەبنەوە .

کەواتە: ڕێبازی من ئەوەیە کە لەبەر ڕۆشنایی دا خەڵك بەرەو لای خوا بانگ دەکەم، ئنجا بۆچییان بەرەو خوا بانگ دەکات؟ بۆ ئەوەی بەندەی خوابن، چونکە مرۆڤ ئەگەر بەندەی خوابێ، ئازادو ئازا دەبێ،

سەرفرازو بەختەوەر دەبێ، لە دنیاو دوارۆژدا، بەڵام ئەگەر بەندەی خوا نەبێ، دەبێتە کۆیلەی مرۆڤێکی وەك خۆی، یان لە خوار مرۆڤیشەوە، وەك شەیتانێك، ماددیەکی بێ ژیان، ئەستێرەو خڕۆکەیەك، ژیانداریك، ڕووەکێك، هەواو ئارەزوویەك .

٣) - ﴿أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي﴾، (خەڵك بەرەو خوا بانگ دەکەم)، خۆمو ئەوانەی شوێنم کەوتوون، ئەوە پیشەمانە، کەواتە: شوێنکەوتووانی پێغەمبەر ﷺیش لەسەریان فەرزە: بەرچاو ڕوونو شارەزاو ئاگاداربن لە بەرنامەکەی خۆیان، کە خەڵکی بۆ بانگ دەکەن، پاشان لەسەریان پێویستە، هەمان ئەو پەیامو بەرنامەیەی کە پێغەمبەری خاتەمی پێشەوایانو سەر مەشقیانو پەیڕەویی لێکراویان، گەیاندوویەتی بە خەڵك، ئەوانیش لە قەدەر خۆیان ئەوەندەی کە لێی دەزانن، ئەو پەیامو بەرنامەیە بە خەڵك بگەیەنن، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە، کە فەرموویەتی: {بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٨٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٧٤)، وَالترمِذِيُّ برقم: (٢٦٦٩)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَابن حِبانَ برقم: (٦٢٥٦)}.

واتە: لە منەوە ئەگەر ئایەتێکیش بێ، بیگەیەنن .

یانی: بیگەیەنن بە خەڵك، کە دیارە هەر کام لە بڕوادارانی شوێنکەوتووی پێغەمبەر ﷺ کەمو زۆر میراتگری پێغەمبەرو جێگریەتی .

٤) - ﴿وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ﴾، (هەروەها بڵێ): پاکیی بۆ خوا .

یانی: خوا بە پاكو بە دوور دەگرم، لە هەموو ئەو شتانەی کە شایستەی خوا نین، لە هەموو ئەو سیفەتو ڕەفتارو کردەوانەی شایستەی خوا نینو، لە خوا ناوەشێنەوە .

٥) - ﴿وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾، بێگومان من لە هاوبەش بۆ خوا دانەران نیم .

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە هاوبەش بۆ خوا دانەران، کەسانێکن، بەبێ بەڵگەو، بەبێ بەرچاو ڕوونیی، ڕێگا دەگرنە بەرو بە دوای کوێرە ڕێو

ڕێچکان دەکەون، نازانن چی دەکەن و چۆن دەکەن ؟ ڕاست و چەپ و دۆست و دوژمنی خۆیان لێك ناکەنەوە، ئەوە عادەت و پیشەی هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، بەڵام بڕواداران و خوا بە تاك دانەران، وەك پێغەمبەرەکەی خۆیان ﷺ بە ڕێی خوادا دەڕۆن، بە بەرچاو ڕوونیی و بە تێگەیشتنەوە، بە شارەزایی و بە کارامەییەوە، هەر قسەیەك دەیکەن بە بەڵگە پشت ئەستوورە، چونکە بێگومان دینداریی کردن بەبێ زانیاریی و، بەبێ بەڵگە ماڵێکی قەڵبە و بەسەر خاوەنی دا دەڕێتەوە، هەر بۆیە خوا ﷻ لە سووڕەتی (محمد)دا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ ﴿١٩﴾﴾.

واتە: بزانە ! کە جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین و، داوای لێبوردن بۆ گوناهت (لە خوا) بکە و، بۆ بڕوادارانی پیاوو ئافرەت، خواش شوێنی نیشتەجێ بوونتان و شوێنی هەڵگێڕو وەرگێڕو هاتن و چوونتان دەزانێ .

کەواتە : پێشێ دەبێ ئینسان زانیاریی و بەرچاو ڕوونیی هەبێ، زانایان گوتوویانە :

(وَكُلُّ مَنْ بِغَيْرِ عِلْمٍ يَعْمَلُ
أَعْمَالُهُ مَرْدُودَةٌ لَا تُقْبَلُ)

واتە: هەر کەسێك کار بکات بەبێ زانیاریی، کردەوەکانی ڕەت دەکرێنەوەو لێی وەرناگیرێن .

بەڵێ لە ڕاستییدا خوا بە بەرچاو ڕوونیی و، بە بەڵگە و زانیارییەوە دەپەرسترێ، بە نەزانیی و لاسایی کردنەوە کوێرانە و نەفامیی، خوا ناپەرسترێ .

**مەسەلەی حەوتەم :** ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە لە پێش پێغەمبەری خاتەم ﷺ دا، تەنیا پیاوان لە خەڵکی ئاوەدانییە قەڵەباڵغەکان بە پێغەمبەر ڕەوانە کراون‌و، فەرمان کردنی خوا ﷻ بە گەڕان‌و پشكنین لە زەویدا، بۆ سەرنجدانی شوێنەوارو سەرەنجامی گەلانی پێشوو، ئەوانەی کە لەگەڵ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دا دانوویان نەکوڵیون‌و لەگەڵیاندا ناکۆك بوون، سەرنجی سەرەنجامیان بدەن، چییان بەسەر هاتوە !

وەك خوا دەفەرمووێ : ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۗ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ١٠٩ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە حەوت بڕگەدا

١) - ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا ﴾، لە پێش تۆدا تەنیا پیاوانمان ڕەوانە کردوون، واتە: ڕەوانەمان کردوون، وەك پێغەمبەرو نوێنەری خۆمان، لێرەدا کە دەفەرمووێ: پیاوان، واتە: خەڵك (الرِّجَالُ: اسْمُ جِنْسٍ جَامِدٍ، أَي: أُنَاس) لێرەدا مەبەست پێی ئەوە نەبووە، کە ئافرەتان پێغەمبەر نەبوون، هەرچەندە شتێکی دیارە کە هیچ ئافرەتێك پێغەمبەر نەبووە، بەڵام مەبەست پێی ئەوەیە کە ئێمە تەنیا خەڵکی وەك تۆمان لە پێش تۆدا کردۆتە پێغەمبەر، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە هەمیشە هاوبەش بۆ خوادانەرو کافرەکان، هەم بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ و هەم بۆ پێغەمبەرانی دیکەش، ڕەخنەیان ئەوە بووە کە: خوا بۆچی فریشتان نانێرێ؟ بۆچی فریشتەیەکی نەناردوە؟ خوای پەروەردگار ویستوویەتی

لێیان حاڵی بکات، کە لە پێش پێغەمبەر خاتەمیشدا ﷺ هەر مرۆڤەکان، پیاوانی وەك تۆمان کردوە بە پێغەمبەر ﷺ، کەواتە: تۆ بیدعەتو داهێنراوێك نی، پێشینەت نەبێ .

**بڕگەی دووەم :** - ﴿ نُّوحِىٓ إِلَيۡهِم ﴾، سروشو نیگامان بۆ لا دەکردن، پەیامی پەنهانمان بۆ دەناردن، چونکە وەحیی بریتیە لە ئاگادار کردنەوەیەکی بە پەنامەکییو پەنهان، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە واتە: ئێمە بە شێوەیەکی پەنهان، بەبێ ئەوەی کە بۆ خەڵك زانراوبێ، پەیامو بەرنامەی خۆمان بۆ پێغەمبەر ﷺ دەنارد .

ئنجا ئایا ئەو پێغەمبەرانە کە پیاوانێك بوو ون، خەڵکی کوێ بوون ؟

**بڕگەی سێیەم :** - ﴿ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓ ﴾، (قری) کۆی (قریة)یە، بە مانای شاری قەڵەباڵغو گەورە دێ، واتە: لە خەڵکی ئاوەدانییە گەورەو قەڵەباڵغەکان، پێغەمبەرانمان ناردوونو لە ڕەگەزی پیاوانیش بوون .

حەسەنی بەصرایی گوتوویەتی[1]: (لَمْ يَبْعَث الله نَبيّاً مِنْ أَهْلِ البادِية قَطّ، وَلاَ مِنَ النِّساء، وَلاَ مِنَ الجِنِّ)، واتە: خوا لە خەڵکی بیابانتشین هەرگیز پێغەمبەرێکی نەناردوە، هەروەها لە ئافرەتانیش نەیناردوەو، لە جینیش پێغەمبەرانی نەناردوون .

هەروەها (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆی[2]دا، دەڵێ: (وَلَمْ يَبْعَث الله نبيّاً مِنْ أَهْلِ البادية، لغَلَبة الجَفَاء والقَسوة عَلَى أَهْل البَدو، ولأَنَّ أَهْل الأَمْصَار أَعْقَل وَأَحْلَم وَأَفضَل وَأَعْلَم).

واتە: خوا هیچ پێغەمبەرێکی لە خەڵکی بیابانتشین نەناردوە، لەبەر ئەوەی ئەوانە حاڵەتی کەم سەلیقەییو دڵڕەقیی بەسەریاندا زاڵەو، خەڵکی شارەکان فامیدەترنو هێدییو مەندترنو چاکترنو زاناترن .

---

١) تەفسیری (القرطبي) ج ٩ ، ص ١٢٣.

٢) ج ٩ ، ص ١٢٣.

واتە: بە گشتی، ئەگەرنا دیارە لە نێو شارەکانیشدا، خەڵکی بە کەڵك نەهاتوو هەیە، وە لە نێو خەڵکی بیابانتشینیشدا خەڵکی فامیدە هەیە، بەڵام حاڵەتی گشتی بەو شێوەیە .

(محمد متولّي الشعراوي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]دا، دەڵێ: (وَالفَارِقُ بَيْنَ أَهْلِ القَرْيَةِ وَأَهْلِ البادِيَةِ، أَنَّ أَهْلَ القَرْيَةِ لَهُمْ تَوطُّنٌ، وَيَمْلِكُونَ قُدْرَةَ التَّعَايُشِ مَعَ الغَيْرِ، وَتَرتَبِطُ مَصَالِحُهُمْ بِبَعْضِهِمُ البَعْض، وَتَرِقُّ حَاشِيَةُ كُلٌّ مِنْهُمْ لِلآخَرِ، وَتَتَّسِعُ مَدَارِكُهُم بِمَعَارِف مُتَعَدِّدَة، وَلَيْسَ فِيهِم غِلْظَةُ أَهْلِ البَادِيَة).

شەش جیاوازیی هێناون، دەڵێ: جیاوازیی نێوان خەڵکی شارەکانو خەڵکی بیابانتشین ئەوەیە :

یەك : کە خەڵکی شارەکانو ئاوەدانییە قەڵەباڵغەکان، لە شوێنێکی دیاریی کراودا نیشتەجێن، بەڵام بیابانتشینەکان، کۆچەریین، دێنو دەچن .

دوو : خەڵکی شارەکان توانای پێکەوە ژیانیان هەیە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا.

سێ : هەندێکیان لەگەڵ هەندێکیان بەرژەوەندییان پێکەوە پەیوەستە، (بەڵام بابای کۆچەریی وبیابانتشین، زۆر پێویستییان بە یەکدی نیە، هەر کەسە بۆ خۆیەتی) .

چوار : هەر کامێکیان لەگەڵ ئەوی دیکەدا، جۆرێك لە زەوقو سەلیقەی نەرمو هەست ناسکییان پێکەوە هەیە .

پێنج : ئاسۆی فیکریان بەهۆی زانیاریی جۆراو جۆرەوە، فراوانە .

شەش : ئەو دڵڕەقییو زبرییەی کە لە خەڵکی بیابانتشیندا هەیە، لەواندا نیە .

١) الخواطر، ج١٢، ص٧١٣٠.

بۆیە خوا ﷻ لە خەڵکی شارە قەڵەباڵغەکاندا، پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) ناردوە .

هەمیشەش خەڵکی شار، خۆیان بە هۆشیارترو بێدارترو شارەزاتر دەزانن، لە خەڵکی لادێو کۆچەریی‌و بیابانشین‌و ڕەوەند .

٤) – ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ واتە: بۆچی بە زەویدا ناڕۆن؟ دیارە بە زەویدا ڕۆیشتن، دوو چەمکی هەن :

١ – بە کردەوە بە زەویدا بڕۆن‌و شوێنەوارەکانیان ببینن، وەك دوایی دەفەرموێ:

﴿ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئنجا سەرنج بدەن: سەرەنجامی ئەوانی پێش وان چۆن بووە ؟ واتە: تەماشای شوێنەوارەکانیان بکەن، تەماشای قەڵاو بورجەکانیان بکەن، تەماشای دارو دیوارو ئەو شوێنەوارانە بکەن، کە بەجێیان هێشتوون، ئەوە ڕۆیشتنی کردەیی .

٢ – ڕۆیشتنێکی دیکە هەیە، ڕۆیشتنی فیکریی‌و زیهنیی، ئەویش ئەوەیە کە مێژوو بخوێننەوەو، لە سەرەنجام‌و لە شوێنەواری ئەو پێشینانە ڕابمێنن .

(محمد متولّي الشعراوي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ: خوا فەرموویەتی: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، نەیفەرمووە: (أَفَلَم يَسِيرُوا عَلَى الأَرْضِ) بۆچی وایفەرمووە؟ دەڵێ: (إِنَّ هُنَاكَ غِلافاً جَوِيّاً يُحِيطُ بالأَرْضِ، مِنْ كُلِّ الجوانب، كما أن هناك غلافاً مائيّاً محيطاً بالأَرْضِ، وَالغِلاَفُ الجَوِيُّ مِنْ ضِمْنِ تَمامِ الأَرْضِ، وَإِنَّكَ حِيْنَ تَسِيرُ عَلَى اليابسة، فَالغِلاَفُ الجَوِي يَكونُ فَوقَكَ، وَبِذَلِكَ فَأَنْتَ تَسِيرُ فِي الأَرْضِ، لأَنَّ ما فَوْقَكَ مِنْ غِلاَفٍ جَوِيٍّ، هُوَ مِنْ مُلْحقَاتِ الأَرْضِ)، عیبارەتەکەی بە کورتیی مانا دەکەم، دوایی تۆزێ شی دەکەمەوە، چونکە شیکردنەوەی دەوێ .

واتە: بەرگێکی هەوایی هەیە دەوری زەوی داوە، {بە بەرزیی ٥٠٠ – ٦٠٠ کلم}لە هەموو لایەنەکانەوە، هەروەك چۆن بەرگێکی ئاوییش هەیە، کە

١) الخواطر، ج١٢، ص١١٣١ و ١١٣٢.

ئەویش دەوری زەوی داوە (کە دیارە سێ لەسەر چواری ڕووبەرو پانتایی زەوی بە ئاو داپۆشراوە) بەڵام لە هەر چوار لاوە، زەوی ئەو بەرگە هەواییە دەورەی داوە، ئنجا ئەو کیفەی دەوری زەوی داوە، هەر لە میانی زەوی دایە، زەوی بەوەوە تەواو دەبێ، بۆیە کاتێك تۆ بەسەر وشکانیی دا دەڕۆی، بەرگە هەواییەکە لە سەرووتەوە دەبێ، کەواتە: تۆ بە نێو زەویدا دەڕۆی، چونکە ئەو بەرگە هەواییەی کە لە سەرووتەوەیە لە پاشکۆیەکانی زەوییە .

مەبەستی ئەوەیە کە دەگوترێ: زەوی، لە ڕاستییدا بەو ئاوەوە کە دەوری داوەو، بەو هەوایەشەوە کە دەوری داوە، بە هەموویان دەگوترێ: زەوی، چونکە ئەگەر هەوا نەبووایە، مرۆڤ لەسەر زەوی نەدەژیاو، هیچ ژیاندارێك نەدەبوو، نە ڕووەك و نە ئاژەڵ و نە زیندەوەرو نە پەلەوەرو نە مرۆڤ، هەروەها ئەگەر ئاویش نەبووایەو دەوری زەوی نەدابووایە، بە هەمان شێوە ژیان لەسەر زەوی نەدەبوو .

کەواتە: ئەگەر تۆ لە دوورەوە تەماشای زەوی بکەی، بە تایبەتی ئەگەر لەسەر مانگەوە، یان لە دەرەوەی چوار چێوەی زەوییەوە، تەماشای دەکەی، زەوی شین دەچێ، لەبەر ئەوەی سێ لەسەر چواری زەوی، بە ئاو دەورە دراوە، ئنجا ئەگەر دوورتر بکەویەوە، ئەو بەرگە هەوایەی کە دەوری زەویشی داوە، هەمووی لە بازنەی زەوی دایە، کەواتە: کەسێك بە هەر شوێنێکی زەمین دا بڕوات، هەر بەنێو زەویدا دەڕوات، چونکە بەرگە هەوایەکەش هەر بەشێکە لەو زەوییە .

**٥) –** ﴿ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، (بڕۆن) سەرنج بدەن، ئایا سەرەنجامی ئەوانی پێش وان چۆن بووە؟ واتە: پەندیان لێوەربگرن، بزانن ئەوان چییان بەسەرهاتوە، ڕەنگە بەسەر خۆشیان بێ !

**٦) –** ﴿ وَلَدَارُ ٱلْأَخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ ﴾، مەنزڵگای دواڕۆژیش باشترە، بۆ ئەوانەی پارێز دەکەن .

**٧) –** ﴿ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾، ئایا ئێوە نافامن! خوێنراویشەتەوە: (أَفَلاَ يَعْقِلُون)، ئایا ئەوان نافامن !

هەروەك چۆن ڕستەی: (نوحي إليهم) خوێنراویشەتەوە: (يوحي إليهم) واتە: ئێمە وەحییان بۆ دەنێرین، یاخود: خوا وەحییان بۆ دەنێرێ .

لێرەدا بە پێویستی دەزانم هەندێ وردەكاریی ڕەوانبێژیی لەم ئایەتە موبارەكەدا باس بكەین، ئێمە سێ وردەكاریی باس دەكەین، كە لە كتێبی: (دُرَّة التنزيل، وغُرَّة التأويل)[1] وەریان دەگرین :

<u>یەكەم</u>: نوكتەی ڕەوانبێژیی : خوا ﷻ لەم ئایەتەی سوورەتی یوسوف دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ ... ١٠٩ ﴾.

لە ئایەتی ژمارە (٤٣)ی سوورەتی (النحل)یش دا، هەمان عیبارەت دووبارە بۆتەوە، دەفەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣ ﴾، لێرەدا بە وشەی (مِن) هاتووە، دەفەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ ﴾.

بەڵام لە سوورەتی (الأنبياء)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٧ ﴾، لەوێدا وشەی (مِن) نەهاتووە، ئنجا ئایا حیكمەت چییە ؟

(من قبلك) واتە: لە پێش تۆدا، هەر لەو سەرەتایەوە كە لە پێش تۆوە دەست پێدەكات، هیچ كەسێكمان نەناردوە، جگە لە پیاوانێك لە خەڵكی ئاوەدانییەكان، ئنجا كە (مِن)ەكەی دەخرێتە سەر، دەیباتەوە سەرەتای سەرەتا، واتە: لە دەستپێكەوە ئێمە تەنیا پیاوانمان ناردوون، لە ئاوەدانییەكان، بەڵام دیارە ئەگەر (مِن)ەكەی لەگەڵدا نەبێ، واتە: لە پێش تۆدا، بەڵام نایباتەوە عەینی سەرەتا .

---

١) للخطيب الإسكافي، ص ١٧٢ – ١٧٣ .

ئنجا (الإسكافِي) دەڵێ: {ولم يجيءْ بدون (مِن) إلاَّ في موضعين، أحدهما هذا، والآخر: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ ﴿٢٠﴾ ﴾الفرقان}، واتە: لە هەموو قورئاندا ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا ﴾ هەمیشە (مِن)ی لەگەڵدایە، تەنیا لە دوو شوێندا (مِن)ی لەگەڵدا نیە :

١) یەکێکیان سوورەتی (الأنبیاء)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِيٓ إِلَيْهِمْۖ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾ ﴾.

٢) لە شوێنەکەی دیکەش، ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ ﴿٢٠﴾ ﴾الفرقان.

یانی : مادام لە هی پێشێ دا (مِن) هاتوە، دیارە ئەم (مِن)ە، بە کافی زانراوە .

بەڵام هی دووەم :

لە سوورەتی (الفرقان)دا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِى ٱلْأَسْوَاقِ ﴿٢٠﴾ ﴾.

واتە: لە پێش تۆدا هیچ کام لە پێغەمبەرانمان نەناردوە، مەگەر خواردنیان خواردوەو بە بازاڕدا ڕۆیشتوون .

واتە: لێرەدا جێی مەبەست هەر ئەوە بووە : ئەو پێغەمبەرانە صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، کە لە پێش موحەممەددا ﷺ هاتوون، وەك موحەممەد ﷺ بوون: خواردنیان خواردوەو بە بازاڕدا ڕۆیشتوون، مرۆڤ بوونو، فریشتە نەبوون، هەر ئەوەندە مەبەست بووە، ئەو هەواڵە بگەیەنرێ، بۆیە پێویستی بەوە نەکردوە کە (من)ی بۆ بەکاربهێنرێ .

<u>دووەم</u>: نوکتەی ڕەوانبێژیی : هی ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴿١٠٩﴾ ﴾.

بەڵام لە سوورەتی (الروم)دا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ ۖ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ﴾، واتە: ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون سەرنج بدەن: کە سەرەنجامی ئەوانەی پێش وان چۆن بووە !

لە ئایەتەکەی سوورەتی (یوسف)دا، (ف) هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا ﴾، بەڵام لە ئایەتەکەی سوورەتی (الروم)دا، (و) هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا ﴾.

(الخطیب الإسکافِي) دەڵێ: (ویکون بالواو عَطْف جُمْلَة عَلى جُمْلَة، وَإِنْ كَانَتِ الثانِيَة أَجْنَبِيَة مِنَ الأُولى) واتە: کاتێك ڕستەیەك دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر ڕستەیەك بە پیتی (و)، ئەگەر ئەو دوو ڕستە لە یەكدیش بێگانەبن ، هەر ڕەوایە .

ئەگەر تەماشای ڕستەکەی سوورەتی (الروم) بکەین، دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ ۖ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ﴾.

لە ئایەتی ژمارە (٨)دا باسی ئەوە دەکات ئایا لە خۆیاندا بیریان نەکردۆتەوە: کە خوا ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان، بە هەقو بۆ کاتێکی دیارییکراو دروستیکردوون ؟ دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ

﴿يَسِيرُواْ﴾، چونكە ئەوەی كە لە ڕستەی دوایی دا دێ، وەك جەزا نیەو پەیوەست نیە بە ڕستەی پێشیّو، لێی بێگانەیە، بۆیە بە (و) (عطف) كراوەتەوە سەری، هەڵبەتە هەمان جۆرە مەبەست لە ئایەتی ژمارە (٤٤)ی سووڕەتی (فاطر)یشدا هاتوە، كە دەفەرموێ : ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةًۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾﴾.

چونكە وەك (الخطيب الإسكافِي) دەڵێ: {لَمْ يَتَقَدَّم : (الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِم) ما يكونُ هَذَا كالجَوَابِ عَنْهُ، فَلَمْ يحسن إلا الواو، لأن الآية التي قَبْلَهُ، لَيْسَت فِي وَصْفِ قَوْم عُوقِبوا عَلَى مخالَفة نَبيِّهم، وَبقِيَت آثارهُم مِنَ العَذَاب، فِي مَنَازِلِهم وَدِيارِهِم} .

واتە: لەبەر ئەوەی لە پێش ئەو ئایەتەدا، شتێك پێش نەكەوتوە، كە ئەمە وەك وەڵام بێ بۆ ئەو، بۆیە هەر وا باش بووە، كە بە (و) (عطف) بكرێتەوە، چونكە ئایەتی پێشیّ باسی كۆمەڵێك ناكات كە سزا درابن، لەبەر سەرپێچییان لە پێغەمبەرەكەی خۆیان كردوەو شوێنەوارەكانیان لە ئەنجامی سزادرانیاندا، لە ماڵو حاڵو خانوبەرەكانیان، مابن .

هەروەها لە سووڕەتی (غافر)یشدا دەفەرموێ : ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴿٢١﴾﴾، لە پێشیەوە چی هاتوە؟ دەفەرموێ : ﴿وَٱللَّهُ يَقْضِى بِٱلْحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقْضُونَ بِشَىْءٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبْلِهِمْۚ كَانُواْ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٢١﴾﴾.

ئەویش بە هەمان شێوە لە ئایەتی (٢٠) دا خوای پەروەردگار، باسی ئەوە دەكات، كە خوا دادوەریی دەكات بە هەق، بەڵام ئەوانەی كە لە جگە لە خوا

دەپارێنەوە، هیچ شتێکیان بۆ جێبەجێ ناکەن و، هیچ بڕیارێك نادەن، بێگومان خوا بیسەری بینەرە .

دوایی دەفەرموێ: ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون، سەرنج بدەن، سەرەنجامی ئەوانەی لە پێش ئەوانەوە بوون، چۆن بوو؟ کە بەهێزتر بوون و، شوێنەواریشیان لە زەویدا زیاتر بوو .

(الخطيب الإسكافِي) دەڵێ: ئەو ئایەتانەی کە پێش ئایەتی: ﴿أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ هاتوون، ئەمە ناخوازن کە ئەم ئایەتەی دوایی، وەك وەڵام بێ بۆ ئەوان، تاکو بە (ف) بفەرموێ: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ﴾، بەڵکو مەبەستێکی جیاوازە، بۆیە هەر بە(و) (عطف) کراوە .

بەڵام شتێك کە لێرە هەڵاوێردراوە، ئەوەیە کە لە سووڕەتی (محمد)دا دەفەرموێ: ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۖ وَلِلۡكَٰفِرِينَ أَمۡثَٰلُهَا ١٠﴾، لێرەدا بە (ف) هاتوە، ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بەبێ ئەوەی کە شتێکیشی پێشبکەوێ، خوازیاری هاتنی (ف) بێ، ئنجا (الإسكافِي) وەڵام دەداتەوە، دەڵێ : کە خوا پێشتر لە ئایەتەکانی: (٧ تا ٩)دا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ٧ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعۡسٗا لَّهُمۡ وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ٨ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ٩﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە دۆستانی خوا سەرکەوتوون و، کافرەکان تێکشکێنراون، بۆیە با پەند وەربگرن لەو کافرانەی کە پێشیان کەوتوون و، بزانن کە ئەوانیش هەمان سەرەنجام، کە کافرەکانی پێش ئەوان هەیانبووە، دەیانبێ، بۆیە بە (ف) هاتوە، چونکە وەك سزا (جزاء) وایە، یانی: با پەند لەوانی پێشێ وەربگرن .

کەواتە: کە لە ئایەتی (١٠٩)ی سووڕەتی (یوسف)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ ﴾ ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ لەبەرئەوەیە کە لە پێشیەوە، ڕستەی: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا ﴾ هاتوە، مادام پێشێ باسی ڕەوانەکرانی پیاوانێك کراوە، بە سیفەتی پێغەمبەر ﷺ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: با پەند وەربگرن لە شوێنکەوتووانی ئەو پێغەمبەرانەی پێشتر ناردوومانن .

هەروەها لە سووڕەتی (الحج)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ ﴾، لە پێشیەوە چی هاتوە؟ ئەوە هاتوە: ﴿ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ فَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ ﴾، کە ئەمە وەك جەزا وایە، پێشێ باسی ئەوە دەکات، دەفەرموێ: زۆر ئاوەدانییمان لە پێش واندا فەوتاندوون، کە ستەمکار بوون، ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون کە دڵانێکیان هەبن، پێیان تێبگەنو، گوێیان هەبن، پێیان ببیستن، وەك ئەوەی فەرموویێتی: مادام سەرەنجام بەو شێوەیە بووە، کەواتە: بە زەویدا بڕۆنو پەند وەربگرن .

هەروەها لە سووڕەتی (غافر)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓاْ أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾، لە پێش ئەوەدا لە سووڕەتی (غافر)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن

قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ﴿٧٨﴾ ﴾، چونکە پێشێ باسی ڕەوانە کردنی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کراوە، لە پێش پێغەمبەری خاتەم دا ﷺ، کە هەندێکیان بەسەرهاتەکەیان بەسەریدا خوێنراوەتەوەو، هەندێکیشیان بەسەرهاتەکەیان نەخوێنراوەتەوە، ئەمە هاتوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴿٨٢﴾ ﴾.

کەواتە: وەك گوتمان تەماشا دەکەی خوای کارزان، تەنانەت (و) لە جیاتی (ف) بەکارناهێنێ، بەڵکو لە شوێنێك (ف) بەکاردێنێ، کە مانای جەزاو پەند وەرگرتن دەگەیەنێ، لەبەرئەوەی لە پێش ئەوەدا شتێکی وا باسکراوە، بەڵام (و) کاتێك بەکاردێ، شتێکی وا باسکراوە، کە ڕستەیەك، بابەتێك، بگێڕدرێتەوە سەر بابەتێکی دیکە، بێ ئەوەی پێکەوە پەیوەست بن .

<u>سێیەم</u>: نوکتەی ڕەوانبێژیی : ئەم ڕستە موبارەکە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ اتَّقَوْا أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾، لێرەدا وا دەفەرموێ، واتە: مەنزڵگای دوارۆژیش باشترە، بۆ ئەوانەی پارێزیان کردوە، ئایا نافامن ؟!

بەڵام لە سوورەتی (الأعراف)دا، ئەم ڕستەیە لە ئایەتی (١٦٩)دا، ئاوا هاتوە: ﴿ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾.

هەروەها لە سوورەتی (الأنعام) لە ئایەتی (٣٢)دا، ئاوا هاتوە : ﴿ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾.

ئنجا ئایا هۆکاری جیاواز بوونی ئەو تەعبیرانە، کە نێوەڕۆکیان یەکە، چییە؟ کە ئەویش کەمو زۆر، کاریگەریی دەکاتە سەر جیاواز بوونی هەندێ لە چەمکەکانیان ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: کە لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (١٦٩)دا، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾، لەبەر

ئەوەیە لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی پێشتریدا، ئەمە هاتووە:
﴿ فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَذَا الْأَدْنَى وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِنْ يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِثْلُهُ يَأْخُذُوهُ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِمْ مِيثَاقُ الْكِتَابِ أَنْ لَا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾، کەواتە: کە لە پێشیەوە دەفەرمووێ: ﴿ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَذَا الْأَدْنَى ﴾، یانی: بەرژەوەندیی ئەم ژیانە دنیاییە نیزیکە، هەڵدەبژێرن، (أي: هَذَا المَنزِلَ الأَدْنَى) ئنجا (المنزل الأدنى) لەگەڵ (الدَّارُ الدُّنيا) یەك واتایان هەیە، مەنزڵگای خوارترو مەنزڵگای نیزیکتر، دەشگونجێ (أدنى) بە مانای کەمتر بێو، (دنیا)ش بە مانای نزمتر بێ .

ئنجا مادام لە سوورەتی (الأعراف)دا سیفەتی (الأدنى) کراوە بە وەسف بۆ (مَنزِل) یانی: ﴿ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَذَا الْأَدْنَى ﴾، واتە: (هَذِهِ الدَّار الأَدْنَى) بۆیە لە سوورەتی (الأعراف)دا، یەکسەر گوتراوە: ﴿ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ ﴾، (ذُكِر الدَّارُ الآخِرَة بَعْدَهُ، فَجُعِلَ الدَّارَ موصوفة، والآخِرَةُ صِفة)، (دار) لە سوورەتی (الأعراف)دا کراوە بە وەسفکراوو، (آخرة)ش کراوە بە سیفەت، (مەنزڵگای دوایی باشترە، بۆ ئەوانەی پارێز دەکەن).

بەڵام لە سوورەتی (یوسوف)دا، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ ﴾، (دار) (إضافة) کراوە بۆ لای (آخرة) چونکە لە پێشیەوە، ئەوە هاتوە: ﴿ أَفَأَمِنُوا أَنْ تَأْتِيَهُمْ غَاشِيَةٌ مِنْ عَذَابِ اللَّهِ أَوْ تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٠٧﴾ ﴾.

واتە: ئایا دڵنیا بوون، کە داپۆشەرێك لە سزای خوایان بۆبێ ؟!

دیارە (ساعة)ش مەبەست پێی ئەو کاتەیە، کە دنیا کۆتایی دێو پێشەکیی قیامەتە، ئنجا لێرەدا مادام (دار) پاڵدراوەتە لای، ئاوای لێ دێتەوە: (وَلَدارُ الساعَة الآخِرَة خير للذين اتقوا) مەنزڵگای کاتی ڕۆژی دوایی، باشترە بۆ ئەوانەی کە پارێزیان کردوە .

ئنجا کە لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾، بەڵام لە سوورەتی (یوسف)دا دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ اتَّقَوْا﴾، لەبەر ئەوەیە کە لە سوورەتی (یوسف)دا، بانگ کراون بۆ ئەوەی پەند وەربگرن لە حاڵو باڵو بەسەرهاتو شوێنەواری ئەوانەی کە پێش وان، فەوتاون، بۆیە یەکسەر فەرموویەتی: ﴿لِّلَّذِينَ اتَّقَوْا﴾، بۆ ئەوانەی کە پارێزیان کردوە، بە ڕابردوو، سیفەتی تەقوایان لە خۆیاندا پەیدا کردوە، بۆ ئەوانە پەند هەیە، لە بەسەرهاتی گەلانی پێشوودا .

بەڵام لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾، بۆیە بە (مضارع) هێناویەتی، چونکە مەبەست پێی ئەوانە بووە، کە لەو ڕۆژگاری دا بوون، بەتایبەتی جوولەکەکان کە لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺدا بوونو، نیشانەکانی پێغەمبەریشیان شاردوونەوە، ئەوە هەم هاندانیانو ئارەزوومەند کردنیان بووە بۆ پاداشتی لای خوا، هەم ترساندنیان بووە لەوە کە: دووریی لە خوا بگرنو نیشانەکانی پێغەمبەری خاتەم، کە لە کتێبەکانیاندا هاتوون، بشارنەوەو پەنهان بکەن، بۆیە لەوێ بە (مضارع) هێناویەتی: ﴿لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾ بۆ ئەوانە کە پارێز دەکەن، مەنزڵگای دواڕۆژ باشترە، بەڵام ئەوەی دیکە، مەبەست ئەوە بووە کە پەند وەربگرن لەوانەی ڕابردوون .

**مەسەلەی هەشتەم :** ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە لە کاتێکدا پێغەمبەران گەیشتوونە حاڵەتی ئەوپەڕی سەغڵەتییو، زۆر خۆیان بە ناچارو بێ دەرەتان بینیوە، یارمەتی خوایان بۆ هاتووەو ، دەرووی خێریان لێکراوەتەوە :

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا اسْتَيْـَٔسَ الرُّسُلُ وَظَنُّوٓا أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا جَآءَهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّىَ مَن نَّشَآءُ ۖ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ ﴿١١٠﴾﴾ .

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ ﴾

### لە پێنج بڕگەدا باسكردنی بیروڕای زانایان لەوبارەوە

١) - ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ ﴾، وشەی (حتى) بۆ گەیشتنە ئامانجێكە، گەیشتنە شوێنێكە، وەك دەڵێی: (سِرْتُ مِن المَدِينة حَتَّى وَصَلْتُ مَكة) لە مەدینە بەڕێكەوتم‌و ڕۆیشتم، تاكو گەیشتمە مەككە .

وشەی (ٱسۡتَيۡـَٔسَ ) موبالەغەیە لە (يئس) یانی (يئس الرسل) پێغەمبەران نائومێدو بێ هیواو تەما بڕاو بوون .

٢) - ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ ﴾، پێیان وابوو: درۆیان لەگەڵ كراوە، بەڵام ئەگەر (كُذِّبوا)بێ، یانی: پێیان وابوو: بە درۆ دانراون.

خوێنراویشەتەوە: (كَذَبوا) واتە: گومانیان وا برد: گەلەكانیان درۆیان لەگەڵ كردوون، كە گوتوویانە: بڕوامان هێناوە .

هەندێكیش (ظن)یان بە مانای (يقين) لێكداوەتەوە، واتە: دڵنیابوون كە گەلەكانیان درۆیان كردوە لەگەڵیان، یان: دڵنیابوون كە گەلەكانیان بە درۆیان داناون .

٣) - ﴿ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا ﴾، یارمەتی ئێمەیان بۆ هات، واتە: یارمەتی ئێمە بۆ پێغەمبەران هات، یاخود سزای ئێمە بۆ گەلەكانی پێغەمبەران هات، كە گەلە بە درۆ دانەرەكان لەبەین بچن‌و، پێغەمبەران سەر بخرێن .

٤) - ﴿ فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُ ﴾، ئەوانەی كە ئێمە دەمانەوێ، قوتاركران، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (فَنَجى مَنْ يَشاء) ئەو كەسەی خوا ویستی دەربازی بوو، ڕزگاری بوو.

٥) - ﴿ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُنَا عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾، سزای ئێمەش لە كۆمەڵی تاوانباران بەرپەرچ نادرێتەوە، واتە: لەو كافرو بێبڕوایانە، بەڵام خوا ﷻ بە (مجرمين)

تاوانباران ناوزەندیان دەکات، تاکو بزانرێ کە ئەوانە بێبڕوایانێکی تاوانبار بوون .

لێرەدا ئەم تەعبیرە بەم شێوەیەی لێدێتەوە، چونکە وەك گوتمان: (حتى: لبلوغ الغاية)، (حتَّى) بەکاردەهێنرێ (بۆ گەیشتنە ئامانجێك)، کەواتە: دیارە سەرەتایەك هەبووە، بۆیە کۆتاییەکیش هەیە، واتە: گەلانی پێشوو لەسەر بە درۆ دانانو دژایەتییکردنی پێغەمبەران، بەردەوام بوون، ئەوانیش لە بەرانبەر ئەو دژایەتییەدا خۆڕاگر بوون، تاکو ئەو کاتەی کە پێغەمبەران بێ هیواو تەما بڕاو بوون .

دوایی ئێمە باسی ئەو تەما بڕاو بوونە دەکەین، کە ئەگەر بۆ پێغەمبەران بێ، یانی چی؟

ئنجا وشەی: (كذبوا) بە چەند شێوەیەك خوێندراوەتەوەو، بە پێی خوێندنەوەکان، ماناکانیشی دەگۆڕێن، ئەوەندە دەڵێین: توێژەرەوانی قورئان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، زۆر مشتومڕیان دەربارەی ئەم ڕستەیە کردوە، چونکە دەگونجێ زیاتر بە دە (١٠) شێوە مانا بکرێ، بەڵام ئێمە وردە وردە پێیدا دێین، دوایی هەمووی پوخت دەکەینەوە، بۆ ئەوەی خوێنەرانی بەڕێز مانای ئەو ڕستە قورئانییەیان لە زەینو مێشکدا ڕوونتر بێ :

شوێنەوارێك لەوبارەوە :

{عَنْ ابن شِهابٍ قَالَ أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ أَنَّهُ سأَلَ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَرَأَيْتِ قَوْلَهُ: (حَتَّى إِذَا اسْتَيْأَسَ الرُّسُلُ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ كُذِّبُوا، أَوْ كُذِبُوا ؟) قَالَتْ: بَلْ كَذَّبَهُمْ قَوْمُهُمْ، فَقُلْتُ: وَاللهِ لَقَدْ اسْتَيْقَنُوا أَنَّ قَوْمَهُمْ كَذَّبُوهُمْ ، وَما هُوَ بِالظَّنِّ، فَقَالَتْ: يا عُرَيَّةُ لَقَدْ اسْتَيْقَنُوا بِذَلِكَ، قُلْتُ: فَلَعَلَّها، أَوْ كُذِبُوا، قَالَتْ: مَعَاذَ اللَّهِ! لَمْ تَكُنِ الرُّسُلُ تَظُنُّ ذَلِكَ بِرَبِّهَا، قلت: فما هَذِهِ الآيَةُ ؟ قَالَتْ: هُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ الَّذِينَ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَصَدَّقُوهُمْ وَطَالَ عَلَيْهِمْ الْبَلاءُ وَاسْتَأْخَرَ عَنْهُمُ النَّصْرُ، حَتَّى إِذَا اسْتَيْأَسَتْ مِمَّنْ كَذَّبَهُمْ مِنْ قَوْمِهِمْ، وَظَنُّوا أَنَّ أَتْبَاعَهُمْ كَذَّبُوهُمْ، جَاءَهُمْ نَصْرُ اللهِ}،{أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ فِي صحيحه برقم: (٤٤١٨)} .

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: عوروەی کوڕی زوبەیر (کە خوشکەزای عائیشە خوا لێی ڕازی بێ‌و کوڕی ئەسمایە) هەواڵی پێداوە، کە کاتێك پرسیاری کردوە لە عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەربارەی فەرمایشتی خوا: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ ﴾، هەتا کاتێك پێغەمبەران نائومێد بوون، عوروە دەڵێ: گوتم: ئایا بە (كُذِبوا) خوێنراوەتەوە (واتە: درۆیان لەگەڵ کراوە)، یان بە: (كُذِّبوا) خوێنراوەتەوە (واتە: بە درۆ دانراون) ؟! عائیشە گوتی: بە (كُذِّبوا) خوێنراوەتەوە، دەڵێ: گوتم: ئنجا خۆ ئەو کاتە کە گەلە کافرەکانیان پێغەمبەرانیان بە درۆ داناوە، پێغەمبەران دڵنیا بوون کە بە درۆ دانراون، بۆچی وشەی گومان (ظن) بەکارهاتوە؟ عائیشە گوتی: بەڵێ ئەی عوروە! بێگومان وایە، دڵنیا بوون کە بە درۆ دانراون، دەڵێ: پێم گوت: ئەدی ناکرێ ئاوابێ : (وظنّوا أنهم قد كُذِبوا)؟ پێغەمبەران پێیان وا بوو کە درۆیان لەگەڵ کراوە، واتە: درۆیان لەگەڵ کراوە لەلایەن خەڵکەکەوە، کە گوتوویانە: بڕوامان پێتان هێناوە، یاخود: خەتەرەیەکیان بە دڵدا هاتوە: کە ئەو بەڵێنەی خوا پێی داون : سەردەکەون‌و گەلە کافرەکەیان لە بەین دەچن، ڕاست دەرنەچووە؟ گوتی: پەنا بە خوا، پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) هەرگیز گومانی وایان بە پەروەردگاریان نەبردوە، کە پێیان وابێ خوا ئەو بەڵێنەی پێی داون، لەگەڵی ڕاست نەبردوونە سەر، منیش گوتم: ئەدی ئەم ئایەتە ماناکەی چییە؟ عائیشە گوتی: ئەوانە شوێنکەوتووانی پێغەمبەران بوون، کە بڕوایان بە پەروەردگاریان هێناوەو پێغەمبەرانیان بە ڕاست داناوە، دوایی سەختیی‌و نارەحەتیی لەسەر ئەوان درێژەی کێشاوە، یارمەتی خواش بۆ ئەوان دواکەوتوە، هەتا کاتێك پێغەمبەرانی خوا نائومێد بوو ون، لەوانەی کە لە گەلەکانیان کە بە درۆیان داناون، (کە تازە بڕوا ناهێنن)و، گومانیان وا بووە، کە شوێنکەوتووەکانیان ـ بەهۆی درێژە کێشانی گرفتاریانەوە ـ بە درۆیان داناون، لەوکاتەدا یارمەتی ئێمەیان بۆ هاتوە .

هەڵبەتە ئەوە بۆچوونی دایکمان عائیشەیە خوا لێی ڕازی بێ، دەربارەی ئەم ئایەتە .

كە كورتەكەی ئەوەیە: پێغەمبەران ﷺ لە بڕوا هێنانی گەلە كافرەكانیان، نائومێد بوونو دڵنیا بوون كە تازە بڕوایان پێ ناهێنن، بەڵام گومانیان وا بردوە، كە ئەوانەی شوێنیان كەوتوون، ئەوانیش بە درۆیان دادەنێن، لەبەر زۆر پێچوونی هاتنی یارمەتی خواو سەختیی حاڵیان، پێیان وابووە ئەوانیش هەڵدەگەڕێنەوە، لەو كاتەدا یارمەتی خوا هاتوە .

كە بە بۆچوونی من: مانا لێكدانەوەیەكی زۆر جوانەو، دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، باشی بۆ چووە، ئەگەر بە (كُذِّبوا) بخوێنرێتەوە .

بەڵام ئەگەر بە (كُذِبوا) بخوێنرێتەوە، كە لەو موصحەفانەی لەژێر دەستمانن، كە بە پێی خوێندنەوەی (حفص)ن، هەر ئەو خوێندنەوە (قراءة)یە: ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ ﴾، واتە: پێیان وابوو كە درۆیان لەگەڵ كراوە، ئنجا ئەگەر وابێ، مانایەكەی چۆنە؟ چەند واتایەك هەڵدەگرێ، بەهۆی جۆراو جۆر بوونی خوێندنەوەی وشەی (كذبوا)وەو، بەهۆی مانای جۆراو جۆری هەر كام لە (استیئس)و (ظَنُّوا)وەوە، ئنجا پاش لێكۆڵینەوەو لێووردبوونەوەی ژمارەیەك لە تەفسیرەكانو سەرنجدانی ئەو ڕستە بە بڕسەی قورئانی بەرزی مەزن نۆ (٩) جۆرە مانامان، بۆ هێناون، كە بێگومان هەندێكیان لە هەندێكیان بەهێزترن :

١- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ ﴾، هەتا كاتێك پێغەمبەران نائومێد بوون لە بڕواهێنانی گەلە كافرەكانیان، ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ ﴾، (و)ی (ظَنُّوا) كە (فاعل)ەكەیەتی، دەگەڕێتەوە بۆ گەلەكان، ئەو خەڵكانەی پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانە كراون، ئەوان پێیان وابوو، درۆیان لەگەڵ كراوە، واتە: لەلایەن پێغەمبەرانەوە، كە پێغەمبەران گوتوویانە: ئەگەر بڕوا نەهێنن، خوا لە بەینتان دەبات، سزاتان دەدات، پێیان وابووە ئەو هەواڵەی كە پێغەمبەران پێیان داون، ڕاست نەبووەو درۆیان لەگەڵدا كراوە .

٢- واتایەكی دیكەی هەر بە خوێندنەوە (قراءة)ی (كُذِبوا)، ئەوەیە كە: ئەو كۆمەڵانەی بڕوایان بە پێغەمبەران هێناوە، پێیان وابووە: پێغەمبەران

(علیهم الصلاة والسلام) لەوەدا کە بەڵێنیان پێداون: خوا سەریان بخات، پێغەمبەران لەو بەڵێنەیان دا، ڕاستیان نەکردوەو، سەرەنجام ئەوان (ئەو کۆمەڵانە، یان پێغەمبەرەکان) درۆیان لەگەڵ کراوە، کە یارمەتی خوایان بۆ بێ‌و دەرووی خێریان لێ بکرێتەوە .

٣- واتایەکی دیکەی دیسان ئەگەر (كُذِبوا) بخوێنرێتەوە، لە (إبن عباس)ەوە خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: (ظنَّ الرسلُ أن الله قد أَخْلَفَ ما وعَدَهم) پێغەمبەران وایان بە دڵدا هات کە: خوا ئەوەی کە بەڵێنی پێدا بوون، ڕاستی دەرنەچواند! کە ئەمە دەبێ ڕوون بکرێتەوە، ئەگەرنا ئیشکالی تێدایە .

٤- واتایەکی دیکەی: (ظَنَّ الرُّسل أَنَّهُم كُذِبَ مَعَهُم مِنْ قِبَلِ قَوْمِهِم وَلَم يُؤْمِنْ بِهِم أَحَدٌ) بە پێی ئەمە (فاعل)ی (ظنوا) کە (و)کەیە، مەبەست پێی پێغەمبەرانە، واتە: پێغەمبەران پێیان وابوو: درۆیان لەگەڵ کراوە لەلایەن ئەو کەسانەوە کە گوتوویانە: بڕوامان پێهێناون، بەڵام بڕوایان نەهێناوە .

ئنجا ئەگەر (فاعل)ی (ظنوا) کە (و)کەیە، بچێتەوە بۆ پێغەمبەران‌و، مەبەست پێی ئەوەبێ کە: خوا بەڵێنی لەگەڵ ڕاست نەبردوونە سەر، ئەوە وەك دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: پەنا بە خوا، کە پێغەمبەران گومانی وا بە پەروەردگاریان ببەن .

بەڵام هەندێك لە زانایان بە جۆرێك ئاراستەیان کردوە، بۆ وێنە: (القرطبي) لە تەفسیرەکەی دا[1] دەڵێ : (قَالَ الْقُشَيريُّ أَبو نَصْر: وَلاَ يَبْعُدُ إِنْ صَحَّتِ الرِّوَايَة، أَنَّ المُرَادَ: خَطَر بقُلُوبِ الرُّسُل هَذَا مِنْ غَيْرِ أَنْ يَتَحققُوهُ فِي نُفُوسِهِم، وَفِي الخَبَر: (إِنَّ اللهَ تَعَالَى تَجاوَزَ لِأُمَّتِي ما حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَها ما لَمْ تَكَلَّمْ بِهِ أَوْ تَعْمَلْ بِهِ)[2] .

واتە: قوشەیریی کوڕی نەصر، دەڵێ: ئەگەر ئەو ڕیوایەتە ڕاست بێ (لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ)، مەبەست

١) الجامع لأحكام القران ج ٩، ص ٢٢٤ و ٢٢٥.

٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٩٦٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٢٧)، وَأَبُو دَاوُدَ رقم: (٢٢٠٩)، وَالترمِذِيُّ برقم: (١١٨٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٤٣٣)، وابن ماجه برقم: (٢٠٤٠).

ئەوەیە کە تەنیا خەتەرەو خەیاڵێکی خراپ بە دڵی پێغەمبەراندا هاتووە، نەك لەلای خۆیانەوە لێی دڵنیابنو دڵی خۆیانی لەسەر بچەسپێنن، بەس خەیاڵو خوتخوتەکەیەکی شەیتانیی بووە بەسەر دڵیاندا هاتووە: {تۆ بڵێی خوا ﷻ ئەو بەڵێنەی پێیداوین، ڕاست دەربچێ؟!} لە فەرمایشتی پێغەمبەریش دا هاتووە، فەرموویەتی: بێگومان خوا چاوپۆشیی لە ئۆممەتی من کردوە، لەوەی کە بە دڵیان دا دێ (لە خەتەرەی خراپ)، مادام بە قسە دەری نەبڕنو کاری پێ نەکەن .

(القرطبي) لە تەفسیرەکەی دا[1] دەڵێ: (الحكيم الترمذي) دەربارەی ئەم ڕستە قورئانییە گوتوویەتی: (وَجْهُهُ عِنْدَنا: أَنَّ الرُّسلَ كانَت تَخافُ بَعْدَ ما وَعَدَ اللهُ النَّصْرَ لا مِنْ تُهْمة لِوَعْدِ الله، وَلَكِنْ لِتُهْمةِ النفُوسِ، أَنْ تَكونَ قَدْ أَحْدَثَتْ حَدَثاً، يَنْقضُ ذَلِكَ الشَّرْطَ وَالعَهْدَ الَّذِي عُهِدَ إِلَيْهِم، فَكانَتِ إِذَا طالَت عَلَيْهِم المدّة ، دَخَلَهُم الإِياس والظنُون مِنْ هَذَا الوَجْه).

واتە: ڕووی ڕاستی تەفسیرکردنی ئەم ڕستە قورئانییە لەلای ئێمە ئەوەیە: کە پێغەمبەران دوای ئەوەی خوا هەواڵی سەرکەوتنی پێداون، مەترسییان هەبووە، بەڵێنەکە نەیەتەدی، بەڵام لەو ڕووەوەنا کە تۆمەت بخەنە پاڵ بەڵێنی خوا، کە ڕاست دەرناچێ، بەڵکو نەفسی خۆیانیان تۆمەتبار کردوە، کە لەلای ئەوانەوە شتێك بووبێ، بوو بێتە هۆی ئەوەی ئەو مەرجو پەیمانەی پەروەردگاریان پێی داون، ئەوان هەڵیان وەشاندبێتەوەو کارێکیان کردبێ کە خوای کارزان لەبەر ئەو کەمو کورییانەیان بەڵێنەکەیان لەگەڵ نەباتە سەر (لەبەر سووچی خۆیانو لەبەر جێبەجێ نەکردنی مەرجەکەیان)، ئنجا کە ماوە کە زۆری پێچووە، لەو ڕووەوە نائومێدیی هاتۆتە دڵو دەروونیانەوەو، گومانی خراپیان بە خۆیان بردوە، نەك گومانی خراپ بە خوا ببەن .

٥- بەڵام ئەگەر وشەکە بە: (كُذِبُوا) بخوێنرێتەوە، کە هەندێك لە خوێنەرەوانی قورئان وایان خوێندۆتەوە، ئەو کاتە ماناکەی ئاوای لێ دێ:

---

١) الجامع لأحكام القران ج ٩، ص ٢٢٤ و ٢٢٥.

هەتا کاتێك کە پێغەمبەران نائومێد بوون لە بڕواهێنانی گەلەکانیان، یاخود نائومێد بوون لەوەی خوای دادگەر ئەو گەلانە سزا بدات، {لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوا بەڕوونیی نەیفەرمووە: سزایان دەدەم، ئیدی ئەو پێغەمبەرەش ڕەنگە پێی وا بووبێ: ئەو گیان دەسپێریّو خوا ئەو گەلە هەر سزا نادات، سزایەکە دوا دەخات}، لەو کاتەدا گەلە کافرەکان پێیان وا بوو، یاخود: دڵنیا بوون[1]، {چونکە دەگونجێ ئینسانی کافر دڵی خۆی یەکلا بکاتەوە لەسەر بۆچوونێکی ناڕاست}، کە پێغەمبەران درۆیان لەگەڵدا کردوون، لەوەدا کە هەواڵیان پێداون .

کەواتە: (فاعل)ی (ظنوا) کە (و)کەیە، مەبەست پێی گەلە کافرەکانن .

٦- دەشگونجێ (ظَنَّ) لێرەدا بە مانای (یقین)بێو، (فاعل)ی (ظنوا)ش، مەبەست پێی پێغەمبەران بێ، یانی: پێغەمبەران دڵنیا بوون کە گەلەکانیان درۆیان کردوەو کوفریان بە خوا کردوە، کە گوتوویانە: خوا پێغەمبەری نەناردوە، یان کە گوتوویانە: خوا هاوبەشی هەیە، کە ئەوەش درۆ کردنە بە ناوی خواوە .

٧- دیسان ئەگەر بە (کَذَبوا) بخوێنرێتەوە، دەگونجێ مانایەکەی ئاوا بێ: (ظَنَّ الرُّسُلُ أَنَّ أَتْباعَهُمْ قَدْ كَذَبوا بدعَوَاهُم الإِيْمان)، واتە: هەتا کاتێك پێغەمبەران نائومێد بوون لە ئیمان هێنانی گەلە کافرەکانیانو، پێشیان وابوو کە شوێنکەوتووەکانیشیان ڕاستیان نەکردوە، لەوەدا کە گوتوویانە: ئیمانمان پێهێناوە، لەبەرئەوەی زۆری پێچووەو تەماشایان کردوە: ئەو خەڵکەش کەوتۆتە نارەحەتییو سەغڵەتییەکی زۆرەوە، بۆیە پێیان وابووە: ئەوانیش هەڵگەڕاونەوەو، درۆیان لەگەڵ کردوون، لە ئیمان هێنانیان دا .

٨- ئەگەر بە (كُذِّبوا)ش بخوێندرێتەوە، دەبێ وشەی (ظنوا) بە (آستیقنوا، علموا) مانا بکرێ، یانی: پێغەمبەران نائومێد بوون لە بڕواهێنانی گەلەکانیانو، دڵنیابوون لەوەی لەلایەن ئەو گەلە کافرانەوە، بە درۆ دانراون .

---

١) چونکە: (ظن) بە مانای گومانیش دێو، بە مانای دڵنیایی (یقین)یش دێو، بە پێی شوێنو سیاق، ئەوە دەزانرێو، جاری واشە هەردووك مانایەکە گونجاون .

٩- هەروەها ئەگەر بە (كذّبوا)ش بخوێندرێتەوە، مانایەكەی لەوەی پێشوو نیزیكە، یانی: پێغەمبەران لە گەلەكانیان بێ هیوا بوونو دڵنیاو مسۆگەر بوون: كە گەلەكانیان پێیان بێبڕوابوونو بە درۆیان دانان .

هەر چۆن بۆ ئەو ئایەتە زۆر شێوەی ئایەتی (١١٢)ی سووڕەتی (البقرة) دەكات، كە دەفەرموێ : ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾ ﴾.

واتە: یان ئایا پێتان وایە بچنە بەهەشت، هەرچەندە جارێ ئەوەتان بەسەر نەهاتووە كە بەسەر ئەوانی پێش ئێوە هاتووە: هەژاریی و نەداریی و ناخۆشییان بەسەر هاتو ڕاچڵەكێنران، هەتا پێغەمبەرەكەو ئەوانەی كە لەگەڵی دا بوون، گوتیان: كەی یارمەتی خوا دێ؟ ئاگاداربن! یارمەتی خوا نیزیكە .

كە لەوێشدا هەرچەندە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) دڵو دەروونیان پڕ بووە لە ئیمانو یەقین، بەڵام ئەوەندە بێزارو ناڕەحەت بوون، هەرچەندە زانیویانە یارمەتی خوا، هەر دێ، بەڵام ویستوویانە كاتەكەی بزانن، ئەم ئایەتەی سووڕەتی (یوسف) لەگەڵ ئەو ئایەتەی (البقرة) زۆر دەشوبهێنە یەكدیو، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات كە تەنانەت پێغەمبەرانی خواش (عليهم السلام)، لە ئەنجامی تاقیكرانەوەی سەختو ناڕەحەتیی و گرفتاریی زۆردا، جاری وا بووە شەیتان خوتوخوتەیەكی خستۆتە دڵیانەوەو، تووشی جۆرێك لە ڕەشبینیی بوون .

هەڵبەتە حیكمەتی خستنەڕووی ئەو ڕاستییەش، بریتییە لە هاندانی پێغەمبەری خاتەمو شوێنكەوتووانی، كە پشوو درێژبنو، خۆڕاگربنو، دڵنیاش بن كە سەرەنجام یارمەتی خوا هەر دێ، ئەوەتا پێغەمبەرانو شوێنكەوتووانیان بەو شێوە سەختە تاقیكراونەوە، بەڵام سەرەنجامەكەشیان دیارە چۆن بووە !

ئنجا بێگومان حیكمەتی ئەو سوننەتو یاسایەی خوای پەروەردگاریش بریتییە لە مەشق پێكردنو ڕاهێنانی بڕواداران‌و، شارەزا بوون‌و دامەزرانیان، چونكە ئەوانەی كە لە نارەحەتییاندا پێدەگەن‌و سەختییان دەبڕن، بێگومان دامەزراوترو قایم‌و قۆڵتر دەبن .

**مەسەلەی نۆیەم‌و كۆتایی :** لە بەسەرهاتی پێغەمبەراندا دەرس‌و پەند بۆ خاوەن عەقڵان هەیە، قورئان هەڵبەستراو نییە، بەڵكو بە ڕاست دانانی كتێبەكانی پێش خۆیەتی‌و، ڕوونكردنەوەی هەموو شتێكە، كە ژیانی مرۆڤ پێویستی پێی هەیەو، ڕێنمایی‌و بەزەییە بۆ بڕواداران:

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ ﴾.

**شیكردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەكە لە پێنج بڕگەدا**

١) - ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي الْأَلْبَابِ ﴾، دیارە (ل)ی سەر (لقد) بۆ سوێند پێ خواردنەو (قد)یش، بۆ ساغكردنەوە (تحقیق)یە، واتە: بێگومان بە دڵنیایی لە بەسەرهاتی ئەواندا، ( كە بێگومان مەبەست پێی پێغەمبەرانە)، پەند هەیە، بۆ خاوەن عەقڵان .

(أولوا) یان (أولي) یانی: (أصحاب)، خاوەنان، هاوەڵان، (ألباب)یش كۆی (لُبّ)ە، (كاكڵ)، یانی: عەقڵ، كەواتە: (لِّأُوْلِي الْأَلْبَابِ ) واتە: بۆ خاوەن عەقڵان، یانی: ئەوەی عەقڵی خۆی بەكارنەهێنێ، تێنەفكرێ، بێگومان ئەگەر دەیان بەسەرهات‌و ڕووداو ببیستێ‌و بۆی باس بكرێن، هیچ پەندێكیان لێوەرناگرێ .

ئنجا بۆ مانای (عبرة) بە کوردیی دەڵێین: دەرس، پەند، بۆچی ئەم ناوەی لێنراوە؟ (العِبْرَةُ: اسْمَ مَصْدَرٍ للإعْتِبارِ، وَهُوَ التوصُّل بمَعْرِفةِ المُشاهَدِ المَعْلوم إلى مَعْرِفة الغَائِبِ، وَهُنا أطلق المصدرُ على المفعُولِ أي: المُعْتَبَرُ بِهِ)، واتە: (عبرة) ناوی چاوگە بۆ پەند وەرگرتن، کە بریتییە لەوەی بەهۆی شتێکی زانراوو ناسراوەوە، بگەی بە ناسینو زانینی شتێکی نەناسراوو نەبینراو، کە لێرەدا (عبرة) هەرچەندە چاوگە، بەڵام بە مانای (مفعول) بەکارهێنراوە .

٢) - ﴿ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ ﴾، ئەم کتێبە قسەیەکی هەڵبەستراو نییە، یاخود ئەو بەسەرهاتەی کە لەم سوورەتەدا هاتوە، وەك هەموو بەسەرهاتەکانی دیکەی قورئان، قسەی هەڵبەستراو نییە .

بەڵکو فەرمایشتەکانی خوا پڕ بە پێستی واقیعن، واتە: بەسەرهاتو چیرۆکێك نییە کە دانرابێ، خەیاڵ دروستی کردبێ، چونکە مەرج نییە، پەند لە بەسەرهاتێك وەربگیرێ، کە خەیاڵ دروستی کردبێ، بەڵام ئەگەر شتێك ڕوویدابێ لەسەر ئەرزی واقیع، دەگونجێ وێنەی ئەوە دووبارە بێتەوەو، دەگونجێ ئاکامی ئەو ڕووداوە واقیعییە چۆن بووە؟ کاتێك وێنەی ئەوە دووبارە دەبێتەوە، هەمان ئاکامی هەبێ، بەڵام ئەگەر شتێك هەڵببەستریو دروست بکرێو، زادەی وەهمو خەیاڵ بێ، ڕەنگە هەر ڕوو نەدات، چونکە لە ئەسڵدا هەر ڕووی نەداوە .

٣) - ﴿ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، بەڵکو ئەم کتێبە بەڕاست دانانی ئەوەی پێش خۆیەتی، واتە: ئەو کتێبانەی پێش خۆی هاتوون، قورئان هەموویان بە ڕاست دەزانێ، وەك ئەسڵەکەیان، دەفەرموێ: خوا هەموو ئەو کتێبانەی ناردوون، بەڵام ئایا چەندیان وەك خۆیان ماونو، چەند لادراونو، چەندیان لە بیر کراوە؟ ئەمە بابەتێکی دیکەیە، بەڵام وەك ئەسڵەکەیان، ئەوە دیارە خوا لە قورئاندا باسی کردوە، کە :

١) (صحف) بۆ ئیبراهیم هاتوە .

٢) هەروەها (صحف)و (توراة) بۆ مووسا هاتوون .

٣) (إِنجیل) بۆ عیسا هاتوە .

٤) داوودیش (زبور)ی بۆ هاتوە .

ناوی ئەو کتێبانە هاتوەو، خوا هەواڵی داوە کە کتێبو بەرنامەی بۆ سەرجەم پێغەمبەران ناردوون، جا چ ناوی کتێبەکانیان هاتبێ، یان نەهاتبێ، کە تەنیا ناوی کتێبەکانی: ئیبراهیمو داوودو مووساو عیسا ، علیهم السلام، هاتوە، لە قورئانێکدا کە بۆ موحەممەد ﷺ .

٤) - ﴿وَتَفۡصِيلَ كُلِّ شَيۡءٖ﴾، هەروەها ئەم قورئانە، ڕوونکردنەوەی هەموو شتێکە، یانی هەموو شتێك کە ڕێی ڕاست دیتنەوەی مرۆڤ پەکی لەسەری کەوتوەو، لە مەودای عەقڵی ئینساندا نیە .

٥) - ﴿وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾، هەروەها ڕێنماییەو بەزەییە بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن، واتە: ڕێیان پێشان دەدات کە چۆن یاسایەکانی خوا (سنن الله) لە بوونەوەردا بدۆزنەوەو ڕەچاویان بکەن، هەروەها حوکمە شەرعییەکانی خوا، کە لە وەحیی خۆیدا بەیانیان دەکات، بیانزانن‌و ڕەچاویان بکەن‌و پێیانەوە پابەندبن‌و، سەرەنجام ئەوەش دەبێتە مایەی هیدایەت‌و ڕەحمەت‌و بەزەیی خوا، بۆیە دەفەرموێ: بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن، دیارە ئەوەی بڕوا نەهێنێ، نە هیدایەت وەردەگرێ، نە شایستەی بەزەیی خوای پەروەردگاریش دەبێ .

# پوختەی دەرس و پەندو حیکمەتەکانی کە لە بەسەرهاتی یوسف و یەعقووب و (علیهما السلام) کورەکانی یەعقووب وەردەگیرێن

بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتە بە پلەی یەکەم پشتم بە تەفسیری: (تیسیر الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان) بەستوە[1]، هەڵبەتە بە دەستکاریی کردن و کەم و زیادیی تێداکردنەوەو، بە دارشتنی خۆم، بەڵام ئەو تەنیا چل و شەش (٤٦) دانەی هێناون، منیش گەیاندوومن بە شەست (٦٠) دانە، کە هەندێکیانم نێواخن کردوە لەگەڵ قسەکانی وی داو، هەندێکیشیان لە دوایی دا دێنم :

<u>یەکەم :</u> یەکەمین دەرس و پەندێك کە لەم بەسەرهاتەی یوسف ﷺ وەردەگیرێ، ئەوەیە کە خوا ﷻ پێغەمبەرانی، وەك سەرمەشق و وەك مامۆستاو چاوساغی مرۆڤایەتیی ناردوون، بۆیە ئەگەر تەماشای سیرەو ژیانی کۆی پێغەمبەران (عليهم الصلاة السلام) بکەین، هەموو جۆرە سەرمەشقییەك، هەموو جۆرە مامۆستایی و چاوساغییەك، لە ژیانی پێغەمبەراندا دەبینرێ: وەك لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)، لە باسی پێغەمبەراندا (عليهم الصلاة السلام)، بە تەفصیل باسمان کردوە .

بابای نەخۆش، دەتوانێ پێغەمبەران بکاتە سەرمەشق بۆ خۆڕاگریی لەسەر نەخۆشییەکەی، بابای هەژار، بابای دەوڵەمەند، بابای دەستەڵاتدار،

---

[1] ١) للعلامة الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي، رحمه الله.

بابای کۆچکەرو غەریب وڵات، بابای زیندانیی، مرۆڤی ئازاد، ئەوەی کە هاوسەرداره، ئەوەی کە بێ هاوسەره، ئەوەی کە ماڵو منداڵی هەیە، هەموو ئەو حاڵەتانەی کە بەسەر مرۆڤ دادێن، خوای پەروەردگار وایکردوە کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) سەرمەشقییانو مامۆستایەتییو چاوساغییان، بۆ هەموو حاڵەتەکانی کە بەسەر مرۆڤدا دێن، هەبێ .

دووەم: ئەو بەسەرهاتەی یوسوف دا ﷺ کە خوای پەروەردگار، پێشێ دەفەرموێ:

﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ ﴾، کەواتە: بێگومان بەسەرهاتی یوسوف لە چاکترین بەسەرهاتەکانە، چونکە لە میحنەتەوە بۆ نیعمەت، لە زەبوونییەوە بۆ باڵادەستیی، لە کۆیلایەتییەوە بۆ حوکمڕانیی، ئنجا لە غەریبیو لێکدوورکەوتنەوەوە، بۆ پێك شادبوونەوە، لە دڵتەنگییەوە، بۆ دڵخۆشیی، پاشان لە هەرزانییەوە، بۆ گرانیی، دوایی لە گرانییەوە، جارێکی دیکە بۆ هەرزانییو، لە سەغڵەتییەوە، بۆ فراوانیی، ئنجا لە سپڵەییەوە، بۆ دان بە چاکەی یەکدی دا هێنان، ئەوانە هەموویان هەن، گەلێك شتی دیکەش لە بەسەرهاتی یوسوف دا هەیە، بۆیە کە خوا دەفەرموێ : ﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ ﴾، ئەو پێناسەیە پڕ بە پێستی بەسەرهاتی (یوسف)ە.

سێیەم: لەم بەسەرهاتەدا، بنچینەکانی خەون لێکدانەوە هەن، چونکە کە یوسوف ﷺ خەون دەبینێ بە خۆرو مانگو یازدە (١١) ئەستێرەوە، کە دیارە خۆر لە شوێنی دایکی دەبێو، مانگ لە شوێنی بابیو، یازدە (١١) ئەستێرەکانیش، لە شوێنی برایەکانی دەبن .

پاشان دوو هاوەڵە زیندانییەکەی کە خەون دەبینن، یەکێکیان بەوەوە: کە ترێ دەگوشێو شەراب دروست دەکات، ئەوی دیکەیان: کە خواردن لەسەر سەری دادەنێو باڵندە لێی دەخوات .

ئنجا پادشا خەون دەبینێ، بە حەوت (٧) ڕەشەوڵاخی قەڵەوەوە، کە حەوت (٧)ی لەڕ دەیانخۆنو، حەوت گوڵەگەنمی سەوز، کە حەوت گوڵەگەنمی وشك دەیانخۆن .

کە زانایان گوتوویانە: بە سەرنجدانی ئەو چوار خەونە کە لەم سوورەتەدا هاتوون، دەگونجێ بنچینەکانی خەون لێکدانەوە، زۆریان دەربهێنرێن .

چوارەم: بەسەرهاتی یوسوف ، ئەو بەسەرهاتە درێژە، بەو وردەکارییە، کە ئێمە ماناامان کردوەو، توێژەرەوانی قورئان زۆر قسەیان لەسەر کردوە، بەڵگەیەکی روونو بێ چەندو چوونە، لەسەر پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ، چونکە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارو نەشارەزا بە کتێبە ئاسمانییە پێشووەکان وەك خوا دەفەرموێ : ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُواْ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾العنكبوت، واتە: تۆ لە پێش قورئاندا، هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوەو، بە دەستی راستیش هیچت نەنووسیوە، کە ئەگەر وابووایەی ئەوانەی کە لەسەر ناهەقن، دەکەوتنە گومانو دوو دڵییەوە .

بەڵێ لە راستییدا هەر ئەم بەسەرهاتە بۆخۆی، بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتیی (محمد) ﷺ، چونکە ئەو بەسەرهاتە، رێکیش لەگەڵ ئەوەی کە لە کتێبە پێشووەکاندا هاتوە، پڕ بە پێستو گونجاوو پێکەڵ پێك (مطابق)ە، بگرە هەندێك هەڵە لەواندا هەن، ئەو بەسەرهاتەی کە لە قورئاندا هاتوە، ئەم هەڵانەش راست دەکاتەوە .

پێنجەم: ئینسان هەر کاتێ بزانێ : شتێك، گوتنیو دەرخستنی زیانی هەیە، دەبێ بیشارێتەوە، ئەوەتا یەعقووب  کە ئامۆژگاریی کورەکەی دەکات : ﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُءْيَاكَ عَلَىٰٓ إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيْدًا ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لِلْإِنسَٰنِ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٥﴾ ﴾، واتە: ئەی رۆڵە گیان! خەونەکەت بۆ برایەکانت مەگێڕەوە، نەوەك دوایی پیلانێکت لە دژ بگێڕن، کەواتە: ئینسان هەر شتێك مەزەنەی ئەوەی لێبکات، کە تووشی زیان دەبێ، بەهۆی باس کردنیەوە، وا باشترە بیشارێتەوەو پەنهانی بکات، وەك گوتراوە: (كُلُّ ذِي نِعْمَة مَحسودٌ)، هەموو خاوەن نیعمەتێك حەسوودیی پێ دەبردرێ، کەواتە: بە پێی توانا

ئینسان ئەو شتانەی کە پێی وایەو مەزەنەنەی ئەوەن، خەڵك بورووژێنن‌و ناڕەحەت بکەن‌و حەسادەتیان بجووڵێ، وا باشە پەنهانیان بکات .

شەشەم: دەگونجێ ئینسان باسی خراپەی خەڵك بکات، لە ڕووی دڵسۆزییەوە، بۆ ئەوەی کەسێك کە پێت وایە تووشی زیان دەبێ، بەهۆی خراپەی بەرانبەرەکەیەوە، پارێزراو بێ، یانی: بۆت هەیە وشەیەکی خراپ بۆ بەرانبەرەکەی بەکاربێنی، چونکە ئەوەتا یەعقووب دەڵێ: (فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيْدًا)، واتە: دوایی فێڵت لێ دەکەن، پیلانت لە دژ دەگێڕن، وشەی پیلان (کید)ی بۆ کوڕەکانی بەکارهێناوە، چونکە مەزەنەنەی ئەوەی کردوە حەسوودیی پێبەرن‌و، بکەونە پیلان گێڕیی لە دژی، بۆیە لە حاڵێکی وادا: دروستە وەك دڵسوزیی: وشەو تەعبیری نەگونجاوی وا بەکاربهێنرێ، کە ئەگەر کەسەکە بیبیستێتەوە، ئەو وشە تەعبیرەی پێناخۆش بێ، بەلام بە نیەتی دڵسۆزیی نواندن بۆ کەسێك، پێویستیی بە ئامۆژگاریی‌و ڕێنمایی هەبێ .

حەوتەم: چاکەی خوا لەسەر مرۆڤ ، دەبێتە چاکە بۆ سەر کەسوکاری‌و خزم‌و دەوروبەریشی، چونکە ئەوەتا یەعقووب ، بە یوسوفی کوڕی دەڵێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: خوا چاکەی خۆی لەسەر تۆ تەواو دەکات‌و، لەسەر بنەماڵەی (یعقوب)یش تەواوی دەکات .

هەر بە ڕاستیش وایە، جاری وا هەیە مرۆڤێك، ئنجا پیاو بێ یان ئافرەت، دەبێتە مایەی سەربەرزیی بۆ نەتەوەیەك، بۆ عەشیرەتێك، بۆ بنەماڵەیەك، هەڵبەتە پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە .

هەشتەم: وا باشە بابای گەنج، بابای تازە پێگەیشتوو، هانبدرێ‌و دڵخۆش بکرێ‌و، ئایندەی ڕۆشنی بخرێتە بەرچاو، ئەوەتا لێرەدا یەعقووب بە (یوسف)ی کوڕی دەڵێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ

﴿وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعْقُوبَ ...﴿٦﴾﴾، ئا بەم شێوەیە پەروەردگار تۆ هەڵدەبژێرێ‌و، لە مانای خەونانت فێر دەکات‌و، چاکەی خۆی لەسەر تۆو بنەماڵەی یەعقووب تەواو دەکات.

هەڵبەتە هاندانی هەموو کەسێك هەر پێویستە، قسەی خۆش بۆ هەموو کەس هەر باشە، بەڵام بۆ بابای گەنجی تازە پێگەیشتوو، کە لە سەرەتای تەمنیەوەیەتی، ئەگەر بەرچاوی ڕۆشن بکرێ‌و گەشبینیی پێشان بدرێ، ڕێگای ڕۆشنی بخرێتە بەرچاو، بێگومان باشترە .

نۆیەم: پێویستە مرۆڤ لە هەڵسوکەوت لەگەڵ ماڵ‌و خێزانیدا، وریای دادگەریی بێ، وریای بێ فەرق‌و جیایی بێ، ئنجا زۆر لە تەفسیرەکان، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێداوە، پێیان وابووە کە یەعقووب جیاوازیی بە کوڕەکانی کردوە، بۆیە کوڕەکانی حەسادەتیان بەرانبەر بە یوسف‌و بنیامینی برایان، جووڵاوە، بەڵام من ئەوە بە ناڕاست دەزانم‌و، پێم وایە ئەوە بەو شێوەیە نیە، چونکە یەعقووب ﷺ وەك هەموو پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوا، لە لووتکەی ڕەوشت بەرزیی دا بووە، ئنجا تەنانەت مسوڵمانێکی باش لە خۆی ناوەشێنێتەوە جیاوازیی بە منداڵەکانی بکات، با لە دوو دایك، یان چەند دایکێك بن، ئەدی چۆن پێغەمبەرێکی پایە بەرز، شتی وا دەکات؟! بەڵام من دەڵێم: دەبێ مرۆڤ خۆی بپارێزێ لەوەی گومانی خراپ لەلای منداڵەکانی پەیدا بکات، وەك گوتراوە: (إتَّقُوا مواضِعَ التُّهَم)، خۆتان لە شوێنی تۆمەت بپارێزن .

با باب لە ئەسڵدا دادگەریش بێ، بەڵام دەبێ خۆی بپارێزێ، لەوەی بەرانبەرەکەی تووشی گومانی خراپ بێ.

دەیەم: گوناح کردن هەمیشە شوومەو، سەرەنجامی زۆر خراپی هەیە، تەماشا دەکەین، برایەکانی یوسف، بە بیانووی ئەوەی کە بابیان ڕووی بکاتە وان‌و گرنگییان پێ بدات، بیر لەچی دەکەنەوە؟ لەوە کە یوسف بکوژن، دوایی دێنە سەر ئەوە کە نەخێر، وا باشە دووری بخەینەوەو بیخەینە بیابانێك، یان بیخەینە چاڵێك، ئنجا دوایی ناچار دەبن کە سیناریۆیەکی درۆ دروست

بکەن، دواییش ئەو هەموو ماوە زۆرە درۆ لەگەڵ بابیان بکەن‌و، ئەو هەموو خەفەتە بخەنە دڵی دایك‌و بابیان، ئنجا ئەو هەموو ناڕەحەتییە بەسەر یوسوف ﷺ بێنن، کەواتە: وەك گوتراوە: گوناح هەندێکیان هەندێکیان پەلکێش دەکەن، بۆیە پێویستە ئینسان لە گوناهان وریابێ، چونکە کە گوناهێکت کرد، ئەو گوناهە ناچارت دەکات یەکێکی دیکەش بکەی‌و، ئەوی دیکەش پەلکێشت دەکات بۆ یەکێکی دیکە... تا کۆتایی .

پازدەیەم: گرنگ کۆتایی‌و سەرەنجامە، ئەوەتا کوڕەکانی یەعقووب لە سەرەتاوە، زۆر ڕەفتارو مامەڵەی خراپیان لەگەڵ دایك‌و بابیانداو لەگەڵ یوسوف‌و بنیامینی برایاندا، کردوە، بەڵام لە کۆتاییدا هەڵەو کەم‌و کورییەکان قەرەبوو دەکەنەوەو، دان بە چاکەی یوسوف دادێنن‌و، داوای لێبوردن لە بابیان دەکەن‌و، بە بابیان دەڵێن: داوای لێبوردنمان بۆ لە خوا بکەو، دان بە هەڵەو کەم‌و کوڕیی خۆیان دادێنن .

کەواتە: دەبێ ئینسان بۆ هیچ کەسێك لەسەر هەڵوێستێکی حوکم نەداو، بڕیاری یەکجارەکی نەدا، تاکو تەماشای کۆی هەڵوێستەکانی دەکات، (العِبْرَةُ بالخاتِمة) گرنگ سەرەنجامە .

دوازدەیەم: خوا ﷻ یوسوفی بەهرەمەند کردبوو لە زۆر ڕەوشتی بەرزو جوان‌و لە زۆر ئاکاری پەسند، کە دیارە مەعدەنەکەی مەعدەنێکی باش بووە، خواش ﷻ کە دەفەرموێ : ﴿... اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ ...﴾ ﴿١٢٤﴾ الأنعام، واتە: خوا زاناترە بەوە کە پەیامی خۆی لە کوێ دادەنێ .

دیارە هەموو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) خوای پەروەردگار وای لێکردوون، کە لە هەموو ڕەوشتێکی بەرزو جوان، لە هەموو ئاکارێکی پەسنددا، لە لووتکە دابن، بۆیە خوا ﷻ ئەرکی پێغەمبەرایەتیی‌و گەیاندنی پەیامی خۆی پێ سپاردوون .

سێزدەیەم: هەندێك جۆری خراپە لە هەندێکی ئەهوەنترو کەمترە، ئنجا ئینسان ئەگەر هەر ناچاربێ‌و، لە نێوان دوو خراپەدا گرفتار بوو بێ، دەبێ

بزانێ کامیان ئەهوەنترە ئەویان بکات، ئەوەتا برایەکانی یوسوف ﷷ دوای ئەوەی بڕیار دەدەن و دەڵێن : ﴿ ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا ﴾ (٩)، واتە: یوسوف یان ڕاستەوخۆ بکوژن، یاخود فڕێی بدەنە بیابانێکەوە، بۆ ئەوەی لە وێ لەبەین بچێ، برا گەورەکەیان ئامۆژگارییان دەکات، دەڵێ: ﴿ لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ ﴾ (١٠)، واتە: یوسوف مەکوژن و فڕێی بدەنە تاریکایی و بنی بیرێکەوە، واتە: ئەگەر ئامانجتان هەر ئەوەیە لە بابتان دووربکەوێتەوە، بەوە دووردەکەوێتەوەو، پێویست ناکات ڕاستەوخۆ بیکوژن، یاخود ناڕاستەوخۆ بیکوژن، دووری بخەنەوەو بیخەنە بیرێکەوە، دواییش کاروانێك هەڵی دەگرێتەوەو لە کۆڵتان دەبێتەوە.

چواردەیەم : هەر شتێك کەوتە نێو دەستان، با لە ئەسڵدا بە شێوەیەکی ناڕەواش بووبێ، بەڵام دوایی کە دەکەوێتە سەر کڕین و فرۆشتن و، دەستاو دەست دەکات، دروستە بکڕدرێ و بفرۆشرێ، مادام دیار نەبێ کە ئەوە ماڵی دزراوە، یان بە زوڵم پەیداکراوەو، خراوەتە نێو ماڵی بازرگانیی، مادام لە بابای کڕیار دیار نەبێ، دروستە مامەڵەی پێبکات، چونکە ئەوەتا خوای زاناو شارەزا وشەی فرۆشتیان (شَرَوْهُ)ی بۆ یوسف (علیه السلام) بەکارهێناوە : ﴿ وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۭ بَخۡسٖ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ ... ﴾ (٢٠)، واتە: بە چەند درەمێکی کەم، فرۆشتیان و تێشیدا نائارەزوومەند بوون، خوا خوایان بوو لە کۆڵیان ببێتەوە .

یازدەیەم : مرۆڤ (پیاو بێ یان ئافرەت) دەبێ زۆر خۆی بپارێزێ، لەوەی لەگەڵ ڕەگەزی بەرانبەردا بە تەنیا لە شوێنێکی چۆڵ پێکەوە بن، ئەوەتا ژنەکەی عەزیزی میسر، لەبەر ئەوەی لە ماڵەوە بە تەنیا بووە، لەگەڵ (یوسف)دا، تەماعی تێکردوە، ئنجا دیارە ئەمە، هەم بۆ پیاو ڕاستەو هەم بۆ ئافرەتیش ڕاستە، هەرچەندە لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ دا، دەفەرموێ : {لا يَخْلُوَنَّ أَحَدُكُمْ بِامْرَأَةٍ}، {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (١١٤)، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين}.

واتە: هیچ کام لە ئێوە با بە تەنیا لە شوێنێك لەگەڵ ئافرەتێك دا نەبێ .

بەڵام بێگومان بۆ ئافرەتیش هەروایە، ئەوەتا لێرەدا ئافرەتەکە تەماعی لە پیاوەکە کردوە، کە یوسوف ﷺ، بەڵام بەهۆی پاکیی و چاکیی یوسوف و، بەهۆی ڕەوشت بەرزییەوە، ئەو تەماعەی ئەو ئافرەتەی عەزیزی میسڕ، سەری نەگرتوە .

شازدەیەم: دیارە ئەم زانایە (عبدالرحمن بن ناصر السعدي)، دەڵێ: ئەو خولیاو خەیاڵەی (زینا) بە دڵی یوسوف داهات، بەڵام لەبەر خوا ﷻ وازی لێهێنا، بووە هۆی ئەوەی خوا ﷻ ڕێزی لێ بنێ، بەڵام من لە تەفسیرکردنی ئەو ڕستە قورئانییەدا: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا ﴿٢٤﴾ ﴾، ڕوونم کردۆتەوە، کە لە ڕاستییدا نیازی ئافرەتەکە، دیارە کە نیازو مەبەستی بووە: یوسوف پەلکێش بکات بۆ داوێن پیسیی، بەڵام نیاز (هَمّ)ی یوسوف ئەوە بوو، کە ئەو ئافرەتە لە خۆی دووربخاتەوە، لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، لە شوێنی خۆی ڕوونم کردۆتەوە، بەڵام بە هەر حاڵ ئەگەر بەو واتەیەش بێ، کە هەروا خولیایەکی زوو تێپەڕ بووە، خەیاڵێك بەسەر دڵی یوسوف ﷺدا تێپەڕ بووە، بەڵام لەبەر خوا ﷻ نەیکردۆتە عەزمێك کە لە دڵی خۆیدا بیچەسپێنێ، کە ئەوەش وەك گوتم: بۆچوونی هەندێك لە توێژەرانە، ئەوەش تۆزێك گونجاوەو ڕێی دەچێتێ، بەڵام نەك ئەو حیکایەتەی کە گوایە: یوسوف دۆخینی کردۆتەوەو بۆی دانیشتوە، بەڵام بابی بینیوەو پەنجەی خۆی گەزیوە، ئەو حیکایەتو قسانە، هیچیان نەك هەر لەگەڵ پایەو مەقامی بەرزی یوسوف ﷺ، بەڵکو هی مسوڵمانێکی باشیشدا ناگونجێن، کە بەو شێوەیە مامەڵە بکات .

حەڤدەیەم: هەر کەسێك ئیمان بە ڕاستی بچێتە دڵو دەروونیەوەو، خۆی بۆ خوا ساغ بکاتەوە، یان خوای میهرەبان بەهۆی ئیمانەکەیەوە، ساغی بکاتەوە، {چونکە وشەی : ﴿ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾، ئەم ڕستەیە، هەم خوێنراوەتەوە: (مُخلَصِينَ)، هەمیش خوێنراوەتەوە: (مُخلِصِينَ)، (مُخلَصِينَ) واتە: هەڵبژاردەکان، هەڵبژێردراوان، بەڵام: (مُخلِصِينَ)، واتە: خۆساغکەرەوان} ئنجا ئینسان گەر ئیمانێکی باشی هەبێ، هەم ئەو ئیمانە باشە وای لێ دەکات:

کردەوەکانی ساغ بکاتەوە بۆ خوا، هەم ئەوەش وای لێ دەکات کە خوای پەروەردگار بۆ خۆی هەڵیبژێریْو ساغی بکاتەوە .

ئنجا ئەگەر ئینسان، خۆساغکەرەوە بێ بۆ خواو، خوا ساغی کردبێتەوە، بێگومان لە خراپە دوور دەبێ، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: ئاوا بەم شێوەیە ویستمان خراپەو شتی ناقۆڵاو ناشیرینی لێ دووربخەینەوە، چونکە ئەو لە بەندە ساغەکانی، یان خۆ ساغکەرەوەکانی ئێمە بوو، یاخود لە بەندە هەڵبژێردراوەکانی ئێمە بوو .

هەژدەیەم: مرۆڤ هەر کاتێك لەگەڵ شوێن و کات و حاڵی گوناه کردندا ڕووبەڕوو بۆوەو، زانی ناتوانێ خۆی مەرزەم بکات، یاخود ناتوانێ، پاڵی پێوەبنێ و لە خۆی دووری بخاتەوە، وا باشە لە چنگی ڕا بکات، وەك چۆن یوسوف عليه السلام لە چنگی ئەو ئافرەتە ڕایکردوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱسْتَبَقَا ٱلْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٍ ﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: پێشبڕکێیان کرد بۆ دەروازەی دەرێ، (یوسوف بۆ ڕاکردن لە چنگیی و، ئافرەتەکەش بۆ گرتنی، وەك لە کاتی تەفسیرکردنەکەیدا باسمان کرد) و، ژنەکە کراسەکەی یوسوفی لە پشت ڕا دادڕیْو قڵیشاند .

نۆزدەیەم: نیشانەکان کاریان پێدەکرێ، لە کاتێکدا کە مشتومڕ پەیدا دەبێ، مادام بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا نەبێ، بە نیشانان (قرائن)یش کار دەکرێ، بە بەڵگەی ئەوە: لە کاتێکدا یوسوف و ژنەکەی عەزیز دەبێتە مشتومڕیان و ئافرەتەکە یوسوف تۆمەتبار دەکات، کە ویستوویەتی دەستدرێژیی بکاتە سەری و، (یوسف)یش ناچار دەبێ کە بەرگریی لە خۆی بکات و بڵێ: ئەو پڕکێشیی منی کردوە: شایەدێك شایەدیی دەدات و دەڵێ: تەماشا بکەن: ئەگەر کراسەکەی یوسوف لە پێشەوە دڕابێ، ئافرەتەکە ڕاست دەکات و یوسوف درۆ دەکات، بەڵام ئەگەر کراسەکەی لە دواوە دڕابێ، یوسوف ڕاست دەکات و ئافرەتەکە درۆ دەکات، دوایش دەبینرێ کراسەکەی لە دواوە دڕاوە .

هەروەها هەر لێرەدا دەگوترێ: كاتێك برایەكانی یوسوف، كراسەكەی یوسوف بۆ باییان دەبەنەوە، كە خوێنیان تێ هەڵسووە، باییان كە تەماشای كراسەكە دەكات، هیچ نەدڕاوە، دەڵێ: ئەو گورگە چەند بە ڕەحم بووە، نەیهێشتوە كراسەكەی یوسوف بدڕێ، ئەدی گۆشتەكەی چۆن خواردوە؟! بەڵام من ئەو قسەیەم نەهێنایەوە لە كاتی تەفسیركردنەكەشدا، چونكە من پێم وایە ئەو دە (١٠) برایە، عاقڵێكیان هەر تێدا هەبووە، كە كراسەكەش بدڕێنن! كەواتە: ئەوەی لە تەفسیرەكاندا هاتوە، لە ڕاستییدا هەر قسەیەكە، هەندێك لە حیكایەت خوانەكان ڕێكیان خستوە، ئەگەرنا پێم وایە، دە پیاو، دە كوڕ، كە كوڕانی یەعقووبن، ئەوەندە عەقڵەیان هەیە، كراسەكەش تۆزێك بدڕێننو، باییان ئەوە ئیشكالەی بۆ دروست نەبێو، ئەو شتەیان ئاوا بە چاودا نەداتەوە !

ئنجا لێرەدا زانایان دەڵێن: ئەگەر پیاوێكو ئافرەتێك بووە كێشەیان لە سەر كەلوپەلی نێو ماڵ، تەماشا دەكرێ: كامەی زیاتر پەیوەندیی بە پیاوەوە هەیە، دەدرێتە پیاوەكەو، كامەشی زیاتر پەیوەندیی بە ئافرەتانەوەیە، دەدرێتە ئافرەتەكە .

<u>بیستەم</u>: یوسوف ﷺ هەرچەندە بەسەرهات گێڕەوەكان (قصاصون)، زیاتر هەر باسی جوانیی ڕواڵەتیی یوسوف دەكەن: چاوو برۆی وابووە، قەدو قیافەی وابووە، حاڵی وابووە! بەڵام لە ڕاستیی دا جوانییە مەعنەوییەكەی یوسوف زۆر زیاتر بووە لە جوانییە ڕواڵەتییەكەی، وەك كاتی خۆی لە تەفسیری ئایەتەكان دا باسمان كرد، هەر بۆیەش ئافرەتەكان كە یوسوف دەبینن، دەڵێن: ﴿مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾﴾، واتە: ئەمە مرۆڤ نیە، ئەمە فریشتەیەكی بەڕێزە .

كەواتە: ژنەكان: بە جوانییە مەعنەوییەكەی، یوسوفو بە ڕەوشتو ئاكاری، بە نەزاكەتی، بە ویقاری، بە خۆڕاگرییەكەی، بە سامو هەیبەتی، پێش جوانیی جەستەو ڕواڵەتی، سەرسام بوون .

بیست‌و یەك : دەبینین کە: یوسوف عليه السلام زیندان‌و بەندیتخانە هەڵدەبژێری بەسەر گوناح کردندا، کەواتە: مرۆڤ دەبێ هەمیشە خۆی لە گوناح بپارێزێ، چونکە یوسوف ئەگەر ئەو داوێن پیسییەی بە پەنهانییش کردبایە، ڕەنگە ڕۆژێکیش هەر لێی ئاشکرا بووبایەو، تووشی بەندیخانەکە هەر ببووایە، بەڵام ئەوە لە کوێ! بچیە بەندیخانەوە، بەڵام بە تۆمەتباریی، ئەوەش لە کوێ، بچیە بەندیخانە، بەڵام بە تۆمەت بۆ هەڵبەستراویی‌و بە پاکیی، ئنجا سەرەنجام بە نیمچە پادشاو حوکمڕانێك لە زیندان بێیە دەرێ؟! بێگومان زۆر جیاوازە، بۆیە ئینسان دەبێ هەمیشە هەوڵبدات بەردەوام لە گوناح ڕا بکات، ئەگەر بە دیلی گوناح کردنەکەش بریتی بێ لە بەندیخانە، کە مەرج نیە هەمیشە ئینسان بخرێتە نێوان دوو بژاردەی، داوێن پیسیی‌و بەندیخانەوە!! بەڵکو جاری وایە تۆ دەبێ تەنازول بکەی، لە عەقیدەو ئایینت، یاخود بچیە بەندیخانەوە، یاخود تەنازول لە ئایینت بکەی یان دەستبەرداری: سامانت، ئەرك‌و کارت، مووچەت، ببی! بەڵام ئەگەر ئینسان هەر لای چاکە بگرێ، لای سەربەرزیی بگرێ، بێگومان بۆ دنیاو قیامەتی باشترە .

بیست‌و دووەم : مرۆڤ دەبێ هەمیشە پەنابەرێتە بەر خوا، لە کاتێکدا کە تووشی نارەحەتییەك دێ، تووشی داوا لێکرانێك دێ، کە جێگای خۆی نەبێ‌و، مایەی تووڕەیی خوا بێ، دەبێ پەنا بە خوا بگرێ، ئەوەتا: یوسوف عليه السلام کە لە خوا دەپاڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾، واتە: ئەگەر تۆ فێڵی وان، پیلانی وان لە من لانەدەی، (ئەگەر حەواڵەی خۆمم بکەی)، ڕەنگە سەرەنجام زەفەرم پێ بەرن‌و، بەلایاندا بشکێمەوەو سەرەنجام لە نەفامان بم .

بیست‌و سێیەم : یوسوف کە دەڵێ: ﴿ وَأَكُن مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾، ئنجا (جهل) دەگونجێ بەرانبەری (حِلم)، بێت واتە: عەقڵ‌و دانایی‌و، دەشگونجێ (جهل) بەرانبەری (عِلم)، بێت، واتە: زانیاریی‌و شارەزایی، (جاهِل)، واتە: نەزان، یان نەفام، ئەگەر نەفامیی بێ، بەرانبەرەکەی بریتیە لە عەقڵ‌و تێگەیشتن‌و، ئەگەر

نەزانیی بێ، بەرانبەرەکەی بریتیە لە زانایی‌و شارەزایی، ئەمە لێی وەردەگیرێ: کە هەم عەقڵ فامیدەیی‌و، هەم زانیاریی‌و شارەزایی، وا لە خاوەنەکەیان دەکەن، کە بەرەو خێر بچێ‌و، لە خراپە دەیگێڕنەوە .

بۆیە یوسوف ﷺ دەڵێ: خوایە! ئەگەر تۆ لە فریام نەیەی، سەرەنجام لە نەفام‌و نەزانان دەبم، کەواتە: ئینسان ئەگەر فامیدەبێ، عەقڵی باش کار بکات‌و، زاناو شارەزابێ، لە گوناح‌و خراپەو تاوان‌و لادان دەپارێزرێ .

<u>بیست‌و چوارەم:</u> مرۆڤ دەبێ لە هەموو حاڵاندا، هەر بەندەی خوا بێ‌و، ئاگای لە بەندایەتیی کردن بۆ خوا بێ، چ لە حاڵەتی فەرحانیی دابێ، چ لە حاڵەتی سەغڵەتیی دابێ، چ لە کاتێکدا کە ئازادەو، چ کاتێك بەندکراو (سجین)ە، ئەوەتا یوسوف ﷺ: لە بەندیخانەشدا، ئەوە نەبووە دەستەو ئەژنۆ دابنیشێ‌و، واز لە هەموو شتێك بێنێ‌و بڵێ: خوایە! من خرامە بیرو، دوایی تۆمەتم بۆ هەڵبەسترا، ئێستاش خرامە بەندینخانەوە!! بەڵکو لە پێشدا قۆڵی لێ هەڵدەماڵێ، دەست دەکات بە چاکەکاریی، بە بەڵگەی ئەوەش دەست دەکات بە چاکەکاریی، کە دوو هاوەڵە زیندانییەکەی پێی دەڵێن: ﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، واتە: بێگومان ئێمە تۆ لە چاکە کاران دەبینین، وا دیارە چاکەی زۆر کردوە لەگەڵ زیندانییەکاندا، لەگەڵ ئەوانەی کە لەگەڵی لە بەندیخانەدا بوون، تاکو چاکەکردن لە (یوسف)دا بۆتە سیفەتێکی ڕۆچوو، بۆیە ئەو هاوەڵانەی ئەو شایەدییەی بۆ دەدەن‌و دەڵێن: بێگومان ئێمە تۆ لە چاکەکاران دەبینین، کەواتە: یوسوف لە بەندیخانەشدا هەر سەرگەرمی چاکەکردن‌و چاکەکاریی بووە !

بێگومان کاتێك کە ئینسان دەکەوێتە بارودۆخێکی نائاساییەوە، بەڵام دەست لە طاعەت، دەست لە چاکە، دەست لە خێرخوازیی‌و جوامێریی هەڵناگرێ، ئەو چاکەو طاعەتەی کە لە سەغلەتیی‌و تەنگانەدا دەیکات، پاداشتی زۆر زیاترە، لەوەی کە لە بارودۆخی ئاساییدا دەیکات، بۆچی؟ چونکە لەوێدا زەحمەتی زیاتری دەکەوێتە سەرو، زیاتر ماندوو دەبێ‌و، بارودۆخەکەی بۆ نەگونجاوترە، وەك گوتراوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە

دایکمان عائیشەی فەرمووە: {إِنَّ لَكِ مِنَ الأَجْرِ عَلَى قَدْرِ نَصَبِكِ وَنَفَقَتِكِ}، {أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (١٧٣٣)، وقال : صحيح على شرط الشيخين. وأخرجه أيضاً: البخاري برقم: (١٦٩٥)}.

واتە: پاداشتت لە قەدەر ماندووبوونتەو لە قەدەر خەرجییتە، کەسێك زیاتر ماندووبێ‌و سەغڵەتبێ بە طاعەتێکەوە، پاداشتیشی زیاترە .

<u>بیست‌و پێنجەم :</u> ئینسان کاتێك کە پرسیاری لێدەکرێ، دەبێ بۆ وەڵامەکەی لە گرنگترەوە دەست پێ بکات‌و، بزانێ بۆ بابای پرسیارکەر، بابای داواکەر، چ شتێك پێویستترە، دەبێ لەوەوە دەست پێبکەی، ئەوەتا دوو هاوەڵە زیندانییەکەی یوسوف، کە لێی دەپرسن، دوو خەونەکانیان بۆ تەعبیر بکات، یوسوف ﷺ پێش ئەوەی خەونەکانیان بۆ تەعبیر بکات، بانگیان دەکات بۆ لای خوا، چونکە لەو کاتەدا: مانا لێکدانەوەی خەونەکان بۆ وان، گرنگ نەبووە، بە قەدەر ئەوەی کە ئەوان لە چاڵ‌و زەلکاوی هاوبەشدانان‌و کوفرو بێبڕوایی دا بوون، بۆیە یوسوف ﷺ ئەوەی بۆ ئەوان باشترە بووەو، بۆیان دڵسۆزییتر بووە، لە دنیاو دواڕۆژدا، ئەوە پێش دەخات‌و، ئەوی دیکە دەخاتە دوایی .

<u>بیست‌و شەشەم :</u> ئینسان دەبێ هەوڵبدات کە لەگەڵ بێ دەستان‌و، بێ دەرتانادا، چاکەکارو بە ڕەحم بێ، بە سۆز بێ، چونکە تەماشا دەکەین: یوسوف ﷺ لەگەڵ ئەو هەموو مەینەتباریی‌و ناڕەحەتیی‌و گرفتارییەی خۆی دا، کاتێك کە ئەو دوو هاوەڵە زیندانییەی دێنە لای، ئەو داوایەی لێ دەکەن، یەکسەر دەست دەکات بە دڵسۆزیی‌و نواندن لەگەڵیاندا، ئنجا بۆ ئەوەش زەمینەی بۆ خۆش دەکات، تاکو قسەکانی باشتر لێ وەربگرن‌و زیاتر متمانەی پێبکەن، کە پێیان دەڵێ: ئەو کێیەو ڕێبازی خۆییان پێ دەناسێنێ‌و، ڕەچەڵەکی خۆی بۆ ئەوان باس دەکات، تاکو زیاتر متمانەی پێ بکەن، کەواتە: ئینسان دەبێ لە هەموو حاڵاندا، هەوڵبدات بەزەیی بنوێنێ‌و چاکە کاربێ‌و خێرۆمەند بێ .

بیستو حەوتەم: ئینسان هەر كاتێك تووشی ناڕەحەتیی و گرفتاریی بوو، دروستەو ڕەوایە: چۆن لەو گرفتاریی و ناڕەحەتییە دەربازی دەبێ، هۆكار بگرێتە بەر، چونكە ئێمە خوا لە دنیایەكدا دایناوین، كە شوێنی هۆكارەكان (أسباب)ە، وەك خوا ﷻ دەربارەی (ذو القرنين) دەفەرمووێ: ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ ﴾الكهف: واتە: بۆ هەموو شتێك هۆكارێكمان پێدابوو، ئەویش بە دوای هۆكارەكە دەكەوت، كەواتە: ئینسان دەبێ چ لە حاڵەتی ئاسایی دابێ، چ لە حاڵەتی نائاسایی دا بێ، بزانێ ئامانج و مەبەستەكەی بە چ هۆكارێك دێتەدی و، پەكی لەسەر چ هۆكارێك كەوتوە، هەوڵبدات ئەو هۆكارەی بۆ فەراهەم بێنێ و برەخسێنێ، نەك تەنیا هەر لە خوا بپاڕێتەوە، چونكە هۆكار گرتنەبەریش، هەر بەشێكە لە دینداریی كردن، بەشێكە لەو طاعەتەی كە ئینسان بۆ خوای پەروەردگار ئەنجامی دەدات .

هەر بۆیەش یوسوف ﷺ وێڕای ئەوەی كە وەك زانایەكی چاكەكار (عالم محسن) وەڵامی داواو پرسیاری دوو هاوەڵەكەی دەداتەوە، بەڵام هاو كات ویستووشیەتی ئەو مەسەلەیەش بكاتە هۆكارێكی خۆ ناساندنی و، پاشان دەربازبوونیش لە بەندیخانە .

بیستو هەشتەم: پێویستە كەسێك كە ئامۆژگاریی كەسێك دەكات و، زانیارییەكی فێر دەكات، بە بەرانبەر بۆی نەكات، یوسوف ﷺ كە خەونەكانیان بۆ تەعبیر دەكات، هیچ چاوەڕوانییەكی لێیان نیەو، هیچ داوایەكی لێیان نیە، بەڵكو دڵسۆزانەو بە پەرۆشانەو، ڕێك و ڕاست بەو شێوەیە كە خەونەكان دەیگەیەنن، خەونەكانیان بۆ تەعبیر دەكات و، لە بەرانبەردا هیچ چاوەڕوانییەك و هیچ داواكارییەكی لێیان نیە، بێگومانیش هەر كەسێك كە بیەوێ چاكە فێری خەڵك بكا، خەڵك شارەزا بكات، دڵسۆزییان بۆ بنوێنێ، هەتا چاوەڕوانیی لێیان كەمتر بێ، قسەكانی باشتر جێگا دەگرن و زیاتر لەلایەن بەرانبەرەكانەوە، بە دڵسۆزو متمانە پێكراو تەماشا دەكرێ .

بیست‌و نۆیەم: هەر کاتێك مرۆڤ پرسێکی دێتە پێش، مادام شارەزابێ لەو پرسەدا، پێوستە بۆ بابای کە داوای کردوە، داوای زانیاریی‌و ڕێنماییی‌و شارەزایی کردوەو، داوای دڵسۆزیی نواندنی کردوە، بۆ ئەو چی چاکە، با بۆخۆشی فکری پێ نەشکابێ‌و داوای نەکرد بێ، ئەوەی بۆ بکات، ئەمەش لەوە وەردەگیرێ: کاتێك کە پادشا خەونەکە دەبینێ، یەکێك لە دوو هاوەڵە زیندانییەکەی کە دەربازی بووە، کە بریتی بووە لەو کەسەی شەراب، یاخود ئاوی گێڕاوە، لە کۆڕی پاشادا[1]، دێ بۆ لای یوسف‌و خەونەکەی پادشای بۆ دەگێڕێتەوە، یوسف ﷺ چی بۆ ئەوان چاکە، لە میانی تەعبیرکردنی خەونەکەی پادشادا، بۆیان دەخاتەڕوو: نەخشەیەکی ئابووریی پازدە (١٥) ساڵەیان بۆ دادەنێ، واتە: ناچێ ڕاست خەونەکەیان بۆ تەعبیر بکاو لێیانگەڕێ، بەڵکو دێنێ لە میانی تەعبیرکردنی خەونەکەدا، نەخشەیەکی ئابووریی (١٥) ساڵەشیان بۆ دادەنێ، کەواتە: کاتێك ئینسان زانیارییەك بە دەوروبەری خۆی دەگەیەنێ، وا باشە تەماشا بکات : چی‌و چۆن بۆ ئەوان باشە، با ئەوانیش فکریان پێ نەشکابێ: داوای بکەن، بۆیان بخاتەڕوو .

سییەم: ئەگەر خەڵکیش لەگەڵ تۆدا ناڕاست بێ، یاخود کەم لوتف بێ، واباشە تۆ لوتف‌و ڕاستیی‌و دڵسۆزیی‌و چاکەی خۆت لە دەست نەدەی، واتە: چاکە لە بەرانبەر چاکەدا نەکەی، یوسف ﷺ کە یەکێك لە دوو هاوەڵە زیندانییەکەی کە دەربازی بووەو بریتی بووە لە بابای ئاو یان: مەیگێڕ، کە دێ بۆ لای‌و خەونی پادشای بۆ دەگێڕێتەوە، یوسف ﷺ هەر بە چاویشی داناداتەوە، نەك وەڵامی نەداتەوەو بڵێ: من داوام لێکردی گوتم: ﴿ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ ﴿٤٢﴾﴾، واتە: باسم بکە لای گەورەکەی خۆت‌و بڵێ: من بە زوڵم لەو بەندیخانەیەم، تۆمەتم بۆ کراوە، کەچی بەهۆی لەبیرچوونەوەی تۆوە، چەند ساڵە لەم زیندانەدام!! نەك هەرداواکەی ڕەت ناکاتەوە کە خەونەکەیان بۆ تەعبیر بکات، بەڵکو هەر بە چاویشی دا ناداتەوە!! ئەوەش بەڕاستیی ڕەوشتێکی زۆر بەرزەو هەموو کەس نایگاتێ .

---

١) پێی دەگوترێ: (ساقي) بە کوردیی: مەیگێڕ، یان: ئاو گێڕ.

بۆیە ئینسان دەبێ لە بەرانبەر لە بیرچوون و کەم لوتفیی و، ناجوامێریی بەرانبەرەکانی دا، هەوڵبدات هەر چاکەکارو ئاکار بەرزو جوامێر بێ .

سی و یەکەم: ئینسان ئەگەر تۆمەتبار کرابێ بە شتێك، واباشە چۆن بۆی دەکرێ، ئەو تۆمەتە لە خۆی دوور بخاتەوە، یوسوف ﷺ دوای ئەوەی خەونەکەی پادشای بۆ دەگێڕنەوەو دوایی پادشا دەڵێ، بۆم بێنن، یەکسەر ناڵێ: بابچین بۆ لای پادشا، هەرچەندە چەند ساڵێکیشە لە زینداندا ماوەتەوە، بەڵکو دەیەوێ جارێ پەرێزی خۆی لەلای خەڵك پاك بکاتەوە، دەیەوێ جارێ ئەو تۆمەتەی بۆی هەڵبەستراوە، لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، کەواتە: ئەگەر ئینسان سووربێ لەسەر ئەوەی لە نێو خەڵکدا سومعەی خۆی بە پاکیی بهێڵێتەوەو، تۆمەت لە خۆی دووربخاتەوەو، ئەگەر درۆو دەلەسەی بۆ کرا، هەوڵبدات ئەو درۆو دەلەسەیە ئەگەر پێویست بوو پووچەڵی بکاتەوە، ئەوەش شتێکی باشەو ئەرکی خۆیەتی .

هەر بۆیەش یوسوف ﷺ پەلەی نەکرد لە هاتنەدەر لە بەندیخانە، تاکو ئەوە تۆمەتەی بۆی کراوە، کە گوایە پەلکێشیی دەستدرێژیی کردوە بۆ ژنەکەی عەزیز، هەتا ئەو تۆمەتە ساغ ناکاتەوەو، ئەو بوختانە لەخۆی دوورناخاتەوە، پەلە نەکات، لە هاتنە دەر لە بەندیخانە .

سی و دووەم: بێگومان زانیاریی و شارەزایی هۆکارێکی گەورەی بەرزبوونەوەی ئینسانە، لە لای خواو لە لای خەڵك، بە مەرجێك، کار بەو زانیارییەی بکات، یوسوف ﷺ کە شارەزای تەعبیری خەونان بووەو، شارەزای کاروباری ئابووریی بوو :

أ) پاشەکەوت کردنی ئازووخە .

ب) چۆنیەتی بەرهەم هێنانی دەغڵ و دان .

ج) چۆنیەتی هەڵگرتنی .

بەهۆی ئەو زانیاریی و ئەو شارەزاییەوە، ئەوە بوو کە یوسوف ﷺ بوو بە خاوەن پێگەیەکی بەرز، لە وڵاتی میسردا، ئەوە بوو بە پادشای گوت: ﴿ قَالَ

﴿ اَجْعَلْنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾ ﴾، واتە: لەسەر عەمبارەکانی زەوییم دابنێ، کاروباری ئابووریی بە من بسپێرە، چونکە من هەم پارێزەرم، هەم زاناو شارەزام، کەواتە: زانایی‌و شارەزایی لە ڕاستیی دا پەیژەیەکە، مرۆڤ پێی دا سەردەکەوەێ، چ لەلای خەڵك، چ لە لای خوا ﷻ بە مەرجێك ئەو زانیارییەی بۆ مەبەستی چاك‌و، بە شێوازی چاك بەکاربێنێ .

سی‌و سێیەم : زانیاریی لێکدانەوەی خەون، یەکێکە لە زانیارییە شەرعییەکان‌و، مرۆڤ لەسەر ئەوە کە بە شێوەیەکی ڕاست‌و دروست تەعبیری خەون بکات، خوا پاداشتی دەداتەوە، هەروەها ئەو کەسەی لێکدانەوەی خەون فێری خەڵك بکات، مانای وایە: زانیارییەکی چاکی فێری خەڵك کردوە، چونکە یەکێك لە پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا، کە (یوسف) ؑ، خوا بە منەتکردنەوەو، وەك نیعمەت پێی دەفەرموێ: ئێمە چاکەمان فێر کردبووو، لە تەعبیری خەونانمان فێر کرد بوو، کەواتە: زانیاریی تەعبیری خەون، زانیارییەکی شەرعییەو، شتێکی چاکەو، مرۆڤ پاداشتی هەیە لە بەرانبەریدا، ئەگەر بەو زانیارییە کار بکات، یاخود ئەو زانیارییە فێری خەڵك بکات .

سی‌و چوارەم : ئینسان لە کاتی پێویستدا، بۆی هەیە: سیفەتە چاکەکانی خۆی باس بکات، لە شوێنێك کە نەناسرێ‌و، خەڵکەکە شارەزای نەبن‌و پێی ئاشنا نەبن، لە حاڵێکی وادا دروستە مرۆڤ سیفەتە باشەکانی باس بکات‌و، خۆی بە خەڵك بناسێنێ، بە بەڵگەی ئەوەی یوسوف ؑ سەرەتا خۆی بە دوو هاوەڵە زیندانییەکەی دەناسێنێ‌و، دەڵێ: من کوڕی (یعقوب)م (یعقوب) کوڕی (إسحاق)و کوڕی (إبراهیم) خۆییان پێ دەناسێنێ، ڕەچەڵەکی خۆی بە وان دەناسێنی‌و، عەقیدەو ئایینی خۆی بەوان دەناسێنێ، دواییش کە دەچێتە لای پادشاش، پێی دەڵێ: ﴿ اَجْعَلْنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾ ﴾، واتە: من لەسەر عەمبارەکانی زەوی دابنێ، چونکە پارێزەری زانام، کەواتە: دروستە ئینسان، سیفەتەکانی خۆی لە شوێنێك کە نایناسن، بخاتە ڕوو، بەڵام نەك بە مەبەستی خۆ هەڵکێشان‌و خۆ فەرز کردن، بەڵکو بە مەبەستی خزمەت کردن لە شوێنێك کە پێی ئاشنا نین، ئەوە ڕەوایەو بەڵکو جاری

وایە پێویست دەبێ، وەك پێشتریش باسمان كردوە، ئەگەر بزانی: كارێك هەیە تەنیا بە تۆ دەكرێ، ئەركێكی شەرعیی هەیە، سوودی خەڵكو وڵاتی تێدایە، تەنیا بە تۆ ئەنجام دەدرێ، دروستەو بگرە جاری وایە پێویستە خۆت بناسێنیو، سیفەتەكانی خۆت بناسێنی بەو كەسانەی كە متمانە دەدەن بە خاوەنی ئەوە سیفەتانە، تاكو ئەو ئەركە شەرعییە وەئەستۆ بگری، بۆ ئەوەی خزمەتی خەڵكو وڵات بكەیو، خوا لە خۆت ڕازی بكەی، نەك خۆتو حزبو خزمو دەوڵەمەند بكەی! وەك لە ڕۆژگاری ئێستامان دا هەیە !

سی و پێنجەم: كە یوسوف ﷺ بە پادشای میسر دەڵێ: ﴿ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾ ﴾، وێڕای ئەوەی كە لە ڕابردوودا گوتمان: ئەوەی لێوەردەگیرێ كە دروستە مرۆڤ لە شوێنێك خەڵك پێی ئاشنا نەبێ، بە تواناو سیفەتەكانی ئاشنا نەبن، كارێكیش هەبێ، دڵنیابێ كە بەو دەكرێ، یان بە باشترین شێوە بەو دەكرێ، بە پێی ئەوە حوكمەكەی دەگۆڕێ، جاری وایە لەسەری پێویست دەبێ: خۆی بناسێنێو خۆی پێشنیار بكات، جاری واش هەیە بۆی پەسند (مندوب)ەو، جاری واش هەیە بۆی ڕەوایە، بەڵام ئەگەر نیازەكەی خراپ بێ، بۆ وێنە: بیەوێ بەهۆی ئەو كارەوە كە وەئەستۆی دەگرێ، قۆرخكارییو گەندەڵیی بكاتو بۆ مەبەستی خراپ بەكاریبێنێ، ئەوە ئەو كاتە دیارە حوكمی خۆ پێشنیاركردنەكەی، یان باسی خۆكردنەكەیو خۆ ناساندنەكەی، پێچەوانە دەبێتەوە .

ئنجا وێڕای ئەوە: شتێكی دیكەش لەو هەڵوێستەی یوسوف وەردەگیرێ، ئەویش بریتیە لە متمانەو باوەڕ بەخۆ بوون، مرۆڤ دەبێ خۆی بناسێو، تواناكانی خۆی بزانێ، چی لە توانادا هەیە، چی پێ دەكرێ! چونكە بەدڵنیایی هەر كەسێ خۆی نەناسێو نەزانێ تاكوێ دەڕواتو، نەزانێ چی لە توانادا هەیە؟ چی پێ دەكرێ؟ چی پێ ناكرێ؟ لە مامەڵەكردن لەگەڵ دەوروبەرو واقیعدا، بەهەڵەدادەچێ، ئنجا یوسوف ﷺ كە دەڵێ: ﴿ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾ ﴾، واتە: لەسەر عەمبارەكانی زەوییم دابنێ، واتە:

کاروباری ئابووریيم پێ بسپێرە، من پارێزەری زانام، دیارە خۆی ناسیوەو متمانەشی بە خۆی بووە، هەر کەسێك هەر بەرپرسیارێتییەك وەربگرێ، هەر ئەرکێك بخاتە سەرشانی خۆی، دەبێ پێشێ باوەڕو متمانەی بەخۆی بێ، کە ئەوەش سیفەتێکی باشە، بەڵام گرنگ ئەوەیە واقیع بینانە، متمانەو باوەڕی بە خۆی بێ، نەك خەیاڵ پلاوانەو، لە ناسینی خۆیدا بە هەڵەدابچێ !!

سیو شەشەم: خوا ﷻ لە دنیادا بەهۆی ئیمانو تەقواوە، شتی چاك قسمەتی بەندەکانی دەکات، چونکە خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی یوسوف دەکات، کە ئاوا نیشتەجێمان کرد، دەست ڕۆیشتوومان کرد لە زەوییدا، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَأَجْرُ ٱلْأٓخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾، واتە: پاداشتی دواڕۆژ باشترە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێنابووو پارێزیان دەکرد، واتە: ئەوەی بە یوسوف درا، کە دەستڕۆیشتوو کرا لە زەویداو، کرا بە بەرپرسی کاروباری ئابووریی لە میسردا، ئەوە چاکەو پاداشێکی خوا بوو بۆ یوسوف، بەهۆی ئیمانو تەقواکەیەوە، بەڵام بە تەئیکد پاداشتی دواڕۆژ بۆ یوسوفو هاوونانی یوسوف، کە ئەهلی ئیمانو، ئەهلی تەقوان، باشترە، کەواتە: ئەوەش جۆرێك بووە لە پاداشت کە خوا ﷻ داویەتەوە، پاداشتی دنیایی لە بەرانبەر ئەوەدا کە لە ڕیزی ئەوانەدا بووە، ئیمانیان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێو، پارێزیشیان کردوە، دیارە کاتی خۆشی لە تەفسیرکردنی ئەم ڕستە قورئانییەدا باسمان کرد، کە بۆیە بۆ ئیمان دەفەرموێ: (ءَامَنُواْ) بەڵام بۆ تەقوا دەفەرموێ: (وَكَانُواْ يَتَّقُونَ)، چونکە یەك جار ئیمان دەهێنرێ، بە یەك قۆناغ، هەڵبەتە دوایی کەمو زیاد دەکات، بەڵام (تەقوا) شتێکە دەڵێ بەردەوام ئینسان لەسەری بێ، چونکە هۆکارەکانی، ئەو شتانەی کە ئینسان دەبێ خۆییان لێ بپارێزێ، کە بە شێوەی گشتی دوو شتن :

أ) جواندنی ئەرکەکان .

ب) توخن کەوتنی قەدەغەکان .

ئنجا ئەرکەکان بەردەوام تازە دەبنەوەو، قەدەغەکانو حەرامو خراپەکانیش، بەردەوام دێنە ڕێی ئینسان، بۆیە بەردەوام دەبێ خۆی بپارێزێ، لە جواندنی

ئەرکەکانو لە شکاندنی قەدەغەکان، بۆیەش بۆ تەقوا بە صیغەی (مضارع) هێناویەتی: (وَكَانُواْ يَتَّقُونَ)، چونکە بەردەوام ئینسان دەبێ ئاگای لە خۆی بێتو، خۆی بپارێزێو لە خۆی وریابێ، هەم لە چواندنی ئەرکەکانو، هەم لە شکاندنی قەدەغەکان .

<u>سیو حەوتەم:</u> حیکمەتێکی دیکە لە سووڕەتی یوسوفو بەسەرهاتەکەی دا ئەوەیە کە: پاشەکەوت کردنی ئازووخە، جا چ لەسەر ئاستی دەوڵەت، چ لەسەر ئاستی ماڵو خێزانێك، شتێکی باشەو، پێچەوانەی پشت بە خوا بەستن نیە، چونکە ئەوەتا یوسوف ﷺ ئازووخەی لە وڵاتی میسرِ کۆکردۆتەوە، بە گوێرەی نەخشەیەك کە بۆیان دادەنێ: ﴿ قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾، دوایی بۆ ساڵی پازدە (١٥)یەم دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾، یوسوف ﷺ کە پێغەمبەرێکی پایەبەرزی خوایە، نەخشەیەکی ئابووریی پازدە (١٥) ساڵیی دادەنێ: (٧) ساڵی هەرزانیی کە کشتوکاڵو بەروبوومی باشیان تێدادەبێ، دوایی (٧) ساڵیی گرانییو قاتو قڕیی، دوایی ساڵی پازدە (١٥)یەم، دەروو کرانەوەو فەرحانیی، دێتەوە پێش .

ئنجا ئا ئەو نەخشە پازدە ساڵییەی کە یوسوف ﷺ دایناوە، بەهۆیەوە فریای خەڵکی میسرو دەوروبەری میسریش کەوتوە، ئەوەتا برایەکانی یوسوف کە دێن بۆ لای: ﴿ وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ ... ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە: کاتێك کە بارەکانی بۆ بارکردن، ئەوەی کە بۆی هاتبوون بۆی ئامادە کردن، کە بریتی بوو لە پێوانی دەغڵو دانو دانەوێڵەو ئازووخە، کەواتە: ئەگەر پێشتر پاشەکەوتی نەکردبایە، بە تەئکید ئێستا ئەو خەڵکەی کە لە میسرِ دابوونو، ئەوانەی کە لە دەوروبەری میسریشەوە هاتبوون، کە بۆیەش هاتبوون، چونکە حەوت

ساڵان قاتو قڕیی و گرانیی بووە، نەیدەتوانی هیچیان بۆ بکات، بەڵام بەهۆی ئەو پاشەکەوتکردنەی یوسوفەوە ﷺ بۆ ئازووخەو دانەوێڵە، لەو برسیەتیی و گرانییە دەرباز بوون .

کەواتە: پشت بە خوا بەستن، پێچەوانەو دژو، ناکۆك نیە لەگەڵ ئەوەدا کە ئینسان پاشەکەوت بکات، بۆ ماڵو منداڵی، چ لەسەر ئاستی خێزان، چ لەسەر ئاستی کۆمەڵگا، چ لەسەر ئاستی دەوڵەتیش .

سیو هەشتەم: حیکمەتێکی دیکە کە لە بەسەرهاتی یوسوف ﷺ وەردەگیرێ، ئەوەیە کە دەبینین یوسوف ﷺ زۆر شارەزاو کارەمە بووە، لە کارەکەی خۆیدا، هەر کەسە بە ئەندازەی خۆی بۆی پێواوەو، بە ئەندازەی خۆی ئازووخەی خۆی پێداوە، بە بەڵگەی ئەوە کە کاتێك برایەکانی یوسوف دەچنەوە بۆ لای بابیان، ئەوە دەکەنە بەشێك لە پاساوی ئەوەی: برایەکەیان (بنیامینیان) لەگەڵ بنێرێ، چونکە یوسوف داوای کردوە (کاتی خۆی بە تەفصیلْ باسمان کرد)، کە بەهۆی بردنی بنیامینەوە، بارێکی دیکەی ئازووخە، باری حوشترێك زیاد دەکەن، ئا ئەو بارە زیادە بە بەڵگەو بیانوو بۆ بابیان دێننەوەو دەڵێن: ﴿وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴿٦٥﴾﴾، واتە: باری حوشترێك زیاد دەکەین لە ئازووخە، کەواتە: دیارە بە حیسابو کیتابو وردبینیی بووە، ئەوە نەبووە هەر لەگۆترە هەر کەسێك بێ چەند باری ویستن، باریان بکات ! نا، هەر کەسە بۆی دیارییکراوە دەبوو باری ولاخێك بەرێ، ئنجا حوشتر بووە، هێستر بووە، گوێدرێژ بووە، هەر کەسە دەبووایە خۆیو بارێك، بۆیە گوتوویانە: با ئەو برایەش لەگەڵ خۆمان بەرینو بارێکی دیکە زیاد بکەین، چونکە دیارە هیچ کەس بۆی نەبووە بڵێ: من سێ هێسترم هێناون، یان چوار حوشترم پێن، دەبێ هەمووان بار بکەم، نا، چونکە ئەگەر وا کرابایە، بێگومان هەندێك پڕ دەبوون، زۆربەش قڕ دەبوونو لەبەریان دەبڕا، بەڵام کارەکە زۆر بە لێزانانەو بە کارامەیی کراوە، بە پێچەوانەی ئەو عادەتەی حوکمڕانە گەندەڵەکانەوە کە، حیزبو خزم پڕ دەکەن، بەڵام زۆربەی خەڵکی قڕ دەکەن، حیزبو خزمو دەوروبەری خۆیان دەکەنە ملیاردێرو، پڕیان دەکەنو

لەسەریانەوە دەڕژێ، لەسەر حیسابی ئەو خەڵکە ڕەش و ڕووتەی کە لەبەری دەبڕێ، یوسوف ﷺ دادگەرانەو لێزانانەو کارامانە کارەکەی خۆی کردوە .

سی و نۆیەم: میوانداریتیی، ئەوە کە ئینسان ببێتە خانەخوێ و خەڵك میوانداریی بکات و، ڕێز لە میوانەکانی بگرێ و، خزمەتیان بکات و حورمەتیان بگرێ، ئەوە نەك هەر شتێکی ڕەواو چاکە، بەڵکو ئەوە لە ڕەوشت و ڕێ و شوێنەکانی پێغەمبەرانە، (علیهم الصلاة والسلام) بە بەڵگەی ئەوە کە یوسوف ﷺ بە برایەکانی دەڵێ: ﴿أَلَا تَرَوْنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ۝٥٩﴾، ئەوە دەکاتە بەڵگەو پاساوی ئەوەی کە برایەکەیان لەگەڵ خۆیان بێنن، دەڵێ: ئایا نابینن! من چۆن پێوان تەواو دەکەم، بە تەواویی بۆتان دەپێوم، بۆ ئێوەو بۆ هەر کەسێکی دیکەش و، من باشترین کەسێکم کە میوانان دادەبەزێنێ لە لای خۆی، واتە: (أنا خیر المضیفین)، واتە: من باشترین خانەخوێم .

کەواتە: ئەوە کە ئینسان خانەخوێیەتیی باش بکات و، ڕێز لە میوان بگرێ، یەکێکە لە ڕەوشت و ئاکارەکانی پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا، صەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێ .

چلەم: گومانی خراپ بردن بە بەرانبەر، لە کاتی هەبوونی نیشانەدا، با بەڵگەیەکی تەواو ساغکەرەوەو یەکلاکەرەوەش نەبێ، بەڵام هەر نیشانەیەك هەبێ، بۆنی ئەوەی لێ بێ کە ئەو کەسە خەتابارە، یان دەگونجێ هەڵەکار بێ، تۆمەتبار بێ، گومانی خراپ بردن لەوکاتەدا، قەدەغەو ناڕەوا نیە، بە بەڵگەی ئەوە کە یەعقووب ﷺ کاتێك کە کوڕەکانی داوای لێ دەکەن: برایەکەیان لەگەڵ بنێرێ، لەسەر داوای یوسوف ﷺ و زۆر ئیلحاحی لێدەکەن دەفەرموێ: ﴿هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ ۝٦٤﴾، واتە: ئایا ئەگەر من ئێوە بە ئەمیندار دابنێم و لێتان دڵنیابم، دیسان وەك ئەوە نابێ کە پێشتر بە ئەمیندارم دانان لەبارەی برایەکەیەوە ؟

ئنجا دواییش کە یوسوف، بنیامین گلدەداتەوە، وەك لە درێژەی بەسەرهاتەکە داهاتوە، بابیان پێیان دەفەرموێ: ﴿بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗا﴿٨٣﴾﴾، بەڵکو نەفسەکانتان شتێکی بۆ جوانکردن‌و ڕازاندنەوە، واتە: ئەوەی دەتانویست ئەنجامتاندا، کە دیارە خەتاشیان تێیدا نەبووە، بەڵام لەبەرئەوەی پێشتر درۆیان لەگەڵ بابیان کردوە، بۆیە بابیان کە (یعقوب) ﷺ، ناهەقی نەبووە کە گومانی خراپیان پێبەرێ‌و تۆمەتباریان بکات، کەواتە، ئەگەر کەسێك خراپەیەکی لێ پشکوتبۆوەو بە خراپەکار ناسرا بوو، یان جارێك تاوانێکی کردبوو، ئەگەر خەڵك گومانی خراپی پێبەرێ، جگە لە خۆی، نابێ لۆمەی کەس بکات .

<u>چل‌و یەکەم:</u> یەکێکی دیکە لەو پەندو عیبرەتانە، ئەوەیە کە حوکمڕان دەبێ هەر کام لە توندیی‌و نەرمیی لە جێی خۆیاندا بەکاربێنێ، چونکە تەماشا دەکەین: یوسوف ﷺ لە لایەکەوە کە دەڵێ: من باش پێوانەی دەغڵ‌و دان دەپێوم، ئازووخە دەپێوم، هەروەها دەڵێ: من خانە خوێیەکی زۆر باشم، ئەوە نەرمیی پێشاندانە، بەڵام توندیی‌و زبریش نیشان دەدات‌و دەڵێ: ﴿فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ﴿٦٠﴾﴾، واتە: گەر برایەکەتانم بۆ نەهێنن، نە لەلای من پێوانتان دەبێ، واتە: دەغڵ‌و دانتان پێ نافرۆشین تاکو بیپێون، (وَلَا تَقۡرَبُونِ)، توخنیشم مەکەون، یانی: مەیەنەوە ئەم شارەشەوە، کە من تێیدا بالادەستم‌و بەشێك لە بەرپرسیاریەتییم بەدەستەوەیە، واتە: حوکمڕان دەبێ هەم نەرمیی پێشانبدا، لە شوێنی خۆیداو، هەم زبرییش پێشانبدا، لە شوێنی خۆی دا، واتە: دەبێ دەستێکی مەڵحەم بێ‌و دەستێکیشی درێشە بێ، مەڵحەمەکە بۆ چاکەکاران‌و، درێشەکەش بۆ خراپەکاران، ئەگەرنا خەڵك هەمووی ئەسپی ڕەسەن نیە، پێویستیی بە ئاوزینگ نەبێ‌و، لە ڕاستییدا خراپەکاران‌و ستەم کاران، ئەگەر بێت‌و هێزێك نەبێ‌و زبرییەك نەبێ، بیانسڵەمێنێتەوە، مافی بێهێزو لاوازو بێ دەستەڵاتەکان دەخۆن .

<u>چل‌و دووەم:</u> خۆ پاراستنی مرۆڤ لەوە کە چاوێنیی (معیون) ببێ، خۆ پاراستن لەوە چاوی پیس کاری تێبکات، یاخود حەسوودیی، حەسوودان کاریگەریی

خراپی لەسەری هەبێ، شتێکی باشە، هەڵبەتە ئێمە باسێکی سەربەخۆمان لەبارەی ئەم ڕستەیەوە کردوە: ﴿وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ ...﴿٦٧﴾﴾، واتە: ڕۆڵەکانم! لە یەك دەروازەوە مەچنەو ژورەوەو، لە چەند دەروازەیەکی جیا جیاوە بچنە ژوورە، واتە: بچنە ژووری ئەو شارەی کە یوسوف علیه السلام لەوێدا نیشتەجێیەو، کاروباری ئابووریی وەئەستۆ گرتوە .

ئنجا وەك باسمان کرد: هەندێ لە زانایان وایان لێك داوەتەوە، کە یەعقووب لە چاوی پیس لێیان ترساوە .

ئنجا چ لە چاوی پیس لێیان ترسا بێ، یاخود لە هەر تۆمەتبارکردنێکی دیکە، لەلایەن حوکمڕان و دەستەڵاتدارانی ئەو شارەوە، لێیان ترسابێ، گرنگ ئەوەیە ئینسان خۆپاراستنی لەو هۆکارانەی کە مەترسییان لێدەکات، ئنجا چاوی پیسە، حەسوودیی بردنە، دژایەتیی کردنە، تۆمەتبارکرانە، خۆ پاراستنی لەو هۆکارانەی جێگای مەترسیین، شتێکی باشەو، ئەوەش دیسان پێچەوانەی پشت بە خوا بەستن نیە .

<u>چل و سێیەم:</u> دروستە ئینسان هۆکارە پەنهانەکان بەکاربێنێ، مادام لە خودی خۆیاندا ناشەرعیی نەبن، بۆ گەیشتن بە ئامانجی بەرزو شەرعیی، بەڵام ئەوەی ناڕەوایە ئەوەیە، کە ئینسان هۆکاری پەنهان، یاخود هەندێك تەگبیر کە وەك فێڵ دەچێ، بەکاربێنێ، بۆ ئەوەی هەقێك بکاتە ناهەق، یان ناهەقێك بکاتە هەق، بەڵام بۆ ئەوەی دەستی بگاتە هەقێك، ئەگەر تەگبیرێك، نەخشەیەك، پلانێك، بەکاربینێ، کە وەك: فێڵ بچێ، بەڵام مەبەستی ئەوە نەبێ، زیان بە کەس بگەیەنێ، بەڵکو مەبەستی ئەوەبێ هەقێك بچەسپێنێ، یاخود ناهەقێك لابەرێ، ئەوە شتێکی ڕەوایە، چونکە یوسوف علیه السلام تەگبیرێکی وایکرد، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِي رَحۡلِ أَخِيهِ ﴿٧٠﴾﴾، واتە: کاتێك ئەو پێداویستییەی کە بۆی هاتبوون و سەفەریان بۆ کردبوو، (کە بردنی ئازووخە بوو)، بۆی تەواو کردن، ئنجا ئاو خۆرەکەی پادشای، (ئەوەی کە ئاوی پێ دەخواردەوە، ئەو دەفرە، ئەو جامە، کە دوایی

کردوویانە بە ڕبەو پێوانە بۆ دەغڵو دان)، خستە باری برایەکەیەوە، بۆ ئەوەی دوایی بەڵگەو پاساوی ئەوەی هەبێ بڵێ: دزییتان کردوە، وەك: لە بەسەرهاتەکەی دا دیارە، بەلاّم بێگومان یوسوف ﷺ مەبەستی ئەوە نەبووە، ئەزیەتیان بدات، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە:

یەکەم: برایەکەی لەلای خۆی گلبداتەوە .

دووەم: ئەوە بکاتە پاساوو بەڵگەی ئەوەی جارێکی دیکە بێنەوە بۆ میسڕ.

هەروەها وایان لێبکات کە هەموویان بێن بۆ میسڕ، کەواتە: پلانەکەی ئەو ئامانجە گەورەو چاکەی لە پشت بووە، بۆیە لە پێناو هێنانە دی ئامانجێکی گەورەو چاکدا، جۆرێك لە ئەزیەتدانی بەرانبەر، یان جۆرێك لە نەخشەو، پلان دانان، با پێشی ناخۆش بێت، شتێکی باشە، وەك چۆن یەکێك دەچێ بۆ لای پزیشك، شوێنێکی تووشی گانگرین بووە، یان دەبێ ئەندامێکی ببڕێتەوە، هەڵبەتە باشترە ئەو ئەندامەی ببڕنەوە، ئەگەر لاقیەتی، ئەگەر پەنجەیەتی، ئەگەر دەستییەتی، ئەوە باشتر لەوەی هەموو بەدەنی دابگریو لە بەین بچێ، یان کەسێك کە شوێنێکی تووشی سەرەتان بووە، بەلاّم تەنیا ئەندامێکیەتیو، ئەو ئەندامەی ئەگەر دەربهێنرێ، ئنجا ئەگەر صندوقی دەنگیەتی، یان گورچیلەتی، یان گەدەیەتی، یان لوویەکە، بە دڵنیایی ئەگەر ئەو ئەندامەی ببڕنەوەو لای بەرن، باشترە لەوەی هەموو بەدەنی دابگرێ .

چلو چوارەم: کاتێك ئینسان بواری هەبێ، بە دەبەر ڕاهاوێشتنو بە کینایە قسەکردن، مەبەستێك بگەیەنێ، دەبێ خۆی لە تەعبیرێکی دیکە کە نەگونجاو بێ، بپارێزێ، بە بەڵگەی ئەوە کە یوسوف ﷺ دوای ئەوەی پێوانەکە لە باری (بنیامین)ی برایدا دەدۆزێتەوە، (کە دیارە پێشتریش پێکەوە نەخشەیان داناوە، تاکو بەڵگەی هەبێ: برایەکەی لەلای خۆی گلداتەوە)، ئنجا دوایی برایەکانی داوای لێدەکەن: یەکێك لە ئێمە لەلای خۆت لە جیاتی بنیامین بهێڵەوەو، بیکە بە کۆیلە، یان بیکە بە خزمەتکار لەلای خۆت، لەبەرئەوەی کە بابێکی پیرو کەنەفتو بەساڵداچووی هەیە، کە زۆری خۆشدەویو دڵی

پێوەیە، یوسوف عليه السلام دەڵێ چی؟ دەفەرمویّ: ﴿قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ...﴿٧٩﴾﴾، واتە: پەنا بە خوا دەگرین، کە جگە لەوەی کەلوپەلی خۆمان لە بارەکەیدا دۆزیوەتەوە، کەسێکی دیکە بگرین، تەماشا بکەن! نەیگوتوە، پەنا بە خوا کە جگە لەوەی دزیی لێکردووین یەکێکی دیکە بگرین! چونکە زانیویەتی کە برایەکەی دزیی نەکردوە، بۆیە وشەیەکی بەکارهێناوە، کە دزییش دەگرێتەوە، بەڵام جگە لە دزییش دەگرێتەوە، تەعبیرێکی زۆر لێزانانەی بەکارهێناوە، کە ڕاست بووە، ئەو دەفرەی کە پادشا پێشتر ئاوی پێخواردۆتەوەو، دوایی بۆتە پێوانەی ئازووخە، ئەوەی لە بارەکەیدا دۆزیوەتەوە، ﴿إِنَّآ إِذًا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾﴾، واتە: ئەگەر وابکەین، ئێمە ستەمکار دەبین، مانای وایە ئێمە کەسێکمان سزاداوە، کە هیچی نەکردوە، لێرەدا یوسوف عليه السلام تەعبیرێکی بەکارهێناوە کە پێی دەگوترێ: (كناية)، تەعبیرێکی بەکارهێناوە کە زەق و ڕەق نیە، یەکسەر بڵێ: ئێمە کەسێك ناگرین کە دزیی لێ نەکردووین .

<u>چل و پێنجەم:</u> ئینسان جگە لەوەی کە دەیزانێ، دروست نیە شایەدیی لەبارەوە بدات، واتە: تەنیا بەو ئەندازەیە کە شارەزایەو دڵنیایە دروستە شایەدیی بدات،، نابێ شایەدییەك بدات کە زانیاریی لەبارەوە نیە، وەك برایەکانی یوسوف کە دەگەڕێنەوە لای بابیان، دەڵێن: ﴿وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا ﴿٨١﴾﴾، واتە: تەنیا بەوە شایەدییمان داوە، کە زانیومانە، ئەوەش کە زانیویانە، ئەوە بووە کە، ئەو دەفرە، ئەو پێوانەیە، لە باری بنیامیندا دۆزراوەتەوە، یانی: ئیدی ئێمە هەر ئەوەندەمان زانیوە: ﴿وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَٰفِظِينَ ﴿٨١﴾﴾، واتە: ئێمە پارێزەری نادیارو پەنهان نین، چەندەمان زانیوەو چیمان دیوە، ئەوەمان گێڕاوەتەوە، کەواتە: جگە لەوەی کە ئینسان دەیزانێ و لێی دڵنیایە، نابێ شایەدیی بدا، ئەگەرنا دەکاتە شایەدییدانی بە درۆ .

چل و شەشەم: ئەو تاقیکردنەوە سەختو قورسەی کە خوای کارزان، خوای میهرەبان، بەندە هەڵبژاردەکەی خۆی، کە پێغەمبەرێکی پایە بەرزە: یەعقووب ﷺ پێ تاقیکردۆتەوە: یوسوفی لێ دوورخستۆتەوە، کە نەیتوانیوە سەعاتێك لێی دووربێ، کەچی بە لای کەمەوە (١٥ - ٢٠) ساڵ، بگرە هەندێك گوتوویانە: سی (٣٠) ساڵو، هەندێك گوتوویانە: چل (٤٠) ساڵ یوسوفی نەدیوەتەوە .

پاشان (بنیامین)یشی بۆتە سەربار! ئەو هەموو میحنەتو بەڵایانەی بەسەرهاتوون، دوایش کە چاوەکانیشی لە ئەنجامی ئەوەدا ئاوی سپییان پەرپوەتێ، یاخود کوێر بوون! لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ: کە خوای کارزان ئەو بەندانەی خۆی کە خۆشی دەوێن، تاقییان دەکاتەوە.

ئنجا زۆر گرنگە ئێمە ئەوە بزانین کە مەرج نیە تاقیکردنەوەی خوا بە سەختییو ناڕەحەتییەکان بۆ بەندەکانی، لە بەرانبەر گوناهو هەڵەکانیاندا بێ، کە بە داخەوە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان وا حاڵی بوون، کە گوتوویانە: یەعقووب کاتی خۆی، نادادگەر بووە لە نێوان کوڕەکانی دا، بۆیە خوا لەسەر ئەوە سزای داوە !

کە من بە درێژیی بەرپەرچی ئەو قسەیەم داوەتەوەو گوتوومە: ئەوە گومانی خراپ بە یەعقووب ﷺ بردنەو، لە ڕاستییدا باش نەناسینی پلەو پایەی بەرزی پیغەمبەرانە، پێغەمبەرانی خوا صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەربێ، ئەو سەختیی ناڕەحەتییانەی کە هاتوونەتە ڕێیان، لەبەرئەوە نەبووە کە خوا سزایان بدات، بەڵکو بۆ ئەوە بووە، کە بۆ خەڵك ببنە سەرمەشق، بۆ خەڵکی مەینەتبارو خەڵکی گرفتار، خەڵکی دەردەدار، خەڵکی لێقەوماو، خەڵکێك کە دەکەوێتە ناڕەحەتییان، بۆیان ببنە سەرمەشق، ئەوەتا یەعقووب ﷺ لەگەڵ ئەو هەموو مەینەتییو ناڕەحەتییانەشدا، هەر خۆڕاگر بووەو، سکاڵای دڵی خۆی بۆ لای غەیری خوا نەکردوە ! دەبێ ئاوای تێبگەین: ئەوەی خوا بەسەر یەعقووبی ﷺ هێناوە، بۆ ئەوە بووە، کە بۆ خەڵك ببێتە سەرمەشق، ئنجا بۆخۆشیان، بۆ پێغەمبەران ببێتە مایەی پایەبەرزیی زیاتریان، بێگومان هەموو ئەو میحنەتانەی کە هاتوونە ڕێی

(یعقوب)یش‌و، ڕێی (یوسف)یش صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، وەك پەیژەیەك‌و بۆیان بوونە هۆكاری ئەوە كە بە پلە بەرزەكاندا سەركەون، بەرەو سەرێ بچن .

چل‌و حەوتەم: ئەو هەڵوێستەی یەعقووب عليه السلام، زۆر ئەدەبێكی گرنگە، كە مرۆڤ سكاڵای خۆی لەلای غەیری خوا نەكات‌و، هەمیشە نركەو گرمەی نەبێ، هەمیشە پرتەو بۆڵەی نەبێ، بەڵكو هەوڵبدات ناڕەحەتییەكانی خۆی لە دڵی خۆیدا كپ بكات، ئەوەتا یەعقووب عليه السلام دەفەرموێ: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٨٦﴾ ﴾، واتە: من سكاڵای ئەو خەم‌و پەژارەیەی كە ناتوانم لە دڵی خۆمدا بیهێڵمەوەو، دەبێ بڵاوی بكەمەوە، هەروەها ئەو خەم‌و پەژارەو ناڕەحەتیی‌و دڵتەنگییەی بەنسبەت ڕابردووەوە هەمە، هەموو سكاڵایەكەی دەبەمە لای خوا سبحانه وتعالى، واتە: لەلای جگە لە خوا، سكاڵای دڵی خۆم ناكەم، ئەوەش بەڕاستیی زۆر شتێكی گرنگە، ئینسان تاكو نەكەوێتە ناڕەحەتییانەوە، بۆی دەرناكەوێ، كە تاقیكردنەوەكەی یەعقووب عليه السلام چەند شتێكی قورس بووە !!

وەك خوا سبحانه وتعالى باسی یەعقووب عليه السلام دەكات، دەفەرموێ: ﴿ وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٨٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ تَفۡتَؤُاْ تَذۡكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨٦﴾ يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾،

وشەیەك كە دەربڕی ئێش‌و ژان‌و ناسۆری سەختی (یعقوب)و ڕاددەی بەرزی خۆڕاگریی‌و هیممەت بەرزییەتی بریتییە لە: ( فَهُوَ كَظِيمٞ )، (كظيم) وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ ﴿١٣٤﴾ ﴾آل عمران، واتە: ئەوانەی ڕق‌و تووڕەیی خۆیان كپ دەكەنەوە، (كظم) بریتییە لەوەی

مەشکەیەك، یان گوندەیەك پڕ بێ لە ئاو، یان دۆ، یان شلەمەنیی، تۆش سەرەکەی توند ببەستی ! کەواتە: یەعقووب ﷺ توند توند دەروونی خۆی گرتووەو، فشاری لە خۆی کردوە، کە وشەیەك نەڵێ، پێچەوانەی ڕەزامەندیی خوای پەروەردگار بێ، ئەوەش دیسان دەرس و پەندێکی گەورەی تێدایە بۆ ئێمەومانان، کە تووشی ناڕەحەتییو گرفتاریی دێین: نە دۆستان ناڕەحەت بکەین، نە دوژمنان بە خۆمان خۆش بکەین، چونکە وەختێك تۆ سکاڵای دڵی خۆتو ناڕەحەتییو خەمو پەژارەکانی خۆت، بڵاو بکەیەوە، ئەوەی کە دۆست بێ، زۆر دڵتەنگ دەبێو ئەوەی دوژمنیش بێ، پێت دڵخۆش دەبێ، کەواتە: لە جیاتی ئەوە، با ئینسان سکاڵای خۆی بەرێتە لای خوای پەروەردگاری، تاکو نە دۆستو نیزیکان بەهۆی خەمی تۆ خەمبار ببن، نە دوژمنانیش بەهۆی خەمو ناڕەحەتیی تۆوە شادمان ببنو بە خۆتیان خۆشبکەی.

<u>چلو هەشتەم:</u> دەرسو پەندێکی دیکە: ئەوەیە کە هەمیشە لەگەڵ خەمو ناڕەحەتیی دا، دەرو لێکرانەوەش هەیەو، لەگەڵ سەغلەتیی دا ئاسانییش هەیەو، لە دوای هەورازان نشێوە، ئنجا ئەو قەناعەتە کە لە دوای هەوراز نشێوەو، لەگەڵ تەنگانەدا فەرحانیی هەیە، لەگەڵ ناخۆشییدا، خۆشی هەیە، ئا ئەو قەناعەتو دڵنیابوونە، شتێکی زۆر گەورەیە بۆ مرۆڤ، ئەوەتا یەعقووب ﷺ لەگەڵ ئەو هەموو ناڕەحەتییەدا، دەفەرمویٚ :

﴿ يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾.

واتە: ڕۆڵەکانم ! برۆن لە یوسوفو برایەکەی بگەڕێن، لێیان بخەفتێن، پرسیاریان لەبارەوە بکەن، نائومێدیش مەبن لە بەزەیی خوا، بێگومان تەنیا کۆمەڵی بێبڕوایان لە بەزەیی خوا، نائومێد دەبن، لەبەرئەوەی خوا ناناسن، نازانن بەزەیی خوا چەند فراوانە ! دەرووی خێری خوا چەند نیزیکە! خوا چەند میهرەبانە! بۆیە نائومێد دەبن، هەڵبەتە خوا ﷻ، کە بەندە خۆشەویستەکانی خۆی بە سەختییو ناڕەحەتییەکان تاقی دەکاتەوە، لەبەرئەوەیە کە زۆری خۆشدەوێنو، دەیەوێ پەروەردەیان بکات، پتەوو بەهێزیان بکات، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا داهاتوە ﷺ:

{وَإِنَّ اللهَ تَعَالَى إِذَا أَحَبَّ قَوماً ابْتَلاهُمْ، فَمَنْ رَضِيَ فَلَهُ الرِّضَا، وَمَنْ سَخِطَ فَلَهُ السُّخْطُ} {أَخْرَجَهُ التِرمِذِيُّ بِرقم: (٢٣٩٦)، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَابن مَاجَهْ برقم: (٤٠٣١)، وَالبَيْهَقِي فِي شعب الإيمان برقم: (٩٧٨٢) قال الألباني: حسن}.

واتە: بێگومان خوای بەرز ئەگەر کۆمەڵێکی خۆشویستن، تاقییان دەکاتەوە، ئنجا هەر کەسێك ڕازیی بوو، خواش لێی ڕازی دەبێ‌و، هەر کەسێك تووڕە بوو، تووڕەیی بۆ دەبێ، {خوا لێی تووڕە دەبێ} .

چونکە خوا بۆ بەرژەوەندیی ئەوە، کە تاقی دەکاتەوەو دەیەوێ چاکی بکاو، پاکی بکات‌و، بەهێزی بکات‌و، پەروەردەی بکات‌و، بەرەو سەرێی بەرێ .

چل و نۆیەم: دروستە مرۆڤ کاتێك تووشی نەداریی‌و هەژاریی دێ، یان تووشی ناڕەحەتییەك دێ، بەیانی حاڵی خۆی بکات، مادام بەرژەوەندییەك پەکی لەسەر ئەو بەیان‌و ڕوونکردنەوەی حاڵە، کەوتبێ، ئەوەتە کوڕەکانی یەعقووب ﷺ ئەگەر هەڵەو کەم‌وکوڕییشان بووە، دەربارەی باب‌و دایکیان‌و یوسوف، بەڵام هەر چۆن بێ لە ماڵی پێغەمبەرێکدا پەروەردە بوون، ئەوەتا کاتێك دەچنە لای یوسوف دەڵێن: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهْلَنَا ٱلضُّرُّ... ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: ئەی عەزیز! خۆمان‌و ماڵ‌و خێزانمان، زیانمان تووش بووە، کە مەبەستیان هەژاریی‌و نەدارییە، (یوسوف)یش ﷺ ناڵێ: بۆچی وا دەڵێن، خۆ ئێوە دەڵێن: ئێمە کوڕانی پێغەمبەرین؟ چونکە دەزانێ کە شتێکی ڕەوایە، ئینسان بەیانی حاڵی خۆی بکات، باسی مەینەتیی‌و ناڕەحەتیی خۆی بکات، بۆ ئەوەی ئەو مەینەتیی‌و ناڕەحەتییەی لە کۆڵ بێتەوەو دەرووی خێری لێ بکرێتەوە .

پەنجایەم: بەهۆی خۆ پارێزکاریی‌و خۆڕاگریی‌و پشوو درێژییەوە، خوا ﷻ دەرووی خێر لە مرۆڤ دەکاتەوەو، ڕەنج‌و ناڕەحەتییەکانی دنیای زایە ناکات‌و بێ پاداشتی ناکات، بە بەڵگەی ئەوە کە یوسوف ﷺ کاتێك خۆی بە برایەکانی دەناسێنێ، دەڵێ: ﴿ قَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَآ ﴿٩٠﴾ ﴾، واتە: بێگومان خوا چاکەی لەگەڵ کردووین‌و، ئێمەی منەتباری خۆی کردوە، ئنجا ئایا لەبەر

چی خوا چاکەی لەگەڵ کردوە، بێگومان کاری خوا هیچی لەگۆترە نیە؟
﴿إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٩٠﴾﴾، واتە: هەر کەسێك پارێز بکاتو خۆڕابگرێ، بە دڵنیاییەوە خوا پاداشتو کرێی چاکەکاران زایە ناکات، کەواتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەهلی تەقواو صەبر بووە، خوا ﷻ چاکەی لەگەڵ کردوەو، پاداشتی ئەو خۆ پارێزکاریی‌و خۆڕاگرییەی لێ بزر نەکردوەو لێی زایە نەکردوە .

<u>یەنجاو یەك</u> : ئینسان لە کاتێکدا بەرانبەرەکەی هەڵەی لەگەڵدا دەکات، بەڵام دوایی دان بە هەڵەی خۆی دادێنێ، نابێ لەسەر سەرزەنشتکردنو سەرکۆنەکردنو باسکردن، بەردەوام بێ، دەبێ لاپەڕەیەکی سپی لەگەڵ هەڵداتەوە .

ئەوەتا یوسوف ﷺ دوای ئەوەی کە برایەکانی دەڵێن: ﴿تَٱللَّهِ لَقَدْ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾﴾، واتە: سوێند بە خوا، خوا تۆی بەسەر ئێمەدا هەڵبژارد (واتە: خوا ﷻ کۆمەڵێك سیفەتی چاکی بە تۆ داون، کە لە ئێمەدا نین)، بێگومان ئێمە لە خەتابارانو لە تاوانباران بووین .

یوسوف ﷺ دوای ئەوەی ئەوان دان بە چاکەی یوسوفو هەڵەو کەمو کوڕیی خۆیاندا دێنن، لە سەری ناچێو یەکسەر دەڵێ: ﴿قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ ﴿٩٢﴾﴾، واتە: لەمڕۆ بە دواوە، ئێوە گلەیی‌و سەرزەنشتتان لەسەر نیە، دیارە بۆخۆی هەر سەرزەنشتی نەکردوونو، لۆمەو سەرکۆنەی نەکردوون، بەڵام بۆ زێدە دڵنیایی دەڵێ، تازە هیچ کەسێك بۆی نیە لۆمەو سەرکۆنەتان بکات، مادام بۆخۆتان دانتان بە هەڵەو کەمو کوڕیی خۆتاندا هێنا .

<u>یەنجاو دووەم</u> : ئینسان دەبێ ڕێزی خزمو کەسوکارو نیزیکانی خۆی بگرێو، ئەوەندەی بۆی بکرێ، پەیوەندیی خزمایەتییان لەگەڵدا جێبەجێ بکاتو، حورمەتیان بگرێو لەگەڵیاندا چاکەکار بێ .

ئەوەتا یوسوف ﷺ دوای ئەوەی خۆی بە برایەكانی دەناسێنێ، دەڵێ: ﴿وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾﴾، واتە: هەرچی خزم‌و كەسوكارو ماڵ‌و منداڵتانە، هەموویان بێنن، چونكە هەموویان : باب‌و دایكی‌و برایەكانی‌و، هاوسەرەكانیان‌و منداڵەكانیانن، كە برازاینی ئەگەر كوڕن، ئەگەر كچن، ئیدی هەموویان خزم‌و نزیكی پلە یەك‌و دوون‌و، بۆیە لەسەرخۆی بە پێویست زانیوە، كە دەبێ ڕێزیان بگرێ‌و حورمەتیان بگرێ‌و، چاكەیان لەگەڵدا بكات‌و، هاوكارییان بكات، لەو قات‌و قڕیی‌و گرانییەدا، كە بەسەر ئەو دەڤەرەدا هاتوە، دەبێ بیانهێنێ بۆ میسر، بۆ ئەوەی ئەو قۆناغە سەختە تێپەڕێنن‌و، دوایی لە میسر نیشتەجێ بن‌و، لە ژیانی بیابان‌و ژیانی كۆچبەریی‌و خێڵەكیی دەربازیان بكات .

یەنجاو سێیەم: كاتێك كە مرۆڤ خوا چاكەیەكی لەگەڵدا دەكات، نیعمەتێكی خۆی پێ دەبەخشێ، دەبێ ئەو چاكەو نیعمەتانە، بۆ خاوەنەكەیان بگێڕێتەوە، كە خوایە ﷻ نەك خۆییان پێوە هەڵكێشێ، بەڵكو فەزڵ‌و چاكە بۆ خاوەن فەزڵ بگێڕێتەوەو، نیعمەت بۆ نیعمەتدەر (مُنْعِمْ) بگێڕێتەوە، كە خوایە، چونكە خوا دەفەرموێ : ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ ﴿٥٣﴾﴾ النحل، واتە: هەرچی چاكەیەك لە ئێوەدا هەیە، هەرچی خۆشیی‌و نیعمەتێك لە ئێوەدا هەیە، هەمووی لە خواوەیە، دوایی ئەگەر تووشی ناڕەحەتییەكیش بوون، هەر بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، هەر پەنا بە خوا دەگرن‌و، هاوار بەس لە خوا دەبەستن .

بۆیە یوسوف ﷺ دەڵێ: ﴿وَقَدْ أَحْسَنَ بِي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ ﴿١٠٠﴾﴾، واتە: مسۆگەر خوا چاكەی لەگەڵ مندا كردوە، كە لە بەندیخانەی دەرهێنام‌و ئێوەشی لە بیابانەوە هێنا، واتە: ئێوەی لەو ژیانی سەختی بیابانشینییە دەرباز كردو، كردنی بە شارنشین .

یەنجاو چوارەم: مرۆڤ دەبێ دوای ئەوەی لەگەڵ كەسێكدا ناكۆكیی بووە، بەڵام دوایی ئاشتییان دەكەوێتەوە بەین، خۆی بپارێزێ لە هەر وشەو

تەعبیرێك، كە بۆنی برین كولانەوەی لێبێ، وەك گوتراوە: (ذِكر الجفاءِ فِي وَقتِ الصَّفا جَفَاءِ) باسی جەفاو دووریی لە كاتی صافبوونەوەو ئاشتەوایی دا، مایەی دووریی‌و نیشانەی نەزانییەو، كەم سەلیقەیی دەگەیەنێ، بۆیە یوسوف (علیه السلام) كە باسی چاكەكانی خوا دەكات، باسی دەرهێنرانی لە بیرەكە ناكات، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ ﴾، دیارە پێش ئەوەی بچێتە بەندیخانەو، تۆمەتی بۆ هەڵبەستری، برایەكانی خستوویانەتە بیرەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك تەنانەت بۆ ئاماژەش، یوسوف باسی خرانە بیرو هێترانەدەری لە بیرو، پاشان كاروانەكە كە وەك كۆیلەیەك فرۆشتوویانە، باسی ئەوانە ناكات، بۆچی؟ چونكە ئەوە برینی برایەكانی دەكولێنێتەوەو جۆرێك لە بەچاو دادانەوەی تێدا دەبێ، بۆیە ئەو لاپەڕەیە هەر لادەبا، یەكسەر دێتە سەر ئەوەی كە خوا لە بەندیخانە هێناویەتەدەر، ئەوەش بەڕاستی ئەدەبێكی بەرزەو، هەر ئەوەش لە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و شوێنكەوتووانی ڕاستەقینەی پێغەمبەران چاوەڕێ دەكرێ .

<u>پەنجاو پێنجەم:</u> پەندێكی دیكە ئەوەیە: كە خوا (سبحانه وتعالى) لەگەڵ بەندەكانی خۆیدا، ئەوپەڕی بەخشندەیە، بە لوتفە، جاری واهەیە مینحەیان[1] بۆ دەخاتە دوو تووێی میحنەتەوە[2]، واتە: ناڕەحەتیان دەكات، بەڵام ئەو ناڕەحەتییە كە بە ڕواڵەت ناڕەحەتییە، نێوەڕۆكەكەی بریتییە لە خەڵاتو بەخشینو چاكە .

یوسوف (علیه السلام) بە هەموو ئەو قۆناغانەدا تێپەڕی، بۆ ئەوەی لە دواییدا ببێ بە حوكمڕانێك لە میسرداو، ئاوا دەستڕۆیشتوو بێو بتوانێ خزمەتی خزمو كەسوكارەكەی خۆیشی بكاتو، خزمەتی خەڵكی میسریش بكات، ئنجا ئەگەر یوسوف ئەو ناڕەحەتییانەی نەبینیبایە، ئەگەر بەو قاڵدرمانەدا سەرنەكەتبایە، نەدەگەیشتە ئەو سەرەوەیە، ئەو باڵەخانەیە ئەو پێگەو دەستڕۆیشتووییە، كە خوای بەخشەر پێی داوە .

---

١) مِنْحة: بەخشش، خەڵات، دیاریی .

٢) محنة: گرفتارییو، سەختیی، ناخۆشیی .

پەنجاو شەشەم : دەرس و پەندێکی دیکە، کە لەو بەسەرهاتە وەردەگیرێ، ئەوەیە کە دەبێ ئینسان هەمیشە لە خوا بپاڕێتەوە: بەردەوامی بکات، بەرقەراری بکات، پشوو درێژی بکات، ڕاوەستاوی بکات، هەروەها دەبێ لە خوا غافڵ نەبێ، بەو هۆیەوە کە دەستەڵاتی هەیەو دەستڕۆیشتوویە، یان بەهۆی ئەوەوە کە دەوڵەمەندو بێنیازە، بەڵکو دەبێ لەو حاڵەتانەدا زیاتر سەری بەندایەتیی بۆ خوا دابنوێنێ، ئەوەتا یوسوف ﷺ لە کۆتایی بەسەرهاتەکەی خۆیدا، دەڵێ: ﴿ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِى مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِى مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِىِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ﴾.

واتە: پەروەردگارم! تۆ بەشێك لە موڵكو حوكمڕانییت بە من داوەو، لە لێکدانەوەی خەونانت شارەزا کردووم، ئەی پەیداکەری ئاسمانەکانو زەوی! تۆی سەرپەرشتیارو مشوورخۆرم لە دنیاو دواڕۆژدا، واتە: هەر ئاگات لێمبێو مشوورم بخۆ، وەك چۆن لە دنیادا مشوورت خواردوومو، ئاگات لێم بووەو پشتت گرتووم، لە دواڕۆژیش دا مشوورم بخۆو ئاگات لێم بێ، من بەندەی تۆم .

بەڵێ دەبێ ئینسان هەمیشە بەم شێوەیە لە خزمەت خوای پەروەردگاریدا، بەندایەتیی خۆی دەربخاتو، هەمیشە نیازمەندیی خۆی بەرانبەر خوای بەرز پێشان بدات .

پەنجاو حەوتەم : زانایانو شارەزایانی بواری ڕۆمانو چیرۆك دەڵێن: ڕەگەزی کتوپڕ بەسەردا کەوتن، پێکهێنەرێکی گرنگی چیرۆكو بەسەرهاتانە، ئنجا لە بەسەرهاتی (یوسف) ﷺ دا، زۆر بە زەقیی ئەوە هەیە، بۆ نموونە:

١ - جارێ لە سەرەتاوە خوای بەرزو مەزن، باسی ئەوە ناکات کە ئەو ماڵەی (یوسف)ی تێدایە، ماڵی کێیە ؟ بەس دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ ﴿٢١﴾ ﴾، جارێ ئێمە نازانین ئەو کەسەی (یوسف)ی کڕیوە

وەك کۆیلەو بە ژنەکەی دەڵێ: ﴿أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَىٰ أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ﴿٢١﴾﴾، واتە: ڕێز لە جێگاو ڕێگاکەی بگرەو خزمەتی بکە، ئێمە نازانین ئەوە کێیە ؟

٢ – ئنجا دواییش کە باسی ئافرەتەکەش دەکات کە دەورو خولی یوسوفی داوە: ﴿وَرَٰوَدَتْهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِۦ ﴿٢٣﴾﴾، دیسان جارێ نازانین ئەو ژنە کێیەو ئەوماڵە ماڵی کێیە؟ بەڵام دوایی بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو کەسەی کڕیویەتی عەزیزی میسڕ بووەو، ژنەکەش، ژنی وی بووە .

<u>پەنجاو هەشتەم:</u> یەکێکی دیکە لەو پەندانە کە لە بەسەرهاتی یوسوف وەردەگیرێن، ئەوەیە کە: لە بەسەرهاتی یوسوف ﷺدا زۆر شت قرتێنراوە، کە بە سیاق و سەلیقەو بە عەقڵ و هۆشی مرۆڤ کەشف دەکرێن، بۆ وێنە: هەموو جارێ کە کوڕەکانی یەعقووب لە میسڕ دەگەڕێنەوە بۆ کەنعان، خوای شارەزا باسی ئەو هەموو وردەکارییە ناکات: بەو جۆرە باریان لێناوەو، چەند ڕۆژان بەڕێدا ڕۆیشتوونو، چەند جار باریان خستووەو، چەند ئیسراحەتیان کردوەو، بەو شێوەیە چوونەوە کەنعان، ئەو شتانە باس ناکات، هەروەها کە لەسەر زەمینی خۆیان لەلای بابیان و لە دەڤەری خۆیان، لە کەنعانەوە دێنەوە میسڕ، دیسان خوای زانا باسی وردەکارییەکان ناکات، واتە: هەرچی بە عەقڵ و سەلیقە دەزانرێ، خوا ﷻ دەیقرتێنێ و یەکسەر شوێنی مەبەست باس دەکات، بۆ ئەوەی کورتتر بێتەوە .

<u>پەنجاو نۆیەم:</u> ئەم بەسەرهاتە، هەرچەندە باسی حاڵەتی هەڵچوون و وروژانی جینسیی تێدایە، بەڵام وشەیەك و، تەعبیرێکی ناڕێك، کە بێ نەزاکەتبێ، لەم بەسەرهاتەدا نابینی، کاتێك کە ژنەکەی عەزیز، پڕکێشیی دەکات بۆ یوسوف ﷺ و دەیەوێ بیهێنێتە سەر قەناعەتی خۆی و، دەستی دەگەڵ تێکەڵ بکات بە حەرامیی، خوا تەعبیرێك بەکاردێنێ کە لە قورئاندا تاکەو، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە: ﴿وَرَٰوَدَتْهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِۦ ﴿٢٣﴾﴾، واتە: ئەو ژنەی کە یوسوف لە ماڵەکەیاندا بوو، ویستی کە یوسوف

پەلکێش بکاتو، لەسەر ڕای خۆی لایبداتو، بیهێنێتە سەر ڕای خۆی، واتە: بیهێنێتە سەر ئەو قەناعەتەی بە حەرامیی دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکات .

هەروەها لە درێژەی بەسەرهاتەکەدا، دوایی یوسوف ﷺ دەڵێ: ﴿ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِي ﴿٢٦﴾ ﴾، واتە: ئەو ویستی پەلکێشی من بکات، ئیدی چیدیکە بە دوای ناکەوێ .

بەلآم من کە تەماشای پەیمانی کۆنم کردوە، لە پەیمانی کۆندا زۆر بە زەقیی دەڵێ: ژنەکە گوتی: دەبێ لەگەڵم ڕاکشێیو کاری خراپم لەگەڵدا بکەی! یانی: هەر بە زەقیی وشەو تەعبیرەکان دێنێ، کە بە تەئکید لە کاتی خۆشی دا لە تەوراتدا، خوای بەرزو مەزن هەر بە تەعبیری بە نەزاکەتو بە ویقارەوە باسی کردوە، بەلآم ئەوان کە تەرجەمەیان کردوەو گۆڕیویانە، بەو جۆرەیان لێکردوەو، وشەو تەعبیری بازاڕییو عەوامانەیان بەکارهێناوە .

<u>شەشەم:</u> ئنجا لە کۆتایی دا یوسوف ﷺ داوای سەرەنجام خێریی دەکات، لە خوا ﷻ هەم لە دنیاو هەم لە قیامەتدا، کە دەفەرموێ: ﴿ تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە: بە مسوڵمانەتییو بە ملکەچی بمرێنەو، بە کاروانی چاکانم بگەیەنە .

کە دەفەرموێ: (تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا )، ئەوە بۆ دنیایە، واتە: لە دنیادا با هەر بە ملکەچیی بۆ تۆ بژیم، ئنجا ئینسان لەسەر چی بژی، لەسەر ئەوەش دەمرێ، ئەگەر بە مسوڵمانیەتیی بژی، بە مسوڵمانیەتییش دەمرێ، بۆ دوارۆژیش دەفەرموێ: (وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ )، واتە: بمگەیەنە بە کاروانی چاکان، مەبەست ئەوەیە: لە بەهەشتدا لەگەڵ چاکەکاراندا کۆم بکەوە، با منیش لە ڕیزی ئەواندا بم .

ئێمەش لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوەو دەڵێین: (توفَّنا مُسلمين وألحقنا بالصالحين)، خوایە! ئێمەش بە ملکەچیی‌و گەردنکەچیی‌و مسوڵمانەتیی بژیەنەو بمرێنەو، لە دواڕۆژیشدا بمانخە نێو ڕیزو کاروانی چاکەکارانەوە.

لێرەشدا دێینە کۆتایی توێژینەوەمان دەربارەی سووڕەتی موبارەکی یوسوف صەڵاتو سەلامی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەرانی خوا بێ، بەتایبەتی لەسەر یەعقووبو لەسەر یوسوف، خوای پەروەردگار لە برایەکانی (یوسف)یش خۆش بێ، کە ئاوا هەم بەرانبەر بابو دایکیانو، هەم بەرانبەر بە یوسوفو بنیامینی برایان، ناڕێکییان کردوە، کە دیارە پەشێمانیش بوونەوەو، خوای پەروەردگاریش بەڵێنی داوە: هەر کەسێك پەشێمان بێتەوەو بگەڕێتەوە، خوا لێی خۆش دەبێ، خوا لێیان خۆشبێ .

خوا یارمەتی ئێمەش بدات: خۆمان بڕازێنینەوە، بەو سیفەتە بەرزانەی کە لە یەعقووبو لە یوسوف دا صەڵاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ هەبوون، یارمەتیشمان بدات خۆمان بپارێزین، لەو ڕەوشتو کارو کردەوە خراپانەی کە برایەکانی یوسوف ڕەچاویان کردوونو، خراپەکاران ڕەچاویان دەکەن .

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

مێژووی پێداچوونەوە

١٠ ی محرم ١٤٤٠ ك

٢٠١٨/٩/٢ ز

هەولێر

# سەرچاوەكان

١) تفسير الطَّبَرِي الْمُسمى جامع البيان في تأويل القُرآن ، لأَبي جَعفَر محمد بن جرير الطَّبَرِي، تحقيق: هاني الحاج، عماد زكي البارودي، خَيْرِي سعيد، المكتبة التوفيقية، ٢٠٠٤ القاهرة .

٢) المِصبَاحُ الْمُنِير في تَهْذِيب تفسير ابن كثير للإمام الجليل عِماد الدِّين أَبي الفِداءِ إِسْماعيل بن عُمَر بن كَثير القرشي الدمشقي ، إِعداد جماعَة مِنَ العُلَمَاء ، بإِشراف الشيخ صَفي الرحمن المباركفوري ، دار السلام ، الطبعة الثانية (١٤٢١هـ - ٢٠٠٠ م) .

٣) التفسير الكبير أَو مَفَاتيحُ الغَيْب للإمام فَخْرالدِّين محمد بن عُمَربن الحسين بن الحسن ابن علي التميمي البكري الرازي الشافعي ، حَقّقَهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ وَخَرَّجَ أَحاديثَهُ عِماد زكي البارودي المكتبة التوفيقية .

٤) الجامع لأحكام القُرآن، تفسير القُرطُبي لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القُرطُبي، حَقّقَهُ وَخَرّجَ أَحاديثَهُ عِماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية.

٥) أَحْكَام القُرْآن ، لأبي بَكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، راجع أصولهُ وَخَرَّجَ أَحاديثَهُ وَعَلّقَ عَلَيْهِ محمد عبدالقادر عطا، الطبعة الأولى (١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م) .

٦) فتح القدير، الجامع بين فني الرواية و الدراية من عِلم التفسير (تفسير الشوكاني) تأليف : الإمام العلامة محمد بن علي بن محمد الشوكاني ، تحقيق : عبدالرزاق الْمَهدي ، دار الكتاب العربي ، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م) .

٧) زاد المسير في علم التفسير : لابن الجوزي .

٨) روح المعاني : للآلوسي .

٩) تفسير القاسمي الْمُسمى محاسن التأويل ، تأليف : علامة الشام محمد جمال الدين القاسمي ، دار الفكر الطبعة الأولى (١٣٩٨هـ - ١٩٧٨م) .

١٠) تفسير المراغي ، تأليف أحمد مصطفى المراغي ، دار الفكر ، بيروت .

